# ئاغاكانی ئاقچاساز

## بەرگی یەكەم

**ڕۆمان**

**یەشار كەمال**

**و: ڕەسووڵ سوڵتانی**

هەولێر ٢٠١٣

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ئاغاکانی ئاقچاساز ١ (رۆمان)**

- نووسینی: یەشار کەمال
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: رەئیس نیا
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: رەسووڵ سوڵتانی
- نەخشەسازی ناوەوە: وەرگێڕ
- بەرگ: هۆگر سدیق
- ژمارەی سپاردن: (٢٥٥٥)
- نرخ: ١٢٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم: خانەی موکریانی ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٥٥٥)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (٧٤٥)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**ئەو وەرگێڕانە پێشکەش بە قەڵەمە بەبڕشت و جواننووسەکەی**

**مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە**

# ١

"ئاخ بۆ ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەسپە جوانەکانیان بوون و سەری خۆیان هەڵگرت و رۆیشتن."

دەروێش بەگ شینی دەگێڕا، شینێکی کۆن، قورس و دوور. بۆ ئەوەی بچێتەوە نێو ئەو خەونە سیحراوییەی کە چەند ساڵ لەمەوبەر تێیدا ژیابوو، یەك پشوو دەیچڕی:"ئای بۆ ئەو بنیادەمە باشانە، باشە....".

باران دەتگوت گۆزەی سەرەو ژێرە، زەرد زەرد و بەبێ هەورەتریشقە. لە پەستا و بە خوڕەم. شەو لە دیوارێکی تاریك دەچوو. دەنگی خرمەی کپ و دووری بارانەکە دەشتەکەی ئاخنیبوو، تووڕە وەك خۆڵ و بەرد و بەبێ هیچ دەنگێکی دی.

دەروێش بەگ دەتگوت گوێی لە ناڵینێك بوو، دەنگێکی کز و شین کە تێکەڵاوی دەنگی بارانەکە دەبوو. بەرەو پەنجەرەکە رای کرد و لە چەقی حەوشەکەدا تارمایی سوارێکی دی هەر لە خەیاڵ دەچوو. ترپەی دڵی وەك فڕەی باڵی پاساری هات و دەستی هەر لە خۆوە و بەپەلە بەرەو دەسکی دەمانچەکە خوشی. دەمانچەکەی راکێشا و لە کەلێنی پەردە کرکرەکەی پەنجەرەکەوە سێرەی لە دەرەوە گرت. بەڵام رێك لەو کاتەدا کە دەیویست پەنجەی لە سەر پەلەپیتکەی ببزێوێ، دەستی راگرت. تارماییەکە بەبێ جووڵە و وەك پەڵەیەکی رەش لە ناخی شەوەکەدا مایەوە.

دەروێش بەگ رای کردە ژوورەکانی دیکە و چووە بەر پەنجەرەکانی دیکەش و لە تاریکاییەکەدا نە پەڵەیەکی دیت و نە تارماییەکیش. هەتا چاو هەتەری دەکرد، شەوەکە تاریك و بێ پەڵە باڵی کێشابوو. بارانەکەی زەرد بوو و کە دەڕژایە سەر عەرزە گەرمەکە، هاڵاوێکی زەردباوی لێ هەڵدەستا، وەك ئاسنێکی تواوە باریبێ. شەو و تاریکاییەکی هەڵماوی و تەم و مژ.

گەڕایەوە و دیسان بە دوو دڵییەوە چۆوە بەر ئەو پەنجەرەیە کە دەیڕوانییە سەر حەوشە بەرین و هەراوەکە و چاوەکانی بچووك کردنەوە و راما. تارماییە رەشەکە هەر وا، بەبێ هیچ

جووڵە و تەکانێك لە سەر جێیەکەی پێشووی راوەستابوو. دەمانچەکەی کێشا و تۆپەی دەمانچەکەی چەند جارێك سووڕاند و لوولەکەی لە کەلێنی پەردەکەوە بردە دەرێ. دڕدۆنگ بوو:"ئەو بنیادەمە کێ بوو و لە حەوشەی کۆشکەکەی ئەودا چی دەکرد؟ چاوەڕێی چ بوو؟ ئەگەر دوژمن بوایە ئاخۆ ئاوا لە چەقی حەوشەکەدا دەچەقی؟ ئەی ئەگەر دۆست یان میوان بوایە، دەنگی نەدەکرد؟ لە بەر ئەو بارانە بە خوڕەمە چی دەویست؟ نەکا، لێقەوماوێك بێ؟ دەروێش بەگ دەمانچەکەی هێنایەوە دواوە و بە دەم خولاندنەوەی تۆپەکەیەوە، بە نێو هۆڵەکەدا کەوتە پیاسە و هات و چۆ. حیلەی کز و کپی ئەسپەکە لە دەرەوە بیسترا.

دەروێش بەگ دەمودەست خۆی هاویشتەوە بەر پەنجەرەکە و تارماییەکە کاڵتر و گێژتر خۆی بە تاریکی و بارانەکەوە نووساندبوو و راوەستابوو. دەستی دەروێش بەگ دیسان لە خۆوە بەرەو دەمانچەکەی خزی، بەڵام خێرا کشایەوە. هەر دەهات و کونجکۆڵییەکەی پتر دەبوو. زیندەوەرێك لە کۆشکێدا بەخەبەر نەبوو. لەوانە بوو پاسەوانەکانی دەرەوەش لە نێو باغەکەدا و پاسەوانەکانی ناوەوەش هاوکات نوستبێن. ئەو تارماییە چەقیوە لە چەقی حەوشەکەدا نەکا ئەسپێکی بێ سوار بێ؟ ئەسپەکە جارێکی دیکە کپتر و کزتر حیلاندی. دەتگوت چەقوچۆیەتی و لە سەرمان دەلەرزی، بەڵام لەو تاریکاییەدا کە بە داوێنی ئەوەکەوە نووسابوو، هیچ جووڵەیەك بەدی نەدەکرا.

دیار و نەدیار چەند باڵندەیەك خۆیان بە نێو باران و شەوەکەدا کرد و پۆل پۆل و دەستە دەستە لە شەقەی باڵیان دا و فڕین. مەلەکان دەستە دەستە لە ئاسمانەوە دەنیشتنەوە و وەك بارانێکی پوولەکە زەرد هەڵدەوەرینە سەر داوێنی شەو و عەرزە رەشەکە. دەروێش بەگ تارماییە چەقیوەکەی حەوشەی لە بیر چۆوە و نوقمی خەیاڵی ئەو باڵندانە بوو کە پەیتا پەیتا لە باغەکەدا دەنیشتنەوە. هەواکەی دەرەوە بێجووڵە و تەماوی و بارانی و خنکێنەر بوو.

شەوگار شەق بوو. کازیوەیەکی زەردهەڵگەڕاو، لە لووتکەی چیا مات و تەماوییەکانەوە دەرکەوت و قەتیس ما. لە بارانە زەرد زەردەکەوە و لە پۆل پۆلە بریسکەدارەکانی سەر خاکە زەردباوەکەدا و لە ئاو و دار و گرد و قامیشەڵانەکانەوە هەڵم و هاڵاوێکی زەرد هەڵدەستا. لەگەڵ تاو هەڵات، بارانەکەش توندی کرد و وردە وردە رەنگی زەردی هاڵاو و درەوشانەوەیەکی زەردباوی بەخۆوە گرت و لەو کاتەدا بارانێکی توند و بریقەداری وەك دەمی چەقۆ دایکرد.

لە حەوشەکەدا پیاوێك، کە خۆی لە کەپەنەکێکەوە پێچابوو، بە سەر ئەسپێکەوە کە زینێکی درێژی تورکمانیی لە سەر پشت بوو، هەروا لە بەر بارانەکە مابۆوە. پاش و کەفەڵی

ئەسپەکە و کەپەنەکی سوارەکە هەڵمێکی زەردباوی لێ هەڵدەستا. ئەسپەکە ملی خۆی درێژ کردبۆوە، دەتگوت بە کونە تفنکیدا بۆن بە بارانەکەوە دەکا. دڵۆپەی بارانەکە لە سەر و کەفەڵی ئەسپەکە و کەپەنەکی سوارەکە دەڕژیە خوارێ. ئاوی بارانەکە لە گۆڵێنگە زێڕچنەکانی کەپەنەکەکەی دەچۆڕایەوە.

ئەو پیاوەی بە سەر ملی ئەسپەکەیدا شۆڕ ببۆوە، دەتگوت وەنەوز دەدا یان لە خەوێکی قووڵ دایە.

سێبەری سوارەکە رەش و تۆخ کەوتە سەر عەرزەکە. چەکمەکانی پڕ پڕ ببوون لە خوێنێکی کەفکردوو. بۆنی تەڕی بووزووەکەی لە دوورەوە دەهات. بە سەدان مێشی کەسك لە زەردایییە رووناکەکەدا، بە دەوری سوارەکەدا دەسووڕانەوە. خوێنە چۆڕەی رکێفەکەی دەڕژایە سەر خاکە نەرمەکەی حەوشەکە و لە سەر عەرزەکە، وردە قوڵکەی دروست دەکردن. کابرای قەپۆز بەرانی، کە بە سەر ملی ئەسپەکەیدا خۆی گرمۆڵە کردبوو، بە هێمنی ئەو سەری و ردێنە رەشە مەیلەو کەسکەکەی کە بە سینگیدا شۆڕ ببۆوە، هەڵێنا و بە چاوە تار و خەفەتبار و بێ تین و خەیاڵاوی و سڵۆکەکانییەوە، سەیرێکی کۆشکەکەی کرد. دەستە بێ تین و هێزە شۆڕبووەکانی جووڵەیان کرد و رێشمەی ئەسپەکەی کێشا. ئەسپەکە ملی کێشا و سەری بەرز کردەوە و یەك دوو لوێچ کەفی خەست خەستی لە لا لغاوییەوە دایە دەرەوە.

خوێنی نێو چەکمەکان خەریك بوو هەڵدەچۆڕان و کەفەکەنیش دەنیشتەوە و وشك دەبوو و مەودای نێوان چۆڕانەوەی دڵۆپە خوێنەکان بۆ سەر خاکە نەرمەکە، هەر دەهات و پتر دەبوو. دەستەکانی کابرا چەند جارێکی دیکەش جووڵان و ئەسپەکەی سەری بەرزتر کردەوە. دیسان سەری کابرا بە سینگیدا شۆڕ بۆوە. بە سەدان مێشی کەسك لە بریسکە بریسکی بارانە زەردەکەدا، بە وزە وز بریسکانەوە و بێدەنگ بوونەوە. کەسکێکی پۆلایی دەنگی هات و لە سێبەری خوێنەکەی سەر خاکە نەرمەکەی حەوشەکەدا کپ بوو. دەروێش بەگ ئاماژەی بە پیاوەکانی خۆی کرد و ئەوان بە پەلەپەل لە پلیکانەکانی کۆشکەکەوە هاتنە خوارێ و سوارەکەیان دابەزاند. دەستەکانی کابرا بە هەوسارەکەوە توند ببوون. لێك جوێکردنەوەیان ئەستەم بوو. خوێنی سەر چەکمەکە مەیبوو. ئەو باریکە خوێنەی بە سەر پانتۆڵەکەیدا شۆلاوگەی بەستبوو، خەریك بوو رادەوەستا. ئەو مێشانەی کەسکایی هەورەتریشقەکەیان دەبریسکاندەوە، لە سەر خوێنەکە هەڵنیشتبوون.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا."

پیاوەکان کابرا گرمۆڵەبووەکەیان بردە نێو کۆشکەکەوە. کەپەنەکە تەڕەکەیان لە سەر شانی لا برد. لە بن کەپەنەکەکەیەوە فیلەنتایەکی ئەڵمانی دەرکەوت. چەند ریزە فیشەکی لە قەدی خۆی ئاڵاندبوو. خوێن لە سەر کەشکەژنۆی چەپی مەیی‌بوو.

دەروێش بەگ بە پەلە گەیشتێ:"بیهێننە سەرەوە، سەرەوە. جلوبەرگی لە بەر داکەنن با داپیرە سەیرێکی برینەکەی بکا."

کابرایان بردە سەرێ. جلوبەرگەکەیان لەبەری داکەند و چایەکیان بە دمییەوە کرد. داپیرە برینەکەی دۆزییەوە و خوێنەکەی دەوروبەری خاوێن کردەوە. لەو جەنگەیەدا کابرا چاوە گەورەکانی هەڵێنا. چاوەکانی وەك رەژوو رەش رەش بوون و گلێنەشی دەتگوت دوو پشکۆی سوورن و مژۆڵە درێژەکانیشی هەڵگەڕابوونەوە. کاکۆڵە رەش و لوول و خووساوەکەی بە سەر تەوێڵیدا پەخش و پەرێشان ببوو. دەموچاوە درێژەکەی، چەناگە قووڵەکەی، پەنجە درێژەکانی و بەژنە بەرز و کەڵەگەتەکەی، وای لە دەروێش بەگ کردبوو لە دڵدا بە ڕێزەوە لێی بڕوانێت و کونجکۆڵیش بێ بۆ ئەوەی بزانێ کێیە. ئەو کابرایەی وەك مەلێکی زامار، لە نیوەشەوێدا هانای هێناوەتە بەر ماڵەکەی، بڵێی کێ بێ؟

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا، ئەو بنیادەمە باشانەی، ئەو بنیادەمە باشانەی... بنیادەمە باشانەی... سوڵتان ئاغا".

کابرا چەند قسەیەکی لە بن لێوانەوە گوتنەوە. ددانە رێك و جوانەکان وەك شیر سپی بوون. لێوەکانی لە نێو دەموچاوە رەنگ پەڕیو و زەردهەڵگەڕاو و گۆشتنەکەیدا، تەڕ و تورت دیار بوون. هەر وەك دەم و ددانی منداڵێك. زمانەکەی شیرن بوو. بە بن زاراوەی باشووری دوور و باشووری رۆژهەڵاتی قسەی دەکرد. بۆنی هەتاو و بارانی لێ دەهات. بۆنی پووش و گیای وشك و سووتاوی بەر هەتاو و بارانی لێوە دەهات.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا، ئاخرییەکەی..."

کە گەرماکە بە گیانیدا گەڕا، کابرا بەلادا هات و خەوێکی قورس پێچایەوە. نوێن و بانێکی خاوێنیان بۆ هێنا کە بۆنی ئاو و سابوونی لێوە دەهات و وەك بەفر سپی بوو. دەستەکانی کابرا لە خەوێشدا هەر قووچابوون و نینۆکەکانی بە لەپی دەستیدا رۆچوبوون.

لە ئاپاش، لە زەیتوون بلەی و لە کەنارەکانی خوارووی دەریای نێوەڕاستەوە، گەردەلوولێك هەستا. لە لای سەرووەوە، لە چەقی ئاسمانە ساماڵ و شینەکەوە، هەوری سپی گەواڵ گەواڵ کۆ دەبوونەوە و لە سەر یەك کەڵەکە دەبوون. ئەو هەورانەی دەتگوت بایەوانی پاپۆڕن لە رووناکایی

دەمی زەردەپەڕدا تێك دەچڕژان. گەردەلوولەکە گێژی دەدا و هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە و جار بە جاریش خێراتر دەبوو و کۆڵەکەی دەکرد بەرەو چەقی ئاسمان و بە گرمە و لوورە خۆڵ و خاکەکەی هەڵدەستاند و دەیبرد.

گەردەلوولەکە تاوێك لە کەنارەکەی دەریای نێوەڕاستیشدا سووڕایەوە. کا و کۆت و پووش و پەڵاشی لە رەگەوە دەرهاتووی بەر تاوە ماتەکەی زەردەپەڕ، وەك هەزاران و سەد هەزاران بلێسە دەدرەوشانەوە و دەکوژانەوە. گەردەلوولەکەش وەك هەورە چڕەکانی باوەشی ئاسمان سپی دەچۆوە.

کۆڵەکەی گەردەلوولەکە شان بە شانی بای رۆژاوا هەر هات و گەورەتر و ئەستوورتر بۆوە و لە بەر یەك کشایەوە و خێراتر بوو و لە دەریاوە بەرەو باکوور و بەرەو چیاکانی بین بۆغا رۆیشت. زۆربەی هەرە زۆری جاران دەمی ئێوارەی چوکووراوا ئاوایە. گەردەلوولەکان، زۆر بوون، بە دوای یەك دا ریزیان گرت و بە خێرایی بەرەو کووزان ملیان پێوە نا.

سێبەری چیاکان بەرەو رۆژهەڵات رادەکشا. سێبەرە تەنك و سپی و رەنگ پەڕیوەکانی هەورەکان لێرە و لەوێ شوێن شوێن بە سەر دەشتەکەدا دەخشکان.

گەردەلوولەکان وەك هەور سپی و هەر کامێکیش هێندەی دوو سێ سپیندار بەرز بوون...

بە دەم ئەوەوە کە لە ترۆپکەکەیانەوە خۆڵ و تۆز هەڵدەستا و دەبووە پووش و پشکۆ و دەنکەتیشکی دەپریشکاند، بە سەر رێگە پڕ لە خۆڵ و تۆزەکاندا خۆیان راکێش دەکرد و لێرە و لەوێ بەلادا دەهاتن و لە پێ دەکەوتن و دیسان هەڵدەستانەوە و قیت دەبوونەوە دیسان دەنیشتنەوە و ون دەبوون.

کۆمەڵێك گەردەلوولی سوورباویش لە سەر دۆملۆوە، لە بەر زەرد و ماە و رەوەزە سوورباوەکانەوە هەستابوون و بەرانبەر رەوەزە ئەرخەوانی و بەرزەکانی ئاناوەرزا و لە قەراغ و لێوارەکانی ئاقچاسازەوە دەسووڕانەوە.

باهۆز و گەردەلوولە سوورەکان پاش ئەوەی ماوەیەك لە ئاقچاساز و کەنارەکانی رووباری ساروونددا خولانەوە و تێك ئالان، لە رووباری جەیهان پەڕینەوە و هاتنە کێڵگە تووتنەکانی ساکارجا کە لە دوورەوە دەتگوت تەپۆڵکێکی رەشە و لەوێش تێکەڵی گەردەلوولە سەوزباوەکان بوون و بە خێراییەوە بەرەو چای گاوران کشان.

بە تۆپراق قەڵا و تێل قوبەشەوە دە دوازدە گێژەڵووکە هەستاو و کۆڵەکەیان کرد و هێندەی هێڵێکی شەمەندەفەر دوور و درێژ، بە پشت سەری یەکتریدا ریزیان بەست.

خوناوکەی باران دایکرد، زەرد زەرد و بلێیی و نەلێیی روون. بارانەکە نەك دەنك دەنك، بە خوڕەم دەباری، وەك شیرێکی لە گوانی مانگاوە بدۆشرێ، وەك کۆمەڵە داوێکی لە ئاسمانەوە رۆهێشرابێن.... بە دوای ئەوەدا بارانێکی وەك گۆزەی سەروبن. لێرە و لەوێ گۆلاو دروست بوون. خاکە زەردەکە هەڵاوسا و تاریکاییەکە زەرد هەڵگەڕا و لە ناخی تاریکاییەکەوە سوارێك خوشی و تێپەڕی. سوارەکە سێ جاران بە دەوری ئاناوەرزادا سووڕایەوە. نۆ سوار سەریان لە دووی سوارەکە نابوو. کۆمەڵێك پیاو کە جامانەی دەورچنراویان لە سەر و خووساوی ئارەقە و ئەسپەکانیان عارەبی و دەمولمۆز کەفاوی بوون. پیاوەکان لە دوور و نزیکەوە پەیتا پەیتا دەسرێژیان لە سوارەکە دەکرد. ئەسپەکە لە پێشیانەوە وا دەفڕی دەتگوت بە سەر عەرزەکەدا دەخوشێ و جاری واش هەبوو نسکۆی دەبرد. سوارەکان خۆی بە بارانەکەدا کرد و لە بارانە تاریکەکەوە، زەرد زەرد هاتنە دەرەوە. توورەکەکانیان، کەپەنەك و پاڵتۆ بارانگر و ئەسپ و سەر و کاکۆڵ و جلوبەرگەکانیان هەر هەمووی زەرد دەچوونەوە. سوارەکان خۆیان بە گەردەلوولەکەدا کرد. خۆی بە گێژەڵووکە و باهۆز و گەواڵە هەورە نیشتووەکاندا کرد و هاتنەوە دەرێ و یەك ریز دەسرێژیان دەکرد. جار و بار دەگەیشتنە بەر هەتاوەکە و لوولەی چەکەکانیان دەبریسکانەوە. بە تەپوتۆزەکەشدا تێپەڕین و کەوتنە بەر بارانەکەوە. خۆی بە لێڕەوارەکەدا کرد و ئەو تاکە سوارەیان لێ بزر بوو کە بە شوێنییەوە بوون و لە نێو پێدەشتەکەدا سەرگەردان و سەر لێ شێواو مانەوە و پەرش و بڵاو بوون و ئاخرییەکەی لە شوێنێك گەیشتنەوە یەك.

شانی تاکە سوارەکە خوێنی لێ هەڵدەقوڵی، خوێنێکی وەك یاقووتی سوور و گەرم... خوێنەکە دەڕژایە چەکمەکانییەوە. سوارەکە لە ئەسپەکەی دابەزی و پاڵی بە دارە توویەکەوە دا. دارەکە ئارەقەی کرد. گەڵا تۆزاوییەکانی، قەدە پڕ لە گرێیەکەی، لك و پۆ و رەگەکانی کە چووبوونە سەر دڵی زەوی، ئارەقەیان کرد. کابرای لە خوێن شەڵاڵیش کە پاڵی بە دار توووەکەوە دابوو و هەوسارەکەی لە رەگی دارەکە بەستبوو، ئارەقەی کرد.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا.... رووناکاییم دیتووە، گیان و دڵەکەم، براکەم سوڵتان ئاغا، وا خەریکن دێن، هاتن و گەیشتنێ. هەستە و سوار بە و لێرە دوور بکەرەوە. یان چەکەکەت بخە سەر پێ و دەست بکەرەوە. دێن، هاتن، گەیشتنێ، چەکەکەت بخە سەر پێ.

کابرا دەمانچەکەی خستە سەر پێ و خۆی لە پەنای دارەکە مات دا. دارەکە زۆری ئارەقە کرد. تەپوتۆز هەستا. خەرتومی هات و تێپەڕی. شازدە فیشەك وێکڕا لە قەدی دارەکە دران. لە شازدە شوێنی دارەکەوە جۆگەلەی زەرد شۆلاوگەی بەست. سوارەکان بەرودیوی دارەکەدا

بایان دایەوە و کابرا دەمودەست خۆی خستە دیوەکەی دیکەی. ڕێك لەو کاتە دا دیسان شازدە فیشەکی دیکە وە قەدی دارەکە کەوتنەوە. قەدی دارەکە دابێژرا. جۆگەلەی زەردباو لە شازدە خاڵی دیکەشەوە شۆڵاوگەیان بەستەوە. کابرا قۆنداغی تفەنگەکەی توند بە سینگییەوە نا. سێ سوارەکە لە چاو ترووکانێکا بە سەر ملی ئەسپەکانیاندا شۆڕ بوونەوە. ئەسپەکان ڕەوینەوە و بەرەو ڕۆژهەڵات تێیان تەقاند. لاقی سوارەکان لە ڕکێفی ئەسپەکانیاندا گیر بوون و سەریان بە سەر عەرزەکەدا دەکشا.

کابراکە ـ کە پاڵی بە دارەکەوە دابوو ـ چاوە گەورە و زەقەکانی بە سەرسووڕمانەوە بڕیبیە ئەوانەی وا بە خێرایی لەوێ دوور دەکەوتنەوە و بە سەر عەرزەکەدا دەکێشران. سوارەکان بە شوێن یەکدا بە ئاوەڕۆیەکەدا چوونە خوارێ و لە چاوان ون بوون.

پشتی برینەدارەکە دەیبریسکاند. ئەسپەکەشی تۆزێك لە خوارترەوە لە سەر گژ و گیا کەسك و چڕەکان دەلەوڕی. بە پڕمە پڕم هەواکەی هەڵدەمژی و بۆنی پێوە دەکرد و گوێی لە مووچەوە دەبردن و یاڵی دەلەراندەوە و کلکی رادەوەشاند و کلکی دەخستە سەر شانەکانی و بە نازەوە هەتا سەر گوێزنگانی دەکێشا و بڵاوی دەکردەوە.

کابرا، کە ژان تەنگی پێ هەڵچنیبوو، بە هەر سەگ مەرگییەك بوو، هەوساری ئەسپەکەی لە رەگی دارەکە لێ کردەوە و سواری بوو و بەرەو ئاوەڕۆیەکە لێی خوڕی. ئەسپەکە چاوەکانی بچووك کردنەوە و گوێچەکەکانی شۆڕ کردنەوە و لە ئاوەڕۆیەکە بازی دا. گەیشتە لێڕەوارێك. بە هەزاران باڵندەی هەنجیرخۆر، بە دندووکە تیژ و درێژ و باریکەکانیانەوە، شین و زەرد، لە شەقەی باڵیان دا و فڕین. کۆمەڵە پەڵەیەکی رەش لە ئاسماندا لە چاویان دا و کوژانەوە. باڵندە زەردباوەکان، هەر کام هێندەی سەرە پەنجەیەك، بە ئاسماندا بڵاو بوونەوە و بەسەر دارستانەکەدا بارین. هێشتا نەنیشتبوونەوە، دیسان فڕینەوە. کەروێشکێك گوێچکەی قوت کردن. ڕێوییەك کلکە کوڵکنەکەی لە نەڕەی پشتی نا. مارێك فیشکاندی. بوو بە هەڵڵا و هەنگەمەیەك هەر مەپرسە. لێڕەوارەکە گەمارۆ درا. فیشەك وەك تەرزە و گلێرە گەڵای داریان لە عەرزی کرد. هاتن و چوونە دەرەوەی کابرای برینەدار لە لێڕەکەدا بوو بە یەك.

دەمی زەردەپەڕێ بارانە زەردەکە توندتری کرد. ڕەوەزەکان و دار و شەتڵە شکاوەکان، ئاسمان و رووبارە بە لرفەکە، زۆنگاوەکان، قامیشەڵان و مێرگ و بژوێن و دڕکەجاڕ هەموو زەرد هەڵگەڕان.

له دەرەوە دەنگی حیلەی ئەسپێك هات. دەروێش بەگ بەرەو پەنجەرەكە رای كرد. دەستی بە شوێن دەمانچەكەیدا گەڕا. لە دەرەوە، بایەك، بایەكی زەرد كە دارەكانی لە رەگەوە دەردێنا، هەڵیكردبوو. كلك و یاڵی ئەسپەكە بە دەم باوە دەشنایەوە. شەوە زەردەكە لەگەڵ بایەكە باڵی گرتبوو.

دەروێش بەگ نەڕاندی:"خێرا، خێراكەن، دەی بجووڵێنەوە."

نۆكەرەكان هاتن و چوون و نەیانوێرا لەو سوارە بچنە پێشێ كە لە نێوەڕاتی حەوشەكە كەپەنەكی لە بەر دا بوو.

تاو هەڵات و باڵی كێشا. بارانە زەردەكە نەرم نەرم دەباری. گژە بایەكە جار و بارە دڵۆپەكانی بارانەكەی رادەماڵی و دەیبرد و تێكی دەچڕژاند و هەمووی بە یەكەوە بە شوێنێكدا دەپژاند.

كەپەنەكەكەی تەڕ و خووساو و شەڵاڵی خوێن بوو، ئەسپە كوێتەكەی گوێی قوت كردبوون... ئاخرییەكەی لە سوارەكە چوونە پێشێ. ئەسپەكە لە جێی خۆی نەبزووت. دەستەكانی بە پەلەپیتكەی تفەنگەكەیەوە رەق ببوون. دەستیان كە گەیشتە ئەسپەكە، كابرا گرمۆڵە بووەكە لە سەر زینەكەوە بەلادا هات و لە بەر سمی ئەسپەكەی كەوتە سەر قوڕ و چڵپاوەكە و چاوەكانی هەڵێنا. چاوەكانی بادامی و درشت و رەش بوون. ردێنێكی رەش و پڕ و لوول و نەرمی هەبوو. دەموچاوی هەڵبزڕكاو و نوورانی و لێوەكانی گۆشتن و سوور بوون. هەڵیانگرت و بردیانە ژوورەوە. كابرا لە نێو كەپەنەكە دەورچنراوەكەیدا جوانچاك دیار بوو. سی ساڵێك دەبوو. هێنایانە دەم ئاگردانەكە. جارێكی دیكە چاوی هەڵێنا. ئاوەردووی پتریان لە كوانووەكە كرد و ئاگرەكەیان خۆشتر كرد. كابراكە بە نزگەرەی قووڵەوە خەوی لێ كەوت. فیشەكەكە شانی سمیبوو.

لە ساری چام و دەوروبەری میسیس"شەوە گەردەلوولەكانی كۆڵەكەیان كردەوە. كۆڵەكەی گەردەلوول هەتا لووتكەی چیای نوور حەق سەر كەوتن. بایەكەی رۆژئاوا هەوساری پچڕاند و شان بە شانی ئەو گەردەلوولەكان هەموو پێدەشتەكەیان داگرت و گەردەلوول و گێژەڵووكە وەك لێڕێكی چڕ، لە هەموو رەنگێك ، سوور و ئەرخەوانی و زەرد و شین و سپی و كەسكی روون و هەر هەمووشیان رەنگ بزڕكاو و بە هەزاران پڕشنگەوە، پێدەشتەكەیان داگرت.

دارستانەکە بە سوورە سوورِ و نەرە نەرِ، و بە خێراییەکی سەرسوورهێنەر لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دیکە دەرِۆیشت. پێدەشتەکە رێك و بێ بەرزی و نزمایی و بەبێ قەڵشت و شیو و دۆڵ دەتگوت ماڵوو کراوە.

بەشێك لە دارستانەکە، دەوری میسیسی گرتبوو و بەشەکەی دیکەشی وەك دوورگەیەکی رەش دابرِابوو و بەرەو ئاناوەرزا دەهات.

گەردەلوولەکان لە نێوان حاجیلا و دۆملۆدا رەنگێکی نارنجیی درەوشاوەیان لێ نیشت.

بای رۆژئاوایی، بای چی، تۆفانێك کە زەوی و ئاسمانی دەشێواند، مێشەلانەکانی گەردەلوولی بەرەو چیاکانی تۆرووس دەبرد کە وەك پشتوێنە تۆرِێکی ئەرخەوانی و روون دیار و نەدیار دەوری دەشتەکەی گرتبوو. هەر کام لە بێشەلانەکان بەرەو لایە رۆیشتن...

"سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون، لێیان دا و رۆیشتن."

وەك دارستان بەرەو پێش خوشین و لە بنیاری تۆرووس خرِ دەبوونەوە، دەتگوت چیی شار و گوند و دار و باڵندە و عامودی تەلەگراف و دەشت و هەرچی گیانلەبەر و بێ گیانە، بەرەو تۆرووس دەرِۆن.

"ئەو بنیادەمە باشانە، بە سواری ئەو ئەسپە جوانانە..."

چیاکانی تۆرووس تاوێك لە پشت گەردەلوولەکانەوە لە چاوان ون بوون. دەوروبەریش لە ناکاو بە تاریکیدا رۆچوو بەڵام تاریکییەکە تۆزێك بوو و رەوییەوە. ئەوجار رووناکایی تاریکاییەکە رەواندەوە و لەو نێوەدا تەنیا دەشتێکی بێ گرێ و وگۆڵ، رێك و خاوێن، چۆڵ و گەش و تۆزێك تەماوی و پرِ لە بۆن و بەرامەی پووشی سووتاو بەجێ ما.

لە سەرووی دەشتەکەوە سێبەری هەورەکان، گەواڵ گەواڵ و بە خشکە تێدەپەرِین.

لەو نێوەدا، لە نێوەرِاستی دەشتەکەوە، لەو لاترەوە، لە دوور دوورەوە، ئەسپێکی هەوسار بەردراو، سەری بەردابۆوە و دەتگوت بۆن بە زەوییەکەوە دەکات، سوارێکی بێ تین و هێز و گرمۆڵە و شۆرِ بە سەر ملیدا، نەرم نەرم و وەك پەڵەیەکی رەش بەرەو چیای حەمیتە رێگەی دەبرِی.

سوار بوون و ملی رێگەیان گرت و رۆیشتن. ئەو بنیادەمە باشانە، بە سواری ئەو ئەسپە جوانانەی دنیا... ئەو جوامێرانە... ئەو هەڵۆیانە، هەر کامە و پڵنگێك، سواری ئەو ئەسپە خۆش رەوتانە بوون و ملی رێگەیان گرت و رۆیشتن و هەرگیز ناشیەنەوە. بووینە دیلی دەستی نامەردان. ژیانی ئەم دنیایە تاڵ و بێ تام بووە. هەزار مەرد دەکاتە دیلی دەستی نامەردێك...

تەنیا و بێکەس و بێدەر. لێقەوماویش. تەنیایی و داماوی وەك برینی خەنجەرێکی ژەهراوی لە سەر دڵ... لێقەوماوی و بێ کەسی...

ئاگرم لە جەرگی بەربووە. ئاگرێکی بە تینتر لەوی جاران. ئەو دڵە شێتەم چەنێ جوان دەسووتا. خەرمانی ئاگر لە ناخمدا. ئای خۆزگە ئێستاش هەر وا بوایە، گەرم و شیرین و سەرخۆشکەر. بریا دڵەکەم گڕی دەگرت و دەسووتا. خۆ ئەگەر دڵەکەی خۆی لەبەر ترس، ترس لە مەرگ و لە مەرگیش خراپتر رانەگرتبایە و تەقیبا، رێك لە نێوەڕاستەوە شەق دەبوو، وەك سەنگی سەبوور...

لەو دنیایەدا هەر بوونەوەرێك پەناگەیەکی هەیە، پاڵپشتێکی هەیە و لکێکی هەیە خۆی پێ بگرێتەوە. بەڵام مرۆڤ نییەتی. لەم دنیایە ئەوی تەنیایە و بێ کەس و کار و لێقەوماو و داوە، بەتاقی تەنێ، بەڵێ هەر بنیادەمە. هەر کەسە و هەر شتێك ژیان و نەمریی هەیە و مرۆڤ نییەتی. دارەکان، باڵندەکان، گژ و گیا و مار و مێروو، هیچ کامیان، هیچیان لە نێو ناچن. بەڵام مرۆڤ وای لە چارەی نووسراوە کە بمرێ و نەمێنێ، چون کە بنیادەم لە خۆیەوە دەست پێ دەکات و لە خۆیشیدا کۆتایی دێ.

ئەو تەنیاییە، ئەو بێ کەس و بێدەرەتانییە هەر تایبەتە بە خودا.

بنیادەم بەزەیی بەخۆیدا دێتەوە و پەناش دەباتە بەر بەزەیی و دڵسۆزی. ریایی و سووکی و سەرکزی و لاوازییەك لەو دڵسۆزییەدا هەیە.

چاوەکانی دەروێش بەگ لە بن برۆ کۆڵکنەکانییەوە دەتگوت ئاگرن. ئێسکی ڕوومەتی دەرپەڕیبوون و بلێیی و نەلێیی چاوەکانیشی گەورە ببوونەوە. چاڵی چەناگەی قووڵ و بە سێبەر و شەویلکەی بەهێز و پتەو بوون. بە دەموچاوە رەش و تاوبردووەکەی و چرچ و لۆچە قووڵەکانی دەموچاوی و نێوچاوانە پانەکەی، پیاوێکی باوەڕبەخۆ دیار بوو. ددانە سپی و بریقەدار و رێکەکانیشی لە کاتی قسەکردن و پێکەنیندا دەردەکەوتن.

سمێڵە باریك و تەنکەکەی بڕێك شۆڕ ببۆوە. سمێڵی تەنك و شۆڕ لەگەڵ ئەو برۆ کولکن و شەویلکە پتەوانە یەکی نەدەگرتەوەو هەر ئەو یەك نەگرتنەوەیەش حاڵەتی روخساری بڕێك نامۆ دەکرد.

قەمچییەکی بە دەستی چەپییەوە و دەستی راستیشی لە سەر دەستکی دەمانچەکەی قەدی بوو و بە چەکمە بریقەدارە و تۆزاوییەکانییەوە بە دیوەخانەکەدا دەهات و دەچوو.

دەموچاوە ئارەق کردووەکەی رەش دەچۆوە و لە تووڕەییان دەتگوت ئێستا دەتەقێ. پانتۆڵێکی شینی کە لێواری گیرفانەکانی داگیرابۆوە، لە بەر دەکرد. قەد قەد و چینە

گەورەکانی پانتۆڵەکەی کە دەکەوتنە سەر چەکمەکانی، تۆزەی لای سەرەوەی دەسڕییەوە و بەو جۆرە بەشی سەرەوەی ملیوانی چەکمەکانیان ئەوەندە بریقەدار دەکردەوە دەتگوت ئەوە تازە بۆیاغت کردوون. لەو دەوروبەرانە ئیتر بەرگدروویەکی وا نەمابوو بتوانێ پانتۆڵی لەو چەشنە بدوورێ کە لێوارەکانی بچنێ. بەڵام دەروێش هەر چۆنێك بێ یەك دوو دانە لەو پانتۆڵانەی هەر پەیدا دەکرد، لە حەڵەب لە شام و هەر نەبوایە لە میسر بۆیان دێنا. پەستەکێکی لە سەر ئەو پانتۆڵەوە لەبەر دەکرد کە سەر سینگەکەی لە هەوریشم بوو. چاکەتەکانیشی بەردەوام لە سەر شێوازی تازەترین مۆدێل بە دوورین دەدا. ئەو چاکەتانەش بەناوبانگترین بەرگدرووی ئیستانبۆل لە گرانبابیترین قوماشەکان بۆی دەدووری.

ئەو جلوبەرگە ناباوانە قەڵافەتێکی تایبەتیان پێ دەبەخشی.

تەمەنی پەنجاساڵێك دەبوو و سەر و قژی سپی ببوو و لەگەڵ ئەوەشدا پتە و بە زیپك و زاکوون و چالاك دیار بوو و وەك گەنجێکی بیست ساڵانە ئەسپی لێ دەخوڕی و لە سەر پشتی ئەسپی عارەبی، کە سینگی دەردەپەڕاند و چاوەکانی لە پێش خۆیەوە دەبڕی و قەمچییەکی بە دەستی چەپییەوە دەگرت، هەر زینەت بوو سەیری بکەی. شکۆیەکی تایبەتی هەبوو. دەمانچەیەکی ناغانی دەسك "عاج"ی رووت و بێ کالان لە بەر پشتوێنی دەنا و هاتبووە سەر رانی راستەی. ئەو جۆرە پشتوێنە رەنگاورەنگەش یەکێك لە برادەرەکانی سەردەمی لاوەتیی خۆی، لە بەغداوە بۆی دەنارد. قوماشەکەی هیندی بوو.

دەچووە هەر شوێنێك، جا شارۆچکەیەك بوایە یان ئەدەنە، ئیستانبۆل بوایە یان ئانکارا... چووبایەتە لای خەلیفە یان وەزیر، دەمانچەکەی هەر پێ بوو و دەستی راستەی لە دەسکەکەی بەر نەدەدا. تەنانەت جارێکیش هەر بەو جۆرە چوو بووە خزمەتی سەرۆك. شەوانەش دەستی لە سەر دەسکی دەمانچەکەی دادەنا جا دەنوست. هەر لە منداڵییەوە وا راهاتبوو. بەژنە بەرز و قیت و نازدارەکەی لەگەڵ دەموچاوی یەکی دەگرتەوە و لێی دەکاڵایەوە و روخسارەکەی گرژتر دەنواند.

سیحرێکی نەجیم و پیاوانەی لە روخساریدا هەبوو. لێوە ئەستوور و گۆشتنەکەشی لەو دەموچاوە ئەسمەرەیدا لە لێوی گەش و تورت و سووورباوی منداڵێك دەچوو و ددانەکانیشی هەر لە ددانی منداڵ دەچوون... منداڵی لە روخسارەکەیدا لەگەڵ نامۆییدا ململانێی بوو. ناسکێتییەکی نامۆ، سیحراوی، کونجکۆڵ و ئازاد و سنووربەزێنی هەبوو. ژنێك، بنیادەمێك لە هەر کوێیەك ئەو روخسارە ببینێ، حەیران و سەرسامی دەبێ و ناتوانێ رووی لێ وەربگێڕێ و

چاوی لەسەر هەڵگرێ. لە سەیری ئەو روخسارە خەیاڵاوییە تێر نەدەبوو. دەروێش بەگ خۆیشی حەزی لە خۆی بوو و چاوی لە خۆی تێر نەدەبوو. ئەوەندە چاوی دەبڕییە ئاوێنەکە، هەتا روخساری دەگۆڕا و جۆراو جۆر دەبوو، پێدەکەنی، دەگریا، نێوچاوانی تێك دەنا و گرژ دەبوو، روخساری گەش دەبۆوە و خەمبار دەبوو و وەك بەردێك لە جێی خۆی رەق دەبوو، رەنگی بە رووویەوە نەدەما و نێوچاوانی ئارەقەی دەکرد و لە بن لێوانەوە دەیورتاند:"مەرگ". و ئیتر ئاوێنەکەی فڕێ دەدایە لایەك.

دیوەخانە گەورەکەی کۆشکەکەی هەمووی بەڕەی لێ راخرابوو.

دیوەخانەکە دەتگوت باخێکی پڕ لە گوڵی جوان و گەش و جۆراوجۆرە کە لە دنیایەکی بەخشندە و نەناسراو و سەرسووڕهێنەر و دەستپێڕانەگەیشتوو هەڵکێشراون و هێناویانن. بۆیە لە شتێك دەچوو لە نێوان خەون و راستی و رۆژ و شەودا.

دیوەخانەکە لە باغێکی پڕ لە گوڵ و خۆش دیمەن و گەش و جۆراوجۆر دەچوو کە لە دنیایەکی بەخشندە و نەناسراو و سەرسووڕهێنەر و دەست پێڕانەگەیشتووەوە هەڵیانکێشابێن و هێنابێیانن، و دەتگوت شتێکە لە نێوان خەون و راستی و رۆژ و شەودا. بە هەزاران هەزار نەخش و نیگار کە بە سەر سەوزاییەکی نامۆ و نەدیارەوە کرابێن... رەنگی روون و وەك مسی تواوە و درەوشاوەی بەرەبەیانی تەماویی بەهار، دەدرەوشانەوە و دەکوژانەوە و دەکوژانەوە و دەدرەوشانەوە.

درەوشانەوەیەکی وەك مس، تورت و ناسك لە دیوەخانە گەورەکەدا. مسی تواوە و دووکەڵاوی لە سەر ئاگرێکی هەزارساڵە. ئەو درەوشانەوە و نەخش و نیگار و دنیای بەهارەی لە دیوەخانە گەورەکەدا رەنگی دەدایەوە و شین دەبۆوە، لە زۆر دوورەوە و لەو بەری هەزاران ساڵەوە و لەوانەشە هەر لە ئەزەلەوە دەهات.

بەیانییەك هەڵدەستێ و سەیر دەکا ئەوە دنیا بە هەموو شکۆیەکەیەوە لە بەر چاویەتی: گژ و گیایەکەی و مێرگ و چیمەنەکەی و بەهار و هاوین و پاییز و زستان و بەفر و سەرما و با و بۆران و گوڵ و دار و بار و لێڕەوار و رەوەزە و چیا و دەریا و گوڵە هەنارەکانی و گوڵە رەنگ مسییەکانی و باران و هەور و ئاوی رووبار و چەم و گوڵە شینەکانی و سوورە ماسی و رووناکاییەکەی و بۆنی خۆش و ئەستێرە و رۆژە رووناکەکانی کە چاویان لەبەر هەڵنایە و شەوە پڕ لە ئەسێرە و تاریکەکانی... تاریکاییە قورس و ئەنگوستەچاوەکان... زەردەواڵەکانی بە نێوقەدی باریکیانەوە، هێڵی سوور و رەش و باڵە ناسك و پڕ لە لەرینەوە و وزە وزەکەیان و

چاوە گەورە و ڕەنگاوڕەنگ و درەوشاوەکانیان... مێرووله و باڵندە و ماسی و کیسەڵ و گورگ و هەڵۆ و مامزە چاوڕەشەکانی و ئەسپە بەرز و یاڵ و کلك پەرش و بڵاوەکانی و بنیادەمە بەختەوەر و دڵخۆش و گەشەکانی، هەر هەمووی تێك دەچرژێن و لە جووڵەدان وەك ژیان.

دیوەخانەکەی کۆشکی دەروێش بەگ، بە هەموو جوانی و تازەیی و کۆنی و شیرینییەکەیەوە.

بەرەیەك کە نوێ دەبێتەوە و شکڵ و بیچم دەگرێتەوە و ڕەنگی تێ دەزێتەوە و لەگەڵ هەتاوی هەموو بەیانیان، دەدرەوشێتەوە بە هەزرا ڕەنگ، کەسك و شین و مسی و ڕەش و گوڵە هەنارەکانی نارنجی و تورنجی و زیندوو و بە لار و لەنجە و سەما، سات بە سات لە گۆڕاندا و بە هەزار و یەك ڕەنگ و شکڵ لە داهاتوودا و لە هەزار و یەك تیشکی دەروشاوە و پڕشنگدارەوە...

ئەو دنیایەی هەموو ڕۆژێ لەگەڵ کازیوەی بەیانیدا دروست دەبوو، لەوانەبوو هەزار ساڵ و بگرە پتریش بوو. هونەری دەست ئارەقەی نێوچاوان و سۆمای چاوانی بنیادەم بوو. بە هەوێنی گیانی بنیادەم ڕەنگ و شکڵی وەرگرتبوو.

دەروێش بەگ هیچی نەدەدی. تەنانەت بە نەرمی و گەرمیی پەشمەکەی بن پێیانیشی نەدەزانی. ڕەوەزە ئەرخەوانییەکەی ئاناوەرزاشی نەدەدی کە بە بەر چاوانییەوە دەسووتا و چیاکانی تۆرووسیش کە لە ڕۆژهەڵات و باکورەوە سەریان لە ئاسمانێ دەسوی و دەشتە ڕێکەکەش کە وەك دەریایەك لە بەردەمیا ڕاکشابوو و نەرم نەرم وردە شەپۆلی دەدا....

ئەو هیچ شتێکی نەدەدی.

لە نیوەڕۆیە لای دابوو و ئەو هێشتا لە بیری نەبوو نانی نیوەڕۆی بخوا.

دەروێش بەگ لە کەڕەی بەیانییەوە بێ پشوو لە دیوەخانەکەدا هەر هاتبوو و چووبوو. ئەو چەند ڕۆژێك بوو تووشی ئەو دەردە ببوو.

باران دەباری، بارانێکی زەرد و لیچق. بارانە زەردەکە کۆلکەزێڕینەی گەورە گەورەی هەڵخستبوو کە ئەو سەر ئەو سەری دەشتەکەیان لە سەرووی ئاناوەرزاوە هەتا چیای گاوران داگرتبوو. کۆلکە زێڕینەکان، زەردییەکەیان لە زەردیی هەتاو و تورنج دەچوو. کاڵ دەبوونەوە و دەڕەوینەوە و دیسان خەست خەست بە سەر تارمایی دەشتەکەدا دەکشانەوە.

لە بناری ڕەوەزە ئەرخەوانی و تەمگرتووەکانەوە سوارێك دەرکەوت کە سەری بەردابۆوە و بەسپایی پێی نایە زەوییە ڕێك و بێ گرێیەکە و بێ تین و هێز، بەرەو ئەو دار چنارە ڕۆیشت کە

لە نێوەڕاستی پێدەشتەکەدا سەری بەرز و قیت ڕاگرتبوو. کە گەیشتە ئەوێ، لە سێبەری دارەکەدا ڕاوەستا. ئەوجار کۆمەڵە سوارێك بە لینگ دان لە داوێنی چیاکەوە داگەڕان و بەرەو دارچنارەکە غاریان دا. لە پشتیانەوە تەپوتۆز وەك دیوارێکی سپی، بە درێژایی ڕێگەکەیان هەستابوو. سۆزەی بایەکی نەدەهات و هەتاوە بەتینەکە سینگی دەشتەکەی هەڵدەچۆقاند. سوارەکان هاتن و لە بن دار چنارەکە ڕاوەستان. سوارە تەنیاکە بە لینگدان پانتایی دەشتەکەی بڕی و وەك ئەستێرەیەکی ڕاخوشیو بەرەو لای "جی جیقی سەروو" غاری دا و لە دۆڵەکەی یالینز تۆت، لە چاوان ون بوو. لەو جەنگەیەدا، سوارەکان کە لە بن سێبەری دار چنارەکە بوون، بە هەشتاو بە دەشتەکەدا بڵاو بوونەوە. زین و کۆپانی ئەسپەکانیان لە بەر تاوەکە دەدرەوشانەوە. ڕێك لەو کاتەدا، تاکە سوارەکە، لە لای خوارووەوە، لە شوێنێکی نزیکی رووباری جەیهانەوە، لە شیوەکە هاتە دەرێ. سوارەکان بڵاو دەبوونەوە و کۆ دەبوونەوە. بە دەم رووبارەکەدا سەرەوخوار سەریان لە دووی تاکە سوارەکە نا کە بەرەو جەیهان دەڕۆیشت و لە دوای خۆیانەوە تەپوتۆزێکی چڕیان بەجێ دەهێشت. ئەسپیان لێنگ دا و غاریان دا و هێندەی پێنج سەت هەنگاوێکی لێ نزیك بوونەوە. بە حەوت تفەنگ داڵ بە داڵ تەقەی لێ کرا. ئەسپەکەی پێشەوە، سێ جاران سەرەنگرێ بوو و دیسانیش نەکەوت. ئەوجار گەڕایەوە و سەیرێکی ئەو سوارانەی کرد وا بەرەولای دەهاتن. دەنگی سمی ئەسپەکانیان لە هەتاوە تاقەتبڕ و بەتینەکەدا ون دەبوو. ئەسپەکە خۆی لە بەر یەك کێشایەوە و خۆی وێك هێنایەوە هەتا لە سەر هەڵدێرەکەوە خۆی فڕێ دایە نێو ئاوەکەوە. سوارەکانی دیکەش یەك بە یەك خۆیان بە ئاوەکەدا دا کە لە لەبەر هەتاوەکە دەبریسکایەوە و وەك بڵێسە لرفە و گرفەی دەهات.

تاکە سوارەکە لە پێشیانەوە و سوارەکانی دیکەش بە دوایدا، خۆیان بە پشتی ئەسپەکانیانەوە نووساندبوو و سەریشیان بەرز کردبۆوە و کونە تفنیان لێك ڕەویبوونەوە و پرخەیان دەهات. بە دەم ئاوی رووبارەکەدا بەرەو ئاناوەرزا ڕۆیشتن. هەر جار نە جارێك تەقەیەك دەکرا. ئەوی پێشەوە جوان مەلەی دەکرد و ڕێگەی خۆی دەبڕی. لە گەرووی ئاناوەرزاوە لە ئاوەکە هاتە دەرێ. ئەسپەکەی خۆی ڕاوەشاند و ئاوەکەی لە خۆی تەکاند و ئەوجار لە هەستایە سەر پاشوان و حیلاندی و وەك با، بەرەو لای ڕۆژهەڵاتێ تێی تەقاند.

خۆر ئاوا بوو و تاریکان بەسەر داهات و بوو بە شەو. هەورە ڕەشەکان لە باکوورەوە هاتن و لە سەر دەشتەکە خێوەتیان هەڵدا. هەورەتریشقەی زەرد و تار و نارنجی، چەند جارێك سینگی ئاسمانیان هەڵدڕی. هەورە نارنجییەکان ڕەش داگەڕان. چیی سەگی دەشت بوو، یەك دەنگ

وەڕین. ئەوجار کەڵەبابەکان لە چیای حەمیتەوە تا ئاناوەرزا خوێندیان. بایەکی توند هەڵیکرد و خۆڵ و پووش و پەڵاش و قەسەڵ و کا و کۆت و پووش و پەڵاش و گیا و گژی پێك وەرکرد. دەنکەدەنکی بارانەکە درشت و شلەتێن، خرم و هۆڕ کەوتنە سەر عەرزی و پەرش و بڵاو بوون. بارانەکە جار بە جار توندتری کرد و زەرد هەڵگەڕا.

سوارەکان گەیشتنێ و راوەدوونانێکی پڕ لە بەڵا و چەرمەسەری دەستی پێ کرد. تفەنگەکان کەوتنەوە کار. لە بەر بارانەکە، سەرەنێزە و کەمەندەکان هاوێژران و سوارەکەی پێشەوەش، لە هەموو ئەوانە قوتار بوو. بە کەسکاییە تۆخەکەی ئاقچاسازدا رۆچوو و لە چاوان ون بوو. سوارەکانیش بە شوێنیدا لە زۆنگاوەکەیان دا. سوارەکە لە قامیشەڵانەکە هاتە دەرێ. خۆی و ئەسپەکەی هەر دووکیان سەر تا پێیان قوڕاوی ببوو. قوڕ و لیتەیەکی کەسك، قەوزاویی و بۆگەن. سوارەکانیش تاوێکی دواتر لە زۆنگاوەکە هاتنە دەرێ. ئەوانیش سەرتا پێیان قوڕاوی بوو و هەر ددانەکانیان سپی دەچۆوە.

بارانەکە خۆشی کردەوە و تاو هەڵات. پشت ئەستۆی سوارەکان هاڵاوی لێ هەڵدەستا. ئەوجار قوڕەکەی پشتیان وشك بۆوە و شەقار شەقار بوو و شوێن شوێن هەڵوەری. ئەسپەکەی پێشەوە بە نەرمە غار دەڕۆیشت و دەتگوت بەر زگی بە عەرزەکەدا دەکێشێ. گژ و گیایەکەی سەر ئاقچاساز دەسووتا. ئەوانەی کەوتبوونە شوێن تاکە سوارەکە، تەنگیان پێ هەڵچنیبوو. سووتمانەکە هەر دەهات و پەرەی دەگرت و بڵێسەکانی سەریان لە ئاسمانێ دەسوی. سوارەکەی پێشەوە بە دەوری ئاگرەکەدا سووڕایەوە. بازنەی خەرمانە ئاگرەکە چەندی گەورەتر دەبۆوە، ئەویش بازنەی خولانەوەکەی گەورەتر دەکردەوە. سوارەکانیش بە شوێنیدا بە دەوری ئاگرەکەدا دەخولانەوە. کە لێی نزیك دەبوونەوە، هەر هەمووان وێکڕا تەقەیان لێ دەکرد. ئەسپی سوارەی پێشەوە، سەرەنگرێ دەبوو و نسکۆی دەبرد و دواتر خێراتر بە دەوری ئاگرەکەدا دەسووڕایەوە. ئەسپەکە جار و بار خۆی بە ئاگرەکەدا دەکرد و لە بڵێسەکانەوە دەهاتەوە دەرێ. هەتا ئێوارە هەر وابوو. کە خۆر ئاوا بوو، سوارەکان شان بە شانی یەکتری لینگیان دا و وێکڕا تەقەیان کرد. ئەسپەکە دیسان نسکۆیەکی برد و رێك لەو ساتەدا، شەپۆلێکی بڵێسە، بە سەر ئەسپ و سوارەکەیدا بارین. شەپۆلی ئاگر تاوێك دواتر سوارەکانیشی داگرت.

بارانەکە دایکردەوە. دووکەڵێکی خەست کە کۆڵەکەی دەکرد و وەك گلۆڵە بەنێك لە ئاسماندا دەکرایەوە، مێرگ و بژوێنەکەی داپۆشی. سوارەکان لە دووکەڵەکە هاتنە دەرێ و لە کێڵگەی برینجەکەیان دا. کە لە کێڵگەی برینجەکە هاتنە دەرێ، هەر هێندەی سەری

ئەسپێکیان مابوو بگەنە تاکە سوارەکە. کەس نازانێ چۆن بوو ئیتر تەقەیان لێ نەدەکرد. بارانەکە جار بە جار توندتری دەکرد. شەو بوو کە گەیشتنە بەر کۆشکەکە و بە دەوریدا خولانەوە. بارانەکە رەنگێکی پرتەقاڵی لە شەوەکە دەدا. لە شەوێکدا کە چاو چاوی نەدەدی، خرمە و زرمەی کپی سمی ئەسپ لە سەر خۆڵ و قوڕەکە هەستا و هەتا بەیانی کۆشکەکەی پڕ کرد. هەر زرمەی پێی ئەسپان بڕایەوە، بێدەنگییەکی قورس باڵی بە سەر دەوروبەردا کێشا. بەیان ئەنگوت. پەردەی بارانە زەردەکە، رووناك و درەوشاوە و بریقەدار بە هەزار و یەك رەنگەوە لە بەر تیرێژی نیگای خۆرەکەدا کەوتە جووڵە و لەرینەوە. پەردەیەکی دووکەڵ و هەڵم سەر چیای گاورانی داگرت و بە هەزران رەنگەوە بریسکایەوە.

لە حەوشەکەدا، سوارێك بە سەر ئەسپێکی کوێتەوە، بە زینێکی جوان و درێژی تورکمانییەوە چەقیبوو. بە دەموچاوە درێژ و زەردهەڵگەڕاوەکەی و مژۆڵە درێژ و کەوانییەکانییەوە و بە ردێنە مەیلە و رەشەکەیەوە دەتگوت پیاوچاکێکە، یان دەروێشێکی جەزمەگرتوو... پیاوەکان گەیشتنێ و ویستیان ئەو پیاوەی خۆی لە کەپەنەکێکی دەورچنراو پێچابوو لە ئەسپەکەی دابەزێنن، بەڵام تا بەخۆیاندا هاتن، کابرای نیوەزیندوو، بەلادا هات و لەو سەرەوە کەوتە بەر پێی ئەسپەکەی. کەپەنەکەکەی و جلوبەرگ و ردێنە رەشەکەی شەلاڵی خوێن بوون. چەکمەکانیشی پڕ بوون لە خوێن. کابرا پشووی دەهات. هەڵیانگرت و بردیانە نێو کۆشکەکەوە. هەر بردیانە ژوورەوە، لە دەرەوە هەڵڵایەك هەستا. سوارەکان بە قریوە قریو بە دەوری کۆشکەکەدا خولانەوە. هەر سووڕانەوە و خولانەوە و ئەوجار هاتن و لە نێو حەوشەکەدا کپ و بێدەنگ و بێ جووڵە بە ریز راوەستان. چەند سوارێك خۆیان لە کەپەنەکی رەشی دەورچنراو پێچابوو و ئەسپە کوێتەکانیان زینی تۆرکمانییان لە سەر پشت بوو. لە کونە تفنکی ئەسپەکانیانەوە بە فشە فش هالاو دەهاتە دەرێ.

ئەوەی لە پێش پێشەوە راوەستابوو و ردێنێکی سپیی هەبوو، رێك لە نیوەڕۆیەدا لە ئەسپەکەی دابەزی و کەپەنەکەکەی خستە سەر ماڵی زینەکەی و بەرەو دەرگای کۆشکەکە چوو و سێ جاران لە دەرگاکەی دا. دەرگاکە کرایەوە. دەروێش بەگ لێی هاتە دەرێ و سینگی بە سینگییەوە نا. کابرا دەستی لە سەر سینگی دانا و سەرێکی بە نیشانەی کڕنۆش بۆ دانەواند. مژۆڵە پڕەکانی کابرای ریش چەرموو، وەك مژۆڵی ئەسپێك، هەڵگەڕابوونەوە.

"هەستاین و لە ئۆرفەوە، لە دەشتی حەرانەوە کەوتینە رێ، لێی سواری ئەسپی خۆشبەز بووین و تفەنگ و شمشێرە تیژەکانمان.... رۆژە خۆشەکانمان، رۆژە ناخۆشەکانمان.

هەر کامە و سێ ئەسپمان لە بندا سەقەت بوو. حەوت کێومان تەقاند و داگەڕاین بۆ دەشتی ئامیك و جۆگەکەی و بۆ بیابانەکەی سوریا... داگەڕاین بۆ حەما... بە دەوری چیای مووسادا بامان دایەوە و گەیشتینە ئێرە. ئەو کابرایە رادەستی ئێمە بکە. ئێمە ئەومان دەوێ. ئەگەر نەیدەیتە دەستی ئێمە، خاکت بە توورەکە دەکێشین و وەجاغت کوێر دەکەینەوە. ئیتر لە تۆرەمەت کوڕێك نامێنێ وەچەی لێ بکەوێتەوە. هەرچی هەیە خوێن دەیبا. ئەسپێکی رەسەنت لە ماڵیدا نامێنێ، ئەو کابرایەمان بدە دەستی."

دەرگاکە، رەش و وەك قورقوشم قورس، بەسەریدا داخرایەوە.

دووەم پیاو دابەزی. هات و چوار جار لە دەرگای دا. دەرگاکە کرایەوە. ئەویش هەر ئەو قسانەی کردنەوە. سێهەمیان هات و پێنج جارانی لە دەرگا دا. یەك بە یەکیان دابەزین و هاتن و لە دەرگایان دا. ئاخرییەکەیان یازدە جاری لێ دا. دوای یازدەهەمین جار، دەرگاکەی لێ کرایەوە. کرایەوە و دەسبەجێ پێوە درایەوە. بەر لەوەی کابرا قسەیەك بکات، پێوە درایەوە. نۆ ئەسپی بێ سوار هاتن و سەر و لمۆزیان لە دەرگاکە هەڵسوی. سەریان بەر دایەوە و بە چاوە گەورەکانیانەوە خوێن گریان. ئەسپەکان هەتا تاریکان بەسەرداهات، هەر گریان و ئەوکات وێکڕا حیلاندیان. حیلەی ئەسپەکان هەتا بەیانی لە رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دایەوە.

تاو هەڵات. ئەسپە رەسەنەکان بێدەنگ بوون و بەر دەرگاکەیان بەر دا. ئەوان کە لە بەر دەرگاکە کشانەوە، کۆمەڵێك پیاو هاتنە پشت دەرگاکە کە چاوەکانیان خەوی لێ دەتکا. پەیتا پەیتا لە دەرگاکەیان دا و هەر نەکرایەوە. چێشتەنگاوێ بوو کە دەرگا کرایەوە. سێ پیاو کە چاویان رەش و گەورە و ردێنیان مەیلەو رەش و مژۆڵەکانیان هەڵگەرابۆوە و دەموچاویان درێژۆکە بوو، لە دەرگاکە وەدەر کەوتن و لە سەر خۆ و گران و سەنگین و دڵنیا و بە وردە هەنگاوان بەرەو پیاوە کەپەنەك لەبەرەکان رۆیشتن.

"لە دەشتەکەی ئۆرفەوە، لە حەرانەوە و لە چیاکانی عەبدولعەزیزەوە داگەڕاوین و هاتووینە ئێرە."

سوارەکان تا شەوێ بە دەوری کۆشکەکەدا خولانەوە. ئەسپەکان حیلاندیان و کەڵەباب خوێندیان. عەرزەکە لەرزی و هەرچی گیانلەبەری دەشت و باڵندە و دەعبای کێوی بوو، ئەوەندەیان نەڕاند و هێندە گریان تا پشوویان لێ بڕا.

جارێکی دیش باران ئەنگووت. باران جارێکی دیکەش کازیوەی بەیانی داپۆشی. پیاوەکان و ئەسپەکانیان جارێکی دیکەش وەسەر کەوتنەوە و خۆیان بە دەرگاکە دادا. چاوە رەش و درەوشاوەکانیان تەمی لێ نیشت.

گێژەڵووکەیەکی گەورەی هێندەی دێوەزمەیەك هەستا و گژ و گیا و لۆکەی لە ڕەگەوە هەڵکەند و خەرمانە کایەك و میچی ماڵەکانیشی هەڵگرت و مریشك و مراوی و باڵندەکانی هەستاند، سواڵەتەکانی سەربانی کۆشکەکەی هەڵکەند و بەری دانەوە خواریٚ. دەروێش بەگی خۆی بە لاشیپانەی دەرگاکەوە گرت. خۆی نەگرتبایە، گژەبایەکە هەڵیدەگرت و لە کۆشکەکەوە دەیخستە خوارێ. تۆز و خۆڵەکە بۆ ساتێك پشووی لیٚ بڕی. دەم و لووتی پڕ بوو لە تۆز و خۆڵ.

هەر چاوی کردەوە، سەیری کرد گێژەڵووکەکە ئەستوورتر بەرزتر بووەتەوە و بەرەو تۆرووس کەوتووەتە ڕێ. سەر و دەموچاوی تەواو تۆز و خۆڵاوی ببوو.

هەستی کرد لەم دنیایە نییە. خۆ ئەگەر ئەو ڕەشەبایە جارێکی دیکەش بەو تووڕەییەوە هاتبایەتەوە... هەستی کرد لە سەر دنیایە نییە. دەتگوت هێندیٚ لە ئەندامەکانی لەشی پێوەی نین. بۆ ئەوەی بێتەوە سەر خۆ و لەو بۆشایی بوونەیدا هەست بە قورسایی لەشی بکاتەوە، دەسکی دەمانچەکەی توند گرت و گوشیی. وای گوشی دەستی ژانی کرد و قرچەی لە ئێسکانی هات.

ئەسپەکە سەری بەردابۆوە و وردە وردە دەڕۆیشت و ئەوەندە هێمن دەڕۆیی دەتگوت ناجووڵێ. لە بەر قرچەقرچی گەرماکە، سێبەری ئەسپەکە بەرەو ڕۆژهەڵاتیٚ کشابوو و سوارەکەی هەوساری بۆ شل کردبوو. وەك یەکێکی بەڵایەکی بەسەر هاتبیٚ و ئاگای لە خۆی نەمابیٚ. ئەسپەکە لە تەنیشت زۆنگاوە گەورەکەوە وردە وردە بەرەو ڕۆژهەڵات دەچیٚ. جار و باریٚ پیٚ دەچەقێنیٚ و سەری بەردەداتەوە و تاوێك ڕادەوەستیٚ و دیسان چەند هەنگاوێك دەنێتەوە.

سوارەکە تاوێك لە نێو گەردەلوولە سپی و درێژ و باریکەکەدا کە دەتگوت تەم و مژێکی بەهارییە، مایەوە. تۆزێك دواتر گەردەلوولەکەی بە دوای خۆیدا کێشا و ڕۆیشت. سوارەکە دەتگوت هیچ نەقەوماوە، بە بەر تاوەکەدا هەر وا بیٚ تاقەت و نیوەزیندوو ڕێگەی دەبڕی.

بۆنێکی تیژ، بۆچرووك و بۆسۆ هات.

سوارەکە لە بن دارە تووەکە ڕاوەستا. لەو لاترەوە، زۆنگاوەکە لە تەنیشت ئاناوەرزاوە هەتا ڕووبارەکەی جەیهان کە لە بەر تیشکی خۆرەکەدا وەك ڕێگەیەکی قورقوشمکراو دەبریسکایەوە، ڕەش ڕەش پان ببۆوە.

کەوتە گەڕان. گەڕان بە شوێن شتێکی بزربووی گرانباییدا کە ناوەکەی لە سەر زمانی بوو بەڵام هەرچیی دەیهێنا و دەیبرد وەبیری نەدەهاتەوە. یەك بە یەك گیرفانەکانی گەڕا و

دەمانچەکەی لە بەر پشتوێنەکەی دەرکێشا. بریقەی دەمانچەکەی لە بەر تاوەکە شەپۆلی دا. فیشەکەکانی کردە لەپی دەستییەوە. فیشەکەکان چەور و بۆر بوون. دەمانچەکەی پڕ کرد. تۆپەی دەمانچەکەی سووڕاند و سووڕاندییەوە هەتا تاقەتی نەما و دەمانچەکەی خستەوە جێی خۆی. چۆوە ژوورەکەی و دیسان هاتەوە دەرێ. لە ژووری "بەگی"دا راوەستا. مات و خەمبار سەیری یادگارییەکانی بەگیی کرد، بەڵام ئەو شتەی هەر نەدۆزییەوە کە لێی دەگەڕا. چۆوە باخەکە و گەیشتە سەر بیرەکە. بە سەر زارکی بیرەکەدا نوشتایەوە و خۆی لە ئاوێنەی ئاوی بن بیرەکەدا بینی. روخساری خۆی لە هیچ ئاوێنەیەکدا ئاوا زیندوو نەدیبوو. تاوێك لە روخساری خۆی ورد بۆوە، بەڵام دیسانیش ئەو شتەی هەر نەدۆزییەوە کە لێی بزر ببوو. دەنکە چەوێکی هەڵگرت و لە بیرەکەی هاویشت. وردە شەپۆل سەر ئاوەکەیان داپۆشی. دارە زەیتوونەکان تۆزیان لێ نیشتبوو. گەڵای دار تووەکەش لەبەر تۆز و خۆڵ خۆڵەمێشی دەچۆوە. لە تەنیشت دار تووەکە بەرەو لای زەیتوونەکان و لەوێشەوە بۆ سەر بیرەکە و لە سەر بیرەکەوە بەرەو ماڵەوە و لە لای ماڵەوە بەرەو مەزرا و لە مەزراوە بەرەو بێستانێ دەچوو و دەهاتەوە و دەڕۆیشت و دەهاتەوە. بەبێ راوەستان، بە بێ هیچ راوەستان و پشوودانێك دەڕوات، لێی سواری ئەسپەکە دەبێ و دەڕوات، ئەسپەکەی لینگ دەدات و بە دەم لینگدانی ئەسپەکەیەوە هەر لە سەر پشتییەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارێ و دیسان خۆی داوێتەوە سەر پشتی ئەسپەکەی و بە دەشتە کاکی بە کاکییەکەدا ئەسپەکەی تاو دەدا. نازانێ دەچێتە کوێ و چی دەکا. خۆی بە دڕکەڵانەکەدا دەکات و دڕك و نووسەنەکە جلوبەرگ و گیانی شیتاڵ شیتاڵ دەکەن، شەڵاڵی خوێن، لە رەوەزە بڕگە بڕگەکانی ئاناوەرزا وەسەر دەکەوێ و هەتا نیوەی شەوێ بەو تاریکانە لە گابەردێکەوە خۆی داوێتە سەر گاشەبەردێکی دیکە. لە ناخی دڵەوە دەنەڕێنی و هاوار دەکا، دەخولێتەوە و سەر لە دیواری زبری رەوەزەکان دەکوتێ.

لە سەر مۆبلەکە دانیشت. چەکمەکانی داکەند و چاوی بڕییە هەر دوو تای دەرگاکەوە. ئەوجار هەستا چووە ژوورەکەی. پەردە ئەستوورەکانی ژوورەکەی دادرابوونەوە و هەر لە کەلێنێکەوە داوە تیشکێك لە ژوورەوەی دەدا. پێی خۆش بوو لەو داوە تیشکە ورد بێتەوە و چاوی تێ ببڕی کە تۆز و گەردێکی نامۆ و سەیر تێیدا دەسووڕانەوە. ژەنگەسوورەیەك، کەسك، شین کەوتە نێو داوە تیشکەکەوە و ئیتر نەیتوانی لێی بێتە دەرێ. سەرلێ شێواو و تووڕە بە درێژایی داوە تیشکەکەدا سەرو خواری دەکرد. ژوورەکەی پڕ کرد بوو لە وزە وز. دەتگوت خستوویانەتە لوولە شووشەیەکی بەستراو، هەوڵی دەدا و خۆی رادەپسکاند و نەیدەتوانی

دیواری تاریکاییەکە ببڕێ، هەر بۆیە هەتا هێزی لە بەردا بوو وزەی وزی دەکرد و سەری بە تەختی ژوورەکە و پەنجەرەکەدا دەکێشا و ئۆقرەی نەبوو.

دەروێش بەگ گوتی:"هەی گیانلەبەری کەر، پێی وایە ئەو تاریکاییە دیوارێکی پۆڵایە، هەر دەڵێی بنیادەمە."

لەپی دەستی پڕ بوو لە خوێن. بۆنی خوێنی تازە، سیحراوی و کەف کردووی بۆ هات. سەیری دەستەکانی کرد، دەستی بریندار نەبوو، بەڵام دیسان خوێنی لێ دەهات. دیسان لەپی دەستی پڕ بۆوە لە خوێن، خوێنێکی لیچق. بۆنی خوێنەکە بە دەوروبەریدا بڵاو دەبۆوە و نێو لووتی دەخورا. بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ ماوەیەك هەر بۆنی بە خوێنەکەوە کرد.

خوێن، خوێنی شلەتێن بێ راوەستان لە دەستی راستەیەوە شۆڵاوگەی بەست بۆ سەر ئاسنە ساردەکەی دەمانچەکە و لەوێشەوەمە بۆ سەر رانەکانی و گەرمای لیچقی خوێنەکە وردە وردە بە هەموو گیانیدا بڵاو بۆوە.

تاوێك دواتر خوێنەکەی لەبیر کرد. هەر خوێنەکەی لەبیر چۆوە، دیسان ئەو شتەی بیر کەوتەوە کە لەبیری چووبۆوە و نەیدۆزیبۆوە. دیسان هەستی کردەوە لە سەر ئەم دنیایە نییە و (هەناوی بۆش و بەتاڵە). سەری لە گێژەوە هات و چەند جارێك بە دەوری خۆیدا خولایەوە و بەر چاوی رەش بوون. خەریك بوو بکەوێ کە بە سەر خۆیدا زاڵ بوو. سەرلێشێواو و بە لارە لار کەوتە پیاسە کردن.

لە ناکاو دەتگوت ونبووەکەی خۆی دۆزیوەتەوە و ئەوەی لەبیری چووبۆوە هاتۆتەوە بیری، دیسان شین گێڕییە کۆنەکە هاتەوە و ناخی پڕ کردەوەمە، گەرم و خۆمانە و دارماڵ و پڕ.

"ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و لێیاندا رۆیشتن."

جارێك دوو جار، سێ جار چوار و پێنج جار و سەد جار و هەزار جار پاتەی کردەوە. پڕمەی گریانێك، گریانێکی خەست و پڕ بە دڵ، سووکبوونی رزگاربوون لە تووڕەییەکی سامناك، حەزی گریان ناخی دەئاخنی، بۆ ئەوەی ئەو هەستە دەگمەنەی لە کیس نەچێ، بەردەوام وشەکانی دەگوتنەوە و ئەگەر وشەیەکی لە بیر دەکرد، پێی وابوو ئیتر لەو چێژە دەگمەنە بێبەری دەبێ.

ئاخرییەکەی ماندوو و شەکەت کەوت. هەموو شتێکی بزر کردبوو، بۆش و بەتاڵ و تەواو بوو.

چەندی هێزی لەبەردا بوو لە ناخی دڵەوە نەڕاندی:"هەی خودا غەزەب لە هەموویان بگرێ، هەر هەموویان، هەموویان، هەموویان بە قوڕێدا..."

دەنگی گەیشتە ئەو بەری ئەو گوندە تۆزاوییەی لە بەر هرووژمی گەردەلوولەکاندا مابۆوە. ئازای ئەندامی لەرزی. تووڕەییەکی بێجلەو دایگرت. خۆشی و تووڕەیی لە چاوترووکانێکدا تێك ئالقان و ئاخرییەکەی تووڕەییەکەی بەزی، بەلام خۆشی و شادییەکەش زۆری خۆ رانەگرت و زوو پشووی لێ بڕا.

هەموو رۆژێ چەند جاران دوای تووڕەبوون هێور دەبۆوە، لە هێورییەوە خەم و پەژارە دایدەگرتەوە و دەگریا. هۆشی بە سەر خۆیەوە نەمابوو. لە بۆشاییەکدا مابۆوە و لە دنیایەکی بێسنووردا تاك و تەریك دەکەوتەوە... تووشی لێقەوماوی و نەمان و پووچی و سووکی و بۆشایی دەبوو لە ونبوویەك دەگەڕا و حەزی لێ بوو دیسان ئەو ئارەزووە فەرامۆشکراوە بدۆزێتەوە و بەدەستی بێنێتەوە.

باشترین تووڕەیی، باشترین باشترینەکەی... ئەوەیە کە خۆی بدەیتە دەست خەمێکی ناسك و نەرم و بە ئازار و شیرین و نیوەگریانێکەوە و ئەوجار لە پڕ هەتا سەر ئێسقان دەلەرزی و تووڕەییەکەت بەردەوام دەبێ. رۆژێك، پێنج رۆژ، مانگێك، سالێك، سەد سالْ... بە لەرزینی تووڕەییەوە، کەفهەلْخڕێن و ددان لە چیڕەوە بردوو، زار داتەپیو و چاو سوورهەلْگەڕاو و لە ژێللا هاتوو، سوور هەلْگەڕاو و ژیان لە نێو تووڕەیی و ئازار و خەم و پەژارەدا. ئاوا ژیان لە هیچ و بۆشاییدا. بە بێ عەشق و بێ کەس و بێدەر و نەشتوانی ئێرەیی بە کەس بەری. وەك چلە گیایەك، وەك دارێك جڕ و جانەوەرێك، تەنانەت قالۆنچەیەکیش، مێشێکیش ئاوا لە هیچ و بۆشاییدا ناژیێ. تەنانەت جانەوەرێك، دارێك شەیتانۆکەیەك و تەنانەت کرمێکیش. ترس لە مەرگ. بە باوێشکدانەوە بکەویتە نێو ترس و سامی مەرگەوە. شێتبوون لە ترسی مەرگ. کەوتن لە داوێنی داماویدا. ژیان لە چەقوچۆ و ئازارێکی ناڕوون و نادیاردا. لەنێوچوونێکی تالْ و خەمبارانە... و ترسی مەرگ و ترس لەو شوێنەی وا مەرگ لەوێ کۆتایی دێ.

لە تەواوی ژیانیدا بە تووڕەیی و هەلْچوونییەوە، بە روحێکی شێواوەوە، بە ناخێکی پڕ لە شەپۆلی سووری خوێنەوە، جگە لە مردن و کوشتن بیری لە هیچ شتێك نەکردووەتەوە، رای کردووە و خۆی حەشار داوە و لە هەموو چرکەساتەکانی ژیانیدا بە ترسی مردن و کوشتنەوە ژیاوە و گیانی لە ترسێکەوە کەوتووەتە نێو داوی ترسێکی دیکەوە. خۆشین و رزگاربوونی لە چنگی تەواوی ئەوانە.

رەشەبایەك لە دەوروبەری "حور ئۆشاغ"یەوە هەستا و گەردەلوولەکەی بەرز بۆوە و بەرەو رووباری جەیهان چوو. گەردەلوولێکی دیکە لە خوارووی جەیهانە وشکەوە هەستا. یەکێك لە

سەرووی ئەنەدۆڵەوە. کۆڵەکەی تۆز و خۆڵ وەك هەورەتریشقەو لە چاوترووکانێکا دەشتەکەیان داگرت و بەرەو کسیك ئەللی (دەست پەڕیو) هرووژمیان برد. بڕکە و چڵوچێو و کا و کۆت و پوش و پەڵاشەکانیان بە سووڕە سووڕ هەڵدەگرت و گێژیان دەدا و لوولیان دەدا و سووك سووك دەشتەکەیان دەبڕی. کۆڵەکەکان تاوێك شان بە شانی جەیهان بە ئاراستەی لووزەوی ئاوەکەدا ڕۆیشتن و بە سەر ئاوەکەدا خوشین و گەیشتنە شارۆچکەی جەیهان و لەوێ، لە باغە تووە چڕەکەدا یەك جێ بزر بوون.

لە گۆشەی لای سەرووی حەوشەکەوە، لە بن دیوارەکەوە، چوار ئاڵقە تەندووری کوردی کە دەتگوت بیرن، لە تەنیشت یەکترییەوە ریز کرابوون. تەندوورەکان نێڵەیان دەهات و بڵێسەی ئاگرەکەیان لە بەژنی پیاوێك بەرزتر هەڵدەکشان. ژنەکان لە قوون تەندوورەکە ئەنگوتکیان دەگرت و ئەنگوتکەکانیان لە سەر رفێدەکە(ئەوەی نانی بەسەردا دەدەن و بە تەندوورییەوە دەدەن) دا دەدا و بە دیواری ناوەوەی تەندوورەکەیانەوە دەدا.

بەگ هیچ ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەبوو. لە تەمێکی بەئازاردا گیری کردبوو. وەك خەوگەڕێك چووە پێشێ و گەیشتە قوون تەندوورەکان. ژنەکان سەر و رووی خۆیانیان داپۆشی و پشتیان لەو و روویان لە دیوارەکە کرد. دەروێش بەگ تەشتە هەویرەکە و نانەکانیشی هەڵگرت و هەمووی لە تەندوورەکان کرد. ئەوجار قست بۆوە و پتەو راوەستا و پشووی قەتیسی نێو سینگی بەردا. دەموچاوە گرژەکەی وردە وردە دەکرایەوە. ئاوڕی لە ژنەکان دایەوە و گوتی:"کارتان پێی نەبێ. لێی گەڕێن با یەکسەر بسووتێ."

دووکەڵێکی خەست حەوشەکەی داگرتبوو.

نانەکان و هەویرەکە دەسووتان و دووکەڵێکی رەش و خەست وەك قەیتەران، لە تەندوورەکانەوە دەهاتە دەرێ و وەك گلۆڵەیەك دەکرایەوە و لە حەوشەکە دەنیشت. دەروێش بەگ جار جارێك دەچووە نێو کۆڵەکەی دووکەڵەکەوە و کە دەهات پشووی ببڕێ دەکشایەوە دواوە.

ئارەقەی کرد. قژی سەری، جلوبەرگەکانی تەڕ تەڕ بوون، دەتگوت ماوەیەك زۆر لە بەر باران بووە.

بۆنی نانە سووتاو بردییەوە سەردەمی منداڵی. دەڕۆیشت و لاقەکانی بەدووی خۆیدا راکێش دەکرد و ئاوا لە مەزراکە چووە دەرێ. لە بەردەم شارە مێروولەیەك راوەستا. رێچکەی مێروولەکان باریك و درێژ و سپی بوو. بە دووی رێچکەکەدا رۆیشت. رێگەکە زۆر دوور رۆیشتبوو، هەتا زۆنگاوەکە چوبوو. هەر کام لە مێروولەکان کە بە دووای یەکتریدا ریزیان

بەستبوو، شتێکیان بە دەمەوە بوو. پۆلە مێروولەیەکیش بە هەموو هێز و تواناوە خەریك بوون دەعبایەکی رەق پێستی خاڵخاڵی و رەقهەڵاتوویان بارەوبار دەکرد و رایاندەکێشا. رێگە پڕ لە هەوراز و نشێوەکانیان بە نێو گژ و گیایەکاندا تێدەپەڕی. جار جار لە قەڵشت و درزێك دەکەوتن و تاوێك لە چاوان ون دەبوون.

شەو بوو. شەوێکی تاریك و بێ ئەستێرە و پڕ لە جیکە و سیڕەی سیسرکان. دەنگی باڵندەکان جار جار لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە دەهات. دەروێش بەگ حەزی لەوە بوو بیر لە رۆژگاری کۆنی تورکمانەکان بکاتەوە. بە نووکی چەکمەکەی زارکی شارە مێروولەکەی هەڵدایەوە. خۆڵەکەی هێنا و لە بەردەم شارە مێروولەکە کردییە کۆگا. مێروولەکان هاتن و لە سەر تەپۆڵکەکەی تەنیشت زارکی شارەکەیان کۆ بوونەوە. دانەوێڵەکانیان بەلایەکەوە نا و بە وردی بۆنیان بە خۆڵەکەوە کرد ـ خاکەکەی چوکووراوای شەش سوار چاکەکە تورکمانییەکەی سەریان لە دووی ئاسکەکان نابوو. چوکووراوای بەگە باز لەسەر دەستەکان. چوکووراوای ئەو سەردەم، باخێکی گەورەی گەش و کێوی و شەقڵ نەشکاوی خودا بوو.

دەروێش بەگ هەر جارێکی دڵی توند دەبوو، پەنای دەبردە بەر ئەو چوکووراوا نەمر و بێ مەرگە. چەمەرییەکی تورکمانی لە گوێیدا دەزرینگایەوە. شینێکی شیرینی دەگێڕا، نوقمی ئەو خۆشییە دەگمەنە هۆشی بەسەر خۆیەوە نەدەما.

بە دەستەکانی روخساری خۆی داپۆشی و بە غاردان بەرەو کۆشکەکە رای کرد. پلیکانە چێوییەکان لە بن پێیانیدا داهاتن و راست بوونەوە. هێشتا بۆنی نانە سووتاوەکە هەر دەهات. ژنەکان شەلاڵی ئارەقە، نانە دووکەڵاوی و کۆڵووەکانیان لە تەندوورەکانی دەردەهێنایەوە.

"ئازارچێشتووترین بوونەوەری ئەو دنیایە منم. بنیادەمەکان زۆر ئازار دەچێژن. ژانی مەرگ دەچێژن کە لە هەموو ئازارەکان بەژانترە. ئەمن ژانی داهاتوو، ژانی ئەو شتەی هێشتا نەبووەتە ژان، ژانی بێ ژانی دەچێژم."

زمانە درێژ و سوورەکانیان لە بنەوە هێناوەتە دەرێ و پێدەکەنن. لە هەموو شتێك تێدەگەن، هەموو شتێك دەزانن. مەحاڵە نەیزانن. پێ بە پێی فێربوونێ، تۆزێك لە ترسەکانیان رزگارییان دەبێ، تۆزێك. دیل و کۆیلەکان، ماستاوچی و دەمتەڕەکان، چاوێکیان کردووەتە چوار چاو. ترسنۆکترین ئافرێنراوی ئەو دنیایە، بنیادەمە. ترسی لە دڵیدا مەهێڵەوە و لێی دەربێنە، ئیتر تۆزکاڵێکی لێ دەمێنێتەوە. جا خەڵکی گوندی لە هەموو بنیادەمێك ترسنۆکترن.

دەروێش بەگ گرماندی:"تەورەکان هەڵگرن و وەشوێنم کەون."

پێنج کەسی تەور بە دەست لە بەردەمی ئامادە بوون. دیسان گوڕاندی. "وەرن."

بە دوایدا چوونە باغەکەوە. دەروێش بەگ تەورەکەی لە دەستی ئەو پیاوەی بە دوایەوە بوو، ئەستاند. لە سەر تەپۆلکەکەی سەر لێواری ئەو رووبارەی تار و سوور و بێدەنگ دەڕۆیشت، چنارێکی بەرز و گەورە شین ببۆوە. دەنگی داهاتنەوەی تەور بێدەنگییەکی شەوی شکاند. شەڕێکی قورس و یەك بە یەك لە نێوان چنارە بەرزەکە و دەروێش بەگدا دەستی پێکرد. تەورەکە پەیتا پەیتا و بە ویزە ویز دەوەشێنرا و بە ژوور سەرییەوە کەوانەی تیشکی دەکێشا. شەوەکە نوقمی تریفەیەکی سارد، قورس و کپ و بێ درەوشانەوە و مات بوو. دەنگی گرمەی داهاتنەوە تەورەکە هەتا دوور دوور هەتا رەوەز و زەرد و ماهی ئاناوەرزا دەچوو و لەوێدا دەنگی دەدایەوە. لك و پۆی بەربلاوی چنارەکە لەو سەرەوە، لە ئاسمانێکی تار و قورس و بەباو بۆران دەچوو. دەروێش بەگ لەگەڵ داهێنانەوەی هەر تەورێکدا کە لە قەدی پیرە چنارەکەی دەدا، لە نێو هەست و ژان و حەژمەت و ئارەزووگەلێکی ئاڵۆزدا دەتلێتەوە و شتێك وەك رووناکایی بەرەبەیان لە ناخیدا دەدرەوشێتەوە. تیشکێك ئەم سەر ئەوسەری شەوەکەی شەق کردووە. شنەیەکی شێدار شەوەکە دەلاوێنێتەوە. ماسییەکان لە ئاوەکەدا مەلە دەکەن. وردە چەوەکان لە بن دارە چنار و بڕکە تووتڕەکەکانەوە پەرش و بلاون. بۆنی تازە و شێداری زۆنگاوەکان هەستاوە. پنگە و بزنگرە و بڕکە شووتی لە بەر تاوەکە، مێشەکەرانە...

هەر تەورێکی دایدێنێ، بۆنی توند و تاڵ و تفتی دارەکە بلاو دەبۆوە. شەوانە، بۆنەکانیش وەك دەنگەکان ئاسانتر و باشتر بلاو دەبنەوە.

هەموو گوندەکە بە دەنگی تەورەکە لە خەو هەستان. سەگەلی گوندەکە وێکڕا دەستیان کرد بە وەڕین. سەگەلی گوندی ئاناوەرزاش دەنگیان خستە پاڵ دەنگی ئەوان.

لەگەڵ هاتنی ئەودا دەنگی تەورەکەش کەم دەبووەوە. وای لێهات دەروێش بەگ ئیتر نەیتوانی بە ئاسانی تەورەکەی لە قەدی دارەکە بێنێتە دەرێ. هەر تەورێکی لێی دەدا، هەتا لەوێی دێنایەوە دەرێ، نیوە گیان دەبوو.

سەرتاپای گیانی ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە. تەڕ تەڕ ببوو. بۆنی ئارەقە تێکەڵی ئەو بۆنە دەبوو کە لە قەدی دارەکەوە دەهاتە دەرێ.

کار گەیشتە جێیەك کە پیاوەکە تین و تاقەتی لێ بڕا و تەورەکە نێو قەدی دارەکە نەجوولا.

"لێی گەڕێن با تەورەکەی من، لە جێی خۆی بێ. ئەنگۆ لە لایەکی دیکەوە خەریکی کاری خۆتان بن."

هانکە هانکی بوو. سینگی وەك سینەی ئەسپێکی لێنگدراو دەفی دەدا. دانیشت و پاڵی بە دارێکەوە دا. عەرزەکە بلێیی و نەلێیی گەرم بوو. دەتگوت خەوێك، وردە وردە دەیڕفێنیّ. شەلاڵی ئارەقە، بیّ جووڵە، هەر وا کە وردە وردە دەحەسایەوە، گوێی دابووە دەنگی تەوری پیاوەکانی.

گەردەلوولەکان رۆیشتن. ئێستا ئیتر لە تاریکاییەکەدا دەڕۆیشتن. گەردەلوولەکان لە بەر رووناکایی مانگەشەوەکەش وەك رووناکایی بەر هەتاو دەدرەوشانەوە. گەردەلوولەکان لە بوومەلێڵدا ترسناکترن.

ئێستا، لەو کاتەدا گەردەلوولەکان یەك بە یەك نیشتوونەتەوە و چوونەتەوە هێلانەی خۆیان. شنە و کزەی بایەك نایە، گەڵایەك ناجوولیّ. شەوێکی نەرم، هەوریشمین و بلێیی و نەلێیی فێنك. ئاسمان نوقمی ئەستێرەی درەوشاوە و بە شەپۆل و بریسکەدار. ئەستێرەکان پۆل پۆل لە لایەکەوە دەخوشێن بۆ لایەکی دیکە. ئاسمانەکە دەلێیی گلۆڵە بەنێکی ئالۆزکاوی ئەستێرەیە.

دەروێش بەگ پشوویەکی دا و هەستا و بە دەستێك تەورەکەی لە قەدی دارەکە دەرکێشا. تفی لە لەپی دەستی دا و دەستی بەکار کردەوە. دەمە بریقەدارەکەی تەورەکە لە بەر تیشکبارانی ئەستێرەکاندا بریسکەیەکی کزی لێوە هات و تەورەکە لە دارەکە رۆدەچوو و تەلاشەکان دەپڕیشکان.

"ئەمشەو ئەگەر تا بەیانییش بیّ، دەبیّ ئەو دارە بخەین. هیممەت بکەن."

ئەستێرە و بریسکە بریسکی تەورەکان لە شەوەکەدا درەوشانەوە. بەیان ئەنگووت. لێواری هەورەکان لە لووتکەی شاخەکانی لای رۆژهەڵاتەوە، پڕ بوون لە نەخش و نیگار. پیرە چنارەکە بە لك و پۆ چڕەکانییەوە، بە دەنگ و خشپ و هۆڕێکی زۆرەوە بەرەو لای خۆرهەڵات بەلادا هات و کەوت.

ئێوارانیّ کاتی ئاوابوونی خۆر و بەیانیان لەگەڵ تاوهەڵاتێدا لك و پۆی چنارەکە وەك هێشوو پڕ دەبوو لە باڵندە و پاساری. دەنگی جیکە جیکی ریشۆڵە بەو دەندووکە رەنگاورەنگانەیانەوە، کەسك و تیژ و جوان و چاوی رەش و گەورەیان، دەشتەکەی پڕ دەکرد لە زایەڵە. وەك هەوری رەش دەهاتن و بە قاو قیژ لە دارەکە دەنیشتن. بە سەدان هێلانە لە نێو لك و پۆی دارەکەدا بوون. زەڕنەقووتە دەندووك زەردەکان ملە باریکەکانیان کێشابوو و زاریان داپچڕیبوو و بە جیکە جیك ئەم دیو ئەو دیویان دەکرد.

داره گەش و جوانەکە بە دەنگێکی سامناك وەك دنیایەك بەراوەژوو دەبێتەوە. کەوتە سەر ڕەشایی و بە شوێنیدا دەتگوت تاو هەڵاتووە، تیرێژەکان شەپۆلیان دا. هەزاران جووچکە ریشۆڵە، زاریان، زارە دەور زەردەکەیان تەواو داپچڕیبوو و ملیان قوت کردبۆوە و لە جیکە جیك و قاوقیژ لە هێلانەکانیان دەرپەڕین.

تاو هەڵات و لە بیابانە کاکی بە کاکییەکەدا هەزاران سوار دەرکەوتن، لە زەوییە تەختانییەکەدا بلاو بوونەوە. سێبەرەکانیان بەرەو لای رۆژئاوا کشا. سوارەکان سپی پۆش بوون.

باران دەباری. زەرد و روون. زەرد و ما و رەوەزەکانی ئاناوەرزا پاش باران دەتگوت دووکەڵێك ئەرخەوانین بە ئاسمانەوە. بە هەزاران زەرنەقووتەی بێ پاڵ و پەڕی دەنووك زەرد، رووتەڵە و قوڕاوی لە سەر عەرزەکە تێك دەئالان و گیانیان دەدا.

سوارەکان کە لاقی ئەسپەکانیان هەتا ئەژنۆ لە قوڕە سوورەکە هەڵچەقیبوو، بە دەوری کۆشکەکەدا دەسووڕانەوە. هێندێکیان بە یۆرغە و هێندێکیان بە چوارناڵە و کۆمەڵێکیان بە غاردان. لغاوی ئەسپەکانی کەفاوی بوو و چاوەکانیشیان وەك گۆمی خوێن.

پیاوێك بە ئەسپێکی وەك قیری رەشەوە هاتە حەوشەکە. دیشداشەیەکی خۆڵەمێشیی لە بەر دابوو. سەر قۆڵەکانی گوڵدۆزی کرابوون و چاوەکانی رەش و چەناگەی تیژ و ردێنێکی رەش و تۆپەڵە و سمێڵەکانی شۆڕ بوون. هاتە پێشەوە و گوتی:"ماڵوێرانی کردم. چوار برام هەبوون، هەر چواری کوشتن. بیدە دەست من. ئەگەر رادەستی من نەکەی ئەو کۆشکەت بە سەردا کاول دەکرێ."

بە ئەسپەوە بە سەر دیوارەکەدا بازی دا و چۆوە نێو بازنەی ئەو سوارانەی بە دەوری کۆشکەکەدا دەسووڕانەوە.

سوارێکی دیکە لە بازنەکە جویێ بۆوە و هات و لە نێوەڕاستی حەوشەکە راوەستا. متقەی لێوە نەهات و چاوی لە دیوەخانەکە بڕی. ئەسپەکەی کەوێت، بەرز و راکشاو و قاچ و قولێکی بەهێزی هەبوو. چاوەکانی وەك مەرجان سوور دەچوونەوە. بارانە زەردەکە دەباری. سوارەکەی لە جێی خۆی نەدەبزووت. بارانەکە هەتا مێشکی ئێسقانەکانی چووبووە خوارێ. یاڵ و ملی ئەسپەکەی، ئاوێکی زێڕین دەتکایەوە. پیاوەکە راوەستا، زۆر راوەستا و ئاخرییەکەی قەمچییەکی لە ئەسپەکەی دا و سووك بە سەر دیوارەکەدا قەڵەمبازێکی دا و چۆوە نێو سوارەکانی دەوری کۆشکەکە. پیاوەکە قورس و قایم لە سەر ئەسپەکەی دانیشتبوو. چاوە کاڵەکانی دەدرەوشانەوە. پەنجە باریك و درێژەکانی دەتگوت قامیشن. یاڵی ئەسپەکەی پەخش و بڵاو بوو و کلکی دەگەیشتە سەر گوێزینگانی. لە بەر بارانەکە زەرد دەچۆوە.

دەنگی لێ بەرز بۆوە:"کاری وا مەکە. ئەتۆ پیاوێکی خانەدانی. ئێمە چۆن بە دەستی بەتاڵ بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان؟ بەبێ وی چۆن بگەڕێینەوە؟ ئەگەر لەگەڵ خۆمان نەیبەینەوە، سەگەکانیش چاو لە چاومان ناکەن. دەڵێی چی بەگ؟ سەیر کە بەگ... بمانکوژە، هەر هەمووومان بکوژە، بەڵام ئەومان بدە دەستی، ئێمە شوێنیمان هەڵگرتووە گەڕەك بە گەڕەك و پێی بە پێی ئەسپەکەی لە دەشتی حەرانەوە تا گەیشتووینە ئێرە...."

ئەوجار بێدەنگ بوو و بەو چاوانەی کە دەتگوت پۆڵان و دەدرەوشێنەوە، سەیری پەنجەرەیەکی کرد و دوای تاوێك ئەسپەکەی لینگ دا و لە بارانەکەدا بزر بوو. لەولاترەوە، سەرەڕای بارانەکە، ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا وەك پەردەیەکی هەوریشمین لە بەر شنە بایەکە، شەپۆلی دەدا و دەشنایەوە.

دەمەو ئێوارە سوارەکان لە دیوارەکە بازیان دا و هاتن و لە نێوەڕاستی حەوشەکەدا بە ریز ڕاوەستان. نە قسەیەکیان کرد و نە جووڵەیەکیش. بارانەکە هەروا زەرد و درەوشاوە دەباری. جار بە جارێ خۆشی دەکردەوە و دیسان دایدەکردەوە و توندی دەکرد. شیو و دۆڵ و ئاودڕەکان و بیر و چاڵەکان پڕ بوون و لافاو لە ڕەوەزەکانەوە بە لرفە بەرەو خوار خوشی.

سوارەکان هەتا بەیانی لە چەقی حەوشەکەدا چەقین. ڕێك لە کاتی تاوهەڵاتنیدا، بە دوای یەکدا بە سەر دیوارەکەدا بازیان دا و بە دەوری کۆشکەکەدا خولانەوە. ئەسپەکانیان هەتا ئەژنۆ لە قوڕ دەچەقین.

پەیتا پەیتا ئاوردوویان لە ئاگردانەکە دەخست. سوڵتان ئاغا لە تاو و یاودا هەڵدەچۆقی و هەموو ئەندامی گیانی دەلەزی. برینەکەکەی ئەستوور ببوو و خەریك بوو وەبنی بدا. عەبدوی نەشتەرگەر مەلحەمی لە سەر برینەکەی دانابوو و چاوی بە سەرییەوە بوو. بریندار ددانی لە سەر یەك دادەگرت و لێوی دەکرۆشت و چاوی هەڵنەدێنا.

دەروێش بەگ بە شێواوی بە دیوەخانەکەدا دەهات و دەچوو و تەختەداری تەختی ژوورەکە لە بن پێیدا جیڕە جیڕیان دەهات.

سوارەکان بە شەوێ، جارێ و توند و جارێ لەسەرخۆ لێیان دەخوڕی... سەری ئەسپەکانیان وا شۆڕ ببوونەوە دەتگوت بە عەرزەکەدا دەکشێن.

لەولاتری سوارەکانەوە، سەر و سەکتی سەدان پیاوی چەکداری تورکمان لە دەشتەکەی ئاناوەرزادا دەرکەوتن. سەدان سوار، سەدان بازیان هەڵفڕاند. بازەکان بە لوورە لوور ئەوەندە بەرەو چەقی ئاسمانێ فڕین هەتا لە چاوان ون بوون، هەڵدەفڕین و ئەو جار بە قاوقیژەوە و بەرەو

عەرزی دەهاتنەوە و دەنیشتنەوە. سوارەکانیش لە دەشتەکەی چوکووراوا و بەرانبەر ئاناوەرزا، سەریان لە دووی ئاسك و مامزان نابوو بە هەزاران ئاسکی تیژڕەو، بە قەڵەمباز دەتگوت دەفڕن... و سوارە تورکمانییەکانی قەدیمیش بە شوێنیانەوە، بە سواری ئەسپی سپی و سوور و شەودێز... و رکێفیان لە زیوی بێخەوش و زین و هەوسار و لغاویان زیوکفت و جلوبەرگەکانیان گوڵچنراو... لە پێشیانەوە ئەو ئاسکانەی وەك بڵێسەی گڕ لە دەشتە تەختانییەکەدا شەپۆلیان دەدا و بە دووایانەوە ئەو ئەسپانەی وەك با دەفڕین. ئەسپی تورکمانە قەدیمییەکان لە خۆراسانەوە هەتا چوکووراوا...

هەزاران، سەد هەزاران ئەسپ و هەر هەمووشیان بێ زین و کۆپان و رووت و هەر کامێکیشیان سوارێکی سپی پۆشی چاو کەسك لە سەر. پەرش و بڵاو بە غار و قەڵەمباز و هەڵڵا و قریوە لە دەشتەکەدا. ئەو ئەسپەی لە پێش هەموانەوە بوو، نسکۆیەکی برد و سەرموقلاتێکی لێ دا. ئەوی دواتر و دواتری ئەو و ئەوانی دیکەش هەموو... ئەسپەکان دەتگوت هەورێکی سپین و بە دەشتەکەدا تێدەپەڕن. جلوبەرگ سپی و یاڵ سپی و کلك پەخش و پەرێشان. سەدان و هەزاران. جاری وابوو سەرەنگریێ دەبوون و سوارەکان تەپڵی سەریان لە عەرزی دەچەقی. جلوبەرگە سپییە خۆڵاوییەکانیان لە سەر عەرزەکە دەشەکانەوە.

ئەسپەکان وەك تاڤگە و لافاو و بە جۆش و خرۆش بە سەر دەشتەکەوە دەڕۆیشتن. زەوی لە بن خرمەی ناڵ و سمیاندا دەلەرزی و ناڵەکانیان بە هەزاران پڕشنگەوە بریسکەیان دەهات و بە سەر تۆز و خۆڵە سپییەکەی دواوەیاندا دەخشکا. یەك پشوو و بە چوار ناڵە دەڕۆیشتن و سوارەکان یەك لە دوای یەك خۆیان فڕێ دەدایە خوارێ و عەرزەکە دەتگوت دەریایەکی کەف گرتووە.

بریسکەی ناڵ دەشتەکەی رووناك کردبۆوە. حیلەی هەزاران ئەسپ لە ئاسمان گەڕابوو. ئەسپەکان پۆل پۆل و بە دوای یەکدا و وەك لافاو دەڕۆیشتن. دەشتەکە لێوڕێژ دەبوو. یاڵ و کلك و پێ و جەستە و ناڵ و چاوە درشت و سوور و مەرجانی و وەك پشکۆی گڕیان تێکەڵ و ئاڵۆز بوون. دەتگوت هەژدیها نەبەدی و نادیارەکەی ئاناوەرزا ئەسپەکانی راو ناوە. ئەسپەکانیش لە چوار قوڕنەی دنیاوە روویان کردبووە چوکووراوا و دەشتەکەیان پڕ کردبوو. جگە لە چوکووراوا شوێنێکی دیکە نەمابوو رووی تێکەن.

حیلەی ئەسپەکان کە گوێی کەڕ دەکرد لە هەموو لایەکی دەشتەکەوە دەهات. هەرچیی باڵندە بوو، بە جیکەجیك لە هێلانەکانیان دەرپەڕیبوون. ئاسمان لە بەر باڵندان رەش دەچۆوە. باڵندەکان پێشی هەتاویان گرتبوو. جیکەجیکە ئاڵۆز و شێواوەکانان تێکەڵی حیلە و کوڕژنی

ئەسپەکان ببوو. بزنەکێوی و ئاسك و باز و هەڵۆ و چەقەڵ و رێوی و جرِوجانەوەر و خشۆك و خزۆکی چیاکان بە هانکەهانك و شێواو و شڵەژاو بەرەو دەشتەکە داگەرِابوون. دەنگی ئەوانیش تێکەڵی حیلەی ئەسپەکان ببوو.

حیلەی ئەسپەکان لە حیلە نەدەچوو، شاد و بەخرۆش نەبوو، تۆقیو و زامار و بەحەژمەت نەبوو، دەتگوت چەمەری و شینگێرِییەکە و لە ناخی دڵەوە هەستاوە. کەوتبوون و دەیانحیلاند.

ئێستا ئەو عەرزە پان و بەرینەی چوکووراوا لێورِێژ و پرِ بوو لە بنیادەمی بەخەبەر و ئەو ئەسپانەی دەیانحیلاند و ئەو گایانەی دەیانبۆرِاند و ئەو پڵنگانەی دەیاننەرِاند و پرِ ببوو لە باڵندە، باڵندەی دەنگخۆش و باڵ بزێو کە سینگی ئاسمانیان پرِ کردبوو لە هەڵڵا و هەنگەمە و قریوە ـ پەپوولە و سیسرکە و مامز و نێرییە کێوی و سمۆرە...

لە ناکاو هەموو وڵات کپ بوو. هەورە سپییەکە لێی دا و رۆیشت. تاقە سوارێك لە سەر زەوی مابۆوە. ئەسپەکە سەری بەردابۆوە و سوارەکە تین و هێزی لەبەردا نەمابوو. هەوسارەکەی شل کردبوو و ئەسپەکە وردە وردە و بۆخۆی بە دەشتەکەدا دەرِۆیشت.

"ئاخ بۆ ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و لێیاندا رۆیشتن."

گەنجە گەرِۆکەکە گەیشتە شارێکی جوان. چاوەکانی لە چاوی ئەمیر سوڵتان دەچوون. برۆی تێکەڵ ببوونەوە و رەنگی دەموچاوی زەردهەڵگەرِاو و لێوە ئەستوورەکانی بزرِکابوون. باریکەڵە و کەڵەگەت. لاوی جوانچاك و بەژن رێك جوانترین شتی سەر ئەو زەوییەیە. لە دنیایەدا دوو شت جوانن: جوانووی ئەسپی عەرەبی و لاوی بەژن رێك. لاوەکە لە ئەسپەکەی دابەزی و سەیری کرد ئەو شارە لە شارەکانی دیکە ناچێ.

سوارەکان هاتن و بە ریز راوەستان و بێدەنگ بوون. بارانە زەردەکە دایدابوو. هەمووان چاویان برِیبووە پەنجەرەی کۆشکەکە. هەتا ئاوابوونی خۆر و تاریکداهاتن، لە جێی خۆیان ماوە. لە بن عەرزییەوە و لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە پەیتا پەیتا گرمە و هارِە دەهات.

ئەسپەکەی سەری بەردابۆوە و لە بەر قرچەی گەرماکە هەر وا بێ تین و هێز و وەك مردووان دەرِۆیشت. سەیرێکی دوور دوور و دەوری دۆملۆقەڵای کرد. دۆملۆ قەڵا هاتبوو و وەك کەشتییەکی سوور لە نێوەندی چوکووراوادا لەنگەری خستبوو. دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی بایەوانەکەی هەڵدەدا و بەرەو باشوور دەکەوێتە رێ. سوارەکە تاوێك لە رۆیشتنێ کەوت. رووبارەکەی جەیهانی لە پێش بوو و شووڵە گەزەکان وەك مێشەڵانێك دەم رووبارەکەیان گرتبوو.

باهۆزێکی چڕ و تار بە سوورە سوورێ و خۆبادان لە دوورەوە هات. هەرجارێکی خۆی بادەدا خێراتر دەبوو و چەندی خێراتریش دەبوو، بەرزتر دەبۆوە و ئەستوورتریش دەبوو. لە چیا و بنارانەوە و لە هەر شوێنێکی دیکە چی وەبەر هات هەڵیگرت و گێژی دا و بە سەر سوارەکەدا کشا و ڕۆیشت.

وەك شووشەیەکی ڕەش توایەوە، وەك خشتێکی سوورەوەکراو بەلادا هات، هەڵمی کرد، پەرش و بڵاو بوو و ڕەنگی هەڵبزڕکا و لە خوارووی تۆرووشەوە بەرەو ئاسمانێ هەستا و وردە وردە ڕەوییەوە و نەما.

سوارەکە بە سەر ئەسپە سپییەکەوە دەستی لە سەر چاوی هێنایە خوارێ. چەپ و ڕاست، دنیا، ئاو، بزنگرەی تاڵ و تەپوتۆز و قانگەلاشك و گوڵی ماهوور و زۆنگاوەکان عەتر و بۆن و بەرامەیان لێ دەباری. چوکووراوا لە گەرمای ئاوا بەتیندا هەمیشە بۆنی تۆزێکی هەڵقرچاو و جێ خەرمانێکی شێداری لێ دێ.

سوارەکان لە حەوشەکەدا وێکڕا نەڕاندیان:"ئەمیر، ئەمیر، ئەمیر سوڵتان."

لە چاوترووکانێکا بە سەر دیواری حەوشەکەدا بازیان دا و بە لینگدان بەرەو ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا ڕۆیشتن. بارانە زەردەکە ورد ورد دەباری.

خەڵکی شارەکە، خوێنگەرمترین و خۆمانەترین خەڵك بوون. لە بەر پێی میوان دەبوونە تنۆکێك ئاو. هەر دەتگوت هەژاری تێدا نییە و دەستڕۆیشتووەکانی جوامێر بوون. نیعمەت و بەرەکەتەکەی بە پێی فیلان بوو. دیار بوو خەڵکی شارەکە هەمووی لە کۆنەوە بەختەوەر ژیاون. جگە لە مەرگ گلەییان لە هیچ شتێکی دیکە نەبوو و مەرگیش لەو شارەدا ناجوان و ناشیرن دیار نەبوو. ڕێبوارەکە وای بیر دەکردەوە.

ڕەوە ئاسکێك لە بەر چیای حەمیتەوە بە لەنجە و لار بەرەو ئاناوەرزا دەچوون. سوارەکان و سوارەی ئەسپی شەودێزی پێشەنگیان، پەیتا پەیتا دەهاتن و لە دەرەوەی حەوشەی کۆشکەکە بە ریز ڕاوەستان و وێکڕا هەرایان کرد:"ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان... ئاخۆ هەر بۆ گیانێکی سووك و بێ قیمەت ئاوا سەرت شۆڕ دەکەی."

دەنگەکانیان کپتر و لێڵتر لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاوە دەنگی دایەوە.

سوارەکان تاوێك هەر وا نەڕاندیان و زایەڵەی دەنگی خۆیانیان بیستەوە کە وەك لافاوێك بە شیو و دۆڵەکاندا دەکشا.

پیرە ئاشق (ژەنیار)ـێك بەسەر سازەكەیدا نوشتابۆوە و خەریكی ژەنینی بوو. گرووپێك توركمان، لە سەرووی ئاق یۆلەوە كە، جیاز و كەژاوەی وشترەكانیان لە بەرە و مافووری چنراو و زینی ئەسپەكانیان توركمانی بوو و شان بە شانی كیژۆڵەی تاسكلاو بەسەر، بەرەو كوێستان دەڕۆیشتن.

ئاسكەكان رەوەیەك بوون، بوونە دوو رەوە. دوو رەوەكەش بوو بە سێ و چوار و پێنج رەوە. هەر هەموویان لە دۆڵە سووریاو و ئەرخەوانییەكەی باغە هەڵچووكەی چیای حەمیتەوە وەك ئاوێكی سوورباو بەرەو دەشتەكە دەخوشین. وەك لافاوێكی درێژ و هەراو و هەڵچوو و خرۆشان بەرەو جەیهان و دەشتەكەی ئاناوەرزا و حاجیلار و دۆملۆقەڵا بەڕێوە بوون. چاوت لە هەر لایەك دەكرد، رەوەیەك ئاسكت دەبینی كە لە لای تۆپراق قەڵاوە بە لەنجە و لار بەرەو بەكرلی دێن و بە چاوگێڕانێكی دیكە دەتدی كە لە خوارووی كووزانەوە بەرەو كێڵگەكانی ماش و نیسك داگەڕاون.

چوكووراوا لە سەرەتای رەشەمێدا پڕ دەبوو لەو ئاسكانەی كە لە لای خوارووەوە، لە بیابانەكانەوە دەهاتن. ئاسكەكان دەهاتنە هۆبە و هەوار و گوندەكان و تێكەڵی پەز و مێگەلان دەبوون. وەختایەكی دەیان هەزار ئاسك وەك شەپۆلێكی گەورە لە دەریای نێوەڕاستەوە وەڕێ دەكەوتن و بە داوێن و بنارەكانی تۆرووس وەردەبوون و لەوێشەوە دەچوونە دەشتاییەكەوە و ئەوجار بەرەو عەرەبستان رۆیون. راوی مامز لە كۆندا لەو چوكووراوایە گوناح بووە و كەس ئازاری نەداون.

یەكەم جار ئەفسەرێكی عوسمانی بوو كە لەوێ مامزی راو كرد. بە دوای ئەودا بەگە بێ دایك و بابەكان لاساییان كردەوە. دوای ئەوانیش نۆكەر و كارەكەری بەگەكان.... و ئەوجار گوندییەكان و هەر كەسێكی دیكەش ـ ئای خۆزگە كابرای عوسمانی دەستی لە جومگە بووبایەن و وەجاغی كوێر بووبایەتەوە، خۆ كوێریش بۆوە، و جووقەواری نەما.... و بەو جۆرە بوو كە ئەو چوكووراوایە مامزی لێ نەما. ئەوانەیش كە نەگیران و راو نەكران و بۆی دەرچوون، لێیان دا و رۆیشتن و روویان لە بیابانەكانی خۆیان كرد.

ساڵی رابردوو، پێنج ئاسك لە دەوروبەری رەوەزەكانی ئاناوەرزا بینران كە لە رەوەكەیان دابڕابوون و رێیان هەتڵە كردبوو. باشە چۆن مابوون؟ یان كەنگێ و لە كوێوە هاتبوون؟ زۆر پێ ناچێ ئەوانەش راو دەكرێن. ئاسكەكان لە بناری چیای حەمیتەوە لە دۆڵی باغە هەڵووچەكەوە وەك بڵێسە هەڵدەستان. هەتا چاو هەتەری دەكرد هەر ئاسك دیار بوو... دەشتەكە و داوێن و

بنارەکان و شیو و دۆڵەکە، لە بەر ئاسك بڵێسەی دەدا. قەڵەمبازی وایان دەدا .... هەزاران ئاسك هەر کامە و وەك بڵێسەیەك بەرەو رەشایی و کەسکی و تاریکاییەکی خەستی هەزاران ساڵە بازیان دەدا و سەدان هەزار کەوانە بڵێسە لە هەوادا دەدرەوشانەوە. ئەوجار وەك بایەك شەپۆلیان دەدا و شەپۆل ئاسا ئەمسەر و ئەوسەری دەشتەکەیان دەبڕی.

سوارەکە رۆیشت و گەیشتە بناری چیای حەمیتە و لەوێ راوەستا. سێبەرەکەی تێك چڕژابوو و وەك پەڵەیەکی رەش بە سمی ئەسپەکەیەوە نووسابوو.

سوارەکە دەستی بە شەویلگەیەوە نابوو و بە بیرێکی قووڵدا چووبوو. وەك بەردێك بێجووڵە چەقیبوو. ئەسپەکەیشی نەدەجووڵا. تەنانەت کلکیشی نەدەبزاوت. جیا لەو سوارە هیچ شتێ بە دەشتەکەوە نەبوو. بێدەنگی و بێجووڵەیی باڵی بە سەر دەشتەکەدا کێشابوو. کزەی بایەکی نەدەهات. تاقە سوارەکە بە سێبەرە وەك بەردەکەیەوە لە سەر جێی خۆی وشك ببوو. ترۆپکی رەوەزەکانی ئاناوەرزا بە پوولەکە رەشباوەکانییەوە بریقەدار و دووکەڵاوی دیار بوو.

لە ناخی بێدەنگی و بێجوڵەییەکەوە، یەك بە یەك کۆمەڵێك سوار پەیدا بوون. دوای پەرش و بڵاوبوون و کۆبوونەوەیان لە دەشتەکەدا ئاخرییەکەی بەرەو کۆشکەکە هاتن و لە بەرانبەریدا کۆزیلکەیان بەست. ئەسپەکانیان و بۆخۆیان و سێبەرەکانیان کە کەوتبووە تەنیشت ئەسپەکانیانەوە، هەموو رەش دەچوونەوە.

"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، ئەتۆ ناتوانی ئەوە لە ئەستۆی خۆت داماڵی. ئەمیر سوڵتانمان وێدەوە. ئەوە ساڵێکی رەبەقە کە لە بیابانی عەرەبستانەوە هەتا ئێرەی بە شوێنەوە بووین. دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، یان گیانی ئەومان پێ بدە یان گیان لە ئێمە بستێنە و بمانکوژە. دەروێش بەگ، دەروێش بەگ."

گەردەلوولێکی نارنجی لەو لاوە هەستا. لە لای سەرووی تۆپراق قەڵاوە دەسووڕایەوە و گێژی دەدا و گەورەتر دەبۆوە و گێژی دەدا و جار بە جاریش نارنجیتر دەبوو. گەردەلوولەکە لە چاوترووکانێکدا هات و لە بناری چیای حەمیتەدا راوەستا و لە سەر جێی خۆی سووڕایەوە و گەورەتر بۆوە.

تاوێك دواتر گەردەلوولی نارنجیی دیکەش لە دەوروبەری تیلکی بوجاغییەوە هاتن. زۆرتر بوون و لە دەوری چیای حەمیتە دەستیان کرد بە سووڕانەوە.

کۆڵەکە نارنجییە وەستاوەکەی بناری چیای حەمیتە سامناکتر، بە سەر سوارەکەدا تێپەڕی، ئەوجار دەیان هەزار ئاسکی هەڵگرت و وە حەوای خستن و بەرەو چیاکانی تۆرووسی بردن کە دەتگوت پەردەیەکی تەنکی شینە و کەوتووەتە نێوان ئاسمان و چوکووراواوە.

ئەو شارە گەلیٚ ئەسپی جوانیشی تێدا هەبوو. ئەسپی عارەبی، "سەقلاییی" رەسەن و لە هەموو رەنگێك. رەش و سوورە بریقەدارەکەی، سوورەکەی، خۆڵەمێشییەکەی، ........

رەنگی ئەسپەکانیش لێرە جیاواز بوون. تووکی ئەسپەکان هەر بریقەیان دەهات و چاوەکانیان وەك چاوی مامز دەتگوت کلیان تیٚ کراوە.

دەروێش بەگ، دەورێش بەگ، ئەو زوڵمەمان لیٚ مەکە. ئەمیرمان رادەست بکە. بیدە دەستمان. خۆ هەتا ئەمیر نەستێنین، بە خوای ئێسقانەکانیشمان لیٚ بڕزێن، لەو چوکووراوایە نارۆین. یان ئەمیر دەگرین یان هەر لێرە دەمرین."

ئەمیر کەڵەگەت و جوانچاك بوو، چاوەکانی هەر زگماك دەتگوت قەڵەمت کێشاون. وەك ئەسپی عارەبی مەچەکی باریك بوون. قامکەکانی درێژ و وەك قامیش و نێوقەدیشی باریك بوو. لە مەودای چل مەترییەوە ناوی خۆی بە فیشەك لە سەر دەرگاکەی بەرانبەری دەنووسی. ئەوەندە خۆمانە دەستی پیاوی دەگوشی و ئەوەندە بە لەبز و زمانێکی خۆمانە دەیدواندی، دەتگوت هەرچی ئەشق و خۆشەویستیی ئەو دنیایەیە لە دڵی ئەودا کۆ بوووەتەوە. کە دەیگوت براکەم، هەزار براکەمی دیکەی لە زاری دەهاتە دەریٚ. پاڵی بە چنارەکەوە دابوو، تفەنگە سەدەفکراوەکەی بە دەستییەوە بوو. لە بەر خۆیەوە بە دەنگێکی گەرم و خۆش سەردولکەی دەچڕی و هەتا بەیانی هەر دەیچڕی و دەیلاواندەوە.

"دەورێش بەگ، دەروێش بەگ، باشە ئەتۆ تۆسقاڵێکت ئینساف هەیە؟ بابە هەر بۆ ساتێك هەر هێندەی چاوتروکانێك ئەمیر سوڵتان بێنە دەریٚ با بزانین وەزعی چۆنە؟ دەروێش بەگ، دەروێش بەگ..."

بارانە زەردەکە کردبوویە با و بۆران.

کابرا بە دیتنی ئەو شارە جوانە و ئەو بنیادەمە باشانە، ئەو ئەسپە جوان و رەسەنانە سەری سووڕ ما. لەو شارەدا بار و بنەی خست و گیرسایەوە. دواتر لێی رۆیشت. دوای ئەوەش دەچووە هەر جێیەك و هەر کەسێکی دەدی، سالانی ساڵ هەر تاریفی ئەو شارە و ئەو بنیادەمانە و ئەو ئەسپانەی کرد. ساڵ و عەیامێك هەر باسی لە سەرسووڕمانەکەی خۆی کرد و هەموو ئینسانەکانی شێت و شەیدای ئەو شارە کرد.

پیاوە پیرە ردێن لوول لوولەکە لە ئەسپەکی دابەزی. ئەژنۆی دادا و لە سەر ئەژنۆ هەتا بەر دەرگای حەوشەکە هات. دەسبەجێ دەرگاکەیان لێ کردەوە. کابرا لە سەر چۆکان وەژوور کەوت و لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و کە گەیشتە دیوەخانێ، شیری لە کێلان دەرکێشا. دەروێش بەگ خزیبووە قوژبنێکەوە و بە چاوە زەق بووەکانییەوە پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو و چاوەڕوان بوو. کابرای ردێن لوول هەر چاوی پێی کەوت، ئامبازی بوو و رێك لەو کاتەدا تەقەی فیشەکێك هات. کابرای ردێن لوول گرمۆڵە بوو و کەوت و لە سەر بەڕەکە تخێڵ بوو و شمشێرەکەشی لە تەنیشتی کەوت.

ردێن لوولەکەی، شەلاڵی خوێن بوو. بۆنی خوێنێکی گەرم، کەفاوی و زەرد دیوەخانەکەی داگرت.

کابرا ریش لوولەکە، چەند جارێك زاری داپچڕی و ئیتر لێکی نا. دەتگوت دەیەوێ شتێك بڵێ و ئاخرییەکەشی گوتی:"ئەو پیاوەمان بدەیە دەروێش بەگ، ئەگینا دەبێ هەر هەموومان بکوژی. چارەی دیکەت نییە. ئاخرییەکەی خۆیشت دەکوژرێی. ژنەکەشت، کچەکەشت و کوڕەکەشت و هەرچی لە تۆ کەوتووەتەوە هەر هەمووی دەکوژرێ. کۆشکەکەشت کاول دەبێ و هەنجیری لە جێیەکەی دەڕوێ. دار هەنجیری وای لێ دەڕوێ کە ئەگەر سێ پیاو باوەشی پێ دا بکەن دەستیان لێی ناگاتەوە یەکتری. ئەو کابرایەمان بدە دەستی."

خوێنەکەی فیچقەی کرد. لە ناکاو هەستایە سەر پێ و شمشێرەکی هەڵگرتەوە.

دەروێش بەگ لە بن لێوانییەوە گرماندی:"هەڵیگرن و فڕێی دەنە دەرەوە."

کابرا لە سەر چۆکان حەوشەکەی بڕی و وەدەر کەوت. هەزاران ریشۆڵە کە خاڵی سپی سپییان بە باڵ و سینگەوە بوو، بریقەدار و بە فڕە فڕ لە ئاسمانێ وەدەر کەوتن. دەنگی تەورەکان. سەد هەزاران زەرنەقووتەی دەنووك زەرد لە هێلانەکانیان ملیان کێشا و زارە دەور زەردەکەیان تەواو داپچڕی و کردیانە قیامەتێك هەر مەپرسە. پیاوە تەور بە دەستەکان ماوەیەك بوو هاتبوونەوە نێو چنارستانەکە. سوارەکانیش بەرەو دارستانەکە رۆیشتن. شەو، دیار و نەدیار. ئاگرێك لە ناخی دارستانەکەدا کرایەوە و بڵێسەکەی لە دارەکان پتر هەڵکشا. دارستانەکە لە دووکەڵێکی خەست و چڕدا رۆچوو.

پیاوەکە زۆر پیر بوو. رۆژێك لە رۆژان بە خۆی گوت پێش ئەوەی بمرم و ماڵاوایی لەم دنیایە بکەم، وا باشترە خۆم بگەیێنمە ئەو شارە جوانە و جارێکی دیکەش ئەو خەڵکە باشە و ئەو ئەسپە رەسەنانە ببینمەوە و جا بە دڵێکی خۆشەوە دەست لەو دنیایە بەردەم.

وەڕێ کەوت و قۆناغ بە قۆناغ ڕۆیشت و ڕۆیشت و ئاخرییەکەی بەرەبەری بەیانیی ڕۆژێکیان گەیشتەوە شاری خەڵکە باش و ئەسپە جوانەکان.

ئەسپەکان و خەڵکەکە لە قوڕێ چەقیین و لە بەر قرچەی هەتاوێ وشك هەڵاتن. مووی ئەسپەکان و جلوبەرگی بنیادەمەکان لە بەر تیشکی تاوەکە وەك دار رەق و وشك بوونەوە. شمشێرەکانیان، تفەنگەکانیان و لغاوە زیوکفتەکانیان و کڵاوە زێڕینەکانیان و عابا دەورچنراوەکانیان، جلوبەرگ و رەخت و زینەکانیان هەر هەموو لە بەر تاوەکە وەك وشکەڵیان لێ هات. سەروقژ و پێستی بنیادەمەکانیش لە بەر قرچەی تاوەکە وشك هەڵاتن. شمشێرەکانیان راکێشا و پەلاماری کۆشکەکەیان دا و لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە هروژمیان کرد. هەموو نێو کۆشکەکیان پێك دادا و هیچیان نەدۆزییەوە. هەموویان سەنگ و سووژن دا، بەڵام کەسیان دەست نەکەوت.

"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، داوات لێ دەکەین..."

سواری ئەسپە وشکەوەبووەکانیان بوون و بەرەو جەیهانێ غاریان دا. بارانێکی زەرد وردە وردە، نەرم نەرم و ورد ورد وەك تۆزێکی نیشتوو لە سەر باڵی پەپوولە، دایدایە بارین.

چاوی ئەسپەکان دەتگوت بڵێسەی گڕن، سوور سوور، وەك مەرجان، وەك بلوور دەچوون. دەتگوت گۆمی خوێنن. لە ئاوەکەیان دا. بە ئاوەکەدا هەتا خواروو، هەتا گەرووی رەوەزەکانی ئاناوەرزا رۆیشتن.

هەڵۆ تیژباڵەکان، باڵە رەشەکانی خۆیان لە بەر تاوەکە و لە سەر ئاوەکە لێك کردبۆوە و لە لایەکەوە بەرە و لایەکی دی دەفڕین. سێبەرەکانیان درێژ ببوونەوە و دەکەوتە سەر ئاوەکە.

ئەمیر سوڵتان چاوی هەڵێنا. تنۆکە فرمێسکێك کەوتبووە سەر ردێنە مەیلەو ڕەشەکەی و هەر دەهات و درشتتر دەبۆوە...

چی دیتبوو؟ شارەکە خۆ شاری جاران نەبوو و خەڵکەکەشی خەڵکەکەی ساڵان نەبوو. ئەسپەکانیش هیچ ئاسەواریان لێ نەمابوو. هەموو شتێك گۆڕابوو و هەموو شتێك بە شێوەیەکی دیکە بوو.

سوارەکان بە هەشتاو و پڕتاو هاتن و پەلاماری کۆشکەکەیان دا. شمشێرە لە کێلان دەرکێشراوەکانیان لە بەر تاوەکە بریسکانەوە و درەوشانەوە. نەڕە نەڕێکی سامناکیان وەڕێ خستبوو. رەوەزەکانی ئاناوەرزا دەنگیان دەدایەوە و دەنگەکەیان دەشتەکەی دادەگرت و کپ دەبوو. کەس نەیدەزانی دەڵێن چی. کەس نەیدەزانی بە چ زمانێك دەنەڕێنن و بە چ زمانێك قسە دەکەن. نەڕاندیان و بە دەشتەکە و دەوری کۆشکەکەدا سووڕانەوە و شمشێریان راوەشاند و تەقەیان کرد و بە

سەر دیوارەکەدا بازیان دا و خۆیان بە ژووریدا کرد. هەموو دەرگا و پەنجەرەکانیان خستە سەر پشت و هەرچی وەدەستیان کەوت هێنایانە دەرێ و لە بەر تاوەکەیان دانا.

لە تاوهەلاتەوە هەتا خۆرئاوابوون، هەر نەڕاندیان:"ئەمیر سولتان، ئەمیر سولتان."

بەرەبەری ئێوارێ خۆیان لە کۆشکەکە فڕێدایە خوارێ. ئەسپەکانیان هێنایە نێوەڕاستی حەوشەکە و دەستیان کرد بە گوڕاندن و نەڕاندن. یەکێکیان کە دەموچاوێکی پان و ردێنێکی ئالۆزکاوی هەبوو، شمشێرەکەی دەرکێشا و بە گۆڕ گوڕ و نەڕاندن لە ئەسپەکەی دابەزی. جێی شمشێرەکەی زاری کردەوە و ئەسپەکەی گەوزی. ئەوجار ئەوانیتریش شمشێریان کێشا و یەك لە دوای یەك لە ئەسپەکانیان دابەزین. کانیاوی خوێن لە جەستەی ئەسپەکان هەلقولێن. نەڕاندیان. حیلەی مەرگی ئەسپەکان و نەڕەی زراوبەری پیاوەکان تێکەلێ بوون. شمشێرە خوێناوییەکانیان بە دەستەوە و تەپۆلکێك لە جەستەی لەتوپەتکراوی ئەسپەکانیان لە نێوەڕاستی حەوشەکە بەجێ هێشت. دەلینگی پانتۆلەکانیان هەلکرد و بە پێخاوسی خۆیان بە دڕکەلانەکەدا کرد و بەرەو جەیهان وەڕێ کەوتن. رووبارەکەی جەیهان لە بەر تیشکی تاوەکەدا وەك زیو دەدرەوشایەوە. درەوشانەوە هەلماوییەکەی هەموو دەوروپشتی خۆی تیشکباران دەکرد. پیاوەکان دەلینگیان هەتا ئەژنۆ هەلکردبوو و شمشێرە خوێناوییە بێ کێلانەکانیان بە دەستەوە و وێکڕا سەردولکەیان دەچڕی و شینێکیان دەگێڕا، هەر دەتگوت ئەوە لە دلی ملیۆنان ئینسانەوە و لەوبەری هەزاران سالەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەمیر سولتان بەخەبەر هات و دەستی بردە نێو گڕە سوورەکەی ئاگردانەکەوە کە لە تەنیشتییەوە دەگڕی. بزەیەك نیشتە دەموچاوە سپی هەلگەڕاوەکەی و لێوە سوور و جوان و ئەستوورەکەی. چاوە رەشەکەی رەشتر بوو و کەسك چۆوە و لە ناخی دلییەوە گوتی:

"ئاخ خ خ خ خ خ، ئاخ خ خ خ خ خ ، ئاااخ."

سەری خستەوە سەر بالیفەکەی و پێلووەکانی لە سەر یەك داناوە. لە دوورەوە، لە قوولایی زەوی و زەمانەوە دەنگی سەردولکە و شینگێڕیی بنیادەمەکان قەلتوبڕ تێکەلاوی حیلەی بەرەو کپبوونی ئەسپە نیوەزیندووەکان دەبوو و دەبیسرا.

"ئاااخ، ئاااخ، ئاااخ."

ئەو خەڵکەی جاری جاران ئەو هەمووە میهرەبان و میوانگر بوون و هەموو قسەیەکیان بە بزە و پێکەنینەوە وەڵام دەدایەوە، تەنانەت سڵاویشیان نەستاندەوە. نەك سڵاویان نەستاندەوە هەر خێسەیەکیشیان نەدایێ*. روخساریان گرژ و نێوچاوتاڵ و چاوەکانیان تار و لێڵ بوون.

چیمەن و سەوزاییە گەورەکانی شاری و دەشتەکەی و کێڵگەکانی و ئاخوڕەکانیشی چۆڵ و بەتاڵ بوون. شوێنەوارێك لەو خەڵکە مامزئاسایە نەمابۆوە.

کابرا لە سەرسووڕمان و پەژارەدا دامابوو. پشتی چەمایەوە. بە شارە کاول و تێکقرماوە کپ و بێدەنگ و خەم لێنیشتووەکەدا گەڕا و گەڕا ئاخرییەکەی پیرەپیاوێکی دۆزییەوە، پیرەپیاوێکی رۆژگارە ونبووەکان. پیرە پیاوە پاڵی بە دیوارێکی رووخاوی کاولەمیوانخانەیەکەوە دابوو و لە بەر بەرۆچکەکە لێی دانیشتبوو. ردێنە چەرمووەکەی چڵکن بوو و مێش و مەگەز لە چاوە سوور و نەخۆش و ریپۆقکردووەکانی نیشتبوون.

باران دەباری. دوخی شمشێرەکانیان شوشتبۆوە و لە نێوقەدیان بۆ سەرەوە رووت بوو. شان و باهۆی بەهێز و ئەستۆ و نێوشانی پان و پتەو و دەستی گەورە و شمشێرە هەڵکێشراوەکانیان ئاگری لێ دەبۆوە. لەگەڵ درەوشانەوەیەکی زەرد باودا، لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە بێ ئەژمار سوار، کە ئەسپەکانیان رووت و بێ زین و لغاو بوون دەرکەوتن.

"ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، ئەتۆ وەجاغمانت کوێر کردەوە وماڵمانت کاول کرد و ئاگرت لە گوندەکەمان بەردا. وەرە دەرێ، وەرە دەرێ، وەرە دەرێ. لە ماڵی ئەو تورکمانەدا خۆت مات مەکە. بچیتە هەر شوێنێکـ، جا ماڵی تورکمان بێ یان کونی مار، هێلانەی هەڵۆ یان لانی گورگ، کوڕە بچیتە چین و ماچینیش، بچیتە بیابانەکەی عەرەبستانیش، دوورگەی سەرەندیب و وڵاتی فەرەنگیش، بچیتە هەر شوێنێك، بچیتە پێدەشتەکانی روسیا و وڵاتی مەغۆلان و بچیتە دنیاکەی دیکەش هەر دەتگرینەوە. بەڵێنمان داوە، بتگرین. پەیمانمان بەستووە و قۆڵمان لێ هەڵماڵیوی. وەرە دەرێ، وەرە دەرێ. ئەوە ساڵێك و سێ مانگی رەبەقە بە شوێنتەوەین. دە هەزار ساڵە، سەد هەزار ساڵە... وەرە دەرێ."

دیسان سەردولکەیان چڕی. شینگێڕییەك کە دەتگوت لە ناخی زەوییەوە هاتۆتە دەرێ. ئەسپەکان بە هەناسەبڕکێوە حیلاندیان و حیلەیان جار بە جار نزمتر بۆوە و کپ بوو و گیانیان هاتە سەر لێوان و گیانیان دەرچوو. پیاوەکان لە ئەسپە رووتەکانیان دابەزین و کەلاکی

---

*خێسەدان: لە گۆشەی چاوانەوە روانین و سەیرکردنی یەکێك. هێمن: ... دیاربوو خێسێکی دابوویە ئەو شۆخە لە بن چارشێوا (ناڵەی جودایی)

ئەسپەکانیان راکێشایە دەرەوە و هەڵیانگرت و تا ئاناوەرزایان بردن و لەوێ بە سەر رەوەزەکانیاندا دان و ئەسپە رووتەکانی خۆیان زین و لغاو کرد و گەڕانەوە و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بە دەوری کۆشکەکەدا سووڕانەوە.

لە پیرە پیاوە خەفەتبارە بێدەنگە ریش چەرمووە قژ چڵکنە دەموچاو نوورانی و نێوچاوان پانەکەی لە بەربەڕۆچکەکە و لە بن دیوارە لارووخاوەکە کرووشمەی کردبوو، پرسیی:" سەردەمانێك ئەو شارە خەڵکێکی زۆر باشی لێ بوو، میوانگر و رووخووش و لاوێنەرەوە و گیانلەسەر دەست بۆ دۆست و برا، ئەسپەکانی زۆر جوان بوون هەموو وەك ئاسك، چاو مەرجانی و مل درێژ و گوێ قوت وەك مراوی. ئەو خەڵکە باشە و ئەو ئەسپە جوانانە چییان لێ هاتووە؟ چییان بەسەر هات؟

پیرە پیاوە جووڵەیەکی کرد و تۆزێ خۆی قیت کردەوە. ردێنە چەرمووە چڵکنەکەی لەرزی و رووناکاییەکی کۆنی لە روخساری گەڕایەوە و ئاخێکی قووڵی لە ناخی دڵی هەڵکێشا.

"ئاااااخ"؟

تاوێك دواتر چاوی هەڵێنا و بەسپایی لێوەکانی بەسەریەکدا خزین:"ئەو بنیادەمە باشانە، سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و لێیاندا رۆیشتن... ئااخ! ئااخ! ئااخ!."

بە سەدان کۆڵەکەی وەك هەوری سپی، نەرم نەرم و درەوشاوە، مەیلەو رەش، نارنجی و خۆڵەمێشی و سوورباو و بەرەز و درێژ هەتا تەشقی ئاسمان، رێك لە کەناری دەریای نێوەڕاستەوە و لە خوارووی پایاسەوە هەستان. هەورە ئاوساو و سپی و تەڕەکان گەواڵ گەواڵ بەسەر دەریای نێوەڕاستەوە بوون. گەردەلوولەکان خێراتر بوون. هەورەکان ئاوسان و خێراتر بوون. بە لوورە لوور و بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر بە بریسکە و بریقەبریق، وەك سایەقە دەشتەکەیان دادەگرت. زەوییان بە ئاسمانەوە دووریبوو، بە هەرکوێدا تێدەپەڕین، دەیانشێواند و دەڕۆیشتن.

گەردەلوولەکان لە پێشدا سوور سوور و دواتر کەسك کەسك و ئەوجار رەش رەش داگەڕان. لە لێوارەکانی لای سەرووی دەشتەکە و سەر رێگەی چیاکانی تۆرووس بە گەردەلوولی بێ ئەژمار و رەش و بەرز تا تەشقی ئاسمان داگیرا. هەموو شتێ لە تاریکاییەکی خەست و چڕدا ون بوو. لە تاریکاییەکدا کە رێگەی لە هەموو رووناکاییەك دەگرت. هەورە رەشەکان لە باشوور و باکوور و رۆژهەڵات و رۆژئاواوە دەهاتن لە ئاسمانی دەشتەکەدا تێکەڵی یەکتری دەبوون و تێك دەچرژان. دەکولێن و دەکولێن. بایەك توند هەڵیکرد. بایەك کە لە پێشدا سارد بوو و دوایی

گەرمی کرد. دەنکە درشتەکان دەنك دەنك و قورس قورس بارین. ئەوجار بارانێکی زەرد و بە خوڕەم دایدا. سوارەکان بە شوێن یەکتریدا ریز ببوون و مەودا مەودا بە دووی یەکەوە و ئەسپەکانیان سەریان بەردابۆوە و بێ هێز و تین بەرەو خوارووی دەشتەکە و بەرەو دۆملۆقەلاّ دەڕۆیشتن.

لە بەر خۆیانەوە چەمەرییان دەگێڕا و دەیانلاواندەوە. باران دەباری. لە سەر کەفەڵی ئەسپەکانەوە ئاوەکە لووزەوی بەستبوو و لە سەری کلکیانەوە دەچۆڕایەوە سەر عەرزی. بریسکەیەکی دا. هەورە تریشقەکە لە رەوەزەکانی ئاناوەرزای دا. قەلاّکە لە رووناکاییەکەدا درەوشایەوە و کوژایەوە. بریسکە و هەورەتریشقەیەکی دیکە ئاناوەرزای کوتا. ئاسمان لە ناخی دڵییەوە گرماندی و دەورێش بەگ دەموچاوی بە دەستی داپۆشی و هەرای کرد:"ئەسپەکەم بۆ بێنن."

سوار بوو. شەودێزەکەی لە چاوترووکانێکدا لە حەوشەکە دەرپەڕی و سوارەکەی کە خۆی بەسەر یاڵیدا نوشتاندبۆوە، وەك با هەتا چەقی دەشتەکەی چوکووراوا برد.

لە دوورەوە، لە پشتەوەی ئەسپەکەوە تەپوتۆزێك هەستابوو. ئەسپ و سوارەکەی و سوار و ئەسپەکەی لە پاناوکی ئاسۆدا بوونە یەك و لە خالێکی رەش دەچوون و خاڵەکە بە داوێنی تەختاییەکەی چوکووراواوە، بە سەر ئەو قوولاّییەوە کە بەردەوام شینتر دەبوو، بەرەو کۆڵەکە تۆزێك کە وردە وردە و سووك سووك لە عەرزی هەڵدەستا، لێی دەخوڕی...

# ٢

لە پەنای رەوەزەکانی قزل گدیك (یاڵە سوور) بە دڵەکوتەوە بۆسەی دانابۆوە و چاوی لەو رێیە هەڵنەدەگرت کە وەك پەتێکی سپی بە دەشتەکەدا کێشرابوو. چاوەکان لە چاوی تووڕە و ترساوی گورگێکی برسی دەچوون. چاوی نەدەترووکاند.

قزل گدیك کۆمەڵە رەوەزێك بوو، چەپەك و پڕ لە مارمێلکە. مارمێلکەی گەورە گەورەی پشت مل قەڵشیو، کە بە زمانە سوورەکەیان دەست و پێی خۆیان دەلستەوە.

شەمشەمەکوێرەکان لە تاریکایی و بوولێڵەکەدا بە فرە فڕ وای لێ نزیك دەبوونەوە دەتگوت ئێستا خۆ بە لووتیدا دەدەن.

پتر لە یەك دوو نەفەر بەو رێگایەی هەموو رۆژێدا تێنەدەپەڕین. ئەوانیش زۆربەی جاران بە پێیان و جار جاریش بە سواری کەر. ئەسپ سوار بە دەگمەن دەبینرا. لووتی رێبوارەکە پڕ بە چنگێك دەبوو. لووتێکی پڕ لە موو، مووە رەشەکانی لە کونە تفنکییەوە هاتبوونەدەرێ و لە دوورەوە دیار بوون.

ئاخر و ئۆخری بەهارێ بوو. تەپوتۆزی رێیەکە هێشتا وا نەبوو بگاتە گوێزینگان و کە هەڵدەستا زۆر نەدەمایەوە. کەسکاییەکی نەرم بە گژ و گیا و قامیشەڵان و شیناوەردەکەوە بوو.

مێشوولە و تەپۆ لە سەر و چاوی دەنیشتن. مێشە گەورە کێوییەکان، وایان پێوەی دەدا خوێنیان لێ دێنا و جێی چزووەکەیان لیری دەکرد.

شەیتانۆکەکان بە شاخۆکە سپی و زەرد و کەسك و شینەکانیانەوە لە بەر رووناکاییەکەی بەیانی گێژ و وڕ، تەوەزەلانە بە سەر رەوەزە خاڵ ئەرخەوانییەکاندا دەهاتن و دەچوون.

دەنگەکان لە شەوێدا تێکەڵاو دەبن. دەنگی شەو، دەنگی باڵندان، دەنگی تەراکتۆرەکان... دەشتی پڕ لە ئەستێرە. بۆنی مازوو لە دوورەوە دێ و لەگەڵ بۆنی زۆنگاو و کێڵگە وشکبووەکان و گوڵی وشکەڵاتوو و تەپوتۆز و بزنگرە تێکەڵاو دەبن.

لە گەڵ تاو هەڵاتێدا لەو عەرزە کپ و بێدەنگەدا دەبێتە قیامەتێك هەر مەپرسە. هەرچیی گیانلەبەرە لە هێلانەکانیان دێنە دەرێ و نوقمی هەوڵ و تێکۆشان و جۆش و خرۆشن. لەگەڵ ئاوابوونی خۆر هەموو دەخزێنەوە هێلانەکانیان، یان لانیکەم لە بەر چاوی ئەو کابرایەی لە قزل گدیك چاوەڕوانە، وا دیارن.

لەگەڵ بۆن و بەرامەکان دەنگی سەیر و سەمەرەش لە زۆنگاوە دوورەکانەوە دێ. زۆنگاوەکان وەك مەنجەڵێك زەبەلاحی هەلیماو (شلەی ساوار) لە سەر ئاگرێکی خۆش، قوڵتە قوڵت دەکوڵێ.

کەنگرە دڕکاوی و بۆرەکەی چوکووراوا، لە نێو ڕەوەزەکاندا، لە تەم و مژ و کزەبای بەرەبەیاندا زوقمی لێ نیشتووە.

دڕکە تیژ و ڕەقەکەی کەنگرەکەی لە سینگی ڕۆچوبوو و ئەو هەر گوێشی پێی نەدەبزووت. تیریژی خۆرەتاو، دڕك بە دڕك کەنگرە کێوییەکەی بڕی. گوڵە مۆرەکانی وەك بلووری وردوخاشکراوی شووشە، دەدرەوشانەوە. نێرکی کەنگرە کێوییەکەی لە دڕکەکانی لێکردەوە و خواردی.

ئەو ڕێگەیەی بە سەر سینگی دەشتەکەدا کشابوو، دەچۆوە بناری تۆرووس. گژ و گیای دەم ڕێگەکە و تۆز و خۆڵ و ڕێبوارەکانی و دڕك و قەڵغانە تۆزلێنیشتووەکانی کە ئەمڕۆ و سبەی گوڵیان دەردەکرد، هەر هەمووی لە مێشکی خۆیدا ڕادەگرت. هێڵێکی سپی و باریك بە سەر سینگی تەختایی دەشتەکەدا دەتگوت بە قسڵ کێشراوە، ڕێك وەکوو هێڵێکی بە سەر کاغەزدا کێشرابێ، هیچ لە ڕێگە نەدەچوو. دەتگوت قوتابییەکی منداڵ هەر بۆ ئەوەی دەشتەکە چۆڵ نەبێ و نەخشێکی پێوەبێ، چووە سەتڵێکی پڕ کردووە لە قسڵ و ئەو هێڵەی کێشاوە.

دەمەدەمی ئێوارێ، تەمێکی نەرم و ناسك لە سەر دەشتەکە نیشتەوە. هێڵە سپییەکە کەوتە بن پەردەی تەمەکەوە. ئەوجار مانگ هەڵات. هێڵە سپییەکە لە بەر تریفەی مانگەشەوەکە دەرکەوتەوە. جوان و سیحراوی. دوای تاوێك دەستێکی نادیار ئەو هێڵە سپییەی لە سەر سنیگی دەشتەکە دەسڕییەوە و ئەویش لەو ترسانە، زراوی دەچوو.

له سەر جێیەکەی خۆی حەجمینی نەبوو. ئەی ئەگەر نەهات؟ یان ئەگەر لە ڕێیەکی دوورەوە ڕۆیشت؟ یان خزم و کەسەکەی درۆیان لەگەڵ کردبێ؟... نا، نا، شتی وا نابێ. ئەمجارە هەر دێ. ناکرێ نەیە. ئیتر بەسە. دەبێ کۆتایی بەو کارە بێنن.

پاسارییەکان لە سەر ڕێگە دەنیشتنەوە. باڵندەیەکی گەورەی وەك هەڵۆ باڵەکانی لێك کردبوونەوە و خۆی بە دەستی بایەکە ئەسپاردبوو و لە تەشقی ئاسمانێدا لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دیکە دەڕۆیشت. سەری بەلایەکدا خوار کردبۆوە و چاوی لە سەر ڕێیەکە هەڵنەدەگرت. ئەو باڵندەیەش چاوەڕوان بوو. بەبێ ئەوەی باڵ ببزێوێت و بجووڵێت.

سێ گوندی بە دوای گوێدرێژەکانی خۆیاندا هاتن و ڕابردن. هەر سێکیان پێخاوس بوون.

"بە کوێرایی چاوتان، هەی سەی برسی، هەی کۆیلە و دیل و ژێرچەپۆکەیینە، خوا ئێوەی هەر بە دیلی خولقاندووە. خودا بەدیلی خولقاندوونی و کردوونی بە ئاغای ئەو بوونەوەرانە. هەی ئەو ئاغایەتییەتان سەرتان بخوا یا خوا."

هەڵدەستێتە سەر پێیان. لە نێوقەدی بەرەو خوار، لە پەنای ڕەوەزەکەدایە. پووش و پەڵاش لە سەر و رووی نیشتووە و ئەژنۆکانی دەزیڕێنن. دەست و پێی ڕاستەی تەزیون. لە دوورەوە بە دەشتەکەدا، تەپوتۆزێك گێژی دەدا. بێ و نەبێ سوارێکە. دڵە کوتە دایدەگرێ.

پشتی سڕ دەبێ، ڕێك وەك لەتە لبادێك. دەڵێی هەموو گیانی ڕەق هەڵاتووە و بووەتە سەهۆڵ. لاقەکانی و پشتی و سەلکی سەری و ملی، هەر هەمووی دەڵێی ڕەق هەڵاتوون و بە خۆیەوە نین.

دەستەکانی زل زل، قامکەکانی درێژ و زەرد. دەستە بێ تینەکانی بەولاولای جەستەیدا شۆڕ بوونەتەوە و وەك دەستی مردووان سارد و موچڕکە...

دەستی ڕاستەی تینێکی تێگەڕا، وەك دەستێکی لە گۆڕەوە هاتبێتە دەرێ. قورس بوو وەك تاتە بەردێك. هەژا و دەسکی دەمانچەکەی دۆزییەوە. "بیلیك"ـێکی بریقەداری بۆلگاری بوو. دەستی چەپەی زۆر شارەزایانە سەری لوولەکەی گرت. تۆپەی دەمانچەکەی بەخێراییەوە سووڕا و فیشەکەکانی وەك ئاوێکی هەڵقوڵێ، بەربوونەوە بەر دەمی. دەستە ڕاهاتووەکانی دیسان دەسبەجێ فیشەکەکانیان خستەوە نێو تۆپەی دەمانچەکە. فیشەکەکان ئەوەندە بەخێرایی لە دەستییەوە دەخرانەوە نێو تۆپەکە، دەتگوت تێك دەئاڵێن. لەوانەیە لە سەر ئەو زەوییە دەستێکی دی پەیدا نەبێ کە ئاوا بە خێرایی و لێزانانە دەمانچە پڕ و بەتاڵ بکاتەوە.

دەمانچەکەی دەنگێکی لێوە دەهات هەر دەتگوت ئەوە ماسوورە*یەکە[*] و بێ پسانەوە کار دەکا... فیشەکەکان ماوەیەك هەروا لە نێوان دەمانچە و دەستەکانیدا وەك ماسوورە هاتن و چوون. دەنگەکەی لە دەوروپشتی خۆی دەنگی دایەوە. ئەوجار لە ناکاو راوەستا. دەمانچەکە کەوتە لایەك و دیسان دەستەکانی بەملاولایدا شۆڕ بوونەوە.

بەری هەڵێنا. لە بەر تیرێژی تاوەکە هێڵگەلێکی بریقەداری وەك دەماری لە سەر روخسارە تەڕ و ئەرخەوانییەکەی رەوەز و بەندەنەکەی قزل گدیگ دەدرەوشایەوە. چاوەکانی لە شوێنێك بڕین. هەورێك لە سەر دەشتەکە نیشتەوە. سێبەری هەورەکە رێگە سپییەکەی شاردەوە.

تاوەکەی گەرمتری کرد، دەنگی زەردەزیڕە و جیکەجیکە بەرز بوونەوە. تاوەکە بەردەکانی وا سوور کردبۆوەە کە وەك ئاگرێکی سوورەوەکراو سەری پەنجەیان دەسووتاند.

رێگەیەکیش بە لای چەپدا کشابوو، لە دۆملۆ قەڵاوە بەرەو ساری چام. سەدان و هەزاران بزنە رێ و کوێرە رێ... هەر دەتگوت داوی جاڵجاڵۆکەن و لە لکە دارێکەوە کێشراون و رێیەکەی چوکووراوایان پێ تەنیون و تەوپوتۆزێکی خەست خەستیش بە سەر رێگەکانەوە...

تەپوتۆزێك لە دوورەوە و لە خوارووی کووزانەوە هەستا. شتێك لە تۆز و خۆڵەکەدا درەوشایەوە و کوژایەووە. دەمودەست لە جێی خۆی هەستا و چاوی بڕییە تەپوتۆزەکە. تاوێك دواتر تەپوتۆزەکە نیشتەوە و هیچی لێ نەهاتە دەرێ. کابراکە بە تووڕەییەوە خۆی خستە سەر رەوەزەکان و رەوەزەکان ئەژنۆیان وا بریندار کرد کە سپێنەی ئێسکەکانی لە بن پێستییەوە دەرپەڕینە دەرەوە. بە دوای ئەوەدا سەریشی بە سەر رەوەزەکاندا شۆڕ بۆوە. کاکۆڵی شەلاڵی خوێن بوو. بەڵام هیچیشی لە دەست نەدەهات. خوێنەکەی دیار بوو نەیدەویست راوەستێ. بۆنی خوێن گێژ و کاسی دەکرد. بۆنی خوێن، هێڵنج هێنەر بوو.

دەستە شۆڕەوەبووەکانی گورج چوونەوە سەر دەمانچەکە. فیشەکەکان دیسان کەوتنەوە چرکەچرك. خلەخل و چرکەچرکێکی بێ پسانەوە، دەنگەکەیان لەوانەبوو پیاو شێت بکا.

دەستەکانی دیسان تینیان تێکەڕابۆوە.

خۆر گەیبووە تەشقی ئاسمانێ. کا و کلۆش (قەسەڵ)، ئەو درەوشانەوە و بریسکەبریسکەی چاوی لە بەر هەڵنەدەهات بە سەر رێگەکە وەرکرابوون. پیاوێك کە زمانی قولانجێك لە زاری دەرکێشابوو و نوقمی تەپوتۆز و خۆڵ و خاك بوو و مژۆڵ و برۆی لە خۆڵەکەدا سپیی دەچوونەوە

---

[*] ماسوورە: ئەو خولخولەیەی لە بنەوەی مەکینەی بەرگدوورین دەخولێتەوەو دەزووی دوورینی بەشی بنەوەی جلەکان دەداتە دەرزییەکە.

و دەموچاوەکەی تاو بردبووی و بە ڕێگەکەدا دەهات. بڵێی خۆی بێ؟ نا، ناکرێ ئەو بێ. ئەو ئاوا بە زمانێکی دەرکێشراوەوە و لەو گەرمایەدا وەڕێ نەدەکەوت. ئەو پیاوە دەیەوێ بچێ بە جلوبەرگەوە خۆی بە چەمەکەدا بدات.

دەمانچەکەی لە هەوا کەوانەیەکی کرد و لەو لاترەوە کەوتە سەر عەرزەکە.

پیاوێکی دیکە هات و رابرد. دەتگوت سەدان کیلۆ بەردیان بە کۆڵێدا داوە و پشتی لە بن بارستایی ئەو بەردانەدا چەماوەتەوە.

بەردەکان بە قرچەقرچ دەقەڵشین و دەقەڵشین و لە قەڵشتەکانیانەوە وەك بەردی قسلّ دووکەڵ دەهاتە دەرێ.

گۆشتی لەشی لە بەر قرچەی تاوەکە سوور سوور ببۆوە، دەتگوت داغیان پێوەناوە، دەتگوت ئێستا پل پل هەڵدەوەرێ. پشووی سوار دەبوو. شەلاڵی ئارەقە بوو. لە ناکاو هەستایە سەر پێیان و سینگی دایە بەر بایەکە. سوارێك لە دوور دوورەوە پەیدا بوو. سوارەکە هەر دەهات و نزیکتر دەبۆوە. ئەسپەکەی جوان و دڵگر بوو. سوارەکەشی هەر وەتر... دڵی کەوتە کوتە کوت. دەست و پێی کەوتنە لەرزین.

دەستەکانی دەمانچەکەیان پێ نەگیرا. فیشەکەکان لە دەستی بەربوونەوە.

لە رەوەز و بەندەنەکانی قزل گدیگەوە خۆی خستە چەقی رێیەکە. خۆی خستنە سەر رێیەکە و گەیشتنی رێبوارەکە هاوکات بوو. خۆی بوو.

فیشەکێك تەقی و سوارەکە لە ئەسپەکەی بەربۆوە. دەسبەجێ خۆی گەیاندێ و نێوشانی گرت و هەڵیستاندەوە. نیگای لە چاوە لەژێڵلاهاتووەکانی بڕی و لە بن لێوانەوە گرماندی:"نەتناسیمەوە کافر؟"

وەلامێکی نەبیستەوە. چەند حاران پرسیارەکەی خۆی دووپاتە کردەوە، بەلام رێبوارەکە دەتگوت گوێی لە هیچ نابێ.

"چیت لێ هات؟"

متەق لە بەرد هات و لە کابرا نەهات، بەلام پشووی دەدا.

بە رقێکەوە کە سەرچاوەکەی لە تووڕەییەکی کۆندابوو، شانی کابرای گرت و هەڵیستاند و بە سەر پێیانەوە رایگرت. رێبوارەکە وەك دارێکی رزیو کەوتە عەرزی.

"هەستە، هەستە هەی کافر، ئەوە دە ساڵە، پازدە ساڵە، بیست ساڵە، سەد ساڵە چاوەڕێی وەها رۆژێك بووم."

شەقێکی لە کەلەکەی کوتا. نووکی لاقی کەلەکەی ڕێبوارەکەی کون کرد.

"ڕێك سەد ساڵە کە... ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆ..."

بە تووڕەییەوە داهاتەوە و هەڵیستاندەوە. کابرا دیسان کەوتەوە بە لادا.

لە ناکاو بارانێکی بە خوڕەم دایکرد. بارانێکی کەسك. تاریکاییەکی کەسك بە سەردا هات. دووکەڵێك لە ڕەوەز و بەندەنەکانەوە هەستا. بارانە کەسکەکە و دووکەڵە سپییەکە تێکەڵاو بوون و هەتا دوور دوور، تا زۆنگاوەکان دەکشا.

دیسان پڕی دایەوە شانی کابرا. کابرا لە دەستی هەڵخلیسکا و دەرچوو. بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر بەرەو تۆرووس غاری دا. گەیشتیێ و خۆی هاویشتە سەر ملی. کابرا دیسان خزی و دەرپەڕی. ڕاکردنی چیی، دەتگوت بە سەر عەرزیدا دەخزیێ. بارانەکە لە پڕ لێی کردەوە و ئەو دووکەڵەش کە لە ڕەوەزەکانەوە هەڵدەستا، دامرکایەوە.

تاوێکی بەتین و گەرم دەمودەست هەموو وڵاتی هەڵبرینگاند. خۆڵ و خاك و ڕەوەزەکان وشك هەڵاتن و شەقار شەقار بوون. ڕێبوارەکەش سەرتاپای وشك بۆوە. هەڵیستاندە سەر پیێ. ملی گرت و هەڵیستاند و پاڵی بە ڕەوەزێکەوە دا. جلوبەرگەکانی قوڕاوی و شەقار شەقار ببوون. چاوی هەڵنەدەهێنا ، بەڵام پشووی دەکێشا.

لیچ و لمۆزی ئەسپەکەی ڕێبوارەکەش شەقار شەقار ببوو. حەیف بۆ ئەو ئەسپە. ئەسپەکە وەك پەیکەرێك لە جێی خۆی چەقیبوو و نەدەجووڵا. زین و لغاوەکمەی گرت و شەقێکی لە بەر زگی هەڵدا و بەرەڵڵای کرد. ئەسپەکە چەند جاران هەستایە سەر پاشوو و کلی شۆڕ ڕاوەشاند و ئیتر سەری خۆی هەڵگرت و بە تەختایی دەشتەکەی چوکووراوادا غاری دا و لە چاوترووکانێکا نەدیو بوو.

گوێی گرت و لە ڕەوەزەکەی جویێ کردەوە. کافر ئێستا وەخۆ هاتبۆوە. لغاوی ئەسپەکەی لە زاری کرد و زینەکەی لە سەر پشتی دانا و سواری بوو و بەرەو ڕووبارەکە لێی خوڕی. ئاوەکە زۆر زۆر دوور، زۆر لەو لاترەوە دەڕۆیشت و لە دوورەوە دەتگوت زیوی تواوەیە دەدرەوشێتەوە. هەتا نیوەڕۆ و بە بەر قرچەی ئەو تاوەدا بەرەو ئاوەکە لێی خوڕی. بە پەلە بوو. دەترسا ئاوەکە لەو گەرمایەدا ببێتە هەڵم و بچێتە ئاسمانیێ. جار جاریێ دەکەوتنە نێو هەورێکی تەپوتۆزی خەست و گەرم و تاریکەوە کە وەخت بوو بیانخنکێنیێ. گەیشتنە دڕکەڵانێك. چارەوییەکەی ملی بادا و نەیویست بچێتە دڕکەڵانەکەوە و سوارەکە بە سپایی خەنجەرەکەی لە بەر پشتوێنی دەرکێشا و نووکە تیژەکەی لە سمتی کابرا ڕۆکرد. "چارەوی" خۆی هەڵاویشت و وەنێو

دڕکەڵانەکە کەوت. دەمەدەمی ئێوارە بوو کە لە دڕکەڵانەکە هاتنە دەرێ. لە نێوقەد بۆ خوارێ گیانی "چارەوییەکە" شەڵاڵی خوێن بوو.

ماوەی نیوسەعاتێکیش بە نێو پێکوڵ و بزنگڕەکەدا ڕۆیشتن. خوارەوەی لەشی کابرا هەمووی بوو بە بزنگرە. ئەژنۆکانی دەتگوت دەلەرزن. ئەو جار گەیشتنە مێرگێك. لە تەنیشت مێرگەکە "چارەوییەکە" نەیتوانی بڕوات و لە پێ کەوت و لە سەر عەرزەکە لێی تخێڵ بوو.

"نـ...ا، نا، گاڵتەی ئاوامان نەبوو. هەستە، دەی هەستە، نا، نا، شتی وا نابێ. ئەگەر وەڕزم بکەی، ڕووت ڕووتت دەکەمەوە ئینجا بە نێو قانگەڵاشەکاندا لێت دەخوڕم. دەی هەستە پاڵەوان. هەستە و وەڕێ بکەوە. ماتڵم مەکە. ڕاوەستە با بزانم چۆن چۆنی بتکوژم باشترە؟ چۆناوچۆن؟ ڕاستییەکەی نازانم چۆن بتکوژم. ئەوە بیست ساڵی ڕەبەقە بیر لەوە دەکەمەوە و ئێستاشی لەگەڵدا بێ نەگەیشتوومەتە مەرگێك کە شایانی تۆ بێ."

فیشەکەکانی ئەوەندە خێراخێرا دەستاودەست دەکرد سەرت لێی سووڕ دەما. فیشەکەکان ئارەقاوی بوون. دەمانچەکەی هەڵگرت و لە چاوترووکانێکا پڕی کرد و دیسان هەر وا بە خێراییەوە بەتاڵی کردەوە.

کابراکە لە سەر عەرزەکە کەوتبوو و ئەو چیی هەوڵی دا نەیتوانی هەڵیستێنێتەوە. بۆیە دانیشت و پێڵاو و گۆرەوییەکانی لە پێی داکەن و بە نووکی خەنجەرەکەی نەرمایی گوێچکەی کون کرد. کابرا لە تاوان جنگڵی دا و گرمۆڵە بوو، دەرپەڕی و خۆی بە دڕکەجاڕەکەدا کرد و وەك شێتان غاری دا. گرتییەوە و دیسانەکە لغاوەکەی لە زاری خستەوە و زینەکەی لە سەر پشتی دانایەوە و سواری بۆوە. کافرە غاری دەدا. هەر بە کافر بانگی دەکرد. ناوەکەی لەبیر چووبۆوە. لەوانەیە لەبیریشی نەچووبێتەوە. بێزی لە ناوەکەی هەڵدەستا. کافر، خۆی بە سەر تەرمەکە دڕکێکدا دا و شەڵاڵی خوێن و لە تاوان خۆی بە تەرمەکە دڕووەکەدا کرد. لاقی گرت و کێشایەوە دەرێ. وەك هەزاران کانی، خوێن لە گیانی هەڵدەقوڵی. خۆڵی بە برینەکانییەوە کرد. خوێنەکە خۆڵەکەی کردە قوڕ و قوڕەکەش لە بەر تاوەکە وشك بۆوە. هەڵیستاندەوە. کافر جارێکی دیکەش بۆی دەرچوو. کافر ڕای دەکرد و ئەویش سەری لە دوو نابوو. کافر بە پێخاوسی زۆر توند ڕای دەکرد. پانتۆڵی کافرەکە، کە لێواری گیرفانەکان چنرابوون، دڕا. ڕانەکانی دیسان شەڵاڵی خوێن بوونەوە. ئاخرییەکەی کافرەی گرتەوە و لە حاڵێکدا کە بە دەوری گیشە دڕکێکی گەورەدا دەخولایەوە، گرتییەوە و خۆی هاویشتەوە سەر ملی و وەبەر قەمچییانی دا. لغاوەکە شەویلگەی کافری هەڵدڕیبوو. تاریکان بەسەردا هات. لە

دڕکەجاڕەکەدا دانیشتن. ئەگەر کافرە لە تاریکایی شەوەکەدا دەرپەڕیبایە، ئیتر قەت نەیدەگرتەوە. سەری هەوسارەکەی لە مەچەکی خۆی گرێ دابوو و بە دڕکەڵانەکەدا دەڕۆیشتن. کافر دەنووزایەوە و دەنگی کڕووزانەوە و نووزانەوەکەی دەگەیشتە ئاسمان.

هەتا ڕۆژ بۆوە، هەر وا بە دڕکەڵانەکەدا گەڕان. کە تاو هەڵات، لێی ڕوانی و کافرەی دی کە ڕووت و قووت بوو و هەموو گیانیشی شەڵاڵی خوێن. تینی تێدا نەمابوو. کەوتبوو. لێوەکانی شۆڕ ببوونەوە و گوێچکەکانی لەتوپەت ببوون.

کە لە دڕکەڵانەکە هاتنە دەرێ، بەرەو بژوێن و گژ و گیایەکە وەڕێ کەوتن. کافر خۆی خستە سەر خۆڵ و خاکەکەی سەر ڕێیە. هەموو گیانی خوێنی لێ دەچۆڕایەوە. کافر کە کەوتە سەر عەرزەکە، دەمودەست دەنگ و پشووی بڕا. یانی مرد؟ ئەی ئەگەر بمرێ؟ دەتگوت بەندی دڵی پسا. کافر نەدەبوو وا سووك و سانا بمرێ.

دەسکی دەمانچەکەی بە هەموو هێزی خۆیەوە گوشی و ئەوجار دەستی کردەوە بە پڕکردنەوە و بەتاڵکردنەوە. بەهۆی لەرزینی دەستەکانییەوە نەیدەتوانی وەك پێشوو گورج و گۆڵ فیشەکەکانی پڕ و بەتاڵ بکاتەوە.

داهاتەوە و گوێی بە دڵییەوە نا. لە خۆشیان گەش بۆوە. بە دەنگێکی پڕ لە زایەڵەوە گوڕاندی:"ئەتۆ ئاوا سووك و سانا نابێ بمری کافر."

ئەگەر پێی عەیب نەبوایە و موچڕکەی بە گیانیدا نەهاتبایە لەو کاتەدا لە خۆشیی ئەوەی کافر هێشتا نەمردووە، باوەشی پێدا دەکرد. سەری هەوسارەکەی بە دەستی چەپییەوە گرت و بە دەستی ڕاستەی دەستی کابرای گرت و بە دوای خۆیدا ڕایکێشا. ئاخرییەکەی ماندوو بوو. دەستەکانی کافرەی بە پەتێك شەتەك دا و خۆی لێی سواری ئەسپەکەی بوو. سەری پەتەکەی لە ملی ئەسپەکەی گرێ دا و ئەسپەکەی لێ خوڕی. ئەسپەکە لە سەر خۆ دەڕۆیشت و کافرەکەش وەك مردووان بە سەر خاك و خۆڵە نەرمەکەدا ڕاکێش ڕاکێش دەهات.

کافر، ئاوا سووك و سانا نامرێ. کافر ساغ و تۆکمەیە. ڕۆیشتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دەم ئاوێك و لە دارستانێکدا ڕاوەستان.

دەبەیەکی پڕ کرد لە ئاو و خوێی تێکرد و ئەوەندەی لێك دا هەتا خوێیەکە جوان و زەریف لە ئاوەکەدا توایەوە و تێکەڵی بوو و هێنای و بە سەری کافرەکەیدا کرد. کافرەکە وەك برێشکە هەڵبەزییەوە و وەعەرزی کەوت و دوای تۆزێك پەلەقاژە خۆی وێك هێنا. هەستایە سەر پێ و وەك ئەوەی لە خەوێ هەستابێ، چاوەکانی هەڵگلۆفین و دەرپەڕی. وەك ئەسپ غاری دەدا.

سەیری کرد بە پێیان هەر تۆزیشی ناشکێنێ. لێی سواری ئەسپ بوو و بەدوایدا غاری دا. ئەوەندە خێرا رای دەکرد دەتگوت ئەسپەکەش تۆزی ناشکێنێ. ئاخرییەکەی خۆی گەیاندە ئاوەکە و خۆی بە ئاوەکە دادا و خۆی نوقم کرد. خۆ نەیگەیشتبایە، دەخنکا. هەر چۆنێك بوو، هێنایەوە دەرێ و کێشایەوە سەر وشکانییەکە.

ماوەیەك لێی گەڕا. کافر خەوت. خاکە گەرمەکە خوێنەکەی هەڵدەمشت. خوێنی پیاوە نوستووەکە لە دەمارەکانییەوە فیچقەی دەکرد.

هەر هەستا و دەرەپەڕی. کەڵەشێرەکانی گوندێکی دوور وێکڕا دەیانخوێند. ئەگەر ویستبایەی دەیگرت، بەڵام راوەستابوو و سەیری دەکرد. کافرە هەر وا رای دەکرد و خۆش خۆش ئاوڕیشی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەکرد و هیوا و خۆشییەك لە دڵی گەڕابوو کە زۆری لێ دوور کەوتووەتەوە.

کافرەکە جارێکی دی کە ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد، ئەوەندەی لێ نزیك بۆتەوە هەناسەی وە پشت ملی دەکەوێ. تینی دایە لاقەکانی، ئەوی دواوە خۆی ویستی وەپاش کەوێ. ماوەیەك ئەو راکردن و راونانە هەر بەردەوام بوو.

کافرەکە ئاخرییەکەی وەڕز بوو و لە جێی خۆی راوەستا و بە هانکەهانك گوتی:"ها بابە، چیت پێخۆشە بیکە. خۆ لە بەر هەموو شتێك رادەگرم، بەڵام ئیتر تاقەتی وەم نییە سات بە سات بمرم."

"یانی ئاوا؟ دەی دەی ئاوا؟"

قاقایەکی کێشا. هەر پێکەنی و قاقای کێشا و لە بەر پێکەنین خەریك بوو هەناوی دەربێ.

گرتیەوە. دەستەکانی لە پشتەوەو لاقەکانی لە ئەژنۆیەوە لێك بەست و بە راکێشان بردییە دەم ئاوەکە. یەك پشوو دەپاڕایەوە. لەوەتەی دنیا هەیە، هیچ کەس ئاوا نەپاڕاوەتەوە. کەیفی بە پاڕانەوەی دەهات. دەیویست زۆر بکڕووزێتەوە و بپاڕێتەوە. بڕیاری دا لە کاتی کڕووزانەوە و پاڕانەوەیدا کاری بە سەرییەوە نەبێ. کافرەش تێیگەیشتبوو، بۆیە پتر دەلالایەوە و دەپاڕایەوە. پێی وابوو پاڕانەوە و کڕووزانەوە فریای دەکەوێ. خۆر ئاوا بوو و شەو داهات و ئەو هەر وا دەپاڕایەوە. هەر پاڕایەوە و ئەوەندە پاڕایەوە تا دەنگی نووسا و قسەکانی کپ بوون.

هەتا بەیانی وەك یەکێکی بریندار نووزاندی. کە بەیان ئەنگووت و خۆر بەرز بوو، قامکە تووتەی گرت و بایدا و شکاندی. دوای ئەو براتووتەی گرت و بە دوای ئەودا قامکی هەڵمەقوتەی و بە دوای ئەودا دۆشاومژە و دوای هەمویشیان ئەسپێ کوژەی بادا و شکاندی.

دوای ئەوە پەنجەکانی دەستەکەی دیکەشی شکاند. ئەوجار باسکی راستەی لە جومگەوە بەرەو دواوە بادا و شکاندی. کابرای لە تاوان دەموچاوی وێك هێنابوو. کە باسکی چەپەی بادا و شکاندی کابرا دەنگی لێ برِا.

مووسی دەلاکییەکەی لە توورەکەی ئەسپەکەی دەرهێنا و تیژی کردەوە و ئەوجار گوێچکەی گرت و وەك شریتێك خشت خشت برِیی. شریتی درێژی گوێچکەکەی لە ملی ئالآند. بە دوای ئەودا گوێچکەکەی دیکەشی بەو جۆرە برِی. ئینجا دەستی کرد بە داتاشینی پێستی ملی بەرەو خوار. ئیتر بە گورج و گۆلّی کارەکانی خۆی دەکرد. یەکسەر کەولّی کرد و خوێی پێوە کرد و تێزابی پێدا کرد. کافر پەلەقاژەی دەکرد و هەلّبەزی و لە سەر عەرزەکە تلایەوە و لە سەر گازەرای پشت تخێلّ بوو. ئاوا لێی گەرِا و بە خۆشیی چێژێکی نەچێشتووەوە دانیشت و چاوەرِێی گیاندانی بوو.

فیشەکەکان لە چاوترووکانێکا لە تۆپەی دەمانچەکەوە رژانە سەر لەپی دەستی و دیسان چوونەوە نێو تۆپەکەیەوە و دیسان هاتنەوە دەرێ و بەردەوام و بە دەنگێکی پرِ لە خۆشی و چێژەوە.

ئێستا فیشەکانی هەلّداویشت و لە هەوا دەیگرتنەوە. فیشەکەکان ئەوەندە دەستاو دەستیان کردبوو و لە تۆپەی دەمانچەکەوە هاتبوونە سەر لەپی دەستی و هەلاّویشرابوون و هاتبوونەوە خوارێ، بریقەبریقان وێکەوتبوو. دەمانچەکەی سوورِاند و فرِێی دا. دەمانچەکە رۆیشت و لە بەر پێیانی کەوت. ماندوو ببوو.

تاوەکە جار بە جار گەرمتر دەبوو. خاك و خۆلّەکە شەقار شەقار دەبوو. ئاوەکە دەبووە هەلّم و بەرەو تەشقی ئاسمانێ دەچوو. لە ناخی دلّەوە ئاخێکی هەلّکێشا:"ئاااخ،ـ ئاااخ".

دەنگی ئاخەکەی هەتا دوور دوور چوو. بەلاّم ئاخۆ کەسیش دەیبیست؟

لە گەرما بەتینەکەدا خوێن بە سەر و دەموچاوی کافرەوە قەتماغەی بەستبوو و لە ئێسقانێکی رەش و سووتاو دەچوو. شریتی گوێچکەکەشی بە دەوری ملیدا وەك ریخۆلّەیەك وشك ببۆوە.

خۆی بە کافرەکەدا دا و قژی سەری گرت و تیسکێکی قژی بە پێستی سەرییەوە هەلّقەند. قژە خوێناوییەکەی هاویشتە نێومالّی چەمە وشکەکەوە. گەرماکە هەلّیدەچۆقاند و بەرد و عەرزەکەی سوور دەکردەوە. کە سەیری کرد زمانی کافرەی دی کە زاری هاتووەتە دەرێ. بە هەر دوو دەستی زمانی دەرکێشا... هەتا نیوەرِۆیە هەر کێشا و هەلّنەکەنرا. لە بەر یەك دەکشایەوە و درێژ دەبۆوە. ئەوجار گوێزانەکەی دەرهێنایەوە.

یەك بە یەك پەنجەكانی لاقی شكاند. ئەوجار لاقەكانی و دوای ئەوە هەرچی ئێسكی لە گیانیدا هەبوو شكاندنی. گوێی بە دڵییەوە نا. زۆر توند لێی دەدا. بە قوڵە دارێك و لەسەر خۆ چاوی راستەی لە گلێنەوە دەرهێنا. هەر جارێكی دارەكەی تێدەچەقاند، ئەویتر بە ژانەوە لە سەر عەرزەكە دەتلایەوە. چاوی چەپەیشی هەر بەو شێوەیە دەرهێنا. لەو كاتەدا هەموو گیانی كافرەكە كەوتە لەرزین. هەموو گیانی بە شێوەیەكی سامناك لە بەر یەك دەكشایەوە و دەلەرزی.

مێرووڵەی زەرد پەیدا بوون. مێرووڵەكان لە چەمە وشكبووەكەوە و لە نێو گژ و گیاكانەوە و لە سەر دارەكانەوە و پەیتاپەیتا و بێ پسانەوە دەهاتن و سەر عەرزەكەیان زەرد دادەگێڕا و دەچوونە نێو كاسەی چاوەكانییەوە و هرووژمیان بۆ لێوە شەقار شەقاربووەكانی و گیانە شیتاڵ شتاڵكراوەكە دەبرد. هێندەی نەبرد گیانە لەرزۆكەكەی توێژێكی زەردی لە سەر نیشت. توێژكاڵێكی زەرد كە دەجمی.

لەولاترەوە، لە سەر گابەردێك دانیشت. مێرووڵە زەردەكان بە بەر چاوی ئەوەوە، ورد ورد دەیانخوارد. جا لەوە خۆشتر و باشتر؟

چاوەكانی لە سەر یەك دانان. سەركەوتبوو. مێژوو تا ئێستا سەركەوتنی وای نەنووسیوەتەوە. ئەو ئاوا سووك و ئاسان نامرێ. مێرووڵەكان بە سەری زیندوویی دەیخۆن.

بە دەنگی قریوە و هەڵڵایەك چاوەكانی هەڵێنا و سەیری كرد كابرای بریندار بە سەر پێوە راوەستاوە. ئەوەندەی پێ سەیری بوو پێی بەعەرزییەوە وشك بوون. باشە ئەو شەیتان بوو؟ ئەگەر شەیتانیش نەبێ، وەك سەگ حەوت گیانی هەبوو.

لەوەی باشتر، كە كابراكە تاوێك دواتر وەعەرزی كەوت. گوێی لە سەر دڵی دانا. دڵی زۆر توند و خێرا لێی دەدا.

چوو و ئەسپە سرك و چەمووشەكەی لغاو كرد. كەسی دیكە ئەو ئەسپەی پێ نەدەگیرا تەنانەت ئەگەر مانگێك و پێنج مانگ نا، پێنج ساڵیشی بە دوواوە بوایە. لەوانەبوو تەنیا ئەگەر بە فیشەك لێی بدرێ و بەیدەست بكرێ. ئەسپێكی شەودێز بوو. برینەدارەكەی هەڵستاند و سواری ئەسپەكەی كرد. سەری بەلایەكدا شۆڕ بۆوە و باسكە شكاوەكانیشی لە لایەكی دیكەدا. سەر و باسكەكانی توند لە بەر زگی ئەسپەكە شەتەك دا. بە پەتێكی دەكرێ بڵێی سەد مەترێك. گوێی لە سەر دڵی دانا، هەر لێی دەدا. ئێستا هەڵۆ و سیساركە كەچەڵەكان و باڵندە گەوەر و چووكەكانی دیكەی راوێ، لە ماوەی چەند رۆژاندا لە سەر پشتی ئەو ئەسپە سركە لەتوپەتی دەكەن و دەیخۆن.

قەمچییەکی توند لە کەفەڵی ئەسپەکە دا و ئەسپەکە غاری دا.

"کەیفت بە ئەسپ دێ، دەزانم. ئەسپەکە هەڵتدەگرێ و باڵندەکانی کەوڵت دەکەن و دەتخۆن...."

ئیتر گۆڕیشت نابێ. هەر لەت و پنتکەی لە شوێنێك. لە جیکڵدانەی باڵندە راوکەرەکاندا...

شەکەت بوو. نەیدەتوانی بجووڵێ.

چۆڕ چۆڕ ئاوە فێنکەکەی خواردەوە. جا ئێستا کاتی ئەوەی بوو، پارووە نانێك بخاتە بەر دڵی.

ئەسپە شەودێزەکەی یەك پشوو جووتەی دەخست و بۆ ئەوەی بارەکەی سەر پشتی خۆی هەڵاوێت و بیخا، وەك شێتان خۆی هەڵداویشت و دەکەوتە سەر پاشووان و دەیحیلاند.

قەمچییەکە پانزە جاران سووڕایەوە و بە ویزە ویز داهاتەوە و وەکەفەڵی ئەسپەکە کەوت.

رەوەزو بەندەنی ئاناوەرزا پانزە جاران دەنگی ویزە ویزی قەمچییەکەی دایەوە.

لە پڕ قاووقیژی هەڵۆ تووڕەکان کە بەری ئاسمانێیان رەشداگێڕابوو، وڵاتی پڕ کرد. لەولاترەوە، لە سەرووی ئاناوەرزاوە سیسارکەکان گەیشتنێ.

هەڵۆیەك لە پڕ لە ئاسمانەوە باڵەکانی جووت کردن و گلۆڵە بوو و وەك ئەستێرەیەکی راخوشیو لوور بوو و خۆی بە سەر پشتی ئەسپەکەدا کێشا و لەتێ گۆشتی بە دەندووکییەوە گرت و بە خێراییە هەستایەوە.

تاوێك دواتر، ئەسپەکە لە تەپ و هۆڕ و گژەگژی باڵەکاندا ون بوو. ئەسپەکە وەك شێتان غاری دەدا و کۆمەڵێك هەڵۆ و سیسارکە و باز و بایەقۆش و شاهین لە سەر پشت و بە سەر سەرییەوە بوون. هەڵۆکان هەر کامەیان لەتێ گۆشتیان هەڵدەکەند و دەفڕینەوە...

خوێنەکەش دڵۆپ دڵۆپ و بێ پسانەوە لە دەندووکەکانیانەوە دەبارییە سەر خاکەکەی چوکووراوا، هەر وەك باران....

# ٣

باران دەنك دەنك دەباری. ئەو خەزەڵ و گژ و گیا و پووش و پەڵاشانەی لە دوای هاوینەوە وشك ببوونەوە و رزیبوون، بۆنی بارانیان لێ دەهات. تروسكاییەك چییە، ئەستێرەیەكی بچووك بچووكیش چییە، نەدەبینرا. تاریكاییەكە شیر نەیدەبڕی.

مەحموود كە هەم شەرمیی دەكرد و دەشترسا و هەم نەشیدەزانی بۆچی خۆی پێ زۆرە، لە پلیكانەكانی كۆشكەكە وەسەر كەوت و چووە خزمەتی دەروێش بەگ كە لە بەیانییەوە چاوەڕێی بوو.

"باس و خەبەر چییە؟ ئیشەڵڵا خەبەری خۆشت پێیە؟"

مەحمود متەقی لێ نەهات.

"دیسان دەرباز بوو؟"

"دیسان دەرباز بوو. كوڕە ئەوە شەیتانە و هەر شەیتانیش دەتوانێ لە داوی بجات و بیكوژێ. ئەوە كاری بنیادەم نییە. رێك لەو جێیەی گوتبوویان دۆڵی یالینزتوو، لەوێ لە داوم خست. دوو جاران تەقەم لێ كرد، كەوت و تا گەیشتمە سەری، هەستا و خۆی خستەوە سەر ئەسپەكەی و دەرچوو. لە پشتەوە پێنج فیشەكم پێوەنا و هەر پێنج فیشەكەكەشی وێكەوت، بەڵام وەك نەبای دیتبێ و نە بۆران. كوڕە خۆ فیشەك ئەو كابرایە نابڕێ..."

دەروێیش بەگ ئاخێكی قووڵی هەڵكێشا و گوتی:"نایبڕێ چییە؟ نایئەنگێوی و تەواو."

"شتی وا چۆن دەبێ بەگ؟ چما فیشەكی من سەر دەكا؟ بە گیانی ئەو عەزیز بەگە شیرینە ئەو كابرایە شتێكی لە بن سەری دایە. ئەوە شەشەمین جارە تەقەی لێ دەكەم... بێ و نەبێ دوعای گوللەبەندی هەیە، ئەگینا چۆن شتی وا دەبێ...."

دەروێش بەگ ئیمانی نەما. "جا ئەگەر بە راستی وایە، ئەگەر گوللە نایبڕێ ئەتۆش بیگرە و ورد ورد بیئەنجنە. كێ گوتوویەتی هەر دەبێ بە فیشەكی بكوژی؟

ئەوە پێنج ساڵی ڕەبەقە بۆسەی بۆ دەنێینەوە، کەچی ئەو قیت و قۆز دەگەڕێ و گاڵتە بە ئەقڵمان دەکا. ئەمن نازانم ئەنگۆ چ پیاوێکن. ئاخر چما ئەو براگەورەمانی نەکوشتووە؟ ئەویش چۆن؟ وەك ئاو خواردنەوە. ئاااخ، ئاخ وەجاغم کوێر بۆوە. دۆستێکی گیانی گیانی نەما، کوا پیاو؟ هەر هەموو لە پیاوەتی کەوتن."

"وا مەڵێ بەگ. ئێمە هەموو پێشمەرگەی تۆین. گیان چییە ئەگەر بە فیدای تۆی نەکەین؟"

بەگ بێدەنگ بوو و کە بێدەنگ دەبوو، ئیتر قسەی نەدەکرد و نێوچاوانی تێك دەنا و وەك بزمارێك لە سەر جێی خۆی دەچەقی. بە مەحموودی نەگوت بڕوات، بۆیە مەحموودیش لە بەرانبەری ڕاوەستا وەك چەقیبێ.

تووڕەیی و ڕق گیانی بەگی هەڵدەچۆقاند و مەحموودیش لە دڵیدا خۆی سەرکۆنە و لۆمە دەکرد. پێنج ساڵی ڕەبەق بوو کە پێ بە پێ بە شوێن مورتەزا بەگەوە بوو و نەیدەتوانی هیچی لێ بکا. لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا دە جاران تووشی هاتبوو، کەچی تاقە جارێکیش چییە نەیتوانیبوو فیشەکێکی پێوە بنێ. کۆمەڵێك شت دەهاتن و نەیاندەهێشت دەستی بجووڵێ. چەندی لە خۆی دەنووسا، نەیدەتوانی پەلەپیتکەکە ببزێوێ و پەنجەی پەلەپیتکەی ڕەق دەبوو. هەر چاوی پێی دەکەوت، دەستی وشك دەبوو.

مەحموود هەموو جارێ دەیگوت، ئەمجارەش سەری نەگرت، بێت و جارێکی دیکە وەچنگم بکەوێتەوە، هەر دەشکەوێتەوە، بێ ئەملا و ئەولا دەیکوژم.

مەحموود بە سپایی سەری هەڵێنا و سەیری چاوە پڕ لە ڕق و قینەکانی دەروێش بەگ و نێوچاوانە تاڵ و گرژەکەی کرد. بەزەیی پێیدا هات و بە مێشکیشیدا هات:"باشە بۆچی خۆی نایکوژێ؟ لە "هوردووی چوارەم"ی ئێمە هەر کەسە و بە دەستی خۆی دوژمنەکەی خۆی دەکوژێتەوە و تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە. کەچی ئەوانە خوێنەکەی خۆیان بە دەستی خەڵکی دیکە دەشۆنەوە و هەر بۆیەش پیاوکوژ پەروەردە دەکەن. ئەویش هەر لە منداڵییەوە...." مەحموود بیری لە خۆی دەکردەوە. لە خۆی و هاتنیان بۆ چوکووراوا، باوکی و دایکی و... چی پتر بیری دەکردەوە زیاتر سەری سووڕ دەما و هەوداکەی لێ ئاڵۆزتر دەبوو. هەوڵی دەدا بیرەوەرییەکان لە خۆی دوور بخاتەوە."باشە ئەوانەش بنیادەمن؟ ئەوانەش بەگن؟ کوڕە هەزار بەگی ئاوا بە قوربانی دوژمنێك بێ... بەگی خۆم، ئەگەر پیاوی هەستە خۆت بچۆ و مورتەزا بکوژە، بە دەستی خۆت، باشە؟ لێی سوور بوو کە ڕۆژێك مورتەزا هەر دەکوژێ، واتە ناچار بوو بیکوژێ.

جا دوای کوشتنی ئەو یان دەرباز دەبێت یان هەموو شەوێ تا بەیانی چاوەڕێی دەروێش بەگ دەبێ یان پیاوەکانی ئاق یۆللی" لە بەندیخانەدا دەیکوژنەوە. کەوابوو ڕێگەیەکی دیکە نەبوو.

خەریك بوو ڕۆژ دەبۆوە کە دەروێش بەگ زاری بزواند:"بڕۆ".

هیچی دیکەی نەگوت. ئەو "بڕۆ"یە وەك تیرێك لە دڵی چەقی. بەو بێدەنگی و ماتبوونە مردبوو. لاقەکانی بە دوای خۆیدا ڕاکێش دەکردن و بەرەو ماڵ بۆوە. میرۆ بە سەر و قژی ئاڵۆزکاوەوە بە پیرییەوە هات. هەموو جارێکی کە مەحموود وەشوێن مورتەزا بەگ دەکەوت، هەتا دەگەڕایەوە ماڵێ، نە خەوی لێ دەکەوت و نە پارووە نانێکی لە گەرووی دەچووە خوارێ. منداڵەکان لە سەر جێ و بانەکەیان لە خەوی خۆشدا بوون.

مەحموود سەرچەفەکەی لە سەر منداڵەکانی لادا و سەرە زلەکەی خۆی داهێنایەوە و بەبێ ئەوەی نیگەرانی بەخەبەرهێنانیان بێ، مڵچە مڵچ و گەرم گەرم ماچی کردن.

میرۆ پرسیی:"دەنگ و باس؟ تەواوت کرد؟"

مەحموود بە سەر گوتی "نا".

میرۆ لە بن لێوانەوە گوتی:"دڵم ناحەسێتەوە و پێشموانییە ئەتۆ بتوانی ئەو کابرایە بکوژی. چونکە لە دڵەوە حەزت لێ نییە. ئەگەر دەڵێی با من خۆم بچم بە بەگ بڵێم مەحموود دڵی نایە ئەو پیاوە بکوژێ. ئەو کارە بە یەکێکی دیکە بسپێرە و لە کۆڵ ئەوی بکەوە یەکێکی دیکە بە گژ مورتەزادا بکە. ئەتۆ ئیزنم بدە با بچم مەحموود. ئەتۆ ئەو پیاوە ناکوژی. ناتوانی بیکوژی. ئەوەت پێ ناکرێ. بۆ خۆشت باش دەزانی."

مەحموود هێشتا سەری لە سەر منداڵەکانی هەڵنەگرتبوو، چەند جارێك لە سەر یەك گوتی:"منداڵەکەم، منداڵەکانم."

دەستی منداڵەکان لە بن لێفەکەوە هاتبوونە دەرێ و کەوتبوونە سەر یەك.

"منداڵەکەم، منداڵەکانم... منداڵەکەم..."

مەحموود دەنگێکی خۆش و بلاوێنی هەبوو. میرۆ هێندەی خۆی حەزی لەو دەنگەی بوو. مەحموود کە دەیگوت منداڵەکانم، هەر دەتگوت لایەلایەیان بۆ دەکا. دوای تاوێك، لایەلاییەکان بوون بە گۆرانییەکی خەمناك و پڕ لە ژان و ئازاری کوردی. میرۆ لە بن لێوانەوە لەگەڵی گوتەوە. مەحموودیش کەوتە گریان. ئەوجار هەر دووکیان لێی ڕاکشان و خەوتن.

پیاوکوشتن بە لای مەحموودەوە وەك ئاوخواردنەوە وا بوو. ئەو لەو ماڵە جگە لە پیاوکوشتن کارێکی دیکەی نەبوو. بەگ هەر بۆ ئەوە نانی دەدایێ و ڕایگرتبوو. ئەو و ئەوانی دیکەش....

بەڵام باشە بۆچی کوشتنی مورتەزا بەگی بە یەکێکی دیکە نەسپاردبوو و خستبوویە ئەستۆی ئەو؟

بەخۆی گوت:"لە بەر ئەوەی لە هەمووان پتر متمانەی بە منە."

دڵی خۆش بوو و لەسەری رۆیشت:"بەڵام کوڕە سەیرە، ئەمن ئەوە پێنج ساڵی رەبەقە نەمتوانیوە ئەو راسپاردەیەی بۆ راپەڕێنم. پیاو نەبم ئەگەر... بەڵام دەی باشە، ئاخۆ ئەویش تێناکەویٚ چ بکەم. وەچنگ خستنی زۆر ئاسان نییە."

دوای دوو ساڵانیش کاتیٚ بەسەریدا دەخەی، ئاوا گوو لە کارەکەت دەکەی. هەر چاوت پێی دەکەویٚ دەست و پێت تێکەڵ دێن و ئەویش یاری یاری بە بەردەمتدا تێدەپەڕیٚ و ملی رێیە دەگریٚ و دەڕوا.

مەحموود بیری کردەوە:"میرۆ راست دەکا. ئەمن قەت حەزم لە کوشتنی مورتەزا بەگ نەبووە. هەر بۆیەشە هەر کاتێکی تووشی بوومە، دەستم نەچووەتیٚ بیکوژم. بەڵام ئیتر ئەمجارەیان دەیکوژم. هەر دەیکوژم. ئەمن پیاوێکی سپڵە و پیٚ نەزان نیم. کوڕە ئەوە پیاوەتی نییە پیاو درۆ لەگەڵ کەسێك بکا کە نان نمەکی کردووە. ئەمن مورتەزا بەگ دەکوژم."

"هەر کەس مورتەزا بەگ بکوژیٚ، خۆیشی دەکوژرێتەوە. بنەماڵەی ئاق یۆللی" بەدەسەڵاتترین بنەماڵەی چوکووراوا، تۆڵەی مورتەزا دەکەنەوە و خوێنی دەستێننەوە."

"مورتەزا بەگ دەکوژم."

"زۆریش گەنجە. تازە خەتی لیٚ داوە. تۆ خوا حەیف نییە؟ دایکیشی لە هۆردووی چوارەمە، کچە کوردە...."

"مورتەزا بەگ دەکوژم."

"مورتەزا بەگ خراپەی بۆ کەس نەبووە. زەڕی بۆ مێروولەش نییە. هەر دەڵێی کچێکی شەرمنە. پشت و پەنای هەژاران و لێقەوماوانە. دیارە دەروێش بەگ بە خوێنی سەری تینووە، بەڵام ئەو هەر دەمانچەیەکیش هەڵناگریٚ. باشە دەکریٚ تەقە لە یەکێکی ئاوا بکەی؟"

"درۆیە. ئەوە درۆیە کە ئەو دەمانچەی پیٚ نییە. پشت و پەنای هەژارانیشی هەر قسەی قۆڕ و تاریفی درۆیە. هیچ بەگێك ناتوانیٚ پشت و پەنای لێقەوماوان و داماوان بیٚ. هەژارەکان لە بەر چاوی ئەوان سووك و چرووکن. ئەوان هەژاریان پیٚ بنیادەم نییە. مورتەزا بەگ دەکوژم. چما ئەوان کاکەی دەروێش بەگیان نەکوشتووە؟"

"باشە بۆ دەروێش بەگ خۆی دەستی لە خەنە دایە."

"بۆ مەگەر باپیرەی دەروێش بەگ... ، باپیری باپیری، باپیری باپیرەگەورەشی هەر بە دەستی ئەوان نەکوژراوە؟"

"بنەماڵەی دەروێش بەگیش زۆریان لەوان کوشتووە."

"مورتەزا بەگ دەکوژم."

میرۆ لێی چووە پێشی و بە شڵەژاوییەوە باوەشی پێداکرد و بە دڵپڕییەوە گوتی:"بیکوژە. بەگەکەمان لەو سەرشۆڕییە دەربێنە. ئەو بەگە داماوە خۆ لە لای ژن و منداڵەکەشی سەری هەڵنایە."

ئەگەر مورتەزا بەگ بکوژرێ، ئاخۆ مستەفا ئاغا ئاق یۆللی"، براگەورەکەی مورتەزا بەگ، دەروێش بەگ ناکوژێتەوە؟ بەڵام ئەگەر مورتەزا بەگ نەکوژرێ، ئاق یۆلوەکانیش کاریان بەسەر دەروێش بەگەوە نابێ، چونکە جارێ نۆرەی دەروێش بەگە لە "ئاق یۆللی"یەکان بکوژێ، لە بەر ئەوەی محەڕەمە کەچەڵی نۆکەری مستەقا بەگ ئاق یۆللی"، شەوێك لە شەوانی هاوینێ کاتێك جەودەت بەگی براگەورەی دەروێش بەگ لەسەر کەپرەکە نوستبوو، لە بنەوەڕا بە فیشەك لێی دا و کوشتی. کە جەودەت بەگ لە نیوەشەوێدا فیشەکەکەی وێکەوت، لە جێی خۆی هەڵبەزییەوە و نەڕاندی و کەوت و دەمودەست گیانی دەرچوو. سێ فیشەکی وەسینگی کەوتبوو و قەڵغانی سینگی هەڵتەکاندبوو.

محەڕەمە کەچەڵ دوای دوو مانگان لە بەندیخانەدا بە فیت و ئاماژەیەکی دەروێش بەگ کوژرا. جا ئێستا نۆرەی مورتەزا بەگ هاتبوو، چونکە بە قسەی مستەفا براکەی دەروێش بەگیان کوشتبوو. دەروێش بەگیش دەبوایە براکەی ئەوان بکوژێتەوە، بەڵام چونکە بە پێی نەریتی خۆیان نەیدەتوانی بە دەستی خۆی بیکوژێتەوە. ئەویتر چۆنی لێ کوشتبوون، دەبوو رێك ئاوا بکوژرێتەوە. کامە نەریت؟ ئاخۆ ئەو نەریتە دەروێش بەگ لە خۆیەوە داینەنابوو؟

مورتەزا بەگ کە دەیزانی کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێوە دڕاوە، دوو رۆژ دوای کوژرانی جەودەت بەگ ون بوو. بوو بە دڵۆپەیەك ئاو و بە زەویدا رۆچوو. بەڵام چووبایەتە هەر کوێیەك، تازە نەیدەتوانی روح دەربەرێ. ئەوە چارەنووسێك بوو، چارەنووسێك لە سەرووی هەموو چارەنووسێکی دیکەوە. ئەگەر خۆی خزاندبایەتە کونی ماریشەوە، یان خۆی لە بن باڵی مەل و باڵندەش شاردبایەتەوە، دەروێش بەگ هەر دەیدۆزییەوە و دەیکوشتەوە."

مورتەزا بەگ لە بەر دەستی پیاوەکانی دەروێش بەگدا بوو. ئاشکرا، بێ پەنا و دالّدە، بەبێ چەك وەك منداڵێکی دەستەوستان. ترسێك هەڵیگرتبوو کە یەکسەر رووی کردە کۆشکەکەی ئاق یۆللی". لێرە باشتر دەیتوانی ئاگای لە خۆی بێ و پێنج ساڵ بوو خۆی دەرباز کردبوو.

"مستەفا ئاق یۆللی"، لە بەندیخانەدا دەتکوژێ. ئەو لە کەس خۆش نابێ. ئەوجار دەنێرێ دەروێش بەگیش دەکوژن. لەم دنیایەدا کەس نییە وەك مستەفا ئاغا ئاق یۆللی" خوێنمژ و ئاگری بن کا بێ. خۆ دیتت جەودەت بەگی چۆن کوشت؟ مورتەزا بەگ دەکوژم."

"مورتەزا بەگ دەکوژی. دەبێ بیکوژی و هیچ چاری دیکەت نییە. ئەوە ئەرکێکە و کەوتووەتە ئەستۆت. کوشتنی مورتەزا بەگ و لە داونەکەوتنیش."

"دڵنیا بە هەر چۆنی بێ لە بەندیخانەدا گەورەت دەکەم خۆ ئەگەر ناچار بم بە قژ و کەزیی خۆم عەرزی بماڵم. بە شیری مەل پەروەردەت دەکەم. کوڕەکەشت وەك کەڵ گەورە دەکەم. مورتەزا بەگ بکوژە. کێ بوو ژنی بۆ هێنای؟ کێ بوو تۆی کردە ئەو پیاوەی ئێستا؟"

دەروێش بەگ مانگێککگی رەبەق، هەر بە خێسەش سەیرێکی نەکرد. دەروێش بەگ مانگێکی رەبەق لە کۆشکەکەی نەهاتە دەرەوە و کەسی نەدواند. کەسیشی نەهێنایە سەر سفرەکەی. دەتگوت تازیەبارە. مەحموود هەر لەو مانگەدا سێ جاران ویستی بچێتە خزمەتی دەروێش بەگ، بەڵام هەموو جارێ ترسا و نەیتوانی. شەرمی کرد و نەیتوانی. کەفوکوڵ و تووڕەییەکەی رۆژ بە رۆژ چڕتر دەبووەوە و هەوڵی دەدا خۆی قایل بکا کە مورتەزا بەگ بکوژرێ، بەڵام دڵی قایل نەدەبوو.

"دەیکوژم، دەیکوژم."

ئاخرییەکەی هەموو غیرەتی دایە بە خۆی و ساغ بۆوە و چووە هەنتەشی بەگ." بەڵێن دەدەم بەگ، بەڵێن دەدەم هەتا مورتەزا بەگ نەکوژم، تفەنگەکەم لە شانم ناکەمەوە. بەڵێن بێ تا مورتەزا بەگ نەکوژمەوە، روو لەو ئاواییە ناکەمەوە. ناچمە لای ژنەکەشم و بێشکەی ساواکەشم راناژێنم و سەیری چاوی تۆش ناکەم. دەماری ملم بارمتە بێ. سوێند دەخۆم بە قورئان کە شەرت و بەڵێنەکەم بەرمە سەرێ."

دەروێش بەگ بە تەوسەوە سەیرێکی کرد و گوتی:"بڕوا ناکەم. هیچ بڕوا ناکەم تۆ دەرەقەتی بێی. ئەمن دەبوو ئەوەم بە یەکێکی دی سپاردبا. چ بکەم ئەوە بە تۆ ناکرێ. کاکە هەر کەسە و کاری خۆی... بەڵام جارێ ها ئەوە وەرگرە... کە تۆ نایەیتەوە ئەو گوندە، پێویستیت بەو شتانە دەبێ...."

دەروێش بەگ بەستە دراوێکیکی بۆ راداشت. مەحموود کشایەوە دواوە و گوتی:"سەرت سلامەت بێ بەگ، نامەوێ."

بەگ نێوچاوانی تێك نا و بە ئەمرەوە گوتی:"ها وەریگرە بزانم."

روخساری گەنجانەی مەحموود سوور هەڵگەڕا و گوتی:"زۆریم لێ مەکە بەگ. ئەمن بشمرم دەست بۆ ئەو پارەیە نابەم. هەتا مورتەزا بەگ زیندووە، دەست لەو پارەیە نادەم."

رووی وەرگێڕا و هەستا و بەرەو ئەو قورئانە خۆی راکێش کرد کە لە بوخچەیەکی دەورداگیراو پێچرابوو و بە دیوارەکە داکرابوو. دەستی بە قورئانەکەدا دا و بە پەلە گوتی:"ئەو کتێبە گول و کوێرم بکا، شەل و گێڕم بکا، ئەگەر درۆ بکەم. بە سەری ژن و منداڵەکانم، بەگ بە سەری تۆش سوێند دەخۆم کە..." و بەبێ ئەوەی قسەکەی تەواو بکا، بە خێرایی لە پلیکانەکان چووە خوارێ و خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی.

دیسان، دیسانیش باوەڕی نەدەکرد مورتەزای پێ بکوژرێت. هەموو ئەو کارانەی وەك گەمەیەك دەهاتە پێش چاو.

بەڵام ئیتر دەستی بە قورئانێ دادابوو. خۆی خستبووە بن باری سوێندێکی ئاوا قورسەوە. گەیشتەوە ماڵێ. لە بەردەم ژنەکەی و بە سەر سەری منداڵەکانیشییەوە کە لە بێشکەکەدا نوستبوون، ئەو سوێندەی دووپاتە کردەوە.

ئیتر نەجاتی ببوو. ئیتر ئەمجارە ئەگەر لە دڵیشەوە حەزی لە کوشتنی مورتەزا بەگ نەبێ، بەڵام هەر دەیکوژێ. بەڵێنی دابوو و سوێندی خواردبوو ـ ئەویش بە قورئان و بە سەری ژن و منداڵە خۆشەویستەکەی و بەگەکەیشی.

لە مێشکیدا قیامەتێك بەرپا ببوو: ئەو مورتەزا بەگە پیاوێکی چۆن بوو؟ گەنجێك کە تازە خەتی لێ دابوو و هێشتا سمێڵ و ردێنی نەهاتبوو. دەموچاوێکی درێژ و تێکسمڕاو و رەنگ بزڕکاو و خەمبار. قەت پێکەنینێك نەدەخزییە ئەو روخسارەیەوە. باشە بۆ تا ئێستا نەیکوشتبوو؟ نەیکوشتبوو ئیتر. بەڵام ئەمجارە هەر دەیکوژێ.

سێ ساڵی رەبەق وەك سێبەر بە شوێنییەوە ببوو. دەیزانی چ دەکا و دەکرێ لە کوێ بیگرێ. هەر ئێستاش ویستبایەی بەبێ راوەستان دەچوو و دەیدۆزییەوە.

بارانە نەم نەم بە سەر شەوەکەدا دەباری و بۆن و بەرامەیەکی سەرخۆشیهێنەری لە خاك و گڵەکە هەڵدەستاند. ئەسپەکەی بەرەو ئاوایی ئاق یۆللی" لینگ دا. نە ئازارێك و نە

نیگەرانی و نە ترس و نە شڵەژاوییەك لە ناخیدا هەبوو. ئەو بە درێژایی تەمەنی ژیانی لێوڕێژ ببوو لەو شتانە.

لە قامیشەڵانەکەی خواروی ئاق یۆللی"دا لە دەم ئاوەکە دابەزی و ئەسپەکەی لە دارێك بەستەوە. بەر لەوە لەوانەیە بڵێی هەزار جاری دیکەش ئەسپەکەی هەر لەو دارە بەستبۆوە. بارانەکە هەتا مێشکی ئێسقانەکانی رۆچووبوو و گیانی مێروولەی دەکرد و موچڕکەی پێدا دەهاتەوە.

لە بن پێستی لەشیدا هەستی بە تایەکی بەر باران و خووساو و لیچق دەکرد. وەك خووی پێوە گرتبوو، لە قامیشەڵانەکەوە خۆی گەیاندە سەر رێگاکە. هیچ مەترسییەکی لە سەر نەبوو. تەنانەت سەگە یانیگرەکانی کۆشکەکەی ئاق یۆللی"ش ئیتر پێی نەدەوەڕین. بەڵام ئەو لەوە دەترسا نەکا سەگەکان پێی بوەڕن. خەڵکی گوندەکەش دەیانناسی. لە بیریان چووبۆوە کە ئەو لەمێژ ساڵە کون بە کون بە شوێن مورتەزا بەگەوەیە. هیچ کەس نەیدەتوانی ئاسەوار و شوێنەواری پیاوکوژی لە روخساری منداڵانە و خەفەتبار و بێ ئازاری مەحموددا بەدی بکات، هەر بۆیە کەس بە هەندی نەدەگرت.

لە ئاواییەکەی ئاق یۆللی" کەس نەبوو نەزانێ ئەو نۆکەری دەروێش بەگە. بەڵام کەس غیرەی لێ نەدەکرد ـ شەرمن و بێدەنگ بوو. هەر دوو قسەی کردبایە، لە شەرمان سوور سوور هەڵدەگەڕا و دەستی تێکەڵ دەهات... هیچ کەس، هەر هیچ کەس نە لە کۆشکەکەی ساری ئۆغلی و نە لە کۆشکەکەی ئاق یۆللی"دا بە هەندی وەرنەدەگرت. مەحمودیش ئەو بەکەمگرتنەی ئەوەندە پێ ناخۆش بوو وەك ژەهرێکی بە گەروویدا بکەن.

بەبێ ئەوەی خۆی شلوێ بکا، چووە نێو گوندەکەوە. سەگەکان نەوەڕین. نەوەڕین هیچ، هاتن و کلکەسووتەشیان بۆ کرد. کە سەیەکان هاتن، زانیی لە کۆشکەکە نزیك بۆتەوە. ورد بۆوە و دیواری کۆشکەکەی دۆزییەوە و گورج و چالاك بە پەنای دیوارەکەدا رۆیشت.

پاسەوانەکانی کۆشك بەردەوام لە بەر دەرگاکە کێشکیان دەگرت. لەوانەبوو دیسان لەوێ بن. دەنگی پێیان نەدەهات. جگەرەشیان نەدەکێشا. بارانەکە هەر دەباری. ترووسکایی ئەستێرەیەکیش چییە بە ئاسمانەوە دیار نەبوو. چاو چاوی نەدەدی.

ئاخرییەکەی ئەو پەنجەرەیەی دۆزییەوە کە لێی دەگەڕا. پەرژینە ئاسنەکانی پەنجەرەکەی گرت و وەك پشیلەیەکی گورج خۆی خستە نێو بانیژەکەوە. مورتەزا لە ژوورەکەی سەرەوە کە دەتگوت کەپرە، نوستبوو. خۆی خزاندە ژوورەوە. هیچی نەدەدی. دڵی زرمە زرم لێی دەدا.

دەستی خزییە سەر دەسکی دەمانچەکەی. دوو کەس لە ژوورەکەدا نوستبوون. بە هەناسەیانڕا ژن و مێردەی ناسییەوە. مورتەزا بەگ دوو قولانجی لێوە دوور بوو.

دەمانچەکەی راکێشا. دەستی لەرزی. باشە لەگەڵ تەقەکەی، کۆشکەکە وەك نقێمی ئەموستیلەیەك گەمارۆ نادرێ؟ دەمانچەکەی خستەوە سەر جێی خۆی. لەگەڵ گرمەی هەورەتریشقەیەکدا بریسکەیەك هەموو وڵاتی رووناك کردەوە. روخسارە ناسك و بەنگ بزرکاو و ماتەمبارەکەی مورتەزا بەگی دی. روخساری شەلاڵی ئارەقە بوو. سینگە رووت و هەستاوەکەی ژنەکەشی دی. یەکێك لە مەمکەکانی هاتبووە دەرێ. ئاگری تێبەربوو. رێك لەو کاتەدا دەمانچەکەی راکێشا و پێوەی نا. چەندی گوللەی لە دەمانچەکەیدا بوو هەمووی لە سینگی مورتەزا بەتاڵ کرد، مورتەزا هاوارێکی وای لێ هەستا ئاگرت بۆی تێبەردەبوو. لە جێی خۆی دەرپەڕی و کەوت.

مەحموود لەسەر خۆ دەمانچەکەی لە جێی خۆی نایەوە و ئارام و بەسپایی بە پلیکانەکاندا چووە خوارێ. کۆشکەکە ببووە هەڵلایەك هەر مەپرسە. سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە. کەس بیری لە داگیرساندنی چرایەك نەدەکردەوە.

مستەفا ئاقا سێ جار بە دەنگێکی بەرز و دڵتەزێن نالاندی:"وەجاغم کوێر بـۆوە. وەجـاغم کوێربۆوە.وەجاغم کوێربۆوە."

بەکاوەخۆ لە دەرگای کۆشـکەکە چـووە دەرێ. هـەر کەسـە و بـەرەو لایـەك غـاری دەدا. سەگەکان وێکڕا دەوەڕین. دێ ببووە قیامەتێك هەر مەپرسە. لە هەموو لایەکەوە دەنگی تەقە دەهات. ئاسمان دەیگرماند. بەکاوەخۆ و هێمن گەیشتە قامیشەلانەکە. هەوسـاری ئەسـپەکەی کردەوە و لێی سوار بوو و جگەرەیەکی داگیرساند. ئـەوجار گۆرانییـەکی بەسـۆز و خـەمناکی کوردی لە ناخی دڵییەوە هەڵقوڵی و هاتە سەر لێوەکانی. ئاوەدانییەکە شـڵەژابوو. لـە دوورەوە لە لووتکەی چیای حەمیتەوە بێ پسانەوە بریسکە و هەورە تریشقەی دەدا.

هاتەوە ماڵێ. میرۆ دەرگای لێ کردەوە و ئەسپەکەی راکێشا بۆ سەر ئاخوڕەکەی. مەحموود هەر خۆی خستەوە سەر جێیەکەی خەوی لێ کەوت.

بەیانی زوو زوو لە خەو هەستا و خۆی گەیاندە خزمەتی بەگ. ماندوو و شەکەت بوو. دەتگوت بارێکی هەزار ساڵەیان هەر ئێستا لە سەر شانی داگرتووەتە خوارێ.

دەروێش بەگیش لە جێی خۆی دەرپەڕی و سێ جاران نێوچاوانی ماچ کرد و گوتی:"کوڕە هەر بژی، خوا راوەستاوت بکا، دەستەکانت ئەو خەزایەت لێ موبارەك بێ، نان و نمەکم حەڵاڵت بێ."

باران بێ پسانەوە و بە خوڕەم دەباری. دەتگوت ئەوە هەزاران ساڵە ئەو بارانە ئاوا یەك پشوو دەبارێ و قەتیش خۆشی ناکاتەوە. لێڵ و تار و چەور و لیچق و قوڕاوی و بەبێ سەوزایی و شیناوەرد و وەك خۆڵەمێش...

# ٤

کام ژنی وایلۆك چڕ و سەردولکەبێژ و شینگێڕ بەناوبانگ بوون، لە گوندە دوور و نزیکەکانەوە و لە چیاکان و لە گوندەکانی تۆرووسەوە هاتبوون و لە کوڵ شینیان لە سەر تەرمە خوێناوییەکەی مورتەزا بەگ دەگێڕا و بۆ یەکتریان دەستاندەوە. کۆشکەکە هەر جمەی دەهات لە ژنی لەچك سپیی دەنگ تیژ و خۆش، ئازایانە، ترسنۆك، گڕ، دڵتەزێن و کەڵەگەت و سیس و ژاکاو.

حەوشەی کۆشکەکە قوڕ بوو. قوڕە چەقە بوو. باران بە تەمای خۆشکردنەوە نەبوو. وەك گۆزەی سەروبن دەباری. خلیسك، چەور، زەرد، پیس، تار و قورس و دەنك درشت. کەس نەبوو سەرتاپێی قوڕاوی نەبێ. پەنجەرە و دەرگا و پلیکان و دارەکانی باخچەکە هەر هەمووی قوڕاوی بوون. بنیادەمە ڕەنگ بزرکاو و خەمبارەکان، داماو و دەستەوستان بە نێوباخچەکەی کۆشکێدا بەملاولادا غاریان دەدا. کەس متەقی لەبەرەوە نەدەهات. یەکێك لە ژنە شینگێڕەکان جاری وا بوو دەنگی وا لێ هەڵدێنا، دەتگوت لە گوندەکانی دراوسێشەوە دەبیسترێ و ئەو شین و گریانە مووی لەشی خەڵکەکەی نێو حەوشەی دەکردە نەشتەر.

ژنە شینگێڕەکان تاوێك نەدەوەستان. تێیان دەچریکاند و بە یادگاری و کردەوەی باش و چاکییەکان و هۆز و عێل و تۆرەمە و بە ورد و ناسکترین شتەکانی ژیانی ئەو جوانەمەرگەیان هەڵدەگوت کە لە بن پەردەیەکی سپیدا و لە نێویاندا درێژ ببوو. ئاوەدانییەکە یەکسەر، بە دەشت و دەرەوە دەیناڵاند. بارانەکەش پیس و چەور، یەکپشوو دەباری.

بەڵام مستەفابەگ ئاق یۆللی" لەو کاتەدا لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو و نە گوێی لە هاوار و ناڵینی ژنەکان بوو، نە ئەو بارانەی دەدی کە وەك گۆزەی سەروبن دەباری. یەکسەر بیری دەکردەوە و کپ و بێدەنگ مات ببوو و نەخشەی دەکێشا. دڵ و دەمارەکانی وا لە بەر

یەك دەكشانەوە دەتگوت ئێستا نا ئێستا لە بەر یەك دەچێ. لەشی وا كوترابوو دەتگوت لە دەستاونگدا كوتاویانە. تارماییەكی ڕەش و هیوابڕ لە ناخیدا پەپكەی كردبوو..

دەبوو هەر ئەمشەو دەست بەكار بێ. دەروێش بەگ دەبوو تا سەری حەوتوو بكوژرێتەوە. بەر لەوەی تەرمەكەی مورتەزا لە گوڕەكەیدا سار بێتەوە، دەبوو دەروێش بەگیش بچێتە ئامێزی خاكە ڕەشەكەوە.

خەڵكەكە لە حەوشەدا لە هاتوچۆدا بوون و هەر كەسە و كارێكی دەكرد. بە عارەبانەیەك باوەشێكیان گیای "مۆرتكە" هێنابوو و بۆنەكەی بۆ مستەفا بەگ دەچوو. مستەفا بەگ وەبیری هاتەوە كە هەر هەموو مردووەكان لە كۆن كۆنەوە ئاوا بۆنی "مۆرتك"یان لێ هاتووە. دیسان شین و گریانی ژنان... دیسان خەڵكێكی بەریز ڕاوەستاو... دیسان كلپەی ڕقێكی تاقەتپڕووكێن، زاری وەك تەڵەی تەقیو لە تووڕەییان و ددانی لە سەر یەك توندكراو. دیسان بارانێكی زەرد و پیس و تار و چەور، دیسان لەچكە سپییەكان كە وەك هێشووی بەر بای شەماڵ كەروێشكەیان دەكرد و شەپۆلیان دەدا...

لە پڕ شینگێڕی و سەردولكە بڕانەوە. هەموو شین و ڕۆرۆ و لە خۆدان و ناڵین و هاتوچۆكان لە حەوشەكەدا ڕاوەستا. بارانەكەش خۆشی كردەوە.

چوونە گۆڕستان. گڵە تەڕ و چەقەكەیان هەڵكەند. كێلەكان لە وردكەبەرد و تاتەبەردی نێو چۆمەكە... لە داوێنی گردێكی سەردەمی هیتیتەكان.* تاقە دار توویەك، لایەكی ڕزیو و نیوەی گەڵاكانیشی وشك و نیوەكەی دیكەشی هەر وا تەڕ و تورت وەك گەڵای نەونەمامان. گڵە تەڕ و چەقەكە و بەرد و كێلەكان و تووە نیوە وشكەكان و گردی هیتیت و قامیشەڵانەكەی ئەو بەر و نێوشانی خەڵكەكە هاڵاوی لێ هەڵدەستا، هاڵاوێكی شین، وەك هەور وابوو چاوی كوێر دەكرد...

تەرمەكەیان لە گۆڕەكە نا. دارە چەوركراوە سنەوبەرەكانیان دانا و چڵە مۆرتكەكانیان لە سەر ڕاخست و گڵیان وەسەر كرد. قورئانخوێن قورئانی لە سەر خوێند. بۆنە تیژەكەی مۆرتك بۆ هەمووان دەچوو. بارانەكە دیسان دایكردەوە. مستەفا بەگ لە حاڵێكدا كە پێیەكانی بە سەر عەرزە قوڕەكەدا ڕاكێش دەكرد، لە گۆڕستانەكە دوور كەوتەوە. قورسایی بیركردنەوەیەكی بێ بڕانەوە كەوتبووە سەر شانەكانی. نە بیری لە مەرگ دەكردەوە و نە لە مردووەكەش. تەنیا بیری لە یەك شت دەكردەوە، لە دەروێش بەگ و لەوەی چیی لێ بكا. زینچكاوێكی ڕوون لە برینەكانی مردووەكە دەچۆڕایەوە. ئەو خوێناوە زەردە تاوێك دواتر گۆڕەكەی پڕ دەكات.

دەروێش بەگ پێنج رۆژ نابا دەکوژرێتەوە، بە هەر نرخێك بێ، چونکە زۆر لە مێژ ساڵە کەرەستەی کوشتنەکەی ئامادەکرابوو.

مستەفا بەگ دەیزانی دەروێش بەگ هەر منداڵییەوە تا ئێستا چیی کردووە و چ دەکا و چۆن دەژیێ. لەوانەیە سەد ساڵیش دەبوو ئەو دوو بنەماڵەیە ئاگایان لە هەموو جووڵە و کار و کردەوەیەکی یەکتری هەبوو. دوژمن لە دوژمن خۆش نابێ و کەس وەك دوژمن، دوژمنی خۆی ناناسێ. کۆشکەکەی سەر گردێکی رۆژاوای ساورون، لە بەر چاوەی "ئاق یۆللی"یەکان داغی مەرگێکی رش بوو. هەر چاویان هەڵدێنا ئەو ترسە رەشە، ئەو داوێنی مەرگەیان لە بەردەم خۆیاندا دەبینی. کۆشکی "ئاق یۆللی"یەکانیش کە لە سەر تەپۆڵکەیەك ساز کرابوو، بەلای خەڵکی کۆشکەکەی ساری ئۆغڵییەوە هەر وا بوو. ئایەتی مەرگ بوو، مەرگێکی رەش و بە ژان. هیچ کام لە "ئاق یۆللی"یەکان نێو کۆشکەکەی ساری ئۆغڵییان نەدیبوو، بەڵام وەك بەری دەستی خۆیان شارەزای نێو کۆشکەکە بوون. ساری ئۆغڵییەکانیش شارەزای کۆشکی ئەوان....

بارانەکە دەستی پێ کردبووەوە، بارانێکی پیس و ئاڵۆز و قورس. جاری وابوو خۆشی دەکردەوە و تاو هەڵدەهات. هەموو وڵات نوقمی هاڵاو و تەم دەبوو و دیسان بارانێکی تەماوی و گەرم و چەور دایدەدایەوە.

باڵندەیەکی خووساوی بەرباران، پەڕ و پۆی قرژ ببوونەوە و تووکی بە سەرییەوە نەمابوو، قورس ببوو و لە سەر لقی پیرە هەنجیرە بێ گەڵاکە کرووشمەی کردبوو. ملی بردبووە بن باڵی و چاوەڕێ بوو. بارانەکە تا مێشکی ئێسقانی چوبووە خوارێ.

مستەفا بەگ بانگی کرد:"مام حەسەن، برۆ ئەو باڵندەیە بگرە و بیهێنە. بیهێنە با باڵەکانی وشك ببنەوە و دوایی بەرەڵڵای بکە با بڕوا."

مام حەسەن بە لەبزێکی رازی و بەخۆباییانەوە وەڵامی دایەوە:"ئەوە پیرە سەقرە."

لە کۆشکەکە چووە دەرێ و وەك با رۆیشت و سەقرەکەی گرت و هێنای:"باڵی بریندارە بەگ. ئەنگاوتوویانە."

"مەلحەمێکی لە سەر برینەکەی دابنێ."

بە سەدان چێشکەی خووساو وەك کۆگایەك لە سەر لك و پۆی دار تووەکەی بەر پەنجەرەکە نیشتنەوە و دیسان بە جیکە جیك لە شەقەی باڵیان دا و هەڵفڕینەوە.

دڵۆپە فرمێسکێکی درشت لە چاڵی روومەتیدا راوەستابوو. دەموچاوی وەك بەردێك رەق و بێجووڵە بوو. بەر لە کوژرانی مورتەزاش هەر وا بوو: مەرگی برایەك کە لە گیانی خۆی خۆشتر

دەویست، دەتگوت هەر کاریشی تێنەکردووە. دەموچاوە تێکسمڕاوەکەی خستبووە نێو دەستە زلەکانییەوە و "بیلیك"ـێکی بولگاریشی لە بەر دەم بوو... و کۆگایەك فیشەکیشی لە سەر مێزەکەی هەڵدابۆوە....

"مام حەسەن."

"فەرمو گەورەم."

مام حەسەن کە لە پشت دەرگاوە چاوەڕێ بوو، هاتە ژووری.

"دەروێش چ دەکا؟"

"جا دەیەوێ چ بکا بەگ؟ خۆت لە من باشتر دەزانی چ دەکا. ئەو ئیتر لە کۆشکەکەی وەدەر ناکەوێ. ئەمن خووخدەی وی باش دەناسم."

"جا ئەگەر وابێ، چۆن بیکوژینەوە مام حەسەن؟ ئێمە دەبێ هەر لەو چوار پێنج ڕۆژەدا بیکوژین."

"دەبێ بیکوژین."

"چەند ڕۆژە؟ مام حەسەن چەند ڕۆژە چووەتە گوندی ساری باغ؟"

"سێ ڕۆژە. ڕامسپاردووە، ئەمڕۆ دێ."

لە هیچ کوێوە ترووسکاییەك نەدەهات. ئاوی بارانەکە لە بن پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە. دەموچاوی لە بەر تیشکی لەرزۆك و کزی چرا نەوتییەکە درێژتر و زەرهەڵگەڕاوتر و نێوچاوانیشی پڕ چرچ و لۆچتر دیار بوو. ردێنیشی بەو یەك ڕۆژە هێندەی مانگێك درێژ ببووەوە، قرژ و تەنك...

هەڵلایەك بوو لە ناخیدا. بەبێ دەنگی دەکوڵی و کوڵی دڵی هەڵنەدەڕشت. ئەو کوڵ و کۆیەش جگە لە لەرزینی دەستەکانی، هیچی دیکەی نەدەخستە ڕوو.

لەو چەند ڕۆژەدا دەبێ بەچنگی بێنین. کوشتنەوەکەی دژوار نییە، دەبێ بیگرین. دەبێ بگیرێت و بیهێننە سەر گۆڕەکەی مورتەزا لاوەکە. ئەو مورتەزایەی وەك خەڵفی چنار وابوو، لەوێ لەدارێك ببەسترێتەوەو ئەو جار ورد ورد بیئەنجنن و زەجر کوژ بکرێ.

ئەو دەروێشە چۆن پیاوێکە؟ جارێك، ئەویش زۆر لە دوورەوە دیتبووی. خولق و خووی ئەوی باش دەناسی و بەخۆی دەنازی کە دوژمنێکی ئاوای هەیە. پیاوێکی قسە لە ڕوو و جوامێر و دڵاوا و نەترس و بە دامودەستوور و وردبین و مووئەنگێو بوو. پیاوێك بوو لێوڕێژ لە ئەشق و خۆشەویستی. لەو چوکووراوایەدا وەك دوورگەیەکی بەهەشتی وابوو، کە لە نێو پیسی و

چەپەڵی و بۆگەن و بێ شەرەی و نامەردیدا گەمارۆ درابێ. لە چوکووراوادا هەر دوو دوورگە مابوونەوە، دوو دوورگە لە سەر (دوو) گردۆڵکە و وەك قەڵای رەسەنایەتی و پاکی و پاك رەوشتی. کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی و کۆشکەکەی ئاق یۆللی" و هەر دووکیشیان مەحکووم بوون بە فەوتان و لەنێوچوون ـ هەر دوو کیان دوا رۆژەکانی تەمەنی خۆیان تێدەپەڕاند. دەروێش بەگ ئەم حەوتووە ناباتە سەرێ. ئەو جار خۆیشی.. سەرانسەری چوکووراوا زەلکاوێکە کە چڵکاو و بۆگەنی لێ دێتە دەرێ...

منداڵەکان؟ نا، ئەوانی دیکە نا. هەر کام لەوان ئاغایەکی وەك ئاغا تازە پێگەیشتووەکان...

ئەوەی نووسراوە، پاك ناکرێتەوە. هەر بە راست، دەروێش بەگ چۆن بیر لەوە دەکاتەوە؟

پەنجەرەکەی کردەوە، سەری دەرهێنا و یەك دوو دڵۆپەی فێنك کەوتە سەر دەموچاوی. "هەر بەراستی دەروێش بەگ چۆن بیر لەوە دەکاتەوە؟ ئاخۆ دەزانێ، ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ سبەی و ئەمشەویش نەبێ، سبەی شەو فەرمانی کوشتنەکەی دەکرێتە ئەستۆی؟ دەزانێ. بەڵام ئەی چ دەکا؟ مورتەزا، برا خۆشەویستەکەشم دەیزانی، بەڵام هیچی نەدەکرد. وەك مەڕی قوربانی ملی راکێشابوو بۆ چەقۆکە و چاوەڕێ بوو. ئەگەر ویستبای دەیتوانی بڕێك کاتی مەرگەکەی وەدرەنگی بخات. باشە پیاوی دوژمندار، دەرگای ماڵەکەی دەخاتە سەر پشت؟ ئاخۆ بەردەوام لە شوێنێك دەنوێ؟ ئەو ئیتر تاقەتی چاوەڕوانیی نەمابوو. بێزار ببوو لەوەی هەموو رۆژێ و سات بە سات بکوژرێت و وەڕز ببوو. هەر لە چاوەکانییەوە دیار بوو. ئەگەر کارەکەی لەوەی پتر خایاندبایە، بە پێی خۆی دەچووە کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی و دەیگوت:"ئەوە هاتووم و دەست و پێیانت ماچ دەکەم دەروێش بەگ، تۆخوا زوو بمکوژە و نەجاتم بدە. بمکوژە و رزگارم بکە، نەجاتم بدە. یەکەم رۆژەکان زۆر پیس تۆقیبوو. دەتگوت ئەو ئاسمانەی بە سەردا رووخاوە. بەردەوام دەیبۆڵاند و دەیگوت: باشە بۆ ئەمن دەکوژنەوە؟ لە بەر چی؟ بە هەقێك؟ خۆ ئەمن زەرەم بۆ کەس نەبووە؟ بۆیە ناچار بوو رابکا و بچێتە ئیستانبۆل. لەوێ هەر حەوتووەی لە خانووەکدا دەژیا. بەڵام دیسان لە فرت و فێڵی دوژمن پارێزراو نەبوو. ئاخرییەکەی داماو و ناچار گەڕایەوە ماڵێ و خۆی بە دەستەوە دا. هیچ کەس وەك ئەو و ئاوا لە گیان و ژیانی خۆی وەڕز نەببوو و بەو جۆرە خۆی بە مەرگ نەسپاردبوو. هیچ کەس... مەرگ فریای کەوت. ئەگەر مەرگ درەنگتر هاتبایە سۆراغی، ئەو یان خۆی دەکوشت یان شێت دەبوو.

باران، سات بە سات توندتر دایدەدا. بارانەکە جار بە جار توندتر و قایمتر لە سوالّەتەکەی سەربانی دەدا و خرمەی لێ هەڵدەستاند. دەرگاکە کرایەوە و مام حەسەن وەژوور کەوت. جلوبەرگەکانی بە گیانییەوە نووسابوون و ئاو لە سەرتاپای گیانی دەچۆڕایەوە. لە بەری پێیەوە تا تۆقی سەری قوڕاوی ببوو و کا و کۆت و پووش و پەلاشی بە سەر و دەموچاوییەوە نووسابوو.

مستەفا بەگ گوتی:"باشە، بلێ بزانم حوسێن."

"مەحموود مورتەزا بەگی کوشتووە، گەورەم. لەوانەیە خۆیشت بیستبێتەوە. وەشوێنی کەوتم و چوومە بنج و بناوانییەوە. دەڵێن مەحموود رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو و پشووی لێ بڕابوو. وەك مردووانی لێ هاتووە. مەحموود بە گوندییەکانی گوتووە، گوتوویەتی هەر وا باشترە بە پێی خۆم بچمە بەردەستی "ئاق یۆللی"یەکان. لەوانەیە مەرگ دەرمانێکی هەبێ، بەلام دەرچوون و دەربازبوون لە چنگی "ئاق یۆللی"یەکان ئەستەم و مەحالە. مەحموود گوتوویەتی، مەحموود گریاوە و کڕووزاوەتەوە کە باشە چۆن ئەو خەڵقە چنارە، ئەو مورتەزا بەگە بە شان و باهۆ و جوانچاکەم پێ حەیف نەبوو... گوتوویەتی لەپاش مورتەزا بەگ ئیتر دنیا چ ناهێنێ. هەر هەموو بنیادەمەکانی دنیا بە پووشێك. .. با بچم و خۆڵ و خاکی بەر دەگای "ئاق یۆللی"یەکان ماچ بکەم، لانیکەم لەو کاتەدا یەکێکیان هەر دێتە دەرێ بمکوژێ و نەجاتم بدا. گوتوویەتی با لە تەنیشت مورتەزاوە بمنێژن. بۆ ئەوەی هەر دووکمان، وەك بەهەشت و دۆزەخ، لە تەنیشت یەکترییەوە بین. زۆر نالاندوویەتی و کڕووزاوەتەوە و گریاوە. تفەنگەکەی بە عەرزیدا داوە و خۆی بەسەردا داوە و داوێتە بەر پێلەقان. یەك پشوو گوتوویەتی، ئەی ئەو تفەنگەی مورتەزا بەگت کوشت، وەبن گڵت دەدەم بۆ ئەوەی نەتبینمەوە. گەلێك پێلەقەی پێداداوە و وەك شێتان لەسەری هەڵپەڕیوە. ئەوەندەی پێداداوە و هەڵپەڕیوە کە تفەنگەکە لە قوڕەکە چەقیوە و ون بووە. ئیتر مەحموود وەڕێ دەکەوێت و چەمەرییەکی کوردی دەچڕێ و بە گریان و ناڵین روو لێرە دەکا و دێ، بەلام پیاوەکانی دەروێش بەگ دەیگەنێ و هەوڵ دەدەن بیگێڕنەوە. کەچی مەحموود ئیزن نادا کەس لێی بچێتە پێشێ، وەك لۆکی مەست.... کوردەکانی جیانلی گوتیان لە شین و چەمەرییەکەیدا هەر گوتوویەتی: مورتەزا بەگ، یاخوا ئەو چاوە کوێر بێ کە سەیرت دەکات و ئەو دەستە بشکێ لێت رادەسێ. گوتوویەتی:"سەبەبکار، هەی سەبەبکار ماڵت کاول بێ و چاوت کۆرە بن. ئاخرییەکەی بە شەوە نووتەکەکەدا رۆچووە و تێکەلاوی شەوەکە بووە. لە دوور دوورەوە دەنگی شین و گریان و نووزانەوەیەك، شیوەنێك لە

شەوەوە هاتووە و لە ئاناوەرزادا دەنگی داوەتەوە. دێهاتییەکان هەتا بەیانی لەبەر گریان و ناڵینی مەحموود خەو نەچووەتە چاویانەوە.

مستەفا بەگ کپ و بێدەنگ گوێی دابووە قسەکانی حوسێن و وردە وردە روخساری زەرد هەڵدەگەڕا. دوای ماوەیەك زەردییەکە سپی هەڵگەڕا. سپییەکی کاغەزی وەك بڵێی هەموو خوێنی گیانیان هەڵمشتبێ.... دەستەکانی لەرزین و ئەوجار لە پڕێکدا بە گوڕەیەکی تیژی وەك شێر، نەڕاندی:"بێدەنگ بە، بیبڕەوە، بیبڕەوە حوسێن، بەسە، بەس."

تاوێك بێدەنگییەکە باڵی بەسەردا کێشان.

مستەفا دوای تاوێك، وەك هیچ نەبووبێ، بە هێمنی پرسیاری کرد:"ئەو، ئەو کابرایە، چ لەو کابرایە بکەین؟"

"جا دەکرێ چیی لێ بکەین؟ چما پێی لەماڵەوە دێنێتە دەرێ."

"دەبێ هەر چۆنێك بێ بیکێشینە دەرەوە."

"بەڵام دەرکێشانی لە کۆشکەکەی زۆر سووك و سانا نییە. ئەگەر دنیاش لافاو بیبا، ئەو لە کۆشکەکەی نایەتە دەرێ."

"باشە ناکرێ کۆشکەکەی بەسەردا کاول بکەین؟"

حەمدی دەستپێشخەریی کرد:"کاولی دەکەین، ئەگەر هیچ چارمان نەبێ..."

"ئەی ئەوکات دەروێش بەگ چۆن دەکوژین؟ دەبێ هەر لەو حەوتووەدا مشووری بخۆین."

حوسێن گوتی:"من دەناسێ. ئەمن ئیتر ناتوانم بچمە ئەو ئاواییەوە."

"چۆن دەکرێ گورگ لە لانی دەربێنیتە دەرێ؟ مەسەلەکە ئەوەیە. ئەو کارە هەر دەبێ لەم حەوتووەدا تەواو بکرێ. حەوتووەکمان دەرفەت هەیە. ئەگەر بەدرەنگی بکەوێ، ئیتر تام و بایەخی نامێنێ. هەر چۆنێك بێ دەبێ تەواو بکرێ. ئەنگۆ دەڵێن چی؟"

هەمووان بیریان دەکردەوە و وەڵامیان نەدایەوە. دیسان پرسیی:"چۆنی دەکێشنە دەرێ؟"

حەمدی پەنجەی ئەسپێ کوژەی لە زاری نابوو و دەیمژی. هەر کاتێ گرێ کوێرەیەك دەکەوتە کارەکانەوە، وای دەکرد. پەنجەی لە زاری دەرهێنا و وەك ئەوەی قسە لەگەڵ خۆی بکا گوتی:"دەبێ بکوژرێتەوە، بێ ئەملا و ئەولا دەبێ بکوژرێ."

دەنگی حاڵەتی تووڕەبوونی بەخۆوەگرت و لەرزی:"دەبێ بیکوژینەوە."

"بەڵام ئاخر چۆن؟"

"ئەوەیان ئیتر چۆنی بەگ بفەرموێ. چۆنی بەگ ئەمر بکا ئاوای دەکوژین."

ددانی له سەر یەك داگرت و له بنەوه گرماندی:"دەبێ بیکوژین."

مستەفا بەگ:"ناتوانم چاوەڕێ بم. ئەو کاره تا زووه دەبێ ڕاپەڕێ."

حوسێن:"کەوابوو چارمان نییه جگه لەوەی کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی ئاگر دەین. ئەو کات هەر هاته دەرێ... ئەو کاتەی کۆشکەکە دەسووتێ..."

"یانی تۆ دەڵێی کۆشکەکەی ئاگر دەین، ها؟"

"ئەی چارەیەکی دیکەمان هەیە؟"

مستەفا بەگ:"ئەو پێشنیاره به کار نایه. هەر ئەم حەوتووە دەبێ دەروێش بەگ بکوژرێ. هەر کەس ڕێیەکی باشتری پێ شك دێ با بیڵێ. جارێ هەستن بڕۆن، بیری لێ بکەنەوە بزانن چمان پێ دەکرێ."

مام حەسەن:"یانی تۆ دەڵێی له چوار پێنج ڕۆژدا دەکرێ دەستمان به گورگێکی باران دیتووی وەك دەروێش بەگ ڕابگا؟ گورگێکی ئاوا له ماوەی چەند ڕۆژێکدا دەکوژرێ؟ ئەگەر تەنمان پێ ڕابگا بۆ کوشتنەوەی...."

"چارمان نییه جگه لەوەی هەر لەو حەوتووەدا بیکوژینەوە. تێگەیشتی مام حەسەن؟"

مام حەسەن بەبێ وەڵامدانەوە له ژوورەکە وەدەر کەوت.

مستەفا بەگ دەمانچەکەی که له پێشی بوو، پڕی کرد و خستییەوە نێو قایشەکەی و له بەرقەدی خۆی دا. فیشەکەکانیشی که له پێشی کۆ کرابوونەوە، له فیشەکدانەکانی کردنەوە و فیشەکدانەکەی له قەدی دا و ئەوجار به دەم بیرکردنەوەوە له پلیکانەکان چووە خوارێ و هەرای کرد:"ئەسپەکەمم بۆ بێنن."

ئەسپەکەیان بۆ هێنا. لێی سوار بوو و خۆی به تاریکاییەکەدا کرد.

بارانەکه به خوڕەم و یەکڕیز دەباری. وردە وردە له گردەکەوە داگەڕا. ئەسپەکەی چەند جارێك ڕاوەستا و گوێی قوت کردن. که گەیشتە زەوییە تەختانییەکە، قەمچییەکی لێ دا. ئەسپەکە له تاریکاییەکەدا هەتا ئەژنۆی له قوڕ دەچەقی و نەرمەغاری لێ دەشێوا. پاش سەعاتێك ئەسپەکەی وا له قوڕ چەقی ئیتر نەیتوانی بڕوات.

بارانەکه جار به جار توندتری دەکرد و ئەو هەر وا ئەسپی خۆی لینگ دەدا. له دوورەوە چرایەك له سەر گردێك ترووسکایی دەهات. بەرەو ڕووناکاییەکە لێی خوڕی. ڕووناکاییەکەی باش دەناسی. ئەوە هەر ئەو ڕووناکاییه بوو، که ساڵانی ساڵ بیری لێ کردبۆوە و به خەیاڵ لەگەڵی ژیابوو.

بەرەبەری بەیانی لە ڕووناکاییەکە نزیك بۆوە و ڕووناکاییەکە لەگەڵ ڕووناکایی کازیوەدا کوژایەوە.

کۆشکەکەی دەروێش بەگ لە تاریك و ڕوونی بەیانیدا و لە سەر گردەکە و لە نێو دار چنارەکاندا وەدەر کەوت. هەوساری ئەسپەکەی کێشا و ئەسپەکەی ڕاگرت. قوڕگی وشك بوو و چاوەکانی برژانەوە. ئەو کۆشکە زۆر جوامێری لێ ئەستاندبوو. دوو دڵۆپە فرمێسکی داغ لە کوڵمەکانییەوە خزینە خوارێ.

مورتەزای برای لە نێو ئەو قوڕە چەقەیەدا نوستبوو و دوژمنەکەشی، قاتڵەکەی لەو کۆشکە بەرین و هەراوەدا کەیف و نەهەنگی خۆی دەکرد.

"نا، نا، هەرچۆنێك بێ هەر لەم حەوتووەدا دەتکوژمەوە. بەر لەوەی ئەو بارانە خۆشی بکاتەوە، بەر لەوەی ئەو بارانە ژەهراوییە لێی بکاتەوە ئەتۆش دەچیتە بن ئەو خاکە ڕەش و تاریکەوە."

دیوارەکانی کۆشکەکە هێدی هێدی ڕوون بوونەوە و سپی داگەڕان و سێبەری چنارەکانیش بە سەر زەوییەکەدا کشان. هەڵڵا و قریوە لە ئاوەدانییەکە بەرز بۆوە. ئەوجار دەنگێکی گڕ و بەرز بەسەر هەموو دەنگەکاندا کشا.

بارانە بە خوڕەمەکە، بە لێزمە وەك گۆزەی سەرەوبن دەهاتە خوارێ.

# ٥

ریزە قورینگێك کە لە سەر چیای گاورانەوە دەهاتن، بە سەر ئاناوەرزادا تێپەڕین و لە رۆژئاواوە و لە دەوروبەری تەنگەڵانەکەی گولەك لە چاوان ون بوون.

قەتاری قورینگ هەمیشە نابینرێ. دیتنی قورینگ شومی باشە. کاری قەتارە قورینگ سەیر و سەمەرە و نامۆیە. جا قورینگ هەمیشەش نابینرێ. گەلێك جوان و دلڕفێنن. لەوانەشە دیتنی قورینگ ئاماژەیەك بێت بە شادی و خۆشی. لەوانەشە بە تەمەنێکی درێژ و ئارەزووی پێك گەیشتن. قورینگەکان لە شوێنێك دەنیشنەوە کە لە گۆل و ئەستێرك نزیك بێت و بە تەشقی ئاسمانێدا دەفرن و بە ئاسمانەوە دەڵێی خاڵێکن دەبزوون.

بایەکی سارد هەڵیکرد. هەورەکان لە باشووری تاریکەوە، بە سەر دەریای نێوەڕاستدا بەرەو شاخەکان هەڵدەکشان. هەوا تاریکدا هات. لە چەپ و راستەوە "با" شێتانە لە رۆژهەڵات و رۆژاواوە هەڵیکرد. لەو کاتەدا قەتارە قورینگێك لە ئاسمانەوە دەرکەوتن. بەرەو باشوور دەفڕین. هەر دەتگوت تووشی تۆفان و بۆرانێکی ئاسمانی بوونە. قەتارەکە شەپۆلێکی دا و تێك چرژا. ئەو قەتارە قورینگەی گلۆڵە ببوو، تاوێك لە چەپەوە بۆ راست و لە راستەوە بەرەو چەپ لە بەر یەك کشایەوە و رووی کردە لای رۆژاوا. رەشەبایەکی دیکە تێکییەوەپێچا. بەولاولایدا دەدا و رەشەبایەکی دیکە دەیڕفاند. قورینگەکان ساتێك لێك بڵاو بوون. بایەکە نیشتەوە و قورینگەکان دیسان وێککەوتنەوە و ریز بوونەوە. بارانێکی بە خوڕەم دایکرد. قورینگەکان خووسان و تێکەڵاوی هەورەکان بوون.

قورینگ مەیلەو کەسکن و دەنگێکی خەمناك و تیژیان هەیە.

بارانەکە هیچ، بۆ ساتێکیش خۆشی نەدەکردەوە و ئەو بارانە لەگەڵ ئەو تازیەبارییە هاودەنگ بوو. قورینگێکی بریندار کەوتە نێو حەوشەی کۆشکەکەوە. دەروێش بەگ بە چاوی

خۆی بەربوونەوەی ئەو قورینگەی دی. قورینگەکە وەك باڵندەیەکی زامار، نەخێر وە بەردێك شلْپ بەربۆوە. قورینگەکەیان هێنایە لای بەگ. پەڕ و پۆی خووسابوون و پێکەوە نووسابوون. بارانەکە تا مێشکی ئێسقانی ڕۆچووبوو. هەڵمێکی سەیر و سەرەمەرە و توندی لێ هەڵدەستا. دەتگوت بنیادەمە و ئارەقەی کردووە... جەستەی قورینگەکە گەرم بوو. چەند جارێك دەندووکی کردەوە و لێکی نایەوە و ئیتر یەکجاری لێکی نا و دەروێش بەگ هەموو گیانی باڵندەکەی پشکنی. هیچ کوێی بە حاستەم و دوو بەڵاش چییە بریندار نەببوو. قورینگەکەی دانا.

بارانەکە هەر وا بە خوڕ دەباری و دەتگوت گۆزەی سەروبنکراوە.

قورینگەکەیان هەڵگرت. گیشە قامیشەکە لە نێو باخچە مات و تارەکەدا دەبریسکایەوە. دەتگوت سەیری بنیادەمێکی مردوو دەکەن. هەر وەك چۆن بەزەییان بە مرۆڤێکدا دێتەوە، ئاواش زگیان بەو دەسووتا. مردوو شتێکی سیحراوی و پیرۆزە ـ تەرمی مرۆڤ.

منداڵی گەڵ و قوون رووت لە بەر بارانەکە گەمەیان بە قورینگەکە دەکرد. هەر دوو باڵە گەورەکەیان لێك کردبۆوە. کوڕێژگەیەك سەری باڵێکی و کوڕێژگەیەکی دی سەری باڵەکەی دیکەی گرتبوو و یەکێکیش لاقەکانی. منداڵەکان تا ئەژنۆیان لە قوڕەکە چەقیبوون. قورینگەکە سەری شۆڕ ببۆوە و دەندووکی بە نێو قوڕ و لیتەکەدا دەکشا و پەڕ و پۆ رەنگاوڕەنگەکانیشی بە چنگی منداڵەکانی دیکەوە بوو... منداڵەکان کردبوویانە قریوە و هەڵڵا. گەمەیەکی سەیریان بە قورینگەکە دەکرد. هەڵڵا و هەنگەمەکەیان گوندەکەی داگرتبوو. ژمارەشیان هەر دەهات و پتر دەبوو.

قورینگەکەیان لە قوڕێ هەڵکێشا. لە ئاوایی چوونە دەرێ. گەمە سەیرەکە بەردەوام بوو. بارانەکە هەر دەباری. منداڵەکان خووسابوون و کراسەکانیان بە لەشیانەوە نووسابوو.

منداڵە وردکە گەیشتنە دەم ئاوەکە. قورنگە قوڕاوییەکەیان جوان و زەریف شوشتەوە. قورینگەکە دەتگوت ئێسك و پرووسکە. پەڕ و پۆی پۆل پۆل پێکەوە نووسابوون و هەڵکێشرابوون.

وایان سەیر دەکرد، دەتگوت سەیری بنیادەمێکی مردوو دەکەن.

بە چاوی لە درشت و خەفەتبار و لە ژێڵڵاهاتووەوە سەیریان دەکرد. ئەستەم بوو خۆ لە بەر ئەو نیگایانە رابگری. ئەو چاوانەی لێیان دەڕوانی هەر دەتگوت لە حەیوانێکی پیرۆز و شتێکی سیحراوی و ترسناك دەڕوانن...

هەموو لێیان سوورە، ئەمڕۆش نەبێ، سبەی دەکوژرێ. دەکوژرێم.

چۆنی مستەفا ئاق یۆللی" چەند ساڵان بوو چاوەڕێی بوو، هەر واش دەرچوو. تەنانەت ئەگەر قەرار بێ پێکەوە بمرن، ئاق یۆللی" دیسان هەر بەم زووانە دەیکوژێ.

بەڵام ئەمن هەر دەژیم. ئەگەر سێ رۆژی دیش بکوژرێم، جارێ زیندووم... باشە ئەمن وەك مردووەك سەیری ئەوان دەکەم؟ ئەوانی هەر هەمووان دەمرن. هەر چۆنێکی بێ هەر دەمرن. یانی ئەوە هەر هەمووی نێچیری مەرگن؟ یەکتری بە مردوو دەزانن؟

جا قورینگەکە لە ئاسمانەوە کەوتە نێو زاری مەرگ. قورینگ بە مردنی خۆی نازانێ. قورینگەکان ناتوانن بەو چاوە سەیری یەکتری بکەن. باشە قورینگەکانیش شاد و خەمبار دەبن؟ ئەوەی مەرگ ناناسێ، ناتوانێ هیچ شتێك بناسێ. ئەوانەی مەرگ ناناسن، دەژین، بەڵام حیساب ناکرێن. ئەگەر مەرگ نەبوایە، ئەگەر ترسی مەرگ نەدەبوو، ژیان چۆن دەبوو؟ شتێکی بێزارکەر... هەر لە بەر مەرگە کە دەمانەوێ، تۆزێك پتر، تاوێك زیاتر بژیێن. ئەگەر مەرگ نەدەبوو... باشە ئاخۆ قورینگەکانیش وەك بنیادەمان حەزیان لێیە چەند رۆژێك پتر بژیێن؟...

کەس لە چنگی مەرگ دەرناچێ. مەرگی من زووتر دەگاتێ. هەموو هەوڵێشم ئەوەیە، کە چەند رۆژێك پتر بژیێم. تاوێك، چەند ساتێك.

یانی هەر بەراستی هیچ هیوایەك، هەر هیچ هیوایەك نەماوە؟ یانی مەرگ چارەنووسێکی بێ دەرمانە؟ چارێك، چارێك لە بەرانبەر مەرگدا...

لە ماوەی چەند رۆژێکدا ئاخرییەکەی چارەنووسی دیاریکراو... و چەندی درەنگتر بێ، زۆر زۆر درەنگتر بگاتێ... چەند مانگێك و... زۆر زۆر بخایەنێ ساڵێك دواتر... خۆ ئاخرییەکەی هەر دەکوژرێم.

ئەو تەزووە ساڵ و سووتێنەر و وورووژێنەرەی چزووی لە دڵێدا بوو، هەموو گیانی تەنییەوە و سەرتاپێی لەرزاند.

"تێدا دەچم. دەفەوتێم. نەمان، نەمان، نامێنم و تێدا دەچم. ئەویش لەو هەرەتی لاوەتییەمدا. گەلێ ساڵ و زەمەن دێن و رادەبرن. سەدان ساڵ تێدەپەڕێ. ملیۆنان ملیۆن ساڵ تێدەپەڕێ و ئەمن لەگەڵ نەمان دەژیم. هیچ، هیچ نامێنم. ئەو بارانەش کە دەبارێ، ئەو بایەی هەڵیکردووە، ئەو هەتاوەی دەدرەوشێتەوە... بەهاری گەش، دەستی گەرمی دۆستێك... ئەی کە وایە بۆچی مورتەزام کوشت؟ لانیکەم خۆ لە من پتر لە مەرگ دەترسا. ئەگەر مورتەزا نەمردبایە، ئەمنیش هەتا سەر دەژیام. بە کوشتنی مورتەزا مەرگم بانگهێشت کرد. بۆچی؟ ئەگەر مورتەزا ژیابایە، ئەو مەسەلەیە دەبڕایەوە. مەحموود هەر نەیدەویست بیکوژێ. بۆچی

ناچارم کرد؟ مەرگی مورتزا مەرگی مەحموودیش بوو. مەحمووی خۆی ئەوەی دەزانی. باشە بۆچی مەرگی قەبووڵ کرد؟

کەیفی بەوە دەهات کە گوێی لە دەنگی خۆی دەبوو. لە ناخ و دڵیدا وەك شێتان هەستی بە مەرگ و نەمان دەکرد. تۆزێکیش دەنگی نزمتر کرد. لەوانەش بوو دەنگی هیچ نەیەتە دەرێش، بەڵام هەر پێشی وابوو بەرزە.

"هیچ بوونەوەرێك، هیچ خولقاوێك ئەوەندەی ئازار و تاڵی و مەینەت نەچێشتووە. دەڵێن ئەوەی ژان و ئازاری مرۆڤ سووك دەکا، ئەوەیە کە مرۆڤ هەرگیز باوەڕ ناکا ڕۆژێك دەمرێ. بەڵام وا نییە. درۆیە، درۆیە... هەمووان لێیان سوورە دەمرن. تەنانەت کام مرۆڤ لە هەمووان گەمژەترە و بڕوا ناکات ڕۆژێ دەمرێ، ناتوانێ ئەوەندەی حەز لە ژیان بێ و هێندەی پێوە ببەسترێتەوە. ئەمن دەروێش بەگی ساری ئۆغلی دەکوژرێم و خۆیشم لێم سوورە کە هەر لەو چەند ڕۆژە دا دەکوژرێم. لێم سوورە ئەمڕۆش نەکوژرێم، سبەی هەر دەکوژرێم. تا ڕادەیەکیش ئەوەم لێ ڕوونە کە فیشەکەکە وەکوێم دەکەوێ. دەشزانم چەندی هەوڵیش بدەم ناتوانم لە چنگی ئەو مەرگە خۆم دەرباز بکەم و جا چونکە ئەو ڕاستییەم لێ ڕوونە، لە هەموو ساتێکی ژیانمدا دەمرم و دەژێمەوە و دەمرمەوە. ئەمن لە هەموو وردە و چرکەکانی مەرگدا دەژییم. هەر بۆیەشە لەو سەر زەوییە کەس نییە هێندەی من ژان و ئازار بچێژێ.

"بە ڕاستی گەمەیەکی چەپەڵ و قۆڕە ئەو گەمەی مەرگە. پیسترین گەمەیەکی بنیادەم دایهێناوە، ئەو گەمەی مەرگەیە... هەتا سەر چوونە پێش و بەرەو پێشەوە بردن و تەواوکردن، باشە بۆ؟ جا ترسناکترین گەمەکانی مەرگیش ئەو گەمەی خوێن ئەستاندنەوەیەیە. نەفرەتبار، بە نەریتکردنی پیاوکوشتن، ترسناك و تۆقێنەر.

"کوڕە خۆ بە دەستی خۆم بوو ئەو گەمەیە هەڵبژێم یان کۆتایی پێ بێنم و بیبڕێنمەوە. ئەگەر مورتەزا بەگ نەکوژرابایە، هەر لێرەوە دەبڕایەوە و هەموو شتێك دوایی دەهات. دەی باشە ئەی بۆچی بە لاسارییەوە کەوتمە شوێن بنیادەمێك کە چارەنووس وەك دەواری شڕ دەهێنا و دەیبرد؟ باشە بۆچی هەموو ڕێگەکانی دەربازبوونیم لێ داخست؟ باشە ناچار بووم؟ ئەگەر ناچار نەبووم، ئەوەندەم سەر لە دووی دەنا؟ لەو گەمە ترسناکەی مەرگدا، چما شتێکیش هەیە شیاوی پاشگەزبوونەوە بێ؟

"تازە کار لە کار ترازاوە. مستەفا ئاق یۆللی" پیاوێکی زیرەکە. ئەوان جەودەت بەگی برامیان کوشت و ئێمەش مورتەزا بەگی برای ئەوانمان کوشتەوە. ئیتر بەسە. وا باشترە هەر

لێرەوە سەری وێك بێنینەوە. یەکێك لە ئێمە و یەکێك لەوان... بەڵام بەخوای نابڕێتەوە. سەری وێك نایەتەوە. ئاق یۆللی" پیاوێکی ژیرە. هەموو شتێك سەنگ و سووك و شەن و کەو دەکا، بەڵام ئەو هێز و توانایەی پێ نادۆزرێتەوە کە کۆتایی بەو مەسەلەیە بێنێ. هەر وەك چۆن ئەمن پێی نەگەیشتم، بە خوای ئەویش پێی ناگا.

"ئاق یۆللی"دەمکوژێ. جا بە دەستی خۆیشی... و بە ئەشکەنجەش. براکەی لە گیانی خۆی پتر خۆش دەویست."

دەنگێك کە لە ناخییەوە هەستابوو، هاتە سەر زمانی:"نامرم."

ئەوجار سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد بۆ ئەوەی بزانێ کەس گوێی لە دەنگی بووە یان نا. لە بن لێوانەوە گوتییەوە:"ئەو چارەنووسە سامناکەش دەشکێنم. وای دانێین سەدان ساڵە کەس لە چنگی ئەو چارەنووسە دەرنەچووە، بەڵام ئەمن دەرباز دەبم."

بەڵام چۆن دەیتوانی دەربچێ؟ ئیتر، ئەوەی بۆ نەدەچووەوە سەر یەك، هەر ئەوەندە بوو دەنگێکی دڵنیا لە ناخییەوە دەبیسرا کە دەیگوت:"دەردەچی و نەجاتت دەبێ دەروێش بەگ."

مستەفا ئاق یۆللی" وا هەڵچووە و ئەوەندە توورەیە کە دەیەوێ خۆیشی لەگەڵ خەڵکەکە وێکڕا بفەوتێنێ. هەتا ئەو دەمەی رقەکەی نەنیشتووەتەوە و ئەقڵی نەهاتووەتەوە بەرخۆی، نابێ خۆی پێشانی بدەی. ئێستا لەو کاتەدا چیی کاری شێتانە و قۆڕە دەیکا. دوای چەند مانگان هەموو شتێك دەگۆڕدرێ. جارێ مەسەلە ئەوەیە ئەو رقە بێ جڵەوەی بڕەوێتەوە. بەڵام ئاخر چۆن؟

خۆ ناکرێ خۆت بشاریتەوە. لەو چوکووراوا کاکی بە کاکییەدا کوێت هەیە خۆی لێ بشاریتەوە. خۆ هەر تاقە رۆژێك کەمتەرخەم بی، کارت تەواوە. دەی جا خۆ پەنا بردنە بەر شوێنی دیکە و بیر کردنەوە لە دنیایەکی دیکە، هەر بۆوەی نابێ بیریشی لێ بکەیتەوە.

دەروێش بەگ لەو کاتەوە مورتەزا بەگ کوژرابوو، لە داماوی و دەستەوستانیدا دەتلایەوە و لە هیچ کوێ دەرمانێکی بۆ دەردەکەی خۆی دەست نەدەکەوت. خەریك بوو دەخنکا. خۆی مەرگی بەچاوی خۆی دیتبایە زۆر ئاسانتر بوو لەوەی بە ترسی مەرگەوە بژی.

"خاتوون، خاتوون، گوێت لێمە؟ ئەو ئیتر ناتوانێ بمکوژێ، ئیتر ناتوانێ، نا ناتوانێ. تا سەر دەژیم. هەتا حەفتا ساڵان، تا دەبمە سەد ساڵ هەر دەژیم. بە قەد باپیرەم دەژیم. وەك چۆن نەیانتوانی باپیرەم بکوژنەوە، ئەمنیشیان پێ ناکوژرێتەوە. ئەوە بۆ ئاوام سەیر دەکەی خاتوون؟ باشە بۆ ئاوا؟ هەر دەڵێی سەیری مردووان دەکەن. چما من مردووم؟ چما من کوژراوم؟ دەی پێم

بلێین نەحلەتییانە." لە دڵەوە دەکوڵی و کوڵ و کۆیەکەی بە سەر ئاواییدا دەکشا:"هیچ کەس ئەمنی، هیچ کەس، تەنانەت مستەفا ئاق یۆللی"ش منی پێ ناکوژرێ. ئەمن وەك باپیرەم عومر لە خودا دەبڕم. ئەمن مردوو نیم و ناشمرم. تێگەیشتی خاتوون؟ تێگەیشتن دێهاتییە هیچ و پووچەکان؟ ئەوەی من دەکوژێ هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە." ژنەکەی گریا و بە نووزانەوەوە گوتی:"ئاااخ، سەد خۆزگە... چووزانم... سەد خۆزگە، سەد بریا وا بوایە. خۆزگە وا دەبوو و ئەمن دەست و لاقێکم نەمابایەن و هەر دوو چاوم کوێر بوایەن. خۆزگە وا دەبوو ئێمە دووبەدوو کۆڵان بە کۆڵان و ماڵ بە ماڵ سواڵی حەوت گوندمان دەکرد. تا دەمردین. ئاااخ. ئەی خۆزگە وابێ و خوا لە زارت بڕوانێ. خوا لێت ببیستێ."

"ناتوانێ بمکوژێ. ناتوانێ بمکوژێ خاتوون. دڵنیا بە و خەفەتی لێ مەخۆ."

رێك لەو کاتەدا کە لە دڵەوە ئەو قسانەی دەکرد، نیگەرانی فیشەکێك بوو کە لەوانەبوو لە پەنجەرەکەوە بێ و سینگی بسمێ.

هەوا قورس و مەرگاوییەکەی کۆشکەکە لە مەرگەکەش بەلایەوە قورستر بوو و نەیدەزانی چۆن لە بن بارستایی ئەو قورساییە سامناکە دەرباز بێ. لەوانە بوو رێگەیەك بدۆزێتەوە پێیدا لە مەرگ نەجاتی بێ، بەڵام چۆن دەیتوانی لەو هەوا مەرگاوییە رزگاری بێ.

باشە ئەی ئەگەر بەر لەوەی ئەو تۆ بکوژێ تۆ ئەو بکوژیت چ دەبێ؟... خۆ دیارە بە هەر دوو بارەکەیدا هەر مەرگە، بەڵام مەرگێکی ئاوا جوانتر نییە؟ لانیکەم دەکوژیت و دەکوژرێیتەوە... هەر هەموو بنەماڵە و کەسوکاری ئاق یۆللی" ورد و درشتیان، پیر و پەککەوتە و گەنج و نێر و مێیان بکوژی و جووقەواریان ببڕی و روو لە شاخ بکەی....

ئەوەی تا رادەیەك بە لاوە ماقووڵ بوو. چەند ساتێك کەیفی بەو بیرۆکەیە کە جێبەجێ دەکرا، هات.

شەوێکیان... بەرەبەری بەیانی... ئەو دەمەی هەمووان لە شیرین خەوێدان، چەند کیلۆیەك دینامێت، لە گۆشەیەکی کۆشکەکەوە... لە هەر چوار گۆشەی کۆشکەکەی "ئاق یۆللی"یە دادەنرێت... و دوایی، دوایی... تەقینەوە... مستەفا بەگ و هەموو خەڵکی نێو کۆشکەکە... بە چاوتروکانێکا... با بە نێو کۆشکەکەدا دەگەڕێ... کۆگایەکی گەورەی بەرد و خاك و خۆڵەمێش... و دوای ئەوە ئیتر مرازت حاسڵ بووە و هەموو شتێك سەری گرتووە. پشتت بە چیاکانی تۆرووس بسپێرە. چەندی لە چیا بژیێی، هەر سەرکەوتووی.

ئەوەی بنیادەم ئازا دەکا، دڵ نییە، تێگەیشتنە. هەلومەرجە کە پیاوی ئازا و دلێر دروست دەکا. هەرای کرد:

:"هیدایەت"

هیدایەت لە باخچەکەوە وەڵامی دایەوە:"فەرموو بەگم."

بە فیلینتایەکی ئەڵمانییەوە وەژوور کەوت و دەستەونەزەر لە بەرانبەری راوەستا. کورتەباڵا بوو و دەموچاویشی وەك دەموچاوی کیژۆڵان بێ موو. ئەو بێ موویيە روخساری وەك هیی منداڵان لێ کردبووەوە. بەڵام چەند هێندێ چرچ و لۆچی سەر ئەو دەموچاوە کۆسەیە، لە یەکەم نیگادا کە سەیریت دەکرد، دەری دەخست کە تەمەنێکی تێپەڕاندووە. منداڵی، شێلگیری و فێڵبازی و ساکاری و دڕندەیی لەو دەموچاوە بێ ریش و سمێڵەیدا تێکەڵاوی یەك ببوون. سێ ریزە فیشەکی بە قەدییەوە و دوو ریزیش راست و چەپ بە سینگیدا هاتبوون. هیدایەتە کۆسە بەو فیشەکدانە زیوکفت و دەورچنراوانەوە لە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی دەچوو.

"هیدایەت، دەنگ و باس چییە؟"

"هیچ بەگم... ئەوەندە نەبێ کە دوێ شەوێ سوارێك هات. بەر لە کازیوە. هەتا تاوکەوتنێ لەبەر ئەو بارانە بێ ئەوەی ببزوێ راوەستا. چاوی بە پەنجەرەکە بڕیبوو. لەگەڵ تاوهەڵات، لەئەسپەکەی وەژاند و رۆیشت."

"کێ بوو؟ دەبێ کێ بووبێ؟"

"ناسیمەوە بەگم. مستەفا ئاق یۆللی" خۆی بوو. لە نزیکەوە دیتم. خۆم دایە بەر قەپۆزی ئەسپەکەی ئەو نەیدیم. دەتگوت لە جێی خۆی رەق بووە. دەتگوت نە هیچ دەبینێ و نە هیچ دەبیستێ. سێ جاران لوولەی تفەنگەکەم وە قەپۆزی ئەسپەکەی کەوت، بەو حاڵەشەوە هەر نەیدیتم. ئەوە هەمووی لە تاریك و روونی بەیانیدا بوو. چاوەکانی دەتگوت شووشەن. بەبێ ئەوەی چاوبتروکێنێ، سەیری کۆشکەکەی دەکرد. کە تاو هەڵات، چەپکێ تیشك کەوتە سەر نێوچاوانی. مستەفابەگ لە پڕ راچەنی و رێك لەو کاتەدا منی دی و بەبێ راوەستان قەمچییەکی لە ئەسپەکەی دا. ئەسپەکەی وا بە پڕتاو لینگ دا کە... پێم وابوو شێت بووە. من ئەو باش دەناسم. ئەویش من باش دەناسێ..."

"هەشت ساڵان کارت بۆ کردووە، وا نییە هیدایەت؟"

"وایە بەگم. هەشت ساڵی رەبەق. وەك بەری دەستی خۆم دەیناسم. ئەو حاڵەتەی ئەو جێی مەترسییە. ئیتر لە چنگی دەرناچین. خۆزگە کوشتبایەم بەگ، وا نییە؟":

"ئەی خۆزگە کوشتبات هیدایەت. یانی وا هەیە دیسان دەرفەتی ئاوا بڕەخسێتەوە؟"
"ئاخر ئەمن بەبێ ئیزنی تۆ نەمدەتوانی بیکوژم. تازە هەلی ئاوا هەڵناکەوێتەوە بەگم."
"ئەگەر هەلی ئاوا هەڵکەوتەوە، دەبێ بیکوژی."
"ئاخ، یانی دیسان هەلی وا هەڵدەکەوێتەوە؟"
"ئەی خەبەر و باسی مەحموود؟"
"مەحموود دوای ئەوەی لە چنگی جەندەرمەکان رای کردووە، چووەتە شاخ... چووەتە لای دێهاتییەکانی خۆمان... تفەنگ و تەقەمەنیشی دابین کردووە و گوتوویەتی تا زیندووم لە چیا دانابەزم و خۆم بە دەستەوە نادەم. گوتوویەتی سڵاوم بگەیەننە بەگ و لە زمانی خۆمەوە پێی بڵێن گەردنم ئازاد بکا. ئەمن نامەوێ لەو تەمەنەمدا بکوژرێم. ژن و منداڵم هەیە. گوتوویەتی ئەگەر دەیەوێ یارمەتیم بدات، با لە شاخ ئەو یارمەتییەم بدا. گوتوویەتی کە هاوین داهات، دەستی ژن و منداڵەکەم دەگرم و دەچمەوە وڵاتی خۆمان. دەچمەوە وان."
"ئەی دێهاتییەکانت راسپارد لە یارمەتیدانی مەحموود دەست لە هیچ شتێك نەگێڕنەوە؟"
"نەخێر، بەڵام رادەسپێرم."
"ئەتۆ ئێستا پاسەوانییەکەت بە محەڕەم بسپێرە. ئەسپەکان بێنە با سەرێك لە شارۆچکەی بدەین."
بارانێکی سامناك دەباری. فیلینتاکانیان سەرنخوون بە شانیاندا کردبوو. سمی ئەسپەکانیان لە قوڕەکە دەچەقین و قوڕ و لیتەکەی بەملا و لادا دەپڕیشکاند. تاوێك بەبێدەنگی رابورد.
کە لە جۆگەیەك دەپەڕینەوە هیدایەت گوتی:"بەگ، دەبێ ئاگامان لێ بێ. ئاق یۆللی" لەوانەیە شوێنمانی هەڵگرتبێ."
"خۆت شێت مەکە هیدایەت."
"ئەمن باشی دەناسم بەگ. ئەو ئێستا وەك سێبەری تۆ وایە و لێت جوێ نابێتەوە. هەڵەمان کرد لە کۆشکێ هاتینە دەرێ."
"هەڵەمان نەکرد هیدایەت."
"چۆنی تۆ بفەرمووی بەگ. دەی باشە هەڵەمان نەکرد."
نە کەپەنەکیان هەڵگرتبوو و نە بارانگێڕەوە. بارانەکە ئەوەندە توند بوو دەمودەست لە ئێسکیان کاری کرد و جلوبەرگەکانی بە لەشییانەوە نووساند. چۆلەکوژێك بە دەرەوە نەبوو، بەڵام دەروێش بەگ وریا و پەنجەی لە سەر پەلەپیتکە بوو.

لە ئاوەکە پەڕینەوە. جێی سمی تازەی ئەسپ بە ڕێگەکەوە بوو. کەلاکی هەڵۆیەك بە باڵی کراوەوە لە سەر ئاوەکە و لە نێو لك و پۆپ و قۆزاخە و توێڵکە کاژەکانەوە دەڕۆیشت.

هەوسارەکەی کێشا و لە دەم ئاوە لێڵەکە راوەستا و چاوی لە کەلاکە هەڵۆیەکە بڕی.

"ئەو ماستە بێ موو نییە هیدایەت. تێگەیشتی؟ ئەو ماستە بێ موو نییە...."

"تێگەیشتم بەگم."

"بە سەری تۆ ئەو قورینگەش وا بەیانی کەوتبووە حەوشەکەوە و ئەو کەلاکە هەڵۆیە! تۆ پێت وایە کێ ئەو هەڵۆیەی کوشتووە؟"

"هەڵۆ بە هەموو کەس ناکوژرێ بەگ. ئەوان بۆخۆیان دەمرن."

"هەڵۆکانیش دەکوژن هیدایەت، هەڵۆکانیش..."

وردە شەپۆلێك هەڵۆکەی هێنایە دەم ئاوەکە. هەڵۆکە بەو لك و پۆیانەوە گیرسایەوە، کە ئاوەکەیان دەلەراندەوە. تاوێك لە نێوانیاندا مایەوە و ئاخرییەکەی بەربوو. شەپۆلێکی دیکە هێنایە قەراغ ئاوەکە. کەلاکی هەڵۆکە ماوەیەك هەر بە دەم ئاوەکەوە، ئەو شەپۆل دەیدایە ئەویتر. دواتر شەپۆلێکی بەهێزتر و کەفچڕ کە لە نێوەڕاستەوە دەهات، رایدا و بردی و دەسبەجێ دووری خستەوە.

دەروێش بەگ بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"سەیرە، زۆر سەیرە."

هیدایەتیش گوتی:"زۆر سەیرە. ئەمن پێموابوو هەڵۆکان نامرن."

دەروێش بەگ ئەسپی خۆی لێ خوڕی. لەرەزێکی خزییە ناخ و دەروونی. لە ئاوەکە دوور کەوتنەوە و گەیشتنە دڕووەڵانێك. ئەسپەکان بە زەحمەت بە نێو قوڕ و لیتەکەدا دەڕۆیشتن. قوڕ و لیتەکە دەتگوت چەقەیە.

بارانەکە تاوێك خۆشی کردەوە و هەورەکان بڕێك رەوینەوە. تاوەکە تینێکی تێگەڕایەوە و لە بەر تیرێژەکەیدا، هەڵمێکی بۆنخۆش لە خاکە خووساوەکەی هەستا.

بۆن و بەرامەی گوڵان تێکەڵاوی هەڵم و تەمەکە بوون و بە دڕووەڵانەکە وەربوو.

هەورە چڕەکان لە رۆژهەڵاتەوە هەر هێندەی چاوترووکانێك هەر لە دەریای نێوەڕاستەوە تا تۆرووس، هەموو ئاسمانەکەیان داگرت. دڵۆپەی درشت و گەرمی بارانەکە دایکرد. دەتگوت خۆر ئاوا بووە. ئەسپەکانیان وا لێدەخوڕی دەتگوت هەر لە جێی خۆیان چەقیون و نابزوون.

لەگەڵ تاریکداهاتنی هەواکە، مەلێك لە بەر پێیان هەڵفڕی و بە شوێنیدا چەند تەقەیەك کرا. هیدایەت لە ئەسپەکەی خۆی فڕێدایە خوارێ، بەڵام دەروێش بەگ هەر وا بە سەر خانی

زینەکەیەوە مایەوە و بەبێ ئەوەی بشلوێ، بە هێمنی و بە زمانێکی تەوساوی و لۆمەکەرانەوە گوتی:"ئەوە چ بوو هیدایەت؟ یانی گیانی خۆتت ئەوەندە خۆش دەوێ؟"

فیشەکەکان بە راست و چەپیدا ویزەیان دەهات. فیشەکێك بناگوێی راستەی لستەوە. گوێچکەی راستە و لا روومەتی راستەی مێروولەی کرد.

"کورە خۆ فڕێ بدە بەگ. "ئاق یۆللی"یەکانن. بۆسەیان بۆ دانابووین."

هیدایەت خۆی خستبووە پشت بنە دڕوویەکەوە و نەیدەهێشت ئەوان ببزوون. هاوکات پەکپشوو لە بەر بەگیش دەپاڕایەوە لە ئەسپەکەی دابەزێ و دەستیشی کاری خۆی دەکرد.

تا شەو بەسەرداهات و هەتا وای لێهات ئیتر چاو چاوی نەدەدی، هەر تەقەیان لێك کرد. هەر تەقەکە راوەستا، دەروێش بەگ لە بن لێوانەوە گوتی:"با بگەڕێینەوە، ئەو پیاوە چاوی سوور بووە."

# ٦

خەو لە چاوی رەویبوو. مامی هاتەوە پێش چاوی. بنیادەمێکی کەڵەگەت بوو. دەتگوت ئەسپی عارەبانە. چاوی لە گوللە نەدەترسا و لە جێی خۆیدا گیانیشی لە سەر دەستی بوو.

لە یالّی کێوەکەوە داگەڕا. هەر دەتگوت جۆلانەی دەکا. هەوری تەم و مژ و بزنەگەلەکە لە تاریك و روونی بەیانیدا لە رەوەزە ئەرخەوانییەکانی ئاناوەرزاوە بەرەو خوار دەبوونەوە. تیشکێك لە دار بەڕووەکانی نێو رەوەزەکانەوە درەوشایەوە. ئەوجار کراسێکی سپی بە سەر گژوگیا و بڕکەکاندا کشا. بە هانکە هانك دەهات. وەعەرزی کەوت. لاقی لە گابەردێك هەڵەنگووت و لە سەر رەوەزەکەوە سەرەنگرێ بوو بە لایەکەی دیکەدا. تاوێك لە بەر رەوەزەکەدا کەوت. دەستەکانی لە قوڕگی کردنەوە و لەگەڵ دەستهەڵگرتنەکەی خوێنەکە فیچقەی کرد و بەسەر خۆڵ و بەردەکەدا پژا. بە هەستان و کەوتنەوە خۆی گەیاندە ئاواییەکە. لە ئاوێك دابوو یان تێکەوتبوو. هەموو گیانی ئاوی لێ دەچۆڕایەوە. لە گردەکە وەسەر کەوت بۆ ئەوەی خۆی بگەیێنێتە کۆشکەکە. هەنجیرە دڕکاوییەکان کە بە سەر چلّووکەکانیانەوە گوڵی گەورە گەورەی زەرد و مۆر پشکووتبوون، رێگەی کۆشکەکەیان تەنیبوو. لە رێگایە، بە سەر لك و پۆی هەنجیریە دڕکاوییەکەدا کەوت و دڕك و چقڵەکانی لە گیانی رۆچوون. هات و لە بەر دەرگاکە و لە تەنیشت مانگاکان و لە سەر پەین و پاڵەکە تخێل بوو. "چۆڕێ ئاو".

هەموو لە ماڵێ هاتنە دەرێ. سەری بە دار کۆخێکەوە نابوو. خوێن لە نێوان پەنجەکانییەوە هەڵدەقوڵی و لە سەر عەرزی گۆمیلکەی دروست دەکرد. بە پتە پت گوتی:"بۆ خۆتان دەزانن کێ لێی داوم."

تفەنگەکان پەیتا پەیتا تەقەیان دەکرد. پەیتا پەیتا و بێ پسانەوە. لە هەموو جێیەك و هەموو کەسێك، ماڵەکان، مانگ، هەنجیرە دڕکاوییەکانی ڕەوەزەکان و جۆگەی پڕ لە ئاو، هەر هەمووی لە تۆز و خۆڵدا ون بوون. بۆن و بەرامە تەڕەکەی ڕیحانە و تۆز و خۆڵی شەوەکە تێکەڵاو بوون.

دەنگی زرمەی سمی ئەسپەکان تاوێك بە نێودێدا گەڕا. دەنگی شۆڕە شۆڕی ئاوەکە بڕایەوە. بۆنی ڕیحانەکەش بڕایەوە. گوندەکە پڕ بوو لە هەڵڵا و قریوە. دەستەیەك هەڵۆی خەواڵوو لە ڕەوەزەکانەوە بەرەو شەوەکە فڕین. سوارەکان بە زرم و کوت، بە دەوری ئاواییدا خولانەوە و بە ژوور ئاواییەکەدا بەرەو ئەوبەری ڕووبارەکە چوون. هەموو شتێك بە تاریکاییدا ڕۆچوو. دەنگی باڵی هەڵۆکانیش زۆر نەمایەوە. بێدەنگییەکی سامناك باڵی بە سەر هەموو دەوروپشتدا کێشا.

شەوەکە کاڵ بۆوە و بەیان ئەنگوت و تاوێکی وەك پشکۆی ئاگر وەدەر کەوت. ڕەوەزە ئەرخەوانییەکان ئارەقەیان کرد و وا نوقمی ئارەقە بوون کە لە دوورەوە پێت وادەبوو باران باریوە. دواتر ئارەقەکە وشك بۆوە. وردە تررووسکاییەکان وەك نووکی دەرزی بە سەر گابەرد و ڕەوەزەکانەوە مانەوە.

تەرمەکە لە بەر دەرگا و لە نێو قوڕ و خۆڵ و شەڵاڵی خوێن خۆی گرمۆڵە کردبوو و بێکەس لە بەر تاوەکە کەوتبوو. چەند جووجەڵەی زەرد کە تازە لە هێلکە تررووکابوون، کەوتبوونە شوێن دایکیانەوە و جیکە جیکیان بوو.

مێشکێکی گەورەی کەسك بە ڕەنگی پۆڵای درەوشاوە خۆی بە کونە تفنکی مردووەکەدا کرد و هاتەوە دەرێ و فڕی و ڕۆیشت. تاوێك دواتر مێشەکان بوونە سێ. یەکێکیان بە وزە وز و بەردەوام و بێ ئەوەی ماندوو بێ هەر دەسووڕایەوە.

مستەفا ئاق یۆللی" ڕووداوەکەی وا لەبیر بوو دەتگوت هەر ئێستا بووە. باوکی چاوی لە ڕوخساری مردووەکە بڕیبوو. نێوچاوانی تێك نابوو و چاوی لە ژێڵڵا هاتبوون و حەپەسابوون و لێوەکانی مۆر هەڵگەڕابوون و سەر و قژیشی خووسابوو. تاوەکە هێند بە تین بوو کە دەتگوت شمەکەکانت لەبەردا دەسووتێنێ. کزە بایەك چییە لە هیچ لایەکەوە نەدەهات.

مردووەکەیان نە بۆ هەڵدەگیرا و نە دەیانتوانی دەستیشی بۆ بەرن.

سێبەرەکەی لە سەر ئەو عەرزە سوورەوە بووەی دەتگوت ئاسنی سوورەوەکراوە، بە تەنیشت مردووەکەوە درێژ ببووەوە و چەند تاوەکە پتر هەڵدەکشا ئەو کورتتر دەبووەوە. ڕەشە پشیلەیەك

هات و بۆنێکی بە خوێنە مەیوەکەوە کرد و ئیتر ڕۆیشت و لە سێبەرە ڕەشەکەدا و لە بەر پێیەکانی باوکە خۆی مات دا. چاوی پشیلەکە کەسك کەسك بوون.

تۆفانێك تەپوتۆز هەستا. پشیلەکە دەسبەجێ خۆی فڕێدایە سەر بانی کۆشکەکە و ڕۆیشت. کلکە درێژ و ڕەشەکەی کە دەتگوت مارە و کەسك دەچووەوە، بە تووڕەییەوە دەشنایەوە و رادەوەشا. تەپوتۆزەکە بەری تاوەکەی گرت. رەنگێکی مۆری تۆخ تەپوتۆز و تاوەکەی داگرت و بۆ تاوێك هیچ نەبینرا. زار و چاو و لووت هەمووی پڕ بوون لە تۆز و خۆڵ. لەحزەیەك کەس پشووی دەرنەهات. تەپوتۆز خزییە نێو ماڵ و سندووقە داخراو و قوتووەکان و بن توێکڵی دار و پێستی مرۆڤەکانیشەوە. هەموو شتێك وەبن تۆز و خۆڵ کەوت. تۆفانی تۆز و خۆڵەکە کە نیشتەوە، دار و چیمەن و سواڵەت و گڵێنەی سەربانی کۆشك و سەرودەموچاوی بنیادەمەکان و جلوبەرگەکانیان و دەست و پێیان و ئاژەڵ و مریشك جووچکە و کەڵەباب و قاز و هەرچی هەبوو، تۆێژێکی تۆز و خۆڵی بەسەر کشابوو. مردووەکە لە بن ئەو توێژە خۆڵ و خاکەدا دیار نەبوو. باوکەکە هەروا چاوی بڕیبووە ئەو مردووەی وەبن خۆڵەکە کەوتبوو. تۆزەکە ئەوی وەك پەیکەرێکی "هیتیت" لێ کردبوو.

مانگ و ساڵانی بەسەردا هاتن، بەڵام باوکە هەر وا لە حەوشەی کۆشکەکەیدا رادەوەستا و بەبێ ئەوەی چاو بتروکێنێ و گەلێ جاران هەوری تۆز و خۆڵ لە ڕێگەکەوە هەڵدەستا و دەهات.

مستەفا بەگ لێی سوار بوو و ئەسپەکەی لینگ دا. هەموو گیانی وەك کەوانێکی پۆڵا لەبەر یەك کشایەوە. ئەسپەکەی بن رانیشی هەر وا لەبەر یەك کشایەوە. بە دەم ئەسپ تاودانەکەیەوە کە تۆز و خۆڵی ڕێیەکەی لە پشت خۆیەوە لوول دەدا، سەرانسەری پێدەشتەکەی بڕی. تۆفانی تۆز و خۆڵەکە نیشتبووەوە و تۆز و خۆڵەکە بەسپایی دەنیشتەوە. ئەو تۆز و خۆڵە یەك دوو ڕۆژان هەر وا هەڵدەستا و دەنیشتەوە و ئاخرییەکەی ڕۆژێکیان بایەك وەك هەورێکی خزۆك هەڵیکرد و هەورە خزۆکەکەی بەرەو تۆرووس رادا.

لە دڕووەڵانەکەی ئاشەکە لە ئەسپەکانیان دابەزین. زۆنگاوەکەی سەکیز گوێز لەو بەرەوە پاناونکێکی داگرتبوو. ڕێگەکە لە نێوان دڕووەڵانەکەی ئاشەکە و زۆنگاوەکەی سەکیز گوێزدا تێدەپەڕی و لەوێوە دەگەیشتە کەناری ساورۆن. گوێچکەیەکی زۆنگاوەکە ئاوی لەبەر دەڕۆیشت. زۆنگاوەکە بەو گوڵە نێرگزانە داپۆشرابوو کە ڕێیان نەدابوو چۆلەکەکوژیان پێدا تێپەڕێ. ڕێگەکە لە نێو دڕووەڵان و سەکیز گوێزەوە باریك دەبووەوە و هەوراز دەچوو. لە

لایەکەوە زۆنگاوە قووتدەرەکە و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو دڕووەڵانە چڕەی کەس نەیدەتوانی بیبڕێ و هەوراز، هەورازی گردی گۆڕستان.

ئەسپەکانیان لە دڕووەڵانەکە دا.

مام حەسەن تفەنگێکی خۆکاری پێ بوو. مستەفا بەگ فیلینتایەکی ئەڵمانی و وسێنە رەشش ماوزەرێکی گەورەی روسیی پێ بوو.

رۆژێکی تەماوی، بارانێکی نەرم و خۆش. هەڵمێکی تۆزاوی.. باران کە دەکەوێتە سەر خۆڵە گەرمەکە و وەك هەورێك لە خۆڵەکەوە هەڵدەستێتەوە.

عەرزەکە قوڕ و لیتە. قوڕە چەقە بە پاچ و پێمەڕەوە دەنووسێ و بەری نادا. خوێناو لە برینی مردووەکە دەچۆڕێ... کفنەکەی تەڕ تەڕ و تابووتەکەی خووساوە و چڵ و گیایەکەش تەواو خووساوە. هەتاو سوورە و خەرمانەی داوە.

"وسێنە رەش... تۆ تەقە ناکەی. تەقە لە دەروێش ناکەی، کێ لێی نزیکتر بێ.... وسێنە رەش، ئەگەر بە ترۆمبێل هات، لە تۆپی* ترۆمبێلەکەی بدە... جوانی سێرە لێ بگرە... نابێ کەس لووتی لە خوێن بێ. هەر لە تۆپەکانی. هەر دەروێش بەگ گیرا، ئێوەش ئەوانی دیکە دەگرن و دەیانبەن و دەیانخەنە ژێرزەمینەکەی کۆشکەوە و دەرگاکەی دادەخەن. دەستیشیان توند شەتەك بدەن..."

ئەوانی دیکە لە پەنای بنەتای قامیشێکی زەبەلاحەوە، لە پشت تفەنگە لەسەرپێیەکانیانەوە درێژ ببوون و چاویان بڕیبووە رێگەکە.

مستەفا بەگیش لە پەنای پۆلە قامیشێکەوە درێژ بوو.

هەر جارێ روخساری دەروێش بەگی دیتبوو. سەر و کاکۆڵی رەش رەش و ئێسکی روومەتی دەرپەڕیبوون و دەموچاوێکی ئەسمەری هەبوو. چاوەکانی مەڕی بوون و وەك دەنکە زەیتوون تۆخ و گەورە بوون. بە چاوێکی نیگەران و بێ ئۆقرەوە لە دووری دەڕوانی و بە هەشتاو و لارە لار دەڕۆیشت. لە بن چنارە گەورەکەی مەیدانی بایەزید لە ئیستانبۆل دیتبووی. بە پێی مۆدەی ئەو کات خۆی رازاندبۆوە. جلوبەرگە نیلی و یەخە سپییەکەی لە چاوی دەدا.

هێشتا شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێ نەکردبوو و دەروێش لە کۆلێژی ماف دەرسی دەخوێند. بۆیە دەیانگوت ئەو وازی لە هەموو شتێك، کشتوکاڵ و ئاغایەتی و تۆڵەئەستاندنەوە کردووە و ئیتر ناگەڕێتەوە شارۆچکە و دەبێتە قازی.

مستەفا بەگ بزەیەکی هاتێ. ریزە مێرووڵەیەك بە ریز ڕێچکەیەکیان لە سەر خۆڵەکە کێشابوو و هەر کامە و دەنکە گەنمێکیان بە زارەوە و چوست و چالاك و شێلگیر بەرەو شارەکەیان دەچوونەوە.

"دەیکوژم. دەکرێ خۆی لە چارەنووس دەرباز بکات، بەڵام لە چنگی من قوتار نابێ."

مستەفا بەگ دوای تەواوکردنی قوتابخانەی پاشایەتی ئیتر دەستی لە خوێندنێ هەڵگرتبوو. بەڵام ئەویان کۆلێژی تەواو کردبوو.

"دەی باشە، بە هەموو خوێندەواری و زانیارییەکانییەوە دەچێتە بن گڵ."

ئاخۆ دەروێشیش ئەوی دیتبو؟ دەیویست ئەوە بزانێ."

باشە چۆن دەبوو کونجکوڵ نەبێ؟ خۆی بە ئاو و ئاگردا دەکرد بۆ ئەوەی بیبینێ. خۆ نەیدیتبایە لە داخان دەتەقی. زۆری لە سەر بیستبوو کە... ناکرێ کونجکۆڵ نەبێ. ئێستاش ئەو کونجکۆڵییە نیوەگیانی دەکرد بۆ ئەوەی ئەو... ئای کە چەندەی بەسەردا تێپەڕیبوو.

وەبیری هاتەوە کە گوتبووی:"ئەمن دەیکوژم." باشە ئێرەیی پێ دەبرد؟ ئێرەیی دەبرد؟ ددانەکانی گڕ کردنەوە و قۆنداغی تفەنگەکەی لە دەستیدا گوشی. نێوچاوانی تێك نا. هەڵچوو. هەموو گیانی لەرزی.

"ئەمن دەیکوژم."

خۆشی و شادییەکی تاڵ ناخی تەنی. دوای کوژرانی براکەی، شادی و خۆشییەکی نەبڕاوە لە ناخیدا هەستابوو. باشە براکوژراوێك بە مەرگی براکەی وا شاد دەبێ؟ شوورەییەکی بێزارکەر... بەڵام هەرکات بیری لێ دەکردەوە... سەیری دەکرد لەم دنیایەدا مورتەزای لە هەموو شتێك پتر خۆش دەویست. مورتەزای لە ژن و منداڵەکەی و بگرە لە خۆشی خۆشتر دەویست. باشە بۆیەی خۆش دەویست چونکە هەمیشە وەك مردووەکی لێ دەڕوانی؟ کە پێکرا، هەر دەتگوت خۆیشی کوژرا. باشە هەر بەراستی وا بوو؟ لە پەژارە و خەم و ژاندا وەخت بوو بمرێ. جا دوای ئەوەش شادییەك کە هیچ کەس نەیدەزانی بۆ چییە، خزیبووە ناخییەوە و ئەو مەرگی براکەی پێ لەو شادی و خۆشییە شیرنتر بوو. بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی ئەو شادییەی ئاوا لە ناخیدا بڵێسەی دەکێشا، بڕەوێنێتەوە و دەریکاتە دەرەوە و بیکوژێنێتەوە. بۆشی دەرنەدەکەوت چییە و لە کوێوە و بۆچی هاتووە.

ئێستا لەو کات و ساتەدا دیسان ئەو شادییە نەفرەتییە هات و لە سەر دڵی نیشتەوە. ویستی بگری، نەیتوانی. تەرمی براکەی، پەیکەری شەلاڵی خوێنەکەی، خێزانەکەی کە خۆی بە

سەر مەیتەکە کێشابوو و سەر و قژی خۆی دەڕنییەوە و خۆڵی گۆڕستانەکەی وەسەر خۆی دەکرد و دەگریا و منداڵە لێوبەبار و خەفەتبارەکانی هێنایە پێش چاوی خۆی، بەڵام هەر نەیتوانی و نەیتوانی، بە هیچ کلۆجێ نەیتوانی... ئەو شێتییەکی سەیرە... شێتی... شادییەك چنگی لە گیانی توند کردووەو هەر دێ و گەورەتر و بێزارکەرتر دەبێ.

دەستەکانی گەورە بوونەوە. بارانەکە نەرم نەرم و بێ پسانەوە دەباری. هەوری تۆزەکە نیشتەوە و دامرکا. بۆن و بەرامەی نێرگز لە زۆنگاوەکەوە هەستا. بۆنێکی تیژ و نامۆی خۆڵ و خاك لە هەواکەدا بوو. خۆڵ و خاکی باران لێ دراو...

دەروێش کامە ئەسپ جوانبوو سواری ئەو دەبوو. درۆیە. کێیە لە مەودای چل مەترییەوە بە فیشەك و بە شێوازێکی جوان ناوی خۆی لە سەر تەختە بنووسێ؟ دەروێش ! درۆیە.

کێیە هەرچی ژنە بۆ دیتنی دێنە بەر پەنجەرە و مل دەکێشن؟ دەروێش. درۆیە.

جوانچاکترین؟ دەروێش... درۆیە، درۆیە.

یانی کەس لە دەروێش ئەنگێوەتر نییە؟.... و ناوی خۆی بە فیشەك دەنووسێ... جا ئەوە دەردەکەوێ کێ، چۆن ناوی خۆی دەنووسێ.

"ئەمن دەیکوژم. دەروێش، تەقە لەو کافرە مەکەن. لە پێشدا خۆم، دوایی ئێوە. جوان گوێتان بکەنەوە بزانن دەڵێم چی، لە پێشدا من، جا دوایی ئێوە. لە قاچەکانی، لە دەست و شان و پیلی... دەمەوێ بە زیندوویی بیگرم..."

مام حەسەن گوتی:"بەگ هەر ئەوەی لێ دەوەشێتەوە. هەر ئەوە لە تۆ، لە بەگێکی رەسەنی وەك تۆ دەوەشێتەوە. رووبەڕوو... رووبەروو، یەك بە یەك، تەن بە تەن."

"راسپاردەکانم بکەنە ئاڵقەی گوێتان و موو بەموو... موو بەموو جێبەجێی بکەن."

وسێنە رەش گوتی:"بەڵام گرتنی ئەو، ئەوەندەش سووك و ئاسان نییە کە بکرێ وەك چەقەڵ گوێی بگری. پیاوێکی وەك دەروێش بەگ... ئێستا وەکوو با بە پێش چاوماندا... لە ترۆمبێلدا... وای دانێین لە تۆپەکانیشیمان دا... خۆی دەخاتە قامیشەڵانەکەوە. شەڕ دەکەین، شەو بەسەردا بێ، تێی دەقووچێنێ. سێ کەسین، ئەوانیش... بۆسەنانەوە بۆ ئەوەیە دەسبەجێ بیکوژی، ئەگینا دەترسم دەرباز بێ."

"هەر لەم حەوتووەدا دەیکوژم. هەر ئەمڕۆی دەکوژم. دەبێ بیکوژم. باشە، وسێنە رەش، چۆنی پێت باشە وا بکە. چۆنی کەیفت دێنێ تەقەی لێ بکە. بەڵام چاوەڕێی من بە. لە پێشدا خۆم... دوایی وێکڕا. ترۆمبێلەکە دەکەینە سوزمە. ئاخ، چاو لە چاوی ببڕی... جا لە بەرت

دەپارێتەوە... دەنووزێتەوە... کە وردە وردە گۆشتی بە گاز دەگری و دەیپچڕی... کە ئەنجن ئەنجن دەکرێ..."

وسێنە ڕەش لە سەری ڕۆیشت:"دەرویش لەوانە نییە بپارێتەوە. ئەو دوژمنەی دەپارێتەوە دوژمن نییە. دوژمنایەتییەکەشی بێ نرخە."

"دەیکوژم."

چەپکە تیشکێك، لە رووبەڕووەوە، لە لای رووبارەکەی جەیهانەوە بەرەو زۆنگاوەکەی سەکیز گوێز کشا و بە سەر قامیشەڵانە سەوز و هەستاوەکەدا پرژا.

دەنگی ترۆمبێلێك لە دوورەوە هات و بەرگوێیان کەوت. دەوروپشت نوقمی بێدەنگی بوو. تەنانەت وزەوزی زەردەواڵە زەردەکانیش نەدەبیسرا.

"دەیکوژم... وەك سوزمە کون کونی دەکەم. زمانی لە پشتەسەرییەوە دەردێنم."

زمانی لە دەستی خۆی ئاڵاندبوو و دەیکێشا... دڵۆپ دڵۆپ خوێن لە زمانییەوە دەچۆڕایەوە سەر عەرزی. دەچۆڕایەوە و خۆڵەکە هەڵیدەمشت.

پێ بە پێی نزیکبوونەوەی ترۆمبێلەکە، مستەفابەگیش هەڵدەستا و دڵی لێی دەدا. هەستێکی نامۆ هەموو گیانی تەنیبوو. کەفوکولێکی نامۆ جینگڵی پێ دەدا... ناخی پڕ ببوو لە رووناکی. شیرینییەکی چێشکەنەکراو و دوور لە باوەڕ و دەست پێڕانەگەیشتوو، بە دڵیدا دەخوشی و لە گیانی دەگەڕا. پەنجەی لە سەر پەلەپیتکە و گوێ قوڵاخ... چاوەڕێی هاتنی ترۆمبێلێك بوو وەك با بە بەردەمیدا تێدەپەڕی. بەبێ سەرسووڕمان و حەپەسان. شۆفێرەکەش... هەرچی تێیدایە...

"ترۆمبێلەکە وەك بێژنگ دادەبێژین."

"بەگم، وەك بێژنگ...."

"بەر لەوەی ترۆمبێلەکە تێپەڕێ، دەبێ یەکی پێنج فیشەکیان بەرکەوتبێ. ئیشەڵڵا دەرویش بەگمان بە زیندووی وەبەردەست دەکەوێ."

"بە تەمای خودای، بەگ... بە برینداری... ئیشەڵڵا."

ئەنگۆرە بوو. مستەفا بەگ هەڵدەستا و دادەنیشتەوە و رادەکشا و چاوی لە ڕێگە هەڵنەدەگرت. لە تەندوورێکی تایەکی نامۆ و نائاساییدا دەسووتا و هەڵدەچۆقا و جینگڵی دەدا. تامێکی چێشکەنەکراو، عەترێکی بۆن نەکراو... چێژێك کە هیچ لە چێژە ناسراوەکان نەدەچوو.. لە شێوەی هیچ مەستی و سەرخۆشییەك نەبوو. شیرینییەك کە لە هەموو ژیاندا

تاقە جارێك هەستی پێ دەكرێ، هەموو گیانی لە بڵێسەی چێژێكی دووره دەستدا مێرووڵەی كرد.

هەتاو بار و بنە رەنگ پەڕیوەكەی لە سەر زەوی كۆ دەكردەوە و وردە وردە دەچووە قوڕگی زەردەپەڕەوە. موچڕكەیەك لە هەموو گیانی مستەفابەگ گەڕا. دەست و سینگ و هەموو گیانی لە تایەكی سەرخۆشیدا هەڵدەچۆقا و دەسووتا. شەبەنگی ئەو هەتاوەی لەوبەری ئاناوەرزاوە ئاوا دەبوو، رەنگی خوێنی لە داوێنی ئاسۆ هەڵدەسوو. هۆشی بەسەر خۆیەوە نەبوو. تیشك و رەنگەكان لە بەر چاوەكانی پەلەقاژەیان بوو. ترۆمبێلەكە هات و رێك لە بەرانبەریاندا رایگرت. دەرگاكە كرایەوە و دەروێش بەگ لێی دابەزی. دەمانچە رووتەكەی بە دەستییەوە بوو و بە چاوی لە ژێللا هاتووەوە سەیری دەوروپشتی خۆی دەكرد. دیار بوو ترسێك هەموو گیانی دەلەرزێنێ. شەپۆلی لەرزینێك دەلای راستەی دەموچاوی گەڕا. دەموچاوە تێكسمڕاو و تۆزلێنیشتووەكەی دەتگوت گەچی دیوارە.

لاقە لەرزۆك و بێهێزەكانی بە سەر عەرزەكەدا دەكشان. دەستی چەپەی دەتگوت دەستی سپی هەڵگەڕاوی مردووانە و لە شانییەوە شۆڕ بووەتەوە. لە گەڵ هەر هەنگاوێكیدا چرچ و لۆچی دەموچاوی و لێوە بەبارەكانی تۆزێك دەلەرینەوە. دەتگوت لەگەڵ هەر هەنگاوێكی، لە مەرگ دەچێتە پێشێ.

لە نەكاو ئاسمان گرماندی و لە چاوتروكانێكدا هەموو وڵات تاریك داهات. دلۆپەی شیلەوگەرمی درشتی بارانەكە لێرە و لەوێ كەوتە سەر عەرز و دەسبەجێ رێژنە دایدا. چاوەكانی مستەفا بەگ تاوێك هیچ كوێیان نەدی.

لەولاترەوە تارماییەك لە نێوەندی رێگەكە، قیت قیت و دەتگوت دەچێتە قوڕگی مەرگەوە و ئێستا نا ئێستا لە خوێن دەگەوزێ، دەڕۆیشت. خاڵە هەمزەش لە دواوەی وردە وردە ترۆمبێلەكەی لێ دەخوڕی.

"ئیزن بدە بەگ، ئیزن بدە با دابێژ دابێژی بكەم. ئیزن بدە بەگ. دەستم بە داوێنت، بەگ..."

مستەفا بەگ لە خۆشییان نەیدەزانی چ بكا. چیی وای نەمابوو دەرپەڕێ و ئەو مردووە بەجووڵەیە لە ئامێز بگرێ. دەستەكانی لە فیلینتاكەی كردەوە. دەستێكی لە سەر دەستی مام حەسەن دانا و دەستەكەی دیكەشی لە سەر دەستی وسێنە رەش و لاواندنییەوە.

تاوێك دواتر دەروێش وەك لاقی لە بەردێك هەڵەنگوتبێ، سەرەنگرێ بوو و وەعەرزی کەوت. ئیتر پیاوەکانی گەیشتنێ و هەڵیانگرتەوە. هەموو گیانی قوڕاوی ببوو. هەوڵی دا قیت و قنج بەڕێیەدا بڕوا بەڵام لاقەکانی تێك دەئالاْن و لە دووی نەدەهاتن. خەریك بوو لە پێ دەکەوت. تاوێك دواتر بەژنە قیتەکەی دەروێش بەگ داهاتەوە و پشتی کۆم بۆوە. پیاوەکانی چووبوونە بن پیلییەوە و قەلاْفەتە نیوەزیندووەکەیان راکێشایە نێو ترۆمبێلەکە.

کە خۆر ئاوا بوو و تاریکی باڵی بەسەردا کێشان، مام حەسەن پرسیی:"چ بوو؟ چیمان بەسەرهات بەگ؟"

مستەفا بەگ بە دەنگێکی کە زایەڵەیەکی شادیی تێیدا شەپۆلی دەدا گوتی:"نازانم."

قسەیەکی دیکەیان نەکرد. لێی سوار بوون و بەرەو ئاوایی لێیان خوڕی.

دادوەر بە مستەفا بەگی گوت:"بەپێی ئەو راپۆرتەی هاتووە، براکەت بووەتە قوربانیی تۆڵە ئەستاندنەوەیەکی کۆنی بنەماڵەیی و بە فەرمانی دەروێش ساری ئۆغڵی کوژراوە. ئەوە راستە؟ دەڵێن ئەوەی براکەتی کوشتووە، مەحموودە کوردە، چەکداری دەروێش بەگە و لە کۆشکەکەی ئەودا گەورە بووە. ئەوە راستە؟"

چاوەکانی مستەفا بەگ لەو روخسارەیدا کە رەنگی شادیی لێ نیشتبوو، درەوشانەوە و گوتی:"دیارە لە کۆنەوە دانوومان پێکەوە ناکوڵێ، بەڵام دەروێش بەگ لە خۆڕایی بۆچی برای من دەکوژێ؟ بۆچی دەبێ ئەو شتی وای کردبێ؟ ئەمن پێم وا نییە ئەوەی دەفەرمووی راست بێ. بۆ مەحموودیش دەبێ عەرزت بکەم کە ئەو نەك لە کۆشکی دەروێش بەگدا، بەڵکو لە کۆشکەکەی خۆمدا گەورە بووە و لە کلێ هاتووەتە دەرێ.

لەوانەشە ئەو و براکەم دوژمنایەتییەکیان لە نێواندا بووبێ. ویژدانی من دەڵێ، دەروێش بەگ کاری وا سووك و چرووکی نەکردووە و بەسەر ئەویدا نەهێنم."

سینگی هێنابووە پێشەوە و سەری بەرز راگرتبوو و بەبێ ئەوەی قسەیەکی دیکە بکا، دادوەری بەجێ هێشت. ئەوەندە شاد و بە کەیف دەڕۆیشت، دەتگوت لە هەڵپەڕکێیەکدا پێ بە عەرزیدا دەدات.

سەعاتێك دوای وەدەرکەوتنەکەی مستەفا بەگ، دەروێش بەگ هاتە هەنتەشی دادوەر. روخساری هیچ نەگۆڕابوو، هەر وا هەڵبزڕکاو و چاوەکانیشی دەتگوت چاوی بێ تین و بەمۆڵەق وەستاوی مەڕێکی مردوون. کەنفت و لەپێ کەوتوو... دەست لەرزۆك...

به دەنگێکی کسپەدار و تووڕە و تۆقیو و ماندوو و نامۆ، وەك دەنگێکی هیچ خۆی نەبێ ورتاندی:"کێ دەڵێ؟ شتی وا نەبووە و نابێ. ئەمن مەحموودە کورد دەناسم. دیوەخانەکەی من دووسەد پیاوی وەك مەحموودی تێدایە. یانی هەر بۆ ئەوە بانگت کردوومەتە شار جەنابی دادوەری گشتی؟ نەکا مستەفا ئاق یۆللی" سکاڵای لێ کردبێم؟"

"نەخێر."

دەروێش بەگ تاوێك دواتر، بە نیوەزیندوویی و بەخۆیدا شکاوە، ئیزن درا بڕوات و لە شەرمان دەموچاوی خستە نێو هەر دوو لەپی دەستییەوە. یەك "نەخێر" تین و بڕستی لێ بڕیبوو.

# ٧

نێو کۆشك پڕ جموجۆڵ و هەوڵ و کار بوو. ژنە خزمەتکارەکان لە دیوەخانە گەورەکەی کۆشکەکەدا کۆ بوونەوە و پەیتا پەیتا لە قوماشی جاو توورەکەیان دەدووری. توورەکەی گەورە و بچووك. نۆکەرەکان بە عارەبانە لمیان دەهێنا و ژمارەیەك پیر و کچ و نۆکەر توورەکەکانیان پڕ دەکرد. ژمارەیەك لە گوندییەکانیش ئەو توورەکە لمانەیان لە حەوشەکەوە دەبردە نێو کۆشکەکە و بە پێی رێنوێنیی بەگ، لە پشت پەنجەرە و دەرگاکان هەڵیاندەچنین.

سێ شەو و رۆژان هەر بەردەوام بوون. کۆشك ئیتر ببووە قەڵایەك. جا ئەوجار مستەفا ئاق یۆللی" چیی لە دەست دێ با بیکا. ئەوجار ئەگەر بناگوێی خۆی بینی، جا نێو کۆشکیش دەبینێ.

محەڕەم یەکێك لە باوەڕپێکراوترین تفەنگچییەکانی دەروێش بەگ شەو و رۆژ لە برجەکەی سەر دەروازەی باغەکەوە کێشکی دەکێشا. هیدایەتیش لە بەر دەرگاکەوە و هەر گۆشەیەکی کۆشکەکەش چوار چەکداری لێ بوو.

هەر رۆژ ئاوا بوو، دەروێش بەگ دەرگای ژوورەکەی دادەخست و ئەوجار توورەکە لمەکانی لە سەر یەك و لە پشت دەرگاکە هەڵدەچنی. بەر پەنجەرەکانیش بە توورەکە لم گیرابوون.

لە پێشدا چەند شەوێکیان بەگ خەوی نەچووە چاوی، بەڵام دواتر خووی پێوە گرت.

بە تووتووش پێی لە کۆشکەکە نەدەنایە دەرەوە، نە بە رۆژ و نە بە شەو. شەو و رۆژ رەعیەت و نۆکەرانی لە خۆی کۆ دەکردەوە و جەفەنگی لەگەڵ لێدەدان و سوعبەتی دەکرد. داوای لێ دەکردن گۆرانیی بۆ بڵێن. بەسەرهات و حەقایەتی بۆ دەگێڕانەوە و هەوڵی دەدا جار لە جار پتر بیانناسێ.

دوو مانگ رابرد. ئاق یۆللی" باسی نەبوو. دەروێش بەگ سەرەڕای پرسیار و بەدواداچوونەکانی هیچ سۆراغێکی لێی نەبوو. کوڕێکی دوازدە ساڵانەی یەکێك لە

ڕەعیەتەکانی ماوەی حەوتووەك لە گوندەکەی ئاق یۆللی" مایەوە. ڕۆستەم ئۆرتاقچیش هەموو ئەو کەوشەنەی سەنگ و سووژن دا و هەر نەیتوانی سەرەهەودایەکی لە ئاق یۆللی" دەست بکەوێ. ئاق یۆللی" نەچووبووە شارۆچکەش. ڕووی لە شاخ و چیاش نەکردبوو. نەچووبووە ئەدەنە و ئەنکارا و ئیستانبۆلیش. ئەی باشە زەوی قووتی دابوو؟ دیارنەمانێکی ئاوای ئاق یۆللی"، پەرۆشی و نیگەرانیی لێ دەکەوتەوە. لە وەختی ئاوادا لە ناخافڵ گورزی خۆی دەوەشاند.

لەو بگرە و بەردەیەدا هاوین بەسەردا هات. گەرمایەکی زەردی سامناك دەستی پێ کرد. ڕۆژ هەتا ئێوارێ کۆشکەکە دەبووە جەحەندەمێکی خنکێنەر... دەروێش بەگ بە ڕۆژان دەخزییە گۆشەیەکی دیوەخانە گەورەکەی کۆشك و ئەو منداڵانەی ئاوایی کە نەچووبوونە مەزرایە، لە خۆی کۆ دەکردەوە و گەمەی لەگەڵ دەکردن. ڕەعیەت و نۆکەرەکان شەوانە لە مەزرایەوە دەگەڕانەوە ئاوەدانی و بە هەڵەداوان خۆیان دەگەیاندەوە بەگەکەیان.

ورد و درشتی گوندەکە ڕقیان لە ئاق یۆلوو هەڵگرتبوو کە بەگە هەڵۆکەیانی بەو دەردە بردبوو. کە بەگەکەیانیان ئاوا دەدی بەخۆیاندا دەشکانەوە. ئاوا، بەو وەدەرنەکەوتنەی لە کۆشك و ڕووناکایی نەدیتنەی شێت دەبوون.

هەر هەموو گوندەکەش زراوی چوبوو. دێهاتییەکانیش تۆقیبوون. ئەوانیش کە لە مەزرا و چیا و دەشتێ باڵندەیەکیان لە بەر پێیانی هەڵدەفڕی یان کەروێشکێك دەردەپەڕی، بەندی جەرگ و دڵیان دەپسا. هەر هەموو کەوتبوونە دڵەڕاوکێ و ترسەوە. دامابوون و نەشیاندەزانی چ بکەن. سات بە سات چاوەڕێ بوون لە لایەکەوە مەرگێکی چاوەڕواننەکراویان بۆ نازڵ بێ. بەبێ ئەوەی خۆیان بزانن بۆ، لەگەڵ بەگەکەیاندا بەو دڵەکوتە و نیگەرانییەوە چاوەڕوانییان دەکێشا.

شەو بۆ دەروێش بەگ بووە جەحەندەمێکی تەواو. ئەو شەوانەش وەك زستانێ، دیسان قسەی لەگەڵ ئەو ڕەعیەتانەی دەکرد کە لە کارێ گەڕابوونەوە. لەگەڵیان لە سەر سفرەیەك دادەنیشت و دوای ئەوەی بڵاوەیان دەکرد و شەوگار شەق دەبوو، سەرێکی ژووری ژنەکەی دەدا و دوای ماچکردنی دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی دادەخست و کلیلەکەی دوو جاران تێدا دەسووڕاند و ئەوجار توورەکە لمەکانی لە پشت دەرگاکەی هەڵدەچنی. داوە تیشکێکیش چییە لە پەنجەرەکانەوە نەدەهاتە ژوورەوە.

شەوانی هاوینێش گەرم و گران بوون، وەك جەحەندەم. دەروێش بەگ خەوی لە سەری دەڕەوی و هەتا بەیانی لە ژوورەکەیدا دەهات و دەچوو، بەڵام هەر کونێکیش چییە لە یەکێك لە پەنجەرەکانی نەدەکرد.کە تاو هەڵدەهات، خۆری دەروێش بەگیش لە کەل دەردەکەوت. لەگەڵ

بەیانئەنگوتنیّ خۆی داویشتە سەر ئەو قەرەوێڵەیەی لە گۆشەیەکی دیوەخانەکەی دانابوو و خرپ لێی دەنووست. بەردەوام ئارەقەشی دەکرد. ترسی ئەوە هەبوو، کە دەروێش بەگ یەکسەر بتوێتەوە و ببێتە ئارەقە. جاری وابوو بیری دەکردەوە ئاخۆ مەرگ باشترە یان ئەم ژیانە؟

"مەرگ زۆر باشترە. بەڵام ژیانیش بە هەموو تاڵی و سەختییەکانییەوە... ژیانی ئاوا باشترە لەوەی خۆت بدەیتە دەست سەرشۆڕیی مەرگەوە. تۆزێك هەر باشترە."

ئیتر ژیانی ئارەقاوی هەر بەردەوام دەبوو. بۆنی ئارەقە لە هەموو لایەکەوە هەڵدەستا. دارەکان و بەڕە و دیوارەکانی کۆشك و مرۆڤەکان، خاتوونی دەروێش، زەوی و ئاسمان و هەموو شمەکەکانی بنەوە و سەرەوەی بۆنی ترشاویان لیّ دەهات. هەر هەموو شتێك، چیی لە دنیایە دایە، هەرچیی لێرەی دەدی و دەستی پێی دەکەوت، هەموو کەس و هەموو شتێك لە ئارەقەدا دەخووسا.

شەوێکیان دەروێش بەگ گەیشتە ئێسقانی و بە هات و هاوار خۆی لە ژوورەکەی فڕیّ دایە دەروە:"ئەی هاوار سووتام، سووتام، کوڕە خەریکە دەخنکێم."

چەند سەتڵێکیان ئاو بە سەریدا کرد هەتا وەخۆ هاتەوە و گەڕایەوە ژوورەکە و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخستەوە.

سەرەڕای ئەو هەمووە پاراستنەش، دیسان هەر تۆقیبوو. هەر سەری وەسەر بالیفیّ دەکرد، خەیاڵێك لە مێشکیدا دەگوورا، کە خەوەکەی ئیتر هەستانی نەبوو. لێی دەبووە "هەبوو نەبوو". هەر دەتگوت قەت نەبووە و لە دایك نەبووە... نەژیاوە... لەو دنیایەدا چەند کەس دەیانزانی ئەو هەیە؟ ژنەکەی، منداڵەکانی، خزم و کەسی و دۆست و ئاشناکانی... لەو نێوەدا هەر یەك نەفەر هەیە کە ئەوی قەت لەبیر ناچێتەوە. قەت قەت و ئەویش مستەفابەگی ئاق یۆللی"یە. مستەفا بەگ تا دەژییّ، تا سەر لێوی گۆڕ لە دڵی خۆیدا هەست بە بوونی دەکا.

بەڵام دوای مردنی، هەر هەموو شتێك دەبڕێتەوە، هەموو شتێك، هەموو شتێك... و ئەو دنیایەش نامێنیّ... ئیتر دنیایەك نامێنیّ. خەڵك چییە؟ ... تەنانەت ئەگەر بیّ نرخیش نەبن، ئەوانیش هەر نێچیری مەرگن. ئەوانیش ئاخرییەکەی هەر دەمرن. ژنەکەی، منداڵەکانی، مستەفا ئاق یۆللی"... ئەوانیش درەنگ یان زوو دەمرن. بە مردنی ئەو دنیا و سرووشتی بێبڕانەوەش دەمریّ. کەوابوو هەموو شتێك دەمریّ... ئیتر تۆزێك پتر ژیان بۆچی و لە پێناوی چیدا؟ ژیان سیحرێکی هەیە، هێزێکی بێبڕانەوە، سیحرێکی بێسنوور و دوورە دەست.

بەخۆی دەگوت:"دەبێ بچم و ئاق یۆللی" بدۆزمەوە و هەر هەموو ئەوشتانە، نهێنییەکانی مەرگ و ژیانی بە تیر و تەسەلی لەگەڵ باس بکەم. چەند جارێك ویستی سواری ئەسپەکەی بێ، بەڵام بەر لەوەی بڕوات، پاشگەز بۆوە.

چ نهێنییەك لەو کارە دایە؟ یەکتر کوشتنی لە لاساری... قەتیش نابڕێتەوە. ئەو کارەش ترسنۆك و ئازا ناناسێ. نۆرەی هەر کەسیش دەگاتێ، دەکوژێ و دەشکوژرێتەوە. کەسیش ناتوانێ بە ویستی خۆی پێی لە بازنەی ئەو گەمەی خوێنە بکێشێتە دەرێ. بەڵام ئەو گەمەی خوێنە ئەوەندە خۆشە نەتوانی خۆی لێ ببوێری؟

بەیانییەکیان دەرگای ژوورەکەیان شکاند و بە بێهۆشی بەسەریدا کەوتن. ئارەقە لە ئازای ئەندامی دەچۆڕایەوە. ئەو قەرەوێڵەی لە سەری نوستبوو، خووسابوو. لە بیرەکە سەتڵ سەتڵ ئاویان هەڵێنجا و سەریاندا کرد تا وەخۆ هاتەوە.

ئیتر هاوسەرەکەی وەڕەز بوو و خۆی یەکلا کردەوە و گوتی:"ئەتۆ نەك بە فیشەك، بەڵکو بە لاساری و کەللەڕەقیی خۆت تێدا دەچی بەگ. باشە چ دەبێ کونێکی تێکەی بۆ هاتوچۆی هەوا؟ باشە هەموو رۆژێ جێیەکەت بگۆڕێ کێ دەزانێ لە کوێی؟ ئەگەر کونێك لە سەربانەکەی بکەی، کێ دەتوانێ لەوێوە بتئەنگێوێ؟

دەروێش بەگ وەك شێتان گوڕاندی"ئەتۆ بێدەنگ بە خاتوون. ئەو قسانە لە دەمت زیادن. خۆم باشتر دەزانم چ بکەم و نەکەم. ئەمن نامەوێ بمرم."

"بەڵام ئاخرییەکەی ئەو گەرما نەحلەتییە رۆژێکیان دەتخنکێنێ."

"بمخنکێنێ باشترە لەوەی فیشەکێك بمکوژێ."

"یاخوا دەردت وەسەری من کەوێ بەگ. دەرد و بەڵات لە من بەگ. کوڕە ئەگەر کونێکی بچووك لەو میچە بکەی، دوژمن چووزانێ لەکوێوە و چۆن دەیدۆزێتەوە و لەوێوە دەتکوژێ؟"

"دەیدۆزێتەوە و دەیکوژێ. ئەمن ئیتر خووم بەو ئارەقەیەوە گرتووە. ئیتر لەمەودوا بەبێ ئارەقە ناژیم. جگە لەوەش، ئەگەر کونی تێدا نەبێ، تەپۆش نایەتە ژوورەوە."

دەروێش بەگ سەرەڕای پێداگربوونی دەوروپشتییەکانی و ژنەکەشی، ئامادە نەبوو کونێکی هەر هێندەی بەرەدەستێکیش لە میچەکە یان پەنجەرەی ژوورەکەی بکات. شەوانە هەتا بەیانی وەك گۆزەیەکی پڕ ئاو، ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە و لە گەرمان زمانی دەردەکێشا و لە ژوورەکەیدا پیاسەی دەکرد و گیانە ئارەقاوییەکەی بەردەوام بە دیوارەکانەوە دەنووساند و لەشە بە "تا" سوورەوەبووەکەی فێنکایی دیوارەکەی هەڵدەمشت.

دەنگی زرمەی سمی ئەسپەکان بەردەوام لە گوێیدا دەزرینگانەوە و هەتا بەیانی نەدەبڕایەوە. جار هەبوو نەدەما و دیسان دەستی پێ دەکردەوە.

کۆشکەکە لە سەر گردێکی هێندەی بیست مەتر بەرز دروست کرابوو. دیواری حەوشەکەی یەك یەك و نیو مەترێك بە دەوری گردەکەدا کشابوو. وردە شووشەی ڕەنگاوڕەنگیان بە سەر دیوارەکە وەرکردبوو. قەوزە هێندێ لای دیوارەکەی داپۆشیبوو و باران و تەپوتۆز و خۆڵ و گەرما و سەرما، ڕەنگە سپییەکی جارانیان بۆر کردبوو. دیواری کۆشکەکەش وەك دیواری حەوشەکە دەچوو.

ڕێگەیەکی بەردەچنکراو کە کەپری ڕەزەکە سێبەری دەخستە سەری، دەچووەوە سەر کۆشکەکە. حەوشەکە پڕ بوو لە دار و درەختی چڕ. ڕزەکان بە لك و پۆی دار هەنجیرەکاندا هەڵچووبوون. هێندێ لە دار هەنجیرەکان قەدەکەیان رزیبوو. لەق لەق لە سەر چڵووکی دار چنارەکان هێلانەی کردبوو*. لای ڕۆژهەڵاتی باغەکە هەنارستان بوو. دەوراندەوری حەوشەکە سپیندار و هەنجیری دڕکاوی لێ چەقێنرابوو. هەنجیری دڕکاوی بە گوڵی درشتی ڕەنگاورەنگەوە.

خانووی نیوەکارەکان** لە پێشەوەی ئاوەدانییەوە و هێندێکیان کەوتبوونە لای ڕۆژهەڵاتەوە. مەزرا و کێڵگەی بەگ لە لای راستەی دەروازەی حەوشەکەوە هەڵکەوتبوون و نۆکەرەکانی بەگ لە خانووەکانی لای چەپدا دەژیان.

جگە لە نۆکەر و ڕەعیەتەکان، ئاوەدانییەکە زۆر کەسی دیکەشی تێدابوو، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە دەروێش بەگەوە نەبوو. چەند بنەماڵەش کە هەر کامەیان حەوت هەشت دۆنم زەوییان لە تەنیشت زەوییەکانی دەروێش بەگەوە هەبوو، لەو گوندەدا دەژیان. گوندەکە تاقە دارێك چییە تێیدا نەبوو.

ئەسپەکان بە زەوییە ڕێکەکەی بەری ڕۆژهەڵاتی کۆشکەکەدا و بە کێڵگە لۆکەکاندا تێدەپەڕین و دەڕۆیشتن. تاتە بەردێکی ڕێك و گەورە و سپی لە سەر ڕێی ئەسپەکان کەوتبوو. ئەو تاتە بەردە ئەوەندە گەورە بوو، کەس بۆی نەدەبزووت. باشە ئەو گابەردە چۆن و کێ هێنابوویە ئەو شوێنەی کە خاکەکەی ڕەش و نەرم و خاوێن و بێ بەرد و وردکەبەرد بوو؟ گەلێك ئەفسانە لەو وڵاتە هەڵبەسترابوو. ئەو بەردە ناودارە چووبووە نێو گۆرانی و بەستە و ئاوازیشەوە.

سوارەکانیش هەموو شەوێ بە تەنیشت ئەو بەردەدا تێدەپەڕین.

دەروێش بەگ کونجکۆڵ ببوو. ئەوانە کێن؟ هەموو شەوێ لە کوێوە و بۆچی ئاوا دێن و رادەبرن؟ رۆژێکیان بە محەرەمی گوت:"ئاخری هەر نەتزانی ئەوانەی کێن؟ ئەوە پازدە رۆژە هەموو شەوێ بێرەدا تێدەپەڕن. هەتا بەیانی لە بەر زرمەی نالی ئەسپەکانیان خەوم لێ ناکەوێ."

"شتێکی وام بۆ ساغ نەبووەوە، بەگ. هێشتا نەمتوانیوە بیانناسم. شەوەکە تاریك و نووتەکە... دەبێ چاوەڕێ بین تا مانگ هەڵدێ. هەموو دەم رێك لە یەك کاتدا دێن و دەڕۆن. نیوەشەوێ لە لای چیاوە دێن و برێك بەولایدا بای دەدەنەوە و بەرەو لای باشوور دەڕۆن، بەرەو لای رووبارەکەی جەیهان. دواتر بەرەبەری بەیانی بەرەو شاخ تێهەڵدەچنەوە و خۆیان ون دەکەن. چ دەفەرمووی، وەشوێنیان بکەوین؟"

"نا، وەشوێنیان مەکەوە. چاوەڕێی مانگەشەو بە. لە خەرەندێکدا خۆت مات دەکەیت و هەوڵ دەدەی بیانناسی."

وەرزێرەکانیش پەرۆش و نیگەران بوون و حەزیان دەکرد بزانن چ باسە. کە سوارەکان بە تەنیشت تاتە بەردە سپییەکەدا تێدەپەڕین، پیر و لاو، گەورە و بچووك هەر هەموو لە خەوێ هەڵدەستان و گوێیان بە عەرزییەوە دەنا و تا درەنگ وەختان، هەر گوێیان لە زرم و کوتی نالی ئەسپەکان دەبوو.

دەنگی سمی ئەسپەکان لە سەر سینگی دەشتەکە، تۆوی سەرسووڕمان و کونجکۆڵی و دڵەراوکێی لە دڵی وەرزێرەکان و دەروێش بەگدا دەچاند. ئەو سوارانە، سوارەکان کێ بوون؟ کێ دەیوێرا شتێك لەو بارەیەوە بڵێ.

# ٨

مستەفا بەگ ئاق یۆللی" زۆری پێنەچوو کە بە سەر خۆیدا زاڵ بوو و هەرەسی بەو تووڕەییە هێنا کە وەك دڕکێك بە دڵیدا ڕۆدەچوو. ئیتر بەبێ گوێ پێدان بە دنەدان و کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی، کەوتە تاوتوێ و شەنوکەوکردنی ژیرانەی ڕووداوەکان.

دەروێش بەگ کە کۆشکەکەی خۆی کردبووە قەڵایەك، بە هیچ کلۆجێ پێی نەدەنایە دەرەوەی قەڵاکە. کە لە ترۆمبێلەکەی دادەبەزی، قەڵافەتی لە سەرلێشێواوان دەچوو. ترس لە هەموو تانوپۆی گیانی گەڕابوو. دەروێش بەگ ببووە پەیکەرەیەك لە ترس. ئەی چ باشە، چ باشە، چ لەوە باشتر. ئەو جاری وایە ئازاترین مرۆڤی سەر زەوییە و جاری واشە ترسنۆکترینەکەیانە. هەم ترسنۆکییەکەی و هەمیش چاونەترسییەکەی لە ناخیدا کە دەجووڵێ لێی دەبێتە خووداری و شێتی. دەبێ ئەو خووخدەیەی ئەو کەڵکی لێ وەرگیردرێ.

وەلی شەماڵ، کابرایەکی باریکەڵە و کەڵەگەت بوو. چوکووراوایەکی ئاوا پان و بەرینی بە دوو ڕۆژ ئەوسەر ئەمسەر دەکرد. جارێکیان لەگەڵ سوارچاکێك ڕەقەی کردبوو* و ئەسپە ڕەسەنە عەرەبییەکە لە مەیدانێ لەگەڵ دەرنەبردبوو و نقوستان ببوو. ئەفسانەی وەلی شەماڵ لە سەر زار و زمانان بوو. کە پێی دەنایە دەشتەکەی چوکووراوا و دەکەوتە ڕێ، ئەوەندە خێرا و سووکبار دەڕۆیی، تیر و فیشەکیش نەیدەگەیشتێ.

وەلی شەماڵ چاوەکانی خەفەتبار بوون. جحێل بوو و بیریشی لە ژنهێنان نەکردبووەوە. لەو چوکووراوایەدا کەس نەبوو لە شوێنگێڕیدا تۆزی وەلی شەماڵ بشکێنێ. شوێنی باڵی باڵندەی لە سەر عەرزی هەڵدەگرت.

---

* ڕەقە: کێبڕکێ. هەڤرکێ.

"محەڕەم هەتا نیوەشەوێ لە بەر دەم دەرگای حەوشەکە کێشك دەگرێ و ئەوجار شوێنەکەی خۆی بە پاسەوانێکی دیکە دەسپێرێ و دەچێتەوە کەپرەکەی خۆی و لە نێوان ژنەکەی و بچووکترین منداڵەکەیدا رادەکشێ و هەر سەری دەگاتە بالیفەکە خەو دەیباتەوە. ئەو تفەنگەکەی لە باوەشیدا توند دەگرێ و ئاوا خەوی لێ دەکەوێ. تەختەکانی کەپرەکەی تۆکمە و پتەو و ئەستوورن... بەڵام ئەو دۆشەگەی محەڕەم لەسەری دەنوێ، زۆر ئەستوور نییە... تەنانەت فیشەکی دەمانچەش دەیبڕێ. دەیبڕێ و ئەو کەسەش دەکوژێ کە لەسەری نوستووە... ئەوە کاری هەموو شەوێی محەڕەمە."

"ئەگەر محەڕەم بکوژرێ، دوژمنیش ئەتۆ دەکوژێتەوە. ئەو دەم چی وەلی شەماڵ؟"

"دەی جا دەڵێم چارەنووس وا بووە. دەڵێم وەلی شەماڵ لەو کەسانە نییە ئاوا سووك و ئاسان کلکی بە تەڵەوە بێ."

"وسێنە رەش، ئەتۆ لەگەڵ وەلی شەماڵ بڕۆ. سواری ئەسپەکەت بە و لەگەڵ وەلی شەماڵ بڕۆ..."

"پێویستیمان بە ئەسپ نییە. بە پێیان باشترە."

"ئەتۆ لەگەڵ وەلی شەماڵ دەرناچی."

"دەی باشە با وەلی شەماڵ بە پێی من بڕوا."

"سەی رەش، پێ بە پێی تۆ بێم."

وسێنە رەش و وەلی شەماڵ، محەڕەمیان وا دەناسی کەردار کەری خۆی وا نەناسیبێ. بنیادەمێکی وردیلە و بۆر و کورتەباڵا و تۆکمە و بەکەفوکوڵ و دەم بە پێکەنین بوو. لەو مەڵبەندەدا کەس لە سواری و ئەنگێوەییدا لێی نەدەبردەوە. لەوانەبوو کە لە ئاسمانێ چاوی قورینگ و لە پێش تاژی چاوی کەروێشکی دەنگاوت. کەس نەیدەزانی کەنگێ و لە کوێوە هاتووەتە کۆشکەکەی دەروێش بەگ. پێموایە خۆشی نەیدەزانی هەر لە منداڵییەوە لەو دامودەزگایەی دەروێش بەگدا تفەنگچی بووە و ئازاترین و دەستکەرەوەترین شەڕکەر بوو. کام ئەسپ جوان بوو سواری ئەو دەبوو و کام فیشەکدان جوان بوو ئەوی دەبەست و لەوەتەی هەبووە هەر بە سواری ئەسپەوە دیتراوە. لە شارۆچکە و کووچە و کۆڵانان هەر بە سەر پشتی ئەسپەوە بوو. کڕین و فرۆشتنیشی هەر لە سەر ئەسپەکەیەوە بووە و خواردنیشی هەر لە سەر پشتی ئەسپەکەی بوو. شەش کوڕی هەبوو کە نۆبەرەکەیان بیست ساڵان بوو و لە ئیستانبۆڵ دەرسی دەخوێند.

ژانێك دڵی وسێنە رەشی داگرت و گوشیی.

شەو بوو. تاریك بوو. هەورەکان گەواڵ گەواڵ لە دەریای نێوەڕاستەوە بەرەو تۆرووس دەڕۆیشتن. وسێنە رەش و وەلی شەماڵ بە ئاودڕێکدا بەرەو ئاواییەکەی دەرویش بەگ دەڕۆیشتن. هەر دووکیان شەلاڵی ئارەقە بوون. کزە بایەکی فێنکی هات و بۆ ساتێك وسێنە رەش تەزوویەکی پێدا هات و سەرمای بوو، لە حاڵێکدا هەواکەی گەرم و مات بوو. عەرزەکە هێشتا هەر داغ بوو، بەلاّم بەرەبەری بەیانی گەرمایەکەی دەڕەوییەوە و فێنکایی بەیانی جێی دەگرتەوە. جا دەزانی تا بەیانی چەندی ماوە؟

وەلی شەماڵ و وسێنە رەش دوو رۆژ بوو بە رێوە بوون. بە دزییەوە دەڕۆیشتن و لە هەر جێیەك برسییان بوایە، پرێسکەیان لە پشتیان دەکردەوە و لە پەنا و چەپەکێکی چۆڵ نان و پەنیرێکیان دەخوارد، بەلاّم متەقیان لە بەرەوە نەدەهات. دوو رۆژ بوو هیچیان ورتەیەکیان لێوە نەهاتبوو.

گەیشتنە ئاوەدانییەکە... سەگەل بە وەلی شەماڵ نەدەوەڕین. وسێنە رەشش سەولە*ی هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی هەر سەیەك پێی وەڕی، بۆی باوێ.

گەیشتنە تەنیشت کەپرەکەی مەحەڕەم. سێ چوار مانگا لە بن کەپرەکە مۆڵیان خواردبوو و کاوێژیان دەکرد.

"ئەوەش کەپرەکە، حوسێن. تاوێك دواتر مەحەڕەم دێ و هەر بەو پەیژەیەدا وەسەر دەکەوێ. لە یەکەم تەختەوە دەیژمێری. رێك لە سەر تەختەی چوارەم ملی خۆی دەشکێنێ و دەنوێ. جوان ورد بەوە. نەچی لە ژن و منداڵەکەی بدەی. ئەگەر رێك لە نێوەڕاستی تەختەی چوارەمی بدەی، دڵی مەحەڕەم هەڵدەتەکێنی. ئەمن لە بن تاقەدار تووەکەی ئاقچاساز چاوەڕێتم."

هەر قسەکەی تەواو کرد، لە چاوان ون بوو. وسێنە رەش دەیزانی وەلی شەماڵ زۆر گورجە، بەلاّم پێی وانەبوو ئەوەندەش.

بە وردی کەپرەکەی پشکنی و تەختەی چوارەمی دیتەوە. ئەوجار چۆوە تەنیشت پەرژینەکە و لە پشت کۆگا کونجییەك مات بوو. لێرەوە کەپرەکە جوان دیارە.

لەو دوو رۆژەدا ئەوە یەکەم جار بوو بیری لە مەحەڕەم دەکردەوە. لەو دوو رۆژەدا هەر بە قەستی کوشتنی مەحەڕەم رێگەی بڕیبوو. هەر بۆ چرکەیەکیش بیری لێ نەکردبۆوە. ئێستا، تاوێکی دی مەحەڕەم دەکوژێ و منداڵەکانی هەتیو دەکا. لەوانەشە مەحەڕەمی پێ نەکوژرێ و خۆی بە دەستی ئەو بچێ. بەخۆی گوت:"ئەگەر مەحەڕەم من بکوژێ، ئەی منداڵی من هەتیو ناکەونەوە؟ باشە مەحەڕەمیش بیر لە هەتیوبوونی منداڵەکانی من دەکاتەوە؟"

---

*سەولە: ئەو ئەنگوتکە هەویرەی بۆ سەگ دەیبرژێنن لە تەندووردا.

ئەی دەبێتە قیامەت. سبەی بەیانی لێرە دەرزی هەلاویی وەعەرزی ناکەوێ. ژن و منداڵ دەیکەنە شین و گریانێك نەبێتەوە. هاواری تووك و نەفرەت دەگاتە ئاسمانێ. تازیەبار دەبن. لە گوندەکانی دیکەشەوە بۆ سەرەخۆشی دێن. ژەندەرمە و پیاوی حوکمەت و دوکتۆر لە شارۆچکەوە دێن و تەرمەکەی محەڕەم هەڵدەدڕن و دەیپشکنن.

هەتا بەیانی خوێنەکەی دڵۆپ دڵۆپ لە کەپرەکەوە بەسەر سەر و پشتی ئەو مانگایانەدا دەچۆڕێتەوە کە لەو بنە کاوێژ دەکەن. خوێن بە سەر ئاپۆرای خەڵکەکەشدا دەچۆڕێتەوە. خوێن وەك بارانە لە کەپرەکەوە بەسەریاندا دەبارێ.

ئەگەر رزگاربوونێك هەبێ، هەر لە رێگەی زۆنگاوەکەوە دەبێ. دەنا پیاوەکانی دەروێش بەگ لەو دەشتەدا وەکوو دەو راوی دەکەن... دیسان باشە ئەو زۆنگاوە بێ بڕانەوەیەش هەیە. جا وەلی شەماڵێش نەبێ، کەس ناتوانێ پێ بنێتە ئەو زۆنگاوەوە. مار بە خوشین و مەل بە فڕین ناتوانێ خۆی لەو زۆنگاوە بدا. لێرەوە تا زۆنگاوەکە پیاو دەتوانێ یەك پشوو را بکا. وەلی شەماڵێش ئەوە لە بن دار تووەکە چاوەڕێمە. ئیتر چ شتێك هەیە لە پیاوکوشتنی ئاسانتر بێ.

شەوگار شەق ببوو. مەحەڕەم دیار نەبوو. یانی بڵێی نەیە؟ ئەگەر ئەمشەو نەیە، دەبێ سبەی شەوێش هەر لێرە چاوەڕێی بم.

دەستی برد و چڵە گیایەکی گرت. چڵە گەزگەزگێك بوو. دەست و مەچەکی برژاندەوە.

بە پێناخۆشبوونەوە تفەنگەکەی توند بەخۆوە گوشی. باشە هەر ئێستا محەڕەم بەسەردا هاتبایە و دیتبایەی چ دەقەوما؟ کوڕە محەڕەم بۆوەی نابێ بەکەمی بگری. هەر هێندەی چاوتووکانێك وەك بێژینگ دابێژ دابێژت دەکا. فیشەکی بە خەسار ناچێ.

لە نێو هەورە رەشەکانەوە رووناکاییەکی هێندەی لەپی دەستێك دەرکەوت و بزر بووەوە. بۆنی شیاکە و ریخ لە هەوا گەڕابوو. کزە بایەك کە لە ئاقچاسازەوە هەڵی کردبوو، بۆنی زۆنگاوەکەی لەگەڵ خۆی دێنا، بۆنی هەڕنەهووت و رزیوی و خووساوی، بۆنێکی خەست و گەرم و خنکێنەر...

وسێنە رەش بە سەر پێیانەوە راوەستا و دەمودەست دانیشتەوە.

محەڕەم دیسان لە بیری چووەوە. بەگ دەیگوت دوای راپەڕاندنی ئەو راسپێردەیە، پەنجا دۆنم زەویم لە ئاقچاساز دەداتێ. ئەگەر ئەو زەوییە داچێنم....

چڵی لۆکە هێندەی بەژنی خۆم هەڵدەستێ... هەر قۆزاخەیەکی پڕ بە چنگێك. ئەگەر ئەو لۆکەیە بفرۆشم، پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوێ. ئای وێران بێ ئەو چوکووراوایە خوایە بەلای لێ

بباریَ. چوکووراوای چی، بڵێ تەندووری بەنێڵە و ئاگر. خۆ بۆ ژیان نابێ. بنیادەم تێیدا لە گیانی خۆی وەڕەز دەبێ. ئاخ ئەگەر دەستی ژن و منداڵەکەمم گرتبایە و ئەو تۆرووسە وەسەر دەکەوتم و گەرمێن و کوێستان دەکرد... لێرە وەزاڵە هاتووم. چما مرۆڤ چەندە دەژیێ؟ چما چەندەمان تەمەن بە بەرەوە ماوە؟ ئەمرۆ هەی و سبەی نیی... ئەگەر نەتوانی ئەو چەند رۆژە بە کەیفی دڵی خۆت بژییێ ، چۆنی حەزت لێ بوو رایبوێری... کاژستان، بن دارە عەرعەرەکان... چیا و لێرەوارەکان، کانیی پڕ لە بۆن و بەرامەی پنگەە... ژیان، ژیانەکان، ئەگەر تەنانەت ساڵێکیش، تەنیا هەر هاوینێکیش بێ، دیسان.... کوڕە تەمەنی بنیادەم بە هیچ و پووچەوە بەستراوەتەوە... ئەگەر بەگ پەنجا دۆنمێکم زەوی بداتێ و خۆشم ئازاد بکا... ئیتر ئەمن ساڵ و تەمەنێکم رابوردووە... ئیتر من تەواو بووم...

ئەوەی دێ، بڵێی محەڕەم نەبێ؟ بە کورتەباڵاییەکەیڕا خۆیەتی.

محەڕەم ماندوو و شەکەت، خەواڵوو و بە لارە لار، هات و لە خوار پەیژەی کەپرەکەوە راوەستا. سەری بەردایەوە و ساتێك چووە فکرەوە. وسێنە رەش بەخۆی گوت: ئەگەر هەر ئێستا بچێ و بە ملی شکاوی بنوێ و لێی دەم و تەواوی بکەم چۆنە؟ بەڵام ئەی ئەگەر تا من دەبزووم ئەو دەستی خۆی رەپێش خست و لێی دام چی؟ چم لە گەڵ ئەو ماوەرزە کەڵ کوژەی پێ دەکرێ؟ فڕندە و دڕندەش لێی دەرباز نابن....

رێك لەو کاتەدا محەڕەم بەسپایی و نەرم نەرم لە پەیژەکە وەسەر کەوت و بەبێ ئەوەی شمەکانی داکەنێ، لە جێوبانەکەیدا درێژ بوو. وسێنە رەش ئاگای لێبوو سەری لە کام لا کرد.

بۆ ساتێك لە جێی خۆی نەبزووت. دڵەڕاوکێی بوو. محەڕەمی هاتە پێش چاوی. بە سواری ئەسپێکی سووربوو بە رێگای تەنیشت باغێکی گەورەدا بەرەو چیا غاری دەدا و بە دەمانچەکەی یەکپشوو تەقەی لە رێگا چۆڵەکەی پێش خۆی دەکرد. محەڕەم ئەو کات زۆر گەنج بوو و وەك ئێستا سەری نەڕووتابۆوە. باشە بۆچی تەقەی لەو رێگە چۆڵە دەکرد؟ ئەو کات بیری لەو کارەی ئەو نەکردبووەوە و ئێستا خەریك بوو تێی دەفکری. ئەوەی ئەو دەیکرد، شێتیش نەیدەکرد.

چەند کەڵەبابێك لە نزیکییەوە خوێندیان. جوانووە ئەسپێك حیلاندی. لە سەرووی ئاقچاسازەوە، قاووقیژی مەل و باڵندەکانی زۆنگاو و پۆپییەکان بەرز بووەوە.

وسێنە رەش قیت بووەوە و بە سەری پەنجەکانی هاتە بن کەپرەکە. تەختەی چوارەمی دۆزییەوە و تفەنگەکەی پێوەنا و پەنجەی بە پەلەپیتکەدا هێنا. فیلینتا ئەڵمانییەکەی پێنج فیشەکی داڵ بە داڵ لێ دەرچوو. محەڕەم وەك گا بۆڕاندی و خۆی هەڵاویشت و کەوتەوە سەر

جێیەکەی. کەپرەکە جوولاّ و قرچەقرچی لیّ هەستا.محەڕەم دەمودەست گیانی دەرچوو. دوای بەربوونەوەشی کەپرەکە تاوێك هەر رادەژا.

ژن و منداڵەکەی بە سەرلێشێواوی و زراوچوویی لە خەو راپەڕین. هێشتا نەیانزانیبوو چییان لیّ قەوماوە. بە حەپەساوییەوە لە تەنیشت تەرمەکەی محەڕەمەوە لە جێی خۆیان وشك ببوون. ژنەکە تاوێك دواتر بوو بیری لە داگیرساندنی چراکە کردەوە.

هەموو ئاوایيەکە لە خەویّ راپەڕین و روویان لە ماڵەکەی محەڕەم کرد. ژن و منداڵەکەی بەربوونە شین و گریان. بوو بە هەڵلا و هەنگەمەیەك هەر مەپرسە.

دەروێش بەگ نالاّندی:"ئەی هاوار، محەڕەمیشم چوو، پێم وا نەبوو ئاق یۆللی" ئەوەندە زەلیل بووبیّ. لە دەفتەری مرۆڤایەتیدا زەلیلبوونێکی ئاوا نادۆزییەوە. ئەوانەی بە کەریّ ناوێرن لە کورتانیّ دەدەن. دەرەقەتی بەگەکان نایەن، تۆڵە لە نۆکەریان دەکەنەوە."

دەبوایە بێتە دەریّ، بەلاّم دانی بەخۆیدا گرت. لەوانەشە بۆیەیان ئەو تاوانە کردبیّ، کە ئەو بکێشنە دەرەوە."

دەمانچەکەی بە دەستەوە، ئەمسەر ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد. دوای ئەوەی بەبێدەنگی چوو و گەڕایەوە، ئاخرییەکەی لە بەر دەرگایە راوەستا و هەرای کرد:"ئەگەر نەمردووە، خێرا بیگەیینەنە دوکتۆر."

تاوێك دواتر وەلاّمیان دایەوە:"هەر دەمودەست مردووە."

دەروێش بەگ زۆر پەشێو و شڵەژابوو. دەتگوت شێرێکە لە قەفەزیّ کراوە. لەو دیوارەوە خۆی بەویتردا دەکێشا و دەسکی دەمانچەکەی لە مستیدا وا دەگوشی، خوێن لە نێوان پەنجەکانییەوە فیچقەی دەکرد.

"شێری چی؟ کامە شێر؟ خۆ چۆلەکەش وا نییە... جا مرۆڤ و ئەوەندە ترسنۆك؟"

حەیف، حەیف بۆ محەڕەم. ئەسپ و ئێستر پێکەوە بەشەڕ دێن و مێروولە لە بن پێیاندا دەفلیقێنەوە. ئێستاش وەلی شەماڵ دەکوژرێتەوە. هەر وەلی شەماڵ هاوشانی محەڕەمە. لەوانەشە وەلی شەماڵ ئەوی کوشتبیّ. ئاق یۆللی" خۆی نایە یەکێکی وەك محەڕەم بکوژیّ. محەڕەم، بە دەستی یەکێکی هاوشانی خۆی کوژراوە. وەلی شەماڵیش یەکێك دەیکوژێتەوە هاوشانی خۆی بیّ. باشە بۆ؟ چونکە بەگەکان وایان ویستووە. باشە مەگەر ئاگری شەڕەکانیش هەر ئاوا هەڵناگیرسێن؟ هەر لەگەڵ ئەوەی بەگەکان ئاوایان دەویّ، بە ملیۆنان خەڵك بەردەبنە گیانی یەکتری.

"هەر چونکە ئێمە وامان ویستووە."

گووی سەگ لەو دابونەریتە. بە راستی بەزمێکی قۆڕە.

"دابونەریتی ئێمە، نەریتی ئەوان. نەریتی ئەو تازە پێگەیشتووانە. نەریتی ئاغاکان لەوەش خوێناویتر، لەوەش قۆڕتر. نەریتی ئەو ئاغا و بازرگانانە زۆر زۆر لە نەریتی ئێمە بەگەکان قۆڕتر و بێتامترە."

دنیا وەسەر خوێن گەڕاوە. خوێن دێ و سەران دەبا... ئای لە رۆژەکانی چاناق قەلاوە... کە ئێستاش هەر خوێنی لەبەر دەڕوا.

"ئاااخ، ئەگەر دەمتوانی وەدەر بکەوم. بچمە نێو ئەو جەماوەرە خرۆشاوە. ئاااخ، ئەگەر دەمتوانی وەدەر بکەوم."

لێیان چووە پێشێ و بە دەنگی بەرز پرسی:"کێ لە محەڕەمی داوە؟"

هیدایەت بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"هەر چووتە جێوبانەکەیەوە و چاوی لێك ناوە، فیشەکەکان لە بن کەپرەکەوە... محەڕەم کە فیشەکەکەی وێکەوتووە، دوو مەتر خۆی هەلاویشتووە.... وای دەبۆڕاند گوێی کەڕ دەکرد.... کەس پیاوکوژەکەی نەدیتووە. هەوا تاریك و نووتەکە و چاو چاو نابینێ."

"کەس وەشوێن پیاوکوژەکە کەوتووە؟"

"وەشوێنی کەوتوون، بەلام وەختایەکی ئاقچاساز هەیە، لێرە کەست پێ ناگیرێ. قاتلێ بۆی دەرچووە."

ئارەقە لە ئازای ئەندامی دەچۆڕایەوە. دەرپێ و کراسەکەی خووسابوون. کراسەکەیان لەبەری و دەرپێیەکەیان لە پێی داکەند و رووت رووتیان کردەوە. گەرماکە خەریك بوو بیخنکێنێ... پشووی دەرنەدەهات. ئەگەر ئاوا مابایەوە، دەخنکا. ئارەقە هەلدەقولێ...

"هیدایەت..."

"ئەمر بکە بەگم."

"وەرە لەپشت ئەو دەرگایەوە دانیشە. تفەنگەکەت پڕە؟"

"پڕە گەورەم."

"دەمەوێ دەرگاکە بکەمەوە، ئەوە دەخنکێم."

توورەکە لمەکانی لادا و دەرگاکەی خستە سەر پشت. زاری وەك ماسییەکی فڕێ درابێتە وشکانی، کردەوە و هەواکەی هەلمشت.

"خەریکە لە هۆش خۆم دەچم. لە هۆش دەچم. ئاو بێنە. سەتڵێك ئاو بێنە هیدایەت. زوو بە. بیهێنە و بەسەرمی داکە."

ژنەکەی لە پەنجەرەی دیوەخانەوە سەیری دەکرد. سەری لێی سوور مابوو. کێ دەیتوانی بێ و لەو کۆشکە گەورەیەدا بیکوژێ. نەکا تێکچووبێ؟

هیدایەت سەتڵێکی گەورەی ئاو هێنا و بەسەری بەگی دا کرد و بەگ فێنك ببووەوە یان نا، دەسبەجێ گەڕایەوە ژوورەکەی و دەرگاکەی گاڵە دایەوە و تەوورەکە لەمەکانی بە پشتییەوە نا. بەخۆی دەگوت:"زستان دابێ، باشتر دەبێ. باشتر. سۆبەکە دادەگیرسێنی و لە تەنیشتی پاڵ دەکەوی. ئۆخەیش... ناشهێڵی کەس بێتەژوورەوە. ئاوا باشترە. دڵنیاترە. بەبێ پشکنین رێی کەس نادەم بێتە لام. دوژمنەکەم سەری باش لێ شێواوە. ئیتر دەست لە هیچ ناپیاوییەك ناگێڕێتەوە. تەواو نانی هاریی بە دەمەوە گرتووە. باشە بڵێی یەکێك لە پیاوەکانم لێ نەخەڵەتێنێ؟ ناتوانێ هیدایەت بکرێ؟ ناتوانێ..."

بە هیدایەتی گوت:"وەلی شەماڵ دەبێ بکوژرێتەوە؟ کێ دەیکوژێ؟"

"ئەگەر بفەرمووی، خۆم دەیکوژم. بەزەییم بە مەحەڕەم دادێ. دەبێ تۆڵەی بستێنمەوە."

"دەی باشە، خۆت وەلی شەماڵ بکوژەوە. هەر لە بەیانییەوە وەدرەنگیی مەخە. بیکوژە. مەحەڕەم بۆوەی دەبوو سەدی وای لە شاباشی بدرێ. بەڵام فایدەی چی."

وسێنە رەش بە هانکە هانك خۆی گەیاندە بن دار تووەکە. وەلی شەماڵ لەوێ چاوەڕێی بوو. هەستا و گوتی:"گوێم لێ بوو. دەنگی تەقەکەتم بیست. دواییش شین و گریان گوندەکەی داگرت. خۆ نەکەوتنە شوێنت؟"

"پێنج کەس وەشوێنم کەوتن."

"کەوابوو، دەی لە منت بکەوێ بەرەو ئاقچاساز... بگەینە بێشەڵان و لێڕەوارەکەی ئەوێ، هۆردوویەکیش بێن ناماندۆزنەوە."

دەستی کرد و پێکەوە خۆیان بە ئاقچاسازدا کرد و هەتا ئەژنۆ لە قوڕ و لیتە هەڵچەقین. بەڵام بەوە پتر نەچەقین، چونکە پێیان گەیشتبووە رەقێن.

بەرەو بێشەڵان و دارستانە چڕ و تاریکەکەی زۆنگاوەکە رۆیشتن.

دەنگی قسەکردنی پیاوەکانی دەروێش بەگ کە تا بن دارتووەکە شوێنیان هەڵگرتبوو، دەبیسرا.

# ٩

دەروێش ساری ئۆغڵی، سەرۆکی هۆزی ساریلا بوو. ئەو هۆزە هەتا نەوەد ساڵ لەمەوبەر رەوەند بوون.

بە لە نیشتەجێکردنەکەیان، هەر ئەو مەڵبەندەی نێوان ساروون و سومباس، هۆبە و هەوراگەی زستانیان بوو. بەگی ساریلار هەر لە سەر ئەو تەپۆڵکەی نزیك ئاناوەرزا کە ئێستا بووەتە کۆشکی دەروێش بەگ، خێوەتی ئاغایانەی خۆی هەڵدەدا.

چیاکانی بین بۆغاش هاوینەهەواریان بوو. هۆزی ساری ئۆغڵی هۆزێکی زۆر گەورە نەبوو، بەڵام هۆزێکی تا بڵێی رەشید و ئازا و دەوڵەمەند و نەریت پەرست بوو. هۆزەکان تەفروتوونا کرابوون و دنیا بەسەر یەکدا کاول بوو و هەموو شتێك گۆڕابوو، بەڵام هۆزی ساریلار هەر شەقڵیشی نەشکابوو.

تاقە یەك ژانی بێ دەرمانیان لە دڵی دا هەبوو... ژان و ئازاری بەزین و تێشکان لە بەرانبەر عوسمانییەکاندا، کە چۆن وەك ژەهرێك هەموو شتێکی لێ تاڵ کردبوون و هەر چیی دەیانکرد ئەوەیان لە بیر نەدەچووەوە.

باپیرەی دەروێش بەگ بەشداری شۆڕش و سەرهەڵدانەکەی کووزان ئۆغڵییەکان بوو و یەکێك بوو لەو بەگانەی لە بەر عوسمانییەکان بەزین. ئەو هەتا مرد ئەو تێشکانەی لەبیر نەچووەوە. نەیتوانیبوو تێشکانەکە لەبیر خۆی بەرێتەوە، بەڵام ئیدی خولیای ئەو فەرماندەیە ببوو کە تێکی شکاندبوون و هەر بۆیەش نەوەکەی خۆی بە ناوی ئەوەوە کردبوو.

چەندی دوژمنایەتیی لەگەڵ دەروێش پاشادا هەبوو، ئەوەندەیەش خولیای بوو. دوای تێشکانەکەی کووزان ئۆغڵییەکان، هۆزەکان تەفروتوونا کرابوون و هەر کامە و بەرەو لایەك

رایان کردبوو. هۆزەکان پاش تێشکانیٚ چاوەڕیٚ بوون قەڵتوبڕ بکرێن و دەروێش پاشا گومبەز لە سەلکیان ساز بکا، کەچی هیچ کوشتار و ڕەشەکوژییەکیان لیٚ نەکرابوو، بەڵام هۆزەکان تووشی بەڵایەك هاتبوون سەت خۆزگە بە ڕەشەکوژی.

هێندێك لە هۆزەکان دوورخرانەوە بۆ هاوینەهەواری بوزوك و هەندێکیان بۆ دیاربەکر و قەیسەری و سیواس. هۆزەکەی ساریلاریش لەگەڵ چەند هۆزێکی دیکە بەڕێی چوکووراوا کرابوون. ئیتر لەگەڵ هاتنی بەهاردا باروبنەیان نەدەپێچایەوە بەرەو تۆرووس. بە درێژایی هاوینیٚ لە جەحەندەمەکەی چوکووراوادا هەڵدەچۆقین. حوکمەتی عوسمانی سەربازی لە سەر هەموو ڕێگە کوێستانییەکان و ئەو ڕێگایانەش دانابوو کە دەچوونە هاوینە هەوارەکان و سەربازەکانیش نەیاندەهێشت چۆلەکوژ روو لە چیا و کێوپارەکان و ئەودیوی چیاکان بکات. چوکووراوا قاتی و قڕییەکی سامناکی تێکەوت. نۆبەتیٚ و گەرما بەتینەکەی کەسی نەدەبوارد. سەرەتا ئەوەندەی لیٚ مرد، کەس نەما لەو چوکووراوایە مردووەکان بنێژیٚ. تەرمەکان لە سەر عەرزەکە مانەوە و بۆگەن بوون.

عوسمانییەکان لە زەوییە بە پیت و بەرەکەتەکەی چوکووراوادا گەلێك کێڵگەیان لە بەر دەست نابوون. بەڵام کیٚ هەبوو چاو لە کێڵگە بکا، کیٚ هەبوو دابچێنیٚ و بدروێتەوە؟ ببوونە دوژمنی ئەو زەوییە بە پیت و بەرەکەتە. دوژمنی دار و دەرخت و باڵندە و گژ و گیا و کرم و جڕ و جانەوەرەکەی. ئەوان نەیاندەزانی کشتوکاڵ چییە و چۆن دەکریٚ. ئەوان ئاژەڵدار بوون و ئاژەڵەکانیشیان لەو چوکووراوا خوێناوییەدا کە هەر مێشێکی هێندەی گورگێك دڕندە بوو، پتر لە مرۆڤەکان تێداچوون و مردن.

ئاژەڵەکان هێندەی بنیادەمەکان خۆیان لە بەر ئەو گەرما و مێش و هەوا خنکێنەر و ژەهرئاسایە ڕانەدەگرت.

مەرگ، برسێتی، قڕتێکەوتن و نەخۆشی و پەتا، باوکی لە کوڕ و ژنی لە مێرد و هۆزەکەی لە بەگ کردە دوژمن. نەریتەکان لە ماوەی چەند ساڵاندا تێداچوون و لەبیر کران.

جا ڕێك لەو بگرە و بەردەیەدا بوو کە سلێمان بەگی ساری ئۆغلی خۆی و هۆزەکەی خۆی نەجات دا. سەیری کرد بنیادەم و ئاژەڵ وەك بای ژەهراوییان هەڵمشتبیٚ، هەڵدەوەرن. لە ڕاستیدا بایەکی ژەهراوی بوو کە بنیادەمەکانی وەك گەڵاڕێزان هەڵدەوەراند. سلێمان سەیری کرد هەم خۆی و هەم ژن و منداڵەکانیشی تێدا دەچن. وەختێك دەبینیٚ بنیادەم لەو چاڵەدا خۆی پیٚ ناگیریٚ، کەوتە بیری چارەسەر و دەربازبوون لەو زیندانە گەورەیە.

لێی سواری ئەسپ بوو و چوو فەرماندەی عوسمانییەکانی لە چیا دۆزییەوە. ئەو نەقیبێکی خوێندەوار و کابرایەکی باش و ڕووخۆش بوو. سلێمان بەگ کە باس و کێشەکەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، دەشڵێ:"چیی ماڵ و زێڕ و کچی بفەرمووی پێشکەش بە تۆ."

فەرماندەکەش لە ماڵی دنیا و زێڕ و کیژۆڵە، لە هەر کامە بەشی خۆی وەك پێشکەشی گێڕایەوە.

هۆزەکەی ساری ئۆغڵی پاش ئەوەی ژمارەیەك بنیادەم و یەك سم (ئەسپ و گوێدرێژ) و ئاژەڵ لەو گەرما و مێش و مەگەز و پەتایەدا، لە مرداره مانگی پووشپەڕێدا خۆی گەیاندە هاوینە هەواری بین بۆغا و لەوێ بار و بنەی بە عەرزی دادا.

حەوت هەشت ساڵان ئاوا رابرد و دواتر چاودێریکردنی ڕێگەکانی کوێستان وردە وردە شل بووەوە.

هۆزەکان لە قامیش و چڵ و چێو، کەپر و کۆخیان دروست کرد و گوندیان ساز کردن و وردە وردە فێری پێچ و گەوی کاروباری کشتوکاڵ بوون و تامی ژیانی بەردەوام و ئاکنجی و بەستراوەییان بە خاك و عەرزەوە چێشت.

تەنانەت دوای ئەوەش کە بازگەکانی عوسمانیەکانیش لە سەر ڕێگە و بانە کوێستانییەکان هەڵگیران، زۆر بوون ئەوانەی لە وەرزی هاوینانیشدا چوکووراوایان بەجێ نەدەهێشت و تەنیا ژن و منداڵەکانیان دەناردە کوێستانێ. تا شەڕی یەکەمی جیهانییش قەوما هەر وا چووە پێش. دوای شەڕی جیهانی، نەریتی چوون بۆ هاوینەهەوار لە چوکووراواوە هەر نەما.

ئاوا بوو کە هۆزەکەی ساری ئۆغڵی لە چوکووراوا مایەوە و تا ڕادەیەك لەو قڕتێکەوتن و مەرگە سامناکە رزگار بوو و هێندەی هۆزەکانی دیکە دابونەریتی خۆی نەدۆڕاند.

ئەو کۆشکە گەورەیەش هەر سلێمان بەگ، باپیرەی دەروێش بەگ دروستی کرد.

ماوەیەك بەسەر نیشتەجێبوونەکەیاندا تێپەڕیبوو. هۆزەکە وردە وردە خوویان بە زەوی و زار و کشتوکاڵەوە دەگرت. ساری ئۆغڵی بۆ کارێك چوبووە ماراش و لەوێ چاوی بە یەکێك لە بەگەکانی هۆزی بایزئۆغڵییەکان کەوتبوو.

بایز ئۆغڵی پێی گوتبوو:"سلێمان بەگ، دڵت بە عوسمانییەکان نەیەشێ. براله عوسمانییەکان ڕەوەندەییان بەلاوە وەك نیوەکێویله وایە. عوسمانی لە جوچکەیەك دەچێ کە ڕقی لەو هێلکەیەیە وا لێی هاتووەتە دەرێ. عوسمانی لەو سەودایەدا نە سوودێکی پێ گەیشت و نە شتێکی لە کیس چوو. ئەوەش نە بۆخۆی دەیزانێ و نە کەسی دیکە... کوڕە ئەو دنیایە

ڕەوەندی نەماوە. دەی بڕوانە بزانە لە فەڕەنگستان ڕەوەندی ماوە؟ چار نییە هەر دەبێ نیشتەجێ بین سلێمان. چما ئێمە کارێکی خراپمان کرد نیشتەجێ بووین؟ ئێمە جاری جاران سەرۆك و بەگی هۆزێکی بچووك بووین، ئێستا ئەوە بووینەتە ئاغای ماراشێکی ئاوا گەورە. ئەتۆش نیشتەجێ دەبی و هەر ئاغای ساری ئۆغلێش دەبی. دەتوانی ببیتە ئاغای ئەو چوکووراوا کاکی بە کاکییە و ئەدەنە و تەرسۆس و سیواس. دەست لە لاساری هەڵگرە. دەست لە خێوەت هەڵگرە و کۆشکێك بۆ خۆت دروست بکە. ئەتۆ کۆشکەکەت دروست بکە با عوسمانی و ئاغاکان بێنە کۆشکەکەت. ئەوی دیکەی ئاسانە..."

سلێمان بەگ خۆیشی لە مێژ بوو تێگەیشتبوو کە ئاوا بڕوات، ڕەوەندی و گەرمێن و کوێستان ناکرێ. هەر ئەو دەمەی لە ماراشێ بوو، تەلارسازێکی زیتونلۆیی و دارتاشێکی دۆزییەوە لەگەڵ شاگرد و کرێکار و بە کەلوپەل و ئامراز و کەرەستەوە هێنانییە چوکووراوا و هەر بەو زستانە بناغەی کۆشکیان داخست. لە بناغە و هیمەکەیەوە هێندێ بەردی نەقشکراو و هێڵکاری کراو وەدەر کەوتن. چەندی گردەکەیان دەکۆڵی، بەردی جۆراوجۆر و نووسراوە و نیگار و پەیکەری بنیادەم و ئاژەڵی لێ دەهاتە دەرێ. ئاسەواری کۆنە خانووشی لێ دەردەکەوت. سلێمان بەگ چیی بەردی نەخشێنراو و هێڵکاری کراو و پەیکەرەی مەڕمەڕ هەبوون هەر هەمووی ناردە کوورەی قسڵ. ڕاگرتنی پەیکەرە و بەردەنووسەکان گوناح بوو. ماڵی موسوڵمان نەدەبوو شتی ئاوای تێدا بێ تەنانەت لە بناغەی ماڵەکەشیدا. بەڵام بەرد دۆزینەوەش خۆی کێشەیەك بوو. باشە خۆ ئەو دەشتە خڕکەبەردێکیشی لێ نەبوو، ئەی ئەو کۆشکە گەورەیە چۆن هەڵدەچنرا؟ دیوارەکانی چۆن بەرز دەکرانەوە؟ خۆ مەڕمەڕە دۆزراوەکانی بن گردەکەش ئەوە دەکرانەوە قسڵ...

کەوابوو پێشتریش سەر ئەو گردە بنیادەمی وای لێ بوون کە لە نێو ئەو هەمووە مێش و مەگەز و لەو جەحەندەمەدا و لەو تەندوورە بە گڕەدا، ژیاون و بەردیان کۆڵیوە و پەیکەرە و بتیان تاشیوە... بایز ئۆغڵی گوتبووی:"ئەتۆ کۆشکەکەت بنیات بنێ، جا ئەگەر ویستت هەر مەچووە ناوی. ئێستا کۆشك نیشانەی ئاغایەتییە. کۆشکێك وات لێ دەکا عوسمانی بە پیاوت بزانێ. کۆشکەکەت چەندی گەورەتر بێ و چەندی بەشکۆتر بێ، ئەوەندە لە بەر چاوی عوسمانی ماقووڵتر و گەورەتر دەبی. کوڕە خێوەتەکەت لە خێوەتی پادشاش بێ و ئەگەر ئەتڵەس و دیباش لە عەرزەکەی ڕاخەی، ئەستوندەکیشی لە زێڕی بیست و چوار عەیار بێ، زەنگوڵە و گوڵێنگیشی لە دوڕ و گەوهەر بێ، دیسان بە لای عوسمانییەوە هیچ نی. ئەمڕۆ گەورەیی و

ماقوولّی بە کۆشکە. خێوەت ئیتر باوی نەما سلێمان بەگ، تەواو. ئەو ئاغایەی لە کۆشك و قەڵادا پاڵی لێ دەداتەوە وەك ئاغای نێو کۆشك و قەڵا و ئەوەی لە خێوەتیشدا پاڵ کەوتووە وەك ئاغای نێو خێوەتان سەیری دەکرێ. خێوەتی ئاغایەتی چیی وا لە خێوەتی دۆم و قەرەجان ماقوولّتر نییە. سلێمان بەگ، ئاااخ سلێمان بەگ، ئەو رۆژانە نەمان و رابردن. رۆژە خۆشەکانی خێوەت سووتان و رۆیشتن. بوونە دووکەڵ و کەس نازانێ لە کوێ ون بوون. با دەستێ هەڵبڕین و خۆڵێ وەسەر بکەین سلێمان بەگ.

بیناسازە ئەرمەنییە زەیتونلۆییەکە لە سیواس، لە بینای کۆشکەکەی ئاغای سیواس، هەر لە شاگردییەوە دەستی پێکردبوو و دڵی چووبووە سەر ئەو کۆشکە و بەردەوام بەخۆی دەگوت: بەر لەوەی بمرم، دەبێ کۆشکێکی ئاوا لە سەر ئەو زەوییە بینا بکەم. ئەویش لەوە گەورەتر و بەشکۆتر و هونەرمەندانەتر."

ئێستاش ئەوە هەلی بۆ رەخسابوو. هەلێك کە تا ئێستا بۆ کەس هەڵنەکەوتبوو. دوای ئەوەش لەوانە بوو بۆ کەس هەڵنەکەوێ. بەخۆی گوت، ئێستا کاتی غیرەت و دەستوبردە. کاتی خۆنواندنە وەستا ئۆننیك. ناوبانگت دەڕوا وەستا ئۆننیك. ناوت دەکەوێتە سەر زار و زمانان و هەر بە ناوەکەت دەژییێ. جێی کۆشکەکەش لە بارە، لە نێوەڕاستی دەشتێك و لە سەر گردێك کە باشترین دیمەنی هەیە. لە هەر کوێوە و لە هەر لایەکەوە سەیری بکەی وەك هەتاو دەدرەوشێتەوە.

چوکووراوا خۆ هەر هەمووی گڵە رەشەیە. بەردێکی هێندەی چنگێك چییە لێی دەست ناکەوێ. ئەو بەردانەی لە عەرزیش وەدەر کەوتوون، بۆ هیچ نابن. وەستا ئۆننیك دەبوو بەرد بۆ بیناکە بدۆزێتەوە، کەمیش نا زۆر... قەڵاکەی ئاناوەرزا سەرنجی راکێشا. حەسار و شوورا و بینا و ئاوەڕۆکان... وەستا ئۆننیك چەند حەوتووەك بە وردی قەڵاکەی ئاناوەرزای پشکنی. هێنانەخوارێی بەرد لەو رەوەزانەوە و بردنی بۆ سەر گردەکە زۆر ئەستەم بوو. ئەستەمی چیی، کردەنی نەبوو. بەڵام سلێمان بەگ گومانەکانی رەواندەوە:"هیچ خەمی ئەوەت نەبێ ئۆننیك. ئەتۆ بەردی ئاناوەرزات لە من بوێ. دەبێ ئالێرە کۆشکێك بنیات بنێی کە هەم عوسمانی و هەمیش شای ئێرانێ سەریان لێی سوڕ بمێنێ. ئەتۆ بەردت لەمن بوێ."

جا هەرچی ورد و درشتی هۆزەکەی بوون، پیاو و ژن، تەنانەت پیر و کەنفتەکانیشی بە مەودای دوو هەنگاو دوور لە یەکتری لە گردەکەوە تا ئاناوەرزا ریز کرد... خەڵکەکەی هۆزی ساری ئۆغلی بەشی نەکرد. لە سۆمبا سلی و جریتلی و کوردە لەکەکان و تاتارەکان کرێکاری

هێنا. بەردە هەڵکەنراوەکانی کاولاشەکانی ئاناوەرزا دەست بە دەست دەگەیێنرایە گردەکە. بەردی چوارقولینچك، خڕ، بەردی مەڕ مەڕ و زبرە. ئەو بنیادەمانەی وا بە مەودای چەند کیلۆمەترێك شان بە شانی یەکتری راوەستابوون و دەست بە دەست بەردەکانیان دەگەیاندە گردەکە، هێڵێکی رەشیان پێك هێنابوو کە لە جێی خۆیانەوە دەجووڵان و دادەهاتنەوە و قیت دەبوونەوە و نەرم نەرم شەپۆلیان دەدا... وەك دیوارێکی رەش... و ئەو بەردانەش کە دەستاودەستیان دەکرد، کۆمەڵە بەردێکی قورس و داتاشراو و زەرد و رەش و سپی و مەیلەوسەوز بوون. بەردەکان لە ئاناوەرزاوە دەستا و دەست خلۆرکرانەوە بەرەو تەپۆڵکەکە و لە سەر یەك کەڵەکە کران. بەری دەست بلۆقیان دەرکرد. پێستی لەپی دەست داماڵکان. بەردەکان بەری دەست و قامك و نینۆکەکانیان خواردەوە و سوویيانن. بەردەکان وەك ئاو، چەند مانگان لە ئاناوەرزاوە بە سەر دەستەکاندا بەرەو چوکووراوا لووزەویان بەست. زۆر کەس تاقەتیان نەهێنا و خۆیان رانەگرت و پێی چوون. خەڵکێکیش بۆی دەرچوون و هەر نەگەڕانەوە.

وەستا ئۆننیك ئاشقی تەگبیر و را و ژیریی ئەو سلێمان بەگی تورکمانە ببوو. کوڕە کێ ئەقڵی بەوە دەشکا ئەو هەمووە بنیادەمە لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە تا گردەکە وەك تەسبێح بهۆنێتەوە و ئەو هەمووە بەردە دەستاودەست بێنێتە نێو دڵی چوکووراوا و لە سەر یەکیان کەڵەکە بکا؟ وەستا ئۆننیك لە بەر تیشکی ئەو هیممەتەدا، وەخت بوو بفڕێ و شاگەشکە بێ.

ژن و پیاو و منداڵی هۆزی ساریلار، بە شەو و رۆژ، رۆژ بە رۆژ بەگوڕتر زەحمەتیان کێشا. گەلێك چیرۆك و هەقایەت لە سەر ئەو بەردانە ساز کران کە دەست بە دەست هێنران و تەنانەت بەر لەوەی بناغەی کۆشکەکەش دامەزرێ. گۆرانیبێژ سازیان هەڵگرت و روویان کردە خێوەتی ئاغایەتیی ساری ئۆغڵی و گەلێ بەیت و باو و هەقایەتیان لە سەر وەچە و تۆرەمە و رەچەڵەکی ساری ئۆغڵی و ئەو کۆشکە هەڵبەست کە دروست دەکرا. سلێمان بەگی ساری ئۆغڵیش بەخێرهاتنی کردن و کۆمەڵێك پێشکەشیی پێ دان. سلێمان بەگ دەبوو کۆشکێکی هەبێ، شان لە شانی کۆشکی عوسمانی بدات. ئەو کۆشکە دەبوو لە دوورەوە، تەنانەت لە لێوارەکانی دەریای نێوەڕاستیشەوە ببینرێ و وەك کۆشکی شای پەرییان چاوی لەبەر هەڵنەیێ.

ئەو بەردانە، مەڕمەڕە کۆنە تاشراوەکان، بەردە هەسان و زبرەکان کە لە سێ قۆناغ رێگەوە دەست بە دەست هێنرابوون، خوێن و مەرگ و سەبر و ئارەقەی نێوچاوان و لم و قسڵ و ئاسنی سوورەوەکراو و دەستی بنیادەم و هونەرە دەستییەکانی مرۆڤ و دابونەریتەکان و نەخش و نیگار و بەڕە... هەر هەمووی نیشانەی سەرکەوتن و مەزنیی هۆز و عەشیرەتێك بوون، کە لە

خۆراسان هەڵکەنرابوون و فڕێ درابوونە ئەو گۆشەیەوە و کەوتبوونە بەر سووکایەتی و ترس و تۆقاندنەوە و دەربەدەری و مەینەت و زام وناسۆری رۆژگاریان چێشتبوو. وەك دوایین هەستانەوە و تۆڵەسەندنەوە ودەستپێکردنەوەی ژیان....

بنیادەمەکان ئەوەندەیان بەرد و لم و قسڵ و دار کێشابوو، پشتیان شەقار ببوو. گلەییان نەکرد و نەیانبۆڵاند. هیچ دەستخۆشانەیەکیشیان نەویست بۆ ئەو هەمووە زەحمەتەی کێشایان. نەك هەر نەیانویست بەڵکو هەرچی هەشیانبوو، لە سەر بەری دەستیان دانا و پێشکەشی ئاغاکەی خۆیانیان کرد و بەبێ ئۆقرەیی و تاسەبارانە چاوەڕێی تەواوبوونی کۆشکەکە مانەوە. کۆشکێك کە دوا هیوای رزگاربوونیان بوو لە دەربەدەری و پەرش و بڵاوی. لەو نێوەدا ئەگەر بەگ گوتبای واز لە دروستکردنی ئەو کۆشکە دێنم و پارەم بەش ناکا، گیانی خۆشیان دەفرۆشت و کۆشکەکەیان تەواو دەکرد، یان لەوانەبوو ئاغاکەیان هەر بشکوژن، ئەگەر وازی لێ هێنابا.

هەژان و کەفوکوڵی کۆشکەکەی ساری ئۆغلی هەموو دەشتەکەی ئاناوەرزا و زۆربەی هۆزەکانی نیشتەجێی چوکووراواشی گرتبووەوە. هەر هەمووان چاوەڕوان بوون بەیانیی رۆژێك لە نەکاو کۆشکە بلوورینەکەی شای پەرییان لە سەر گردەکەوە هەڵتۆقێ.

جگە لەو بەردانەی دەستاودەست هەڵگیرابوون، هەر کەسە، تەنانەت هەژارترین تورکمانیش لە هەر جێیەك بووبێ، لە کاولاشەکانی سیواس، بۆدرۆم، قەڵای حەمیتە، قەڵا هاوینە، میسیس، بەردێکی جوان تاشراوی رێکی دۆزییەوە و هێنایە کۆشك. ئەوەندەیان بەرد هێنایە گردەکە کە دەکرا دوو کۆشکی پێ دروست بکەی. کۆگای بەردەکان کە لە ری رۆژئاوای گردەکەوە کەڵەکە کرابوون، ئێستاش کە ئێستایە هەر لە جێی خۆیەتی.

سلێمان بەگ وەستایەکی نەخش و نیگاریشی لە سیواسەوە هێنا، کە دەبوایە کۆشکەکە رەنگ بکا.

ئەو نەخشانەی بنیاسازەکە لە بەرد و ئەو دەرگا و لاشیپانە و سەردەرانە و پەنجەرانەی دارتاشە هونەرمەندەکەش سازی کردبوون، چاو لێیان تێر نەدەبوو. کار و زەحمەتی خۆبەخشانەی دەوروبەری ئاناوەرزا و هونەری بەناوبانگترین وەستاکارەکانی ئەنەدۆل پێشکەشی ئەو کۆشکە کرابوو.

کە بینای کۆشکەکە تەواو بوو، حەوتووەکی تەواو جێژن و هەڵپەڕکێ بوو. نەریتی میواندارییە کۆنەکان ژێنرایەوە. هەرچی ئاغای دوورخراوەی چوکووراوا بوون، بەگەکانی ماراش و ئەنتاب، بانگهێشتی ئەو میوانییە کران. پاشاکانی عوسمانیش لە حەلەب و ئەدەنەوە

بانگهێشت کران. جێژنێکی بێوێنە رێك خرا. ئێستاش کە ئێستایە لە چوکووراوا هەر باسی ئەو جێژنە دەکرێتەوە کە بە "میواندارییەکەی کۆشك" ناوی دەرکردووە. هۆزی ساریلار و هەموو ئەو هۆزانەی دیکەش کە لە دروستکردنی کۆشکەکەدا بەشدار ببوون، بەخۆیان نازین. کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی وەك گەوهەرێك لە نێو دڵی چوکووراوادا دەدرەوشایەوە. لە تاوهەڵاتن و خۆرئاوابووندا، درەوشانەوەی پەنجەرەکانی کۆشك دەشتەکەی رووناك دەکردەوە.

سلێمان بەگ ئەو کۆشکەی دروست کرد. بەڵام نەك بۆ ئەوەی خۆی تێیدا بژیێ... کۆشکەکەی فەرش کرد و بە هەموو زێڕ و زیوێك رازاندییەوە. بەڵام تاقە جارێکیش چییە تێیدا دانەنیشت و نەنووست. کە کاربەدەستێکی عوسمانی رێی لەو دەوروبەرە دەکەوت، دەرگاکانی کۆشکەکەیان بۆ دەخستە سەر پشت و دوای رۆیشتنی، دایاندەخستنەوە. سلێمان بەگی ساری ئۆغڵی خێوەتە گەورەکەی بەگایەتیی هەر لە حەوشە بەرینەکەیدا هەڵدابوو و هەر لەوێدا دەژیا. ئەو تا مردیش هەر نەیتوانی خوو بەو کۆشکەوە بگرێ و لەگەڵی رابێ. کۆشکەکەی زۆر خۆش دەویست و شانازیی پێوە دەکرد. هەر ئەوەندە و هیچی دیکە.

کۆشك بۆ ئەوەی نییە تێیدا دانیشی، بەڵکو بۆ میواندارێتی لە میوانی ماقووڵ و گران و سەنگینە.

ئەو خێوەتەش هێندەی کۆشکەکە و بگرە پتریش بەناوبانگ بوو. حەوت ئەستووندەکێك بوو و هەر ئەستوندەکەش بە شێوەیەکی تایبەت نەخش و نیگار کرابوو. تەختی خێوەتەکە کەوڵی پڵنگی لێ راخرابوو. گەلێکی بەڕەی جوان و نەخشین نێو خێوەتەکەیان دەڕازاندەوە کە دەیانگوت ئەوە عەشیرەتەکەیان ئەو کاتەی لە خۆراسانەوە هاتبوون لەگەڵ خۆیان هێنابوویانن. تەونکەری هونەرمەندی خۆراسانی نەخش و نیگاری وایان تێ خستبوون، هەر دەتگوت ئەو بەڕە و مافوورانە چی گوڵ و رەگ و گەڵا و بۆن و بەرامەی گوڵەکانی خۆراسانە، لەخۆیاندا کۆ کردووەتەوە.

سلێمان بەگ لە سەیرکردنی ئەو بەڕە و مافوورانە تێر نەدەبوو و بەردەوام دەیگوت:"رەنگ و نوورێك لەو دنیایەدا نەماوە لەو بەڕە و مافوورانەدا نەخرابێتە کارەوە. با سەیری ئەو بەڕە و مافوورانە بکەین و بیر بکەینەوە کە ئاخۆ خاکی خۆراسانە چەندە بە پیتە. خاکی کەڵەپیاوان و خاکی رووناکاییەکان. خاکی پیرۆز. با سەیری بکەین و تێبفکرین."

هەتا سلێمان بەگ نەمرد، کەس نەچووە نێو کۆشکەکەوە و کۆشکەکە هەر بە داخراوی و شەقڵ نەشکاوی مایەوە. هۆزەکانی دەوروپشتی ئاناوەرزاش هەتا ئەو کاتەی کۆشکەکە چۆڵ

بوو، بە هیی خۆیانیان دەزانی و کۆشکەکە هەموو بەیانیان و ئێواران، لە بەر چاوی ئەوان وەك کۆشکی شای پەریان دەدرەوشایەوە.

"ئاق یۆللی"یەکانیش کە لەوبەری رووبارەکەی ساورۆنەوە و لە سەر گردەکەی کۆپ، بار و بنەیان خستبوو، قۆڵیان لێ هەڵماڵی و کۆشکێکیان لە گوێن کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی ئاوا گەورە و رازاوە بۆخۆیان ساز کرد. کۆشکی "ئاق یۆللی"یەکانیش گەورە بوو، لەوانەش لە هی ساری ئۆغڵی گەورەتر، بەڵام هێندەی کۆشکی ئەو سەرنجڕاکێش و چاوگر نەبوو. لەوانەشە لەبەر ئەوە بووبێ، چونکە بەگەکانی ئاق یۆللی" دەمودەست دوای دروستکردنی کۆشکەکە چوونە ناوی ئاوەدانیان کردەوە. ئەوەش بە کەیفی هۆزەکان نەبوو. ئەوان دەیانگوت:"نەدی و بدی، کورێکیان بوو ناویان نا گدی گدی، لە جێی نێوکی گونیان بڕی."

ساری ئۆغڵییەکان و بەگەکانی ئاق یۆللی" دوژمنی قەستەسەری یەکتری بوون. بە خوێنی یەکتری تینوو بوون و هەرکام یەکێکی ئەوی دیکەی دەست کەوتبایە، خوێنی دەڕشت. کەس نەیدەزانی ئەو دوژمنایەتییەی نێوانیان لە کەنگێوە دروست بووە. ئەوەندەی وەبیریان دەهات، هەر وایان دیتبوو و هەر واش لەسەری رۆیبوون.

ئەو خوێنڕشتنە لەوانەیە لە تالان و بڕۆ یان مەسەلەیەکی ناموسییەوە دەستی پێ کردبێ. ئەو خوێنڕشتنە بەردەوامە لەوانەشە لە خۆراسانەوە هێنابێیانەتە ئەو ولاتە و لەوانەشە لە سەر لەوەڕگە و بژوێن و گەرمێن و کوێستانێ بووبێ. راپەرینەکەی کووزان ئۆغڵییەکان هەموو دوژمنایەتییەکانی کردبووە دۆستایەتی و کۆتایی بە کێشە و شەڕە خوێناوییەکان هێنابوو، بەڵام بەگەکانی ساری ئۆغڵی و ئاق یۆللی" هەر پێداگربوون لە سەر دوژمنایەتییەکەیان.

دەیانگوت ئەوانە هەرگیز پێکەوە ئاشت نابنەوە. هەتا لەو سەر زەوییە جووقەواریان نەبڕێتەوە، ئەو شەڕەشیان نابڕێتەوە و هەر دەبێ.

نە ئەوان دەیانتوانی بێنە ئەو بەرەی ساورۆنەوە و نە ئەوانەش دەیانوێرا پێ بنێنە ئەو بەری ساورۆنەوە.

ساورۆن سنووی نێوانیان بوو. لە جەنگەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئەو خەڵکێك لە رۆملییەوە هاتبوونە چوکووراوا. ئەو رەوەندانەش کە دە گوندیان پێ ئاوەدان دەکرایەوە، لە کەناری رووبارەکەی جەیحان و دەوروبەری ئاناوەرزا، بار و بنەیان بە عەرزی دادابوو. لەو سەردەمدا کۆمیسیۆنێك بە مەبەستی نیشتەجێکردنی رەوەندەکان پێك هاتبوو. سەرۆکی ئەو کۆمیسیۆنە، جەودەتی بەگی برای دەروێش بەگ بوو. ئەو کۆمیسیۆنە هەرچی رەوەند بوون لە

بەری رۆژهەڵاتی ساورۆن واتە لە بەری کەوشەنەکەی ئاغاکانی ئاق یۆللی" نیشتەجێی کردن. رەوەندەکان لەو بەرەوە، دە گوندێکیان دروست کرد. هەر بۆ تۆوی و دەرمانیش بێ، تاقە رەوەندێك چییە، پێی نەنایە کەنارە رۆژئاواییەکەی ساورۆن. کەچی بەری رۆژئاوایی ساورۆنیش هێندەی بەری رۆژهەڵاتییەکەی زەویی بەیاری هەبوو. ئەو زوڵمە ئاشکرا و کەڵەگایەتییە، ئاگری تووڕەیی و رقی ئاغاکانی پتر نێڵ دا.

سلێمان بەگی باپیرەی دەروێش بەگ، دوای دروستکردنی کۆشکەکەی، سێ کەس لە بەگەکانی ئاق یۆللی"ی کوشتبوو. "ئاق یۆللی"یەکان چەندی هەوڵیان دابوو دەستیان بە سلێمان بەگ رابگا، هیچیان بۆ نەچووبووە سەر. گەرچی ئەو هەمووەساڵە هەر بە شوێنییەوە بوون، بەڵام هیچیان نەیانتوانی تەقەیەکی لێ بکەن. ئەوان دەیانگوت:"سلێمان بەگ سیحربازە. سیحرێکی وای تێ دایە، هەر دەیبینی، جادووت لێ دەکا و ئیتر تەنانەت دەستت بۆ دەمانچەکەشت ناچێ، چ بگا بەوەی سێرەی لێ بگری و تەقەی لێ بکەی. کەس ناتوانێ چاو لە چاوە سیحراوییەکانی بکا.

بەگەکانی ئاق یۆللی"، بۆ داپۆشینی ئەو دەستەوستانی و ترسنۆکییەی خۆیان، گەلێ ئەفسانەی جۆراوجۆریان بۆ سلێمان بەگ هەڵبەست و بە چوکووراواباندا بڵاو کردنەوە.

ئاشیق (گۆرانیبێژە سازژەنەکان) ئەو ئەفسانانەی سلێمانبەگیان کردە هەوێنی گۆرانییەکانیان.

رۆژێك لە رۆژان پێنج کەس لە "ئاق یۆللی"یەکان لە بەری لێژایی زینوێی رەوەزەکان سلێمان بەگ بەسەردا دەخەن. هەر پێنج کەسیان دەمانچەی لێ دەکێشن و تەقەی لێ دەکەن. بەڵام چ دەبینن؟ سەیر دەکەن سلێمان بەگ بە قاقاکێشانەوە هەر پێنج فیشەکەکە دەگرێتەوە و بەرەو لایان رایدەدێرێتەوە. ئەوە یەکێك لە ئەفسانەکانە.

"ئاق یۆللی"یەکان جارێکیان سلێمان بەگ دەگرن. ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە و سلێمان بەگ لە کۆڵەکەیەك دەبەستن و دەیخەنە سەر کڵی گڕەکە و بەجێی دەهێڵن. چەند رۆژ دواتر رێك لەو زینوێیە تووشی سلێمان بەگ دەبنەوە... هەر دەیبینن، لە لاقانیان وەردێنن و بۆی دەردەچن.

سلێمان بەگ نەوەد ساڵ ژیا. دەمی گەیشتبووەوە عەرزی و چاوەکانی کەم حوکم ببوون، بەڵام دیسان لە ئەسپەکەی دانەدەبەزی.

رۆژێکیان نەخۆش کەوت، بەڵام چی کردیان لەبەر نەخۆشییەکەی نەکەوت. دەیگوت:"هەر ئافرەت بە تڕ و تسەوە لە نوێنێدا دەمرن. مردنی نێو نوێن بۆ پیاو نەهاتووە."

ویستیان پزیشکی بێننە سەری، قەبووڵی نەکرد و گوتی:"حەکیمی من خودایە."

چەند رۆژ دواتر ئیتر لە سەر پێی خۆی رانەگرت. پشتی بە ئەستوندەکی خێوەتەکەیەوە نا و هەتا شەوێ دانیشت. دوایی ئیتر ملی شۆڕ بووەوە و نەیتوانی قیت رایگرێ. ئەوجار کەوچکەکەی پێ نەگیرا. شۆرباوەکەیان بە دەمییەوە کرد. ئاخری شەویلکەشی لە کار کەوتن.

هەر لەو جەنگەیەدا بوو کە بانگی کوڕەکەی کرد و گوتی:"جوانترین جلوبەرگەکانم بۆ بێنە. ئەسپە شێیەکەشم بە زین و لغاوە نەخشێنراوەکەوە بۆ بڕازێنەوە."

موو بە موو ئەمر و فەرمانەکانیان بەجێ گەیاند. چما پیاو هەبوو سلێمان بەگ شتێك بڵێ و ئەو جێبەجێی نەکا؟ تەنانەت تەرمەکەشی بە مردوویی دنیات بەسەردا وێران دەکا.

ویستی هەستێ. چیی هەوڵی دا نەیتوانی.

بە دەنگێکی نیوەنووزەوە کە لە نێو قوڕگییەوە هەڵدەستا، بە کوڕەکەی گوت:"بۆ راوەستاوی سەیرم دەکەی؟ ... وەرە دەستم بگرە."

کوڕەکەی دەستی گرت و یارمەتیی دا هەستێتە سەر پێیان.

"بمبە لای ئەسپەکەم."

بردی.

"ئەسپەکە بێنە تەنیشت بەردی سواربوونەکە."

بەبێ یارمەتیی ئەوان، چووە سەر بەردەکە و خۆی سواری ئەسپەکەی بوو. تێر چاوێکی بە وڵاتدا گێڕا و ئاخرییەکەی نیگای لە سەر کوڕەکەی راگرت و لەوێش هەڵیگرت و قەمچیی لە ئەسپەکەی دا. هەستا و وەك هەورێکی رەش لە حەوشەکە دەرچوو و دوور کەوتەوە. سلێمان بەگ سەری ئەسپەکەی بەرەو چیا ئەرخەوانی و بە باران خووساوەکان وەرسووڕاند و لینگی دا و لە چاوان ون بوو.

کوڕ و کاڵ و کەس و کارەکەی بە سەدان کەسەوە گەلێ رۆژان هەموو چیاو چۆڵەکانیان لێ کرد بەشکم مردوو یان زیندووەکەی بدۆزنەوە، کەچی بچووکترین شوێنەواریان لێ نەدۆزییەوە.

کوڕەکانی دابونەریتەکانی ئەویان هەر پاراست، بەڵام یەکەم کاریان دوای ئەوەی هیوایان بە دۆزینەوەی نەما، بەڵام یەکەم کاریان دوای هیوابڕاوی لە نەدۆزرانەوەی، ئەوە بوو خێوەتی ئاغایەتییەکەی ئەویان لە حەوشەکە کۆ کردەوە و بردیانە کۆشکەکەوە.

سلێمان بەگ کۆمەڵێ وەسیەتیشی بۆ کوڕەکانی کردبوو. یەکەم وەسیەتەکەی ئەوە بوو:

"لیّم ببیستن کوڕانم، لەمن ببیەن و هەمیشە پەیوەندیتان لەگەڵ عوسمانیدا باش بێ و هەرگیز زوڵم و ناهەقی مەکەن. عەشیرەت نیشتمان و عوسمانی شان باهۆی ئێمەیە."

هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی، زەوی و زاری ئێرە بایەخێکیان نەبوو. کشتوکاڵیش بێ بایەخ بوو. تۆزێك بەر لە هەڵاییسانی ئاگری شەڕەکە، ژیانیش گۆڕا و جموجۆڵێك پەیدا بوو و کشتوکاڵ لە زەوی زارەکەی دەوروبەری ئاناوەرزا برەوی گرت.

بابی دەروێش بەگ دوای ئەوەی سەیرێکی دەشتەکەی ئاناوەرزای کرد، بە کوڕەکانی گوت:"ئەو چاڵەی تەنیشت یالینزتوت نیشانە بکەن."

ئەوجار ئاماژەی بەو بەری رووبارەکەی جەیهان کرد و گوتی:"بەم بەرە، لە گردەکە بەم لایەوە ئی خۆمان بێ. دەی بڕۆن و ئەو عەرز و زەوییانە بدەن لە دەفتەرەکانی حوکمەتدا بەناوی خۆمانی بکەن. ئەو زەوی و زارانە دواتر بە کارمان دێن. ئەوەندەمان زەوی بەسە. وا نییە؟"

کوڕانی گوتیان:"بەسمانە."

ئاغاکانی ئاق یۆللی"ش هەر وایان کرد. ئەوانیش هۆبە و زستانەهەوار و زەوی و زاریان بۆخۆیان بڕ دا و هاوینە هەوارەکانیشیان بە ناوی خۆیانەوە کرد.

دەروێش بەگ هێشتا مێرمنداڵێك بوو کە ئاغاکانی ئاق یۆللی" باوکییان کوشت. رۆژێکیان، بەیانی باوکی سواری ئەسپەکەی دەبێ و دەچێتە راوە مامز. دەیەوێ ئاسکێك بە زیندوویی بگرێ. ویستبووی ئەسپەکەی تاقی بکاتەوە. بە بەر چاوی خۆیەوە باوکییان ئەنگاوت. تاو هەڵاتبوو. تەرمە خوێناوییەکەی هەموو بەیانییان خوێنی لێ دەچۆڕایەوە.

بابی ئەو کاتەی هێشتا دەروێش بەگ تازە هەشت ساڵان بوو، ئەو دەمانچە دەسك شاخەی لە قەدی بەستبوو. دەروێش بەگ تەمەنی نەگەیشتبووە دە ساڵان، ئەنگێوە و شارەزا بوو. لە سەر چلۆوکی داران چۆلەکەی دەنگاوت. راهێنەرەکانی ئەو، ئەو کوردە دەرسیمییە ئەنگێوە و سمێڵ بابڕانە بوون، کە بەنێوبانگترین یاغییەکانی تۆرووس بوون و لە ئاسمانێ دەرزییان دەنگاوت.

لە پانزە ساڵانیدا ناوبانگی ئەنگێوەییەکەی بە هەموو چوکووراوا وەربوو.

لە نێو دەنگی فیشەك و بۆنی بارووت و لە نێوان یاغی و راهێنەرەکانی تفەنگ هاویشتنێدا، کە سمێڵیان دەورێك لە گوێیان ئاڵاندبوو، لە نێو چاوی سوور و روانینەگرژەکان و روخسارە رەق و تەقە رەوەزئاساکاندا، منداڵانە و لە دنیایەکی منداڵانەدا نەژیابوو، بەڵکو بە ترسێکەوە ژیابوو کە بەردەوام دڵۆپ دڵۆپ وەك ژەهرێك بەگیانیدا گەڕابوو. پێیان دەگوت لە

مەرگ نەترسێت و پیاوانە بەرەنگاری ببێتەوە. بەڵام مەرگ بە سەر هەموو ئەو فێرکاری و تەڵقین دادانەیدا زاڵ دەبوو و ئەو دیوارە تاریکاییەی لە بەردەمی قوت ببووەوە، هەر دەهات و ئەستوورتر دەبوو.

هەر کات و چرکەساتێك بە قەستی کوشتنی تەقەی لێ دەکەن. لە ترسان بەردەوام گوێ قوڵاغ و وەك کەوانێکی پۆڵایی لەبەر یەك کشابوو، دەلەرزی ... مەرگ لە هەموو قوژبنێك، لە هەموو چۆڵەوانییەك، لە سەر هەموو ڕێگەیەك، لە بن هەر پنچکە گیایەك و لە پشت هەر دەرك و دیوارێك بۆسەی بۆ نابۆوە.

بۆیە بەردەوام چەکی لە سەر پێ بوو... دەبوایە لە چاوتروکانێکدا دەمانچەکەی ڕاکێشێ، سێبەر و گیانلەبەر و بێگانەکانی دەوروپشتیشی، هەرچی هاتبایەتە سەر ڕێی، دابێژ دابێژ بکا.

هەڵێدەدا و گەورە دەبوو، بەڵام وەبیری نەدەهاتەوە کە لەو کاتدا تەمەنی چەندە بوو. شانزە و لەوانەشە پانزە... لەبیری چووبووەوە. تەنیا سوورایی مەڕمەڕە تۆز لێنیشتووەکەی وەبیر دەهاتەوە کە لەگەڵ درەوشانەوەیەکی مات چاویان لەبەر هەڵنەدەهات و ئەو بڵێسانەش کە کاڵ دەبوونەوە و دادەمرکانەوە.

بابی لە پێشییەوە ئەسپەکەی تاو دەدا... ئەسپێکی وەك بای شەماڵ و ئەویش لە پشتەوەی بابی ئەسپی خۆی لینگ دابوو. لە نەکاو ویزەویزی فیشەك هەستا. بۆڕە و هاواری بابی هاتە گوێی. ئەسپەکەی سێ چوار جار هەستایە سەر پاشووان و بابی لە ئەسپەکەی بەربۆوە و کەوت.

بە چاوی خۆیی پیاوکوژەکانی دی کە لە پشت پنچکەکان بۆسەیان نابۆوە. کۆمەڵێك پیاوی چاو زەقی سمێڵ بابڕ بوون. کە چاوی پێیان کەوت، بە سەر زینەکەوە وشك هەڵاتی و تینی لە دەست و پێیانیدا نەما. نەیتوانی دەست بۆ دەمانچەکەی بەرێ و نەیوێرا ڕاش بکا. نە زمانی لە زاریدا گەڕا و نە هاوارێکی کرد. هەر وا چاوی بڕییە بنیادەمەکان و دەستە لەرزۆکەکانیان و گوێچەکە و چاوە لە ژێڵڵاهاتوو و تەماوییەکانیان و حەپەسا. باوکی لە سەر عەرزەکە لە خوێنی خۆی دەگەوزی و چنگی لە عەرزی گیر دەکرد و قەپی بە پنچکە دڕوویەك داکربووو قسەکانی لە گەروویدا قەتیس دەمان و لێیان تێنەدەگەیشت. پیاوکوژەکان بە چاوی لە ژێڵڵاهاتوو و حەپەساویانەوە سەیری پەلەقاژە و لینگە فرتێ و گیاندانی قوربانییەکەی خۆیانیان دەکرد. باوکە ساتێك هەستایە سەر پێ و ئامبازیان بوو و تەقەی سێ فیشەکی داڵ بە داڵ بۆ سەر سینگی، خستییەوە سەر عەرزەکە. باوکی کەوت و جووڵەی لێ بڕا. پیاوکوژەکان هەستان و دوای ئەوەی خۆڵی سەر ئەژنۆ و ئانیشکەکانیان تەکاند، وەك نە بای هاتبێ و نە بۆران، بە

کێڵگەی لۆکەکەدا بەرەو جەیهان داگەڕان. دەروێش بەگ خۆیشی نازانێ تاکەی ئاوا حەپەسا بوو و ئاگای لەخۆی نەمابوو.

خوێنەکەی لە سەر عەرزەکە گۆمیلکەی دەکرد. بە زاری داپچڕاو و چاوی زەقەوە لە سەر گازەرای پشت کەوتبوو. ئیتر خۆڵەکە، نەرم نەرم خوێنەکەی هەڵدەمشت. ئەو ساتەی وەبیر هاتەوە کە ماوەیەك سەرسووڕماو بە دەوری تەرمەکەی باوکیدا خولایەوە. دوای ئەوە بە شوێن پیاوکوژەکاندا بەرەو رووبارەکە داگەڕا. پیاوکوژەکان بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. ئیتر نەیتوانی پەل ببزێوێ و لە سەر جێی خۆی وشك بوو و هەتا لە چاوان ون بوون، چاوی تێوە بڕین. دوای لە چاو ونبوونی بکوژەکانی باوکی، هاتەوە سەر تەرمەکە و تاوێك لە ژوور سەری دانیشت. زۆر سالان دواتر، وەك خەون و خەیاڵێك وەبیری دەهاتەوە کە لە نەکاو لە جێی خۆی راچڵەکیبوو و بەرەو ئاواییەکە گوڕاندبووی و ئیتر لە پێ کەوتبوو... کە هاتەوە ماڵێ زمانی شکابوو و ئیتر دیوارە بەرز و سوورەکەی، کە لە بن توێژکاڵێکی تەپوتۆزەوە، بریقەبریقێکی ماتی هەبوو، دیت. پیاوەکانی بای لە پاڵیان دابووە گابەردێکی سوورباوەوە و یەکپشوو تەقەیان دەکرد. فیشەکەکان لە باوکی دەردان. فیشەکەکانی وێدەکەوت و چەنگی لە گابەردە سوورەکان گیر دەکرد و بەهەموو تینی خۆی دەیگرتن و هەڵنەدەکەنران.

گابەردە زلە رەگ سوورەکە، وەك گوڵاڵەی سووری لێ هات. بابیشی هەروەتر و لەگەڵ دیوارەکەدا بوو بە یەك و لە بن تەپوتۆزێکی سووردا مایەوە. دە رۆژێك هەر زمانی نەکرایەوە و هیچی نەگوت و تا بەیانییەکیان وەك هیچ نەقەومابێ، لە خۆوە زمانی کرایەوە و سێ رۆژان هەر قسەی کرد و ئەوجار بۆ ماوەیەکی زۆر و لەوانەیە ساڵێکیش دەبوو، زمانی نەگەڕا.

ئێستاش تا چاوی لێك دەنێ یان هەر شەوێکی دەچێتە جێوبانەکەیەوە، باوکە کوژراوە لە خوێنگەوزیوەکەی لە تەنیشت گابەردە رەگەسوورەکەی دێتەوە پێش چاوی. لۆکەی پشکوتوو دەبینێ کە شەلاڵی خوێن و سوور سوورن. نیوەی بەردە مەڕمەڕە نەخشێنراوەکەی نێو کێڵگەی لۆکەکەش خوێناوییە. باوکە باوەشی بە بەردەکەدا کردووە هەڵیهێنێ.

ددان بە بەردەکەدا دێنێ و شێتانە بە دەوریدا دەخولێتەوە. رەوەزەکان، سوور سوور، کێوی و سەریان لە ئاسمانێ دەسوین و باوکە سوور سوور و وردیلە و بچووك لە نێو رەوەزەکاندا پێیانەوە نووساوە و نایەتە دەرێ. وردکە بەرد، گژ و گیا و رەگە گیا بە دەستەکانییەوە ... خوێناوی ... شەپۆلێکی گەورەی تەپوتۆز هەڵی کردووە.

دوای کوژرانی باوکی، هەرچی ئەرك و کار بوو، کەوتە ئەستۆی جەودەت بەگی برا گەورەی. جەودەت بەگ ناچار بوو، تا زووە یەکێك لە "ئاق یۆللی"یەکان بکوژێتەوە.

دەروێش وێڕای جەودەت بەگی برای و وەك ئەو ئاوا بە شپرزەیی و شڵەژاوییەوە ژیابوو کە هەم خوازیاری تۆڵەسەندنەوە بوو و هەمیش زەندەقی لە کوژرانەوە و مەرگ چوبوو. ئەوان شادی و ژان و مەرگیان بە تەنێ نەبوو. هەموویان پێکەوە بوو. هۆبەکەی ساری ئۆغڵی لە هەموو قەومان و ڕووداوێکدا لەگەڵیان هاوبەش بوون و شانیان وەبەر دەدا.

جەودەت بەگ دوای دوودڵی و شڵەژان و ترسە تاقەتبڕەکانی ئاخرییەکەی ڕۆژێکیان برا گەورەی ئاق یۆللی"ی کوشت. بە فەرمانی ئەو، مردووەکەیان بە پەتێك لە ئەستۆی ئەسپەکەی خۆی کرد و ئەسپیان بەڕەڵڵا کرد. ئەسپەکە مردووەکەی بە نێو کێڵگە و زۆنگاو و ڕەوەز و گژ و گیا و دڕووەڵانەکاندا ڕاکێشا و ڕایکێشا تا گەیاندییەوە کۆشکەکەی ئاق یۆللی". ئەسپە خۆشبەزەکە لەو مردووە ڕەویبووەوە، کە بە دوویدا دەکشا و لەوێوە تا ئێرە هەر پێشێلی کردبوو و ئەنجنیبووی.

دەروێش بەگ دوای ئەوەی ڕوشدیە (پۆلی ناوەندی لە سەردەمی عوسمانیدا) ی لە شارۆچکە تەواو کردبوو، لە سوڵتانییە (دواناوەندی)ـی ئەدەنەدا ناوی خۆی نووسیبوو و ئەو دەمانچەیەی لە هەشت ساڵانییەوە پێی بوو، لە ڕوشدییەش داینەنا. هەموو مامۆستا و قوتابییەکان دەیانزانی دەمانچەی پێیە، بەڵام هیچیان بەرووی خۆیانیان نەدێنا. لە سوڵتانییش دەمانچەکەی هەر پێ بوو. مامۆستا و قوتابییەکانی سوڵتانییش بەسەرهاتی دەروێش بەگیان دەزانی، بەڵام کەس نەیتوانی هیچ لە سەر دەمانچە و سەربردەکەی لێی بپرسێ. هیچ کەس نەیدەتوانی سوعبەت و جەفەنگی لەگەڵ دابەستێ. کەس نەیدەوێرا شتی وا بکا.

هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی، وای لێکردبوو لە مرۆڤێکی لەخۆبایی و باوەڕبەخۆ و سەرسەخت و گران و سەنگین دەچوو. هەر کەسێکیش ئەوی دەناسی، بەزیی پێیدا دەهاتەوە و وەك کوژراوێك سەیری دەکرد. هەر واشیان دەدی و لە دڵدا بەزەییان پێیدا دەهاتەوە و لێی دەترسان. بە ڕێزێکی تێکەڵ بەو حاڵەتەی لە بەرامبەر شتە سیحراوی و پیرۆز و حەرامەکاندا بەرۆکی مرۆڤ دەگرێ، لێی دەچوونە پێش.

دەروێش بەگ، هەتا خوێندنی تەواو کرد هەر لە نێو شوورای ئەو هەستە ترسناکانەدا و لە بەر ئەو نیگایانەدا ژیا کە ئەو هەستەیان لێ دەباری. ئێستاش ئەوە خاوخێزانەکەی خۆی هەر بەو هەستەوە سەیری دەکەن و لێی دەچنە پێشێ و لێی دەڕوانن. بەو دواییانە... هەر ئەو

هەستە ـ کە لە بن بارستاییە سامناکەکەیدا گیانی هاتبووە سەر لێوانی ـــ خەریك بوو شێتی بکا. دوای سوڵتانی لە دارولفنونەکەی ئیستانبۆڵدا لە بواری مافدا ناوی نووسی. لێرە یەك دوو ساڵان نەك کەس بە دەمانچەکەی زانی و نە کەسی بە نەقڵ وسەربردەکەی. دەروێش بەگ دەمانچە و سەربردە و بەسەرهاتەکەی خۆی هەروا بە شاراوەیی و نهێنی رادەگرت .... بەڵام ئاخرییەکەی نەهاتییەك لێی ئاشکرا کرد. ئیتر دوای ئەوە دیسان ژیانەکەی لێ بۆوە بە جەحەندەم.

ڕۆژێکیان لە مەیدانەکەی بایەزیدی ئیستانبۆل، لە قاوەخانەیەك لە بن دار چنارێك دانیشتبوو و لەگەڵ برادەرەکانی سوعبەتی دەکرد. دوو کەس لە هاوڕێیەکانیشی لە مێزەکەی تەنیشتیانەوە لەگەڵ گەنجێکی نەناسراو دانیشتبوون. گەنجێکی باریکەڵە و روخسار تێکسمڕاوی و چاو رەش و گەورە. تاوێك دواتر مێزەکانی تەنیشتیان پێکەوە نووسان.

یەکێك لە برادەرەکانی دەروێش بەگ، گەنجە باریکەڵە و رەنگ پەڕیوەکەی نیشانی دا و گوتی:"حەزدەکەی پێکتان بناسێنم؟"

ئەوجار گوتی:"پێم سەیرە بۆچی تا ئێستا یەکتریتان نەناسیوە؟ لە حاڵێکدا هەردووکتان خەڵکی مەڵبەندێکن."

دەروێش بەگ دەستی برد:"مستەفا لە ئاغاکانی ئاق یۆلووە."

دەروێش بەگ دەستی وا کێشایە دواوە دەتگوت لە ئاگری رۆکردووە. مستەفاش کە دەستی بۆ لای ئەو درێژ کردبوو، هەر وا بە خێراییەوە کێشایەوە دواوە.

دەروێش بەگ وەك برووسکە لە جێی خۆی دەرپەڕی و لە چاوترووکانێکا ون بوو. مستەفاش هەر ئەو کاتە، وەك ئەوی کرد.

برادەرەکانیان دەیانویست بزانن چ قەوماوە و مەسەلەکە چییە. دەسبەجێ چوونە بنج و بناوانییەوە. دوای ئەوە بوو کە ژیانە بەهەشتییەکەی ئەو دوو ساڵەی ئیستانبۆل لە دەروێش بوو بە دۆزەخ. ئیتر هەر کەس، برادەرەکانی و گراوی (مەعشووق) و مامۆستاکانی هەر هەموویان دیسان بە سرکی و تۆقیوی و شڵەژاوی و ترس و حورمەتێکەوە سەیریان دەکرد، دەتگوت لە مردووەك دەڕوانن. ئەو ئیدی بە لای هەموانەوە ببووە بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە.

ئەو خوێندنی قانوون و مافی زۆر پێ خۆش نەبوو. دەرسەکانیشی بە قۆنە قۆن دەخوێند و هەر بۆ ئەوەندەی لێیان دەربچێ و نەکەوێ. لە ئیستانبۆل گیرۆدەی دوو دەرد ببوو:"ئەڤینداری و فێربوونی زمانە بیانییەکان. ئەگەر هەموو رۆژێکیش نەبوایە، لانیکەم هەموو مانگێك شێتانە دڵی دەچووە

سەر کچە ڕۆمییەك یان تورکێك یان ئەورووپی یان جوولەکەیەك و دوای ئەوە لە نەکاو دڵی لێ بەردەدا و لەبیری دەکرد و دڵی دەچووە سەر جوانێکی دی. ئەوەی وەبەر چاوی نەدەهات پارە خەرجکردن بوو بۆیە، جاروبار بێ پارە دەمایەوە. لە چوکووراواوە بەستە بەستە پارەیان دەنارده ئیستانبۆل. هەقایەتی ئەبلەخەرجی و دەستبڵاوییەکانی لە ئیستانبۆل و چوکووراوادا کەوتبووە سەر زار و زمانان. دەروێش بنیادەمێکی ئەوەندە جوامێر بوو کە ژیان و پارە و دار و نەدار و هەموو هەستی خۆی بە دڵاوایییەوە دەبەخشییەوە. خۆی دەسووتا بۆ ئەوەی کۆڕی خەڵك رووناك و گەرم دابێنێ. ئەو ژنانەی ئەویان دەناسی، هەر لە بەر ئەوە شێت و شەیدای دەبوون.

دەروێش بەگ هەر وا شێلگیرانە فێری زمانی بیانی دەبوو. لە ماوەی شەش مانگدا وەك ئاو فێری زمانی فەڕەنسی بوو. هەموو رۆژێ دەچووە خولی تایبەتی زمانی فەڕەنسی و جگە لە فەڕەنسی، ئینگلیزییش فێر دەبوو. بەر لە تەواوکردنی دەرسەکەی، فێری فەڕەنسی و ئینگلیزی و یۆنانی و عەرەبی بوو. لەو نێوەدا پتر لە هەمووان بەسەر فەڕەنسیەکەیدا زاڵ بوو. پێی کرابووەوە بۆ نێو پیاوماقووڵانی ئیستانبۆل و دەگمەن بوون لە زانینی فەڕەنسیدا نێوانیاندا ئەوی شان لە شانی بدا. پیاوماقووڵانی ئیستانبول لەبەر سەربردەکەی و توانا و لێهاتوویەکەی خولیای ببوون و سەریان لێی سووڕ مابوو. ئەویش پێی سەیر نەبوو کە ئەوەندە سەریان لێی سووڕ ماوە. ئاخر هەر بنەماڵە و رەچەڵەکیان خوویان واگرتبوو، دڵ لە خەڵکی بستێنن و تووشی سەرسووڕمانیان بکەن.

دوای ئەوە لە چاناق قەڵا شەڕی کرد و بریندار بوو. ئەوجار لە شەڕی رزگاریخوازانەی تورکیادا گروپێکی پارتیزانیی پێك هێنا لە چیاکانی تۆرووس و دژی فەڕەنسییە داگیرکەرەکان شەڕی کرد. کە بە هۆی برینەکانییەوە لە سەربازی ئیزن درا، پلەی نەقیبی و میدالیای سەربەخۆیی بە سینگەوە بوو. ئیتر لەمەودوا هاتەوە و لە نێو مڵك و زەوی و زارەکەی خۆیدا دانیشت و لەگەڵ ئەو کچەی وا دایکی و داپیرەی بۆیان دۆزیبووەوە، زەماوەندی کرد. کچە باشووی و خەڵکی دەشتەکەی ئامیك و کچی بەگێکی گەورەی تورکمان بوو. دەروێش ئەو رۆژەی چاوی بە روخساری کچە کەوت، کە بۆیان گواستەوە.

دوو حەوتوو لە سەر یەك شایی و زەماوەند بوو. بەگ و ئاغا و ئەمیر و کاربەدەستێك لەو نێوە نەما بەشداری ئەو شاییە نەبووبێ.

دەروێش بەگیش ئیستانبۆل و ژیانەکەی ئەوێی خۆی لە بیر کرد. کە باسی ئیستانبۆل دەکرا، خەیاڵی پڕ لە گومبەز و منارەی سەر بەتەمی دەهاتە پێش چاوی. دەروێش بەگ لەو شتانەی لە ئیستانبۆڵەوە خووی پێوە گرتبوون، وازی لە دووانیان هەر نەهێنا: خوێندنەوەو

قوولترکردنەوەی زانیارییەکانی لە سەر زمانەکان. بەردەوام فەلسەفەی دەخوێندەوە. دەیخوێندەوە و لە مەرگ و ژیان و بنیادەمەکان و دنیا و سرووشت رادەما و تێیان دەفکری و لێی دەکۆڵینەوە. پێنج ساڵی رەبەق بیری لەوە کردەوە و لەوەی کۆڵییەوە کە لە کوێوە هاتووین و بەرەو کوێ دەڕۆین و ئاخرییەکەی دوای ماوەیەکی زۆر سەرلێشێواویی وای لێهات گوتی خودایەك نییە. خودا نا، بەڵام بنیادەمەکان هەبوون و ئاغاکانی ئاق یۆللی" هەبوون. هیچ نییە. هیچ شتێك نییە، ئەم دنیایە هەر مەرگی تێدایە و هیچی دی.

ماوەیەك چووە دنیای مردووانەوە. ئەو هەرچی دەیدی، بێ گیان و مردوو بوو. مرۆڤ و ئاژەڵ و گیا و دار و دەوەن و جڕ و جانەوەر و هەرچیی دەیدی بە مردوویی دەیدیتن. ئەو بەزەیی بە هەموو شتێکدا دەهاتەوە ئیتر ئەو شتە جوان با یان چڵکن و دزێو یان گیانلەبەر بوایە. بە تاقی تەنێ بە گۆڕستانێکی بێ سەر و بندا دەسووڕایەوە. ئێرەیی بە هیچ شتێك نەدەبرد و لە هیچ شتێك تووڕە نەدەبوو. شاد نەدەبوو و پێشنەدەکەنی. چونکە هەموو شتێکی وەك مردووان دەهاتە بەرچاو.

چەند ساڵان دواتر، تووشی بە تووشی پیرە سۆفییەکی ریش چەرمووی سەر و قژ درێژ و چاوجوان هات. بە پیرەی گوت: هەموو شتێك، ئەوەندەی مەرگە (بەشی مەرگە) ئەوەندەش ژیانە، نە پتر و نە کەمتر.

پیرە بەو قسەیەك تێك چوو و قسەی پێ گوت:"ئەتۆ خراپ لە دنیایە دەڕوانی. نا، ئەمن ناڵێم خراپی لێ دەڕوانی، راست نییە بڵێم خراپی لێ دەڕوانی، هەر بە لایەکیدا لێ دەڕوانی. خۆ ئەگەر ورد بیتەوە و لێی قووڵ بیتەوە، دەزانی ژیان لە مەرگ بەهێزترە. ئەگەر ژیان نەبێ، هیچ شتێك نابێ. مەرگ بۆیە هەیە، چون ژیان هەیە. هەموو شتێك بە ژیانەوە بەستراوەتەوە. ئەوەی بەردەوامە مەرگ نییە، ژیانە. ئەتۆ سەروبن لێی دەڕوانی بەگ، تەواو سەروبن سەیری دنیایە دەکەی. ئەگەر ئەمن هەڵەیەکیش بکەم، هەڵەی من لە هەڵەکەی تۆ هەر باشترە. چونکە ئەوەی مانا بە مەرگ دەبەخشێ، ژیانە. ئەگەر ژیانێك نەبێ، مەرگێکیش لە گۆڕێ نابێ."

دەروێش بەگ لە ژیانیدا تەنیا ئیمانی بە یەك کەس ئەویش بەو پیرە عەلەوییە هێنا. قسەکەی لێ وەرگرت و بڕوای پێ کرد. ژیان خۆی هەر ئەو پیرە بوو ـ تیرۆژی رووناکی ژیان بە سەر مەرگەکاندا. دەروێش بەگ ئەو بنیادەمە بێ باوەڕی کە جگە لە مەرگ بڕوای بە هیچ شتێکی دیکە نەبوو، ئیمانی هەر بەو پیرە عەلەوییە هێنا وەك تیرێژێك لە ژیان.

# ١٠

تاوكەوتنان، گەیشتنە ئەو بێشەڵانەی لە دوورەوە رەش دەچووەوە. هیچ كامیان بە سەر پێیانەوە خۆیان نەدەگرت. هەتا بەیانی بە نێو قوڕ و لیتەی ئەو زۆنگاوەدا كە وەك چرێش* بە لاق و لەتەریانەوە دەنووسا، یەك پشوو رایانكردبوو.

زەنازەنا و هەڵڵای گوندەكەی ساری ئۆغڵی لە بری دووركەوتنەوە و دامركانەوە، جار بە جار بەرزتر و نزیكتر دەبووەوە. رەوەزەكانی ئاناوەرزا هەڵڵا و هەنگەمەكەی ساری ئۆغڵیی ئەوەندەی دیكە بەرزتر دەكردەوە و بە زۆنگاوەكەی ئاقچاسازی وەردەكرد.

"خەریكە رۆدەچم، كوڕە فریام كەوە وەلی شەماڵ."

وەلی شەماڵ ئاوڕێكی دایەوە و سەیری كرد. وسێنە رەش، هەتا سینگی رۆچووبوو و پەلەقاژەی بوو و چەندی پتریش خۆی رادەپسكاند، زیاتر رۆدەچوو.

وەلی شەماڵ خۆی فڕێدایە سەر بنەتای پۆلەقامیشێك و بە دەستێكی لكێكی ساغی گرت و دەستەكەی دیكەی بۆ وسێنە رەش درێژ كرد و هەرای كرد:"دەستم بگرە، بەڵای لابەلا... بیگرە...."

وسێنە رەش دەستی گرت.

"دەمكێشنە خوارەوە وەلی، دەمكێشنە خوارەوە."

"جوان دەستم بگرە دەستەوستان."

كێشای و هێنایە دەرێ.

وسێنە رەش هەتا ژوور نێوكی قوڕاوی ببوو. هەڵڵا و زەنازەنای ئاوایی كە لە رەوەزەكانی ئاناوەرزا دەهاڵا و دەنگی دەدایەوە، گوێی كەڕ دەكرد.

---

* چرێش: سكۆتین

"ئەی لەو گرمەیە، دەڵێی تۆپ دەتەقێنن... لەوێ چ قیامەتێکە... هەموو هاتوونە دەرێ. کوڕە خۆ ئەتۆ نەبوایەی تڕی ئاخریم کەندبوو. هەر وا ڕۆدەچووم. تۆزێك درەنگتر فریام کەوتبای ئیتر وسێنە ڕەش نەدەما. وا نییە؟ بەڵام با شتێکیش بڵێم وەلی، ئەمن دەترسم لەو زۆنگاوە گیان دەرنەبەم. دەڵێی لە دڵم گەڕاوە. دێی لێرە بچینە دەرێ و بە وشکانیدا را بکەین؟"

"کوڕە ئەتۆش تەواو تێك چووی ها وسێنە ڕەش. هەر ئەو زۆنگاوە دەتوانێ رزگارمان بکا. ئەگەر توانیمان لە ڕێگەی ئاقچاسازەوە خۆ بگەیەنینە ئاق یۆللی"، ئەوە باشە، دەنا بەس تەرمەکەمان دەچێتەوە ئەوێ. ئێستا وەرزی هاوینە و دەر و دەشت پڕە لە دێهاتی. هەموو کون و کاژێرێکمان لێ دەگەڕێن. ئێستا هۆزەکەی ساریلار بە ورد و درشتیانەوە کەوتوونەتە شوێنمان. ئەگەر بە یاڵەکەی ئاناوەرزا هەڵگەڕێی، جا دەزانی لەوێ چ قیامەتێکە. دڵنیابە دەرزی هەڵاوێی وەعەرزی ناکەوێ. جگە لەوەش ئەوان خۆ وەشوێن تۆ نەکەوتوون، بە شوێن منەوەن. نۆرەی منە..."

"کەوابوو با هەر لەو بێشەڵانەدا خۆمان مات بکەین."

"کوڕە وسێن قسەی قۆڕ مەکە. ئەرێ هیچ دەزانی دەڵێی چی؟ ئەوە چتە؟ خوێن نەیگرتبێی؟"

وسێن بە هەموو هێزی خۆی هاواری کرد:"بێدەنگ بە وەلی."

وەلی راچڵەکی و بێدەنگ بوو و تاوێك دواتر سەبر و لەسەرخۆ و بە لەبزێکی فەرماندەرانە و لۆمەکەرانە گوتی:"هەتیو ئەتۆ پێت وایە نازانن خۆمان بە قامیشەڵانەکەدا کردووە؟ خۆ مێشکی کەرت نەخواردووە وسێن؟ پێت وایە زۆر ئەستەمە شوێنمان هەڵگرن تا ئێرە؟ دەروێش ئێستا بە دەیان سەی هاری وەدوو خستووین. ئێمە دەبێ هەرچۆنێکی بێ، بۆ شەوێ خۆ بگەیەنینەوە ئاق یۆللی". هەر ئەو ڕێگەی نەجاتەمان هەیە."

وسێنە ڕەش لە جێی خۆی نەدەبزووت. چاوەکانی ـ کە یەکەم تیرێژەکانی تاوی بەیانی ئازاریان دەدا ـ پەیتا پەیتا دەیپیتاندن.

"کوڕە وەلی هیچ کوێ نابینم. چاوم بە شەوارە کەوتوون. لێگەڕێ با خۆرەکە تۆزێك بەرز بێتەوە دوایی."

وەلی شەماڵ تفەنگەکەی لە وسێنە ڕەش ئەستاند و ئەوجار دەستی گرت و بەدووای خۆیدا رایکێشا. چاوەکانی وەلی وەك چاوی گورگ تیژ بوون. نە قیچ دەبوون و نە ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد.

تیریژی خۆر وەك مووسی دەلاك تیژ بوو. هەتا ئەژنۆیان لە زۆنگاوەکە ڕۆچوبوون و بن پێیان ڕەقێن بوو.

"دەستم بەردە وەلی. ئەو زۆنگاوە هەر ئاوا بیّ ئەوان تۆزیشمان ناشکێنن."

"زۆنگاوەکە هەر وا نییە."

"گوێت لێیە؟ بە سەدان کەس سات بە سات لێمان نزیك دەبنەوە."

"نزیکتر دەبنەوە. ئەوان بست بە بست ئەو زۆنگاوە دەناسن. ئێرە وەك ماڵی خۆیان وایە. ئەوان دەزانن چەند قامیشەڵان و بێشەڵان و تەنانەت چەند چڵە قامیش و حەیزەرانیشی تێدایە و چەند زەردەواڵەش تێیدا وزەوزیانە. ئەوان هەر هەموو ئەو شتانە دەزانن."

"وەلی شەماڵ".

"گیانی وەلی، دەڵێی چی؟"

"دەڵێم، یاخوا بەو درۆ زل زلانەتەوە بەو قوڕەدا بچیت و قەت نەیەیتەوە دەرێ. هەتیو بۆ پێت وایە تووشی منداڵ بووی؟ ئاخر کێ دەزانێ ئێرە چەندی مێش و مەگەز و زەرگەتە تێدایە؟"

"بەخودایەتیی خودا دەیزانن."

"ئەو تفەنگەم بدەوە و لەوە زیاتری لێ مەڵێ. وەك تۆ دەڵێی وا بوایە، هەتا ئێستا گرتبوویانین. وا نییە؟ هەتا ئەو تفەنگەم پێ بێ، هۆردووەك دەرەقەتمان نایە."

تفەنگەکەی لە دەستی وەلی کێشایە دەرێ و کەوتە پێشی.

"ئەگەر هەنگاومان خۆش نەکەین، پێویستیمان بەو تفەنگەی تۆ دەبێ. ئێستا ئەوانیش گەیشتوونەتە زۆنگاوەکە. لەو جێیەوە لێیانداوە کە ئێمە خۆمان پێدا کرد. دەی خێرابە."

لە چاوتروکانێکا وەپێشی کەوت.

وەلی سەد و پەنجا مەترێك لە پێشەوە و وسێنە ڕەشیش بە شوێنیدا، بەر لەوەی تاوەکە گەرمی بکا، قامیشەڵانەکەیان بڕی و گەیشتنە نێوەڕاستی زۆنگاوەکە. گەیشتنە شوێنێك کە مێشەڵانێکی چڕیان لە بەردەم بوو. بڕینی ئەو بێشەڵانە زەحمەت و ئەستەم بوو. خۆ ڕۆژێکیشی پێدەویست بتوانن بە دەوریدا بسووڕێنەوە. تاوێك دواتر سەیریان کرد گەیشتوونەتە شوێنێکی ئاوەڵا لە بێشەڵانەکەدا. زۆنگاوەکە لێرە، نەك هەر وشك ببۆوە، بەڵکو گژ و گیایەکەشی وشك ببوو.

لێرە تەپۆ و مێشوولە لە سەر و چاویان نیشتن. وەلی هەوڵی دەدا بە هەر دوو دەستە زلەکەی مێشەکان لە سەر و ملی خۆی دەربکا، بەڵام مێشە لاسارەکان هەر گوێشیان پێی نەدەبزووت.

ئەگەر یەکێك لە دوورەوە سەیری کردبایەن، پێی وابوو دوو کەسی ڕەشپێست دەبینێ. سەر تا پێیان بە مێشوولە داپۆشرابوو.

لەگەڵ گەرمبوونی هەواکە، مێشوولەش زیاتر دەبوون و هەواکەی خەست و کپ دەبوو و بۆنی تیژی زۆنگاوەکەش ئەوەندەی دیکە توندتر دەبوو. خۆرەکە لەو دیو هەوا خەستەکەوە دەتگوت گڕێکە و بە توێژکاڵە خۆڵەمێشێك داپۆشراوە.
کە وسێنە ڕەش ئاوڕی دایەوە، بە لای راستدا کۆمەڵێك مێشەنگوینی دی، کە لە بن قامیشەڵانێك پلوورەکەیان داپۆشیوە. بە هەزاران مێشەنگوین بە دەوری پلوورەکەیاندا دەسووڕانەوە.

هەنگەکان لەو هەوا کپ و خەستەدا تووڕە دەبن و هەر شتێك لێیان بچێتە پێشێ، پەلاماری دەدەن و چاوی دەردێنن.

"وەلی بێدەنگ بە و بڕوانە. تا وەخەبەر نەهاتوون، لێرە دەربچین باشە، دەنا حیسابمان ڕۆیوە..."

"ئەی هاوار بەماڵم. کەوتووینە داوی مەرگەوە. خۆ بمانبینن تێدادەچین. ئەی ماتڵی چیی وسێن؟ دەی بجووڵێ، خێرا بە دەی."

بە سپایی و بە سەری پەنجە لەوێ دوور کەوتنەوە.

مێشەکان لەو گەرما خەستەدا و لە بەربەڕۆچکەکە تێك چڕژابوون و هیچ نەدەفڕین. بەڵام بێت و دەنگێك یان جووڵەیەکی خەوەکەی لێ تێك دابایەن، هەموو وێکڕا تووڕە دەبوون و هەرچی لە پێشیان بوایە پەلاماریان دەدا.

ئێستاش باڵەلەرزە و وزەوزکەرەکانیان، بە هەزاران ڕەنگ دەبریسکانەوە. کە چاوی مێشەکان دوور کەوتنەوە، بە بێشەڵانەکەدا تێیان تەقاند و دوای ماوەیەك راوەستان و شان بە شانی یەکتری لێی درێژ بوون. هەر دووکیان هانکە هانکیان بوو و سینگیان وەك دەفە لێی دەدا.

"جا ئێستا بەرەو کام لا بڕۆین؟"

"بەرەو ڕۆژهەڵات. بە بێشەڵانەکەدا دەرناچین. هیچ چاری دیکەمان نییە، جگە لەوەی دەوری لێ بدەین. دەی خێرابە."

وەلی هەر لەیەکەم هەنگاوی دا ڕۆچوو. وسێن لە جێی خۆی وشك بوو. وەلی تاوێك دواتر هاتەوە سەر ئاوەکە و بە مەلەکردن خۆی گەیاندە کەناری بێشەلانەکە و هاتەوە دەرێ.

وسێن:"برالە، ببوورە نەمتوانی هیچت بۆ بکەم. ئیتر تین و توانام تێدا نەماوە. باش بوو ئەمن تێنەکەوتم، ئەگینا نەمدەتوانی بێمەوە دەرێ."

ئەو هەللا و زەنازەنایەی لە کەناری بێشەلانەکەوە دەهات، تەقەی تفەنگیشی هاتە سەر. تاو نا تاوێك چەند تفەنگ وێکڕا دەهاویژران و ئەوجار زەنازەنا و هەنگامەکە بەردەوام دەبووەوە.

ڕۆیشتن. وسێن قۆڵی وەلیی گرتبوو. ئیتر تین و هێزی ئەوەندەیان تێدا نەمابوو مێشوولەکان لە خۆیان دەربکەن. هەتاوەکەش جار بە جار بەتینتر دەبوو و هەواکەی خەستتر دەبووەوە. هەڵمشتنی ئەو هەوا خەستەش ئیتر دژوار دەبوو و جا چونکە کونە تفنکیان بەشی پشووکێشانی نەدەکردن، زاریان گەزێك داپچڕیبوو.

"خەریکە دەخنکێم وەلی. کوڕە سەیری ئەو هەوایە. هەر زۆر سەیرە."

"ئەمنیش، ئەمنیش... وا دەخنکێم. خەست...."

ئەو کیسەلانە نەبێ کە لە بن بنەتا قامیشەکانەوە، لەگڵ دیتنی ئەوان خۆیان دەخستەوە نێو ئاوەکە، هیچ بوونەوەرێکی دیکە لەو دەوروبەرانە نەدەبینرا. هەر وەها مێشەکانیش... بە هەزاران جۆر، ورد و درشت و هیی وابوو هێندەی زەردەواڵەیەك... دەنگدار و بێدەنگ....

جەگەن* و قامش و حەیزەران و کورتە دەرختی گەلا پان. گژ و گیاکانی نێو زۆنگاوەکە جۆرە تێراوبوونێکیان پێوە دیار بوو. دەتگوت هەر گەلایەك، لکێك، گوڵێك کە لێی بکەیتەوە، چەند ڕۆژێکیش دوای لێکردنەوەکەی هەر وا ئاوێکی مەیلەوکەسکیان لەجێی دەچۆڕێ.

خۆر گەییە چەقی ئاسمانێ. بەتینتر بوو و ئەوەندە بەتین بوو دەتگوت لەو سەرەوە ئاگر بە سەر شان و ملیاندا دەبارێنێ. هەر دووکیان شەلالی ئارەقە بوون. تین و هالاوی گەرماکە و شێ و هەڵمەکەی لە سەر زۆنگاوەکەوە هەڵدەستا و پشووی سوار دەکردن. مێشوولە و مێشی دیکەش لەگەڵ تینی ئەو گەرمایەدا تووڕەتر و لاسارتر ببوون.

"کوڕە کوشتیانین وەلی".

"بابیان گاین، وسێن."

---

* جەگەن و سێ سوو: جۆرە گیایەکی پانە لە قامیش دەچێ بەلام نەرمە و حەسیر و کلاویان لێ دەچنن...

هەر دووکیان دەستیان خەریکی مێش دەرکردن بوو، بەڵام چما مێشەکان دەست هەڵگر بوون؟ خۆ هەر دەستیان راگرتبایە، چاویان دەردێنان... مێشەکان نەیاندەهێشت پشوو بکێشن.

زۆنگاوەکە قوڵتە قوڵت کوڵی. دەنگی کوڵینەکە دەتگوت لە قووڵ قووڵاییەکەیەوە و لە دوورەوە و لە بن عەرزییەوە دەهات. زۆنگاوەکە دەینەڕاند.

هەر دووکیان پێڵاویان لەپێدا بوو. وەلی شەماڵ هەرکات ڕێی سەفەری دەگرتە بەر، پێڵاوی لەپێ دەکرد. خۆ ئەگەر لە پێیاندا نەبوایە، ئەستەم بوو بتوانن لەو زۆنگاوەدا پێ هەڵێننەوە. خۆ ئەگەر ناچاریش بوایەن دەلینگان هەڵکەن، لە بەر زەروو نەیاندەتوانی هەنگاو بنێن. خوێنیان دەمژین و لە ماوەی ڕۆژێکدا دەماری گیانیان هەڵدەچۆڕاندن.

گەرما بەتینەکەی نیوەڕۆ، زۆنگاوەکەی دەکوڵاند. ئارەقە لە هەموو گیانیان دەچۆڕایەوە. ئارەقەی تەوێڵیان چاوی دەبرژاندنەوە.

"چاوم ڕەشکەوپێشکە دەکا وەلی. خۆزگە سێبەرێکمان وەگیر کەوتبایە و پشوویەکمان هاتبایەتەوە بەر و پارووە نانێکمان خستبایەتە بەر دڵمان. ئەگەر گەیشتباینە درەختێك، لێی وەسەر دەکەوتین و تاوێك لە سەر لکەکانی رادەکشاین."

دارە بەرزەکانی لای باشووری قامیشەڵانەکە وەك کۆگایەکی ڕەش دەهاتنە بەر چاو. وسێنە ڕەش دارەکانی دیت و گوتی:

"ئەو دارستانە دەبینی وەلی؟"

"دیتوومە."

"دەڵێی چی بچینە ئەوێ؟"

"با بڕۆین، بڕۆین. بەڵام... بن ئەو دارانە کەرێزێکی لێیە ئاوەکەی ئەوەندە ساردە ددان دەتەزێنێ. بەڵام وسێن هیچ پێت وانەبێ ئەوێ شوێنێکی ئەمن و ئەمان و بێ مەترسییە، هەرچی رادەکا پەنادەباتە بەر ئەوێ. ئەوێ تەڵەی مەرگە بۆ هەموو راکردوویەك. ئەگەر لەوێ بەسەرماندا بێن، ئاخۆ ئەوەندەمان فیشەك پێیە تا ئێوارێ خۆمانی پێ ڕاگرین؟"

"پێمە، چما نابینی؟"

وەلی شەماڵ تاوێك خەیاڵ هەڵیگرت و ئەوجار وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێ، گوتی:"شەیتان بە نەحلەت، ئاوی سارد و فێنك زۆر خۆشە. نووچدان و سەرخەوێکی سەر لکی داریش هەر خۆشە، بەڵام..."

سەری هەڵێنا و چاوی لە چاوەکانی وسێن بڕی و بە لەبزێك کە پاڕانەوە تێیدا شەپۆلی دەدا لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:"بەڵام، لێگەڕێ و وازی لێ بێنە براله... پیاو نابێ بە دەستی خۆی، خۆی بە کوشت بدا. تۆزێکی دی خۆ ڕاگرە، سەبر و تاقەت تاڵە، بەڵام شیرینیی تێدایە."

"ئەمن چیدی تین و هێزی ڕێگەڕۆیشتنم نییە. سەیرێکی لێوم بکە. وشك و شەقار بوون. لە تینوان وەختە بخنکێم. ئەوە بۆ چۆڕە ئاوێك گیانم دەردەچێ."

نوشتایەوە و ئاوە قوڕاو و شیلەوگەرمەکەی زۆنگاوەکەی خواردەوە.

"تف، بۆگەنی لێ دێ. دڵم تێکەڵ هات، خەریکە دەڕشێمەوە. ریخۆڵەو هەناوم هاتە دەرێ. ئەوە ئاو نییە ژەهرە."

وەلیش گوتی:"ژەهری بێ خەوشە." دارە دوورەکان وردە وردە نوقمی نوور دەبوون و دەدرەوشانەوە و لە بەهەشت دەچوون. بەڵام ئەوان چەندی پتر دەچوونە پێشێ، جووڵەیان لێ دەبڕا و لە پێ دەکەوتن.

"ئەگەر بۆسەیان بۆ دانابێین ... ئەوێ خەتەرە. بنیادەم لە بری ئەوەی لەو زۆنگاوەدا گیانی دەربچێ، هەر وا باشترە لەوێ بۆسە بۆ دوژمنەکەی بنێتەوە."

"پێت چۆنە هەر لێرە لە بن ئەو پۆلە قامیش و جەگەنانە خۆمان بشارینەوە تا شەو دادێ؟"

بەرەو دەوەنەکان ڕۆیشتن. گژ و گیا و دەوەنە دڕکاوییەکانیان لە سەر عەرزەکە ڕاخست و لە سەری دانیشتن. لك و پۆ تەڕەکان لە پێشدا خستنییەوە بیر فێنکایی کوێستان، بەڵام وردە وردە پشووی لێ سوار کردن.

"خوا بکا لێرەم نەجات بێ، دەچمە لای مستەفا بەگ و پێی دەڵێم:"تکایە ئازادم بکە بەگ. هەتا ئێستا خزمەتم زۆر پێ کردووی. بە فەرمانی تۆ دەستم بە خوێنی زۆر کەس سوور بووە. هەمیشە گیان لەسەر دەست بووم بۆت... جا ئەویش دەبێ سەد و پەنجا دۆنم زەویم بداتێ. وا نییە وەلی شەماڵ؟ ئەمن ئەو زەوی و زارە دادەچێنم و دەیدروومەوە و هاوینانیش دەچمە کوێستانێ. دەمەوێ بە کەیفی دڵی خۆم بژیم. دەمەوێ تا دەمرم بە حەز و ئاواتی دڵی خۆم ڕابوێرم. منداڵ دەبێ دەرس بخوێنن و بۆ خۆیان ببنە پیاو. وەك کەری گاڕانێ نەبن. مەزراکە یەك و سی، یەك و چل بەرهەم دەدا و ئاوا بێ، دەوڵەمەند دەبم. دەبێ خانووەکیش ساز بکەم. وا نییە وەلی؟ بەڵام لە پێشدا دەبێ بەگم قایل بکەم... جا دوای ئەوە..."

"کە مووچەی خانەنشینیت بۆ ببڕێتەوە... وەك قایمەقامێك خانەنشین دەبی..."

"قەڵسەم لێ مەگێڕە* وەلی. دەرد و مەینەتی خۆم لێ زیادە... زۆرم برسییە. پێم وایە لەوێ شووتییمان دەست دەکەوێ."

"کوڕە دەڵێی تێك چووی وسێنە رەش. کێ دەچێ لە هۆوێ شوتی بچێنێ؟"

"بەشکم چاندبێتیان، لە دەم کانییەکە."

"بەڵێنت دەدەمێ جگە لە لێقەوماو و راکردووان زیندەوەر پێی نەچووەتە ئەوێ."

"بچینە ئەوێ؟ ئیتر پشووم لێ برا."

"ئەمنیش...."

هەوای خنکێنەر ... خەست خەست ... تەم و مژێکی خەستی وەك دووکەڵی پووشکە، لە سەر قامیشەڵانەکە نیشت.

"کەس شکی بۆ ئەوەی ناچێ ئێمە چووبێینە ئەوێ... لە دڵی خۆیاندا دەڵێن ئەوانە ناشارەزان و نازانن ئەو زۆنگاوە جێی ئاوای تێدایە."

"چووزانم وسێن."

وسێنە رەش وەك رێوییەکی قانگ درابێ و لە کونێ دەرپەڕیبێ، دەرپەڕی و دەرچوو. وەلیش بە شوێنیدا. تەنگی ئێوارە بوو کە گەیشتنە دارستانەکە. گەیشتنێ بەڵام خۆیان بە سەر پێیانەوە رانەدەگرت. لە بن دارەکان تەپۆڵکێکی بچووکی وشکی لێ بوو... بە تەپۆڵکەکەدا هەڵگەڕان و ماوەیەکیش بە سەر شیناوەرد و چیمەنە نەرم و کەسکەکەدا رۆیشتن. هەوا تۆزێك فێنك بووەوە. هێندەیان تینوو بوو، زمانیان بە مەڵاشوویانەوە نووسابوو.

"ئاوە فێنکەکە لە پێشمانەوەیە. لە بن هۆو دار بییە بەرزە."

وسێن هەموو تینی خۆی کۆ کردەوە و بەرەو دار بییەکە رای کرد. گەیشتێ و ساتێك راوەستا. کانییەکی روون وەك چاوی قرژاڵ لە بن دارەکە هەڵدەقوڵی. ئاوەکە دەبریسکایەوە و لە قەدی دارەکەدا شەپۆلی دەدا.

لەگەڵ نوشتانەوەی وسێن بەسەر ئاوەکەدا، دەنگی سامناکی دوو فیشەك کە وێکڕا تەقێنران، بێدەنگیی دارستانەکەی شکاند و بە شوێنیدا رەهێڵەی گوللە باری. وسێن رێك لە لێواری ئاوەکە و بستێك لەولاترییەوە کەوتە سەر چۆك و لە سەر زگ راکشا. لە پێشدا دەستی گەیشتە ئاوە سەهۆڵاوەکە و ئەوجار بینی پێوە نا. قوڵت قوڵت دەیخواردەوە. دەتگوت قڕی هاتووە. پاراو نەدەبوو. چیی پتر دەیخواردەوە، زیاتر تینووی دەبوو. لە کاتی خواردنەوەیدا دوو

*قەڵسەگێڕان: تووڕەکردن. ئەزیەتکردنی یەکێك. کەڵەگاییکردن لە یەکێك.

فیشەکی دیکەشی وێکەوت. خوێنەکەی لە ئاوی کانییەکەدا بڵاو بووەوە و تێکەڵاوی بوو و ئاوی سەرچاوەکەی سوور هەڵگێڕا. وسێنە ڕەش پەلەقاژەیەکی کرد و لەرزی و ئەوجار سەری کەوتە نێو گۆمیلکەی خوێنەکە و جووڵەی لێ بڕا.

وەلی شەماڵ لەگەڵ بیستنی دەنگی یەکەم فیشەك، خۆی خستبووە پشت قەدی دارێك و تۆقیو و بە راکردن خۆی بە زۆنگاوەکەدا کردەوە و وەك بای شەماڵ لەو تەڵەی مەرگە خۆی نەجات دا. وەك مار بەنێو بێشەڵان و قامیشەڵان و گژ و گیا و جەگەن و تووترك و لاولاوە کێوییەکاندا دەخوشی.

هیدایەت لەگەڵ یەکێك لە پیاوەکانی دەروێش بەگ، تەرمەکەی لە کانییەکە هێنایە دەرێ. سەری پەتێکی درێژیان لە نێوشانەکانی بەست و بە راکێش راکێش لە قامیشەڵانەکە بردیانە دەرەوە.

بەستێنی لێوارەکە زۆر لە دارە چڕەکان دوور نەبوو. ئەوجار تەرمەکەیان لە ئەسپێك بەست و بەرێی گوندەکەی ئاق یۆلوویان کردەوە.

بەرەبەری بەیانی گەیشتنە شیوەکەی بەرانبەر گوندەکە. لێواری شیوەکە دارچناری لێ چەقێنرابوو. چڕ چڕ. تەرمەکەی وسێنە ڕەشیان بە دارە هەرە بەرزەکەوە کرد. لێی سواری ئەسپەکانیان بوون و بە لینگدان بەرەو ئاواییەکەی ساری ئۆغڵی رۆیشتنەوە و تاوهەڵاتنێ گەیشتنەوە ئاوەدانی.

تەرمەکە بە لاقی زەرد هەڵگەڕاوەوە، لە بەر تیشکی تاوی تازە هەڵاتووی بەیانی و لە بەر شنەبای بەیانی، نەرم نەرم دەشەکایەوە.

# ١١

دەگێڕنەوە:

زۆر دوای نیشتەجێکردنی ڕەوەندەکان، بەگێکی هەوشاری هەبووە بە ناوی عەنبەر ئاغا. ئەو هەوشارییە، زستانان دەهاتە دەشتێ و خێوەتەکەی لە سەرووی ئەو وایوایلییەی ئێستا هەڵدەدا و هاوینانیش دەچووە چیاکانی بین بۆغا. عەنبەر کەس و کار و خزمەتکار و نۆکەرێکی وای نەبوو، بەڵام لەو دنیادیتە و ساردوگەرمی چێشتووانەی ڕۆژگار بوو، کە جنۆکەی ناڵ دەکرد و شتی سەیر و سەمەرەی بە مێشکیدا دەهات.

ڕۆژێکیان کە دیسان بیرێکی نوێی لە مێشکی گەڕابوو بەخۆی گوت:"ئەو دەشتە برینجی باشی لێ دەکەوێتەوە. ئەمن لە چوکووراوا برینج دەچێنم."

پیاوی ناردە حەڵەبێ و لەوێوە تۆوی برینج و شەتڵکاریان بۆ هێنا. کە شەتڵکارەکان چوکووراوایان دی، هەر سەریان سووڕ ما و حەپەسان. ئێرە برینجێکی لێ دەکەوتەوە کەس لە ژیانیدا نەیدیبێ... وایان دانا شەتڵکارەکانی حەڵەب لەبری کارەکەیان، بەشێك لە بەرهەمی برینجەکە بەرنەوە.

عەنبەر ئاغا دەستی کرد بە لێدانی جۆگەیەکی بە مەودای کیلۆمەترێك لای سۆلەمیش. ئەو جۆگەیە بە شان و پیلی پیاوەکانی عەنبەر ئاغا لێ دەدرا. جگە لە هەقی ڕۆژانەیان پارەی جگەرەشی بە پیاوەکانی دەدا و بەوجۆرە جۆگەکە لە خوارووی سۆلەمیشەوە هەتا سەرووی وایوایلی لێ درا و برینج چێنەکانی حەڵەب هەتا چاو هەتەری دەکرد برینجیان چاند. عەنبەر ئاغا پاییزەکەی ئەو ساڵە کە لە چیاکانی بین بۆغاوە گەڕایەوە بە سەر هەماری پڕ لە بەرهەمدا کەوت. برینجەکەیان بە وشتر ناردە حەڵەب و لەوێوە سندوق سندووق پارەیان بۆ نارد.

کەس نەیدەزانی عەنبەر ئاغا کەنگێ برینجی چاندووە، بەڵام هەمووان دەیانزانی عەنبەر ئاغا هەتا مرد دەستی لە برینج چاندنێ هەڵنەگرت.

چەند ساڵ دواتر کە عەنبەر ئاغا مرد، برینج داچاندنیش لە بیر چووەوە، بەڵام جۆگەکەی عەنبەر ئاغا هەر مایەوە. کەسیش بیری لەوە نەکردەوە کە ئەو بەنداوە بشکێنێ و تێکی بدات کە عەنبەر ئاغا لە پێش رووباری ساورۆنی هەڵبەستبوو. بەشێکی زۆری ئاوەکەی ساورۆن کە لە زستانێدا هەڵدەستا، بە جۆگەکەی عەنبەر ئاغادا بەرەو کێڵگەی برینجەکە دەڕۆیشت و وردە وردە بە دەشتەکەی ئاناوەرزادا بڵاو دەبووە. زستانەکەی ئەو ساڵەش ئاو ئەوەندە زۆر و زەوەند بوو، کە هاوینێش هەر وشکی نەکرد و هەڵنەچۆڕا. وشکیشی نەدەکرد، چونکە جۆگەکەی عەنبەر بەردەوام ئەو قۆرغە گەورەیەی پڕ دەکردەوە.

لە رووکارەکەی ئاناوەرزادا حەوت هەشت گوند هەبوون، کە هێندێکیان تەواو دامەزرابوون و هەندێکیشیان مابوویان تەواو تۆکمە بن. سێ گوند لەو دێیانە، زستانان وەبن ئاو دەکەوتن و دێهاتییەکان ناچار بوون ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت و روویان کردە شوێنی دیکە و بە جێی دیکە گیرسانەوە و گوندیان پێکەوە نا. ساڵی دواتریش گوندەکانی دیکە و ئەو ساڵەش هەر سەرانسەری ئاناوەرزا وەبن ئاوێ کەوت و دەشتەکە لە ماوەی چەند ساڵاندا بوو بە زۆنگاو و ناویان لێ نا زۆنگاوەکەی ئاقچاساز. ئاقچاساز بە تێپەڕینی ساڵ و مانگان پان و بەرینتر بۆوە و لە باکوورەوە گەیشتە ئەو شوێنەی وا ئەمڕۆ پێی دەگوترێ عەنبەرین ئارکی (جۆگەی عەنبەر) و لە باشووری رۆهەڵاتیشەوە گەیشتە بناری جیغ جیغ و باشووریشتەوە چۆوە سەر کسیك ئەللی و ئەندەل و رووبارەکەی جەیهان.

ئاقچاساز مێش و مەگەز و مەلاریای هێنا و وای لێ هات بنیادەم تێیدا نەدەژیا. نۆبەتێ خەڵکێکی زۆری کوشت و ئەوانەش کە خۆیان قوتار کردبوو، پەنایان بردە بەر چیاکان. هەواکەی چوکووراوا هەر خۆی قورس و خەست بوو، کە ئەو ئاقچاسازەشی لێ کەوتەوە، ئیتر بوو بە جەحەندەمێك بۆ ژیان.

هاوینان کەس نەیدەتوانی لە ئاقچاساز نزیك بێتەوە و تەنیا تورکمانەکان بۆ هاوینەهەوار و هۆبەکانیان، کە لە کوێستانەوە دادەگەڕان لێی دەچوونە پێشێ...

ماوەیەك دواتر دیسان ئاغاکانی قادری دەستیان کردەوە بە برینج چاندنەوە و لە رووبارەکەی ساورۆنەوە جۆگەیان کێشا و زۆنگاوی زۆر لە ئاقچاساز گەورەتریان لە دەوروپشتی دروست کردەوە. زۆنگاوی کێڵگە برینجەکان ... ئەوەندەیان برینج داچاند، کە ئیتر ئاوەکەی

ساورۆنیش بەشی نەکردن. شەڕی گەوەر گەورە لە سەر ئاو هەلاّییسان و کێڵگە گەنم خوێنی لە سەر رژا.

ساورۆنیش هەموو ساڵێ لە کۆتایی بەهارێوە هەتا سەرەتای پاییزێ وشکی دەکرد و بەوجۆرە ئاقچاساز ساڵێ پێنج مانگ لە سەرچاوەکەی خۆی واتە ساورۆن بێبەش دەبوو و ساڵ بە ساڵ پتر وشکی دەکرد و دادەکشا. وەرزێر و ئاغاکان بە ئاقچاسازی وشکەوە بوو، کە بەردەوام لە وشکبوونیشدا بوو، وەربوون و دەستیان بە سەر بست بە بستیدا گرت. چیها بەنداویان لێ دا و جۆگە و جۆباریان کێشا. دێهاتییەکان دەستیان بە سەر کێڵگەکانی ئاقچاسازدا گرت، بەلاّم بۆیان رەعەمەل نەهات و نەیانتوانی بیانپارێزن. ئاغا تازە پێگەیشتووەکان، برینجە گەیشتووەکەی کێڵگەکانیان لە چنگی دەرهێنان. ئاقچاساز کۆمەڵێك بنیادەمی کردە پیاو و دەوڵەمەندی کردن و کردنییە ملوێنێر، کە بستۆکە زەوییەکیان نەبوو. ئاغا تازە پێگەیشتووەکان، لە ئاقچاساز چوونە نێو مەیدانی سیاسەتیشەوە و تێکەلاّوی ئەو کەسانە بوون کە فەرمانیان بە سەر چارەنووسی ولاّتەکەیاندا لێ دەدا و کام دەور و رۆڵ خراپ و سامناك بوو، ئەوەیان گێڕا.

لەو بگرە و بەردەیەدا کە دەوڵەمەند و ئاغا و خاوەن زەوی زارە برینجەکان وەك کارگ لە زەوییەکەی ئاقچاسازەوە هەڵدەتۆقین، دەروێش بەگ و مستەفا ئاق یۆللی" گرفتاری ئەو بەلاّیە ببوون، گرفتاری یەکدی. بێ خەبەر لە دنیای دەوروبەریان و نوقمی دنیای خۆیان و دەستەیەخەی شەڕی مەرگ و ژیان، بوون و نەبوون، مان و نەمان. ئاقچاساز وەك شیر هەڵدەچوو و هەتا قوڕگیان هەڵدەستا، بەلاّم ئەوان نەیاندەدی و هەستیان نەدەکرد و تێنەدەگەیشتن. خۆ دیتباشیان و تێشگەیشتبایەن، جگە لە یەکتری، بیریان لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە.

# ١٢

هیدایەت گوتی:"کوڕە وا هەڵدەهات فیشەکی نەدەگەیشتیێ، بەگ. فیشەکم خستەوە بەری، بەڵام تا دەستم بە پەلەپیتکەدا هێنا، ون بوو. ئەمن لە ژیانمدا بنیادەمی وام نەدیوە. جمکی شەیتانە. زۆرم تاریفی وەلی شەماڵ بیستبوو، بەڵام قەت بڕوام نەدەکرد ئاوا بێ. لەگەڵ ئەوەشدا، خۆ ئاخری وەچنگم هەر دەکەوێ. دەیگرم و جەحەندەمی لێ پڕ دەکەم. تۆڵەی خوێنی مەحەڕەمی لێ دەکەمەوە."

گەرم بوو. کۆشکەکە یەکسەر، دارەکانی باغەکەی و گژ و گیا و چڵە لۆکەکان و خاکەکە هەر هەمووی ئارەقەیان لێ دەرژا. دەروێش بەگیش یەك پشوو ئارەقەی دەکرد، دەتگوت بە جلوبەرگەوە چووەتە نێو ئاو و هاتووەتە دەرێ.

لە نەکاو لە دوورەوە دەنگی تەقەی تفەنگ هات. فیشەکەکە هات و ڕێك وەبن پەنجەرەی ژوورەکەی دەروێش بەگ کەوت. چەند ڕۆژێك بوو ئەو کارە دووپاتە دەبووەوە. یەکەم فیشەك سەر لە ئەنگۆرەی داویژرا و دووەم فیشەك لە کاتی کەڵەباب خوێندنی نیوەشەوێدا و سێهەمیان لە بەرەبەیانیدا. هەر سێ فیشەکەکەش ڕێك وەبن پەنجەرەی ژوورەکەی دەروێش بەگ دەکەوتن.

دەروێش بەگ لە پێشدا زۆری پێ تێکە چوو و بێ ئۆقرە بوو و ویستی هەرچۆنێکی بووە بچێتە بنج و بناوانی و بزانێ ئەوە کێیە تەقە دەکا. بەڵام نەیدەوێرا لەو قەفەزە بچێتە دەرێ کە خۆی سازی کردبوو و هەر وا لە نێو چواردیوارییەکەی ژوورە گەرم و خەفەکەیدا مایەوە و زەمانی دەرکێشا. نە هیدایەت و نە هیچ کام لە پیاوەکانی دیکەشی نەیاندەتوانی بزانن ئەو فیشەکانە لە کوێوە دێن و لەو کەسە بچنە پێشێ کە تەقەی دەکرد. باشە ئەی نەیاندەتوانی بۆسەی بۆ دابنێنەوە و بیگرن؟ بەڵام چما دەیاندی تا بۆسەی بۆ دانێنەوە؟ ئاوایان بە دەروێش بەگ دەگوت و دەروێش بەگیش بڕوای پێ نەدەکردن. ڕۆژێکیان ترسی وەلاوە ناو کونێکی لە

توورەکە لمەکان کرد کە دەستێکی تێوەدەچوو. لەوکونەوە سەیری دەرەوەی کرد. تەنگی نوێژی شێوان، سوارێك بە لینگدان لە لای ئاقچاسازەوە هات و لەو بەری ئاوەکەوە، لە تەنیشت دار بووزەکە جڵەوی ئەسپەکەی کێشا و دەسبەجێ دابەزی و دوای ئەوەی فیشەکەکەی هاویشت، لێی سواری ئەسپەکەی بۆوە و بە لینگدان لەوێ دوور کەوتەوە. باشە سوارەکە بۆچی لە ئەسپەکەی دادەبەزی؟ چما نەیدەتوانی هەر چۆن لە سەر ئەسپەکەی دانیشتبوو، ئاوا تەقەکەی بکا؟ لەوانەش بوو دانەبەزێ و هەر لە دوورەوە ئەم پێی وابێ دابەزیوە. چونکە لەوێوە بە روونی دیار نەبوو و لەوانەشە هەر جوان نەشیدیتبێ و تەنیا پێی وابووبێ دەیبینێ.

سوارەکە بەرەبەری کەڵەباب خوێندنی نیوەشەوێش دیسان هاتەوە. بەرەبەری بەیانیش وەك تاپۆیەك و وەك سێبەرێکی ون... دەروێش بەگ هەموو ئەوانەی ئاوا دی، بەڵام لەو بارەوە هیچ شتێکی بە پیاوەکانی خۆی نەگوت. پێی نەگوتن کە ئێوە درۆم لەگەڵ دەکەن.

ئیتر هەموو رۆژێ بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی سوارە ئەنگێوەکە دەبوو. کە تۆزێك درەنگتر دەهات، دەتگوت شتێکی لێ بزر بووە و بەشوێنیدا دەگەڕا. نیوە شەوێ رێك لەو کاتەدا کەڵەشێرەکان دەیانخوێند، تەنانەت لە شیرین خەوێشدا بوایە، هەڵدەستا و خۆی دەگەیاندە پشت کونەکە و بە دەم ترپەی خێرا خێرای دڵییەوە، سەیری هاتنی و تەقەکردن و رۆیشتنی سوارەکەی دەکرد. بەر لە تاوهەڵاتنیێش هەڵدەستا و لە پشت کونەکەوە چاوەڕێی سوارەکە دەبوو.

سوارەکان لە نەکاو بوون بە سێ کەس. ئەوجار بوونە چوار و دواتر پێنج نەفەر. هەموو رۆژێ تاریکان چەند سوارێك بە لینگدان دەهاتن و لە بن دارە بووزەکەوە، تاوێك لەنگەریان دەگرت و ئەوجار تفەنگیان بە کۆشکەکەوە دەنا و وەك باش شەماڵ دەردەچوون. رۆژ لەگەڵ رۆژ سوارەکان پتر دەبوون. لە خەوێشدا زرمەی سمی ئەسپەکان لە گوێیدا دەزرنگایەوە. لە دوورەوە، لە لای ئاناوەرزاشەوە دەنگی سمی ئەسپی دەبیست. لێگەڕێ با مانگەشەو بێ. مانگی چاردە، بەشکم ئەو کات بکرێ بیانناسم.

دیسان لە هیدایەتی پرسی:"گوێت لێیە لە دەنگی گوللە؟"

"گوێم لێیە بەگم."

"سوارەکان دەبینی؟"

"دەیانبینم بەگ."

"پێت وایە کێن ئەوانە؟"

"نازانم بەگ."

"دەكرێ بۆسەیان بۆ دابنێیەوە؟"

"هەر شەوەی لە رێیەكەوە دێن بەگ."

"لە بن دار بووزەكە...."

"وا وێدەچێ بەگ. بەڵام هەر شەوەی لە شوێنێك رادەوەستن. لەوانەشە بیانەوێ بۆسەیان بۆ دابنێین.. دەیانەوێ لە بۆسەدا بمانكوژن..."

"مستەفا دەیەوێ سەرم لێ بشێوێنێ و تووڕەم بكا و لێرە بمكێشێتە دەرێ... دەیەوێ بمكێشێتە دەرێ... بەڵام ئەوە من نیم وەدەر كەوم... ئەگەر پیاوە با بێتە ئێرە. ئەمن خۆم ناچمە دەرێ. جا كە ناچمە دەرێ و هەموو ریسەكانی لێ دەكەمەوە خوری، ئیتر لە دین دەهری دەبێ و ئیمانی پێ نامێنێ. هەر پیاوێكم لێ بكوژێ، دوو پیاوی لێ دەكوژمەوە. خۆ ئەگەر وەلی شەماڵیشت بكوشتایە، ئەوە شاكار دەبوو."

"كوڕە تا سێرەم لێ گرت، غەیب بوو. نازانم ئەو بنیادەمە جنۆكەیە یان شەیتانە؟"

مانگ هەڵات. سێبەری دارەكان، رەوەزەكانی ئاناوەرزا و كاولاشەكانی بەرەو رۆژئاوا كشان. مانگەشەوێك بوو وەك رۆژی رووناك. چاو دوور دووری دەدی.

سەر و سەكتی دەستەیەك سوار لە دوورەوە پەیدا بوون. سوارەكان هەتا بن دیواری كۆشكەكە هاتن. دابەزین و تەقەیان لە كۆشكەكە كرد و لێی سوار بوونەوە و بە خێرایی بەرەو تۆرووس تێیان تەقاند. لەگەڵ ئەوەدا زۆر نزیكتر ببوونەوە، دیسان نەیتوانی روخساری هیچ كام لە سوارەكان ببینێ. هەموو سوارەكان سمێڵ بابڕ دیار بوون و ئەسپەكانیشیان ئەسپی رەسەن..

سوارەكان وردە وردە زیاتر بوون. پێنج، دە، بیست، سی... زایەڵە و زرمەی سم وناڵیان تا بەیانی لە گوێیەكاندا دەزرینگایەوە.

لە دوورەوە، سەگەل دەوەڕین.

دەنگێكی دیكەش تێكەڵی دەنگی رزم و خرتی ناڵ و سمی ئەسپەكان و حەپەی سەگەلەكە دەبوو، ئەویش قیڕەی بۆقەكانی ئاقچاساز بوو... قیڕە قیڕی بۆقەكان تێكەڵاو دەبوو و وەك هەڵڵایەكی سەیر و سەمەرەی لێ دەهات. دەتگوت، دەشت و دەر و شیو و دۆڵەكە هەمووی بۆتە بۆق.

رۆژێكیان زۆر چاوەڕوان بوو، بەڵام سوارەكان نەهاتن، سەگەلیش نەدەوەڕین و بۆقەكانیش نەیاندەقیڕاند. خەم و پەژارەیەكی نەرمونیان ناخی دەرویش بەگی تەنییەوە. پەژارەیەكی ناسك،

ترسێکی قووڵ، دەتگوت ئەگەر سوارەکان نەیەن، هەر ئێستا نەگەنێ، نەگبەتی و نەهاتییەکی گەورە داوێنی دەگرێ. وای لە دڵی گەڕابوو. چاوەڕێی نازڵبوونی بەڵا بوو.

چاوەڕێ بوو، کە بڵێسەیەك لە خوارووی ئاناوەرزاوە بەرەو ئاسمان هەڵکشا. بایەك کە لە باشوورەوە هەڵیکردبوو، سات بە سات توندتر ببوو و کردبوویە تۆفانێکی دڕ و خۆی بە دار و بەردی دەکێشا. ئاگرەکە پەرەی سەند و لێرە و لەوێ گەشایەوە و زیادی کرد و بڵێسەی دا. خەرمانەکان دەسووتان.

هیدایەت بە کڕووزانەوە ناڵاندی:"هەموو خەرمانەکانیان سووتاند بەگ، هەموو لە برسان دەمرین. بچین بیانکوژێنینەوە؟ ئەو بایەی هەڵیکردووە..."

"یانی کاری ئاوا خوێڕییانەشت دەکرد مچە؟ یانی ئەوەندە خوێڕی و هیچ بووی ئاگر لە رزق و رۆزیی خەڵك و ماڵ و منداڵی هەژاران بەردەدەی؟ ئەمن وەك مرۆڤ سەیری تۆ دەکەم و پێم وایە پیاوی بۆیە دوژمنایەتیت دەکەم مچە. هاوارە لە من."

هیچ شتێك هێندەی ئەو خوێڕییایەتی و سووکبوونەی دوژمنەکەی، دەروێش بەگی ئازار نەدەدا. نوقم و شەڵاڵی ئارەقە بە ژوورەکەیدا، دەهات و دەچوو و خەریك بوو پشووی راوەستێ:"شتی وا نەکراوە و نابێ. ئەو پیاو ماقووڵەی چەند ساڵان دوژمنم بووە، کاری ئاوا بکا. دوژمنی من ئەستەمە ئەوەندە دابەزێ و خۆی سووك بکا. نا. ن ا ا، مەحاڵە."

بە هیچ کلۆجێ، بەهیچ کلۆجێ بڕوای نەدەکرد.

"ئەوەی تۆ کردووتە مستەفا، بڕوا پێکردنەکەی ئەستەمە. ئەو پیاوەی دوژمنی منە، کاری وا قۆڕی لێ ناوەشێتەوە و نابێ شتی وا بکا. ئەتۆ تاوانت کردووە مستەفا، ئەمنیش ئیتر لەو چلەخانەیە دێمە دەرێ و خۆم دەخەمە بەر دەستت. وەرە و چیت پێ خۆشە بیکە... ئەگەر دەتەوێ تیربارانم بکە، بەڵێن بێ چاو ناترووکێنم. هەر بتبینم، چیی چەکی پێمە بۆتی فڕێ دەدەم و دەڵێم ها بۆتۆ هەی هیچ و پووچ. ئیتر دوای ئەوە، دوای ئەوەی خۆتت ئاوا سووك کرد، ئەمن ئەتۆ بە دوژمن نازانم، بەڵکو بە جەللادێکی سووك و چرووکت دەزانم. جەللادێکی دۆم و هیچی دی. جا ئێستا کە ئاوایە، چیت دەوێ لەگەڵ من بیکە... چیت پێ خۆشە بیکە... ئیتر لەوە ناترسم بە دەستی تۆ بکوژرێم مستەفا. وەك پیاوکوژێکی چەپەڵ جووڵایەوە مچە، هەموو شتێکت تێك دا، دوای ئەوە ئیتر چ بایەخێکی هەیە تۆ بژیی و منیش بژییم مچە. کەسێکی دوژمنێکی ئەوەندە خوێڕیی هەبێ، ناتوانێ بەخۆی بنازێ مچە. تەسلیم، مچە، تەسلیم. دوای ئەوە چیت پێ خۆشە لەگەڵ من بیکە مچە، گەردنت ئازا بێ و خوێنمت حەڵاڵ بێ."

هەر دەهات و ئاگری تووڕەییەکەی پتر بڵێسەی دەستاند و شێتانە ئەوسەر و ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد و مستی لە دیوارەکان دەکوتا و دەیگوت:"مچە، ئەتۆ سووکایەتیت کرد بە خوێنەکەیان، بە خوێنەکەیان، بە خوێنی باوباپیرەکانمان کە رژاوە، بە ئینسانییەت، بە پیاوەتی و جوامێری و بە دۆستایەتی و شانازییەکان، پاش ئەوە ئیتر ئەمن دوژمنێکی وەك تۆم نییە. پیاوکوژێکی ئاسایی، ئاسایی ئاسایی، هەیە و دەیەوێ بمکوژێ. فەرموو مچە خوێنمت حەڵاڵ بێ."

رەعیەت و نۆکەر لە حەوشەی کۆشکەکەی کۆ ببوونەوە. بێدەنگ و کپ بوون و هیچیان نەدەگوت و وەك پەیکەرێکی لە بەرد سازکرابێن، لە بەر تریفەی مانگەشەوەکەدا راوەستابوون.

دەروێش بەگ هاتە هەیوانی کۆشکەکە و دوای ئەوەی ساتێك چاوی بە سەر حەشامەتەکەیدا گێڕا وەقسە هات:"وەچەی مرۆڤ، هەمیشە ئاوا سووك و چرووك نابێ و داناکشێ. ئەو بەڵایەی بە سەرتان هات، لە ئەستۆی منە و خەتای منە. چ بکەین، بوونەوەرێکی چەپەڵ، چەپەڵییەکیە خۆی نواندووە. ئەنگۆ نابێ برسی بن. هەر کەس زیانێکی وێکەوتووە، خەسارەکەی بۆ دەبژێردرێ و قەرەبوو دەکرێتەوە. ئەوەی ئاگر لە جەرگ و هەناوم بەردەدا، خەسار و زیانەکە نییە، بەڵکو دوژمنەکەم هێندەی خۆ سووك کردووە و داکشاوە و کەوتووەتە نێو گۆلاوی خوێڕییایەتییەوە. نەوەی ئاق یۆللی" هەتا ئێستا کاری وا سووك و چرووکانەیان نەکردبوو، کە ئەو شێتە کردی. ئێمە شانازیمان بە خۆمانەوە دەکرد کە دوژمنی وەك "ئاق یۆللی"یەکانمان هەیە. خەمی بەروبوو و بەرهەمەکانتان نەبێ."

هێشتا قسەکانی خۆی تەواو نەکردبوو کە دەنگی تەقینەوەیەکی سامناك کۆشکەکەی لەرزاندەوە و بڵێسەیەك لە پشت کۆشکەکەوە بەرەو ئاسمانێ کۆڵەکەی کرد. دەروێش بەگ هەر جووڵەشی نەکرد. وەرزێرەکان پەلاماری ئەو شوێنەیان دا کە ئاگرەکە لەوێوە هەڵدەستا و دەستیان کرد بە کوژاندنەوەی. ژنەکەی دەروێش بەگ هات و قۆڵی گرت و بە دەنگێکی لەرزۆك و ترساوەوە هەرای کرد:"وەرە خوارێ بەگ. بۆ لێرە راوەستاوی؟ وەرە با نەتئەنگێون. ئەوان، هەموو ئەوانەیان بۆ تۆیە. راوی رێوی بۆ کەوڵەکەیەتی. وەرە بچینە خوارێ بەگ. بچینە نهۆمی خوارەوە."

دەروێش بەگ وەك مێشێکی خۆی رادەپسکێنێ، ئاوا قۆڵی راوەشاند و گوتی:"ئیتر بۆم گرنگ نییە هاتوون. مەرگ و ژیان بەلامەوە گرنگ نین... دوای ئەوەی دوژمنەکەم ئەوەندە خوێڕی و سووك دەرچوو، دوای ئەو سووکبوونە ... بمرم باشترە. زۆر زۆر زویر بووم خاتوون.

ئیتر دڵم شکاوە خاتوون. ئیتر هیچ سوودێکی نییە. وەها چاوەڕوانییەکم لە مستەفا نەبوو. دوای ئەوە چۆن بتوانم وەك دوژمنی خۆم سەیری بکەم؟"

لەوە پتر قسەی نەکرد. لە جێیەکەشی نەبزووت. دەستی بە پەرژینە باریك و درێژەکەی هەیوانەکەوە گرتبوو و بە پەنجە بەهێزەکانی توند دەیگوشی و وای دەگوشی چیی نەمابوو خوێن لە بن نینۆکەکانییەوە دەرپەڕێ. بڵێسەکان هورووژمیان بۆی هێنا. کۆشکە گەورەکە قرچە قرچ دەسووتا. پیاوەکانی بەگ فیدکارانە و بە هەرچی بەردەستیان کەوتبایە وەك ئاو و خۆڵ و خاك و جلوبەرگ و بەڕەی تەڕ، هەوڵیان دەدا ئاگرەکە بکوژێننەوە.

"کوڕە ئاگر دەگری، دەسووتێی بەگ، با لێرە بڕۆین."

ژنەکە لە بن گوێی دەیقیژاند و رایدەوەشاند و ئەو مێشێکیشی لێ میوان نەبوو. هەر دەتگوت هۆشی بەسەر خۆیەوە نییە. نە دەیبیست و نە دەیدیت و نە ئاگای لێ بوو.

# ١٣

له قامیشه‌لانه‌که‌ی ئاق یاردا دانیشتبوون و چاوه‌ڕوان بوون. سریوه‌ی هیچ گیانله‌به‌رێك نه‌ده‌هات. سروه و شنه‌یه‌كیش چییه قامیشه‌لانه‌که‌ی نه‌ده‌بزاوت. هه‌ر قامیشه‌ی گوڵێکی جوان و گه‌وره‌ی ده‌رکردبوو. گه‌رماکه قورس شانی لێ داخستبوو، گه‌رمایه‌کی هه‌ڵماوی و خه‌ست و خنکێنه‌ر. مسته‌فا به‌گ هه‌ستا. ره‌نگی زه‌رد زه‌رد هه‌ڵگه‌ڕابوو. به‌ره‌و ئه‌و ئاوه رۆیشت که توێژکاڵێکی ته‌پوتۆز و کای له سه‌ر نیشتبوو. توێژکاڵه کایه‌که‌ی له‌سه‌ری لادا. به ئاوه شیله‌وگه‌رمه‌که ده‌موچاو و لاملی خۆی شوشت و گه‌ڕایه‌وه و پشتی به پۆله قامیشێکه‌وه دا و تفه‌نگه‌که‌ی له باوه‌شی گرت و دانیشت. مام حه‌سه‌ن خه‌نووچکه ده‌یبرده‌وه و وه‌نه‌وزی ده‌دا. کونی لووته قه‌پۆزبه‌رانییه‌که‌ی نه‌رم نه‌رم هه‌ڵده‌ستا و ده‌نیشته‌وه. روخساره ئه‌سمه‌ر و تێکسمڕاوه ره‌قه‌ڵه‌که‌ی که ئێسکه‌که‌ی ده‌رپه‌ڕیبوو، بلێی و نه‌لێی زه‌رد هه‌ڵگه‌ڕابوو. کا و کۆتی سه‌ر ئاوه‌که له بن بلێسه‌ی خۆره‌که‌دا، ئاگریان لێ ده‌بووه‌وه. قامیشه‌کان پۆل پۆل سه‌ر ئاوه‌که‌یان داپۆشیبوو.

هه‌ڵۆیه‌کی گه‌وره باڵه‌کانی لێك کردبوونه‌وه و به‌سه‌ر قامیشه‌لانه‌که‌دا ده‌فڕی. هه‌ڵفڕینی چی، هه‌ر ده‌تگوت به سینگی ئاسمانیانه‌وه دووریوه. تاوێك دواتر یه‌کی دیکه هات و له ته‌نیشتییه‌وه چه‌قی. قرچه‌ی گه‌رماکه له‌نگه‌ری خستبووه سه‌ریان و عه‌رزه وشك شه‌قار شه‌قار و وشك هه‌ڵاتووه‌که و دار و ده‌وه‌نه هه‌ڵپرووزاوه‌کان قرچه قرچیان ده‌هات. که‌س به رێگا پڕ له خۆڵ و خاکه‌که‌ی به‌ر ده‌میاندا که جێی تایه‌ی سه‌یاره‌ی به‌سه‌ره‌وه مابووه‌وه، تێنه‌ده‌په‌ڕی.

تاوێك دواتر، فۆرده‌که‌ی خاڵه هه‌مزه نوقمی تۆز و خۆڵ ده‌رکه‌وت و هه‌ر وا که خۆڵ و خاکه‌که‌ی وه‌ك ئاو به‌ملا و لایدا ده‌پڕیشکاند، به به‌رده‌میاندا تێپه‌ڕی. خاڵه هه‌مزه نه‌بێ، که‌س له سه‌یاره‌که‌دا نه‌بوو.

مستەفا بەگ لە مام حەسەنی پرسی:"چ بوو؟ ترۆمبێلەکە بەتاڵ بوو."

"وەڵڵا چیت عەرز بکەم بەگ، خوا دەزانێ قەول وابوو دەروێش بچێتە شارۆچکەی. یانی ناچاریش بوو بچێ. بۆ ئەوەی پارە لە بانك وەربگرێ... زۆر زۆر حەوجێی بەو پارەیەیە... دەیەوێ مەزراکەی "قورت قولاغی"یش بفرۆشێ. ئەویش بە عادی ئاغای چەرکەزان. لە شارۆچکە چاوەڕێی ئەون. با چاوەڕێ بین بزانین چیی لێ دێتەوە. لەوانەشە نەیویستبێ بە ترۆمبێل بچێ."

"باشە، چاوەڕی دەبین با بزانین چیی لێ دێتەوە."

هەورێکی سپی وەك هوڕەی لۆکە، گەواڵ گەواڵ و روون بە سەر دۆملۆ قەڵادا کشا و بەرەو ژوور سەری ئەوان کەتە رێ. هەورەکە لە سەر دۆملۆ قەڵا هەڵکەنرا و بە تەنێ لە ئاسمانە سامال و ساوە بێ پەڵەکەدا وەك مەلێکی گەورە، بە لەز بەرەو پێشەوە دەخزی و دەهات و هاوکات بەرزیش دەبووەوە و ژووتر هەڵدەکشا.

بە دوای هەورەکەدا، بایەك هەڵیکرد و تۆز و خۆڵی رێگەکانی هەستاند و تێکییەوە پێچا و بۆ تاوێك چوکووراوای لە تەمی تەپوتۆزەکەدا ون کرد. بایەکە هەر دەهات و توندتر دەبوو و تەپوتۆز و خۆڵ و خاکی رێیەکانی هەڵدەستاند.

بایەکەی خست و تۆز و خۆڵەکە وردە وردە نیشتەوە. بارانێك دایکرد. بارانێکی تۆزاوی و چەور... بارانێکی زەرد و قوڕاو وەك ئاوێکی لە قوڕ بچۆڕێتەوە و وەك هەڵم. ئاوێکی لە هەوراز و نشێواندا. بارانێکی وەك ئەو هەڵمەی لە مەنجەڵێکەوە هەڵدەستێ، گەرم و قورس و پشووبڕ. تاوەکەش لەولاوە، لەو لاترەوە وەك کۆگایەکی ئاگری نێو خەرمانەیەکی خەیاڵ بزوێن. بارانەکە وەك لوولەی مەسینە بە قامیشەکاندا هاتە خوارێ. مستەفا بەگ و مام حەسەن خووسان و جلوبەرگەکانیان بە گیانیانەوە نووسا.

"لە رێیەکی دیکەوە یان بە سواری شتێکی دیکە نەڕۆیبێ؟ با ترۆمبێلێکی دی؟"

"جا لە کام رێکەوە؟"

"کام رێگە؟"

"وایە، رێگەیەکی دیکە نییە..."

"دەبێ بیگرم، دەبێ بە زیندوویی بیگرم، نامەوێ بیکوژم... باشە مام حەسەن دەروێشت وەچنگ بکەوتایە دەتکوشت؟":

مام حەسەن راچڵەکی. وەخۆی هاتەوەو لە خۆوە لە زمانی دەرپەڕی:"نەمدەکوشت. نەمدەکوشت، وام لێدەکرت لەبەرم بپاڕێتەوە و خۆی بە سەر پێڵاوم بکێشێ..."

"دەروێش پیاوێك نییە لە پێناوی گیانێکدا لەبەر تۆ بپاڕێتەوە..."

"بۆ خۆم دەزانم چۆنی وەپاڕانەوە دەخەم، ئاخ ئەگەر وە چنگم دەکەوت...."

"پێم گوتی ئەو ناپاڕێتەوە..."

"ئەگەر وەچنگم دەکەوت، دەمبردە سەر رەوەزەکانی ئاناوەرزا... دەمبرد لەوێ رووت و قووتم دەکردەوە. جا لە نێو شانییەوە تا سەر دۆڵی قوونیم بە چەقۆ هەڵدەدڕی و برینەکەیم پڕ دەکرد لە خوێ. ئەوجار لە دارێکم دەبەستەوە کە نەتوانێ بجووڵێ. جا شیلەی قەنداوم لە برینەکەی هەڵدەسوی. مێش و مەگەزی ئاناوەرزا، زل زل و ئێسکدار... زەردەواڵە... مێش و مەگەز لە برینەکەی دەنیشتن و وردە و وردە دەیانجوی. ئاواش نەدەکەوتە کڕووزانەوەو پاڕانەوە؟"

"دەروێش لەوانە نییە بپاڕێتەوە."

"دوای ئەوە قامیشە نووك تیژەکانم لە بنی پەنجەی ڕۆ دەکرد. دەڵێی نەدەپاڕایەوە؟"

"ناپاڕێتەوە."

"ئەوجار لە دارەکەم دەکردەوە... لە دۆڵی قوونییەوە هەڵمدەدڕی و هۆرەیەکی نووك تیژم بۆ دەچەقاند و لە سەری دامدەنیشاند و لەبەر تاوەکە... جا هەرکات ئاوی ویستبایە، تۆزێ خوێاوکم دەدایە. هەرکات نانی ویستبایە، بابۆڵە خوێم دەدایە. یەك دوو ڕۆژانیش لە پێش چاوی ئەو ئاوی روونم دەخواردەوە. دەزانی بەگ، گابەردەکانی ئاناوەرزا لە بەر تاوی نیوەڕۆی هاوینان وەك ئاسنی سوورەوەبووی لێ دێ. یانی بۆ چۆڕە ئاوێکیش ناپاڕێتەوە؟ دەپاڕێتەوە بەگ. بنیادەم خۆ لەبەر هەر شتێکیش رابگرێ، لەبەر تینوێتی خۆی راناگرێ، ئەویش دوای خواردنی خوێ."

"دەروێش بۆ هیچ شتێك لە بەر هیچ کەسێك ناپاڕێتەوە. سەیر کە حەسەن، ئێستا ئەگەر بێت و پەیامێك بنێرێ کە ئەوە خۆم لە ماڵەکەت هاویشت، ژن و مندالم هەیە. هەر ئەوەندە. ئیتر نە بپاڕێتەوە و نە بکڕووزێتەوە، هەر ئەوەندە بڵێ و تەواو. ئەمن لێی خۆش دەبم. گەردنی ئازا دەکەم لە خوێن باب و باپیرە و براکەشم. تەنانەت کوڕیشی کوشتبێتم، دیشانیش لێی خۆش دەبم و گەردنی ئازا دەکەم. ئاخ ئەگەر وەچنگم دەکەوێ و هەر ئەوەندەی لە زمانی دەربکێشم بڵێ، مستەفا مەمکوژە، هەر ئەوەندە و هیچ."

"ئەمن ناچاری دەکەم وا بڵێ...."

" لێی مەڵێ و بیبڕەوە تۆش حەسەن. ئەتۆ ناتوانی و قسەی قۆڕیش مەکە. ئەگەر من بیگرم لە پێشدا هیچی لێ ناکەم. دەستی دەگرم و لە لای سەرووی دادەنێم. چیی ڕێز و حورمەتە بۆ دادەنێم و لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێم. لە نیوەی شەوێدا دەچمە لا و پێی دەڵێم:"دەروێش، لە نێو مەرگەکاندا یەکێکیان هەڵبژێرە. ئەویش دەڵێ، بمکە بە قوربانی فیشەکێك... دەڵێم کوڕە بەسەر چاوان. حەزرەتی دەروێش بەگ. گوللەبارانت دەکەم. دەتدەمە بەر گوللەی گەرم. ئەویش بڕوا دەکات و پێی وا دەبێ بە فیشەك دەیکوژم. جا ئەو کات... چاوەکانی دەبەستم و دەیبەمە تۆرووس، لە سەر دوندی تەکەداغی و لە دارێکی دەبەستمەمەوە. ڕۆژێك لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ هەر فیشەکی پێوە دەنێم و لێشی نادەم. بە هیچ جۆرێ لێی نادەم. لەوانەشە فیشەکێك سەرشانی یان نەرمەی گوێی یان کاکۆڵی داماڵێ. ئەگەر ئاوی ویست و ئەگەر داوای نانیشی کرد دەیدەمێ. هەر ئەوەندەم دەوێ گرێی زمانی بکاتەوە و بڵێ لێم خۆش بە برالە مستەفا و ئەمنیش دەیکەمەوە و بەرەڵڵای دەکەم. بەڵام نایڵێ. ڕۆژی دووهەمیش هەر وای لێ دەکەمەوە. لە سەر یەك تەقەی لێ دەکەم. ڕۆژێك تا ئێوارێ بە پێنج دەمانچە سەدان فیشەکی پێوە دەنێم. لە نێو لاقەکانی دەکەم، بە سەر شانیدا، بە بن شەویلکەیدا و بە پەنا چاوەکانیدا... و جا پێی دەڵێم، هەر کات وتت دەست ڕاگرە، دەست ڕادەگرم. هەر ئەوەندە بڵێی لێم خۆش بە، خۆش دەبم. سێهەم ڕۆژ، چوارەمیش ڕۆژ، پێنجەمیش ڕۆژ و دەیەمیش ڕۆژ و سەدومین ڕۆژیش... هەتا ئەو دەمەی ئەو بڵێ دەست ڕاگرە. نابێ بزانێ دەمەوێ کەی بیکوژم."

مام حەسەن:"خۆ ڕاناگرێ، خۆی پێناگیرێ... دەڵێ دەست ڕاگرە، لێی خۆش بە... ناتوانێ، دەی بنیادەمە ئیتر..."

"دەتوانێ. تاقەت دێنێ. ئەو بنیادەم نییە، ئەو، دەروێش... ئەوەندەش بەسە بپاڕێتەوە و بڵێ مستەفا تکایە بمکوژە و نەجاتم بدە... ئەوەش دەڵێم، هەر بڵێ مستەفا بمکوژە، دیسانیش لێی خۆش دەبم. هەر ئەو قسەیەی لە زاری بێتە دەرێ، لێی خۆش دەبم. هەر ئەوەندە بڵێ، گەردنی ئازا بێ لە هەموو خوێنی ئاق یۆللی". تەنانەت ئەگەر خۆشم بکوژێ."

مام حەسەن ڕیاییکەرانە و بە زمانێکی لووس گوتی:"هەر ئەو کاتەی دەڵێ بمکوژە، دەیکوژم و هەر ئەو دەمەش کە دەڵێ لێم خۆش بە، دیسان هەر دەیکوژم. ئەو دەبێ بکوژرێ...."

بارانە زەردەکە خۆشی نەدەکردەوە و دەنکە وردەکانی هەر دەکەوتنە سەر عەرزی، وەك کەوتبێنە سەر ئاسنێکی سوورەوەبوو، دەبوونە هەڵم. گڵەکە بوو بە قوڕەچەقەیەکی زەرد. هەورەکانیش وەك قوڕ و لیتەکە زەرد داگەڕان.

لە نەکاو هەورێکی رەش هات و هەواکەی وا تاریك داهێنا، چاو چاوی نەدەدی. بەڵام ئەوە زۆری نەبرد و دیسان روونی کردەوە.

تەنگی نوێژی شێوان بوو کە لە بۆسەکەیان هەستان و چوونە سەر لێواری هەڵدێرەکە و ورد ورد لە دەشتەکەی خواروو و رێگەی شارۆژکە و رێگەکەی گوندی ساریلایان روانی. ئەو هەڵمەی دەگەیشتە نێو قەدی بنیادەم، لە سەر دەشتەکە نیشتبوو. هیچ شتێك نەدەبینرا. هەڵمەکە تاوێك لە شوێنێکەوە سوور چووەوە.

لە خوارووی شارۆچکەکەوە، لە دەم ساورۆنەوە، لە باشووری چنارەکانەوە سوارێك دەرکەوت. بارانەکە هەر دەباری. ئەسپەکە، کە سوارەکەی خۆی بەسەر ملییەوە مەڵاس دابوو، وەك شمشێرێکی لە کالان دەرکێشراو ئەم سەر ئەوسەری دەشتەکەی دەبڕی. ئەسپ و سوارە ببوونە یەك.

"دیوتە مام حەسەن؟ چووەتە شار و ئەوە دەگەڕێتەوە. ئەو گاورە، وا بە ئاسانی بە تەڵەوە نابێ. ئەتۆ لێرە خۆت لێ مات داوە، ئەو بە رێیەکی دیکەدا دەڕوا. ئاخ، ئاخ، نەمتوانی بیگرم. ئاااخ، ئاااخ، ئاخ مام حەسەن...."

"لەوانەشە ئەو نەبێ بەگ، لەوانەیە نەخۆشیش بێ و لە ماڵێ وەدەر نەکەوتبێ."

مستەفا بەگ کە باسی نەخۆشبوونی دەرویشی بیست، رەنگی بە روخسارییەوە نەما و بە چاوە بێ ئۆغرەکانی لە مام حەسەن ورد بووەووە. گرماندی:"بێدەنگ بە مام حەسەن. ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ ئەو نەخۆش نییە. ئیشەڵڵا نەخۆش نابێ."

مام حەسەن کە زانیبووی تێی ریاوە، دەیویست تێی هەڵبێنێتەوە:"ئەمن خۆ هیچم نەگوت بەگم. هیچی نییە. لەوانەشە تۆزێك بێ تاقەت بووبێ، گیانی داگیرابێ... نا هیچی نییە..."

"ئەو سوارە ئەو نەبێ، کەس نییە... پێت وایە دەتوانم بیئەنگێوم؟"

ئەژنۆی راستی لە سەر عەرزی دادا و سێرەی لێ گرت و تەقەی لێکرد و نەی ئەنگاوت.

مام حەسەن گوتی:"کوڕە زۆر دوورە، بەگم. ئەمنیش تاقیی بکەمەوە؟"

"نا، بێ سوودە."

بەگ جارێکی دیکەش سێرەی لێ گرتەوە و بە بن زگی ئەسپەکەیەوە نا کە وەك با دەفڕی.
بەڵام ئەسپەکە هەر وا دەفڕی.

"خۆی بوو، خۆی. بەڵام زۆر دوور بوو. فیشەکی نەدەگەیشتێ.

هەستا.

بارانە زەردەکە دەباری و هەڵمی دەکرد. سێ هەڵۆ باڵیان لێك کردبووەوە و تەڕ و خووساو و ڕەش و بێجووڵە لە چەقی ئاسمانەکەدا دەبزووتن.

مستەفا بەگ تفەنگەکەی بەرز کردەوە و سێرەی لەوی نێوەڕاست گرت. ساتێك پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە و چاوی لە هەڵۆکە مایەوە و تاوێك دواتر بەسپایی تفەنگەکەی هێنایە خوارێ. بزەیەکی پڕ لە تەوس و گاڵتەی بە سەر سمێڵە ڕەش و بابڕەکەیەوە مایەوە.

هەڵۆکان هەر وا بەبێ جووڵە لە چەقی ئاسمانەکەدا دەخزین.

بارانە زەردەکە وەك گۆزەی سەروبن دەباری و خۆشی نەدەکردەوە.

# ١٤

ئەو کۆچەرییانەی لە بەری رۆژهەڵاتی ساورۆن نیشتەجێ ببوون، دەستیان کرد بە پێکەوەنانی ماڵ و دێهات. گوندێکی دیکەش لە خوارووی بۆزقویۆوە لە نزیك حەوت گوندی هەرمەنی‌یەوە دروست کرابوو.

ئەو وەختەی ئەم رەوەندانە دەهاتن، بەهار تازە لە چوکووراوا چرۆی کردبوو. ئەوان زۆر دڵیان خۆش بوو بەوەی تووشی مەڵبەندێکی ئاوا خۆش ببوون. هەتا هاوین داهات و گەرما زەردەکە هەڵیکرد، خۆشیان لێ گوزەرا. بەڵام کە هاوین داهات و گەرما بەتین و سووتێنەرەکەی چوکووراوا هەموو وڵاتی هەڵپرووزاند و سووتاندی، رۆژیان لێ بوو بە شەوی رەش. پێشکە و تەپۆ، شەوە گەرم و خەستەکانیان داگرت.

ئەو رەوەندە کۆچپێکراوانە خەڵکی ناوچە کوێستانەکانی بەلکان بوون. ئەوان لە ژیانیاندا گەرما و تەپۆی ئاوایان نەك نەدیتبوو، هەر بە خەیاڵیشیاندا نەهاتبوو. کە هاوین داهات یەك یەك و دوو دوو نۆبەتێیان لێ هات. لە پێشدا ئەو سێ منداڵەی نۆبەتێیان لێ هاتبوو، مردن و یەکەم کێڵی گۆڕستانی ئاوارەکان لە گوندە نوێیەکەدا چەقێنرا. نە دەستیان بە دوکتۆر رادەگەیشت و نە داوودەرمان و نە گیای "گنێ گنێ" کە داوودەرمانی مەلاریای لێ دروست بکەن. لە شارۆچکەش کەس نەما ئاوارەکان سەردانیان نەکردبێ. سەریان بە هەموو کونێکدا کرد و هەر هەمووان ئاوایان جواب دانەوە:"پشت بە خودا ببەستن. نۆبەتێ دوکتۆر و دەرمانی نییە."

لەو کاتەدا، گەورەکانیش بە داوی مەرگەوە بوون. مردن وا زۆر بوو، ئاوارەکان، مردووەکانیان پێ کفن و دفن نەدەکرا. ئاخرییەکەشی کەس نەما لە گوندەکەدا نۆبەتێی نەگرتبێ. هەموو رۆژێ لە بەیانییەوە تا شەوێ، بە سەدان بچووك و گەورە، پیر و گەنج، لە

سەر خاك و گڵە رەشەكە و لە بەربەرۆچكەی تاوە بەتینەكە هەڵدەچۆقین و دەلەرزین باوێشكیان دەدا. كەس لە ئاوەدانییەكەدا نەما مردووەكان بنێژێ، تەرمەكان لە تەنیشت ئاگردان و كوانووەكان و لە پشت دەرگا و لە ئاورِ و لافاوگەكان و قوولكەكاندا بۆگەن بوون و توێ توێ بوون.

باران دای كرد. خۆ بارانی هاوینانی چوكووراوا هەر ئەوەندەی دایدەكرد، ئیتر لێكردنەوەی نەبوو. زەرد زەرد، لێڵ، چەور و قورس دەباری وەك گۆزەی سەروبن. بارانێكی زەرد وەك ئاوی كا.

مستەفا بەگ بەو بارانە بە سواری ئەسپ ماڵ بە ماڵی گوندەكە دەگەرِا و سەیری مردووەكان و ئەو ئاوارانەی دەكرد كە یەك پشوو دەلەرزین و دەیانناڵاند. ئەو بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ و قسەیەك بكا یان هەر لانیكەم بڵێ "خوا شیفاتان بدا" بە لایاندا تێدەپەرِی. مام حەسەن و چەند پیاوێكیشی بە دواوەی بوون....

مستەفا بەگ كە تەواو خووسابوو و پەیتا پەیتا تفی دەكردەوە، هەلینگی لە ئەسپەكەی دا بۆ ئەوەی لە لینگدان لە گوندی ئاوارەكان بچێتە دەرێ.

ئەو شەوە یاغییەكان هەڵیانكوتایە سەر گوندەكە و پێنج كچی عازەب و تازەپێگەیشتووی نۆبەتێ لێدراویان رفاند و بردیاننە چیا. چەند رۆژ دواتریش ئیدریس ئەفەنی، ریش چەرمووەكەی ئاوایی لە بەر ماڵەكەی خۆی كوژرا. ئاوارەكان سەریان لێ شێوابوو. چەند سەرێكیان مانگا و ئەسپ و گوێدرێژ هەبوو، شەوێكیان چەتە هاتن و ئەوانیشیان وەپێش خۆیاندا و بردیانن.

ئاوارەكان هانایان بردە بەر حكوومەت. ئاپۆرایەكی چڵكن و شپرز و شرِ كە سەرلەبەریان هەڵدەلەرزین و تایان لێ بوو، چەند رۆژێك لە بینایەكی حكوومیدا چاوەرِوان بوون. سێ كەسیشیان لە بەر دەم بیناكەدا مردن.

كابرایەكی خێرخواز پێی گوتن:"حوكمەت هیچی بۆ ئێوە پێ ناكرێ. ئەوە هەموو گووی مستەفا "ئاق یۆللی"یە ئەنگۆ دەیشێلن و هەر هەمووی لە بن سەری ئەو دایە. بچن و دەستەوداوێنی ئەو بن. خۆ بە سەر پێڵاویدا بكێشن، چونكە ئەگەر دەرمانێكتان هەبێ لای ئەو دەست دەكەوێ."

ئاوارەكان ئەوجار روویان كردە گوندەكەی ئاق یۆللی". مستەفا بەگ خۆی پێشان نەدان و ئەمری كرد بە پیاوەكانی كە لە ئاوەدانی دەریان بكەن. ئاوارەكان بێ كەس و بێ پەنا روویان كردە چوكووراوا.

ڕۆژێکیان بارانەکە خۆشی کردەوە و تاو هەڵات... ئاوارەکان ماڵەکانی خۆیان لە قامیش و هەڵاش دروست کردبوو، دوو ڕۆژ دوای لێکردنەوەی بارانەکە، گوندەکەیان ئاگری گرت. پێنج کەسی تووشبوو بە مالاریا کە نەیانتوانیبوو لە کەپرەکانیان بێنە دەرێ، لە بڵێسەی ئاگرەکەدا برژان.

کە تاو هەڵات، سەیریان کرد جگە لە کۆگایەکی خۆڵەمێش و ڕەژوو و کۆڵوو، هیچ لە گوندەکە نەماوەتەوە. ئاوارە نۆبەتێ گرتووەکان لە گۆڕەپانی گوندەکە کۆ بوونەوە و هەتا ئێوارێ پێکەوە کڕووزانەوە و ناڵاندیان و لەرزین.

لەو ناڵە و هەللەرزینەدا، جاری وابوو ئاوارەیەك دەیگوت:"گوتمان ئێرە نیشتمانمانە و ئەوانەش برامانن بۆیە هاتین. هاتین و پەنامان بۆ هێنان..."

ئاوارەکان ئەو شەوەیان لە گۆڕەپانی گوندە سووتاوەکە و لە بن میچی ئاسماندا تێپەڕ کردبوو. بەرەبەری بەیانی دەنگێکی ناخۆش و زلیان بیست کە دڕی بە شەوەکە دەدا:"هۆی ئاوارەکان، جوان و زەریف گوێ ڕاگرن و گوێتان لێ بێ. ئەو زەوییەی داگیرتان کردووە، ملکی مستەفا بەگی "ئاق یۆللی"یە. لێرە بڕۆنە دەرێ. ئەگەر تا دوو ڕۆژی دیکە لێرە نەڕۆنە دەرێ و ملی خۆتان نەشکێنن، هەرچی بەسەرتان بێ لە چاوی خۆتان دیتووتانە."

ئەو دەنگە هەتا تاوهەڵاتنێ، چەند جاران بیسترا. ئاوارەکان خۆیان پێکەوە نووساندبوو و دەلەرزین و پاڵەپەستۆیان بوو. ئەگەر یەکێك لە دوورەوە لێی ڕوانیبان، پێی وادەبوو لە نێوەڕاستی گۆڕەپانی گوندەکەدا ڕانە مەڕێك نووستووە.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ متەقیان نەهات و هیچیان نەگوت. هەڵلەرزین و پاڵەپەستۆیان بوو. نە چۆڕە ئاوێکیان خواردەوە و نە پاروە نانێکیان خستە بەر دڵیان. ئیشتیایان کوێر ببووەوە و لەو گوندە سووتاوەشدا نە ئاو دەست دەکەوت و نە نان. هەر وا لە بەر تاوەکە مانەوە.

کاتێ ڕۆژ ئاوابوو، وەڕێ کەوتن. نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن. هەموو هێز و تینی خۆیان کۆکردبووەوە و شان بە شانی یەکتری ڕایان دەکرد. پیرە هەنجیرێك لە جێی گوندە سووتاوەکە پاڵی بە دیوارێکی ڕووخاوەوە دابوو... جگە لەو دار هەنجیرە، هیچ نیشانەیەکی دیکە بەجێ نەمابوو لەوەی کە ڕۆژگارێك ئێرەش خەڵکێکی لێ ژیاوە.

هیچ کەس نەیزانی خەڵکی ئەو گوندە سووتاوە چوونە کوێ و چییان بەسەر هات. کەس نەیپرسی چارەنووسی ئەو لێقەوماوانە بەکوێ گەیشت. یانی هەموو تێداچوون و قڕیان تێکەوت؟ ژیان؟ ڕایان کرد؟ نەك کەس پرسیی چییان بەسەر هاتووە و نە کەسیش سۆراغی کردن.

خەڵکی گوندێکی گەورە لە ماوەی دوو سێ مانگدا بوون بە هەقایەت و "یەکێ بوو یەکێ نەبوو".

بەڵام پاش ئەو ڕووداوە، بە مستەفا بەگی ئاق یۆللی"یان گوت "مستەفا بەگی دێ دەرکەر."

ئەو شۆرەت و ناوبانگە لە کەوتە سەر زاری هەموو چوکووراوا. هەرچی خەڵکی چوکووراوا بوو بە پیر و لاو و ژیر و شێت و هەژار و دەوڵەمەندەوە گوتیان و دووپاتیان کردەوە:"بژی مستەفا بەگ. ئا بەوە دەڵێن پیاو. ئەو بێ دینانەی لە زەوی و زارەکانی خۆی دەرکرد."

مستەفا بەگیش گەلێ جاران ئەوەی بیستەوە و بەخۆی نازی.

# ١٥

دڕووەڵانەکە لەو سەردەمدا، هەر لە دانگەکەی ئاواییەوە دەستی پێدەکرد و لە مەودایەکی دوورەوە، کە دەگەیشتە ڕێیەکەی حاجیلار لە تەنیشت ئاقچاسازەوە، تەواو دەبوو. ئێرە دڕووەڵانێکی پان و بەرین و چڕ بوو. ئەوەندە چڕ بوو پڵینگی لێ دەرنەدەچوو.

دڕووەڵانەکە هەموو ساڵێ وەك باغێك بە گوڵی زەردباو دەڕازایەوە و بۆن و بەرامە دڵڕفێنەکەی هەتا پاییزێ وڵاتی دەتەنییەوە. ئەوجار پاییز دەهات و گەڵای دڕووەکان هەڵدەوەرین، ئیتر لەو کاتەوە جا ڕوخساری ڕاستەقینەی دڕووەڵانەکە دەردەکەوت. لەمەودوا هیچ نیشان و شوێنەوارێك لەو باغە پڕ لە گوڵ و بۆن و بەرامەیە نەدەمایەوە.

کام چڵە دڕوو لە هەمووان بەرزترە، لە بنیادەمێکی ئاسایی بەرزتر نییە. بە هەزاران چووزەرە و چڵ لە ڕەگی بڕکە دڕوویەکەوە سەر دەردێنن و هەر لکێکیش هەزاران چقڵی نووك تیژی وەك دروێشەیان لێ دەڕوێ و دەدرەوشێنەوە. دڕووەڵانەکە لە بەر تیرێژی خۆرەتاوە بەتینەکەی نیوەڕۆیانی پاییز، بە ملیۆنان بریسکەبریسکی وردەوە، دەکوڵێ.

دڕووەڵانەکە ئەوەندە چڕ و پڕ لە چقڵە، مار ناتوانێ پێیدا بخوشێ و بخزێتە نێوی و باڵندە ناتوانێ لێی بنیشێتەوە. چیی زەرگەتەی چوکووراوایە بەهاران و هاوینان، دێن و لەو دڕووەڵانە دەنیشن و ویزە ویزیان گوێ کەڕ دەکا.

دەروێش بەگ وا تووڕە بووە و هەڵچووە خۆی پێ ناگیرێ. سواری ئەسپە شێیەکەی بوو و خەرەزەنێکی بە دەستەوە بوو. کامیلیان لە تەویلە هێنایە دەرێ. سەر و قژ و دەموچاوی شپڕێ و شپرز و جلوبەرگەکەی شڕ و شڕۆڵ ببوون. ئەو خوێنەی لە نێوچاوانییەوە هەڵدەقوڵی، بە لا ڕوومەتی چەپیدا دەچۆڕایەوە و شۆڵاوگەی بەستبوو.

کامیل گەنجێکی قژ زەردی چاو سەوزی نێوچاوان پان و چوارشانە و جوانچاك بوو. کامیلیان لە تەنیشت دڕووەڵانەکە بەرهەڵدا کرد. دەروێش بەگ لە دوورەوە ئەسپەکەی تاو دا و بە لینگدان بەرەو کامیل لێی خوڕی. ئەسپەکە بە تەنیشت کامیلدا تێپەڕی و ئەو بە بای ئەسپەکەی کەوت. کامیل دەسبەجێ هەستایەوە و توند راوەستا. دەروێش بەگ زۆر دوور کەوتبووەوە کە توانیی سەری ئەسپەکەی وەرسووڕێنێتەوە و دیسان چۆن بە خێرایی رۆیبوو ئاوا بەرەو کامیل گەڕایەوە و کە بە تەنیشتیدا تێدەپەڕی، قەمچییەکی لە تەختی پشتی راکێشا. ویزەی قەمچییەکە لە رەوەز و گابەردەکانی ئاناوەرزا گەڕا.

هێز و گوڕی خێرایی ئەسپەکە و تین و رقی دەروێش بەگ پێکەوە، قەمچییەکەیان وەك شمشێرێکی تیژ لێ کردبوو. قەمچییەکە هەرکوێیەکی دەگرت، وەك تیغ دەیبڕی.

دەروێش بەگ هەتا نیوەڕۆ بەو پەڕی رق و تووڕەییەوە کامیلی قەمچی دایە بەر قەمچی. کە خۆر گەیشتە چەقی ئاسمانێ، لە دڕووەڵانەکەی دا. کامیل کە لە حەژمەتان خۆی بە دڕووەڵانەکەدا کردبوو، هەموو گیانی شەڵاڵی خوێن بوو. خوێن لە دەموچاو و سەر و دەست و پێی و پشتی و نێوشانی و سینگ و هەموو ئازای ئەندامییەوە دەچۆڕایەوە.

دەروێش بەگیش بە شوێن کامیلدا بە ئەسپەوە خۆی بە دڕووەڵانەکەدا کرد. کامیل ددانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو و بە دڕووەڵانەکەدا غاری دەدا و قەمچییەکەی دەروێش بەگیش ویزە ویز دادەهاتەوە و لە سەر و مل و نێوشانی دەهاڵا.

دەروێش بەگ هەتا ئێوارێ بە قەمچییان تا ئەوبەری ئاناوەرزای برد. کامیل تیتۆڵێکی شمەك لەبەردا نەما. دڕووەکان جلوبەرگەکانیان یەکسەر لەبەر داڕنی. هەموو گیانی کامیل شەڵاڵی خوێن بوو.

وەرزێرەکانی ئاوایی دەروێش بەگ و جووتیارەکانی دیکەش بە بیستنی ئەو خەبەرە روویان لەوێ کردبوو. ژن و پیاو و پیر و گەنج و منداڵ لە دەرەوەی دڕووەڵانەکە سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد. خەڵکێکیش خۆیان بە دڕووەڵانەکەدا کردبوو و بە دوای دەروێش بەگ و کامیلدا دەڕۆیشتن. ویزەویزی قەمچییەکە سات بە سات لە ئاناوەرزا دەگەڕا.

دەروێش بەگی لای ئێوارێ ماندوو بوو. باسکە خوێناوییەکەی رەق بوو و بەرز نەبووەوە. بانگی هیدایەتی کرد و گوتی:"بڕۆ و سواری ئەسپەکەت بە و وەرە ئێرە. قەمچییەکی قایمیش بێنە. دوو سواریش..."

هیدایەت رۆیشت و تاوێك دواتر، گورج و گۆڵ لەگەڵ دوو سوار هاتەوە.

کامیلی پیشان دان و گوتی:"تا جووڵەی لێ دەبڕێ لێی دەن."

ئەو شەوە تا بەیانی ویزەویزی قەمچی و نووزە و ناڵە لە ئاناوەزا گەڕا و دەنگی دایەوە.

دەم بەیانی، تەرمی بێ گیان و هەپروون هەپروونی کامیلیان کە هیچ لە بنیادەم نەدەچوو، هێنایەوە و لە بەر دەرگای دانگەکەی کۆشك فڕێیان دا. دەروێش بەگ وردە وردە لە کۆشکەکەی هاتە خوارێ. هات و لە تەنیشت تۆپەڵێك گۆشت و ئێسقانی لەتوکوتکراو راوەستا و پرسیی:"ئەوە کامیلە؟"

هیدایەت گوت:"بەگم تەمەنی درێژ بێ. هەر لەتکەی بە سەر چڵە دڕووەکەوە مایەوە. هەر ئەوەندەیمان بۆ کۆکرایەوە."

دەروێش بەگ بزەیەکی ئاغایانەی هاتە سەر لێوی و نۆکە شەقێکی لە تەرمەکە دا و گوتی:"هەڵیگرن و بیبەن لە دەرەوەی ئاوەدانی بیخەنە پێش سەگەل."

کامیل مێردی تاقانە خوشکەکەی دەروێش بەگ بوو. خوشکەکەشی لەو دیو پەنجەرەکەوە سەیری دەکردن و هەموو ئەوانەی بە چاو دەدی.

هەواڵی کوژرانی کامیل لە بن قەمچییاندا، بە هەموو چوکووراوادا گەڕا و هەر لە پارێزگارەوە بگرە تا دەگاتە نوێنەری پەرلەمان و فەرماندەی جەندەرمە و سەرۆکی پۆلیس، هەموویان بیستیانەوە. هەموو بیستیانەوەو هیچیان نەگوت. ئەوی بیستیشی گوتی:"هەی بژی دەروێش بەگ. ئا بەوە دەڵێن پیاو. پیاوی پیاوان. کارێکی کردووە نەبێتەوە. بەڵام تۆزێك توندوتیژیی پێوەبوو."

جا دەروێش بەگیش هەموو ئەوانەی بیستەوە و بەخۆی نازی.

# ١٦

هیدایەت بەبێ جووڵە لە بەردەم بەگ راوەستابوو و دەیگوت:"خۆ ئاوا نابێ. ئەو پیاوە یەکسەر هار بووە."

بەگ نێوچاوانی تێك نابوو و سەری بەردابۆوە و دەمی ببووە تەڵەی تەقیو.

"ئەوەی ئەو دەیکا، کەس نایکا. کاری ئاوا لەوانەیە هەر ئەوانە بیکەن کە تازە پێگەیشتوون."

دەروێش بەگ چەند ساتێك دواتر سەری هەڵێنا و نیگا تیژەکانی خۆی لە چاوەکانی ئەو بڕی:"هێشتا بڕوا ناکەم هیدایەت. لەوانەیە کاری یەکێکی دیکە بێت. ئەتۆ دەڵێی چی؟ مستەفای کوڕی ئاق یۆللی" کابرایەکی نەجیمزادەیە. چما ڕێی تێدەچێ دوژمنی من ئەوەندە سووك و چرووك بووبێ؟ یانی دەبێ ئەوەندە هیچ و پووچ و خوێڕی بووبێ خەلەو خەرمانی هەژار و رووت و قووتان بسووتێنێ؟ باشە ئەوە چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەوەی لە خەودا بەسەر یەکێکدا بدەیت؟ ئەوە بە گیانی ناخێری ئەو مستەفا "ئاق یۆللی"یەیە دوژمنی منە...."

جا لە سەر "دوژمنی منە" پێی داگرتەوە و لە سەری رۆیشت:"یانی وا هەیە دوژمنی من کاری ئاوا خوێڕییانە بکا؟ ئەتۆ دەڵێی چیی هیدایەت؟ ئەمن دەڵێم لەوانەیە یەکێکی دیکە ئاگری لە کۆشك و خەرمانەکان بەردابێ، لەوانەیە یەکێکی دیکە، تۆ دەڵێی چی؟"

هیدایەت بە دەنگێکی پڕ لە دڵنیاییەوە گوتی:"یانی لەو چوکووراوایەدا دەکرێ یەکێکی دیکەش هەبێ، بوێرێ بە سیلەی چاو سەیری کۆشك و زەوی و زاری ئێمە بکا؟ یان کەس هەیە لەو چوکووراوایەدا وا نەترس بێ؟ جگە لەو دەکرێ کێ بێ؟"

دەروێش دەستەکانی لە سەر ئەژنۆی دانان و هەستا و بە پانی و درێژایی ژوورە نیوەسووتاوەکەیدا کەوتە پیاسە کردن.

"پێم وانییە، بڕوا ناکەم. بڕوا نەکەم. بڕوا ناکەم دوژمنەکەی من ئەوەندە دابەزیبێ و سووك و رەزیل بووبێ. ئەستەمە بڕوا بکەم. زۆر ئەستەمە. ئەتۆ دەڵێی چی خاتوون؟"

رووی لە ژنەکەی بوو کە لەولاتری پلیکانەکەوە راوەستابوو و سەیری دەکردن. ژنەکەی هاتە پێشەوە و لە لاشیپانەی دەرگاکەدا راوەستا و گوتی:" هەر من دەیڵێم و ئەتۆ لە گوێی مەگرە بەگ. ئەو رۆژگار بەسەر چوو. پیاوەتی و جوامێری نەماوە. ئێستا هەمووان وەك ئاق یۆللی"ن... یان ئاق یۆللی" وەك هەمووانە. ئەگەر ئەمن لە جێی تۆ بم، دوای ئەوە، ئیتر ئاق یۆللی" بە "دوژمن" نازانم و وەك دوژمنێکی ماقووڵ و رێزدار سەیری ناکەم. هەر کارێکیش بکا، خۆم شلوێ ناکەم و هەر گوێشی پێ نادەم. بەڵام دەشزانم ئەو قسانە ناچنە گوێی تۆوە. ئەتۆ ناتوانی تووڕەییەکەت جڵەو بکەیت و ئەوەی ئەو دەیکا، تۆش هەر ئەوە دەکەیەوە. ئیتر ئەو دوای ئەمە لەو چوکووراوایە لە پیاو مەگەڕێ، دەروێش."

ئیتر گەڕایەوە و بە تووڕەییەوە لە پلیکانە نیوەسووتەکانەوە، کە هەر پێیەکی لەسەری دادەنان رەژووەك بەردەبووەوە، چووە خوارێ و وەك ئەوەی قسەیەکی تازەی بیر کەوتبێتەوە، راوەستا و گوتی:"چما نابینی ئیتر ئەو کۆشکە بۆ ئەوە نابێ تێیدا بژێی؟ هەر ئەمڕۆ با بچینە شارۆچکەی. ئەمن منداڵەکان هەڵدەگرم و دەڕۆم؟"

دەروێش بەگ گوێی لە قسەکانی ئەو نەبوو. لەوانەیە گوێشی لێ بووبێ و خۆی لێ گێل کردبێ. گوتی:"راست دەکا. خاتوون هەقێتی. ئەمن ناتوانم تووڕەییەکەم جڵەو بکەم. ئەمنیش لەو چاڵە دەکەوم کە ئاق یۆللی"ی تێکەوتووە. ئەوەی ئەو بەسەر منی هێناوە، منیش هەر ئەوەی بەسەر دێنمەوە. پشت دەکەمە جوامێری و پیاوەتیشەوە. دەبمە پیاوێکی سووك و بێ نرخ. دەزانم، دەزانم، هەموو شتێك دەزانم. زۆر زۆرم بیر لەوە کردووەتەوە هیدایەت. زۆر زۆر هەوڵم داوە بەسەر خۆمدا زاڵ بم، بەڵام ناتوانم. خۆ ئەگەر توانیبایەم بەسەر خۆمدا زاڵ بم و تۆڵەی لێ نەکەمەوە، دەمێك بوو لەنێوم بردبوو. ئەو لە بۆسەکەیدا بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و لە منی نەدا. باشە ئەو چۆن توانیی وا بکا؟ ئەو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و لێی نەدام و سووك و بێ قیمەتی کردم و ئاوای بەسەر هێنام. دەنا خۆ ئەو کاتەی لە پێش ترۆمبێلەکەوە دەڕۆیشتم، دڵنیا بووم لێم دەدا. پێم وانەبوو ئەوەندە بەهێز و دانبەخۆداگر بێ، بچمە بەر دەستی و قامك بە پەلەپیتکەدا نەهێنێ. پیاوی ئاوا، پیاوی ئاوا جوامێر چۆن دەتوانێ کاری ئاوا بێنرخ و

سووك و خوێڕییانە بکا و نانی ڕەشوڕووت و هەژاران ببڕێ و کۆشکەکەی منیش ئاگر بدا؟ نازانم، تێناگەم، بۆم ناچێتەوە سەر یەك. ئاااخ، ئاااخ تێدا ماوم. ئەگەر هێزی ئەوەم بوایە تۆڵەی لێ نەکەمەوە.... ئاااخ هیدایەت، ئاااخ."

بێدەنگ بوو و بە ژوورەکەدا کەوتەوە پیاسەکردن. بانیژە و دیوەخانە گەورەکە و هەموو ژوورەکانی کۆشکەکەی سووتابوون و هەموو وڵات ڕەش داگەڕابوو. ئەو کۆشکە گەورەیە تەنیا چواردیوارەکەی لێ مابووەوە. جا باش بوو جگە لە کۆشکەکە هیچی دیکە بەو سووتمانە نەچووبوو و کەلوپەلەکانیان دەرباز کردبوو.

ئەوێ شەوێ، بە زۆر و زۆرداری دەروێش بەگیان لە ژوورەکەی بردبووە دەرەوە. خۆ ئەگەر خاتوون نەبوایە، کەس نەیدەوێرا لە ژوورەکەی و لە خۆی بچێتە پێشێ و لێی نزیك بێتەوە. یان دووکەڵ دەیخنکاند، یان چزە چز دەبرژا. بە دوورودرێژی سەیرێکی ژوورەکەی کرد و ئەوجار بزەیەکی زوڵاڵ، کە دەتگوت لە ناخی دڵییەوە هەڵقوڵیوە، خزییە ڕوخسارییەوە. سەرێکی لەقاند و گوتی:"نازانم، پێم قەبووڵ ناکرێ، ئەستەمە، ئەستەمە. ئەستەم. بەرەنگاریی دوژمنێکی ئاوا، تاقەتبڕە. نیشانی دەدەم."

هەر گوتی و گرماندی و بۆڵاندی و لە بن باری ئەو حاڵە ئاڵۆز و تووڕەییەی ڕزگاری بوو. سووك بوو و ئاوڕێکی لە هیدایەت دایەوە و بە پێکەنینەوە گوتی:"بچۆ بە خاتوون بڵێ بەیانی بار دەکەین و دەچینە شاری."

"ئاخۆ پێویستە کەسێك بنێرم ترۆمبێل بێنێ؟"

"پێویست ناکا. ئەتۆ خاتوون ئاگار بکەوە. زولفەقاریش بانگ بکە. با بێ بزانم ئەو دەڵێ چی."

زولفەقار ڕاوێژکاری بوو. ئەگەر پرسیاریان کردبایە کە ئاخۆ لە کەیەوە تا ئێستا خەریکی ئەو کارەیە، نەیدەتوانی وەڵامێکی دروست بداتەوە چل ساڵانە دیار بوو. دە ساڵ لەوە پێشیش هەر چل ساڵانە دیار بوو. لەوانەبوو دە ساڵی دیکەش هەر وا بنوێنێ. کەڵەگەت و باریکەڵە بوو. دەموچاوێکی درێژووکە و دەست و ملیشی زۆر درێژ بوون. شوێنی سووتاوێك بەسەر لاروومەتی ڕاستییەوە دیار بوو کە هەتا بن چەناگەی کشابوو. چاوەکانی وردیلە بوون و ئەوەندەش ورد بوون کە هیچ لەو دەموچاوە درێژەی نەدەهاتنەوە. لێوەکانی هەر دوو هێڵی باریك و تەنك بوون. ردێنە تەنك و کۆسەکەی، چڵ چڵ لە چەناگەیەوە شۆڕ ببووەوە. کە قسەی دەکرد یان

سەیری شوێنێکی دەکرد، بە هەموو هێزی خۆی ملی دەکێشا و وەك باڵندان سەری بەلایەکدا خوار دەکردەوە و بە چاوێکی سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد.

بەرپرسیارەتیی هەموو کاروبارەکانی زەوی و زار و کشتوکاڵ بەئەستۆی ئەو بوو. بەروبووەکەی خڕ دەکردەوە و دەیفرۆشت و کرێکاری دەگرت و ... دەروێش بەگ هەر کاریشی بەو شتانە نەبوو.

زولفەقار زۆری لە زەوی و زار و کشتوکاڵ دەزانی. باشە بڵێی ئەگەر دەروێش بەگ،وازی لەو چەرکەزە "ئۆزوون یالایی"یە هێنابایە و بەرەڵڵای کردبایە، کشتوکاڵ و زەوی و زارەکەی ئاوای لێ دەهات؟ ساڵ دەری دوازدە مانگان ئاوا گیرفان بەتاڵ دەبوون؟ و زەوی و زارەکەیان ئاوا ساڵ بە ساڵ بچووکتر دەبوونەوە؟ نا، هەرگیز، بەڵکو رێك بە پێچەوانەوە دەبوو. هەموو ساڵێ پەڵە زەوییەکی تازەیان دەکێڵا و ساڵ بەساڵ پان و بەرینتریان دەکرنەوە و زەوی و زارەکەیان پێنج هێندە و بگرە دە ئەوەندەی ئێستا دەبوو.

"رۆستەم ئۆغڵی هات؟ سات و سەوداکەتان کرد؟ بڕیتانەوە و رێککەوتن؟ تەواوتان کرد یان نا؟ داتانناوە کەی پارەکەی بدا؟ ئەمن هەر ئێستا دەمەوێ. هەتا بەیانی دەبێ بیهێنێ. سەیر کە زولفەقار، کۆشکەکەم سووتا و رەعیەتەکانم لەو سۆنگەیەوە لە سەر ساجی عەلی دانیشتن. ئەگەر دەیەوێ زەوی بکڕێ، با بەیانی بێ و پارەکەی بدا. زەویی ساقچا گوێزێت پێوا؟ چەند دۆنم بوو؟"

"زەوییەکەی ساقچاگوێز حەوسەت دۆنمە، بەگەم. گەزم کرد و باشیشم پێوا. ئەوە خاك نییە گەوهەرە. کوڕە بە خوای پیاویشی تێدا بچێنی، شینی دەکاتەوە و بەر دەگرێ، بەگ. لەو خاکە رەشەدا، ئەگەر گەنم بچێنی، یەك بە سەد دەیداتەوە. لۆکە بچێنی، هەر دۆنمێکی چوار سەد کیلۆی لێ هەڵدەگریتەوە. ئەوە چۆن دڵت دێ بەگ؟ مەلی بەبێ پەڕ و باڵ چۆن دەتوانێ بفڕێ بەگ؟ زەوی وەك باڵ و پەڕی بنیادەم وایە. بنیادەمی بەبێ زەوی وەك شوانی بێ مێگەل وایە."

"دەی با بزانم چەندی پێ دەدا؟"

دەستەکانی رێك خشاندن و وەك بپاڕێتەوە ملی بەلای بەگدا لار کردەوە و بێدەنگ مایەوە. دەتگوت گوێی لە هیچ نەبووە.

ئەوە کەڕی زولفەقار؟ گوتم رۆستم ئۆغڵی چەند پارە بە زەوییەکەی ساقچاگوێز دەدا؟"

پارە، پارە نادا بەگ. هیچ پارەیەك نادا... دەیەوێ هەر وا بە خۆڕایی لە دەستی بکەین. پارە نادا."

"دەی، باشە. بڵێ بزانم چەندە دەدا؟"

زولفەقار منگە منگێکی کرد و ملی تۆزێکی دیکەش درێژ بووەوە. خوێن لە دەمارەکانی گەڕا و سوور بووەوە ئاخرییەکەی گوتی:"دەیەوێ هەر بیست هەزار لیرە بەو هەمووە زەوییە بدات. وەڵڵا تفێکم لە رووی کرد و دەرم کردە دەرەوە."

بەگ قاقایەکی کێشا و گوتی:"کاری چاکت کردووە تفت لە رووی کردووە. کار لەوە باشتر نابێ. زۆر بێ چاو و روویە. هەر چاك چاکت کردووە وەدیوی دەرەوەت ناوە زولفەقار. بەڵام کوڕە بەینی خۆمان بێ، بیست هەزار لیرەش کەم نییە ها. لەو سەر و وەختەدا کێ بیست هەزار لیرەی نەقد و پوخت بە پیاوی دەدا؟ پارەکەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو؟"

زولفەقار خۆی کۆ کردەوە، وەڵامی دایەوە:"هێنابووی بەگ. توورەکەیەکی پڕ پڕی هێنابوو. بەڵام جوابم کرد. وەدەرم نا. ئاخر بیست هەزار پارەیە بۆ زەوییەکەی ساقچاگوێز؟ بێ ئەدەبی نەبێ لە خزمەتتدا گەورەم، ئەتۆش خەریکە ئاگر بەماڵەکەی خۆتەوە دەنێی. ئەوە گاڵتەی پێ ناکرێ بەگ، حەوسەد دۆنم زەوی.... عەرزێکی کاکی بەکاکی و بێ سنوور.. هەزار، دوو هەزار دۆنمیش لە ئاقچاساز دێنێتە دەرێ. پێنج دە هەزار دۆنمیش... و مەزرایەکی گەورە لە هەمبەر مەزراکەی ئێمەدا قوت دەبێتەوە. چما ئەو سەگی کێیە؟"

دەسبەجێ توورەییەك، جڵەوی لە دەست زولفەقار دەرهێنابوو. سەری هەڵێنا و مژۆڵەکانی کە هەتا ئێستا لە سەر یەکدانابوون، لێك کردنەوە و چاوی لە چاوی بەگ بڕی و گوتی:"رۆستەم ئۆغلی سەگی کێیە بەگ؟ ئەو کێیە زەوی و زاری ساری ئۆغلیی پێ بڕدرێ؟ خۆ ئەو سەگە بەرەڵلایە، ئەو رۆستەم ئۆغڵییە بێ دایی و بابە ملوێنێکیش بدات، هێشتا تۆزێکی پێ نافرۆشم وەك دەرمان لە چاوی بکا. ئەوە رای منە بەگ. ئەو رۆستەم ئۆغڵییە بێ دایی و بابە، زۆڵی رۆژگارە... هەتا دوێنێ نانی شەوێی نەبوو. تا دوێنێ کلکی کەرەشەلێکی دەگرت و گوندا و گوندی دەکرد و زەنجەفیل و خەنە و مێخەك و بنێشت و کووژەکەی دەفرۆشت. هەر دوێنێ بوو... دوێنێ... چما خۆت ناینا‌سی بەگ؟ ئەمن ناتوانم بیکەمە جیرانی مەزراکەی ساری ئۆغلی. سەریشم تێدا بچێ ئەو پەڵەیە بە سەر شانی خۆمەوە نانێم. ناچارم مەکە بەگ. ناچارم مەکە... کارێك مەکە تووشی هەڵەیەکم بکەی. مەهێڵە خوێنی گڵاوی ئەو رۆستەم ئۆغڵییە سەگبابە بڕێژم. ناچارم مەکە بەگ."

بەگ ئەوی باش دەناسی. ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"راست دەکەی زولفەقار. هەقتە زولفەقار. بەڵام چارمان نییە. چیمان لە دەست دێ؟ ئەو بێ شەرەفانە ماڵوێرانیان کردم. ئەوە

بۆ خۆت دەبینی ڕەعیەتەکانیان لە سەر ساجی عەلی دانام. باشە دەکرێ لێ گەڕێین کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی ئاوا بێ دەرگا و پەنجەرە و کاول و سووتاو بمێنێتەوە؟... خەڵك چیمان پێ دەڵێین؟ یانی جنێو بە دایك و ژنمان نادەن؟ دەکرێ و خودا هەڵدەگرێ گوندی برسی بمێننەوە؟ کوڕە بنیادەمی برسی ئیمانی نییە و گوێی لە گەورە و بچووکی نییە. بنیادەمی برسی و ئاغای تازە پێگەیشتوو فەرقیان نییە. یانی مردوو و زیندوومان وەك یەك لێناکەن؟ ناموسمان تالاّن ناکەن؟ باشە لە ڕۆستەم ئۆغڵیت باشتر پێ شك دێ؟ لەومان باشتر دەست دەکەوێ؟ ئەتۆ پێت وایە چییە زولفەقار؟ کوڕە هەموو ئەو ئاغایانە سەر و قوونی یەکن و لە زاری یەك تفیون. دەست لە سەر هەر کامیان دانێی لەوی دی خراپترە. هەر هەموویان توخمێکن. بەڵام مخابن پێویستیمان بە پارەیە. دەنا چما دەمهێشت هەر بۆنیش بە تۆزی خاکەکەمەوە بکەن؟ چما دەمهێشت پێیان بە زەوییەکەمدا بێ؟ بەلاّم چارمان نییە. وانییە زولفەقار؟ یەکێك بنێرە شوێن ڕۆستەم ئۆغڵی با پارەکەی بێنێ و بێ. ئەمڕۆ بەرەو شارۆچکە دەکەوینە ڕێ. دەبێ تا مانگێکی دیکە کۆشکەکەش چاك بکرێتەوە. دەزانی ئەمن زۆر لە شاری هەڵناکەم. دەستم بە داوێنت زولفەقار، پەلەی بکە..."

دەروێش بەگ کە قسەی دەکرد، فرمێسکی لە چاویدا قەتیس مابوو. دەروێش ئەو خدەیەی زولفەقاری باش دەناسی. چەندی لەبەریت دانواندبا، ئەویش ئەوەندەیەی دادەنواند، بەلاّم لێی لێت توند کردبایە، ئەویش توندتر دەبوو.

دەروێش بەگ ئەگەر چەند قسەیەکی دیکەشی کردبا، زولفەقار، ئەو پیاوە زلە دەستی دەکردە گریان.

زۆر جاران بەو جۆرە زولفەقاری وەگریان خستبوو. کەس نەبوو وەك زولفەقار ئەو زەوی و زارەی لە گیانی خۆی خۆشتر بوێ. زولفەقار چاوی بەرایی نەدەدا دەروێش بەگ بە شڵەژاوی و ئالۆزی ببینێ. شادی و خەمی دەروێش بەگ، شادی و خەمی زولفەقاریش بوو.

زولفەقار بە بۆڵەبۆڵ گوتی:"ئەمن ئەو ڕۆستەم ئۆغڵییە نارەسەنە دەکوژم..."

بە تووڕەییەوە لێی دا ڕۆیشت.

دەروێش بەگ دەیزانی هەر ئێستا زولفەقار دەست دەکا بە گریان و لێرەوە ڕاستەڕێ دەچێتەوە ماڵەکەی خۆی و تێر تێر دەگری. ئەوەندە دەگری تا دڵی سووك دەبێ و کە سووك بوو، جار بە ناچاری لە ڕۆستەم ئۆغڵی ڕادەسپێرێ و دیسان چەنەی لەگەڵ لێ دەدا و دیسان دەری دەکاتەوە دەرێ و چەند ڕۆژ دواتر دیسان بانگی دەکاتەوە و ئاخرییەکەی دەستی دەگوشێ

و له دڵی خۆیدا دەڵێ:"ها بیگرە، خێری لێ نەبینی یاخوا." ئەمن ئاخرییەکەی دەتتۆپێنم. ئەتۆ خێر و خۆشی لەو زەوییە نابینی." جا پارەکەی لێ وەردەگرێ.

دەروێش بەگ چەندیش بەپەلە بێ، ئەزموون دەریخستبوو کارەکە هەر وا دەچووە پێشێ و تەواو.

دەروێش بەگیش بە دوای زولفەقاردا لە پلیکانەکان چووە خوارێ و گوتی:"ئەسپەکەم، ئەسپە شەودێزەکەم بۆ بێنە هیدایەت."

رووی لە ژنەکەشی کرد:"ئەنگۆ بە ترۆمبێلەکەی خالۆ هەمزە برۆن، ئەمن بە ئەسپی خۆم دێم."

ئەسپەکەیان تاوێك دواتر بە زینکراوی بۆ هێنا. دەروێش بەگ لێی سوار بوو. ساتێك دوودڵ بوو و ترسێکی رەش لە ناخیدا وەك مار پەپکەی خوارد. لە نێوەڕاستی حەوشەکە هەر وا ماتڵ مایەوە. هێشتا خۆی یەکلا نەکردبووەوە. ئەگەر بە لای سۆیوتلودا بڕوا، لەوێ بۆسەیان بۆ داناوەتەوە... بەلای ساورۆندا، بەلای ئاق تاشدا، لە سەرووی یالینزتووتەوە، لە خوارووی وایوایلییەوە... لە هەرکام لەو رێگایانەدا لەوانەیە خۆیان مات دابێ. ماوەیەك لە ترسان بێ ئۆقرە بوو. ترسەکەی هەر دەهات و پتر دەبوو و لەگەڵ ئەویشدا دڵی پتر بێ ئۆقرە دەبوو.

ئیتر چاوی لێك نا و قەمچییەکی لە ئەسپەکەی دا و جڵەوی بۆ شل کرد. ئەسپەکەی لە چاوترووکانێکا بەرەو خوارووی وایوایلی غاری دا. لە حاڵێکدا سات بە سات چاوەڕێی ئەوە بوو لە پەنا پنچك و بەردێکەوە فیشەکێکی پێوە بنێن، جەستە تا گرتووەکەی خۆی بەو بایە سپارد کە بەهۆی ئەسپ تاودانەکەیەوە وێی دەکەوت و شەودێزەکەشی کە بەغار دەڕۆیی و لەبنیدا رێی دەبڕی، دایە بەر قەمچییان.

# ١٧

"ڕۆستەم ئۆغڵیی سەگبابی خوێڕی، مەگەر تۆ نەبووی بە کەرەکوێرەیەکەوە هەموو ئەو چوکووراوایەت دەتەقاندەوە و بۆ ئەوەی دەرزییەك بفرۆشی، سێ ڕۆژ لەسەر یەك چەقەچەقت دەکرد و هەتا شتێکت بەو خەڵکە هەژار و دەستکورت و بەو ژنە لێقەوماو و گێلە دێهاتییانە بە سێ بەرانبەر و بگرە پێنج بەرانبەر نەفرۆشتبایە، دەستت هەڵنەدەگرت، هەی فێڵبازی ... هەی کەری کەران باب گاو..."

زولفەقار کە هەر وا لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند و دەیگرماند، لێی سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو ماڵەکەی ڕۆستەم ئۆغڵی کەوتە ڕێ.

ڕۆستەم ئۆغڵی کاتێ هاتە چوکووراوا، تەمەنی هەر پازدە ساڵ دەبوو. لە "دارەنە"ی وشك و قاقڕەوە هاتە ئێرە. خەڵکی دارەنە هەر لە کۆنەوە ڕوویان لە وڵاتی غەریبایەتی کردووە. ڕێیان دەکەوتە هەر شوێنێك، وردە کاسبییەکیان وەڕێ دەخست و وردە وردە پەرەیان بە کاروبارەکەیان دەدا و پارەیەکیان وەسەر یەك دەنا. بۆیە چەند دانە لە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئەیالەتی ئاناتۆلی دارەنەیی بوون.

ڕۆستەم ئۆغڵی خۆی ناوی مەمەد بوو. ئەو دواتر ناوی خۆی نا محەمەد زەکی ڕۆستەم ئۆغڵی. ئەو ناوە شان و شکۆیەکی تایبەتی بۆ ئەو هەبوو. کە گوێی لە ناوی ڕۆستەم ئۆغڵی دەبوو، زۆر سەیر لەخۆی ڕازی دەبوو.

ڕۆستەم ئۆغڵی لە پێشدا بوو بە نۆکەری ئاغایەك. بەراتی ساڵانەی مەمەد بیست و سێ لیرە بوو، کە وایان دانا سەری ساڵ بیدەنێ. مەمەد باش دەیزانی چاوی قەت بەو بیست و سێ لیرەیە ناکەوێ، بەڵام دیسانیش هەر وا کاری بۆ ئاغاکەی دەکرد.

مەمەد پێویستیی بە دەسمایەیەك هەبوو و دەشیزانی ئەو سەرمایەیە، بە کارکردن و زەحمەتکێشان دەستەبەر نابیّ. مەمەد تەمەنی پازدە ساڵ بوو و لەو رۆژەوە کە لە سەر مڵکی ئاغاکەی خەریکی کاری خۆی بوو، دەستی کرد بە نوێژکردنیّ. هیچ کات فێری حەمد و سوورە و شایەتمان و دووعا و پاڕانەوە نەبوو و قەتیش نەیویست فێریان بیّ. بەڵام لە ماوەی حەوتووەکدا هەستان و دانیشتنەکانی نوێژکردن وا فێر بوو دەتگوت هەر لە زگی دایکییەوە بە نوێژکەری لە دایك بووە.

نوێژکەرییەکەی زۆری پێنەچوو کاری خۆی کرد. دوای دوو مانگ، ئاغاکەی کردییە سەر کرێکاری پاڵەی لۆکەڕنینەوە. لەمەودوا مەمەد دەبوو چاوی بەسەر کرێکارەکانەوە بیّ، نەکا لۆکەکە پاشقۆل بدەن. ئەو ئەرکە باشترین هەل و دەرفەتی بۆ مەمەد رەخساند. ئەو لە پێشدا کوڕیژگەیەکی زیت و زیرەکی لە نێو کرێکارەکان هەڵخەڵەتاند. دیارە خەڵەتاندن و لاڕێکردنەکەی زۆریش سووك و سانا نەبوو. پێویست بوو چەند شەو و رۆژ لە سەر یەك زمانچەوریی بۆ بکا و لە گوێی بخوێنیّ کە دزینی لۆکە لە دزییەکانی دیکە جوێیە و لە سەر ئەوە هیچ گوناحێکت لەسەر نانووسریّ هەتا کوڕە راهات و بوو، بە هاوکار و هاوڕێی.

شەوێکی تاریك و نووتەك بوو. نەرمە بارانێك دەباری. بارانەکە ئەوەندەی دیکەی شەوەکە تاریکتر کردبوو و چاو چاوی نەدەدی.

دڵی توند لێی دەدا و دەست و پێی دەلەرزین. وای سەر لیّ شێوابوو، کە نەیدەتوانی سەری ئەو جەواڵە رابگریّ، کە کوڕەکە دەیئاخنییەوە، چ بگا بەوەی بە کۆڵیشی دابدات. سەپانەکان لەولاترەوە خەوتبوون. خۆ ئەگەر بەخەبەر هاتبان و دیتبایانن... هەموو شتێك تەنانەت ژیانیشی تێدادەچوو. ئەو فکرەش وەك خۆرکە لە ناخەوە دەیخوارد. بەڵام گەنجەکە هەر مێشێکیشی لیّ میوان نەبوو. مەمەد ئاخرییەکەی هەلینگی لە خۆی دا و جەواڵەکەی بە کۆڵی خۆی دادا، جا بۆ ئەوەی بگاتەوە هاوڕێیەکەی، کە دەمێك بوو لە پەرێزەکە چووبووە دەریّ، بە کۆڵەکەیەوە غاری دا.

کە گەیشتنە قەراغ شارۆچکە، تازە تاو هەڵاتبوو. مەمەد بە هاوکارەکەی خۆی گوت:"ئەتۆ هەر لێرە چاوەڕێم بە تا سەرێکی نێو شاری بدەم و کڕیارێك بدۆزمەوە لۆکەکەی پیّ بفرۆشم. چونکە بێت و هەر بە جەواڵەکەوە بچێنە نێو شاری، لەوانەیە بمانگرن."

دوای سەعاتێك، بە کەرێکەوە لە شارۆچکەوە گەڕایەوە بۆ لای شیوەکە. ئەو دەبوو لۆکە دزێتییەکە هەر لێرە لەوان وەربگریّ و خۆی جۆرێك بیباتەوە شارکەس لێی نەکەوێتە گومانەوە.

مەمەد لەمەودوا هەموو شەوێ پێنج فەردەی گەورەی لۆکە لەگەڵ هاودەستەکەی دەبردە دارستانێکی نزیك ئەوێ و کڕیارەکەش بە عارەبانەوە دەهات و لۆکەکەی دەبردە شاری.

کە وەرزی لۆکە رنینەوە کۆتایی هات، مەمەد پارەیەکی باشی کۆ کردبۆوە. چووە لای ئاغاکەی و گوتی:"ئاغا، ئەمن ئیتر تاقەتی ئەو مێش و مەگەزەم نەماوە. سەری تۆ سلامەت بێ و بێ وەی بی ئاغا. ئەمن ئیتر دەمەوێ لێرە بڕۆم. پێنج مانگ لە ماڵەکەت کارم کردووە. هەزار جاران ماڵت ئاوەدان بێ. ئەگەر ویستت هەق و بەراتەکەمم بدەیتێ ماڵت ئاوا، ئەگەر نەشتدامێ مەیدە. ئەمن دەبێ بڕۆم."

ئاغا پێی ناخۆش بوو. زۆر باش ئاگای لە لۆکەکەی ببوو. پیاوێکی ئاوای کە سەری چووبا نوێژی نەدەچوو، لەکوێ دەست دەکەوت؟ زۆری هەوڵ دا نەڕوات، بەڵام مەمەد بڕیاری خۆی دابوو. ئاغاش پازدە لیرەی لە بری کاری ئەو پێنج مانگەی پێ دابوو و مەمەد دەستی ئاغاکەی ماچ کرد و داوای گەردن ئازابیشی لێ کرد و لەوێوە راستەڕێ چوو بۆ ئەدەنە. لە ئەدەنە بە شوێن دووکانێکی دارەنەییدا گەڕا و پێشانیان دا. دووکاندارەکە کابرایەکی سمێڵ بابڕی زەردەڵە بوو. سمێڵی سپی سپی بوو.

سەرمایەکەی خۆی نیشانی کابرای دووکاندار دا و گوتی دەیەوێ خەریکی چ کارێك بێ. کابرای لای خۆیان گوتی:"زۆر ئاسانە. هەموو شتێك سەر دەگرێ."

جاشکە کەرێکی تۆکمە و پەل ئەستووری بۆ کڕی و دارتاشیان راسپارد و جووتێك سندووقی بۆ دروست کرد. دوای ئەوە سندووقەکانیان پڕ کرد لە وردەواڵەی جۆراوجۆر. گیرفانی مەمەد ئەوەندەی پارە تێدا نەمابوو بتوانێ کەرێکی دیکەش تەیار بکا. ئیتر مەمەد بەرەو گوندان وەڕێ کەوت. لە هەر جێیەك چاوی بە کۆمەڵێك خەڵك بکەوتایە، کاتی بوایە یان نا، بەرماڵەکەی رادەخست و نوێژەکەی دادەبەست.

بەبێ ئەوەی گوێ بداتە باران و بەفر و گلێرە و تەرزە و تۆفان، سەرانسەری ئەو چوکووراوایەی گوند بە گوند دەتەقاند و دەگەیشتێ هەر جێیەك نوێژەکەی دادەبەست.

دوای کردنەوەی دووکانێك لە شاری، بۆ ماوەی حەوتووەك سەردانی دارەنەی کرد و ژنی هێنا و ژنەکەی هەر لەوێ بەجێ هێشت و گەڕایەوە شاری. دووکانەکەی لە هەموو دووکانی شار پڕ مشتەریتر بوو. لە بەر ئەوەی هەموو گوندییەکان دەیانناسی و باوەڕیان پێی هەبوو، زۆر زوو کارەکەی برەوی گرت و بەسەریدا باری.

وای لیّ هات بازاڕ کەوتە گرانی. خەڵکە بە ئەزموونەکەی لای خۆیان ئاگاداریان کردەوە کە"ئەوەندەی پێت دەکریّ، کەلوپەل و کالاّ لە هەمار بکە." ئەویش ئامۆژگاریی خەڵکەکەی لە گویّ گرت و زۆر زوو پشتی خۆی قایم کرد و لە ماوەی چەند ساڵێکدا سەرمایەکەی دە پازدە ئەوەندەی هاتە سەر. لە ئەدەنەش دووکانێکی کردەوە. لەو ماوەیەدا، ژنەکەی لە زێدەکەی، سیّ کچی بوو. دوای ئەوەی دووکانەکەی لە ئەدەنە کردەوە، بۆ حەوتوویەك سەرێکی لای ژنەکەی دایەوە.

دوایی، وەك دەڵێن، خودا محەمەد زەکی رۆستم ئۆغڵیی بەسەر کردەوە. ژنەکانی بوونە چوار و کچەکانیشی یازدە کچ.... لەو ماوەیەدا محەمەد زەکی رۆستەم ئۆغڵی دەستی بەسەر مەزرای ئەرمەنییەك داگرت لە نزیك حاجیلاری ئاناوەرزا، کە هەزرا دۆنم دەبوو. قەباڵەی بۆ دەرهێنا و ئەوەش پانزە لیرەی تێچوو. هەر لەو سەروبەندەدا بوو، کە خەیاڵی دامەزراندنی کارخانەیەکی کەوتبووە سەری. بەڵام بەر لەوە دەبوو زەوییەکانی هەراوتر بکاتەوە. ئەگەر هەر شتێك بناغەیەکی هەبیّ، ئەوا بناغەی سەرمایە، زەوی و زارە. کارخانە و دووکان لەوانەبوو رووداوی سەیر و سەمەرەیان بەسەردا بیّ، بەڵام عەرز، هەر لە سەر جێی خۆی دەمایەوە. ئەگەر گرنگی و بایەخی پیّ درابایە، بە دڵنیاییەوە زیاتر و هەراوتر دەبووەوە. هەتا ئەو مرۆڤانە ئاوا گەوج و کەر بن، زەوی لە کارخانە زووتر پەرە دەگریّ. هەر کەس زەویی هەبیّ، پشت قایمتر و باوەڕبەخۆتر دەبیّ. چێژی باوەڕبەخۆبوونێکی کە هیچ کات نەیچێشتبوو، ئەو کاتە چێشتی، کە بوو بە خاوەنی زەوی. هیچ شتێك هێندەی زەوی بنیادەم دڵنیا و پشت ئەستوور ناکا. تاسە و ئەشقی زەویی کەوتە سەری. چاوی بە هیچ تێر نەدەبوو. بنیادەم تا زەویی پتر هەبیّ، پتریش لە نهێنیی خۆشەویستی و نهێنیی هیوا و عەشق و جوانی تێدەگا. هەر هەموو ئەو هەست و ئیحساسانە شتێك بوون کە ئەو یان نەیدەناسین یا گوێی نەدەدانیّ. لە بازرگانیدا جگە لە پارە ناتوانی هیچ شتێکی دیکەت خۆش بویّ. چونکە لێرە هیچ شتێك نامێنێتەوە و هەموو شت تێپەڕ دەبیّ. یارییەکی پیس و چەپەڵە. بەڵام زەوی نەمرە، زیندووە، بیّ مەرگە. جا رۆستەم ئۆغڵی رووی کردە زەوی و زار. ئێستاش ئەوە چاوی بڕیوەتە زەوییەکانی دەروێش بەگ.

"ئەو پیاوە بیّ مێشکە، خاك و زەویی لە بن پێیانییەوە دەخزیّ و دەردەچیّ. زۆر نابا چیی زەوی هەیەتی پێی نامێنیّ و لە دەستی دەدا. کوڕە لێگەڕیّ با بکەوێتە دەستی یەکێکی وەك من کە باش نرخ و قەدری زەوی دەزانیّ و گیانی خۆی بە قوربانی بستۆکەیەکی دەکات."

جا ئەوجار نۆرەی ئاقچاساز بوو. ئەو زۆنگاوەی کەوتبووە نێو دڵی چوکووراوەوە، ئاخری رۆژێك هەر وشکی دەکرد. دەورودووکان دەگۆڕدریّ و زۆنگاوەکەی ئاقچاسازیش هەر دەبیّ بگۆڕیّ. ئەو هەزاران دۆنم زەوییە بە پیتە... دەبوو تا درەنگ نەبووە جیّ پێیەکی تێدا

بکەیتەوە. پیاوی ژیر و ئاقڵ ئەوەیە حیسابی داهاتوو بکا. رۆستەم ئۆغڵی وەك بەری دەستی خۆی داهاتووی ئاقچاسازی دەدی و خۆی بۆ لە دەسك نابوو، بیهێنێتە بەر نیری خۆی.

هەر ئەوەندە بەس بوو لە لێوار و بەستێنەکەی ئاقچاساز پێنج سەد دۆنمێکت زەوی هەبێ و دوای دە ساڵان وتەنانەت کەمتریش ببیتە خاوەنی پێنج تا دە هەزار دۆنم زەوی. لە رۆژهەڵاتەوە تا باشوور هەر هەمووی زەویی دەروێش بەگ بوو.

ئەو چوار دیوارییەی بە درێژایی سەد و پەنجا مەتر لە سەر زەوییەکی هێندەی مەترێك بەرزی نێو کێڵگەکاندا، بە قامیش و هەڵاش دروست کرابوو و هیچ پەنجەرەیەکیشی تێدا نەبوو، خانووەکەی رۆستەم ئۆغڵی بوو. پانزە مەتر لەولای باشووری ئەو بینایەوە، کەپرێکی بچووکیشی لێ بوو کە لە قامیش و سێ سووەکانییەوە دیار بوو تازە هەڵبەستراوە. دار بییەکیش سەرنجی پیاوی رادەکێشا.

"رۆستەم ئۆغڵی، رۆستەم ئۆغڵی."

رۆستەم ئۆغڵی دەسبەجێ هاتە دەرێ. کۆنە پانتۆڵێکی رەنگ پێوەنەماوی لە پێ و چاکەتێکی تیتۆڵ تیتۆڵ و پێنەکراوی لەبەردا بوو. پێخاوس بوو و تەپڵی کڵاوە فیچاوەکەشی کون بوو. چاوە رەشەکانی لە کاسەی سەریدا هەڵبەزدابەزیان بوو. دەموچاوی بچووك و سەلکی زل بوو. تۆزێکیش کوورِ ببووەوە. ردێنە ماش و برینجییەکەی هێندەی پەنجەیەك هاتبوو. نێوچاوانی، ملی و دەوروبەری چاوەکانی پڕ بوو لە چرچ و لۆچ.

"بەخێرهاتی زولفەقار بەگ، برالە فەرموو. بەخێر بێی، خێر و بەرەکەتت هێنا و گەورەت کردم. بەسەرت کردمەوە. گەورەت کردم و تاجی پادشایەتیت لە سەر نام. ئەمشەوە تا بەیانی خەونم پێوە دیتووی."

بە دەستێك هەوساری ئەسپەکەی و بە دەستەکەی دیکەی رکێفەکەی بۆ گرت و دیسان گوتی:"فەرموو دابەزە. گەورەمان بکە میوانی ئازیز. پێڵاوت لە سەر سەر و چاو... فەرموو بەشکم پێی موبارەکت خێر و بەرەکەت بە زەوی و زارەکەم ببەخشێ..."

زولفەقار دابەزی. رۆستەم ئۆغڵی هەوساری ئەسپەکەی کێشا و دەسبەجێ گەڕایەوە نێو کەپرەکەی. حەسیرێکی هێنا و لە بەر پەرژینەکەوە رایخست و دەستی کردەوە بە زمانچەوری. "فەرموو دانیشە سۆمای چاوانم. چ بکەم هێشتا نەمتوانیوە کاروباری مەزراکەم رێك خەم. ماڵ و منداڵ نایانەوێ بێنە ئێرە. تەپۆ و مێشی مالاریا ئێرەی کردووەتە جەحەندەم.

کاکە لای خۆمان کوێستانە. ماڵ و منداڵ ناتوانن لێرە بژیێن. خۆ راناگرن. بەڵام دەبێ هەرچۆنێك بێ لەگەڵی رابێین چاوەکەم، زولفەقار بەگ. بیستوومە ئەنگۆش خەڵکی کوێستانە دوورەکانن. بیستوومە زۆریش رەسەنزادە و نەجیمزادەی. بیستوومە چەپگەڕی گەردوون گەڕی پێ کردوون. بیستوومە بەگێکی رەسەن و بەرو پشت ئەتڵەس بوون وەك هەڵۆ... ئای فەلەك..."

زولفەقار لەوە پتر خۆی رانەگرت و لەگەڵ ئاخێکی قووڵدا کەوتە قسە:"هێشتا بابم مابوو... سی و پێنج، بەڵێ، ئەویش یەك دووانێك نا، بەڵکو سی و پێنج یەڵخچیمان ئەسپ هەبوو. سەرانسەری قەفقاز لە بن نیری ئێمەدا بوو. ئاخ، ئاخ.... ئێستاش.... سەرانسەری قەفقاز گوێڕایەڵی ئەمری ئێمە بوو.... بابی من...."

تنۆکە فرمێسکێك لە چاوە وردیلەکانیدا قەتیس ما.

رۆستەم ئۆغڵی هەر ئەوەی دی، چووە نێو قسەکانییەوە:"رەچەڵەکی رەسەن قەت ون نابێ. گیا لە سەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە. خۆ ئەتۆ نەبای دەروێش بەگ لە سەر ساجی عەلی دادەنیشت. هەموو ئەو چوکووراوایە بە جوامێر و پیاوی پیاوانت دەناسن. باشە ئەو ناوبانگە بە نەسیبی هەموو کەسێك دەبێ؟ دوێ شەو لە خەوێمدا بوو ئاوێکی سپی سپی دەڕۆیشت. پیاوێکی کەڵەگەت، بازێکی لە سەر شانی نیشتبوو، بە سواری ئەسپێکی شێ کە هەموو گیانی دەترووسکایەوە، لە سەرووی ئاوە سپییەکەوە دەهات. ئەو دەهاتە پێشێ و ئاوەکەش شان بە شانی دەهات. هاتن و هاتن و سوارەکە و ئاوەکە لە بەر دەرگای ماڵەکەی من راوەستان. سوارەکە دابەزی و ئاوەکەش لە بەر دەرگای ماڵەکەمان کۆ بووەوە و کەفی کرد و وەك کێوێك هەستا... ئەوە دەبێ نیشانەی چی بێ؟ نیشانەی بەرەکەتە. نیشانەی ئەوەیە کە پیاوێکی رەسەنزادە و گەورە خێر و بەرەکەت و فەرعانە لەگەڵ خۆی بە دیاری دێنێ. ئەمنیش هەر لە بەیانییەوە لاقێکم لە دەرێ بووە و یەك لە ژوورەوە و چاوم لەو رێگەیە دەبڕێ تا بزانم ئەوە کێیە دێ و خێر و بەرەکەتمان بەسەردا دەبارێنێ، کە لە نەکاو دیتم جەنابت گەورەت کردین. کە چاوم پێت کەوت، ئەوەندە شاد و بە کەیف بووم وەخت بوو باڵ بگرم و بفڕم. دەی دەنگ و باس چییە؟ ئیشەڵڵا خەبەری خۆشت پێیە. چما دەکرێ پیاوی باش خەبەری خۆشی پێ نەبێ؟ دیارە خەبەرێکی دڵخۆشکەرت بۆ هێناوم، وا نییە؟ بە دڵمدا هاتووە بەگ رازیی بووە، وایە؟ کوڕە ئەمن جیرانێکی باش دەبم، وا نییە؟

ڕۆستەم ئۆغڵی پیاوێکی کورتەباڵای مردەلۆخە بوو. ڕوومەتەکانی قوپیبوون. لە نووکی پێی زولفەقارەوە بۆ تەپڵی سەری لێی ورد دەبووووەوە و دەتگوت لە کێوێك دەڕوانێ.

زولفەقار پشووی نێو سییەکانی دەردایە دەرەوە و گوتی:"چیت عەرز بکەم. ئەمن کە تا ئێستا لە تاریف و پەسنی تۆ زیاتر هیچم نەبیستووە. سەیر کە ڕۆستەم ئۆغڵی، ئەگەر ڕاستیت دەوێ، بەگ دەیەوێ زەوییەکەت پێ بفرۆشێ، بەڵام ئەگەر لەمن دەپرسی، دەڵێم نەکا بیکڕی. چونکە ئەمن ئەو ئاغایانە باش دەناسم. لە پێشدا زەوییەکە دەفرۆشن و دوایی فێڵێك دەدۆزنەوە ئەو سەری دیار نەبێ. خۆ خەلیلت لە بیر ماوە؟ خەلیل تەرسووسی دەڵێم. دەبێ ناویت بیستبێ. هەر ئەو خەلیلەی وا دەروێش بەگ زەوییەکەی پێ فرۆشتبوو..."

ڕۆستەم ئۆغڵی لە بن لێوانەوە گوتی:"بیستوومە، بەڵێ بیستوومە، بەڵام...."

"ئەگەر بیستبێتت، کەوابوو دیارە دەشزانی بەگ دووهەزار دۆنم زەویی پێ فرۆشت و ئەویش دەست بە دەست پارەکەی دایە بەگ. بەڵام شەوی ڕۆژ نەکردەوە. بەڵێ، ڕۆژێك دوای ئەوەی سەوداکەیان سەری گرت، بە مردوویی لە ماڵەکەیدا دۆزییانەوە. گۆشاوگۆش سەریان بڕیبوو. ئەستەغفیرۆڵڵا خۆ ئەمن ناڵێم بە ئەمری بەگ کوشتیان. ناتوانم شتی وا بڵێم، بەڵام دەکرێ ئەوە بڵێم کە زەوی و زاری بەگ شومی خراپە و بێ فەڕە. لەوانەیە بپرسی ئەی ئەنگۆ چۆن هەڵدەکەن... ئێمە خوومان پێوە گرتووە. ئەوجار لەو ئاقچاسازەدا هەژدیهایەکی تێدایە کە قەبووڵ ناکا هیچ بێگانەیەك پێ بنێتە بەستێنەکانی ئەوێ و دەمودەست هەڵیدەلووشێ."

ڕۆستەم ئۆغڵی تفی زاری قووت دایەوە و بە دەنگێکی دڵنیاوە گوتی:"ئەتۆ خەمی منت نەبێ. زەوی و زاری بێفەڕ، هەر من پێی تێ نێم، خێر و بەرەکەتی تێدەزێ و ئیتر تارمایی و دۆڵپاکانیش نایەنەوە ئەوێ. هەر لە کۆنیشەوە زۆریان باسی حەزیاکەی ئاقچاساز کردووە و هەر هەمووی فشەیە. بیبینە و بڕوا مەکە. ئەوە دامنا حەزیایەکی ئاواشی لێ بێ، ئەمن نووشتەیەکم هەیە کار لە بەردیش دەکا.. ئەگەر ئەو نوشتەیە لە بەستێن و لێواری ئاقچاسازدا لە بن گڵ بنێم، حەزیاکە لە زۆنگاوەکە دەچەقێ و ئیتر ناتوانێ بێتەوە دەرێ و دەمرێ."

"کەوابوو دیارە پێت چەقاندووە و سووری لە سەر ئەوەی بە هەر نرخێکی بێ ئەو زەوییە بکڕی... هیچ ناشترسی، وایە؟"

"نا، ناترسم. دەروێش بەگ کاری بەسەر منەوە نییە و ئیزن بە کەسیش نادا، خراپ سەیری مڵکی من بکەن. ئەو پیاوێکی ڕەسەن و نەجیمە. حەزیشی لێیە پیاوێکی وەك من دراوسێی بێ..."

"کەوابوو زەوییەکە دەکڕی، وایە؟ ئەمن ئەوە پێم گوتی. زۆرم بەزەیی پێتدا دێ. بەڵام بڵێم چی ئەو خۆڵە خۆت بەسەر خۆتیدا دەکەی. کەیفی خۆتە."

زولفەقار چیی لە دەستی هات کردی بۆ ئەوەی پاشگەزی بکاتەوە و زۆری چەنە لێدا و زمانی بە مەلاشوویەوە نووسا. بۆ ئەوەی ئەو خەیاڵە لە مێشکی ڕۆستەم بەگ دەرباوێ، چیی لە دەستی هات کردی. جا ئاخرییەکەی، کاتێ قسەی نەچەقی، دەستی کرد بە پاڕانەوە. بەڵام ڕۆستەم ئۆغڵی وەك سۆنە، تەڕ نەبوو و پاشگەز نەبووەوە. ئەوەی دەیگوت هەر ئەوە بوو.

زولفەقار کە تێداما، تەگبیرێکی دیکەی کرد. بێ و نەبێ ئەو پیاوە چەقاوەسووە، کە ئەوەندە پێداگربوو لەسەر کڕینی ئەو زەوییانە، شتێکی لەبن سەری دا بوو. دەبوو بچێتە بنج و بناوانییەوە و بزانێ بۆ ئەوەندە سوورە.

"بەگ قسەکەی گۆڕیوە. تەنیا سێسەد دۆنم دەفرۆشێ. ئەو سێسەد دۆنمەش بە هەژدە هەزار لیرە دەدا، ئەگینا سەر ناگرێ و بەگ زەوییەکە بە یەکێکی دیکە دەفرۆشێ. زەویی وا بەپیت و بەرەکەت لە هیچ کوێ وەگیر ناکەوێ. هەر بستێکی کوڕێکی شیرین دێنێ."

شەویلگەی لە لێدان کەوت. دەی چەنە لێدە ئاخری بە شتێك دەگەی. زۆری هێنا و برد. شەو و ڕۆژێك هەر لە سەری ڕۆیشت. یەکتریان هێنا و برد و نەڕاندیان و بەسەریەکدا گوڕاندیان و چیی خراپ بوو بە یەکتریان گوت. زولفەقار لە هەژدەهەزار لیرەکەی خۆی، یەك لیرەشی دانەشکاند. لە ڕاستیدا پەشیمان بوو، کە گوتبووی هەژدەهەزار لیرە. چونکە بۆی دەرکەوتبوو دەتوانێ بە کەیفی خۆی بۆ ئەو زەوییانە پارە لە ڕۆستەم ئۆغڵی دەرکێشێ.

بەرەبەری بەیانی، ئیتر هیچکامیان زمانیان نەدەگەڕا و قسەیان پێ نەدەکرا. ڕۆستەم ئۆغڵی ئاخرییەکەی دەستی برد و گوتی:"دەی باشە قەبووڵم کرد. قسەی تۆ ناشکێنم. وەرن تا زووە قەباڵەکەیم بە ناو بکەن. ئەمن بەیانی دەچمە شارۆچکە. پارەکەش دەبەم."

زولفەقار کەڕەی بەیانی، ماندوو شەکەت وەك نیوەزیندووان، سواری ئەسپەکەی بوو. سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ ببووەوە و گریان ئەوکی گرتبوو و خەریك بوو بخنکێ. دەریایەکی ئاڵۆز و هەڵچوو لە ناخیدا شەپۆلی دەدا. زاری وەك ژاری مار وابوو. سەری لەگێژەوە دەهات. دڵی

خەریك بوو بتەقیٚ. ئەو دەمەی چەند ساڵ لەمەوبەر چووبووە سەر مەیتی کوڕە هەژدە ساڵانەکەی، ئەو دەمیش وەك ئێستای بەسەر هاتبوو. تاوێك گریان ئەوکی بەردا و وەك منداڵێك زۆر زۆر گریا و فرمێسك بە دەموچاوە پانەکەیدا شۆلاوگەی بەست. هەر کاتێك پارچەیەك لە زەوییەکان دەفرۆشرا، ئاوای لیٚ دەهات.

"هەر جۆرێکی بووە، بەگ رۆژێك لە رۆژان زەوییەکانی لە چنگی ئەو رۆستەم ئۆغڵییە بەرەڵڵایە دەردێنێتەوە."

هەر دەتگوت ئیمانی بەوەیە کە وا دەبیٚ، ئاواش سوکنایی نەدەهات و هەتا گەیشتەوە ئاوەدانی، بە خوڕ فرمێسکی لە چاوانی دەڕژا و بە پانایی دەموچاویدا لووزەوی دەبەست.

# ١٨

بله ئیبۆ ئۆقرەی لیٚ هەڵگیرابوو و خوێن بەری چاوانی گرتبوو و دەماری لا ملی وەك کاریتە هەستابوون و بە توورەییەکی وەگیانهاتووانەوە نەڕاندی:"نا بەگ، نا. خزیوەتە نێو ماڵەکەیەوە و نایەتە دەریٚ. ئەوە سیٚ رۆژە ئاوی چاوم چووە. هەر دەڵێی چووەتە خەڵوەتەوە. نە دێتە کۆلاّن و نە دەچتە بازاڕیٚ. چوار نەفەریش لە بەر دەرگاکەی کێشك دەکێشن. لەو سیٚ رۆژەدا، جگە لە یاغمور ئاغای چەرکەز کەسی دیکە نەچووەتە نێو ماڵەکەیەوە. ئەمن چیم پیٚ لەو پیاوە دەکریٚ؟ هەر چاوەڕیٚ بە بەڵیٚ ئەوە کابرا لە ماڵەکەی دێتە دەریٚ. ئەوەندە چاوەڕان بە هەتا وەك دار لە جێی خۆت شین دەبییەوە."

مستەفا رەنگی بە روخسارییەوە نەما و بە دەم جووینی گۆشەی سمێڵەکەیەوە، داڵغەی لێدا:"حەزم لیٚ بوو لە ماڵەکەی شاریشی دەرپەڕێنم و وای لیٚ بکەم روو لە شاخ و چیاکان بکا...دەمەویٚ وای لیٚ بکەم.... دەرپەڕاندنی لە ئاوەدانی شتێکە و کێشانەدەرێی لە شار شتێکی دیکەیە. دەبیٚ تەگبیرێکی لیٚ بکەین. دەبیٚ رێگەیەکی بۆ بدۆزینەوە. هەر چۆنێك بووە دەبیٚ ناچاری بکەین روو بکاتە شاخ و کێو. ئەو کات جا رۆژنامەکانی دنیا چ دەنووسن؟ جا لە چیاش..."

مستەفا ئاق یۆللی" تاوێك چاوی لێك نا و لێوەکانی و پەڕەی لووتی لەرینەوە. هەزاران دەرزی لە پشتی رۆچووبوون و نووکی دەرزییەکان دەبریسکانەوە. لە بەر تاوەکە هەڵدەقرچا. پەتێکی لە ملی کردبوو و لە ئەسپەکەی بەستبوو... و خۆشی سواری ئەسپەکەی. هەیها.... ئەسپەکەی دابووە بەر قەمچی. دەروێش زمانی دەرکێشابوو... دەیهانکاند....

"نا، نا، نامەویٚ بە فیشەکێك بکوژریٚ کە لە پەناوە پێوەی دەنریٚ. دەیگرم. بە دەستی خۆم... بە چەند رۆژان... بە ئەشکەنجەیەك گیانی لیٚ دەستێنم لەوەتەی دنیا هەیە و مرۆڤ

هەبووە، کەی ئاوا زەڕە زەڕ گیانی لێ نەستێنرابێ. هەر بۆیە دەبێ تەگبیرێکی لێ بکەین بزانین چۆن لە شاری دەرییەڕێنین. دەبێ مشووری بخۆین. چەند رۆژ لە شاری دەمێنێتەوە؟"

بلە ئیبۆ:"خەریکن کۆشکەکەی بۆ چاك دەکەنەوە. دەڵێن بە مانگێك مانگ و نیوێك کاری تەواو دەبێ. دەروێش بەو زووانە دیسان زەویی فرۆشتووە. بە رۆستەم ئۆغلی... پارەی داوەتە ئەو کەسانەش کە زەوی و زارەکەیان سووتێنرابوو. پارەی بە سەر گوندییەکانیدا دابەشیوە."

ئاق یۆللی" لە بن لێوانەوە بۆلاندی:"مخابن... ئاااخ، مخابن..."

قسەکەی قووت دایەوە و دوای ئەوەی پشوویەکی دەردا گوتی:"دەبێ شەوێك بیگرم و بیبەمە ئالاداغ. وا نییە بلە ئیبۆ؟"

بلە ئیبۆ دەسبەجێ خۆی کۆ کردەوە:"بەڵێ بەگ. دەبێ بیبەین."

ئالاداغ چیای ئێمە نییە. کەس شکی بۆ ئەوە ناچێ ئێمە دەروێش بەگ، ئەو کافرەمان بردبێتە ئەوێ."

بلە ئیبۆ وەك ئەوەی لە شتێکدا نوقم بووبێ، راچڵەکی و لە زاری دەرپەڕی:"هیچ کەس نازانێ لەوێ...."

حەمدی بنیادەمێکی وردیلە و تاوەسووت بوو. کۆنە یاخییەکی خاراو. ئەویان بە ناوی "قرق ئایغ"ی قەساب کردبوو کە سەردەستەی یاخییەکان بوو.

حەمدی بە سەر پێوە راوەستابوو. خۆی وێك هێنا و لێوەکانی لستنەوە:"لەوێ... ئەو کات... دەڵێم: وەرە بزانین دەروێش ئەفەنی. وەرە، وەرە، وەرە.... وەرە پێشتر مەترسە گیانەکەم. وەرە سۆمای چاوم. مەترسە، مەترسە. وەرە، هەی چەردواوڕوو، هەی دۆم و قەرەج... مەترسە..."

ئیتر چوونە بن دارە چڕەکان و هەر کامە و پاڵی بە دارێکەوە دا و دانیشت.

"وەرە گیانەکەم، وەرە ئازیزەکەم، برالە وەرە... ئەوە بۆ رەنگت بە رووەوە نەما؟ مەپاڕێوە. پاڕانەوە بێ پاڕانەوە. سەیر کە، ئەمن زۆر دڵ ناسکم. خۆ راناگرم، هاکا دیتت بەرەو پشت کەوتم..."

جۆرێکی قسە دەکرد دەتگوت ئەوە دەروێش بەرانبەری راوەستاوە و دەکرووزێتەوەو دەپاڕێتەوە.

"هاتی، وانییە؟ کارێکی باشت کرد هاتی. نەتویست ئەمن زەحمەت بکێشم. بارەکەڵڵا... جا ئێستا شمەکەکانت داکەنە، دایانکەنە بزانم. ئیتر بیبڕەوە. بۆ ئەوەندەی دەگنخێنی؟ شەرم

دەکەی؟ نا بابە گیان شەرمی ناوێ. دەی خێراکە. ماتڵم مەکە... چما تا ئێستا قەت رووت نەبوویەتەوە؟ دەی بیبڕەوە. خەریکە وەڕەزم دەکەی ها. گوتم خۆت رووت بکەرەوە تووتکە سەگ. ئیتر ئاغایەتی لێرە بەکارت نایە. دایناکەنی، ها؟ دەی باشە... کەوابوو بگرە..."

مەستان، قاقایەکی کێشا و گوتی:"ئەوەش پەردەیەکی نوێیە. جا ئێستا با بزانین ئەو جووچکەیە چیی لێ دەکا. خۆ ئەو کافرە هەر نایەوێ رووت بێتەوە..."

حەمدی قیت راوەستا و دەستی پێکردەوە:"باشە. با رووت نەبێتەوە. شمەکەکانی داناکەنێ؟ با داینەکەنێ. باشتر... دەبەیەك دۆشاو هەڵدەگرم. دۆشاوێکی روون... لە تەپڵی سەرییەوە پێیدا دەکەم تا سەری نینۆکەکانی.... لە هەموو گیانی هەڵدەسووم. ئەوجار دەرگای پلوورە هەنگەکانی بۆ دەکەمەوە. مێشەکان تێی دەهاڵێن. مێشی چیاکانی دیکە هەر باسی مەکە. یاخوا موسوڵمان نەیبیستێ و کافر نەیبینێ. ئەوانیش بە سەر و پێیانییەوە دەنووسێن. وەك ئەو لکەی مێشەکان لە وەرزی جووتبوونیاندا وەك هێشوو لە سەری دەنیشنەوە. کۆمەڵ کۆمەڵ بە جموجۆڵ. دەست دەکا بە راکردن. رادەکا و لەشکرێك مێشی بە دواوە... را دەکا و مێش وەدووی دەکەون. دۆشاوەکە پێیدا دەچۆڕێتەوە. مێش بەردەبنەوە... ئەو جار مێشی کەندوویەك، پێنج کەندووی تێبەر دەدەم...."

ئاق یۆللی" هاتە نێو قسەکانییەوە:"ئاوا نابێ حەمدی، ئەگەر بۆ ئەوەی دەردەپەڕێنین ئاوای بەسەر بێنین، وا باشترە هەر دەرینەپەڕێنین. هەر وا باشترە بە قوربانی فیشەکێکی بکەین."

حەمدی پرسی:"زۆر خراپ بوو؟ تا ئێستا نەتدیتووە مێش چ بەڵایەك بە سەر بنیادەم دێنن؟ خراپ تێمەگە بەگ، ئەوانە مێشەنگوین نین... زەرگەتەی خورماین."

مەستان پشتی قسەکەی ئاق یۆللی"ی گرت و گوتی:"نابێ. ئەوە ئیتر نەبوو. بایی ئەوەندە نییە و شیاوی ئەوە نییە بۆ ئەشکەنجەیەك بیبەینە لووتکەی تۆرووس. جا کەوابوو باشتر وایە بیکەین بە قوربانی گوللەیەك. بەگ، ئەمنیش پێم وایە دەبێ بیگرین. ئەو کات بە دەستی خۆم رووتی دەکەمەوە. لە سەر عەرزەکە دایدەنیشێنم و پاڵی بە دارێکەوە دەدەم. جا بە پەتێك لە دارەکەی شەتەك دەدەم. جا کە توند توند چۆڵەپێچم کرد... دەست دەدەمە کێردێك و لە پێشدا نێوەڕاستی پەنجەکانی پێی هەڵدەدڕم. دوایی بەلەکی لاقی و ئەوجار وردە وردە رانەکانی هەڵدەدڕم. لە نێوقەدی بۆ خوارەوە قەڵێش قەڵێش دەکەم. لایەکی پڕ دەکەم لە خوێ و لایەکەی دیکەی لە هەنگوین. لایەکی مێش تێی دەئاڵێن و لایەکەی دیکەی مێش. لە لایەکیشەوە هەلا هەلا دەبێ و توێ توێ دەبێ. مێشەکان هەنگوینەکە و مێرووڵە زەردەکان گۆشتەکەی ورد ورد

دەخۆن. جا مێش وا وەخوروو دەخەن هیچ بنیادەمێك خۆی لە بەر شتی وا راناگرێ. مێشەکانیش وای پێوە دەدەن، هەر پەنا بە خودا، پەنا بە خودای. هەتا دەمرێ، مێش هەر بە بەرچاوی خۆیەوە دەیخۆن و تەواوی دەکەن..."

ئاق یۆللی" سەرێکی لەقاند و گوتی: ئەوەیان باشترە. ئەوەیان باشترە. لە هیچ کتێبێکدا شتی وام نەخوێندبووەوە. ئەوە باشترە..."

مەستان گوتی:"لە داخان و لە تووڕەییان ساتێك ئۆقرە و ئارامم نییە و خەوم لێ ناکەوێ. هەر بیر لەوە دەکەمەوە، کە ئاخۆ دوای گرتنەکەی دەکرێ چیی لێ بکەین؟ گاڵتەی پێ نارۆێ. ئەو هەر ئەو زاڵمەیە کە جوامێرێکی وەك مورتەزا ئاغای ناردە بن خاکی رەشەوە. تەنانەت ئەوەندەش کەمە."

حەمدی کە زۆر پیس بۆر ببوو، قسەکەی لە زاری مەستان وەرگرتەوە و گوتی:"ئەمن دەڵێی خەو دەمباتەوە. پێت وایە ئەمن بیر لە زەجرکوژکردنی بکوژی مورتەزا بەگی ئازیزمان ناکەمەوە؟ تەنانەت بیرم لەوەش کردبووەوە کە ئەگەر جلوبەرگەکانی دانەکەند چیی لێ بکەم."

ئاق یۆللی" هاتە نێو قسەکانییەوە:"خەمت نەبێ حەمدی. نوقلانەی خراپ لێ مەدە. راوەستە با جارێ بیگرم، دوای ئەوە باشترین رێگە دەدۆزمەوە."

رەجەبیش بۆ ئەوەی لەوانی دیکە بەجێ نەمابێ، گوتی:"با لەپێشدا بیگرین، ئەو رێیەی بە مێشکی مندا هاتووە، نە لە کتێباندا نووسراوە و نە بە ئەقڵی کەسیشدا هاتووە. با لەپێشدا بیگرین..."

مەستان:"دا بڵێ رەجەب، بڵێ بزانم، زۆرم حەز لێی بیبیستم... دەی بیڵێ دەی."

هەکۆ گوتی:"با لە پێشدا بیگرین. ئەمنیش شتی سەیرم بە مێشکیدا هاتووە."

ئاق یۆللی":"رەجەب هیچ باسی ئەو شتە ناکا کە بە مێشکیدا هاتووە. هیچ ناڵێ. پێم وایە ئەوەی بە مێشکی ئەودا هاتووە، دەبێ زۆر سەیر بێ. جۆرە مەرگێکی بێ وێنە و نایاب."

رەجەب:"چۆنی دەیفەرمووی هەر وایە بەگم. لێگەڕێ با بکەوێتە بەر چنگمان... ئەو کات دەیبینی."

"وایە. با لەپێشدا وەچنگمان بکەوێ."

مستەفا بەگ:"ئیبۆ سێ رۆژ لە سەر یەك کێشکی کێشاوە و بە دەستی بەتاڵ گەڕاوەتەوە. ئەمن دەڵێم پێتان چۆنە شەوێکیان بە هەر دە کەسمان هەڵکوتینە سەر ماڵەکەی؟..."

مەستان:"ناکرێ بەگ. ئێمە با چەکداریش بین، ئەوانیش هەیانە. ئەوجار جەندەرمەکانیش دەسبەجێ دەگەنێ. ئەمن دەڵێم چۆنە سێ کەسمان خۆمانی لێ نەناس بکەین و ...."

حەمدی:"ئەتۆ تەواو شێت بووی ها. دەروێش بەگ باڵندە بە سەر ماڵەکەیدا بفڕێ باڵی دەوەرێنێ و ئەتۆش پێت وایە دەرگا لە سەر سێ کەسی نەناس دەکاتەوە بچنە ماڵەکەی؟"

رەجەب پشتی قیت کردەوە:"ئەمن زۆرم بیر لەوە کردووەتەوە. با بچین و بە دەروێش بەگ بڵێین مستەفا ئاق یۆللی" دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ. با بچین و نامەی مستەفا ئاق یۆللی"ی بدەینێ. شوێنی چاوپێکەوتنەکەش ئێمە دیاریی دەکەین. مستەفا بەگیش با لە نامەکەیدا بنووسێ ئەمن بەتەنیا دێم، ئەتۆ تەنیا وەرە. چما نایە؟"

ئاق یۆللی":"دێ."

ئەوانی دیکەش:"دێ."

"اا، ئەی دوایی؟..."

حەمدی:"ئێمەش لە دەوروپشتی ئەوێ خۆمان مات دەکەین و هەر دەروێش هات، دەیگرین."

ئاق یۆللی" سەری خستە نێوان دەستەکانییەوە و گوتی:"دەبێ بیری لێ بکەینەوە. دەروێش ئەو بانگێشتە قەبووڵ دەکا و دێتە شوێنی چاوپێکەوتنەکەش. دێ، بەڵام؟"

جا رووی لە بلە ئیبۆ کرد و لەسەری رۆیشت:"ئەو پێی وایە من خەلە و خەرمان و ماڵەکەیم سووتاندووە، وایە؟"

"پێوابوونی چی، کوڕە ئەو بایەش کە بەسەر زەوی و زارەکەیدا دەڕوات، لە ئێمەی دەزانێ."

مستەفا بەگ ئاق یۆللی":"جا ئەویش نە ئاگری لە ماڵەکەم بەردا و نە لە زەوی و زارەکەم. ئەو تووتکە سەگە زۆر پیس بە کەمم دەگرێ. مادام ئاوا بیر لە من دەکاتەوە... دەبێ سزاکەشی ببینێ... راوەستن، راوەستن بۆتان بگێڕمەوە."

ئەوانی دیکەش وێکڕا گوتیان:"دوایی دەیگێڕیتەوە."

گەرمایەکی بەتین و تاقەتبڕ هەڵی کرد. خەست خەست و خنکێنەر. ئەوجار بارانێکی زەرد و لێڵ و تار و خەست دایدا. قورس و توند، لە باران نەدەچوو، گەرم گەرم بوو وەك هەڵم...

# ١٩

بله ئیبۆ هەتا بگاتە لای دەروێش بەگ کێشەیەکی ئەوتۆی تووش نەبوو. لە پێشدا لە بەر دەرگایە تۆزێکیان پشکنی و ئەوجار دەمانچە و خەنجەرەکەیان لیّ ئەستاند جا ئیزنیان دا بچێتە ژووریّ.

بله ئیبۆ دوای ئەوەی نامەکەی دایە دەستی بەگ، کشایەوە دواوە و دەستەونەزەر لە قەراغەوە راوەستا و سەری بەردایەوە.

دەروێش بەگ هەر وا کە نامەکەی دەخوێندەوە، هەر جارەی رەنگێکی لە روخساری دەنیشت و جارنەجاریّ چاوێکی لە نامەکەی هەڵدەگرت و لە بنی پێی بلەوە تا تۆقی سەری سەیرێکی دەکرد و دیسان نوقمی نامەکەی دەبۆوە.

ئاخرییەکەی سەری هەڵێنا و نیگا سڕ و ساردەکەی لە بلە بڕی. بلە هەموو گیانی وەلەرزین کەوت و دەنگی بەگی هاتە گوێی:"دەی بڵیّ بزانم، ئەتۆ کۆشکەکەی منت سووتاند؟

بله ئیبۆ دوای ئەوەی تۆزێك راوەستا، وەڵامی دایەوە:"ئەمن کۆشکەکەتم ئاگر دا. خەرمانەکانیشت من سووتاندمن و مستەفا بەگ هیچ ئاگای لەو شتانە نییە."

"ئەی بۆچی پێت نەگوت؟"

"چونکە ئەگەر پێم گوتبا، رازی نەدەبوو."

بچۆ پێی بڵیّ، ئەو هەر شوێنێکی دیاریی بکا، بە تاقی تەنیّ دێم. دوای ئەوەی خەبەرت پیّ دا، بەتەنیّ دەگەڕێیتەوە ئێرە. ئەتۆ کابرایەکی بەرەڵڵا دیاری، بەڵام وێدەچیّ چاونەترسیش بی. دەی بڵیّ بزانم مستەفا بەگت زۆر خۆش دەویّ؟"

"زۆرم خۆش دەویّ. سەر و گیانمی لە پێناوی دەنێم."

"ئاخۆ ئەویش بۆ تۆ سەری پێوە نییە؟"

"ئەوەیانی ئیتر نازانم. دوای ئەوەی نامەکەم گەیاند، ئیتر ناتوانم بگەڕێمەوە ئێرە. جا پێت خۆشە وەرە بۆ شوێنی دیاریکراو، پێت خۆشە مەیە. ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە، پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە. بەڵام ئەمن کۆشکەکەتم ئاگر دا. بەلای منەوە ماڵ و حاڵ سووتاندن و خەرمان ئاگردان و لە پشتەوە تێسرەواندن و لە ناخافڵ لێدان و داونانەوە و هەر چەشنە خیانەت و بەدفەڕییەك ڕەوایە. ئەگەر ئەو کات بۆ دەرکێشانی تۆ لە ماڵەکەت پێویست بوایە، هەموو چوکووراوا کاول بکرێ و لە خوێن بگەوزێنرێ، بەدڵنیاییەوە دەستم لێی نەدەلەرزی و دەمکرد."

بەگ هیچ پێی سەیر نەبوو و دوای ئەوەی سەرێکی بۆ لەقاند و گوتی:"ئەتۆ باش دەناسم بلە ئیبۆ. ئەی حەمدی؟ ئێستاش هەر وا بێبەزە و دڵڕەقە؟"

"هەزاران هێندەی جاران. هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ نەخشە بۆ ئەوە دەکێشێ کە چۆن بە جەزرەبە و ئازارەوە بتکوژێ."

دەروێش بەگ پێکەنی و گوتی:"هێشتاش بۆی تەواو نەبوو؟ نەخشەکەی دەڵێم."

"هەموو ڕۆژێکی نەخشەیەکی نوێ دادەڕێژێ. بەڵام ڕۆژی دوایی نەخشەکەی پێشووی قەبووڵ نییە."

"باشە ئەمن چ خراپەیەکم بۆی هەبووە؟ لەو دنیایە هێندەی چاکەی بۆ ئەوم هەبووە بۆ کەسم نەبووە... لانیکەم سێ جاران لە مەرگ نەجاتم داوە. وەك برای خۆمم سەیر کردووە. هیچ خراپەیەکم بۆی نەبووە."

"ئەو لە هەمووان تووڕەیە. ئەو دوژمنی وەچەی بنیادەمە. جا ئەتۆ بیت یان کەسێکی دیکە. فەرقی بۆ ناکا. ئەو ڕقی لە هەموو بنیادەم و بوونەوەرەکانە. هەموو ڕۆژێ هیچ نەبێ گیانلەبەرێك دەکوژێ. باڵندەیەك، پشیلەیەك، سەگێك و ئەگەر دەستیشی نەکەوت، مێروولەیەك، مێشێك، زەردەواڵەیەك... جارێکیان چوبوومە ماڵەکەی سەیرم کرد بە هەزاران زەردەواڵە و هەنگی وەك دەنکە تەزبێح بە داوێکەوە کردووە. زەردەواڵەکان لە بەر تاوەکە هێندەیان ڤیزەڤیز کرد هەتا دەنگیان بڕا و ڕەق هەڵاتن. هەر هەموو زەردەواڵە بەداوەوەکراوەکان ئێستاش کە ئێستایە لە کەپرەکەی دان"

"کەوابوو ئەو مستەفا بەروپشت ئەتڵەسە، هاوکاری ئەوجۆرە پیاوانەیە؟"

"هیچ کەسێك نییە کاری بەو جۆرە کەسانە نەبێ. باشە کەڵکیان لێ وەرنەگرێ چ بکا؟"

دەروێش بەگ چەند هەنگاوێکی لێ چووە پێشێ و دەستی لە سەر شانی بلە ئیبۆ دانا. دەستی راستەی لە سەر دەسکی دەمانچەکەی بوو. لەو کاتەوە ئیبۆ وەژوور کەوتبوو، بۆ چرکەساتێکیش چییە دەستی لە سەر دەمانچەکەی هەڵنەگرتبوو.

"بچۆ بە مستەفا بەگ بڵێ بە تاقی تەنێ دێمە گردە رێوی. تەنانەت ئەگەر کۆشك و کێڵگەکانیشم هەر تۆ ئاگرت دابێن، ئەمن ناتوانم بڕوا بکەم ئەتۆ کاری وات کردبێ. ئەگەر ئەوە کاری ئەو بێ، ئیتر دیارە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو ئاغایانەی تازە پێگەیشتوون. جا هەر بەراستی حەزیش ناکەم وابووبێ. دەنا، ئەگەر متمانەم پێی نەمێنێ و بەتەنێ نەیەم بۆ شوێنی دیاریکراو، هەقمە. بەڵام هەر دێم. سڵاوی منی پێ بگەیەنە. لەو دنیایەدا بە ئاواتی شتێکەوەم ئەویش ئەوەی کە دوژمنەکەم لەو ئاغا سووك و چرووکانە نەچێ. زۆری سڵاو بگەیەنن."

بلە ئیبۆ گوتی:"بەسەر چاوەکانم بەگ. بێ کەم و زیاد فەرمایشەکانت دەگەیەنمە مستەفا بەگ."

ئیتر گورج و گۆڵ لە پلیکانەکان چووە خوارێ. دەمانچە و خەنجەرەکەی لە پاسەوانەکانی بەر دەرگا وەرگرتەوە و خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و وەك بای شەماڵ دوور کەوتەوە.

پاش رۆیشتنی بلە ئیبۆ، پەشیمانییەك لە هەموو گیانی بەگ گەڕا. چووە ژووری ژنەکەی و بۆی باس کرد و نامەکەی دایە. خاتوون کە نامەکەی خوێندەوە، دەستی بە هاوار و قیژە کرد:"نابێ کاری وا بکەی، شتی وا نەبووە و نابێ. ئەتۆ چۆن کەسێکی کە کۆشکەکەتی سووتاندووە و ئاگری لە کێڵگە و مووچە و مەزرات بەرداوە، بە بنیادەمی دادەنێی و دەچییە بەر دەستی؟ چۆن متمانە بە قسەی ئەو دەکەی؟ هەر کەس دەیەوێ چاوی بە تۆ بکەوێ، با بێتە ماڵەکەت. ئەگەر بە راستی قسەیەکی هەبوایە، ئەتۆی بانگ دەکردە گردە رێوی؟ ئەوە مەحاڵە، نابێ بە تەنێ بچی. ئەو ماستە بێ موو نییە. تا ئێستا نەیتوانیوە گونت بگرێ، ئەوە هاتووە ئەو دەهۆ و کەڵەکەی رێك خستووە. دڵنیابە هەر لەو ماڵە پێ بنێیتە دەرێ، پیاوەکانی کە لە سەر رێگەت بۆسەیان بۆ ناویتەوە، هەڵدەکوتنە سەرت و بە دەست و پێ بەستراوی دەتبەنە لای ئەو. جا ئەویش پێت دەڵێ:"ئەمن بە تەنیایی چاوەڕێت بووم، بەڵام وا دیارە قۆڵبەست کراوی. چ باشتر."

دەروێش بەگ نێوچاوان تاڵ و بێهیوا گوتی:"راست دەکەی خاتوون. جا ئێستا دەڵێی چ بکەین؟"

"مەڵێ نایەم، تەنیا کاتەکە وەدوا بخە...."

"راست دەکەی خاتوون. منداڵەکان لە کوێن؟"

"موزەفەر چووەتە بازاڕ و جەیحوون لە باغەکەیە."

ئەو کۆشکە، دۆستێکی هەرمەنی بە دیاری پێی دابوو. دۆستە هەرمەنییەکەی، شەوێکیان ئەو کاتەی هێشتا باس و خواسی راکردووان و دوورخراوەکان نەهاتبووە گۆڕێ، هاتبووە لای و گوتبووی:"ئێمە لێرە ئاقیبەت بەخێر نابین. ئاخرییەکەی دەکوژرێین یان دوور دەخرێینەوە." بۆیە قەباڵەی ماڵەکەی لە دەستی دەروێش بەگ نابوو. دەیانگوت ماڵەکەی بە سێ هەزار سکەی زێڕ بە دەروێش بەگ فرۆشتبوو. بەگ سەری سووڕ دەمێنێ و دڵی برادەرە هەرمەنییەکەی دەدابۆوە و گوتبووی:"ئەو قسانە چین دەیانکەی برالە؟ نوقلانەی خراپ لێ مەدە. شتی وا کردەنی نییە. کێ هەیە بیەوێ ئێوە ئازار بدات؟...."

هەرمەنیەکەش گوتبووی:"ئای بە چ هیوا و ئاوات و ئارەزوویەك ئەو ماڵەم دروست کرد. بەڵام لە دوو ساڵ پتری تێدا نەژیام، یانی نەمتوانی تێیدا بم. ئێستاش کە دەمەوێ بڕۆم، پێم حەیفە تازە پێگەیشتوویەکی بێ دایی و باب تێیدا خۆش رابوێرێ. زۆرم بیر لەوە کردەوە ئەو ماڵە شیاوی کێیە؟ ئاخرییەکەی هاتمە سەر ئەوەی کە شیاوی دەروێش بەگی ساری ئۆغڵییە... هانێ کاکە ئەو خانووە بۆ تۆ، گەردنت خۆش و ئازا بێ. بۆ تۆ و خێری لێ ببینی و تێیدا خۆش رابوێری. ئەو ماڵە هیچ، هەزار خانووی لەوەش رازاوەترت قابیلە. کۆشك و تەلاران قابیلی تۆن."

باخچەکەیان پڕ کردبوو لە نەمام. هەناری رەسەن و سوور و مۆر و کەموێنە. هەنارەکان گوڵیان کردبوو و باخچەکە لە سوورایییەکی دوور لە باوەڕدا شەپۆلی دەدا.

"نەکا ئەو هەتیوەیان دزیبێ؟"

خاتوون وەڵامی دایەوە:"ئاغا تازە پێگەیشتووەکانیش تەنانەت، کاری وا بیلحەت و شەرماوی ناکەن. خەمی منداڵەکەت نەبێ."

دەورێش بەگ ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"ئەو دەست لە هیچ شتێك ناگێڕێتەوە و لە هیچ ناپرینگێتەوە. دوای سووتاندنی خەلەوخەرمان و کێڵگەی ئەو خەڵکە هەژارە..." و ئیتر قسەکەی قووت دایەوە و رووی وەرگێڕا و لە ژوورەکە چووە دەرێ.

ئاشق و شێت و شەیدای ژنەکەی بوو. هێشتا ئەڤیندارانە خۆشی دەویست. ئەو و ژنەکەی بەبێ ئەوەی یەکتریان دیتبێ، لێکیان مارە کردبوون. ژنەکەی خەڵکی لای نزیك بیابانەکەی عارەبستان و کچی دەشتی پڕ لە بۆن و بەرامەی نێرگز و بەپیت و بەرەکەتی ئامیك بوو. کچی

یەکێك لە بەگە ناوداره تورکمانەکانی ئەوێ بوو. بەگە تورکمانەکە پیاوێکی بە دام و دەستوور و سەربەرز و جوامێر و بە دڵ و دەروون بوو.

ئەسمەر بوو. چاوەکانیشی رەش و گەورە بوون. رەش وەك قەیتەران. کوڵمە ناسکەکانی دەتگوت ئێستا نا ئێستا دەپشکوێن. لێوەکانی گۆشتن و سوور و هەست بزوێن بوون. کە پێدەکەنی بلێی و نەلێی لێوەکانی لە بەر یەك دەکشانەوە و دیسان دلّبەرانە و بەناز وێك دەهاتنەوە. هەر جوولەیەکی دەیکرد، ناسکێتی و زەریفی و خۆشەویستییەکی لێ بەرز دەبۆوە. زۆر کەمدوو بوو و حەزی لە گوتنی هەر قسەیەك بوایە، بە نەرمە جوولەی دەستە و چاوەکانی و چرچ و چینی زەریفی دەموچاوەکەی دەریدەبڕی.

جا هەر وەك پیرەژنانی کۆن شمەکی لەبەر دەکرد:داوێنی گوڵدار و پێڵاوی بریقەدار و... سوخمەی کۆبەگیراو کە ریز ریز سکەی زێڕی پێوە کرابوو. تۆق و ملوانکە بە ملەوە و ریزە بازنەیەکیش لە دەست دا. کەچی سەرەڕای ئەوەی بەگ زۆریشی حەز لێ بوو بەڵام نەیدەوێرا لووتی کون بکا بۆ خەزێم و خرخاڵ و پاوانە لە گوێزینگانی بکات.

هیچ لەوە نەدەترسا کە لەوانەبوو مێردەکەی بکوژرێ. چونکە کوژرانی بنیادەمەکان هەر لە کۆنەوە لە بنەماڵەکەی ئەودا شتێکی باو بوو. درەنگ یان زوو، مێردەکەی هەر دەکوژرا. بەر لەوەی مێردی پێ بکا ئەوەی لێ روون بوو. ئەو خەمی لەوە دەخوارد ئاخۆ دوای کوژرانی مێردەکەی چۆن ئەو منداڵانەی گەورە بکات و پێیان بگەیەنێ.

گەردنی درێژ بوو. وەك ملی مراوی و چەناگەی قوت و تیژ.

هیدایەت گوتی:"ئەمن مەنێرە لای ئەو، بەگ. دەست و لاقت ماچ دەکەم، مەمنێرە. دەمکوژێ. ئەمن هیچ متمانەم بەو نییە."

"ئەی ی ئەی، کورە هەر بڕوام نەدەکرد. سەیرە وەڵڵاهی سەیرە. یانی مستەفا بەگ ئاوا سووك و چرووك بووە؟ پیاو چۆن دەتوانی دوژمنایەتیی کەسی ئاوا بکا؟"

"نازانم... بەڵام ئەمن دڵم لێی ئاو ناخواتەوە بەگ. ئەمن دڵم لە کەسێکی ئاگر لە ماڵان بەر دەدا و خەلە و خەرمانان دەسووتێنێ و بۆسە دەنێتەوە و رێگری دەکا، دڵم ئاو ناخواتەوە. ناتوانم متمانەی پێ بکەم. پێم بڵێ ئەگەر تۆ متمانەت پێیەتی بەگ. ئەەگەر ئەتۆ متمانەت پێیەتی، بچۆ بۆ ئەو شوێنەی دیاریتان کردووە. بەڵام ئەمن خۆم ناتوانم بچمە لای. ببوورە بەگ. بیرکردنەوە ئاوا لە دوژمن، بێ جێیە بەگ، بەڵام چ بکەم هیچی دیکەم لە دەست نایە. گیان گاڵتەی پێ ناکرێ بەگ. گیان شیرینە..."

بەگ تێك چوبوو، بەڵام وەسەر خۆی نەدێنا. هەر قسەیەکی بۆنی سووکایەتیکردنی بە مستەفا ئاق یۆللی" لێوە هاتبا، برینێك بوو لە سەر دڵی و سووکایەتییەك بوو بە کەسایەتیی خۆی.

ئاخێکی هەڵکێشا و بە دەنگێکی نیوەزیندووانەوە گوتی:"کە وابوو عەلیجیکم بۆ بانگ بکە با بێ. لانیکەم با ئەو بنێرم. چ بکەم هیدایەت، هەقتە."

بە ئاخێکەوە گوتی:"دەسەڵات چییە؟"

بزەیەکی پڕ لە رەزامەندی لە لێوەکانی هیدایەت گەڕا:"عەلی جیك باشە."

"ئەو جووتە لێك دەکاڵێنەوە."

"ئەوە باشترە. مەیتەر دەچێتە ماڵی وشترەوان و عەلی جیك دەچێتە ماڵی مستەفا. مستەفا ئەگەر بزانێ عەلی جیك کێیە، شێت دەبێ."

بەگ تووڕەییەکەی خواردەوە و گوتی:"با ببێ، با شێت بێ. با روو لە شاخ و کێوان بکا. جوابی خراپە هەر خراپەیە. گووی خۆیەتی با بیشێلێ. ئەوی ماسی بگرێ، قوونیشی تەڕ دەبێ. عەلی جیك باشترە. با عەلی جیك بچێ."

هیدایەت هەر خەریکی پەنجەکانی بوو و پەیتا پەیتا دەیژماردن. جار نە جارێکیش سەیرێکی میچەکەی دەکرد و داڵغەی لێ دەدا و دیسان سەری بەردەدایەوە و دەستی دەکردەوە بە ئەژماردنی قامکەکانی.

"کەنگێ هیدایەت؟"

هیدایەت ئاگای لە خۆی نەبوو. گوێی لێ نەبوو.

"هیدایەت."

هیدایەت راچڵەکی، دەتگوت لە خەوێ راپەڕیوە. "ئەمر بکە بەگ."

"گوتم کەی؟"

هیدایەت دەسبەجێ گوتی:"ساڵی داهاتوو نا، ئاخرین مانگی هاوینی ساڵەکەی ئەولاتر."

"هەتیو ئەوە شێت بووی هیدایەت؟ ئەو هەر ئێستای نامە ناردبوو، کە دەمودەست بچم بیبینم. ئەوە دەڵێی چی؟"

"دەزانم بەگ. بەڵام ئەوەی ئاگر لە ماڵ و حاڵی خەڵکی و لە خەلە و خەرمانی برسی و هەژاران بەردەدا، نابێ لەوە باشتری لەگەڵ بکەی. بۆ ئەوەش نابێ پێی بڵێی حەز ناکەم بتبینم، چونکە ئەوە وەڵامێکی بەجێ نییە. ناشتوانی سووتمانکەرێك بە پیاو دابنێی و لەگەڵی بەرەوڕوو

بیتەوە و بەیانی بچیتە لای و کردەوەکانی بە چاویدا بدەیتەوە. دوو ساڵی دیکە، ڕێك لە بیست و نۆی دوایین مانگی هاوینەکەیدا دەچی و چاوت پێی دەکەوێ... ئەگەر وا بکەی، تێدەگا چەندە کابرایەکی سووکە. بۆی دەنووسی لە ڕۆژێکی تاو و ساوی دوایین مانگی هاوینی ساڵی داهاتوودا نا، بەڵکو ساڵەکەی دواتریدا چاوت پێی دەکەوێ. بەڵێنی نادیار. ئەگەر ئاوای بۆ بنووسی، لە دین دەهری دەبێ، شێت دەبێ و ئاگر دەگرێ و کەف هەڵدەچڕێنێ و سەری خۆی بە دار و دیواردا دەکێشێ. لێی گەڕێ با وای لێ بێ. هەر دەبێ وا بێ: با هەتا عومری بێ، ئاگر لە ماڵ و حاڵ و خەلەوخەرمانی خەڵکی هەژار بەرنەدا. کۆشکەکەش بلە ئیبۆ نەیسووتاندووە. خەرمانەکانیش کاری ئەو نەبوون. ئەگەر ئەو ئاگرانە لە گۆڕی ئەوەوە هەڵنایسساون، دەبوو خۆی ڕوونی بکاتەوە کێ وای کردووە. ئەگەر کۆشکەکەی ئەو سووتابایە، ئاخۆ بۆ سڕینەوەی ئەو پەڵەی شوورەییە ئێمە سەبەبکارەکەمان نەدەدۆزییەوە؟"

دەروێش بەگ بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە:"دەماندۆزییەوە."

هیدایەت لە سەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت."دەی با ئەویش بیدۆزێتەوە و شەرەفی خۆی بکڕێتەوە."

دەروێش بەگ:"با بیکڕێتەوە."

خاتوون:"هیدایەت ڕاست دەکا، ئاخری مانگی هاوینی دوو ساڵی داهاتوو. با هەتا عومری هەیە، ماڵی خەڵکی نەسووتێنێ."

هیدایەت: "بەگم کە تۆ بی، دەبێ بنووسی لە ڕۆژێکی بە پیت و بەرەکەت و ڕووناکی دوایین مانگی ساڵی هەزار و نۆسەد و نۆزدە ئەویش ڕێك بیست و نۆی مانگ و دروست دەدەمی کازیوە، ئەویش نەك لە گردە ڕێوی، بەڵکو لە گردی مەلان (قۆشلار تەپەسی) هەر دووکمان بە تەنێ و یەك بە یەك، هەر کام بە قورئانێکەوە کە مۆری بنەماڵەییمانی پێوە بێ و مۆرەکەشی سوور بێ بۆ ئەوەی لە دوورەوە بناسرێتەوە و دەسرەیەکی سپیی گەورەشمان پێ بێ، نەك ئاڵا و دەرزی و پەرچەم، بەڵکو ئاڵای تایبەتی عیسمەت پاشا کە بە دەم بای بەیانییەوە بشنێتەوە، ئاوا بە پیر یەکترییەوە دێین."

"زۆر تێکەڵ پێکەڵت کرد، بەڵام تێگەیشم دەڵێی چی."

هیدایەت لەسەر قسەکەی ڕۆیشتەوە:

"جا بڵێین چی بەگ. ئێمە خەڵکێکی نەخوێندەوارین. هەر ئەو چەند قسەیەی وەسەر یەکی دەخەین، ئەوەشمان لێ سەر و زیادە. بۆ خۆت باشتر دەزانی ڕێکی بخەی. ئەوجار بیر لەوەش

بکەوە، باشە لە بەگ و ئاغاواتان دەوەشێتەوە بۆسە و داو بنێنەوە؟ ئەوە یانی دامودەستووری ئاغاواتی و بەگایەتی تەواو بووە و ئێمە نەمانزانیوە؟ ئەگەر پیاوەتی و ئینسانیەتی باوی نەماوە، ئیتر ئێمە بۆچی هەوڵی رشتنی خوێنی یەکتری بدەین؟ ئەگەر ئەو خوێن ڕشتنانە هیچ خزمەتێك بە مرڤایەتی و پیاوەتی ناکا، بۆچی درێژەی هەبێ؟... دەی باشە بنووسە بەگ."

"ئەگەر ئەو جۆرەی تۆ دەیڵێی بینووسم، ئیتر ناتوانم وەك دوژمنێك سەیری ئەو بکەم. پیاوی ئاوا بۆ ئەوەی نابێ نامەی بۆ بنووسی."

هیدایەت:"ئیتر من ئەقڵم بەوەیان ناشکێ. ئەتۆ کاتی چاوپێکەوتنەکەت بخە ئاخری مانگی هاوینی دوو ساڵی داهاتوو، جا ئەویدیکەی چۆنی خۆت پێت باشە وا بکە.

ئەمن زۆر لەو مستەفا بەگە پڕم. موحەڕەمیش هەر ئەو کوشتی. بنیادەمێکی زۆر سووك و چرووکە... ترسنۆکە... ترسنۆك."

بەگ بە تووڕەییەوە گرماندی:"بێدەنگ بە هیدایەت. جارێکی دیکە ئاوا چاوقایمانە باسی مستەفا بەگ بکەی، زمانت لە پشتە سەرتەوە دەردێنم."

خاتوون لە سەرەخۆ و پتەو گوتی:"ئەو ترسنۆکێکی بێشەرمە. ترسنۆکی لە ترسنۆکان بوو. هیچ پووچی کوڕی هیچ پووچ. فێڵباز و کەڵەکباز و سووك و چرووك و چەپەڵ..."

دەروێش بەگ ڕەنگی بە روخسارییەوە نەما و دەست و پێی لەرزین.

"هەروەها ماڵ سووتێن و خەرمان سووتێن و بۆسەگر و...."

دەروێش بەگ لە گەروویدا گرماندی:"بێدەنگ بە، بێدەنگ بە خاتوون. بیبڕەوە. ئیتر ئەتۆش مەمکوژە. هەر ئەوەی لە دەستی ئەو دەیکێشم بەسمە. ئەتۆش خوێم بە برینانەوە مەکە. خودا دوژمنی ئاوا بە نەسیبی هیچ زیندەوەرێك نەکا. نە دۆستایەتیی دەکەم و نە دوژمنایەتیشی. خودا بیباتەوە و پاکی بکاتەوە. ئیتر بەسمە. لەوە زیاتر زەجرکوژم مەکە. سووکایەتیم پێ مەکە مە."

خاتوون دەستی لە کەلەکەی نا و لەسەرخۆ گوتی:"دەروێش، بۆی بنووسە. وای بۆ بنووسە لە سەری جەرگی کار بکا. بنووسە با بزانێ لە هەمبەر ساری ئۆغڵیدا دەبێ چۆن راوەستێ، یان ئەوەیکە دەست هەڵگرێ. ئەگەر ناتوانێ، ئەگەر خۆی پێ ناگیرێ، با پیاوانە سەری بەرداتەوە و دەست هەڵگرێ و پێی لێ بنێ کە ناتوانێ و پیاوی ئەو مەیدانە نییە و ئەو کارەش لێرەدا ببڕێتەوە."

دەروێش بەگ بە دووی قسەکەیدا ڕۆیشت:"با لێرە ببڕێتەوە."

"ساری ئۆغڵی کەسێکە، یان دەبێ مرۆڤانە و پیاوانە دوژمنایەتیی بکەن یان هەرگیز خۆی لێ نەدەن. هەرگیز، هەرگیز. چما دوژمنایەتیی ساری ئۆغڵی کارێکی سووك و سانایە؟ یان خۆی لێ نادەن، هەرگیز."

دەروێش بەگ لێی زیاد کرد:"یان هەرگیز."

هیدایەت"یان هەرگیز."

## ٢٠

بارانەکە دیسان دایدابۆوە. شیلەوگەرم و زەرد... سلێمان سامی کەوتە نێوبژیوانییەوە. چەند رۆژێك بوو سەری بە هەموو کونێکدا دەکرد و تووشی هەر کەس دەبوو پێی دەگوت:"ئەوە دروست نییە، ئەوە دروست نییە گیانەکەم، ئەوانە خەریکن یەکتری دەخۆن. خەریکن جووقەوار لە یەکتری دەبڕن. دروست نییە. پەیتا پەیتا لێك دەکوژن. یەك پشوو و بێ برانەوە. هەر هەمووشیان گەنجی وەك توولە نەمام. ئەوانە تا ئێستا هۆردوویەکیان لێك کوشتووە. هۆردوویەك لە کوێ و نەفەرێك لە کوێ؟ هۆردوویەك هۆردوویەکە و یەك نەفەر، نەفەرێك. بەڵێ، یەك نەفەر، هەر ئەو یەك نەفەرەش بۆ بکوژرێ؟ وا نییە؟ ئەدی گیانی من، ئیتر دەبێ پێشی ئەو ترس و سام و خیانەتکردنە بە نیشتمانەکەمان بگرین. وا نییە؟ خیانەت بە ئاو و خاك، خیانەت بە نیشتمان. ئەوە خیانەت بە ئاو و خاك و نیشتمان. دەبێ ئەوانە ئاشت بکەینەوە. دەبێ ئاشتیان بکەینەوە و ئەو کوشتن و بڕینە ببڕینەوە."

سێهەم جاری بوو کە ماهیر قاباقچی ئۆغلی لە وەڵامی دا دەیگوت:" راست دەکەی سلێمان سامی."

جا لە بەڕێکردنیشیدا، سارد و سڕ و بە دڵنیاییەکەوە دیسان گوتی: ئەو کارە لە سەردەمی ئێمە ناوەشێتەوە. بێت و ئەورووپییەك گوێی لێ بێ، سەری لەو ترس و سامە سوور دەمێنێ."

سلێمان سامی قسەکەی قۆستەوە و بە هەژاوییەوە گوتی:"ئەرێ وەڵڵاهـ سەری سوور دەمێنێ. ئاخر سەری لێی دەرناچێ. چونکە لەو سەردەمەدا ترس و سامێکی وەك ئەوە دوور لە ئەقڵە ، ئەویش بۆ ئێمەمانان کە دەمانەوێ وڵاتەکەمان بگەیێنینە ئاستی وڵاتانی ئەورووپی و رێگەی گەشە و پێشکەوتنمان گرتووەتە بەر و بەرەو ئاسۆ روونەکانی داهاتوو هەنگاو دەنێین..."

"ئەدی گیانی من، ئەدی سلێمان سامی، ئەدی براکەم. ئەمن لەو هەستە مرۆییانەی تۆ تێدەگەم و بە گیان و دڵ ئامادەم لەو پێناوەدا هاوکاریت بکەم. بەڵام پێم وا نییە ئەو وەحشییانە دەست لە کوشت و بڕی یەکتری هەڵگرن. هەتا ئێستا زۆر گوتراوە و زۆریش هەوڵ دراوە، بەڵام هیچی لێ شین نەبووەتەوە. هەر هەموو چوکووراوا کەوتە مابەینیان بۆ ئەوەی ئاشتیان بکەنەوە، تەنانەت وەزیری نێوخۆش لە ئانکاراوە هاتووە، بەڵام چما بە گوێیاندا دەچێ؟ هەر وەك مێشێکیشیان لێ میوان نەبێ. هەر خۆم لانیکەم پێنج جاران لەگەڵ پیاوماقووڵەکانی شاری و چوکووراوا چوومەتە ماڵی هەردووکیان، بەڵام بێ فایدە بووە. کارێکی خۆڕاییە. بەڵام ناشبێ بێهیوا بین. دوێنێ جارێکی دیکەش، سەد هەزار جاری دیکەش تاقیی بکەینەوە. دەبێ ئەو پەڵەی دواکەوتوویيە لەداوێنی میللەتەکەمان بکەینەوە. ئەو کارە لە سەردەمی ئێمە ناوەشێتەوە. ئەمن حازرم براله، ئەتۆ بڕۆ قسە لەگەڵ خەڵکەکەی دیکە بکە. ئەمن دەچمە لای هەر دووکیان. هەر دووکیشیان بە گیانی ناخێریان خوێندەوار و دنیادیتەن. ئەمن پێیان دەڵێم ئەوەی ئەنگۆ دەیکەن، کارێکی وەحشییانە و ناشارستانی و دژە سەردەم و فێڵبازانە و خۆکرد و نا مرۆڤانەیە. دەڵێم، سووکبوونە، داڕزینە، پەڵەیەکە بە تەوێڵی نیشتمانەکەمانەوە. دەڵێم بێت و ئەورووپییەکان بیبیستنەوە، گاڵتەمان پێ دەکەن و بە کێوماندا دەکەن. هەتا زمانم لە زارمدا دەگەڕێ هەر دەیڵێم. سەیر بکە، دوای مەرگی مورتەزا بەگ چ شتێك ماوە نەقەومابێ؟"

"ئاق یۆللی"، مەحەڕەم، پیاوەکەی دەروێش بەگی کوشتووە. مەحەڕەم مەیتەرێکی لێزان بوو. لەو چوکووراوایەدا کەس نەبوو وەك ئەو ئەسپ ناس بێ. کوژرا و تێدا چوو. دەروێش بەگیش دەسبەجێ دوای مەرگی مەحەڕەم وسێنە رەشی کوشتەوە و تەرمەکەیان برد بە سەر چڵووکی چنارێکی حەوشەکەی ئاق یۆللی"یانەوە کرد. تۆ خوا ئەو هێزە ئینسانییەی ئەم مەملەکەتە حەیف نییە؟ هێز، هێزە و نیشتمان، نیشتمانە. نابێ کەس بکوژرێ. مەحەڕەم لاو بوو. وسێنە رەشیش... مەحموود لاو بوو، مورتەزاش. هەر کامیان پێنج کوڕیان هەبوو، دەبووە فەوجێك سەرباز. وا نییە؟ کوڕەکانی ئەوانیش... چما دەکرێ یەکتری خاشەبڕ بکەن؟ با بڕۆین ماهیر بەگ، با بڕۆین و بە ناوی نیشتمانەوە قسەی خۆمانیان لەگەڵ ببڕینەوە. با قسەی خۆمان ببڕینەوە تا ئەقڵیان بێتەوە مێشکی ئەو ئەقڵ دۆڕاوانە. ئەقڵ هەر ئەو شتەیە کە دەبێ بیخەیتە مێشکی ئەوانەوە. ئەگەرچی هیچ هیوایەکم پێیان نییە، دیسانیش دەچم."

دەستی یەکتریان گوشی.

سلێمان سامی:"هەر بژی، هەر بژی ماهیر بەگ. هیچ چاوەڕوانییەکی دیکەم لێتان نەبوو. پیاوێکی خوێندەواری فەرەنگ رازی نابێ، برینی سەر دڵی نیشتمان ئەوەندەی خوێن لەبەر بڕوا."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی کە لە ناخی دڵییەوە پێدەکەنی گوتی:"رازی نابێ."

قسەی سەر زار و بنی زاری خەڵکی شارۆچکەکە ئاشتبوونەوە بوو. ئەو ئاشتبوونەوەیە دەبوو سەر بگرێ. چ واتایەکی هەبوو؟ مانای چ بوو ئەو هەموو کوشتنە بەردەوامە؟ چما شتی وا دەبێ؟ ئەوە چ ترس و سامێکە؟ باشە ئەوە لە مرۆڤایەتی دەوەشێتەوە؟ ئەوە قسەی سەر زار و زمانان بوو، بەڵام دڵەکان ئاشت نەدەبوونەوە. خوویان پێوە گرتبوو کە ساڵ دەری دوازدەی مانگان باسی کوشتن و بڕین و تۆڵە ئەستاندنەوەکانی تۆرەمە و وەچەی ئاق یۆللی" و ساری ئۆغلی بکەن.

لە زۆر کۆنەوە، لەگەڵ چیرۆکێکی پڕ کەفوکوڵ و شەرم و شێتانە و تەواو کەرانە ژیابوون. ئەو چیرۆکە نەدەکرا لە نەکاو ببڕێتەوە، چونکە ئیتر دەستبەتاڵ دەمانەوە و لێیان دەقەوما. سلێمان شامیی ئاگرگرتووش ئیتر کاری بەوەوە نییە و ئاوا شێلگیرانە وەشوێن کارەکە کەوتووە. هەی خودا بتباتەوە هەی. ئاخر بە تۆ چی کێ، کێ دەکوژێ. لێیان گەڕێ با ئەوەندە لێك بکوژن تا خۆیان دەڵێن بەسە. ئەوە نەریتێکە لە باوباپیرانیانەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە. چما دەکرێ بە رۆژێك و دووان وازی لێ بێنن؟ ئەوە وای دانێین، هاتن و وازیشیان لێی هێنا، ئەی ئەو کات، پیاوەکانی ئاق یۆللی" و ساری ئۆغلی چییان بەسەر دێ؟ نان بڕاو نابن و سەگ و شوانیان نایەتەوە؟ ئەوانەی لە تەقەکردن بەولاوە هیچ نازانن. دەبێ لایەنی دیکەی شتەکەش لێك بدەیتەوە. دەروێش بەگ دوای ئەوە چ دەکا؟ مستەفا بەگ چ دەکا؟ ئاخۆ دێنە کلوپ و نادییەکانی شار و تا بەیانی لەوێ خەریکی قومار دەبن؟ ئەی چ دەکەن؟

ئەگەر ئەوان دەست لەو کارە هەڵگرن، ئەو خەڵکە دەست و پێ سپیلکەیە چ بکەن؟ سەیر نییە ئەگەر یەکتری بخۆن.

بەڵام حەسەن ئاغا لە سلێمان سامی تووڕە بوو و بەسەریدا گوڕاند:"ئەمن ناچم. ئەوە چتە سلێمان؟ تۆ چکارت بەو شتانەیە؟ ئەوە دامنا دنیاش سووتا، چما تۆ چڵە گیایەکت هەیە بسووتێ؟ دەست هەڵگرە کوڕم لەو کارانە. هەر وا بووە و هەر واش دەبێ. ئەوانە تا جووقەواریان نەبڕێ دەست هەڵناگرن. گوتوویانە خووخدە دووەم سروشتی بنیادەمە. ئەو کوشتن و کوشتنەوەیە بووەتە خووخدەیان. ئەوان ئاوا نەبێ ناژین. چ لەوە باشتر کە بەگەکان یەکتری بکوژن بۆ ئەوەی فەقیر و هەژاران پشوویەکی لێ بکێشن. ئەوان ئەگەر یەکتریان نەکوشتبایە،

ئێمەیان دەکوشت سلێمان. باشە سلێمان ئەتۆ کە پێخەفت ئاسمانە، چیت بەو کارە قۆڕانە؟ ئەتۆ لە مێشێك دەچی کە لە بن کلکی ماینێك نیشتبێ. کێ پێی گوتووی ئەوانە ئاشت بکەیتەوە؟ کێ ئەتۆی خستووەتە ئەو مەیدانەوە سلێمان؟"

لەو دەشتەدا چیها شەڕ کراوە وەك شەڕەکەی عەلی. خوێن هات و کەلاکی برد. لە کۆنی کۆنەوە، لە سەردەمی هۆز و عەشیرەتەکانەوە، ئاق یۆللی" و ساری ئۆغلێیەکان حەوت ڕۆژ، دە ڕۆژ لەو دەشتی ئاناوەرزایەدا شەڕیان کرد. ئاوەکەی سۆمباس سوور هەڵگەڕا. هەڵۆکان زگێکیان لە گۆشتی مرۆڤان تێر کرد. خێوەت سووتان، دەشت سووتا، مەزرا و کێڵگە سووتا و بێشەڵان سووتان. مێگەلە مەڕ، وشتر و ڕەوە ئەسپ بە تالان بران. کەس نێوبژیوانیی نەکردن و لێکیان نەکردنەوە. شەڕەکە هەر بۆ خۆی دامرکایەوە. ئیتر پشوویان لێ بڕا، بڕستیان لێ بڕا و لە پێ کەوتن. شەڕکەری هەر دوو لا لە خوێن گەوزان و تەرمەکانیان سێ شەو و ڕۆژان لە بن میچی ئاسماندا مانەوە و بۆگەن بوون.

"لێیان گەڕێ با شەڕ بکەن کوڕم. ئەگەر دەتانەوێ ئەو کارە تەواو بێ، لێیان گەڕێن شەڕ بکەن. لێیان گەڕێ کوڕم. بێت و نێوبژیوانییان بکەن و ئەوان بزانن خەڵکی چوکووراوا شەو و ڕۆژێ لەوان پتر بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەنەوە، ئیتر دەست لەو کوشت و کوشتارە هەڵناگرن. ئەگەر ئەنگۆ کارتان بە سەریانەوە نەبێ، ئەوان بۆخۆیان کۆتایی پێ دێنن. ئەمن وەك خۆم، قەت ناچمە لایان و ڕووی خۆم هەڵناوێم. ئەوان هەزار ساڵە شێتن. شێتن ئەوان. شێتن ئازیزەکەم. ئەمن ئەوان باش دەناسم. مێشکیان هێندەی دەنکە جۆیەکی ئەقڵ تێدا نییە. هەر خۆپەرستی و خۆنواندنە و بەس. بۆ خۆنواندن یەکتری دەکوژن. لێگەڕێ با بکوژن. با یەکتری بکوژن. یان ماندوو و شەکەت و داماو دەبن، یان قڕیان تێدەکەوێ وازیان لێ بێنن و لێیان گەڕێن. ئەمن پێم ناچێتە بەر دەرگایان. هەر هەموویان بە قوربانی پەنجە تووتەی لاقم بن. ئەنگۆش لەوە پتر ئەو بنیادەمە بێ قیمەت و سووك و چرووك و هیچ و پووچانە هان مەدەن. ئەو گەند و گووانە."

نێوچاوانی تێك نا و دەنگەکەی حاڵەتێکی بەسووکگرتنی تێکەوت:"ئەتۆ بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا. دەی بڕۆ و جەحەندەم پڕ بکە. لەو سەگی سەگبابانە گەڕێن کەیفی خۆیانە..."

وەك مێشێك لە خۆی دەربکا، دەست راوەشاند و گرماندی:

"دەی بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا، بڕۆ لە بەر چاوم ون بە...."

سلێمان سامی وەهەناسە برِکێ کەوتبوو. ملی درێژتر بۆوە و دەمارەکانی گەردنی وەك کاریتەیان لێ هات. وەك مریشك، لە حالێکدا چاوێکی لە عەرزەکە دەگێرِا، سەیرێکی ئەو پیرەپیاوە وردیلەیەی کرد، کە رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو و دەستە بچووکەکانی دەلەرزین، ملی خوارکردەوە و گوتی:"حورمەتی تەمەنەکەت بگرە ها، ئێمەش ئەتۆمان بە...."

بەلاّم حەسەن لە قوولاّیی قورِگییەوە گورِاندی:"لە بەر چاوم ون بە کەری کەران باب گاو. هەتیوە دەستەوستانە، خۆتت پێ چییە؟ پێت وایە بەو خۆ رِانانەت دەتوانی کلاّو لە سەری خەڵکی بنێی و لەو رێگەیەوە پێگە و حورمەتێك بۆ خۆت دەستەبەر بکەی و سەرێك بی لە نێو سەراندا؟ خراپ لە خەو هەستاوی سلێمان. ئەدی بە سەری بابە گۆرِ بە گۆرِەکەت... ئاخر ئەتۆ کێی؟ هیچ، هیچ، مێشێکی بن کلکی ئەسپ، تێگەیشتی؟ مێشی بن کلکی ماینێك... مێشی بن کلکی ئەسپ، هەر مێشیکە و بە بن کلکی ئەسپەوە و تەواو، هەر شتێکیشی لێ بکەن، دیسان دیارە بە کوێوە دەنووسێتەوە... لاچۆ لە بەر چاوم ون بە و حەز ناکەم ئەو روخسارە شوومەت ببینم. برِۆ لێرە و ملت بشکێنە نامەوێ دەستم بە خوێنی مێشێك سوور بکەم، دەی ملت بشکێنە و برِۆ..."

سلێمان سامی، روو شکێنراو و مات، سەری بەردابۆوە و لەگەڵ هەر هەنگاوێکی دەینا، تەکانێکی دەخوارد و لە حالێکدا کە بەردەوام ئاورِی دەدایەوە لەوێ دوور کەوتەوە. چاوە گەورەکانی کە دەتگوت چاوی مانگان، لە ژێللاّ هاتبوون و سوور ببوونەوە. شکاندبوویانەوە و لە بن لێوانەوە جنێوەکانی دەجوی:"هەی پیرە سەگی ژن گاندەری... هەی ی ی ، ژنەکەت .... دایکەکەشت...."

هەتا ئێستاش هەر سلێمان سامی کاروباری پێکهێنانەوە و ئاشتکردنەوەی خەڵکیی رێك خستبوو. ئەو کارانە هەر کاری خۆی بوون. لەو دنیایەدا هەر کەسە و بۆ کارێك دروست کراوە و کاری ئەویش هەر ئەوە بوو کە ئالۆزی و بشێوی و ناکۆکییەکانی نێوان بنیادەمەکان رێك بخاتەوە و چاکیان بکاتەوە. زۆر شت لە ژیانماندا هەن کە لەگەڵ مرۆڤایەتی ناکۆکن. باشە ئەی نابێ کەس قۆڵ هەڵماڵێ بۆ چاککردنیان؟ لە درێژایی ئەو هەمووە ساڵەی کە لەو پێناوەدا هەوڵی دابوو، کەس هێندەی ئەو پیرەپیاوە زمان پیس و چەنەورِە سووکایەتیی پێ نەکردبوو.

"جا مادام وایە منیش وازی لێ دێنم. با هەر یەکتری بکوژن. با ببێتە کوشت و کوشتار. با ببێتە درِندەیی. وەحشیگەری. کورِە جا بە من چی؟ ئەوە هاتین و چاکەیەکمان کرد، خراپەمان لێ دەکەنەوە. باشە سەرت نایەشێ بۆ پرِێسکەی لێ دەبەستی؟ ئەوانە زۆر لە مێژ

ساڵە خوێنی یەکتری دەخۆنەوە. لێ گەڕێ با هەتا جووقەواریان لێ دەبڕێ، هەر خوێنی یەکتری بڕێژن. تارمایی سێبەرە درێژەکەی دەگەیشتە لك و پۆی خوار خوارەوەی چنارەکە. پشتە کۆماوەکەشی وەك کەوانێك... چاوە قیچەکانیشی لە دوو هێڵ دەچوون. لێوەکانی وەك قورقوشم بەسەر یەکدا کەوتبوون. دەستە چەپەکەی جاروبار توند رادەوەشا. باشە وازی لێ بێنم چ دەبێ؟ هیچ. دیسان یەکتری دەکوژن. کێ زیانی لێ دەبینێ و کێ قازانج و سوود؟ لەو نێوەدا ئەوەی زیان و خەساری وێدەکەوێ، نیشتمانە. پێیان وایە ئەمن بۆ خۆنواندن قۆڵم لەو کارە هەڵماڵیوە. چون بێکار بووم، چونکە هیچم لە دەست نەهاتووە، خۆم لەو کارە گرنگە داوە. ئەوە دامنا وا بوو، ئەمنیش وازی لێ دێنم. وەباڵ بە ئەستۆی ئەو پیرە سەگە بنێسە.

عەبدولخالق ئەفەنیی قەباڵەنووس. عەبدولخالق ئاراش. وەزیرزادە. پیاوێکی درێژ و دەیلاخ، گۆچانێکی زیوکفت بە دەستەوە. هەر ئەوەی خوێندەوارانە قسە دەکا و ئەوەندە وشەی زل زل و نامۆ دەخاتە نێو قسەکانییەوە، کەس نازانێ دەڵێ چی. ئای ی وەلیی حەسەن ئاغا، چما تۆ هەر ئەو کەسە نیی کە پێش ئەوەی ببیتە ئاغا، پووشکە و دارت بۆ ماڵەکەی عەبدولخالق ئەفەنیی قەباڵەنووس دەکێشا؟ جار و بارە فاتەگوڵێشت بۆ دەبرد؟ بەو کولمەی وەك گوڵ و تورت و گووپن و چاوە سەوزانەیەوە؟ ئەویش هەر بۆ چەند دراوێکی رەش؟ ئاخرییەکەشی عەبدولخالق ئەفەنی قەباڵەکەی موڵکی سازانلیی بەناو کردی. ئەتۆ دوایی دەزانی چ چاکەیەکت دەرهەقی دەکەم وەلی حەسەن. نەوە و نەتیژەت هەتا رۆژ بازاڕی قیامەتێ دوعای بەخێرم بۆ دەکەن وەلی حەسەن. بڕۆ ساباتێك لە زۆنگاوەکەی سازانلیدا و لە لای چەپی مەزراکەتەوە هەڵبەستە و ببە بە خاوەنی موڵك. فاتەش بخوازە دەڵێی ماینی کەحلانە. حەڵاڵت بێ. چەندی دڵت بخوازێ منداڵت بۆ دەخاتەوە. ئەمن زۆری لێ رازیم. خودا لە تۆ و لەویش و لە ژنەکەی منیش رازی بێ. فاتەگوڵ تام و بۆنێکی دا بە ژیانی من. هەتا ئەو پیاوە سپڵە و پێ نەزانانە نەیانقۆستۆتەوە، بیهێنە.

جا ئەتۆش لەگەڵ فاتەگوڵ زەماوەندت کرد و منداڵت لێی بوو. حەوت کوڕ و حەوت کچ. هەر هەمووشیان لە موڵکەکەی سازانلیدا پێگەیشتن. زۆنگاوەکە وشکی کرد. کوڕە شێت و بێ شەرەفەکانت لە "بار"ەکانی ئەدەنەدا وەك خۆڵ، پارەیان خەرج کرد. تۆو و تۆرەمەت بڕایەوە. کوڕە گەورەکەت لە تاشچی قان لە سەر قەحپەیەك کوژرا. فاتەگوڵ هێشتا هەر بسکەبسکێتی و دڵی ترپەی دێ و جار و بارە سەرێك لە عەبدولخالق ئەفەنی هەڵدێنێتەوە. ئەوە بەخێر تەمەنێکیشی بەڕێ کردووە، بەڵام هەموو دنیا دەزانن چ سوڕێکیان لە نێوان دایە. چل ساڵی

ڕەبەقە هەر سرتوخورتیانە. فاتە گوڵ گوتوویەتی، تەمەنم سەت ساڵانیش بێ، پێیەکیشم لە سەر لێوی گۆڕ بێ، دیسان ئەوم هەر... دیسان ئەو گیایەی لە سەر گۆڕەکەشی دەڕوێتەوە، هەر بانگی ئەو دەکا. ئەی تۆ چکارەی وەلی حەسەن؟ ئەتۆ لەو نێوەدا چکارەی؟ ئەتۆ لەو ماڵەدا چ گوویەك دەخۆی؟ کام یەك لەو منداڵانە لە تۆن و کامیان لە عەبدول بەگ؟ ئاخۆ دەتوانی هەڵیان هاوێری؟ ئەگەر خۆت نەتوانی ئەوا خەڵك باشیان هەڵداوێرن. وردیلە و لەڕ و لاواز و ڕەشەکان لایەك و کەڵەگەت و چاو هەنگوینی و کاڵ و ژیکەڵەکان لە لایەکی دی... چۆن خەوت لێ دەکەوێ پیاو؟

سلێمان سامی لە دڵەوە نەڕاندی:"دیسان تووشی یەکتری دەبینەوە. ئەوە خۆتت پێ پیاوە؟ بڕۆ نانێك بخۆ و نانێك بکە بە سەدەقەی موڵکەکەی سازانلی، هەتیوە پووشکە کێشە. ئەگەر ئەو هەرمەنییانە لێرە دەرنەپەڕیبایەن، ئێستا دەبوو گۆشتی گونت بخۆی. فاتەگوڵ هەر گاندەر دەبوو و ئەتۆش کۆڵکێش. دوعایە بکە هەتیو بڕۆ دوعا بۆ گیانی سەرکیس دوودین بکە. سەرکیسی خەزێنەدز... سەرکیس ئەفەنی. ئەگەر سەرکیس ڕای نەدەکرد... ئەگەر دەرنەدەپەڕی... سەرکیس... سمێڵ بابڕ، ددان زێڕ. ئەموستیلەیەکی گەورەی لە قامکی دەکرد کە ڕوخساری بنیادەمێك و شێرێکی لە سەر نقیمەکەی بوو. ئەو ئەموستیلەیە ئێستا لای باوکی منە. باوکم سەرکیسی نەکوشت. هەر ددانەکانی و ئەموستیلە و دەمانچە "بیلیك"ـە بولگارییەکەی لێ ئەستاند. دەڵێن زێڕەکانیشی لە چنگی دەرهێنابوو. بەڵام درۆیە. چونکە ئەگەر زێڕەکانی ئەو کەوتبانە دەست باوکم، یانی ئێستا ئاوا تووشی ئەو نەبوونییە دەبووین کە بۆ نانی شەوێ دابمێنین؟ ئااخ سەرکیس. ئاای، ئەتۆ لە سایەی سەری سەرکیسەوەیە بوویەتە پیاوی نێو پیاوان. هەموو دنیا ئەوە دەزانن. هەمووان ئەوەیان لێ ڕوونە و دەزانن کێ سەرکیسی کوشت و کێ نەیکوشت. لێمگەڕێ با زار نەکەمەوە. ئەمن وا دەستم لەو کارە هەڵگرت..."

لە بن دارەکە تەکانێکی لە خۆی دا و داهاتەوە و دیسان قیت بۆوە و بەرەو بازاڕێ وەڕێ کەوت. ئاگای لە خۆی نەبوو و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ڕێبوارەکان، شانی لەم و لەو دەکوتا. بای دایەوە و بەرەو لای سەرووی شار ڕۆیشت. چاوی هیچ کوێی نەدەدی. دەکەوتە نێو قوڵکەیەکەوە و دەهاتەوە دەرێ وەك هیچ نەبووبێ. ڕاستەوڕێ ڕۆیشت و سەیری کرد گەیشتووەتە ماڵی وەلی حەسەن. حەوشەکەیان چەند دار توویەکی تێدا بوو کە یادگاری هەرمەنییەکان بوون. ماڵەکەش هەوەتر. سلێمان سامی لە خۆیدا نوقم ببوو و لە بەر خۆیەوە دەیگوت... ئەوە چەند ساڵە هەرمەنییەکان لێرە ڕۆیون؟ سپیکارییەکەی ماڵەکانیان هەر وەکی

خۆی ماوەتەوە. ئەو خانووەش هەر ئی سەرکیس بوو. باشە وەلی حەسەن ئەو ماڵەت لەکێوە بە میرات پێگەیشتووە؟ باشە سەرکیس بابی تۆ بوو؟

کە دەرگای حەوشەکە کرایەوە، وەلی حەسەن وەك قوزەڵقۆرت لە لاشیپانەی دەرگاکەدا سینگی بە سینگییەوە نا. وەلی حەسەن هەر چاوی پێی کەوت، نەیهێنا و نەیبر، زاری کردەوە و چاوی قووچاند، ئەوی بە زاریدا هات پێی گوت. زۆر پیس لە دین دەهری ببوو. ئەو هەر دەینەڕاند و سلێمان سامی هەروا دانی بە جەرگی خۆیدا دەگرت و ملی لەبەر یەك دەکێشایەوە و هیچی نەدەگوت. ئاخرییەکەی لێوەکانی لێك ترازان و دەنگی دەرهات:

"ئەمن وازم لێ هێنا ئاغا. دوای ئەو هەموو راکە راکە ماچم کرد و وەلاوەم نا. ئیتر وازم لێ هێنا. با یەکتری بکوژن."

ئەوەی گوت و گەڕایەوە و خۆی کووڕ کردەوە و وەڕێ کەوت.

شڵەژابوو. لە گیانی خۆی وەڕز ببوو. کوڕە خۆ لەو دنیایەدا پیاوێکی خێرخواز نەمابوو. لە زاری خۆیدا یەك پشوو جوێنی دەدا. مولکەکەی سازانلی و عەبدولخالق ئەفەنیی هەر لەبیر چوبووەوە. جوێن بارانەکەی یەکسەر بەرەو خەیاڵ دەڕۆیشت. لە سەر شۆستە بەردەچنکراوەکەی بازاڕ بە لارەوە لارەوە پیاسەی دەکرد. حاجی عوسمان ئاغا. ئەویش ریش چەرمووە. ئەگەرچی زۆر خۆشەویست نییە، بەڵام روو خۆشە. ئەویش مولکەکەی خۆی بە هەزاران فرت و فێڵ بەدەست هێناوە...

لە نزیك ماڵەکەی عوسمان ئەفەنییەوە دەهات و دەچوو. هەر هاتوچۆی بوو. دڵەکوتەیەك لە ناخیدا سەری هەڵێنا و دامرکایەوە. سەری هەڵێنا و دامرکایەوە و ئاخرییەکەی کە سەیری کرد ئەوە گەیشتووەتە نهۆمی دووەمی ماڵەکەی. کابرایەکی ردێن تاشراوی لامل چرچن و چاو خێلی لە پێش قوت بۆوە. حاجی عوسمان ئاغا پێدەکەنی و دەیگوت:"دەی باشە، باشە کوڕم سلێمان. ئەتۆ پیاوێکی خێرخوازی. نەك باش نییە، گوناحیشە. پیاوکوشتن گوناحی کەبیرەیە و هەر کەس پێشی پێ بگرێ، خێرێکی زۆر لە کارنامەی کردەوەکانیدا دەنووسرێ. نەکا راوەستی. ئەتۆ گوێ مەدە بە قسەی وەلی حەسەن ئاغا کوڕم. ئەتۆ نابێ بەو قسە پڕ و پووچانە هەنگاوت شل بن. ئەو هەر خۆی پیاوێکی مرچ و مۆن و بەدگوزە. هەر باسیشی مەکە. کێ هەیە و بە شتەکەی عەبدولخالق نەزانێ؟ باسی منداڵەکانی هەر مەکە مە. جا بە ئێمە چی. ئەتۆ شل مەبەوە. سەیر کە گیانی من، ئەتۆ کارێکی خێرە و دەیکەی و کاری خێریش تەڵحاگرتنەوەی ناوێ. ئەگەر کەسیش نەچوو، خۆم و خۆت دەچین. راسم بەگیش دێ.

هەرچۆنێك بووە دەبێ کۆتایی بەو مەسەلەیە بێنین. خەریکە ئەخلاقی شارۆچکەکە تێك دەچێ. دەترسم خودای نەکردە، هەر هەمووان چاو لەوان بکەن و ئیتر جڵەوی کارەکە لە دەست پیاوە ژیرەکان دەربچێ و ببێتە تێکە و لێکە و بکوژە و بگرەیەك سەگ خاوەنی خۆی نەناسێتەوە. پیاوکوشتن شتێکە لێی دەگرنەوە. ئەگەر بێت و بتەنێتەوە، هەرکەس دەستی بگاتە ئەویتر دەکوژێ. بۆیە تا درەنگ نەبووە دەبێ پێشی بگرین. ئاوەکە دەبێ لە سەرچاوەکەیەوە بگیرێتەوە. بێت و ئەو شتە هەر وا بڕوا، گیانی هەموومان دەکەوێتە مەترسییەوە. بەڵام بە قسەم بکە، ئەوەی لە وەلی حەسەنت گێڕایەوە لە هیچ کوێی دیکەی نەگێڕییەوە کوڕم سلێمان. دەترسم خۆت تووشی گێچەڵ بکەی. وەلی حەسەن ئاغا، لەو بەفرت و فێڵ و بەدەهۆیانەیە کە بەزەیی بە چاوی خۆیشیدا نایە. هاکا دیتت کوردێکی کوێستانیی لێ راسپاردی و بە کوشتی دای. چما خوێنی بنیادەمێك چەندەیە؟ خوێنی کوژراوێك لە پێنج سەد تا دووهەزار و پێنج سەد. ئااخ، ئەگەر تەمیرە کوردە زیندوو دەبوو، چما وەلی حەسەن دەیتوانی لە حاندی من سەر هەڵێنێ و بڵێ پیاوم و سازانلیم لە چنگ دەربێنێ؟... یا... ـ ... ئاگات لە خۆت بێ رۆڵە سلێمان. دەبێ کەنگێ بچین؟"

"سبەینێ گەورەم. لە سبەی زووتر نییە. دەکرێ سبەی بێ؟"

"سەیر کە سلێمان. ئەم شارۆچکەیە بەتەنێ هیچی پێ ناکرێ. بچۆ ئەدەنە و کووزان. ئەوانە رەچەڵەك و بنەماڵەیان زۆر بەلاوە گرنگە. هەوڵ بدە خەڵکێکی رەسەنزادە و ماقووڵ بدۆزییەوە. ئەگەر عەلی ئاغا کوردەمان لەگەڵ نەبێ، هیچ ناکرێ. کورد ئۆغلی و خورشید بەگیش هەڵگرە و بیانهێنە..."

سلێمان سامی گوتی:"ئەو رۆژانە بەسەرچوون کە خەڵك لە سەر شتی هیچ و پووچ یەکتریان دەکوشت."

بە دەنگێکی بەرز چەند جاران پاتەی کردەوە:"بەسەرچوو... بەسەرچوو... بەسەرچوو..."

لە سەر قسەکەی خۆی رۆیشتەوە:"کۆتایی بەو مەسەلەیە دێنین. بە کوشتن و زوڵم و ناهەقی. وایە؟ ئەتۆ ورەت پێدام مامە گیان. جا هەتا پیاوماقووڵ و گەورەی وەك تۆم لە پشت بن، نابەزم و کۆڵ نادەم."

"پیاوی بە رەچەڵەك و رەسەن بدۆزەوە کوڕم. پیاوی بە ئەزموون و دنیادیتە و نەجیمزادە. نوێنەرەکانی پەرلەمانیش هەروەتر. خالیدە شێتیشت لەبیر نەچێ ها. ئەگەر وای"پارێزگار"یش بێ..."

"دەچمە لای ئەویش. یان دەمرم یان کۆتایی بەو کارە دێنم. یان مەرگ یان... یا... ئەوان ئیتر یەکتری ناکوژن."

سلێمان سامی کەیفخۆش و بەدەماخ بوو. تێریشی خواردبوو و قاوەیەکیشی بەسەردا کردبوو. پەنجا لیرەیەکیشی لە عوسمان ئاغا وەرگرتبوو. ئەگەر هەمووان وەك عوسمان ئاغا بوونایە، خەمی چیی بوو. جا با تا ئێستا چوار کەسیشی کوشتبێ، دەی با وابێ. ئێستا ئەوە دەستی لە پیاوکوشتنێ هەڵگرتووە... دوو کوڕە پارێزەرەکەشی هەر دووکیان دیموکراتن. هەر دووکیشیان... هەر دووکیشیان بەو زووانە دەچنە پەرلەمان. ئەگەر دەروێش بەگ دەستی لەو کارە هەڵگرتبا و چووبایەتە نێو سیاسەتەوە، بۆ نیشتمانەکەمان زۆر بە سوود دەبوو. کوڕە ئەو زرتە زەلامانەش خولق و خوویەکی سەیریان هەیە. لە نەکاو دەبینی بوونەتە "عیسمەت پاشا"یی. کوڕە ئەو عیسمەت پاشایە هەر دەڵێی خودای ئەو قەدیمی و نەجیمزادانەیە. ئەدی خودایانە. چما عیسمەت پادشا ئەنگۆی نەگەیاندە ئەوڕۆ؟ دەبەنگینە؟ هۆی ی ی ی هۆی ی ی ی.

"راسیم بەگ، راسیم بەگ..."

"زۆر چاکە، زۆر زۆر باش. هەم دەروێش بەگ و هەم ئاق یۆللی"ش بێ و نەبێ گاوگەردوونمان لە پێش دەکەن. وا نییە؟ "راکی"یەکەشی لەسەر دەبێ. ئەو هەمووە خەڵکەی لێیان میوان دەبن. داوایان لێ دەکەین، لەبەریان دەپاڕێینەوە لە خوێنی یەکدی خۆش بن. وا نییە. کوڕە خۆ ئەوەندەش کەر نین خۆ لە یەك دوو پیاڵە راکی بدزنەوە.

"ها"؟

سلێمان بە شڵەژاوییەوە وەڵامی دایەوە:"بەڵێ، وایە".

تەح، بە راستی خەڵکی ئەو شارۆچکەیەش زۆر بڵەن. کەس ئەوەندە لەسەر کارێك سوور و شێلگیر نییە.

ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت. ئەوان یەکتری دەکوژن و لەو شارەشدا هەر کەسە و لە بیری خۆی دایە. وا نابێ نا. براکانمان دەکوژرێن، هۆی خەڵکینە. براکانمان خەریکن یەکتری دەخۆن. یەکتری دەخۆن. با بخۆن چاویان دەربێ. رووی لە حاجی عوسمان کرد و گوتی:"ئەسپێکم دەویست مامە گیان."

"باشە، باشە کوڕم."

کە سواری ئەسپەکە بوو، ئەو قسە خۆشانەی لە گوێی خوێند:"ئەو خەزایەت لێ پیرۆز بێ رۆڵە سلێمان. ئەو کارە تەواو بکە، دوایی کارێکم پێتە."

"خوا راوەستاوت بکا عوسمان ئاغا... شتێکی هەر لێ دەکەم."

تەنگی ئێوارە، گەیشتە بەر دەرگای ماڵی عەلی ئاغا کوردە. عەلی ئاغا بە رووگەشییەوە فەرمووی کرد:"هێشتا ئەو کارەت تەواو نەکردووە سلێمان سامی بەگ؟"

سلێمانیش بە ئاخێکی قووڵەوە وەڵامی دایەوە:"چما وا سووك و سانا تەواو دەبێ عەلی ئاغا؟ ئەوە یەکیش تەواو بوو، پێنجی دیکە قوت دەبنەوە. دەعبایەکی خوێنمژ لە ناخی بنیادەمەکاندا هێلانەی کردووە. تاوێك دەنوێ و هەزاران دەم بەخەبەرە. ئاخ، چۆن لەگەڵ ئەوانە بچارێین؟"

سلێمان دوو رۆژ لە ماڵی عەلی ئاغا مایەوە. لە ژوورێکی گەورەدا کە بە، مافوور و بەڕەی تورکمانی رازابووەوە، لە نوێنی پەڕی قازدا نوست. تێر زگی خۆی خواردی و خواردییەوە.

کە دەست لە گونان درێژتر لە ماڵەکەی عەلی ئاغای کورد وەدەرکەوت، لەوانەیە بۆ سەدەمین جاری بوو پاتەی دەکردەوە:" ئاخ، ئاغای خۆم، ئەگەر توانیبات بیّی، ئەگەر ئەزیەتت کێشابایە، ئەو کارەمان جێبەجێ دەکرد."

عەلی ئاغای کورد، کە جڵەوی ئەسپەکەی ئەوی گرتبوو، گوتی:"رۆڵە، ئەمن زۆر پیر و کەنفت بووم. ئەگینا چۆن، رووی کەسێکی وەك تۆ نەجیم و ماقووڵم لە عەرزی دەدا؟ ئەوە بۆ خۆت دەمبینی بە سەر پێیانمەوە خۆم پێ ناگیرێ. پێم لە سەر لێوی گۆڕە. ها ئەمرۆ بمرم، ها سبەی. ئەتۆ کاری خۆت بکە. پێیان بڵێ ئیتر کەسی رەسەن و بە رەچەڵەك نەماوە. تورکمان تۆویان بڕاوە، رەسەنەکان نەماون. پێیان بڵێ ئیتر دەست لە کوشتنی یەکتری هەڵگرن. ئیتر بەسە، ئەوەی کوشتوومانە بەسمانە."

سلێمان سامی گوتی:"وا دەڵێم."

ئیتر قەمچیی لە ئەسپەکەی راکێشا.

هەر وا کە ددانەکانی لە سەر یەك داگرتبوون، لە بن لێوانەوە گرماندی:"بێ شەرەفینە. کەس دۆستی کەس نییە. ئەوانە خەریکن یەکتری دەکوژن و ئەمانەش وا... وا دەڵێم عەلی ئاغا، پێیان دەڵێم. ئەی دوایین بەگی رەسەن، وا دەڵێم. پێیان دەڵێم براکەم، بەگم، ئاغام، پاشام. دەڵێم عەلی ئاغای کورد دەڵێ، وا بکەن و وا بڕۆن ئیتر ئەوانیش دەست لە یەکتر کوشتن هەڵدەگرن. دەیڵێم براکەم، ئاغای خۆم."

دەستی بۆ گیرفانی برد. بەتاڵ بوو:"کوڕە ئەتۆ سەیری ئەو گووخۆرە بیّ شەرەفە بکە. چما پیاوێکی قۆڵی لە کارێکی ئاوا گەورە و خێر هەڵماڵیبیّ، بۆ ئەوەی دەبیّ بە گیرفانی بەتاڵ بەڕێی بکەن؟ ئای ی ... لە باب و باپیری هەزار بەگ و ئاغا و پاشای وەك تۆ..."

سیّ رۆژ دواتر هاتە ئەدەنە. لە تەنیشت کاروانسەرایەك ئەسپەکەی بەستەوە و چووە دووکانێکی بەرگدروو. جلوبەرگە نیلییەکەی لە توورەکەکەی دەرهێنا و دای بۆیان ئوتوو کرد و هەر لەویّ لە پشت مێزەکەوە لەبەری کردن و شمەکە کۆنەکانی لە توورەکەکەی نا. پێڵاوەکانیشی دا بۆیان بۆیاغ کرد و ردێنیشی تاشی و سەریشی کورت کردەوە. کورتی ببڕینەوە دوای ئەوەی جوان و زەریف خۆی تیف تیفە دا، بەرەو کۆشکەکەی قایمقەمام وەڕیّ کەوت و کاتی وەرگرت بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزگار.

چاوپێکەوتنەکە خرایە دوانیوەڕۆ. نانی نیوەڕۆی لە کەبابخانەیەکدا خوارد. کەبابەکە بەبیّ پیواز زۆر بە دڵییەوە نەنووسا، بەڵام بلّیی و نەڵیی کەبابی ئەدەنە بوو. پارێزگار بەرەبەری سەعات سیّ ئیزنی دا بچێتە لای. چەند جاران لە هەمبەری پارێزگاردا دەست لە سەر سینگ نووشتایەوە. پارێزگار کڕنۆش و نووشتانەوەکانی ئەوی بە چاوێکی رەزامەندییانەوە سەیر کرد و ئەوجار جێیەکی بۆ دانیشتن نیشانی دا. سلێمان سامی وەقسە هات و پارێزگار هاتە نێو قسەکانییەوە:"دەزانم. ئەو مەسەلەیە وەك سەرەتانێك وایە کەوتبێتە گیانی وڵاتەکەمانەوە. ئەگەر هەر کامەیان بۆ مەڵبەندێکی دیکە دوور بخەینەوە، دەروێش بەگ بنێرینە وان و مستەفا بەگیش بنێرینە ئایدین یان ئەدرنە... بەڵام مخابن هەلومەرجەکە لەبار نییە بەداخەوە..."

سلێمان سامی بە لەبزێکی پڕ لە کەسەرەوە دووپاتەی کردەوە:"لەبار نییە."

دەسبەجیّ لە قسەکەی زیاد کرد:"خۆ ئەگەر لەباریش بیّ و بکریّ دووریشیان بخەیتەوە، دیسان هەر یەکتری دەدۆزنەوە و یەکدی دەکوژن. پێشتریش بابی باپیرەی مستەفابەگ لەو کوشتن و کوشتنەوەیە بێزار ببوو و رای کردبوو چووبووە سلانیك. سلانیك ئەو کات موڵکی ئێمە بووە جەنابی پارێزگار. حوکمەتی عوسمانیش هەر لەویّ زەوی و زارێکی هێندەی چوکووراوای لە بەر دەستی دەنیّ. عەرزی پاشای خۆمی بکەم، کە پادشا لە سلانیك کۆشکێکی وای دابوویە، ئێستاش کە ئێستایە ئاق یۆللی" هەر پێی دەنازیّ. ساڵێکی بەسەردا رانابریّ رۆژێکیان سەیر دەکا ئەوە برای باپیرەی مستەفابەگ لە گۆڕەپانە سەرەکییەکەی سلانیك لە خوێنی خۆی گەوزیوە و نووسراوێکی ئاوای لە سەر سینگی دانراوە:" خۆ بێت و بچنە نێو سندووقێکی ئاسنیشەوە، یان را بکەن بچنە ئەوسەری دنیاش، هەر وەك مەرگ لێرە بەرۆکتانی

گرت، دیسان بەرۆکتان دەگرێتەوە. هەر هەمووتان دەکوژرێن. جا وا باشترە زووتر بگەڕێنەوە چوکووراوا و زێدەکەی خۆتان و ئەو پەڵەی ترس و راکردنە لە داوێن و سەرشانی خۆتان بکەنەوە و لە وڵاتی غەریبایەتیددا لە خوێن نەگەوزێن و گۆڕ غەریب نەکەونەوە. هیچ چارمان نییە جگە لەوەی ئاشتیان بکەینەوە. تۆ خوا ئەو کوڕە بەجەرگانەی نیشتمان کە بەژنیان دەڵێی خەڵفی چنارە، حەیف نین، پاشای گەورە؟ خۆ ئەگەر لە مەیدانی شەڕێ کوژرابایەن، دیسان شتێك بوو، بەڵام... هەر هەموو باب و باپیرەکانی من لە مەیدانی شەڕێدا کوژراون. باپیرەم، باپیرەی باپیرەم و باپیرەی ئەویش، بابم، خاڵوانم، مامەکانم، هەرچی نێرینەی بنەماڵەمانە لە مەیدانی شەڕێدا کوژراون. تاقە پیاوێکی ئەو بنەماڵەیە بە زیندوویی دەرچووبێ، منم و ئەمنیش هەتا ئێستا ئەو شانازییەم پێ نەبڕاوە بەشداری شەڕێك بم. جا کێ دەزانێ، لەوانەشە شانازیی ئەوەشم پێ نەبڕێ، لە مەیدان بمرم و لە نوێن و بانەکەمدا بمرم و ببمە پەڵەیەکی رەش بە سەر شان و داوێنی پڕ لە شانازیی بنەماڵەکەمەوە و نەریتی جوامێرانەی بنەماڵەکەم تێك بدەم. ئاخ، ئاخ پاشای گەورە، ئاااخ."

پارێزگار کە تێدامابوو و نەیدەزانی چۆن دڵی سلێمان سامی بداتەوە، گوتی:"ناڕەحەت مەبە ئاغا سلێمان سامیی خۆشەویست. ئەتۆش پیاوێکی مەزن و گەورەی. بڕوانە لەو کارە باشانەی تۆ قۆڵت لێ هەڵماڵیون و هەوڵیان بۆ دەدەی."

سلێمان سامی کە خوێنێکی گەرم گەرم خزیبووە بن پێستییەوە، ملی کێشایەوە و ئاخێکی لە ناخییەوە هەڵکێشا و گوتی:"تاقە ئاواتم ئەوەیە لە شەڕێکدا بکوژرێم. راستە ئەوەش خەباتە، شەڕە، بەڵام باشە ئەوە ئەستەم و ناخۆش نییە بۆ دوایین کەسی نەوەی بنەماڵەیەکی کە رانەهاتوون لە نوێن و باندا بمرن؟ بەلامەوە زۆر ئەستەم و دژوارە. ئەتۆ چ دەفەرمووی پاشای بەڕێز؟ ئەتۆ کەی سەرێك لە شارۆچکەکەمان هەڵدێنی و گەورەمان دەکەی؟ چەندی پتر خۆی لێ بگنخێنین، خوێنی خەڵکێکی دیکە بە ناهەقی دەڕژێ. دەبێ تا زووە ئەو مەسەلەیە ببڕێنینەوە... تا چاوم بە جەنابت کەوت...."

"یانی تۆ پێت وایە؟"

سلێمان سامی هەر وا بە هەژاوییەوە وەڵامی دایەوە:"تا زووتر دەستی لێ ببزێوین، باشترە. کاری خێر تا زوو بیکەی درەنگە."

ناهێڵم زۆری پێ بچێ دێم. سڵاوم بە جەنابی قایمەقام بگەیەنە."

"بەسەر چاو."

هەواڵی ئەوەیکە پارێزگار دێ و دەچێتە لای پیاوماقووڵەکانی چوکووراوا و دەروێش بەگ و ئاق یۆللی" دەمودەست بە شارۆچکەکەدا بڵاو بووەوە. ئەوە هەمووی سلێمان سامی ڕێکی خستبوو. یەکێ دەیگوت:"ئەو کارە هەر بە پارێزگار جێبەجێ دەبێ."

ئەویتر دەیگوت:"پارێزگاری چی، پادشاش بێ، عیسمەت پاشاش بێ ئەو کارە سەر ناگرێ. هەتا ئێستا زۆر بەگ و پارێزگار و پاشا نێوبژیوانییان کردوون، سێ چوار ڕۆژان ئاشت بوونەتەوە بەڵام لە نەکاو دیسان دەستیان کردووەتەوە بە یەکتری کوشتن.

یەکێکی دیکە دەیگوت:"ئەوە قانوونێکە. باشە ماسیی گەورە واز لە خواردنی ماسیی بچووك خۆ دەبوێرێ؟ هەڵۆ دەست لە نێچیرەکەی و گورگ دەست لە بەرخ هەڵدەگرێ."

کەسێکی دیکەش دەیگوت:"وەڵاهی جا بڵێم چی. چ بڵێم.... لەوانەشە ئەو کارە جێبەجێ بێ... کێ چووزانێ... نابێ بێهیوا بین. هیواکان لە بێهیوایی دان."

هەر هەمووشیان چاوەڕوانی هاتنی پارێزگار بوون.

ڕێك لەو ڕۆژانەشدا بوون کە دوو تەرم لە ڕێگەکەی بەرانبەر ئاناوەرزا دۆزرانەوە. هەر کامەیان خەنجەرێکیان هەتا مشتوو لە سینگی چەقێنرابوو. شکلێ و نەخشی هەر دوو خەنجەرەکەش ڕێك وەك یەك بوون. هەر دوو کوژراوەکەش دەتگوت سێوێکن و لەتت کردوون. سمێڵ و چاو و برۆیان سەرە موویەك لێك جیاواز نەبوو.

سلێمان سامی دەچووە ئەم قاوەخانە و سەری بەو دووکاندا دەکرد و دەخولایەوە و دەگەیشتە هەر شوێنێك، یەك پشوو دەیگوت:"خوایە شوکرت. خودایە شوکرت کە ئەو هەمووە کارەمان پێ کرا. ئیتر تەواوە. دوای ئەوە ئیتر هاو نیشتمانییە ئازیزەکانمان یەکتری ناکوژن و پێکەوە تەبا و ڕەبا دەبن. ئیتر نەجیمزادە خەریکن تۆویان دەبڕێ. ئیتر ئەو گۆی زەوییە خەریکە بێ نەجیمزادە دەکەوێتەوە. دەبێ وەك گلێنەی چاومان بیانپارێزین. ئەگەر ئەوانەی ماون، یەکتری بکوژن و وڵاتەکەمان نەجیم و ڕەسەنزادەی تێدا نەمێنێ، ئەی ئەو کات چ قوڕێ بەسەر خۆماندا بکەین؟ باشە چما نەتەوەیەك دەتوانێ لە کۆمەڵێك خەڵکی ئاسایی و ڕەش و ڕووت پێك بێ؟ خۆ نەتەوەیەکی پیاوماقووڵ و نەجیمزادەی تێدا نەمێنێ، ڕاوەستاو و بەردەوام نابێ... نەجیمەکان وەك خوێنی نێو دەماری میللەت وان. مایەی شانازین. ئێمە ئیزنیان پێ نادەین خۆیان لە نێو بەرن. ئێمە نەتەوەیەکی ڕەسەنین کە خەڵکە ماقووڵەکەمان و بەگەکانمان، ئەو گەورەییەی خۆیان بە فیڕۆ نادەن. پیاوکوشتن کارێکی ماقووڵانە نییە. بەڵام ئەگەر شەرەف و گەورەیی لە کوشتن و کوشتنەوەدا بکەوێتە مەترسییەوە، ئێمە ئیزن نادەین هەر وا ماقووڵانە

هەڵسوکەوت بکەین. پارێزگارەکەشمان خۆی نەجیمزادەیەکە. ئەوە راستە نەجیمزادەکان بە لای پۆست و پلەی پارێزگارێتییدا ناچن، بەڵام باشە ئەی پارێزگارەکەمان چیی کردبایە؟ دەورودووکان گۆڕاوە و ئەویش دوای سەقامگیربوونی کۆماری، بڵێی و نەڵێی قەبووڵی کردووە ببێتە پارێزگار."

گەورە و پیاوماقووڵەکانی ئەدەنە و کووزان و ناوچەکانی دیکە یەك لە دوای یەك هاتنە شارۆچکەکە. سلێمان سامی بە ناسیار و نەناسراوەوە بە پیر هەمووانەوە دەچوو و بە پێی پێگە و گەورەیی هەرکامەیان میوانداریی لێ دەکردن. شەش ئاغای بە تەنێ بردە ماڵەکەی وەلی حەسەن. وەلی حەسەن هیچ هیوایەکی بە هاتنی پارێزگار نەبوو، بەڵام نەهاتنەکەشی مسۆگەر نەببوو. هەر بۆیە هەوڵی دەدا لەگەڵ سلێمان سامی رووخۆش بێ. ئەویش دەبوو، خۆی بخاتە گەڵ ریزی ئەو کوێخا و کەیخودا ئاشتکەرەوانەی  پارێزگار لەگەڵ خۆی دەیبردن. ئەو سلێمان سامییە توتکە سەگە نەکا رۆژێك تۆڵە بستێنێتەوە و گورزی خۆی بوەشێنێ.

ترۆمبێلەکەی پارێزگار سەر لە بەیانیی رۆژێکیان لە گۆڕەپانەکەی شارەوانی رایگرت. قایمەقام و سەرۆکی پۆلیس و شارەوان هەر هەمووان بە غاردان خۆیان گەیاندە بەردەم ترۆمبێلەکە.

پارێزگار:"هەر ئێستا دەچمە ماڵی ئاق یۆللی". هەر بە راستی جێی داخە. گوناحە گوناح. شوورەییە. دواکەوتوویيە... چۆن دەبێ لە سەردەمی ئێمەدا... شتی وا چۆن دەبێ، گیانەکەم؟"

سەرۆکی پۆلیس خۆی رەپێش خست:"نابێ قوربان، نابێ."

قایمەقام گوتی:"مەحاڵە قوربان."

سەرۆکی شارەوانی گوتی:"نابێ نا، قوربان."

پارێزگار لە ترۆمبێلەکەی دابەزی:"با جارێ قاوەیەك بخۆینەوە و ئەوانەی لەگەڵمان دێن، خۆیان ئامادە بکەن. مخابن، شتی وا نابێ، باشە شوکور ئەورووپییەکان ئاگایان لێ نییە لەوەی خەڵکەکەی ئێمە ئەوەندە دواکەوتووە. مخابن، نابێ شتی وا نابێ."

ئەوی لەوێ بوون هەموو وەباڵیان بۆ کێشا و وێکڕا گوتیان:"نابێ، مخابن."

کاتێ والی خەریکی قاوەخواردنەوە بوو، سلێمان سامی چووە ژووری سەرۆکی شارەوانی. پارێزگار هەر دیتی، بە پێکەنین و رووخۆشییەوە لەبەری هەستا.

سلێمان سامی بە نیشانەی کرنۆش سەرێکی بۆ دانەواند و گوتی:"قوربان دەبێ شتێکت عەرز بکەم."

"تکا دەکەم، فەرموو سلێمان بەگ...."

"نیو سەعاتێکم ئیزن بدەن قوربان. خەڵکێك هەن دەیانەوێ لەگەڵ بەڕێزت بێن. نەجیمزادە و پیاوماقوڵ و بەگەکانی ئەدەنە و کووزان هاتوون لەو کارە خێرە پڕ لە شانازییەدا بەشدار بن. بە پاسێکی گەورە لەگەڵت دێن. هەر هەموویان دەیانەوێ ئەو پەڵەیەمان لە نێوچاوان و داوێنی پاك بێتەوە و ئێمەش لەو دنیای شارستانییەتیەدا بگەینە شارستانییەتی خۆمان. هەر بۆیە زۆر پیاوماقووڵ هاتوونەتە شارۆچکەکەمان."

پارێزگار دوای ئەوەی قاوەکەی تەواو هەڵچۆڕاند، گوتی:"با چاوەڕێیان بین..."

مستەفابەگی ئاق یۆللی" دەمێك بوو بیستبووی پارێزگار بۆ ئەوە دێ ئەو و دەروێش بەگ پێك بێنێتەوە و ئاشتیان بکاتەوە، بۆیە دەستی کردبوو بە خاوێنکردنەوەی ماڵەکەی و دەستێکیشی بە دارودیوارەکەیدا هێنابوو و سپیی کردبۆوە و تەختی عەرزەکەی و دیوارەکانی کۆشکەکەی بە بەڕە و مافووری تورکمانی رازاندبوونەوە... چەند ساڵێك بوو بەڕە و مافووری کۆنی تورکمانی گران ببوون. هەر خوێندەوارێك چاوی بەو بەڕە و مافوورانە دەکەوت، سەری سووڕ دەما و زاری گەزێك دادەپچڕی و ئەوجار پەیتا پەیتا دەیگوت:"ئەی ئافەرم، ئافەرم... شانازیی رەچەڵەك و کەسایەتیمان.... لە وەها دەمودەستێکدا، لە نەکاو کەوتبوونەوە بیر "ئاشق"ـەکان[١]. پارێزگاری و نوێنەران و مامۆستاکان بۆ بیستنی ساز و گۆرانیی ئەو گۆرانیبێژ و شایەرانە ملی خۆیان دەشکاند. مستەفا بەگی ئاق یۆللی" گفتی لە ئاشقە کەچەڵەکانی بناری تۆرووسیش وەرگرتبوو. یەکێك لە شانازییەکانی ئاشقەکەچەڵەش ئەوە بوو کە لە تەرابلۆس لە هەنتەشی مستەفا کەمالدا سازی لێ دابوو. مستەفا کەمال ئەوکات پاشا نەبووە و لە بیابانەکەی عارەبستان گەلێك کێشە و گێچەڵیش بەرۆکیان گرتووە. لە شەوانی بیاباندا لە حاڵێکدا خەم و خەفەت سێبەری خستبووە سەر چاوە ئاسمانییەکانی (چاوە شینەکانی)، ئاشقەی بانگ دەکردە خێوەتەکەی و دەیگوت:"لێی دە، کوڕە لێیدە سووتاین و ئاگرمان تێبەربوو و فەوتاین."

کە ئاشق هات، ، مستەفا بەگ پێی گوت:"ئێستا لە لای پارێزگار باسی مستەفا کەمال پاشا بکە."

---

[١]. ئاشق، ئاشیق: لە زمانی تورکی و ئازەریدا بە گۆرانیبێژ و شایەرە میللییەکان دەگوترێ.

چ بە پارێزگار دەڵێ؟ یانی دەڵێ لەگەڵی ئاشت نابمەوە؟ بە پارێزگاری مەزنی کۆماری کە زەحمەتی کێشاوە و خاکەڕایانە هاتووەتە کۆشکەکەی ئەو، دەیتوانی بڵێ چی؟ ئاخ، بێت و ئەوەشیان سەری نەگرتبا، کە دیارە نەشیدەگرت، ئیتر ئەوە دوایین دەرفەت بوو. دەروێش و مستەفا بەگ دوایی دەرفەت. یان دەروێش دەکوژرێ یان مستەفا یان هەر دووکیان. کەسی دیکە نەمابوو کە درێژە بەو نەریتە، بەو نەریتی مەرگ یان ژیانە بدات.

عوسمانی بەو مەزنی و گەورەییەی خۆیەوە بەچۆکدا هات. تورکمانی گەورەش لە گیانەڵڵا و سەرەمەرگا بوو. ئەو دوا دەرفەتەمان پێ بدەن و لێمانگەڕێن بە دڵی خۆمان بیبەینە سەر و بفەوتێین. نە دەروێش و نە منیش هیچ کاممان کەسێکمان نییە درێژە بەو کارە بدات. لە بن هاتین. نەك هەر رەگ و ریشەمان، بەڵکو لك و پۆشمان نەما. لە لکێکەوە، لە سەر چڵووکی لکێکەوە هەتا نێوقەد و رەگەکەمان هەلاهەلا دەبین و دەڕزێین. ئاخ، ئەگەر دەروێش بێتە لام، بزەیەکی لە سەر لێو بێ و تۆزە خەفەتێکیشی بە روخسارییەوە بێ و سەری بەردابێتەوە بەبێ ئەوەی چاو لە چاوانم بکا، دەستی بێنێ و تاوێك چاوەڕێ بێ و جا ئەمن دەستە لەرزۆکەکەی ئەو بگرم و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەین و سەیری یەکتری بکەین هەروا... دوژمنایەتیی سەد ساڵانەمان، دوو سەد ساڵانەمان، سێسەد ساڵەمان لە نێو دەستەکانماندا بتوێتەوە و ببێتە دۆستایەتییەکی ئەوەندە گەورەی تا ئێستا بە نەسیبی هیچ ئادەمیزادێك نەبووبێ... ئەگەر لەگەڵ دەروێش ببینە دۆست، دۆست و برادەر....

کێ چووزانێ پارێزگار پیاوێکی چۆنە؟ بەشکم ئەگەر نووکی گۆچانە پەرجۆکەرەکەی بدات لە عەرزی، لە هەوا، لە دڵی ئێمە، لە ئاو، لە درەخت و لە دەستە دوژمن سروشتەکانی ئێمە... هەر هەموو شتێك لە چاوترووکانێکا بگۆڕدرێ و ببێتە دۆستایەتی. ئەدی، جەنابی پارێزگار، ئەگەر لەو دنیایەدا دوو نەفەر، تەنیا دوو کەس بتوانن راستگۆیانە و بێدرۆ لە دڵەوە ببنە دۆست، ئەو دوو کەسە من و دەروێش بەگین. ئیتر نەوەی ئەو بنیادەمانەی دەبوو تا دەمرن هەر دوژمنی یەکتری بن، کۆتایی هاتووە و بڕاوەتەوە. ئەوانەی وەك گیا دەڕوێن، ئەوانەی بە "پێنج" دەیکڕن و بە "دە" دەیفرۆشتنەوە، نە دەتوانن تا مێشکی ئێسقانەکانیان دوژمنایەتی بکەن و نە دۆستایەتیش. نە دەزانن ئەشق چییە و نە جوامێریش... ترس هەموو گیانیانی تەنیوە. ترس دەخۆن و ترس دەخۆنەوە و ترس هەڵدەمژن. لە ترسدا دەنوون و خەون بە ترسەوە دەبینن. ئاسمانی ژوور سەریشیان ترسە و زەوییەکەی بن پێیانیشیان تۆزێك متمانە و تەناهیی تێدا نییە. ئەوان نقوستانن، ئینسانیەتیان تێدا نەماوە و مرۆڤایەتییان لەبیر کردووە. میللەتی

بە پێنج وەگر و بە دە فرۆشەرەوەن. لێی گەڕێ جەنابی پارێزگار، وازی لێ بێنە... بەر لەوەی هیچ ئاسەوارێك لە مرۆڤایەتی نەمێنێتەوە، لێگەڕێ با وەك بنیادەمان لەو کەرێتی و گەمژەییەماندا بژێین. مەرگ هەیە و دەشبێ جەنابی پارێزگار.... ترس هەیە و هەر دەشبێ. بەڵام بنیادەمەکان هەر یەکسەر لە قوڕ و هەویری ترس دروست نەکراون.

دیسان شیرنە خەیاڵی ئاشتبوونەوەیان لە سەر دەستی پارێزگار هەڵیدەگرت و دیمەنی ئاشتبوونەوەیانی لە بەر چاوی ون نەدەبوو کە دەروێش سەری داخستووە و دەستەکانی درێژ کردووە بۆ تەوقەکردن.

مستەفا ئاق یۆللی" گوتی:"ئەوە مەحاڵە جەنابی پارێزگار. بەخێر هاتی و خێر و بەرەکەتت هێنا، بەڵام ئەو کارە کردەنی نییە. ئێمە بەهیچ کلۆجێ لەگەڵ دەروێش بەگی ساری ئۆغلی ئاشت نابینەوە. هەر بژییت و پایەدار بیت جەنابی پارێزگار. هەوڵەکەی بەڕێزت لە گەورەیی و ئینسانیەتی خۆتەوەیە. بەڵام ئەوە، ئەو دوژمنایەتییە ئەمن دەستم پێ نەکردووە کە ئەمنیش بیبڕمەوە. لە خۆراسانەوە تا ئێرە هاتووە و نەبڕاوەتەوە. کەس باشاری نەکردووە تا ئێمە بیکەین. وەك چۆن دەست و پێ و چاو و سەر بەشێکن لە ئێمە، ئەوەش بەشێکە لە ژیانی ئێمە. بەشێکی جیانەبووەوەیە لە ئێمە. بەبێ دەست و پێ و چاو و سەر دەکرێ بژێین، بەڵام بەبێ ئەوەیان نا. لەگەڵ شیرمان فرچکمان پێوەی گرتووە و دەبێ لەگەڵ گیانیشمان دەربچێ."

"یانی لەو سەردەمەدا و لە کۆماری تورکیادا ئەنگۆ یەکتری بکوژن و بەوەندەش رانەوەستن و نۆکەرە داماوەکانیشتان پێك بە کوشت بدەن و ئێمەش دەست لە سەر دەست دابنێین و سەیرتان بکەین، ها؟"

مستەفا بەگ رەنگی بە روویەوە نەما و کڕ و بێدەنگ بوو لە جێی خۆی وشك هەڵات. ئەگەر ماڵی خۆی نەبوایە، زۆر جوان جوابی پارێزگاری دەدایەوە و وای لێدەکرد لە ژیانی خۆی بێزار بێ. بەڵام مخابن هاتبووە سەر بەڕەی ئەو و لێی میوان بوو. لە بن لێوانەوە گوتی:"ئەو پەنجەیەی قانوون بیبڕێ ژانی نییە."

پارێزگار پتر تووڕە بوو:"وایە ئەو پەنجەیەی قانوون بیبڕێ ژانی نییە، بەڵام ئەو سەرەی قانوون دەیبڕێ ئازار و ژانی دەبێ."

مستەفا بەگ سەری لەگێژەوە هات و بەرچاوی رەش بوون. ئەگەر دەستی بە دیوارەکە نەگرتبایە، تلپ بە عەرزەکەدا دەکەوت. بە بێتاقەتییەوە خۆی خستە سەر قەنەفەکە.

به زۆری بزەیەکی هێنایە سەر لێوی و دەنگی لە قورگیدا گیرا:"جەنابی پارێزگار، ئەو سەرەش کە قانوون بیبڕێ، هەر ژانی نییە، دیارە سەرێك کە بۆ بڕین بێ...."

پارێزگار بە تێر و تەسەلی باسی شارستانییەت و دواکەوتوویی و پیاوکوژیی کرد و قسەکانی خۆیشی بەو وتەیە بڕییەوە:"جا مادام ئەو ئاشبوونەوەیە سەری نەگرت، ئەمنیش لێرە ناچمە دەرێ."

مستەفا بەگ وە مردووەکی لە سەر جێی خۆی گرمۆڵە بووبێ، ئاوا وێك هاتبووەوە و رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو. چاوەکانی هەڵێنابوون بەڵام هیچی کوێیان نەدەدی.

دوای پارێزگار، عەلی ئاغا کوردە کەڵەگەت و تیشکەڵە و بەساڵاچوو کە ئێسکی گیانی لە بن پێستەکەیەوە دەرەپەڕیبوون، دەستی بە قسە کرد. ئەو کە دوای هاتنەکەی پارێزگار رای خۆی گۆڕیبوو و هاتبووە نێو ریزی ئاشتکەرەوەکان، یادگارێکی سەردەمانی تورکمانی بوو. بە دەنگێکی لەرزۆك و چاوی فرمێسکاوییەوە گوتی:"مەکە کوڕم مستەفا مەکە. سەیرێکی من بکە و تیتۆڵێك لێ دادڕە. سەیر بکە بزانە ئەمن تینی ئەوەم لەبەر دایە بێمە ئێرە؟ بەڵام دەبینی بە حاڵی سەگیش بێ ئەوە هاتووم. هاتووم ئەتۆ و دەروێش لەو کێشەیە رزگار بکەم. ئەوەی ئەنگۆ لە سەری دەڕۆن نە لە مرۆڤایەتی دەوەشێتەوە و نە، و نە، و نە... هیچی دیکە... ئاشت بنەوە، ئیتر ئاشت بنەوە. دنیا پڕ بووە لە خەڵکی چەپەڵ و خراپەکار و دەستکیس. ئەگەر ئەنگۆ یەکتری بکوژن، دنیا بە پانەوە بۆ ئەو سەگەلە بەجێ دەمێنێ. جوامێری و ئینسانیەت لە سەر ئەو زەوییە نامێنێ، جا جوان بیری لێ بکەرەوە..."

بە دەستی راستەی ئاماژەی بە هەموو ئەو کەسانە کرد کە شان بە شانی یەکتری لە سەر قەنەفەکان دانیشتبوون و لە سەر قسەکەی رۆیشت:"جا لە دنیادا هەر ئەو گەند و گووانە دەمێننەوە... سەیر کە، سەیر بکە، ئەوانە، هەر ئەوانەی دراوێکی سووتاو ناهێنن. تۆ خوا حەیف نییە ئەنگۆ بمرن و بۆ ئەوانەی بەجێ بێڵن؟ بۆ ئەوانە کە خوێن و جەرگیان لە سەر یەك دراوێکی رەش ناهێنێ؟ ئیتر چیی لە یەکتریتان کوشتووە، بەسە. ئەوە لە حەوت پشتیشتان زیادە. ئەو دنیایە بۆ ئەو کەسانە بەجێ مەهێڵن کە بۆنی ئینسانییەتیان بەسەردا نەهاتووە. سەیر کە، هەر بۆ ئەوەی ئەم دنیایە بۆ ئەمانە بەجێ نەهێڵن، ئەوەی دێنێ دەست لە رشتنی خوێنی یەکتری هەڵگرن. جوان سەیریان بکە. تۆ خوا ئەوانەش پیاون؟ کوڕە ئەوانە پتر لە ژنان دەچن نەك لە پیاو. دنیا بۆ ئەو ژنانیلانە بەجێ مەهێڵن... هۆی، هۆی هۆی، مستەفا."

بالّتۆ کۆنە ئەستوورەکەی جوان لە خۆی وەرپێچابوو و، راوەستا و نیگا توند و تیژەکەی چاوە دەرپۆقیوەکانی نێو روخسارە رەقەڵەکەی بە سەر یەك بە یەکی خەڵکەکەدا گێڕا و تۆزێك لە سەر هەرکامەیان هەڵوێستەی کرد و رۆیشت تا مستەفای دۆزییەوە و لە سەر ئەو چەقی و دەنگی فەرماندەرانە و پڕ لە دڵنیاییەکەی تەلارەکەی داگرت:"دنیا بۆ ئەو خەنیمانە، ئەو جنۆکە بە روالّەت بنیادەمانە و ئەو توخم و تۆرەمەی شەیتانانە بەجێ مەهێڵە. قسەکانی من بۆ دەروێشیش بگێڕەوە. تورکمان لێیان دەقەومێ. سەیرێکی ئەو حاڵ و باڵەی تورکمانان بکە. باشە؟"

سووکایەتیکردن بەو خەڵکەی "مێرووله دەکڕن و بە نرخی گا دەیفرۆشنەوە" لە لایەن عەلی ئاغاوە، مستەفا بەگی وەخۆ هێنایەوە و جارێکی دیکەش بووژاندییەوە و ئەوجار بە لەبزێکی پێ زانانەوە گوتی:"خودا راوەستاوت بکا عەلی ئاغای خۆم. هەر بژی پیاو."

دەنگی هێمن و بێ لەرزتر ببووەوە و وردە وردە دەموچاوی دەهاتەوە سەرخۆ و رەنگی دەگرتەوە.

دوای ئەوە، هاوسەرەکەی گوێزوقارا ئۆغڵی دەستی بە قسان کرد. دەنگە پیاوانەکەی، پتەو و چاوقایمانە بوو:"ئەو هەمووە خەڵکە لە بەر تۆ هاتوون مستەفا. پارێزگاری گەورەی چوکووراوا... عەلی ئاغا کوردە. عەلی ئاغا کوردەش بە سەد ساڵ تەمەنییەوە. گەورە و مەزنی تورکمانان بەبێ ئەوەی گوێ بداتە تەمەنەکەی خۆی لە بەر خاتری تۆ هاتووەتە ئێرە. مەرگ تاڵە. ئیتر بەسە. گیاندانی مرۆڤێك، زوڵمێکی ئاشکرایە لە هەقی ئەودا. تێگەیشتی مستەفا؟ ئەتۆ دایك نەبووی، ئەنگۆ دایك نەبوون کە بزانن گیان چەندە ئازیزە. هەر دایکەکان دەزانن، گیانێك بایی چەندەیە؟ نرخی گیانێك چەندەیە؟ تێگەیشتی مستەفا؟ تەنانەت خوداش نەدەبوو مافی گیان ئەستاندنی هەبوایە. ئاخۆ بنیادەمیش جوانترین و شیرینترین و شادیهێنەرترین و دڵگرترین خوڵقاوی خۆی بە دەستی خۆی دەکوژێ؟ چما وا نییە مستەفا؟ تۆ خودا ئەوەش بوو بە چارەنووس؟ ئەوە چ چارەنووسێکە بەسەر بنیادەمدا سەپاوە؟ ئەتۆش، ئەتۆش مستەفا، لە خودا پتر خەریکی ئەو خوڵقێنراوە جوانە تێك دەدەی و دەیشێوێنی. تۆ خودا حەیف نییە ئەو بنیادەمە، مستەفا؟ چۆن دەکرێ زوڵمی ئاوا لە بنیادەم بکەی؟ ئەوەتا، مورتەزا کوژرا. لە رۆژێکی باراناویدا... مەکوژن مستەفا، هەی ببڕێتەوە ئەو مەرگە، مەرگی بنیادەمی خاکەسار، بنیادەمی خاکەسار."

خاتوون گوێزوقەرە ئۆغڵی کچی بەگی عێلێکی ناودار و ژنی بەگی عێلێکی ناوداریش بوو. مێردەکەی ئەو یازدە ساڵ دوای زەماوەندەکەیان کوژرابوو و تەرمەکەی فڕێ درابووە

نێوگاشەبەرد و ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا. کاتێك تەرمەکەیان دۆزیبووەوە، کە نیوەی پتری قەل و داڵ خواردبوویان. دواتریش هەر کوڕێکی پێگەیشت، کوژرا. تەرمی لاوە کوژراوەکانیشی هەر فڕێ دەدرانە نێو ئەو ڕەوەزانەوە و کاتێك تەرمەکانیان دەدۆزرانەوە کە قەل و داڵ پتر لە نیوەیان خواردبوون.

خاتوون گوێزوقەرە ئۆغلّی کاتێ تەرمی دوایین کوڕەکەی لە ئاناوەرزاوە بە شان دێنایە خوارێ، دیسان هەر نەگریا. تەنانەت لە سەر مەیتی دوایین کوڕیشی هیچ سەردولکەی نەگوت و شینی نەگێڕا. تەرمە لەتوپەتکراوەکەی لە ئامێزی گرت و هەر وەك چۆن منداڵێك رادەژێنن، ئاوا رایژەند و لەوێ سێ ڕۆژان لە سەر یەك لایە لایەی بۆ گوت و لاواندییەوە. هەرچی گوندی دەوروپشتی هەبوو، هاتن و لە دەوری کۆ بوونەوە و ئەو هیچ کەسی نەدی و هەر لایی لایی خۆی گوت.

دوایی هەستا و وەك بڵێی هیچ نەبووبێ، تۆز و خۆڵەکەی لەخۆی تەکاند و لە ڕەوەزەکانەوە هاتە خوارێ و لە دنیایە سەربەرز و ئازا و خۆڕاگر و تاك و تەنیا مایەوە. سواری ئەسپەکەی بوو. ژنێکی تا بڵێی جوان بوو. پڕ و گۆشتن وەك کارمامز، چاو ڕەش، هەر زگماك کلچووکی لە چاوی کێشرابوو... تورت و ساغ و... هەر وا نزیك ساڵێك ساڵ و نیوێك دوای هێنانە خوارەوەی دوایین گەنجەکەی لە ڕەوەزەکان و بەخاکسپاردنی بە گوڵ و ڕیحانەوە، ئیتر گوندەکەی عەلی ئۆشاغی ئەوی تێیدابوو بە بنیادەم و ماڵاتەوە کوژران. کەس نەیزانی ئەو کوشتارە سامناکە کێ کردی و چۆن کرا. دکتۆر و جەندەرمە و پۆلیس هاتن و چەند مانگ لەو گوندە خەریکی پشکنین و لێکۆڵینەوە بوون، بەڵام هیچیان بۆ نەچووەوە سەر یەك.

خاتوون قەرەگوێز ئۆغلّی گەلێ وایلۆك و چەمەریی بۆ ئەو مەرگانە هۆندەوە و چڕینی.

گوتی:"هەی قەڵا و قەت کەسی نەمێنێ ئەو مەرگە، هەی خوا بیباتەوە ئەو مەرگە، کاتێ کوڕەکەم گیانی دەردەچوو، گوڵەکان بە قیژە و زریکەوە هەڵدەوەرین."

ئەوانی دیکەش قسەیان لەگەڵ یەکتری دەکرد. ئاخری، نۆرە گەیشت ماهیر قاباقچی ئۆغلّی. زۆر زۆر تووڕە و شڵەژاو دیاربوو. لە حاڵێکدا بە هەژاوییەوە دەست و سەر و هەموو گیانی رادەوەشاند و دەیگوڕاند و دەمارەکانی ملی وەك گوریسیان لێ هاتبوو و سەر کوڵمەی سوور ببوونەوە، گوتی:" لەبەر ئەو جەللادە، ئەو جەللادە شێتەی ناوی دەروێشە، چۆن دەتوانین ڕوو لە مستەفابەگ بنێین؟... هەر دوێنێ بوو کە خوێنمژە براکەی مستەفا بەگی کوشت. هەر دوێنێ بوو باشترین پیاوی مستەفا بەگ واتە وسێنە ڕەشی داوای کوشت و کۆزێك منداڵی لێ

هەتیو کرد و تەرمەکەشی بەو چنارەوە کرد، جەنابی پارێزگار! بەڵام مستەفا بەگ پیاوێکی بەڕێزە. بەگێکی ڕەسەنە و پیاوێکی بە ڕەچەڵەك و بەر و پشت ئەتڵەسە*. ڕەچەڵەکێك کە خەریکە کوێر دەبێتەوە. دیارە بەخشین و لێخۆش بوون هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. بەڵام بەرانبەر ئەو دڕندەیە، بەرانبەر ئەو دڕندە خوێنمژە چیی پێ دەکرێ؟ هەر دوێنێ بوو کە براکەی کوشت و ئێستا دەیەوێ مستەفا بەگیش بکوژێ و وەجاغیان کوێر بکاتەوە. هەر من، خۆم ئەوە دەزانم. هەتا ئەو جانەوەرە لەو چوکووراوایەدا بێ، هیچ کارێك لێرە بەڕێوە ناچێ و هیچ شتێك سەر ناگرێ."

ئۆمەت ئاغا دوایین قسەکانی ماهیری قاباقچیی ئۆغلیی دووپاتە کردنەوە:"هیچ شتێك سەر ناگرێ."

جا ڕووی تێ کرد و گوتی:"ئەنگۆ نەدەبوو ئاوا باسی دەروێش بەگ بکەن. ئەوە سووکایەتییە بە مستەفا بەگ."

قاباقچی ئۆغڵی ڕاچڵەکی، زمانی شکا:"بەهیچ جۆرێك، بەهیچ جۆرێك، دوور لە ڕووی حازریان، ئەنگۆ نازانن چەنە لەو دەروێش بەگە تووڕەم. کار و پیشەی بووەتە پیاوکوشتن."

مستەفا کە ڕەنگی بە ڕوخسارییەوە نەمابوو و دەستەکانی دەلەرزین، هەستابووە سەر پێیان و گوتی:" دەروێش بەگ جانەوەر نییە. بە هیچ جۆرێکی وەحشی نییە. خوێنمژیش نییە. براکەشم ئەو نەیکوشتووە و کەسێکی دیکە کوشتوویەتی. وسێنە ڕەشیش ئەو نەیکوشتووە. دەروێش بەگ پیاوێکی زۆر ڕەسەن و بە ڕەچەڵەك و جوامێرە." ئەوەی گوت و بەهێمنی لە جێی خۆی دانیشتەوە.

ماهیر شێواو و دەستەوستان وەقسە هات:"تێناگەم، تێناگەم، چما من چم بە دەروێش گوت؟ هیچ نا..."

دیار بوو ڕاچەنیوە و دەیەوێ تێی هەڵبێنێتەوە و پەڵەکانی بشواتەوە:"ئەدی، ئەدی، دەروێش بەگ کابرایەکی نەجیم و ڕەسەنە. چما کەس دەتوانێ بڵێ وا نییە. چما کەس دەتوانێ بڵێ وا نییە؟ کوڕە کەفوکوڵ هەڵیگرتم و بۆ ئەوەی ئاشتبوونەوەکە سەر بگرێ، چەند قسەیەکم کرد. وا دیارە زۆرم شوو لێ هەڵکێشاوە. بەڵام مەبەستی خراپم نەبوو، هەر دەمویست ئاشتبوونەوەکە سەر بگرێ... ئاشتبوونەوە... ئاشتبوونەوە... واتە ویستم بڵێم پیاوکوژی وەحشیگەرییە. بۆ ئەوەم نەبوو سووکایەتی بە دەروێش بەگ بکەم. ئەو بەگێکی ڕەسەنە."

---

* بەر و پشت ئەتڵەس: واتە کەسێك کە لە دایك و باب ڕەسەنزادە و نەجیمزادە بێ.

پارێزگار بە تووڕەییەوە لە سەر جێی خۆی هەستا. لە قەڵافەتییەوە دیار بوو لە خۆی تووڕەیە لە ئەو چ کارێکی ئەو جۆرە کارانەیە. هەر دوو دەستەکانی لە گیرفانیدا بوون و جگەرەیەکی بە لێوانەوە و جوان دیار بوو بە سەر لێوییەوە دەلەرزی. کە پارێزگار هەستا، ئەوانی دیکەش هەستان. پارێزگار چووە نێوەندی ژوورەکە. جگەرەکەی بە لالێوی چەپییەوە نابوو. قولینچکی چەپەی لێوی زەرد هەڵگەڕابوو. لە بن لێوانەوە دەیبۆڵاند. راوەستا. لاقی راستەی هێنایە پێشەوە و لە حاڵێکدا دەستی راستەی هەر وا لە گیرفانیدا بوو، دەستەکەی دیکەی راوەشاند و گوتی:"هیچ خەمت نەبێ ماهیر بەگ. ئەتۆ قسەی چاکت کرد. راست وایە... ئەوانە...."

جا لە حاڵێکدا بە تووڕەییەوە دەستی بەرەو لای مستەفا بەگ راداشتبوو، لەسەر قسەی خۆی رۆیشت:"ئەوانە وەحشین. ئەوانە نەخۆشن. ئەوانە شێتن. ئەوانە دەبێ لێیان سوور بێ، کە دەوڵەتەکەمان چۆن گورزی گورچوبڕی خۆی لەو دەرەبەگایەتییە دەوەشێنێ و دایاندەپلۆسێ. قسەکانت بەجێ و ڕێ بوون ماهیر بەگ. پێیان دەڵێم پووتێك چەند کیلۆیە. ئەمن باش دەزانم چۆنیان ئاشت بکەمەوە. ئاشتکردنەوەی ئەوانە بە من. با ئەو کارە ڕێك بخەم، جا بەوانە دەڵێم قۆناغ لە کوێیە."

بە لۆق هاویشتنێ رۆیشت و لە تەنیشت ماهیر بەگەوە راوەستا و لە حاڵێکدا بزەیەکی لە سەر لێوانی بوو، سەری دانواند و بە سرتە شتێکی پێ گوت. ماهیر بەگ پێکەنی. دوایی هەردووکیان بە چاوی پڕ لە بەکەمگرتنەوە نیگای خۆیان بەسەر ئەو بەڕە و مافوورانەدا گێڕا کە تەختی ژوورەکەیان داپۆشیبوو. ئاشقە کەچەڵیشیان دی کە لە قوژبنێکەوە کرووشمەی کردبوو. بەویش پێکەنین. ئاشقە کەچەڵیش کە هەستی بە پێکەنینەکەی ئەوان کردبوو، لەبەر خۆیەوە پێکەنی. هەستا و هات و لە بەرانبەر پارێزگارەوە راوەستا و وەقسە هات:"ئەمن ئاشقی مستەفاکەمال پاشام وای پاشا. یانی پێش ئەوەی گوێت لە زایەڵەی سازەکەی من بێ لێرە دەڕۆی؟"

لە حاڵێکدا کە بزەیەکی بە سەر لێوەکانییەوە بوو و چاوی پڕ لە چاوەڕوانی و داوایی بەخشین و گەورەیی خۆی لە چاوەکانی ئەو دەبڕی، لە سەر قسەکەی خۆی رۆیشت:"ساڵێکی تەواو سازم بۆ مستەفا کەمال پاشا لێ داوە."

کە ئاشق قسەی دەکرد، پارێزگار هەلی ئەوەی بۆ رەخسا لە نووکی پێیەوە تا تەپڵی سەری لێی ورد بێتەوە. کەپۆیەکی زل بە نێوەڕاستی دەموچاوی ئاشقەکەی مستەفا کەماڵەوە بوو. شپرز و شڕ و شپڕێو بوو. ملیوانی کراسەکەی کەمرەی گرتبوو. دەستەکانی هەر کام هێندەی چەند دەست گەورە بوون. چاوەکانی تیژ و سینگی پان و سازە سەدەف نیشانەکەشی زۆر جوان بوو.

پارێزگار دوای ئەوەی لە سەیرکردنی بەژن و باڵای ئاشق بۆوە، لە خۆوە گوتی:"یانی ئاوا؟"

ئیتر ئاشقە کەچەڵ هەرچی داوا و زمانچەوری و ریایی و چاوەڕوانی و بزەیەی بە روخسارییەوە بوو رەواندییەوە و توند و تۆکمە گوتی:"بەڵێ، ئاوا."

ئیتر تەکانێکی لەخۆی دا و تەواو گۆڕا. بوو بە بنیادەمێکی دیکە:"چۆن هاتمە پێش چاوت، رۆڵە؟"

زایەڵەی دەنگەکەی، کە بەرز ببۆوە، بە دەموچاوی پارێزگاردا دەپڕژا:"ئەمن ئاشقی مستەفا کەمالم. تیتۆڵێك لەو دادرە جەنابی پارێزگار."

ماهیر بەگ دەسبەجێ قۆڵی خۆی لە قۆڵی پارێزگار دەرهێنا و لە ئاشق چووە پێشێ و چەپکێ پارەی لە گیرفانی ئاخنی و گەڕایەوە و لە تەنیشت پارێزگارەوە راوەستاوە و دەستی بەرەو لای پارێزگار درێژ کرد و ئەو کاتەی لە پلیکانەکان دەچوونە خوارێ گوتی:"داب و نەریتەکە وایە. دەبێ لەگەڵ ئاشقەکان روو خۆش بی."

پارێزگار کە تیزە بزەیەکی بە لێوانەوە بوو، بە چاوێکی بەکەمگرتنەوە، سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد.

سواری ترۆمبێل بوون.

# ٢١

عەلیجیك لە هەمبەر مستەفا بەگدا راوەستابوو و دەیگوت:"ئەمساڵ نا، ساڵی داهاتووش نا، ساڵەکەی دی."

چاوەکانی، چاوە سرك و بێ ئۆقرەکانی، پەیتا پەیتا لە گلێنەیدا دەسووڕانەوە. دەستەکانی عەلیجیك بچووك بوون. مستەفا بەگ بیری کردەوە کە ئەو پیاوانەی دەستیان بچووکە، زۆر گورج و بەکارن. عەلیجیك قسەی دەکرد. بنیادەمی ناپاك، دوو روو، ئاوان، هەرچیی هەیانە لە خەڵکی دەشارنەوە. چاوەکانی کەسك بوون، شین یان رەش؟ دیار نەبوو چ رەنگێکن. تەنانەت دایکیشی نەیدەزانی چاوی عەلیجیك چ رەنگن. هەر وەکی چاوی بنیادەمە ناپاك و لەبنەوەبڕەکان سات بە سات رەنگیان دەگۆڕا. مستەفا بەگ لە دوورەوە بنیادەمی دەناسی. هەر چاوی بە هەڵسوکەوت و رەفتاری یەکێك کەوتبایە، دەمودەست دەیزانی چ کارەیە و چۆنە. ئەگەر ئەو کاتە لێی تێنەگەیبایە، ئیتر زەحمەتی ئەوەی بە خۆی نەدەدا پتر لێی ورد بێتەوە و تێی بفکرێ. لە نەکاو ئەوەی بە زەینیدا رادەبرد، دەربڕی:"چەند منداڵت هەیە عەلیجیك ئاغا؟"

"حەوت منداڵ ئاغا. نۆکەرتن."

"چەند ژن، عەلیجیك؟"

"دوو ژن."

"خەڵکی کوێی؟"

"دەڕەی قووتی، لەودیوی کێوپارە."

"خواردن و پێخۆرت چۆنە؟"

"خودا بەگەکەمان، دەروێش بەگمان لێ نەستێنێ، لە سایەی سەریدا باشین..."

"له تفەنگ هاویشتنیّ چۆنی؟"

"له سایەی سەری تۆوە، خراپ نیم..."

"بەگت زۆر خۆش دەویّ؟ ئاخۆ متمانەی پیّتە؟"

"زۆر زۆرم خۆش دەویّ. له گیانی خۆمم خۆشتر دەویّ. ئەویش متمانەی پیّمە."

مستەفا بەگ ماوەیەك له عەلیجیك ورد بۆوەو دیسان دەستی كردەوە بە دواندنی. عەلیجیك وەك پەیكەرەیەك لە بەرانبەریدا راوەستابوو.

"دانیشە عەلیجیك."

تا عەلیجیك دانیشت، چاوی بە سەر هەموو جوولّە و هەلّسوكەوتییەوە بوو.

"باشە دەرویّش بەگ زیادە لە هەمووان بۆچی ئەتۆی ناردووەتە لای من؟"

"لەوانەیە لەبەر ئەوە بیّ كە ئەمن دەم و دووی باشم هەیە بۆ قسەكردن و دەتوانم ئەوەندەی یەك و دوو چل درۆ هەلّبەستم. ئەمن زۆلّی رۆژگارم. ئەوجار بەگ ئەمنیش بە بنیادەم دانانیّ. بەگ لە نیّو مولّكەكەی خۆیدا نەك هەر خەلّكەكە، بەلّكو سەگیّكیش بە بنیادەم دادەنیّ، بەلاّم ئەمن بە بنیادەم نازانیّ."

"ئەی خۆت چۆن بیر دەكەیتەوە؟"

"ئەمن، بۆی دەسەلمیّنم. بۆی دەسەلمیّنم لەو چوكووراوایەدا كیّ پیاوە. بۆی دەسەلمیّنم كە ئاخۆ جگە لە من كەس لە بنیادەم دەچیّ، یان نا. بە گویّی خۆم گویّم لیّ بوو."

"گویّت لەچی بوو؟"

"دەرویّش بەگ بە هیدایەتی دەگوت عەلیجیكی دەنیّرمە لای. ئەمن لە پشت دەرگاوە كە گویّم لە ناوەكەی خۆم بوو، قوت بووم و گویّم هەلّخست. بەگ بە هیدایەتی دەگوت عەلیجیك هاوشانی ئەوە. ئەگەر سەرانسەری ئەو گۆی زەوییە سەنگ و سووژن بدەی، كەس لە عەلیجیك شیاوتر نادۆزیتەوە بینیّریتە لای ئەو خەرمان سووتیّنەرە مالّ سووتیّنەرە نۆكەركوژە."

"هەر بە راست؟"

"بەلّیّ بەگ، ئەگەر دنیا سەروبن بكەی، نارەسەنتر لە منت گیر ناكەویّ. ئەمن لەوانەم كە مەمكی دایكی خۆشیان دەگەزن."

"لە چی شارەزای؟"

"رۆلّە لەبەر دایك هەلّدەگرم. حەوت سالاّن سەردەستەی پیاوە چەكدارەكانی یاغمور ئاغا بووم. چەندی دلّت دەخوازیّ خۆشم رابواردووە و میّ بازیم كردووە. ئەوەندەم پیاو كوشتووە لە

ژمار نایەن. پیاو کوشتن و ئاوخواردنەوە لام وەك یەك وان. بڕوا ناکەی چەندە بە سانایی سەری بنیادەمێك لە لەشی جیا دەکەمەوە. هیچ کەس ناتوانێ تەنانەت چۆلەکەیەکیش ئاوا بە ئارامی سەر بیڕێ."

"چیتر، چی دیکەش؟"

"دەستدرێژیم کردووەتە سەر کچۆڵەی کەم تەمەن شەش ساڵان لە گرتووخانەدا بووم."

"دەی؟"

"تۆرقوت بەگ، دوای ئەوەی سێ رۆژان وام لێ کرد لەبەرم بپاڕێتەوە و بکڕووزێتەوە، جا کوشتم."

مستەفا بەگ لەسەرخۆ لێی پرسی:"جا ئێستا چیت دەوێ؟"

عەلیجیك بزەیەکی زۆڵانەی هاتێ و گوتی:"سلامەتیی سەرت."

لە نێوقەدی بەرەو خوار زۆر درێژ و پتەو بوو. لاقەکانی جیاوازییەکیان لەگەڵ لاقی پیاوی ئاسایی نەبوو. بەڵام لە نێوقەدییەوە بەرەو سەر، سەری و نێو شان و نێو قەدی و شان و باهۆ و دەستەکانی هەر دەتگوت هیی منداڵێکی دە ساڵانن. دەموچاوێکی کوڵکنی هەبوو.

عەلیجیك لە خۆشییان و لەبەر بەخۆنازینەکەی، وەخت بوو بفڕێ. ئێستا هەلی بۆ رەخسابوو خۆی بناسێنێ.

"جا ئێستا بڵێ بزانم عەلیجیکی سەردەستەی درۆزنەکان، چیت دەوێ؟"

"عەرزم کردی سلامەتی سەری بەگ..."

"سەیرکە عەلیجیك، ئەگەر بتەوێ درۆم لەگەڵ بکەی و فرت و فێڵت لەبن سەریدا بێ، دەتدەم لە چاوترووکانێکا کات لە پێستی سەری بئاخنن ها."

"دەزانم بەگ. ئەتۆ دەتوانی وەك ئاوخواردنەوە من بکوژی. جوانت دەناسم. درۆشت لەگەڵ دەکەم و بەدەهۆشت دەبەم و ئەگەر بۆم بلوێ وەك تۆرقوت بەگ دەشتکوژم."

"باشە ئاخرییەکەی دەکرێ ملی خۆت بشکێنی و بڵێی بۆچی هاتووی و چیت دەوێ؟"

"گرنگ ئەوەیە کە جەنابت چیت بوێ بەگ. جەنابت چیت بوێ؟"

"ئەمن دەمەوێ دەروێش بەگ لە ماڵەکەی بکێشمە دەرەوە. ئەتۆ دەبێ یارمەتیم بدەی."

"دەمێك بوو ئەوەم دەزانی. دەروێش بەگیش دەزانێ. ئەمن یارمەتیت دەدەم."

"پێنج سەد دۆنم زەویت...."

"دەی باشە..."

"تراکتۆرێك."

"دەی."

"دە هەزار لیرەش پارەی نەقد."

"دەی."

"دەی؟"

"ئەسپێکی عەرەبی و فیلینتایەکی ئەلمانی و دەستێك جلوبەرگی شیاویش کە لە ئەدەنە پڕ بە بەری خۆت درووابن."

"باشە."

"باشە، بەڵام ئەمن چۆن ئەوانەم دەست دەکەوێ؟ پاش ئەوەی بەگم لە ماڵەکەی دەرپەڕاند و دام بە دەستتەوە، ئەو دەم پێم نالێی جا عەلیجیك لە بری ئەوانە وەرە گونم بمژە؟"

"وا نالێم."

"ئەتۆ نالێی، بەڵام وەچەکانت وا دەڵێن."

"ئەی دەڵێی چ بکەم عەلیجیك؟"

"ئەمن رێگەیەکی بۆ دەدۆزمەوە بەگ، باشە؟"

"باشە."

"دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم بەگ. بە شەیتانی و شۆفاری نەبێ، چۆنە لە جێی ئەوەی دەریپەڕێنم بیکوژم. کوشتنی ئەو بەلای منەوە وەك ئاوخواردنەوە وایە... بەڵێن دەدەم تا کۆتایی ئەو حەوتووە سەری بە گۆمدا بکەم. دەڵێی چی؟"

"دەمەوێ دەریپەڕێنم عەلیجیك."

"باشە بەگم. لەم دنیایە لە هەموو کەس زیاتر متمانەت بە کێیە؟"

مستەفا بەگ چووە فکرەوە و تاوێك دواتر سەری هەڵێنا و گوتی:"تێگەیشتم. زانیم دەڵێی چی. خۆ عەلی ئاغا کوردە دەناسی؟ قەباڵە و پارە و چیی دەتەوێ دەیدەمە دەستی ئەو و ئەتۆ دوای ئەوەی بەگت بۆ دەرپەڕاندم دەچی لەوی وەردەگری. باشە؟"

عەلیجیك بە خۆشییەوە گوتی:"ئەوە بوو بە قسە. عەلی ئاغا بۆ ئەوەی دەبێ هەموو شتێکی لەلا باس بکەی. ئەو پیاوێکی نهێنی پارێزە و هیچ نادرکێنێ."

مستەفا ئاق یۆللی" دووپاتەی کردەوە:"نایدرکێنێ."

"ئەی ئەگەر هات و مرد چی؟ خۆ کەس عومری بۆ نەهاتووە؟"

"بۆ ئەوەش ڕێگەیەك دەدۆزینەوە. هەر ئەمڕۆ دەچمە شارۆچکە و قەباڵەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم. "پارە"کەشت لە بانك بۆ دادەنێم. ناو و شۆرەتت؟"

"عەلی داغلار ئاشان. ناوی باوك دورمووش و ناوی دایك ئەلیفچە."

"زۆر باشە."

"ئەمن شەوانە دێم. حەوتووی جارێك. بەر لەوەی ڕۆژ ببێتەوە."

"هەر کات هاتی، بلە ئیبۆی ببینە."

"بلە ئیبۆ پیاوی دەروێش بەگە. تەنانەت دەروێش بەگ خۆیشی بەوە نازانێ. هەر من دەزانم و خوشکەکەی دەروێش بەگ ... جەرەن خاتوون، ئاغا یاللیجە..."؟

"جا ئەتۆ چۆن دەزانی؟"

"هەردووکمان هەر لەو گوندە گەورە بووین. وەك برا واین. هەردووکمان هەتیو و بێکەس و کار بووین. ئەو جەرەن خاتوون گەورەی کردووە و بە قسەی ئەویش هەڵدەسووڕێ. ئەگەر جەرەن خاتوون لەو بارەیەوە شتێکی بە دەروێش بەگ گوتبا، ئەو دژایەتیی دەکرد. ئەو لەوانە نییە سیخوڕ بنێرێتە ماڵی دوژمنەکەی."

"ئاوا، هەر بە ڕاستی نانێرێ؟"

"نانێرێ."

"هەی دایك حیز."

"بلە ئیبۆ زۆر زۆڵە بەگ. ئاگات لێی بێ. ساڵێ یەك دوو جاران سەر لە یاللیجە دەدات."

"سەیرە."؟

"من پێم وایە... بەڵام نا، هەر لێی گەڕێ، وەباڵی ئەویشم دەکەوێتە ئەستۆی...."

"دەی بڵێ، بڵێ..."

"وەباڵی..."

"درۆیان مەکە. ئەتۆ گوێت لە وەباڵ مەبالان نییە."

"گوێم بە وەباڵ نابزوێ..."

"گوێت بە خودا و کتێبیش نابزوێ."

"کوڕە واش نا، نا، ئەوەندەش نا بەگ."

"بڵێ دەی."

"بلە ئیبۆ مورتەزا بەگی کوشت. بەگ، باشە نافەرمووی بە نێو ئەو هەمووە سەگە زل و یانیگرەدا* و بەنێو ئەو هەمووە پاسەوانانەدا کە مورتەزا بەگیش لەو سەری کۆشکەکە نوستبێ و درەگاکەشی داخستبێ، نەفەرێك چۆن توانیوێتی لە دەرەوەڕا بێت و مورتەزا بەگ بکوژێ؟ سەیرکە بەگ، ئەمن خۆم دەمێك بوو وەك سێبەر بە شوێن مورتەزا بەگەوە بووم و نەمتوانی بیکوژم. خۆ بە خوێنی سەریشی تینوو بووم... خۆ ئەگەر کوشتبایەم، لە لای بەگ زۆر زۆر شیرین دەبووم... بەڵام نەمتوانی. ئەو کارە کردەنی نەبوو. شەوێکیان توانیم بێمە نێو کۆشکەکەوە، چوومە سەرێ و بە هەموو هێزم لە دەرگاکەی نووسام پێم نەکرایەوە، ئیتر وەخەبەر هاتن... سێ رۆژی رەبەق لە بانیژەکەی سەرێ برسی و تینوو خۆم مات کرد هەتا شەوێکیان توانیم خۆم رزگار بکەم."

"درۆیە. وەك سەگ درۆیان دەکەی عەلیجیك."

"ئەتۆ وای دانێ درۆیە، بەگ."

"ئەتۆ دەتەوێ باشترین پیاوی خۆم بە دەستی خۆم بکوژم. زۆر هیچ و پووچ و زۆڵی ها."

"ئاخری رۆژێك هەر دەیکوژی. دەیکوژی. بەڵام نەکا ببیستێتەوە کە شتێکم لە سەر ئەو پێ گوتووی. بزانێتەوە ئەمنیش دەکوژرێم. ئەو جانەوەرەی من دەیناسم، جنۆکەش ناڵ دەکا. تەنانەت بەبێ ئەوەی دەروێش بەگیش تێ بگەیەنێ، من دەکوژێ."

"درۆیان دەکەی عەلیجیك."

"باشە، درۆ دەکەم. خوا حافیز. یەکشەممە چاوەڕێم بن. بەر لە رۆژبوونەوە لە بن دار چنارەکە."

"ئەتۆ راوم دەنێی عەلیجیك."

"راوت دەنێم ئاغا."

"باشە، پێش تاوکەوتنان لە بن دار چنارەکە."

"چ بە دەروێش بەگ بڵێم."

"بڵێ مستەفا ئاغا چاوەڕێیە دوایین مانگی پاییزی ئەمساڵ نا ساڵەکەی دیکەش بگاتێ."

"وا دەڵێم."

"ئەی نۆژەنکردنەوەی کۆشکەکە گەیوەتە کوێ؟"

---

*یانیگر: واتە مرۆڤگر. سەگێك کە فێری ئینسانگرتن بووە

"چیی نەماوە تەواو بێ. شتێکی وای لێ نەهاتبوو. هەر پلیکان و دەرگاکانی سووتابوون. دیوار و بناغەی زیانی بەرنەکەوتبوو. ئاخرین مانگی پاییزی ئەمساڵیش هەر لەوێین."

عەلیجیك خۆی نەیدەزانی کەنگێ و لە کوێ لە دایك بووە. دایك و بابی خۆیشی هەر نەدیبوو. یەکەم شتێکی وەبیری دەهاتەوە، لە بن دارێك بوو. تێکچرژان و پێکوەربوونی مێشی ورد و درشت لە سەر سەرە کەچەڵەکەی... سەرتا پێی برین و کێم بوو و بنی پێیەکانی قەڵشت قەڵشت ببوون. چاوە ریپۆقاوییەکانی دەتگوت دوو برینی خوێناوین، چلکن... ژنێکی میهرەبان بە لەچکێکی سپی و دەست و پەنجەی شووش و باریك، گەرم و سپی... دەستی بە کوێیەکیدا دێنا سارێژی دەکردەوە. سابوون و کەفێکی زۆر، خشەخشی لك و پۆ و بۆن و بەرامەی گوڵی لاولاو... باخچە، گوڵێکی مۆری گەورە. کەفی سابوونەکە چووە چاوییەوە. چاوەکانی برژانەوە، دەزوورانەوە، پەلەقاژەی بوو، دەیزیڕاند. لەچکە سپییەکە و پەنجە جوانەکانیش دەیانزیڕاند. دارەکەش، ئاوەکەش، لك و پۆپەکانیش، هەموو شتێك دەیزیڕاند.

"برسیمە نەنە سەلوا."

"هانێ دایە گیان."

رۆنی کەرە لە نێو نانی گەرمە تەندووردا دەتوێتەوە و دڵۆپەدڵۆپ دەچۆڕێتەوە. عەلیجیك زاری داپچڕیوە. پارووەکی گەورە. پارووەکی گەورەی دیکە. یەکی دیکەش.

"نەنە وەختە لە برسان بمرم. نەنە سەلوا. نەنە گیان."

خوشکە قودرەت خۆشترین لایەلایەکانی گوت. هەر منداڵێکی گوێی لە لایەلایەی ئەو بوایە، لە گریانێ ژیر دەبووەوە. بریندارەکان بە بیستنی دەنگە خۆشەکەی ئەو لە ناڵین و کڕووزانەوە دەکەوتن و نەخۆشەکان دەرد و ئازاری خۆیانیان لەبیر دەچۆوە.

"خوشکە قودرەت لایەلایەیەك بڵێ، تۆ سەری من بیڵێ..."

"لەبەر چاوم ون بە، بەرازە کەچەڵ."

"خوشکە، بە قوربانت بم خوشکە، دەی بیڵێ..."

ئاو لە رۆیشتنێ دەکەون، با جووڵەی لێ دەبڕێ و ئەسپی بە تاو لە جێی خۆی وشك دەبێ."

عەلیجیك دروێنەوانێکی باشە، جووتێرێکی باشە، سەپانێکی باشە بۆ لۆکە رنینەوە... لەو چوکووراوایە پیاو نییە بڵێی هێندەی عەلیجیك پڕ کار و بەکارە. عەلیجیك کوڕی نەنە سەلوایە. عەلیجیکی کوڕمان. عەلیجیك تا هەناسەی لەبەردابێ کاری پێ دەکرێ. عەلیجیك

لە بن بارستایی باردا ئێسقانەکانی ورد دەبن و گیانی دێتە سەر لێوانی. ئەستێرە درشتەکان، تەپوتۆز و ڕێگا دوور و پڕ لە پێچ و گەوەکان[*].

سەرە کەچەڵەکەی عەلیجیك تووك دەردەکاتەوە، برینکە بەکێم و زووخاوەکانی عەلیجیك لە بیری دەچنەوە.

"عەلیجیك، عەلیجیك ون بووە. عەلیجیك رای کردووە."

نەنە سەلوا تووڕە بوو و بنەماڵەکەی دایە بەر جنێوان:"باشە بستەمنداڵێك بۆ ئەوەی دەبێ ئەوەندەی کار پێ بکەن؟ بەڵایەکتان بە سەر هێنا دەرپەڕی و رای کرد. چما کۆڵی وا قورس لە سەر شانی منداڵێکی ئاوا دادەنێن؟"

"خەمی لێ مەخۆ دایە، لە هەر شوێنێك بێ دەگەڕێتەوە."

"ئەدی بە سەری تۆ."

"لێرەی باشتر دەست ناکەوێ. لە تۆ باشتری لە کوێ دەست دەکەوێ؟"

"هەی ئێرەم بە قوڕ گرت، هەی ئەو چاکبوونەم سەرم بخوا یارەبی. عەلیجیکی بەستەزمان بۆ کوێ چوو؟ ئاخ عەلیجیك، باشە چ بەڵایەك بەسەر ئەو منداڵە هات؟ منداڵەکەم."

نەنە سەلوا سێ کوڕی هەبوو کە هەموان کەڵەگەت و چوار شانە و بە شان و باهۆ بوون.

"ئەو زۆر وردیلەیە. لەڕ و بنێسە. کەپۆی بگری گیانی دەردەچێ. وەك ئەنگۆ مل ئەستوور نییە. مردەلۆخەیە. ئیشەڵڵا رای کردووە. بەستەزمانە بێت و شتێکی لێ هاتبێ، ئاهی ئەو داوێنی هەموو گوندەکە و هەموو ئەو میللەتە و کەس و کار و دەروجیرانەکەش دەگرێتەوە.

نەنە سەلوا ئەو جار بۆ عەلیجیك نووزایەوە و لاواندییەوە. چەند مانگان تازییەبار بوو و زەردەی نەهاتە سەر لێوان. عەلیجیك زۆر دواتر ئەوەی بیستەوە.

سەر لە بەیانیی رۆژێك کە نەنە سەلوا نانی دەکرد، تەلێلی بە هەڵەداوان هات و بەهات و هاوارەوە گوتی:"نەنە، نەنە، نەسەلوا، عەلیجیك هاتەوە."

نەنە سەلوا نانەکەی لە تەندوورێدا بەجێ هێشت و غاری دا و لە باوەشی گرت"عەلی، رۆڵە."

عەلی لە شەرمان سەری داخستبوو. مێش و مەگەز لە دەوری سەری دەخولانەوە. چاوە سوورەکانی دیسان ریپۆقیان دەرکردبوو. جلوبەرگەکەی بە بەری فش ببوونەوە. چڵکن و شڕ و

[*] پێچ و گەوە: پێچ و پەنا. / گەوە: لۆفە. لە کتێبەکەی د.ع.شەریعەتیدا کە هەژار کردوویەتی بە کوردی، تانە لەو کەسانە دەدات کە بەناوی ئیسلامەوە خەڵك دەچەوسێننەوە دەڵێ:"ئەگەر ئیسلام هەر ئەوە بێ، با نێوان سەد گەوە بێ.

دڕ ببوون... برینی لاقەکانی کرمێ ببوون. هەر پێستێك بوو بە سەر ئێسقانەکەیدا کشابوو و نیوەزیندوو. عەلیجیك هانکەهانکی بوو.

نەنە سەلوا بە دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستی و بەزەییەوە گوتی:"ئیتر را مەکە عەلیجیك، تێگەیشتی؟"

عەلیجیك ئەگەر توانیبای زۆڕ زۆڕ دەگریا و کوڵی دڵی خۆی هەڵدەڕشت. بەڵام چما تاقەتی گریانی هەبوو؟ زاری ببووە تەڵەی تەقیو و زمانی شکابوو. چەند ڕۆژێك بوو خەوی نەچووبووە چاوی. هەر دەستی دایەی گەیشتێ، بەلاداهات و دەسبەجێ خەوی لێکەوت.

نەنە سەلوا قیژاندی:"وەی ڕۆ عەلیجیك مرد."

گوتیان:" نا، نەمردووە. هەناسە دەکێشێ. یان لە هۆش چووە یان خەوی لێ کەوتووە."

عەلیجیك تەمەنی چەند بوو؟ عەلی حەوت، دە، پانزە، حەڤدە، عەلیجیك سەد ساڵان دیار بوو. پێستە تاوبردوو و چرچبووەکەی دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی لە ئێسقانەکانی دەخزێتە خوارێ. نەنە سەلوا مەنجەڵێك ئاوی کوڵاند و عەلی جیکی لە سەر تاتە بەردە مەڕمەڕەکەی بن پیرەهەنارەکە نواند. هەنارەکە گوڵی کردبوو. مێش و مەگەز ویزەویزێکی سەیریان وەڕێ خستبوو. بەردە مەڕمەڕەکە و عەلی نوقمی کەفاوی سابوونەکە بوون. عەلی دوای ئەوە خواردنێکی زۆری خوارد. نەنە سەلوا ئەو مەڵحەم و هەتوانانەی بەدەستی خۆی سازی کردبوون، لە سەر برینەکانی سەر و گیانی عەلیی دانان. برینەکان ئەمجارەیان کێمیان کردبوو و کرمێ ببوون و سارێژبوونەوەیان ئاسان نەبوو. نەنە سەلوا کارێکی وای کرد برینەکانی عەلیجیك بە مانگێك چاك ببنەوە. دیسان بووژایەوە و چاوەکانی هەڵێنا و گیانێکی وەبەر هاتەوە.

دیسان عەلیجیکیان وەبەر کار نایەوە. دەبوو بایی ئەو نانەی دەیخوارد کاری کردبایە. علیجیك دیسان بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە لە خەوێ هەڵدەستا و تاقی لەبەر ئەسپەکان دەکرد و بە حاڵی سەگ ئاوی لە بیرەکە هەڵدێنجا و ئاوی دەدان و لە عارەبانەی دەکردن. عەلیجیك دەڵێی مێروولەیە. عەلیجیك لۆکەی رنییەوە، دروێنەی کرد، خەلەو خەرمانی داخست و جەنجەڕی کرد و خەرمانی بەباداکرد و بووجاڕی کرد. عەلیجیك هەموو ئەو کارانەی دەزانی.

تەللییش وەك عەلیجیك وا بوو. کچۆڵەیەکی پانزە شانزە ساڵانە کە دەتگوت شوولکێکی باریکە. ئەویش کەڕەی بەیانی لە خەوێ هەڵدەستا و شمەکی دەشووشت و چێشتی لێ دەنا و شتی دروومانی دەکرد و لە مەزرایەش زەحمەتی دەکێشا و کاری دەکرد.

ڕۆژێکیان تەللی بە عەلیجیکی گوت:"ئەگەر ئاوا بڕواتە پێشێ ئەتۆ بەرگە ناگری و دەپسێی."

عەلیجیك ملی بەلارەوە نا و گوتی:"بەرگە ناگرم و دەپسێم خوشکە تەللی."

پاییز داهات و وەرزی کار و بار بەسەر چوو. عەلیجیك ئیتر بە تەنێ ئەسپەکانی بەخێو دەکردن و هەر لە بەیانییەوە تا شەوێ لە نێو ئەو کاولاشانەدا، کە لە پاش هەرمەنییەکان بەجێ مابوون، خەریکی هەنجیر ڕنین بوو و لوێچ لوێچ دەیخوارد. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ قەڵەو دەبوو و باڵای دەکرد. نەنە سەلوا پانتۆڵ و کراسی بۆ دروویبوو. جووتێکی پۆتینی سووریشی بۆ کڕیبوو. عەلیجیك پێی حەیف بوو پۆتینەکانی لە پێی بکا و بە پێخاوسی دەسووڕایەوە. ڕۆژێکیان عەلیجیك ون بوو.

نەنە سەلوا گوێی نەدەدایە قسەی هیچ کەس و یەك پشوو دەکڕووزایەوە و دەگریا:"ئەنگۆ، ئەنگۆ دیسان بەڵایەکتان بە سەر ئەو کوڕە هێناوە، ئەگینا لە خۆڕایی بۆچی دیسان سەری خۆی هەڵگرتووە و وەکێوان کەوتووە؟"

مێرد و منداڵ و هەوێ و منداڵەکانی هەوێکەی، هەر هەموویان بە سوێند و قورئانێدا نووسان کە"هیچ کەس پێی نەگوتووە پشتی چاوت برۆیە."

بەڵام ئەو قسانە بە گوێی نەنە سەلوادا نەدەچوون و نەدەچوون. بە گوێیدا نەدەچوو و هیچیشی پێ نەدەکرا.

عەلیجیك چەند مانگ دواتر کە گەڕایەوە، دیسان هەر تاس و حەمامەکە بوو. دیسان ببووەوە ئێسك و پرووسکێکی بن تەنکە پێستێك.

دیسان سەلکە کەچەڵەکەی هەموو ببووە برین و زام. دیسان شڕ و شپڕێو ببوو. دیسان برینەکانی وەبنیان دابوو و کێم و چڵکیان کردبوو. لە بەر کزەبایەکەی زستانێ و لە ئاخوڕەکەدا و کەفی تاڵی سابوون...

عەلیجیك هەتا تەمەنی گەیشتە بیست ساڵان هەر ڕای کرد و گەڕایەوە ماڵەکەی نەنە سەلوا. نەنە سەلوا قەت لۆمەی نەکرد، تیر و توانجی تێ نەگرت و دەنگی لێ نەگۆڕی و شتەکانی بەو جۆرەی هەبوو، قەبووڵ کرد. بەڵام ئەو منداڵە لە شتێك دەگەڕا، چقڵێکی لە دڵی دابوو. ڕەنگبێ خۆیشی نەیزانیبێ چ دەردێکی هەیە. نەنە سەلوا تەنانەت بۆ جارێکیش لێی نەپرسی دەرد و مەرگت چییە و بۆ وا دەکەی. نەیپرسی کە ڕادەکەی دەچییە کوێ و لە کوێوە

دێیتەوە. ئەگەر خۆی حەزی لێ بوایە بەڕەی لە سەر هەیتوان هەڵدەدایەوە. ئەگەر نەیشگوتبایە نەدەبوو ناچاری بکەن.

عەلیجیك لە بیست ساڵیدا دیسان خۆی بزر کردەوە و ئیتر ئەو سەری بردی نەیهێنایەوە.

پاش چەند ساڵان، عەلیجیك بە سەر و سەکوتێکی ڕێك و پێك و گیرفان پڕ، لەگەڵ کچێکی جوانی قژکاڵی چاوشین و دلڕفێندا پەیدا بۆوە. دیسان هەر لە بن چناری گۆڕین دانیشتەوە. پاڵی بە قەدی ئەو دار چنارەوە دا، کە باوەشی سێ کەسانی تێ وەرنەدەسووڕایەوە. ژنەکەشی هەر بەو جلوبەرگە جوان و نەخشینانەیەوە لە پاڵ خۆیەوە لە سەر عەرزەکە دانیشت. عەلیجیك وای ویستبوو. ئێستا دەیبینن و نەنە سەلوای لێ ئاگادار دەکەنەوە و نەنە سەلواش بە هەڵەداوان دێ. باشە ئەو کەچەڵە چیی لە گیانی من دەوێ؟ دیسان خوێن و چڵك و کێم و ریپۆق و پێست.

"ئەتۆ کێی کابرا؟"

"ئەمن عەلیجیکم نەنە."

نەنە پێی سەیر دەبێ و لە خۆشییان چاوی پڕ دەبن لە فرمێسك. باوەشی پێدا دەکا و دەڵێ:"خودایە گیان زۆر زۆر شوکر، هەزار جار شوکر. شوکر بۆ ئەو ڕۆژە خۆشە. وەی عەلیجیکی من بۆتە چ پیاوێك. هەزار جاران سوپاس."

"ئەوەش ژنەکەمە نەنە."

نەنە ئەویشی لە ئامێز دەگرێ و ماچی دەکا.

"ئەوەیە ئەو نەنە میهرەبانەم کە بۆم باس کردبووی. خۆ لە بن گوێنی نەهاتووینە دەرێ."

نەنە بە دڵێکی خۆشەوە دەیانباتەوە ماڵێ و بە بزەیەکی پڕ لە شادییەوە کە بە ڕوویەوە دیارە، بە سێرەی چاوان سەیرێکی بەژن و باڵای ژنەکە دەکا و بە زمانی بێ زمانییەوە دەڵێ، بووکەکەمان جوانە، دەڵێی تیشکی خۆرە، هەر تەمەن درێژ بی بۆ سەلیقە و هەڵبژاردنت. جێژنە دەگرێ. مەڕێك دەکوژێتەوە و خوێنی گەرووی مەڕەکە لە نێوچاوانی بووك و زاوا هەڵدەسوێ. دەستەکانی خوێناوی دەکات و پەنجەی ئەسپێ‌کوژەی لە ڕەگی دار چنارەکە و قەدەکەی هەڵدەسوێ و...

"ئەو سەعاتە زنجیر زیوە، یادگاریی بابی خوالێخۆشبوومە، پێشکەش بە تۆ و ئەو بازنە و ملوانکەیەش بۆ تۆ."

چۆن دەبێ بێ کەس و بێدەر بم. هەتا نیوەڕۆ چاویان لە دەرگا و پەنجەرەکەی ماڵەکەی نەنە سەلوا بڕی و لە بن دار چنارەکەوە هەر چاوەڕوان بوون. گەرما داهات. نە کەس هات و نە

کەس بەوێدا رابرد. جاران منداڵە وردکە هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ لە بن ئەو چنارە دەکەوتن. ئەی ئەوان چییان لێ هاتووە؟ هەستا و شێواو و شەرمەزار بە دەنگێکی کپ و بێ گیان گوتی:"هەستە ژنەکە."

دەنگی وەك شەرابێك نیشتەوە و خاکەکە هەڵیمشت. بە ترسەوە دەرگاکەی کردەوە. بەردە مەڕمەڕە سپییەکەی بن دار هەنارەکە لە بەر تیرێژی بەتینی تاوەکە سپیی دەچۆوە. گوڵە هەنارەکان دەنگ و هەڵڵایان لێوە دەهات. مێش و هەنگ و زەردەواڵە وزەوزێکیان وەڕێ خستبوو هەر مەپرسە. ژنێك دادەهاتەوە و قیت دەبۆوە و نانی بە تەندوورەوە دەدا. بۆنی نانە تازەکە بۆ عەلیجیك هات و لووتی خوراند و بە ناخیدا چووە خوارێ. بەرەو لای تەندوورەکە چوون.

عەلیجیك بە دەنگێکی سرك و بێ ئۆقرە و بە ترسەوە و بە خەمباری و لە حاڵێکدا هەستی دەکرد شتێکی قورس و تاریك لە ناخیدا هەر دێ و گەورەتر دەبێ و وەختە بیخنکێنێ، پرسیی:"نەنە سەلوا لە کوێیە؟ نەنە سەلوا؟"

ژنەکە بە سەرسووڕماوییەوە سەری هەڵێنا و پشتی قیت کردەوە. نەنە سەلوا نەبێ کەس نەیدەتوانی نان بەو تەندوورەوە بدات. روخسارە جوان و گەشەکە ئارەقەی کردبوو.

"نەنە سەلوا لە کوێیە؟ نەنە سەلوا؟"

"نەنە سەلوا مرد."

بای رۆژئاوا هەڵدەکا و تۆز و خۆڵی رێگەکە رەپێچەك دەدا. عەلیجیکە کەچەڵ، جوان و تەڕ پۆش. هەر دەڵێی تا ئێستا ئەو نەبێ کەس ژنی نەهێناوە. نەدی و بدی. چما بنیادەم بەرد دەخاتە ئەو کانیاوەوە کە ئاوی لێ دەخواتەوە؟ چما هەر کەسێکی ناوی بنیادەمیان لێ نابێ، فیشەك بەو ماڵەوە دەنێ کە لەوێ سفرەی بۆ راخراوە؟ ئەویش لە حاڵێکدا کە ژنەکەی زمانی گەزێك لە زاری دەرکێشابێ و بەدوایدا را بکا بۆ ئەوەی بگاتەوە مێردە نەدی و بدییەکەی؟ جا ئەوجار چما پیاوی ژیر لە گۆڕستانێ خۆی بە سەر خۆڵ و خاکدا دەدات؟

لە تاریکایی شەوەکەدا، گەڵاکانی چنارەکە، هێمن و بێ جووڵەن.

"نەنە سەلوا مرد."

"دەسەڵات چییە؟ وەرە بڕۆین ژنەکە."

"مستەفا بەگ چی گوت؟"

"پێکەنی."

"هیچی نەگوت."

"دەستی کرد بە پێکەنین. ئەوەندە پێکەنی چی وای نەمابوو ببوورێتەوە. ئاخرییەکەی گوتی، باشە رادەوەستم. گوتی ئەگەر نەمردین هەتا پاییزی داهاتوو نا، ئەوی ئیتر رادەوەستین. دیسان قاقا پێکەنی و گوتی بە دەروێش بڵێ ـ بەگەکەی نەگوت ـ ئەوەندەش نەترسێ نا."

"دەی؟"

"ئەوجار گوتیشی ئەو جەستەیەی ترس تێیدا هێلانەی کردبێ، لە قەدی دارێکی رزیو، تەنانەت ئەگەر داری چناریش بێ، خراپترە."

"ئەی تۆ چیت گوت؟"

"ئەمنیش گوتم بۆ خۆت باشتر دەزانی و کێ لە کێ و چۆن دەترسێ، مستەفا ئاغا."

"کەوابوو رادەوەستێ؟"

"گوتی ئەگەر هەزار ساڵیش زیندوو بمێنم، هەر چاوەڕێ دەبم. هەتا ئەو رۆژەی رووخساری ئەو دوژمنەم نەبینم کە لە سەر ئەم دنیایە ماوە، ناچمە دنیاکەی دی."

دەروێش بەگ گوتی:"دەچێ. چونکە بەر لەوەی پاییز دابێ، دەچێ. ئیتر وەگیان هاتووم. ئیتر بەسە."

عەلیجیك بە خۆشییەوە دووپاتەی کردەوە:"ئیتر بەسە."

# ٢٢

بارانێکی زەرد ـ لە حاڵێکدا ئاسۆی لای باشوور روون دەبۆوە و دەکرایەوە و نارنجی دەچۆوە و کاڵ دەبۆوە و لایەکی وا دەبریسکایەوە دەتگوت ئاگری تێبەر بووە ـ دای دابوو. قاراقیز خاتوونی پیر، تێکسمڕاو بە برۆ کوڵکنە پیاوانەکەیەوە لە بن چارشێوێکی سپیدا، لێوە چرچ و لۆچەکانی لە سەر یەك داگرتبوون و لە سەر قەرەوێڵەکەی گرمۆڵە ببوو و پەنجەی دەستە رەقەڵەکانی لە سەر زگی لێك هەڵپێکابوون و چاوەکانی زەق زەق لە رەوەزەکانی ئاناوەرزا بڕیبوو و چاوی لێ هەڵنەدەگرتن. جار نا جارێکیش وەك شین بگێڕێ، لە سەر جێیەکەی، خۆی رادەژاند.

چەناگە باریك و نووك تیژەکەی و چاوە درشتە خۆڵەمێشییەکانی گەورەتر دیار بوون لە یەکەم روانیندا، هەر چاوەکانی دەبینران. نە دەموچاوە پڕ لە چرچ و لۆچەکەی و نە دەستە رەقەڵەکانی و نە گەردنە درێژەکەی و نە جەستە گرمۆڵەبووەکەی، بەڵکو چاوە خەمبارە تووڕە و تەڕ و زەقەکانی کە وەك ئاوێنە دەبریسکانەوە، دەبینران. توند و تیژ و پڕ لە حەژمەت، بەبێ ئەوەی بیانتروکێنێ، دەیڕوانی.

قوڕ و لیتەی زەرد وەك هوڕەی لۆکە، وەك زێڕی تواوە، بە سەر چڵ و گیا و گەڵا کەسکەکانی داری "مۆرتك"ەوە و بۆن و بەرامەی "مۆرتك"یش تووڕە و تازیەبار، شەو تا بەیانی، لە بەرەبەیانیدا، بە ناڵە و شین و رۆوە، لە مەرگدا لە نێو خوێنی رژاو بە سەر گوڵە زەردباوەکاندا، لە نێو پووش و گیا وشکەڵاتووەکاندا.... خووساو بە کەفی خوێن... تاڵ، تفت. تفت و کەسکێکی تۆخ.

جا لە کاتی سەردولکە و شینگێڕییەکەدا، مورتەزا بەگ هێشتا نەنێژرابوو و تەرمە زەردهەڵگەڕاوەکە لە بن چادری شەوێ و سەرچەفە سپییەکاندا ... لاقە ناسك و زەردەکانی ئارەقەیان کردبو. لسپێك لە کاکۆڵە رەش و درێژەکەی کە سەوز دەچووەوە، کەوتبووە سەر

نێوچاوانە هەڵبزرکاوەکە و بڵاو ببووەوە. شینگێڕییەکە بە هەڵکشان و داکشان و لە زارێکەوە دەکەوتە زارێکی دیکەوە و ژنێك بۆ ژنێکی دیکەی دەستاندەوە، بەردەوام و بە شەپۆل و پڕ لە زایەڵە، دەگۆڕدرا لە دەنگێکەوە بۆ دەنگێکی دیکە، هەڵدەستا و دەنیشتەوە. زوڵاڵ زوڵاڵ سەرو بنی دیار بوو. یەك هەوا و پڕ ئاواز و هەر ئەوەندەی تۆزێك مایەی دەنگەکان دەگۆڕدران. لاقی زەردی درێژکراو، کاکۆڵی رەشی پەرش و بڵاوی سەر تەوێڵی رەنگ پەڕیو، لە رێگە دووردرێژەکانەوە، لە دەشتەکانەوە، لە شاخەکانەوە، تاڵان و بڕۆکان و لە سەفەری بێ بڕانەوەی سەدان ساڵە، لە بن سەرچەفی سپی و بەڕە و مافووری سوور و لبادی نەخشین و خێوەتی مەرەز و بەن و لە سەر ئاگردانی رەشماڵە گەورەکانی سەرۆك عێلەکان... هەر هەموو کوژراون، خوێنیان کەفی کردووە و هاواریان لێ هەستاوە و شینیان گێڕاوە و هەر هەمووش وەك یەك... عیلاتی خۆراسان، بیابانەکانی عەرەبستان پێك وەربووەکان و پێك هەڵپڕژاوەکان. یاسای سرووشت، هەوارخستن و کۆچی بەردەوام. ئەو خاکەی ئەمڕۆ پێی لەسەر دادەنێی ئەوە نیشتمانی تۆیە. ئەو پارچە عەرزەی ئەمڕۆ خوێنی لە سەر دەڕێژی و شینی سەدان ساڵەی بێ پسانەوە بۆ دەگێڕی ئەوە نیشتمانی تۆیە و سبەی نیشتمانت نییە. ئەو خاکەی تەنانەت ناوەکەشی نازانی و تەنانەت لە ئاوی رووبار خێراتر و تیژتر لێی تێدەپەڕی، شینگێڕی و سەردولکە و حەماسە و گۆرانی و تەنانەت چیرۆکەکانیشیت وەبیر نایەنەوە. بەڵام خۆ ئەگەر لەوەڕی هەبوایە، تاڵانی هەبوایە، شیر و ماست و گەنمی بە پیت بوایە، نەتدەتوانی لەب یری بکەی. خاکێك کە بەرەکەتەکەی، تامی تفتی هەرمێ و بۆن و بەرامەی سێوە گێوییەکانی چەندین ساڵان لە سەر زار و زمانان بووە و بڵاوبوونەوەی بۆنی عەترێکی شیلەوگەرم و نەفەوتاوی سێوێك، گوڵێکی خۆرسك، گوڵێکی وشکبووی کلکەڕێوی لە بن بنەوەی مجرییەکی پڕ لە نەخش و نیگار یان توورەکەیەکی زەنگوڵەدار کاتێك دەیانکەیەوە... ئەوجار خوێن، مەرگ، ئەو شان و باهۆیانەی کەوانەکانیان لەبەر یەك کێشاوەتەوە و بۆنی توندی باڕووتی رەش، خوێن... لەچکی درێژ و سپیی جوان، شینگێڕی...

قەرەقیزخاتوون لە سەر تەرمی مورتەزا بەگ شین و شەپۆڕ و گریانی وەڕێ نەخست و خۆی بە سەر تەرمەکەدا نەکێشا. سەر و چاوی ماچباران نەکرد. باوەشی پێدا نەکرد و یەخەی کراسی بۆ دانەدڕی و لە سەر و سینگی خۆی نەدا و سەر و قژی خۆی نەڕنییەوە و خۆڵی دەوری گۆڕەکەی وەسەر خۆی نەکرد و کوڵمەکانی بە نینۆك دانەڕنی و گوێی لەو سەردولکانە نەگرت کە بۆ جوانەمەرگەکەی دەخوێنران و لاقە زەردهەڵگەڕاوەکان و کاکۆڵە رەشە دەرکەوتووەکەی بن سەرچەفەکەی نەدی. خوێنەکەفکردووەکە ئیتر کەفی نەکرد و لووزەوی نەبەست. مێشە کەسکە

ڕەنگ پۆلاییەکان لە بەر گەرما زەردەکەدا نەبریسکانەوە. بارانە زەردەکە یەك پشوو دەباری و لێی نەدەکردەوە. قەرەقیز خاتوون دەم و لیچی پێکدا دابوون و کپ و بێدەنگ بوو. چاوە مەڕییەکان زەق زەق کربوون و مات رامابوو. ئەژنۆی لە ئامێز گرتبوو و خۆی گرمۆڵە کردبوو. نە قسەی دەکرد و نە دەیدی و نە دەیبیست و نە دەمی لە هیچ دەدا و نە هیچی دەخواردەوە و نە نزاشی دەکرد. حەزی لە تۆڵەئەستاندنەوەش نەبوو و تووك و لەعنەتیشی نەدەکرد و ئاخیشی هەڵنەدەکێشا. نەیدەگوت و بیری لێ نەدەکردەوە کە نابێ. زاری ببووە تەڵەی تەقیو و دەتگوت هێلێکە و بەو چاوانەوە کە جار بە جار روونتر دەبوونەوە و گەورەتر دەبوونەوە، هیچ نەیدەڕوانی.

مستەفا بەگی ئاق یۆللی" نەیتوانی چاو لە چاوی دایکی بکا و پاش مەرگی مورتەزا بۆ جارێکیش بیبینێ. لە ژنەکەی و منداڵەکانی و براکانی و پیاوەکانی و لە هیچ کەسی دیکەی نەتوانی بپرسێ دایکی چۆنە و چ دەکا. بۆخۆی دەیزانی. دایکی دوای مەرگی منداڵەکانی هەمیشە ئاوای لێ دەهات و زۆر دواتر وەك ئەوەی تازە لە دایك بووبێت، وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێ، رادەبوو. رادەبوو و چەند رۆژێك هەر وا مات و خەمبار، بەبێ ئەوەی سەیری چاوی کەس بکا لە کۆشکەکەدا پیاسەی دەکرد و دواییش دەمەدەمی بەیانیان بەتاقی تەنێ رووی دەکردە نێو گابەرد و رەوەزەکانی ئاناوەرزا و لەوێ لە سەر بەردێکی مەڕمەڕی سپی، کە گوڵی مۆری لە سەر هەڵکەنرابوو، دادەنیشت و خەیاڵ دەیبرد.

دەیخوارد و دەیخواردەوە و هەستی دەکرد و دەگریا و دەیلاواندەوە. بیری لە دەشت دەکردەوە و دیدی و خەونی دەبینی و ئەسپە کێوییەکان بە غار بە دەشتەکەدا تێدەپەڕین... ئاناوەرزا هەوارگەی ئەسپ و چارەوی.... مەڵبەندی تورکمانی کۆن، کانیاوی پڕ لە گوڵ و سونبولی بۆن بۆغا هاوینەهەوارەکەی و دەشتەکەی ئاناوەرزا بە گوڵە بالابەرزەکانییەوە هێندەی بالای پیاوێك، زستانەهەوارەکەی.

کراسە خوێناوییەکە... کوڕە قەبووڵی مەکەن ئەی هۆز و عێلات، قەبووڵی مەکەن... هۆی زاڵمەکان، قەبووڵی مەکەن کە وەکازی دەستی پیرەژنێك شکا، شکانێکی تەواو... تورکمان هەمووی تێك شکاوە. لە بنە هاتووە. رەگی وشك بووە، رەگەکەی، هەزار ساڵ لەمەوبەر، دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر وشك بووە. رەگی نییە. نەیتوانی پنج داکوتێ. شینگێڕی بە دەنگی بەرز، ئەسپی نەجیم، مێگەلە مەڕ و بزن، شمشاڵ، تیر و کەوان و ئالای بەرز و سپی، دەرزیی سپیی درێژ لە ئاشتیدا، شەڕ، جێژن، سەرکەوتن، شکان. تۆقی سەر تاجی پاشاکانیش. بێ شکۆمەندی... سادە، بێ رەنگ و ژاکاو... هەر هەمووی شکان. هەموو شین و شەپۆڕ، ئەمن تا ئەو کاتەی کۆشك و شار

و مەڵبەندانت هەمووو کاول نەکردبیٚ، بە کوڕی خۆمت نازانم... بە کوڕی خۆمت نازانم... بە کوڕی خۆمت نازانم... هێنانەوەی لە دەستچوو، زیندووکردنەوەی مردوو... بۆ وەدەستهێنانەوەی هێزی بەردەوامبوون لە مەرگدا، بۆ نەفەوتان و مانەوە... بە شایەتگرتنی مەرگ و کوشتنەوە، بۆ بەردەوامی بەخشین بەبوون... بەشایەتگرتنی خوێن... باشە ئەمن چۆن توانیبام ئەو لە خوێنی سوور گەوزیوە ماچ بکەم... گیان وەبەرنانەوەی ئەوەی لە دەست چووە... وێرانکردن ... کوڕە کەڵەگەتەکان. کاکۆڵە رەشەکان، چاوی کەسکی وەك چیمەن و روون وەك ئاو، ئەسپی کەفەڵ بریقەدار، شەش مانگ بە شەو و شەش مانگ بە رۆژ بە لینگدان، لە کوڕەکان، لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە تا ئاسۆی زەردەپەڕەکەی. لە رزگاریی بەختەوەرانەی ملکەچکردن بۆ مەرگ، لە شایەتی و دڵنیایی هەبوون، لە ئازایەتی و بەجەرگیی تێکەڵبوون لەگەڵ هەبوونی بیٚ بڕانەوە لە مەرگ و کوژراندا.

سەردولکەکە لە دەشتەکەی ئاناوەرزادا دەبیسرا. دەتگوت لە رەوەزەکانەوە بەسەر خاکەکەدا باریوە. خەمبار بوو و کز و وەکو زەمزەمە و ویرەویرێکی وەك بڵێی لەو بەری هەزاران ساڵەوە بیٚ. ونبوون، ونبوونێکی وەها هەتا قیامەت، جێیەکەی نادۆزێتەوە. بەتاڵ بەتاڵ، خەمناك. قەرەقیز خاتوون بە رەچەڵەك و باب و باپیرەکانی خۆی هەڵدەڵیٚ و دەیانلاوێنێتەوە. دادەنیشت و بۆ هەزاران، سەد هەزاران کوژراوی لە خوێنی کەفکردوو گەوزیو، بە هەمـوو ئەوانەی خۆراسانیان بەجیٚ هێشتبوو و روویان کردبووە بیابانەکان و چیاکانی قەوقاز و دەریا گەورەکان، بە پەرش و بڵاوەکان و بە شوێنبزربووەکان و بە ملیۆنان خوێن ڕژاو و لەشکری مێش و مەگەزی سەوزی لە خوێن نیشتووی هەڵدەگوت و سەردولکەکەی بۆ شۆڕش و کۆمەڵکوژییەکەی عوسمانییەکان و پەیمان شکێنی و شکست و کووزان ئۆغلی و ساری عەلی ئۆغلی و پایاسلی ئۆغلی و جادی ئۆغلی و بۆ پەرش و بڵاوی و تەواوبوون و توانەوە و غوربەتی حەفتاودوو تیرەی توورکمانی دەچڕی و ئاخرین جاریش بۆ مردووەکەی خۆی. لە سەر رەوەزەکانی ئاناوەرزا لە تەنیشت خاکە بیٚ سنوورەکە ئەژنۆی دادەدا و بۆ مێردە کوژراوەکەی و بۆ باپیرەی کە لە کاتی تاڵان و بڕۆدا، تەرمی کەوتە دەست دوژمنان، بۆ براکانی، بۆ هەمـوو کەسوکارەکەی کە کوژرابوون، سەردولکەی دەگوت و پێی هەڵدەگوتن.

جا سەردولکەکانی قەرەقیزخاتوون کەوتنە سەر زار و زمانان. قەرەفیزخاتوون بۆ ئەوەی هێندیٚ شتی لیٚ نەبڕیٚ و تەواوی نەکا و وازی لیٚ نەهێنیٚ، دەچۆوە سەر وایلۆك و چەمەری و سەردولکە لەبیرکراوەکان و دابونەریتە بزربووەکانی تورکمانان. وەك ئاوی حەیات. لە سەردولکەکانیدا بە شوێن زیندووبوونەوە و زیندووبوونداا دەگەڕا... ژیانی بە کوژرانی مورتەزا بەگ بە دەستی دەروێش بەگ و

کوژرانەوەی دەروێش بەگ بە دەستی مستەفابەگەوە دەبەستەوە و ئەو چاوەڕوانییەشی لێی هەبوو. بە دژایەتیکردن و خۆڕاگری و بەستنەوەی خۆڕاگرییەکەی بە سەردولکەیەکەوە و چۆڕە خوێنێك بەسەر ئەو خاکە خۆماڵییەی ئەو پنج و رەگی لەوێ دایە.

مستەفا بەگ خۆی لە دایکی لادەدا و لە دیتنی خۆی دەبوارد. خۆی لێ دەشاردەوە. لەو جۆرە رۆژانەدا نەدەبوو دایکی بیبینێ. ئاخ ئەگەر وەدەستی دەکەوت... کەڕەی بەیانی لە ماڵێ وەدەر دەکەوت و درەنگانی شەوێ دەگەڕایەوە.

رۆژێکیان سیوادی بەیانیی دابوو، تارماییەکی درێژ درێژ دەتگوت دەلەرزێ، لە مستەفا بەگ نزیك بۆوە. لەچکە سپییەکەی لە تاریکاییەکەدا لە چاوی دەدا. مستەفا بەگ لە جێی خۆی وشك ببوو. تینی جووڵان و راکردنی نەبوو. زمانی لە زاریدا شکابوو. زاری وشك ببوو. راوەستا و بە دڵەکوتەوە راوەستا و ئاخرییەکەی تارماییەکە بەحاستەم هەڵکشا و دەنگێکی وەك دوخی شمشێر بێدەنگییەکەی بڕی:

"کوڕم مستەفا بەگ، هێشتا نەتتوانیوە بیکوژییەوە؟ پێت ناکوژرێ؟ ... وەچنگت ناکەوێ؟ ئێمە ئەوەندەی یەك و دوو پێوە دەبین. ئێمە دەکوژرێین کوڕی خۆم مستەفا بەگ. مستەفا بەگ، ئەی خوارزای پڵینگەکان. دێن و لە کۆشکە پان و بەرینەکەی خۆماندا دەمانکوژن. ئەوان وەچەی شەیتانن. لە داوخستن و گرتنیان ئەستەمە."

بێدەنگ بوو. هەر وا رووبەڕووی یەکتری راوەستابوون. نەجووڵان. دیار نەبوو چەندە ئاوا راوەستان. لە نەکاو دەنگێك تەقییەوە:"بیکوژە مستەفا، بیکوژەوە. بەسە ئەوەندەی مەگنخێنە. ئەمن پێیەکم لە سەر لێوی گۆڕە. بیکوژە با بە چاوی زەق و کراوەوە لەم دنیایە نەڕۆم. بیکوژە با داکی مورتەزای چیاپەیکەر، ئەو جوامێرەی دەتگوت نێرە مراوییە، بە چاو و دڵی نیگەرانەوە نەمرێ. دەکرێ، مستەفا بەگی ئاق یۆللی" تا زووە بیکوژە. بیکوژە یان لێگەڕێ ئەوەندە شینی تۆش بگێڕم و سەردولکەت بۆ بچڕم تا لە پەل و پۆ دەکەوم و سەگەل لە رەوەزەکانی ئاناوەرزا مەیتەکەم لەتوپەت دەکەن. ئەگەر نەیکوژی و تۆڵەمی لێ نەستێنییەوە... بیکوژە."

تارماییەکە جار بە جار گەورەتر بۆوە و درێژتر بۆوە و تاریکتر بۆوە و ئەوجار هێمن بۆوە، بێدەنگ بوو و دامرکایەوە. مستەفا بەگیش نەیدی و نەیزانی چۆن بزر بوو.

# ٢٣

حەمدی، تۆ رات لە سەر بلە ئیبۆ چییە؟ پیاوێکی خوێڕییە. لە لایەکیشەوە خوشکەکەی دەروێش بەگ گەورەی کردووە. ئەوە ئاوایە، دەبێ چ بکەین حەمدی؟ بۆ ئەوەی نابێ پشتی پێ ببەستی. ئەگەر ئەو لەو مولّکەدا نەبوایە، دەمێك بوو دەروێش بەگمان کوشتبوو. ئەویش وەك تۆ لە کۆشکەکەی خۆماندا گەورە بووە حەمدی. باشە هەر بە راست هیی جێی مەترسییە؟ کێ کۆشکەکەی دەروێش و خەلە و خەرمانەکانی لێ سووتاند ها؟ کێ؟ ك.... ێ ... ئا ... گر ... ی دا؟ ئیبۆ، بلە ئیبۆ. چما ئەو نەیسووتاندن؟ بۆ سووتاندنی؟ باشە هەر بۆ ئەوەی نەبوو کە تۆ ئیتر لای کەس سەرت هەلّنەیە؟ ... نا ... جارێ راوەستە، راوەستە. ئەوە شێت بووی؟ چما من، هەر خۆم پێم نەگوت بڕۆ کۆشکەکەی کابرا بسووتێنە؟ بۆ ئەوەی ناچار بێ دەرپەڕێ؟... ئاگر لە خەلەوخەرمانی بەربدە تا لە دین دەهری بێ؟ ... چما خۆمان بە بلە ئیبۆمان نەگوت؟ تۆ دەلّێی چی؟ لەگەلّ تۆمە حەمدی، بە سەهوو چووی حەمدی بە سەهوو. چما هەر خۆت لەو کارەدا یارمەتیدەری ئیبۆ نەبووی؟ دەی بلّێ دەی، چۆنی زمانت شکاوە؟ چما شێت بووی؟ ئەمن. ئەمن چۆنم لێك دابۆوە حەمدی؟ گوتم دەروێش تووڕەیە، وا نەبوو هەکۆ؟ ئەی هاوسەنگەرەکانم. کوڕە هۆی مەستان، پیری قسە لە روو، ئەتۆ دەبوو گەنج بوایەی. ئەتۆ رازی نەبووی، ئەتۆ گوتت لە تۆ ناوەشێتەوە ئاگر لە کۆشکی دوژمنەکەت و کێلّگە و خەرمانی رەشووڕووت و هەژاران بەربدەی. هەر تۆ ئەوەت پێ گوتم. ئەمنیش گوتم، کە کۆشکەکە گڕی گرت، دەروێش دەردەپەڕێ و ئەمنیش دەیگرم و راوی دەنێم و لێی دەدەم و دەیکوژم. هەور، دووکەلّ، ئاناوەرزا، دەشتی بێ هەوراز و نشێو، رەوەزەکانی ئاناوەرزا، هەر هەمووی یەکسەر بە رووناکایی بلّێسە خۆیان دەشۆن. دەشتەکە، خەرمانەکان، کێلّگە و پەرێز و کۆشکەکە لە نێو بلّێسەی ئاگردا... دەروێش بەگ لە کۆشکەکەدا دەسووتێ، دەسووتێ، ئەی هاوار دەسووتێ، هاوارە لە من دەسووتێ، حەمدی، حەمدی کارێکی باشمان نەکرد، حەمدی دەسووتێ. هەکۆ، دەسووتێ. بە دایکم، بە دایکم مەلّێن کۆشکەکەیان ئاگر داوە، پێی نەلّێن ها. حەمدی،

حەمدی خوێڕیگەرێتیمان کرد. بەبێ ئەوەی خۆی تێك بدات بە هێمنی و بە سەری بەرزەوە لە ئاگرەکە دێتە دەرێ. لە پلیکانەکان بە پەلەپەل دێتە خوارێ. لە درزی شەوێدا رووبەڕووی رووناکایی، لە بەر بڵێسە سوورەکان وا رادەوەستێ وەك تف بکاتەوە. بەژنی جار بە جار کەڵەگەتتر دەبێتەوە سێبەرەکەی رەش رەش دەکەوێتە سەر شەوەکە و بەو رووناکاییەدا شۆڕ دەبێتەوە کە دڕی بە شەوەکە داوە و شەپۆل دەدا.

دەستەکانی هەڵدێنێ و لە سەر تەوێڵیان دادەنێ و دەجوولێ. لە گۆشەیەکی دیوەخانەکە... لە نەکاو گڕ دەگرێ و لەگەڵ بڵێسەیەکی بەرزدا بەرەو ئاسمان دەکشێ. ئارەقەی کردووە حەمدی، وایە؟ کێ گوتی؟ لە بەیانییەوە ئارەقەی هەڵڕشتووە، بەگ. دەهات بخنکێ. لە ترسان زراوی چوبوو. ئەقڵی لە مێشکیدا نەماوە بەگ. نەیکوژی باشترە، بەگ دیوەخانەکە قرچەقرچ و شرق و هۆڕ دەسووتێ. بڵێسە لە هەر چوار لاوە دەوری دەدەن. لە نێو بڵێسەکان و لە تاریکاییدا هەر درێژتر دەبێتەوە و ئارەقە دەڕێژێ. چاو و مژۆڵەکانی دەبریسکێنەوە. دەدرەوشێنەوە. دەست راگرە حەمدی، تەقەی لێ مەکە. ئێستا دێتە خوارێ. ئاگر لە کۆخە قامیشەکان و لە هەموو گوندەکەش بەردەن. بلە ئیبۆ، ئاااخ محەڕەمە بەڕەڵڵا، دەتکوژم. دەتکوژم. بە شوێنیدا وەك سەگ، بای دێ و بڵێسەکانی ئاگرەکە لە بەر بایەکە هەر هەڵدەکشێن و هەڵدەکەنرێن. بڵێسەکان وەك هەور هەڵدەکەنرێن و دەفڕن. لە پلیکانەکان دێتە خوارێ. پلێکان رمان. تاریکایی. بیهێنە حەمدی. ئەو فیشەکانە لە کوێوە دێن؟ زوو بە هەکۆ، پلیکانەکان دابێژە. ... تاو هەڵدێ. دووکەڵەکە وردە وردە دەوروبەر دادەگرێ. رەوەزە ئەرخەوانییەکان دووکەلاوین. ئەسپە شێیەکە دەرچوو و ئەویش خۆی لەسەر مەلاس داوە. ئەسپەکە کلکی رەپ کردووە و باڵەکانی پەخش و پەرێشان دەکا... دەی کوڕینە لێی سواری ئەسپان بن. خۆی بە مێشەلانی بیبەکەدا کرد. ئەو ماهیر قاباقچی ئۆغلییە کەس نازانێ ئەو هەمووە پارەیە لە کوێوە دێنێ. هەر دەڵێی لە سەر گەنجی قاڕوون دانیشتووە. بگەڕێوە مەستان بگەڕێوە. بگەڕێوە مەستان بگەڕێوە... بگەڕێوە حەمدی بگەڕێوە. بزانە دەتوانی تۆزی پێی ئەسپەکەی بشکێنی؟

ئەو ئەسپە، شێخ عەرەبی برادەری لە ئۆرفەوە بۆی ناردووە. ئەسپێکی رەسەنە لە رەچەڵەکی دولدول. لێرەوە حەمدی، هەر لێرەوە، بەسپایی، با بە رێچکەکەدا بڕۆین، رێچکەی نێو مێشەلانەکە. لە گەڕانەوەدا بێرەدا دێتەوە. چما من نازانم؟ رێك بێرەدا تێدەپەڕێ. ئەمن دەزانم. هەمیشە بێرەدا دەگەڕێتەوە. تێی تەقاند و دەرچوو. تاریماییەك خۆی لەبەر یەك کێشاوە

و لە نێوەندی دەشتەکەدا، وەك فیشەك، وەك فیشەکی تۆپ بەرەو رووبارەکەی جەیهان دەفڕێ. ئەو بۆنی زۆنگاوەش دڵی بنیادەم تێکەڵ دێنێ. راوەستە حەمدی. لە ئەسپەکانتان دابەزن. دابەزن، دابەزن، دابەزن لە ئەسپەکان. دەبێ بیگرم. ئەوە جوامێری نییە. خوا دەزانێ سەبارەت بە من چۆن بیر دەکاتەوە. بێ ئەملا و ئەولا، بە خوێڕی و ماڵسووتێن و خەرمانسووتێنم دەزانێ. یان وەك ئەوەی لە کەرێ ناوەستێ و لە کورتانێ دەدا. دنیا تێك چوو. تفەنگ داهێنرا و جوامێری نەما. با نەمێنێ. لە پشت دەوەنەکان خۆ مات دەن. راکشێن. وریابن دەوەنەکان نەجوولێنەوە.

سوارێکی دیکە لە نێو دووکەڵ و ئاگری کۆشکەکەدا هاتە دەرێ. ئەویش وەك تیرێکی لە کەوانێ دەرچووبێ، بە پاناوکی دەشتەکەدا بازرە بوو.... ئەوانە بۆ کوێ دەچن حەمدی؟ ئەتۆ بڵێ بلە ئیبۆ؟ وەشوێن بەگەکەیان دەکەون. بەگەکەیان، دەروێش بەگ. نەتهێشت تەقەی لێ بکەم. ئەو کۆشك سووتاندنەمان چ سوودێکی هەبوو بەگ؟ قازانجەکەی چ بوو بەگ؟ ... هیچ قازانجی نەبوو. دووکەڵ بە سپایی لە کۆشکەکە هەڵدەستێ.

دەشتە دووکەڵ گرتووەکەی بەر تاوەکە رەنگێکی زیوینی بەخۆوە گرت. هەتاو دووکەڵەکەی رەواندەوە و سڕییەوە بردی. هەتاو دەشت و دووکەڵەکە هەڵدەلووشێ. سوارەکان لەچاوان ون بوون. کێ بوو پێشنیاری کرد ئاگر لە کۆشك و خەرمانی بەردەین؟ برایم ئیبۆ تۆ بڵێ. بڵێ دەی خوێڕیی بێ شەرەف دەی بڵێ؟ ئەو ماڵەکەی من ناسووتێنێ، وا نییە؟ نایسووتێنێ بەگ. ئەگەر ماڵەکەی شاریی و ئەوی هاوینەهەوارەکەی و هەموو گوندەکەشی بسووتێنین ئەو پووشێکیشمان لێ ناسووتێنێ. پەڵەیەکی رەشمان بە داوێنەوە نووسا. دەروێش زۆر تێك دەچێ. لە حاڵێکدا کە لە ژووورە تاریکەکەیدا کە بەر دەرگا و پەنجەرەکانی بە توورەکەی لم هەڵچنیوە و هیچ درز و کونێکی نەهێشتووەتەوە، ئارەقەی مەرگ هەڵدەڕێژێ و دەخنکێ. دەڵێ، سەیر کەن، دوژمنەکەی من چیی لێ هاتووە، حەیف، حەیف بۆ مستەفا. لەوانەیە ئەمڕۆ، یان سبەی بێ و هەر لێرە راوەستێ و لە قووڵایی دڵییەوە هاوار بکا و بڵێ ئەوە هاتم. ئیتر ئەوەندەی ناهێنێ. بابی ئەو سووکایەتییە نابێ. ها بمکوژە و نەجاتم بدە. برایم ئیبۆ، برایم ئیبۆ، ئەوە کێ ئەو رێگەیەی خستە بەر دەمم؟ کێ تووشی ئەو رۆژە رەشەی کردم؟ چۆن ئەو خوێڕییەتییەم قەبووڵ کرد؟ کاری چاککردنەوەی ئەو کۆشکە کەی تەواو دەبێ حەمدی؟ تەواو بووە بەگ. دوێنێ دیتم. دارتاشەکان، سندووقێکی گەورەی دار گوێزیان چاك دەکردەوە کە هەڵکۆڵینەکانی سەری تێك چوبوو. ئەو سندووقە ئەحمەد پاشای کوزان ئۆغڵی بەر لەوەی دوور بخرێتەوە، کردبوویە دیاری.

سندووقێکی زەنگوڵەدار. دارە سووتاوەکەی بۆنی تفتی سێوی کێویی لێوە دێ. کارێکی باشمان نەکرد. کارێکی باشمان نەکرد حەمدی، برایم ئیبۆی خوێڕییە پیاو... راوەستە، ئیبۆ راوەستە، کارێکم پێتە. ئەمن دەمەوێ دوو قسەت لەگەڵ بکەم. سوارەکان چییان لێ هات؟ تاوەکە جار بە جار بەتینتر دەبێ. زەردەواڵەکان شێت بوون. نێو قامیشەڵانەکە دەڵێی جەحەندەمە. هاڵاوی گەرماکە قورس و شێدارە. پشوو سوار دەکا. ئاگرێك لەوبەرەوە، لەو گۆشەی زۆنگاوەکەوە دەشتەکەی داگرتووە و دێتە پێشێ. قامیشی بڵند، قامیشی وشکەڵاتوو، گژ و گیا و دەوەن و دڕووەکان ئاگرەکە خۆشتر دەکەن.

حەمدی:"ئەمرۆ بێ و نەبێ بێرەدا تێدەپەڕێ. لە ئاسکێکی سرك دەچێ. دەترسێ، دەترسێ و ئارەقە هەڵدەڕێژێ و دەترسێ. ئێستا کاتی پەیدابوونێتی. لە پێشدا شەو بوو کە لە کۆشکەکەی دەرپەڕی. ئەسپەکەی وا تاو دابوو ... کە ئەسپەکە لەبنیدا گرمۆڵە دەبوو. وێك دەهات و دەکشایەوە. فیکەی دەهات. جار بە جار پتر لەو سوارانە دوور دەکەوتەوە کە لە دواوەی دەهاتن. سمی ئەسپەکەی دەتگوت عەرزی ناگرن. ئەمن دەیناسم، ئەمرۆ هەر بێرەدا دێتەوە. بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەك بێرەدا و بە بەر لوولەی تفەنگەکانماندا تێدەپەڕێ. جا ئیتر خودا یان بە ئێمەی دەدات یان بەو. ئەوان سێ کەسن، ئێمە چوار کەس. ئێمە لە بۆسەداین و ئەویش لە بەر سێرە و تیرئەنگێوی ئێمەدایە."

"کەوابوو دێ، حەمدی؟"

"دێ، بەگ."

لە زۆنگاوەکەی ئاقچاسازەوە دەنگەدەنگێك دێ. زۆنگاوەکە پڕ لە باڵندەی مل درێژ و لۆق درێژ و گەورە کە شینەکەیان شینێکی بێوێنە و لە بەر تاو و سێبەرێ، لە تاریك و رون و رووناکایی ئەستێرەدا بە هەزار جۆر شین، شینی تۆخ و رەنگاو رەنگ و زەرد دەچنەوە. بە هەزاران زەردەواڵە هەر یەکەی هێندەی سەری پەنجەی ئەسپێ کوژە کە بە باڵە روونەکانیانەوە وزەوز هەڵدەفڕن. باڵندەی کۆچەر بە دندووکە وەنەوشەییەکانیان و بە باڵی لێك کراوەوە، پەپوولەی هەزار و یەك رەنگ و خاڵ خاڵ بە چاوی لەرزۆك و بریسکە بریسکەوە، چەقەڵ و بۆق و بەراز و ماری ئەفعی و کێسەڵەکان دەتلێنەوە. لەگەڵ بەتینتر بوونی گەرماکە قوڵتەقوڵتی زۆنگاوەکەش زیاتر دەبوو. مستەفا بەگ وەك بەری دەستی خۆی ئەو زۆنگاوەی دەناسی. دەروێش بەگیش ئاوا شارەزای بوو. زۆنگاوەکە لە هەر سەعات و کاتێکی رۆژدا قوڵتەقوڵت و دەنگەکەی جۆرێك بوو. بەیانییان بێدەنگ بوو. هەر جار نە جارێك لە نێوەڕاستەوە، قوڵتەقوڵتێکی لێڵ، کە هەر دەتگوت

شتێك لە قووڵاییەوە هەڵدەکەنرێ، دەبیسترا. دەنگەدەنگێکی وەك ناڵین و نووزانەوە لە قووڵاییەکەیەوە دەهات. هەر تاو هەڵدەهات دەبووە هەڵڵا و زەنازەنایەك و هەموو شتێك دەشێوا و تێك دەچڕژا و هەر کام لە قامیشە بەرزەکان، گوڵ و دار و قامیشە بچووکەکان و باڵندەکان و هەزاران سیسرە و زەردەزیڕە دەنگیان هەڵدەبڕی. تەنانەت دەتگوت تیشکی خۆرەکەش بێدەنگ نییە. کە تاوەکە دەکەوت و گەرم دا دەهات، زۆنگاوەکە لە نێو هەڵمێکی خەست خەستدا نوقم دەبوو و ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاش لە پشت تەمی هالاوێکەوە ون دەبوو. زۆنگاوەکە دەتگوت پشووی قووڵ قووڵ هەڵدەکێشێ، لە ناخەوە قوڵتەی دەهات.

لەو بەری دەوەنە چڕەکانەوە، لە پشت قامیشەڵانە بەزەکەوە بۆسەیان داخستبوو و تفەنگە ماوەرزەکانیشیان خستبووە سەر بنەتای قامیشەکان و چاوەڕێ بوون.

مستەفا بەگ دەیگوت:"دایکم، دایکی من، قەرەقیز خاتوون لەژیانیدا وای لێ نەهاتبوو. زەرگەتە کردبوویانە وزەوز. زەوی، لە بەر پشووکێشانی زۆنگاوەکە دەلەرزێ. دەیوێ بەر لە مەرگ، بەر لە مەرگ، بەر لە مەرگ تەرمی بێ گیانی ساری ئۆغلی لەبری مورتەزا بەگ ببینێ. چاوەڕێیە. چاوەکانی بەقووڵدا چوون ـ ئەوە دیارە شتێك هەیە. بنیادەمەکان زۆریان لە چاویانەوە نامرن. ئەگەر دەوروپشتی چاوەکانیشیان چرچ و لۆچ بووبێ، ترووسکە ترووسکی چاوەکانیشان گەشبوونی خۆیان و زیندوویەتیی خۆیانیان لە دەست دابێ، دیسانیش کۆمەڵێك شتی زیندوو لە گیانیاندا هەر دەمێنێتەوە. وەك چاوتروکاندن و برۆ هەڵتەکاندن و... تەنانەت ئەگەر دەوروپشتی چاوەکانیشیان چرچ و لۆچی تێکەوتبێ... مەرگی مرۆڤەکان لە دەستەکانیانەوە دەست پێ دەکا. قەرەقیز خاتوون ئاق یۆللی" دەستەکانیش مردبوون. دەستەکانی درێژ ببوونەوە زەرد و چرچ و لۆچ و بێجووڵە و شۆڕ ببوونەوە. قەرەقیز خاتوون بە دەستە مردووەکانییەوە ڕاوەستاوە و چاوەڕێیە تۆڵەی کوڕەکەی بستێنرێتەوە. بەر لەوەی خۆی بڵێ دەمرم، دەستەکانی مردبوون. ئەو کارە زۆری خایاند. باشە دەروێش بەگ نەبێ و لەبری ئەو ساری ئۆغڵییەکی دیکە بکوژین نابێ؟ ئەگەر من کوڕەکەی دەروێش بەگ بکوژم، باشە ئەویش حەمە عەلییەکەی من ناکوژێتەوە؟

بزەیەکی هاتێ: حەمە عەلی شێت و خولیای تەراکتۆرە. هەر ڕۆژەی جۆرە تەراکتۆرێك دێنێتەوە بەر دەرگا. هەموو ڕۆژێ دەچووە نوێنەرایەتیی کۆمپانیایەك و لە بەیانییەوە تا ئێوارە وەك شێتان خۆی بە تەراکتۆرانەوە دەخافڵاند. حەمە عەلیی ئێمە وای دەست بە سەر

تەراکتۆراندا دێنا، دەتگوت کچێك دەلاوێنێتەوە. دواییش بە بەرپرسی کۆمپانیاکە دەڵێ، بابم سڵاوی گەیاندی و گوتی ئەو تەراکتۆرەم بدەنێ و ئیتر سواری تەراکتۆر دەبێ و دەیهێنێتەوە.

حەمە عەلی ماوەی حەوتوویەك هەتا ماندوو و شەکەت و وەڕەز دەبێ، بە تەراکتۆرە نوێیەکەی هەموو گوند و دەشتەکەی ئاناوەرزا و گوندەکانی ئاناوەرزا دەگەڕا.

"ئەو هەمووە تەراکتۆرەت بۆ چییە حەمە عەلی؟ وەرە سەیرکە لەو حەوشەیەدا دەرزی هەڵاوێی وە عەرزی ناکەوێتەوە. ئەو هەمووە تەراکتۆرەت بۆ چییە؟"

"زەوییان پێ دەکێڵم بابە. دروێنە دەکەم. تۆوی لۆکە دادەچێنم. هەموو ئەو دەشتەی ئاناوەرزا دەکێڵم. ئەو زۆنگاوە وشك دەکەمەوە. دەبێتە موڵکی خۆم. باغی پرتەقاڵی لێ دەچەقێنم. لێرەوە تا ئەو سەری ئاناوەرزا هەموو دەبێتە باغی پرتەقاڵ."

"ئەوانیش حەمە عەلی دەکوژنەوە. لە پشت سوکانی تەراکتۆرێکی کەسك، نارنجی.

"بیکوژە مستەفای خۆم، تۆڵەی لێ بستێنەوە، بیکوژە مستەفاکەم. بیکوژە مستەفاکەم. لە نەکاو خرمەی سمی ئەسپێك بیسترا. ئاوڕی داوە و سەیری کرد، سێ سوار لە بەر سێرەی تفەنگەکان...

گوتی:"یەك، دوو، سێ."

تەقە کرا. چوار پەنجە هاوکات پەلەپیتکەیان راکێشا. دووکەڵ لاتی داگرت. سێبەرەکان پەرش و بڵاو بوون. تاریکییەکە نیشتەوە. سوارەکەی پێشەوە گلا. دەنگێکی وەك قیژەیەکی بەرز، وەك گوڕەیەك لە رەوەزەکانی ئاناوەرزا گەڕا و دەنگی دایەوە. پیاوێك پێی لە رکێفەکەی گیرابوو و ئەسپەکەش رەویبۆوە و بەرەو زۆنگاوەکە دەیکێشا. سێهەم سوار لە جێی خۆی چەقی و نەبزووت.

"مەستان، مەستان، ئەو ئەسپە بگرەوە کە بەرەو ئاقچاساز چوو."

مەستانە پیر گورج و گۆڵ لە جێی خۆی دەرپەڕی و خۆی خستە سەر ئەسپ لینگی دا. حەمدی ئەتۆش بچۆ ئەو پیاوە بگرە کە کەوتووەتە نێو خەرەندەکەوە... هەکۆ ئەتۆش ئەو سوارە دابەزێنە وا بە سەر ئەسپەکەیەوە وشك هەڵاتووە.

سوارەکە تەکانێکی لەخۆی دا و بەسپایی ئەسپەکەی بەرەو ئەوان لێ خوڕی و ئەوجار دەستەکانی وەك باڵی هەڵۆیەك لێك کردنەوە و بە گریانەوە هەرای کرد:"مەمکوژن، ئەمان، ئەمان... لێم مەدەن... لێم مەدەن."

هەکۆ گوتی:"دابەزە. چەکەکەت فڕێ دە."

مەستان دوای تاوێك ئەو ئەسپەی هێنایەوە کە رای کردبوو. ئەو پیاوەی پێی لە رکێفەکە گیرابوو زیندوو نەبوو. ئەو پیاوەش کە حەمدی کەوتبووە شوێنی، پەیتا پەیتا لە خەرەندەکەوە تەقەی دەکرد.

مستەفا بەگ لە خۆشییان وەخت بوو بفڕێ.

"مەستان، هەکۆ، دەستەکانی شەتەك بدەن. ئەسپەکەشی لە دارەکە ببەستنەوە. نەکا بێڵین دەروێش را بکا."

مستەفا بەگ بە سینگەخشکە خۆی گەیاندە تەنیشت حەمدی و پرسی:"چۆنە حەمدی؟ دەروێش خۆی بە دەستەوە نادا؟"

حەمدی وەڵامی دایەوە:"دەست دەکاتەوە. دەروێش بەگ دەستو تفەنگێکی باشی هەیە، خەتەرە."

"ئەگەر ویستی را بکا، لێی دەدەین. ئەتۆ لە لای راستەوە و ئەمن لە چەپەوە، مەستان ئەتۆ لەگەڵ من وەرە. ئەتۆش لە لای خوارووی خەرەندەکەوە راکشێ. لەبیرت نەچێ تەقە هەر لە لاقەکانی بکەی ها."

حەمدی"ناتوانێ را بکا. دەڵێی فیشەکی وەلاقی کەوتووە."

"ئاواش هەر تەقە لە لاقی بکەن. وا بکەین فیشەکی لێ ببڕێ."

تاریك داهات. هێشتا مانگ هەڵنەهاتبوو. بەڵام تارمایی دەوەنەکان دەبنیران. سەرچڵۆکی دار و قامیشەکان لە بەر شنە نەرمەکە هێدی هێدی دەلەرینەوە. ئاسمانەکە پڕ لە ئەستێرە بوو و بەردەوام ئەستێرەش رادەخوشین و دەکوژانەوە. بە هەر چواریان تەقەیان لەو پیاوە دەکرد. کابراش تەقەی لێ دەکردنەوە. مستەفا بەگ دوو مەخزەنی لە سەر یەك پێوە نا و جوابی دایەوە و بە دەنگێکی مێرانەوە هەرای کرد:"دەست بەردەوە دەروێش بەگ."

لەولاوە هیچ دەنگێك نەهاتەوە و ئەوانیش پەیتاپەیتا تەقەیان لە قووڵایی خەرەندەکە کرد. دەستیان راگرت. گوراندیان و دیسان دەستیان پێ کردەوە."

"ئیشەڵا زیندووە، نەکوژراوە، نا حەمدی؟"

"نەکوژراوە، نەکوژراوە. دەروێش بەگ بە زیندوویی دەگرین. نەکوژراوە."

مستەفا بەگ لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. ئەو بارە قورسەی لە مێژبوو لە ئەستۆی بوو و خەریکبوو پشووی لێ ببڕێ، ئێستا لەسەری لاچوبوو. خۆی دۆزیبووەوە. دەروێش بەگ ئیتر لە چنگی قوتار نابێ. تەنانەت ئەگەر برینداریش نەبێ، نەیدەتوانی را بکا. ئەگەر دەروێش مردبێ،

سەری دەبڕێ و کەڕەی بەیانی دەیخاتە بەر پێی دایکی. لە پێش چاوەکانی دایکی، سەلکە خوێناوییەکەی دەروێش بەگ دەداتە بەر شەقان. مانگ هەڵات و ریچك لەو کاتەدا کابرای نێو خەرەندەکە لە سەر کەلاکی ئەسپەکەوە خۆی هەڵاویشت و تەقەی لە هەکۆ کرد. هەکۆ گوڕاندی و لە کەوتندا دەسرێژێکی لە کابرا کرد. کابرا بە سەر کەلاکی ئەسپەکەدا کەوت.

مستەفا بەگ دەنگی لێ هەستا: "ئاااخ، ئاخ هەکۆ، پشتت شکاندم، دەروێشت کوشت."

لە جێی خۆیان نەبزووتن. هەکۆ دەیناڵاند. برینەکەی زۆر قورس نەبوو. سواری ئەسپەکەیان کرد و بەڕێی ئاوەدانییان کردەوە.

مستەفا بەگ گوتی: هیچ بۆ دایکم مەگێڕەوە. بەیانی سەری دەروێش بەگی بۆ دێنمەوە."

مستەفا بەگ هەتا بەیانی لە کەناری زۆنگاوەکە، لە نێو کێڵگەی لۆکەدا ئەوسەر ئەو سەری کرد. هەر رۆیشت و گەڕایەوە. ئیتر هەموو شتێك تەواو ببوو. ئەو گەمەی خوێنەی دەمێك بوو هەبوو، ئاخرییەکەی بە مردنی دەروێش بەگ کۆتایی هاتبوو. کێ دەزانێ لەو ماوەیەدا لە هەر دوو بەر چەند کەس کوژرابوون؟ کێ دەزانێ؟ خەمێکی لە رادە بەدەر لە دڵی نیشت و چاوەکانی برژانەوە و دوو دڵۆپە فرمێسکی گەرم کەوتنە سەر روومەتی. ساتێك ناخی بەتاڵ بۆوە. لە مێشکی خۆی و ئێسقانەکانیدا هەستی بە بۆشاییەك کرد و بە زاریدا هات: "تەواو بوو. تەواو بوو حەمدی، ئیتر بەبێ ترس و خۆف و بەبێ رق و قین و وەك بنیادەمێك دەژییم. ئیتر یەکێك وەك دڕندەیەك ئەویتر ناخوات. ئەتۆ پێت وایە دەروێش کوژرا؟"

"کوژرا بەگ. دە شەقاوم مابوو بیگەمێ. بەبێ جووڵە بەسەر ملی ئەسپەکەیدا کەوتووە. بەڵام کەس لەو دەروێشە تێ ناگا. وا باشترە تا بەیانی راوەستین."

"راوەستین رۆژ بێتەوە. بەخێر و خۆشی رۆژ بێتەوە."

"بەخێر و خۆشییەوە رۆژ بێتەوە.

ئیتر هەردووکیان بێدەنگ بوون.

بەیان ئەنگووت و تاو هەڵات. حەمدی چاوە تیژە گورگییەکانی خۆی لە تاریك و روونەکەی بەیانیدا لەو تەرمە هەڵنەدەگرت کە بە سەر ئەسپەکەدا کەوتبوو. لە نەکاو گوڕاندی: "کوژراوە. بەگ.

دەنگەکە لە بێدەنگییەکەی بەیانیدا دەنگی دایەوە و گەیشتە گابەرد و رەوەزەکانی ئاناوەرزاش. لە مردووەکە چووە پێشێ. مردووەکە بەراودەم بەسەر ملی ئەسپەکەدا کەوتبوو. پڕی بە قژ و کاکۆڵیدا کرد و سەری بەرز کردەوە. بەندی جەرگ و دڵی پسا. مەیتەکەی

وەرسووڕاند و هەرای کرد و دەنگەکە لە قورگیدا گیرا:"هەی قوڕ بە سەرمان... ئای ی ی ی .، کوڕە خۆ دەروێش نییە..."

دەشتەکانی لە نێوشانییەوە سڕ بوون و شۆڕ بوونەوە.

دەنگێك لە قوولاّیی دڵی مستەفا بەگەوە هەستا:"چیت گوت؟"

کە بەغاردان چوو و مردووەکەی دی، لە جێی خۆی وشك بوو. لاقەکانی سڕ و بێهێز بوون و ئەژنۆی لەرزین و نووشتانەوە و لەجێی خۆی دانیشت. چاوەکانی بەسەر مردووەکەوە مۆڵەق مابوون. چاوە ڕەشەکانی لە شووشە دەچوون. سمێڵە زلەکەی ڕەش ڕەش و برۆیەکانی تێکەڵ بە یەکتر ببوونەوە. سەر ڕوومەتی راستی شوێنی برینێکی پێوە بوو کە سپی دەچۆوە. بەژنێکی ڕێك و پێکی هەبوو هەر بیست و پێنج ساڵ دەبوو. حەمدیش لە تەنیشت بەگەوە دانیشت. چەند ساتێك بێدەنگ بوون. ئاخرییەکەی بەگ سەبرێ سەری هەڵێنا و چاوەکانی کە دەتگوت گۆمی خوێنن، لە حەمدیی بڕین و پرسیی:"ئەوانە کێن حەمدی؟ ئەوانەی کوشتمانن؟"

"کۆمەڵێك قاچاخچیی "ئەنتەپ"ن، بەگ. ئەو داماوەش عەباسە. عەباس قاچاخچی. دەیناسم. گەنجێکی ئازا بوو. سێزدە برای ملهوڕی هەیە کە هەر هەمووان قاچاخچین. کارێکی باشمان نەکرد...."

هەستان و چوونە سەر کابرای دەست و پێ بەستراو. کابرا پەیتا پەیتا دەینالاّند و چاوەکانی لە ژێلاّ هاتبوون و دەرپەڕیبوون. دەموچاوی درێژووکە و ڕەنگ بزرکاو بوو. هەر ئەوانی دی بە نالێنەوە گوتی:"مەمکوژە مستەفا بەگ، ئەتۆ ئێمەت لێ تێك چووە."

مستەفا بەگ بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی:"ئەتۆ کێی؟"

کابراش بە دەنگێکی نیوەزیندوو گوتی:"مەمکوژە مستەفا بەگ. باسی ئەو ڕووداوە بۆ کەس ناگێڕمەوە."

مستەفا بەگ بەری چاوی تاریکدا هات و سەری لەگێژەوە هات و گوێچکەی زرینگانەوە و ئاماژەی بە مەستان کرد. مەستان لوولەی تفەنگەکەی بە شەویکەی کابرای دەست و پێ بەستراوەوە نا و پەنجەی بە پەلەپیتکەدا هێنا.

مستەفا بەگ ئاوڕی لەو لایە دایەوە کە ئەو نیشانی دەدا و سوارێکی دیت کە لە پشت دارەکانەوە بە تاو تێدەپەڕی. دوو سواری دیکەش لە دوورەوە بە دوویەوە بوون.

حەمدی گوتی:"خۆیەتی."

مستەفا بەگ."هەر لێرە، لە تەنیشت زۆنگاوە قووڵکەیەك هەڵکەنن. مردووەکان بەبێ ئەوەی رووتیان بکەنەوە هەر ئاوا لە قووڵکەکە بخەن و بۆ شەویٚ خۆ بگەیێننەوە کۆشك."

پێی لە رکێف نا و بە زەحمەت خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و بە داهێزراوی و سەری شۆڕبووەوەوە بەرەو ئاوەدانی لێی خوڕی.

زۆنگاوەکەی ئاقچاساز لە بەر قرچەی تاوەکە لە ناخەوە دەکوڵی و قوڵتەی دەهات و زەوییەکەی رادەتڵەکاند و هەنگەکان بە باڵە لەرزۆك و لێك کراوەکانیانەوە کە رەگە رەگەی سووریان تێگەڕابوو، لە پوورەکانیاندا دەجمین و تێك دەچڕژان و ئەو پوورە هەنگانە بەردەوام دەهاتنەوە پێش چاوی مستەفا بەگ.

# ٢٤

مستەفا ئاق یۆللی” پرسیی:"دەی باشە، شاردتانەوە؟ ئەی ئەسپەکانتان چ لیَ کرد؟ کەلوپەلەکان کوانێن؟

مەستان گوتی:"هێنامانن."

"ئەسپەکان بەرە گوندی جیق جیق و با وەلی بیانفرۆشیَ. کەلوپەلەکانیش بەسەرخۆتاندا بەش بکەن. ئەی هەکۆ چۆنە؟"

"برینەکەی قووڵ نییە. چەند رۆژێکی دی چاك دەبێتەوە."

"بەشی ئەویش بدەن. پێی بڵێن نەکا لە زاری دەرپەڕیَ. نە کەس دیوێتی و نە بەڵگەیەك هەیە... ئێمە دوژمندارین."

جا رووی لە بلە ئیبۆ کرد:"ئەتۆ دەڵێی چ بکەین بلە ئیبۆ؟"

"دەروێش بەگ گەڕاوەتەوە و هەموو رۆژێش لە سەر زەوی و زارەکەیەتی. بەتاقی تەنیَ. لە رێی چنارەدار."

"بە ئەسپ یان ترۆمبێل؟"

"بە ئەسپ."

"بۆسەی بۆ دابنێین؟"

"ئەمشەو؟"

مەستان گوتی:"بەڵیَ، دەی چ دەبیَ، هەر ئەمشەو. بەرەبەری بەیانی."

بلەئیبۆ:"دیار نابیَ. کتوپڕ دەبینی لە نیوەی شەوێدا بەرەو ئاناوەرزا تێی تەقاندووە. جوان سەروسۆراغیم کردووە. بەردەوام بەرەو ئاناوەرزا دەڕوا. لە زینوێی عەلی ئاوەژوو دەبێتەوە بەو دیودا. بە ئەسپ لە رەوەزەکانەوە وەسەر دەکەویَ."

"کەوابوو چ باشترە لەوەی لە نێو گابەردەکان چاوەڕێی بین."

بلەئیبۆ:"زۆر باشە."

"بە ئەسپ بکەوینە شوێنی."

بلە ئیبۆ:"با وەشوێنی بکەوین. ئەوەندەی لێ نزیك بینەوە تیر بیگاتێ بەسە. ئەگەر بتوانین ئەسپەکەی بنگێوین، ئەوی دیکەی ئاسانە."

دەنگێك لە پشتەسەرییەوە دووپاتەی کردەوە:"ئەوی دیکەی ئاسانە."

مستەفا بەگ هەر گوێی لە دەنگەکە بوو هەستا. دایکی بە پشتی کۆماوەوە، وشکەڵاتوو و روخسارێکی پڕ لە تۆڵە ئەستاندنەوە و تووڕە بەرەو لای دەهات.

"وام بیست کوشتووتە مستەفا. بیستم لە بری دەروێش، لە بری کوڕەکانی دەروێش سێ لێقەوماوت کوشتووە. دەڵێن ساری ئۆغلێت پێ ناکوژرێ. دەڵێن، هەڵۆکەم کاتێ چاوی بە دەروێش دەکەوێ، دەستی دەلەرزێ و ناتوانێ تفەنگی پێوە بنێ. وەباڵ بەستۆی ئەوانەی وا دەڵێن رۆڵەم، جوامێرەکەم، مستەفاکەم. لە شاری وا بڵاو بووەتەوە کە دەستت، دەستت، دەستت لەرزیوە و هەر چاوت بە دەروێش کەوتووە تفەنگەکەت لە دەستی بەربۆتەوە."

مستەفا بەگ بێدەنگ بوو و نەیتوانی سەری هەڵێنێ و سەیری چاوی دایکی بکا.

"مورتەزا لە گۆڕدا ئێسك و پرووسکێشی رزین و لە وەچەی ساری ئۆغڵی کەس نەچووە لای، مستەفا ئێستا براکەت گۆڕ هەڵدەتەکێنێ. براکەت هێشتا تۆڵەی نەستێنراوەتەوە."

حاڵەتە بێ بەزەیی و سووکایەتی پێکردنەکە لە روخساری رەوییەوە. لێوە تەنکەکانی لەزرین و وەك قەیتان باریك بوونەوە:

"مستەفا، یانی کوشتنی ساری ئۆغلییەك ئەوەندە ئەستەم و دژوارە؟ ئەوەندە ئەستەمە؟ لەو کاتەوە مورتەزا چووەتە بن ئەو گڵە رەشەوە، چەند رۆژ، چەند مانگی بەسەردا تێپەڕیوە؟ رادەوەستم، مستەفا، ئیتر پێم لەسەر لێواری گۆڕە رۆڵەم، چۆن دەتوانم لێرە بڕۆم؟ بڕۆم و چ بە مورتەزا بڵێم؟ بڵێم لە ژێر ئەو گڵە رەشەدا دەبێ زۆر چاوەڕوان بی مورتەزا؟ چونکە کوشتنەوەی سارییەکان کارێکی ئەستەمە؟ کوشتنی ئێمەمانان ئاسانە، بەڵام کوشتنەوەی ئەوان ئەستەم و دژوارە. کە چوومە ژێر گڵ و چوومە لای مورتەزا، چ بڵێم مستەفا؟"

هەر قسەی کرد. زۆری گوت، قسەی دڵتەزێن، تووڕە و ئەوجار لە پشتە کۆماوەکەیەوە لەوێ دوور کەوتەوە. بە روخسارێکی تێکسمڕاو و لێوی رەش داگیراوەوە رووی لە بلەئیبۆ کرد:"بلەئیبۆ لەگەڵم وەرە."

جا بە هەشتاو لە پلیکانەکان چووە خوارێ. چاوەڕێی بلەئیبۆ بوو. تاوێك دواتر ئیبۆ بە سواری ئەسپەکەی هات. مستەفا بەگ ئاوڕی دایەوە و چاوی لە چاوی بڕی و لێی ورد بۆوە. گوتی:"وەرە."

ئەسپەکانیان لینگ دا. لە زینوێی عەلی تێپەڕین. گەیشتنە گابەرد و ڕەوەزەکان و دابەزین و چاوەڕێ مان. مانگ هەڵات و هاتە سەرێ و هەڵکشا و گەیشتە نێوەندی ئاسمانێ و ئەوجار شۆڕ بۆوە بەرەو داکشان. هەتا چاو هەتەری دەکرد دەروێش بەگ دیار نەبوو. ئەوجار لە دوورەوە لە تاریك و روونەکەی بەیانیدا سوارێك پەیدا بوو.

بلەئیبۆ گوتی:"نەمگوت بەگ؟ ئەوەتا خەریکە دێ. ڕاست خۆیەتی. دەروێشە. ئێستا لەو ڕێیەی خوارەوە روو بەرەو ڕەوەزەکان هەڵدەکشێ."

سوارەکە سەری ئەسپەکەی خۆی بەرەو ڕەوەزەکان وەرسووڕاند و هاتە بەر سێرەی تفەنگەکان. مستەفا بەگ دوای ئەوەی ماوەیەك سێرەی لێ گرت، ئاخری پەلەپیتکەی ترازاند. بلەئیبۆش. ئەسپەکە گلا. ئەویش بە تەقە وەڵامی دانەوە و تا تاو هەڵات هەر تەقەیان لێك کرد.

دەنگی دەروێش بەگ لە پەنا ڕەوەزێکەوە هەستا:"مستەفا، هۆی مستەفا، قەت بڕوا ناکەم ئەتۆ خەلە و خەرمانی ڕەشووڕووت و هەژارانت ئاگر دابێ، هەر بۆیەش هاتوومەتە ئێرە. ئەوە چەند ڕۆژێکە هەموو شەوێ دێمە ئێرە. زۆر زۆر خراپت هەواڵ دەگەیەننێ، مستەفا بەگ. ئەو لێقەوماوانەی گیانیان بۆ پارووە نانێك لە سەر بەری دەستیان دانابوو... بێ ئینسافیت کرد. تۆ خوا ئەو ئەسپە بەستەزمانەی منیش حەیف نەبوو؟ ئەسپی عەرەبیی ڕەسەن بوو. تۆ خوا لە ڕەچەڵەکی تۆ دەوەشێتەوە ئەسپێك بکوژی؟ هەی تف و لەعنەت لە ڕەچەڵەکی من، کە دوژمنایەتیی هیی وەك ئێوە دەکەم کە لە بری سوارەکە ئەسپەکەی دەکوژن...."

مستەفا بەگ بێدەنگ بوو.

دەروێش بەگ هەرچیی قسەی کرد، مستەفا هەر بێدەنگ بوو. مستەفا بەگ لە پشت بەردێکەوە ڕاکشابوو و پەنجەی لە سەر پەلەپیتکە دانابوو و چاوەڕێ بوو هەر هێندەی سەرە دەرزییەك لە جێیەکی دەروێش دەرکەوێ، فیشەکێکی پێوە بنێ. پەشیمان بوو لەوەی سێرەی لە دەروێش بەگ نەگرتبوو و لە ئەسپەکەی نەیگلاندبوو و لە بری سوارەکە چارەوییە بەستەزمانەکەی کوشتبوو. ئێستا هێندەی سەرە دەرزییەك خۆت دەرخە با وەك ئەسپەکەت ئەتۆش...

ڕێك لەو كاتەدا دەتگوت تۆزێك لەجێی خۆی قیت ببۆوە، كە فیشەكێك بە ویزەویز بەسەر سەریدا تێپەڕی و كڵاوەكەی رووشاند. خۆ لەو ساتەدا سەری دانەنواندبایە، گوللەی دووەم مێشكی دەپژاند.

دەروێش بەگ بە تەشەرەوە گوتی:"خەمت نەبێ ئەسپەكەت زیانی پێ نەگەیشت. پیادەم نەكردی. ئەمن ئەسپت لێ ناكوژم. لەوە دڵنیا و خاترجەم بە.

مستەفا بەگ ئیمانی نەمابوو، دەرورووبەری دەروێش بەگی دایە بەر بارانی فیشەك. مستەفا بەگ لە داخان وەخت بوو شێت بێ.

تاو هێندەی سپیدارێك بەرز ببوو. رەوەزەكان سوور بوونەوە و هەورێكی سپی دەورو پشتی داپۆشین. بەڵام زۆر نەمایەوە و تاوێك دواتر رەوییەوە.

نە ئەو و نە ئەوانی دیكەش لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. هەر كەس سەری هەڵێنێ سەری دەچێ. هەر جارێكی مستەفا بەگ هێندەی سەرە پەنجەیەك سەری بەرز دەكردەوە، فیشەكی دەروێش بەگ ویزەی دەهات و مستەفا بەگ هەموو جارێ لە سەر هەڵدێری مەرگ گیانی شیرینی نەجات دەدا.

بارانێكی زەرد دەباری. مستەفا ئاق یۆللی" بەو قەڵافەت و قاییش و قرووشەوە لە بن چنارەكەی گۆڕەپانی بایەزید لە ئەستەمبول دەتگوت هەورەتریشقە لێی داوە... هەستانی لە پشت مێزەكەوە ... دەروێش بەگیش وەك ئەو، هەورەتریشە لێدراو، رێك لەو ساتەدا و بەو هەڵسوكەوتەوە.

بەڵام ئەوەیان چی؟ ئەسپ كوشتن، خەرمان سووتاندن، ئاگرتێبەردانی كۆشك و نۆكەر كوشتن... دژكردەوەكان دوای چەند ساڵان گۆڕابوون. هەر بە راستی بازاڕی گیان ئەستاندنە. لەو گەمەی مەرگەدا هەر كەس ئەویتری كوشت، ئیتر تەواوە. ئەو گەمەی مەرگی سەد ساڵەیە، لەوانەیە دووسەد ساڵیش بخایەنێ تا دەبڕێتەوە. ئەگەر مستەفا بەگ و دەروێش بەگ یەكێكیان ئەویتر بكوژێ، ئەوەی قوتار بووە، بە مەرگی خۆی دەمرێ. هیچ كامیان دڵیان لە كوڕەكانی خۆیان ئاوی نەدەخواردەوە و متمانەیان پێیان نەبوو. ئەوان پیاوی ئەو مەیدانە نەبوون و لە بنەوە و جاری واش بوو راشكاوانە گاڵتەیان بەو گەمەیە دەكرد. مورتەزا بەگیش گاڵتەی پێ دەكرد، بەڵام نەیتوانی لەو بازنەی مەرگە پێ بنێتە دەرەوە. مەحموود ئاوای لە مورتەزا بەگ دەگێڕایەوە:"ئەو وەك منداڵان، لە لایەكەوە بڕوای بە مەرگ و كوژران نەبوو و لە لایەكیشەوە لە ترسی مەرگ شێت دەبوو. دەروێش بەگ بیری كردەوە:"رێك وەكوو من."

مستەفا بەگ بیری کردەوە:"ئەوەش نەبوو. ئێستا لەوێ لە کەلێنی ئەو رەوەزەدا و لە پەنا کەلاکی ئەسپەکەی شەلاڵی ئارەقە بووە و لە ترسی مەرگ ئەژنۆی شکاوە. بنیادەمم زۆر دیتوون، بەڵام کەسم نەدیتووە ئاوا لە ترسی مەرگ شێت و خوودار بووبێ. کە لە ترۆمبێلەکەی دابەزی و چەند هەنگاوێك رۆیشت، هەموو گیانی ترسی لێ دەباری. هیچ کەس، هیچ بنیادەمێك، ناتوانێ کەسێکی ئاوا تۆقیو و ترساو بکوژێ. ئەگەر دوژمنەکەت ئەوەندە ترساوە، هەر وا باشترە دەستی لێ هەڵگری و وازی لێ بێنی. ژیانی ئاوا هەزار جاران لە مەرگ تاڵترە. لێی گەڕێ با لە جێی هەناسە ترس هەڵمژێ، خەون بە ترسەوە ببینێ و لە ترسدا سەرجێیی ژنەکەی بکات و لە ترسدا بژیێ. ئێستاش پتر تۆقیوە و زراوی چووە. ئێستا، ئێستا لەوێ... تا ئێوارەی ئەمڕۆ هەر دەیکوژم. لە هەر چاوترووکانێکدا جارێکی لە ترسان دەکوژم. بزانە هەر لە جێی خۆی نابزوێ. هەر بۆ جارێکیش چییە سەری نابزێوێ. جگەرەیەکیش داناگیرسێنێ. لە بەر ئەو قرچەی هەتاوە لە ترسان ئارەقە دەکات و بەتاڵ بەتاڵ دەکەوێتەوە. ئەو هیچ کات ناگاتە ئەوەی بڵێ:"مەرگ هەیە و لە هەر لایەکەوە دێ پێی بڵێن با بێ و ئیتر باوەش بۆ مەرگ بکاتەوە و ئەمنیش لە وەها حاڵەتێکدا هەرگیز نایکوژم."

جا بەبێ ئیختیار هەرای کرد:"دەتکوژم."

دەروێش بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:"چیت گوت مستەفا، جوان گوێم لێ نەبوو. چیت گوت؟"

مستەفا بەگ وەڵامی نەدایەوە.

دەروێش بەگ بەخۆی گوت:"نامەرد، نامەردی کوڕی نامەرد." و ئەوان دوو کەس بوون.

هەر بۆ تاقە ساتێکیش بێ چاوی لەو جووتە هەڵنەدەگرت. لەوانەیە بێنە شوێنی. بەشکم هیدایەت و لەوانەشە ئەوانی دی بێنە شوێنی. لەوانەش بوو خاتوون یەکێکی بەدوودا بنێرێ. ئەی باشە ئەو کابرایە نایەوێ من بکوژێ؟ ئەی بۆچی لە ئەسپەکەمی دا و خۆم نەئەنگاوت؟ باشە بۆچی لەبری خۆم تەقەی لە ئەسپەکەم کرد؟ لە نەکاو فیشەکێك کڵاوەکەی کون کرد و لە کەلاکی ئەسپەکە چەقی. دیارە ویستوویەتی بمکوژێ و نەیتوانیوە. ترس بەگیانیدا گەڕا. هەر چوار بەندی گیانی لەرزی. لە چاوترووکانێکا، لە ناخی دڵەوە، بێ مانابوونی لەناوچوون و فەوتان و هیچ و هیچ نەبوون و یەکێك هەبوو و یەکێك نەبووی هەست پێ کرد. هەموو شتێك، مستەفا بەگ و ئەسپە مردووەکەی و مەرگ و بۆشاییەکی تێپەڕ.... لە حاڵێکدا چاوی هیچ کوێی نەدەدی و لە حاڵێکدا لە زیندەخەوێکدا خۆی هاویشتە پشت گابەردێکی ئەولاترەوە و

لەو کاتەدا خۆی فڕێ دەدایە پشت گابەردەکە، مارمێلکەیەکی کلك درێژ بە سەر دەستیدا رابرد. چاوەکانی مارمێلکەکەی دیت، سوور و زیندوو بوون و دەتگوت مەڕمەڕە شووشەن. ڕێك لەو کاتەدا تێگەیشت فیشەك بە ویزە ویز بە سەر سەریدا دەڕۆن. ئەوجار جێیەکەی باشتر بوو. وەڵامێکی نەدانەوە. بە میهرەبانییەوە سەیری مارمێلکەکەی کرد کە تەقەی تفەنگ و ئەو فیشەکانەی وەبەردەکان دەکەوتن و پڕیشکە بەردیان دەپڕژاند، شڵەژاندبووی. بەخۆی گوت، هەر بە وارسکە (غەریزە) ئەو شتانە دەزانێ، ئەگینا ئەوەندە لێرە هاتوچۆی نەدەکرد و وەشوێن کاری خۆی دەکەوت. دەتگی تەقەیەك و خرم و هۆڕی پڕیشکە بەرد و دووکەڵ و تەپوتۆز مارمێلکەکەی تەواو شڵەژاندبوو و سەری لێ تێکدابوو. بیری کردەوە کە دیارە دەزانێ. مارمێلکەش دەزانێ مەرگ چییە. ئاگای لە تاڵی و بۆشاییەکەی مەرگ هەیە. هەموو کەسێك، هەموو گیانلەبەرێك کە دەترسێ، دیارە مەرگ دەناسێ. گژ و گیا و پەپوولەکان و قالۆنچەکانیش دەزانن مەرگ چییە. هەر بۆشاییە مەرگ ناناسێ و لە تاڵییەکەی و ئەوبەری تاڵییەکەی تێناگا. بەختەوەرەکان، بەختەوەرەکان، بەختەوەرەکان... زۆربەی بنیادەمەکانیش بۆشایی و بۆشایی بۆشاییان نەناسیوە و لێی تێنەگەیون. ئەوانەی بەختەوەرن، ئەوانەی زیندوون. مارمێلکە بە زمانە سوورە دەرکێشراوەکەیەوە لە قووڵایی رەوەزەکەدا و بە خێرایی و سەرلێشێواو لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دی هەڵدەهات. جارێك بە پشتی دەروێش بەگ هەڵدەگەڕا و جارێك دەهاتەوە خوارێ، جارێك بە سەر باسك و دەستیدا دەڕۆیشت و جارێکیش هەستا سەر نووکی لوولەی تفەنگەکەی دەچوو و بە ترسەوە دەگەڕایەوە و رای دەکرد و دیسان دەهاتەوە و بەردەوام بەولا و لادا دەڕۆیشت.

دەروێش بەگ بە روونی دەیدی، کە پشتی مارمێلکەکە، وردە وردە سوور هەڵدەگەڕێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: هەی وای وا پێکراو، ئەوە ترساوە، پشتی سوور هەڵگەڕاوە. دەروێش بەگ تاوێك دواتر سەیری کرد دوو مارمێلکەی دیکەش خزینە نێو قووڵکەی رەوەزەکەوە. کەوابوو لە فیشەکان هەڵاتوون. تەقەکە تاوێك وێستا. لەگەڵ بێدەنگبوونەکەی، بە سەدان مارمێلکە گورج و توند لە سەر لێواری گابەردەکەوە رایان کرد. نەرمە بزەیەك نیشتە روخساری دەروێشەوە. نازانن بۆشایی چییە. لە بۆشایی ناگەن. بەڵام بەو حاڵەشەوە ئەو بێ قیمەتانە لە مەرگ دەترسن. خۆ ئەگەر زانیباشیان بۆشایی چییە، ئیتر نەیاندەتوانی لە جێی خۆیان ببزوون یان دڵیان دەتۆقی. ئەمن ئێستا وەك مردووان وام. رێك وەك مردووان. ئیتر واز لەو تەقەوەستانەش بێنە. کە تەقە دەکرێ، بنیادەم کەمتر بۆشایی مەرگ و بێسنوورییەکەی دەکا.

تۆزێك خۆی قیت کردەوە و خەشاب (مەخزەن)ـێکی پێوە نان. ئەگینا بۆشاییەکە دەیکوشت. جارێکی دیکەش تفەنگەکەی پڕ و بەتاڵ کردەوە. دەتگوت شێت بووە. دوو ریز فیشەکی بە قەدەوە بوو. توورەکەکەشی پڕ بوو لە فیشەك. هەر کاتێکی ویستبای دەیتوانی توورەکەی لە پشتی ئەسپەکەی بکاتەوە. لە نەکاو لە ژوور سەری خۆیەوە گوێی لە دەنگێك بوو. کە سەری هەڵێنا، سەیری کرد بلە ئیبۆ ئەوە لە سەر رەوەزەکەی تەنیشتی راوەستاوە. رووی تفەنگەکەی تێ کرد و پێنج فیشەکی پێوەنا.

ددانەکانی گڕ کردن و گرماندی:"سەگباب."

دیسان گەڕایەوە نێو ژیان. بۆشایی و ترسی مەرگ لە چاوتروکانێکدا سڕانەوە.

"لەوێ وەرە دەرێ سەگباب."

بلە ئیبۆ لە پشت رەوەزەکەوە هاتە دەرێ. تفەنگەکەی فڕێ دا و بە پاڕانەوەوە گوتی:"بەزەییت پێمدا بێتەوە، ئەتۆ ئاغای و من نۆکەرێك."

"بگەڕێوە و بچۆوە لای بەگ. دەی بڕۆ دەی."

بلەئیبۆ بە غاردان گەڕایەوە لای مستەفا بەگ.

مستەفا خێسەیەکیشی لێ نەکرد، بەڵام بۆ یەکەم جار وەقسەهات:"پێشنیارێکم هەیە دەروێش، هەر دووکمان لەو کونانە بێینە دەرێ و هەر هاتینە دەرێ تەقە لێك بکەین."

دەروێش گوێی خۆی لێ خەواند و وەڵامی نەدایەوە. مستەفا بەگ لە نەکاو لە پەنا گابەردەکەوە تەقەی کرد. خۆ ئەگەر جێیەکەی دەروێش قووڵتر نەبوایە، ئەنگاوتبووی. ئەو کابرایە شێت بووە. شێت بووە، شێت. دیسان شەلاڵی ئارەقە بۆوە.

تاو ئاوا بوو و تاریکی باڵی بەسەردا کێشان. ئەو وردە وردە نیشتە سەر رەوەزەکانی ئاناوەرزا. دەروێش بەگ لە جێیەکەی، هێور هێور و وەك مارێك بەرەو شیوەکەی پشتەوەی خزی....

# ٢٥

مستەفا ئاق یۆللی" حەجمین و ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو و لە هیچ کوێ نەدەحەواوە. نە لە ماڵەکەی و نە لە مەزراکەی. حەمە عەلی تراکتۆرێکی دیکەی کڕیبوو. تراکتۆرێکی سەیر و سەمەرە کە تا ئێستا کەس لە گوێنی ئەوەی نەدیبوو. حەمە عەلی دەیگوت:"ئەوە لە زنجیر دارەکانە بابە. وەك تانك(دەبابە)ی وایە. دنیای لێ ببەستی، دەیکێشێ. گاسنەکانی تا سەر دڵی زەوی رۆدەچن."

ئەوە جاری جاران بوایە، رادەوەستا و سەیری دەکرد. دەستەکانی لەولا و لای دەخشاند. چێژی وەردەگرت لەوەی سەیری کاری حەمە عەلی بکا و شانازیی بەخۆیەوە دەکرد کوڕێکی ئاوای هەیە. ئەو کوڕە بەشتێك دەبێ.

شتێکی نادیار، سەرەداوێك، زنجیرێکی نەبەدی شەو و رۆژ ئەوی بەرەو کۆشکەکەی ساری ئۆغلی رکێش دەکرد. لە پێشدا لە بن چنارەکە رادەوەستا. ماوەیەك بوو، ئاوا هەموو شەوێ تا بەیانی، چاوی لەو تیشکە دەبڕی کە کز دەسووتا و دوایی دەگەڕایەوە ماڵێ. زراوی چووبوو لەوەی نەکا یەکێك بیبینێ و بلێ مستەفا بەگ مات و سەرلێ شێواو تا بەیانی سەیری کۆشکەکەی ساری ئۆغلی دەکا. ئەوجار لە کۆشکەکە چووە پێشتر. ئەوجار بە سەر ئەسپەکەیەوە و نوقمی خەون و خەیاڵەکانی خۆی، لە پشت قامیشەڵانێکەوە رادەوەستا و بە سەرسووڕماوی و سەرلێشێواوییەوە و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە دەورووبەری خۆی، چاوی لە کۆشکەکە دەبڕی و بیری لەو کەسە دەکردەوە کە لەو دیوەوە و لە پشت توورەکە لمەکانەوە ئارەقەی دەکرد و لە خەیاڵی خۆیدا لەگەڵی دەکەوتە قسە و ئەوەندە لەوێ رادەوەستا تا زوقم و خوناوی لەسەر دەنیشت و لە سەرمان هەڵدەلەرزی... جا ئەوجار، سەیری کرد لە خەرەندێك دایە. پێشی پڕ بوو لە تووترك و دەوەن کە وەك دیوارێکی کەرتکراو رەش دەچوە و ماوەرزە

تەڕەکەی بە دەستییەوە تەڕ ببوو و هەر بە دەستییەوە و دەستەکانیشی لە سەرمان لەگۆ چووبوون و سڕ ببوون....

هەتا تیشکی چرای کۆشکەکە کاڵ دەبۆوە و بەر لەوەی تاو هەڵبێ. هەر تیشکی چراکە خامۆش دەبوو، تەقەیەکی لەو پەنجەرەیە دەکرد کە تیشکەکەی لێوە دەهات. فیشەکەکان چوارچێوە و قەراغ و لێوارەکانی پەنجەرەکانیان دەشکاند و کەوانەیان دەکرد و دەکەوتنە خوارێ. مەودای نێوان خەرەندەکە و کۆشك شەش سەد شەقاو، نا، نا، ئەوەندەش نزیك... لەوانەشە دوورتر. کە کۆشکەکە لە تاریکی و نیوەتاریکیدا ون دەبوو، ئیتر مەوداکان دەشێوان و دیار نەدەبوون. تاوێك بەر لە ئاوابوونی خۆر، پۆلێك باڵندە بە سەر خەرەندەکەدا دەفڕن و لە ئاسمانێدا بڵاو دەبنەوە و وێك دەکەونەوە و کۆ دەبنەوە و لە نەکاو وەك یەك پارچە وا لووری زەوی دەبن هەر دەڵێی لە عەرز رۆدەچن. بێدەنگی دەشتەکە وەك هیچ رووی نەدابێ، هەر وا بەردەوام دەبێ.

مستەفا بەگ رێك لە کاتی تاوهەڵاتنێدا دەستڕێژێك لە پەنجەرەکە دەکا و جا سەری ئەسپەکەی بەرەو پێدەشتەکە وەردەسووڕێنی و لە بوولێڵ و خوناوکە و زوقمی تێکەڵ بە بۆنی خاك و گڵ و گوڵە کێوییەکاندا تاوی دەدا و هەتا کۆشکەکەی لە چاوی ون دەبێ، پەیتا پەیتا ئاوڕ دەداتەوە....

مستەفا بەگ ئاوا هەموو شەوێ وەك خەوگەڕان هاتە خەرەندەکە و لەوێوە هەر لە سەر ئەسپەکەیەوە، بە بێ هیچ بیر و خەیاڵێك، بەبێ هیچ هەستێکی تۆڵە ئەستاندنەوە و رق و قینێك و بەبێ هیچ ویست و حەزێك، بەرەو کۆشکە ترس لێ نیشتووەکە، بەرەو کۆشکە مات و ناسك و ئارەقکردووەکە، بەرەو ئەو کۆشکەی بەحاڵ ڕووناکاییەکی کزی لێوە دەهات، راوەستا و ئەوجار دەمانچەکەی دەرهێنا و تەقەی لە پەنجەرەکە کرد. لە حاڵێکدا خۆی دەیزانی گوللەی دەمانچەکەی ناگاتە ئەوێ...

هیچ نەیدەویست بچێتە ئەوێ. بەیانی تا ئێوارێ لە بەر خۆیەوە سوێندی دەخوارد و خەیاڵی دەکردە و ئاد و پەیمانی دەبەست و بڕیاری دەدا، بەڵام زۆر پێش ئەوەی کازیوە بکەوێ، لە جێوبانەکەی دەهاتە دەرێ و جلوبەرگی لەبەر دەکرد و دەست و دەموچاوی دەشوشت و لە خوارێ لێی سواری ئەسپە زینکراوەکەی دەبوو و هەتا ڕووناکاییە کزەکەی کۆشکەکەی لێ وەدەر دەکەوت، بە چوارناڵە ئەسپەکەی لینگ دەدا و لە جێی جارانی هەوسارەکەی دەکێشا و رادەوەستا.

لە پێشدا سوارێك هات. دوو بە دوو، بەر لەوەی تاو هەڵبێ و ئەو دەمەی هێشتا ئەستێرەکەی بەیانی لە ئاسۆوە دەیجریواند، لوولەی تفەنگەکانی خۆیان کردە کۆشکەکە و تەقەیان لێ کرد و ئەوجار وەك بای شەماڵ بە دەوری کۆشکەکەدا سووڕانەوە. ئەوجار سوارەکان بوونە دوو. ئەوجار سێ و چوار و پێنج ... جار بە جار سوارەکانی گەڵ مستەفا بەگ کە بەردەوام و بە خێرایی بە دەوری کۆشکەکەدا دەسووڕانەوە و پەیتا پەیتا تەقەیان دەکرد و هیچیان نەدەگوت و وەك خەیاڵ لەگەڵ شەو و تۆز و خۆڵ و تەم و مژ و زوقم و خوناو تێکەڵ دەبوو، ژمارەیان زیاتر و زیاتر دەبوو.

مستەفا بەگ هەر لە کۆشکەکە دوور کەوتەوە، بەرەبەری بەیانی سەیرێکی دەورووپشتتی خۆی کرد و لە نێو مێشەڵانەکەدا سەیری کرد تاك و تەنیا کەوتووەتەوە. گەرمایەکی خەست وەك ئاوێکی قوڕاو دارستانەکەی لەخۆیدا نوقم دەکرد، بە حاڵێکدا هەنگە زەردەکان بەبێ جووڵە بە پوورەکانیانەوە نووسابوون و باڵندەکان پشووسوار و هەناسەبڕاو هەوڵیان دەدا لە ناخی خشتوخاڵە نیشتووەکەی گەرما خەست و خۆڵاوییەکە بێنە دەرێ، تینی و توانایان تێدا نەمابوو باڵەکانیان کە شەڵاڵی ئەو گەرما چەور و لیچقە ببوون، راوەشێنن.

ناڵە و نووزەی بنیادەمی ئەنگێوراو، خوێنی گەرم، خز و چەور. هەڵلووشینی نووزە و ناڵینەکە، خوێنەکە، بنیادەمەکان و جەستە لەتوپەتکراوەکان و رۆچوونیان بەگەرووی خاکدا. گەرم و ئارەقاوی. کۆشك، پیاوەکەی نێو کۆشکەکە، ئەنگێوراو، چاوی درشت و لە ژێڵڵاهاتوو لە دەموچاوە لە خوێن شەڵاڵەکەیدا، هیوابڕاو، کێوی. کێوی. نوقمی ئارەقە. ترس و سامی مەرگێکی وەحشی. کرووشمەکردوو و خۆ مات داو، نوقمی ئارەقە... چاوە گەورە دەرەپەڕیو و تۆقیوەکانی لە قوڕگی زۆنگاوەکەدا. جەستە شڕ و شپڕێوکراوەکان.. مێش و مەگەز، تاڵی و تفتی و پیسی...

دەستەکانی بە گەروویەوە، ترس... ئەسپێکی سەرداخستوو لە بەر تیرێژی خۆرەکە، و سوارێکی لاسار و ماندوو، وەزاڵەهاتوو بە چاوە پەرێشان و بە مۆڵەق وەستاوەکانییەوە. لەو لاشەوە، چێشتەنگاو، تەپوتۆزی کزە بایەکان، جارێ لە هەڵکشان و جارێ لە داکشاندا لە بەردەم نەرمە شنەیەکەدا... و لەوانەشە کەوتنی لە کیلۆمەترێك لەولاترەوە، لەوێ...

لە نەکاو گرمەیەك شەوەکەی شڵەژاند. شەوەکە لەرزی. رەوەزەکانی ئاناوەرزا دەنگی تەقە و دەنگەکەی دایەوە. ئەستێرەی گەلاوێژ بە داوێنی ئاسمانەوە درەوشایەوە. ئەسپەکەی بن مستەفا بەگ سەرسمی دا.

"رااوەستە، رااوەستە، مەڕۆ، رااوەستە."

دیسان سەرسمێکی دیکەی دا. لە هەر چوار لاوە پەیتا پەیتا ویزی گوللە دەهات. ئەسپەکەی گلا و هەڵنەستایەوە. ئەسپەکانی دیکەش گلان. بە پەنا کەلاکی ئەسپەکاندا بە سینگەخشکێ چوونە پێشێ و خۆیان هاویشتە نێو مالّی رووبارە پڕ لە قوڕ و لیتەکەوە و هەتا نێوقەدیان لە قوڕ و لیتەکە هەڵچەقین.

"راوەستە، راوەستە، راوەستە، مەڕۆ، هەی ترسنۆکی نامەرد، راوەستە، مەڕۆ."

شانی چەپەی برژایەوە. دەتگوت شتێك پێوەی داوە. ئەسپەکان پەیتا پەیتا حیلاندیان. حیلەی توند وەك لە قوولاّییەکان و لە دوورەوە بێ. حیلەیان دەشتەکەی داگرت. لە نەکاو نیشتەوە و دامرکایەوە.

مستەفا بەگ بەرەو خواروی ئەو رووبارەی هەتا نێوکی دەهات، رای دەکرد. جارێك لە قوڕ و لیتەکە دەچەقی و بە زەحمەت دەهاتەوە دەرێ و جارێك زیخ و چەوە ورد و ساردەکان بنی پێیان ئازار دەدا. گوللە بە ویزەویز بەسەر سەریدا دەفڕین. بە هانکەهانك بەرەو لای خوارێ رایان کرد. کەنارەکانی رووبارەکە بە هەزاران سینگەوە دەیهانکاند.

"لێرە، ئالێرە، لە نێو چەمەکەدا..."

رووبارەکە بە تاریکیدا دەخوشی.

"تەقەی لێ بکە توتکە سەگ، توتکە سەگ، توتکە سەگ، ئەوە تۆی شەو و رۆژ تەقە لە کۆشکەکەم دەکەی؟ شەو و رۆژ. هەی بێ شەرەفی بێ رەچەڵەك، بێ شەرەفی بێ رەچەڵەك، بێ شەرەف."

دەنگێك گوتی:"لێرەیە."

دەنگەکە پڕ بوو لە شادی. مستەفا بەگ لەرزی. بەندی جەرگ و دڵی پسا. خوارەوە... لە سەر ئاوەکە درێژ بووە، بەرەو پیشتر کشا. دەنگی هەزار و یەك پێ لە کەناری رووبارەکەوە... ئەوانەی وەشوێنی کەوتبوون، بە هانکەهانك، هانکەهانکی تووڕە و شێتانەیان لە نێو دەوەن و چڵە تووترك و دڕووەکان و قامیش و قووڵەکەکاندا...

"راوەستە تووتکە سەگ، راوەستە، هەر چۆنێك بێ دەتگرم. هێندەی نەماوە تاو هەڵبێ."

ئەگەر راستیشت دەوێ چیی نەمابوو خۆر لە ئاسۆ بێتە دەرێ. رووناکاییەك لە پشت پێڵووەکانییەوە، رووناکاییەکی لێڵ، لە پشت تاریکاییەکەوە شۆڕ ببۆوە و خەریك بوو بالاّی دەکرد.

"دەتگرم. جا بەو جۆرەش دەتکوژم، کە خۆت دەتویست من وا بکوژی. بە رۆژێك، بە پێنج رۆژ، بە پەنجا رۆژ، بە سەد رۆژ... گۆشتت لێدەکەمەوە، دەیدەمە دەستت. پل پل دەخواردی خۆتی دەدەم... خۆت بە خۆت... خۆت بە خۆت... هەتا تەواو دەبی. خۆت، خۆت بخۆی، تەواوی بکەی. تەواو بی."

ئاوەکە خوڕتر بوو. شلّپ و هۆڕەکەی دەتگوت شۆڕەشۆڕی تاڤگەیە. مستەفا بەگ خۆی بە ئاوەکەدا دا. لە نەکاو شانی چەپەی و پشتی وا برژایەوە تاقەتی لێ بڕی و تینی لێ بڕی. ئاوەکە مستەفای نیوەگیانی هەڵگرت و بەرەو ئاقچاساز رفاندی. مستەفا بەگ، کە لە دار بییەك گیر ببوو، زۆری خایاند هەتا گیانە بێ تین و هێزەکەی خۆی لەو چلّ و چێو و لك و پۆپانە رزگار کرد کە دەوریان دابوو. بەگ لە پشت پێڵووەکانییەوە بلّێی و نەلّێی، رووناکاییەکەی هەست پێ دەکرد. ئیتر خۆی نەخافلاند. تەکانێکی لە خۆی دا، خۆی لە لك و پۆپەکان راپسکاند و خۆی بە ئاوەکە دادایەوە. دەنگی پێیەکان پتر بوون. فیشەك بە راست و چەپیدا ویزەویزیان دەهات. دەنگێك بە نەڕنەڕەوە هەستا:"خۆت ویستت. چەند مانگان راوەستام و گوتم بەشکم ئەو بنیادەمە دەستم لێ هەڵگرێ. هەر بۆ ئەوەی وەجاغت کوێر نەبێتەوە. دەنا کوشتنی تۆ وەك ئاوخواردنەوە وابوو. هەموو رۆژێ کە بە سەر ئەسپەکەتەوە، ئەویش ئاوا قیت و قنج تەقەت لە پەنجەرەی ماڵەکەم دەکرد، منداڵێکیش دەیتوانی بتئەنگێوێ. بەڵام ئەمن سەبرم گرت. ئەوەندەم سەبر کرد هەتا ... هەر بۆ ئەوەی وەجاغت کوێر نەبێتەوە... ئەوەندەم دان بە جەرگی خۆم دا گرت بوومە سەنگی سەبوور. ئێستا رێك کاتی ئەوەیە بتگرم و بتکوژم. نا، نا، ناتکوژم. هەر ئەوەت لەگەڵ دەکەم کە تۆ دەتویست لەگەڵ منی بکەی... لە پێشدا گوێچکەت دەبڕم و دوایی کەپۆت... دوای،، دوایی، دوایی،... جا پل پل خۆت دەرخواردی خۆت دەدەم."

مستەفا بەگ کە سەری هەڵێنا گەیشتبووە رووناکایی. ژانی نێو شانی تاقەتی لێ بڕیبوو. سەیری کرد قامیشە بەرز و سووورباوەکان، کە گەڵا درێژەکانیان بە دەم باوە، خشەخش پێکدا دەخشکان، و دەوروپشتی خۆی هەر هەموو نوقمی رووناکین و رووناکاییەکە بەرەو لای خۆی کێشا. گوێی هەڵخست. زۆنگاوەکە قووڵ قووڵ هەناسەی دەکێشا و وەك مەنجەڵێکی گەورە دەکوڵی. ئەوجار دەنگەکان، ئەو دەنگانەی تێکەڵی دەنگی پێی بنیادەمەکان و ئەسپەکان دەبوون و جار بە جار نزیکتر دەبوونەوە. مستەفا بەگ تا ئێستا وڕ و کاس بوو. نە بە روونی دەیدی و نە بە جوانی گوێی لە هیچ دەبوو. بەڵام ئێستا هەموو شتێکی جوان دەدیت و ورد

بیری دەکرد و تێدەگەیشت. سەیری کرد لە نێو گۆڕەپانێکی بەریندا هەتا ئەژنۆی لە ئاو و قوڕدا رۆژووە و قامیشەکان پۆل پۆل گرتوویانەتە خۆ. دەنگەکان نزیك بوون و جاری وابوو تەواو لە قسەکانیان تێدەگەیشت. خۆی لە پەنا قامیشەکانەوە مات دا. برینەکەی هەر وا خوێنی لێوە دەهات و ئەو نەیدەزانی برینەکە چۆن ببەستێ و خوێنەکەی چۆن راگرێ. رێك لەو کاتەدا بوو لە بن گوێی خۆیەوە گوێی لە دەنگێك بوو و بەلادا هات. دەنگەکە پەیتا پەیتا دەیگوت:"بەگ، بەگ، بەگ، ئەمنم، من."

دەنگەکە ئاشنا بوو. رووناکایی هیوایەك لە دڵی گەڕا.

"ئەمنم، من. مەستان...."

ژانەکە تین و تاقەتی لێ دەبڕی. بە ناڵەناڵەوە گوتی:"مەستان، مەستان، لێرەم مەستان، مەستان، مەستان."

ئیتر لەهۆش خۆی چوو. دەنگی پێیەکان لە دەوروبەرەوە نزیك دەبوونەوە، بە شڵپەشڵپ بە نێو ئاو و قوڕ و لیتەکەدا، دەنگی توڕەی بنیادەمەکان و هانکەهانکی ئەسپەکان... مەستان گوێی هەڵخست. لەو کاتەدا کە دەیویست بەرەو مستەفا بەگ بچێ، لە جێی خۆی وشك هەڵات و ئیتر خۆی خزاندە نێو قامیشەڵانەکەی پشت خۆیەوە. ببووە پەیکەرە قوڕینەیەك. لە نێو قامیشەڵانە چڕەکەدا تاوێك راوەستا. پەپوولەیەکی نارنجی باڵە گەورەکانی لێك کردبوونەوە و لە نێو گوڵە قامیشەکاندا دەخولایەوە و بەو هێڵە ئەرخەوانییانەی بە ئاسمانەوە دەیکێشان، تان و پۆی نارنجی دەتەنی. مەستان نەیدەتوانی چاو لەو پەپوولە باڵ نارنجی و خاڵ خاڵە هەڵگرێ، کە وەك ئەستێرە دەدرەوشایەوە. پەپوولەکە ساتێك هات و لە سەر سەری نیشتەوە بەڵام نیشتنەوە و هەستانەوەی لە چرکەیەك پتر نەبوو.

# ٢٦

برینەکەی شانی مستەفا بەگ بە پانزە بیست ڕۆژان چاك چاك بووەوە. نەشتەرگەرە کوردەکە، بۆ چارەسەری ئەو جۆرە برینانە یەکا و یەك بوو. خزم و کەسی مستەفا بەگ لەبەریدا شل و کوت بوون بۆ ئەوەی پزیشکی بۆ بێنن، بە گوێیدا نەچوو و هەر دوو پێی خستە پێلاوێکەوە کە حەکیمە* کوردە بێنن و کەسی تر نا. کەس نەیدەزانی دوکتۆرە کوردە تەمەنی چەندە. عومری نووحی هەبوو. ردێنێکی سپی و تەنکی هەبوو. ئاگری لە چاوی دەباری. یەکی باریك و تێکسمڕاو و ڕەش داگەڕاو و مل درێژ و وردیلە بوو. کەمدوو بوو و کاری بە کاری کەس نەبوو و هەر لەو کاتەوە هاتبووە چوکووراوا، ساڵ دوازدەی مانگ بە کێو دەشت و شیو و گرد و دۆڵانەوە بوو و گژ و گیا و گوڵ و گەڵا و جڕ و جانەوەری کۆ دەکردەوە لە بن دار چنارە گەورەکەی بەر دەرگای ماڵەکەی لە مەنجەڵە مسی گەورە و بچووکدا دەیکوڵاندن و گوندەکە بۆنێکی خۆشی تێدەگەڕا.

نەشتەرگەرەکە کۆمەڵێك مەڵحەمی بە ڕەنگ و بۆنی جۆراوجۆری تاڵ و شیرینی لە سەر برینەکەی مستەفا بەگ دانا. جارێك وەقسە هات و گوتی:"برینەکەت بە حەوتوویەك سارێژ دەبێتەوە، بەگ. برینی پیاوە ڕەسەنزادەکان زووتر خۆ دەگرێتەوە. ئەءتۆ زۆر لەوە ڕەسەنتر بووی کە بیرم لێ کردبووەوە."

مستەفا بەگ خۆی دەیزانی ڕەسەنزادەیە و هەر بۆیەش بەخۆی دەنازی، بەو حاڵەشەوە ئەو قسانە ئەویش لە زاری بنیادەمێکی وەك دوکتۆرەکەیەوە زۆر زۆر کەیف خۆشی کرد. دوکتۆرەکە دوای ئەوەی دە ڕۆژ لە کۆشکەکەی ئاق یۆللی"دا مایەوە، لە ڕۆیشتنێدا بوو، کە

---

* حەکیم: لێرەدا حەکیم بە واتای دوکتۆر دێ. ئەوەندەی لەبیرمە پێشینیان بە دوکتۆریان دەگوت حەکیم. بۆ وێنە دەیانگوت"دەچمە سەر حەکیم". لێرەشدا ئەو شوێنانەی لە زمانی مستەفا بەگەوەیە نووسیومە حەکیم.

جارێکی دیکەش وەقسە هاتەوە و گوتی:"لە هۆردووی چوارەمی ئێمەدا، لە دابونەریتی کۆنی عەشیرەتەکەماندا، تۆڵەئەستاندنەوەی ئاوا هەر نەبووە، بەگ. نەبووە ئاوا لە پشتەوەڕا لێ بدرێ. دیارە جۆرە لە پشتەوە لێدانێك هەبووە کە ئەویش دابی نەماوە. ئەتۆ لە پشتەوە بریندار بووی، هەر ئەوەندە و هیچی دی. دەروێش بەگ لای داوە. ئەتۆ ئیتر بیری کوشتنەوەی ئەو لە سەرت دەربهاوێ. ئەوەندەی ناهێنێ. ئەتۆ کارت تەواو بووە. دەروێش بەگ لە پشتەوە لەتۆی داوە. ئەوە ئیتر بەسەر چووە. عەیبە. ئەو ئیتر دوژمنی تۆ نییە. ناکرێ دوژمنت بێ. ئەوە رای منە."

مستەفا ئاق یۆللی" ئۆغڵی بەگی رەسەن، بە پێی دابونەریتی تورکمانان دوای ئەوەی دراوێکی باشی دا بە دوکتۆرەکە، ئەسپێکی رەسەنیشی پێشکەش کرد.

مستەفا بەگ لە ماوەی ئەو بیست و پێنج رۆژەدا کە بەجێوبان کەوتبوو، نەخشەی زۆر سەیر و سەمەرەی دەکێشا بۆ گرتنی دەروێش بەگ و گەلێ خەیاڵی کرد. هەر کەس دەهات و شێوەیەکی نوێی شکەنجەی لە گوێی دەخوێند. بلەئیبۆ، مەستان، حەمدی، نۆکەرەکانی دیکە، ژنەکان و تەنانەت منداڵەکانی ئاوەدانییش هەموو رۆژێ جۆرە ئەشکەنجەیەکی نوێیان پێشنیار دەکرد. مستەفا بەگ بە بیستنی وردەکارییەکانی ئەو ئەشکەنجەیەی وا بەکەیفی دەبوو، کەیفی ساز دەبوو و خەڵات و دیاریی دەدا بە داهێنەرەکانی ئەو ئەشکەنجانە. لە هەموو ئەشکەنجەکان بەژانتر و بێبەزەییانەتر ئەوە بوو وا قەرەقیز خاتوون دایهێنا. دەیهێنا و لە ژوور سەری کوڕەکەی دادەنیشت و بە تێر و تەسەلی بۆی باس دەکرد و دەکوڵی و هەڵدەچوو و دەیهێنایە پێش چاوی خۆی و دەگریا و دەیناڵاند، رق و قینی هەڵدەڕشت و خۆی توند دەکرد و دەیگوت و دەیگوتەوە:"هەر وا بکە مستەفا. وای لێ بکە دڵی دایکەکەت بەر لەوەی بچێتە بن گڵەوە، ئاوپڕژێن بکرێ و بڵێ ئۆخەی. ئەو ساری ئۆغڵییە بێ دینانە گەلێ کوڕی جوانچاکیان لێ خواردووین. تۆرەمەیان نەهێشتووین. هەر وەکی گوتم وا بکە با دەروێش بەگ سزای کردەوەکانی خۆی ببینێ."

مستەفا بەگ بە متمانە و باوەڕبەخۆبوونەوە، هەر وا کە تیزەبزەیەکی لە سەر لێوانی بوو، دەیگوت و دووپاتەی دەکردەوە:"بەو زووانە دایە، بەو زووانە، هەر بەو زووانە پاکانە حیسابی لەگەڵ دەکەم. بەو زووانە دایە، بەو زووانە."

بلەئیبۆ بە هەڵەداوان هات و بە هانکەهانك گوتی:"ئەوە دەڕوا، بەگ... بە ڕێگەکەدا رادەبرێ. بە سواری ئەسپە شێیەکەی و بە فیز و پۆزەوە و جار جارەش لەخۆباییانە ئاوڕێك دەداتەوە و بە سووکایەتییەوە سەیرێکمان دەکا. چ بکەین، بەگ؟"

مستەفا بەگ رای کردە دیوەخانێ. خاڵێکی رەش لە دوورەوە، بەرەو ئەو پێچ و گەوە دەڕۆیشت کە رووبارەکەی جەیهان بەلای رەوەزەکانی ئاناوەرزادا کردبوویەوە. هەرای کرد:"دووربینەکەم بۆ بێنە، بلەئیبۆ."

بلەئیبۆ بە غاردان دووبینەکەی هێنا.

مستەفا بەگ گوتی:"خۆیەتی، بەڵام بۆ کوێ دەچێ؟"

"ڕێگەی پێ بگرین، بەگ؟"

"چما کەس دەزانێ بە کوێدا دەگەڕێتەوە؟ بە کوێ دەچێ؟ بەرەو کام لا؟ دەبێ لەوێ چ کارێکی هەبێ؟ قەت بەرەو لای ئاناوەرزا نەدەچوو. ئەو ماستە بێ موو نییە. نەکا تەڵە و داوێکی بۆ نابێینەوە؟"

بلەئیبۆ گوتی:"ئەوەی لە پشتەوەڕا دەوەشێنێ، دەبێ چاوەڕوانیی هەموو فێڵ و تەڵەکەیت لێی هەبێ. شتێك هەیە و ئەو ماستە بێ موو نییە. دەفەرمووی چ بکەین؟ مەستان، وەلی شەماڵ، مام حەسەن و حەمدی لە خوارەوە چاوەڕێن."بەگ بە تۆزێك دڵخۆشییەوە، لە حاڵێکدا چاوی لە سەر ئەو سوارچاکە هەڵنەدەگرت، گوتی:"وا باشترە جارێ راوەستین. ئەگەر راستیتان دەوێ، ئیتر لەمەودوا لە هیچ ناپاکییەك ناپرینگێتەوە."

بەگ دیسان خزییەوە نێو نوێنەکەی. نێو جێوبانەکەی زۆر پێ خۆش ببوو. دەچۆوە نێو جێوبانەکەی و خەیاڵی هەزاران جۆر ئەشکەنجە هەڵیدەگرت. چێژی تۆفانی بەلرفەی ئەشکەنجەکردن لە ناخی دا سەری هەڵدێنا و دەگوورا و هەڵدەچوو و هەتا مێشکی ئێسقانەکانی رۆدەچوو. ئەو شەوەی بە شڵەژاوییەوە تێپەڕاند. نەیدەزانی خەوتووە یان بە خەبەرە، خەون دەبینێ یان مۆتەکەی لە سەر سینگە؟ جارێ دەکەوتە نێو ڕووناکاییەکی بێ سنوورەوە و رووت و قووت و بەتاقی تەنێ دەحەپەسا و جارێکیش لە تاریکاییەکی رەش و ئەنگوستەچاودا دەتلایەوە و پشووی لێ دەبڕا. جاری واش بوو دەروێش بە پێکەنینەوە، چاوقایم و گاڵتەجاڕانە، بە ددانە سپییە بریقەدارەکانی و بە چاوە گەورەکانی و بە روومەتە رەقەڵەکانییەوە دەهاتە پێش چاوی. لە حاڵێکدا چەکمەی لە پێدابوو و بە بە حاستەم پێی لە سەر عەرزی دادەنا،

"ناغان"ــە دەسکە شاخە رووتەکەی و فیلینتا ئالمانییە قۆنداغ سەدەف نیشانەکەی، دەبریسکانەوە. کە گوتبووی دەروێش سمێڵ بابڕە؟ هەر بەراستی دەروێش سمێڵ بابڕ بوو؟

جاری واش بوو لە خەوگەڕییەکانی خۆیدا لەگەڵ مردووەکاندا دەکەوتە شەڕ... ئەوانەی ماوەیەك لەوە پێش کوشتبوونی و لە زۆنگاوەکەی ئاقچاسازدا شرت و گومی کردبوون، لە پێش چاوی زیندوو دەبوونەوە. رۆژێکی زۆر گەرمی دەهاتەوە پێش چاوی. دەست و لاقە خوێناوییەکانیان و لینگەفرتە و پەلەقاژەیان و جەستە خوێناوی و گرمۆڵەبووەکەیان، کە هەموو گژوگیاکەیان خوێناوی کردبوو و هاوار و بابەڕۆیان تێکەڵی گەرما و هالاوە پشووبڕەکە دەبوو... تۆ بڵێی دەروێش بەگ خەبەری ئەو قاچاخچییە کوژراوانە بۆ حوکمەت بەرێ؟ لەوێ...

ئەو دەروێش بەگە... بەو روومەتە دەرپەڕیو و رەشانەیەوە. ئازا و ترسنۆك، دڵنەرم و زاڵم. لەخۆبایی و کەم. لە هەمانکاتدا کە دەڵێ ئەو کێو و شاخانە من خولقاندوومن، کاری ئاوا سووك و چرووکیش دەکا.. ئازا و جوامێر و تۆقیو بە مەرگ، دواییش بە رۆژ و مانگان لە ژوورێکی بێ درز و کوندا و لە گەرما زەردەکەی چوکووراوادا ئارەقەی رەش و شین دەردەکا ... چەند سالان ئارەقە دەکا... چاوی هیچ نامەحرەمێك بە داوێن و بەلەکی ژنەکەی نەکەوتووە و لە هەمانکاتدا لەو چوکووراوا کاکی بە کاکییەدا، هەر لە نۆکەر و شوانەوە بگرە تا دەگاتە قاچاخچی، کەس نەماوە لەگەڵ خوشکەکەی جووت نەبووبێ... هەر رۆژەی لینگ بۆ گۆڵەکەرێك هەڵدێنێ...

زاڵمی شێت، دیتت چۆن مێردی خوشکەکەی لە پێش چاوی هەمووان ونجڕ ونجڕ کرد و ئەنجنیی؟ بە خەرەزەنێکی چەرم راوی نا بۆ نێو دڕووەلانەکە و هەر پلێکی گۆشتەکەی بە سەر دڕووەکەوە مایەوە... لە سەر هیچی خۆڕایی. وەلی شەماڵ چیی دەگوت؟ وەلی شەماڵ درۆ ناکا. خوو و خدەی وی وایە کە هەتا نەچێتە بنچ و بناوانی مەسەلەکەوە، دەستی لێ هەڵناگرێ. دەمی لە هیچ نەدا و ئۆقرەی نەگرت هەتا نەچووە بنەبانی مەسەلەکە.

وەلی شەماڵ دەڵێ بەو چاوانەی خۆم دیتم. بەو گوێیانەی خۆم بیستم. بە سوێند و قورئانەوە شین و رەش دەبێتەوە.

سەباحەت خاتوون گوتوویەتی نابێ پێم بڵێن خاتوون. لە دواناوەندییە کچانەییەکەی ئەدەنە دەرسی دەخوێند هەر لە بەر ئەوەی کوڕ و پیاوی ئەدەنەی هەڵدەخەڵەتاند، لە مەدرەسە دەریان کردبوو. دوای ئەوەی گەڕایەوە ئاوەدانی، مێردی بە کامیل کرد. کامیل خەڵکی بەدلیس بوو. گەنجێکی بەژن و بالا جوان. سەباحەت خاتوون هەتا ساڵێك دوای زەماوەندەکەیان پێی خوار

دانەنا و دەتگوت کولّ و کۆی دامرکاوەتەوە. دەروێش بەگ و هەموو بنەماڵەکەی رازی و دڵخۆش بوون کە ئیتر لە گۆلاوی سەرشۆڕی نەجاتیان بووە. بەڵام ئەو رازیبوون و کەیفخۆشییەیان زۆری نەبرد... سەباحەت خاتوون دیسان دەستی کردەوە بە سەرەڕۆیی و تاق و جووت کەڵەگا دەگرێتەوە و هەر پیاوێکی گوند و دێهاتەکانی دەوروبەری بەکەیف بێ، فریوی دەدات و لینگیان بۆ هەڵدێنێ. نێو رەوەزەکانی ئاناوەرزا و دەوروبەری ئەوێ دەکاتە ژوانگەی خۆی و چەند پیاوێك. رووت و قووت دەبێتەوە و سەما دەکات و قوون بادەدا. دەروێش بەگیش ئاگای لە هەموو ئەو شتانە هەیە و وەڕووی خۆی ناهێنێ:"جا بە من چی، خۆی مێردی هەیە. ژن بەر لە هەرکەس ناموسی مێردی خۆیەتی."

خۆ کاولاشەکانی ئاناوەرزا زمانیان هەبوایە... دوای چەند رۆژان، پاش چەند حەوتوو و مانگان، جاری وابوو بە نیوەڕووتی و سەر و قژی ئالۆزکاو و رووت و لێوی هەوکردوو و بن چاوی شین و مۆر و بەلەکی خوێناوی و گیانی رەش و شین هەڵگەڕاوەوە و بە بەر چاوی هەموو خەڵکی گوندەکەوە بەبێ ئەوەی کەس بە بنیادەمیش دابنێ، لە رەوەز و گابەردەکان دەهاتە خوارێ و بە کاوەخۆ دەهاتەوە ئاواییەکەی ساری ئۆغڵی. چەند رۆژێك تێر بە زگی خۆی خواردنی دەخوارد و پشووی دەداوە و دەحەسایەوە و دیسان دەبووژایەوە. ئەگەر بەهار بوایە ئەوە ئاناوەرزا دیسان بانگی دەکردەوە و ئەگەر هاوینیش بوایە، دەم چەم و کانیاو و ئاوە پڕ لە عەتری پنگەکان و پڕ لە ماسییەکانی تۆرووس و ئەگەر زستانیش بوایە، کادێن و ئاخوڕەکان....

"کامیل، کامیل، کوڕە ئاگات لەو ژنەت بێ..."

"ژنەکەم هیچی نەکردووە بەگ، وەك ئاوی شەوێ پاکە. بەفر پەڵەی پێوە بێ، ژنەکەی من پێوەی نییە."

"کامیل، کوڕە پیاوێك دەرەقەتی ژنەکەی خۆی نەیە، ئیتر کەسی دیکە دەرەقەتی نایە و باشاری ناکا. ژنەکەی تۆ خوشکی منە، بەڵام ئەوە مێردە دەبێ ژنەکەی هەس بداتەوە. دەڵێی چی کامیل؟ ژنەکەی تۆ حەیای تۆرەمە و رەچەڵەکی منی بردووە. ناموسمانی هێنایە سەر فلسێك. دەڵێی چی کامیل؟"

"ژنەکەی من حەیا و ناموسی کەسی نەبردووە بەگ. ناموسی کەسیشی نەهێناوەتە سەر فلسێك."

"برۆ جەحەندەمت لێ پڕ بێ، لە پێش چاوم ون بە کامیل."

"بەچاوان، بەگ."

"باشە وەلی شەماڵ، ئەتۆ ئەوانە لە کوێ دەزانی؟ باشە ئەو دەمەی ئەو قسانەیان دەکرد لەوێ بووی؟"

دەموچاوی وەلی شەماڵ درێژتر بۆوە و تێك چرژا و دوای تۆزە راوەستانێك، لێوەکانی جوولان:"خۆم لەوێ بووم مستەفا بەگ. ئەگەر درۆ بکەم خودا کوێرم بکا.

"هەی سەگی سەگباب، کەوابوو ئەوانە هەموو راستن؟"

"ئەوانە، ئەو شتانەن، کە بە چاوی خۆم دیتوومن بەگ. زۆر شتی دیکەش هەن کە من نایانزانم. جا وەرە خۆت لێکی دەوە بزانە دەبێ چیی دیکەش هەبێ. بڕوانە ئەو سەباحەت خاتوونە چیها هونەری هەیە."

مستەفا سەباحەت خاتوونێکی گوت و خۆی بۆ بادا. تورت و ناسك و پڕ و گۆشتن و بەلەنجە و لار، چاو کەسك، گەردن بلوور... کێل گەردن و گەردنی سپی وەك بەفر. چاوە کەسکەکانی، مژۆڵەکانی، برۆکانی، قژە رەشە قەترانییەکەی کە لەبەر رەشی، کەسك دەچێتەوە و شەپۆل دەدا... گەردنی بڵند... بە جموجۆڵ و بە لەنجەولار. دەیویست بڵێ:"وەلی شەماڵ."، بەڵام پاشگەز بۆوە. دەیویست بڵێ، ئەگەر سەباحەت خاتوونمان وەدەست کەوتبایە وەلی شەماڵ، لە کوشتنی دەروێش بەگ باشتر بوو. هەزاران جار لەوە باشتر بوو. رووت و قووت هەڵپەڕاندنەکەی، حەوتووەك بە شەو و رۆژ. ژن و کچەکانی دەروێش بەگیش. بەڵام شەرمی لە خۆی کرد. ماوەیەکی درێژ هەر نەیتوانی خەیاڵی سەباحەت خاتوون لە سەری دەربهاوێ.

خەریك بوو رۆژ دەبۆوە کە لە پڕ لە جێوبانەکەی هاتە دەرێ. دەرپەڕییە دەرێ. چووە ژوورەکەی. دەسبەجێ جلوبەرکەکانی لەبەر کرد و وەدەر کەوت. بن ساباتەکە پڕ بوو لە تەراکتۆری نوێ و رەنگاورەنگ. حەمە عەلیی دیت کە خەریکی یەکێك لە تەراکتۆرەکانە. لێی چووە پێشێ و دەستێکی لە سەر شانی دانا. حەمە عەلی کە نوقمی خەیاڵی خۆی بوو، هیچ ئاگای لە هاتنی باوکی نەبوو. راچڵەکی و بە سەرسووڕمانەوە چاوی لە بابی بڕی.

جا بە سەرسووڕمان و خۆشییەوە گوتی:"بابە، بابە، تورکیا تەراکتۆرێکی دیکەی لەوەی تێدا نییە. هەم جوانە و هەمیش قایمە... دەیبینی؟"

لە لاوە راوەستا و بە سەرسووڕمانەوە سەیرێکی تەراکتۆرەکەی کرد و ئەوجار لێی نزیك بۆوە و بە زمانێکی کە مستەفا بەگ هیچ لێی تێنەدەگەیشت، دەستی کرد بە تاریفی

تەراکتۆرەکە. مستەفا بەگ لە هەموو قسەکانی ئەو ئەوەندەی بۆ ساغ بۆوە کە حەمە عەلی ئەمشەو هەتا بەیانی هەر بە دەوری ئەو تەراکتۆرەیدا هاتووە.

ئەو حەمە عەلییە قسەی لەگەڵ کوڕانی دەروێش بەگ کردووە و چاك و خۆشیی لەگەڵ کردوون. هەر بەراست؟ باشە بڵێی هەر دوژمنان ئەو قسانە هەڵبەستن و بڵاویان بکەنەوە؟ چما شتی وا دەبێ؟ یانی دەکرێ رۆژێك دابێ نەوە تووك لێکراوەکانی ساری ئۆغلی و ئاق یۆللی" هەموو شتێك لە بیر بکەن و لە سەر مێزێك دابنیشن و جەفەنگ لێ بدەن و سوعبەت بکەن؟"

حەمە عەلیی هەر وا بەجێ هێشت کە تەواو بە کارەکەیەوە خافڵبوو و لە بوولێڵەی بەیانیدا بەرەو ئاناوەرزا کەوتە رێ. سرك و قوت، لە حاڵێکدا ورد ورد سەیری چوار دەوری خۆی دەکرد و دەستی بە پەلەپیتکەی فیلینتا ئەڵمانییەکەیەوە بوو...

لێرەکەی ئاقچاساز لە بوولێڵ و تاریك و روونی بەیانیدا چڕتر و تۆختر و لە تەم و مژەکەدا گەورەتر دیار بوو. ئەو حەمە عەلییە بەو دەست و پلە چەورەیەوە نە ئەسپی بە لاوە گرنگە و لە رەچەڵەکەو رەسەنایەتی. ئەو شێت و خولیای تەراکتۆرە و هیچی دی. شەو رۆژەکەشی هەر لە کێڵگەکان و لەگەڵ تەراکتۆر و مەکینەی خەرمانکوت و دروێنە و کرێکاراندا تێدەپەڕێ و چاوی هەر بە دوای پارە و پووڵەوەیە. شەو و رۆژ بیر و خەیاڵی هەر بەلای حیساب و کتاب و خەرج و موخاریجەوەیە. ئاخۆ دەتوانم بە پێنج بیکڕم و بە دەی بفرۆشمەوە؟ تەراکتۆرێك، خەرمانکوتێك کە کۆن دەبێ قازانجەکەی چەندەیە و زیانەکەی چەندە؟ چۆن دەکرێ ئەو موڵکە دوو ئەوەندە بەرین بکەمەوە؟ چۆن دەکرێ کرێکارەکان بە پارەیەکی هەرزانتر و بەراتێکی مەمرە و مەژی راگرم و کاریان پێ بکەم؟ لە ئەدەنە دەکرێ چەند کارخانە دابنێم؟ ئەی کەنگێ؟ لە سەر ئەو گردە چۆن بینایەك هەڵچنم و هەسێڵ و ئاوی گەرم و کارەبا و ئامێری فێنككەرەوەی تێدا هەبێ؟"

هەر حەمە عەلی نا، بەڵکو هەموو منداڵەکان ئاوا بیر دەکەنەوە... ئەوان چاو لە ژیانی ئاغا تازە پێگەیشتووەکان دەکەن و ئەوانیان کردووەتە سەرباشقەی خۆیان. هەتا ئێستا بۆ جارێکیش چییە ئەو حەمە عەلییە و منداڵەکانی دیکەش هەر بۆ جارێکیش بێ، ناوی ساری ئۆغلییان بە سەر زاریدا نەهاتووە. ئەوان تەنانەت ئەو رۆژەی مامیشیان کوژرا، هەر باسی ئەو مەسەلەیەیان نەکرد. ئەوان گاڵتەیان بەو کارە دێ. لە کەسیشی ناشارنەوە و لە هەموو جێیەکیش دەیڵێن. گاڵتەی پێ دەکەن. بەزەییان نایە، ئازار ناچێژن. ئەوانە کەمایەسییەکیان هەیە. بەشێك لە مرۆڤبوونی خۆیانیان بزر کردووە.

تفێکی فڕێ دایە سەر عەرزە و پیشێکی خواردەوە و گوتی:"ئەوانە شەڕ ناکەن. ئەوانە بە خوێن تینوو نین. ئەوانە هیچیان لە مرۆڤایەتی پێ نەبڕاوە. منداڵەکانی دەروێش بەگیش رێك وەك ئەوانەن. لە یەك قوماشن. هاودەنگن. دوای رۆیشتنی دەروێش بەگ یان من، جا ئیتر یەکێك لەو دووانەمان، هەموو شتێك دەبڕێتەوە. ئێمە کۆتایی شتێك، چاخێك، جۆرێکی دیکەی مرۆڤایەتیین. مرۆڤایەتییەك جوێ لەوەی ئێمە پابەندی بووین، دەست پێ دەکا. لەوانەشە ئێمە دەستپێکی ئەو مرۆڤایەتییە بین. لەوانەشە هێڵی مەودای نێوان مرۆڤایەتییەکەی حەمەعەلی و مرۆڤایەتییەکەی دیکە بین.

دایکیی هاتە پێش چاوی. پڕ پڕ لە رق و قین، داخی ساری ئۆغڵیی لە دڵیدا و مێشکی پڕ لە بیر و خەیاڵی ساری ئۆغڵی، لە بەر ساری ئۆغڵی دەژیێ و هەر بۆ ئەویش دەمرێ. هەر ئێستا بە دایکم بڵێن ساری ئۆغڵی خاشەبڕ بوون و جووقەواریان لێ بڕاوە، ئەوەندەی یەك و دوو دەمرێ و چرکەیەکیش چییە ناژی. جا ئەوەش داپیرەی حەمە عەلییە. هەر دوو کیان لە یەك تیرە و خوێنن. پێکەوە جەفەنگ لێ دەدەن و یەکترییان خۆش دەوێ. بەڵام حەمە عەلی بە هەموو هەڵسوکەوتێکی خۆی گاڵتە بەو دەکا و ئەویش بە هەموو جووڵە و حاڵەتێکی خۆی ئەو بەکەم دەگرێ. لە زۆر لەمێژەوە، وەك داوێکی پۆلایین هەر لەبەر یەك کشاوەتەوە و وەك ژێیەکی پۆلایین زرینگەی دێ و گوێی هەڵخستووە و چاوەڕوانی بیستنی خەبەری مەرگی دەروێش بەگە و جا نازانی چەندە هەوڵ دەدا مەرگی دەروێش بەچاوی خۆی ببینێ و پێش ئەو نەمرێ.

مستەفا بەگ تاوێك هەروا لە بەر خۆیەوە ورتە ورتی هات و لەگەڵ خۆی قسەی کرد. کە وەخۆ هاتەوە و زانیی لە بن لێوانەوە ورتەورتێتی، بزەیەکی هاتێ. گوتی خەریکە پیر دەبم. پیر دەبم. لە ناخی خۆیدا جۆرێك لە نامۆیی و تاڵیی هەست پێ کرد و پێی وابوو دڵی دەگوشن. سێبەری رەشی هەستێکی وەك خۆبەکەم زانین گیانی داگرت. لە جێی خۆی وشك بوو و راوەستا. کە دەهات تاو هەڵبێ، هەنگاوێکی نا و لە نەکاو راوەستا. باشە بۆچی ئەو کارەی پێ رانەدەپەڕی؟ باشە بۆ تا ئێستا هەر نەیتوانیبوو دەروێش بکوژێ؟ تا ئێستا کار نەبووە ئەو دەستی بۆ بردبێت و بۆی نەکرابێ. ئەو دەروێشە چ هێزێکی هەبوو؟ بەخۆی گوت ئەو هیچ هێزێکی نییە. هیچ هێز و هونەرێکی تێدا نییە. هیچ تایبەتمەندییەکی نییە. ترسنۆکە. ترسنۆکە وەك مشك. وەك مشك. مشکێکی دەشتێ.

بیرکردنەوە لەوەی کە ئەگەر دایکی بەر لە دەروێش بمرێ، بە چاوی کراوەوە ماڵاوایی لەم دنیایە دەکا، کزەی لە جەرگی هێنا. سەری هەڵێنا و چاوی لە خۆرە تازە هەڵاتووەکە بڕی.

چەند جاران بە خۆی گوت، پێش مەرگی دایکم هەر دەیکوژم. تیرێژی خۆرەکە چاوی ئەزیەت کرد، بەڵام بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە کۆشکەکە. "بەر لە مەرگی دایکم دەیکوژم، دەیکوژم."

کە گەڕایەوە نێو کۆشك، بەرچاییەکەی ئامادە بوو. شیرە داغەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا. بەسەر ئەو تۆپەڵە رۆنەکەرەیەوە کە لە نێوەڕاستی قاپێکی مسی دانرابوو، شوێن پەنجە و دڵۆپەی دۆ دیار بوون. دانیشت. لە پێشدا رۆنە خۆماڵییەکەی لە نانەکە هەڵسوی و کردییە پارووەکی گەورە و دەستی دایە قاپی شیرە گەرمەکە، کە هاڵاوی لێ هەڵدەستا. ئەگەر میوانی نەبوایە، مستەفا بەگ بەرچاییەکەی بەتەنێ دەخوارد.

کاتێ دوای خواردنی قاوەڵتی دەچۆوە ژوورەکەی، دیسان بلەئیبۆ بە هانکەهانك و شەلاڵی ئارەقە لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و بە شڵەژاوییەوە گوتی:"بەگ، بەگ، بڕوانە، ئەوە خەریکە تێدەپەڕێ. سەیر بکە بەکوێدا دەڕوا. سەیر بکە، سەیر بکە... ئەگەر لێرەوە تەقەی لێ بکەین، فیشەکەکە وەبن سمی ئەسپەکەی دەکەوێ."

بەگ رەنگی بە روخسارییەوە نەما و لێوەکانی شین هەڵگەڕان و لە دەستبەجێ هەستا و خۆی گەیاندە دەرێ و لە زاری دەرپەڕی:"ئەو کابرایە لە کەللەی داوە. شێت بووە."

"وەشوێنی بەکەوین، بەگ؟"

مستەفا بەگ بێدەنگ بوو و لێوەکانی لەسەر یەك داگرتن.

"چ دەفەرمووی بەگ؟"

مستەفا بەگ هەر دەتگوت نابیستێ. بلەئیبۆ بەبێ ئەوەی چاوی لەو سوارە بە پڕتاوە هەڵگرێ، پەیتا پەیتا دەیگوت:"خەریکە دوور دەکەوێتەوە بەگ. دوور دەکەوێتەوە بەگ. دەی شتێك بڵێ. خەریکە دوور دەکەوێتەوە، دوور دەکەوێتەوە... بۆمان ناگیردرێ."

بەگ لە بەرد بێدەنگتر، لە سەر جێی خۆی وشك ببوو و هیچی نەدەگوت. ماوەیەك هەر وا لە بێدەنگیدا رابرد. بەگ بە سەرسووڕمان و رەنگ پەڕیویەوە لە جێی خۆی چەقیبوو و حەپەسابوو و چاوی بڕیبووە ئەو سوارەی جار بە جار لێی دوور دەکەوێتەوە. تا دەرویش بەگ لە چاوان ون نەببوو، وەخۆ نەهاتەوە و نەجووڵا.

بلەئیبۆ دەستەکانی شۆڕ ببوونەوە. وەدەنگ هات:"رۆیشت بەگ... تێپەڕی و رۆیشت. دەرفەتێکی دیکەشمان لە کیس چوو. خۆ ئەگەر بۆسەمان بۆ دانابایەوە، هەر ئەمڕۆ وەك مەل دەمانگرت. فیشەکێکمان لە لاقی ئەسپەکەی دەدا و بە زیندوویی دەمانگرت. مخابن."

ئیتر ئاخێکی هەڵکێشا. ئەوجار کەوتە حەول و وەلا و وەخۆ کەوت:"بەیانی، بەیانی، با هەتا ئێواریٚ لە سەر ئەو ڕێگەیە بۆسەی بۆ دابنێین بەگ... بەیانییش هەر بێرەدا تێدەپەڕیٚ."

"ئەتۆ پێت وایە دیسان بێرەدا تێدەپەڕیٚ، ئیبۆ؟ یانی دیسان بەو ڕێگەیەدا رادەبریٚ، کە جارێك پێیدا تێپەڕیوە؟ رادەبریٚ ئیبۆ؟ چما ئێمە ئەو ناناسین؟"

"ئەو کابرایە لە کەللەی داوە بەگ. وەڵڵا، بیللا، تەڵڵا لە کەللەی داوە. شێت بووە. خوێن بەری چاوی گرتووە. ئەوە دەیبینی بەیانییش هەر بێرەدا رادەبرێتەوە."

"ئەو رانابریٚ ئیبۆ، تێناپەڕیٚ ئەو، تێناپەڕیٚ."

گەڕایەوە و سەیری کرد دایکی لە پشتەوەی راوەستاوە. بە پشتی کۆماوە و چاوی زەق و لە ژێڵڵاهاتۆوە لە حاڵێکدا هەموو گیانی دەلەرزین، ئاگای لە هەموو ئەوشتانە ببوو کە رووی دابوو.

مستەفا بەگ بە دەنگێکی لەرزۆك و شەرمنەوە پرسیی:"چۆنی دایە؟ باشی؟"

قەرەقیزخاتوون بە چاوی پڕ لە پاڕانەوەی چاوێکی لە سەرتاپێی کرد، بە دەنگێکی تۆقیو و ماندوو و هیوابڕەوە گوتی:"دیارە ئەتۆ نایکوژی، مستەفا...

سەیر بکە، کوڕم، ئەو بە بەردەمی ماڵەکەتدا و بە سواری ئەسپێك وەك مامز خوشی و رابرد و قەڵسەی لیٚ گێڕای. ئەتۆ نایکوژی مستەفا. یانی ئەمن بە چاوی ئاوەڵاوە ماڵاوایی لەو دنیایە دەکەم مستەفا؟ چ بکەم، دەی باشە. ئەتۆ بژی مستەفاکەم. ئەتۆ بژی. هەرچی دەبیٚ با ببیٚ؟ ئەمن سلامەتیی تۆم دەویٚ مستەفاکەم، ئازاکەم، شێرە کوڕەکەم."

دەستی بە سەر دەستی کوڕەکەیدا هێنا و کۆم بۆوە و لاقەکانی بە دووی خۆیدا رکێش کرد و لەویٚ دوور کەوتەوە، وەك سەردولکەیەك.

موچڕکەیەك بە هەموو گیانی مستەفادا هات و بۆ ئەوەی خۆی بە سەر پێیانەوە راگریٚ، دەستی بە پەردووی بەر هەیوانەکەوە گرت. پشووی لیٚ بڕابوو. ساتێك راوەستا و دوایی چاوی بە بلەئیبۆ کەوت و بە دەنگێکی کە بەحاڵ دەبیسترا، گوتی:"بڕۆ."

بلەئیبۆ بە هێمنی لە پلیکانەکان چووە خواریٚ. مەستان و حەمدی لە خوارەوە چاوەڕێی بوون. بلەئیبۆ زاری کردەوە و گوتی:"نا، بەگ نایەویٚ ئەو کابرایە بکوژیٚ. ئەو گاڵتە بە خۆی دەکا و ئێمە خەریکین لێرە خۆمان بە کوشت دەدەین. ئەوە سیٚ رۆژە ئەو پیاوە بەردەوام بە بەردەماندا تێدەپەڕیٚ و ئەو هەر مێشێکیشی لیٚ میوان نییە. دەی بە ئێمە چی."

ئەوانی دیکەش گوتیانەوە:"بە ئێمە چی."

مستەفا بەگ تۆزێك وەخۆ هاتەوە و شەكەت و ماندوو چووە نوێنەكەیەوە. ئەو شەوەش بە مۆتەكە و وڕێنەوە رۆژی كردەوە. بە بەرچاوییەوە، لە رەوەز و گابەردە مۆرەكانی ئاناوەرزادا كۆمەڵێك نوور پەیتا پەیتا دەتەقینەوە و سەرانسەری چوكووراوا نوقمی لافاوێكی تیشك دەبوو و ئەوجار تاریكاییەكی سامناك دەنیشتە سەری. تاریكاییەكی خەست و چڕ، ئارەقەكردوو، وەك لافاوێكی قورس، وەك بەرد. شیر نەیدەبڕی. دەروێش بەگیش بەبێ راوەستان لە كەلێنێكەوە هێندەی جێ خەرمانێك كە تیشكێكی تیژ لە دڵی تاریكاییەكەی خستبوو، بە پڕتاو دەردەكەوت.

رەوەندەكان بە بەرە و مافووری پڕ لە نەخش و نیگارەوە، بە كەمبەرەی پانەوە، بە پێڵاوی سووری قەپۆز بەرزەوە، بە پانتۆڵی دەستچنی بەنەوە، بە وشتر و ئەسپانەوە، وەك سەردولكە و وایلۆكی درێژ، كۆمەڵێك شمشاڵ بە هەوای خەمناكەوە، خێوەتگەلێك كە وەك هەڵۆی رەش لە چوكووراوا دەنیشتنەوە، دەكەوتنە سەر درزەكەی رووناكییەكە. رەوەندەكان زەوییەكانی ئاقچاساز، زەوییەكانی دەروێش بەگ و ئاق یۆللی"یان تاڵان دەكرد و دەیانماشتەوە. كۆمەڵێك بنیادەمی تووڕەی دەست لە گیان هەڵگرتوو، بە چاوی وەك گۆمی خوێنەوە، بنیادەمگەلێك كە بۆ بستە خاكێك گیانیان فیدا دەكرد، لە درزەكەی رووناكاییەكەدا دەجمین. روناكاییەكە جار بە جار بچووكتر و تەسكتر دەبووەوە و تەنیا سەر و سەلكی پۆلێك بنیادەم و ئەسپ لە رووناكاییەكەدا دەمانەوە. تراكتۆرەكانی حەمە عەلییش بە هاڕەهاڕ دەچوونە نێو گۆڕەپانی رووناكاییەكەوە. ئاغا و بازرگانە تازە پێگەیشتووەكانیش هەر كامە گۆشەیەكی چوكووراوایان دەگرت و بەرەو خۆیانیان دەكێشا و هەوڵیان دەدا و مشتومڕیان دەكرد و هەر پەڵەیەكی ئەو پێدەشتە گەورەیە بە دەست یەكێكیانەوە دەمایەوە. خەڵكێكی نەناسراو كە، هیچ كەس نەیدەزانی خەڵكی كوێن و لە كوێوە هاتوون، چوكووراوایان بەسەر خۆیاندا دابەش دەكرد. زەوی و زارەكەی دەروێش عەلی ئاغا، خلووسی بەگ و زەوی و زارەكەی ئاق یۆللی"ش. كوڕەكانی سارییە شێت و حیسام بەگ هەر لە ئێستاوە نیوە ببوون. ئاغا توركمانە داماوەكان كوێستانەكانی خۆیانیان دەفرۆشت. لەو زەوی و زارەدا ئاوەدانی و كێڵگەی نوێ دادەمەزرا.

مستەفا بەگ لە دنیای زیندەخەودا، ئاخێكی قووڵی هەڵكێشا و لەگەڵ ئەو ئاخە دڵتەزێنەدا گوتی:"ئاخ دەروێش، ئەتۆ كوردی، ئەتۆ... ئەتۆ ئێمەت لە بنە هێنا، چوكووراوات فەوتاند."

زۆری پێ ناچێ، خاکی کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی بە تەوورەکە دەکێشرێ. کوڕ و برایەکی وا شیاوی نییە جێی بگرنەوە. هەر هەموویان سەر بەسەر کەرێك ناکەن. هیچ و پووچن.

"جەرگت دەردێنم دەروێش. دەستم ئاوا دەخەمە نێو قەفەزی سینگتەوە، دڵت هەڵدەکەنم و دەیخەمە پێش سەگەل، سەگەل، سەگەل."

بە دەموچاوی تێکسمڕاو و زەرد هەڵگەڕاوی مەیلەو سەوزییەوە لە جێوبانەکەی قیت بۆوە و بە چاوی ترس لێ نیشتوویەوە سەیرێکی ژوورەکەی کرد و نیگای بە شوێنێکەوە مۆڵەق وەستا. لە بەر چاوی لە نێوان خەو و بەخەبەریدا و لە سەر تاریکاییەکەوە بەرەو درزی رووناکییەکە، شالاوێکی بێ بڕانەوە و بێ وەستان بەردەوام بوو.

بە هاواری زایەڵەداری "مستەفا بەگ، مستەفا بەگ، مستەفا بەگ،" لە جێیەکی دەرەپەڕی و بەرەو هەیوانەکە غاری دا و هەرای کرد:"سەیر بکە، سەیری بکە، سەیر بکە بەگ، ئەوەتا رادەبرێ."

بلە ئیبۆ لە حەول و وەلادا بوو. دەروێش بەگ ئەمڕۆ زۆر نزیکتر لە جاران تێدەپەڕی.

مستەفا بەگ بێ ئیختیار پرسی:"هەوە؟"

بلەئیبۆ لە وەڵامدا گوتی:"خۆیەتی."

بلەئیبۆ پانتۆڵێکی سوارچاکان و کراسێکی سپی و پشتوێنێکی دەستکردی عەنتەب و پەستەکێکی شینی یەخەداری لەبەر کردبوو. چەکمەکانی دەبریسکانەوە و سمێڵی شۆڕ و چاوە تیژەکانی لە خاڵێك بڕیبوو. خەنجەرێکی چەرکەزیانەی زیوکفتی بە لا رانی راستەیەوە بوو کە مشتووەکەی زێڕکفت کرابوو.

هەتا چوارەکە بە چوار ناڵە لە چاوان ون نەبووبوو، مستەفا بەگ هەر وا بەبێ جووڵە لە سەر جێیەکەی خۆی مایەوە و نەیتوانی چاوی لێ هەڵگرێ.

بلەئیبۆ گوتی:"ئەگەر ئەمڕۆ خۆمان لێ مات دابایە، ئێستا گرتبوومان. هەموو رۆژێ بێرەدا تێدەپەڕێ."

مستەفا بەگ گوتی:"ئیدی سبەینێ بێرەدا رانابرێ."

بلەئیبۆش نەیزانی چ بڵێ.

مستەفا بەگ تا ئاوڕی دایەوە، چاوی لە چاوی دایکی ئالْقا و ساتێك وڕ و کاس مایەوە. دایکی چاوەکانی لە چاوی بڕی و بە نیگای پڕ لە پرسیار و خەفەتبار و بێهاوە سەیری دەکرد.

بێ ئیختیار لە زاری دەرپەڕی:"چۆنی دایە؟ باشی؟" و ئەوجار هیچ قسەیەکی پێ نەما و بێدەنگ بوو.

"دەفەرمووی سبەینێ بۆسەی بۆ دابنێین یان هەر ئەمڕۆ؟ لەوانەشە بێرەدا بگەڕێتەوە." ڕێك لەو کاتەدا دوو سوار لە دوورەوە سەر و سەلکیان دەرکەوت.

"بڕوانە بەگ، وا دێ."

قەرەقیز خاتوون دیسان بووژایەوەو بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە هەیوانەکە و دەستی بە ئەستوندەکەکانەوە گرت و ملی وا کێشا و خۆی وا بەرەو پێشەوە کێشا دەتگوت ئێستا وەك هەڵۆیەك تێی ڕۆ دێ و خۆی بە سەر سوارەکەدا دەدات.

"بەگ، ئەگەر دەڵێی با بچینە خوارەوە و لە خەرەندەکەی خوارەوەدا لە پشت قامیشەڵانەکەوە خۆی لێ مات بدەین."

قەرەقیز خاتوون ئەمجارەیان هەر بە دەموچاوەکەی پێشوویەوە ئاوڕی لە مستەفا بەگ دایەوە. چاوەکانی لە چاوی پڵینگێکی دڕندە دەچوون. مستەفا بەگ خۆی لە بەر نیگاکانی دایکی رانەگرت و رای کردە ژوورەکەی خۆی و توند دەرگاکەی پێوە دا و خۆی خستە نێو جێوبانەکەیەوە.

لە بەر پەنجەرەکە، چنارێکی چڕ و بە لك و پۆپ و گەش، بە کۆمەڵێك هێلانەی نێو لك و پۆپەکانییەوە، بەرەو ئاسمان هەستابوو.

هێلانەکان دەتگوت لە یەکتری دەچن، بەڵام واش نەبوو. ئەوە مستەفا بەگ دەیزانی. ئەو گەلێك ساڵان بە ویستی خۆی یان نا، بە وردی سەیری ئەو هێلانانەی کردبوو. زەڕنەقووتەی تازە لە هێلکەدەرهاتووش بەو دندووکە داپچڕاوە دەور زەردەیانەوە و بە جیکەجیکەکەیانەوە هەر لە یەکتری دەچوون، کەچی واش نەبوون. ئاوەکان، گوڵەکانی باغێك، نەرگزە زەردە پشکووتووەکانی ئەو ئاقچاسازە و نیلوفەڕی بڵاوی سەر ئاوەکە و زەردەزیرە و مێروولە و هەورەکان بە رواڵەت هەموو لێك دەچن، بەڵام واش نین. هەر بوونەوەرێکی لێی ورد دەبیتەوە، تایبەتمەندییەکی تێدا دەبینی، کە هەر لەخۆیدا هەیە. نەشتەرگەرەکە دەڵێ؟ نەشتەرگەرە کوردە ردێن تەنك و بێ زمانەکە. نەشتەرگەرە کوردەکە کە زمانی هەموو گیایەکان و جڕ و جانەوەر و بوونەوەرەکان دەزانێ و لە خووخدەی و تایبەتمەندی و خسڵەتی هەر هەموویانیش دەگا، دەڵێ ئەو ئاوەش کە لەبەری دەڕوات، هەموویان دەچێتەوە ئامێزی دەریا. بێ راوەستان رێ دەپێوە. ئاوەکەی ئەوبەریشەوە، تۆزێك لەولاترەوە، هەر لە زەوی هەڵدەقوڵێ. دەڵێی هەر لەو

گابەردانەوە، هەر لەو کانیاوانەوە هەڵدەقوڵێ. جا ئەوە هەر بە چاو وا دیارە. ئەگەر لەگەڵ هەر دوو ئاوەکە ژیابێی، دەزانی تەنیا رۆیشتنەکەیان لێك دەچێ... و هیچی دیکەیان. دەستە دەستە مێرووله لۆق درێژەکان هەر هەموو لێك دەچین... وایە؟ بەڵام هیچ کامێکیان رێك لەویتر ناچێ. بەو لاقە درێژ و باریك و جەستە سوورانەیانەوە لە نێو گژ و گیا سەوزەکان و لە سەر رێگا پڕ لە خۆڵ و خاکەکان... بە سەرانسەری ئەو چوکووراوایە وەربوون و دەسووڕێنەوە. هەر کامێکیشیان وەك ئەوی دیکە جوان و بە بریسکانەوەیەکی جیاوازەوە. هەر هەموو ساری ئۆغڵییەکان لێك دەچن... ئەوەیکە هەموو رۆژێ لە کاتی خۆیدا بە چوار ناڵە بێرەدا رادەبرێ... ئەسپەکانی هەموو ساری ئۆغڵییەکان سوورن. هەر هەموو ساری ئۆغڵییەکان چەنەباز و زۆربڵەن. ژنی هەموو ساری ئۆغڵییەکان بەئالۆوش و گانی گانین. هەر هەموو ساری ئۆغڵییەکان یەك جۆر جلوبەرگ لەبەر دەکەن. هەموو ساری ئۆغڵییەکان خوێن مژ و فێڵباز و ترسنۆکن. هەر هەموویان لە پشتەوە دەست دەوەشێنن، لە پشتەوە. پیاو لە خەوێدا دەکوژن.

کێهەمان پترمان لەویتر کوشتووە؟ ئێمە یان ئەوان؟ لەو ساڵانەی دواییدا ئێمە. لەوە پێش نە ئێمە دەزانین و نە ئەوانیش. کامان بنیادەممان پتر کوشتووە؟ ئێمە. چونکە ئێمە کەللە رەقتر و کەم قسەترین. ئەوان زۆری دەڵێن، دەترسن. بەخۆیان هەڵدەڵێن، بەڵام هیچیان لەدەست نایە. دەستەوستانن. بنیادەمەکان بە باب و باپیر و رەچەڵەکی خۆیان دەنازن. هەر دەڵێی بە راستی پیاوی رەسەن لە سەر ئەو زەوییە هەیە. نەشتەرگەرەکە گاڵتەی دەکرد کە دەیگوت ئەتۆ رەسەنزادە و بەر و پشت ئەتڵەسی. کوردەی چەپەڵ. ئەو بڕوای بە رەسەنایەتیی هخیچ بوونەوەرێکی سەر ئەو زەوییە نییە. چما شتی وا دەبێ؟ ئەسپی عەرەبی باش غار دەدا، بەڵام تاقەتی کەمترە لە بارگینەکانی چوکووراوا. باشە ئێسترەکانی چوکووراوا بەو لاقە کورتانەیانەوە کە وەك شەیتان دەڕۆن و زۆریش قایم و خۆڕاگرن، رەسەنتر نین؟ خۆ ئەو قسەیەم لە کن بابم کردبایە، لە هەموو میراتێك بێبەریی دەکردم و تا مردنی سەیری چاومی نەدەکرد. رەسەنایەتی جۆرە دواکەوتووییەکە. یەکەم پادشای عوسمانی بێنەوە بەر چاوت، ئەوجار سوڵتان رەشادیش، دوایی پادشای عوسمانییەکان. خۆ ئەوە خوێنی تازەیان لە ژنانیشەوە وەرگرتووە... هەر کامەیان کەموکورتی و کەمایەسییەکی هەبوو...

بنیادەمی رەسەن، بنیادەمێکی دواکەوتوویە. رەسەنایەتی شتێکی سازکراوە. بنیادەم یان هەر لە بنەوە رەسەنە یان هەر لە بنەوە نارەسەن. ئەگەر وایە ئەی ئێمە لەگەڵ دەروێش بەگ چ حەق و حیسابێکمان هەیە؟ بۆ دەبێ یەکتری بکوژین؟ ئەو بۆچی لە خوێنی مورتەزا بەگێك

خۆش نەبوو کە لە ترسی مەرگ دەربەدەر ببوو؟ ئەگەر لێی خۆش بوایە، ئەو مەسەلەی خوێن و تۆڵەیەش هەر لێرەوە دەبڕایەوە. لەوانەش بوو پێکەوە ببینە دوو برادەر و وەك دوو برا لەو چوکووراوایەدا لە بەرانبەر ئەو بنیادەمە بێ قیمەتانەی وا پەیتاپەیتا دێن....

لە سەر پلیکانەکانەوە هاوارێك هەستا:"بەگ، بەگ، بەگ."

دەسبەجێ لە جێی خۆی دەرپەڕی و دەروێشی دی کە قیت و قن لە سەر ئەسپە باڵدارە کلك و یاڵ پەخشکراوەکەی دانیشتووە... مستەفا بەگ بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، دەستی بۆ دەمانچەکەی برد و ویستی سێرەی لێ بگرێ، کە لەو کاتەدا دەروێش بەگ خوشی و لە بەر سێرە و تیرئەنگێوی ئەو چووە دەرێ. مستەفا بەگ بە هێمنی دەمانچەکەی لە سەر جێی خۆی دانایەوە.

ئاوڕی لە لای راستەی خۆی دایەوە. سەیری کرد دایکی لەوێ راوەستاوە. لە جێی خۆی وشك ببوو و چاوی بڕیبووە ئەو سوارەی دوور دەکەوتەوە.

"بلەئیبۆ وەرە ئێرە."

"فەرموو بەگ.

"بەیانی لە قوڵکەکەی ئەو قامیشەڵانەدا بۆسەی بۆ دادەنێینەوە. ئەوە سێ رۆژە بە قوڵکەکەدا دەپەڕێتەوە. هەر لەوێ، بەڵام تۆ پێت وایە بەیانییش دێتەوە؟"

بلەئیبۆ توند وەڵامی دایەوە:"دێتەوە. ئەو شێت بووە. ئیتر دەستی لە گیانی خۆی شوشتووە و لە ئارەقە رشتنێ وەڕەز بووە. بە پێی خۆی دێ بۆ ئەوەی بیکوژین."

"جا ئەتۆ دەڵێی ئێمەش بیکوژین؟"

مەستان گوتی:"نا، نا بەگ. نەیکوژین."

قەرەقیز خاتوون لە نەکاو راچڵەکی و بە دەنگێکی دوور لە چاوەڕوانی و لە ناخی دڵییەوە گرماندی:"بیکوژە مستەفا."

ئیتر خۆی خستە سەر دەستەکانی:"گوێ مەدەرە قسەی ئەوانە. بیکوژە مستەفا. بیکوژە و دڵ و جەرگیم بۆ دەربێنە و بۆمی بێنە. دڵەکەیم بۆ بێنە، بۆمی ... دڵەکەیم بۆ بێنە. پیاڵەیەك لە خوێنەکەیم بۆ بێنە."

مستەفا بەگ بە هێمنی و وەك هیچ نەقەومابێ، لە پلیکانەکان چووە خوارێ. حەمە عەلی لە حەوشەکە سواری تەراکتۆرێك ببوو و خۆی ئامادە دەکرد بچێتە مەزرا. رەنگی تەراکتۆرەکە شین شین بوو. تەراکتۆرەکە وەك گوڵێکی شین لە نێوەڕاستی حەوشەکە پشکووتبوو. وەك قالۆنچەیەکی شینی ئەفسانەیی.

# ٢٧

بەڵێ جەنابی قایمەقام، هەتا ئەوانە خاشەبڕ نەکرێن و تۆویان نەبڕێتەوە، ئەو مەملەکەتە پێش ناکەوێ. ئەوانە گرێ و لووی سەر دڵی ئەم وڵاتەن. ئاغای من، دوور لە رووی جەنابت، ئەوانە گرێیەکی بێدەرمانن. دەم زۆنگاوەکەی ئاقچاساز هەر هەمووی پڕە لە قەبر. گۆڕی ئەو لێقەوماو و داماوانەی بە دەستی ئەوانە شرت و گوم* کراون. ئەوانە هەر هەژار و لێقەوماو زۆر دەکوژن، کەمتر لە یەکتری دەکوژن. دەستیان بە سەر ئەو زەوی و زارەدا گرتووە و نە دادەچێنن و نە دروێنەی دەکەن و نە لە ئێمەش دەگەڕێن لە سەر ئەو زەوی و زارە بە پیت و بەرەکەتە کار بکەین. مەسەلەکە ئەوەیە گەورەم. مستەفا ئاق یۆللی" حەوتووەك لەوە پێش پێنج کەسی کە بە رێیەکەی ئاناوەرزادا تێدەپەڕین، شوێنبزر کردووە. دەستی بە سەر ئەسپ و دراوەکانیشیاندا گرتووە و تەرمەکانیشیانی لە قوڕ و لیتەکەدا شاردۆتەوە. باشە ئێمە وەك پیاوی حکوومەت، ئەرکی سەرشانمان نییە گیان و ماڵی ئەو هاووڵاتییانەمان بپارێزین؟ ئەو کارە، واتە کوشتنی یەکتری و هەژارەکان، کارێکی نامرۆڤانەیە. باشە نابێ پێش بە کردەوەی لەوجۆرە بگرین؟ مەحموودە کوردە، کوڕی ژن و مێردێکی داماوی دەوروبەری "وان"ـە و پەڕیوەی دەشتی چوکووراوا بووە و مێش و مەگەز کەوڵیان کردووە. ئەو زۆر لەمێژە بەبێ ئەوەی کەس بزانێ تەمەنی چەندە بووە، هاتووەتە خزمەتی دەروێش و دەروێشیش ئەوی وەك چەکدارێکی شەڕکەر راهێناوە. مەحموود بەر لە کوشتنی مورتەزا بەگ، گەلێك پیاوی دیکەشی کوشتبوون. ئەو دەست پەرەوەردانە، هەموو پەسنی دەروێش دەکەن. دەروێش سیحریان لێ دەکا و چیی پێی خۆش بێ پێیان دەکا. ئێستا ئەو مەحموودەش بە تەڵەوە نابێ و خۆی بە

---

*شرت و گوم: شوێنبزر. بێ سەروشوێن

دەستەوە نادا و کەڵەگایی لە دەوڵەت دەکا و خەت و نیشانت بۆ دەکێشێ و ژانەسەری بۆ دروست کردووی. بن هەموو بەرد و دەوەن و دار و کون و کاژێرێکی ئەو تۆرووسە، پەناگەی ئەوە. دەروێش بەگەکان و مستەفا بەگەکان لەو هەرێمەدا حوکم دەکەن. ئێمەش پێمان وایە ئەو مەڵبەندە حکوومەتی لێیە، کەچی هەر لە کۆن کۆنەوە حکوومەت لەو مەڵبەندەدا واتە دەروێش و مستەفا. هەتا دەسەڵاتی ئەوانەش نەشکێنرێ..."

قایمەقام لە حاڵێکدا دەمارەکانی ملە درێژ و باریکەکەی وەك کاریتە هەستابوون و پەنجە بە تووتن زەردبووەکانی دەلەرزین، لە قوڕگەوە گرماندی:"تێك دەشکێنرێن. کار نییە حکوومەتی ئێمە لە دەستی نەیە. ئەگەر بمانەوێ، هەر بە یەك ڕۆژان ئەو ئاغا کۆنەپەرستانە تێکەوە دەپێچین... دەستەیەك ژەندەرمە هەڵدەگرم و بە ئەنەدۆڵ دا دەگەڕێم و هەموو گوندەکان سەروبن دەکەم و تەواوی ئەو ئاغایانە کۆ دەکەمەوە و لە گوندێکیان دەپەستێوم و سێ کەسیشیان لە سەر دادەنێم بەر دەرگاکەیان لێ بگرن. هەر ئەوەندە. ئەوانە توانای ئەوەیان نییە بەربەرکانێی کۆمارە گەنجەکەمان بکەن. ئێمە لە شەڕە ڕزگاریخوازەکەماندا لەگەڵ هەموو دنیا بەشەڕ هاتین. نەك لەگەڵ یەك دوو کەس، بەڵکو لەگەڵ سوپای دنیایەکی ئاوا گەورە. جا ئەو دوو پاشماوەی ئاغاوات و بەگایەتییە چ شتێکن لە بەرانبەر ئێمەدا کە..."

پیاوماقوولانی شارۆچکە، بە دوای موفتی ئەفەنیدا وەژوور کەوتن.

قایمەقام هەستا و دوای پێشوازی و نیشاندانی جێگەی دانیشتن پێیان، چۆوە سەر قسەکانی خۆی. جار بە جار پتر هەڵدەچوو و قسەی دنەدەر و بەخۆداهەڵگوتنەکانی خۆی پتر کاریان تێ دەکرد و ئاگای لە خۆی نەدەما. بە دەم پیاسەکردنەوە لە ژوورەکەیدا، پێی لە عەرزی دەکوتا و دەیگوڕاند و دەنگی بەرز و کز دەکردەوە.

"بەڵ ڵ یٚ یٚ یٚ یٚ یٚ. زۆر زۆر زەحمەت دەکێشن ئەو برادەرانە، زۆ ۆ ۆ ۆ ر ر ر ، لە مەڵبەندەکەی ئێمەدا دوو پاشماوەی ئاغاواتی ماون ئەوانیش وا خەریکن یەکتری دەخۆن. بەڵ ڵ یٚ یٚ یٚ یٚ، یەکتری. حکوومەتی ئێمە ئەوەندە بەهێزە کە هەر کات بیەوێ، دەتوانێ لە چاوتروکانێکدا تێکەوەیان بپێچێ. بەڵ ڵ یٚ یٚ یٚ یٚ یٚ. ئێمە لە چاوتروکانێکدا دەتوانین ئەوانە تێکەوە بپێچین. ئەگەر بخوازین... ئێمە ئاغا و بەگمان خاشەبڕ کردوون. ئەو پیاوە بێهێزکراوانەی هاتن و لەو زەوییە کاکی بە کاکییەدا نیشتەجێ بوون، ئەوانە جیا لە کوشتنی یەکتری هێزێکی دیکەیان نییە کە زۆری پێناچێ، زۆری پێناچێ ئەوەش دەدۆڕێنن. زەوییەکانیشان دەدۆڕێنن. میللەتی ئێمە و حکوومەتەکەمان ڕێگەی خۆی هەڵبژاردووە. ئێمە

به ڕێبەرایەتیی داشدارانەی پێشەوای گەورەمان و سەرۆکی بۆزقۆرتی مەزنمان ڕێگەی خۆمانمان گرتووەتە بەر کە بگەینە ئاستی ئەورووپا. هیچ گومانێکتان لەوەی نەبێ."

جا کاتێ ئەو قسانەی دەکرد، پێی خۆی وا بە عەرزەکەدا کێشا، تەختەکانی بنی ژوورەکە گرمەیان لێ هەستا و دیوارەکان لەرزین.

ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلی یەکەم کەسێك بوو کە وەژوور کەوتبوو. بە تێر و تەسەلی خۆی ناساند و بە دەم ئاماژەکانی چاو و برۆیەوە، باسی ئەو ساڵانەی کرد کە لە ڤیەننا قوتابی بووە و زمانی ئەڵمانی دەزانێ و گوتبووی بە مەبەستی خزمەت بە نیشتمانەکەی، زۆر پۆستی گرنگ و وەزارەتیشی تەنانەت وەرنەگرتووە و قەبووڵی نەکردووە و هاتووە شارۆچکەیەکی هەڵبژاردووە بۆ خزمەتکردن. ئەوجار نۆرە گەیشتبووە رەوش و وەزعی بەشەکە و دوای روونکردنەوەیەکی تێر و تەسەل لەو بوارەشدا، بە تایبەتی پێی لە سەر مەسەلەی ئاغاواتە خوێنمژەکان، داگرتبووەوە.

ئەو کاتەی پیاوماقووڵان و دەمڕاستەکانی شارۆچکە وەژوور کەوتن سلێمان سامی خەریك بوو دەیگوت:"گەورەم جەنابت راست دەفەرمووی. سوپاکەی ئێمە دنیا و سوپاکانی دنیا و دەوڵەتە مەزنەکە (بەریتانیا)ی تێك شکاندووە، دیارە ئەو دوو پاشماوەی ئاغایەتییەش دەخەسێنێ."

ئەوەی لەوێ بوون کاتێ لە سەر کورسی و مۆبلە شڕ و شەوێقەکان دادەنیشتن، یەك دەنگ دووپاتیان کردەوە:"دەیانخەسێنێ. هەر ئێستاش هیچ هێزێك بە سوپا بەهێزەکەی ئێمە ناوەستێ."

سلێمان سامی لە سەر قسەکەی خۆی رۆیشت:"دەرەقەتی نایەن. دەوڵەتە مەزنەکە، ئێستاش ئەو شەپلاغەیەی لە بیر نەچووەتەوە کە ئێمە لێمان راکێشاوە. دوای ئەوە ئیتر ئەو سوپای خاچ هەڵگرە تا عومری بێ بەرەنگارمان راناوەستێتەوە. ئەو پاشماوەی ئاغاوات و بەگایەتییەش دەبێ هێز و توانای ئێمەیان بۆ روون بێتەوە و دەست لە ئاژاوە و تێکدانی هێمنیی وڵاتەکەمان هەڵگرن. وەك بڵێی بەس نەبووبێ، کە دەستیان دایە دەستی دوژمنان و نیشتمانەکەمانیان پێشکەش دەکردن."

هەمووان لە بنەوە گوتیان:"پێشکەشیان دەکردن."

سلێمان سامی:"ئەگەر ئەو ئاغاواتانە خەڵکە ئازا و چاونەترسەانی ئەو نیشتمانەیان بەکوشت نەدابایە و تەواویان نەکردبایەن، چما دەوڵەتە مەزنەکە سەهلە، سەد دەوڵەتی مەزنی

دیکەش هاتبایەن، هەر لە سایەی سەری ڕێبەرە مەزنەکەمانەوە نەیاندەتوانی سنوورەکانی نیشتمانە پیرۆزەکەمان ببڕن. هەر نەیاندەوێرا لەگەڵیشمان بەشەڕ بێن، تەنانەت لە دووریشەوە نەیاندەتوانی خراپ سەیری خاکە پاکەکەمان بکەن. ئەو ئاغاواتە... کۆسپی بەردەم نوێ بوونەوەن... ئیتر ئیزنیان نادەین ئاوا چاوقایم و رووهەڵماڵدراو بن..."

ئەوانەی لە مۆبڵە شڕ و شەوێقەکاندا پاڵیان دابۆوە و ئەو جگەرانەیان داگیرساندبوو کە قایمەقام خولْقی کردبوون و پێی دابوون و ئەو کووپە قاوانەی دورسوونی خزمەتکاری بۆی هێنابوون، هەڵیانچۆڕاندبوو، یەك دەنگ گوتیان:"ئیزنیان نادەین."

سلێمان سامی:"ئەو کاتەی ئێمە کفنمان دەپۆشی و لەو چیایانەدا بەرەنگاری دوژمنی دەبووینەوە، ئەو بەرێزانە لە ئەدەنە لەگەڵ فەرەنسییەکان شامپانییان هەڵدەپچڕی*."

سلێمان سامی کەیفی بەوە ساز بوو کە دەستەواژەی "شامپانییان هەڵدەپچڕی" و چەند جارێك دووپاتەی کردەوە:" بەڵ ڵ یێ یێ یێ یێ یێ. شامپانییان هەڵدەپچڕی. بەڵ ڵ یێ یێ یێ... هەڵیاندەپچڕی... هەڵیاندەپچڕی."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵێش دووپاتەی کردەوە: هەڵیاندەپچڕی."

ئەوجار گوتی:"ئێمە خۆ ئەو نیشتمانەمان نەدۆزیوەتەوە. ناشهێڵین چەند وردکە ئاغایەکی دواکەوتوو کاولی بکەن."

قایمەقام بە تووڕەییەوە گوڕاندی:"کەس ناتوانێ بە نیشتمانەکەی ئێمە بڵێ پشتی چاوت برۆیە. ئەمڕۆ و سبەی دەور و دووکانی ئەو خونکارانە تێکەوە دەپێچین."

هەر کان بە تێر و تەسەلی باسی چوکووراوا و شارۆچکە و جوانییە بەهەشتییەکانی و ئەو کێشانەیان دەکرد، کە خونکارەکان لە بەردەم پێشکەوتنەکانی نیشتمانەکەیان دا ساز دەکردن و لەسەر دەڕۆیشتن.

ڕۆژی دووەم بەشارۆچکەدا بڵاو بۆوە و هەواڵەکە زار بە زار گەڕا و گەیشتەوە گوێی دەروێش بەگ و مستەفا بەگیش. خەڵکی شارۆچکەکە بوونە دوو بەش و مقۆ مقۆ دەستی پێ کرد.

هەندێکیان دەیانگوت:"راستە. حوکمەت هەقێتی. ئەو خونکارانە بەردەوام خوێنی هەژاران دەڕێژن. تازە بەوەش ڕاناوەستن، خوێنی یەکتریش دەڕێژن. هەتا ئەوانە زیندوو بن، ئەو میللەتە

*لە وەرگێڕدراوە فارسییەکەدا نووسراوە: شامپانییان دەتەقاندەوە. مەبەست لە کاتی هەڵپچڕینەکەیدا کە سەرەکەی وەك تەقیبێ دەردەپەڕێ. پێموابوو لە کوردییەکەیدا ئەگەر ئەوم دانابایە، واتاکەی تەواو نەدەگەیاند و لەوانەبوو زەینی خوێنەر بۆ لایەکی دیکە بەرێ.

هێمنی و بەختەوەری بەخۆیەوە نابینێ. چما هەر ئەوانە نەبوون، کە ئالی عوسمانی جیهانگریان بە پلتۆکێك لە عەرزی دا؟ ئێستاش ئەوە دەیانەوێ کۆمارەکەمان بەچۆکدا بێنن. راستە، حوکمەت ئەوانە..."

حوکمەت رۆژێك دادێ هەموو ئەوانە لە ئەنەدۆل کۆ دەکاتەوە و فڕێیان دەداتە دوورگەیەکی دوورەوە. جا ئەو جار زاری تۆپەکانی بەرەو دوورگەکە وەردەسووڕێنێ و جا کاکی خۆم لێی دە ئەمان لێدان. هەر هەموویان لەتوپەت دەدا. حوکمەت هەقێتی. ئەوانە، ئەو بەگانە میللەت و مەملەکەت تووشی ئالۆزی دەکەن.

هەندێکیش دەیانگۆت:"مخابن، هەزار حەیف و مخابن... ئەوانەی وا ئەمڕۆ بە ناوی ئاغا و خونکار سووکایەتییان پێ دەکەین، هەر ئەوانە بوون کە رۆژگارێك دەستەونەزەر لە بەردەمیاندا رادەوەستاین. باشە ئەوانە کێ بوون کە شەڕە نیشتمانییەکەی دژی دوژمناندا وەك پڵینگ شەڕیان دەکرد؟ کێ بوون ئەوانەی میدالیای زێڕینیان بەسەر سینگەوە بە شارۆچکەدا دەسووڕانەوە؟ چما هەر ئەو دەروێش بەگ و مستەفا بەگە نەبوون؟ ئەوانە دەنگۆن. حوکمەت کاری بە کاری ئاغاکانمانەوە نییە.... بەگەکانمان، ئاغاکانمان بناغەی ئەو ئاو و خاکەن."

"کێ گوتی، کێ گوتی؟"

"قایمەقام خۆی گوتی."

"چی گوت، چیی گوت؟"

"گوتی ئەمن بە دەست ئاوەڵاییەوە هاتوومە ئێرە. یان ئەو گەمەی خوێنە کۆتایی دێ و دەبڕێتەوە، یان ئەوەی کە ئەو بەگانە بە ورد و درشتی کەس و کاریانەوە لێرە دوور دەخەمەوە. گوتی ئەوانەی "لوو"ی بێدەرمانی ئەو ئاو و خاکەن. گوتی، دەیانفەوتێنێ و لە ناویان دەبا."

"لەو رۆژانەدا لەشکرێك بە فەرماندەی جەنابی موشیر فەوزی پاشا دەگاتە ئێرە..."

"خوا بکا ئەو نەیە."

"جا بۆ نەیە؟ بۆ...."

"ئەگەر ئەو بێ، خاکی ئەو چوکووراوایە بە توورەکە دەکێشێ. ئەو زۆر توندە..."

"کوڕە ئەتۆش ملی خۆت بشکێنە... ئەو کابرایەکە سەری بچێ نوێژی ناچێ."

"کەس نییە لەو بە بەزییتر..."

"کوڕە تۆش راست دەکەی ها، هەر دەڵێی ئەو کابرایە مێشکی کای تێدایە."

"دەزانی، نەجاتی* وەزیری رۆشنبیری چیی گوتووە؟ گوتوویەتی خودا نا، بەڵکو دەوڵەت هەیە و جا دەزانی فەوزی پاشا چ قسەیەکی لە پارسەنگی ناوە؟ گوتوویەتی ئەگەر خودا نەبیٚ.... ئەی ی ی نەجاتی، ئەتۆش نابی و نییت."

"ئەوکات، موشیر فەوزی پاشا دەمانچەکەی راکێشا و گوتوویەتی زارت بکەوە بزانم."

"چما دەیتوانی نەیکاتەوە؟"

"زارت داپچڕە نەجاتی."

"چاری نەبووە و کردوویەتەوە."

"گوتم بیکەوە زارت..."

"تەق، تەق، تەق،... تەقاندوویەتی."

"مستەفا کەمال غازی ئەوە دەبیستێتەوە و خێرا خۆی دەگەیێنێتە ئەویٚ..."

"نەجاتیی زۆر خۆش ویستووە و زۆریشی رێز لە موشیر چاقماق زادەی فەوزی پاشا گرتووە. چاقماق زادە. پاشامان چاقماق زادەی ئەرزەرۆمی..."

"فەوزی پاشا هیچ ناڵیٚ، هەر ئەوەندە وردە وردە لەویٚ دوور دەکەوێتەوە."

"فەوزی پاشا هەر ئەو فەوزی پاشایەیە کە فەرماندەی سوپاکەمانە ـ سوپایەك کە هەر ئەندامێکی لە جێی خۆیدا بێچووە پڵنگێکە. فەوزی پاشا خۆی دێتە سەر بەگەکانی چوکووراوا و بەڵێنی بە قایمەقام داوە ئادار بە سەر پاداری ئەو مەڵبەندەوە ناهێڵیٚ."

"دنیا باشاری ئەوی، ئەوی ، ئەوی... نەکرد. دەوڵەتەکانی حەوت وڵاتان و سوپاکانی هەر چوار قوڕنەکەی دنیاش دەرەقەتی...."

"نەهاتن.... تەح، هەی رەحمەت لە دایکت، گوێچکەی بەگەکانی چوکووراوا دەگریٚ و..."

"سەر شانەکانی فەوزی پاشا لە جێی ئەستێرە، کیلۆیەك زێڕیان پێوەیە..."

"دیٚ."

"دیٚ و جا چ هاتنێکیش."

هەواڵی لەشکرکێشانی فەوزی پاشا بۆ سەر بەگە یاغییەکانی چوکووراوا و بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە لە زمانی پارێزگار و قایمەقامەوە و پشتڕاستکردنەوەی لە لایەن عەلی سائیب بەگی نوێنەری پەرلەمانەوە ئەوەش، کە زۆری پێناچیٚ مستەفا بەگ و دەروێش بەگ لە کۆڵ ئەو وڵاتە

---

* مستەفا نەجاتی لە ساڵی ١٩٢٠دا وەزیری رۆشنبیری بووە.

دەکەنەوە، گەیشتەوە گوێی ئەوان و قایمەقام و پارێزگار و عەلی سائیب بەگیش بیستیانەوە. دڵەکوتە و ئاڵۆزییەکی گەورە شارۆچکەکەی داگرت.

دەروێش بەگ دوای بیستنەوەی هەموو ئەو شتانە، ماوەیەك بێدەنگ بوو و ئاخری بزەیەکی هاتە سەر لێوی. دیار بوو دنیا لە گۆڕان بوو. بەڵام ئەوەی دەگۆڕدرا چ بوو؟ خۆ نەدەکرا ئەو هەمووە قسەیە، قسەی خۆڕاییی بن.

مستەفا بەگ دژکردەوەی توندتر بوو. هەڵچوو و گرماندی و جنێوی دا. شتی نەکردە و مەحاڵ بوو. ئەوە هەر هەمووی کاری دوژمنان و ناحەزان و ئاژاوەگێڕان بوو...

"هەر هەمووی قسەی قۆڕە. خۆ ئەمن ئەو کات لە ئەنکەرە بووم. نەجاتی بەگ بە ئەجەلی خۆی مرد. ئەوە عالەم و ئادەم دەزانن. ئەو درۆ زل زلانە چۆن هەڵدەبەستن؟ بۆ چییان هەڵدەبەستن؟ بۆچی؟ ئەگەر فەوزی پاشا خۆی ئەوەندە بچووك کردەوە کە بۆ دوورخستنەوەی ئێمە، خۆی بێتە چوکووراوا، یاخوا بەخێر بێ. خێر و بەرەکەت دێنێ. با بێ و دوورمان بخاتەوە. هاتنی فەوزی پاشا بۆ ئێرە نەك بۆ دوورخستنەوە، بەڵکو بۆ کوشتنی ئێمەش، شانازییەکی گەورەیە بۆ ئێمە."

شارۆچکەکە ماوەیەك ئەو قسانەیان دووپاتە کردەوە.

دەروێش بەگ قوت ببوو و دەیویست بنچ و بناوانی ئەو دەنگۆیانە دەربێنێ و بزانێ کێن بڵاویان دەکەنەوە. ئەو دوای ئەوەی لە زمانی سلێمان سامییەوە موو بە موو راپۆرتی کۆبوونەوەکەی ژووری قایمەقامی بیست گوتی:"هەی هیچ و پووچی بێ شەرەف."

ئەوجار بە بزەیەکەوە لێی زیاد کرد:"هەی ماهیری بێ شەرەف، ئاخ."

# ٢٨

سلێمان سامی گوتی:"هەر ئەوە، هەر ئەوە بوو کە عەرزم کردی. ئێستا دەروێش ئەگەر دەتوانێ با خۆی رزگار بکات. ئێمە هەموو شتێکمان بەو گوت و تکامان لێکرد و گوتمان ئەو کارانە لەو سەردەمە ناوەشێنەوە. بە گوێیدا نەچوو، ئاغای من، نەچوو و نەچوو."

رەزا قومارکەر گوتی:"ئەوە دەڵێی چی سامی؟"

سلێمان سامی بەهەندی نەگرت و لەسەری رۆیشت:"بە قسەیان نەکردم. هەموو پیاوماقووڵ و ردێن سپی و دەمڕاست و پیاوی بەناوبانگی ئەو چوکووراوایەم بۆ تکا بردە سەر بەرەکەیان، گوێیان نەدانێ و بە قسەیان نەکردن. ئیتر کار لە کار ترازا. هەر دوو بنەماڵە بڕانەوە. باشە، با تەواو بن. با بن، بن، بەڵام تۆ خوا حەیف نییە؟ ئاخ لە دەست دەروێش بەگ."

رەزا قومارکەر گوتی:"بەخوای حەیف، ئاااخ. ئاخر سامی، ئەوانیش بۆ ئەوەی دەبن ئاخیان بۆ هەڵکێشی؟"

سلێمان سامی گوتی:"وەیش، ئێستا دەروێش بەگ چ دەکا؟ ئاق یۆللی" دەویست تۆڵەی هەموو رەچەڵەکەکەی لەو بکاتەوە. بڕیاری دابوو قەت نەیکوژێ. بەڵام ئێستا هیچیان دیار نین. کەس بە شوێنیان نازانێ."

مراد زبڵ ڕێژ:"ئێمەش سەردەمانێك بەگمان هەبوون، کۆمەڵێك بەگی خوێنمژ. هەم خوێنی خۆیان و هەمیش خوێنی خەڵکیان دەخواردەوە. لەو نێوەدا هەر باب و باپیرە نەجیمزادەکەی من خوێنخۆر نەبوون."

وەلی حەسەن ئاغا:"بە قسەیان نەکردین، دەی باشە با نەیکەن."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی:"گووی خۆیانە با بیشێلن. لێیان گەڕێ با یەکتری بخۆن. هەتا ئەو بێ ئەقڵانە زیندوو بن، ئەو وڵاتە هەر لە مردوو دەچێ. مردوو."

ئەحمەد ئاسنگەر:"ئەوە بە گیانی ناخێرمان ئێمە بنیادەمین... ئێمە ئێستا باش دەزانین ئاق یۆللی" چیی بە سەر دەروێش بەگ هێناوە. با هەتا زووە، هەتا زووە دەبێ لە چنگی ئەو جانەوەرە دڕندەیە رزگاری بکەین. ئەوە ئەرکی ئینسانیی ئێمەیە. دڕندەیەك، بنیادەمێکی خستووەتە بن چنگ و چۆکی خۆی... جا چیی لێ ناکا..."

بۆسەی دانابۆوە. مستەفا ئاق یۆللی" بنیادەمێکی بەفرت و فێڵ بوو. لە قامیشەڵانێکدا بۆسەی بۆ نابۆوە. شەش مانگی رەبەق لەوێدا چاوەڕێی ببوو. دەروێش بەگ سواری ئەسپەکەی دەبێ و بە لایەکی دیکەدا دەڕوات. مستەفا بەگیش وای دانابوو دەروێش بەگ ئاخرییەکەی هەر بە بەردەم سیپە* و بۆسەکەی ئەودا رادەبرێ. ئاخرییەکەی رۆژێك لە رۆژان، هەر وا دەبێ. وەك پشیلەیەك بە سیکڵدانە و سەبرەوە، لە قامیشەڵانەکەدا هەروا چاوەڕێی دەروێش ببوو. قامیشەڵانەکە ببووە هێلانە و ماڵی وی. خۆ ئەگەر دەروێش بەگ نەزانێ ئەو لە کوێی بۆسە بۆ دادەنێتەوە، ئاخرییەکەی رۆژێك دەکەوێتە نێو ئەو داوەوە. مستەفا وەك جاڵجاڵۆکەیەك لە پەنا تان و پۆ تەنراوەکەی خۆی لە گۆشەیەکی دەشتەکەی ئاناوەرزا خۆی مەڵاس دابوو و چاوەڕێی بوو. دەروێش بەگ بە سواری ئەسپە خۆشبەزەکەی کە وەك بای شەماڵ دەفڕی، بە لای راست و چەپیدا تێدەپەڕی و هەرگیز لە سیپە و بۆسەی مستەفا نزیك نەدەبووەوە. ئاق یۆللی"ش هەر وا لێبڕاوانە چاوەڕوانیی دەکێشا.

ئەمن لەوێ بووم. چوبووم بۆ راوە رێوی. لە گۆشەیەك سیپە نابۆوە. ئەو رۆژە سێ رێویم گرت. بەو کلکە کوڵکنانەیانەوە، بەبێ ترس و خەم بەرەوڕووم دەهاتن. ئەمنیش هەر سێکیانم بە فیشەکێك سەروبن کرد. بە بۆن کردن و مڵومۆ بەرەو لام دەهاتن. ئەو رۆژە شتی سەیر و سەمەرە قەوما. پۆلە هەڵۆیەك لە نزیك نزیکی من دەنیشتنەوە و دەفڕینەوە. لە دوورەوە سوارێك کە ئەسپەکەی لینگدابوو بە چوارناڵە دەهات. ئەسپەکەی وا غاری دەدا دەتگوت زگی وەعەرزەکە دەکەوێ. سوارەکە هات و لە قەراغ قامیشەڵانەکە راوەستا و سێ تفەنگ یەك جێ تەقەیان لێ هەستا. هەر لەگەڵ تەقەکە، ئەسپەکە هەستایە سەر پاشووان و وەعەرزی کەوت. هەر ئەسپەکە کەوت، سوارەکە بەرەو زۆنگاوەکە تێی قووچاند. پێنج کەس لە قامیشەڵانەکە

---

* سیپە: ئەو قوڵکەیەی راوچی بۆ خۆماتکردن هەڵیدەکەنن و دەوروپشتی بە شووڵکەدار و گیا دەچنن بۆ ئەوەی نێچیر نەیانبینێ.

هاتنە دەرێ و لە پیاوەکە دەگەڕان. کابرا بەرەو لای من هات. پشووی سوار ببوو. دەنگی هانکە هانکی لە دوورەوە دەبیسرا. چەند جارێك لە بەر دەمم کەوت و هەستایەوە. ئەو پێنج پیاوەی بە شوێنیەوە بوون، پەیتا پەیتا تەقەیان دەکرد. کابرا بە هەر لەونێك بوو، خۆی بە زۆنگاوەکەدا دا.

پێنج پیاوەکەش بە دوایدا خۆیان لە زۆنگاوەکەیان دا. لە نێو زۆنگاوەکەوە دەنگی تەقە دەهات. ئەمن ئەوێ شەوێ دوو ڕێویی دیکەشم گرت. ڕێوییەکان ڕاستەڕێ بەرەو رووم دەهاتن. ئەو شەوە تا بەیانی هەر دەنگی تەقە هات. ئەوجار دەنگی هاوارێکی بەرز هەستا و ئەسپەکان هەتا بەیانی وەك شێتان حیلاندیان.

هەڵۆیەکی گەورە بە پەڕ و پۆی سووربۆوەوە، لە ڕەنگی مس. وەك مسی سوورکراوە. مستەفا بەگ مەڕێکی بەرەڵڵا کردووەتە لایەك و ئاماژە بە هەڵۆکە دەکا. هەڵۆکە باڵە گەورەکانی لێك دەکاتەوە و دەفڕێ بۆ ناخی ئاسمان. هێدی هێدی لە سەر مەڕەکە دەخولێتەوە و وردە وردە دەخوشێ بەرەو خوار. ئەوجار نووکی باڵەکانی دەکەونە لەرزین و دەلەرزن و لە نەکاو هەر دوو باڵی جووت دەکات و بەرەو سەر دەکشێ و جا لە تەشقی ئاسمانێ خۆی گرمۆڵە دەکا و توند و خێرا لوور دەبێ و لە چاوترووکانێکدا چاوێکی مەڕەکە دەردێنێ و هەڵدەفڕێتەوە و لە ئاسمانێ دەیخوا. دیسان وردە وردە بەرەو خوار دەبێتەوەو لە سەر سەری مەڕەکە ئەوەندە دەخولێتەوە هەتا گیان و باڵی دەکەونە لەرزین و دیسانەکە بەرەو سەر هەڵدەکشێتەوە و جارێکی دیکەش خۆی کۆدەکاتەوە و وەك هەورە تریشە لووری مەڕەکە دەبێ و ئەمجارەیان پنتکێکی دیکەی لێ دەکاتەوە و هەڵدەفڕێتەوە.

مستەفا ئاق یۆللی" ئەو هەڵۆیەی بۆ دەروێش بەگ پەروەردە دەکرد. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا پێنج هەڵۆی ئاوای پەروەردە کردبوو. بۆ ئەوەی کاتێك دەروێش بەگی گرت... دەڵێن دەروێش بەگی لە زۆنگاوەکەی ئاقچاسازدا گرتووە. نە سووکایەتیی پێ کردووە و نە جوێنیشی پێ داوە. هیچ بێ ئەدەبیی بەرانبەری نەکردووە. جۆرێکی لەگەڵ جووڵاوەتەوە وەك هیچ شتێك لە نێوانیاندا نەقەومابێ. دەروێش بەگی هەڵگرتووە و بردوویەتی لە نێو ڕەوەزەکانی ئاناوەرزادا لە گابەردێکی بەستووەتەوە. هەڵۆکان لە سێ ڕۆژ پێشترەوە برسی بوونە. بەڵێ، مستەفا بەگ، بەر لەوەی دەروێش لە گابەردەکە ببەستێتەوە، رووت رووتی دەکاتەوە و جا هەڵۆکەی بۆ هەڵدەفڕێنێ. پێستە مەڕێکیش بە سەر شانی دەروێشدا دەدا. هەڵۆکە لە ئاسمانەوە دەخوشێ

بەرەو خوار و نووکی باڵەکانی کەوتوونە لەرزین و ئەوجار بەرەو سەر کشاوەتەوە و لەو سەرەوە وەك هەورەتریشقە بەسەر دەروێشدا هاتووە و چاوێکی دەرهێناوە و فڕیوەتەوە.

ئێستا ئەوە چەند رۆژێکە پێنج هەڵۆی رەنگ مس، لە ئاناوەرزا دەروێش ونجڕ ونجڕ دەکەن و وردە وردە دەیخۆن.

هەر بەراستی، بنیادەم چەندە قین لە دڵ و رقنە. نا، شتی لەو جۆرە نەبووە و نەبیستراوە و نەبینراوە.

بارانێکی زەرد نەرم نەرم دەباری. لە بەر بارانەکە، رەوەزە رەشەکان، دارچنارەکان و دەوەنە سەوزەکان، خاك و ئاسمان و ئاوە بەلووزەوەکان، لێڕەوار و خانووبەرەو دێهات و شارۆچکە هەر هەموو زەرد دەچوونەوە. مستەفا بەگی ئاق یۆللی"ش زەرد زەرد دەچۆوە. باڵندە و مێروولەکانیش زەرد زەرد. رێك لەوەها حاڵ و وەزعێکدا کە دنیا زەرد دەچۆوە، مستەفا بەگی ئاق یۆللی" ون بوو و هیچ شوێنپێیەکی لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت. دەروێش بەگ زراوی چوو. مستەفا بەگ لەنەکاو رۆژێکیان، لە جێیەکی کە ئەو هیچ چاوەڕوانی نەدەکرد، لە پێشی قوت دەبێتەوە و بەرەنگاری یەك دەبنەوە. مستەفا بەگ پیاوێك نەبوو بترسێ، وەڕەز بێ و خۆی بشارێتەوە. دەروێش بەگ وای بیر دەکردەوە، بەڵام وردە وردە ترسەکەی لە دڵی خۆی دەڕەواند و مستەفا بەگی لەبیر خۆی دەبردەوە. ئەو ترسی ـ هەر ئەو هەستەی کە نزیکترین دۆستی بنیادەمە ـ بەلاوە نابوو.

مستەفا بەگ رۆژێك لە رۆژان لە نەکاو لە پێشی قوت دەبۆوە. کەوتن و دەسبەجێ کوژرانی ئەسپەکەی بن خۆی بینی. خۆی بە لێڕەکەی ئاقچاسازدا کرد. مستەفا بەگ بە شەش پیاوی خۆیەوە وەشوێنی کەوتن. هەر سێ هەنگاویان مابوو بیگەنێ. ئەو مەودایە نە کەم دەبۆوە و نە زیاد. دەروێش ئاخرییەکەی لە لێڕەوارەکەی ئاقچاساز هاتە دەرێ و رووی لە رەوەزەکانی ئاناوەرزا کرد. دەست و پێی لە داوێن و بنارەکاندا و لە نێو گابەردەکان و لە بەر قرچەی گەرماکەدا هەمووی داماڵکابوو و خوێنی لێ دەچۆڕایەوە و پشووی بڕابوو. بارانە زەردەکە وەك بڵێسە، ورد ورد، گەرم و بە زەبر وەك قەمچی و تیژ وەکوو مووس دەباری.

دەروێش ئاخری، لە بن بەردێك کەوت. دەست و پێیەکانی خوێنیان لەبەر دەڕۆیشت. نێو رەوەزەکان پڕ بوو لە بەردە ئەستێی تیژ تیژ. بە حاڵی سەگ هەستایە سەر پێیان، بەڵام دیسان کەوتەوە و تخێڵ بوو. دیسان هەستایەوە و جووڵا. مستەفا بەگ گەیشتێ و بن پیلی گرت و گوتی:"خێر دەبێ ئیشەڵڵا."

دەروێش دەنگی نەکرد. بانگی پیاوەکانی کرد:"قوولکەیەك هەلکەنن."

بارانە زەردەکە وەك تیغ دەباری.

دەسبەجێ قوولکەیەکیان هەلکەند. بالای پیاوێك. دەروێشیان رووت رووت کردەوە و هەتا گەرووی لە قوولکەکەیان گرت. بارانە زەردەکە، بەتیژی، وەك تیغ وەك هەودایەکی پۆلایین بێ پسانەوە بە لێزمە دەباری.

تاو هەلات. رەوەزەکان لە گەرمان تەقین و شەقار شەقار بوون.

دەروێش دوو رۆژ دواتر پشووی لێ بڕاو و وەك مردووان وەدەنگ هات. هەموو گیانی لە گلدا و تەنیا سەری بەدەرەوە بوو. مێش و مەگەز لە چاوەکانی نیشتبوون و زەردەوالە دەچوونە نێو زار و گوێچکەکانییەوە و دەهاتنە دەرەوە.

مستەفا بەگ گوێچکەی بردە بن زاری دەروێش بەگ. دەروێش بەگ بەحالێ دەنگی دەهاتە دەرێ و دەیگوت:" ئاو، ئاو، ئاو...."

مستەفا بەگ گوتی:"ئەها تێگەیشتم دەروێش ئێستا خۆت هێناوەتە سەر نرخی چۆڕە ئاوێك. هەر بایی ئەوەندەشت ئاو دەدەمێ."

بلە ئیبۆ بە شەلپەشەلپ سەتلێکی پڕ کرد لە ئاو. چەند قالبە سەهۆلی تێ هاویشتت. سەتلەکە ئارەقەی کرد و دەوروبەرەکەی هەلمی لێ نیشت. سەتلەکەی برد و لە نزیك سەری دەروێشەوە داینا. چاوەکانی دەروێش زەق بوونەوە و لێوەکان لەرینەوە.

مستەفا بەگ گوتی:" چارەڕەش، ئاوت دەدەمێ."

گەرمای نیوەڕۆ هەلێکرد و رەوەز و عەرزەکەی سوور کردەوە. بلەئیبۆ سەتلێك خوێاوکی گرتەوە....و بۆ دەروێشی برد. دەروێش زمانی دەرکێشابوو و دەی هانکاند.

"ئاو، ئاو، ئاو..."

"هانێ ئەوش ئاو."

"ئاو، ئاو، ئاو..."

"دەی ها، ئەوەش ئاو."

بلەئیبۆ پەرداخە ئاوەکەی بە لێوەکانییەوە نا. دەروێش ئاوە سوێرەکەی هەلقوڕاند. چۆڕی لێ بڕی. هیچی لە سەتلەکەدا نەهێشتەوە. بە دوای ئەوەدا چاوە سووربووەکانی لە ژێللا هاتن. وا لە ژێللا هاتن دەتگوت ئێستا نا ئێستا دەردەپەڕن و دەکەونە نێو ئەو سەتلە ئاوە ئارەق کردووەی سەهۆلەکەی تێدا بوو.... مستەفا بەگ هاتە پێشێ و سەتلە ئاوەکەی هەلگرت و

هێندەی دوو قولانج لەولای سەری دەروێشەوە داینا. زمانی دەروێش درێژتر بۆوە و درێژتر بۆوە و درێژتر بۆوە و باریك بۆوە وەك هەودایەكی لێهاتەوە، بەڵام نەگەیشتە سەتڵەكە.

بارانە زەردەكە وەك تیغ دەهاتە خوارێ.

مستەفا بەگی ئاق یۆللی" گوتی:"وەرە، وەرە دەروێش، ئەمن ئەوە چەندی چەند ساڵە هەر چاوەڕێی وەها رۆژێك بووم. رۆژێكی جوان. لە كلكی ئەسپت دەخەم. راتدەكێشم... نا... چما شتی وا دەكرێ؟ لەسەرخۆ، هێمن هێمن... چما شتی وا دەبێ؟ نا، نا، ئەگەر بخوازی لە ژوورێكدا داتدەنێم. برسی و تینوو. هەموو رۆژێك مریشێكی مردارەوەبووی بۆگەنی كرم تێدراوت بۆ دێنم.... نا، نا... دەورێش، بە پیاوەكانت... نا، نا... دەروێش..."

مێروولەی زەرد هەموو گیانی دەروێشیان داپۆشیبوو. دەروێشیان ورد ورد دەخوارد.

ناڵبەندەكە لە بن چنارەكەی بازارێدا ئەسپەكانی ناڵ دەكرد. دوو شاگردەكەی بێ وچان لە ناڵەكانیان دەدا و ئەو لەگەڵ سێهەم شاگریدا ئەسپێكی چەرمووی ناڵ دەكرد. خاوەنی ئەسپەكەش، سەری ئەسپەكەی گرتبوو. دەنگی خرمەی ناڵی ئەسپێك لەو سەری بازاڕەكەوە هەستا. ناڵبەند تا سەری هەڵێنا، سوارەكە گەیشتێ و لە بن چنارەكە راوەستا و گورج و گۆڵ لە ئەسپەكەی دابەزی و بە دەنگێكی پڕ لەخۆشی و شادییەوە هەرای كرد:"دەسبەجێ ئەو ئەسپەم بۆ ناڵ دەكەی باشە؟"

ناڵبەندەكە تفەكەی نێو زاری خۆی قووت دایەوە. ساتێك بێدەنگ حەپەسا و زمانی شكا و هەر ئەوەندەی پێ گوترا، بڵێ:"بەگ، بەگ، بەگ...."

زۆری پێچوو تا توانیی بەسەر خۆیدا زاڵ بێتەوە و بڵێ:"هەر سمێكی ماوە. تەواوی بكەم ئەسپەكەی تو..."

و قسەكەی تەواو نەكرد و دوای تۆزە راوەستانێك، بە بزەیەكەوە و بە لەبزێكی تژی لە سەرسووڕمانەوە گوتی:"بەگ، ئێمە پێمان وابوو تۆ..."

دەروێش پێكەنی.

"بەگ ئێمە پێمان وابوو تۆ..."

بەگ دیسان پێكەنییەوە.

ناڵبەندەكە دەیویست بڵێ:"مێرووله زەردەكان... ملوێنان ملوێن..."

مێرووله زەردەكان، بە دەست و پێ بەستراوییەوە... هەنگوینیان بەسەدا كردووە. مێروولەی زەرد تێی هاڵاون.

مستەفا بەگ سێ ڕۆژ دواتر هاتبوو و گوتبووی:"وەیش، وەیش، وەیش، وەیش."
دەروێش بەگ، ئێسکە سپییەکانی هەلا هەلا بوون و وەك بنیادەمێکی کرووشمەکردوو، خەوی لێ کەوتووە.
"وەیش، وەیش، من نەمدەویست وای لێ بێ، ئەمن نەمدەویست وا..."
"بەگ، بەگ، ئێمە... زراومان چوو."
بەگ هەتا قوڕگی لە عەرز گیراوە و زاری بووەتە پەمپی با... لە زار و لووتییەوە خوێن فیچقە دەکا.
بەگ، بەگ، زراومان چوو.
دەروێش بەگ هەر بزەی دەهاتێ.
"پەلەمە."
نالبەند دەستیان لە کار هەڵگرتبوو و وایان سەیری دەروێش بەگ دەکرد دەتگوت لە کابرایەکی نامۆ دەڕوانن.
"تا دەگەڕێمەوە، نالی بکە."
بە لۆقە درێژ و باریکەکانییەوە بەرەو ئەو لایەی بازاڕەکە ڕۆیشت کە لەوێوە هاتبوو. دووکاندارەکان و هەموو ئەوانەی لە قاوەخانەدا بوون، ڕژانە دەرێ و سەیری دەروێش بەگیان دەکرد، کە بە نێوەڕاستی بازاڕەکەدا دەڕۆیشت.
دەنگی چەکوچەکان تنۆك تنۆك دەتکایە سەر گەرما حەپەساوەکەی بازاڕەکەوە. مێروولەکان لە قەدی ئەو دارەوە کە ئەسپەکانیان لە بنیدا نالْ دەکرد، لە هاتوچۆدا بوون. قەدی پیرە دارە ئەستوورەکە، زەرد هەڵگەڕابوو. بە ملێۆنان چاوی تۆخ و درەوشاوە و بە ملیۆنان سەری بریقەداری وەك نووکە دەرزییەوە.
لەو کاتەدا مێروولە زەردەکان هەموو بازاڕەکەیان داگرت. جامخانەی دووکانەکان، ڕێگەوبان و دار و خانوو و کۆڵان و گۆڕەپانەکانیان داپۆشی. بنیادەم و ڕێگەکان هەموو زەرد زەرد بوون. ئاوەکان زەر زەرد بوون. بارانێکی وەك تیغ، بەلێزمە و زەردباو، دەباری.

# ٢٩

مستەفا بەگ گوتی:"یانی ئاوا، ئاوا بلەئیبۆ؟ رامەوەستە و دەست پێ بکە... لە لێواری ئاقچاسازدا، لە نێوەڕاستی لێڕەوارێکی ئەوەندە چڕدا کە ماریش نەتوانێ پێیدا بخوشێ، جێیەکی خۆشی وەك هێلانەیەك... ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنینەوە. کەلوپەلی پێوەیستیش ئامادەبکەن. هەموو بەیانییان، بەر لە تاوهەڵاتنێ، دەچینە ئەوێ و هەموو شەوێ لە تاریکاندا دەگەڕێینەوە."

بلەئیبۆ پرسیی:"لە کوێوە بێت باشترە؟ دیارە دەبێ لە شوێنێکەوە بێ، کە دەروێش بەگ زیاتر بەوێدا تێدەپەڕێ؟"

"جێیەك نییە ئەو زۆربەی جاران بەوێدا رابرێ. ئەو بە هەموو جێیەکدا تێدەپەڕێ. ئێمە لە شوێنێك بۆسە دادەنێین و چاوەڕێی دەبین هەتا رۆژێکیان بە رێکەوت، رێی بکەوێتە ئەوێ."

بلەئیبۆ گوتی:"راستە. هیچی دیکەمان لە دەست نایە. هەقتە."

"ئەسپەکان ئامادە بکەن."

حەمدی وەڵامی دایەوە:"ئەسپ ئامادەن."

بەگ پرسی:"ئەی وەلی شەماڵ سۆراغێکی نییە؟"

حەمدی وەڵامی دایەوە:"بەیانی دێتەوە."

ئاق یۆللی" گوتی:"با بێتەوە. بەشکم خەبەری خۆشی پێ بێ."

حەمدی گوتی:"بێ ئۆقرە و زراو تۆقیوە. سەیر ترسی رێنیشتووە. ئارا و قارای نییە. لە هیچ کوێ تۆتکە ناگرێ. شوێنێکی جارێکی لێ نوستبێ، ئیتر لەوێ ناخەوێتەوە. پێم وانییە ئەو بتوانێ هیچمان بۆ بکا. دوای ئەوەی وسێنی دیتووە کوژراوە، مێشکی شڵەقاوە. خوا

دەزانیێ، بەشکم نەشڵەقابێتیش. خۆی دەیگوت مەرگ وەك سێبەر بەدوومەوەیە. مەرگ سەری لە دووی ناوە و بەو چوکووراوایەدا راوی دەنیێ. ئەمرۆ لە ئایاس قەڵایە و بەیانی لە چیچکلی دەرە... لە دەریاوە هەتا تۆرووس، لە تۆرووسەوە هەتا دەریا."

مستەفا بەگ نێوچاوانی تێك نا و گوتی:"قەیناکا. ئەگەر ئێمە دەروێش بگرین، ئیتر ترسەکەی ئەویش دەڕەوێتەوە."

حەمدیش بە شڵەژاوییەوە دووپاتەی کردەوە:"دەڕەوێتەوە."

قەرەقیزخاتوون تۆزێك لەولاترەوە راوەستابوو و سەیری دەکردن. کە لە پلیکانەکان چوونە خواریێ هەر دوو دەستی هەڵبڕی و دەستی کرد بە نزا و پاڕانەوە و ملی کێشا. ئەوجار گەڕایەوە شوێنەکەی هەموو رۆژێی لە تەنیشت کۆڵەکەکەی بەرهەیوانەکە و پاڵی بەوێوە دا و ملی کێشا و لە جێی خۆی راوەستا. هەرلەویێ مایەوە هەتا پیاوەکان لێی سواری ئەسپ بوون و وەڕیێ کەوتن و لەگەڵ تاریکایی لێڕەکەی ئاقچاسازدا تێکەڵاو بوون و لە گژ و گیا و دەوەنەکەدا لەچاوان ون بوون. قسەی لەگەڵ کەس نەکرد و سەیری دەوروپشتی خۆی نەکرد. دەمەدەمی ئێوارە بوو کە قەرەقیزخاتوون لە جێی خۆی دەرپەڕی، پشتی قیت کردەوە و دیسان وەك پێشوو راوەستایەوە و پاڵی بە کۆڵەکەوە دایەوە. دەروێش بە پێدەشتەکەی رووبەڕوویدا، بە سواری ئەسپێکی شەودێز، کە لە دوورەوە دەدرەوشایەوە و بریقەی دەدا، بە لای دار سنۆبەرەکاندا تێدەپەڕی. رکێف و هەوسارە زیوکفتەکەی قەرپۆزی زینی ئەسپەکەی دەبریسکانەوە. فیلینتاکەشی بلێی و نەلێی هەڵدەبەزییەوە.

قەرەقیزخاتوون نووزایەوە:"ئاخ، ئاخ، بەر لە مردنم، ئاخر و ئاقیبەت و چارەنووست دەبینم. دەروێشی کافر؟"

دیسان دەستی کردەوە بە نزا و پاڕانەوە. خوا بکا هەر ئێستا تووشی بن و مستەفا توند توند بیگریێ و هەر گرتیشی دەڵیێ جا وەرە دەروێش با پێستی سەرت هەڵقەنم. خوا بکا، خوا بکا. هەر ئێستا تووشی یەك بن. دەروێش بەتەنێیە و کوڕەکانی ئێمەش چوارن. جا کوڕەکانی ئێمە لە بۆسەدان. هەر بیەویێ دەستی بجووڵێنیێ، وەرە دەروێش، وەرە چیت لێم گەرەکە پێم بێژە... فەرموو چیت دەویێ. جا ئەو کاکۆڵە رەشەی لە دەستم دەئالێنم... بای دەدەم، بای دەدەم... دەروێش بەسەر ئەو خاکەدا رادەکێشم... لەوانەیە قەوەشم پێی نەشکیێ کە بەسەر عەرزەکەیدا راکێشم. مستەفام قژی لە دەستی دەئالێنیێ. مستەفام، رۆڵەم مستەفا ئەوە دیێ. خەریکە دیێ. بەرەو لات دیێ. بیگرە. بیگرە. لە ئەسپ و رکێفی بدە. ئەسپەکەت تاو بدە و

بەسەر ئەو عەرزەدا ئەوەندەی راکێشە هەتا لەتوپەت دەبێ. هەر پنتکێکی بە سەر چلێکەوە دەبێ.

مستەفا بەگ گوتی:"ئێرە چۆنە؟ پێم وایە جێیەکی باش بێ. ئەوەش رێیەکە. لێم سوورە رۆژێك بەوێدا تێدەپەڕێ. هەتا تێشنەپەڕێ، هەر رادەوەستم. مانگێك، سالێك، چەندی بخایەنێ."

حەمدی گوتی:"چەندی بخایەنێ... باشە. لەوە باشتر نابێ. رادەوەستین و ئاخرییەکەی رۆژێك هەر دەیگرین. لە گابەردەکانی ئاناوەرزادا لە بەر قرچەی تاوەکە و لە نێو ئەو مار و مێروانەدا وشکی دەکەینەوە."

مستەفا بەگ گرماندی:"ئەوەمان زۆر بیستووە حەمدی. شتێکی تازە بدۆزەوە." حەمدی وەلامی دایەوە:"دەدۆزمەوە بەگ. دیارە هەر دەبێ بدۆزمەوە. لە پێشدا جێیەکەمان با بدۆزینەوە، دوایی... جا بزانە شتی چۆن دەدۆزمەوە. چی و چۆن، ئەو..."

لە نەکاو بە شلەژاوییەوە گوڕاندی:

"بڕوانە، بڕوانە، بەگ، ئەوەتا بێرەدا تێپەڕی."

هەر چواریان هەوساری ئەسپەکانیان کێشا و بێجوولە راوەستان و چاویان بڕییە ئەو سوارەی تۆزێك بەولاتردا دەشتەکەی دەبڕی. سوارە، کە زین و تفەنگەکەی لە دەشتە پڕ لە گولەکەدا و لە بەر تاوەکە دەدرەوشایەوە و کەفەلی ئەسپەکەشی بریقەی دەهات، بە لینگدان بەرەو خوارووی رووبارەکەی جەیهان داگەڕابوو. مستەفا بەگ دوای ونبوونی سوارەکە، مێشەیەکی بچووکی نیشان دان، کە لە نێو دەشتەکەدا وەك دوورگەیەك رەش دەچۆوە و گوتی:"ئەوێ لە هەموو جێیەك باشترە. ئا لەوێ چاوەڕێی دەبین. ئەگەر رێی بکەوێتە ئەولایە، تەواوە."

لە قەراغ مێشە دوورگەئاساکە دابەزین و ئەسپەکانیان بەستەوە و چوونە نێو دارەکانەوە.

"بلەئیبۆ"؟

"فەرموو بەگم."

"بچۆوە مالێ. تەور و داس و تەورداسەکە هەلگرە و بیانهێنە، دەبێ لێرە کەپرێك ساز بکەین. لباد و بالیفیش بێنە ها.... کەلوپەلی قاوەخواردنەوەشت لەبیر نەچێ. بە گشتی هەرچی لێرە پێویستیمان پێی دەبێ بێنە."

"باشە بەگ. هەتا سبەی هەموو شتێك ئامادە دەکرێ."

حەمدی گوتی:"دێتەوە."

بلەئیبۆ:"جا چۆن هاتنەوەیەکیش."

دەتگوت یەك بە یەك وشەکانی لە زاریدا دەمژیێ.

لە مێشەکە دوور کەوتنەوە و وەڕێ کەوتن. بەگ لە پێشەوەیان، بلەئیبۆ لە پشتەوەی و مەستان لە پشت سەری بلەوە. حەمدی وەدوا کەوتبوو. هەزار جۆر فکر و خەیاڵ لە مێشکی حەمدیدا دەسووڕانەوە. ئەوانی پێشەوە جار بە جار لێی دوورتر دەکەوتنەوە. حەمدی هەر هۆشی بەلایانەوە نەبوو..."

خۆرەکە لە تەپڵی سەریانی دەدا. زیکەزیك و وزە وزی سیسرکە و مێش و مەگەز و زەردەواڵە تێکەڵ دەبوون و وەك لوورەیەکی دوورودرێژی لێ دەهات.

حەمدی لە نەکاو گەشایەوە. سەری هەڵێنا و روانیی. ئەوانی دی دوور کەوتبوونەوە و رۆیشتبوون. لەخۆوە هاواری کرد:"دۆزیمەوە، دۆزیمەوە، دۆزیمەوە، بەگ."

ئەسپەکەی تاو دا و بە غار لێی خوڕی. بە دەم غاری چوارناڵەی ئەسپەکەیەوە ئەویش پەیتا پەیتا دەینەڕاند:" دۆزیمەوە، دۆزیمەوە."

مستەفا بەگ هەوسارەکەی راکێشا و بە ساردی پرسی:"چیت دۆزییەوە؟"

"دۆزیمەوە بەگ. ئاخرییەکەی دۆزیمەوە."

"گوتم چیت دۆزییەوە؟"

"سەیرکە، کابرایەك هەیە لە بەندیخانە بە ناوی بەکرە رەش."

"دەی؟"

شان بە شانی یەکتری دەڕۆیشتن.

"ئەوە بەکرە رەشە گەنجێکی بیست ساڵانەی کوشتووە. دەزانی چۆن؟"

"چۆنی کوشتووە؟"

"ئیتر هەر لەوەی مەپرسە بەگ. هیچ مەپرسە. پێم سەیرە نازانم بۆ لەو ماوەیەدا بەکرە رەشم هەر لەبیر نەبووە. زۆر سەرنجڕاکێشە زۆر. ئەگەر هەموو ئەو وڵاتە سەنگ و سووژن بدەی، ئێران و توووران و تەنانەت ئینگلیز و ئەلمانیاش بگەڕێی، کەسێك نادۆزیتەوە یەکێکی بەو دەردە کوشتبێ و تەنانەت ئەقڵی بە شتی وا شکابێ. کاتێ قەرەبەکریان هێنا، ئەمن سێ ساڵ بوو لە بەندیخانە بووم. کابرایەکی بۆری باریکەڵەی چاوڕەش. کە لە دەرگای زیندانەکە وەژوور کەوت، راست چوو لە گۆشەیەك دانیشت. دوای ئەوەی هەمووان هاتن و بەخێرهاتنیان کرد. بەکرە رەش گوتی برادەرینە زۆر ماندووم. بەڵام دەبێ سەربردەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە و لە بنی

کوولەکەی بدەم. گوتی: لە دارم دەدەن، دەی با بمدەن. هیچ تاوانێکم نییە، بەڵام ئەگەر لە داریشم بدەن با بیدەن چیە. چما بە پەتەوەکران شوورەییە؟ لەوانەیە نەشمکوژن. بە گشتی گرنگ نییە. بەکرە رەش ئەو رۆژە هەتا نیوەشەوێ موو بە موو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ ئێمە گێڕایەوە. بەیانی زوو هەر لەخەو هەستا و دەستی کردەوە بە گێڕانەوەی ئەو سەربردەیە. مانگێکی پێ چوو بەکرە رەش هەموو رۆژێ و هەر کاتێك دەرفەتێکی بۆ رەخسابایە، هەر ئەو بەسەرهاتەی خۆی دەگێڕایەوە. ساڵێك پێ چوو. هەرچی پێی دەنایە زیندانەکەوە، یان هەرکەسێکی بۆ هەڵکەوتبایە، ئەو بەسەرهاتەی موو بە موو بۆ دەگێڕایەوە. بەکرە رەش لە هەر کەس نزیك دەبۆوە، کابرا رای دەکرد و هاواری لێ هەڵدەستا و دەیگوت کوڕە دە بیبڕێنەوە، بەکرە رەش لە گیانی خۆمت وەڕەز کردم. بەکرە رەش ئاخرییەکەی "لوتفی"ی بۆ هەڵکەوت.

مستەفا بەگ لە بن لێوانەوە گرماندی:"دەی جا؟"

"هەموو رۆژێ لیرەیەکی دەدایە لوتفی و لە چیرۆکەکەی خۆی لە سەرڕاوە بۆ دەگێڕایەوە. هەرکەس بۆ یەکەمجار دەهێنرایە زیندان، بەکرە رەش دەمودەست نێوانی لەگەڵ خۆش دەکرد و دەسبەجێ دەستی کرد بە گێڕانەویە چیرۆکەکەی خۆی. هەموو بەندییەك بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە بەگ. بەندییەکان زۆر شتیان لە بەسەرهاتەکانی خۆیان زیاد دەکرد و زۆریان پێوە دەنا. بەڵام لەو نێوەدا بەکر شتێکی دیکە بوو. ئەو بەبێ هیچ کەم وکورتییەك چیرۆکەکەی خۆی دەگێڕایەوە. ئەو چیرۆکەکەی خۆی ئەوەندە ورد و جوان دەگێڕایەوە، دەتگوت چۆنی بووە و ژیاوە لەو رۆژەدا ئاوا دەژیێ. لە کوێ ئارەقەی کردبوو، ئارەقەی دەکردەوە. لەکوێ پێکەنیبوو، پێدەکەنییەوە و دەترسا و جنێوی دەدا و چاوەکانی دەبریسکانەوە و لە کوێ توورە ببوو، وا بە توورەییەوە دەیگێڕایەوە دەتگوت ئێستا شێت دەبێ. هیچ کام لە گێڕانەوەکانیشی هێندەی سەرە دەرزییەك لەوی پێشوو جیاواز نەبوو."

مستەفا بەگ چەند جارێکی حەمدی رادەوەستا، دەیگوت:"دەی، دوایی؟"

"دوایی، دوایی، عەرزت بکەم ئەو بەکرە گەلێك ملوانکەی جوان جوانی لە دار و توێکڵ و ناوکی میوە دروست دەکرد. و تەزبێحی زۆر جوان و ناسکی..."

"دەی دوایی؟"

"هیچ نەدەنوست. بەردەوام لە بن لێوانەوە دەیبۆڵاند و پیاسەی دەکرد."

"دەی دواتر..."

"عەرزی ئاغای خۆمی بکەم، ژنەکەی بەکرە رەش چەند مانگ پاش گیرانەکەی ئەو، تەلاقی لێ وەرگرت و مێردی بە کوڕە مامێکی حەسەن کرد. بەکرە رەش ئیتر شێت بوو."

"دەی دوایی...."

کە بەکرە دەچێتەوە ماڵێ، ژنەکەی، هەموو شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە چۆنی رویان داوە ئاوا: گوتبووی:"ئەمن لە شیوەکەدا جلوبەرگم دەشوشت. هەموو جلەکانم شوشتن و هەر ویستم بەسەر لك و پۆپەکانیاندا بدەم، دەنگێك لە پشتەوەم هات. کە ئاوڕم دایەوە، بریسکەی خەنجەرەکەی حەسەن لە چاومی دا. راوەستابوو و بە چاوی دەرپەڕیو و پڕ لە شەهوەتەوە سەیری دەکردم. سەیری دەکردم و بزەی دەهاتێ. دەتگوت مارێکە و سیحری لە چۆلەکەیەك کردووە. وای سەیر دەکردم، دەتگوت بە ساغی قووتم دەدا. قەڵەمی دەست و پێیانم شکابوو. وەك گورگێکی برسی پەلاماری دام. تا ویستم بجووڵێمەوە، گرتمی. چارم نەبوو. کە گرتمی، هێشتا نیوەڕۆ نەببوو. ئیتر هەتا نیوەشەوێ بەیدەستی کردم و ئاوا بێ ئابڕووی کردم. بەکرە ئیتر خۆی پێ نەگیرا و هاوارەکەی لە قوڕگیدا قەتیس ما. ئیتر بەسە بیبڕێنەوە ژنەکە. بێدەنگ بە. بێدەنگ بە. بەسە. هیچی دیکەی نەدەگوت. هەر ئەوەندەی لەزمانی دەهاتە دەرێ، ژنەکە بێدەنگ بە، بیبڕێنەوە. زارت داخە.... ژنە گەنج و بەکرەش بەتەمەن بوو. بەکرە مێشکی دەکوڵی و بەر چاوی رەش ببوون. قۆڵی هەڵماڵی و دەمانچەیەکی پەیدا کرد. دەمانچەیەکی باریك و درێژ و نوێ نوێ، کەسك دەچۆوە. دوای ئەوەی ئیتر رۆژ هەتا ئێوارێ هیچی نەدەکرد، هەر دادەنیشت و دەمانچەکەی چەور دەکرد و بریقەداری دەکرد و لە حەسەن دەگەڕا. هەموو جێیەکی لێ دەگەڕا، سەرانسەری ئاوەدانی، کێڵگەکەکان و چیا و بەندەنەکان، لێرەوار و ئاودڕ و خانوو و شوێنە چۆڵەکان. سەری بە هەموو کونێکدا دەکرد و حەسەنی نەدەدۆزییەوە. هەموو خەڵکی ئاوایی بەو شتەیان زانیبۆوە. نە ژنە هیچی گوتبوو، نە حەسەن و نە بەکرە رەشیش. خەڵکی گوندەکە زۆر لەمێژبوو ئاگایان لە پەیوەندییە ناشەرعییەکەی حەسەن و ژنەکەی بەکرە هەبوو. ئاخرین رۆژیش کە پێن شەش منداڵ خەریکی پەپوولە گرتنێ بوون بەسەر حەسەن و ژنەدا دەچن دەچن کە لە نێو دەوەنەکاندا خەریکی یەکتری هەڵگلۆفین و ماچ و مووچان بوون و ژنە چیی نەمابوو لە ترسان زراوی بچێ. بڵێی و نەڵێی ئەوە دەگاتەوە گوێی بەکر. بەکر دان بەخۆداگر بوو. لە وەشوێنکەوتنی حەسەن ماندوو نەدەبوو. کار و باری وەلاوە نابوو و وەك خەوگەڕان شەو و رۆژ دەگەڕا. بەبێ هیچ خەوتن و پشوودانێك. بەڵام حەسەن ون ببوو. لە گوندەکە رای کردبوو. رۆژێکیان بارانێکی زۆر باری. خۆرە سوور و تەماوییەکە دەتگوت لەسەر چیا پاڵ

کەوتووە. بارانەکە وەك بەرد، وەك گۆزەی سەروبن یەك جێ دای کردبوو. قورس وەك گلێرە و تەرزە. بەکرە رەش پشتی وەك قەمچیی وێکەوتبێ دەیزریکاند. نێو گابەردەکان وا دەبریسکایەوە، دەتگوت وردە شووشەیان بە نێو بەردەکان وەرکردووە. سوور و زۆربەشیان ئەرخەوانی، تۆزێك زەرد، تۆخ... هەموو جێیەك و بەهەر لایەکدا دەچووی بەردەڵێن بوو. بەکرە رەش گوتی:"راوەستە حەسەن."

جا حەسەن راوەستا. چاوەکانی زەق زەق لە ژێڵڵا هاتن. لەوێ، لە تەنیشت بەردەکە، رەنگ بزڕکاو و دەست و پێ لەرزۆك لە سەر جێی خۆی وشك بوو. حەپەسابوو و چاوی لە لوولەی دەمانچەکەی بەکر بڕیبوو. بەکری چیتر دەستی نەلەرزی. حەسەن لەوکاتەدا پێی وابوو بەکر تەقەی لێ دەکا. بەکریش هەر پێی وابوو، بەڵام بەکر پەنجەی بە پەلەپیتکەدا نەهێنا. حەسەن پتر ترسا. سەری لەگێژەوە هات و دڵی تێکەڵ هات. بەکرە رەش چاوەکانی قووچاند بۆ ئەوەی پەلەپیتکەی بترازێنێ. بەڵام دیسان نەیترازاند. کە چاوی هەڵێنا، چاوی پڕ لە پاڕانەوە و دەستە شۆڕبۆوەکانی حەسەنی دی. دەتگوت شووشەیەکی تەڵخن. بەکرە رەش دیسانیش نەیتوانی پەلەپیتکەی بترازێنێ. حەسەن وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو. چاوەکانیشی جار بە جار زەقتر دەبوونەوە. دوایی لە نەکاو دەتگوت خوێنی لە روخساری گەڕاوە. روخساری حەسەن سوور سوور بۆوە و دیسان وا بزڕکایەوە هەر دەتگوت خوێنی لەبەردا نەماوە. دەمێ سوور دەبۆوە و چاوەکانی دەدرەوشانەوە و دەمێ خوێنی گیانی وشك دەبوو و سپی سپی هەڵدەگەڕا. بەکر دەنگێکی نیوەزیندووی بیست. مەمکوژە. ئەو دەنگە بەکری تووشی سەرسووڕمان کرد. دەنگەکە لە زاری حەسەنەوە نەدەهات، بەڵام لە جێیەکەوە دەهات. دەنگەکە جار بە جار دەبووژایەوە و بەرزتر دەبۆوە. مەمکوژە، مەمکوژە، مەمکوژە... بەکر سەیری کرد و دیتی حەسەن گەش بووەتەوە و رەنگی گۆڕاوە و وەخۆ هاتووەتەوە و وەك بنیادەمێکی لێ هاتۆتەوە کە بەکەیف و بەختیار بەڕێدا دەڕوات. بەکر وەخۆ هاتەوە و دەسکی دەمانچەکەی توند لە دەستیدا گوشی و رووی تێ کرد. چاوەکانی لە نەکاو بەست و کردنییەوە و دیتی حەسەن رەنگی بە رووەوە نەماوە... خێرا خێرا چاوی دەترووکێنێ و تەواو سەری سووڕ ماوە. وەك مردووان. دەنگێکی سامناك لە رەوەزەکان و شیو و دۆڵ و دارستانەکە گەڕا. دەنگەکە درێژ بۆوە. مکوژە، مکوژە، مکوژە. دەنگەکە لە زاری حەسەنەوە نەدەهاتە دەرێ.

مستەفا بەگ گوتی:"دەی، دواتر؟"

"عەرزی ئاغای خۆم بکەم بەکرە رەش..."

مستەفا بەگ قسەکەی پێ بڕی:"باشە، باشە، زۆر باشە. ئەوە جۆرە کوشتنێکی زۆر کۆنە. بەڵام دەی باشە... ئەڵمانییەکانیش بەو جۆرە ئەو دوژمنانەیان دەکوشتن، کە زۆریان لێ داخدار بوون. دەی باشە، باشە."

حەمدی لەخۆباییانە گوتی:"زۆر باشە. هەموو زیندانییەکان رقیان لە بەکرە رەش بوو و لێی بێزار بوون. هەر گەرچی تاوانی نیوەی زیاتری بەندییەکان پیاوکوشتن بوو، بەڵام رقیان لەو کارە بوو وا ئەو کردبووی. کار گەیبووە جێیەك کە ئیتر کەس نەیدەدواند..."

مستەفا ئاق یۆللی" دیسان قسەکەی پێ بڕی:"ئەلمانییەکان لوولەی دەمانچەکەیان لە سەر شەویلکەی ئەو دوژمنە دادەنا کە دەیانویست زەجرکوژی بکەن و سەعاتێك، دوو سەعات، سێ سەعات و جاری وابوو رۆژێك و دوو رۆژ هەر وا رایاندەگرت. کابرای داماو خۆی رانەدەگرت و دڵی دەتۆقی. لە رۆژنامەدا نووسرابوو."

حەمدی پرسی:"بەڵام دەروێش بەگ ئاوا سووك و سادە گیانی دەرناچێ. چوارپەلی قایمە وا نییە؟"

مستەفا بەگ وەڵامی دایەوە:"ئیشەڵڵا، ئێشەڵڵا گیانی زوو دەرناچێ. ئەوە شێوەیەکی باشە. زۆر باشە. ئیشەڵڵا حەوتووەك، پانزە رۆژ خۆ رادەگرێ و زوو لێ ناکەوێ. بیری لێ بکەوە. لوولەی دەمانچە لەسەر شەویلاگەی... جار جار ئارەقە دەکات و جار جاریش سڕ دەبێ و چەقوچۆی دێتێ..."

حەمدی:"بژی ئەلمانی. ئەلمانی لە بەکرە رەشیش توندترن."

بلەئیبۆ گوتی:"ئەلمانی برای ئێمەن. هاوپەیمانمانن. هاوپەیمانمان. ئەلمانی خەروارێك ئەقڵ و ئاوەزی هەیە."

حەمدی:"ئەڵمانی دۆستمانە. ئاخ، ئەی خۆزگە پێشەوا گەورەکەیان وا زوو لە دەست نەچووبا."

بلەئیبۆ:"دوژمنان چاویان بە ئازایەتییەکانی هەڵنەدەهات و ناپاك و خیانەتکارەکان کوشتیان. خەڵکێکی ئازا و دڵپاك و سادەن. دوژمنان بە دەهۆیان برد. کە هیتلەر مرد، سینگیان لێك کردەوە، کە سەیریان کرد لە بری دڵێك چوار دڵی تێدایە. چوار دڵ لە جێیەکدا."

حەمدی نوقمی خەیاڵاتی بێ سنووری خۆی و بە تۆزە لەخۆباییبوونێکەوە گوتی:"لە یەك جێدا. ئاخری دۆزیمەوە. هەر کەس بگەڕێ پێ دەگا. میشکت بخە ئیش، با بیدۆزیتەوە و پێی بگەیت. ئەقڵی ئێمە ئەقڵی ئەلمانییە."

لەو دەمەیدا کە مستەفا بەگ لە پێشەوە وبلە و حەمدی و مەستان لە دواوەی بەر لە کازیوە بەرەو کەپرەکەیان دەڕۆیشتن، قەرەقیزخاتوون خۆی بە کۆڵەکەی هەیوانەکەوە نووساندبوو و دەپاڕایەوە بەشکم ئەوجارەیان کوڕەکەی شانسی بێنێ و دەستی بە دوژمنەکەی رابگا. نزا و پاڕانەوە لە ناخی دڵەوە. کارەکانی بەکرە رەش و ئەڵمانییەکانیان بۆ ئەویش گێڕابۆوە و قەرەقیز خاتوون گوتبووی:"ئەوە باشترە. لەوە باشتر نابێ. هیچ مەرگێك بۆ ئەو لەوە شیاوتر نییە. ئیشەڵڵا سێ رۆژ دواتر بە مردوویی لەبەر پێی مستەفامدا دەکەوێ."

جا بە نەرمە بزەیەکەوە ئەوەشی لە قسەکەی زیاد کردبوو:"ئەو خۆ رادەگرێ. ئەو خۆ رادەگرێ. ساری ئۆغڵییەکان وەك سەگ حەوت گیانیان هەیە. خۆ رادەگرێ. ئەو خۆ رادەگرێ."

پاڵی بە کۆڵەکەکەوە دابوو و چاوی لە ئاقچاساز بڕیبوو و تا ئێوارێ هەر وا راوەستا. لە نەکاو دەنگێکی وەك زریکە لە قوڕگی هەستا. لە دوور دوورەوە سوارێك بەرەو ئاناوەرزا بە لینگدان دەڕۆیشت.

قەرەقیزخاتوون توند دەستی لێك دا و قیژاندی:"ئەوە دەڕوات، دەڕوات، دەڕوات، دەڕوات. و راستە و رێ بەرەو مستەفای من دەڕوات. بیگرە، بیگرە، بیگرە...

دەمانچەکەتی لەسەر شەویلاگەی دابنێ و دەست راگرە و پەلەی مەکە. پەلەی مەکە. نەکا لێت تێك بچێ و پەلەپیتکەی بترازێنی، مەیکوژە، مەیکوژە..."

## ٣٠

لەوێ، لە تەنیشت کۆڵەکەکە و لە بەر قرچەی تاوەکە، لە سەر چرپایەك کە تەختەکانی قەڵشیبوون و لە لای ئەو گوڵە مەخمەرییە تۆزاوییە لە سندووقێکی چێویندا نێژرابوو و باداك و قەوزە بەسەرییەوە وشك ببوونەوە، کرووشمەی کردبوو. لە پشت سەرییەوە، لە دەرگا کراوەکەی کۆشکەکەوە، وێنەیەکی گەورەی مێردەکەی دیار بوو کە لە چوارچێوەیەکی زێڕین گیرابوو و بە دیوارەوە کرابوو. مێردەکەی دەموچاوێکی گرژ و مۆنی هەبوو. سمێڵ بابڕ و چاو گەورە و برۆکانی تێکەڵ ببوونەوە. هەر بە ئانقەست خۆی دەبوارد لەوەیکە ئاوڕێك بداتەوە و سەیرێکی پشتەوەی خۆی بکات. لە خۆیدا گرمۆڵە ببوو و دەتگوت وەنەوز دەدات. ژنە خزمەتکارەکان و بووکەکانی و منداڵ و میوانان هەر هەموویان بۆ ئەوەی خەوەکەی لێ تێك نەدەن، بەسپایی و بە نووکی پەنجەیان و بە سرکییەکی پیرۆزەوە بەلایدا تێدەپەڕین. بە دەستە رەقەڵە و پڕ لە گرێیەکانی کە رەشایی دەمارە هەستاوەکانی لە بن پێستە چرچ و لۆچە و پڕ لە پەڵەکەیەوە بزر دەبوو، دەستی بە پەرژینی پلیکانەی دیوەخانەکەوە گرتبوو و چاوی بڕیبووە خاڵێکی سەرووی زۆنگاوەکەی ئاقچاسازەوە. شەویلگە توند و قایمەکەی، لێوە بەسەریەکدا تەپیوە لەرزۆکەکانی و پێستە سپییە چرچ و لۆچەکەی و بەرخەبەبەی، کە دەتگوت لێکراوەتەوە و شۆڕ بووەتەوە و کەوتووەتە سەر یەك... روخساریشی بزرکاو و رەش وەك قورم، گەردەنە سپییەکەی و دەمارە کەسکەکانی دەرکەوتبوون، پەنجە درێژ و چەماوە و بێ گیانەکانی زەرد زەرد... جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند. هەر جارێکیش قوتووە زێڕە جگەرەکەی بە هێمنی لە لوێی پشتێندەکەی دەهێنایە دەرێ و دەیکردەوە و بە سەر دووپەنجە درێژەکەی جگەرەکەی بە جوانی هەڵدەگرت و بە دەستە لەرزۆکەی دەیخستە نێوان لێوە لەچڵەکانییەوە* و جا ئەوجار پووشووی دەخستە نێوان

---

*لەچڵ: پارچەگۆشتێکی زیندووی بریندار کە خۆی هەڵداوێ دەڵێن چڵ دەدا. هێمن موکریانی دەفەرموێ:"

بولبولی باڵ شکاوی وەختی گوڵم ......... هەر شەپۆلان دەدا دڵی لە چڵم

بەردەئەستێ و چەخماخەی لێ دەدا بۆ ئەوەی پووشووی داگیرسێنێ. جگەرەکەی کە لەو ماوەیەدا تەڕ ببوو، فڕێ دەدا و جگەرەیەکی دیکەی دەخستە نێوان لێوەکانییەوە و هەڵی دەکرد و مژێکی لەو دووکەڵە شینباوەی بەرەڵڵا دەکرد، کە بەرە تیشکی تاوەکە وەك زیوی لێ هاتبوو. هەر وا کە جگەرەی دەکێشا، لاقی راستەی لە خستبووە بن خۆی و دانیشتبوو و هەر دەتگوت خۆی بەو گەرمایەوە بەو گەرمایەوە کە بریسکە بریسکی دەهات و ئەوسەری دیار نەبوو و دەتگوت دووکەڵە، نووساندووە و لە حاڵێکدا خۆی رادەژەند، گوێی دابووە سەردولکەیەك کە دیار نەبوو لە کوێوە دێ... سەردولکەیەکی نەرم و درێژ بوو کە بە حاستەم دەبیسرا. لەو کاتەدا ئاگری بن سوتووەکە، کە لە بەر تیشکی خۆرەکەدا نەبەدی و بزر ببوو، پەنجەکانی دەسووتاند.

چاوەکانی بڕیوەتە سەرووی قامیشەڵانەکە و لە حاڵێکدا ئەسپە کوێتی سوارچاکەکان وەك پەڵە دەشتەکەیان داگرتووە و وەك باڵندە باڵ رادەوەشێنن...

سەرەنگرێ بوونی پەیتا پەیتای سوارەکان و بە لینگدانیان بەرەو ئەو لێڕەوارەی وەك دوورگەیەك بە قەراغی ئاقچاسازەوە رەش دەچێتەوە... هەڵتۆقین و کوڵینی دەورووپشت لە بەر تەقینەوەی فیشەکان و لەرزینەوەی گەرما و هالاوی بەمۆڵەق وەستاو، فڕینی قەرەقیزخاتوون بەرەو دەشتەکە و شێتبوونی لە بێ سەبری و چاوەڕوانیی و بێهیوایی و بەچۆکداهاتنەکەی، شادبوونی و لەخۆشییان فڕینەکەی و وەڕێکەوتنی بەرەو لێڕەوارە رەشەکە. شێدار و فێنك بە تێپەڕینی بە نێوان ئەسپە پەرش و بلاوەکاندا و بە نێوان گەرما و رووناکاییە بەئازارەکەدا... ئامبازبوونی سوارەکان لە لێڕەکەوە بە چاوی لەژێڵڵاهاتۆوە بەهۆی چاوەڕوانی کێشانی زۆرەوە، بەو چاوانەوە کە لە چاوەکانی شەهێنێك دەچن بەسەر تفەنگێکەوە چەقێنرابێن و خەنجەرە درێژەکەی لە کالان دەرکێشاوە...

"رابن کوڕینە، رابن توتکە سەگینە، بەسیەتی پرخەپرخ و خۆ گنخاندن.. رابن دەی هەستن... هەستن دەی هەستن. هەستن ئەوە دڵی ساری ئۆغڵی دێ. دێ، لە حاڵێکدا کە هێشتا گەرم گەرمە و لە نێو لەپی مستەفای مندا توند توند چڵ دەدا و وەك شێتان هەڵداوێ. رابن مرۆڤینە، هەستن ئەی ئۆمەتی محەمەد، هەستن. سەری ساری ئۆغڵی دێ... دێ و بە پاڕانەوە و لە حاڵێکدا فرمێسکی چاوەکانی تێکەڵی خوێنی ملە بڕاوەکەی دەبن. هەستن ئەی میللەت، رابن."

وەك هیوایەك، تووڕەییەك، لەوێ لە تەنیشت رەیحانە گوڵ مۆرە تۆزاوییەكانی نێو ئەو سندووقانەی لە پەنای گوڵە مەخمەرە تەنیاكەی نێو دیوەخانەكە ریزكرابوون، وشك هەڵاتبوو. وەك وێنەیەكی هەڵگێڕدراوە، بە گەرماكەوە نووسابوو. بێجووڵە و تەكان.

چیها شەو و رۆژان بەبێ خەوتن و چاولێك نانێك. بەبێ جووڵە وەك وێنەیەكی هەڵگێڕدراوەی سەر وێنەهەڵێكگرەوەیەك، چاوەڕوان و چاوەڕوانی چێشتوو، هەتا قیامەتێ لێرە گرمۆڵە دەبێ، دەپووكێتەوە وەك تاژییەكی پیر و لەڕ، نێوقەد باریك، دەموچاوی درێژ بووەتەوە و هەر چنگێك پێست و ئێسقان وەك تارمایی و خەیاڵێك و وەك وێنەیەكی بە گەرماكەوە نووسابێت یان لێی هەڵكەنرابێت، وەك وێنەیەكی وێنەهەڵگێڕەوەیەك.

"مورتەزا بەگیش یەكێكە

مورتەزا بەگیش یەكێكە

مورتەزا بەگیش یەكێكە."

دووكەڵی جگەرەكە نادیار، تیژتێپەڕ، چێژێكی دەست پێڕانەگەیشتوو، قاچی سڕبوو، دەست و لێو و سمت و سەر .... و هەموو گیانی. هەر باریك و باریكتر دەبۆوە و لە بەر گەرماكە هەڵدەچۆقی.

"لە كەولی پڵینگە زینی

لە كەولی پڵینگە زینی

لە كەولی پڵینگە زینی."

ئەوە چەند ساڵە دەگوترێتەوە؟ چەند هەزار ساڵە؟ بە خوێنیدا دەگەڕێ...

"بە دوژمنەوە دیم

نیوەی دڵی بچكۆڵەی

نیوەی دڵی بچكۆڵەی

نیوەی دڵی بچكۆڵەی."

بارانەكە ئەوەندە بەخوڕ دەباری، دوو هەنگاو پێش خۆتت نەدەدی. بارانەكە زەرد زەرد، وەگ قوڕاو. دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەكەی، چاوە داپڵیشاوەكانی، ددانە سپییەكانی لە نێو بارانە قوڕاوەكەدا. رووت و قووت لە بەر بارانەكە درێژیان كردبوو. جەستەی، دەستەكانی، لاقەكانی، دەموچاوە درێژووكەكەی. مردووەكە درێژ ببووەوە، دوو هێندەی درێژییەكەی خۆی.

کۆشکێك لەوبەرەوە، لە دوور و دوورتر... لە نێو بڵێسەکانی ئاگردا، ئەو بڵێسانەی جار بە جار پتر هەڵدەکشان. دیسان لێرە لە تەنیشت گوڵە مەخمەرییەکە دانیشتووە و دەستی بە پەرژینی دیوەخانەکەوە ناوە و لەگەڵ هەڵکشانی بڵێسەی گڕەکە و کۆڵەکەکردنی بەرەو ئاسمانێ، ئەویش هەڵدەکشا و گەورەتر و گەورەتر دەبۆوە.

بە دڵێکی خۆشەوە گوڕاندی:"بسووتێ."

لە جێی خۆی هەستا و بە سەماکردن بە دیوەخانێدا گەڕا:"بسووتێ، بسووتێ، بسووتێ و ببە خەڵووز."

خەرمان و کێڵگەکان سووتان و تا بناری ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا هەمووی بوو بە خەڵووز و خۆڵەمێش. سووتا.

"بسووتێ، بسووتێ."

مستەفا بەگ کەڕەی بەیانی هات. ئارەقەی شین و مۆری دەرکردبوو، شڵەژاو بە سەرودەموچاوێکی ڕەش و دووکەڵاوییەوە. دایك و کوڕ لووتیان بەیەکدا تەقی.* نە ئەمەیان هیچی پێ گوترا و نە ئەوی دیکەش توانیی شتێك لەمەیان بپرسێ. دوای ئەو هەمووە ڕووبەڕووی یەکتری ڕاوەستان و حەپەسانەیان، یەکتریان هەر نەدی.

چەند و ڕۆژ و لەوانەشە مانگێك دەبێ مستەفا بەگ بەردەوام بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە، لە جێوبانەکەی دێتە دەرێ و بەر لەوەی دەستودەموچاوی بشوات، بە هەشتاو خۆی دەگەیێنێتە دیوەخانێ و لە ترسی ئەوەی نەکا تووشی دایکی بێت، بەسپایی و بە سەری پەنجەی پێی، بەرەو پلیکانەکان دەچێت و هەر جارێکی دەیەوێ پێ بنێتە سەر پلیکانەکان، لە نەکاو سەر و سەکوتی دایکی پەیدا دەبێ. جا مستەفا بەگ تارماییەکەی دایکی دەبینێ و لە جێی خۆی پێی بە عەرزییەوە وشك دەبێ و دەحەپەسێ. قەرەقیزخاتوون چاوەڕێ دەبێ، مستەفا بەگ چاوەڕێ دەبێ و هەر دووکیان چاوەڕێ دەبن. یەکەمین تیریێژەکانی خۆر دەکەوێتە سەر گوڵە مەخمەرییەکە و پان دەبێتەوە. قەرەقیزخاتوون لە سەر جێیەکەی جارانی کرووشمەی کردووە و توند پەرژینەکەی گرتووە و دەمارەکانی دەستی هەستاون، مستەفا بەگ تێدەپەڕێ و بە نێوچاوان گرژی و بێزارییەوە بەسپایی لە پلیکانەکان دەچێتە خوارێ... سواری ئەسپەکەی دەبێ. مەستان و حەمدی و بلەئیبۆش بەدوویدا. مام حەسەن نایە. لە نێوەڕاستی حەوشەکە لە

---

* واتە: جۆرێك گەیشتنە یەکتری چی نەمابوو لووتیان وێك بکەوێ. تووشهاتنی لەنەکاو.

تەنیشت حەمە عەلییەوە رادەوەستیٚ و لە حالیٚکدا دەستی لە کەلەکەی ناوە و داهاتووەتەوە، لە پشتەوە سەیریان دەکا.

"چەند رۆژە، ئیبۆ؟ چەند رۆژە حەمدی؟ چەند رۆژە مەستان؟ لەو ماوەیەدا هیچ سوار و پیادەیەك بەوانەیدا رانەبرد؟ ئەی ئەو دەرویٚشەی هەموو رۆژیٚ بە ئەسپیٚکی کویٚت بە بەر دەرگای مالەکەمدا تیٚدەپەڕی چیی لیٚ هات؟ ها چیی لیٚهات؟ چیی لیٚ هات؟

ئیبۆ گوتی:"دیٚ."

حەمدی گوتی:"دیٚ."

مەستان گوتی:"دیٚ، بەگ. دیٚ. بلیٚی و نەلیٚی دیٚ. لە مالەکەیدا دانیشتووە و نایەتە دەریٚ. هەرچۆنیٚك بیٚ، ئاخرییەکەی، هەرنەبیٚ بۆ جاریٚکیش بیٚ بەم ریٚیەدا رادەبریٚ."

مستەفا بەگ هیچی نەدەبیست و بەردەوام دەیگوت:"ئەوە چەند رۆژە؟ بوو بە چەند رۆژ؟ بلیٚن بزانم بوو بە چەند رۆژ کوڕینە؟"

ئیبۆ:"دیٚ."

مەستان:"دیٚ، دیٚ."

حەمدی:"دیٚ."

"خۆ سالیٚکیشی پیٚ بچیٚ هەر رادەوەستین. ئەگەر پیٚنج سالیش بخایەنیٚ، هەر لیٚرە و ئاوا چاوەڕوان دەبین. ئاخرییەکەی هەر دیٚ. هەر دیٚ، دیٚ..."

چاوەکانی مەستان کە لە مەودای کیلۆمەتریٚکەوە چۆلەکەیەك دەبینیٚ، دەرویٚش بەگ دەبینیٚ. هەر لە مالەکەی وەدەرکەویٚ وەلی شەمالٚ وەك بای شەمالٚ هەوالەکەی دیٚنیٚ بۆ ئیٚرە بۆ دەشتیٚ و بۆ لیٚرەوارە تاریکەکە.

مەستان تەپۆ بە حەواوە نالٚ دەکا.

مەستان تفەنگ لە سەر دەست، لە پشت ئەو چلەگیایەی گولە ئەرخەوانییەکانی لەبەر تاوەکە پشکووتبوون، بە مۆدنەیەکەوە* کە هەرگیز داینەدەنا. فیٚلباز وەك پیرە ریٚوی. مستەفا بەگ، حەمدی و بلە لە ناوەوە و ئەسپە ئارەقەکردووەکان لە نیٚو قامیشەلانەکەدا. حەیزەرانە بەرزەکان، گولٚ پشکووتوو... مەیدانیٚکی کراوە لە نیٚوەڕاستی قامیشەلانەکە و سەماوەریٚك بە قولتەقولٚت لە سیٚبەرەکە و چاییەکی وەك خویٚنی کەرویٚشك سوور لە ئیستیکانە نیٚوقەد باریکەکاندا...

---

*مۆدنە: دار جگەرە

"مەستان، کەس لە دوورەوە دیار نییە؟"

"نەخێر بەگ."

"وەرە چایەکی بخۆوە."

"چایەکەم بۆ بێنە ئێرە ئیبۆ. بەشکم رێك لەو کاتەدا پەیدا بێ. ئەو هەمووەی چاوەڕوان بووین، نابێ لەبەر چایەك لە دەستمان دەرچێ."

"ئیبۆ ئەو چایە بەرە بۆ مەستان."

مەستان چۆکی دادا، تفەنگەکەی هەر وا لە باوەشیدا بوو. دەنگی قولتەقولتی سەماوەرەکە دەهات.

بریسکە لێلەکەی سەماوەرە برنجییەکە. گەرما خەست و چەورەکەی قامیشەڵانەکە... ئەو ئەسپانەی بە خرمەخرم گیایان دەخوارد و بە کلکیان مێشەکانیان لەخۆیان دەردەکرد...

چاوەڕێبوون ئەستەمە... هەر چاوەڕوان بە کە بەڵێ کابرا دێ. ئەوەندە چای بخۆرەوە هەتا زگت با دەکا و هەموو رۆژێ سەیری میزکردنی ئەسپەکان بکە... دژوارە و ئەستەمە ئەستەم. گەرما و ئارەقە چەور و لێچقەکە. شێیەك کە بچووکترین با، بۆن و تیشکێکی تێ ناچێ و نایبڕێ و داغ داغ و سووتێنەر و پڕە لە تەپۆ و مالاریا. کوڕە سەختە خۆ راگری، بەڵام لەوە ئەستەمتر نییە کە هەموو رۆژێ بنیادەمێك هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ پاڵی بە کۆڵەکەکەی دیوەخانێوە داوە و چاوەڕوانە و ئەوەندە چاوەڕوان بووە چاوی زەق زەق بوونەتەوە و بە مۆڵەق وەستاون و سڕ بوون و وێك هاتووەن و چرچ و لۆچ دایانپۆشیوە و ئیسك و پرووسکی لە لە ئاگری تۆڵەسەندنەوەدا هەڵدەچۆقێ... هەموو رۆژێ هاتن و هیچ نەگوتن و بێ پرسیار و هەر وا بەبێ هیچ جووڵەیەك راوەستانەکەی لەوێ...

"چ بکەم مەستان، چ بکەم مەستان، چ بکەم؟ نایە، مەستان، نایە، چۆن بچمەوە ماڵێ مەستان، چۆن روو لە ماڵێ بکەمەوە؟ هەر وا دانیشتووە و بەو دەستانەیەوە کە دەمارەکانی هەستاون و پەرژینەکەیان گرتووە، ملی گەزێك درێژ بووەتەوە و چاوەکانی دەرپۆقیون و چاوەڕوانە. چاوەڕوانە، مەستان چاوەڕوان. چۆن بچمەوە ماڵێ مەستان بە چ روویەکەوە؟ چۆن؟"

هەموو رۆژێ ئاوا بوو. خۆر کە ئاوا دەبوو، مستەفا بەگ لە قامیشەڵانەکە دەهاتە دەرێ و دەیکردە بۆڵە بۆڵ. مەستانیش بەردەوام لەوەڵامیدا دەیگوت:"با نەچینەوە ماڵێ و هەر لێرە لەو قامیشەلانەدا بمێنینەوە."

بە رۆژ مێشوولەی ماریا لە گیانی خۆیان وەڕزی دەکردن. ئەسپەکانیش. مستەفا رازی بوو بەوەی تەپۆ بیخۆن، بەڵام تاقەتی ئەوەی نەبوو دایکی ببینێ کە ملی درێژ بووەتەوە و

چاوەکانی دەرپۆقیون. ئاخۆ دیسان هەر وا لەبەر گەرماکە و پرووکاو وەك تارماییەك بە قوولایی چاوەکانیدا رۆدەچێ؟

ناچار بوو سواری ئەسپەکەی بێ و جۆرێك بەرەو ماڵەوەیان ئەسپەکەی لێنگ بدات بڵێی ئێستا نا ئێستا بەردەبێتەوە و دەگلێ.

کە دەرگای حەوشە کرایەوە، لە بوولێڵی ئێوارەدا، سەیری کرد حەوشە گەورەکەیان پڕ پڕە لە ژن و پیاو و گەنج و لاو و منداڵ. سەری سووڕما. هەموو بێدەنگ بوون. کەس متەقی لێوە نەدەهات. خۆ ئەگەر نەڕەی لێڵی زۆنگاوەکە لە دوورەوە نەهاتبا، دەنگی هەناسەدانی حەشامەتەکەش دەبیسرا.

"چ بووە؟ چ قەوماوە؟ ئەوە بۆ کۆ بوونەتەوە؟ باشە شتێك قەوماوە؟"

کەس متەقی لێوە نەهات. حەشامەتە بێدەنگەکە هەر نەشجوولا.

لە ئەسپەکەی دابەزی و چووە نێوەڕاستی حەشامەتەکە و لە تەنیشت پیرەپیاوێکەوە راوەستا:"چ بووە؟ حەسەن؟ ئەوە بۆ کۆ بوونەتەوە؟ چیتان دەوێ؟"

حەسەن گوتی:"مەپرسە، بەگ. هیچ لێمان مەپرسە. دەفەرمووی بچینە کوێ؟ باشە ئێمە مەوتەن و زێدەکەی خۆمان بەجێ بهێڵین و بچینە کوێ؟ گەرمێنەکەی باب و باپیرانمان بەجێ بهێڵین و بچینە کوێ؟ ئەتۆ بفەرموو بەگ، بۆ کوێ بچین؟ باشە ئێستا کێ رامان دەگرێ؟"

مستەفا بەگ پرسیی:"چما چ بووە؟ بۆ دەبێ بڕۆن؟"

حەسەن بە تۆزە گەشانەوەیەك لە دەنگیدا گوتی:"چما نەتزانیوە بەگ؟ پێمان وابوو بێ ئەملا و ئەولا زانیوتە. پێمانوابوو ئەوە هەر کاری تۆیە. هەر هەمووومان..."

"کامە کار؟"

ئیتر حەسەن بە دەنگێکی تۆزێك بەرزترەوە پرسیی:"دەتویست چ کارێك بێ بەگ؟"

جەشیمەتەکەش جمی و شەپۆلی دا. مستەفا بەگ لە بن برۆکانییەوە سەیرێکی دیوەخانێی کرد. قەرەقیزخاتوون وەك تارماییەك بە هەر دوو دەستی، پەرژینەکەی دیوەخانێی گرتبوو و دەتگوت باڵندەیەکە و باڵی لێك کردووەتەوە. دەتگوت بەسەر حەشامەتەکەدا هەڵدەفڕێ. ساتێك بە زەینی مستەفا بەگدا هات کە دەمودەست لەوێ بڕوات. سواری ئەسپەکەی بێ و بچێتە شوێنێك و لێرە نەبێ. هەموو رۆژێ کە ئەو پیرەژنەی ئاوا و بەوجۆرە دەبینی...

"حەمە عەلی بەگی کوڕت پێی گوتووین تا مانگێکی دی لەو گوندە بڕۆنە دەرێ. گوتی مانگێکتان دەرفەت پێ دەدەم... ئەوەش بۆ ئەوەی سڕ و سیپاڵتان کۆ بکەنەوە. دار و نەدارتان کۆ بکەنەوە، کەپر و سەیوانیتان هەڵگرن و لێرە بڕۆن. گوتمان بچینە کوێ بەگ، حەمە عەلی

بەگی ئازیز؟ گوتی کوێتان پێ خۆشە بچنە ئەوێ. بەغدا نیوەی رێتان بێ. کۆماری تورکیا تا بڵێی پان و بەرینە. ئیتر بەسە. ئەوەندە لەسەر خاك و زەویی ئێمە ماونەتەوە، بەستانە. گوتمان، حەمە عەلی ئاغا، ئاغای خۆمان، راست دەفەرمووی ئێرە خاکی ئێوەیە و موڵکی خۆتانە. راستە، چۆنی دەفەرمووی وایە. بەڵام ئاخۆ ئێرە هەوار و گەرمێنی باب و باپیرانی ئێمەشە یان نا؟ چما بەر لەوەی رەوەند و خێوەتنشینەکان نیشتەجێ بکرێن، ئێرە هۆبە و هەواری ئێمە نەبووە؟ گوتی نەخێر نەبووە. ئیتر بەسە. بەسە. ئێمەش هیچمان نەگوتووە و هاتینە خزمەتی تۆ. لای ئاغای خۆمان. تۆ چ دەفەرمووی، بەگ؟"

حەشامەتەکە لە جێی خۆی جووڵا و لە بوولێڵ و تەنگی ئێوارەدا شەپۆلی دا. دەنگێك لە گۆشەیەکەوە هەستا:" دەڵێی چی ئاغا."

مستەفا بەگ دەیەویست خێرا لە نێو ئەو حەشامەتە بڕواتە دەرێ و لە بەر چاوەکانی دایکی ون بێ. نەیدەتوانی هیچ شتێکیش بە جووتیارەکان بڵێ. دوای مەرگی مورتەزا بەگ هیچ کارێکی بە زەوی و زار و کشتوکاڵ نەبوو و هەمووی بە حەمە عەلی ئەسپاردبوو.

ئیتر هەمووان بە ژن و پیاو و پیر و گەنجەوە، قسەیان دەکرد و سکاڵا و واوەیلایان بوو لە دەستی حەمە عەلی. مستەفا بەگیش بۆ وەقسەهێنانیان چیی لەدەستی دەهات دەیکرد. ئەوانیش چیی دەهاتە سەر زاریان، بە ئاماژە و توێکڵەوە بە حەمە عەلییان دەگوت، بەڵام بێ حورمەتییان نەدەکرد. و مستەفا بەگیش دیارە ئاگای لەو رێز و ئیحترامەیان بوو. دەیانگوت حەمە عەلی بەگ نییە، ئاغایە و لەگەڵ ئەو ئاغا تازە پێگەیشتووانە هیچ فەرقێکی نییە. تەواو چووتەوە سەر ئەوان. خەڵکی دێهات هەر بە بنیادەم دانانێ. زۆر دڵ رەقە. گرژ و مۆنە و هیچی بەلاوە گرنگ نییە. حیسابی سەگێك بۆ کەس ناکا. نە سڵاو دەکات و نە دوو قسەش دەکات. نە لە کەس دەپرسێ و نە چاك و خۆشیی دەکات. هەر دەڵێی لە لووتی فیلەوە بەربۆتەوە. بنیادەم و مێروولەی بەلایەوە وەك یەك وایە... جەحەندەمێکی تایبەتییە. خودا بمانکوژێ و تووشمان بە تووشی ئەوەوە نەکا... ئەگەر تووشی ئەو... ئەو... واز لەو هۆبە و هەوارەی باب و باپیرانمان دێنین و دەچینە مەملەکەتێك ورچ رێی تێ نەکەوتبێ...

هەتا شەو بەسەردا هات هەر گوتیان و رستیان و ئاخرییەکەی مستەفا بەگ وەدەنگ هات:"ئەمن هەر ئێستا لەگەڵ حەمە عەلی قسان دەکەم بزانم بۆ وا دەکا؟ جارێ بڕۆن بەخێر چن."

بە ترس و شەرمێکی تاقەتبڕەوە، بەرەو پلیکانەکان هەنگاوی نا. بە بێ ئەوەی بە سێرەی چاوێکیش سەیری دایکی بکا، تیژ بە تەنیشتیدا تێپەڕیز رزگاری ببوو. کە وەژوور کەوت،

هەستی کرد بارێکی قورس لەسەر شانی لاچووە. سەحەر خانمی خێزانی لە ژووری چاوەڕوانی بوو. ڕەنگی بە رووەوە نەمابوو و زەرد هەڵگەڕابوو. ژنێکی کەڵەگەت و قەد باریك بوو. چەناگەیەکی جوان و چاوەکانی درشت. ئێسکی کوڵمەی دەرپەڕیبوون. سەر و روخساری و هەڵسوکەوتەکەی گران و سەنگینییەکی تایبەتییان پێ بەخشیبوو. چاوەکانی گەش بوونەوە و بە نیگایەکی دلڕفێنەوە چاوی پڕ لە دڵەڕاوکێی لە چاوەکانی مستەفا بەگ بڕی و بە دەنگێکی زویر و پڕ لە گلەییەوە گوتی:"بیستت؟ بیستت ئەو حەمە عەلییە چی کردووە؟"

"بیستم. ئەی دایکم چۆنە؟"

سەحەر خاتوون لەگەڵ ئاخێکی قووڵدا گوتی:"جا چۆن بێ؟ داماوە نە دەم لە هیچ دەدا و نە هیچیش دەخواتەوە. ئەمڕۆ تا کووپێك چام دەرخوارد دا، گیانم دەرچوو. هەر ئاوا کڕ و کپ دانیشتووە لە سەر جێی خۆی و چاوی لەو شوێنە هەڵناگرێ کە ئێوەی دەچنێ و پەیتا پەیتا جگەرە دەکێشێ. ئەمڕۆ تەنانەت جگەرەیەکیشی نەکێشاوە."

"چ بکەم؟ بۆم هەڵناکەوێ. پیاوی وەك دەروێش بە رۆژێك و دووان ناکوژرێ. گاڵتەی پێ ناکرێ. گیان لە گۆڕێیە و گیانیش شیرینە. هەر وا سووك و سانا کلکی بە تەڵەوە نابێ. دایکم هەقێتی. نەدەبوو ئەوەندە بخایەنێ. ئاخ، نەدەبوو بخایەنێ، بەڵام... چ بکەم سەر ناگرێ..."

دەنگی هەڵێنا و هەموو کۆشکەکە دەنگی دایەوە:"بەڵام خۆ هەر دەیگرم. دەی، دەیگر، دەیگرم... دایکم با خەفەت نەخوا، خەمی نەبێ، ئەمڕۆ سبەی هەر دەیگرم.... دەیگرم.."

لە خۆشیی ئەوەی دایکی گوێی لەو قسانە دەبێ، بە هەموو هێزی خۆی گوتی:"شتێکی وای نەماوە، زۆری نەماوە خاتوون... شتێکی وای نەماوە ئەو رۆژە بێ و پەتێك لە ئەستۆی دەروێش بەخەم و بە راکێش راکێش بیهێنمە پێش دایکم. چی وای نەماوە خاتوون، شوکر بۆ خودا زۆری نەماوە. بەو زووانە لەو داوە دەکەوێ کە بۆمان داناوەتەوە. واش تێدەکەوێ کە..."

سەحەر خاتوون گوتی:"تێدەکەوێ. ئێستا بۆ کاروبارەکەی ئەو حەمەعەلییە دەڵێی چی؟"

"لە کوێیە؟ بانگی بکە بێتە ئێرە خاتوون."

سەحەر خاتوون چووە دەرێ. حەمە عەلی لە ژوورەکەی خۆی بوو. سەحەر خاتوون گوتی:"بابت بانگت دەکا. بچۆ بزانم چیی جواب دەدەیتەوە... ئاگات لێیە چ لەو داماوانە دەکەی، شێتی چەقەسرۆ...."

حەمەعەلی کە خۆی ئامادە دەکرد بچێتە لای بابی گوتی:"ئەنگۆ ئەقڵتان بەوشتانە ناشکێ دایە."

دەنگی هێنایە خوارەوە:"بابیشم ئەقڵی..."

هەر وەڕوور کەوت، لە بن لێوانە ورتاندی:"ناتوانم تێیانگەیەنم، بۆم حاڵی نابن... تێناگەن، تێناگەن..."

مستەفا بەگ هەر چاوی بە حەمە عەلی کەوت بە تووڕەییەوە گوتی:"ئەو چەپکە گوڵە چییە بە ئاوت داداوە*؟ چیت لە گیانی ئەو رەعیەتانەی من دەوێ حەمە عەلی؟"

حەمە عەلی وەڵامی دایەوە:"ئەمن هیچم لە رەعیەتەکانی تۆ نەویستووە...."

"ئەی ئەو کارەت بۆ کردووە؟"

"بابەگیان چارم نەبوو. یان دەبێ وابم یان تێدا دەچین."

"بۆ؟"

"سەیرکە بابە... ئیتر لەمەودوا ناکرێ بە نیر و ئاموور و کەڵ و گا کشتوکاڵ بکەی. لەمەودوا نیوە بە نیوە قازانجی تێدا نییە. دوای ئەوە... تەراکتۆرێك هەزار بنیادەمە. مەکینەیەکی خەرمانکوت دەهەزار...."

"بەڵام کوڕم ئەوانە عێل و هۆبەی ئێمەن. پیاوی ئێمەن. ئەوانە لەگەڵ بنەماڵەی ئاق یۆللی" وەك گۆشت و ئێسقان وان. باشە بچنە کوێ؟ خۆڵی کوێ وەسەر خۆیان بکەن؟ ئەوجار کوڕم، دەبێ بزانی ئەو زەوی و زارە چەندی ئێمە بەشمان پێوەیەتی، ئەوەندەش ئەوان بەشیان بەسەریەوەیە.... ئێرە زستانەهەواری ئەوان بووە."

"قەباڵەکەی بە کێیە؟"

"بە ئێمە..."

"بە ئێمەیە بابە... بڵێی و نەڵێی نیوەکاری هەڵدەوەشێتەوە. ئێمە ئەو هەمووە خەڵکەمان پێ تێر نابێ. بابە، بابە، بابە..."

"باشە بۆ؟ بۆ حەمە عەلی، چما چ بووە؟"

"ئەگەر ئاوا بڕواتە پێشێ، ئێمەش لەگەڵ ئەواندا نوقم و نوغرۆ دەبین. هەتا دەرفەت لە کیس نەچووە..."

"با لانیکەم لە گوندەکەدا بمێننەوە. خۆ ئێمە ناتوانین لە گوندێ وەدەریان بنێین."

"دەڵێی چی بابە... ئەو قسانەیان وەپێش مەکەوە. ئەوەی لێرە گوتت، نەکا لەجێیەکی دیکە بیڵێیەوە بابە. نەکا بزاننەوە کە ئێمە ناتوانین لە ئاواییەکەیان دەربکەین."

مستەفا بەگ بە خەفەتەوە سەرێکی بادا و لە بن لێوەوە ورتاندی:"نەکا بزاننەوە."

---

*ئیدیۆمەکە فارسییە و پێشم وابوو ئەگەر دەقاودەق دابنرێتەوە، چ لە واتاکەی خۆی ناگۆڕدرێ.

ئەو دەمێك بوو چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بوو. زۆر لە مێژ بوو كشتوكاڵی شەریكی و نیوەكاری و سیستەمی كۆنی ئاغا و ڕەعیەتی لەو دەشتە بەسەر چوبوو و جوتیارەكان دەربەدەر ببوون و لە گوندێكەوە بەرەو گوندێكی دیكە و لە مەزرایەكەوە چوبوونە كێڵگەیەكی دی.

لە نەكاو تەقەی دەرگاكە هات و قەرەقیزخاتوون بە تووڕەییەوە وەژوور كەوت. كراسە داوێن خەت خەتییەكەی كە پڕ بوو لە نەخش و نیگاری زەرد و سوور و مۆر و داوێنی خوارەوە شین بوو، كەوتبووە سەر گوێزینگانی. پشتوێنێكی زەرد هەوریشمینی هیندستانیی بەستبوو كە گوڵێنگەكان تا خوار ئەژنۆی دەهاتن. تاسكلاوێكی پڕ لە سكەی زێڕ و ریشووی ڕەنگاوڕەنگی هەوریشمین لەسەر بوو. قژە خەنە لێدراوەكەی لە بن تاسكلاوەكەیەوە دەركەوتبوون و ملە باریكەكەی دادەپۆشی. نێوقەدی ئەوەندە باریك بوو، دەتگوت ئێستا دەشكێ و دەپەڕێ. قەرەقیز خاتوون بەو حاڵەشەوە لە هەنگێكی درێژی تێكسمڕاوی سەر پوورەی هەنگوینێ دەچوو، كە لەبەر تاو وشك هەڵاتبێ. لەبەر یەك كشاو و مل هەستاو و چاو لە ژێڵڵاهاتوو و هەموو گیانیشی وەك بینی ئاو دەلەرزی.

دەستی هەڵێنا و بە تووڕەییەوە نەڕاندی:"بێ دایك و بابینە. شەرمێ ناكەن، كافرینە؟ هەر ئەوەندە عێل و هۆبەیەمان بۆ ماوەتەوە، ئەویش، ئەویش، ئەویش، هەی ژنانیلەی... ئێستا هەر بەو داماوانە دەوەستن، ها؟ لە هێلانە وماڵی خۆیان وەدەریان دەنێن؟ ئەو داماوانە چۆن و لە كوێ بژین؟ كوێیان هەیە بچن؟ خۆڵی كوێ وەسەر خۆیان بكەن؟ ئێمە، ئێمە بەبێ هۆبە و هۆزەكەمان چمان پێ دەكرێ؟ ئەمن چ دەكەم؟ هیچ بیرت لێ كردووەتەوە مستەفا؟ باشە بنیادەم بەبێ خەڵك و هۆزەكەی دەژیێ؟ یانی ئەتۆ دەسەڵات و هەموو شتێكت دەدەیتە دەست ئەو بستە منداڵە؟... خەڵك و هۆزەكەم.... ئەگەر ئەوەندە ئازا و بە جەرگن. ئەوەندە...."

دوو هەنگاو چووە پێشتر. دەستەكانی هەڵێنایەوە و مستەكانی توند قووچاندن و پشتە كۆماوەكەی قیت كردەوە و بە دەنگێكەوە كە تۆزە تەوسێكی تاڵی تێدابوو و تووڕەییەكیشی پێوە دیار بوو گوتی:"كوڕە ئازاكانی من."

جا دەستەكانی هێنایەوە خوارێ و دیسان گوتی:"كوڕە ئازاكانم..."

ئەوەشی گوت:"ئەگەر ئەوەندە ئازا و بە جەرگن، چۆنە دوژمنەكەتان هەموو ڕۆژێ بە سواری ئەسپەكەی بە ڕاست و چەپی ماڵەكەماندا دێ و دەچێ؟ ساری ئۆغڵی پێی عەیب نەبوایە، دەهات و گووی لە هەیوان و دیوەخانەكەشمان دەكرد. چما وانییە كوڕە پاڵەوانەكانم؟"

بەهێمنی و گران و سەنگین، بە زاری وەك تەڵەی تەقیوەوە و بە پشتی كۆماوە بەرەو دەرگاكە گەڕایەوە. لە لاشیپانەی دەرگاكەدا ڕاوەستا و لە نەكاو بە خێراییەكی لەو چاوەڕوان نەدەكرا، سەری

هەڵێنا و بە چاوە زەقەکانی، سەیرێکی توندی لە هەردووکیان کرد و تووڕەییەکەی بوو بە هاوارێك و تەقییەوە:"هەتا من زیندووم لەسەر ئەم دنیایە، بۆتان نییە کارتان بە پیاوەکانی من بێ. نە تۆ مستەفا و نە ئەو کوڕە تڕکەنەشت."

لێوەکانی هەڵقرچاندن وەك بۆگەنێکی بۆ چووبێ، لووتی ورسووڕاند و بە بێزاری و سووکایەتییەوە سەیرێکی حەمەعەلیی کرد و لە نێوان لێوە قووچاوەکانییەوە بۆڵاندی:"هەتا من زیندووم لەسەر ئەم دنیا... لەبیرتان نەچێ ئەو گوندە... تێگەیشتن؟ هەر دەرەقەت ئەو داماوانە، ئەو هۆز و کەسەی من دێن؟ بێکەس کوژینە؟ ئەمنیش، ئەمنیش...."

ئیتر زمانی نەگەڕا. بەپەلە لە ژوورەکە چووە دەرێ و توند دەرگاکەی پێك دادا و لەسەر جێیەکەی جارانی دانیشتەوە و بە هەر دوو دەستی کۆڵەکەکەی گرت و گوشی و ئەوەندەی گوشی تا دەستەکانی ئارەقەیان کرد. چەند رۆژێك بوو نێو لەپی دەستی ئارەقەیان دەکرد و ئارەقەکە بە پەرژینە چێوییەکەی هەیوانەکەدا رۆدەچوو.

بەخۆی گوت:"بێ شەرەفینە. هەر ئەگەر هێندەی دەنکە جۆیەك ئینسانییەتتان تێدا مابایە، ساری ئۆغلێتان دەکوشت. ئەگەر دەروێش لە جێی ئێوە دەبوو، ئەگەر ئێوە برای ئەوتان کوشتبایە، ئەو تا ئێستا سەد جار دەیکوشتنەوە.... دەیکوشتنەوە.... دەیکوشتنەوە...."

لە بن لێوانەوە هەر دەیبۆڵاند و دەیبۆڵاند. لە نەکاو پەشیمان بۆوە و لەبزەکەی بەجۆرێکی دیکە گۆڕدرا:"خۆزگە، سەد خۆزگە... لە مستەفام راخوڕیم. دڵی رۆڵەکەمم شکاند. لەو حەمە عەلییە بێ دایی و باب و قڕنیسەی لەو سەحەرە دۆمە بووە، تووڕە بووم و... ئەی خۆزگە ئەوەی نەبووبا... خۆزگە لە بری ئەوە توتکە سەیەکی بوایە. جا هەر تولە سەگیش لە زگی ئەو دێڵە دێتە دەرێ. لێی تووڕە بووم، چما مستەفام کەم هەوڵ دەدا ئەو کافرە بکووژێ؟..."

لەگەڵ دامرکانەوەی تۆفانی تووڕەییەکەیدا، پتر پەشیمان دەبۆوە:"چ بکەم، چۆن دڵی مستەفای بدەمەوە؟ ئای کوڕم، ئاخ چاوڕەشەکەم، تۆم کوشت."

مانگ هەڵات و بە پاناوکی ئاسمانێدا کەوتە رێ. بناری ئاسۆ رووناك بۆوەو قەرەقیزخاتوون هەر وا لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو و هێدی هێدی هەناسەی دەهات.

مستەفا بەگیش نەنووستبوو و بیری لەو سووکایەتییە دەکردەوە، کە دایکی پێی کردبوو. دایکی تا ئێستا ئاوا لێی تووڕە نەببوو و قسەی پێ نەگوتبوو.

"پێی دەڵێم. بە دایکم، بۆ قەرەقیزخاتوونی دەسەلمێنم، بەر لەوەی بمرێ، لووت و گوێ و سەلکی دەروێشی پێشکەش دەکەم. ئەی ئەو دەم چ دەکا؟ لە شەرمەزارییدا نابێتە تنۆکێك ئاو؟ ئاد و بەڵێن بێ، بەڵێن بێ قەرەقیزخاتوون شەرمەزارت بکەم. جا ئەو کات ئەو قسانەت... ئاد و بەڵێن بێ."

لە نەکاو ترسێکی تاڵ و تیژ وەك نەشتەر لە دڵی گەڕا. نەکا دوای ئەو هەمووە تووڕەیی و هەڵچوونە شتێکی لێ بێ؟ گورج لە ژوورەکە دەرەپەڕییە دەرێ. تارماییەکەی قەرەقیزخاتوون هەر لە سەر جێیەکەی جارانی و لە تەنیشت ئەستونی هەیوانەکە بەبێ جووڵە گرمۆڵە ببوو. بۆن و بەرامەی رەیحانە هەموو دیوەخان و کۆشکەکەی داگرتبوو.

"دایە، دایە خەوت نایە؟"

"قەرەقیزخاتوون راچڵەکی و توند سەری هەڵێنا و لە نکاو هێور بۆوە و ئاوڕی دایەوە و بە لەبزێکی گەرم و گوڕ و بلاوێن گوتی:"کوڕم، کوڕم، ئەتۆ خەمی منت نەبێت خەوم لێ دەکەوێ."

هەستا و قۆڵی کوڕەکەی گرت و هەردووکیان شان بە شانی یەکتری وەڕێ کەوتن. دایکەکە بە نەرم و نیانی و بە دەنگێکی پڕ لە حەژمەت و هاودەردی گوتی:"کوڕم، هەتا نەمردووم عێل و هۆیەکەم پەرتەوازە و ئاوارە مەکە. دوای مەرگی منیش ... پاش مەرگی منیش ... ئەگەر لەم دنیایەدا هیچ شتێك بۆ بنیادەم پێویست نەبێ، هەموو شتێکیش کۆن بێت و کەڵکی نەمێنێ، شتێك هەیە کە قەت قەت بێ کەڵك نابێ. ئەویش بنیادەمە. هۆز و تایەفە هەر پێویست و بەکەڵك دەبن... لە عێل و عەشیرەتت دامەبڕێ مستەفا. برسێتی بکێشە و تینوو بە و سواڵێ بکە، بەڵام لە عێل و هۆزی خۆت دامەبڕە و پشتیان تێ مەکە. ئەگەر حەز دەکەی ساری ئۆغڵی هەر مەکوژە، خودا خۆی تۆڵەی لێ دەکاتەوە، بەڵام عێل و هۆزەکەتت بەجێ مەهێڵە و پشتیان تێ مەکە. شیری ئەو مەمکانەمت حەڵاڵ ناکەم مستەفا پشتیان تێ مەکە."

مستەفا بە دەنگێکی پڕ لە متمانەوە گوتی:"پشتیان تێ ناکەم دایە."

# ٣١

گەرم بوو. سەماوەرەکە قولتەقولت دەکولی. زۆنگاوەکە، کە قولتەقولتی دەدا زەوی دەلەرزی. مستەفا بەگ خووی بەو شتانە گرتبوو. ئیتر نە چای وەك خوێنی کەروێشکی نێو ئیستیکانە قەدباریکەکەی دەدی و نە گوێی لە هەناسەکێشانە قوولەکانی زرنگاوەکە بوو کە قولتەی دەهات و دەیگرماند و بە هەزار دەنگەوە دەکولی. بەردەوام بەخۆی دەگوت، کوڕە ئەوەندە چاوەڕێ بووم چاوێکم بوو بە چوار چاو. بوو بە چوار، بوو بە چوار، بوو بە هەزار. دلی دەگوشرا و خێرا خێرا لێی دەدا. بیری لە بێ تاقەتییەکەی دایکی و دەستەوستانییەکەی خۆی دەکردەوە و لەوەش کە دەروێش بەگ بووەتە بوونەوەرێکی کە دەست پێی ناگا، ئیتر سەری لێ دەشێوا و لە پێ دەکەوت. بەر لە هەر شتێ بیری لەوە دەکردەوە، کە دەمەدەمی ئێواری چۆن بگەڕێتەوە مالێ و بە بەردەمی دایکیدا کە گرمۆلە ببوو و چنگێکی لێ مابۆوە و هەموو گیانی ببووە قین و رق و هەر بە حال هەناسەیەکی دەدا، تێپەڕێ. هەر روالەت و نیگا و قسە و هەلسوکەوت و جوولەیەکی قەرەقیزخاتوون ئیتر سووکایەتییەك بوو. نزیکبوونەوە لەو و چوونە بەرچاوی، سووکایەتی و توانەوە و بەخاکدا رۆچوون بوو. ئەوجار، هەرجارێکی دایکی، ئەو چنگە پێست و ئێسقانەی دەهاتەوە پێش چاوی، کزەی لە جەرگی دەهات...

لەر لەوەی مورتەزا بکوژرێ هیچ وا نەبوو. شاد و بە کەیف و گەش بوو. چاوەکانی پڕ بوون بە بریسکەی بەختەوەری. تەنانەت حەمە عەلییشی خۆش دەویست. تەنانەت رقی لە سات و سەودای تەراکتۆر و پارەخۆشەویستی و هەلسوکەوتی ئاغایانە و دوژمنایەتی نەکردنی لەگەل ساری ئۆغلێش نەبوو. لەگەل مورتەزا رای کردبوو و سات بە سات و رۆژ بە رۆژ کوژرانی ئەوی بەچاوی خۆی دیتبوو. مەرگ و ژان و چزەی فیشەکەکەی لەسەر دلی خۆی هەست پێ کردبوو لە هەمبەر مەرگدا پێ بە پێی ئەو داماوانە هەولی دابوو و ئەو شتانە تەنانەت سێبەرێکیشیان

نەخستبووە سەر ڕووخسارە گەش و شاد و بەکەیفەکەی... دوای کوژرانی کوڕەکەی مانگێکی ڕەبەق لە سەر جلوبەرگە خوێناوییەکەی ئەو کڕووزایەوە و لەبەر خۆیەوە سەردولکەی گوت و شینی گێڕا. دوای مانگێك بە پشتێکی کۆماوەوە لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەرێ، ئیتر تواببووەوە و هەڵچۆڕابوو. ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەتوایەوە و نەدەما.

مستەفا بەگ گوتی: خۆی ڕادەگرێ. چاوەڕێ دەبێ و خۆی ڕادەگرێ."

مەستان گوتی:"نامرێ. خاتوون نامرێ. ئەگەر ئێمە هەتا پەنجا ساڵی دیکەش دەروێش نەکوژین، ئەو پەنجا ساڵ هەر لەوێ پاڵ بە کۆڵەکەی دیوەخانەکەوە دەدا و چاوەڕێ دەبێ. ئێوارەی ئەو ڕۆژەی دەروێش بەگ دەکوژین، خۆی بە دەستەوە دەدات و وەك چرایەکی نەوتەکەی تەواو بووبێ، پتەپتێك دەکات و دەکووژێتەوە."

ڕۆژ و مانگان ڕادەبردن ئەو هەر لێرە لەو گەرما چەور و شێدارەی ئەو قامیشەڵانەدا، لەبەر سەماوەرە لەکولەکە، یەکسەر ئاوای بیر دەکردەوە و هەموو ڕۆژێش هەروا سوعبەتیان دەکرد:"ئەی باس و خەبەری وەلی شەماڵ؟"

"هێشتا سۆراغێکی نییە. بەڵام دەیبێ بەگ."

دەنگی شڵەژاوی حەمدی لە قامیشەڵانەکەوە هەستا و خۆیشی بە غاردان و لە حاڵێکدا قامیشەکانی دەشکاندەوە گەیشتێ و بە هانکەهانك گوتی:"ئەوە دێ بەگ. سوارێك بە ئەسپێکی شەودێزەوە کە تەپوتۆزێکی زۆر لە پاش خۆیەوە بەجێ دێڵێ." هەر هەمووان بە غاردان لە قامیشەڵانەکە دەرپەڕین، بەڵام کەسیان نەدی. حەمدی گوتی:"خۆی بە شیوەکەدا کرد. زین و لغاوی ئەسپەکەشی دەبریسکایەوە. هەر دەبێ دەروێش خۆی بێ. ئێستا سەر و سەکتی پەیدا دەبێ."

مستەفا بەگ بە دەم شادمانییەوە، دڵیشی توند بوو. بەخۆی گوت، خۆزگە دەروێش بەلامالدا نەیە. دڵەخورپە دایگرت. ئێستا چ بکا؟ ئەوەندەی بیر لە دایکی و ئەو دڵەکوتە و بیربلاوی و وەزعە تاڵ و بەئازارە کردبووەوە، کە هەموو شەوانە لە کاتی چوونەوەیدا تووشی دەبوو، ئیتر هەموو شتێکی لەبیر چووبووەوە. ئێستا نەیدەزانی چ بکا و تفەنگەکەی بەدەستەوە و بێ تین و هێز ڕاوەستابوو.

حەمدی لە گەروویدا گرماندی:"ئەوەتا، ئەوەتا، ئەوەتا. هەر ڕاست بەرەو ئێمە دێ. چ بکەین بەگ؟"

بلە ئیبۆ گوتی:"لە ئەسپەکەی یان خۆی؟"

مستەفا بەگ کە خۆی دەخزاندە پشت دەوەنەکەی ئەوبەرەوە، خەفەتبار و داهێزراو و بێهێز بوو. لە حاڵێکدا دەبوو دڵخۆش و بەکەیف بێ، چونکە ئەو کەسەی لە ئاسمانانی لێ دەگەڕا، لە عەرزی هاتبووە بەردەستی و بە لینگدان بەرەو لای دەهات و تۆزێکی دی دەگەیشتە بەر لوولەی تفەنگەکەی. ئەی بۆچی کەیفخۆش نەبوو؟ بۆچی ئەو بۆشاییەی لە دڵیدا هێلانەی چێ کردبوو، هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە؟

لە پشت دەوەنەکە راکشا، خەشاب (مەخزەن)ـی تفەنگەکەی دەرهێنا و خستییەوە جێی خۆی. بۆنی رۆن و ماوزەرەکە لە دەوری گەڕا. ئەوانی دیکەش خۆیان خزاندە پاڵ ئەو. ئەوانیش خەشابی تفەنگەکانیان دەرهێنا و خستیانەوە جێی خۆی.

"ئەسپەکەی یان خۆی؟"

مستەفا بەگ گوتی:"هەرچوارمان پێکەوە و رێك لە خۆیز"

مەستان دووپاتەی کردەوە:"لەخۆی."

بلەئیبۆ گوتی:"لەخۆی. رێك لەسەر دڵی."

سوارەکە سات بە سات نزیکتر دەبۆوە و جوانتر دەردەکەوت. حەمدی گوت:"لەخۆی. بەڵام قسەی خۆمان بێ، وەڕەزی کردووین ها. زۆر چاوەڕوانی بووین...."

مەستان گوتی:"ئیشەڵڵا ئەمجارەیان رێیەکەی ناگۆڕێ."

بلەئیبۆ بە مەستانی گوت:"نوقڵانەی خراپ لێ مەدەمە مەستان."

ئەسپەکە بە چوارناڵە دەهات و یاڵ و کلکی با دەیشەکاندەوە. بە گاڕانە رێیەکەدا دەهات و پیاوێکی لەسەر زینەکەی بەرەو ئەوان دێنا. هەر چواریان پشوویان لە سینگیاندا قەتیس کردبوو. پەنجە لەسەر پەلەپیتکە و چاویان لەو سوارە هەڵنەدەگرت کە سات بە سات لێیان نزیك دەبۆوە. تا نزیکتر دەبۆوە، رەنگی ئەسپەکەی و بیچم و شێوەی سوارەکە روونتر دەردەکەوت. گومانی تێدا نەمابوو ئەوەی دەهات دەروێش بەگ خۆی بوو. تۆزێك دواتر چوار قیشەك لە لوولەی تفەنگی هەر چوار تفەنگچییە ئەنگێوەکەوە دەردەچوو و دڵی ئەوی هەڵدەتەکاند و لە سەر پشتی ئەسپەکەیەوە ئاوەژووی دەکردەوە.

سوارەکە هەر هات و نزیکتر بۆوە... ئیتر...

هاوارەکەی مەستان رایچڵەکاندن:"دەست راگرن، دەست راگرن."

ئیتر دەستی لەسەر تفەنگەکەی مستەفا بەگ دانا. وەك بینی ئاویّ دەلەرزی و هەموو گیانی چڵی دەدا. بە منەمنەوە گوتی:"کوڕە بڕوانن، سەیر کەن بزانن کێیە؟ سەیر کەن وەخت بوو کیّ بکوژین.؟"

مستەفا بەگ بەلادا هات:"وەی باوکەڕۆ."

بلەئیبۆ:"باوکەڕۆ، باوکەڕۆ، باوکەڕۆ."

حەمدی:"باوکە ڕۆ"

مستەفا بەگ ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. ئەو جگەرەیەی بە زەحمەت لە پاکەتەکەی دەریهێنابوو، بۆی نەدەخرایە سەر لێوەکانی.

"بڕۆ لە پێش چاوم ون بە کوڕی قورت بۆغا. شەویّ قەدر لە دایك بووی ئەگینا... ئەگەر ئەمجارە نەمردی، قەت نامری، تا قیامەت. بڕۆ خودا ڕوحمی پیّ کردی... بڕۆ..."

سوارەکە ڕێك بەو ڕێیەدا کە سەد و پەنجا مەترێك بەولای ئەواندا دەکشا، ڕۆیشت. تازە خەتی لیّ دابوو. لە دەروێش بەگ کەڵەگەتتر و نێوشان پانتر بوو. کاکۆڵیشی درێژتر بوو.

مەستان لەحاڵێکدا دەهاتەوە سەرخۆی گوتی:"

"کوڕە هەر تۆزێکی دیکە..."

مستەفا بەگی ئاوڕی لیّ دایەوە،"خوا ڕاوەستاوت بکا مەستان، ڕاوەستاو بی... لە گێچەڵێکی گەورە ڕزگارت کردین."

بلەئیبۆ جگەرەکەی مستەفا بەگی کە لە نێوان لێوەکانیدا دەلەرزی، داگیرساند و گوتی:"بەحەیاتم ئەوەندە نەترسابووم..."

مستەفا بەگیش بیّ ئەوەی ئاگای لیّ بیّ ترسەکەی خۆی ئاشکرا کرد:"ئەمنیش لە ژیانمدا وا نەترسابووم. پەلەپیتکەم دەترازاند کە لە نکاو سەیر دەکەم نەخێر ئەوە هەو نییە، دەروێش نییە، یەکێکی دیکەیە..."

حەمدی گوتی:"یەکێکی دیکەیە. ئەویش لەوانەیە هەر لە کۆشکەکەی ساری ئۆغڵییەوە گەڕابێتەوە."

جا ملی بەلارەوە نا و گوتی:"کیّ چووزانیّ ... لە کوێوە."

مستەفا بەگ هەستا و خۆی خاوکێش کرد و فیلینتایەکەی هەڵگرت و چوو خۆی خستە سەر ئەو بەڕەیەی لە تەنیشت سەماوەرەکە و لە بن دارهەنجیرەکە ڕاخرابوو. سەری لەسەر توورەکەکە دانا و لەسەر گازەرای پشت لێر ڕاکشا و ئەژنۆی هەڵدا.

پەپوولەیەکی نارنجی، هێندەی لەپی دەستێك لە دەروبەری گوڵە قامیشەکە دەهات و دەچوو. ماوەیەك لەو گوڵە قامیشەوە دەفڕییە ئەویتر و ئاخرییەکەی لە سەر گوڵێکی ئەرخەوانی نیشتەوە و چاوە درشتەکان و سەری بە قاچەکانیدا هێنا. مستەفا بەگ چاوی لە پەپوولەکە بڕیبوو وسەیری دەکرد. باڵە پان و لەرزۆکەکانی پەپوولەکە پڕ بوو لە بازنە و خاڵی مۆر و رەش و سوور و سپی. دەوری بازنەگەورەکان پڕ بوون لە پەڵەی بچووکی خڕ خڕ.

دوو پەپوولەی دیکەش پێکەوە بەسەر قامیشەڵانەکەدا تێپەڕین. جارێ ئەوەندە نزم دەبوونەوە خۆیان لە گژ و گیایەکە دەدا و جاری واش بوو ئەو ئاسمانەی بەرقرچەی هەتاوەدا ئەوەندە هەڵدەکشان لە چاوان ون دەبوون. ئەو پەپوولانەش گەورە و مەیلەو مۆر بوون و بە سەدان خاڵی سپی بەسەر باڵەکانیانەوە بوون. پەپوولەکان جار بە جار پتر دەبوون و هەموو گوڵەقامیشەکان و گوڵەکانی گوڵی (پێنج پەنجە)یان داپۆشی. پەپوولەیەکی نارنجیی دیکە ئۆقرەی گرتبوو. ئیتر نە دەلەرزی و نە باڵی لێك دەکردەوە و نە دەیبەستنەوە. جووڵەی لێ بڕابوو و هیچ ئاگای لەو پەپوولە رەنگاوڕەنگە بچووکە و گەورانەش نەمابوو، کە لە دەورویشتی دەهاتن و دەچوون.

مستەفا بەگ وردە وردە وەخۆ هاتەوە و قیت بۆوە و گوتی:"چایەکم بدەیە حەمدی. بلەئیبۆ بچووە سەر شوێنی پاسەوانییەکەت. لە دڵم چەقیوە هەر ئەمڕۆ یان سبەی ئەو کافرە پەیدا دەبێ. یان ئەمڕۆ یان سبەی."

کە حەمدی چایەکەی دێنا، بلەئیبۆ بەنێوچاوانێکی تاڵ و مرچ و مۆنی وەدەر کەوت.

بە شوێنیدا مستەفا بەگ دەنگی لێ هەستا:"چایەکی بخۆوە دوایی برۆ."

ئیبۆ گەڕایەوە. تفەنگەکەی بە سەر دەستییەوە و ئەژنۆی دادا. حەمدی چایەکی بۆ ئەویش تێکرد. ئیبۆ دوای ئەوەی پەیتا پەیتا سێ ئیستیکان چای هەڵقوڕاند، هەستا.

"لە دڵم چەقیوە هەر ئەمڕۆ دێ."

مەستان لە دووی دا و گوتی:"دێ. باش بوو زوو ئەو هەتیوەی قورت بۆغام ناسییەوە. کوڕی قورت بۆغا لە سویسرای خوێندووە. هە خوێندوویەتی و هەمیش گوتوویەتی خوایەك لەگۆڕێ نییە. ئەدی، ئەگەر خوایەك هەبوایە باشە باوکی دەیتوانی ئەو هەمووە زوڵم و ناهەقییە بکا؟ خوێنی ئەو خەڵکە بمژێ وەك زەروو و مێشێکیشی لێ میوان نەبێ؟"

مستەفا بەگ بەنێوچاوانێکی تاڵ و بە پێناخۆشبوون و تەوسەوە گوتی:"بێدەنگ بە مەستان. دین و ئیمانی خۆت زایە مەکە."

ئەوجار نێوچاوانی گەش بۆوە و بۆ یەکەم جار بزەیەکی کاڵ لە روخساری گەڕا و نەرم نەرم لێوی لێك کردنەوە و گوتی:"وەلی شەماڵ دیار نییە. هیچ هەواڵێکمان بۆ ناهێنێ."

مەستان لەو دیو ددانە چیڕکردووەکانییەوە بە تووڕەییەکی ئاشکراوە گرماندی:"نقوستان بووە، ئەو گەوادە نقوستان بووە. گەوادی ترسنۆك. سەیرە لەو چوکووراوایەدا هەمووان بە ترسنۆکترین کەسی دەناسن. دیاریش نییە ئەو نێوزگە بۆگەنەوە چۆن دەتوانێ ئاگای لە دەروێش بێ؟"

حەمدی گوتی:"ئەتۆ لەو خاترجەم و دڵنیا بە. ئەگەر من وەلی شەماڵم ناسیبێ، چۆنی باش و گونجاوە کاری خۆی وا رادەپەڕێنێ. گیانیشی دەرچووبێ، کارەکەی خۆی هەر دەکا. زۆر نابا روون دەبێتەوە."

مەستان بەتووڕەییەوە گوتی:"بەو سەیە بڵێ بێدەنگ بێ، بەگ. کابرای نەفام، ئەگەر من نەبوایەم، ئێستا کوڕەی قورت بۆغات کوشتبوو. ئەگەر کوشتبات جا دەتدی پووتێك چەند کیلۆیە و قورت بۆغا چۆن هەڵیدەچزاندی."

مستەفا بەگ هەڵچوو و نەڕاندی:"بێدەنگ بن. ئەوە چیتانە؟ ئەگەر بتانەوێ ئاوا دەم لە دەمی یەکتری بنێن، تووشی کێشەم دەکەن. هاکا دیتان لێمان تێکچوو لە یەکێکی دیکەمان دا، جا ئەوجار وەرە ئەو کەرە لەو قوڕە دەربێنەوە."

مەستان گوتی:"لێ نادەین بەگ. ئەمن لە مەودای رۆژەرێیەك هەنگێك...."

حەمدی قاقای کێشا:"دیسان دەستی پێ کرد. دەزانین بابە گیان، دەزانین، ئەتۆش وەك دەڵێی وەلی شەماڵی. ئەو لە چاوترووکانێکدا رۆژەرێیەك دەبڕێ و ئەتۆش هەر لەو مەودایەدا هێڵ و خەتی سەر باڵی هەنگێك دەبینی. ئەو رەگانە سوورن یان کەسك...."

مەستان نەڕاندی:"زارت دادەخەی یان نا، سەگباب؟ کێ بوو کوڕی قۆرت بۆغای دی؟"

مستەفا بەگ نێوبژیوانیی کردن:"هەر بژی مەستان تۆ دیتت. ئەگەر تۆ نەدەبووی، ئێستا کوڕەکەی قۆرت بۆغامان شوێنبزر کردبوو. بەڵام بەینی خۆمان بێ، زۆر خراپیش نەدەبوو ها، دەبوو؟"

حەمی گوتی:"دەی خۆ ئەوە هیچ نییە بەگ. ئەگەر دەفەرمووی دەیکوژم. هەر بێرەدا دەگەڕێتەوە. دەفەرمووی بەقوربانی فیشەکێکی بکەم؟"

لە سەر قسەکەی رۆیشت:"جا لە سویسراش دەرسی خوێندووە و چەپیش بووە. دەفەرمووی لە چاوترووکانێکدا بیکوژم؟"

مەستان چووە پێشتر:"ئەگەر دەفەرموی با بیکوژین، شوێنبزری بکەین. کەسیش سۆسەی ناکا و شك ناکەن کە ئێمە کوشتوومانە...."

مستەفا بەگ گوتی:"سۆسەی ناکەن؟ لێگەڕێ تۆزێکی بیر لێ بکەینەوە. نابێ لەخۆوە خۆی پێدا بدەین."

"هەر هەمووان دوژمنی ئێمەن. وا نییە؟ جا دەروێش بێ یان کوڕەکەی قۆرت بۆغا."

مستەفا بەگ دوای ئەوەی ماوەیەك مات بوو و بیر و خەیاڵ بردی، سەری هەڵێنا و سەیری مەستانی کرد:" یانی ئەو کارەمان پێ ناکرێ؟"

ئەوجار چاوی لە چاوەکانی بڕی. مەستان نیگای لە نیگای بەگ دزییەوە و لەسەرخۆ گوتی:"پێمان دەکرێ بەگ. پێمان دەکرێ. بلێی و نەلێی دەروێش هەر دەکوژین."

مەستەفا بەگ دیسان چاوی لە چاوەکانی مەستان بڕییەوە. مەستان دیسان نیگای خۆی لێ دزییەوە. ردێنە ماش و برنجییەکەی دەلەرزی و روخسارە تاوبردووی پڕ لە چرچ و لۆچەکەی تێك نا.

"نەکا وەلی شەماڵ بەلایەکی بەسەر هاتبێ."

مەستان ناڕاستەوخۆ پشتی گومانەکەی ئەوی گرت:"ئەگینا هەتا ئێستا هەواڵێکی هەر بۆ دێناین."

حەمدی شانێکی هەڵتەکاند، گوتی:"نەیتوانی خۆی بگەیەنێتێ."

لەبزەکەی تووڕەتر بوو:"ئەو کەسەی لە مەرگ دەترسێ... چۆن دەتوانێ کۆشکی دەروێش بخاتە ژێر چاودێرییەوە و هەواڵی ئەومان پێ بگەیێنێ؟ کەرە مەمرە بەهار دێ... ها مەستان؟"

"دەی باشە برالە. باشە حەمدیی سەگباب."

بەگ:"دەروێش نەیکوشتبێ؟"

مەستان خەمبارانە گوتی:"چووزانم. ئەو شوێنهەڵگرێك بوو کە... شوێنهەڵگرێك کە... وا بە رێیەدا دەڕۆیی .... هەر دەتگوت باڵ دەگرێ و دەفڕێ. ئەو، ئەو، هەروەك...."

دەنگەکەی وەك سەردولکەی لێ هات.

حەمدی:"ئەو شوێنهەڵگرێك بوو کە... ئەو تەنانەت شوێنی باڵندەی بەسەر چڵووکی دارانیشەوە هەڵدەگرت..."

مستەفا بەگ دیسان دووپاتی کردەوە:"دەروێش نەیکوشتبێ؟"

بلێی و نەڵێی ڕەنگی بزڕکا و تەزوویەك بە دەستەکانیدا هات.

هەموو بێدەنگ بوون. بەگ هیچ بەکەیف نەبوو. گەرماکەش هەر دەهات و بەتەوژمتر دەبوو. چایەکی دیکەی خواردەوە. بە دوای یەکدا هەر خواردییەوە. هەستا و دانیشتەوە. لە قامیشەڵانەکە چووە دەرێ. بلەئیبۆی دی کە لە نێو دەوەنەکان دانیشتووە و فیلینتاکەی لەسەر ئەژنۆی داناوە و چاوی بڕیوەتە ئەو ڕێیەی لە کۆشکەکەی ساری ئۆغڵۆوە دێ. باوەشێك گژ و گیا و دەوەنی گوڵداریشی خستبووە سەر چڵ و چێوی دارە گوڵەکە و سەیوانێکی بۆخۆی دروست کردبوو. ئارا و قارای نەبوو و تۆتکەی نەدەگرت. بەپەلەپەل خۆی بەنێو قامیشەڵانەکەدا دەکرد و دەهاتەوە دەرێ. چاوی لە کۆشکەکە دەبڕی و تاوێك دەمایەوە و دادەهاتەوە و توێکلێکی لە عەرزی هەڵدەگرتەوە و تفێکی دەکردەوە. بە قامیشەڵانەکەدا دەهات و دەچوو، دەچووە پێشەوە و دەگەڕایەوە. زۆنگاوەکە، قووڵ و لەسەرخۆ هەناسەی دەکێشا. هەڵڵای دوورودرێژ و نەبڕاوەی هەنگ و مێش. درەوشانەوەی شووشەی پەنجەرە تازەچاکراوەکانی ساری ئۆغڵی لە چاوی دەدا. باشە چۆن سۆراغێکی وەلی شەماڵ بکەین؟ تەرمەکەی چۆن بدۆزینەوە؟ باشە ئەی بۆ تەرمەکەیان بە لکی چنارێکەوە نەکرد؟ هەموو ئاغا و بەگ و میرزا و پاشا و فەرماندەکان ئێرەیی بە ئی وەك وەلی شەماڵ دەبەن. ئێرەیی بە هەبوونی کەسانێکی ئاوا زیرەك و لێزان و کارامە دەبەن. ئەمن بۆخۆشم ئێرەیی بە پاڵەوان وەلی دەبەم، بە مەستان. ئێرەیی بە مەستانیش دەبەم... ئەو نەبوایە هەتیوەکەی قۆرت بۆغام... جا وەرە ئەوجار قۆرت بۆغا بەخۆی و بیست و هەشت کوڕییەوە... ئەدی لە سایەی سەری ئەوانەوەیە ... بیست و هەشت کوڕ... ژن گاندەری و کۆنەحیز... بزەی لە لێوانی نارەوێتەوە و خەمی لێ میوان نابێ. گاڵتە بە هەمووان دەکات و تەوس و توانج لە هەمووان دەگرێ...

بە مێشەڵان و قامیشەڵان و بە نێو تووترکەکاندا گەڕا و خولایەوە. کیسەڵێك بە خشکە لە مێشەڵانەکە هاتە دەرێ. ماسیگرەیەکی درێژ و پەمەیی باڵەکانی سێ جاران لێ دا و هەستا و فڕی. ڕێوییەك قەپۆزی لە نێو تووترەکەکانەوە هێنایە دەرێ و کشایەوە. دوو خاڵی درەوشاوە لە پێش چاوی مستەفا بەگ مانەوە. مارێکی ڕەش لە حاڵێکدا جار نە جارێك سەری هەڵدێنا و لە دەوروپشتی خۆی دەڕوانی، بە فیشکەفیشك خوشی و ڕۆیشت و خۆی کرد بە نێو دڕووەڵانەکەدا.

خۆرەتاو لە ئاوابوونێ بوو کە گەڕایەوە نێو قامیشەڵانەکە. ئارەقەی شین و مۆری کردبوو. سەری بلەئیبۆ لە نێو دەوەنەکانەوە کەوتبووە سەر سینگی و دەتگوت وەنەوز دەدا. بەگ نەیویست رایچڵەکێنێ. مەستان و حەمدییش لە نێو قامیشەڵانەکەدا لە خەوی شیریندا بوون. چڵ و لکەکانی گوڵی پێنج چڵ، لە حاڵێکدا بۆن و بەرامەیەکی خۆشیان بە قامیشەڵانەکە وەردەکرد و لە بەر شنەی ئەو نەرمە بایەی بە سەر سینگی زەوییەکەدا دەکشا، هێدی هێدی دەشنانەوە. پەپوولە نارنجییەکە بەو چاوە درشت و دەرپۆقیوەکانییەوە هەر لەوێ لەسەر گوڵە بەرزەکان بەبێ هیچ جووڵەیەك نیشتبوو. چەند پەپوولەش وەك ئەو لەسەر پەلکی گوڵەکە نوستبوون. ئەوانی دی هەندێکیان باڵیان دەبزاوت و هەندێکیان لاقەکانیان بەسەری خۆیاندا دەکێشا. هەندێکیشیان بە شێنەیی لەسەر گوڵە زەرد و سپی و مۆر و خاڵدار و خۆڵەمێشییەکانی گوڵە پێنج چڵەکە دەنیشتنەوە و بە هێمنی دەفڕینەوە.

لە نکاو لە مەودایەکی نزیکەوە ئەسپێکی حیلاندی و حیلەی چەند ئەسپی دیکەشی بەدووودا بەرز بۆوە. لە پێشدا پەپوولە نارنجییەکە بەسپایی لە سەر پەلکی گوڵەکە هەڵفڕی و خولێکی دا و هاتەوە لە جێیەکەی پێشووی نیشتەوە. دوای ئەوە هەموو ئەو پەپوولانەی لەسەر گوڵەکان نیشتبوونەوە هەڵفڕین. دەتگوت وردە شووشە و پوولەکەت بە ئاسمانێ وەرکردووە... پەپوولە نارنجییەکە دیسان فڕییەوە و راست بۆ سەر و هەر بۆ سەر چوو و هەردی جێ هێشت و لە چاوان ون بوو.

ئەسپەکان پەیتا پەیتا دەیانحیلاند. ئەوانەی لە خەوێدا بوون، لە خەو راپەڕین و پڕیان دایە چەکەکانیان.

# ٣٢

وەلی شەماڵ لە پێشدا چووە ئەدەنە و سێ ڕۆژان لە کاروانسەرای عەشرەت مایەوە. لەو سێ ڕۆژەدا بەبێ ئەوەی بە ئاوی تروومپای حەوشە گەورەکەی کاروانسەراکە دەست و دەموچاوی بشوات، هەموو کۆڵانەکانی ئەدەنەی تەقاند*. لە کۆڵانەکاندا لەگەڵ منداڵان گوڵ قەندی خوارد و سەری بە هەموو کونێکدا کرد. کابرایەك بوو، دەتگوت دەمی چەقۆیە. دەموچاوێکی درێژووکەی هەبوو. چەند تاڵەمووی بە بەر چەناگە تیژەکەیەوە نووسابوو. یەکی چاوخڕ. دەست و لاقی درێژ و باریك بوون. وەلی شەماڵ لە ماسیگرێکی پەمەیی دەچوو. ڕۆژێکیان لە کەڕەی بەیانییەوە هەتا شەوێ لە بەرانبەر تاوەری کاتژمێرەکە راوەستا و چاوی بڕییە کاتژمێرەکە. ترسێکی لە رادەبەدەر لە دڵی گەڕا و بە دوایدا خەمێکی نامۆ لە ناخیدا پەپکەی خوارد. کە سەری هەڵێنا گەیشتبووە ڕێگەی مەرسین. وا دەڕۆیشت دەتگوت باڵی گرتووە. پێی وابوو سەریان لە دووی ناوە. بەر لە خۆر ئاوابوون گەیشتە مەرسین. کرێکارە تاوبردووەکان، سەریان داخستبوو و سەریان بەردابۆوە و لەبەر قرچەی تاوە گەرمەکە ئارەقەی شین و مۆریان دەرکردبوو و خەریك بوو دەمردن. وەلی شەماڵ چاوی بەرایی نەدا بیانبینێ. خەریك بوو ئاگری تێبەربێ بۆ ئەو بنیادەمانەی ناچار بوون کاری تاقەتپڕووکێن بکەن.

دیسان ترسەکە هاتەوە و لە ناخیدا خێوەتی هەڵدایەوە. ڕێبوار نەبوو دەمانچەیەکی پێ نەبێ و هەر دەتگوت بۆ کوشتنی وی هاتوون. هەر کەسێکی دەدی ئاوڕی دەدایەوە و خۆی کووڕ دەکردەوە و هەوڵی دەدا خۆی بشارێتەوە.

لە دوورەوە لە نێوەڕاستی کێڵگەی پەمۆکەدا پیاوێکی کەڵەگەت دادەهاتەوە و قیت دەبۆوە. وەلی شەماڵ شتێکی بەدەستی کابراوە دی کە دەبریسکایەوە. بەندی جەرگ و دڵی

* ئەوشارەم تەقاند: واتە هەموو ئەو شارە گەڕام. "تەقاند" زیاتر بۆ گەڕانی بەبێ راوەستان و بە شوێن شتێکدایە.

پسا. بەخۆی گوت ئەوە دەروێشە و چاوی بەسەر منەوەیە. هەنگاوەکانی خۆشتر کرد و بای دایەوە و بە نێو کێڵگە و لۆکەجارەکاندا بەرەو دەریای ناوەڕاست ڕۆیشت. ئەو تارماییە درێژە دیسان سەری لە دووی نابۆوە. هیچ ئاوڕی نەدەدایەوە. زۆر لە "تەرسۆس" دەترسا. تەرسۆس لە کۆنەوە لای ئەو، شاری تەلیسم و سیحرەکان بوو. ئەشکەوتەکەی ئەسحابی کەهف لەوێ بوو و هەر لەوێش بوو لوقمان دەرمانی نەمریی دۆزییەوە. شامار، پادشای مارەکانیش لە تەرسۆس بوو. تەرسۆس ئەوە نەبوو کە باسیان دەکرد. چۆن دەیتوانێ بەبێ ئەوەی بچێتە نێوشارەوە پێیدا بگەڕێ؟

کە چووە نێو باغێکی پرتەقاڵەوە، وەرسووڕایەوە و ئاوڕێکی دایەوە. کەسی نەدی. دڵی زۆر خۆش بوو. لە خۆشییان خێراتر ڕۆیشت. حەزی لێ بوو، دەیگوت بریا توانیبای بچێتە نێو تەرسۆسەوە... بەخۆی گوت:"بە خوای چاکم لەکۆڵ خۆم کردەوە. کوڕە ئەمن وەلی شەماڵم پێ دەڵێن... و ڕێك لەو کاتەدا بوو کابرایەکی مەڵەغان* بەدەستی لێ پەیدا بوو. وەلی شەماڵ دەسبەجێ لە ترسان لای دا. یەك پشوو لە بن لێوانەوە دەیگوت، هاوارە لە من. بەخوای تەڕ پێوە دەبووم. ئەگەر تۆزێك زووتر وەخۆ نەکەوتبام، پیاوەکەی دەروێش لە نێوەڕاستدا لەتی دەکردم. وەی باوکەڕۆ. باش بوو هەرچۆنێك بوو گیانە شیرینەکەمم نەجات دا....

بەڵام نا، ئەتۆ خەیالات هەڵیگرتووی... مۆتەکە گرتووتی وەلی شەماڵ. مێرووی سەر زەوی و مەلی ئاسمانێت لێ بووەتە پیاوی دەروێش. دەروێش هیچ کارێکی نەبوو وڵات بە وڵات وەدووی تۆ بکەوێ؟ بەڵام ئەی چ لە چاوەکانی ئەو کابرا مەڵەغان بە دەستە دەکەی؟ دیتت چۆن سەیری دەکردی؟ باشە کابرا پیاوی دەروێش نەبێ، ئاوا سەیری تۆ دەکا؟ جۆرێك وەك بڵێی دەیەوێ هەر ئێستا بتکوژێ و لەتوپەتت بکا. باشە پیاو لە باغی پرتەقاڵدا مەڵەغانی بۆ چییە؟ دەی بڵێ دەی، بڵێ وەلی شەماڵی بێ ئەقڵ. دەی بڵێ دەی، ئەو لەو باغە پرتەقاڵەدا مەڵەغانی بۆ چ بوو؟ خودا ئەو دوو لاقە گورجەی پێ داوی بەڵام خۆ ئەقڵی نەداویی. خۆ باغەوانەکە ناسیباتی و چووبایتە پێشتر، ئێستا لە نێوقەدەوە دوولەتی کردبووی. ترسەکە و خێراییەکەی وەك یەك بوون و چەندی ترسەکەی پتر دەبوو، خێراتریش ڕای دەکرد. لە پێش چاوی خوێن هات و سەری برد. لافاوێکی خوێنی پڕ لە سەر و لەش. بە تووتووش ئاوڕی نەدەدایەوە. کابرا درێژەکە بە مەڵەغانەکەوە کەوتبووە سەری. کابرا دەمانچەیەکیشی بە نێوقەدەوە بوو. خۆی لێ کردبووە باغەوان بۆ ئەوەی وەلی شەماڵ نەیناسێتەوە و بە بەردەمیدا

* مەڵەغان: کەرەنتوو. ئەو داسە دەسك درێژەی دروێنەی پێ دەکەن.

بڕوات و ئەویش بیگرێ و لەگەڵ دەرهێنانی چاوەکانیدا کەوڵیشی بکات و زمانیشی ببڕێت و تینووی بکات و هەتا قوڕگی لە گڵی بگرێت و... بیکوژێ. ئاخر ئەی بەگەکان، ئەی جانەوەرە وەحشییەکان، بەبەزییانە، چما ئێوە بنیادەم نین؟ چما دەزانن بەزەیی و جوامێری چییە؟ ئەو زوڵم و ناهەقییەتان لەپێناو چی؟ تەرمە خوێناوییەکەی وسێنی هاتەوە پێش چاوی. داهاتەوە بەسەر کانییەکەدا. دامەیەوە. وەرە وسێن. وەرە دەی، وەرە وسێن. کوڕە ئەوە گوێت لە دەنگی تەقە نییە؟ مەکە، وسێن، وسێنە رەش... سەری وسێن چووە نێو کانییەکە و هاتەوە سەرێ. ویزە ویزی فیشەك. فیشەکەکان گەرماکەیان دەبڕی و دایاندەپێژت. جۆگەلە جۆگەلە خوێنەکە تێکەڵی کانییەکە بوو. کانییەکە پڕ بوو لە خوێن. خوێن هەڵقوڵی. فیشەکەکان بە ویزە ویز گەرماکەیان دابێژ دابێژ دەکرد. وسێن هەڵبەزییەوە و دیسان چەند فیشەکی دیکەش ویزەی هات... سەری وسێن کەوتە نێو ئاوەکەوە... وەرە وسێن، وەرە رابکەین، کوڕە خێراکە وسێن، خێراکە با رابکەین... وسێن ئەژنۆی لەرزین... "یەکێکی دیکەشە... دووان بوون، ئەی هاوار، هاوار، ئەی ئەوە کوا ئەوی دی؟ ئەوی دی وەلی شەماڵ بوو. کوڕە دەی، خێرا بکەن دەرچوو. دەبێ بیگرین. دەبێ چاوی لە گلێنەیەوە دەربێنین... دەبێ پێستی سەری هەڵکەنین." وەلی دەرپەڕە. کوڕە هۆۆۆی بەگ، مستەفا بەگ، رابکە. وا دێن. سەیر بکە، سەیر بکە. لاقەکانی زەرد هەڵگەڕاون و شل بوونەتەوە. روخساری زەرد هەڵگەڕاوە و سەری شۆڕ بووەتەوە و زمانی لە زاری هاتووەتە دەرێ و درێژ بووەتەوە. چاوەکانی دەرپۆقیون، درێژ درێژ، درێژ، درێژ. بەگم، بەگی خۆم، مستەفا بەگی من رابکە. بڕوانە وا بە شوێنمەوەن. ئەمن دەرچووم ئەتۆی خۆت کۆ بکەوە. کوێ؟ کوێ؟ کوێ وەلی؟ ئەمن کوێم بێتە رێ رووی تێ دەکەم. دەچمە شوێنێك دەروێش و مەرگ نەیگەنێ. جێی وا هەر نییە. جێیەك مەرگ نەیگاتێ هەر نییە. ئەتۆ هیوات بەو لاقە گورجانەت بەستووە وەلی شەماڵ، کوێت پێ خۆشە بچۆ بۆ ئەوێ. بەڵام ئەوەندە بزانە هیچ کوێ نییە پێی مەرگی نەگاتێ. دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ.... هەموو بیستیان، سەرانسەری چوکووراوا گوێیان لێ بوو. دەنگی"دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ" لە رەوەزەکانی ئاناوەرزا گەڕا و دەنگی دایەوە. لە خاکی چوکووراوا و ئاوەکەی جەیهان و چیای نووری حەق و زێی بچووك و زێی گەورە و چیای گاوران گەڕا و دەنگی دایەوە. دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ، دەبێ هەبێ. ئەگەر هەبوایە مورتەزا بەگ دەیدۆزییەوە. هات و بە دەستی خۆی، خۆی رادەستی مەرگ کرد. هەنگی سووربا و لە سەر گوڵە ماهوورەکان و هەنگێکی رەش رەشیش، بە وزەوز، خڕ، بریسکەدار و مەیلەو سەوز... پەل ئەستوور و دەنگ زل. دەسووڕێتەوە

و دەخولێتەوە. دەخولێتەوە و دەسووڕێتەوە. ئاوڕێك بدەوە وەلی شەماڵ، وەلی شەماڵ هەر ئاوڕێك ناداتەوە سەیری دواوەی خۆی بکا. داسەکەی فڕێ داوە و دێ. کە لە تەرسۆس تێدەپەڕێ بای دەداتەوە بەرەو باشوور... ناوێرێ ئاوڕ لە دواوەی بداتەوە. خۆرەتاوە گەرمەکە لە ژوور سەری هەڵواسراوە... وەلی شەماڵ وشك بوو، تەڕایی لەبەردا نەما. زمانی وسێن درێژ بووەتنەوە و دەگاتە سەر خۆڵەکە. خۆڵاوی دەبێ... بارانێك دایدا. لە پێشدا بایەك هەڵی کرد، تەپوتۆزی هەستاند، لوولی دا و باهۆز و گێژەڵووکەی هەستاند. بارانێکی فێنك و زەرد و دەنك درشت و پەرش و بڵاو. تەپ، تەپ، تەپ. دەنك درشت، زەرد زەرد وەك دەنکی تەزبێحی کارەبایی. دڵۆپێك بگرەوە و سەیری بکە تا وێنەی خۆتی تێدا ببینی. دەموچاوی مردووەکە دەردەکەوێ. مردوویەکی بە دارەوە کراو و درێژ بووەوە لە با و بۆراندا دەشەکێتەوە. چەندی تەڕتر دەبێ، درێژتر و درێژتر دەبێتەوە. دەڵێی ئەوەندە درێژ دەبێتەوە تا لاقی دەگاتە عەرزی. سەری لەو ژوورە و لاقەکانیشی لەسەر عەرزی...

مەرسین. لافاوەکانی نوور. نووری گەڕۆك وەك ئاوی بەلێشاو. مەرسینی بەر لافاوەکانی نوور. لافاوی بەلرفە. دەریا وەك تیشکێکی شین هەڵدەستێ و دەنیشێتەوە. بارانە زەردەکە دەڕژێتە سەر نووری دەریا. دووکانەکان هەر کام بنیادەمێکی تەڕپۆش. لێواری دەریا نارنجی دەچێتەوە و نێوەڕاستەکەشی شین. کەشتییەکان لەسەری و لە رووناکییەکەدا بەمۆڵەق وەستاون وەك هەڵواسرابێن و لە بەر بایەکە هەڵدەستن و دەنیشنەوە. کەشتییە رەشەکان کە خوارەوەیان دەدرەوشێتەوە. کەشتییەکان بە هەواوە، لە نێوان رووناکایی و شیناییدا و بەسەر نارجییەکەوە... ئاوڕێکی دایەوە و سەیرێکی پشتەوەی خۆی کرد و بەهانکەهانك راوەستا. دەستی کردە سێبەری چاوەکانی. ترۆمبێلێکی رەش و خۆڵاوی و گەورە کە چراکانی داگیرساندبوو، چەند هەنگاو لەولاترییەوە رایگرت. فڕۆکەیەك بە دەنگێکی کە لەوانەبوو گوێ کەڕ بکا، نزم نزم تێپەڕی. خۆی لە بایەوانی هەڵدراوی کەشتییەکان خشاند و تێپەڕی. کچێکی چاو گەورەی مژۆڵ خۆڵاوی لە ترۆمبێلەکەدا دانیشتبوو. پیاوێکی خەپۆکەش کە بەرچێڵە (غەوغەو)ی بەلادا کەوتبوو و بن چاوەکانی مۆر ببوون، دەستی کچەی لە دەستە زلەکانی خۆی گرتبوو و هیچ ئاگای لەخۆی نەبوو. خەریکی رابواردنی خۆی بوو. کچە لێوی خوارەوەی داچۆڕابوو و نێوقەدە باریکەکەی و... قژیشی لە پشتەوە کۆ کردبووەوە. پێدەکەنی، بەڵام بە زۆری. قڵفەزەردەکەی قایشی پانتۆڵەکەی وەك قوڵێنگ دووسەر بوو. کچە، کە پێدەکەنی، قوڵێنگە دووسەرەکە لەسەر نێوکییەوە هەڵدەکشا و دەهاتەوە خوارێ.

کچە وا پێدەکەنی دەستی بە زگییەوە دەگرت، دەتگوت ختۆکەی دەدەن. کچە دابەزی و لەبەر بارانەکە راوەستا. تۆزی سەر مژۆڵەکانی شۆرانەوە و کەوتە سەر کوڵمەکانی.

وەلی شەماڵ بە نێو حەشامەتەکەدا رێچکەیەکی بۆخۆی کردەوە. حەشامەتەکە لە لایەکەوە بۆ لایەکەی دی دەجمی و شەپۆلی دەدا. قەتارەکە دووکەڵێکی خەست خەستی دەردەدا. ئاسنەڕێیەکە تا چاو هەتەری دەکرد، کشابوو. بە درێژایی رێیەکە، کەپر و سەیوانی لاولاو تێ ئاڵاو و بۆن و بەرامەی سەرخۆشکەری گوڵەکانیش لە قووڵایی گەرماکەدا نیشتبووەوە. لە نێوان رووناکاییەکەی ئەوبەری ئاسنەڕێیەکەدا تارمایی پیاوێك دەرکەوت. تارماییەکە هەر هات و گەورەتر بۆوە و بریسکەی دەمانچەکەی، یان لەوانەیە شمشێرەکەی، لەوانەشە خەنجەرەکەی و بەشکم... ــەکەی تێکەڵی هێڵە لەبڕاننەهاتووە بێ کۆتاییەکانی ئاسنەڕێیەکە دەبوو. تارماییەکە زۆر خێرا بەرەوڕووی دەهات. وەلی شەماڵ دەسبەجێ گەڕایەوە و وەڕێ کەوت. بەبێ ئەوەی بزانێ بەرەو کوێ دەڕوات و بەکوێدا دەڕوات. رۆیشت و رۆیشت کە سەری هەڵێنا گەیوەتە قەراغ دەریا. کەشتییەکان کە دەتگوت بە هەواوە هەڵواسراون، بەسەر دەریاکەوە بوون. بارانە زەردەکە لێی کردبۆوە. لە لێواری دەریاکە، لە سەر لمەکە دانیشت و شووتییەکی شکاند و بەنانەوە خواردی. سەری هەڵێنا و لە نەکاو دیتی ئەوە کابرای مەڵەغان بەدەست، بەرانبەری راوەستاوە. درێژ درێژ و زەبەلاح و سامناك. رووی کردە دەریا. سەری لەگێژەوە هات. کەشتییەکان هەڵکشان و دیسان لە نێوەڕاستی دەریاکەدا راوەستانەوە. چووە پێشتر و پێشتر و ئاوەکە گەیشتە گەرووی. دەریاکە لە نەکاو نیشتەوە و وشك بوو. شەقار شەقار بوو. دەریاکە بوو بە هەڵم و چووە ئاسمان و کەشتییەکان لە هەڵمەکەدا توانەوە و ون بوون. جێی بەتاڵی دەریاکە رەش داگەڕا. وشك وشك، شەقار شەقار و قەڵشیو و تا چاو هەتەری دەکرد رەش رەش. دەریاکە لە نەکاو دەکرایەوە و هەڵمی دەکرد و دەکرایەوە. بەرەبەری بەیانی، ئەو کاتەی پێیەکانی هەتا گوێزینگانی لە خۆڵە نەرمەکەی کێڵگەیەکی لۆکەی پشکووتوو دەچووە خوارێ و بن پێیانی دەبرژانەوە و لە دوورەوە گوێی لە گۆرانییەك دەبوو و ماسیگرەیەکی پەمەیی بە مل و لاقە درێژەکانییەوە و بە دەندووکە رەقەکەیەوە لە نێوان رووناکاییەکدا کە هێدی هێدی دەپرژا، بەسەر عەرزەکەدا دەڕۆیشت و باڵی لێك دەکردنەوە بۆ ئەوەی بفڕێ و تۆزێك دەفڕی و دیسان دەنیشتەوە، پیاوێك لە بن دەوەن و تووترکەکانی ئەو بەرەی گردەکەوە هاتە دەرێ. وەلی شەماڵ هەر کابرای دی، گەڕایەوە. هاوارە لە من، کوڕە خۆ ئەوە دەروێشە. دەروێش خۆیەتی. خۆی. ملی رێگا پڕ لە خاك و خۆڵەکەی گرت. لاقی تا ئەژنۆی لە خۆڵەمڕەکە رۆچوو. وەلی شەماڵ جار نەجارێ دەکەوت و لە خۆڵەمڕەکە دەگەوزی و هەڵدەستایەوە و دیسان تێی دەقووچاندنەوە. ئەسپێکی بەلغاو

و پاشقوون و کەفەڵ خۆڵاوی، چاوەکانی وەك یاقووتی سوور کە ددانەکانی گڕ کردبوونەوە، سەری لەدوو نابوو. هەناسەی گەرمی ئەسپەکە دەگەیشتە پشتەستۆی و دەیسووتاندەوە. دەروێش بەگیشی سوار بوو. ئەو بوو. خۆی بوو. دەروێش بەگ نەبێ ئەی کێیە؟ ئەو نەبێ کێی دیکە ئاوا ئەسپ دەئاژورێ؟ خۆی بە لێڕەکەدا کرد. دیسان هەناسەی گەرمی ئەسپەکەی لەسەر پشت ملی بوو. لە مێشەڵانەکەوە گەیشتە زۆنگاوێك. هەناسەی ئەسپەکەش لە سەر ملی. گەیشتە ئاوێکی بەخۆڕ. ئاوێکی کەفچڕێن و زۆر. خۆی بەئاوەکەدا دا. نوقم بوو و هاتەوە سەرێ. نوقم بوو و هاتەوە سەرێ و گەیشتە تەنگەڵانێك. لێرە ئاوەکە بە نێو گاشەبەردی نووك تیژدا تێدەپەڕی و دەبووە تاڤگە. دەنگی خرمەی ناڵی ئەسپان هات. خرمی ناڵ و بزماران لە گابەردەکاندا دەنگی دەدایەوە. وەلی شەماڵ تاوێك چاوەکانی لێك نا.

ئۆرفە، "عەین زولەیخا"... ماسییەکان تێك دەچرژێن. ئاگرێك بەرزی وەك کێو گڕ گڕ دەگرێ. خەرمانەی ئاگرەکە لە گۆشەکەی دیکەی دەشتەکەوە و لە بیابانی عارەبستانیشەوە دەبینرێ. گەنجێکی لۆق درێژ، چاو گەورە و مامز پەروەردە، با ردێنێکی لوولی مەیلەورەش، پێخاوس، عابایەکی سپیی لەبەر و دڕکێکی درێژ و رەشی پڕ لە چقڵ و ئاگراوی بەدەستەوە...

گەورەکراو بە شیری مامز لە ئەشکەوتدا و بە چالاکی و لە میزۆپۆتامیای گەورەدا و هاوڕێ لەگەڵ هەزاران مامز. سەردولکەبێژ و بێژەری گۆرانیی ئاسکان... برایم خەلیلی پێغەمبەر، کوڕی ئاسکان و بنیادەم، لەشکرێك بنیادەم بەشوێنییەوە. لە پشت هەر دەوەن و بەرد و هەور و گێژەڵووکەیەکدا، سێبەری بنیادەمێك. برایم خەلیلی پێغەمبەر، بە هانکەکان و بەغاردان و خەرمانی ئاگر. وەچەی پێغەمبەر براوەتەوە. لە نووح بەولایەوە.... بە دوایدا دەنگی خرمەی ناڵ و بزماران... هەڵکێشان و داهێنانی شمشێری لەکالان دەرکێشراو... شمشێرگەلێك کە لە دەشتی میزۆپۆتامیادا دەڕوێن. هیچ کەس، هیچ شمشێرێك، هیچ ئەسپێك ناوێرێ شان بدات لە شانی برایم خەلیلی مامز پەروەردە و هاوڕێ و هاودەمی ئاسك و مامزان. بە ردێنێکی رەش و لوولەوە، بە چاوی گەورەوە، شا بەڕوویەکی رەشی تەڕ و تورت، ماندووی راکردن و غاردان، سەرداخستوو... داماوە بە سەری داخستوو و ملی بەلارەوە ناوەوە، دێت و خۆی بەدەستەوە دەدات. مەنجەنیقیان بۆ دامەزراندووە لەسەر چیا و دەیخەنە نێو خەرمانی ئەو ئاگرەوە کە هێندەی کێوێکەوە و بڵێسەی دەچێتە ئاسمانێ و سێبەرەکەشی بە دواوەی... ئاگرەکە دەبێتە ئاو و دەستەچیلە و ئاوردووەکانی دەبنە ماسی و گوڵی گوڵستان دارستانێکی بەرز و فێنك... و برایمی خەلیلیش لە نێویاندا.... سێبەری شمشێرێکی رووت بە دەستەوە... و شمشێر دێ بگاتە بێشکەکە و مامزان منداڵکە دەڕفێنن

و خێرا دەیگەیێننە مەزرا... شمشێرە راکێشراوەکە ئامادەی داهاتنە. مندالّەکە هەلّدەدا و پێ دەگا... بە ردێنێکی لووی رەش و چاوی گەورەی هێندەی بەڕوویەك، روخسارێکی گەش و کێل گەردن و کەلّەگەت... لە رەچەلّەکی ئاسکان. شمشێرە بریقەدارەکە رووت رووت بەسەر سەرییەوە و ئامادەی هاتنە خوارێ... و مایەی پیت و بەرەکەت، پشکووتن و شینکایی و پنج داکوتان بە قوولایی خاکدا و رووناکاییەکی روو لەگەشە لە سەر عەرز، لە ناخی برایمی خەلیلدا شاراوەیە. لەو خاکەوە کە پێی گەیشتووەتە سەری و لەو هەوایەدا کە دەستی گەیوەتێ، ئاوێکی بە لرفە هەلّدەقولّێ.

وەلی شەمالّ هەر چنگێك ئێسك و پێستی لێ مابۆوە. ماندوو و شەکەت و بڕستی لێ بڕابوو و زایەلّەی دەنگی نالّی ئەسپەکان لە مێشکیدا دەگەڕا.... دەتگوت ئەسپەکان سمیان لە سەر و مێشك و پەردەی گوێچکەی دەکوتن... برایمی خەلیل خۆی بەدەستەوە دا. خۆی بەدەستەوە دا. برایمی خەلیل رووی کردە نەمروود. بەرەو لای نەمروود چوو. سێبەرەکەی بە شوێنییەوە. لە مەرسینەوە ئاوڕی نەداوەتەوە. لە چیاکان تێپەڕی و هاتە ماراش. سێبەرێك بە دوایەوە بە شمشێرێکی لە کالان دەرکێشراوەوە کە هەر ئێستا نا ئێستا دەیتوانی لێی راکێشێ. بە دوو شەوان خۆی گەیاندەوە ئاواییەکەی مستەفا بەگ. نیوەشەوێ دۆزییانەوە گوتی:"بڕوانە، بڕوانە، بڕوانە، دەدرەوشێتەوە. ویستیان حەزرەتی برایمی خەلیلمان لێ بکوژن. بەبە. دایکەکەی خستییە نێو بێشکەیەکی چێوییەوە. بە نەمروودیان گوتبوو ئەتۆ بە دەستی کوڕێك تێدادەچی، کە ئەمسالّ لەدایك دەبێ. ئەویش گوتبووی کێیە؟ گوتبووی نابێ. چونکە ئەوەش رێگەچارەی هەیە. دایکی مندالّەکەی خستە بێشکەیەکەوە و سەری داپۆشی و بە دەم ئاوەکەی دادا. بە فەرمانی نەمروود هەموو ئەو مندالانەی ئەو سالّە لەدایك ببوون، کوژران. ئاوەکە بێشکەکەی بردە نێو ئەشکەوتەکەوە و لە تاریکترین قوژبندا گیرسایەوە. مێوەئاسکێك کە لەوێ بێچووی ببوو، مندالّی نێو بێشکەکەی دی و مەمکی دا بەویش. مندالّەکە هەلّی دا و بوو بە گەنجێکی وەك مامز. ئەو چیرۆکە گەیشتەوە گوێی نەمروود. گوتیان ئەو تاقانە کوڕێکی لە دایکبووی ئەو سالّەیە، کە گیانی دەربردووە... و ئێستاش من، بەگم، مستەفا بەگ، من، من، وەشوێن دەروێش بەگ دەکەوم. جارێ دەبێ پاروە نانێك بخەمە بەر دلّم و خۆم تێر بکەم. دوای ئەوە دەکەومە شوێن دەروێش بەگ. تا ئێستا پێی لە مالّی نەناوەتە دەرێ، ئاگادارت دەکەمەوە. بڕوانە، بڕوانە، ئەو پیاوەی بە شوێنمەوەیە، ئەوەی سەر پشتم، دیتت؟ وا باشترە ئەو بکوژم. چار نییە دەبێ بیکوژین و نەجاتمان بێ."

مستەفا بەگ گوتی:"چاوەڕێم. چاوەڕێیم. لە قامیشەلاَنەکەدا. سەبر، سەبر، بە سەبر و دانبەخۆداگرییەوە چیاکان رێك دەبن. سەبر. قرچەی گەرمای نێو قامیشەلاَنەکە. وەڕەزم. سەبر. باش بوو. پێم وابوو مردووی. سەبر. وسێنیان بە دارەوە کرد. سەبر. بەر لەوەی چەقۆ بگاتە سەر ئێسقان. بەر لە مەرگی دایکم. بەر مردنی ئەو... ناشتوانێ بمرێ."

گوتیان:"ناشتوانێ بمرێ."

"برۆ، بەلاَم بەجوانی ئاگات لێی بێ بزانە چ دەکا."

وەلی شەماڵ لە وەلاَمیدا گوتی:"خەمت نەبێ. کێ لە من باشتر دەتوانێ ئاگای لێی بێ؟ ئەگەر ئەو نەمرێ، ئێمە دەمرین. بڕوانە، بڕوانە، ئەو، ئەو، ئەو، لەبەر درەگاکە راوەستاوە، دیتت؟"

"لەکوێ بووی؟"

:"برایمی خەلیلی پێغەمبەرمان رێك کەوتە سەر کڵی ئاگرەکە. کۆمەڵێك شمشێری لەکالان دەرکێشراو بە ژوور سەرییەوە..."

مستەفا بەگ گوتی:"بە لێ لێ یێ."

"تا لە ماڵەکەی نەیکێشمە دەرێ، نایەمە ئێرە. ناچمەوە ماڵێ. چاوم بە ژن و منداڵەکەم ناکەوێ. ئەو دەمکوژێ."

مستەفا بەگ گوتی:"ئەمنیش. ها ئەو پارەیە. هانێ وەلی شەماڵ وەریگرە. بەکارت دێ. نیوەی بدە بە ژن و منداڵەکەت و بە نیوەکەی دیکەشی ئەسپێك بکڕە..."

وەلی شەماڵ هەر چنگێك ئێسك و پێستی لێ مابۆوە. پێکەنی. ددانە سپییەکانی و ردێنە نووك تیژەکەی و روومەتە دەرپەڕیوەکانی و چاوە مەڕییە بەقووڵداچووەکەی هەر هەموویان وێکڕا پێکەنین.

وەلی گوتی:"پێویستیم بە ئەسپ نییە. بۆخۆم خێراتر را دەکەم. ئەتۆ دەمانچەیەکم بدەیە."

مستەفا بەگ دەمانچەیەکی لە بن بالیفەکەی خۆی دەرهێنا و گوتی:"ها، ئەوەش دەمانچەیەکی باشە. دەمانچەکەی مورتەزا بەگە. بیگرە. ئەگەر بەکارت دێ هانێ.... بەر لەوەی رۆژ بێتەوە من لە قامیشەلاَنەکەم. ئەمڕۆ دێ. لە دڵم چەقیوە ئەمڕۆ دێ. ئەویش رێ و راست بەرەو لای من. دەروێش ئەمڕۆ دەکوژرێ. دایکم بە چاوەکانی دەیگوت کە دەروێش دەمرێ. دەمرێ. ئەتۆ برۆ. ئەگەر سۆراغێکت لێی زانی، وەرە ئاقچاساز و فیکەیەك لێ بدە. لە هەر کوێ بم دێمە دەرێ. وەك کەناری فیکەفیك بکە..."

# ٣٣

ئەوە بۆیە چاوەکانت

هەر لە چاوی مامز دەچن

مێروولە رەش و زل و قەڵەوەکان لە شارەکەیان لە بن دەوەن و چڵی گوڵە پێنج پەڕەکانەوە هاتبوونە دەرێ و بە دەوری سەماوەرە لەکوڵەکەدا، رێچکەیەکێکی هێندەی دوو پەنجەیان کردبووەوە و بەرەو قامیشەڵانەکە غاریان دەدا و دەنکە گەنمی سوور سووریان، کە لەبەر با و باران تۆزێکیش کاڵ ببوونەوە لە خەرمانەکەی تەنیشت لێڕەکەوە بەحاڵی سەگ دەکێشایەوە و ملەیان لەگەڵ دەنکە گەنمی لەخۆیان زلتر دەکرد و بە ئاسانی نەدەبەزین. بۆ ئەوەی لاق ورد و باریکەڵە، بەڵام بەهێزەکانی خۆیان لە عەرزەکە گیر بکەن، تەپوتۆزێکیان هەڵدەستاند کە خۆیشیان بە چاوە درشت و شووشەییە بریقەدار و دەرپۆقیوەکانیانەوە، بە سەلکە زلەکانیانەوە و بەو دوو شاخۆکە باریکەیانەوە، نوقمی هەوری تۆز و خۆڵەکە دەبوون. سەدان هەزار مێروولە کە لە سەر رێ تووشی یەك دەبوون، بۆنیان بە یەکترییەوە دەکرد و دوای ئەوە دوو مێروولە پێکەوە قەفی زاریان لە دانەوێڵەیەك قایم دەکرد کە لەسەر رێیەکە کەوتبوو و نەدەجوولا و هەر دەیانبزواند، دەتگوت شەپۆلێکی شادی و رەزامەندی لە لاقە باریك و پڕ لە هەوڵەکانیان دەگەڕێ. ئاخرییەکەی پاش سەرکەوتن و داگەڕان لە وردەبەرد و گلمتکەکان، دەگەیشتنەوە هێلانەکاینان. هەر مێروولەیەکی لە هێلانە دەهاتە دەرێ، بۆنی بەو دەنکە گەنمەوە دەکرد، کە هێنرابوو و لەسەر شارەکە دانرابوو و ئەوجار شاخۆکەکانی خۆی بۆ ئەمەگداری، لە شاخۆکەی ئەو مێروولەیە دەدا کە هێنابووی و بەدەوری دانەوێڵەکەدا دەخولایەوە، جا لەو دەوروبەرانە دەستی دەکرد بە گەڕان.

لە دەوروپشتی شارەکە، وردە چەو و زیپکە خۆڵی ڕەش، کۆگا کۆگا کەڵەکە ببوو. چەند کۆگایەك بچووکی خۆڵ وەك شوورایەك شارە مێروولەکەی لەخۆ گرتبوو. سەر ئەو کۆگا بچکۆڵە خۆڵانە کە لە دوورەوە دەتگوت ساوارن، پڕ بوون لە جەستە و پەڕ و پاڵی وشکەوەبووی جڕ و جانەوەر و دانەوێڵە و گەنم و تۆوی گوڵ و....

مستەفا بەگ لە سەر زگ ڕاکشابوو و چاوی بڕیبووە شارە مێرووەکە و هۆشی یەکسەر بەلای ئەو مێروولانەوە بوو کە تێك چڕژابوون. مێروولەیەکی سوورباو خەریکی قالۆنچەیەکی مردووی پڕ لە نەخش و نیگار بوو، کە تیشکەکانی هەتاو ورد ورد و بە هەزار بریسکەوە تێیدا دەبریسکایەوە. لاشەی قالۆنچەکە لانیکەم پازدە هێندەی مێروولە بچکۆڵەکە دەبوو. لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا هەر ئەوەندەی توانیبوو، هێندەی سەرە پەنجەیەك بیبزوێنێ. مێروولە بچکۆڵەکە ئەمڕۆ بەیانی قالۆنچەکەی گەیاندبووە نێو قوڵکەکەوە و کارەکەی خۆی ئەستەمتر کردبوو. مێروولە قوڵفەی زاری لە جێیەکی ئەندامی قالۆنچەکە گیر دەکرد و قەوەی دەدایە خۆی و لاقە باریکەکانی لە سەر عەرزەکەدا دەگرت و چنگی لە عەرزەکە قایم دەکرد و تەپوتۆزی دەکرد و سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی خۆی نەیدەتوانی قالۆنچەکەی ببزێوێ. قالۆنچەکەی وەك گابەردێکی قورس کەوتبووە نێو قوڵکەکەوە. مێروولەکە بە تاقەتەوە تین دەداتە خۆی، بەری دەدا و لاقەکانی بەسەەر شاخۆکە و چاوە دەرپۆقیوەکانی و سەری خۆیدا دێنێ، چەندین و چەند جاران بە دەوری قالۆنچەکەدا دێ و بۆنی پێوە دەکا و هەوڵ دەدا و کاتێ گیرگەیەکی لەبار دەدۆزێتەوە، دیسان شێلگیرانە دەست پێ دەکاتەوە و دەیگرێ و قەوەی دەداتێ و دیسانیش قالۆنچەکە هەر نابزوێ. بەڵام مێروولەکە دەستهەڵگر نییە و واز ناهێنێ و ئەوەندەی دەکێشێ هەتا ملی درێژتر و درێژتر دەبێتەوە و ترسی ئەوەیە هەڵکەندرێ. دەڕوات و ئاخرییەکەی ماندوو و بڕست لێ بڕاو دەکەوێ و لە تەنیشت قالۆنچەکەوە پاڵی پێوە دەدا و بێ جووڵە دەمێنێتەوە:

مێروولەکە دوای ماوەیەکی زۆر، خۆی لێ بادا و لە قالۆنچەکە دوور کەوتەوە و دەستی بەسەر شاخۆکە و چاوەکانی و قڵفەی زاری خۆیدا کێشا. دەتگوت ئارەقەی کردووە. وەك بڵێی زگە بڕگەبڕگە و تۆزاوییەکەی ئارەقەی کردبێ. مێروولەکە تاوێك هەر وا لە سەر جێیەکەی خۆی مایەوە و دوایی وەڕێ کەوتەوە و وەك بڵێی ئەوە هەر قالۆنچەکەی جاران نییە، کە ئەوەندەی پێوە خەریك ببوو و بڕستی لێ بڕابوو، دەستی کرد بە خولانەوە بە دەوریدا و بە سەر باڵەکانیدا و بە سەر پشتی و چاوە وشك و ڕەقەڵاتووە بریقەدارەکانیدا. تاوێك سەری هەڵێنا

وەك بڵێی بۆنی بە هەواوە کردبێ و چەند جارێك قولڤەی زاری لێك کردەوە. دەستە بچووکە گڕنی گڕنییە ناسکەکانی لەرزین. دەنگێکی وەك وزەوزی زەردەواڵەی لەخۆی دەرهێنا. لەوانەشە دەری نەهێنابێ. ئەوجار سەری داخست وەك بڵێی لە چیایەك بێتە خوارێ، وەك سەردارێکی شکستخواردوو، لە سەر قالۆنچەکە هاتە خوارێ. سەر و زاری قالۆنچەکەی پشکنی و قلڤەی زاری بردە نێو شانەی زاری قالۆنچەکەوە و تینێکی دایە و دیان بەری دا. بۆنێکی پێوە کرد و وازی هێنا و گەڕایەوە و بەسپایی و بلێ و نەلێی بە لارەوە لارەوە لە بن سێبەری قالۆنچە مردووەکە، کە بەرەو باشوور راکشابوو، هاتە دەرێ و ماندوو شەکەت لە لێواری قولکەکەوە وەسەر کەوت. تاوێك لەوێ راوەستا و ئەوجار لە نەکاو وەڕێ کەوت و بەخێرایی گەڕایەوە و دیسان خۆی بە قالۆنچەکەوە نووساند و کەوتەوە هەوڵ دان. دیاربوو ئەمجارەیان شێلگیرانەتر و بەبڕیارێکی لاسارانەوە دەستی پێ کردووە. کۆمەڵێك مێروولە بەنێو و بە قەراغی ئەو قولکەیەدا تێدەپەڕین و جاری وابوو شل دەبوونەوە و سەیرێکیان دەکرد و هەندێکیان بۆنێکیشیان دەکرد و ئەوجار وەك هیچ نەقەومابێ، ملی رێیان دەگرت و دەچوون بە دوای کاری خۆیاندا. هیچیان ئی ئەوەی نەبوون چاوەڕوانیی یارمەتیت لێیان بێ. لەوانەشە گاڵتەیان بە هەوڵەکانی مێرووە بچکۆڵەکە هاتبێ. مێروولە زل و خاراوەکان بەبێ ئەوەی بەلایانەوە گرنگ بێ، بە تەنیشت مێروولە بچکۆڵەکەدا کە خەریك بوو خۆی دەکوشت تێدەپەڕین. مێروولە بەئەزموون و دنیادیتەکان وەشوێن رسقێك دەکەوتن کە بتوانن هەڵیگرن.

ئاخرییەکەی چ دەقەومێ؟ مستەفا بەگ بە دەم هەڵقوڕاندنی چایەکەیەوە لە مێروولەکە ورد ببۆوە. هەژا بوو. ئاخۆ ئەمڕۆ مێروولەکە دەتوانێ قالۆنچەکەی لەو قولکەیە بێنێتە دەرێ؟ ئاخۆ دەروێش بەپێی خۆی بەرەو لایان دێ؟

مەستان لە گەرمایەکی تاقەتبڕدا، لە تەنیشت کەنگرێکی گەورە و رەش، لە بن ئەو تووترکانەی لە گوڵە پێنج پەڕەکە هاڵابوون، لە نێوان خەو و بەخەبەریدا چاوەڕێی دەروێش بەگ و نوقمی خەیاڵەکانی خۆی بوو. رێك بیست ساڵ بوو. رێك بیست ساڵ... لێدە، بکوژە، کەڵەگایی بکە، دەمتەڕی و ماستاوچێتی بکە و... ئەی ئاخری؟ ئاخرییەکەشی بستێك خاك. منداڵەکانیش وەك خۆت، هە ی ی ی ی ، ئاخرییەکەی؟ ئاخرییەکەی چی؟ هەر ئەو کارە تەواو بێ، دەچمە لای مستەفا بەگ و پێی دەڵێم ئەوە ئەم کارەش تەواو بوو. بیری لێ بکەوە بەگ. بزانە چەندەم خزمەت کردووی؟ هەتا ئێستا بە ئەمری تۆ چەند کەسم کوشتتووە؟ بیری لێ بکەوە بەگ. بیری لێ بکەوە چاو رەش. بیری لێ بکەوە ئەی ئەو کەسەی دڵێکی دوو لکت

هەیە. کە دوو نا بەڵکو چوار دڵت لە سینگی دایە. دەروێشیش کە لە نێو بنیادەمەکاندا، نەجیم بوو وەك ئەسپی عەرەبان لە نێو ڕەگەزەکانی دیکەی ئەسپدا و لە ڕێیەکی هەزار ساڵەوە هاتبوو، ڕۆیشت. بڕوانە، ئەمن مەدەرە دەست سەلاحەدین بەگ، کە لە ترۆمبێلی حەمە عەلی دادەبەزێ. ئەوانە لە برسمان دەکوژن. ئازادم بکە. شتێکم بدەیە پێی بژیم و بەرەڵڵام بکە. ئیتر بەشمە. بڕوانە، ئەوە چەند ڕۆژ و حەوتووە لێر ملم خوارکردووەتەوە و لە بن دەوەنێك خۆم مات کردووە و وەك دارێکی نیوەسووت، وشك هەڵاتبووم و ڕەش هەڵگەڕاوم. وەرە دەروێش، دەی وەرە و تەواوی بکە دەروێش. بەنۆکەرت بم دەروێش وەرە. ئیتر تەمەنم بەسەر چوو و تاقەتم بڕا. وەرە ئیتر. وەرە. هەر دێی. دێ. وەرە هەی سەگی کوڕی سەگ. خۆ هەر دەبیتە نێچیری مەرگ. نەجاتبوونت نییە. مەمدەرە دەست حەمە عەلی و سەلاحەدین. ئەمنیش وەك هۆزەکەت چارەڕەش و داماو دەکا. بەگ و پاشاکان هەر لە کۆنی کۆنەوە خوویان بەوەوە گرتووە گوێیان لە شیوەن و ناڵین و کڕووزانەوەی هەژاران بێ... گوێت لێیە؟ گوندەکە چۆڵ بوو، بەگ. نیوەی ڕەعیەتەکانت سەری خۆیان هەڵگرت و لێیاندا و ڕۆیشتن و هەر ئاوڕێکیشیان نەدایەوە. بە تووتووش بەلای تۆدا نەهاتنەوە. چونکە دەیانزانی ئیتر ئەتۆ و قەرەقیزخاتوون هیچتان لەدەست نایە و حەمە عەلی، ئەو حەمە عەلییە پارەپەرستە قسەی دەڕوا. ئەتۆ ئیتر هیچ. هیچ نی. ئەتۆ ئیتر لەخۆڕا هەراهەرا دەکەیت. ئەتۆ ئیتر هیچ کارە نی. حەمە عەلی دەمڕاستە. دوای ئەوەی حەمە عەلی هەرچی بڵێ هەر وا دەبێ. هەر واش بووە. حەمە عەلی گوندییەکانی وا جڵەو کردووە کە هەر هەموو کەوتوونەتە بەر پێیانی و دەستیان کردووە بە لالانەوە و پاڕانەوە. ئەو دەردە بە ئێمە مەدە، بەگ، بەگزادەیی مەکە. مەیکە. باشە، ئێمە زۆر زوو، واز لە گوند و لە هۆبە و هەوار باب و باپیرانمان و لە ماڵ و حاڵی خۆمان دێنین و ئەوەندە دەڕۆین مەگەر خودا بزانێ. بەڵام مستەفا بەگ نەکا، باباغات ببیستێتەوە یان قەرەقیزخاتوون ببیستێتەوە، نەکا پێش بە ڕۆیشتنمان گرن. نەکا ببیستنەوە کە ڕسق و ڕۆزیی ئێمە حەواڵەی شوێنێکی دیکە کراوە... ڕۆیشتن مستەفا بەگ، بە ویستی خۆیان ڕۆیشتن. بەڵێ، ڕۆیشتن. دەی ڕۆیشتن بەغدا نیوەی ڕێیان بێ. هە هە هە هە هە . یانی دەیانگێڕییەوە؟ ئەگەر بتەوێ ئەمنیش وەك ئەوان لێ بکەی، ئەو سەودا و معامەلەیە پێنج فیشەکی خەرج تێدەچێ. دووانیان لە چاوێك و دووانەکەی دیکەش لە چاوەکەی دیکەت و یەکێکیشیان ڕێك لە تەختی نێوچاوانت. چما خۆت ئێمەت نەکردووەتە شەڕکەر؟ ئەگەر بتەوێ دەرم بکەی، جگە لە تەقەلێکردن چیی دیکەم لەدەست دێ؟ هیچی دیکە فێر نەبوومە کە... کە... کە.. هانێ، هانێ دەی. مەستان هەستا

دانیشت. قرچەی لە ئێسکەکانی هەستا. ئەوە چەند ساڵێك بوو مەستان هەرکاتێك هەڵدەستا و دادەنیشت، ئێسکەکانی قرچ و هۆڕیان لێ هەڵدەستا. هەر سێ کوڕەکەم لەسەر تۆ تێدا چوون. هەر سێ کوڕەکەم هەر لەبەر ئەوەی کوڕی مەستانن، بە ئەمری دەروێش بەگ کوژران. هیچ درێغیمان لە دۆستایەتی و راستگۆییدا بەرانبەرت نەکردووە. گوتمان بەگمانە، سێ کوڕ سەهلە گیانیشمان، ماڵیشمان، دار و نەداریشمان بە قوربانی تاڵە موویەکی بەگمان بێ. بەڵام ئیتر لێیتان هیوابڕاو بووم. ئاااخ دوای ئەو هەمووە ساڵە تازە وەئاگا هاتوومەوە. بە چاوەکانی خۆم دیتم، کە گوندی و نیوەکارەکان چۆن لەبەر حەمە عەلی دەپاڕانەوە و ئەویش لە پشت سوکانی تەراکتۆرە نارنجییەکەیەوە دانیشتبوو و پۆزی لێ دەدا و بزیەکی تەوساویی دەهاتێ و گاڵتەی پێیان دەهات. ئەو پیاوە هەڵۆئاسایانە وەکوو کۆیلە لەبەر ئەو پارەپەرستە دەپاڕانەوە. هەر کام لەوانە کەسێك بوون کە بێ ئەملا و ئەولا بە دڵنیاییەوە ئامادەبوون و گیان و ماڵیان بە قوربانی بەگەکەیان بکەن. نە پێستی سەگ بۆ دەباغی و نە ئاغاش بۆ دۆستایەتی دەبن.

ژیانمان بە زایە چوو. ئاخرییەکەی ئەقڵمان هاتەوە بەرخۆ، بەڵام کاتێك هاتەوە ئیتر عومرمان نەمابوو. سێ کوڕیشم بە دەستی خۆم بە قوربانی ... کەر کرد. سێ کوڕ.... قەرەقیز خاتوون کچی ئاغا رەسەن و بەروپشت ئەتڵەسەکانە. لێی سواری ئەسپێکی عەرەبی دەبوو. دەمانچەیەکی لە قەدی دەدا... وەك پیاوان ئەسپی دەئاژوی. سەربەرز. وەك غەڵفێك* لەسەر پشتی ماینێکی عەرەبی دادەنیشت. دەتگوت پڵینگی مێیە. ئێستاش سەیری ئەو خوێڕییە بکە لە ترسان زراوی چووە. خوێڕی هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ لەو قامیشەڵانەدا چا هەڵدەقوڕێنێ و سەیری مێرووڵان دەکا و ئەو بەستەزمانانە تێك بەردەدا. باشە خۆ ئاژەڵ بنیادەم نییە. جانەوەر، وەحشی... پۆلە مێرووڵەیەکی تێك بەرداوە. ئەوان سەرقاڵی شەڕی مەرگ و ژیانن و ئەویش رادەبوێرێ. دوای کوژرانی دەروێش بەگ، لە پێش هەموو شتێکدا سەد دۆنم زەویی قەباڵەدرام دەوێ، ئەوە یەك. دە هەزار لیرە پارەی نەقدم دەوێ ئەوە دوو. دوو کوڕەکەشم دەبێ وەك کوڕەکانی خۆت بنێیە بەر خوێندنێ بۆ ئەوەی چەندی دەتوانن بخوێنن. لەوەشدا دەبێ بەڵگەیەکی مۆرکراوم بدەیتێ، ئەوەش سێ. دەمانچەیەك و دەستێکی جلوبەرگی نیلی و ئەسپێك و تفەنگێکی ناغان و بیلیکێکی بولگارییشم دەوێ، ئەوەش چوار. دەبێ هەموو ئەوانەم بدەیتێ. نەیدەی دەتکوژم. ماڵەکەت ئاگر دەدەم و حەمە عەلیش بەو چنارەوە دەکەم کە وسێنیان پێوە کردبوو. تێگەیشتی مچە؟ ئەگەر خەڵکی دیکەش مەستانیان

---

* غەڵف/خەڵف: نەمام. مەبەست ئەوەیە قیت دانیشتبوو.

نەناسیوە، ئەتۆ باشی دەناسی. کاتێ کوڕەکانم کوژران، چما وەخت نەبوو لە ترسان زراوت بچێ؟ وەك بینی ئاو دەلەرزیی کە نەکا مەستان لە کەللەی بدا و بیەوێ تۆڵەی لە تۆ بکاتەوە. سێ رۆژان دەرگات لەسەر خۆت پێوەدا و بیانووت هێنایەوە کە بەڵێ ناڕەحەتی و تازیەباری. سێ رۆژ دواتر کە هاتمە لات وەك هیچ نەقەومابێ بزەیەکم لەسەر لێو بوو، ئەتۆ سەرت سوورِما و زمانت شکا.

"وەرە مەستان."

"فەرموو بەگ."

"سەرت سلامەت بێ مەستان. نەمدەویست وای لێ بێ."

"گیانی بەگم سلامەت بێ. کوڕێك چییە، هەر پێنج کوڕەکەم بەقوربانی تاڵە موویەکی بەگم."

بە ردێنێکی تەڕ و لەرزۆکەوە لەبەر حەمەعەلی دەپاڕایەوە:"حەمە عەلی بەگ، ئەمن کەسم نییە. بەو سەری پیرییەم بچمە کوێ و روو لە کوێ بکەم کە پاروەە نانێکم دەست بکەوێ؟ چ بکەم؟"

"من چووزانم، بۆخۆت کوێت پێ خۆشە بچۆ، کەیفی خۆتە چ دەکەی."

حەسەنی حوسێن سەرجووخە

حەسەنی حوسێن سەرجووخە

حەسەنی حوسێن سەرجووخە

بە ردێنێکی چڵکن و پشتێکی کۆماوە و چاوە کزەکانییەوە.

هەفتا هەشتا ساڵان... نەوەد...

نۆ ساڵان لە یەمەن بووە.

براکەی کاتێ بە شوێن دەروێش بەگەوە بووە، کوژرابوو. دوای نۆ ساڵ سەربازی لە یەمەن و هەفتا ساڵ نۆکەری لە دامودەزگاکەی بەگدا...

"بچمە کوێ حەمە عەلی بەگ؟"

"چووزانم، کوێت کەیف لێیە..."

سەگبابی بێ چاوڕووی بێ شەرەفی گەودا، پێ دەکەنێ. لە بنەوە پێدەکەنێ و بە تەوسەوە دەڵێ:"بچۆ یەمەن مامە، یەمەن. ئەو فیشەکانەی لە زگتدا ماونەتەوە، یادگاریی یەمەنن. بچۆوە یەمەن، یەمەن، یەمەن، یەمەن، یەمەن..."

"له لای ئێوه دامنا براله. هەفتا ساڵ لای ئێوه دامنا. هەفتا ساڵان لای ئێوه عومری خۆم دانا. بۆ یەمەن، یەمەن، ههه ، یەمەن."

به دەم دووپاتەکردنەوەی "بۆ یەمەن، بۆ یەمەن"، پشت کۆماوەکەی قیت بۆوه و کەوته سەماکردن:"بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن، بۆ یەمەن، بۆ یەمەن..."

دەنگی له گابەردەکانی ئاناوەرزا گەڕا و به سەماکردن وەك دەروێشان به کێڵگەی لۆکەکەدا بەرەو زۆنگاوەکەی ئاقچاساز وەڕێ کەوت و له ناخی دڵییەوه هاواری کرد:"بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن."

دوای خۆرئاوابوون، هەتا رۆژ بۆوه، بەدەم سەماکردنەوه هەر گوتییەوه:" بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن، بۆ " و دەنگی شیوەنەکەی هەتا تاو هەڵات هەر هات و ئەوجار دامرکایەوه:

"بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن، بۆ یەمەن، بۆ یەمەن."

بۆ یەمەن ههه، بۆ یەمەن
بۆ یەمەنیٚ، بۆ یەمەن
تێکەڵی دووکەڵ و تۆز
بڕۆن تا یەمەن
یەمەن گەرمە بەرد و چەوی
گەرمای قاوه دەبرژێنیٚ
سەرباز مەشق دەکا و
ناشارەزا کەر دەبیٚ
ئەوه تاو کەسیره بوو؟
ئاخۆ زەوی هەڵیلووشی؟
چاوەکانی حەمەدۆك
ئاخۆ مێرووله تێی داون؟
ئێستا بۆ یەمەن، بۆ یەمەن
یەمەن گەرم و تۆ بیٚ ئۆقره
زوو دەڵێن:"هەستە لەخەو"
گەنجی و خەوخۆشی
بۆ یەمەنیٚ ه هه، بۆ یەمەن

مندالّ كە وەزمان بیّ
بەكیّ دەلّیّ بابە؟
ئیّستا بۆ یەمەن، بۆ یەمەن...
ئاخۆ میّرووله خواردی
حەسەنی وسیّن سەرجووخە
وەك هەلّۆ
وەك پلّنگ؟

بە خولەخول و چەقلّە سەما، "بۆ یەمەنیّ، تا یەمەن"، هەر دەیگوت و هەلّدەبەزی. دەستەكان لیّك كردبوونەوە و چەقلّەسەمای بوو. دەستی كردبوو بە شیوەنیّكی سیحراوی و تالّ و بەژان و شیّتانە و سەرلیّشیّواوانە لە تووڕەییان. پەشیمان. لە بەر قرچەی گەرما زەردەكە و بەبیّ ترسیّك لە زستان یان هاوین. وەك دەمی گاسنیّكی بە دلّی خاكدا ڕۆبچیّ. وەك كۆلّووی لیّ هاتبوو. لینگی دریّژ ببوونەوە و پشتی كۆمابووەوە. دەموچاوی تیّكسمڕاو و پیّستیّك بەسەر ئیّسقانیّكەوە. لاقەكانی ئەوەندە لە خاكە ڕەشەكە سویبوو، پاژنیّی شەقار ببوون. قەلّشیو و خیّچ و خوار. وەك هەلّۆیەكی هەلّفڕینی بیر چووبیّتەوە. یەكیّك لە بالّەكانی شۆڕ بووبیّتەوە. یان مریشكیّكی سڕ و پەڕ و پۆ خووساو كە سەری بردبیّتە بن بالّەكانی. بە چەرخ و خول و چەقلّەسەما، بە ئەژنۆی چەماوە و بە هانكەهانك. خوار هەلّدیّرەكە، ئاوی بەلرفە و بە خوڕ، قوڕ و لیتە، زۆنگاو، بۆنی كیّم و زووخاو، بەچەرخ و خول. دوای ئەوە تاریكاییەكی تیشكیّك شەقی كردبیّ. حەسەنی حوسیّن سەرجووخە، وەكو پلّنگ، پلّنگیّكی بریندار، بریندار بەدەستی خۆی، بەچەرخ و خول بە ترسی مەرگەوە، ئاوی هەلّچوو، چەرخ و خولی ئەسپایی، ڕۆچوون.

حەسەنی حوسیّن سەرجووخە .
بە چەرخ و خول
شویّن بزر.
بە چەرخ و خول.

ئەوجار گۆم و قولّكە ئاوەكان، كەف و ئاومالّك و بلّق، ویّكهاتنەوەی ئاو، وردە شەپۆلی سەر ئاوە ڕەش و خەستەكە. بزربوونەوە، بە چەرخ و خول.

بۆ یەمەنیّ، بۆ بۆیەمەن

ئێستا بۆ یەمەنێ بۆ یەمەن.
یەمەن دەڵێی دووکەڵە
داخوا چاوە کاڵەکانی
مێرووله هەڵیانکۆڵی؟
ئێستا بۆ یەمەن، بۆ یەمەن
بۆ یەمەنی بیابان.
حەمە عەلی دەکوژم، دەیکوژم.
ئێستا دەروێش بەگ دەکوژم. دەیکوژم، دەتکوژم یان...

دەترسن. ترس خزیوەتە سیلّدانەیانەوە و بۆیەش هەوڵ دەدەن وا بنوێنن کە ناترسن.

زراویان چووە. لە مەلی ئاسمان و دەعبای سەر زەوی تۆقیون. هەر بۆیەشە ئەوەندە حەزیان لە ئازایەتی و نەترسی هەیە. ئەوەی بە مێشکی مەستاندا دەهات، لە بن لێوانییەوە بوونە ورتە ورت:"ترسنۆکانە، ترسنۆکی کوڕی ترسنۆکان..."

مستەفا بەگ دەسبەجێ سەری هەڵێنا و پرسی:"چییە مەستان؟"

"هیچ نییە بەگ. ئەرێ بە راستی مێرووله بچکۆڵەکە چیی لە قالۆنچەکە کرد؟"

"هەر وا تێی نووساوە. بەڵام هێشتاش نەیتوانیوە بیبزێوێ."

مەستان بیری کردەوە:"دەیکوژم." چاوە وردیلەکانی هەر کام دەتگوت هێلێکن و کەوتوونەتەنە نێوان کۆمەڵێك چرچ و لۆچی بەسەریەکدا کەوتوو. ملە درێژەکەشی پڕ بوو لە چرچ ولۆچ، دەستەکانی توند تفەنگەکەیان گرتبوو.

مەستان گوتی:"ئەمشەو مێرووله بچکۆڵە، قالۆنچەکە لەو قوولکەیە دەردێنێ."

مستەفا بەگ گوتی:"دەروێشیش ئەمشەو هەر دێ. نیگەرانی وەلی شەماڵم. هیچ سۆراغێکی نییە. نەیانکوشتبێ.

بلەئیبۆ گوتی:"زراوی لە مەرگ چوبوو. پێی وابوو پیاوەکانی دەروێش شەو و رۆژ بە دواوەین."

حەمدی گوتی:"لە ترسان شێت بووە."

مستەفا بەگ پرسی:"ئەی بۆ وەشوێن دەروێش کەوت؟"

مەستان گوتی:"لە ترسانی. ترسی گەورە ئاوایە. ترسی بێ برانەوە... حەسەنی حوسێن سەرجووخەیش... بە چەقڵەسەما و چەرخ و خول چووە نێو قوڕگی زۆنگاوەکەوە... ترس... ترس..."

مستەفا بەگ چووە فکرەوە و شەپۆلی ترسێك هەتا مێشکی ئێسقانەکانی لەرزاند. هەستا. لە قامیشەڵانەکە هاتە دەرێ و چاوەڕێی دەروێش ما. لەوێ لە تەنیشت دەوەنی قەرەمۆق راوەستا. لە نێوەڕاستی رێگەکە کۆڵەکەیەکی گەردەلوول بەرەو ئاسمانێ هەڵدەکشا. سروەی بای نەدەهات. کەس بە رێیەکەدا رانەدەبرد و لەگەڵ ئەوەدا لە گۆشە و کەناری رێیەکە تەپوتۆز هەڵدەستا. هەڵمێکی نەرم لەسەر زۆنگاوەکە نیشتبوو. شینایییەکی کاڵەوەبوو و هەڵمێکی روون ببووە پەردەیەك لە نێوان زۆنگاوەکە و رەوەزەکانی ئاناوەرزادا. ماسیگرە پەمەیییەکە، کە باڵە لێككراوەکانی بەسپایی دەبزواند، بەسەر سەریدا تێپەڕی.

مستەفا بەگ دوای ماوەیەك راوەستان لەوێ، دیسان گەڕایەوە نێو قامیشەڵانەکە. سەماوەرەکە قوڵەقوڵت دەکوڵی. برسیی بوو. گوتی:"کوڕینە وەرن. وەرن شتێك بخەینە بەر دڵمان."

سەری قابڵەمە مسییە پڕ لە نەخش و نیگارە قەدیمییەکەی هەڵگرت. مەستانیش سفرە پڕ لە نەخش و نیگارەکەی راخست. هەر کامە و دوو نانی لە پێش دانان. کە سەری قابڵەمەکەی هەڵگرت، پلاو و دوو مریشکی برژاوی تێدا بوو. مستەفا بەگ شارەزایانە و سووك و سانا مریشکەکانی هەڵدڕی و لەتوکوتی کردن و بەشی هەر کامەیانی خستە سەر نانەکەی و یەك یەك پەنجەکانی لستنەوە. قابڵەمەکە پڕ بوو لە قیمە و ساوارێکی بەتام. بە کەوچکان وەرگەڕانە قابڵەمەکە و لە ترمزە گەورەکە ئاوی ساردیان خواردەوە. هارویێیان پاك کرد و تەماتەیان ورد ورد کرد. لەسەر یەك خواردنی رۆژانەیان ئاوا بوو. خواردنەکانیان بە دەست ورد و پرد دەکرد و بە نان و کەوچك دەیانخوارد. دواییش وەك پشیلەیەك لە سێبەری تووترکەکەدا تخێلّ دەبوون و قامکەکانیان دەلستەوە و چایان بەسەردا دەکرد.

مستەفا بەگ دوای نانخواردنەکە پرسی:"جا ئەوجار نۆرەی کێیە؟"

حەمدی وەڵامی داوە:"من"

"چایەکەت هەڵگرە و بچۆ دەرێ. دەروێش ئەمڕۆ دێ. نابێ لە چنگمان دەربچێ."

مەستان بلەئیبۆ تفەنگ و کووپە چایەکانی خۆیانیان هەڵگرت و خزینە بەر سێبەری تووترکەکانەوە. مەستان بە سێرەی چاو لە مستەفا بەگی دەڕوانی و لە دڵی خۆیدا

دەیگوت:"گەوادی هیچ و پووچ، گەوادی بێ شەرەف، بە بنیادەمەکان دانەکەوت ئێستا بەربووەتە گیانی ئەو مێرووڵە بەستەزمانانەوە. قورمساغی بێ بەزە. ئاخر کابرای بەزەڕ، چیت لە گیانی ئەو بەستەزمانانە دەوێ؟... چ چێژێك لەو کارە وەردەگری بێ شەرەفی واجبوالقتل..."

ئەوەی تۆ دەیکەی کاری منداڵۆچکانە. بە گیانی ناخێرت ئەتۆ ئاغای... ئەتۆ دەتەوێ ئاغایەکی وەك دەروێش بەگ بکوژی... هەر بەراستی ئەمڕۆ دەروێش بەگ دێ؟ وەلی شەماڵ چیی بەسەر هاتووە؟ یانی کوشتوویانە؟ نەکا وەك حەسەنی حوسێن سەرجووخە بە چەرخ و خول و چەقڵەسەما سەری خۆی هەڵگرتبێ و ڕۆیبێ؟ چووبێتە ئەوسەری دنیا؟ دیارە ڕۆیوە. ئەو لە هیچ کوێ تۆتکە ناگرێ. ڕای کردووە. لە ترسی مەرگ فیزماڵکی داوەتێ*. پێی وایە ئەگەر ڕا بکا مەرگ تۆزی پێی ناشکێنێ... ئاوڕ لە دواوەشی ناداتەوە. بە زاری داپچڕاوەوە کەوتووەتە بەر دەمی دەعبای مەرگێك لە ئاگری لە چاو و زاری دەردەپەڕێ. بە هانکەهانك ڕادەکا و تێی دەقووچێنێ. ئاخۆ دەعبای مەرگ گرتی؟ ئاخۆ بردیانە کۆشکەکەی دەروێش؟ جا ئەو لەوێ هەموو شتێکی، شوێنی بۆسە و سیپەنانەوەمانی بە دەروێش گوتووە و ئاشکرای کردووە و ئیتر دوای ئەوە بە قوربانی گوللەیەکی گەرم و ئاگراوییان کرد؟ ئەتۆ دەڵێی چی مستەفا بەگی تووتکە سەگ؟ دەروێش بەگێك کە هەموو ڕۆژێ بەو ڕێیەدا دەهات و بە بەر کۆشکەکەتدا تێدەپەڕی، باشە بۆچی لەوەتەی بۆسەمان ناوەتەوە، ئیتر ڕێی نەکەوتووەتەوە ئێرە؟ بۆچی هیچ بیر لەوە ناکەیتەوە و ڕۆژ هەتا ئێوارێ هەر خۆت بەو مێرووڵە بەستەزمانانەوە خافڵاندووە و هەر دەڵێی دەروێش ئەمڕۆ دێ، سبەی دێ؟ دەروێش نایە، نایە ئیتر... بشمری نایە. دیارە ڕۆژێك هەر دێ، دەزانم دێ، بەڵام هەموو ڕۆژێ نا. نەك ڕۆژێك، ڕۆژێك لە ڕۆژان. ئەتۆ خەونی پێوە ببینی و نەبینی... زەلام زەلام دێ. گورج و گۆڵ و قیت و قنج و بە سواری ئەسپێکی شێ...

هاکا دیتت کە... دیتت کە... دیتت کە... دەروێش کەوتووەتە بەر پێی ئەسپەکەی و لە خوێنی سووری خۆی دەگەوزێ و هەر چوار فیشەکەکەی وەسینگی کەوتووە و لە هەر چوار کونەوە خوێن فیچقە دەکات. ئەو دەگەوزێ و چنگی لە خاك و عەرزەکە گیر دەکا و خۆی لە پەلی ئەسپەکەی دەئاڵێنێ و قەپ بە سمی ئەسپەکەیدا دەکات. ئەسپەکە سمکوتی دەکات. ئێمەش ڕاوەستاوین و سەیری دەکەین و دەپاڕێینەوە خوایەگیان وا زوو گیانی دەرنەچێ. چما وەلی ماراشلی"ـم کە پێیان دەگوت وەلی ددان زێڕ، ئاوا نەکوشت؟ فیشەکی وێکەوتبوو و

---

*فیزماڵك: بە ڕاکردن و خۆدزینەوەی نهێنی و شاراوە دەڵێن: فیزماڵکی دایێ. واتە بەخشکە خۆی دزییەوە و ڕایکرد.

کەوتبووە بەر پێی ئەسپەکەی و چنگی لە پەل و پێی ئەسپەکەی گیر دەکرد و قەپی پێدا دەگرت. ئەسپەکە دەسڵەمییەوە و دەخولایەوە و سمی لە عەرزی دەکوتا و جووتەی داویشت و غاری دەدا، بەڵام وەلی لاقی ئەسپەکەی بەرنەدەدا. وەلی زۆری پێ چوو. لەبەری پاڕامەوە ـ ئەوە دەیبینن، دەیبینن کە چیی بەسەر ئەو مێرووڵە بەستەزمانانە دێنێ؟ سەیر کەن، تف لە رووت کافری هیچ و پووچ. تف لە رووت ـ گوتم کوڕە بەگ، داماوە، زۆر زەجر دەکێشێ، لێیگەڕێ با بەقوربانی گوللەیەکی دیکەی بکەم. بەزەییم بە وەلیدا نەدەهات، بەڵام ئاخر ئەسپەکەی چ گوناحێکی هەبوو؟ ئەمن وەلیم ئەنگاوت. بەڵام من تاوانم چییە؟ بەگ ئەمری فەرمووبوو. گوتی نۆ گیانی بکە، بەڵام وەلی سێ رۆژیشی کێشا، دەبێ هەر ئاوا لە حاڵێکدا قەپی بە لاقی ئەسپەکەیدا کردووە، بمرێ. وەلی چ تاوانێکی هەبوو؟ من چووزانم. لەبیرم چووەتەوە. بەهەر حاڵ گوناحەکەی گەورە بووە. خۆ بێ گوناح نەبووە. لەوانەشە پەیوەندیی بە دەروێشەوە بووبێ. گوتم بەگ مەکە، تاقەتم نەما... جا لەو کاتەدا ئەسپەکە هەستایە سەر پاشوان و وەلی بەلادا هات و کەوتە سەر گازەرای پشت... و وەلی کە کەوت، مستەفا بەگ، ئەو سەگەی کە هەموو ئیش و کارەکەی بووەتە گەمەکردن بە مێرووڵان، سێ فیشەکی داڵ بە داڵ لە ئەسپەکە ـ کە تازە پێی لە چنگ و ددانی وەلی راپسکاندبوو ـ دا و ئەسپەکەی سەرسمێکی دا و هەستایەوە... جارێکی دیکەش ... و ئاخرییەکەی کەوت و سەری لە عەرزی هەڵچەقی. گەوادی چەپەڵ، گەوادی بێ شەرەف. ئێستاش کە ئێستایە بەزەییم بەو ئەسپەدا دێتەوە. ئێستاش ئەوە بەربووەتە گیانی ئەو مێرووڵە ورد و بچووکانە.

مەستان ئیتر چاوی بەرایی نەدا سەیری گەمەی مستەفا بەگ و مێرووڵەکان بکا. رووی وەرگێڕا و چاوی بڕییە رەگی تووترکەکان و پەناگە تەڕ و خەمبارەکەی خۆی.

مستەفا بەگ بە چاوە شەهێنییەکانی خۆی دەگەڕا بزانێ لە قەتاری مێرووڵەکاندا کێهەیان لەهەمووان گەورەترە بیدۆزێتەوە. ئاخرییەکەی مێرووڵەیەکی دۆزییەوە، درشت و سوور، تۆخ. مێیەمێرووڵەیەك کە ددانەکانی قەڵفەی زاری دیار بوو. دەتگوت پشتی پڕە لە گەنەموو و چاوە تۆزاوییەکانیشی بریسکەیەکی ماتیان لێوە دەهات. زگی بازنە بازنە هەستابو. مێرووڵەکەی گرت و چاوە شەهێنییەکانی بە شوێنی خەنیمێکدا گێڕا وەك خۆی وابێ. ئەوەی لێی دەگەڕا لەسەر شارە مێرووەکە دۆزییەوە. مێرووڵەیەکی زەنەك و بەئاڵووش و لە هەموو بارێکەوە شیاوی مێرووڵەکەی پێشوو. دڵی بەوە خۆش بوو کە توانیبووی مێرووڵەیەکی ئاوا بدۆزێتەوە، لە خۆشییان چەپڵەیەکی لێ دا و شارەزایانە مێرووڵەکەی گرت. مێرووڵەیەکی پێشوو قەپی

زاری داپچڕیبوو. مله باریکەکەی مێرووڵەی دووەمی هێنا و خستییە نێو زارەداپچڕاوەکەوە و لەسەرخۆ زگی مێرووڵەکەی پێشووی گوشی. ئەو مێرووڵەی زگی گوشرابوو، زاری وێك هاتەوە و توند پێکدا درا و ملی مێرووڵەکەی دیکەی گوشی. مستەفا بەگ لەو بوارەدا زۆر بە ئەزموون بوو. مێرووڵەکانی لەسەر عەرزەکە دانا. ماوەیەك مێرووڵەکەی پێشوو لە سەرەوە بوو و مێرووڵەکەی دیکەش کە ملی گوشرابوو، لە بنەوە چاوەکانی دەرپەڕیبوون. دوایی مێرووڵەکەی سەرەوە قەپی زاری کردەوە و ملی ئەوی دیکەی بەردا و رای کرد. ئەو مێرووڵەیەش کە ملی گوشرابوو، بەو خێراییە لەوێ دوور دەکەوتەوە کەچی پەنجە درێژ و رەشەنەکانی مستەفا بەگ وەك چیایەکی قورس بەسەریدا هات. ئەوجارەیان ملی مێرووەکەی پێشووی خستە نێو زاری مێرووڵەی دووەمەوە. مستەفا بەگ دیسان مێرووڵەکانی بەردا. مێرووڵەکان تاوێك دواتر لێك بوونەوە. مستەفا بەگ ئەمجارەیان ملی ئەویدیکەی خستەوە نێو زاری یەکەمیانەوە و بەری دا. دیسان لێك بوونەوە. چەند جاران ئەوەی دووپاتە کردەوە و کە زانی هەردووکیان تەواو تووڕە بوون، ئەوجار زار بە زار تێکی بەردان.

ئیتر دەیزانی ئەمجارە مێرووڵەکان دەست لە یەکتری هەڵناگرن و لەو قەرارە چەند رۆژان هەر وا پێکەوە بەشەڕ دێن. جاری وابوو یەکێك لە مێرووڵە تووڕەکان قەپی لە ملی ئەوی دیکە دەگرت و بەی نەدەدا هەتا سەری هەڵدەپساند.

رێچکە دوور و درێژەکەی مێرووڵەکان و دەوروبەری شارەکەیان پڕ بوو لەو مێرووڵانەی کە دووان دوان ملیان لەبەر ملی یەکتری نابوو و لەگژ یەکتری رۆچوبوون. ئەو مێرووڵانەی وەڕەز دەبوون و وازیان لە یەکتری دێنا، مستەفا بەگ دەیگرتن و پێکی هەڵدەپڕژاندنەوە. جار وابوو دوو مێرووڵە پێداگرانە خۆیان لە شەڕ دەبوار و لەو کاتانەدا مستەفا بەگیش لاساریی دەکرد و جار هەبوو لە کەڕەی بەیانییەوە تا شەوێ دەستی لەو دوو مێرووڵەیە هەڵنەدەگرت، کە خۆیان لە شەڕ دەبوارد و ئاخرییەکەشی قین و تووڕەییەکەی خۆی هەر پێ دەڕشتن. قاچەکانیانی هەڵدەکەند و ئاگری تێبەردەدان و ئێوارەش لە کاتی گەڕانەوەیدا بەرەو کۆشك، وەك شێتان سەری مێرووڵە ئاشتیخوازەکانی هەڵدەپساند. دوای ئەوەش دایکیی وەبیر دەهاتەوە و ئیتر دەماری مێشکی دەیگرت. بەڵام مێرووڵە ئاشتیخوازەکانیش ژمارەیان زۆر نەبوو.

مستەفا بەگ ئێستا سەرقاڵی سەیرکردنی شەڕی سەدان و هەزاران مێرووڵە و نوقمی چێژ و خۆشییەکی کێوییانە بوو. وەك فەرماندەیەکی سەرکەوتوو بەکەیف و لەخۆبایی بوو. تاجەگوڵی

شانازی لەسەر مستەفا بەگ، هەزاران مێروولە لە شەڕگە، لە حاڵی ئاویلکەدان و گیان-کەنشتدا و بە سەری هەڵپساوەوە.

دەروێش بەگ ئەمڕۆکە دێ. دوێنێ نەهات. ئەمڕۆ دێ و هەر بە ئێرەشدا رادەبرێ. حەمدی بەسپایی گوتی بەگ، وا خەریکە دێ. دوایی، دوایی، دوای ئەوەی ئیدی دیارە. گرتنی دەروێش بەگ چەندە خۆشە. بەڵام بەسلامەت دەرچوونەکە دوای ئەو هەمووە چاوەڕوانییە بە راستی پیاو دەکوژێ. خۆ بە دەستی مستەفا بەگ بوایە، بایی ئەوەندە دەبوو کە دەروێش بەگ هەزار جار لە چنگی را بکا و جارێکیش چییە نەکەوێتە چنگی. بەڵام دایکی خەریك بوو لە چاوەڕوانیدا دەپڕووکا و تاقەتی نەدەما. هەموو هێز و تینی خۆ کۆ دەکردەوە بۆ ئەوەی بەر لە کوژرانەوەی قاتڵی کوڕەکەی، خۆ بەدەست مەرگەوە نەدا. ئەگەر دایکی بەر لە مەرگی دەروێش بمرێ، بمرێ و بە چاوی کراوەوە لەم دنیایە بڕوات مستەفا بەگیش ناتوانێ بژێ و بە دوای دایکیدا دەمرێ.

مستەفا بەگ گرماندی:"بۆ کوێ هەڵدێن؟ بۆ کوێ؟ هەی ترسنۆکینە."

مەستان لە جێی خۆی راچڵەکی و خەونووچکەی لەسەری پەڕی و دوای ئەوەی زانیی کە مستەفا بەگ بەسەر مێروولەکاندا دەنەڕێنێ لە بن لێوانەوە گوتی:"سەگی گەمژە."

دیسان وەنەوزی دایەوە.

مستەفا بەگ بە هۆگرییەکی بێسنوورەوە سەرقاڵی تێکبەردانی ئەو مێروولانە بوو، کە خۆیان لە شەڕ دەبوارد.

لە سەر بەردێکی سپی دانیشتووم. رەوەز و گابەردەکانی ئاناوەرزا، رێك لە ژوور سەرمەوە تا ئاسمانی بێسنوور هەڵکشاون. ئاسمانێك نییە هیچ، هیچ نییە. ئەی ئاسمان نەبێ چ هەیە؟ هیچ شتێك نییە. نا، نا، سەهووم کرد. لەبیرم چووەتەوە. ئاسمان بەتاڵ دەبێ. بەتاڵ و حەتاڵ. نە رەنگێك و نە تیشکێك، نە تاریکاییەك. هیچ شتێك. لەسەر بەردێکی سپی دانیشتووم. رەوەزەکان سوور سوور. سوورێکی ئاگرین، سوورێکی بلوورین... سەر لە ئاسمانێ دەسوون. ئاسمان هەر نییە. جا بەسەر بەرزایی بێ ئاسمانەوە، لافاوێك لە رووناکایی... و لە بن لافاوە رووناکییەکەشەوە، مێروولەکان، مێروولەکان، هەموو شتێك: مێروولەکان. لە بناری ئاناوەرزا لەسەر بەردێکی سپی کە نووسین و نەخش و نیگاری لەسەر هەڵکۆڵدراوە، دانیشتووم. لەپڕ دەریایەك لە بن پێیانم هەڵدەستێ. ئەوجار دەریاکە ون دەبێ. لە سەر بەردێکی سپیی چەخماغ دانیشتووم. مارمێلکەکان بە زمانی لەزار دەرکێشراو و پشتی شەقار شەقارەوە...

مارمێلکەی پیری چاو مەرجانی. ئەوجار شەو... شەوی بێ تیشك. نە تیشکی مانگ، نە تریفەی ئەستێرە، نە تیشکی ئاگرێك. دەڕوانم. بە بەرچاومەوە لە بنارەکە سەدان هەزار تیشکی دەنك سووری مەرجانی وەك مێرووڵەکان. مێرووڵەیەکی گەورە بەخێراییەکی سەرسووڕهێنەر دەست دەکات بە هەڵلووشینی ئەو دەنکە تیشکانە. ئەو هەڵیاندەلووشێ و دەنکە تیشکەکان دیسان سەرهەڵدەدەنەوە و بە ملیۆنان درەوشانەوەی مەرجانی، سوورباو، پوولەك پوولەك لە شەو و تاریکییەکەدا پەخش و بڵاو دەبن. دەنکە نوورەکان، بەردەکەی بن پێی، مێرووڵەکان، کەشتییەکان، شامارەکان، زۆنگاوەکە، کە بە گرم و هۆڕی بەردەوامی، رەوەز و گردۆڵکە و دار و لێڕەکان هەڵدەلووشێ.

خاك، ئاو، ئامان و هەموو شتێك لە نەکاو ون دەبن. بۆشاییەك، نەبوویەکی لەگوێن بۆشایی بەجێ دەمێنێ.

لەسەر بەردی سپی دانیشتووم. بەردەکە دەبزوێ و دەبزوێ... و دەروێش بە سواری ئەسپە شێیەکەی لە بۆشاییەکەدا. ئەسپەکەی بنی پەیتاپەیتا لە بۆشاییەکەدا سەرموقلات دەدا. دەروێش ملی ئەسپەکەی لەباوەش گرتووە و پەیتاپەیتا سەرموقلات دەدا. لەنەکاو وەلی شەماڵ لە بن لۆق و پێی ئەسپەکەی دێتە دەرێ. ئیتر بۆشاییەك لە گۆڕێ نییە. وەلی شەماڵ وەك چەرخ وفەلەك دەخولێتەوە. کەس نازانێ لە کوێوە، دەسکی کێردێکی درێژ، رەش و باریك و شوختدار دەکەوێتە نێو لەپی دەستی وەلی. نووکی کێردەکە بەچاوی دەروێشدا رۆدەچێ. چاوی لە گلێنەی دێتە دەرێ. دوایی لە چاوەکەی دیکەی رۆدەچێ. کێردەکە لەو چاوەی کە دەردێنێ، تا دەگاتە چاوەکەی دیکەی، ئەو چاوەیان ساغ و بێ خەوش دەچێتەوە جێی خۆی. کێردە رەشەکە وەك ماسوورە* لە هاتوچۆ دایە. لە پڕ هاوارێك بۆشاییەکە پڕ دەکاتەوە. بەسە، بەسە، بەسە، مستەفا، مستەفا، کێردەکەت دەربێنە. بەگ وەلی شەماڵ بگرە، وەلی شەماڵ. دەست لە چاوەکانم هەڵگرە. وا مەکە، چیت پێ خۆشە بیکە، چیت پێ خۆشە بیکە...

مستەفا بەگ بە دەنگێکی بەرز گوتی:"دەروێش دێ. ئەمڕۆ دێ. جا چ هاتنێکیش."

مەستان بەخەواڵوویییەوە گوتی:"ئەگەر وابێ، ئەگەر ئاوا بڕوات، بێت و ئاوا بڕوات، بەردی سپیی نەخشداری چەخماغ نیشانەی هیوادارییە. دێ. بەردی سپی ئاماژەیە بۆ مەرگ. ئاماژەیە بۆ قەفەزێك، بۆ سەفەر."

دەنگی دڵنیاکەرەوەی حەمدی لە دەرەوە بیسترا:"ئەمڕۆ دێ. تاوێك دواتر."

---

[*] ماسوورە: ئەو خولخولە بچووکەی لە بنەوەی مەکینەی بەرگدوورینەوە، تەقەڵەکانی ژێرەوەی لێ دەدا.

بلەئیبۆ دووپاتەی کردەوە:"تاوێکی دی."

مستەفا بەگ گوتی:"دێ. ئەی وەلی شەماڵ چیی بەسەر هات؟ خۆزگە ئەو داماوەم نەناردبا. ئیتر پیر بووە. وەلی شەماڵ ئیدی وەلی شەماڵەکەی جاران نییە کە بە هەزار فێڵ و تەڵەکە دەروێش لە کۆشکەکەی بێنێتە دەرێ و بەرەو لای ئێمەی بنێرێ. ئەو داماوە پیر بووە و پرزەی لێ براوە... خوا بکا نەکوژرابێ، ئەگینا زۆرم بەزەیی پێی دا دێتەوە."

مەستان گوتی:"پێیدا دێتەوە. وەلی شەماڵ لەوانەیە کە لە هەموو ئادەمیزادی ئەو سەر زەوییە پتر لە مەرگ دەترسێ."

مستەفا بەگ گوتی:"نا، ئەوەی تۆ دەڵێی دەروێشە."

گوتی و بێدەنگ بوو. مەستانیش نەیتوانی بڵێ ئەتۆشی. خۆ ئەگەر دوای کوژرانی دەروێش ئەەتۆش داخوازییەکانم دابین و جێبەجێ نەکەی... ئەتۆش... ئەتۆش دەترسی شێرەکەی خۆم. هەموو ئەوانەی گەمەی گیان دەکەن، ترسنۆکترین کەسن. وا نییە؟ سەیری ئەو مێروولانە بکە وا بەشەڕ دێن. بنیادەمێك کە شەڕ دەکا لەگەڵ ئەوانە فەرقی چییە؟ جا لە خۆی پرسی، فەرقی نییە؟ یانی هەر نییەتی؟ بە دڵێکی پڕەوە گوتی نا، وەڵامی مستەفا بەگیشی نەدایەوە.

مێرووله بچکۆڵەکە زۆر لە مێژبوو ملی لەبەر ملی قالۆنچە مردووەکە نابوو و جار و بارە شێلگیرانە ئامبازی دەبوو و هەوڵی دەدا لەجێیەکەی بیبزێوێ.

خۆر ئاوا دەبوو و سێبەرەکان ون دەبوون. مستەفا بەگ هەستا و لەسەر لینگە درێژەکانی خۆی خاوکێش کرد و چاوی بڕییە خۆرەتاو، کە خەریك بوو ئاوا دەبوو و رەوەزەکانی ئاناوەرزای سوور داگیرابوو...

لەسەرخۆ گوتی:"ئەمرۆ ئیتر نایە. ئەمڕۆ نایە. بەیانی، سبەی دێ."

مەستان گوتی:"سبەی دێ."

لە قامیشەڵانەکە هاتنە دەرێ و بەرەو لای ئەسپەکانیان چوون. ئەسپەکان سەریان لە توورەکەکانیان نابوو و خرمەخرم جۆیان دەخوارد.

# ٣٤

حاجی قۆرت بۆغا لەگەڵ ئەوەدا شەوێ هەتا بەیانی تێر نەنووستبوو و لەگەڵ هەزاران بیر و خەیاڵ دەستەویەخە ببوو، دیسان هەر لە کاتی خۆیدا هەستا. تووشی شەڕێکی قورس ببوو. زۆر ژیابوو و زۆری هەوڵ دابوو و سەریش کەوتبوو. ئەگەر لەخۆیت پرسیبایە دەیگوت:"لەم دنیایەدا دەستی بۆ هەر کارێك بردبێ، بەدەستییەوە هاتووە. لەو بارەیەوە زۆر بەخۆی دەنازی و لەگەڵ ئەو بەخۆوەنازینانەیدا، سەردەمی منداڵییەکەی کاڵ و روون لە مێشکیدا زیندوو دەبووەو:"دایکی لە تا و نۆبەتێ و چەقوچۆدا گینگڵی دابوو و ئاخرییەکەی گیانی دەرچوبوو و بابیشی کەس نەیدەزانی کەنگێ چوبووە یەمەنێ و هەر نەگەڕابۆوە. هەشت برای هەبوو کە هەمووان یەك لە دوای یەك ببوونە نێچیری مەرگ و هەر هەمووانیش بە نەخۆشینی ئۆغلانجیك (دەردە منداڵ) مردبوون. لە دەشتەکەی ئاناوەرزادا دەگمەن بوون ئەو منداڵانەی تووشی دەردە منداڵ نەبووبێت. برایمی هاتەوە پێش چاوی. حاجی، برایمی لە هەر هەموو براکانی خۆشتر دەویست. باریکەڵە و کەڵەگەت و جوانچاك و چاوگەورە بوو و هەر پەنجەی هونەرێکی لێ دەباری. برایم جوانترین شمشاڵ و فیقەنەی لە قامیش دروست دەکرد و لە لك و پۆی داری بی وشتر و عارەبانەی جوان و لە گوڵ و گەڵاکانی خانووبەرە و دیواری جوان و رازاوەی دروست دەکرد. لە لاسکە وشك هەڵاتووەکان شیلەیەکی دەردێنا کە بۆنە تیژ و تفتەکەی نێو لووتی وەخورووو دەخست و کاتێ برێکت لێ دەخوارد، سەرت لەگێژەوە دەهات و هەناسەت بۆن و بەرامەی گوڵەکانی دەگرت. منداڵەکانی دیکە ئەگەر لە رۆژێکدا دە چڵی شیلەداریشیان دۆزیبایەوە، ئەو لە بنارەکەی ئاناوەرزا کە هەتا دەگەیشتە دەشتاییەکە پڕ بوو لە بیزا و کوڕادە. باوەشێکی لەو گیایە کۆ دەکردەوە و دوایی لەسەر بەردێکی کە تاوە پاییزییەکە گەرمی داهێنابوو، دادەنیشت و سەرخۆشانە و وەك بڵێی دەست لە شتێکی متفەڕك و پیرۆز

دەدا، دەستی لێ دەدان و بە سیكڵدانە و لەسەرخۆییەوە ورد ورد دەیقەڵاشتنەوە و شیلە مەیلەوسەوزە دەروشاوەكەی نێویانی دەدۆزییەوە و لە نێوەڕاستەوە نیوەی دەكرد. نیوەیەكی دەدایە حاجی و نیوەكەی دیكەشی دەخستە سەر زمانی خۆی و وردە وردە لە زاریدا دەیهێنا و دەیبرد تا تامەكەی وردە وردە لە زاریدا دەتوایەوە و نەدەما. ئەوجار لاسكێكی دیكەی دەكردەوە. حاجی قۆرت بۆغا لەو دنیایەدا هەر شتێكی دەیزانی لە برایمەوە فێری ببوو. رۆژێكی گەرم گەرم كە تاوەكەی ئاگری دەباراند، برایم لەنەكاو لە بن دار تووەكە، كە بنیادەم هەتا گوێزینگان لاقی رۆدەچو، كەوت و گینگڵی دا. هاواری دەكرد و دەیگوت: سەرمامە. دەیگوت: سەرمامە و ددانەكان شەقەشەق وێك دەكەوتن. هەر لە بەیانییەوە تا بەرەبەری نیوەڕۆ لەو خۆڵ و خاكەدا گەوزی و پەلەقاژەی كرد و لەرزی و جارێ گوتی: سەرمامە و جارێ هاواری كرد، باوكەڕۆ سووتام. خۆی وێك دێنا و قیت دەبۆوە و گرمۆڵە دەبوو و دیسان لەبەر یەك دەڕەوییەوە و خۆی وێك دێنایەوە و دەلەرزی و هەڵدەلەرزی و دوای ئەوەی ماسوولكەكانی لەبەر یەك رەوینەوە و شەقەشەقی ددانەكانی تەواو بوو و رەنگی روخساری زەرد و زەردتر بوو و ئەوجار كەسك داگەڕا. هەر چوار پەلی چڵی دەدا و دەلەرزی. ئەوجار زاری برایم كەفی كرد. دەر و جیران كۆ بوونەوە. بوو بە سرتوخورت و دەیانگوت، دەمرێ. زۆر ناژیێ. كاری تەواوە. ئەوجار حوسێن قاریی چاو كەسك، كە پشتی كۆمابۆوە و خۆی دابووە سەر گۆچانەكەی، هات و بەژوور سەری منداڵەكەوە راوەستا و گوتی:"منداڵەكە تێدا چووە. حەیف بۆ برایم..." دوای ئەوە لە بن لێوانەوە گوتی:"ئەمن لە منداڵی ئاوا تۆقیوم. لەو منداڵانەی لە گۆشە و قوژبنێك هەڵدەكورمێن و بێدەنگ دەبن و سەریان لەبەر خۆیان دەنێن. لێیان تۆقیوم. منداڵی ئاوا زۆر ناژییێن. وەیش كە برایم چەنێ جوانیش بوو. حەیف بۆ ئەو چاوە مەڕییانەی. حەیف بۆ برایم، حەیف."

دەنگی هەڵێنا:"كورتانێك بێنن. یاڵڵا دەی زوو بن. ئەی بەشكم خوای گەورە... ئەگەر رۆژی نەهاتبێ..."

دەسبەجێ كورتانێكیان هێنا و سەرنخوون لەسەر عەرزەكەیان دانا. كورتانەكە رووە و ئاسمان زاری داپچڕی. لە كەلێن و كولێنە دڕاوەكانی لبادە چڵكن و ئارەقاوییەكەوە، پرزە و كولكە دەركەوتبوون. لاقە رووت و زەردەكان لە كورتانەكە هاتنە دەرێ. لاقەكانی چڵیان دەدا و جاری وابوو هەڵدەبەزینەوە. دەنگێكی كپ و ناروون لە قوڕگی برایمەوە دەهاتە دەرێ و كەفی زاری هەر دەهات و پتر دەبوو. ژنێك جار نەجارێ كەفی دەوری زاری منداڵەكەی دەسڕییەوە. ژنەكان جار

بە جار پتر دەبوون. منداڵیش هاتبوون و لە بن لك و پۆی بەربڵاوی دار تووەکەدا کە گەڵاکانی سپی دەچوونەوە، لە دەوری برایم کە چەقوچۆ و لەرزینەکەی وردە وردە لێی دەبووە هەڵبەزینەوەی پەیتاپەیتای دەمارەکانی، کۆزیلکەیان بەستبوو. دڵۆپە ئارەقەکانی سەر نێوچاوانی برایم وشك دەبوونەوە. منداڵەکان بەبێ جووڵە و بە روخسارێکی مات و خەمبارەوە چاوە مات و کەسیرەکانی خۆیان لە برایم هەڵنەدەگرت. چەند ژنێك لەبەر خۆیانەوە دەنووزانەوە و بە لکی کۆڵوانەکەیان فرمێسکیان دەسڕی. ئەوانە، ئەو ژنانە بوون کە منداڵەکانیان بەو دەردەی برایم، لە پێش چاوی خۆیان جوانەمەرگ ببوون.

حوسنە، ژنێکی تێكشکاو، لە تەنیشت کورتانەکەوە لە نێو خۆڵ و خاکەکەدا چوار مەشقی دانیشتبوو و بە دەستە لەرزۆك و بێ تینەکانی، کورتانەکەی گرتبوو. بۆنی تیژ و ترشاوی ئارەقە لە کورتانەکەوە هەڵدەستا. لە دوورەوە ژنێك دەهات. وەك شێتان، بێ ئۆقرە... و دەنگی شین و گریانەکەی لە رەوەزەکان دەگەڕا... هات و لە تەنیشت ژنەکانەوە دەستی کرد بە گریان و نووزانەوە. دەموچاوی درێژ ببووەوە. باسکی وەك دوو باڵی باڵندەیەك هەڵدەستان و دەهاتنەوە خوارێ. دڕی بە حەشامەتەکە دا و خۆی گەیاندە تەنیشت کورتانەکە. کە برایمی دیت، دەنگەکەی بەسۆزتر بوو. لە دەوری کورتانەکە گەڕا. هەر گەڕا و گەڕا و لە پڕ دەنگی بڕایەوە و لە بەر پێی نەخۆشەکە دامرکایەوە و کرووشمەی کرد و مات بوو. بەبێ جووڵە و بەبێ ئەوەی تەنانەت چاوە دەرپۆقیو و سوورهەڵگەڕاوەکانی و لێوە رەش هەڵگەڕا و قەڵشیو و بارگرتووەکانی تەنانەت بۆ جارێکیش چییە لێك بنێ. دەستەکانی زەرد زەرد و سەر و قژی ئاڵۆز بوو.

غەڵبەغەڵبێك کەوتە نێو حەشامەتەکەوە. گوتیان: ئەو برایمی گەورە کردووە. پوورێتی. خۆی وەجاغ کوێرە.

نەخۆشەکە لە پڕ لە کورتانەکەدا هەستایە پێ. بەبێ روانین و بەبێ ئەوەی چاوەکانی شتێك یان کەسێك ببینن، تاوێك هەر وا راوەستا و ئەوجار بە هێمنی لەسەر گازەرای پشت راکشا. خۆی وێك هێنا و جووڵەی لێ بڕا. ژنە بەبێ ئەوەی جووڵەیەك بکا هەر وا لەسەر جێیەکەی خۆی وشك ببوو. چەند ژنێك هاودەنگ زریکاندیان. حەشامەتەکە شڵەژا و لە هەر زارێکەوە دەنگێك هەستا. حاجی لەسەر خۆ لە حەشامەتەکە دوور کەوتەوە و کاتێك لە ئاواییەکە هاتە دەرێ، دەستی کرد بە غاردان و هەتا کەناری جەیهان رای کرد. لە کەلێنەکەوە چووە خوارێ و خۆی خزاندە شوێنێکی خەڵوەتەوە و لە پڕمەی گریانی دا و زۆر زۆر گریا. رۆژ ئاوا بوو و ئەو

هەر وا بەکوڵ دەگریا. دوای ئەوە خەوی لێ کەوت، کە هەستا شەوگار شەق ببوو. گەڕایەوە و بەبێ دەنگی لە پلیکانەی کەپرەکەی وەسەر کەوت و خزییە نێو پێخەفەکەیەوە. تەپۆ وەك هەور دەهاتن و دەنگی وزەوزە بەردەوامەکانیان کە وەخت بوو گوێ کەڕ بکەن، لە مێشکی دەگەڕا... تەپۆ بنیادەمیان کەوڵ دەکرد. یەکێ دەیگوت نۆبەتێی ژەهراوی... دکتۆرەکان دەرزییەك دەوەشێنن کە... وەیش بۆ برایم... بەقوڕ گیرێ ئەو چوکووراوایە. لێرە، لەو زۆنگاوەدا و لەگەڵ ئەو هەمووە مێشوولە و تەپۆیەی هەیەتی، هیچ منداڵێك ناژیێ... ئارانەکان. برایم مرد. خۆ منداڵێکی مردەلۆخەش نەبوو. حاجی کە مێش و تەپۆ کەوڵیان کردبوو و هەموو گیانی بریندار ببوو و لیری کردبوو و لە حاڵێکدا دەستەکانی رادەوەشاند، نیوە خەوتوو و نیوەبەخەبەر، لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە و دەیگوت و دەیبیستەوە. کە تاو کەوت و گەرمایەکی خنکێنەر لەنگەری خست، لە پلیکانەکان هاتە خوارێ. پووری نێوچاوان گرژ و دەست لەکەلەکەدا راوەستابوو. تازیەبار و تێکسمڕاو وشکەڵاتوو و رەنگ بزڕکاو، نەیدەوێرا چاو لە نێوچاوی پووری بکا. نەیتوانی سەری هەڵێنێ. هیچی نەدی و نەیتوانی ببینێ.

"دانیشە شتێك بخۆ. هەر تۆ ماوی. شتێك بخۆ..."

حاجی نەیبیست. وەڕێ کەوت و لە ئاواییەکە چووە دەرێ. بە چنگەکڕە و دەتگوت بە تاریکاییدا دەڕوات، بەرەو پێشەوە دەچوو. دواتر وەك خەون و خەیاڵ وەبیری دەهاتەوە، کە پێ دەنێتە رێگەیەکەوە و خاك و خۆڵی رێگەکە وەك ئاسنی سوورەوەکراو بنی پێی دەسووتێنێ و ئەو لەتاوان دەست دەکات بە راکردن و تەنیا کە دەگاتە شارۆچکەکە چاوی هەڵدێنێ. وەك خەون و خەیاڵ... وەبیری نەدەهاتەوە ئاخۆ ئەو رۆژە شتێکی لە گەرووی چووەتە خوارێ یان نا.

ماوەیەك دواتر، چاو هەڵدێنێ و دەبینێ ئەوە لە نێو ماڵێکدا، لە بەرانبەر پیاوێکی مێزەر بەسەر لەسەر ئەژنۆ دانیشتووە و شتێك لەبەر دەکات و هەندێ شتیش بەخوار و خێچی دەنووسێ و کاغەزێك رەش دەکاتەوە. هەر هەموو رابردووەکەی تەنانەت وەك خەون و خەیاڵیش نایەتەوە بیری. لە شارۆچکە چیی کرد، چووە کوێ، چۆن هاتە ئەو ماڵە؟ کێ هێنای؟ وەبیری نایەتەوە کە لە کەنگێوە لە بەردەم ئەو مەلایەدا ئاوا چوارمەشقی دانیشتووە و کۆمەڵە شتێك، وشەگەلێکی لە ژیانیدا نەیبیستوون، دووپاتی دەکردنەوە.

دەموچاوی شوشت و چوارمەشقی لەسەر سفرەکەی دانیشت. بەرچایی هەموو رۆژێ هەر ئامادە بوو. سەلکێك رۆنی کەرەیان لە نێوەڕاستی قاپێکی مسی دانابوو. شوێنی پەنجەکان بەسەرییەوە و جێی دلۆپە دۆیەکان لەسەری تۆقلەی کردبوو... لەتێکی شانەی هەنگوینیش

لەسەر سفرەکە بوو. هەنگوینێك کە لە دۆڵی چیچکلییەوە هێنابوویان. لە تەنیشت هەنگوینەکەش سەلکە پەنیرێکی وەك شانە هەنگوینەکە کون کون بوو، دانرابوو. حاجی قۆرت بۆغا لە پێشدا دەستێکی بە ردێنیدا هێنا. ردێنەکەی تۆپەڵە و چاککراو بوو. زۆر درێژ نەبو. کەیفی بە ردێنی درێژ نەدەهات. لەتێکی لە نانەکە پچڕی. لە پێشدا بەکەوچکە چێوییەکە رۆنەکەی هەڵگرت و خستییە نێو ناکەوە و هەر بەو کەچکەش بە قاپە سواڵتەکەدا هەنگوینی هەڵگرت و شارەزایانە لە رۆنەکەی هەڵسوی. نانەکەی نوشتاندەوە و کردییە بابۆڵە و چاوەکانی لێك نا و قەپاڵێکی لێ دا. لە قوونی بابۆڵەکەیەوە هەنگوینی تێکەڵ بە رۆنەکە هاتە دەرێ و کەوتە سەر ئەو نانانەی لەسەر سفرەکە دانرابوون. دوایی هەر ئەو نانە هەڵدەگرێ و دەیکاتە بابۆڵە. کە یەکەم پاروو دەخوات، کووپێك چای لە سەماوەرە کوڵیوەکە بۆ تێدەکرێ و لە پێشی دادەنرێ. ئەوە دڵی حاجیی خۆش دەکرد. دوای ئەوە پارووی لە ماست و پەنیرەکە دەدا. بە دوای ئەویشدا پاروویەك رۆنی کەرە و هەنگوین و ئیتر... بەرچاییەکەی بە بابۆڵەی هەنگوین و کەرەوە، کە یان بەسەر پێوە یان بەسەر زینەکەوە و لە "ماشێن"دا دەخورا، تەواو دەبوو.

لەگەڵ گەردوگوڵی بەیانیدا، دەنگی گرمەی مەشکە لە ئاوایی دەگەڕا. یەکەمین سەلکە رۆن کە دەگیرا، لە سەر سفرەکەی حاجی دادەنرا. ئەو کەرەیە بۆنی کاژ (سنۆبەر)ی لێوە دەهات. چونکە لە توێکڵی سووری کاژدا مەشکەکە رادەگرن. کەوڵی بزنێکی سوور، دەباغی دەکەن و مووی لێ دادەڕنن و خوێی دەکەن و ئەوجار بەو داوو دەرمانانەی لە هەزار و یەك جۆرە گیا دروستیان کردووە، دەیسوونەوە و بۆنەکەی دەگرن و کاتێ مەشکەکە ئامادە بوو، ئاوی تێدەکەن و چەند رۆژان دەیژەنن. کە خۆش بوو، جا دێنن ماستی تێدەکەن و مەشکەی دەژەنن. مەشکەکە سوورباوە. هەموو رۆژێ دوای مەشکەژاندنەکە، لە کوتراوەی توێکڵی سووری کاژی دەنێن. ئەوە نەریتێکی کۆنی تورکمانانە. زۆر دواتر ئەو دۆلکەیەی لە بەرمیل دەچێ لە چێوی کاژ دروست کرا و حاجی قورت بۆغا قەت نەیهێشت دۆلکە بەماڵیدا بێ.

"بانگی شۆفێرەکە بکەن."

ترۆمبێلەکەی، فۆردێکی رەشی درێژ بوو. چەند مانگێك بوو کڕیبووی. هەر لە کۆنەوە کام ئەسپی عارەبی جوان بوو، سواری ئەو دەبوو. لەو دنیایەدا هیچ شتێك هێندەی ئەسپێکی رەسەنی عارەبی کاریگەریی لەسەر بنیادەمەکان دانانێ.

ئەو یەکەم کەس بوو کە بارگینی لە پەیتوونە رازاوە و جوانەکەی خۆی کرد. پاڵدانەوە لە پەیتووندا و جگەرە بەباداکردن زۆر لە ئەسپ سواری بەشکۆتر دیار بوو. زۆر زوو باوی

پەیتوونیش نەما و سەردەمی ترۆمبێل داکەوت. دەبوو سواری ترۆمبێلێك بیێ لەو چوکووراوایەدا کەس نەیبیێ و تەنانەت چاوەکانی عەلی سایب بەگ و سۆمای چاوی مستەفا کەمال پاشا و عەلییە شێتیش بەدیتنی لە ژێللا بێن. بەگەکانی رەمەزان ئۆغلێش و هەر وەها و هەروەها... بەگەکانی ئەنتەپ و بەگە چاوسوورەکانی ماراشیش ئێرەیی پیێ بەرن. هەر شتێك سەردەمێکی هەیە. ئیتر باوی ئەسپ سواری نەماوە و کۆن بووە. لەو دەشتەدا جگە لەو دەروێشە لووتبەرزە لەخۆباییە، کە پێی وایە کوڕی خودا و خەلیفەی پێغەمبەر و برای مستەفا کەمال و نەوەی چەنگیزخانە، کەس سواری ئەسپ نابیێ... ئەویش لە ترسان سواری ئەسپ دەبیێ. جگە لە دەروێش کە رەچەڵەك و بنە و بنەچەکی دەچێتەوە سەر غوزەکان و بەگەکانی یۆرقیرلی و هەروەها هەوشاری گەورە و بەرەی قایی و ئەو عێل و عەشیرەتانەی باب و باپیرانی عوسمانییەکان بوون و برازای زولقادرلی.... هەی گووم بە رەچەڵەکی، لێی گەڕێ با ئەوەندە سواری ئەسپ بیێ، با هێندە سواری بیێ سەگبابی ئاوا، هەتا چاوی دێتە دەرێ...

"سلاو کاکە حاجی. سلاو گیانەکەم. ئەوەندەت چاوەڕێ بووم چاوەکانم مووقراییان دایە و ئاوی چاوم رژا."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی دەرگای ترۆمبێلەکەی کردەوە. ترۆمبێلەکە هاتبوو و لە بن دار چنارە بەرزەکەی بەردەم بازاڕگەکەی شار رایگرتبوو.": بەخێر بێی."

حاجی ئاغا لەخۆباییانە دەستێکی لیێ هەڵێنا. کەیفی لە گوشینی دەستی خەڵکی نەبوو. ئەو دەست و موشتاقەش داهێنانێکی نوێ بوو. داهێنانی کافران. بەڵام ماهیر بەگ بنیادەمێکی خوێندەوار بوو. لە ڤیەننا دەرسی خوێندبوو و دنیا گەڕابوو و دەرسەکانی فێر ببوو و لەبەری کردبوون و لەگەڵ عیسمەت پاشا لەسەر سفرەیەك دانیشتبوو و چووبووە خزمەتی فەوزی پاشا. ئاگای لە هەموو شتێك هەبوو. جنۆکەی ناڵ دەکرد. لەگەڵ عەولخالق ئەفەنی نێوانی خۆش کردبوو و لە ماوەی چەند ساڵێکدا هەرچی زەوی و زار و مڵکی هەرمەنییەکان بوو بەناو خۆی لە قەباڵەی کردبوو. قاباقچی خۆی بەرەڵلایەك بوو و هیچی دی و دواتر لە سێبەر و بن باڵی ئەو شەیتانەدا بوو بەو قاباقچییە.

"حاجی ئاغا لە سەرەوە چاوەڕێتن. مامۆستا رۆستەم بەگ، و سلێمان ئەسلان سێوی پەنجەش هاتوون. جەفەر ئۆزپولادیش لێرەیە. زالم ئۆغلێش..."

حاجی ئاغا قۆرت بۆغا گوتی:"باشە، باشە."

ئیتر وەڕێ کەوت. پانتۆڵە فش و ڕێ ڕێیەکەی لە ڕۆیشتنێدا چین چین دەبوو. پشتوێنە سپییەکەی لە چاکی چاکەتەکەیەوە دیار بوو. پۆتینە تۆزاوییەکانیشی بەحاڵ بریقەیان دەهات. چاوی سەوز و گەورە و گەش و دەموچاوی درێژ و برۆکانی پڕ بوون. برۆ پڕ و خەنەلێدراوەکانی پێش هەموو جێیەکی سەرنجی بنیادەمی رادەکێشا. هەمیشەی خودا دەتگوت حاجی ئاغا کۆسەیە و ردێنی نییە. چوارشانە و کەڵەگەت و قیت بوو. زیپکەیەکی گەورەی بەسەر روومەتی راستییەوە بوو کە سوور دەچۆوە. نێوچاوانە پانەکەی پڕ بوو لە چرچ و لۆچی قووڵ. دەچووە هەر جێیەك، دەست و پێ زلەکانی و سمێڵە پانەکەی بەر لەخۆی وەژوور دەکەوتن و بەوجار قەڵافەتە سامناکەکەی خۆیشی وەژوور دەکەوت.

ئەوی لە "یانە"کە بوون یەك پێ لەبەری هەستان.

حاجی قۆرت بۆغا لە حاڵێکدا دەستی بە سینگییەوە نابوو و بەبێ چاوترووکاندن چاوی بە یەك بەیەکیاندا دەگێڕا، گوتی:سلامون عەلەیکوم، سەلامون عەلەیکوم."

ئەوانیش کە هێشتا هەر بەپێوە بوون، لە وەڵامدا گوتیان:"عەلەیکوموسسەلام."

لە هەموو هەڵسوکەوتیانەوە رێز و حورمەتێك بە تێبینییەوە بەرانبەر قۆرت بۆغا، هەست پێ دەکرا.

هەر دانیشت، لە هەموو لایەکەوە قوتووی جگەرەی بەرەولا رادێردرا و حاجی ئاغا سەرێکی لەقاند و گوتی:" سوپاستان دەکەم، لە قوتووەکەی خۆم..."

جا وقتووە زێڕینەکەی خۆی لە گیرفانی دەرهێنا و لەسەرخۆ جگەرەیەکی پێچایەوە و خستییە نێوان لێوەکانی و دایانگیرساند. " ئێ ێ ێ برادەرینە، ئێ ئێ ێ، برادەرینە، وا دیارە داواکاری گشتی هەر مل بادەدا و سوورە لەسەر داواکەی، باشە، با سوور بێ، بزانین..."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی دووپاتی کردەوە:"با سوور بێ، بزانین."

هەمووان وێکڕا گوتیان:"با سوور بێ بزانین."

ئەو داواکارە گشتییەی باسیان دەکرد، عێزەدین فەخرەدین بەگ بوو. کەس نەیدەزانی ئەو کەنگێ هاتووەتە ئەو شارۆچکەیە. چەند زنجیری زێڕی تایبەتی بیستوچوار عەیاری بەسەر ورگە زلەکەیدا شۆڕ کردبووەوە. دەرزییەکی ئەڵماس نیشانیشی لە بۆینباخە سوورە کوڵکەهەڵدراوەکەی دابوو. دەیانگوت باپیرەی داواکاری گشتی جێگری سەرۆکی پێشوو بووە و بە فەرمانی پادشا کوژرابوو. بەڵام کەس نەیدەزانی کام جێگری سەرۆك بووە و بە فەرمانی کامە پادشا کوژراوە. خۆی ئەم داواکاری گشتییەش هەرگیز بە روونی باسی نەدەکرد.

ئەوەندەی پێی کرابایە خۆی لە شانازیکردن بە ڕەچەڵەك و باب و باپیرانییەوە دەدزییەوە. ئەو کابرایەکی گۆشەگیر بوو و دەستی لە دنیا بەردابوو. لە گێژاو و تۆفانە گەورەکان نەجاتی ببوو لە بەستێن و کەنارێکی ئارام گیرسابۆوە و پاپۆڕەکەی ژیانی لەو تەنکاوەدا خەریك بوو دەپوا و دەڕزی. هەموو شەوێ لە ریستورانتەکەی ئینجەجیك ئۆغلی لەگەڵ کارمەندەکانی دیکە لەسەر سفرەی مەشرووب دادەنیشت و بەبێ ئەوەی بۆی گرنگ بێ ئەوانیتر ئاخۆ لێی تێدەگەن یان نا، پەیتا پەیتا چوارینەکانی خەیام و عەزەلەکانی فزوولی و نەدیمی و نایلی و نەبی و نیزامی و عورفیی دەخوێندەوە و یەك بە یەك لێکی دەدانەوە و شیی دەکردنەوە. ئیی وابوو بیست ساڵ بوو لەسەر ئەو مێزە لەگەڵی دانیشتبوو و ئێستا بەشێك لەو شێعرانەی لەبەر کردبوون کە عێزەدین فەخرەدین بەگ دەخوێندنەوە. گەپ و سوعبەتەکانی دەوری مێزەکە لای سەعات دە کۆتاییان پێ دەهات و هاوڕێیان سەعات دە و چارەگێك لە کافتریاکەی شار کۆ دەبوونەوە. لەوێ دەیانکردە قومار و هەتا نیوەی شەوێ هەر قوماریان دەکرد. پۆکەر و پۆکەری کراوە و حوکم و... هەر گەمە و قومارێکی دیکە کە پارەی زیاتری تێچووبایە... داواکاری گشتی لەسەر مێزی قومارەکە دەبوو بە پیاوێکی دیکە. کە دەیدۆڕاند لە دین دەهری دەبوو ئیمانی نەدەما و چەندی پتری دۆڕاندبا پتر پەلاماری دەدا. کە سوخت دەبوو* لە کافتریاکەدا، داوای لە هەموو کەسێك دەکرد پارەیەکی بەقەرز بداتێ جا لە دە لیرەوە بگرە تا هەزار لیرە و بگرە پتریش قەرزی دەکرد و دەچۆوە سەر قومارەکەی. ئیتر ئەگەر کەسیشی وەچنگ نەکەوتبایە، لە پلیکانەکان دەچووە خوارێ. زۆر جار وا ڕێککەوتبوو کە سەعات دوو و سێی بەیانی لە دەرگای ماڵێکی دەدا بەبێ ئەوەی بزانێ ماڵی کێیە و یەکتریان ناسیبێ و لەخەوی هەڵدەستاندن و دەیگوت:"رووتیان کردم. دار و نەداریان بردم. ئەمن سەرۆکزادەم. سەد لیرەیەکم بە قەرز بدەنێ لەو کات و ساتی تەنگانەیەدا پەکم لەسەری کەوتووە. کوڕە بێت و دەست بە روومەوە بنێن، ژنەکەم رام ناگرێتەوە. فریام کەون."

جاری وابوو لە شەوێکدا بەوجۆرە لە دە پازدە دەرگای دەدا و بەبێ ئەوەی شەرم بکا، داوای قەرزی دەکرد. ئەوانەی پێویستییان بە داواکاری گشتی دەبوو، ئەو جۆرە شەوانەیان بە غەنیمەت و هەلی هەڵکەوتوو دەزانی. داواکاری گشتی زۆربەی جاران ئەوانەی قەرزی لێ کردبوون و ئەو ماڵانەی لە نیوەی شەوێدا بەخەبەری هێنابوون، نەیدەناسینەوە، بەڵام جاری وابوو تووشی گێچەڵ دەبوو. ئەو زۆربەی جاران ئامادە نەبوو خزمەتێك بەو کەسە بکات کە

* سوختبوون: لە قورمادا بە یەکێك دەگوترێك ئیتر ئیفلاس دەکات و هیچی پێ نامێنێ و تەواو هەڵدەچۆڕێ. دەڵێ: سوخت بوو.

قەرزی داوەتێ و بەوهۆیە کەڵکی خراپ لە پێگەکەی خۆی وەربگرێ. بەڵام نەشیدەتوانی لە بەرانبەر هێندێکیاندا مل بادا. یەکێك لەو قەرزدەرانە و لە راستیدا یەکەم کەسیان حاجی قۆرت بۆغا بوو.

"دوێ شەوێ دە هەزار لیرەت وەرگرت."

"جەنابت کێی؟ ببوورە، ناتناسم. کام دە هەزار لیرە کاکی خۆم؟ ئاخۆ کەسێك دە هەزار لیرەی لێ خواردووی؟ ئەتۆ کێی؟"

عێزەدین فەخرەدین بەگ هەر بە راستی سەری سوورِ مابوو لە حاڵێکدا دەستەکانی لێك دەخشاندن، بە لەبزێکی ماقووڵانەوە گوتی:"سەیرە، سەیرە، فەرمووت دە هەزار لیرەی..."

"چی؟ تێ نەگەیشتم. بێدینی خوانەناس، باشە ئەی بۆچی دوێنێ کە دۆڕابووی و دە هەزار لیرەکەت لێ وەردەگرتم ئاوا باش دەتناسیم و ئێستاش نامناسیتەوە؟ دەڵێی باوکە سەرۆکەکەت..."

"تووڕە مەبە... تووڕە مەبە... جەنابت کێی؟"

"کاتێ دار و نەداری لێ دەستاندم..."

لە نەکاو بریسکەی دەمانچەیەك چاوی داواکاری گشتیی زەق کردەوە. لوولەکە رێك بەرەو نێوچاوانی عێزەدین فەخرەدین راگیرابوو.

"تکا دەکەم، تکا دەکەم، لەسەرخۆ بە، هێمن بە. من لە تۆم پرسی جەنابت کێی؟"

"ئەمن حاجی قۆرت بۆغای قاتڵی رەجەب جۆمبوشم. رووداوێکە و قەوماوە. دە هەزار لیرەی دیکەش دەدەم و دەبێ ئەو گێچەڵەم لەکۆڵ بکەیتەوە. بەڵێ، خۆت چۆنت پێ باشە."

داواکاری گشتی ئارەقەی نێوچاوانی بە دەسرەیەك سڕییەوە و وردە وردە وەخۆ هاتەوە و رەنگ و رووی وەبەر هاتەوە و ئاخری سەری هەڵێنا و گوتی:"تکا دەکەم. ئێرە ئیدارەیە. دەمانچەکەت بخەرەوە جێی خۆی و هیچ هەڵمەچۆ. ئەوە ئێستا تۆم ناسییەوە. چەندی پێت دەکرێ ئەو دە هەزار لیرەیە ئامادە بکە پێویستم پێیەتی. ئەتۆ برادەرێکی لە براکەم فەڕزتری. خەمت نەبێ. کارەکەت رێك دەخەم. دیارە خۆت دەبێ یارمەتیم بدەی."

"چیم لە دەست بێ دەیکەم خاوەن شکۆ. پارەش ئامادەیە."

"لەبەر ئەوەی بڕیارەکە دەرچووە، ئەتۆ دەبێ ئێستا حاجی قۆرت بۆغایەکی دیکەم بۆ بدۆزیتەوە. بڕیارەکەت دەرچووە و پێشیدا چوونەتەوە و تەمیزپش کراوە. بیست و چوار ساڵ زیندانت بۆ بڕاوەتەوە، وایە؟"

"بەڵێ، بیست و چوار ساڵ."

"حاجی قۆرت بۆغایەکم بۆ پەیدا بکەن. بۆ هەر ساڵێکیش دوو هەزار و پێنج سەد لیرە تەرخان بکەن."

"دانی دووهەزار و پێنج سەد لیرە شتێك نییە، بەڵام... حاجی قۆرت بۆغا لە کوێ بدۆزمەوە."

"بچۆ لای کارمەندەکەی ناسنامە و باری کەسێتی. تێگەیشتی؟ کەسێك بدۆزەرەوە ناسنامەی نەبێ."

"زۆر باشە، زۆر باشە جەنابی داواکاری گشتی... بەڵام قسەی خۆمان بێ جەنابی عێزەدین فەخرەدین بەگ ئەتۆ بۆ خۆت پادشایەك بووی ها... هەر بژی... بژی... قەرەجێکت بۆ ... باشە؟"

"قەرەجێکی باش دەتوانێ حاجی قۆرت بۆغایەکی باش بێ... دەینێرمە دیاربەکر... ئەویش لەوێ هەرچی هاوار و فوغان بکا و بڵێ ئەمن حاجی قۆرت بۆغا نیم، رەجەب زووبیم، تازە تێکەوتووە. کابرا تا یەکەم لێبوردن دەردەچێ، هەر حاجی قۆرت بۆغا دەبێ. حاجی قۆرت بۆغا، حاجی قۆرت بۆغازادە."

"هەر بژی جەنابی داواکاری گشتی. ئەتۆ نەك نەوەی سەرۆك، بەڵکو نەوەی پادشای. رەجەب زووبیت لەکوێ دەناسی؟ لە کوێ وەبیرت هاتەوە؟ هەی خوا راوەستاوت بکا و دەست بە باڵتەوە بگرێ، جەنابی داواکاری گشتی، هەر بژی."

هەردووکیان پێکەنین. پێکەنینەکان ماوەیەك تێکەڵ بوون و ورگ و سمێڵەکان هەڵبەزینەوە و دەستەکان شلّپ و شەق بە رانەکاندا کێشران و دەرك و دیواری ژوورەکە ماوەیەك لە تۆفانی قاقا و پێکەنینەکاندا لەرزین و لەرینەوە.

رەجەب زووبیش بوو بە حاجی قۆرت بۆغا. ئێستا وەك دەڵێن لەمێژە لە زیندانێ هاتووەتە دەرێ و هەر وا ناوی حاجی قۆرت بۆغاشی بەسەرەوەیە. تەنیا لە هەنتەشی ئاغادا کە هیچ کەس نەیدەوێرا بە حاجی قۆرت بۆغا بانگی بکا. ئاغا، گوێی لە شتی ئاوا بوایە ئیمانی نەدەما و دار و بەردی پێکدا دەدا. رەجەب زووبیش کەیفی دەهات کە حاجی قۆرت بۆغا بێ. چێژی حاجی قۆرت بۆغا بوونەکەی لە بن ددانیدا بوو.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی لە قۆرت بۆغای پرسی:"بانگی بکەین بێتە ئێرە؟"

حاجی قۆرت بۆغا قامکە درێژ و تۆکمە و ساغەکانی لە ردێنەکەی رۆکرد و چەناگەی خوراند و بیرێکی کردەوە. هەموو گوێ قولاغ بوون بزانن دەڵێ چی. دەستی لە ردێنییەوە بەرەو سمێڵی و لەوێشەوە بەرەو لووتی رۆیشت و تاوێك هەر هێنای و بردی و ئاخرییەکەی گەیشتە سەر لێوەکانی:"نا، دروست نییە."

ئیتر هاتە خوارێ و بەرەو ئەو کووپە قاوەیە چوو، کە دەمێك بوو لەو پێشیان دانابوو و جا دەستی کرد بە قسەکردن:"دروست نییە. ئەو برای گیانی گیانیمانە. خۆ نۆکەرمان نییە. ئەمن ئەوم زۆر خۆش دەوێ، هەر وەك چۆن حوکمەتەکەمان خۆشەویستە. هەر بۆیەش، دەڵێم نابێ بانگی بکەینە ئێرە. ئێستا ئێمە هەر هەموومان لێرەوە دەچینە هەنتەشی جەنابی عێزەدین فەخرەدین بەگی رەسەنزادە. دەڵێن چی؟"

ماهیر بەگ گوتی:"زۆریش باشە. لەوە باشتر نابێ."

"لە پێشدا من، دووەم کەس تۆ، سێهەم کەس، سێهەم کەس..."

چاوەکانی قۆرت بۆغا بەسەر روخساری یەك بەیەکیاندا گەڕا و ئاخرییەکەی لەسەر رۆستەم بەگ راوەستا و لە قوڕگییەوە قسەکانی هەڵڕشت:"ئەها، سێهەم کەس، تۆش وەرە مامۆستا، ئەتۆ قسەخۆشی."

ئەوجار نیگای لەسەر رۆستەم بەگەوە هەستا و لەسەر روخساری سلێمان سەلان سێوی پەنجە نیشتەوە:"تۆش وەرە سلێمان ئاغا."

وێکرا گوتیان:"باشە، باشە، کێشە نییە."

بەڵێ ئاغای خۆم. ئاوا ئاقچاساز وەك گۆشتی قوربانی بەسەر خۆماندا دابەش دەکەین. بەڵام ئەو قەرەجانە لەکوێوە پەیدا بوون؟ ئەو گوندییانەش، ئەو گوندییە گێژ و وێژانە، ئەی چ لەوانە بکەین؟

ماڵ بەکۆڵەکان لەسەر تەل بۆغا، لە سەرووی بەردەنیشانەوە، بار و بنەیان خست...

دە هەزرا دۆنم زەوییان داگیر کرد. خێوەتیان هەڵگرت و بە پووش و قامیش کۆخ و کەپریان ساز کرد. دەیانگوت ئێرە ئارانی باب و باپیرانمانە. هەر ئەوەندەیان دەگوت و هیچی دی. بەر لەوەی نیشتەجێمان بکەن، ئارانی ئێمە بوو و دوای نیشتەجێکرانمان، بوو بە نیشتمانمان. دەروێش پاشا خۆی ئێرەی بە ئێمە بەخشی. سەرشانکەکانی* دەروێش پاشا وەك خۆر دەدرەوشانەوە و لە سەر ئەسپێکی وەك نەڕەشێر... دەروێش پاشای چاوشین کە سوار دەبوو، لە

* سەرشانکە: نیشانێکی سەربازییە لە سەر شانی کراسەکەیانی دەدەن.

بن بارستایی قەڵافەتە تۆکمەکەیدا پشتی ئەسپەکەی دادەهات. ئەو دەمەی تورکمانە گەمژەکان دژی نیشتەجێکران، وازیان لە زەوی و زار و ئارانی باب و باپیرانیان دەهێنا و رایان دەکرد، دەروێش پاشا هەموو ئەو زەوی و زارەی هەر لە ئیسلاحییەوە بگرە تا دەگاتە خاسێ و تا حەڵەب لەقەباڵە کردبوو.

ئەو ماڵ بەکۆڵە گەمژانەش زۆر دوای ئەوە، پاش ئەوەی تازە کار لە کارێ ترازا، هاتن و دەستیان بەسەر ئارانێدا گرت. بەڵێ کاکی خۆم، ئاوا بوو. بەڵام بەرەنگاربوونەوەی ئەو ماڵ بەکۆڵانەش زۆر سووك و ساکار نییە. هەر بە ئاماژەیەك سەد چەکداری شەڕکەر ئامادە دەکەن. ئەدی بە ئاماژەیەك... و هەر کامەشیان بە نۆرەی خۆی شەهێنێکی خوێنمژ. دەرکردنیان لەوێ، لە ئاقچاساز مەحاڵە. لەگەڵ وشکبوونی ئاقچاساز، ئەوانیش هەتا نێوەڕاستەکەی دەچنە پێشێ. ئەوجار، لەوەش خراپتر ئەو ماڵ بە کۆڵانە پشتیوانێکی دەستڕۆیشتووشیان هەیە کە ئەگەر بیەوێ، هەزار پیاو چەکدار دەکا.

بەڵێ کاکی خۆم، بەڵام ئەو گوندییانە، پیاو بەزەیی پێیاندا دێ. دەبێ بەزەییشت پێیاندا بێتەوە. چما ئەوان هاونیشتمانیمان نین؟ برامان نین؟ رێك نێوەڕاستی ئاقچاساز، چەقی ئەقیەکە،... پەڵەیەکی رەش... بە چاوی خۆم دیتم. ئەگەر سەرە دەرزییەك درۆم کردبێ، یاخوا کوێر بم. ئەو گوندە لەوێ، ناهێڵن لەوێ بمێنێتەوە... ئەو خاکەی کە هەر بستۆکەیەکی دراوێکی زێڕە، مەحاڵە بدرێتە دەست ئەو گوندییانە... نایاندەنێ. بەقورئان نایاندەنێ. بەزەییم بەو داماوانەدا دێ... بەزەییم پێیاندا دێ، ئەی کاکە، ئەدی... وەختە ئاورم بۆیان تێبەربێ... ئاوری تێبەر نەبێ چ بکا؟ ئاورت تێبەربێ ئەی دڵ، بسووتێ و هەڵقرچێ...

لە چیاکانەوە هاتن. بە کالەی دڕاو و پۆتینی سووری زبر و سۆلی زەرد لە پێ و پانتۆڵی ئەستووری پەشمین کە بە توێکڵە گوێز و هەنار رەنگیان کردبوو و چاکەتی کۆبەگیراو لە قوماشی مانیی ماراش لەبەر. ژنەکانیشیان بە بەروانکەی سووری دەورگیراو و پیرێژنەکانیان بە کراسی ئاوادامێن و لەچکەی سپییەوە و کچ و تازەبووکیشیان بە سوخمە و شەدە و گێل گێلەوە. سازی جۆراوجۆری وەك تۆلۆم* و قاباق** و دەهۆڵ و زوڕنا بە دەستیانەوە و بە گوتنەوەی ئەو سەردولکە و گۆرانییانەی لە سەدان ساڵ لەمەوپێشەوە گوترابوون، هاتن.

---

* ئامێرێکی هەوایی کە لە پێستەی مەڕ و بزن و بەرخ و ئاسك و لە شاخی مانگاش دروست دەکرێ.

** ئەو ئامێرە موسیقییە لە کوولەکە دروست دەکرێ.

هەندێکیان خەڵکی تۆرووس دوور بوون و بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد. هەر شوێنێکی تەختاییان گیر دەکەوت یان دەگەیشتنە سەر هەر تاتە بەردێکی پان دەستیان دەکرد بە گۆرانی و هەڵپەڕکێ و ئاگری گەورەیان دەکردەوە و لە بەرانبەر ئاگر و بنیادەم و خاك و هەرچی لەو دنیایەدایە و هەرچی جوانە و لە بەردەم گوڵ و ئاسماندا کە وەك گوڵێکی گەورەی مۆر پشکووتووە و لە هەمبەر ئەو ئاوە زوڵاڵانەدا کە رووناکاییان لە ناخەوە هەڵدەقوڵێ، کڕنۆشیان دەبرد. ئەژنۆی راستەیان لەسەر خاکە نەمرەکە دادەنا و دەستیان دەکرد بە راز و نیاز. وازیان لە هەموو شتێك دەهێنا و دەستیان لەخۆیان دەشوشت و پتشیان دەکردە نیشتمانەکەیان و دەستیان لە گوند و ماڵ و حاڵیان هەڵدەگرت و لە داوێن و بنارەکانی تۆرووسی مەزندا، بە نێو داری سنۆبەر و گێلاس و دەوەن و گوڵە کێوییەکاندا بە دەشتەکە وەردەبوون. پەرش و بڵاو و سەرلێ شێواو بوون. سەدان ساڵ چەوسێنرابوونەوە و تاڵ و سوێرییان چێشتبوو. بست بە بست دارستان و لێڕەکەیان لە دار و دەوەن پاك و خاوێن دەکردەوە و رێکیان دەخست و بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەری کێڵگەیەکیان ساغ دەکردەوە. دوای سێ چوار ساڵان کوێرەوەری جا ئەوجار دۆنمێك دوو دۆنم زەوییان لە لێڕەکە ساغ کردبایەوە، هەر بستە زەوییەك بە ئارەقەی نێوچاوان... ساڵێك دایدەچێنن و ساڵەکەی دیکە لافاو دێ و رایدەماڵێ و لەبری خاك و گڵەکەی، ئەوەی جێ دەمێنێ هەر رەوەزێکی زبر و رەق و تەقە. ساڵێك نا، پێنج ساڵ نا، لەوانەیە سەد ساڵ لەوانەشە سێ سەد ساڵ... و دار و لێڕەکەی تۆرووس و خاکەکەی تۆرووس بەو جۆرە وردە وردە فەوتا و گوڵ و گیا و مێش و جڕ و جانەوەر و باڵندە و دەعباکانیشی تێداچوون و فەوتان. ئیتر یەك یەك و دووان دووان بە تاك و بە کۆ بەرەو دەشتەکە داگەڕان و تا وای لێ هات بوو بە کۆڕەو و بە پانەوە روویان لە دەشتاییەکە کرد. زۆربەی زۆریان بە نۆبەتێ و نەخۆشی و پەتای دیکە تێداچوون و ئەوانەش کە قوتار بوون، بوونە نیوەکار و نۆکەر.

خاتوون چاوڕەش، تووشی نیگەرانی و دڵەخورپە بوو. زەوی و زار و نۆکەری لە دەشتەکەی ئاناوەرزا، زۆر و زەوەند بوو. هەواڵێکی ناخۆش کەوتە سەر زار و زمانان کە بەڵێ حکومەت ئەو زەوی و زارانەی نیوەکارەکان کاری لەسەر دەکەن، دەیداتە خۆیان... خاتوون چاوڕەش ئەو دەنگۆیەی بیستەوە و بە نیوەکارەکانی خۆی گوت:"برادەرینە، ئەوە گوناح و خەتای من نییە، بەڵکو هیی حوکمەتە کە دەیەوێ زەوی و زارەکەی من بداتە ئێوە. هەر ئەمڕۆ نا بەیانی، سڕ و سیپاڵتان کۆ بکەنەوە و بۆ کوێ دەچن بچن. گوتیان کاری وا مەکە خاتوون، ئەوەمان لەگەڵ مەکە خاتوون، ئێمە تۆ و زەوی و زارەکەتمان خۆش دەوێ. ئێمە زەوی و زاری تۆ وەرناگرین و

داگیری ناکەین. ئەتۆ چاکەت لەگەڵ ئێمە کردووە و کردووتین بە نیوەکاری خۆت. ئێمە نان و نمەکی یەکترمان کردووە، نانی تۆمان خواردووە، ناندێنت نادڕین. خاتوون چاوڕەش گوتی:"دەزانم، دەزانم ئەنگۆ زەوی و زاری من داگیر ناکەن، بەڵام حوکمەت بە زۆر و زۆرداری زەوی و زارەکەی من دەداتە ئێوە. گوندی بە پاڕانەوەوە گوتیان، تەنانەت ئەگەر بە زۆرییش پێمانی بدات وەری ناگرین. خاتوون چاوڕەش گوتی:"ئەمن حوکمەت باش دەناسم. ئەگەر لێی قەبووڵ نەکەن و زەوی و زارەکەش وەرنەگرن، زۆریتان لێ دەکات و تێتان هەڵدەدا و بیانووی ئەوەتان لێ دەگرێ کە سەرپێچیتان کردووە و ملتان باداوە، بۆیە تێتان هەڵدەدا و دەتانکوژێ. من دەزانم ئێوە زەوی و زاری من وەرناگرن و سپڵەیی ناکەن، بەڵام دەرەقەتی ئەو حوکمەتە نایەن و باشاری ناکەن.

گوندی هیچیان نەگوت. دەست لە گونان درێژتر گەڕانەوە و ئەو شەوە هەتا بەیانی دار و نەداری خۆیان و سڕ و سیپاڵیان کۆ کردەوە و نیوەشەوێ گوندەکەی خاتوون چاوڕەشیان بەجێ هێشت و لێیاندا و ڕۆیشتن. گەیشتنە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا. لە بناری ڕەوەزەکان ئاگرێکی گەورەیان کردەوە و لە دەوری دەستیان کرد بە هەڵپەڕین و هەتا بەیان ئەنگوت لەگەڵ دنیا و مانگ و ئەستێرەکان ڕاز و نیازیان کرد. کازیوەی بەیانی کە سەیریان کرد دەشتە تەختاییەکەی ئاناوەرزا و کەنارەکانی ئاقچاساز پڕ بوون لە قریوە قریوی گوندیی ڕەتێنراو و دەرکراو.

گوندییە دەرکراو و ڕەتێنراو لە زەوی و زارەکان، ئاوارەی ئەو دەشتە بوون و لە مەڵبەندەکەی چوکووراوادا دەرگایەك نەما لێی نەدەن و شوێنێك نەما لێی نەگێرسێنەوە. سەریان بە هەر کونێکدا کرد، چاری دەردی سەرگەردانیی خۆیانیان نەدۆزییەوە.

گەرمای نیوەڕۆ بەردی دەبرژاند و تاقەتی لە مرۆڤ دەبڕی. لە نەکاو دەنگێکی تیژ پەردەی ئەستووری گەرماکەی دڕی:"هۆۆۆۆی ی ی جووتیارەکان، جووتیارەکانی چاوڕەش."

جوتیارەکانی چاوڕەش لە بن دارێك کۆ بوونەوە. هەر هەموویان لەبەر نۆبەتێ لێوەکانیان باری گرتبوو و شەقار شەقار ببوو. چنگێك پێست و ئێسقان نەبێ هیچیان لێ نەمابووەوە. منداڵەکانیان یەك لە دوای یەك گیانیان دەردەچوو. تەرمی منداڵەکانیان بە دزییەوە لە شیوەکەی چاوڕەشدا دەناشت. لە نێو گوندییەکاندا پیرەمێردێکی دنیادیتە هەبوو بە ناوی عەلی ڕەزا. عەلی ڕەزا سەرەڕای پیرییەکەی تۆکمە و ساغ و سەلیم بوو و بە گفت و لفتیش جوامێر... عەلی ڕەزا بە گوندییەکانی گوت:"ئاوا نابێ برادەرینە، ئەوە چەند مانگێکە ئێمە ئەو دەشتی چوکووراوایە دەبڕین و هەر وەك دەبینن هێشتا دەستمان لە هیچ کوێ بەند نەبووە.

زیانێکی زۆرمان وێکەوتووە و نۆبەتێ قڕی تێخستووین. ئێستا پێشنیارێکم هەیە. پێشنیارێکی دژوار و ئەستەم. نیوەی مەرگە و نیوەی ژیان، بەڵام ئاقیبەت بەخێر. ڕێ و چارەتان نیشان دەدەم. هەرکەس ویستی لەگەڵ من بێ و ئەوانەش کە نایانەوێ با هەر وا سەرگەردان و سەرلێشێواوی نێو ئەو چوکووراوایە بن."

گوتیان:"بلێ گیان و ماڵمان لەسەر تۆ گەڕێ عەلی ڕەزا. فەرموو لەو دەربەدەرییە ڕزگارمان بکە، پێشنیارەکەت بلێ. هەر ئەوەندە بەسە ڕێگەی ڕزگاربوون لەو بەڵایەمان نیشان بدەی..."

گوتی:"پێشانتانی دەدەم.."

دەنگی عەلی ڕەزا وەك تۆپێك بەسەر حەشامەتەکەدا تەقییەوە. دەنگەکە بەرز و بێ گرێ جارێ نزم دەبووەوە و جارێك هەڵدەکشا.

"ئەو ئاقچاسازە دەبینن؟ ئەو زۆنگاو و مێشەڵان و دڕووەڵانە، ئەو زەلکاو و قامیشەڵان و گێژاو و بەنداوە دەبینن؟ کورتی ببڕینەوە ئەمن دەڵێم لێرە، لەو بنەوە، سەد هەزار دۆنم، ئەنگۆ بڵێن دووسەد هەزار دۆنم خاك نووستووە. ئەویش چ خاکێك. بنیادەمی لێ بچێنی شین دەبێتەوە. خاکێك کە ڕێواسی لێ شین دەبێ. ئەو دەمەی بە شوێن جێ پێیەکدا چوکووراوامان دەبڕی، ئەمن بەجوانی ئەو ئاقچاسازەم پشکنی. ڕێك لە نێوەڕاستەکەی ئاقچاساز تەپۆڵکێکی لێیە وشك و ڕێکە. هەزار و سێسەد و چل و شەش شەقاو درێژاییەتی. جا ئێستا پێتان دەڵێم ئەمن دەمەوێ بچم و لەوێ نیشتەجێ بم. قەراغەکانی پەڵە زەوییەکەی نێوەڕاستی زۆنگاوەکە تەنکە. ئەگەر جۆگە و خەرەند و زنەکێشی لێ بدەین، دەتوانین خاك و عەرزێکی زۆر لە بن ئاوەکەوە دەربێنین."

یەك دەنگ و وێکڕا هاواریان کرد:"با بچین."

عەلی ڕەزا درێژە دوای تۆزێك ڕاوەستان و تەقاندنی پەنجەکانی، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:"ئەوەندەش ئاسان نییە کە بیری لێ دەکەنەوە. کۆسپی تاقەتبڕتان لە پێشە. دەوروپشتی ئەو تەپۆڵکەی دەڵێم هەمووی قامیشەڵانە و حەیزەران و قامیشی ورد و سێسوو و جەگەنە و سەر لە ئاسمانێ دەسوێ. هاڵاوی گەرماکە پیاو دەخنکێنێ و هیچ شنە و سروەیەك ئەوێ ناگرێ. هەواکەی خەست و قورسە و بۆگەن و ژەهراوییە. تەپۆ و مێشوولەکانی چنگێك دەبن و ئێسکدارن. هەر کەسێك سێ مێشوولە پێوەی بدات بەسیەتی، بەزیندوویی دەرناچێ. چیی مار و مێروو و دووپشك و هەڵپەزەی نێو زۆنگاوەکەیە هاتوون و پەنایان هێناوەتە بەر گردەکە.

لەوێ مارێکم دیت لێرەوە بۆ هۆوێ درێژ بوو. ماری چی، هەژدیها و حەزیایەك بوو. دەتگوت لەوانەیە وا دەڵێن شاخیان هەیە. کە منی دیت درۆشەی دەرکێشا. درۆشەکەی دەتگوت چەتاڵە و هێندەی لەپی دەستی من پان بوو. دەڵێن چی؟ بچین یان نا؟ ئاوەدانی بکەینەوە و لێی نیشتەجێ بین؟ با ئەوەش بڵێم هەر لە چوار کەسمان لانیکەم سێ کەسمان دەمرێ. منداڵەکانیشمان قڕیان تێدەکەوێ."

کە عەلی رەزا درێژە قسەی تەواو بوو، هەموو کڕ و کپ ببوون. نە گوتیان دەبێ و نە گوتیان نابێ. چوونە فکرەوە و نێوچاوانیان تێك نا و بێدەنگ بوون و چەند ساتێك دوای ئەوە یەك یەك و دووان دووان سەریان داخست و بە خەمباری بڵاوەیان کرد.عەلی رەزا درێژە هەتا تەنگی نوێژی شێوان وەك گاشەبەردێك، لەجێی خۆی چەقی و دوای ئەوە رۆیشت و لە شەوەکەدا لەچاوان ون بوو.

چەند مانگ دواتر، هەواڵی عەلی رەزا بەهەموو دەشتەکەی ئاناوەرزا وەربوو. عەلی رەزا کەڵەکێکی بە دار و پەردووی داربییەکان دروست کردبوو و بەخۆی و ژنەکەی و دوو مانگا و سێ گوێرەکە و بارگین و گوێدرێژێك و مریشك و قەلەکانییەوە پێی پەڕیبووەوە نێوەڕاستی زۆنگاوەکە و لەوێ کەپرێکی بە قامیش دروست کردبوو و مەزرایەکی هێندەی دوو دۆنمی بۆخۆی رێك خستبوو و بێستانی لێ کردبوو. جا بێستانەکەی شوتیی چۆنی پێوەببوو؟ پیاو بەزۆری شووتییەکی پێ هەڵدەگیرا. شوتی بۆوەی دەبوو وەك کەر سواری بی. جا چەنێ شیرین؟ وەك هەنگوین، شیلەی هەنگوین. بەڵام مخابن و زۆر داخ مستەفا کەمالی کوڕە بچووکەکەی عەلی رەزا کە تەمەنی شەش ساڵان بوو، بەنۆبەتێ مردبوو.

گوندییەکان کە هێشتاش لە دەوری ئاقچاساز هەر سەرگەردان بوون، ئەو خەبەرەیان بیستەوە، نە توانای ئەوەیان هەبوو، بچنە شوێنێکی دیکە و نە دەشیانتوانی ماوەیەك زۆر لەوێ بمێننەوە. نە توانای ئەوەشیان هەبوو بگوازنەوە بۆ نێوەڕاستی زۆنگاوەکە. لەوێ، لە لێوارەکانی زۆنگاوەکە بەبێ ئەوەی تاقەتیان بێ سەیری ئەو نێرگزە درشتە پشکووتووانە بکەن و بۆنیان پێوە بکەن، یەك پشوو بەدەوری ئاقچاسازدا دەخولانەوە.

کۆسەدووران:"چارەیەکی دیکەی نەبوو. زەوی و ئاسمان و باڵندە و فڕندە و خزۆك و خشۆك وەخۆمان ناکەن. مەرگ مەرگە، جا لێرە بێ یان لەوێ. ئەمن لێرە کە ئاوارەی ئەو کەژ و کۆیەم زگم بە دوو منداڵی خۆم سووتا بەڵام عەلی رەزا درێژە هەر منداڵێکی مردووە. ئەمنیش دەمەوێ بچمە ئەوێ." بەوجۆرە کۆسەدوورانیش خۆی گەیاندە تەپکەکەی نێوەڕاستی

زۆنگاوەکە... عەلی رەزا بە باوەشێکی ئاوەڵاوە پێشوازیی لێ کرد و بەپیرییەوە چوو. دەمودەست و پێکەوە، کەپر و چادراغێکیان بۆ کۆسەدوورانیش پێکەوە نا و دەستیان کرد بە ئامادەکردنی زەوی و زار. دواتر گوندییەکانی خاتوون چاوڕەش یەك یەك و دووان دووان لە ماوەی مانگێکدا خۆیان گەیاندە گردەکە و گیان لەسەر دەستان، دەستیان کرد بە ئامادەکردن و رێکخستن و کێڵانی زەوی و کشتوکاڵ. لە ماوەی دووساڵدا بە ئارەقەی نێوچاوان زەوی و زارێکی بە قەرایی دووهەزار و دووسەد دۆنمیان لە جەرگی زۆنگاوەکە هێنایە دەرێ. زەوییەك ئەگەر رۆحی بنیادەمت تێدا چاندبایە، لێی شین دەبۆوە. منداڵ و بەساڵاچوویان لێ بڕا و هەر هەموو بە گرانەتا و نۆبەتێ مردن. بەڵام هەر چۆنێك بوو گوندەکەیان ساز کرد و ناویان نا "جان قورتاران" واتە گیان نەجاتدەر. مردووەکانیشیان بە دزییەوە بردە ئەوبەری زۆنگاوەکە و لە گۆڕستانەکەی گوندی چاوڕەش خاتووندا ناشتیانن. هەر بۆیەشە گوندەکەی جان قوتاران گۆڕستانی نییە.

بەڵێ کاکی خۆم و هەزار جار بەڵێ، ئاغاکان دەڵێن:"ئەگەر ئێمە برنجمان نەچاندبایە و بە درێژایی وەرزی هاوین و بۆ ماوەی شەش مانگان رووبارەکەی سارووغان وشك نەکردبایە، زۆنگاوەکەی ئاقچاساز قەت وشك نەدەبوو. هەر بۆیەشە کاکی خۆم، ئەو بەر و بووەی لە ئاقچاساز دەکەوێتەوەی، هیی ئێمەیە. ئەدی برالە، بەدی، دنیاش خرابێ کەس ناتوانێ لەو مافە رەوایەمان بێ بەشمان بکا. عەلی رەزا درێژەی بێچووەگورگ، کە دیقی کردووە و نیوەی جەستەی لەکار کەوتووە بەڵام هێشتا سەکەت نەبووە، لە جان قوتاران، لە زەوییەکەی خۆمان کە داگیری کردووە، وەدەر دەنێین. حوکمەت سەهلە، دنیاش ناتوانێ پێشمان بگرێ. ئاقچاساز هی خۆمانە...

بەڵێ ئاغا، خۆ ئێمە هێشتا نەمردووین. کێ ئەو خاك و عەردەی رزگار کرد؟ کێ ئاقچاسازی وشك کردەوە؟ کێ ئەو زەوی و زارەی ئاوەدان کردەوە؟ ... گوندی وایوایلی... هەی وەجاغتان کوێر بێتەوە. هەر کامەیان وەك گورگێکی برسی پەلاماری زۆنگاوەکەیان دا... سنوور و کەوشەنی ئێوە ئەوەتا. هەر ئەو خەرەندەیە کە پێش لێدرانەکەی ئاوی زۆنگاوەکە.... ئەوە بۆ کوێ ئاوا؟ سەیر بکە بزانە خەرەندەکە کەوتووەتە کوێ، پێنج کیلۆمەتر خەرەندەکەتان بەزاندووە. ئەو هەمووە زەوی و زارەتان بۆ چییە؟ هەر کامەتان سەد دووسەد، سێسەد دۆنمتان بڕ داوە. وەك مالی بابتان بێ. ئەو خاکە هی کەسێکە کە وشکی کردووەوە و ئاوەدانی کردەوە واتە هی ئاغاکانمانە. تێگەیشتن؟ ئەگەر تا ئێستا تێنەگەیشتوون، کە لەتەپڵی سەرتان راکێشرا

جا تێدەگەن. قایمەقام لایەنتان دەگرێ؟ لەو گەڕێن. ئەگەر ئەمڕۆ نەبێ، بەیانی لە کایزمانەوە دەنگی دێ. ئەگەر ئاغاکان بیانەوێ و پاشاکان بخوازن، هەڵیدەدێرنە شوێنێك خۆشی نەزانێ کوێیە. ئەدی، ئەدی، ئەدی.

ئەی ڕۆستەم ئۆغڵیی پێخاوسی گەمژە، پێت وایە دەتوانی ئەو گەوجە بخەڵەتێنی و بە پارەیەکی کەم سێسەد دۆنم زەوییەکەی لە چنگ دەربێنی و تا نێوەڕاستەکانی ئاقچاساز بێیەپێشەوە؟ ئەو دەروێش بەگە، ئەو بەگزادە نیشتمانفرۆشە خۆی دەبینێتەوە. ئەو دەروێش بەگە، هەی بەگایەتییەکەی سەری بخوا. چیی لێ بکەم. وەك پێشینیان دەڵێن: ئەوەی خاوەن زێڕە، خاوەن زۆرە، ئەگەر ڕەشە ئەگەر پیسە ئەگەر بۆرە... هەر ماقووڵە لە بەرچاوان...

ئیتر تۆ لەکوێوە هاتی ئاڵتی گوێز ئۆغڵی؟ کێی؟ چکارەی؟ ئەو قەباڵەیەت لەکوێ هێنا؟ ئەو خاك و زەوییە کێ وشکی کردەوە؟ باشە پیاوی چاك، چما باپیرەت زۆنگاوەکەی کڕیبوو؟ ئەو باپیرە زیرەکەت زۆنگاوی بۆ چ بوو؟ ئاخۆ ڕەوەز و گابەردەکانی ئاناوەرزاشی کڕیبوو؟ ئەدی بەخوای، ڕەوەز و زەرد و ماهی بۆ چ بوو؟ بنیادەمێك کە باپیرەیەکی ئاوا سەیر و سەمەرەی هەبێ... وا نییە؟ چەند کارخانەت هەیە ئاڵتی گوێز ئۆغڵی؟ یەکێ لە تەرسۆس لۆکە هەللاجی دەکا. یەکێ لە ئەدەنە بۆ چنین و ڕستن. یەکێ لە جەیهان بۆ گیا ورد کردن. یەکێکی قەباڵەی زۆنگاوەکە... باپیرەیەکی ئاوا؟ دە تۆ خوا پێم بڵێ با بزانم ئەو قەباڵەیەت چۆن وا لێ کرد لەگەڵ ئێرە یەك بگرێتەوە؟ خۆ نەهێنیی خودا نییە. بۆ نابێ؟ بەڵام وشککردنەوی ئەو زۆنگاوەو حوکمەتەکەمان و هەروەها حیزبەکانمان و هەروەها...

ئەدی، ئەدی، ئەدی. مامۆستا بەگ، مامۆستا ڕۆستەم بەگ. ڕۆستەم بەگی چاوشین. هەموو منداڵەوردکەی ئەو شارۆچکەیە و ئەو ئاغا هەلۆئاسایانە هەر هەموویان لە تۆیان بۆ بەمیرات ماوەتەوە. ئەو زیرەکی و ژیرێتییە، ئەوە تۆ بووی خستتە نێو مێشکی ئەوانەوە. کە هاتییە ئەم شارۆچکەیە، پێخاوس بووی. کە هەرمەنییەکان دەرپەڕین، چووی کامە خانووی هەرمەنییەکان جوان بوو لەوێدا نیشتەجێ بووی. لە ماڵەکەی ئارتین کولەقایا. ئەوە تۆ بووی کۆشکەکەی کەندیرلیت پێش هەموو شتێ، کردە قوتابخانە. ماڵ و حاڵی هەرمەنییەکانت یەك بە یەك بەسەر ئاشنا و ڕۆشناکانی خۆت و ئاغا کۆچەرییە تورکمانەکاندا دابەش کرد. لە خێوەتێ هاتنە دەرێ و لە خانووی هەرمەنییاندا نیشتەجێ بوون. ئەوە ئێستاش ئەوانەی چوکووراوایان لەگەڵ بەش کردووی، کوڕی هەر ئەو ئاغایانەن. زەوییەکەی هاییك تۆپۆزیان. باشە قەباڵەی زەوییە بێ وێنەکەی ئەوت چۆن دەست کەوت جەنابی مامۆستا بەگ، چۆن؟

ئەگەر تۆ نەبوای، ئاخۆ رەحمەت ئەفەنیی بەرازەوان ئەقڵی پێ دەشکا ئەو گوندە بکڕێ؟ چ ئاقڵێتییەکت کرد وا لە بازاڕێ بەرۆکی رەحمەتت گرت و گوتت: چەندەت پارە هەیە؟ ئاخۆ کەیفت هات وا بێ پێچ و پەنا وەڵامی دایتەوە؟ باشە بۆ لە ماوەی رۆژێکدا مەزرا شەش هەزار دۆنمییەکەی وارتان بەغیانت لە دەستی ئەو نا؟ چیتان لە بەیندا رابورد؟ چ پەیوەندییەکت لەگەڵ رەحمەت هەبوو؟ ئەتۆ خەڵکی رۆملیای و ئەو مەلاتیە. کەیفت بە چ شتێکی رەحمەت هات؟ چ بوو؟ خوشکەکەی کەڵەگەت و تیشکەڵە و چاوڕەش و جوان بوو. حەڤدە ساڵان. ئەتۆ لەوکاتدا چل ساڵان بووی. چ بوو؟ رەحمەت ئێستا سەروەت و سامانێکی بەسەر یەکەوە ناوە. رەحمەت بۆتە ئاغا و سەرێکە لەنێو سەراندا. هەندێکیان پێی دەڵێن بەگ. ئەویش لە زەوییەکی دووهەزار دۆنمییەوە هاتە نێو ئاقچاسازەوە. باشە مامۆستا بەگ، ئەو وشکی کردەوە؟ هەقتە. کوڕەکانت لە ئەستەمبۆڵ دەرسیان خوێندووە و کچەکانیشت خوێندەوارن و زاواکانت لە نەوەی تورکمانی کۆنن، وەك هەڵۆ... بیری وشککردنەوەی ئەو زۆنگاوە لە پێشدا بە مێشکی تۆ و فانیدا هات. قەرار وابوو لە کاتی شەڕەکەی یەکەمی جیهانیدا ئەو کارە دەست پێ بکرێ. گوندییەکانتان تۆقاندبوو و پارەیەکی زۆرتان لێ ئەستاندبوون. ئەی ئەو هەمووە پارەیە چیی لێ هاتەوە جەنابی رۆستەم بەگ.

هەقتە. لەو مەزرایانەی لە چنگی زۆنگاوەکە دەردەکێشرێن، چەندی کەیفت دێنێ بیخە سەر موڵکەکەی خۆت. ئەتۆ مامۆستا و باوکی هەموو ئەو شارۆچکەیەی. ئەگەر ئەتۆ ئەقڵت بەوە نەشکابایە، ئەتۆ پێش بینیت نەکردبایە، ئەتۆ رێگەت پێشان نەدابوایەین، باشە ئەی کێ دەهات لە ماڵەکانی ئەو هەرمەنییانەدا کە هەرکامەیان دەرگایان لە زێڕ بوو، نیشتەجێ بێ؟ ئەگەر تۆ نەبوایەی، کێ دوو دراوی دەدایە عەولخاق ئەفەنی و زۆزان بە زۆزان وەشوێن ئەو هەنگوینە نایابە دەکەوت و دەیهێنا؟ کێ جگە لە تۆ دەیزانی ئەو زەوی و زارە دواتر دەبنە زێڕ و هەر لویێچێ لەو خاکە لویێچێ زێڕ دێنێ. ئەگەر دەتەوێ هەر هەموو ئاقچاسازت پێشکەش بێ. حەڵاڵت بێ، ئەتۆ پیاوێکی داهێنەر و خوڵقێنەری.

ئەدی ئاغای خۆم، ئەدی ئەدی. زوڵم و خوێن ... مەرگ، مالاریا، مێش و مەگەز. دەشتە تەختایی و پڕ لە گژ و گیا و دڕوەڵان و دار و دەوەن و مێشلان و جەگەن و... کێ ئەقڵی پێی دەشکا کە... کێ بەبیریدا دەهات ئەو زۆنگاوانە رۆژێك لە رۆژوان وشك دەبن؟ ئەو دڕووەڵانە، ئەو لێڕە خاشەبڕ دەبێ... کێ بە مێشکیدا دەهات حەشامەتی ئەو شارۆچکەیە لە دووهەزارەوە دەگاتە سێ هەزار و لە سێ هەزارەوە دەگاتە دەهەزار کەس؟ کێ جگە لە تۆ دەیزانی نیوەی

شارەکە کوردی تێدا نیشتەجێ دەبێ و ئەوی دیکەشی کە کاولاشە کۆن و خانووە رووخاوی هەرمەنییەکان بوو، داگیر دەکرێ؟ کێ، کێ، باشە مامۆستا کێ، ئەی باوك، ئەی ئەی ئەقڵی تەواو و نێردراوی خودا بۆ لای ئێمە؟ کێ ئەقڵی پێ دەشکا حەشامەتی ئەو شارۆچکەیە لە ماوەی بیست ساڵاندا بگاتە سی هەزار، چل هەزار کەس؟ شەپۆل شەپۆل لە جێی خۆیان هەڵدەکەنرێن و دێن. لێڕەوارەکە و خاکەکە تەواو دەکەن. دێن و وەك لەشکری کوللە رێگە دەبڕن، ئەوەندە زۆر کە... چاوی کێ جگە لە چاوەکانی تۆ کە وەك چرای ترۆمبێل تاریکی دەبڕن، دەیتوانی ببینێ؟ ئەو شارۆچکەیە بەپانەوە پێشکەشت. هەرچی لەو خاکە بەتۆ گەیوە کەمە. وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ.

ئەدی و هەزار جار بەڵێ. و زۆر زۆر بەڵێ، ئاغای من، بەڵێ.

وەك هەڵۆیەکی تیژباڵ لە چیاکانەوە نیشتەوە. هەڵۆیەکی مسی، بە باڵ لێك ئاوەڵاوە و پەڕ و پۆی لە خەنەی خودا هەڵکێشراو. گرژ گرژ وەك ژیشك. سمێڵە سوورەکانی، گرژ گرژ و پڕ پڕ. شەویلکە بەهێزەکەی دوو شاخە... ئێسکەکانی روومەتی دەرپەڕیو. چاوە رەشەکانی گەورە گەورە. سەوز، شتێکی وەك سەوزایی ژەهر، سپێنەکانیشیان وەك خوێن.

لینگ درێژ، لەنێوقەدەوە بۆ سەرێ کورت و نێوشان داتەپیو و تۆزێك بەرەوپێشەوە کۆماوە. باسکەکانی زۆر درێژ و دەستەکانیشی پان و زل. سەری زل و دەمارەکانی نێوچاوانە پانەکەی ئەستوور و هەستاو. دەستە پانەکانی لە پاش قوونی لێك توند کردووە و وردە وردە و مل قوت و بەبێ ئەوەی سەیری بەر پێیان بکا، رێ دەبڕێ.

لە چیاکانەوە هات. زۆر بەر لەوەی خۆی بێ، ناوبانگەکەی گەیشتبووە ئێرە. ناوبانگەکەی زۆر پێش خۆی چوکووراوای تەنیبۆوە. ئەوەی لە رێگەی "حاجینێ" لە سەرپێڵ، وەك هەڵۆیەك داگژایە ئەو هەرمەنییانەی بەشەوە ئەنگوستەچاوەکە رایان دەکرد و هەمووی قەڵت و بڕ کردن و توورەکە پڕ لە زێڕەکانی ئەوانی پێشکەش بە پاشای ئەدەنە کرد، ئەو بوو. ئەوەی لە ئەشکەوتی کوز بە خۆی و برادەرانییەوە پازدە کچۆڵەیان کردە ژن و پازدە رۆژان لەسەر سینی سەمای زگیان پێ کردن، و دوای ئەوە بەناوی ئەوەی ئەو کچانە داوێن تەڕانە شیاوی ئەوە نین وەك بنیادەم بژیێن، هەر هەموانی کوشتبوو، ئەو بوو. ئەوەی لەگەڵ "سوڵتان یوزباشی"ی یاغی گەمارۆ درا و لە هەڵدێرگەیەکی هێندەی دە منارەوە خۆی هەڵداشتە خوارێ و بەزیندوویی قوتار بوو، هەر ئەو بوو. ئەوەی سەد و چل و شەش ئەسپی رەسەنی عەرەبیی بە ملهوڕی زۆرە ملی لە گەوڕی ئاغا کوردەکان و عەرەبەکانی لای ئۆرفە هێنایە دەرێ و بردی و

هەموو چوکووراوا سەریان لێی سوورمابوو، ئەو بوو. ئەوەی بەردەوام دەیگوت سێبەری دار هیی لك و پۆکەیەتی و هەڵفڕینی مەل بە باڵەکانێتی، ئەو بوو. ئەوەی بست بە بستی چیاکانی تۆرووس وەك بەری دەستی شارەزایە و ئەوەی لە قوژبنی هەر ئەشکەوتێك و لە کەلێنی هەر رەوەز و گابەردێکا هەرمەنییەکانی دەردەکێشا، ئەو بوو. ئەوەی کاتێك گۆرانییەك تێهەڵدەکا، دەنگی دەگاتە ئەوسەری شارۆچکەکە و هەر کاتێك حەزی لێ بێ لێی سواری ئەسپەکەی دەبێ و بەغاردان و لینگدان بەنێو بازاڕەکەی شاریدا داڵ بە داڵ تەقە دەکا و بە سواری ئەسپی عەرەبی لە پلیکانەکانی کۆشکەکەی پارێزگاری وەسەر دەکەوێ، ئەوە. ئەوەی پشتوێنی تەرابلۆسی لەپشت دەبەستێ و چەکمەی خوریدار لەپێ دەکا و عەبای گوڵدۆزیکراوی ئەدەنە لە شانی خۆی ناکاتەوە و جەمەدانیی پەشمینەی ریشۆداری لەسەر دەکا و سەر گیرفانەکانی پانتۆڵەکەی زێڕکفت کراوە، هەر ئەوە. ئەو دەمەش کە گوتیان تەسکەرە و پێناس دەدرێ، ئەوکەسەی ریزێك شۆرەتی نووسیبوو و ماڵ بە ماڵ و قاوەخانە بە قاوەخانە و گوند بە گوند دەگەڕا و چەند مانگان بەشوێن شۆرەت و نازناوێکەوە بوو کە شیاوی ناوبانگ و ئازایەتی و قارەمانێتییەکەی بێ، ئەوە. هەر ئەو بوو کە هەر شۆرەت و نازناوێکی هەڵیدەبژارد، حەوتووەك بارەوباری دەکرد و ئەگەر بە دڵی نەبوایە، لە شۆرەتێکی دیکە دەگەڕا. کێ شۆرەت و نازناوی داهێنا و کردییە باو؟

مستەفا کەمال پاشای مەزن. ئەی خۆی کام شۆرەت و نازناوی هەڵبژارد؟ ئاتاتۆرك. زۆر باشە. زۆریش گونجاوە. ئەو شۆرەتە لەو دەوەشێتەوە. زۆری بیر کردەوە و لەگەڵ خۆی و هەموو دۆست و برادەرێك کەوتە راوێژ و ئاخرییەکەی ئەو شۆرەتەی بۆخۆی هەڵبژارد. ئۆلۆتورك. چەند رۆژێك بە ئۆلۆتورك ئۆلۆتورك، گەڕا و گەڕا و لە ماوەی حەوتووەکدا کۆنی کرد. چەند رۆژیش بە شۆرەتی تورك ئۆلووەوە ژیا. باشە ئەو شۆرەتەیان بۆچی داهێناوە؟ لێی کۆڵییەوە. لەو ئەورووپا هەرکەسە و شۆرەتی خۆی هەیە کە بە دوای ناوەکەیدا دێ. دەی دەی، خۆ ئێمەش شۆرەتی خۆمان هەیە، بەڵام گونجاو نییە و ئەوجار بەر لە ناوی کەسەکەش دێ. کۆمەڵێك ناوی قۆڕ و ناموبارەکی وەك: قولاغ سیز ئۆغلی محەمەد، گوین گویرمەمیش ئۆغلی حەسەن، ئوسوور کلوئۆغلی جومعە... خەیرسیزئۆغلی محەمەد، تومبوزۆك ئۆغلی، سولو پسرات ـ ئاشغالی... چەندی حەزت لێیە ناو بێنە. شۆرەتی قۆڕ و قێزەون و مردار. ئەو شۆرەتانەش کە لە ئەورووپاوە هاتوون هەروان. چلیك یەیلدیز، سونگور یەیلدیریم، ئالتین دەمیر، شاهین قانات، یوجە بۆلۆت،

چلیك پەنە، ئۆست یەیلدیز، قولەج یورك... دەی هەڵسەنگێنە و تاقی بکەوە، هەرکامێکت بەدڵ بوو، هەڵبژێرە...

جوانترینەکەیان، شیاوترینەکەیان.. شۆرەتی تورك ئۆلۆی هەڵبژارد. لە پێشدا سلێمان ئەسلان یورگی... زۆری پێ خۆش بوو. بەڵام ئەسلان یورگییش بە سێ رۆژان کۆن بوو. ئەوجار تورك دەمیرسویزی پێ جوان بوو. ئەو شۆرەتە هەر رۆژێکی خۆ گرت. دوای ئەوە سێ رۆژان بەبێ شۆرەت بە کۆڵان و بازاڕدا گەڕا و ئاخرییەکەی بوو ئۆلوچەنگیز ساواشکان. ئەوە لە هەموان جوانتر بوو. وەخت بوو بفڕێ. تووشی هەرکەس ببوو پرسی:"چۆنە، باشە؟ شیاوە؟ لەگەڵ ناوەکەم یەك دەگرێتەوە؟ دەبینی، سلێمان ئولوچەنگیز ساوشاکان..." ئەوەش لە حەوتووەك پتر خۆی نەگرت و کۆن بوو. دەی با ببێ گرنگ نییە. خۆ شۆرەت نەبڕاوەتەوە. چەندی کەیفت بێنێ هەیە. ئەوەیان نەبوو، ئەوی دی... ئەویش نەبوو، ئەویتر. لای کەس ناوی گوندەکەی نەدێنا. تەح لەو ناوە ناخۆشە. خۆ ئەگەر حوکمەت ئەقڵی بوایە ناوی گوندەکان، هەموو ئەو ناوانەی لە شان و شکۆی مەزنی تورك ناوەشێنەوە، لە بنەوەڕا دەیگۆڕین. هەی داد و بێدا، هەی داد و بێداد... چاکتان کرد ئەو شۆرەتە قۆڕانەتان گۆڕی و یا لانیکەم لاتان بردن. خۆزگە بڕیارێکی ئاواشتان لەسەر گوندەکان دابوایە. کۆستوکۆی... کۆستوکۆی یانی چی؟ کۆستبەك واتە جرجە مشك. گوندی مشکان. تۆخوا ناوی ئاوا قۆڕ لە نیشتمانی مەزنی تورك دەوەشێتەوە؟ ناوی مەزراکانیش خۆش نین. نارلی قشلاق... ناوێکی نەگونجاو و میراتی سەردەمی کۆچەرێتی و رەشماڵ نشینی.... مەزرا، شارۆچکە و گوند ئەگەر ناوێکی گونجاوی هەبێ دەبێ گون سێلی تورك... بۆ هەموو چیاکانی ناوی جوان جوان بدۆزێتەوە. ناوی وا لەگەڵ رەچەڵەك و بنەچەی ئۆغۆزی و تورکی شارستانی و بەئەورووپی بوومان یەك بگرێتەوە. ئەوجار دەبێ هەرچی ئۆرەتە لای بەری و لە بنج و بناوانی بکەی. وا نییە؟ ناوی خاك و بەرد و چیاو ئاو و بنیادەمی ئەو میللەتە دەبێ بگۆڕدرێ و بگەیەنرێتە ئاستی شارستانییەتە نوێیەکان. دەبێ لە چنگی توندوتیژی و نارێکی و زبری و دانەتاشراوی و نەڕووشاوی و پەروەردەنەکراوی رزگار بکرێ و نیشتمانە مەزنەکەمان دەبێ لەو دواکەوتووییە رزگار بکرێ. ئاخرییەکەشی دوا کۆنەکردنی ئەو هەمووە شۆرەتە، ئاخری نازناوی ئەسلان سۆوی پەنجەی هەڵبژارد. ئەسلان سۆوی پەنجە شۆرەتێکی بێ هاوتا و بێ وێنە بوو.

لە چیاکانەوە هاتن. وەك هەڵۆیان لە چیاکانەوە داگەڕان. کۆشکە بەشکۆ دوو نهۆمەکەی پانۆسیانی بەناوبانگ کە رووکاری دەرەوەی سپی بوو و لە قۆچکەیەك لە سەربانەکەیەوە بەرەو

ئاسمان هەڵکشابوو و سەری لە ئاسمانێ دەسوی و گەلێك ژوور و پەنجەرەی هەبوو، دابوویان بە چاتان هۆیوك مستەفا ئاغا. ڕۆژێکیان بەرەبەری نیوەڕۆیە سلێمان بە نۆ پیاوی چەکدارەوە لە دەرگای ماڵەکەی مستەفا ئاغای دا. خولقیان کردن.

"دەبێ ئێرە چۆڵ بکەی. میراتی پانۆسیان بەمن دەبڕێ. نەك پێت وابێ کوڕی ئەوم... نەخێر، بەڵکو هەر لەبەر ئەوەی من پانۆسیانم کوشت. هەربۆیەشە هەمو موڵك و ماڵەکەی پانۆسیان هەر لە زەوی و زارەکەیەوە بگرە تا دەگاتە دووکان و کۆشکەکەی بەمن دەبڕێن."

ئەوجار کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا:"ئەوەش نامە."

مستەفا نەیوێرا نامەکەی لێ وەرگرێ و سەیری بکا. هەر ئەوەندەی پێ گوترا:"تۆزێکم لێ ڕاوەستە سلێمان ئاغا."

ئیتر بانگی ژنەکەی کرد و گوتی:"منداڵەکان هەڵگرە خاتوون. دەبێ بگەڕێینەوە ئاوایی. چما نەمگوت ئەو شارۆچکە و کۆشکی هەرمەنییانە بۆ ئێمە شوومی باش نییە؟ دەی خێرابە... دواتر منداڵەکان دەنێرم هەرچی بەجێ مابوو بیهێننەوە."

ئیتر وەك هەڵۆیەکی سووربا‌و، لە چیاکانەوە داگەڕا و بە نۆ پیاوی چەکدارەوە موڵك و کۆشکەکەی پانۆسیانی داگیر کرد. ئەو کاغەزەی پێشانی مستەفا ئاغای دا، نامەیەك بوو بۆ کۆشك و مەزراکە... کۆمەڵێك قەباڵە و کاغەزی دەرهێنا کە لە کۆماری تورکیادا دەچوون. سلێمان ئەسڵان سۆوی پەنجە هەموو ئەوشتانەی بە زەبری شان و باهۆ و تەگبیر و ڕای خۆی بەدەست هێنا. نەك هەر مەزراکەی پانۆسیان، بەڵکوو هەموو چوکووراوا بە دار و بەردەکەیەوە بە قوربانی پاڵەوانێکی ئاوا بەشان و باهۆ. شۆرەتی ئاواش هەر لەو پاڵەوانانە دەوەشێتەوە. ناوی گوندەکەشی گۆڕاوە و دەبێتە ئیشیق لار. گوندێکی پاڵەوانی ئاوای لێ بەوەلەد بووبێ، ڕووناکایی سەهلە، خۆریشی لێ هەڵدێ، خۆر. ئاغا ئەسڵان سۆوی پەنجەکەی ئێمە، لەوپەڕی خاکەڕاییدا.... ناوی گوندەکەی خۆی لە دەفتەری بەڵگەنامەکاندا کردە گوین دوغار نەك ئیشیق لار. نۆزدە کوڕی لە چوار ژنەکەی هەبوو. نۆبەرەکەی ناو نا کەمال و دوای ئەوی ناو نا عیسمەت و سێهەم کوڕی ناو نا فەوزی و چوارەمی ناو نا کازم و پێنجەمی ناو نا تۆفان. دوای ئەوە ئیتر ناوی هەموو سیاسەتڤانە ناودارەکانی بەدوای یەکدا لە کوڕەکانی دیکەی نا.

هەرچی دەیکرد شیاو و بەجێ دەیکرد. بوو بە ئەندامی حیزبی خەڵك و گەیشتە پلەی سەرۆکایەتییەکەی. دواییش دەستی جەلال بایار و مەندەرسی گرت و هێنانییە شارۆچکەکە و کۆڵان بە کۆڵان و ماڵ بە ماڵ گێڕانی. کە مەندەرس بوو بە سەرۆك وەزیران، ئەو یەکەم وشتری بۆ

کوشتەوە و گاووگەردوونی بۆ کرد و کە هاتە ئەدەنەش، شەش گای گرانبایی لەبەر پێیانی سەربڕی. هەموو کار و کردەکانی باش بوو، تەنیا کارێکی نەبێ. کوڕەکەی چۆن لە دەستی دادپەروەری رای کرد؟ دوای ئەوەی بە نوێژی نیوەڕۆ لە نێوەڕاستی بازاڕێ حەوت فیشەکی دالێ بە دالێ لە حەسەن بێکەس دا و کوشتی، لە سەر تەرمەکەی راوەستا و لاقی لەسەر سینگی دانا و پۆزێکی لێ دا و بەو حەشامەتەی لەدەوری کۆ ببوونەوە گوت:"پێتان چۆن بوو؟ ئەو گەوادەم باش تەمبێ کرد؟"

ئیتر، لای کردەوە و وردە وردە لێی دا و رۆیشت. بەڵام تاقە رۆژێکیش چییە لە زینداندا نەمایەوە. کێ بوو ئەوەی وەزگی بە خورشید بەگی سەرۆکی دادگای تاوانەکانی دا؟ * بە ئاماژەی کێ بوو مەزلووم بەگیان دوور خستەوە بۆ ئۆرفە و لە دادگای ئەنتەپ کوشتیان؟ هەموو کارەکانی، نیشتمانپەروەرییەکەی باشە، باشە بەڵام لە شەڕی رزگاریخوازیشدا لە ریزەکانی پێش پێشەوە فیداکاریی کرد، بەڵام دەچێتە بەردەم سەرۆکی دادگای تاوانەکان و دەڵێ کوڕەکەم لە زیندانێ توند مەکە. ئەوە یەکەم نێچیری کوڕەکەمە. ئەگەر بیخەیتە زیندانەوە ترسنۆك و دەستەوستان دەبێ. باشە بنیادەمی دەستەوستان و ترسنۆك بەکاری ئەو مەملەکەتە دێ؟ کوڕەکەت دوو رۆژ لە بەندیخانەدا بێ خۆ نامرێ، هیچی لێ نایە. دەمرێ؟ باشە ئەوەی دێنێ لەبەر دوو رۆژ زیندان، گاڵتە بە پێگە و شەرەفی دادگایەکی گەورە بکەی؟ دوو رۆژ، هەر لەبەر دوو رۆژان؟ هەموو کارەکانی باشە، بەڵام... ئەوە دەڵێن ئەوانەش قەیناکا. ئەی ئەو قەتڵەی دووەم کوڕی کردی، ئەو چی؟ یان دووەم پیاوکوشتنەکەی هەر ئەو کوڕەی؟ ئەو دادوەرانەی کوڕەکەی ئەویان بێ تاوان ناساند، تا چەند ساڵان سەریان هەڵنەدەهات چاو لە چاوی خەڵکی بکەن. داواکاری گشتی، عیزەدین فەخرەدین تۆغ سالۆر، گەورە داواکاری گشتییەکەی دەوڵەتی مەزن. ئاخۆ بنیادەمیش لە نێوەڕاستی بازاڕ و لەبەر چاوی خەڵکی بەرتیل بە پیاوی ئاوا دەدا و بە بەرتیلخۆر ناوی دەزڕێنێ؟ سەگ بە خاوەنەکەیەوە دەناسرێتەوە. یانی شەرم لە عیسمەت پاشای گوڵ ناکات کە ئەتۆ و ئێمە و هەر هەموومانی هێنایە ریزی بنیادەمانەوە؟

لێگەڕێ با وەرگرێ، با وەرگرێ، چەندی زەوی دەوێ لە ئاقچاساز با وەرگرێ... با هەموو زەوی و زارەکەی مستەفا بەگی ئاق یۆللی" و دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی داگیر بکا... لێگەڕێ با دووریان بخاتەوە... دەرفەت و هەلی لەباری بۆ رەخساوە. بەڵام قەت چەك لەوان

---

* وەزگی بە .... دا: وەزگدان: دیق کردن. کوشتنی بە خەفەتەوە. لەخەفەتان کوشتن. کوشتنی کەسێك بە دەم ئازار و خەفەتەوە. کوڕە لە داخانت وەزگم دا.

ناکێشێ. لەبەر ئەوەی ئەوانیش هەیانە. بەڵام ناتوانێ حوکمەت لەوان بەربدا. لەبەر ئەوەی ئەوانیش لە دامودەزگای حکومەتدا کەسی خۆیان هەیە. جارێ ئەوە هەلی بۆ رەخساوە. دەیانکاتە تۆزی بانان. ئەو سۆوی پەنجەیە لەسەر ساجی عەلییان دادەنێ. ئاقچاساز هەمیشە قاپێکی هەنگوینە و ئاغا و گوندی مێش و مەگەزەکانی دەوری ئەو قاپەن... هورووژمیان هێناوەتە سەر ئاقچاساز بۆ تالآن و برۆ... بۆ تالآن و برۆ... بۆ تالآن و برۆ... هەرکەس وەبەر پێیان بکەوێ دەفلیقێتەوە. ئێرە لێرەکەی مەولا و مەزنە.

وەك هەڵۆیەکی سوورباو، لە چیاکانی تۆرووسەوە داگەڕایە دەشتەکە و لەو کۆشکەدا کە پانۆسیان بە هەزار ئاوات و ئارەزووەوە دایانبوو، نیشتەجێ بوو و موڵك و ماڵەکەی پانووسیانی کە دەرپیەڕاندبوو و فەوتاندبووی، داگیر کردبوو. لە زۆر ماجەرا و گێچەڵاندا بەشدار بوو. لە رەنگی مس و باڵی مسی. هەرکارێکی خراپ بوو... کوڕە پیاوکوژەکانی قیت و قنج بە شەقامەکاندا دەگەڕێن و کەس نییە پێیان بڵێ پشتی چاوتان برۆیە...

بەڵێ ئەوە ئێستا حاڵ و باڵەکەمان ئاوایە. ئاوا. بەڵێ ئاغای من، بەڵێ. بەڵێ و سەد هەزار بەڵێ. ئەو هۆبەیە، هۆبەی چاپانلییە. لە پێشدا هەزار رەشماڵ دەبوو، لەوانەشە دوو هەزار... لە خۆراسانەوە، لە وڵاتی خوارەزمەوە. لە سەرووی زێی گەورەوە هاتن. چەند ساڵان قۆناغ بە قۆناغ رێیان بڕی و دەشت و بیابان و کێوپارە و شاخ و داخیان تەقاند. لە کام هۆز و عەشیرەتی تورکمانی گەورە بوون، ئێستا خۆشیان نازانن. لە هۆز و هۆبەیان هەڵکەندراون. بە چاوی خۆیان کاولبوون و خاك بە توورەکەکێشرانی خوارەزمیان بینی. تۆفانێکی مەرگ، لە رواڵەتی لەشکرە پیاوێکی چاو سەوزدا کە سواری ئەسپی وردیلە ببوون و وەك مار و مێروو، پیر و لاوی رادا و لە چیا و شاخ و داخ و بنار و دەشت و پێدەشتانەوە هێنانی و لە وڵاتێکەوە هەڵیداشتنە وڵاتێکی دیکە. ئەوان لە ریزی شەڕکەرەکانی قەڵای جابردا بوون. دیاربەکریان گەمارۆ دا و زستانێك لە بن شووراکانی دیاربەکر مانەوە. بەر دیوارەکانی دیاربەکر هەر جمەی دەهات لەو تورکمانانەی وەك لافاو هاتبوون. دەروازەکانی دیاربەکریان لێ نەکرایەوە و برجەکانی نەگیران. کە هاوین داهات، بەرەو چیاکان رۆیشتن و بەر دیوارەکانی دیاربەکر کەسی لێ نەما. لەو حەشامەتە، تەنیا جێی کوچکاور و سینگی خێوەتەکان و مۆڵگەی مەڕ و ماڵاتەکانیان بەجێ ما. بەهارانە شوێنی مۆڵگەی مەڕەکانیان جۆرە گیایەك پۆل پۆل شین دەبوون کە دووکەڵێکی نەرم و کزیان لێوە دەهات. زۆر جوێ بوون لە گژ و گیاکانی دیکە. بەشداری گەمارۆدانەکەی مەلاتییە و قەیسەرییەش بوون. لە راپەڕینەکەی باوە ئیسحاقدا هەر

ئەوە نەبوو کۆمەڵێك پیر و لاو و ژن و منداڵ بکوژرێن، بەڵکو ئەوان نەریتە مرۆیانەکەی تورکمانیان شکاند. شەڕێکی زۆر قورس قەومابوو. شوێنکەوتووەکانی باوە، بە شمشێرە رووتەکانیان ملیان لە بەر ملی لەشکری کوفر نابوو و تێشکابوون و قەڵتوبڕ کرابوون. ئەو شەڕە یەکێك لە گەورەترین شەڕەکانی مێژوو و یەکەم راپەڕینی مەزنی تورکمانیی گەورە بوو دژی ئاغاکانی خۆیان. باوە ئیسحاق و تازییەکەی ئەو پاش چەندین ساڵان وەك حەماسەیەك و وەك پیرۆزترین ئەمانەتی خوایی لەبیر نەکرا و هەر مایەوە و بەشداربووەکانی ئەو شەڕە و شوێنکەوتووەکانی باوە ئیسحاق ناویان نرا باوە ئیسحاقی.

هۆبەی سەد، سەد و پەنجا رەشماڵییەکەی چایانلی بەر لەوەی نیشتەجێ بکرێن هاوینان لە تۆرووس و زستانان لە چوکووراوا خێوەتیان هەڵدەدا و دەم گەوی رووبارەکەی ساروونیان، کە پڕ بوو لە چناری چڕ و بەسێبەر، کردبووە هەواری خۆیان. تاقمی ئیسلاحییە، چایانلییەکانی لە هۆبەو هەوارە هاوینییەکەی خۆیاندا نیشتەجێ کردن و هەر لەوێ گوندێك ساز بوو. چایانلییەکان لە زۆربەی شوێنەکانی ئەنەدۆل گوند و ئاوەدانییان دانا. یادی رۆژە گرنگەکانی رابردوویان لە سەردولکە و لاوك و گۆرانییەکانیاندا مابۆوە. دوای نیشتەجێبوونەکە، ئەوانەی رایان کرد رۆیشتن و ئەوانەش کە لە گەرمای پێدەشتەکەدا مانەوە، تێداچوون. ئەوانەش کە زیندوو مانەوە، بەناچاری شانیان دایە بەر کشتوکاڵ و جوتیاری. ئەوان حەزیان لێ نەبوو لە شوێنێك بمێننەوە و بژین و نەشیاندەویشت لە دەفتەرە حکوومەتییەکاندا ناویان بنووسرێ. لە ماوەی سەدان ساڵدا لەگەڵ مێگەل و ماڵاتەکانیان بە دەشت و بیابانەکاندا گەڕابوون و چاوەکانیان لەبەر یەك کشابوونەوە. چاوی هەندێکیان مەڕی و هەندێکیان رەش و هەندێکی دیکەیان سەوزێکی تۆخ بوو. ردێنە درێژەکەی پیرەکانیان تەنك و بۆر بوو. چەناگەیان تیژ و خۆشیان کەڵەگەت بوون. ئافرەتیان کە بەرێیەدا دەڕۆیشتن، لەوانەشە لەبەر ئەوەی کە زۆر لە دەشت ببوون، دەتگوت تاسکەتاسك و لار و لەنجەی ئاسکن. ئەو نیشتەجێکرانەیان لە راستیدا بە دڵی چایانلی نەبوو. زۆر لەوەی لێی دەترسان پتریان بەسەر هات. ناچار بوون ماڵیات و پیتاکی جۆراوجۆر بدەن. پۆل پۆل چوونە سەربازی. بوونە کۆیلە و نۆکەر. پێنج ساڵ، دە ساڵ، پانزە ساڵ. ماوەی نادیار. ئەوانەی بە زۆر دەبردران، بە ئاسانی نەدەگەڕانەوە. زۆریان هەر نەدەگەڕانەوە... بووك و دەسگیران ئەوەندە چاوەڕوان دەبوون، هەتا پرچی سپییان دەهۆنییەوە و پیر دەبوون و زۆرجارانیش لە تاوی مێردەکانیان سەریان دەنایەوە و ئاواتی دیدارەکەیان دەبردە بن گۆڕ... نیشتەجێکرانەکە بەڵایەك بوو بەسەریاندا رما. ژنەکانی تورکمانان یەکدەنگ

دەیانچڕی:

"مەڕ بۆ یەمەن، بۆ یەمەنێ

نوقمی خۆڵ و تەپوتۆز

نامەیەکم بنێرە برا

بۆ خوشکە چاو لەڕێیەکان"

هەر بیریان لە یەمەن، بیابانەکەی یەمەن و ئەوانە دەکردەوە کە چوبوونە بیابانی یەمەن و ئەو سەرەی بردبوویان نەیانهێنابووەوە و گۆڕ غەریب ببوون. چیی تووك و لەعنەتی لەسەر زمانیان بوو بۆ دەروێش پاشای فەرماندەی شالاوەکەی نیشتەجێکردنیان دەنارد. ئەو بەلای یەمەنەش هەر لەو نیشتەجێکرانەوە بوو. مەزرایان هەبوو، جووت و گایان هەبوو، مانگای شیردەریان هەبوو. مێگەلە مەڕیان هەبوو، بەلام خۆ مەرگیش لەگۆڕێ بوو، زولم و زۆریش لەگۆڕێ بوو. لە ماوەی سەدان ساڵدا لە خۆراسانەوە تا عەرەبستان و ئەنەدۆلیان بڕیبوو، تووشی گەلێك شەڕ ببوون، کوشتەیان دابوو، بەلام قەت بەلای ئاوایان بەسەر نەهاتبوو. بەلای نیشتەجێکران، بەلای یەمەن... گەرما، مێش و تەپۆ، قامیشەلانی چڕ، گژ و گیا و زۆنگاوان...

"... ئەرێ هەتاو هەلێبرینگاند؟

زەوی قووتی دای؟

چاوەکانی مەمەد

مێرووله کۆلێیان؟

مەچۆ یەمەن، مەچۆ یەمەن

یەمەن گەرمە بەرد و چەوی

کوچك دەبرژێنێ هەوای

سەرباز لەوێ مەشق دەکا.

ناشی ئەقڵی نامێنێ

مەچۆ یەمەن، مەچۆ یەمەن

مەچۆ یەمەن، مەچۆ یەمەن..."

زۆربەی پیاوانی ئاوایی رایانکردبوو لە سەربازی. باشە رایان نەکردبایە چییان کردبا؟ چوون بۆ یەمەن، واتە چوون و نەگەڕانەوە. واتە سەفەری بێ گەڕانەوە. واتە مەرگ. جا زۆربەی

باشوورییەکانیان (باشووری تورکیا) دەنارده یەمەن. ئەوە بووە نەریتێك. هەر باسی سەرباز و سەربازی دەکرا، یەمەن لە زەین و مێشکی ژنی تورکماندا زیندوو دەبۆوە. ئێستا کوڕی گەنج، چ لە ئەستەمبۆڵ یان لە چیا پڕ لە بەفرەکانی رۆژهەڵات سەربازییەکەی بکات یان لە تەراکییە یان بەڵکان، سەربازی لە زەینی ژنی تورکماندا بەو واتایە بوو، کە خۆشەویستەکەی لە بیابانی یەمەنێ بوو. هەر بۆیەشە هەموو گۆرانی و لاوکە و سەردولکەکەی، ناڵینەکەی بۆ ئەوانەی رۆیشتبوون و نەگەڕابوونەوە، هەر باسی یەمەن بوو.

رووداوەکە هەشت نۆ ساڵ بەر لە رەش بگیرەکە قەوما. شەوێکیان، بەرە بەری بەیانی، ژەندەرمە بەسەر گوندەکەیان دادا. هەر گەنج و پیاوێکی چەکی پێ هەڵگدەگیرا، گرتیان و بردیان. ئەوانەش کە یاغی بوون و چووبوونە شاخ و داخ، ئەوانیشیان گرتبوو. گوندەکەی چایانلی نێرنەی تێدا نەما. لە حەوت سالانەوە تا حەفتا ساڵان کەس نەما. دیار بوو دیسان هەڵڵا و ئاژاوەیەك وەڕێ کەوتبوو بەڵام لە کوێ؟ کەس نەیدەزانی. بەڵام ژنەکان پێیان وابوو پیاوەکانیان، منداڵەکانیان و بابیان دیسان نێردراونەتە یەمەنێ و تازە ناگەڕێنەوە...

رێك لەو رۆژانەدا کە تاقە پیاوێك لە ئاوایییەکەدا نەمابوو، سەروسەکتی گەنجێك لەوێ پەیدا بوو. گەنجێکی کەڵەگەتی چوار شانەی جوانچاك. چەند رۆژێك لە گوندەکەدا ئاوارە بوو. دوایی سەیریان کرد هەر کەس پێویستییەکی هەبێ، بۆی دابین دەکا و یارمەتی هەموو پەککەوتوویەك دەدا. دەچوو زەوی و زاری ئەو ژنەی دەکێڵا کە کەسی نەبوو بۆی بکێڵێ و ئەگەر حاسڵەکەی بەپێوە بوایە بۆی دەدووریەوە و لە رۆژانی جێژن و تازیەباریدا، ئەو ژنانەی بێ مێرد کەوتبوونەوە، بە دەنگی بەسۆزی حاجی لەبانگیان دەدا و دەگریان. رۆژێکیان هەواڵێکی ناخۆش هێمن و ئارامییە ماتەکەی گوندەکەی گەچلاند و هەمووان خستە هاوار و باوکەڕۆ. ئەوی چوبووە یەمەنێ، کوژرابوو. ریزی ناوەکانیان هاتبۆوە بنکەی پۆلیسەکە. بەبێ ئەوەی پرسیارێك بکەن، بڕوایان بە هەواڵەکە کرد. بۆ دەبوو راست نەبێ؟ یەکەم جار نەبوو خەبەرێکی ئاوا رەش و شووم دەهات. زۆریان لەو هەوالانە پێ گەیبوو. هەتا ئێستا ناوی زۆر کەس هاتبووەوە کە ئیتر کەس بە دەنگ و سەر و سۆراغی نەزانیبوو. حەوتووەك دوای تازییەباری و سەردولکەبێژی و شینگێڕییەکە جا دەرکەوت حاجی بەبێ ئاگادرایی هەمووان، لەگەڵ فاتمۆکێ، جوانترین بووکی ئاوایییەکە زەماوەندی کردبوو. دیاربوو هەر حاجی خۆی فاتمۆکێی لەخۆی مارە بڕیبوو. خۆی میرزایەك بوو. چما خۆی نەیدەگوت لە سایەی میرزایەتییەکەیەوە لە سەربازییەکەی خۆش بوون؟ ئەگەر میرزایەکی دیکە نەبوایە، میرزایەك خۆی دەیتوانی ئافرەتێك

لەخۆی مارە بکا. کورتی ببڕینەوە حاجی خۆی فاتمۆکێی لەخۆی مارە بڕیبوو. فاتمۆکێ بەختەوەر بوو، حاجی بەختەوەر بوو، گوندییش بەختەوەر بوون. چونکە حاجی دیسانیش یارمەتیی خەڵکی هەر دەکرد و بۆ خەڵکی گوندەکە وەك باوکێك وابوو.

لە سەردەمی نیشتەجێکرانی رەوەندەکاندا زەوی و زاریان بە هەموو کەس دابوو و بۆیان لە قەباڵە کردبوو. حاجی دەسبەجێ دوای زەماوەند لەگەڵ فاتمۆکێ، ئەوی بردە شارۆچکە و هەموو ئەو زەوی و زارانەی بە میرات پێی گەیشتبوو، بەناوی خۆی کردن. حاجی دوو رۆژ دوای گەڕانەوەی بۆ ئاوایی، فاتمۆکێی تەڵاق دا. فاتمۆکێ سەری سووڕ ما، بەڵام تازە کار لە کارێ ترازابوو. حاجی چەند رۆژ دوای تەڵاقدانی فاتمۆکێ ژنێکی دیکەی مارە کرد و زەوییەکانی ئەویشی بەناوی خۆی کرد و ئەویشی بەمەرەدی فاتمۆکێ برد. دوای تەڵاقدانی پێنجەم ژن بوو کە ئافرەتەکانی ئاوایی تازە لێی تێگەیشتن. دوای ئەوە بوو کە بەپێی جوانی و ناسکێتی، ریزیان بەست و حاجی لە ماوەی پێنج ساڵاندا، هەموو ژنەکانی گوندەکەی مارە بڕی و تەڵاقی دانەوە. لەو نێوەدا حۆری گوڵان بەخۆی نەوەستان و خۆی لەبەر ئەو سات و سەودایەی حاجی رانەگرت و لە زۆنگاوەکەدا خۆی خنکاند. زەڵە حەڤدە ساڵان بوو. یەکەم بەیانیی بۆکێنییەکەی تەرمەکەیان بە دارچنارەکەی دەم ئاوەکەوە بە هەڵواسراوی دۆزییەوە. ناوبانگی حاجی بە هەموو مەڵبەندەکە وەربوو. گەلێك بێوەژنی خاوەن موڵك و زەوی لە گوندەکانی دیکەشەوە دەهاتن و سۆراغی حاجییان دەگرت و بە ویستی خۆیان تۆقی ژن و مێردایەتیی ئەویان لە ملیان دەکرد. حاجییش سەنگ و سووکی دەکرد، دەیزانی زەوی و زارەکەی چەندەیە، جوانی و بەژن و باڵاشی دەدی جا زەماوەندی لەگەڵ دەکرد و یەك، دوو ئەوپەڕەکەی سێ مانگ دوای ئەوەی زەوی و زارەکەی بەناوی خۆی دەکرد، جا تەڵاقی دەدا. لەو نێوەدا تەنیا یەك ژن بوو کە ساڵ و نیوێکی تەواو هەر ژنی حاجی مایەوە و ئەویش کچێکی زلەی فیلەتەنی بەخۆوەی بەگی سومباسلی بوو. هەر حاجی دەیگوت سێ بەردەت لە مستی دەنێم، ژنە وەك برێشکەی سەر ساج هەڵدەبەزییەوە و دەیکردە شین و شەپۆڕ و گریان و هەڕەشە و گوڕەشەیەك مەگەڕ خوا بزانێ. هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکرد هەتا حاجی هیچی لە دڵیدا نەدەما و قسەی لە قوڕگیدا عاسێ دەبوو. ئاخرییەکەی هەر کچەکەی سومباسلی خۆی بوو کە دەستی لە بەرۆکی حاجی بەردا و وەشوێن کاری خۆی کەوت. ئەو حاجی قۆرت بۆغایە هەر هەمان حاجییەکەی گۆرینە. حاجی دواتر، پاش راگەیەنرانی کۆماری، دەستی پتر رۆیشت و پێگەی قایمتر بوو. بوو بە ئەندامی حیزب و بە ئەندامەتیی پەرلەمانی ناوچە هەڵبژێردرا. چەند ساڵێکیش کرایە سەرۆکی

شارەوانیی شارۆچکەکە. لەگەڵ پارێزگار و داواکاری گشتی و دادوەرەکان و فەرماندەکانی پۆلیس و قایمەقامەکان هاموشۆی دامەزراند و بوو بە برادەریان. شیر و سەرتوێ و رۆن و ماست و گۆشت و ساوار و هەنگوین و کەرەی ماڵی ئەو کاربەدەستە پایەبەرزانە، حاجی قۆرت بۆغا دابینی دەکرد. هەرکەسێکی ئەو ناردبایە لای بەرپرسەکان، بێ ئەملا و ئەولا کارەکەی جێبەجێ دەکرا و بە بەرتیلیش حیساب نەدەکرا. حاجی رۆژێکیان کە هەستی کرد تەواو بەهێزە و حکومەتی لە پشتە، گوتی ئیتر بەسە. دەبێ ئەو ژنەتیوانە، ئەو هێمای هەژاری و نەگبەتییانە لەو گوندە وەدەر بنێم. هەر هەمووشیان کۆنەژنی خۆی بوون. هەندێکیان تەنانەت منداڵیشیان لێی هەبوو... حاجی خۆی زۆری هەژاری و نەداری دیتبوو. زۆۆۆۆر زۆر. هەر بۆیەش بێزی لە هەژاری و نەداری هەڵدەستا. کە چاوی بە هەژارێکی رەش و رووت دەکەوت، ئاوری دەگرت و لەدین دەهری دەبوو. ئەو رەش و رووتانە بەکاری چی دێن... بۆچی زیندوون؟ دەبێ هەر هەموویان بکوژرێن. سواڵکەرێك و مێشێك چ جیاوازییەکیان لێك هەیە. بۆچی بژیێن؟ دەبێ پاك بکرێنەوە و ئەو نیشتمانە رەسەنە بە خەڵکی بەتوانا بسپێردرێ. حاجی زۆۆۆۆۆری تاڵی و سوێری دیتبوو و چێشتبوو، زۆۆۆۆۆری هەژاری چێشتبوو.... هەر بۆیە لە هەژاران بێزار بوو. لە پێشدا بە دورسوونی دەرکەوانی گوت: جاڕ بکێشێ. دورسوونی درەکەوان تەمەنی حەفتا ساڵ دەبوو. لە یەمەن بە زیندوویی دەرچوبوو و گەڕابۆوە. تاقە پیاوێك بوو لە یەمەنێ گەڕابۆوە و بۆ خەڵکەکەی دەگێڕایەوە کە چۆن برادەرە هاونیشتمانییەکانی تێداچوون و قەڵتوبڕ بوون. بە دەنگە ژنانەییەکەی و بە ناڵینەوە هاواری کرد:"هۆۆۆۆۆی خەڵکیییییینە هۆۆۆۆۆۆ ۆ ۆ ۆ ۆ ، هۆۆۆ ۆ ۆ ۆ ۆی خەڵکینە.... دوایی نەڵێن گوێمان لێ نەبوو ها، دەبێ لە ماوەی سێ رۆژاندا لەم گوندە، لە گوندی ئاغاکەمان وەدەر کەون. ئیتر بەو گوندەدا نەیەنەوە ها. ئەوە فەرمانی حوکمەتە. کوێتان حەز لێیە بڕۆنە ئەوێ.... هۆی ژنگەل، عەورەتینە، بەربەرەکانێ و پێداگری بێ فایدەیە. ئەوە بۆخۆتان دەبینن فەوجێك جەندەرمە چاوەڕێی ئاماژەیەکی ئاغامانن بۆ ئەوەی هەمووتان بکوژن... هەی عەورەتینە، ئیدی نەڵێن نەمانبیست ها..."

لە نەکاو دەنگی شین و شەپۆڕ و گریان لە ئاواییەکە گەڕا و هاوار گەیشتە تەشقی ئاسمانێ. زەوی و ئاسمان ماوەیەك ناڵاندی. دواتر ژن و منداڵ هەمووی لە بەر دەرگای ماڵی ئاغا کۆ بوونەوە... و دەستیان کرد بە گریان و پاڕانەوە و لاڵانەوە:"باشە بچینە کوێ؟ روو لە کوێ بکەین؟ بچینە کوێ؟"

زۆر گریان و کڕووزانەوە.

سێ ڕۆژ رابرد. گریان و شین و کڕووزانەوەیان هەر بەردەوام بوو و نەبڕایەوە. ژنە هیوابڕاوەکان، سێ ڕۆژ دواتر دیسان کڕ و کپ و بێدەنگ سەریان بەردایەوە و هاتنەوە بەردەرگاکەی ئاغا. هەموو زاریان ببووە تەڵەی تەقیو و چاوەکانیان چۆڵ و بەتاڵ دەیانڕوانی. هەموویان نوقمی بێهیواییەکی پڕ لە پاڕانەوە بوون.

ئاغا ئیتر خۆی پێ نەگیرا و تاقەتی نەما سەیری ئەو سەرلێشێواوی و رەشورووتی و چڵك و چەپەڵییە بکا، هەڵچوو:"کوڕە هۆی ژەندەرمە بەغیرەت و چاونەترسەکان، ئەو ناپاك و خەیانەتکارانە، ئەو یاغییانەی دژی ئاسایشی دوایین دەوڵەتی تورك پیلان دادەڕێژن، خێرا لەو موڵکەی من وەدەر بنێن. نێزە ئامادە."

فەرماندەی ژەندەرمەکان فەرمانی دا:"سەرنێزە ئامادە."

ژنەکان کردیانە زیقە و هەرا. ژن و منداڵەکانی جارانی حاجی قۆرت بۆغا لە ترسان بەولاولادا رایان دەکرد. ژەندەرمە دەگەیشتنە هەر کەسێ، بە قوونە تفەنگ لە خوێن و خۆڵیان دەگەوزاند. شەڕی تەن بە تەن لە نێوان ژنە گوندی و ژەندەرمەکاندا هەتا شەوێی کێشا. ژەندەرمەکان نیوەی ئەو کەسانەیان کە دژی ئاسایشی نەتەوەیی و دوایین دەوڵەتی تورك هەستابوون، بە زەبری قوونە تفەنگ شل و کوت کردبوو. ناڵین و هاوار و قیژە هەتا بەیانی لە ماڵەکانی و لە بن دار چنارە لك و پۆ چڕەکە و لە دەرەوەی گوند دەهات... شەڕی نیوان ژەندەرمە و ژنەکان لە بەیانییەی ڕۆژی دووەمەدا و لە نێو کۆخ و کەپرە قامیشەکاندا دیسان دەستی پێ کردەوە. لەو نێوەدا ژەندەرمێکی پیر لوولەی ماوزەرەکەی لەسەر شەویلکەی خۆی دانا و پەلەپیتکەی ترازاند... ئەمڕۆش کە شەو داهات، تەقە راگیرا و ژەندەرمەکان لە سەر سفرەیەك دانیشتن کە بە گۆشت بەرخی سوورەوەکراو رازێنرابۆوە. ئەوجارە بە سەدان ناڵە و کڕووزانەوەو نووزانەوە تا بەیانی لە ئاواییەکەوە دەهات.

ڕۆژ بۆوە. بەیانیی هەمووتان شاد و خۆش. بەیانی حاجی و فەرماندەی ژەندەرمەکانیش... ژەندەرمەکان لە دوایین پەلاماری خوێناویی خۆیاندا هەڵیانکوتایە سەر ژنەکان لە دەرەوەی ئاوایی. دیسان قوونە تفەنگ کەوتنەوە کار. حاجی قۆرت بۆغا دەستی فەرماندەی ژەندەرمەکانی گرتبوو و پەیتا پەیتا دەیگوت ئیتر تاقەتم نەماوە. تاقەتی بیستنی ئەو هاوار و ناڵین و کڕووزانەوەیەم نەماوە. با ببڕێتەوە. ئەوەی بەدەستیانەوە چێشتوومە بەسمە. ئەوەی لە دەستی ئەو خەیانەتکار بە نیشتمان و وڵاتانە چێشتوومە بەسمە. سەیر بکە جەنابی فەرماندە، ئەوە دەبینی چ دەکەن؟ چۆن بەرەنگارمان دەبنەوە؟ دەبینی ئەو قەحپانە چۆن لە هەمبەر

سوپای نیشتمانیدا ـ چما ژەندەرمە بەشێك لە سوپا نییە، ئەویش چاو و رووناکایی سوپا؟ ـــ لە هەمبەر سوپای بەشان و شەوکەتماندا مل بادەدەن؟ خۆ ئەگەر مێردەکانیشیان لێرە بوایەن، ئەوانیش لە یەمەنەوە گەڕابانەوە، ئیتر کەس باشاری نەدەکردن. سەرهەڵدان و راپەڕینێکیان وەڕێ دەخست ئەوسەری دیار نەبێ... ئەوانە بەڵای گیانی دوایین دەوڵەتی تورکن. خۆ دەیبینی؟ بەچاوی خۆت دەیبینی! ئەمن ئیتر تاقەتی ئەوەم نەماوە، تاقەتی ئەوەم نییە ببینم کۆمەڵێك ژنی نەگبەت بەرەنگاری سوپا مەزنەکەمان بوونەتەوە، نیمە...

بۆ نیوەڕۆیە هەر هەموویان لە ئاوایی وەدەر نرابوون. ئەوجارەیان بەبێ دەنگ و گریان و بە گاگۆڵکێ و سینگەخشکە بە دەوری گوندەکەدا خولانەوە. رۆژ ئاوا بوو و شەو داهات. قۆرت بۆغا و فەرماندە هەتا نیوەی شەوێ هەر پێکیان بە خۆشیی یەکتری لێك دا و قسەی خۆشیان کرد و پێکەنین و قاقایان کێشا. کە بەیانی لە خەو هەستان، گوێیان لە هیچ دەنگ و سرت و خورتێك نەبوو. قۆڵیان لە قۆڵی یەکتری کرد و سەرخۆشانە هاتنە دەرێ و سەرخۆشی بادە و شەرابی لەخۆباییبوون وەك دوو فەرماندەی سەرکەوتبوو، سەرکەوتووی شەڕێکی قورس و گران، بە گوندەکەدا گەڕان. دەرگای ماڵەکان لەسەر گازی پشت بوو و لێرە و لەوێ هەندێ پەڕۆ و سیپاڵە کۆن دەبینران. سەگەل و پشیلەی تۆقیو لە گۆشە و قوژبنان کرووشمەیان کردبوو. پەڵەی خۆێن بەسەر دەرگا و لاشیپانەی دەرگاکانە بەدی دەکرا.

فەرماندە و حاجی قۆرت بۆغا دەستیان لە نێو دەستی یەکدا دەورێکی نێو قەڵای ئاغایان لێ دا. فەرماندە گوتی:"تەواوە؟"

"ئەو خەزایەت لێ مەبارەك بێ فەرماندە، هەر بژی."

"ئێوەش بژین، ئاغا."

حاجی قۆرت بۆغا دەستی فەرماندەکەی گرت و لەسەرخۆ گوتی:"تکایەکم هەبوو فەرماندە."

"بفەرموو، حاجی ئاغا."

"دەڵێم وا باشترە کارەکەت بە خێر و خۆشی تەواو بێ. شکۆمەندتر بێ."

"چۆن؟"

"ئەمر بفەرموون ژەندەرمەکان سێ دەسڕێژی هەوایی بکەن بۆ ئەوەی دەنگی بگاتە گوندەکانی دەوروبەریش."

"بەسەر چاو حاجی ئاغا."

"خەرج فیشەکەکانیش لەسەر خۆم."

"تێگەیشتم، سوپاس."

چەندەرمەکان چەند خەشابیان بە ئاسمانەوە نا و دەنگی تەقەکان هەتا دوور دوور ڕۆیشت و لەدەشتەکە گەڕا."

جا ئەو حاجی ئاغایەی باسی دەکەم، هەر ئەم ئاغا قۆرت بۆغایەیە.

جا زۆر لە دەروێش بەگ پڕە:"سەگبابی گەواد، دەروێش بەگی خوێنمژ، چما ئەتۆ دایکی ئەو ژنانەی؟ ئاخر بە تۆ چی؟ ژنی پێشووی خۆم بوون ئەزبەنی. هەر تۆ مابووی لەسەر ژنەکانی من وەجواب بێی؟ ئەو زەوی و زارە بەرهەمی ئارەقەڕشتن و شان و باهۆی خۆمە. باشە ئەگەر تۆ بتەوێ، ناتوانی ڕەعیەتەکانت لە موڵکەکەی خۆت دەربکەی؟ ئەمنیش پۆلێکی ژنی زۆربڵەم کە بەکاری هیچ شتێك نەدەهاتن، لە موڵکەکەی خۆم دەرکردووە. چما موڵکی من خانووی پیرەژنانە؟ ئەی تۆ بۆچی خۆ لە کاری من هەڵدەقوتێنی؟ باشە ئەمن چ خراپەیەکم بۆ تۆ بووە. باشە تا ئێستا لە گوڵ کاڵترم پێ گوتووی؟ ئاخری ڕۆژی خۆی دێ، جا درەنگ یان زوو، تۆڵەی ئەو چاوقایمییەت لێ بکەمەوە. یانی وات لێ هاتووە ببیتە داشداری ژنەکانی من؟ زۆر باشە. شتێکی تۆڵەی هەبێ، گلەیی ناوێ... بەتۆ چی ژنەکانی من لە دەشتی چوکووراوادا لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ڕەق هەڵدێن و وەك خەزەڵ هەڵدەوەرن؟ ئەتۆ چ کارەی؟ باشە ئەوە کارێکی ژیرانەیە بچی و کاتی بەنرخ و پڕ بایەخی پارێزگارێکی گەورە بۆ شتێکی ئاوا هیچ و پووچەکە بگری؟ باشە بەتۆ چی نوێنمژ؟ لاپرەسەن! کوڕە خۆ کۆمارەکەشمان نەیتوانی تۆوی ئێوەی بەگی چەتە و دژ ببڕێتەوە. بۆ خۆم جووقەوارت دەبڕم. بۆ خۆمان. وات لێ دەکەم هەتا تۆ بی، باشترین پەڵە زەوییەکەی دەوری ئاقچاسازت بە ڕۆستەم بەگی خوێڕی نەفرۆشی. باشە ڕۆستەمبەگ کێیە؟ کەردارێکی بەرەڵڵای "دارندە"یی. چما پیاو زەوی بە هیچ و پووچی وا دەفرۆشێ؟ باشە ئەوێ سەراوەرد و بەراوەردی نەدەهاتەوە سەر زەوییەکەی من؟ باشە، زۆر باشە، دەبیتە کۆسپی سەر ڕێی من؟ ناهێڵی دەستم بە ئاقچاساز ڕابگا؟ باشە دنیا خرا دەبوو پەڵەیەك، چەند دۆنمێك لە زەوییەکانت، هێندەی هۆگانێکت لە لێواری ئاقچاساز بە من دابایە؟ ئەوەتا ئەوە وشك دەبێ و خاکێکی لە ڕۆحی بنیادەم بەنرختری لە بن دێتە دەرێ. ئێستا ڕەوەیەك بەرەڵڵا پێ گەیون و وەك گۆشتی قوربانی ئەوێ بەسەر خۆیاندا دەبەشنەوە و ئەتۆش لەو حەیس و بەیسەدا دێی و ڕێگەی لەمن دەگری... باشە، باشە، ئێستا کاتی هاتووە کە

تۆڵەت لێ بکەمەوە. گوتم ئاخرییەکەی دەکەوییەوە بەر چنگی خۆم. جا چۆنیش کەوتییەوە. ڕێگەی قوتاربوونت نییە."

لە کافتریاکەدا، باسی کەش و هەوا و زەوی و ئاسمانیان کرد و ئەوەندەیان سوعبەت کرد هەتا خۆر ئاوا بوو و کە خۆر ئاوابوو، حاجی قۆرت بۆغا هەستا و گوتی:"هەستن با بڕۆین. هەموو شتێکتان ئامادە کردووە؟ نەکا کەم بێ. دەبێ شیاوی خۆی بێ. لە پێشدا من دەچم. دوایی قایمەقام و ئەوانە. گاڵتەی پێ ناکرێ، داواکارێکی گشتیی دادگایەکی تاوانی ئاوا مەزن... خۆ پیاوێکی ئاسایی نییە. نەوەی سەرۆکێکی بەشان و شکۆیە کە حەوت نیشان و مەدالیای هەبووە."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە گەرووی پاك کردەوە و گوتی:"بەڵێ، زۆر بە شان و شکۆیە. دەبێ دڵنیا بین لەوەی دیارییەکەمان شیاوی سەرۆکزادەیەکی بەشان و شکۆیە."

مامۆستا ڕۆستەم بەگ کە سەر و کاکۆڵی داهێنرا و دەموچاوێکی گەورەی هەبوو، لە حاڵێکدا دەلینگی پانتۆڵە قاوەییە ئوتوولێدراوەکەی هەڵدەکێشا، گوتی:"دیارە تەواوە. بەڵام ئەمن نازانم چەندە و چۆنە."

ماهیربەگیش پشتی گرت:"وەڵا ئەمنیش نازانم چەندە و چۆنە. ئەو کارە لە ئەستۆی سلێمان ئاغایە."

سلێمان ئاغا بزەیەکی کاڵی هاتە سەر لێوی و گوتی:"لە پێشدا بەتەمای خودای..."

هەستایە سەرپێ و گوتیشی:"هەستن با بڕۆین. لێم ڕاسپاردووە، کە نەچێتە هیچ کوێ و لە ماڵەکەی چاوەڕێم بێ. لە پێشدا بە تەمای خودا و دوای ئەوەش ئەوە لە سایەی سەری ئێوەوە هەموو شتێك ئامادە کراوە. بەسپایی دەیخەمە گیرفانییەوە. خەمی ئەوەتان نەبێ نا."

وەڕێ کەوتن. حاجی قۆرت بۆغا لە پێشەوە و سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە بە دوای دا و ماهیر قاباقچی ئۆغلی بە دوای ئەودا و ڕۆستەم بەگ بە نیوچاوانێکی گرژەوە و لەسەرخۆ بە دوای هەمووواندا. هەرچی لەوێ بوون، بە ڕێز و حورمەتەوە هەستانە پێ.

قۆرت بۆغا لە پێشەوە ڕاوەستا و دەستێکی بە سمێڵیدا هێنا و گوتی:"هەتا مامۆستام، مامۆستای هەمووومان نەفەرمووێ، ناچمە دەرێ. ئەو مامۆستای هەموومانە و هەرچی گەورەیی و شکۆی هەمانە لەسایەی سەری ئەوەوەیە."

جا گەڕایەوە و دەستێکی لەسەر سینگی دانا و گوتیشی:"دەتوانین حاشا لە هەموو مافەکان، مافی دایك و باوکان و حوکمەتیش بکەین، بەڵام ناکرێ نکوڵی لەو هەقە بکەین، کە مامۆستا لە ئەستۆی ئێمە هەیەتی."

هەموو وێکڕا گوتیان:"ناتوانین."

ڕۆستەم خاکەڕا، فیلەتەن، هێمن، کاڵ و بەهێز، سوور هەڵگەڕا و لە بن لێوانەوە گوتی:"ئەستەغفیروڵڵا، ئەستەغفیروڵڵا، ئەمن هیچ کارێکم نەکردووە، خزمەتێکی وام نەکردووە، ئەگەر کردبێشم، ئەرکی سەر شانم بەجێ گەیاندووە. ئەرکیش پیرۆزە."

قۆرت بۆغا چەند هەنگاوی دیکەش کشایەوە دواوە و دەنك دەنك قسەکانی پاتە کردنەوە و لێشی زیاد کرد:" ئەو نەبوایە ئێستا هەر هەموومان لەو چیا و شاخ و داخانە یاغیگەریمان دەکرد... هەر هەموومان، هەموومان. ئەو فێری مرۆڤبوون و گەورەیی کردین. ئەگەر ئەو نەدەبوو، ئێوە بەجاشولکەیی لە دایك دەبووین و بەگوێدرێژی دەمردین."

ئیتر دەستی لە سەر سینگی هەڵگرت و ئاماژەی بە ڕۆستەم بەگ کرد:"فەرموون مامۆستا."

مامۆستا لەسەرخۆ و گران و سەنگین لە حاڵێکدا سوور سوور هەڵگەڕابوو، بە بن دەستە لێككراوەکەی قۆرت بۆغادا تێپەڕی.

سواری ترۆمبێلەکە بوون. دیسان بە هەمان دامودەستوورەوە.

ڕۆستەم بەگ و حاجی ئاغا لە تەنیشت یەکترییەوە دانیشتن. دوای وەڕێکەوتنی ماشێنەکە، حاجی ئاغا سەری بردە بن گوێی ڕۆستەم بەگ و بە سرتە پێی گوت:"چۆن بوو مامۆستا؟ پێت خۆش بوو؟ لێگەڕێ با ئەو گەوادانە بزانن کێ بنیادەمە و کێ سەگە. ئەمن خۆم بە ئانقەست ئاوا قسەم کرد.مەبەستێکم هەبوو. با بزانن لەو وڵاتی تورکیایەدا کەس لە مامۆستامان مەزنتر نییە."

ڕۆستەم بەگ پەیتا پەیتا دەستەکانی لێك دەخشاندن و بەردەوام و لە حاڵێکدا لەسەر وشەکان هەڵوەستەی دەکرد، دەیگوت و دووپاتەی دەکردەوە:"سوپاست دەکەم. سوپاست دەکەم."

داواکاری گشتی لەماڵەکەی خۆی پێشوازیی لێ کردن. هەم کەیفخۆش دیار بوو، هەم تۆزێ نیگەرانییشی پێوە دیار بوو: فەرموون، فەرموون، چاوەڕێتان بووم. بەخێر هاتن. خێروخۆشیتان هێنا، گەورەتان کردم..."

لەو پلیکانانەی لە بن پێیانیاندا جیڕە جیڕیان بوو، وەسەر کەوتن و لە ژوورێکی گەورەدا کە لە پاش هەرمەنییەکان بەجێ مابوو، لەسەر مۆبلەکان لێی تخێڵ بوون. کچۆڵەیەکی تازە پێگەیشتوو لە کووپی دەسك زێڕدا قاوەی بۆ هێنان. داواکاری گشتی جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساندەوە.

حاجی ئاغا وەقسە هات:"فەرموو، فەرموو دانیشە فەخری بەگ. براکەم. خۆت دەزانی بۆچی هاتووینە خزمەتت. دەزانی چ داوایەکی نیشتمانپەروەرانەمان لێت هەیە."
عێزەدین فەخرەدین تۆغ سالۆر گوتی:"تکا دەکەم، ماڵی خۆتانە..."
"دەزانین رەسەنزادە و بە رەچەڵەکی... رەچەڵەکت دەچێتەوە سەر... سەر ..."
بێدەنگ بوو و سەیری یەك بە یەکی خەڵکەکەی کرد و کەس هیچی نەگوت.
"رەچەڵەکت دەچێتەوە ... سەر..."
دەتگوت وشەیەکی پڕ بە پێستی نەدۆزییەوە."
"دەچێتەوە سەر... سەر..."
ماهیر قاباقچی ئۆغلی فریای کەوت:"سەر ئۆرنووس پاشا."
داواکاری گشتی خاکەڕایانە و بەشەرمەزارییەوە لە حاڵێکدا دەستی بە بۆینباغەکەی دادێنا، گوتی:"سوپاستان دەکەم ئاغا."
حاجی ئاغا تەق لە سەر ئەژنۆی راکێشا و بە پێکەنینەوە گوتی:"کوڕە سوپاسی ناوێ، پێویستی بە سوپاس نییە. کێ بێ و رەچەڵەکی بەرزت نەناسێ؟ ئەوەی هەڵکشان و داکشانی نییە هەر خوایە. ئەتڵەس کۆنیش بێ، ناکرێتە راخەر. زێڕ و گەوهەر لە قوڕاویش بکەوێ هەر زێڕ و گەوهەرە..."
سلێمان ئاغا لەسەری رۆیشت:"... هەر زێڕ و گەوهەرە. "فیل زیندووەکەی و کەلاکەکەی هەر نرخێکیان هەیە." ئەوەی لە سەر ئەسپەوە دەگلێ، خۆ لە رەچەڵەك ناکەوێ. هەر وەك چۆن خۆر بە تۆپەڵە قوڕ ناشاردرێتەوە، رەچەڵەکی رەسەنیش ون نابێ."
حاجی ئاغا لەوەی کە سلێمان ئاغا خۆی تێهەڵقورتاند، مۆڕەیەکی لێ کرد و گوتی:"بنیادەمە رەسەن و نەجیمەکان پارێزەر و پشت و پەنای وڵاتن. ئەوان نیشتمانپەروەرن. ئەوان ئەو پەپوولانەن کە لە ئاگری نیشتمانەکەیاندا دەسووتێن. خۆت ئەوانە لە ئێمەمانان باشتر دەزانی."
لەو نێوەدا سلێمان ئاغا سووکێ خۆی لە داواکاری گشتی نزیك کردەوە و پاکەتەکەی دەرهێنا و وای دەرخست کە بەڵێ ئەوانی دیکە ئاگایان لێی نییە، بە ئاماژەیەك پێشانی دا و بە پێکەنینێکی زیرەکانەوە کە چرچێکی دەخستە بن روومەتەکانی، خزاندییە نێو گیرفانییەوە.
"تکایەکم لە برای خۆم هەبوو. ئەو ئاغایانە، ئەو بەگە هەڵۆ ئاسایانە، هەر لەبەر برایەتیمانە ئەمنیان هێناوەتە لای تۆ. ئەمنیش شانازی بەوەوە دەکەم کە برا و سەرۆکزادەیەکی وەك تۆم هەیە، دەستم بە روویانەوە نەنا و هاتمە خزمەتت. خەڵکێك هەن لەو مەملەکەتە بوونەتە گونی قۆڕ. ئەوانە دەیانەوێ وڵاتەکەمان بگێڕنەوە سەردەمی دە هەزار ساڵ لەمەوبەر، بۆ چاخە تاریکەکانی ئەشکەوت-

نشینی. دەست لە کوشت و کوشتار هەڵناگرن. هەر پیاو لە یەکتری دەکوژن. با بکوژن، زۆر باشە، زۆریش باش... با تا زووە قڕیان تێکەوێ و تەواو بن. بەڵام کێشەکە لێرەدایە کە هەر لەخۆیان ناکوژن. لەو نێوەدا گەلێك کوڕە لاوی ئازا و بەجەرگی ئەو نیشتمانەش دەکەنە پێخۆری ئەو گەمە دواکەوتووانەی خۆیان. بۆخۆتان باش دەزانن ئەو دەشتە گەلێك هەژارە. بۆ پێنسەد لیرە پیاوێك دەکوژن. بیست ساڵ بەندیخانە بە سێ هەزار لیرە دەکڕنەوە. ئەو بەگانە زەوی و زارەکەیان بێ سنوورە. باب و باپیرەکانیان پێیان لە رکێفان ناوە و ئەسپیان لێ لینگ داوە و گوتوویانە چەندی ئەسپ توانای راکردنی تێیدا هەبێ، هیی ئێمەیە و بەو جۆرە سەرانسەری چوکووراوا هیی ئەوانە. بۆخۆشیان ئەوەندەیان پارە هەیە لە کەوڵی گای دەئاخنن. ئەمیان شەڕکەری خۆی لەسەر ئەویتر دەکات و ئەویش تۆڵەی خۆی دەکاتەوە. ئەو بگرە و بکوژەیە سەد، دووسەد ساڵی رەبەقە هەر وا بەردەوامە. ئەو میللەتە لە خیانەت و ناپاکییەی ئەوانە رزگار بکە جەنابی داواکاری گشتی. ئەو ئاگرە هەر بەتۆ دەکوژێتەوە. هەر لە تۆی رەسەن دەوەشێتەوە. نیشتمانەکەمان رزگار بکە جەنابی داواکاری گشتی. رزگاری بکە. بیری لێ بکەوە، بزانە ساڵی چەند سەربازمان بە دەستی ئەو جانەوەرە وەحشییانە بە ناهەقی و لەخۆڕایی بەکوشت دەچن؟ ئەگەر بێت و ئەو بەگانە هەر وا بەدەسەلات بن، سوریا و یۆنان و لوبنانیش کە سەردەمانێك لەبن دەست و دەسەلاتی ئێمەدا بوون، ئەوجار دەتوانن بەچۆکماندا بێنن. بەو بگرە و بکوژەیە چما گەنجمان بۆ دەمێنێتەوە... وانییە مامۆستا؟"

رۆستەم بەگ لە نەکاو هەودای خەیاڵی پسا. راچڵەکی و وەخۆ هاتەوە:"بەڵێ، بەڵێ، فەرمایشتە... تێك دەشکێین گەورەم... تەنانەت لەبەر لوبنانیش دەبەزین کە وەختایەکی لەبندەستی خۆماندا بوو."

"لەسەر ئیزنی مامۆستا. بە چەند قسەیەکی دیکەش سەرت دێشێنم. دواتر جەنابت فەرمایشت بفەرموو. ئێستا ئاغای من، برای خۆشەویستم، ئەو پەتایە لەسەر ئەو وڵاتە کەم بکەرەوە. ئەو زەوی و زارانە لە چنگی ئەو دەروێش ساری ئۆغلی و ئەو مستەفا "ئاق یۆللی"یە دەربێنە و رزگاری بکە... ئەوانە بنێرە شوێنێك خۆیشیان نەزانن کوێیە. بەڵێ هەڵیاندێرە. چییان لە گیانی ئەو میللەتە دەوێ؟ نیشتمان ئەو چاوەڕوانییەی لێتە. ئەگەر ئەوە بکەی، ئەوانیش موڵکەکانیان دەفرۆشن و کلکیان لە گەلۆزیان دەنێن و دەچنە بەرەو هەندەران و شەڕ و شۆڕیان لەسەر ئەو میللەتە دەبڕێتەوە.

جا ئەوجار خۆشم دەچمە ئەنکەرە و کاروباری پلەبەرز کردنەوەکەی بەڕێزت جێ بەجێ دەکەم. قسە، قسە... قسە... من... ئەمن هیچ..."

چەند جارێك هەستا و دانیشتەوە و دیسان گوتی:"بۆخۆت بڵێ، هەتا ئێستا دیتووتە ئەمن لەسەر قسەی خۆم نەبوویێتم؟"

عێزەدین فەخرەدینیش هەستا و دەستی لەسەر سینگی دانا و چەند جارێکیان بەگران و سەنگینییەوە دووپاتەی کردەوە:"ئەستەغفیروولڵا..."

"کەوابوو جەنابت بفەرموو مامۆستا... لە بواری قانوونییەوە مەسەلەکە لێك بدەرەوە."

ڕۆستەم بەگ لەمێژ بوو خۆی ئامادە کردبوو. لەسەرخۆ و هێمن و بەبێ ئەوەی دەنگی هەڵبێنێ، یەك ریز و پوخت دەستی پێ کرد:"بەپێی مادەی ٣٢٣٦ی قانوون، ئەوانەی بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە پیاو دەکوژن و تۆڵەئەستاندنەوە دەکەنە نەریت و باو، بەپێی داوای داواکاری گشتی و پەسندکردنی دادگای تاوانەکان، مەودای پێنج سەد کیلۆمەتر لە شوێنی نیشتەجێبوونەکەیان دوور دەخرێنەوە. ئێستا ئەو داوایەی لە بەڕێزتت هەمانە ئەوەیە، کە قۆڵێك لە دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی و خزم و کەسوکارەکەی و هەروەها مستەفا بەگی ئاق یۆللی" و خزم و کەس و کارەکەی هەڵمالێ. جا لەبەر ئەوەی شارەکەی ئێمەیان کردووەتە شوێن و ناوەندی تۆڵەئەستاندنەوەی سەردەمی دقیانووس، جێی خۆیەتی ئەو بنەماڵانەش دوور بخرێنەوە کە تێوە گلاون. شارۆچکەکەی ئێمە بە تایبەتی ئەو قانوونە دەیگرێتەوە. ئەوەی کە لە شارۆچکەکەی ئێمە ڕووداوی ئاوا قێزەون دەقەومێ، ئێمە لە هەمبەر نەوەکانی داهاتووماندا شەرمەزارین. ئەوە پەڵەیەکی شوورەییە بە سەر شانی ئێمەوە. هەر بۆیەشە جەنابی داواکاری گشتی، ئێمە دەبێ هەموومان دەست بدەینە دەستی یەکتری و ئەو پەڵەی لە داوێن و سەر شانی خۆمان و شارۆچکەکەمان پاك بکەینەوە. ئەو دووبنەماڵەیەی وەك پەتای سەرەتان کەوتوونەتە دەمار و خوێنی ئەو شارۆچکەیەوە. شارۆچکەکەمان با لە چنگی ئەو گرێ سەرەتانییانە رزگار بکەین... ئیتر ئەمن قسەیەکم نەما."

داواکاری گشتی رووی گرژ بوو و نێوچاوانی تێك نا:"ئەمن وەك داواکاری گشتیی قانوون، ئەو دوو بنەماڵەیە بۆ مەڵبەندگەلێکی دیکەی وەك بۆ وێنە قارس..."

سلێمان چووە نێو قسەکەیەوە:"باشە، قارس زۆر باشە."

حاجی ئاغاش پشتڕاستی کردەوە:"باشە، زۆر باشە. ئیتر ناگەڕێنەوە. ئەو سەری دنیایە."

"بۆ وێنە بۆ ئەدەنە."

سلێمان دیسان چووە نێو قسەکەیەوە:"ئەوێش باشە، چەقی جەحەندەم..."

"بەڵێ، ئاغا، زۆرم بیر لێ کردەوە. قانوون تەنیا دەستی ئاوەڵا کردووم بۆ ئەوەی داوا بکەم و پێشنیار بکەم. ئەویدیکەی بە دەستی دادگای تاوانەکانە. ئەنگۆ هەر کات ویستتان ئەمن پەروەندە (دۆسیە)ی پەیوەندیدار بەو مەسەلەیەوە ئامادە دەکەم و دەیدەمە دادگای تاوانەکان."

حاجی قۆرت بۆغا بەپەلەپەل گوتی:"هەر ئێستا."

"هەر ئێستا پێشکەشی دەکەم. لە سەر ئەو دوو بنەماڵەیە لە پەنجا ساڵی رابردووەوە تا ئێستا بەڵگەی ئەوەندە بەهێز لە دەست دایە کە... بۆ خۆت، تەحسین بەگ، سەرۆکی دادگای تاوانەکان لە من باشتر دەناسی. ئەو قسە سەهلە، فیشەکیش کاری تێناکا."

رۆستەم بەگ وە قسە هات:"براله ئەو مەملەکەتە قانوونی هەیە. سەرۆك ناچارە بە پێی ئەو قانوونانە لەگەڵیان بجووڵێتەوە."

ماخیر بەگ لە خەونووچکەکەی راچڵەکیبوو، پرسی:"ئەی چ لە ئەندامەکانی دادگا دەکەن؟ کاتێ هەر دووکیان لە خۆمان بن، تەحسین بەگ چی پێ دەکرێ؟"

رۆستەم بەگ وەڵامی دایەوە:"هیچی پێ ناکرێ."

"تۆفیق بەگ ئەندامی دادگایە و خزمی خۆمانە. قسەی من لە عەرزی نادا."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەش لێی زیاد کرد:"عوسمان ئاڵنی ئاچیقی ئەندامی دادگاش لە ئەستۆی من."

داواکاری گشتی:"بەڵام عوسمان ئاڵنی ئاچیق ناتوانێ قسە لە قسەی تەحسین بەگدا بکاتەوە."

سلێمان ئاغا بە تووڕەییەوە:"ئەوە دەیبینین..."

داواکاری گشتی:"ئەمن لەو حەوتووەدا دۆسیەکە دەدەمە دادگای تاوانەکان. ئەو کارەش هەر لەبەر ئێوە دەکەم. بەڵام دیسانیش دەیڵێمەوە خاوەخاو مەکە لە رازیکردنی تەحسین بەگدا. هەموو کارەکان بەدەستی ئەوە..."

حاجی قۆرت بۆغا:"خەمی ئەوەت نەبێ. ئەگەر قایل نەبێ، خوا دەزانێ، بەشکم خۆیشی لە قارس خۆی ببینێتەوە."

سلێمان ئاغا:"هەر بژی... هەر بژی حزب و حکومەتە مەزنەکەمان. ئەنکارای خۆمان، قسەمان لە عەرز نادا."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی بە تۆسە تەوسێکەوە لە دەنگیدا بەرز گوتی:"ئەنکارای خۆمان."

# ٣٥

دەرگای دووکانەکان یەك بەدوای یەکدا و بە خرم و هۆڕ دەکرانەوە. جاری وابوو چەند دەرگا پێکەوە دەکرانەوە. هێشتا تاو نەکەوتبوو. نانەواکە بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە، تەندوورەکەی نێڵ دابوو و بۆن و بەرامەی نانەکەی بە بازاڕەکە وەرکردبوو. بۆن و بەرامەیەکی خۆش، تازە و هەڵماوی و دووکەڵاوی. نانەواکە بە لارە لار دەڕۆیشت و هەر دوو چاویشی قیچ و کوێرەمووشە بوو. شەپقەکەی هەتا سەر چاوەکانی دەکێشا خوارێ. بنیادەمێکی بە دەنگەدەنگ بوو لە بازاڕێ سوعبەت و گاڵتەی بە هەموان دەکرد و خەم و خۆشیی خۆی لەگەڵ هەموان دابەش دەکرد. لەگەڵ هەمووان بەینی خۆش بوو. لەگەڵ منداڵان منداڵ و لەگەڵ گەوران گەورە بوو و لەسەر یەك خۆشەویستی هەموو خەڵکی شارەکە بوو. دوای ئەوەی نانە گەرمەکانی کە دەستیان دەسووتاند، لەسەر سەکۆیەکە دانا و بە کەیفخۆشییەوە سەیری نانە برژاوەکانی کرد، لە دووکانەکەی هاتە دەرێ. هەموو ڕۆژێ بەیانی دوای ئەوەی نانەکانی لەسەر سەکۆیەکە و لەسەر قەفەزەکانی قەراغەوە هەڵدەچنی، خولێکی بە بازاڕەکەدا لێ دەدا و لەبەر دەرگای هەر دووکانێك یەك دوو خولەکێك رادەوەستا و تۆزێك قەشمەریی دەکرد و پێدەکەنی و خەڵکەکەی دەخستە پێکەنین و ئەوجار دەگەڕایەوە دووکانەکەی و دەستی دەکرد بە نان فرۆشتن. بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ ترِی بزن بەشەڕ دەهات. نێوچاوانی تێك نابوو و یەك پشوو دەیبۆڵاند و لە بن لێوانەوە جنێوی دەدا. جاری واش بوو دەنگی وا هەڵدێنا لەو سەری بازاڕەکەوە گوێت لێ دەبوو و دەتگوت بۆیە وادەکا دەیەوێ بڵێ خەسوو لەگەڵ تۆمە بووکێ گوێت لێ بێ.

یەکەم تیرێژەکانی خۆر ڕووناکایی دەخستە سەر بازاڕەکە، کە نوقمی دەنگی تەقەتەق و خرم هۆڕی کرانەوەی دووکانەکان بوو. چیای دوڵدوڵ کە زستانان یەکسەر بە بەفر داپۆشراوە و

هاوینانیش سپی دەچێتەوە، لە سەرووی هەموو ئەو چیا ڕەنگ بزرکاوانەی لە دوور دوورەوە بەشوێن یەکتریدا ریز بوون و تا دوورتر دەکەونەوە کاڵتر دیار دەبن و لە ڕەنگە خۆڵەمێشییەکەی ئاسماندا لە چاوان نەدیو دەبن و لەگەڵی تێکەڵ دەبن، سەری قوت کردووەتەوە. ئێستا، چیاکە لە تاڤگەی رووناکایی بەیانیدا خۆی تیف تیفەداوە و ئەوەندە نزیك دیارە

هەر دەڵێی دەستی بۆ بەری دەستت وەبنارەکەی دەکەوێ. شیو و دۆڵ و ڕەوەزز و سێبەرەکانی جوان جوان دەبینرێن. هەندێکیان ڕەش دەچنەوە و هەندێکیان سوور و هەندێکیشیان سپی. ئەو و چیایە بە هەموو جۆرە ڕەنگەکانییەوە سەری لە ئاسمانێ دەسوێ و هەر دەڵێی بەرەو دەشتەکە کشا و لەوێ قۆناغی گرتووە. چیای دوڵدوڵ کە سوورێکی ماتی مسیی دەنوێنێ، لە دەشتەکە جوێ ناکرێتەوە و وێناچێ لێشی جوێ بێ. بەرەبەری ئێوارێ کە بای ڕۆژاوا هەڵدەکا و هەورە سپییە بەرز و ئاوساوەکان لەگەڵ سێبەرە تارەکانیان بەرەو چیاکە رادەدا و هەورە ئاوساو و هەڵکشاوە بەربلاوەکان، روون دەبنەوە و لە سەرووی چیاکانەوە و لە بناری چیای دوڵدوڵ دادەمرکێنەوە... چیای دوڵدوڵ دوای مانگی گەلاوێژ، رووت و کەچەڵ و بێ هەور دەکەوێتەوە و وەك زەڕەنەقووتەیەکی لێ دێ کە هێشتا پەڕ و پۆی دەرنەکردووە.

بازاڕەکەی شار لەو بەردانە دروست کرابوون کە لەدرێژایی سەدان ساڵدا و لەبەر لووزەوی ئاو خلۆر ببوونەوە و سوابوون و لووس و لێك و لەبار ببوون و هەر یەکەشیان هێندەی سەلکی سەری پیاوێك دەبوون. ئەو وەستاکارەی شەقام و شۆستەکانی بازاڕەکەی ئاوا بە جوانی و بە سەلیقەوە دروست کردووە و بەردەچنی تەختی شۆستەکەشی ئاوا شارەزایانە داناوە، لەوانەیە پیاوێکی کەڵەگەتی لێوبەبزە بووبێ و قامکەکانی درێژ و بلێی نەڵێی پشتیشی لەوانەیە تۆزێك کووڕ بووبێ. بەڵام گومانی تێدا نییە پیاوێك بووە چاوڕەش و خەفەتبار و بەردەوام لە بن لێوانەوە ورتەی هاتووە و گۆرانیی گوتووە. ئەگەر ورد لێت روانیبایە، دەتدی کە بە لەپەنا یەکتردانانی خاڵە سوور و شین و ڕەش و مۆر و کەسکەکان لە نێو بەردە سپییەکاندا گوڵ و دەوەنی نەخشاندووە. دیارە کابرایەك بوو لێو بە پێکەنین و لەگەڵ هەر پێکەنینێکی دڵاوایییانەدا ددانە سپییە سەدەفییەکانی دەرخستوون و هەر کاتێك گرێیەك کەوتووەتە بەر کارەکەی، وەك شێتان تووڕە بووە. لەوانەشە لەو شارەدا ئەوە بەبیری کەس نەبێ. ئەگەر ئەو وەستاکارە زۆر ژیابایە و کەسانێکی پەروەردە کردبایە کە وەك خۆی نەرم و نیان بوایەن وەك خۆی شێتانە تووڕە بوایەن و پڕ بە زاریان پێکەنیبایەن، بازاڕەکان و مەیدان و کۆڵانەکانی ئەو شارە و هەموو شارەکان ئاوا بە بەردی لێك و لووس و ڕەنگاورەنگ و نەخش و نیگاری جوان دەڕازانەوە،

بە جۆرێك كە پیاو دڵی نەهاتبایە پێیان لەسەر دابنێ. وەستاكارەكە لەگەڵ ئەو تازە پێگەیشتووە نەدی و بدییانەی شار و ئەو بەرپرس و سەرۆكە تازە پێگەیشتووانە چیی پێ دەكرا؟ لەگەڵ ئەو مەیموون سیفەتانە، لەگەڵ ئەوانە كە نامرۆڤانە كە بە چیمەنتۆی رەش و تار و زبر زەوی و ئاسمان دەخنكێنن و شاری بێ رەنگ و مات و وشك و بێ گیان هەڵدەچنن، چیی پێ دەكرا؟ چیی پێ دەكرا لەگەڵ ئەو لاساییكەرەوە مەخسەرە و بێ دایك و باوكانەی كە بۆنی مرۆڤایەتییان بەسەردا نەهاتووە و نە بەكەیف دێن و نە گۆرانییەك دەچڕن و نە كتێبێك دەخوێننەوە و نە دەنووسن و نە گوێ لە مۆسیقایەكی رەسەن و گۆرانییەكی خۆماڵی دەگرن و نە تەنانەت فیتوویەك لێ دەدەن و هەر هەوڵ دەدەن ببنە شتێك لەو دیوی ئەو شتەی وا رەگ و پنجی خۆیانی تێدایە بێزارن لە خۆیان و لە منداڵیان و لە هەرشتێكی كە خۆماڵییە و بێگانە نییە؟ دڵنیام هەموو هەوڵی خۆی دەدا و چیی لەدەستی هاتبایە دەیكرد بۆ ئەوەی قایلیان بكا ئیزنی بدەن، لانیكەم كۆڵانێك لەسەر گیرفانی خۆی بەردەچن بكات. نە ئەو مامۆستا دەسترەنگینە ماوە و نە شاگردەكانیشی... هەر بۆیە ئەو شار و شارۆچكانەی ئێستا مردوون. بۆگەنیان دێ. چیمەنتۆ و كۆنكرێت و خشتن و هیچ هونەرێكیان تێدا نییە و هەموو لەیەك دەچن. دەكرێ چاوەڕوانیی چ شتێكت هەبێ لەو دەوڵەمەندە شارییانەی كە لەگەڵ كێبڕكێیەكی پیس تێكەوتوون و هەرچی جوان و هیوابەخش بێ پێشێل و پێخوستی دەكەن و چاوی یەكتری دەردێنن و بەرتیل دەدەن و پیاو دەكوژن و درۆزنن و خۆپەرستن و شەوێ هەتا بەیانی لە ریستوڕانتە پیسەكاندا دەخۆنەوە و خۆهەڵدەكێشن و بەخۆیان هەڵدەڵێن و هێزی شان و باهۆی خۆیان پێشانی كیژۆڵە چارەڕەش و لێقەوماو و خەمبار و وەڕەزەكانی نێو باڕ و دیسكۆكان دەدەن و دەمانچە رادەكێشن و ژن و گراوی و خۆشەویستەكانی خۆیان دەخەڵەتێنن و گەورە و بچووك و ژن و كچ و باوك و كوڕیان قومار دەكەن و دەدۆڕێنن و هەمووانیش بەچاوی سووك سەیر دەكەن... دەكرێ چاوەڕوانیی ئەوەت لەو شێتە لەخۆنامۆیانە هەبێ وەستایەكی دەسرەنگین و هونەرمەند لەبیر نەكەن و رێز لە شاگردەكانی بگرن و چێژی جوانیی رەسەن و خۆماڵی، راگرن و نەیفەوتێنن؟ ئەو مەیموونە تازە پێگەیشتوو و سووك و چرووكانە، ئەو وەستاكارەیان دەكوشت، هەر ئەو وەستا دەسرەنگینەی ناو و نیشان و بیرەوەرییەكیشی لێ بەجێ نەماوە، لەبەر ئەوەی پێداگر دەبوو لەسەر پاراستنی جوانی و زەریفی و بە بیانووی ئەوەی كە شۆرەتی "سۆوی ئەسلان تورك"ـی لەسەر خۆی دانەدەنا و خاكەڕایانە دەیگوت كاكە من شۆرەتم بۆ چییە؟ كاتێ زۆرییان لێ دەكرد كە بەڵێ بەپێی قانوون ناچاری شۆرەتت هەبێ و ئەو

بەناچاری ملی کەچ دەکرد و دەیگوت با شۆڕەتەکەم تاشچی ئۆغلی "کوچك زادە" بێ لەبەر ئەوەی هەر لە کۆن و دێرزەمانەوە بەو ناوە دەماننناسن، لەبەر ئەوە دەیانکوشت. لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە کوشتبێتیان. ئەو مەخلووقانە، ئەو لاسارانە، ئەو شێتانە، ئەو بێ مێشکانە، ئەو بەگ و ئاغا پیاوکوژانەی چاویان لە ژێللا هاتووە، هەرچی جوان و مرۆیی بێ لەناوی دەبەن و ئاسەوارەکەی دەفەوتێنن. خۆڕاگری و بەربەرەکانێش بێ سوودە. بەڕە و مافوور و گۆرانییە رەسەنەکان و هزر و دڵ و گریان و پێکەنین و شادی و خۆشەویستی و ئەسپ دەکوژن. پارە و دراوەکەیان و تەلار و بنیا چەند نهۆمییە زبر و چڵکنەکانیان کە لە تەنیشت رووبارە جوانەکەی شاری بەرزیان کردوونەتەوە، وەك خۆیان سەیر و سەمەرەن، زیندوو دەمێننەوە. ئەوانە مرۆڤایەتی سەرلەبەر دەکوژن. هونەری دەستی و نەخش و نیگارە جوانەکانی وەستا لەبیرکراوە زویر و شکست خواردووەکە لە گۆشەیەك دەمێننەوە.

ئەی چ لە بەردەکانی ئەو بازاڕە دەکەن...

دار چنارەکان سێبەر دەخە سەر ئەو کانیاوەی لەو سەری بازاڕەکەوە هەڵدەقوڵێ. ئەو چنارانەی لك و پۆ بڵاوەکانیان گۆڕەپانێکی گەورەیان داگرتووە... ئەو چنارانەی ئەگەر سێ پیاو باوەشیان پێدابکەن دەستیان ناگاتەوە یەکتری. لەو سەری بازاڕەکەش کۆمەڵێك چناری چڕ سەر لە ئاسمانێ دەسوون. مێشەکەرانەی زەرد و زەردەواڵەی خاڵدار و مێشەنگوین لە سەر ئەو توێکڵە شووتییانە دەنیشن و هەڵدەفڕنەوە کە لە شۆستە چۆڵەکانی بازاڕەکەدا کەوتوون. زەردەواڵە و پووش بە قوونەی نێوقەد باریك و رەش لە نێوەڕاستی بازاڕەکە و لە سەر عەرزە هەر دەڵێی بۆن بە بەردەچنەکەی شۆستەکەوە دەکەن، هەڵدەفڕن و دەخولێنەوە. بە ئازادی و بەبێ ئەوەی سڵ بکەنەوە لە رێبوارەکان لە سەر توێکڵە شووتییەکان و لە سەر بەردەکان و لە گوڵە لیمۆ و چڵ و گەڵاکان دەنیشنەوە. سیسرکەی نێو چنارەکان لە نیوەڕۆیەدا بێدەنگ دەبن و لە دەمی ئێوارێ یەك پشوو دەزیکێنن. باڵندەکانیش بە گۆرانی و جیکە جیك لە نێو چڵ و پۆپی چنارەکان دەیکەنە هەڵلا.

ئەو چنارانەش دەبڕنەوە. کێ؟ ئەو هەتیوە نەزانە خۆپەستە مەیموونە جاشکەکەرە، ئەو سەگبابە مارزبابە، حاجی قۆرت بۆغا کە سەردەمانێك سەرۆکی شارەوانی بوو و دوایی بوو بە نوێنەری پەرلەمان. دەیبڕێتەوە، دەیبڕێتەوە، ئەو چنارانەش دەبڕێتەوە.

پووشکە بەقوونەیەك هات و لە سەر شانەکانی نانەواکە نیشتەوە و جووڵەی نەکرد. وەستای عارەبانەساز لەوبەری چنارەکەوە و لە دەم جۆگەئاوەکە، ئاسنێکی دەکوتایەوە. ئاسنە

سوورەوەکراوەکەی بە گازێکی گەورەکەی هێندەی دوو باسك درێژ بوو، گرتبوو و لە ئاوەکەی ڕۆدەکرد و دەنگی چزەچزەکەی و هالاوی ئاوەکە هەڵدەستا. عارەبانەسازەکە پیرەمێردێکی ریش چەرمووی کەڵەگەتی سەر ڕووتاوە و سوورهوولی و دەموچاو چرچن بوو. پشتوێنە سوورەکەی وەك هەمیشە بە جوانی بەستبوو.

نانەواکە گوتی:"کار لە کارێ ترازا. ئاخرییەکەی ئەوەی دەیانویست کردیان. وەجاغیان کوێر کردینەوە. چما پێم نەگوتی بەگەکان دوور دەخەنەوە، مەهاجرە پیر؟ داواکاری گشتی قایل بووە."

عارەبانە سازەکە بەر لەوەی ئاسنەواڵەکە لە ئاوەکە دەربێنێ و بەر لەوەی دەنگی چزەچز و هالاوەکەی بنیشێتەوە، گوتی:"شتی وا نابێ. خۆ شاری بێ دەرِوازە نییە، هە کەس چیی ویستی بیکا. ئێمە گوتمان نیشتمان و زێدی دایکمانە، با بچینەوە باوەشی دایکی نیشتمان. دەی وەرە بزانە تووشی چ رۆژە رەشییەکیان کردین... کێ گوتی؟"

"جا دەتویست کێ بیڵێ؟ عالەم و ئادەم دەزانێ."

عارەبەسازەکە ئاسنەواڵەکەی لە ئاوەکە دەرهێنا و لە تەنیشت سندانەکەی دانا. بازنەی ژەنگگرتوو و لەتە چەرخی شکاو و تۆپەی چەرخان، ماڵبەند و نیر و ئاموور و رێشمە و هەوسار و شۆرتکە و یەك دوو کۆنە پەیتوون و عارەبانە و پێچ و مۆرە لێرە و لەوێ لە سەر کۆگای خۆڵەمێش و خەڵووزە نیوەسووتەکە کەوتبوون. دەوەنێکی سەوزی دڕکاوی کە گوڵە دڕکاوییەکانی مۆر و مەیلەو پەمەیی بوون، لە نێو کۆگایەکی خۆڵەمێش سەری هێنابووە دەرێ.

عارەبانەسازەکە دەستەکانی لەبەر پشتوێنی نا و گوتی:"رۆژێك دێ ئەو شارە وێران دەبێ. ئێمە گوتمان دایکی نیشتمان و زێدی خۆمانە و هاتینەوە و دەبینین چ دایکەنیشتمانێك. نیشتمانی دایك زۆر وەحشییە... ئاغاکان زۆر وەحشین. لەوێ چ باس نەبوو... شتی وا هەر نەبوو. یەك پشوو دەکوژن و دەکوژن و قەت لەو کوشتنە ماندوو نابن... کارێکی دیکە نییە، هەوڵ و تێکۆشانێك لەگۆرِێ نییە... دەمانچە رادەکێشن، تەق، تەق... نە بەرەو حەوا، نەك لە لاق و پل، رێك بە گلێنەی یەکترییەوە دەنێن... نیشتمان و زێدەکەمان زۆر وەحشییە.... با بکوژن و دوور بخەنەوە... با بزانین... ئەتۆ نانی خۆت بکە. نانە گەرم و برژاوەکەی خۆت بکە و خۆت تێکەڵی ئەو مەسەلانە مەکە... تەق، تەق.. نا، لێیانگەرِێ یەکتری بکوژن..."

ئاسنەواڵەکەی خستەوە نێو کوورەکەی و ئاگرەکەی خۆش کردەوە.

نانەواکە گوتی:"هۆی مهاجرە شێت، ئەوە دەڵێی چی؟ کورە بەگەکانمان دوور دەخەنەوە. گوڵە بێ گەردەکانمان لێ دەستێنن. هیچ دەزانی ئەگەر بەگەکان برۆن، ئەو ئاغا تازە پێگەیشتووانە چمان بەسەر دێنن؟ بەو گیانە شیرینەت وامان لە کۆت و نیر دەکەن هەر مەپرسە. ئەتۆش دەڵێی خۆم تێکەڵی ئەو مەسەلانە نەکەم؟ لە تەقە بترسم و فزەم لێوە نەیە، ها؟"

وەستا سەری هەڵێنا و گوتی:"ئەوان خۆ کاری دیکەیان نییە. هەر تەقەیە و هیچی دیکە، تەق، تەق..."

ئاسنەواڵەکەی لە کوورەکە دەرهێنایەوە و لەسەر سندانەکەی دانایەوە و دەستی کردەوە بە کوتانی. پزیسکی سوورەوەبوو لە ئاسنەکە بوونەوە و کەوانەیان کرد. دەنگی کوتکەکەی، کە باسکە بەهێزەکانی هەڵیاندێنا و دایاندەهێنایەوە، لەوبەری بازارەکەوە دەبیسرا:"ئەگەر دەمزانی ئەو وەحشیگەرییە لێرە هەیە، چما کەر بووم بێمەوە..."

جارچییە پشتکوورەکە بەرەو نانەواییەکە هات و بە دەنگە ماندووەکەی کە لە پاڕانەوە دەچوو، گوتی:"خۆ بیستت؟ بیستت چ بوو؟"

بەژنە کورتەکەی ئەوەندەی دیکە کورت ببۆوە و پشتە کووڕەکەی پتر دەرپەڕیبوو. گۆشەی چاوەکەی گۆمیلکەی بەستبوو و وەك منداڵێکی هەلامەتی گرتبێ، چلمی هەڵدەلووشییەوە. بە دەم پرمەی گریانەوە گوتی:"ئەمن چ خۆڵێك وەسەر خۆم بکەم؟ قۆرت بۆغای ناپاك... بێ شەرەف... قاتڵی هەشتا بنەماڵە. چما هەر ئەو نەبوو هەر هەموویانی کوشت و فڕێی دانە نێو زۆنگاوەکەی ئاقچاسازەوە و شرت و گومی کردن؟ ئەمنیش ئێستا، ئەمنیش ئێستا... تەلەفۆن دەکەم بۆ عیسمەت پاشا و فەوزی پاشا و دەڵێم ئەو گەوادە هەشتا ژنی داماوی بە یەك رۆژ سەر بڕی.

وای دانێین ئەو تاوانەی لە رابردووشدا کردووە، بەڵام چما لەو شارەدا کەس دەست ناکەوێ ئاگای لە چۆنێتیی ئەو تاوانە بووبێ؟ ئەمن ئێستا خۆڵی کوێ وەسەرخۆم بکەم؟ ئەوە بیستساڵی رەبەقە ئاردەکەم دەروێش بەگ دەیدا و رۆنەکەم مستەفا بەگ... ئەمن لێرە چ داهاتێکم هەیە؟ دەروێش بەگ هەر کات رێی دەکەوێتە ئەو شارۆچکەیە، دراوێکی بیست و پێنج لیرەییم لە گیرفان دەنێ. بەڵام ئەمن لە بەرانبەردا چ خزمەتێکم بەو کردووە؟ هەر ئەوەندەیە کاتێکی دێتە شاری، گورج را دەکەم و هەوساری ئەسپەکەی دەگرم و دەیبەمە کاروانسەرا. یان مستەفا بەگ هەموو جێژنی قوربانان مەڕێکم بۆ دەنێرێتە ماڵێ. ئەمن چ خزمەتێکم بەو کردووە؟

هیچ... هەر ئەوەندەیە بە دەنگێکی بەرز هەرا دەکەم دوژمنت چاوی کوێر بێ بەگ. ئەمن ئێستا خۆڵی کوێ وەسەر خۆم بکەم؟ سکاڵا دەکەم، سکاڵا دەکەم."

دەیگوت و بە کڕووزانەوەو تووڕەییەوە پاتەی دەکردەوە:"کوشتنی هەشتا ژن..."

نانکەرەکە تۆزێك سڵەمییەوە و ئامۆژگاریی کرد:"خۆت شێت مەکە جارچی، کوڕم، خۆت کەر مەکە... کێ دەڵێ ئەو ژنەکانی خۆی کوشتووە؟ ئەو ژنەکانی نەکوشت، ئەوانی لە گوندەکە وەدەر نا و دووری خستنەوە. بە سەرەنێزەی ژەندەرمەکان. مەنەڕێنە، تووشی کێشە و گێچەڵمان مەکە."

جاڕچی نەڕاندی:"باشە، باشە، لێیان گەڕێ با بەگەکانمان دوور خەنەوە، جا ئەمنیش دەزانم چ بەڵایەکیان بەسەر دێنم."

جاڕچییە کووڕەکە، دووکان بە دووکان دەگەڕا و ئەو قسانەی دەگوتەوە. چەندی پتر دەگەڕا، تووڕەتر دەبوو و پتر هەڵدەچوو و بەرزتر دەیگوڕاند.

لەو نێوەدا، قوماشفرۆش و پینەچی و دارتاش هەموو بە ترس و بەپارێزەوە دەیانگوت:"بێدەنگ بە براله، بێدەنگ. چما لە گیانی خۆت وەڕەز بووی؟ کوڕە ئەوانە لە هیچ تاوانێك ناپرینگێنەوە..."

"بەڵێ لە گیانی خۆم وەڕەز بوومە. لەماڵەکەم وەڕەز بووم. ئەگەر بەگەکانمان دوور بخەنەوە ئەمن لە برسان دەمرم. ئەگەر بەگەکانمان دوور بخەنەوە، شارەکەمان کاول دەبێ... ئێوە بڵێن ئەی میللەت، ئەی خەڵکی شارۆچکەکە، ئاخر جاڕچییەکی لە من باشتر پەیدا دەبێ؟ کاتێ جاڕ دەکێشم، دەنگم وەك دەنگی داوود زایەڵەی دێ و دڵەکان نەرم دەکات و کار دەکاتە سەر بەرد و ئاسنیش. کە بانگ دەدەم، ئەو مورتەدەی لە حەوت دینان وەرگەڕاوە، دەگەڕێتەوە و دەبێتە موسوڵمان... تۆخوا من حەیف نیم؟ چما ئەمن لێقەوماو نیم؟ ئێستا خۆڵی کوێ وەسەر خۆم بکەم؟ دوو کوڕم دەخوێنن هەر دووکیشیان لە ئەدەنە، لە دواناوەندین. دەڵێم با بخوێنن و وەك خۆم ماڵوێران و چارەڕەش نەبن و حەوجێیان بە خەڵکی نەبێ و نیری یەخسیریی ئاغاکانیان لە ئەستۆیدا نەبێ. ئەتۆ بفەرموو ئاغای سەراج، ئەتۆ بڵێ ئاغای من، ئەمن ئێستا خۆڵی کوێ وەسەر خۆم بکەم؟"

دووکانەکەی سەراج رووبەڕووی کاولاشی ئەرمەنییەکان بوو. بە سەدان پەڕەسێلکە بەلەز سەریان بە کاولاشەکاندا دەکرد و تێکەڵی ئەو (دلدلیچە) بەجیك و فیکانە دەبوون. دلدلیچە تۆزێك لە پەڕەسێلکە گەورەترن و خۆڵەمێشین و دەندووك و باڵەکانیان رەشن.

هێلانەی ڕەوەیەك لەو مەلانە لە کونێکی بن بانیژەکەی دووکانەکۆنەکەی سەراجدا بوو و سەراج زۆری ئەو باڵندانە خۆش دەویست.

"هەقتە براکەم جاڕچی. هەقتە. هێندەی زەوی و ئاسمان هەقتە. لە کۆن کۆنەوە هەر وا بووە و هەر واش دەبێ کە بەگەکان لە کوێیەك بار بکەن و بڕۆن، ئیتر جوتیاری لەوێ نامێنێ. ئەگەر بەگەکان لە شاری دوو بجەنەوە، ئەم شارە بێ ئەملاوئەولا کاول دەبێ. دەمرێ. شارۆچکەکە دەکەوێتە دەست تازەپێگەیشتووان و نەدی و بدییان و پارەپەرستان و ئەوانەی سواری ئەسپ نابن و خەڵك بەلایانەوە لە دراوێکی سووتاو بێ نرخترن. ئەدی بەوانەی کە سواری ئەسپ نابن، سواری ئەسپ نابن..."

سەراج خەڵکی ماراش بوو. لەو کاتەوە کە باپیرەی لە ماراشەوە هاتبوو، زینی گوڵدۆزیکراوی تورکمانی و زیوکفتی چەرکەزییانەی بۆ بەگەکانی چوکووراوا دووریبوو. زین و جل و کورتانی لبادیی ئەسپەکانیشی زێڕکفت دەکرد. زینێکی زێڕکفت گوڵدۆزیکراو کە لە باپیرەیەوە بە میرات بۆی مابووەوە وەك ئەستێرەیەك لە سەر دیوارە داڕزیوەکەی دووکانەکە و بەسەر تەختە ڕەشکراوەکانەوە دەدرەوشایەوە. سەراج هەموو بەیانیان لە بەر ئەو زینەدا کڕنۆشی دەبرد و دەستی بەرز دەکردەوە و دەپاڕایەوە. ئەگەر پیشەیەك جوان و دەگمەن بوایە، لەبەر ئەوەی ئەو سپڵانە پشتگوێیان دەخست، وردە وردە تێدا دەچوو، وەستای ئەو پیشەیە هەقی بوو لە هەمبەر ئەو پیشە بەرەو نەمانەی خۆیدا دەست بکاتە ڕاز و نیاز. جا ئەوە واجبیشە، حوکمی قورئانیشە...

هەر دەڕۆن. هەر ئەو دوو پیاوماقووڵەش مابوون، ئەوانیش دەڕۆن. با پارەپەرستان هەر چەقەنە لێدەن و خەنی بن. ئەوە ئێستا لە نێو ئەو درۆزنە بێ غیرەت و بێ ڕەگانەدا هەر دوو پیاو مابوون، دوو پیاو کە بلێی و نەلێی قەدر و نرخی ڕاستەقینەی زین و کۆپان و کورتان و ئەسپ و گولێنگ باش دەزانن و سواری ئەسپە ڕەسەنەکان دەبن، خەریکن دەڕۆن. هەر ئەوان مابوون، کە دەیانزانی ئەسپ و زین یانی چی... هەر ئەوان. دوای ڕۆیشتنی ئەوان دەبێ ئەو چەقۆیە و هەسان و دەرزییەکە لە تەنیشت ئەو زینە هەڵواسم و هەتا دەمرم لە بەرانبەریان، لە بەرانبەر ئەوانەدا کە جوانییان بەو دنیایە بەخشیوە، دەست بکەمە ڕاز و نیاز.

ئارەقە، دڵۆپ دڵۆپ و درشت، کەوتبووە سەر نێوچاوانە پان و پڕ لە چرچ و لۆچەکەی سەراج. سمێڵە شۆڕ و ماش و برنجییەکەی و ملە درێژ و پەنجە ڕەش و گرێ گرێیە هونەرمەندەکانیشی ئارەقەیان کردبوو.

وەك کەسێکی لەخەوێ راپەڕیبێ، وەخۆ هاتەوە. لەسەر شۆستەکە، لە تەنیشت توێکڵە شووتییەك، لکی گوڵێکی پێنج پەڕیان فڕێ دابوو کە گوڵێکی مۆری بەسەرەوە پشکووتبوو. سێ پووشکەبەقوونە لە بن ئەو لقەوە نیشتبوون و هەر دەتگوت هانکەهانکیانە و نێوقەدە درێژ و باڵە روونەکانیان هەڵبەز و دابەزیان دەکرد.

بە نارەحەتییەوە گوتی:"ناکرێ. نابێ ئەو کارە سەر بگرێ. دەڵێن هەموو شتێك بە دەست پیرە قازییەکە بووە."

جارچی:"بەدەست ئەو بووە. ئەو زاوای ساوورانەکانە و ساوورانەکانیش دوژمنی بەگەکانمانن."

سەراج:"باشە. بەڵام ئەمن لەو ئارەخەیان و دڵنیام. باشە هەر بەو گەوادانە چی؟ ئەگەر دەشکوژن، لەخۆیان دەکوژن، بەخەڵکی چی؟ سەد ساڵە، دووسەد ساڵە یەکتری دەکوژن. بە خەڵکی چی. گیانی خۆیانە و بۆخۆیان دەزانن چیی لێ دەکەن. وا نییە؟"

کوورە:"ئاقچاساز وشك دەبێ و موڵکی بەگەکانیش خۆ نیوەی دەوروبەری ئاقچاسازی داگرتووە. دەیانەوێ ئەوانە دووربخەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن دەست بەسەر هەموو ئاقچاساز و موڵکی بەگەکاندا بگرن و هەر بەڵایەکی هات، بەسەر من هات." و فرمێك لە چاوە قووڵەکانیدا گۆمیلکەی بەست و قوڵپەی گریان، شانەکانی و پشتە کوورەکەی هەڵبەزاندەوە.

سەراج بە دەنگێکی خەمبار و کپەوە گوتی:"دەبێ شتێك بکەین. ئاخۆ کارێکمان لە دەست دێ؟"

جارچی لەسەر چرپاکەی تەنیشت هەیوانەکەی سەراج کرووشمەی کردبوو و گرمۆڵە ببوو.

"ئەوە ساڵێکە نەمتوانیوە کارێك بکەم. هیچ کارێکی شیاوی گوتن بێ، وەدەستم نەکەوتووە. ئەگەر بەگەکانیش کە هەر کامەیان شەش سەر ئەسپی عەرەبییان هەیە، لێرە بڕۆن و ئەو بێ رەچەڵەك و خوانەناس و بێ ویژدانانە، ئەو بێ نامووسانەی بە چوار مەزەبان خوێنیان حەڵاڵە، جێیان بگرنەوە، ئیتر من تێدا دەچم. ئەسپە عەرەبییەکان نەمان. بەگەکان نەمان... ئەو دووانەی ئاخری... چما ئەوانە شێتن؟ ئەگەر ئەوان یەکترییان نەکوشتبایە و کارەکە تەواو بوایە، باشە چ دەبوو؟..."

بێ دەنگ بوو و دیسان نوقمی خەیاڵەکانی بوو و سمێڵە ماش و برنجییە درێژەکانی شۆڕتر بوونەوە.

"ئاخرییەکەی ڕۆژێکیان یەکتری هەر دەکوژن. هیچ چار نییە. نەریتی کۆنی بەگایەتی هەر وایە و جگە لەوە نەبووە و ناشبێ. ئەگەر بەگێك تۆڵەی کردەوە، هەتا کۆتاییەکەی هەر بەردەوام دەبێ... ئەگینا لە مردووەك بەولاوە نییە. بنیادەم بە شانازی و شەرەفییەوە دەژییێ."

سەراج سەری لەقاند:"وایە. هەقتە براکەم."

ئەو ئەسپە عارەبی و خۆشبەز و قوتانەی لە ئۆرفە و عەرەبستانەوە هێنرابوون. دڵت نایە تێر بە چاوان سەیریان بکەی. هەر دەڵێی باڵیان هەیە و سواری با بوون. ماینی پەل کورتی نێوقەد باریکی چوکووراوا لە ڕەگەزی ئەسپی عەرەبین. ئەوانە هەر لە کۆنەوە جوانی و خشڵی چوکووراوا بوونە. ئەسپێکی عەرەبی کە رادەکا کەس لاق و سمی نابینێ و هەر دەڵێی زگی لە عەرزەکە دەخشکێ. تەنانەت لە بنیادەمیش زیرەکتر، دۆستی... ئەو زینە هەتا ئەو کاتەی سەراج سمێڵ شۆڕ نەمرێ، هەر وا بەو دیوارەوە دەدرەوشێتەوە. وەك باخچەیەکی گەش و جوان. سەراج هەموو بەیانیان بە ڕێز و حورمەتی باپیرانی و جوانی و زەریفی و خۆشەویستیی هونەری هەزاران ساڵەیان کە بەرەو نەمان دەچێ، ئەژنۆی چەپەی لەسەر عەرزی دادەدات و دەستی لە سەر دڵی دادەنێ و ڕاز و نیاز دەکا. دواتر، دوای مەرگی سەراج، کوڕە هیچ و پووچ و دەستەوستانەکەی هەر لەوانەیە لەسەر مێزی قومار یان مەشرووب خواردنەوە لە بری پەنجا لیرە بیدۆڕێنێ یان بە گەنجێکی دێهاتیی کە هێشتا تۆزێك جوانپەرستی لە گۆشە و قوژبنی دڵەکەیدا ماوە، یان هێشتا دایکە تەونکەرە مافوورچنەکەی نەمردووە، دەفرۆشێ:"هانێ، ها. لە باوە سەراجمەوە بەمیرات پێم گەیشتووە. ئەگەر پیرە باوکەکەم زیندوو بوایە، بە پێنج هەزاری چی، بە دەهەزاریش نەیدەفرۆشت. هانێ بۆتۆ."

جا بەگەکان لە بەر دەرگای دووکانەکەی ڕیزیان دەبەست و بە نۆرە توورەکە زێڕیان بە وەستا دەدا. وەستاش جوانترین زین و کورتانی بۆ ئەسپی ئەو کەسە دروست دەکرد کە لە ئەسپی هەمووان جوانتر بوو.

"وەستا، وەستا، بڕوانە، ئەوە حەوتووەك نابێ لە حەلەبەوە هێناومە. سەیرکە بزانم پێت باشە؟"

"پێم باشە، باشە."

"جا مادام پێت باشە، دەستێك زین و کورتانیشی بۆ دروست بکە، تا سێ مانگی دی."

"لە شەش مانگ زووتر بۆم ئامادە ناکرێ."

"چما، چما کەیفت بە ئەسپەکە نەهات؟"

"ئەسپێکی جوانە، بەڵام ئیشم زۆرە. ئەسپەکەت جوان نەبوایە، زینەکەی بە ساڵێکیش ئامادە نەدەبوو."

"وەستا، بۆ چوار مانگی دی..."

"مەحاڵە..."

"چەند دەفەرمووی وەستا؟ چەندی بفەرمووی دەتدەمێ..."

"پێنج مانگ، وەتا. پێنج مانگ باشە؟ پێنج مانگ، باشە؟... پێنج مانگ؟"

"باشە، پێنج مانگ. لەبەر خاتری تۆ. هەر لەبەر جوانیی ئەسپەکەت. خێری لێ ببینی."

جا بە چوارناڵە ئەسپەکانیان بە دەشتەکەی چوکووراوادا لینگ دەدا. بەڵام ئێستا نۆکەرە بێ دایك و بابەکان، ئەو سوارچاکانەی سەر ئەو ئەسپانە دوور دەخەنەوە...

چ بوو؟ زولفەقار ئۆغڵی، بایەزیدلی، پایاسلی ئۆغڵی، جان پۆڵاد ئۆغڵی، کوزان ئۆغڵی، چاپان ئۆغڵی، کوچك عەلی ئۆغڵی، جادوئۆغڵی، مونجی ئۆغڵی، مورسەل ئۆغڵی و ... ئەوانە چییان لێ هات؟ ئەوانەی ئەسپیان لینگ دەدا و شمشێریان دەبەست چییان لێ بەسەر هات؟ شێر و مامزە چاو رەشەکان... تۆرەمەیان مایەوە. تۆرەمەیان مایەوە و تۆرەمەکەشیان کەسی وەك حاجی قۆرت بۆغای لێ کەوتەوە. توخم و تۆرەمەیان بوونە دوژمنی ئەسپی عەرەبی و مرۆڤ و دۆست و عێل و عەشیرەت. لە ئاغایەکی پارەپەرست و سوودخۆریش خراپتر دەرچوون. مێبازی دەکەن، لێقەوماوان دەچەوسێننەوە و وەك ئاوخواردنەوە بنیادەم دەکوژن، پارە بە سوود دەدەن و...

جارچی لەسەر خۆ هەستا و لە دووکانەکە وەدەر کەوت. سوودخۆر دەرگای دووکانەکەی دەکردەوە. درێژ و نارێك و کوورِ بوو. چاوەکانی لە چاوی گا دەچوون. ملە درێژەکەی قیت و رەق و تەق... لەگێلی و گەوجێتی، نە لە قوتابخانە و نە لەسەربازی بەزەبری دار و تێهەڵدانیش فێری خوێندن و نووسین نەببوو. دواییش ببووە نایب عەریفی ژەندەرمان و دوای تەواوکردنی سەربازییەکەی، بە ویستی خۆی لە سوپادا مابووەوە و لە ناوچەیەکی کوێستانیی چەپەك و دووری رۆژهەڵاتی وڵات ببووە فەرماندەی بنکەیەك و پێنج ساڵ لەوێ مابۆوەو لەو ماوەیەدا خۆی پێ گەیاندبوون جا چ خۆ پێگەیاندنێکیش....

دایك و بابی نایب عەریف هەژار و دەستکورت بوون. بابی دواتر وازی لە دایکی هێنابوو و دایکەکەش دوای چەند سالان سواڵ و قەرەواشی لە چوکووراوا ئاخرییەکەی لە برسان مردبوو. نایب عەریف هەر هاتبۆوە شاری دەسبەجێ دووکانێکی کردەوە و دەستی کرد بە عەلافی و

کڕین و فرۆشتنی دانەوێڵە. لە هەر کوێیەکی بۆی هەڵکەوتبایە بەخۆی هەڵدەگوت و یەك سەر باسی بەرتیل خۆرییەکانی خۆی دەکرد و ئەوەیکە چۆناوچۆن خوێنی گوندییەکانی مژتووە و هەژار و دەستکورتی کردوون و وای لێ کردوون ناچار بن مریشك و کەڵەباب و بزن و مەڕ و ماڵات و بەرە و راخەرەکەی بن خۆشیان بفرۆشن و لە گیرفانی ئەوی بکەن. نایب عەریف لە سۆنگەی کڕین و فرۆشتنی دانەوێڵەدا وردە وردە وای لێ هات لەگەڵ خەڵکی سەرگەورەی شار وەك قایمەقام و فەرماندە پۆلیس و نوێنەری پەرلەمان و کەسی ئاوا ئاشنا بوو و نێوانی لەگەڵ خۆش کردن و لەگەڵیان کەوتە هاموشۆ و خواردن و خواردنەوە. هەر لە سەربازییەکەیەوە فێر ببوو چۆن خۆ لەو گەورانە نزیك بکاتەوە و هاموشۆیان لەگەڵ دامەزرێنێ. ماوەیەکیش بوو بە ئەندامی حیزبی دیموکراتدا کە بەرهەڵستکاری حیزبی دەسەڵاتدار بوو و خەریك بوو ئەستێرەکەی بەختی هەڵدەکشا. لەو جەنگەیەدا دەستی کرد بە سووت و سەلەم. بۆ هەر سێسەد یان پێنج سەد لیرەیەکی دابووی، لانیکەم هەزار لیرەی بە سوود وەردەگرتەوە و بۆ وێنەی ئەو لۆکەیەی کە هەر کیلۆیەکی لە وەرزی پاییزێدا سێسەد قرۆشی دێنا، لە زستان و بەهارێدا بە سەد قرۆش سەلەمی دەکرد. ئیتر زاری وا شیرن ببوو کە ئیتر لە ماوەی چوار پێنج مانگدا سوودی سێ بەرانبەر لێ وەردەگرت. بۆ وێنە لە مانگی گوڵانەوە هەتا خەرمانان تینوێتییەکەی نەدەشکاندە و چاوی تەماحی پڕ نەدەکرد. سەرمایە و سامانەکەی رۆژ بە رۆژ زیادی دەکرد و گوندییش هەموو دەبوونە کۆیلە و یەخسیر و نۆکەری. لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا زۆری هەوڵ دا. هیچ کام لەو وەرزێرانەی قەرزباری بوون، دەنگیان نەدا بە پاڵێوراوەکانی هیچ حیزبێکی دیکە. نەشیاندەتوانی بیدەن. کە حیزبەکەشی جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت، ئیتر هەموو شتێك گۆڕدرا. نایب عەریف لە رۆژی ٢٤ی گوڵاندا لە سەر رادیۆ خۆی رانا و گوڕاندی و گوتی بژی دیموکراسی. بژی نیشتمان، مەرگ و نەمان بۆ دەرەبەگ و ئاغایەتی. مەرگ و نەمان بۆ حیزبی گەل. ئەو کاتەی لە بیست و هەشتەمی گوڵاندا لە ئەنکەرە چووە لای مەندەرس و جەلال بایار و دەستی گوشین و زاری تەڵەی تەقیو و دڵی پڕ بوو. سەرۆکەکان بە روخسارێکی گەشەوە وەریانگرت و ئەو بە دەنگێکی کە بە حاستەم دەبیسترا، لە بن لێوانەوە گوتی:"سوپاس، سوپاس میللەت نەجاتی بوو، سوپاس کە لەو زوڵمە نەجاتی بوو...

"بانك"ـەکان دوای بیست و چوارەمی گوڵان، پارەیەکی زۆریان خستە بەر دەستی نایب عەریف. ئەگەر نایب عەریف هەتا ئەو کاتە سات و سەودای لەگەڵ شانزە گوند هەبوو، دوای

ئەو ڕێکەوتە، ژمارەی ئەو گوندانەی سات و سەودای لەگەڵ کردنەوە، گەیشتنە سی و نۆ گوند و ئەو بڕە پارەیەش کە بۆ قەرز و سەلەم دەیدانێ، خۆی لە ملوێنان لیرە دا.

ژمارەیەك لەو وەرزێر و جووتیارانەی قەرزیان وەردەگرت، هەر کەسە و لەبەر شتێك، پارە یان دانەوێڵە سەلەمکراوەکەی خۆی لە کاتی دیاریکراودا و هەر لەو ساڵەدا بۆ ساغ نەدەبووەوە کە بیدەنێ. حاسڵات و بەروبووی زەوی و زارەکەیان تەرزە و گلێرەی بەسەردا دەهات یان ئافەت و پەتای دیکە لێی دەدا و... لەو کاتانەدا سوودی قەرزەکە شەش ئەوەندەی دەهاتە سەری و ئەگەر ساڵێکی دیکەش وەدوا کەوتبایە، دوازدە بەرانبەر زیادی دەکرد و واش دەهاتە پێشێ کە گوندی قەرزکەی هەر پێ نەدەدرایەوە.

جا نایب عەریف چیی دەکرد؟ دەبوو پارە و هەقەکەی خۆی هەر وەربگرێتەوە. پێویستیی بە بەڵگە و کاغەز و دادگا و شتی وا نەبوو. نایب عەریف خۆی چەکداری لەبەر دەستدا بوون. قوڕ بەسەر ئەو گوندەی ملی بادابا و قەرزەکەی نەدابایەوە. هەر ئەو شەوە ماڵ و حاڵی لێ دەسووتا و مانگا و مەڕ و ماڵاتی لێ دەکوژرا و جا ئەگەر کچۆڵەی جوانیان بوایە، دەڕفێنرا بۆ کێوی و دەستدرێژیی دەکرایە سەری. هەموو گوندەکان بگرە بە پۆلیس و قایمەقام و دادگاشەوە دەیانزانی ئەو کارانە لەبن سەری کێ دان، بەڵام کەس گوێی نەدەدا بە داد و هاوار و گازندەی جوتیار و وەرزێری لێقەوماو. نایب عەریف جارێکیان نیوەی گوندێکی ئاگر دا و ئەوجار خۆی بەزەیی پێیاندا هاتەوە لە کۆڕی مەشرووب خواردنەوەدا و لە هەنتەش نوێنەرانی پەرلەمان و قایمەقام و دادوەرەکاندا گوتبووی:"زۆرم بەزەیی بەو گوندییانەدا هات. بەڵام چیم لەدەست دەهات؟ چارم نەبوو جگە لە ئاگردان و سووتاندنی گوندەکە. ئەوەم نەکردبایە، زەرەرم دەکرد. بەڵام سووتاندنی گوندەکە چیی لێ کەوتەوە؟ هەر خۆم زیانم وێکەوت. بۆ سبەینێکەی دەست لە گونان درێژتر هاتنە لام و بەربوونە پاڕانەوە. ئاخری خۆم پێ نەگیرا. چۆن دڵم بەرایی دابایە ئەوانە بێ ماڵ و حاڵ و سەرپەنا لەبەر با و باراندا بمێننەوە؟ بەناچاری قەرزم دانێ و ئەوانیش بە دووعای بەخێرەوە ڕۆیشتنەوە و سەر لەنوێ خانووەکانیان دروست کردەوە."

جا دادوەر و قایمەقام و نوێنەرانی پەرلەمان دەڵێن:"ئەتۆ بەبەزیی..."

جا نایب عەریف بە پۆزێکەوە، دەست بە قسان دەکاتەوە:"جا جووتێری تورك زۆر سەیرە. فیداکارە. جوامێرە. ئازایە. لە هەر جێیەك بێ، بە پشت و پەنای ئەو میللەتە دادەنرێ. دەك ئەو گیانە شیرینەمان بە قوربانی بێ. جووتێر و وەرزێری تورك لە نیشتمانی تورك پیرۆزترە. ڕەسەن و ماقووڵ و گوێ لە مستە. تێی هەڵدە و پارووی لە زاری بێنە دەرێ..."

جا نوێنەری پەرلەمان دەڵێن:"بارەقەڵلا، بارەقەڵلا، ئاخۆ ساڵی دووەم توانییان قەرزەکانیان بدەنەوە؟ قەرزە کۆن و تازەکانیان..."

نایب عەریف قاقایەك دەکێشێ و ددانە زێڕەکانی وەدەر دەخا و لە حاڵێکدا ورگی هەڵبەز و دابەز دەکا، دەڵێ:"چما دەتوانن نەیدەنەوە؟ دایانەوە و دیناری ئاخرییشیان دا. لە بەردەم دووکانەکە ریزیان گرتبوو. جا لە پێشدا دەستیان ماچ دەکردم ئەوجار قەرزەکەیان دەدایەوە. وەرزێری تورك زۆر نەجیمە. قارەمان و فیداکارە، نانت بخوا نانت نادرێ. جا پارەشی لێ نابڕێ. هەر خوا بزانێ چەندی پارە هەیە لە پێستی گامێشی ئاخنیوە. وەرزێری تورك دەوڵەمەندترین وەرزێری دنیایە. هەر ئەوەندەیە دەبێ بەردەوام تێی وەژێنی. دەبێ تێی هەڵدەی. زۆر نارێکە. مل کەچ دەکا و دەست دەکات بە پاڕانەوە و نووزانەوە، بەڵام نابێ بڕوای پێ بکەی. نەکا بخەڵەتێی. یەك پشوو تێی هەڵدە و داپەڵۆسە. وەرزێری تورك وەك جەواڵە ئارد وایە. چەندی لێی دەی هەر تۆزی لێ هەڵدەستێ. چەندی تێی هەڵدەی و بیکوتی، هەر تۆزی لێ هەڵدەستێ و تەواو نابێ... هههەهە."

نایب عەریف پەڵە زەوییەکی پێنسەد دۆنمیی لە ئاقچاساز بڕ دابوو و سپی چناری لێ چەقاندبوو. دە ساڵ دواتر دەبووە چنارستانێك و بەملوێنان لیرەی دەکرد. زەویی بێوەژنێکی بێکەس و بێدەریشی کڕیبوو و پارەکەی بە قیست دەدا. بەشی بە سەرمایەی بانکێکی تایبەتیشەوە هەبوو.

نایب عەریفی بێ ئۆقرە و بێ قەرار، لەو سەرەوە بۆ ئەو سەر بەپەلەپەل دووکانەکەی گەز دەکرد و دەیپێوا و جاروبارەش ملێکی دەکێشایە دەرەوە و بە شڵەژاوییەوە سەیرێکی بازاڕەکەی دەکرد و دیسان بە تووڕەییەوە دەگەڕایەوە دووکانەکەی. لە پیاوێکی نێو بۆسە دەچوو.

کە جاڕچییەکە، بەسەری لە قەپیلك خزاندوویەوە بە بەردەم دووکانەکەیدا تێدەپەڕی، نایب عەریف وەك هەڵۆیەکی لە نێچیرەکەی رۆبێ، ئامبازی بوو و ملی گرتو و کێشایە نێو دووکانەکەی و دەنگی وەك تۆپ تەقییەوە:"گەوادی نەگبەت، گەوادی نەگبەت، باش وەچنگم کەوتی. یانی وات لێ هاتووە بە بازاڕێدا بگەڕێی و گووی زیادی بخۆی؟ دەی بخۆ، دەی." بە مستەکۆڵە بەربووە سەروچاوە تێکسمڕاوەکەی کووڕە و لە قوڕگیدا دەیگرماند:"دەتکوژم. دایك سەگ. ئەو بەگە فلان و فیسار لێکراوانەشت دوور دەخەوە، دووریان دەخەمەوە، دووریان دەخەمەوە."

بەهەموو هێزی خۆی جاڕچیی لە عەرزی دا و بە پێلەقە تێی بەربوو. جاڕچییەکە چەند جار خۆی وێك هێنا و لەسەر عەرزی چیمەنتۆی دووکانەکە لاقی راکێشا.

"کوورەی دایك سەگ. گیانت بە قوونتدا دەردەکێشم. وات لێ دەکەم تا تۆ بی، گووی وا نەخۆی لە زارت زیاد بێ."

چەند شەق و پێلەقەی دیکەشی لە پشت و کەلەکەی کوتا و کاتێ تەواو داخ و قینی دڵی خۆی پێ هەڵڕشت و خوێن بەرچاوی بەردا، تازە زانی ئەوە جاڕچییەکە لەسەر عەرزی جووڵەی لێ براوە. ئەمجارە لە روخساریدا شڵەژاوی و نیگەرانی جێی تووڕەییەکەی گرتەوە. رەنگی بەر رووەوە نەما و بەو دەستانەی کە بە ئاشکرایی دەلەرزین، کووڕەی هەڵگێڕایەوە و بە شڵەژاوییەوەی سەیری روخساری کرد. دەموچاوی کووڕە رەنگی مردووانی لێ نیشتبوو. پتر سەری لێ شێوا. بە هەڵپە رایوەشاند. بە سەری پەنجەکانی ئاوی بە دەموچاویدا کرد. سەیرە، سەیرە. دەستی لەسەر مەچەکی دانا بزانێ لێ دەدا یان نا؟ دیار بوو دەمارەکەی هەڵنەداویشت. سەیرە، ئەی لەو بەڵایەی... پیس پێوە بووم. کوڕە خوێنی ئەو کووڕەشم بە ئەستۆوە بوو.:" نا، نا، نابێ شتی وا بقەومێ."

دەنگی نەرم و تێکشکاو و گریاناوی بوو. بە دەوری تەرمەکەدا هەڵدەخولا و زمانچەوریی دەکرد:"مەمرە، مەمرە براکەم. تۆخواکەت هەستەوە. باشە ئەمن چم لێ کردی... من هەر نقورچێکم لێ دای... دەست و پێت ماچ دەکەم... گوووم... برالە... هەستە. برالە. تۆخوا هەستە. ئەگەر تۆ بمری، لە نێوەندی ئەو بازاڕە... خۆ هەموو چاویان لێ بوو... ئاخ، مەمرە تۆخوا مەمرە...."

رەنگی سپی سپی هەڵگەڕابوو و ئازای ئەندامی دەلەرزین و دەست و پێی خۆی پێ زەوت نەدەکرا. دانیشت و سەری جاڕچیی لەسەر رانی دانا:"هەستە برالە. ئاخر من چیم لێ کردی... هەستە برالە. هەستە پیاو. ئەگەر هەستی، نەزر دەکەم گایەك بکەمە خێر. سێ مەڕیش، وەڵڵا بیللا دەیکەمە خێر. سەریان دەبڕم . قوربانی دەکەم. ئەوە چ بەڵایەك بوو بەسەر منت هێنا."

خەڵك کۆ بوونەوە و لە بەر دەرگای دووکانەکە ئاپۆرایان بەست. حەشامەتەکە جار بە جار پتر دەبوو و زەنا زەنا و دەنگەدەنگەش بەرزتر دەبۆوە. نایب عەریف لە دووکانەکەی دەرپەڕییە دەرەوە و بە پاڕانەوە گوتی:" خۆ دیتتان؟ بەچاوی خۆتان دیتتان؟ هەر پێی نایە دووکانەکەمەوە بەعەرزدا کەوت. وەرمسووڕاند و ئاوم بەسەر و چاویدا پژاند. بەڵام دەڵێی پشووی راوەستاوە. نازانم چیی لێ هاتووە."

سەراج چووە پێشەوە و سینگی بە سینگییەوە نا و دەنگی لێ گر کردەوە:"ئەمن شایەتم. خواش لەو سەرە شایەتە ئەو داماوەت بە مست و پێلەقە فلیقاندەوە. کوشتت. بەو چاوانەی خۆم دیتم."

"نەکەی سەراج، سەر هەڵێنە و خوا ببینە براله. پیاوەتیت هەبێ."

لە نەکاو گەش گەش بووەوە و چاوەکانی بریسکەیان دا. وەك شتێکی تازەی وەبیر هاتبێتەوە. وەك لەگەڵ خۆی قسەبکا، لەبن لێوانەوە گوتی:"سەر هەڵێنە و خوای ببینە... خوایەك هەیە... دوکتۆر، دوکتۆریش هەیە."

دەهەزار دەدەی و ئەگەر نەبوو سەد هەزار... ئەوپەڕەکەی نیو ملوێن. چما گیانی پیاوێك بایی چەندەیە؟

ئەوجار دەنگی بەرزتر کردەوە:"لەبەر خاتری پشتکووڕێك کە هاتووە و لە دووکانەکەمدا سەکەت بووە، بوختانم پێ مەکە."

پینەچییە پیرەکە لە سەر جێیەکەی خۆی، جووڵەیەکی کرد و بە دەنگێکی کە لە قووڵایی گەرووییەوە دەهاتە دەرێ گوتی:"ئەمنیش دیتم. چما تۆ نەبووی لە چەقی ئەو بازاڕەوە پشتەملی ئەو جاڕچییە داماوەت وەك کەروێشکێکت گرتبێ، گرت و لەسەر شانتت دانا و بردتە نێو دووکانەکەتەوە؟"

"خوایەك هەیە، دوکتۆر هەیە، بوختان..."

دەنگی نانکەرەکەش هەستا:"ئەمنیش دیتم."

نایب عەریف لەدین دەهری بوو و بە شڵەژاوییەوە چووە ژوور سەری جاڕچییەکە و بن پیلی گرت و بە راکێش راکێش بردییە نێوەڕاستی بازاڕەکە و فڕێی دایە سەر توێکڵە شووتییەکان و مێش و مەگەزەکان.

"من؟ باشە ئەمن ئەو گۆج و نقوستانە داماوە بۆ دەکوژم؟ لەبەر چی؟ چما لە خوای ناترسم؟

دەستە درێژ و نالەبارەکانی بەسەرسووڕمانەوە لێك کردبۆوە و بە زاری کەفکردوو و لێو و لچی شۆڕەوە قسەی دەکرد. خەڵکەکەش هەر وا بێ جووڵە و مات و سەرسووڕماو راوەستابوون.

لە نەکاو پەرجۆیەك رووی دا. خەونێك وەدی هات و کووڕە قیت بۆوە و دانیشت. غەڵبەغەڵب لە حەشامەتەکەوە هەستا. جاڕچی مات و گێژ و وڕ و کار لە نێو توێکڵە شووتی

و وزەوزی مێش و مەگەزەکاندا کەوتبوو و چاوەکانی پڕ بوو لە پرسیار و سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد و یەك بە یەك لە نایب عەریف و خەڵکەکەی دەڕوانی و دەتگوت نازانێ چی بەسەر هاتووە. هەر ئەوەندە وەخۆی هاتەوە و وەبیری هاتەوە چیی لێ قەوماوە، دەرپەڕی و بە نێو خەڵکەکەدا رێچکەیەکی کردەوە و بەرەو خوارووی بازاڕەکە رای کرد و هەتا نەگەیشتە بن دارچنارەکان، ئاوڕیشی نەدایەوە و کە گەیشتە ئەوێ، لە سەر کۆتەرەی ناڵبەندەکە دانیشت. هانکەهانکی بوو و سینگی وەك دەفە لێی دەدا.

نایب عەریف کە کوڕەی لەدەست دەرچووبوو، نەیزانی چ بکا، بۆیە دەمانچەکەی راکێشا و پەلاماری دا:"هۆی گەواد، فێڵباز... دەتکوژم... گاڵتە بە من دەکەی؟ وات لێ هاتووە گاڵتە بە کلکی شێر بکەی؟"

چەند کەسێك پێشی نایب عەریفیان گرت. بەڵام چما دادەکەوت و دەیبڕییەوە؟ خۆ لە دەست نێوبژیوانیکەران رادەپسکاند و چەند هەنگاو چووە پێشەوە و ئاخرییەکەی راوەستا و لە قووڵایی قوڕگییەوە نەڕاندی:"ئەو بەگە خوێنمژانە دوور دەخرێنەوە. دوور دەخرێنەوە. دوور دەخرێنەوە. جا دەشیبینی."

ئەوجار دوای ئەوەی مۆڕەیەکی دیکەی لە جاڕچییەکە کرد، لە حاڵێکدا ددانەکانی لێ چیڕ کردبۆوە، گەڕایەوە و لەخۆبایی و لووتبەرزانە چۆوە نێو دووکانەکەی. جا ئێستا قسەوباسی ئەو کارەی دەگەیشتەوە گوێی جافرئۆز پۆلاد و سلێمان ئاغا و ئەوانی دیکەش و ئەوەندەی دیکە لە لایان گەورەتر دەبێ.

بەڵام شتێك، شتێکی خراپی کە وەك پەڵەیەکی رەش کەوتبووە سەر داوێنی خۆشی و شادییەکەی، ئەوە بوو کە گایەك و سێ سەر مەڕی کردبووە نەزری پشت کووڕێکی مردەلۆخە. باشە ئەگەر مردبایە چ دەبوو؟ ئاخۆ پێت وایە ئاغاکان و دۆست و برادەرەکانی هێشتبایان لەبەر خاتری پشت کووڕێك بخرێتە بەندیخانەوە؟"

بەڵام باشە نەزرێکی کە لەخۆڕایی و لە حاڵەتی نائاساییدا کردوویەتی، لەسەری دەکەوێ؟

"ئەوە نەزر و سوێندەکەمم وەرگرتەوە."

سەری حیزب سلامەت بێ.

جاڕچی کە لەسەر کۆتەرەی ناڵبەندەکە دانیشتبوو، دەموچاوە تێکسمڕاو و بچووکەکەی گرتبووە نێو دەستەکانییەوە. بیری دەکردەوە. چەندی پتریش بیری دەکردەوە، تووڕەتر دەبوو. هەستا و خێرا و بەهەشتاو بەرەو لای کارگەی داربڕینەوەکە رۆیشت کە لە دەم چۆمەکە و لە بن

دار بییەکان بوو. کابرای داربڕ، پیاوێکی نەترس و ملهۆڕ و برادەری خۆی بوو. هەر گەیشتە ئەوێ گوتی:"کوشتمی. نایب عەریفی سوودخۆری بێ شەرەف کوشتمی. دەروێش بەگ و مستەفا بەگ لێرە دوور دەخرێنەوە. باشە هەتا ئێستا دەروێش بەگ چاکەی لەگەڵ تۆ نەکردووە؟ ئەو کاتەی ئەو ئاغا خۆپەرستانە حیسابی سەیەکیشیان بۆ نەدەکردین، ئەو بانگی دەکردینە سەر سفرەکەی خۆی. خۆ لەبیرت نەچووەتەوە براله؟"

داربڕەکە گوتی:"بیستم، بیستم و ئاگریشم تێبەر بوو. بەڵام دەسەڵات چییە؟ ئەوە حوکمەتە ئەوان دوور دەخاتەوە. دادگایە دووریان دەخاتەوە. ئێمە چیمان لەدەست دێ؟ ئەو دەستەی دادوەر بیبڕێتەوە، خوێنی نییە."

پشت کووڕ هەڵچوو و چاوی لە برادەرەکەی زەق کردەوە و بە زویرییەوە گوتی:"سەیرکە، من دەبینی؟ دیتووتە چیم بەسەر هاتووە؟ ئاخۆ دەبوو ئەوا بێ حورمەتی بەمن بکرێ؟ بیست ساڵە ئەمن جاڕی ئەو شارۆچکەیە دەکێشم. ئاخۆ دەستی من دادوەر بڕیوێتی یان نایب عەریف؟"

بۆنی گوڵی "پێنج پەڕ" و گەڵای بی و بنگە و توێکڵە و ئاردەمشاری سنۆبەر تێکەڵ ببوون و دەهاتن.

"ئەو دەستەی دادوەر دەیبڕێ ژانی نییە، بەڵام سەر کە ببڕدرێ، ژانی دەبێ. خەریکن سەرمان دەبڕن. لەو شارەدا هەموو لەتۆ دەترسن... چما ئەتۆ کۆنە یاغی نیی؟ هەر تۆ نەبووی سێ شەوان لەسەر یەك هەتا بەیانی هەر بۆ ئەوەی دڵی جافر ئۆز پۆلاد خۆش بکەی، شارەکەت دایە بە دەسڕێژی تیربار؟ تف لە رووت، و تف لەو گەد و گیپاڵەت، نۆکەر سیفەتی بێ حەیا."

داربڕەکە زاری بوو بە تەڵەی تەقیو و هیچی پێ نەگوترا. نەیدەزانی چ بڵێ و چەند جار تفی زاری قووت دایەوە. ساتێك دواتر بە شوێنیدا، کە خۆی گرمۆڵە کردبوو و پشتی کووڕتر ببۆوە دەڕۆیشت، هەرای کرد:"تێناگا، تێناگا. خۆ ئەو داماوە تێناگا. نازانێ کە ئیتر من کەڵکم بڕاوە و سەردەمی دەرەبەگایەتیش بەسەرچووە. نازانێ کە ئیتر ئێستا هەموو شتێك جافر ئۆز پۆلادە. هەم عێل و عەشیرەت و هەم حوکمەتیش. بەڵێ هەر هەموو شتێك. جافر ئۆز پۆلاد و سلێمان ئەسلانی سۆوی پەنجە.... تێناگا نا تێناگا. ئەگەر ئەو دنیایە پیاوێکی تێدابێ، هەر ئەو پشت کووڕە داماوەیە کە لە هیچ ناگا. ئەو داماوە شرت و گوم دەکەن و منداڵەکانیشی بێ باب دەکەونەوە. ئاخ، حاڵی نابێ."

هەتا پشتکوورِ لەبەر چاوی ون بوو، وەك چۆن لە دواوە سەیری تابووتێك دەكەن، ئاوا سەیری کرد.

تووشی سەرتاشەکە بوو. قەد و قەڵافەتی تەواو وەك جارچی وابوو. چاوی لیّ سوور کردەوە و بەسەریدا نەراندی:"هۆی سەگی پشت کوورِ. ئەتۆ، ئەتۆی سەگباب، لەسەر دەرەبەگان دەکەیەوە؟ ئەوە ئەوان بوون گوویان لەو ولاّتە کرد و وێرانیان کرد و هەژار و داماویان کرد. هەر دەبیّ دوور بخرێنەوە. دەبیّ دەرکرێن بۆ شوێنێکی چەقەڵی لیّ نەژییّ... بۆ ئەوەی هەتا عومرت بیّ ئەتۆش... ئیتر لە پشت سەری ئاغا و گەورەکانی ئێمە و لە پشتەملەی حاجی ئاغامان قسەی قۆرِ نەکەی..."

مووسی دەللاکییەکەی دەرهێنا و بەرەو پشت کوورِ چوو:"راوەستە بزانە هەر بەو مووسە زگت هەڵدەدرِم و ورگ و ریخۆڵەت بەگۆرِیّ وەردەکەم یان نا. برِۆ لەپێش چاوم ون بە. دەی برِۆ ملت بشکێنە. سەگبابی کەر."

پشتکوورِ کە بەو لێوە رەش و مۆرهەڵگەراو و قەڵشیوانەیەوە لە کارگەکە دوور دەکەوتەوە، ترۆمبێلەکەی حاجی قۆرت بۆغای لیّ وەدەرکەوت. ریّ و راست بەرەو لای جارچییەکە دەهات. بێت و خۆی لانەدابایە، ترۆمبێلەکە پانی دەکردەوە.

نەعرەتەیەك هەستا:"راوەستە."

مێشەکەرانەیەکی سوور، زەردەواڵەی خالّ خالّی سوور و زەرد کە کلکیان رەش دەچۆوە، هێندەی دوو پەنجە بەسەر بەردەچنەکەدا دەفرِن و بۆنیان دەکرد و ئەوسەر و ئەوسەری بازارِەکە دەگەرِان. چیای دولّدولّ، بە رەنگێکی پەمەیی روون و کاڵەوە، لەودیو کێو پارەکانەوە سەری قوت دەکردەوە. گەواڵ گەواڵ هەوری سپی بە بنارییەوە کۆ ببوونەوە.

" راوەستە سەگی بەرەڵلاّ، راوەستە."

دەنگەکە لە هەموو بازارِەکە گەرِا. هەموو دووکاندارەکان دەرپەرِینە دەرەوە.

"راوەستە سەگی بەرەڵلاّ، راوەستە."

لە ترۆمبێلەکەی دابەزی و ریّ و راست بەرەو پشتکوورِ چوو. سەیرە. سەیرە. زۆر سەیرە. پشتکوورِ لە بەر حاجی ئاغا کە وەك تارمایییەکی زەبەلاح بەرەو لای دەچوو، رای نەدەکرد. سەیرە، سەیرە. ئەوە پشتکوورِ بۆ وا دەکا؟ سەیرە. سەیرە. خۆ قۆرت بۆغا زانیبایەی وای لیّ دیّ، هەر دانەدەبەزی و خۆی نەدێنایە ریزی ئەو پشتکوورِە هیچ و پووچەوە. بەڵام ئیتر کار لە کاریّ

ترازابوو. بۆیە ناچار بوو بەبێ ئەوەی وەرووی خۆی بێنێ، وەك تۆفانێکی توورەیی، ئامبازی پشتکوور بوو.

پشتکووڕ هەر لەوێ لەسەر جێیەکەی خۆی چەقیبوو و سەیری ئەو پەیکەرە بەهەیبەتەی دەکرد، کە بەرەو لای دەچوو. حاجی قۆرت بۆغا چووە پێشێ و گەیشتە پشتکووڕ. دەستە پان و زلەکەی هەڵێنایەوە و رێك لەوکاتە تەقینەوەی دەنگی پشتکووڕ لە حەوا دەستی پێ راگرت:"دەست راگرە. دەستت وێم کەوێ ورگت دەدڕم."

حەشامەتەکە هەر دەهات و لە دەوریان پتر کۆ دەبوونەوە.

قۆرت بۆغا دەستی شل بۆوە و وەك بالۆنێکی کون کرابێ هێمن و لەسەرخۆ شۆڕ بوونەوە و دەنگێك لە قورگییەوە هەستا:"سەگ."

دەنگی پڕ لە زایەڵەی پشتکووڕ هەموو بازاڕەکەی داگرت:"سەگ باب و باپیرتە."

قۆرت بۆغا ددانی چیڕ کردەوە و گرماندی:"دەتکوژم."

پشتکووڕ دەنگی گڕتر کردەوە:"هیچ گوویەکت پێ ناخورێ. بە باب و باپیرانتەوە هیچ گوویەکتان پێ ناخورێ."

قۆرت بۆغا چاوی لە ژێڵڵا هاتن و پڕی دایە تفەنگەکەی:"نەگبەتی پیس. بێدەنگ دەبی یان..."

پشتکووڕیش گورج ئامبازی بوو و سینگی بە سینگییەوە نا. دەتگوت کەڵەگەتتر بووە. کووڕاییەکەی پشتیشی دەتگوت تواوەتەوە و نەماوە.

ئەوەندە خێرا و بە رقەوە بەرۆکی کراسەکەی کردەوە هەموو دوگمەکانی لێ بوونەوە:"لێم دە، دەی، لێم بدە، ئەگەر پیاوی لێمی بدە. دەمانچە راکێشان چ نییە، گرنگ ترازاندنی پەلەپیتکەیە. ترسنۆکی خوێڕی... ئەگەر پەلەپیتکەی نەترازێنی، دەرپێی ئەو هەشتا ژنەت لەپێدا بێ کە کوشتتن. ئەوە سینگی من، ئەوەش ناقانە* پڕەکەی دەستی تۆ. دەی مکوژە پاڵەوان فس فس. تەواوی بکە دەی گەوادی ترسنۆك. بۆ راوەستاوی؟ ئەو هەمووە خەڵکە راوەستاون بزانن چەندە پیاوی و چ گوویەکت پێ دەخورێ..."

قۆرت بۆغا خراپ تووشی گێچەڵ ببوو. رەنگی بەر رووەوە نەمابوو و زاری وشك ببوو. سەری لەگێژەوە دەهات و سەرسووڕماو، سەیری پشتکووڕی دەکرد کە کەفی هەڵدەخراند.

---

* ناقان: جۆرە دەمانچەیەکە.

بنیادەمەکان و چیای دوڵدوڵ و پشتکووڕ تێکچڕژابوون و لە نێوان دووکەڵ و هەڵم و گەڵاچنارەکاندا دەسووڕانەوە.

دەمانچەکەی هەروا بە دەستیەوە مابۆوە و لوولەکەی، ڕاست و چەپ و سەر و خواری دەکرد. خۆ تەقەشی کردبایە، نەیدەتوانی ئەو پشتکووڕە بنگێوێ وا دوو هەنگاو لە پێش دەمییەوە قیت و قایم ڕاوەستابوو. شڵەژابوو و ئاگای لەخۆی نەمابوو. زەردەواڵە، زەردەواڵە زەرد و خاڵدارەکانی دەدی. پووشبەقوونەکان بە باڵە تۆخ شینەکانیانەوە، بە باڵە ناسك و روونەکانیانەوە هەر هێندەی پەنجەیەك بەرز بەسەر بەردچنەکەدا وا دەخوشین، دەتگوت بۆنی پێوە دەکەن.

پشتکووڕ، بە دەنگێکی پڕ لە زایەڵە و ڕەوان پەیتا پەیتا دەیگوت و لێی نەدەبڕییەوە. قۆرت بۆغا ئیتر لە قسەکانی تێنەدەگەیشت... سەری لە گێژەوە دەهات و هەموو دنیا بە دەوری سەریدا دەخولایەوە. زەردەواڵە و جۆگەلە و بنیادەمەکان، چاوە زەق بووەکان و ئەو جاڵجاڵۆکە زلەی داوەکەی خۆی بە لکی چنارێکەوە تەنیبوو و ددانە سپییەکانی پشتکووڕ، هەر هەموویان تێکەڵ پێکەڵ دەسووڕانەوە و دەسووڕانەوە.

"چما ئەوە هەر تۆ نییت بە چاندنی برنج و بە ژەهراویکردنی دەشتەکە و هەموو ساڵێ بە کوشتنی هەزاران منداڵ لە نۆبەتێدا و بە مێش و مەگەز، خیانەت لە نیشتمان دەکەی؟ دەی بیتەقێنە، بوودەڵەی بێ غیرەت. ئێستا کە چەکت کێشاوە تەقەی بکە، دەی گەواد. پیاو کە دەمانچەی کێشا... دەی پەلەپیتکەی بترازێنە، بێ شەرەفی ترسنۆك. پێت وابوو لەبەر خاتری گیانێك، لەبەرت دەپاڕێمەوە؟ چما هەر تۆ نەبووی ئەو هەموو ژنە بەستەزمانەی مێردەکانیان لە یەمەنێ بێ سەر و شوێن ببوو، هەمووانت لە خۆت مارە کردەوە و تەڵاقت دان و دواییش هەمووانت بە دەستی حوکمەت لە ئاقچاسازدا زیندەبەگۆڕ کرد؟ هەموو ساڵێ، هەموو ساڵێ، هەزار منداڵت... دەی لێم دە، لێمی دە ترسنۆك، لێم دە هەی لە ژن کەمتر... لێم بدە چەپەڵ، لێم بدە هیچ و پووچ..."

حاجی قۆرت بۆغا کە لەسەر جێیەکەی خۆی پێی بە عەرزییەوە وشك ببوو، بە چاوی پڕ لە پاڕانەوەی، داوای یارمەتیی لە خەڵکەکە دەکرد. ئەو هەمووە ڕوودواوە لە چەند چرکەساتێکدا قەومابوون. بە زمانی حاڵ و بە چاوی یارمەتیخوازانەوە دەیگوت، وەرن لەو گێچەڵەم نەجات بدەن. سەیری یەك بە یەك دۆستەکانی دەکرد کە لە نێو ئاپۆرای حەشامەتەکەدا بوون. دەمانچەکەی هەڵدێنا و دایدەنایەوە و لە هەوادا بازنەی دەکێشا.

چاوی لە چاوەکانی جافر ئۆز پۆلاد ئەڵقا. بە روخسارییەوە دیار بوو ئەویش حاڵی لەم باشتر نییە. ئەویش نەیدەزانی چ بکا. نیگایان کە تێك ئاڵقا، جافر خۆی راوەساند و بەرەو حاجی قۆرت بۆغا رای کرد و خۆی خستە نێوان ئەو و پشتکوورەوە و دەستی بەرز کردەوە کە لە پشتکووری راکێشێ. رێك لەو کاتەدا چەقۆ زامندارەکەی دەستی پشتکوور بریسکەی دا:"دەستم لێ هەڵێنیتەوە، کون کونت دەکەم."

جافر ئۆز پۆلاد بەلەسەرخۆییەوە گەڕایەوە و چووە بن پیلی قۆرت بۆغای رەنگ هەڵبزرکاوەوە و بردی بەرەو لای ترۆمبێلەکەی و سواری ترۆمبێلەکەی کرد و خۆیشی سوار بوو. قۆرت بۆغا بەلادا هات و دەمانچەکەشی لە دەستی بەربۆوە سەر کورسییەکە و چاوەکانی لێك نان. جافر ئۆز پۆلاد دەستێکی لە پشتی شۆفێرەکە دا و گوتی:"هەڵی کە، هەڵی کە با برۆین."

ئەوجار ئاوری لە قۆرت بۆغا دایەوە و بە دەنگێکی هێمنتر گوتی:"ئەرێ کاکە ئەتۆش تاقەتێکت هەیە ها، ئاغا. چما پیاو دێ و لە نێوەڕاستی ئەو بازاڕە دەم لە دەمی ئەو پشتکوورە پیسە دەنێ؟"

ترۆمبێلەکە وەڕێ کەوت. حەشامەتەکە کشایەوە و رێگەیان بۆ مێرسدس بێنزەکە کردەوە...

پشتکوور سینگی دەرپەڕاندبوو و نێوچاوانی ئارەقەی دەرکردبوو و چەقۆکەی بە دەستێکییەوە و دەستەکەی دیکەی لە کەلەکەی نابوو.

لە نێو ئەو حەشامەتەوە کە هەتا ئێستا کپ و بێدەنگ بوو، لە پێشدا غەڵبەغەڵبێك هەستا و بەدوایدا بوو بە قسە و پێکەنین و قاقا و هەرا و هۆریایان گەیشتە ئاسمانێ.

پشتکوور ماندوو و هیلاك گەڕایەوە و لەسەر کۆتەرەی ناڵبەندەکە دانیشتەوە. چەقۆکەی نووشتاندەوە و لە گیرفانی خستەوە و جگەرەیەکی داگیرساند.

خەڵکەکەش وردە وردە هاتن و لە دەوری کۆ بوونەوە.

"کورم ئەو کارە قۆڕە چ بوو؟ خۆ هیچت بۆ نەهێشتەوە. پێت وایە قۆرت بۆغا تۆڵەی ئەو چاوقایمییەتت لێ ناکاتەوە؟ کورە خۆ کردتە پەڕۆیەکی گواوی. هەر سەیرە نەیکوشتی. پیس حەیات برد. گوێ لە من بگرە، خۆت لە کێشەی ئەو ئاغاواتە هەڵمەقورتێنە. ئەتۆ کابرایەکی داماوی کورم، چکارێکت بە کاری دەرەبەگانە. ئەسپ و ئێستر جووتەی داوێن و لە نێوانیاندا کەر دەتۆپێ."

حەشامەتەکە هەر دەهات و پتر دەبوو. پینەچییە سمێڵ شۆڕ و بابڕە دەموچاو شڵەکە، لە حاڵێکدا، بە بەروانکەکەی دەستەکانی وشك دەکردنەوە گوتی:"کەر دەتۆپێ. قۆرت بۆغا لەوانە نییە بەرۆکت بەربدا. وەك رۆژ رووناکە تۆڵەی ئەو چاوقایمییەت لێ دەکاتەوە. ئەمڕۆ سبەی ئەو بەردانە بە خوێنی تۆ سوور دەکا. خۆزگە خۆت لەو گێچەڵە هەڵنەقورتاندبایە. کارێکی باشت نەکرد."

دارتاشەکە بە قۆڵی هەڵماڵڕاوەوە هاتە پێشێ و گوتی:"بە قوربانی ئەو دەستەت بم. کارێکی سەیر بوو. کارێکی پیاوانە. وات پێ کرد، تا قیامەت کەس گونی نەبوو شتی وا بکا. لەبەر ئەو غیرەتەت مرم. بەخوای تەڕ لێت لە هەرا دان. کوڕە با میللەت بزانن ئەوانە دەهۆڵی نێو بۆشن و بەو هات و هاوار و پۆز و ئیفادەیەیانەوە، ناوێرن پەلەپیتکەی ئەو دەمانچەیە بترازێنن کە رایانکێشاوە. براکەم، جاڕچی گیان، لە دوای خەزای (ئوحود)ەوە پیاوی وەك تۆ بەغیرەت لە دایك نەبووە. بەو جەستە گێڕ و وێڕەتەوە سنیگت بۆ ئەو ناقانە (جۆرەی دەمانچەکەیە) دادڕی و وەك شاخێك لە بەرانبەریدا راوەستای. هەی رەحمەت لەو شیرەی مژیوتە و رەحمەت لە رەچەڵەکت. حەڵاڵت بێ ئەو شیرەی لە دایکتت مژیوە. ئەو گوندە سەد ساڵی دیکەش ئەو پیاوەتی و ئازایەتییەت لەبیر ناکا."

جاڕچی لە نێو بازنەی ئەو حەشامەتەدا کە هەر دەهات و چڕتر دەبۆوە و دەوریان تەنیبوو، وەك جەواڵێکی پڕ لە شووتی لەسەر کۆتەرەی بن چنارەکە گرمۆڵە ببوو و جگەرەی دەکێشا. سێ مێشەکەرانەی رەش و بریقەدار، هەر کام هێندەی پەنجەگەورەکەی دەست، بە وزەوزێکی سەیر و سەمەرەوە، بەسەر خەڵکەکەدا دەخولانەوە.

قاوەچییەکە بە دەنگێکی بەرز کە دەیویست هەمووان بیبیستن گوتی:"ئاخر کەس نییە بڵێ، سەی بەرەڵڵا، ئەتۆ چیت بەو کارانە... گەمژەیە ئەو چەقەڵەی بیەوێ لەگەڵ شێردا بچێتە جەواڵێکەوە...*"

بۆیاغچییەکە قسەکەی بە کابرای قاوەچی بڕی و گوتی:"کارێکی باشت کرد براله. کارێکی زۆر زۆر باشت کرد. هەر بەراستی دەستت خۆش بێ. لێگەڕێ با لە خۆشییانت پێڵاوەکانت بۆیاغ بکەمەوە. لەبەرت مرم."

سندووقەکەی لەبەر پێی پشتکووڕەکە دانا و دانیشت و دەستی کرد بە بۆیاغکردنەوەی پێڵاوەکانی."

---

* ئیدیۆمێکە پێموایە پەیامەکەی ناڕوون نییە و پێویست بە روونکردنەوە ناکا.

نوێنەری تراکتۆر فرۆشی و ترۆمبێل و دروێنەکەر و کەلوپەلەکانی سەلاجەش دەستێکی بە سمێڵەکەیدا هێنا و گوتی:"پشتکوورِی هیچ و پووچ... سەگبابی کەر هەر بۆ خۆنواندنێك گیانی خۆی خستە مەترسییەوە. سەگباب میز لە کانییەکەی زەمزەم دەکا و پێشی وایە بەزیندوویی لێی دەگەڕێن... ئاخر هەتیو مێشوولە و شەڕی فیل؟... بەسەری بابت... ئەدی سەی پشت شکاو، ئەدی بەسەری بابت... چونکە دەتزانی قۆرت بۆغا بەو حەیا و شەرەفەیەوە نایە دەستی خۆی بەخوێنی بەڵا لێدراوێك پیس بکات، بۆیە خۆت ئازا کرد و ئەو کارە قۆرەت کرد... ماسی دەگری دەبێ قوونیشت تەڕ بێ، جا ئەو کات تێدەگەی دنیا بەدەستی کێیە..."

ئاسنگەرەکە بە تووڕەییەوە نەڕاندی:"ئەتۆش دەمت لێك دەنێی یان نا؟ سووك و چرووکی ناپیاو؟ گوو بەو زارە شڕەت... بەڵایەکت بەسەر دێنم هەتا تۆ بی گووی وا نەخۆیەوە. دەی جا چ بووە؟ بە وردییەکەی لێ مەڕوانن، وەرن بزانن چەندە پیاوە. ئەو قەڵافەتە غیرەتی شێری تێدایە. بەڵام ئەتۆی لووسکەڵە، دەمانچە نا، هەر دەستمت لێ هەڵێنمەوە، گوو بە خۆتدا دەکەی و یەك پشوو هەتا ئەو سەری ئەدەنە هەڵدێی."

ئیتر مستە گەورەکەی کە دەتگوت کوتکە، لێ راست کردەوە و بە تووڕییەوە پەلاماری نوێنەری فرۆشتنەکانی دا و بەسەریدا نەڕاند:"جەحەندەم پڕ بکە، دەی جەحەندەم پڕ بکە..."

نوێنەرەکە خۆی خزاندە نێو خەڵکەکەوە و لە قوژبنێك لێی مات بوو. زەرگەتە رەش و بریقەدارەکان بە وزەوز بەسەر خەڵکەکەدا لە بازنەیەکدا دەخولانەوە. لەولاوە چیای دولدولَ بە رەنگێکی پەمەیی روون و بزرِکاوەوە کە تۆزێکیش مەیلە و تار ببوو، هەر دەتگوت بەسەر سەریانەوە هەڵواسراوە. ئاسنگەرەکە بە نێو خەڵکەکەدا کە دڕی دابوون، تێپەڕی و هات و لەبەردەم جارچییەکەدا راوەستا و دواییش داهاتەوە و نێوچاوانی ماچ کرد و گوتی:"ئەو نامەردانە ئەمڕۆ یان سبەی دەتکوژن. دەبێ مشوورێکی لێ بخۆین. خوێنت بەو بەردانە وەردەکەن. تەرمەکەشت هەر لێرە، فڕێ دەدەنە بن ئەو چنارە. ها ا ای جوامێرەکەم، شێرەکەی خۆم. چیت بۆ بکەم؟ وا باشترە چەند رۆژێك لە بازاڕ و کۆڵانێدا دەرنەکەوی هەتا ئاوێك بە ئاگرەکەدا دەکرێ."

حاجییە شێتە دەمانچەیەك بە دەستەوە و بە لێوی کەفکردووەوە و بە نەڕەنەڕ دەهات:"هۆۆی، هۆۆۆۆ ۆۆۆ پشتکوورِی گوو سەگ، ئەوە هاتم. هاتم پێشانت بدەم پووتێك چەند کیلۆیە.... ئەوە یان تۆ ... یانی تۆی سەگ، وات لێ هاتووە کە... پێت وایە ئەو میللەتە بێ کەسە؟... ئاغاکانمان؟... خوێنت... خوێنە پیسەکەت بە گۆڕێ وەردەکەم..."

حاجییه شێت بەسەر خەڵکەکەدا ملی کێشا و جارچیی دیت کە لەسەر کۆتەرەکە دانیشتووە و پێڵووەکانی لەسەر یەك داناون و بزەیەکی لەسەر لێوە و پێڵاوەکانی بۆیاغ دەکاتەوە. سێرەی لێ گرت و نەڕاندی:"بگرە، بگرە."

فیشەکەکە دەرچوو. بەڵام بەر لەوەی حاجییە شێتە پەلەپیتکەی بترازێنێ، ئاسنگەرەکە مەچەکی گرتبوو و رووی دەمانچەکەی لە حەوا کردبوو. دوو سێ گەڵای چنار بەسەر خەڵکەکەدا وەرین. ئاسنگەرەکە سووکێك دەمانچەکەی لە دەستی حاجی دەرهێنا و بە رقێکەوە تفێکی لە نێو چاوی کرد و بەتەوسەوە پێی گوت:"کوڕە هەی مەرایی کەری بێ شەرەف. بەکرێگیراوی خۆفرۆش. چڵکاوخۆری سەر سفرەی ئاغاواتان. هەی کەوچکی نێو هەموو قاپێك..."

مەچەکی بەرنەدابوو. پاڵێکی بە حاجییە شێتەوە نا و فڕێیدایە ئەوبەری ئاوەکە و حاجی لەسەر چیمەنەکە تلپ بەعەرزیدا کەوت و لە حاڵێکدا لەبەر مەستییان زمانی تێکەڵ دەهات، کەوتە پاڕانەوە:"تۆبە، تۆبە، ئیتر کارم بە پشتکووڕەکە نابێتەوە... باشە؟ دەمانچەکەم بدەرەوە... تکا دەکەم... گووم خوارد... تۆبە... پشتکووڕ برای منە."

"ناتوانن بەگەکان دوور بخەنەوە..."

"ناتوانن دووریان بخەنەوە."

"هەتا قازییە پیرە مابێ ناتوانن."

"یەکێك لە قازییەکان، دادوەری قۆرت بۆغایە... یەکێکیشیان پیاوی سلێمان پەنجە و رۆستەم بەگە..."

بە دڵخۆشییەوە گوتیان:"قازییە پیرە پیاوی کەس نییە..."

"ناتوانن. هەتا قازییە پیرە قایل نەبێ، ناتوانن دووریان بخەنەوە."

"چما دووریان بخەنەوە چ دەقەومێ؟ ئەی خۆزگە دەریان بکەن. چما ئەوان چ جیاوازییەکیان لەو ئاغایانە هەیە؟ ئەوانە چ گوڵێکیان لەسەرمان داوە؟... کوڕە لێیان گەڕێن با وەکوو سەگ ورگی یەکتری بدڕن."

رێك لەو کاتەدا، پیرێکی سەر زل و چوارشانە بە چاوی دەرپۆقیوەوە، روخسارێکی تووڕە و ورگێکی لە ژێڵڵاهاتوو و پانتۆڵێکی تەنگ، بە پێڵاوی "ئۆسکاری بریقەدارەوە" و بە پەستەکێکی رەشەوە کە زنجیرێکی زێڕی سەعات، بەسەرییەوە سەرنجی بۆلای خۆی رادەکێشا و چاکەتێکی لە قوماشی رەشی ئەتڵەسی لە شێوەی "ئەسمۆکینگ" لەبەر کردبوو و گۆچانێکی

حەیزەرانی زێڕکفتی بەدەستەوە بوو، وردە وردە و گران و سەنگین بە شۆستەکەدا تێدەپەڕی. ئەو قازییە پیرە بوو. کڵاوێکی گەڕگەڕیی ڕەشی لەسەر سەرە بێ تووکەکەی نابوو.

ئاسنگەرەکە بە دەنگێکی بەرز و بۆ ئەوەی قازییە پیرە گوێی لێ بێ گوتی:"هەتا قازییە پیرە مابێ، ناتوانن دووریان بخەنەوە."

زیاتر لە نیوەی خەڵکەکەی بن دار چنارەکە، وێکڕا دووپاتیان کردەوە:"ناتوانن دووریان بخەنەوە."

نانکەرەکە هەرای کرد:"ئەوە قازییە پیرەی پێ دەڵێن. سەر لەبەر گەردوونیش دانانوێنێ."

دووکاندار بە دەنگێکی گڕ کە زایەڵەیەکی شادییشی تێدابوو، گوتی: ناتوانن دووریان بخەنەوە."

دووکاندارەکە کابرایەکی کەمدوو و دانبەخۆداگر بوو، کە هیچ حیسابێکی لێ تێك نەدەچوو. هەر ئێستا سی و شەش هەزار لیرەی لەسەر دەروێش بەگ بوو. دووکاندارەکە دەمڕاستی دەروێش بەگ بوو لە شاری. پارە و کاڵای دەدا و لە دەفتەرەکەیدا دەینووسی... کە دەروێش پارەی بەدەستەوە دەبوو، لێی دەپرسی:"چەند؟"

سەیری دەفتەر و چۆرتکەی نەدەکرد... هەر دەیپرسی:"چەند؟" هەر ئەوەندە.

قازییە پیرە دەیزانی لەوێ چ باسە. هەموو ئەو قسانەی بیستبوو، کە بۆوەیان کردبوو گوێی لێ بێ و بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆی بێنێ، ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیشت. تەنیا ئاوڕێکی دایەوە و بە گۆشەی چاوان خێسەیەکی دایە حەشامەتەکە.

"ناتوانن دووریان بخەنەوە."

"بەڵام پیاوەکانی قۆرت بۆغا جارچی دەکوژن."

"دەی چ بکەین؟"

"جارچیی داماو..."

"با پارەی بۆ کۆ بکەینەوە."

"کابرایەکی بەغیرەتە. وەری ناگرێ."

"نا راستەوخۆ.."

"هەر ئەمشەو."

"پارەکەی بدەینێ..."

"با بچێتە شوێنێکی دی."

"بچێتە ئەزمیر."

"ئەزمیر باشە."

"لاچەپە. چ باشتر..."

سەراج و نانکەر ئەو شەوە ماڵ بە ماڵ گەڕان و پارەیەکی زۆریان بۆ جاڕچی کۆ کردەوە. پارەیەك کە ئەگەر سێ ساڵی رەبەق لە هەندەران دەستی لە رەش و سپی نەدابایە، پێی دەژیا.

وایان دانابوو ئاسنگەر و نانکەرەکە و سەراج پارەکە بدەنە جاڕچی و شەوێك هەڵیگرن و بیبەنە وێستگەی شەمەندەفەرەکە. کەس بە شوێنی جاڕچی نازانێ و بەو جۆرە جاڕچی گیانە شیرینەکەی رزگار دەکات.

جاڕچی کە گوێی لە قسەکانی ئەو سێ پیاوە، ئەو سێ برا گیانی گیانییە بوو، گوتی:"یاخوا هەر بژین."

بە هێمنی و بە پشتی دەستی دراوەکەی وێ دانەوە و گوتی:"ناچمە هیچ کوێ. پێویستیشم بەو پارەیە نییە و وەری ناگرم. دوای ئەوە ئیتر، تاقەتی ئەوەم نییە، خەڵك هەزار قسە و قسەڵۆکم لە پشت سەری بکەن."

"بەڵام ئاخر دەتکوژن."

"دەزانم دەمکوژن."

# ٣٦

وەلی شەماڵ غاری دەدا. لینگە درێژەکانی کە دەتگوت لینگی تاژین، نێوقەد و پشتە درێژەکەی و دەموچاوە تێکسمڕاوەکەی و ئێسقانەکانی شەویلاگەی دەرپەڕیبوون. بە کێڵگەی لۆکە و کونجی و نۆك و ماش و نیسك و پیاز و پەڕیزە گەنم و جۆ و بە بێستانەکاندا رای دەکرد. بەبێ ئەوەی ئاوڕێك لە دواوەی بداتەوە و بوێرێ سەیری پاش خۆی بکا و لە حاڵێکدا کە وەختابوو زراوی بچێ، غاری دەدا. رای دەکرد و لە حاڵێکدا خەریك بوو دڵی لە سینەی بێتە دەرێ، لە پاش خۆیەوە تۆزێکی سوور و خەست و پشووبڕی وەك بەورینگەی نێو تەندووری نێڵدراوی پڕ لە پشکۆی هەڵدەستاند. تۆزێکی سوورباو لە پشتەوەی، سوور وەك هەوری لەجۆش و پشکۆی ئاگری لە نێودا بێت و بەرەو ئاسمان بڵێسە بدا و لە دوورەوە تەندوورە بکێشێ و پاژنە و گوێزینگی بسووتێنێ... و هەوری تۆزە سوورەکە، یەك، دوو و سێ هێندەی قەڵافەتی بنیادەمێك و لەوانەشە هێندەی منارەیەك هەڵدەستا و بە دوایدا خۆی لە پێ و بەلەکی هەڵدەسوی و لە هەوادا بەمۆڵەق دەوەستا و پشکۆ ئاگرەکانیش وەك ئەستێرەی راخوشیو... و سێبەرەکەشی پێ بە پێی و لە نێو تەپوتۆزەکەدا بە تووڕەییەوە دەهات... دەروێش بەگ بە سواری ئەسپێکی کوێتی گوێ قوتی کلك و یاڵ پەخش و پەرێشان، ، بە تەپوتۆزە سوورەکەدا دەخوشی و دەمانچەکەی وەك قەمچی رادەوەشاند و دەهات. بە شوێن سێبەرەکەیدا و لەگەڵ سێبەرەکەی، سەگ گورگێکی تۆخ سوور کە لە سوورییان رەش دەچووەوە و کەڵپە سپییەکانی دیار بوون، بە هانکەهانك دەهات. تەپوتۆز و سێبەر و سوار و سەگەکە تێکەڵ بەیەك دەبوون و لێك جوێ دەبوونەوە و لە وەلی شەماڵ جوێ نەدەبوونەوە. دەهاتن و دەهاتن.

"ئەتۆ بەدەستی من دەکوژرێی. بە دەستی من. ئەوە چارەنووسی تۆیە، چارەنووسەکەت وایە وەلی شەماڵ و چارەنووسیش ناگۆڕدرێ. وەچەی ئادەمیزاد، شتی وەك تۆی نەدیوە. وەك

تۆ بە قەڵافەت جوان و گورج و توند و شوێن هەڵگر... بێ وێنەیەك كە تەنانەت شوێن پێی مێرووش هەڵدەگرێ. بەڵام چ سوود كە شووشەكەی ژیانت لە دەست من دایە و من دەتكوژم."

بە هەژاوی و وەك شێتان بەسەر خۆڵە سوورەوەبووەكەدا كە دەتگوت پشكۆی ئاگرە دەڕۆیشت و پەیتا پەیتا لە پەنا گوێچكەی خۆی گوێی لە سرتوخورتكەیان دەبوو:"دەتگەمێ. دەتگەمێ. دەتگرم. چارەنووس ناسڕدرێتەوە."

جا كاهینەكە گوتی: ئەی نەمروود، لە گەڕ و سووڕی ئەستێرەكانەوە وا دیارە دەورودووكانی تۆ بەدەستی كوڕێك وەردەگەڕێ، كە ئەمساڵ لە هەرێمەكەی تۆدا لەدایك دەبێ.

"ئەدی چار چییە؟"

كاهینەكە گوتی:"هیچ چار نییە."

"ئەی كاهین، ئەی ئەگەر من ئەو چارەنووسەم گۆڕی چی؟"

كاهینەكە گوتی:"ئەی نەمروود، ناگۆڕدرێ." كاهینەكە پێكەنی. تەپوتۆزە سوورباوەكان وەك پشكۆ لە دەشتەكەی حەڕان و چیاكانی ئورفەوە بڵێسەیان كێشا...

"ئەمن ئەو نووسراوە دەگۆڕم. دەبێ بیگۆڕم."

كاهینەكە گوتی:"ناگۆڕدرێ."

مووی لێ ببوونە نەشتەر و چاوەكانی سوور سوور وەك مەرجان. جا بە ئەمری نەمروود خزم و كەس و سوپاكەی بە كێو و دەشت و ئاو و جۆگە و جۆباران و بە دوورگە و ئەشكەوتەكانی كەوشەكەنەكەی وەربوون و هەموو وڵاتیان سەنگ و سووژن دا و لەو ساڵەدا لە هەر جێیەكی منداڵێك لە دایك ببوو، كوشتیان... منداڵی كوڕیان هەموو كوشتن و ژنێك بەبێ ئەوەی بهێڵێ مێردەكەی و منداڵەكانی و خەڵكی شارەكە و مەل و باڵندە و دەعبای كێوی پێی بزانێ، لە تراویلكەیەكدا منداڵەكەی بوو. منداڵەكەی لاواندەوە و مەمكی دایە. لە داری بی، جوان و زەریف بێشكەی بۆ ساز كرد. بێشكەیەكی وەك لۆتكە* كە ئاوی دانەدەدا. مەلۆتكەكەی لە لۆتكەكە نا و بە ئاوەكەی دادا و لایەلایەی بۆ ئاوەكە گوت. بە سۆزی دڵەوە و لە حاڵێكدا سەر و قژی ئاڵۆز و پەرێشان بوو و مەمكەكانی راسابوون و شیریان لێ دەچۆڕایەوە. لایەلایەی بۆ چیاكان و دەشت و گوڵ و ئاسك و دارەكان گوتەوە. لە سەر عەرزەكە دانیشت و بۆ ئەوەی جگەرگۆشەكەی لە ئەماندا بێ، دەستی هەڵێنا بۆ نزا و پاڕانەوە. هەورێكی زێڕین لەسەر منداڵەكەی نیشت. هەورە زێڕینەكە پێ بە پێی بێشكەكە بەسەر چیا و تاڤگە و دەشتەكاندا

* لۆتكە: گەمی، بەلەم، قایق

تێپەڕی و منداڵەکەی پاراست. بێشکەکە هات و هات و لە دەم ئۆرفە، رێك لە دەم ئەو ئەشکەوتە بە لکی دارەبییەکەوە گیرسایەوە. مانگ هەڵات و هەورە زێڕینەکە رەوییەوە. ئاسکۆڵەکان بۆ ئاوخواردنەوە لە کەژ و کۆوە داگەڕان. منداڵەکە پەنجەگەورەکەی دەستی خۆی خستبووە زارییەوە و دەیمژت. مامزە مێیەك دیتی. مامزەکان دیتیان. بێشکەکەیان بە ددان هەڵگرت و بردیان بنەبانی ئەشکەوتەکە. مامزەکان تێر شیریان کرد. هەموو رۆژێ دوای خۆر ئاوابوونێ سەریان لە ئەشکەوتەکە دەدایەوە و شیریان دەدایێ و منداڵەکە شیرمەستەکە زۆر بەخێرایی بەخۆی دەهات و هەڵی دا و چووە نێو رەوە ئاسکەکانی چیا و دۆڵ و دەشتانەوە و هەر چاوی بە بنیادەمان نەکەوت. لەگەڵ مامزان بووە دۆست و هاوڕێ و هاوزمان و هاوژیانیان. گەورە بوو. هەر بۆیەشە چاوەکانی لە چاوی ئاسکان دەچوو. ردێنە درێژ و لوول لوولەکەی وەك بلێسەیەکی رەش لەسەر  سینگی شەپۆلی دەدا. رۆژێکیان هەستی کرد  ئەوا تارماییەك سەری لە دوو ناوە. بنیادەمی دۆزییەوە و زمانی بنیادەمان فێر بوو و ئەو تارماییەی ناسییەوە کە بەدواوەیەوە بوو. باڵابەرز بوو، لێوەکانیشی وەك بلێسە... رۆژێکیان لەگەڵ مامزەکاندا بە رۆژی رووناك رووی کردە شارەکەی ئۆرفە و گوتی:"ئەی نمردوود، وەگیان هاتووم ئەوەندەی راکردووە بم بە چیا و چۆڵانەوە، ها ئەوە من و ئەوەش سەرم."

جا نەمروود شایی لەدڵی گەڕا و فەرمانی دا دەمودەست لەسەری بدەن. جەللاد شمشێریان کێشا و شمشێر تاقە موویەکی چییە نەیانبڕی. ئەمری کرد بیخنکێنن، بەڵام پەت و کەمەند کاریان لێ نەکرد. هەموو رێیەکیان تاقی کردەوە بۆ کوشتنەکەی و هەر نەیانتوانی، ئاگرێکیان بۆ کردەوە هێندەی کێوێك و لە سەر چیایەکەوە بە مەنجەنیق هەڵیانداشتە سەر کڵی ئاگرەکە و ئاگرەکە بوو بە ئاو و دارەکان بوونە ماسی و پشکۆکان بوونە گوڵ و شینکە... گەنجە ردێن رەشە چاو مامزەکەش لە نێو ئەو گوڵستانە تایبەتییەدا پیاسەی دەکرد و نەمروودی کوشت و برایمی خەلیلی نەبی، بوو بە پێغەمبەری بەرەکەت. جا هەر کەسێك لە سەر خەرمانێ یان لەە کاتی هەڵگرتنەوەی حاسڵات و بەروبوودا و لە وەرزی میوە رنینێدا هاواری لێ کرد، بەرەکەت لە حاسڵاتی کەوت. ئیتر کچی مامزئاسای خواست و گەلێ منداڵی خستەوە. هەموو ساڵێ سەدان هەزار مامز پەنایان هێنایە موڵکەکەی ئەو و پارێزران. هەر بۆیەشە گۆشتی ئاسکان حەرام کراوە و شیرەکەیان حەڵاڵ. هەر بۆیەشە چاوەکانی لە چاوانی ئاسك دەچێ.

مانگ هەڵات. مانگی چاردە، بە تریفە و زیوین... تیشکە زیوینەکە شەوەکەی شوشتەوە. وەلی شەماڵ بە دەوری کۆشکەکەدا دەسووڕایەوە. چەند رۆژ بوو؟ نە خۆی دەیزانی و نە

کەسێکی دی. برایم نۆبەرە مندالّی دەروێش بەگ و مێرمندالّێکی کەلّەگەتی چاو و برۆ رەشی لێوبەبار و رەوەك بوو، گوتی:"بابە، بابە، دیسان ئەو کابرایە هاتەوە. دیسان وەك پەپوولە بە دەوری کۆشکەکەدا کەوتەوە خولانەوە."

دەروێش بەگیش لە رۆچنەی پەنجەرەکەوە سەیری کرد. وەلی شەمالّ یەك پشوو رای دەکرد... برایم و دەروێش بەگ هەتا بەیانی نەخەوتن... دەروێش و برایم هەر کامەیان لە کونێکەوە سەیری وەلی شەمالّیان دەکرد بە دەوری کۆشکەکەدا بالّی گرتبوو. ئەو پیاوەی بە راکردن دەوری کۆشکەکەی دەدا، کە رۆژ بۆوە ون بوو. بوو بە دلّۆپە ئاوێك و بەعەرزیدا رۆچوو. لەوانەش بووبێتە هەلّم و چووبێتە ئاسمانێ و ئەو پیاوەش کە شەوانە یەك پشوو غاری دەدا و هەموو خەلّکی نێو کۆشکەکە دیتیان، وەدووی کەوتن و تۆزیان نەشکاند. سەگەلیان پێوە نا و سەگەلیش تۆزیان نەشکاند. سواریان وەدوو خست و کابرا ون بوو.

وەلی شەمالّ کە برسیی بوو، چووە ئاوایی. گوندی لە کەپرەکانیاندا ماستیان لە قاپی گلّینەی گەورە کردبوو. وەلی شەمالّ ماستەکەی وەدلّی کەوتبوو. هەر شەوەی ماستی یەکێکی هەلّدەقوڕاند و بنی قاپەکەشی دەلستەوە. کێشکی کەپرەکانیان کێشا و شەوانە هەتا بەیانی نەخەوتن. وەلی شەمالّ وەك با دەهات و ماستەکانی هەلّدەلووشی و کلکی بەتەلّەوە نەدەبوو.

وەلی شەمالّ گەلێ رۆژان بەسەر لکێکی خوار و پڕ لە چلّ و گەلاّوە لە نێو چنارستانەکەی سەر گەوی چەمەکە، دەخەوت و هەندێ شەوان لە جێی خۆی نەدەبزووت و هەروا لەسەر جێ و بانەکەی خۆی کە بەسەر لکەکانەوە سازی کردبوو، دەمایەوە.

ژنێك لە ئاوەکە هاتە دەرێ. وەك مانگی چاردە، هەموو ولاّتیش وەك رۆژی رووناك. ژنەکە کەلّەگەت و نێوقەد باریك و سمت و قوون پان و مەچەك ناسك و مەمك هەناری. هەموو لەنجەولارەکانی دلّبزوێن و ورووژێنەر... با، شەپۆلی دەخستە نێو پنگە گولّ کردووەکانەوە کە وەك مەزرایەك هەتا بنارەی گردەکەیان داگرتبوو. بۆنێکی توند و مەستی هێنەری و سەرگێژکەر دەوروبەرەکەی داگرتبوو و خوێنی لە دەماراندا دەبزوواند. ژنە هات و لە بن چنارەکە و لە سەر شینکە پڕ لە گولّەکە لێی درێژ بوو و خۆی تلاندەوە و هەر وا دەتلایەوە، دەنگێکی هەژێنەر و مەستی هێنەری دەردێنا، کە پیاوی شێت دەکرد و دلّێك و سەد دلّ دەیگوت وەرە.وەلی شەمالّ لکەدارەکەی توند توند بەخۆیەوە گوشی. دەستەکانی ئارەقەیان کرد. ئارەقەی شین و مۆری دەرکرد. ژنەکە لەسەر شینکە و گولّەکان تلایەوە و تلایەوە و لە بن دارچنارەکە لەسەر گازەرای پشت درێژ بوو و ئەژنۆکانی هەلّدا. ژەنۆی هەلّدان و لاقەکانی لێك

کردەوە و تێی هەڵکرد لە گۆرانییەکی بەسۆزی وەك لاوك و لاواندنەوە، دەتگوت تەیرێکی مێیەیە و بانگی نێرەکەی دەدا. رێك لەو کاتەدا گەنجێکی رووت و قووت لە نێو دەوەن و گوڵ پێنج پەڕەکانەوە هاتە دەرێ. بەسپایی لێی نزیك بۆوە و لە تەنیشتی راوەستا. ئەویش ئەوە هەر دەچرِێ. لە تەنیشتی راکشا و وەك ئەو ئەژنۆی بەرز کردنەوە. دیسان لەسەر گوڵ و چیمەنەکە کەوتە تلانەوە و هەڵبەز و دابەز و زۆر غەریب و دڵبزوێن دەنگی هەڵێنا. گەنجەکەش ساتێك وەك ئەو دەنگی لێ هەڵێنا. دوایی هەستان و... دواتر خۆیان خستە سەر گوڵە دڕکاوییەکانی چیمەنەکە و... وەلی شەماڵ چاوی لێك نا و لکە دارەکەی جار بە جار توندتر بەخۆیەوە گوشی. ژنە وردە وردە و بە نازەوە دەنووزایەوە و پیاوەکەش وەك ئەسپێکی لینگ دراو، دەی هانکاند. هانکە هانکێکی تێکەڵ بە ئاخ و ئۆخێکی هەژاو و هەژێنەرانە. وەلی شەماڵ چاوەکانی کردەوە. هەردووکیان بەسەر پێوە بوون. گەنجەکە گەڕایەوە و بەرەو لای پێنج پەڕەکان وەڕێ کەوت. ژنەکە بەدوایدا بانگی کرد:"مەڕۆ، مەڕۆ، مەڕۆن، مەڕۆ، راوەستە. مەڕۆ، مەڕۆ، راوەستە."

گەنجەکەش هەر رۆیشت. جلوبەرگەکانی لە گوڵەکان کردەوە و لەسەر زیخ و چەوە سپییەکان لەبەری کردنەوە و لە ئاوەکەی دا و پەڕییەوە. ژنەکە لەوێ، لە تەنیشت دەوەنەکان، لەو شوێنەی گوڵەکان تەواو دەبوون و زیخ و چەو دەستی پێ دەکرد، راوەستا و هەتا گەنجەکەی لەچاوان ون بوو، هەر سەیری کرد. نیو سەعات و لەوانەشە سەعاتێك دەبوو هەروا راوەستا و دوایی گەڕایەوە بن دار چنارەکە و ساتێك لەوێ راوەستا. ئەوجار داهاتەوە و ئەژنۆی لەسەر عەرزەکە دادا و دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنا. دەتگوت دووعایەك دەخوێنێ. دوایی بە گاگۆڵکێ بە دەوری چنارەکەدا خولایەوە. سمتەکانی لە مانگەشەوەکەدا دەلەرینەوە و شەپۆلیان دەدا. گەنجێکی باریکەڵە و کزۆڵە و رووت و قووت لە دەوەنەکان دەرپەڕی. بە هەر دوو دەستەکانی گەڵ و گونی داپۆشیبوو و داهاتبۆوە و پشتی کووڕ کردبۆوە و سەری لەبەر خۆی نا و راوەستا. ژنە بە گاگۆڵکێ و گۆرانییە سەیر و سەمەرەکەی لە سەر لێوان و دڵبزوێن و ورووژێنەر و لەوپەڕی ورووژێنەریدا لەسەر پشت لێی درێژ بوو و ژەنۆکانی هەڵێنا و لێکی کردنەوە و... گەنجەکە جووڵەی لێ بڕا. دەتگوت پشووی دەرنایە. ژنە وەك شێتان لەسەر چیمەنەکە هەڵدەبەزییەوە و بەو شێوەیە پاناوکێکیان وەبەر خۆیان دا.

وەلی شەماڵ ئارەقەی کرد. چاوەکانی بڕیبووە ئێسقانە دەرەپەڕیوەکانی گەنجەکە. قژە چڕ و درێژەکەی پەخش و پەرێشان ببوو.

تاوێك دواتر، کوڕە ناڵاندی و بەلادا کەوت و لەسەر چیمەنەکە تلایەوە... و ژنە لە تەپڵی سەرییەوە هەتا بەری پێی ماچ باران کرد. دوایی لە ژوور سەری ئەژنۆی دادا و لە بن لێوانەوە لاواندییەوە. دەیلاواندەوە و جار و بار دەستەکانیشی بەرز دەکردنەوە. گەنجەکە لە نەکاو وەخۆ هاتەوە و قیت بۆوە و رای کرد و جلوبەرگەکانی لەسەر دەوەنەکان هەڵگرت و بە زیخ و چەوەکەدا تێی قووچاند. دەنگی خزینی زیخ و چەوەکان لە بن پێیەکانی، لە بێدەنگیی مانگەشەوەکەدا دەدایەوە.

ژنە هەر لەوێ لەسەر چۆك و بەبێ جووڵە مایەوە.

پیاوەکی ریش چەرمووی پشت کۆماوە هات. ژنە بەبێ ئەوەی بەهەندی بگرێ، هەروا لەسەر ئەژنۆ بەبێ جووڵە مایەوە. کابرا لە دەوری دەگەڕا و دەیگوت:"سەباحەت خاتوون، سەباحەت خاتوون من هاتم. هاتم."

ژنە هەر گوێشی پێی نەدەبزووت و کابرا دەخولایەوە و دووپاتەی دەکردەوە:"من، من، من."

ژنە لە نەکاو دەستی گرت و کێشا و لە تەنیشت خۆی درێژی کرد و... سەرتاپێی ماچباران کرد. ئەوەندەی ماچ کرد هەتا کابرا دەنگی سەیر و سەمەرەی لێ هەستا و لەو کاتەدا درێژ بوو و کابرا پیرەی ... ماوەیەك بێ جووڵە مانەوە. دوایی ژنەکە کەوتە گینگڵدان و هەڵبەز و دابەز. پیاوەکە دەنگی لێوە نەدەهات و وردە وردە، دەیلاواندەوە... و ئاخرییەکەی کابرا دەستی ژنەکەی گرت و هەڵیستاند و... بە نێو پنگەکاندا بەرەو لای گردەکە رۆیشت. ردێنەکەی لە بەر تریفەی مانگەشەوە زیوینەکە دەشنایەوە و دەدرەوشایەوە.

ژنە لە بن چنارەکە چۆکی دادا و دوایی لەسەر چۆك هەتا دەم رووبارەکە رۆیشت. لەوێ هەستایە سەر پێ و دەستەکانی لێك کردنەوە و خۆی بادا و خۆی خاوکێش کرد. بەلاقی لێك ئاوەڵا و دەستی بەرزکراوەوە گەڕایەوە بن چنارەکە. دەنگێك لە دار بییەکەوە هات.

دەنگێکی گەرم و دڵبزوێن پرسی:"کێیە؟ کێیە؟ کێ لەوێیە؟..."

کە هیچ وەڵامێك نەبوو، بە لەنجە و لار بەرەو دەم رووبارەکە چوو و خۆی بە ئاوە خۆڕەکە دادا. ماوەیەك دەنگی شڵپە شڵپ هات.

برایم هەرای کرد:"بابە، بابە، بابە... سەیر کە، سەیر کە، کابرایەکی لینگ درێژ... هۆوەتا، ها هانێ، هۆوەتا. ناسیمەوە. وەڵڵا راست خۆیەتی. سەیر کە چۆن رادەکا. وەك تاژی.

رۆیشت. تازە دەرچوو. بۆچی سەیرت نەکرد؟ بۆ نەهاتی، بابە؟ ئەمن لەو پیاوە دەترسم. دەمکوژێ، دەمکوژێ، ئەو پیاوە من دەکوژێ بابە."

باوەشی بە لاقەکانی بابیدا کرد:"نەجاتم دە بابە. نەجانم بدە. ئەو پیاوە بکوژە. بە لای کۆشکەکەدا رادەبرێ، بابە، بە بن کۆشکەکەدا."

"ئەمشەو دەیکوژم برایم. هەر کەسێك بێ. جا دۆست بێ یان دوژمن، هەر ئەمشەو لەبەر دڵی تۆ دەیکوژم برایم."

جا تەپوتۆزێکی سوور بەرەو ئاسمانێ کۆڵەکەی کرد و بارانێکی زەرد زەرد بەسەر ئاسۆدا کە لەبەر تریفەی مانگەشەوەکە سپی دەچۆوە و بەسەر پەلکە بریقەدارەکانی گوڵی پنگەکاندا و بەسەر گوڵە ئەرخەوانییە بۆنخۆشەکانی پێنج پەڕەکەدا دای کرد. بارانێك بە باوە. با و بۆرانێك کە کەروێشکەی خستبووە کێڵگە برینجەکانەوە و گوڵەپڕ و قورسەکانی رادەژاند. بارانێکی ورد و دواتر... و سمە پانەکانی گایەکان لە عەرزە قوڕەکە رۆدەچوون و بۆنێکی قورس لە گوڵە زەردەکانەوە هەڵدەستا و بڵاو دەبووەوە...

جا برایم دیتی کە رێگەی رزگاربوون نییە و تارمایییەکە هەروا بەشوێنییەوەیە. هاتەی لای نەمروود، هەزاران ئاسکەی کێویی بەشوێنەوە... لە پاردە و شووراکانی ئۆرفە پەڕینەوە و گوتی:"ئەی نەمروود."

لە حاڵێکدا هەورێکی تەپوتۆزی سوور لە پشتەوەی دەنیشتەوە و مامزەکان بەبێدەنگی و خەمبار و تازیەبار...

ئەی نەمروود، ئاخرییەکەی هاتمەوە من.

جا نەمروود دڵی زۆر خۆش بوو. ئەوجار ئاگرەکە بۆ برایم سارد و سەلامەت بۆوە و برایم لە گوڵستانەکە هاتە دەرێ و چووە دەربارەکەی نەمروود و خەنجەری کێشا. نەمروود کڕنۆشی برد و بانگی کاهینەکەی کرد و سەری دانواند. جا برایم گوتی:"ئەمن زوڵم بنبڕ دەکەم. بە کوشتنی تۆ لەو دنیایەدا زوڵم ناهێڵم."

جا کوشتی بە خەنجەر کوشتی. دوای کوژرانی نەمروود، زوڵم هەر بەردەوام بوو و برایمی پەروەردەی مامزان، زۆری پێ سەیر بوو. گوتی:"زاڵمم کوشت، کەچی زوڵم هەر مایەوە."

جا برایم بێهیوا نەبوو. گوتی:"زوڵم لەناو دەچێ. زوڵم دەبێ بنەبڕ بکرێ."

ئیتر برایم لەگەڵ مامزەکانی روویان کردە بیابان. زۆری منداڵ خستەوە. تۆرەمەکەی زۆر بوون و بە هەموو وڵات وەربوون. برایم وەسیەتی بۆ منداڵەکانی کرد، کە هەرچی چێژ و بەرەکەتە بۆم بەجێ هێشتن. گوتیشی ئەنگۆ زوڵم دەسڕنەوە و نایهێڵن. رۆژێك دێ ئاسەواری زوڵم و زۆری لە سەر ئەو زەوییە نامێنێ.

تەپوتۆزە سوورەکە و سێبەرە زەردەکە بە شوێنییەوە... وەلی شەماڵ بە دەوری کۆشکەکەی ساری ئۆغلێدا دەسووڕایەوە... دار بییەکە، سەباحەت خاتوون، مانگەشەوەکە...

" بابە، بابە وەرە، ئەوە رادەکا."

دەروێش بەگ هەرای کرد:"راوەستە، مەبزوو، ببزووی تەقەت لێ دەکەم."

تارماییە درێژ و باریکەکە لەسەر جێیەکەی، لە مانگەشەوەکەدا چەقی.

"هیدایەت بچۆ بزانە کێیە؟"

هیدایەت بە پارێزەوە و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە، لە تارماییە چەقیوەکەی بەر مانگەشەوەکە چووە پێشێ و گوڕاندی:"چیت بە دەستەوەیە، فڕێی دە."

تارماییەکە متەقی لێوە نەهات. هیدایەت دیسان نەڕاندی."گوتم چیتت پێیە، فڕێی دە."

تارماییەکە و شەوەکە تێکەڵ ببوون. دەتگوت لەجێی خۆی تواوەتەوە.

"گوتم فڕێی دە، ئەگینا تەقە دەکەم."

تارماییەکە هەر بێدەنگ بوو. هیدایەت لە نەکاو خۆی پێدادا و هەر دوو دەستی گرت. تارماییەکە هیچ ملەی نەکرد. هیدایەت دەستی برد و دەمانچەکەی لە قەدی کردەوە و گوتی:"خۆ دەمانچەشت پێ بوو؟"

تارماییەکە هیچی نەگوت.

"وەڕێ کەوە."

تارماییەکە بەبێ ئەوەی بەملاولادا خۆی خوار بکاتەوە یان دابێتەوە، سڕ و نیوەگیان وەڕێ کەوت و هات و لە بەردەم پلیکانەکاندا راوەستا.

"وەسەر کەوە."

وەلی شەماڵ لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. لە نێوەڕاستی دیوەخانەکە مات و سەرسام راوەستا. لە حاڵێکدا پەیتا پەیتا چاوەکانی دەترووکاند، سەیری مافوورە و بەڕە راخراوەکانی دیوەخانەکە و وێنە چاو گەورە و سمێڵ درێژەکان و تفەنگە کۆن و قەدیمییە سەدەف نیشانە

بەنەخش و نیگارەکان و قەرەویڵەی نەخشین و گۆزە لە دار سنۆبەر سازکراوەکانی کرد، کە لە پەنا پلیکانەکانەوە دانرابوون و هەر کام لە هەلۆیەك دەچوون کە ئامادەی فڕین بن. گۆزە دارینەکان ئاویان دەدەلاندە سەر تەختی دیوەخانەکە.

"کێیە؟ بیهێنە."

"زمانی شکاوە بەگ. نەمناسی."

"بیهێنە ئێرە."

وەلی شەماڵ دیسان وەك کەسێك بەدەم خەوەوە بگەڕێ، هاتە ژوورەکەی دەروێش بەگ. بەر پەنجەرەی ژوورەکە بە توورەکە لم هەڵچنرابوون و مێز و کورسییەکی لە دار گوێز دروستکراویان بۆ لە گۆشەیەکەوە دانابوو. پاڵپشتەی کورسییەکە، کە بەتانییەکی بەدلیسیشیان پێدادابوو، لە تووکی قاز دروست کرابوو. لە تەنیشت کورسییەکەوە، مۆبلێك دەبینرا کە مافوورێکی "یاغجی بەدیر"ی لە بەردەم راخرابوو. دەروێش بەگ بە پێوە بوو. وەلی شەماڵ هەر وەژوور کەوت، دەورێش بەگ سەری هەڵێنا و بە بە دەنگێکی مێرانەوە پرسیی:"ئەتۆ کێی؟"

وەلی شەماڵ کە دەتگوت لە تاریکاییەوە هاتووەتە شوێنێکی زۆر رووناك، خێرا خێرا چاوی دەترووکاندن.

"ئەتۆ کێی؟ چکارەی؟ لە دەوروپشتی ئەو کۆشکەی من لە چی دەگەڕێی؟"

وەلی هەروا لەجێی خۆی وشك ببوو و یەك پشوو و پەیتا پەیتا مژۆڵی چاوە بەقووڵداچووەکانی دەترووکاند. ملی باریك و سەری گەورە ببۆوە. ئیسقانی شەویلکەی وا دەرپەڕیبوون، جوان دیار بوون. پێستە چرچ و لۆچ بووەکەی نێوچاوانی دەتگوت هەر ئێستا لە کاسەسەری جوێ دەبێتەوە و دادەماڵکێ... جلوبەرگەکانی دەتگوت شڕ و شیتاڵی بەر داوەڵێکن...

"ئەتۆ کێی؟ چکارە؟ ژیری یان شێت؟ بۆچی ماوەیەکە هەموو شەوێ بە دەوری کۆشکەکەی مندا..."

وەلی لەنەکاو راچڵەکی و خۆی بەسەر پێیەکانی دەروێشدا کێشا و کەوتە پاڕانەوە:"لێم خۆش بە بەگ، مەمکوژە. من کابرایەکی داماوم و ژن و منداڵم هەیە، پیرم. مەمکوژە. ئەگەر نەمکوژی، زۆر شتم هەیە پێتی بڵێم. زۆر بە کارت دێم بەگ. مەمکوژە."

"دەی باشە، ئەتۆ کێی؟"

وەلی چاویترووکاند و نیگای پڕ لە ترسی وەرگێڕا و لەسەر هیدایەت قەتیس مان. دەروێش بەگ لێی تێگەیشت و گوتی:"هیدایەت، تۆ بچۆ دەرەوە."

هیدایەت کە بەسەر سووڕمانەوە سەیری ئەو دەیلاغەی دەکرد وا کەوتووەتە سەرچۆك و چاوەکانی دەدرەوشانەوە، چووە دەرێ. برایم لە پشت دەرگاکەوە تۆقیو و شڵەژاو چاوەڕوان بوو. هەر چاوی بە هیدایەت کەوت، بە پەلە لێی پرسی:"کێیە؟"کێیە؟ ئەو پیاوە کێیە؟"

هیدایەت وەڵامی دایەوە: نەمزانی. لە شێتان دەچێ. وڕ و کاسە. دەڵێی مێشکی شڵەقاوە."

لای نیوەڕۆیە دەنگی دەروێش لە ژوورەکەیەوە بیسترا. هیدایەت دەرەپەڕی.

"ئەو برادەرەمان بەرن با حەمامێك بکا. دواییش، جلوبەرگە نیلییەکان و جووتێك لە پێڵاوەکانمی بدەنێ با لە بەر و لە پێیان بکا... بە خاتوونیش بڵێ من لەگەڵ ئەو ئاغایە، لە ژوورەکەی خۆمدا نانی نیوەڕۆ دەخۆم. خواردنی جۆراوجۆر لێ بنێ. ئاغا میوانێکی ئازیز و خۆشەویستمە."

دەروێش بەگ بەیانیی دووەم رۆژ، تووڕە و هەڵچوو، وەك ئاسنێکی سوورەوەکراو، لە جێوبانەکەی دەرپەڕی و دەسبەجێ جلوبەرگی لەبەر کرد. دەمانچەکەی هەڵگرت و چەکمەکانی هەڵکێشان و خەرەزەنێکی لە چەرمی گای بەدەستەوە گرتت. دەروێش بەگ لەوەتەی هەبووە، تەنیا چەند جارێك ئاوا بە تووڕەیی بینرابوو. چاوەکانی وەك دوو کووپە خوێن..."

"کامیلم بۆ بانگ بکەن. لە هەر کوێیەکە بیدۆزنەوە و بیهێننە ئێرە."

کامیل بەپەلە و بە راکردن هات.

وەلی شەماڵ، کامیل و دەروێش بەگ ماوەیەك سرتوخورتیان بوو. جاری وابوو دەنگی دەروێش بەگ لە ژوورەوەکەوە دەبیسرا و دەهات. دەیگوت:

"باشە، ئێمە، ئەو کچە سەباحەتمان هەر بۆ ئەوە دایە تۆ؟ باشە پیاوێك، پیاوێك نابێ ئاگای لە ژنەکەی بێ؟... پیاوێکی دەسەڵاتی ژنەکەی خۆی نەبێ... پیاوی وا بۆ مردن باشە... بۆ مردن باشە... مردن... ئەتۆ نامووسی ساری ئۆغڵیت برد. ئەتۆ بۆ مردنێ باشی. دەبێ بکوژرێی... ئێمە خوشکەکەی خۆمانمان... بەتۆ..."

ماوەیەك ژوورەکە بێدەنگ بوو. دەروێش بەگ لە حاڵێکدا چاوەکانی وەك دوو مستی قووچاو لە گلێنەی دەرپەڕیبوونە دەرێ و پەڕەی لووتی وەك کونە تفنی ئەسپێکی لینگ دراو

هەڵدەبەزییەوە، لە ژوورەکەی هاتە دەرێ:"ئەسپەکەم بۆ بێنن. ئەو سەگە بەڕەڵڵایەش بەرنە دڕکەڵانەکە. رووت رووت بکەنەوە. رووت رووت..."

ئەوەی گوت و بە پەلە لە پلیکانەکانەوە چووە خوارێ. ئەسپەکەی لە حەوشە زین کرابوو. لێی سوار بوو و لەگەڵ دەرپەڕینی ئەسپەکەی لە بن لێوانەوە گرماندی:"رووت و قووت... رووت رووت رووت..."

دوو کەس لە حاڵێکدا بن پیلەکانی کامیلیان گرتبوو، لە پلیکانەکان هێنایانە خوارێ. دەم و لووتی کامیل خوێناوی بوو و سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ ببووەوە و بەملاولادا دەکەوت و لاقەکانی بەسەر عەرزەکەدا دەکێشران.

کامیل لە پێشەوە و دەروێش بەگ بەدوایدا وەنێو دڕووەڵانەکە کەوتن. دڕووەڵانەکە بە رەنگێکی قاوەیی تۆخ تۆخ، دەدرەوشایەوە. لقەکانیان چقڵی باریك باریك و تیژ تیژیان پێوە بوون. رەگ و چڵیان دیار نەبوو و هەر چقڵەکانیان دەبینران. دوو کەس کامیلیان رووت کردەوە. کامیل رووت و قووت هەڵدەلەرزی و وێك هاتبوو و بە هەر دوو دەستی گەڵوگونی داپۆشیبوو و راوەستابوو. دەروێش بەگ ددانەکانی خۆی توند لەسەر یەك داگرتبوو و لە حاڵێکدا ددانی لێ چیڕ دەکردەوە، ئەسپەکەی بەچوارناڵە بەرەو کامیل لینگ دا و هەستایە سەر رکێفان و قەمچییەکەی لە هەوادا خولایەوە و سووڕا و دیسان لێك کرایەوە و بە ڤیزەڤیز هەواکەی قەڵشتەوە و چوو لەبەر یەکەوە و دیسان کرایەوە و فیکەی کێشا. داهات و داهات و هەر جارێکی دادەهات شووخاڵێکی دەخستە سەر شانەکانی کامیل و جار بە جار شووخاڵ شووخاڵی دەکرد. شووخاڵەکان هەڵدەستان و جار بە جار جێی شووخاڵ دەیبریسکاند و زاری دەکردەوە و دەپچڕا. خوێنی لێ هەڵقوڵی و هەڵقوڵی و هەڵقوڵی و دەروێش بەگ پتر تووڕە بوو و هەڵچوو. ئەسپەکە خولایەوەو و دەروێش بەگ قەمچی. کامیل لە پێشدا هەر بە پێوە مایەوە و خۆی راگرت و تەنانەت هەوڵیشی دا لە حەوا خەرەزەنەکەی لێ بگرێ و چونکە نەیتوانی و چونکە پشت ئەستۆی هەموو پچڕا و هەلاهەلا بوو و چونکە گیانی شیرینی هاتە سەر لێوی، خۆی بە دڕووەڵانەکەدا کرد. دەروێش بەگیش کە ئەوەی لەخودا دەویست، بە ئەسپەکەوە وەشوێنی کەوت. کامیل لە دڕووەڵانەکەدا هەر دەکەوت و هەڵدەستایەوە و دڕك و پێکوڵەکان گۆشتی لەشیان پل پل دەکرد. ژنەکان، مندالەکان، گەنج و پیرەکان لە دەم دڕووەڵانەکەوە

و له سەر خەرەندەکە و له سەر کۆگاکان راوەستابوون. هەر قەمچییەکی دایدێنایە، ئەوان خۆیان وێك دێنا و له جێی خۆیان هەڵدەبەزینەوە و موویان لیٚ دەبووە نەشتەر و دەتگوت له شان و ملی ئەوان دەدریٚ.

دەروێش بەگ بە قەمچی لێدانەوە، کامیلی هەتا نیوەڕاست و چڕایی دڕووەڵانەکە رادا. ئەوجار له سەر کۆگاکانیشەوە کامیل نەدەبینرا. هەر ئەوەندە بوو کە لەگەڵ لێدرانی هەر خەرەزەنێکدا، هاوارەکانی دڵتەزێنتر دەبوون.

## ٣٧

ئالاتەمیر یاماکلی نۆزدە ساڵان بوو کە لە گوندەکانی سەرووی ئاکارجاوە هاتە گوندەکەی باجاق. گوندێك کە هەر ماڵێکی کەوتبووە شیوێکەوە و هەر کامەشیان لانیکەم سەعات و نیوێك لێك دوور بوون و گرد و تەپۆڵکیان کەوتبووە نێوانیانەوە. لەو گوندانە، دوای رێکخستنی چارەگە زەوییەك، کشتوکاڵی تێدا دەکەن. یەکەم ساڵ یەك و چلی لێ هەڵدەگرنەوە و دووم ساڵ بەروبووی زەوییەکە یەك و پازدەی دادەبەزێ و سێهەم و چوارەم ساڵ لافاوێك هەڵدەستێ و خاکەکەی یەکسەر رادەماڵێ و لە جێیەکەی هەر رەوەزە ئەرخەوانییە رەق و تیژەکان بەجێ دەمێنن و دواتر دەچن لێڕێکی دیکە دەدۆزنەوە و لە ماوەی چەند ساڵاندا خاشەبڕی دەکەن و جێیەکەی رێك دەکەن و دایدەچێنن و دیسان لافاو رایدەماڵێتەوە و دیسان دێنەوە سەر کەر و داسەکەی جاران. ئالاتەمیر یاماکلی بوو بە نۆکەری بێوەژنێك. ژنەکە سەد و پەنجا دۆنم زەویی هەبوو. بەپیت و بەرەکەت و چەور و رەش رەش. مەزرایەك بوو لە دەم زۆنگاوەکە و دەست لێ نەدراو و هەموو ساڵێ یەك و چل بەرهەمی دەبوو. ئالاتەمیر یاماکلی ئەو مەزرایەی کێڵا و دایچاند و دروویەوە و خەرمانی گێرە کرد و هەڵیگرتەوە. بەکاربوون و ئازایەتییەکەی وێردی سەر زار و زمانان بوو. ژنە هەموو رۆژێ بەیانی قاپێکی هەلیماو و بروێش و نیو کەوچك رۆنی لە پێش دادەنا و ئەویش بەو کەوچکە چێوییەی بە دەستی خۆی تاشیبووی و لە چیاوە هێنابووی، بە چەند نان بروێش و هەلیماوەکەی هەموو دەخوارد و تەختی بنەکەی دەلستەوە. نیوەڕوان نان و دۆیەك بوو. نانەکەی تێدەکوشی و لەگەڵ پیازێك دەیخوارد. نانی شەوێشی ساوارێك بوو کە تۆزێك بۆنی رۆنیشی لێوە دەهات. ئەوە خواردنی هەموو رۆژێی بوو. پانتۆڵە جاوەکەی، کە بە دەست چنرابوو و پڕ بوو لە پینەوپەڕۆ، قەت دانەدەکەند. لە سەر داوای خۆی بێوەژنەکە، تەنوورەیەکی رێ رێی لە قوماشی مارش و چاکەتێکی هەر لە جاوەکە

بۆ دووریبوو. قوماش و جاوی هەموو ئەو جلوبەرگانەی لەبەری دەکردن، لە گوندەکەیەوە هێنابوونی. دایکی هەموو ئەو قوماشانەی بە دەستی خۆی بۆ کوڕەکەی چنیبوو. تەنیا حەزی لێ نەبوو کلاش لەپێ بکا و لەبری ئەوە جووتێك پۆتینی سووری لەپێ دەکرد کە ملیوانەکەیان دەگەیشتە ئەژنۆی و تا رادەی پەرستن خۆشی دەویستن و بەردەوام ئاگای لێیان بوو نەکا بەرد و چقلێ کونیان بکات. تەنانەت پێشی حەیف بوون لەسەر عەرزییان دابنێ. هەر بۆیەش یازدە ساڵان جووتە پۆتینێکی لەو چوکووراوایەدا لەپێ کرد.

بێوەژنەکە ناوی زوهرە بوو و تەمەنێکی بڕیبوو و گەڕابۆوە* و منداڵیشی نەبوو. لەو کاتەوە کە ئالاتەمیر کاری بۆ دەکرد، زەوی و زارەکەی بەرهەم و حاسڵاتی پتر بوو و ببوو بە دەوڵەمەندترین ژنی ئاوەدانی و لە خۆشیی دراو و سامانەکەی بووژابۆوە.

ئالاتەمیر بە خاتوونی دەگوت:"بەراتەکەم هەر لای خۆت راگرە با ئەوەندەی لێ بێ هەتا جەواڵێك پڕ دەکا.

کورتەباڵا و قەڵەوە بوو، دەتگوت کۆتەرە دارە... نێوشان و نێوقەدی وەك یەك پان بوون. چاوە وردەکانی کەسکێکی مەیلەوزەرد بوون. قژە زەردە کاڵەکەی وا گرژ دەوێستا، دەتگوت هەر تاڵە موویەکی بە چەکوچ لەسەری داکوتراوە. ئێسقانی کوڵمەکای دەرپەڕیبوون و بن روومەتی بەقووڵدا چووبوون. لێوەکانی تەنك بوون و چاڵی چەنەی ئەوەندە قووڵ بوو گرێی پەنجەیەکیان تێدا ون دەبوو. ردێنە زبرەکەی لە بن چاوەکانییەوە هەتا سەر سنگی و گوێچکەکانی داپۆشیبوو.

زوهرە خاتوون لە شەشەمین ساڵی نۆکەرێتییەکەی ئالاتەمیردا بەبێدەنگی مێردی پێ کرد. گوندی دواتر لە مەلای گوندەکەیان بیستەوە. ئالاتەمیر لە دوای زەماوەندەکەیانەوە، شەو و رۆژێك بەبێ ئەوەی گوێ بداتە با و بۆران و هاوین و زستان و ساڵ دەری دوازدەی مانگ، کار دەکا. بەیانیان ورگی پڕ دەکرد لە برۆێش و نیوەڕۆیانیش قاپێك دۆ و دەنکە پیوازێکی بە مست دەشکاند و نۆشی گیانی دەگرت و ئەوانەش دیسان ساوارە کەم چەورییەکەی وەبەر پاروان دەدا. جلوبەرگەکانیش هەر شمەکەکانی جارانی بوون. پانتۆڵێکی جاوی پینەکراو و چاکەتێکی رێ رێ و مینتەنەیەکی رێ رێی ماراش و کراس و شەڵوارێکی دەلینگ چیندار کە دایکی بۆی دەچنی و بۆی دەنارد.

---

*گەڕاوە: تەمەنی نێوان قەیرەیی و پیری. لەتەمەنی چل بەو لاوە

ئالاتەمیر لە پێشدا گاڕانێکی گا کڕی. ژنە ئەگەرچی لە زەماوەندەکەی پەشیمان ببۆوە بەڵام هەر گا و گوێرەکەیەکی دەکڕدرا و لەگەڵ هەر چەند قرۆشێکی دەیخستە نێو ئەو قوتووە تەنەکەیەوە کە لە قوژبنێکی حەوشەکەدا لە عەرزی گرتبوو، شاگەشکە دەبوو.

ڕۆنیان دەفرۆشت، حاسڵاتی مەزراکە و مریشك و هێلکەیان دەفرۆشت و هەرچی پەیدایان دەکرد، پاشەکەوتیان دەکرد. لەو نێوەدا ژنە سێ منداڵی خستەوە. منداڵ دەبوونە حەوت ساڵانیش شمەکیان لەبەر نەدەکرا و هەر ڕووت و قووت بوون.

زوهرەش وەك مێردەکەی، ئەو چاکەت جاو و پانتۆڵە زبرانەی لە قوماشی ماراشێ چنرابوون و دایکی مێردەکەی لە کوێستانێوە بۆی دەناردن، لەبەر دەکرد. ئەویش ڕاهاتبوو پۆتینی پیاوانە لە پێ بکا. ئەویش ڕێك وەك مێردەکەی سێ ڕۆژان چەنەی لەگەڵ قوجامان حەسەنی پینەچی لێ دابوو هەتا جووتێك پۆتینی لێ کڕیبوو. ژن و مێردە، کە دەهاتنەوە ماڵێ، پۆتینەکانیان لە پێ دەکرد و پاڵیان وەدیوارەکە دەدا و لاقیان ڕادەکێشا و بەبێ ئەوەی چاوێك گەرم بکەن یان پارووە نانێك بخەنە بەر دڵیان، بە سەرسووڕمانەوە سەیری پۆتینەکانیان دەکرد.

منداڵەکانیش کە گەورە بوون، قۆڵیان لە کار هەڵماڵی. وەك دیلی کافران... شەو ڕۆژە. ئەو قوتووانەی لەعەرزی گرتبوون بۆ پارەتێکردن، ببوونە سێ و چوار و تا دەهات پتر دەبوون. قوتووە بچووکەکانی قاوە زۆری پێنەچوو کران بە پووتیی تەنەکەی نەوت و پڕ کران لە چەپکە دراو.

سەد و پەنجا دۆنم زەوی ئالاتەمیر بەشی کار و تێکۆشان و ماندووبوونەکانی ئەو کابرا بەکارەی نەدەکرد. ئالاتەمیر شەش سەد دۆنم زەویی پیرەژنێکی بێ کەس و کاری بە پارەیەکی زۆر کەم، ئەویش بە قیست، لە چنگی دەرهێنا... هێشتا قیستەکانی تەواو نەببوون کە پیرەژنە عومری درێژی بۆ ئالاتەمیر بەجێ هێشت. شەرافەتمەند و حیساب ڕاست. هەر بۆیە باقی قەرزەکەی بۆ ژنەکە کردە خێر و مەرقەدێکی لەسەر ساز کرد. ئالاتەمیر کە داهاتەکەی چەند بەرانبەر ببوو، مەزرا و زەوی و زارەکەی "موسلیم سەرخۆشی"ـیشی کڕی و ئەوجار بەردەوام هەر زەویی کڕی و کڕیی. زۆر زووش سۆسەی ئەوەی کرد کە "عەولخالق ئەفەنی" کابرایەکی کار ڕێکخەرە و دەسبەجێ ڕێگەیەکی دۆزییەوە، کە لەویش نزیك بێتەوە. شەوێکیان بە تەنەکەیەك هەنگوینەوە کە ڕایسپاردبوو و تایبەت لە کوێستانێوە بۆی هاتبوو و بە تەنەکەیەك ڕۆنی کەرەوە کە خۆی ئاخنیبوویەوە، لە عەولخالق وەژوور کەوت و هەر چاوی بە فەرمانبەرەکەی تاپۆکردن کەوت، خۆی خستە سەر دەست و پێی و لاقەکانی ماچ باران کرد. عەولخالق ئەفەنییش لەحاڵێکدا کە داهاتبووەوە، دەستی بەسەریدا دێنا و شانی گرت و

هەڵیستاندەوە و لەسەر مۆبلەکە داینا. عەولخالق ئەفەنی کەیفی بەو رەفتارەی هاتبوو و کەوتبووە بەر دڵی.

بە چاوە پرووشە بێ مژۆڵەکانییەوە لە بن چاویلکە چوارچێوە کانزاییەکەیەوە بە سەرسوورِمانەوە و کۆنجکۆڵانە لەو بنیادەمە سەیر و سەمەرە و پۆتین سوورەی دەڕوانی.

دەستی بەرەو لای تەنەکەکانی بەر دەرگاکە راداشت و گوتی: ئەوانە چین؟

ئالاتەمیر کە دەستی لەسەر ئەژنۆی دانابوو و ئارەقەی رەش و شینی دەرکردبوو، لە سەر جێیەکەی خۆی گرمۆڵە ببوو و بێجووڵە کەوتبوو، تەکانێکی لە خۆی دا و گوتی:"یەکێکیان رۆنە. بە دەستی خۆم ئاخنیومە و وەك کارەبا زەردە و بۆنی گوڵە نێرگزی دێ و پیاو مەست دەکا، گەورەم. ئاخر چونکە مانگاکانی ئێمە لە دەم ئاقچاساز لە گوڵی نەستەرەن و نێرگز و پنگە دەلەوەڕێن، بۆیە رۆن نییە لەو رۆنە بۆنخۆشانەی ئێمە باشتر بێ... ئەمنیش گوتم رۆنە بۆنخۆشەکەی ئێمە شیاوی زاتی موبارەکی ئەو گەورە و رۆزیدەرە مەزنەمەمان عەولخالق ئەفەنییە کە ئەو هەمووە چاکەیەی لەگەڵ ئێمە و خەڵکی گوندەکەمان کردووە و لە کۆنەوە وتوویانە جوابی چاکە، هەر چاکەیە."

"ئەی ئەو تەنەکەیەی دیکە چییە؟"

"ئەویش هەنگوینە. ئەمن کوڕی کوێستانێم. کوێستان. هەنگوینی چیاکان شیفایە و وەك مامۆستا قەرەتۆپاقولی دەفەرموێ دەرمانی هەموو دەردانە."

"خۆ مامۆستا قەرەتۆپاقولی دەناسی؟ لە نیزکەوە دیتووتە؟"

"کەس ئەو نابینێ. ئەو کابرایە گەیوەتە خوا. وەك خۆت. وەك خۆت بەندەیەکی بەهەشتییە. ئێمەمانان هی ئەوەی نین ئەو ببینین. ئێمەمانان شیاوی ئەوەی نین بچینە هەنتەشی مەزنە پیاوان و ئەو دەستانەیان ماچ بکەین کە لە گوڵ ناسکتر و لە هەوریشم نەرمترن. ئێمەمانان تەنیا ناوی چەند عەولادێکی پێغەمبەر دەبیستین."

عەولخالق ئەفەنی کە زاری تا بن گوێچکەی داپچڕیبوون گوتی:"خۆمانە بە، خۆمانە."

ئالاتەمیر خۆی بڕێك کۆ کردەوە و دەستەکانی زیاتر لە سەر ئەژنۆی داگرت.

"دەبێ عەرزی ئاغای خۆم بکەم کە ئەو هەنگوینە دەرمانی دەردانە. لە چیاکانی ئێمە گوڵێکی بۆنخۆش دەڕوێ بە ناوی "پۆرنە". لوقمانی حەکیم گوتوویەتی ئەو گوڵە دەرمانی حەفتاودوو دەردە. پۆرنە بۆ برینی فیشەك و هەوکردنی جەرگی سپی و گرانەتا و سوورەکوان یەکاویەکە..."

تۆزێك راوەستا و چاوی بڕییە عەولخالق ئەفەنی و کەپۆ قەپۆزبەرانییەکەی و ملە پڕ لە چرچ و لۆچەکەی کە نیشانەی پیریی بوو و لە دەستە توێژهەڵداوەکانی ورد بۆوە و ئاخرییەکەی ئەوەشی خستە سەر قسەکانی:"لوقمانی حەکیم گوتوویەتی هەرکەسێك هەنگوینی پۆرنەی بخوات، بیست ساڵ تەمەنی دەگەڕێتەوە و گەنج دەبێتەوە."

لەو جەنگەیەدا ژنە گوندییەکەی عەولخالق ئەفەنی بە سینییەکەوە کە سەرچەفێکی گوڵدۆزیکراوی بەسەردا درابوو، دوو کوپ قاوەی هێنا. کووپەکانی لێوارەکەیان زێڕین و هێڵی سووریان پێدا هاتبوو. ژنەکە وەك ئەستێرەیەك لەبەر چاوەکانی ئالاتەمیر درەوشایەوە:"فەرموون."

ئالاتەمیر دەستی راستەی لە سەر ئەژنۆی هەڵگرت و بۆ کووپەکەی برد. کووپەکە لە دەستیدا دەلەرزی و دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕا و خۆی پتر کۆ دەکردەوە، بۆیە ماسوولکەکانی دەتگوت خراونەتە مەنگەنەوە و دەگوشرێن، بۆیە هەموو دەیانزیڕاند. نێوچاوانی ئارەقەی لێ نیشت. پشت و بن پیلەکانی و نێوشانی ئارەقەی رەش و شینیان دەرکرد و خووسان. چاوی بە ئارەقە کزانەوە. قەتی قاوە نەخواردبۆوە، بەڵام دیتبووی چۆنی دەخۆنەوە. کووپەکەی بۆ دەمی برد و هەروا بە داغی هەڵیقوڕاند. لەو کاتەدا هەموو شتێك و عەولخالق ئەفەنییشی لەبیر کردبوو کە لەسەر مۆبلەکە لێی پاڵ کەوتبوو و قەف قەف دووکەڵی جگەرەکەی بەبادا دەکرد و نەرم نەرم قاوەکی دەخواردەوە و هەر لەبیریشی نەمابوو لەکوێیە و بۆچی هاتووەتە ئێرە... شەشدانگ هۆشی بەلای قاوەکەیەوە بوو. وەك خەون و خەیاڵ هاتە بەرچاوی کە عەولخالق ئەفەنی خولقی کرد بۆ جگەرەیەك و ئەو جگەرەکەی وەرنەگرت و دەتگوت بەو دەست گێڕانەوەیە هەڵەیەکی گەورەی کردووە. لە قورتمی پێنجەمدا بە خۆشییەوە سەیری کرد، کووپەکە تەواو هەڵچۆڕاوە. ئارەقەکەشی وردە وردە وشك دەبۆوە. کووپە بەتاڵەکەی کە لێوارە زێڕینەکەی دەبریسکایەوە، هەروا بە دەستییەوە مابۆوە. دەنگێك لە دوورەوە فریای کەوت:"بیدە بە من."

کووپەکەی بۆ لای عەولخالق راداشت و لەو جاتەدا دەسبەجێ دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دانانەوە و پشتی کە لەکاتی قاوەخواردنەوەکەدا کووڕ کردبۆوە، قیت کردەوە و رەپ دانیشت.

"دا بڵێ بزانم ئەتۆ کێی؟ و خەڵکی کوێی؟"

"خەڵکی گوندی باجاقم و ناوم ئالاتەمیر یاماکلییە."

عەولخالق ئەفەنی زۆری پێ سەیر بوو بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا.

"کەوابوو ئەتۆی ئالاتەمیر ئاغا؟ ئالاتەمیر ئاغای بەکار و تێکۆشەر... هەی بارەکەڵڵا... بارەقەڵڵا..."

ئالاتەمیر لەوەیکە ناسیبوویان و پێی گوترابوو ئاغا، بزەیەکی خاکەڕایانەی هاتە سەر لێوی و بلێی و نەلێی بڕێك بەخۆی نازی.

"دەمویست بلێم خۆم لە ماڵت هاویشتووە. ئەتۆ دەرمانی دەردی دەردەدارانی و ڕێ پێشاندەری لێ قەوماوانی. زەوی و زارەکەی من کەوتووەتە دەم ڕووبارەکەی جەیهان و خوار گوندەکەوە بەرەوڕووی دڕووەڵانەکە. ئاخۆ لەوێ دەوروبەران و لە تەنیشت و نزیك زەوی و زارەکەی من هیچ مەزرایەك لە پاش دۆستە هەرمەنییەکانمان بەجێ نەماوە؟ هەر هاتبووم ئەوەت لێ بپرسم. زەوی و زارەکەم بەشی خۆو و منداڵەکانم ناکا."

عەولخالق ئەفەنی زۆر شێلگیرانە چاویلکەکەی دەرهێنا و دوای سڕینەوەی شووشەکانی، دیسان لە چاوی کردەوە و چوو لەفکرەوە.

ئالاتەمیر لەنەکاو هەستی کرد زۆر شل و شەوێق دانیشتووە و دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی لاچوون. دەمودەست خۆی کۆ کردەوە و دەستی لە سەر چۆکی دانانەوە و قیت و بێجووڵە دانیشت.

عەولخالق ئەفەنی لەسەرخۆ و بە حورمەتەوە گوتی:"بەڵێ، بەڵێ، تەمیر ئاغا، بەڵێ ئاغای بەڕێز."

سەری گرت، ئەوەش سەری گرت. هەم زەویی پێ شك دێ و هەمیش بە ئاغا بانگم دەکا. ئەی لەو پیاوەی. وەی لەو پیاوە باشەی. چەنێ باشە؟"

"پێم شك دێ. قۆش ئۆغڵیش پرسیاری بوورە و بەیاری کردبوو، سۆراغم کرد، هەیە. بەڵێ گیانەکەم، دەکرێ پەیدای بکەی. دەکرێ بدۆزیتەوە. براکەم، تەمیر ئاغای ئازیز. لەودیو دڕووەڵانەکەوە زەوی و زارێکی زۆر هەیە... ئەوجار ... ئەوجار ... خۆ دڕووەڵانەکە... پێموایە شەش هەزار دۆنم دەبێ. لە دڕووەڵانەکەی جەیهانەوە... حەوتووی داهاتوو سەرێك لێرە هەڵێنەوە با بزان دەتوانم چ خزمەتێکت پێ بکەم."

عەولخالق ئەفەنی هەستایە سەر پێ و تەمیر یاماکلیش دەسبەجێ وەك فەنەر لە جێی خۆی دەرپەڕی.

عەولخالق ئەفەنی لە حالێکدا بەرەو لای دەرگا دەچوو، گوتی:"بەڵێ ئاغای بەڕێز، بەڵێ ئاغای بەڕێز، حەوتووی داهاتوو چاری دەکەین. ئیزن بدە سەیرێکی دەفتەرەکانم بکەمەوە، دوایی...."

ئالاتەمیر یاماکلی توند رانەکانی گوشی و چاوێکی کردبوونە چوار و گوێچکەیەکی کردبوونە چوار.

عەول خالق ئەفەنی کە سەیری کرد ئالاتەمیر لە جێی خۆی نابزوێ، گەڕایەوە و بە سەرسووڕمانەوە سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. بەڵام ئەو هەروا بێ جووڵە راوەستابوو. عەولخالق لەپڕ تێگەیشت بۆچی ناجووڵێ. دەستێکی لەسەر شانی دانا و گوتی:"تێگەیشتم، چەندی پتر بێ باشترە، بەڵێ. زیاتر بێنە براله. زیاتر بێنە. زیاتر بێنە کە ئەمنیش پێویستیم بە زیاترە."

تەمیر هەر گوێی لەو قسانە بوو وەك کۆتەرەیەك بەسەر لاقەکانی عەولخالق ئەفەنیدا کەوت و دەستی کرد بە ماچکردنی پێڵاوەکانی و ئەژنۆی. عەولخالق ئەفەنییش داهاتەوە و لە حالێکدا بارانی ماچ بەسەر پێڵاوەکانیدا دەباری، دەستێکی بەسەریدا هێنا و ئەوجار هەڵیستاندەوە و دەستی گرت و بەرەو دەرگای حەوشە وەپێشی کەوت.

تەمیر راوەستا و چاوی لە عەرزەکە بڕی و گوتی:"ئەمن زەویم زۆر دەوێ. زۆر زۆر گەورەم. زەوییەکی زۆر. ئەوەندەی قەوەم پێی بشکێ و چی پارەی هەمە بۆتی دێنم. زەوییەکی زۆر زۆر زۆرم بدەیە گەورەم عەولخالق ئەفەنی."

عەولخالق ئەفەنی وەك باوکان دەستی بەسەریدا دێنا و فرمێسك لە چاوەکانیا قەتیس مابوون. هەتا ئێستا کەس وەك ئەو تەمیر ئاغایە ئاوا رێزی نەگرتبوو. هیچ کام لەوانەی کە هەر بە مفتێ کردبوونییە پیاو و خاوەنی موڵك و سەروەت و سامان...

"تورکیا رۆژێك لە رۆژان شانازی بە نیشتمانپەروەری وەك تۆ راستگۆ و بەکار و تێکۆشەرەوە دەکا. ئەمن لەوە دڵنیام هەروا دەبێ. دکتۆر تۆفیق روشدی، وەزیری دەرەوە، خزمێکی نزیکمە. بۆی دەنووسم کە تورکیا بەرەو پێشکەوتنی بێ وێنە هەنگاو دەنێ. داهاتوویەکی درەوشاوە و پڕشنگدار. چونکە لەو مەملەکەتەدا پیاوی رەسەن و ماقوولزادە و ئاغای وەك تەمیر ئاغا پێگەیون. تورکی رەسەن و بێخەوش و خوێنپاك. کەسایەتیی وا هەڵکەوتوون کە ئەتاتۆرك بەبێ هیچ ترس و نیگەرانییەك دەتوانێ ئەمانەتەکەی خۆی بەوان

بسپێرێ. هەر ئێستا ئەوە یەکێك لەو کەسانە وەك قەڵایەکی پۆڵا لە بەرانبەرم راوەستاوە. وڵات و میللەتەکەی یەکپارچە و بێ مەرگ دەمێنێتەوە..."

ئالاتەمیر هیچی بۆ نەچووبۆوە سەر یەك، هەر ئەوەندە تێگەیبوو کە بە باشی باسی ئەو دەکرێ و لە پەسنی ئەودا کۆمەڵێك شت دەنووسرێ. دواییش عەولخالق ئەفەنی دەڵێ، لایەکی مەملەکەتەکە بە کابرایەکی ئاوا باش بسپێردرێ. زەوییەکی پتری بداتێ و پارەیەکی کەمتر وەرگرێ و چی حەزی لێیە بۆی بنووسێ. چاوە سەوزە زەردباوە بچووکە لەبنەوەبڕەکانی، گەشانەوە و درەوشانەوە.

"چی پارەی بەدەستم بکەوێ، مانگا و گاجووتەکانیشم دەفرۆشم... زەوییەکی زۆرم، زۆر زۆر..."

لە حاڵێکدا دەستە قەڵشیوەکانی ئالاتەمیری لە نێو دەستەکانی خۆی گرتبوو، بە پلیکانەکاندا وەپێشی کەوت و ئاخرییەکەی گوتی:"بەخێرچی."

ئالاتەمیر دوای ماچکردنی دەستی، بەخێرایی بەرەو گوندەکەی باجاق وەڕێ کەوت و دەستی کرد بە گوتنەوە ئەو تاقە گۆرانییەی دەیزانی.

کاروبارەکانی و سەروەت و سامانەکەی و زەوی و زارەکەی و پارەی نێو بانکەکانی زیادیان کرد. لە شەش کوڕەکەی، چواریان لەسەر زەوییەکە کاریان دەکرد و دووانەکەی دیکەی لە ئەدەنە دەرسیان دەخوێند. منداڵەکانیشی وەك باوکیان لەچەر و قڕنیس بوون و وەك خۆیشی بەکار. هەر یەك عەیبیان هەبوو، ئەویش نەك وەك باوکیان، بەڵکو وەك گوندییەکان جلوبەرگیان لەبەر دەکرد. لەوەش خراپتر کوڕە گەورەکەی جار و بارە مریشکێکی دەکوشتەوە و هەر کات رێی دەکەوتە شاری رانە بزنێکی لە قەسابەکە دەکڕی و دەیهێنایەوە ماڵەوە. ئالاتەمیر کە ئەوەی دەدی، چاوی دەچووە پشتە سەری و وەك تۆپ دەیگرماند و دەنگی بە هەموو گوندەکەدا دەگەڕا:"ئەی هاوار لەسەر ساجی عەلیی دانام، لەسەر ساجی عەلی..."

هەرجارێکی خەڵکی ئاوەدانی گوێیان لە دەنگی:" ئەی هاوار لەسەر ساجی عەلیی دانام." دەبوو، دووقڕانییەکەیان دەکەوت و دەیانزانی دیسان گۆشت هێنراوەتەوە ماڵەکەی ئالاتەمیر. ئالاتەمیر بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی پێش بەو وێڵ خەرجی و تەخشان و پەخشانانەی کوڕە گەورەکەی بگرێ. چونکە کوڕە گەورەکەی میکانیك (فیتەر)ی تەراکتۆر و سەیارە و خەرمانکوت بوو. میکانیکێك، کە کەس لەو مەڵبەندەدا دەسکی لەدوو نەدەکرد. زۆر لە بابی و تەنانەت لە سەردەمانی لاوەتیی باوکیشی بەتین و گوڕتر و بەکارتر بوو و جاری وابوو مانگی

بەسەردا دەهات و ئەو نەدەهاتەوە ماڵێ و چاوی بە ژن و منداڵەکەی نەدەکەوت و هەر لە سەر دەزگاکان دەنوست و چەور و رۆناوی و تۆزوخۆڵ لێنیشتبوو، لە مەزراکان دوور نەدەکەوتەوە هەر بۆیەش ئالاتەمیر تۆزێك خاتری دەگرت.

کوڕەکانی دیکەی بەگوێ و قانع و کوڕی کار و بار بوون و تەواو چوبوونەوە سەر بابی خۆیان.

ئالاتەمیر هیچ نەگۆڕابوو. هەروا پۆتینە سوورەکەی کە دوای سێ رۆژان چەنەلێدان لەگەڵ قوجامان حەسەنی پێنەچی لێی کڕیبوو، لە پێی دەکرد و پانتۆڵە جاوەکەی و چاکەتە زبرە ماراشییەکەی... کراس و بندەرپێشی هەر لە گوندەکەی کوێستانێوە بۆ دەهات. دایکەکەی لەمێژبوو مردبوو، بەڵام خزم و کەسەکەی کە بۆ کارکردنێ دەهاتنە چوکووراوا، رێك لەو جلوبەرگانەیان بۆ دێنا کە دایکی بۆی دەچنی. ئالاتەمیر دڵی خۆش دەبوو و لە زەوی و زارەکەیدا کاری بە خزمەکانی دەکرد. دیسان وەك جاری جاران پۆتینە نوێیەکانی لە پێ دەکرد و پاڵی بە دیوارەکەوە دەدا و ماوەیەکی زۆر تێیان رادەما. هەموو بەیانیان زگی پڕ دەکرد لە شلەی بڕوێش و نیوەڕۆیانیشی بە قاپە دۆیەك و پیوازێك بەسەر دەبرد و دیسان هەروا بە ئیشتیا و بە تەماح و چاوبرسی.

هەر نانی شەوێیان گۆڕانێکی بەسەردا هاتبوو. ئەو ساوارەی هەموو شەوێ لەسەر سفرەکە دادەنرا، چەور بوو و ئەو ساوارە چەورەشی کە دەخوارد بەردەوام دەیبۆڵاند و دەیگوت ئەو ژنە و بووکەکان ماڵم وێران دەکەن. ناچاربوو مل راکێشێ و تەحەمولی دەکرد. هەمووان دەیانگوت:"ئالاتەمیر، ئیتر تەمەنێکت لێ چووە، ئەوەی هەتە ئەگەر هەزار ساڵی دیکەش دەست لە رەش و سپی نەدەی و هەر بیخۆی، هێشتا تەواو نابێ. بخۆ و بخۆرەوە و خۆش بژی. ئەوەش بزانە ماڵی خۆ نەخۆری لەبۆ چەکمە بۆری. هەر بەلادا بێ، کوڕەکانت تەخشان پەخشانێکی وێدەخەن نەبێتەوە."

ئەو گوێی بەو قسانە نەدەبزووت و لە حاڵێکدا چاوە زەردە بچووکەکانی بچووکتر ببوونەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئاااخ تێناگەن، نااازانن. هەر کەسە و بە ربەی خۆی دەیپێوێ. ئاااخ نازانن من کوێم دێشێ.

جاروبارەش ئەو گۆشت بزن و مەڕ و مەل و باڵندە کێوییانەی کوڕە گەورەکەی لە شارییەوە دەهێنایەوە و سفرەکەی پێ دەڕازایەوە، دەیماشتەوە و هەمووی دەخوارد و وەسەر خۆی نەدێنا. لە پێشدا وەك بڵێ لەگەڵ ژنەکەی دانیشتووە و سەیری پۆتینەکانی دەکا، لە حاڵێکدا پەڕەی

لووتیان دەجوولا، سەیری پلاوە پڕ لە گۆشتەکەی دەکرد و ئیشتیای هەڵدەستا و زاری پڕ دەبوو لە ئاو. دەتگوت لە شتێکی متفەرك و پیرۆز دەچێتە پێشێ، تێی دەکرد و کە پارووی با دەدا، چاوەکانی لێك دەنا و پاروەکەی لە زاری دەئاخنی و ئەوجار وەك چۆن مانگا کاوێژ دەکەن، چاوەکانی بۆ خومار دەکرد و نەرم نەرم دەیجوی و دەیهێنا و دەیبرد و ماوەی چەند سەعاتێك لەسەر سفرەکە هەڵنەدەستا و چێژوەرگرتن لە ژیانی دەگەیاندە ئەو پەڕی خۆی.

گۆڕانێکی زۆر گرنگ لە تەمیردا بەدی دەکرا. کلاوێکی لبادیی رەشی لێوار پانی لەسەر دەنا. زۆر لە جاری جاران و لەسەردەمی گەنجێتی پتری کار دەکرد. فێر ببوو تەراکتۆر لێ بخوڕێ و سەیارە و مەکینەی دروێنە و خەرمانکوت بخاتە کار و کاریان پێ بکا. دیارە نەدەگەیشتەوە کوڕەکەی، بەڵام لە وەکارخستن و چاککردنەوەی مەکینەکانی کشتوکاڵدا فێری زۆر شت ببوو و ئێرەیی بە هونەری دەست و برد و زیرەکییەکەی کوڕەکەی دەبرد و بە سەرسووڕمانەوە لێی دەڕوانی. دوو کلاوی لبادیی هەبوو. یەکێکیانی بۆ کاروباری مەزرایە لەسەر دەکرد و ئەوی-دیکەی لە بوخچەیەکی هەوریشمین دەنا و تەنیا ئەو کاتانەی سەردانی شاری دەکرد، لەسەری دەنا. ددانی زێڕیشی تێکردبۆوە. دوو ددانی تۆکمە و بێ عەیبی پێشەوەی خۆی دابووە دەست ددانساز.

گۆڕانێکی دیکەش هاتبووە گۆڕێ، ئەویش ئەوەیکە شەوێکیان بە یارمەتیی کوڕەکەی چیی پارەی لە تەنەکەکاندا هەیبوو، هەمووی بردبووە ئەدەنە و لە بانکدا خەواندبووی. بەڵام تەنەکەکان هەر وا لە گۆشەیەکی حەوشەکەدا مابوونەوە. ئاخر بانك هەر دراوی درشتی وەردەگرت. ئالاتەمیر جاروبارەش سەرێکی لە ئەدەنە هەڵدێنا و بۆ خواردنەوەی قاوەیەك سەرێکی لە مودیری بانك دەدا و مودیرەکەش بە زۆر دەیبردە گەورەترین ریستورانتی شارەکە و پەیتا پەیتا پێی دەگوت:"ئەگەر دوو مشتەریی دیکەی وەك بەڕێزتم هەبێ، نەك لە ئەدەنە، بەڵکو لە سەرانسەری تورکیادا کەس ناتوانێ پشتمان لە عەرزی بدا."

ئالاتەمیر ساڵێ یەك دووجاریش وەك جاری جاران بە تەنەکەیەك رۆن و هەنگوینەوە سەرێکی عەولخالق ئەفەنیشی دەدا، کە ئیتر خانەنشین کرابوو و هەروا دەستەونەزەر لە خزمەتیدا قیت و بێجووڵە دادەنیشت:"بە دەستەکانی خۆم ئاخنیومەتەوە. زۆنگاوەکە خەریکە هەڵدەچۆڕێ و وشك دەکات، بەڵام رۆنەکە هەروا بۆنی نێرگزی لێوە دێ. هەنگوینەکەش تایبەتی گوڵی پۆرنەیە. لە چیاکانی لای ئێمە لە دەوروبەری کانیاوە چاوقرژاڵەکان گوڵی پۆنە

دەڕوێن. لۆقمانی حەکیم دەڵێ:"ئەو گوڵە دەرمانی حەفتاودوو دەردانە و پیاو گەنج دەکاتەوە. سنۆبەریش... هەنگوینە سپییەکەی چیاکانی ئێمە...."

عەولخالق بە گەرم و گوڕی میوانداریێتیی دەکرد و ڕێزی دەگرت و لەبەرانبەریدا سەری دادەنواند و بە "ئاغا" و گەورەم ناوی دێنا.

ئالاتەمیر تەنیا شتێکی لەدڵ گران دەهات ئەویش ئەوەیکە وەك جاری جاران نەیدەتوانی خۆی بخاتە سەر دەست و پێی عەولخالق ئەفەنی و دەستی ماچ بکا. بۆ؟ بۆ نەیدەتوانی؟ ئاخۆ لەبەر ئەوەی تەمەنی چوبووە سەرێ یان خاکەڕاییەکەی لێ ببووە لووتبەرزی؟

کوڕە گەورەکەی بەبێ ئەوەی پرسی پێ بکا، مێرسدسێکی کڕی. ئەو نهێنییە ماوەیەکی زۆر لە ئالاتەمیر شاردرایەوە. لە حاڵێکدا ئالاتەمیر هەر یەکەم ڕۆژ، زانیبووی ئەو سەیارەیە بابی چەندەیە و کوڕەکەی ئەو پارەیەی لە کوێوە هێناوە، بەڵام وەڕووی خۆی نەدێنا و وای دەنواند، کە ئاگای لە هیچ نییە. ترۆمبێلەکەیان جار و بارە لەبەر دەرگا نیوەڕووخاوەکەی ماڵەوە ڕادەگرت و تەمیر ئاغا خۆی لێ گێل دەکرد. کوڕە گەورەکەی زۆر زوو سۆسەی ئەوەی کرد کە بابی ئاگای لە هەموو شتێکە و وەڕووی خۆی ناهێنێ. بۆیە ڕۆژێکیان ترۆمبێلەکەی جوان و زەریف شوشت و هێنای و لەبەر دەرگای ماڵێ ڕایگرت و گوتی:"بابە ئەوەم کڕیوە." تەمیر ئاغا تاوێك بەدەوری ترۆمبێلەکەدا هات و سەیری تایە و سوکان و ئاماژە و ئاوێنە و پتر لە هەمووان ئاوێنەکانی کرد و وەك منداڵێك بەدەوریدا هات و دەستی پێدا هێنا و هەڵی کرد و نوورە کەسکەکەی دیت. کەسك، سوور، زەرد... دانیشت، پاڵی لێ دایەوە، پۆزێکی لێ دا و چەند جاران لە ئاوێنەکەیدا سەیری خۆی کرد و... کوڕەکەی لەو ماوەیەدا هەروا سەیری هەڵسوکەوتی بابی دەکرد و چاوی لێ هەڵنەدەگرت.

پرسیی:"لەو شارەدا کێی دیکە ترۆمبێلی ئاوای هەیە؟"

کوڕەکەی بە لەخۆباییەکەوە لە دەنگ و ڕوخساریدا وەڵامی دایەوە:"هیچ کەس."

ئەوەشی بیر خستەوە:"بەڵام قۆرت بۆغا لەو مۆدێلە نییە. هیی ئێمە دوا مۆدێلە."

"کەوابوو کەسی دیکە لەو شارەدا لەو جۆرەی نییە؟"

"نییانە."

لە ترۆمبێلەکە دابەزی و تۆزێکی لێ دوور کەوتەوە و چاوی بڕییە تەشقی ئاسمان و ئەوجار ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"کەوابوو لە شارەکەدا، هیچ کەس تەنانەت تاقە سەیارەیەکیشی لەوە نییە؟"

"نییە."
"بانگی براکانت بکە بێنە ئێرە."
کوڕە رای کرد و تاوێك دواتر لەگەڵ سێ گەنجی خۆڵاوی و تۆزاویدا گەڕایەوە.
ئالاتەمیر چەند جاران زاری کردەوە ویستی شتێك بڵێ، بەڵام دەنگی نەهاتە دەرێ. لە جێی خۆی تەکانێکی خوارد و چەند جارێك هەروا لە خۆڕا خولایەوە. پێکەنی، نێوچاوانی تێك نا. کوڵی گریانی هەستا. لێوەکانی لەرزین و هەڵقرچان. دیسان پێکەنی و لەحاڵێکدا هێشتا شوێنەواری گریانەکە تەواو لە روخساری نەسڕابۆوە... ئاخرییەکەی وەدەنگ هات:"کاکتان دەڵێ لەو شارەدا کەس لەو سەیارەیەی نییە."
کوڕە نێونجییەکەی گوتی:"نییە."
بچووکترەکەش لەسەر قسەی برای لەخۆی گەورەتری گوتی:"لە ئەدەنەش هەر دوو یان سێ دانە لەوە هەیە."
ئالاتەمیر سییەکانی پڕ کرد لە هەوا و گوتی:"ئێمە کارمان بە ئەدەنەوە نییە."
پاشەبەرەکەی گوتی:"لە شارەکەدا هەر نییە."
ئالاتەمیر گوتی:"کەوابوو هەر ئەمڕۆ دەچیتە ئەدەنە و ئەگەر لەوێش نەتدۆزییەوە، دەچیتە ئەستەمبۆڵ و بۆ هەر کامەیان ترۆمبێلێك لەوە دەکڕی. ئەوانەی دەرس دەخوێنن، نایانەوێ. ئەوان دەخوێنن و ئەوەندەیان بەسە. ئەنگۆ زەحمەت دەکێشن و کار دەکەن. دوایی کە لە قوتابخانە گەڕانەوە، ئەگەر ویستتان براکانتان سواری ترۆمبێلەکانتان بکەن."
وێکڕا گوتیان:"سواریان دەکەین بابە."
لە نێودڵی ئالاتەمیردا هەڵڵا و هەنگەمەیەك بەرپا ببوو. فرمێسك وەك باڕێژە لە چاوانی هەڵدەوەرین و گریان ئەوکی گرتبوو. بۆ ئەوەی کوڕەکانی فرمێسکی بەچاوییەوە نەبینن، رووی وەرگێڕا و رای کردە ماڵەوە و چوو لە سندووقخانەکەدا دانیشت و لە بانگی دا و وەك بارانی پەڵە فرمێسکی رژاند. دایکی کە لە برسێتی و نەداری گیانی دەرچوبوو و تەنانەت گۆڕێکیشی نەبوو، بە سەرکزییەوە هاتە پێش چاوەکانی. دوایی یەك بە یەك برا رووت و قووتەکانی و کە هەموان لە برسان رەقەڵاتبوون و باوکی کە تەنیا لینگە گۆرەوییەکی نەخشداری لە هەندەرانەوە هێنابۆوە، هەموو هاتنەوە بەر چاوی. لەو کاتەوە هاتبووە چوکووراوا، نەگریابوو. دوای ئەوەی تێر بەدڵی خۆی گریا، دڵی پڕ بوو لە خۆشی و شادی. کڵاوەکەی لە بوخچەکەی

دەرهێنا و لە ماڵەکەی هاتە دەرێ و بە پتە تەکاندی و ئاخرییەکەی لەسەری نا و بە کوڕە گەورەکەی گوت:"سوارم بکە و بمبە کافتریای شار."

دەرگای ترۆمبێلەکەی کردەوە و دانیشت و پۆزێکی لێ دا و دەکرێ بڵێی بۆ یەکەم جاری بوو، دەیویست لاق بخاتە سەر لاقەکانی. بەڵام رانە ئەستوورەکەی نەچووە سەر رانەکەی دیکەی. ئەوجار سەری هێنایە دەرێ و گوتی:"ئەوە بۆ وا واق وڕماو سەیرم دەکەن؟ بڕۆن سەیارەی خۆتان بکڕن دەی... دراوەکەی ... لە زمانی منەوە سڵاوی مودیر بانك بگەیەنن یان ... راوەستە با بزانم بایی چەندەیە؟"

کوڕە گەورەکەی گوتی: بایی ئەوەندەیە. ئالاتەمیر دەستی برد و دەستە چەکەکەی دەرهێنا و دایە کوڕە گەورەکەی و گوتی:"بنووسە. سێ دانە. وەك یەکیش بن. جۆرێکی دیکە بن قەبووڵم نییە.

گەنجەکە نووسی. ئالاتەمیر دوای ساڵێك هەوڵدان فێری ئیمزایەك ببوو. ئارەقەی لەبەری پێی رۆیشت و بە هەزار زەحمەت هێڵێکی خواروخێچی کێشا و سەرکەوتووانە گوتی:"هانێ."

ترۆمبێل هەڵبوو.

جافر ئۆز پۆلاد لە کافتریاکەدا بەپیرییەوە چوو و باوەشی پێدا کرد. هەر هەمووان پێکەوە هەر لە داواکاری گشتییەوە هەتا قایمەقام و پارێزەرەکان هاتنە سەیری سەیارەکەی.

جافر ئۆز پۆلاد سەری بردە بن گوێی و گوتی:"مزگێنییەکی خۆشم پێیە بۆت تەمیر، دەبێ خەڵاتێکی باشم بدەیتێ."

تەمیر بە چاوی پڕ لە خەندەوە سەیری کرد و گوتی:"مزگێنی و خەڵاتت لەسەر چاوم، کوڕی ئاغاکەمان. تەنانەت ئەگەر خەبەرەکەت خۆشیش نەبێ ئەمن بەسەر و گیان لە خزمەتتدام."

جافر ئۆز پۆلاد تاقە پاشماوەی دەرەبەگەکانی عێلی چوکووراوا بوو کە هێشتاش خۆی راگرتبوو. باوکی لە هەژاری و دەستکورتیدا مردبوو، بەڵام عێلەکەی کە دوازدە گوندیان گرتبوو، ئەویان نەك هەر وەك جاری جاران، بەڵام هەروا بە ئاغای خۆیان دەزانی و کەم وابوو بە قسەی نەکەن و قسەی بشکێنن. لە کاتی کۆڕەوەکەدا لە یەکێك لە گوندەکاندا کۆشکێکی گەورەی بنیات نابوو. یەکێك لەو گوندانە، هەر ئەوەی لە هەمووان شەڕانیتر بوو و هەموو پیاوەکانی خەریکی ئەسپ دزین بوون، لە قسەی بەگ دەرنەدەچوون و وەك جاری جاران گوێ لە مستی بوون. کۆشکە بەرزەکەی بەگ، کە چوبووە نێو گۆرانی و لاوکەکانیشەوە، بە رووکارە

سپیەکەی و شووشەی روونی پەنجەرەکانییەوە، لە نێو کۆخ و کۆلیتەکانی ئاواییدا شان و شکۆیەکی هەبوو.

جافر ئۆز پۆلاد دوای مردنی باوکی، لەگەڵ دوو براکەی بە هەژاری و نەداری ژیان. یەکێك لە براکانی بڕوانامەی یەکەمی دواناوەندیی وەرگرت و پێی دامەزرا و دەستی کرد بە ئارەق خواردنەوە. ئەو برایەیان یەکێکی خاکەڕا و لەسەرخۆ بوو لە بێزار بوو لە هاش و هووشی دنیای دەرەبەگایەتی. ئەوی دیکەیان کە شەڕانی و قوون بەگێچەڵ بوو، دوای تەواوکردنی دواناوەندی گەڕایەوە گوند و ئاغایەتیی گوندی ئەسپ دزانی دەکرد. جافر لە دوو براکەی دیکە گچکەتر، بەڵام بەخۆوەتر و کەڵەگەتتر بوو. بەگزادەکان خۆ لە زۆرانبازی نادەن و ئەوە لە شانی خۆیاندا نابینن، بەڵام جافر لە زەماوەند و شاییەکاندا زۆرانبازیی دەگرت و پشتی خەنیمەکانی خۆی لە عەرزی دەدا و تەنانەت چەند خەڵاتێکیشی وەرگرتبوو. چوارشانە و رەش ئەسمەر بوو. نێوچاوان پان و شەویلگە توند. لە کاتی رێگارۆیشتنێدا ئەستۆی قیت قیت رادەگرت و سەیری ئەملا و ئەولای خۆی نەدەکرد. بۆینباخی دەبەست و بەردەوام پانتۆڵی ئۆتوو لێدراوی لەپێ دەکرد و دەسرۆکەی رەنگاورەنگی لە گیرفانی چاکەتە خەتخەتییەکەی دەنا. دەنگێکی عەنتیکە و تایبەتی هەبوو و گۆرانیی تورکمانیی زۆر بە سۆزەوە دەچڕی.

ئەو بەگزادانە ساڵی ساڵان لە دەم ئاقچاساز دەژیان. سەروەت و سامانیان زیادی نەکرد بەڵام لە برسانیشا نەمردن... بەشێکی هەرە زۆری ئاقچاساز قامیشەڵان و سێسوو و حەیزەران دایگرتبوو. زۆربەی ماڵەکانی چوکووراواش بەو قامیشانە دروست دەکران.

بەگزادەکان کە هاوین دادەهات قۆرغچی و دەشتەوانیان لە ئاقچاساز دادەنا و پارەیان لەو گوندییانە وەردەگرت کە دەهاتن بۆ بڕینەوەی قامیش و دروینەوەی سێسوو و حەیزەران.

بەگزادەکان ساڵی ساڵان بە داهاتی بەرهەمەکانی ئاقچاساز دەژیان. دواییش ئەو بەشەی ئاقچاساز کە وشك بۆوە، دەستیان بەسەردا گرت. کە قامیشەکانی ئاقچاسازیان دەفرۆشت، کەس پێی نەگوتن باشە بۆچی بۆ ئەو قامیشانە پارەمان لێ دەستێنن. دەشتەوانەکانی بەگزادەکان، هەرکەسیان لە قامیش دوورینەوەدا گرتبا، ئەوەندەیان تێهەڵدەدا شل و کوتیان دەکرد و زۆرجارانیش ئەسپەکانیان دەدزین و مانگاکانیان لێ بریندار دەکردن. کاتێ هەزاران دۆنم زەوی وشکەوەبووی ئاقچاسازیان داگیر کرد، کەس ئەقڵی بەوە نەشکا کە لێیان بپرسێ ئەو زەوییان بۆدەبێ بەئێوە ببڕدرێ. نەشیاندەتوانی پرسیاری وا بکەن.

لەو سەروبەندەدا ماراشییەکان لەگەڵ دەوڵەمەندەکانی شارۆچکەکە بە شەریکایەتی، برنجیان دەچاند و جافر ئۆز پۆلاد ئەو زەوی و زارەی لە ئاقچاساز هەیبوو کە یەك و چل یەك و پەنجا حاسڵاتی لێ دەکەوتەوە.... ئەو زەوییانە تازە وشك ببوونەوە و ئەو چەند کەسێکی شەڕلاتان و شەڕانی و ئەسپ دزی لەبەر دەستدا بوون، بەڵام پارەیەکی وای نەبوو بتوانێ زەوی و زارەکەی داچێنێ. برنج لە مانگی جۆزەرداندا دەچەقێنرێ و لە نیوەی دووەمی خەرماناندا دەدووردرێتەوە. یەك و سەد، یەك و سەدوسی بەر دەگرێ. ئەگەر ئەو ساڵە گلێرە و تەرزە نەبارییبایە و بارانی بەردەوام نەبارییبا. پاڵە یەکسەر ژیانی دەگۆڕدرا و خەنی دەبوو. زەوی و زارەکە پێویستیان بە کێڵان نەبوو. هەر ئەوەندەی بەس بوو شەتڵەکەی تێدا بچەقێنی و ئاوی بدەی... مێش و مەگەز هەموو وڵاتی داگرتبوو و هەزاران کەس لەو دەشتەدا تووشی نۆبەتێ دەبوون و کەس نەبوو نۆبەتێی نەگرتبێ. ئەوەندەی بوو لەبەرانبەردا پارەیان وەدەست دەکەوت. پارە پەیدا دەبوو، بەڵام سەرانسەری دەشتەکەش بە درێژایی هاوینێ یەکسەر دەبووە زۆنگاو ... قەی چی دەکا؟

جافر ئۆز پۆلاد جینگڵی دەدا و حەجمینی نەبوو. دەگەڕا، بێت و لیرەیەکی لە یەکێك وەگیر کەوتبایە، ئەوە گرێ کوێرەی کارەکەی بۆ دەکردەوە. ئەگەر ئاوا رۆیبایە، ئاقچاساز وردە وردە وشك دەبوو و ئەویش کە داهاتەکەی لەسەر فرۆشتنی قامیشەکەی ئاقچاساز بوو، ئەوەشی دەبڕا. ئەو زەوی و زارەی لە زۆنگاوەکە هاتبوونە دەرێ، دەبوو داچێنرێن... لەو کاتەدا حیزبی دیموکرات هێشتا جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە نەگرتبوو و بانکەکان ئەو هەمووە وام و پارەیەیان بۆ موڵکی ئاغا و دەرەبەگەکان تەرخان نەکردبوو.

یەکێك لە برادەرەکانی جافر ئۆز پۆلاد پێشنیارێکی پێ کرد:"سەیر کە جافر بەگ، لە یەکێك لەو گوندانەی هۆبەکەی تۆدا کابرایەك هەیە هەر خوا دەزانێ چەندە دەوڵەمەندە. هەر یەك نا، زیاتریش. چەندی پارەت بوێ دەتوانی لێی وەرگری."

جافر بەهیواوە پرسیی:"کێیە؟"

"تەمیر".

تیشکی هیوایەك لە چاوەکانی ئۆز پۆلاددا درەوشایەوە. بێدەنگ بوو.

"تەمیر؟ هەی چاوی سەرم بی. چما تەمیر پارەی لە چنگی دێتە دەرێ. تەمیر گیانی دەدا بەڵام دراوێکی سووتاو بەکەس نادا. کەس لەو هەتیوە هیچ و پووچتر و لەچەرتر نییە. نان نەخۆرێکە هەر مەپرسە."

"دەی چییە، تاقیی بکەوە. کاتێ تووشت دەبێ، چ دەکا؟"
"وەڵلا جا دەستەونەزەر رادەوەستێ."
"ئەی کە سلاوی دەستێنییەوە چ دەکا؟"
"جا چ دەکا، زاری هەتا بن گوێچکەی دادەپچڕێ و لە خۆشیان خەنی دەبێ."
"جا دەزانی چ بکە؟"
"دەزانم."

ئەو شەوە جافر ئۆز پۆلاد هەتا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. تیشکی هیوایەك دڵی رووناك دەکردەوە. رێك وەرزی برنج چاندن بوو و شەتڵ کاری ماراشی هەوڵیان دەدا لەگەڵی ببنە شەریك. چونکە ئەو زەوی و زاری هەبوو و دەشیتوانی بە نرخێکی زۆر کەم زەوی و زار لە گوندییەکان بکڕێ.

کەڕەی بەیانی وەخەبەر هات. ردێنی تاشی و عەتری لەخۆی دا و پانتۆڵە سوارییەکەی و چەکمەکانی لەپێ کرد. لەمێژبوو چەکمەی لەپێ نەکردبوو. بەڵام ئەمڕۆ لەپێی کردن. چونکە پێی وابوو چەکمەکانی کاریگەرییەکی پتر لەسەر ئالاتەمیر دادەنێن. دەسرۆکە سوورەکەی لە یەخەی چاکەتە نیلییەکەی دا و درزیلەیەکی گەوهەر نیشانیشی لە بۆینباخە سوورەکەی دا و قامچییەکی دەسك زیوکفتی بە دەستەوە گرت و سمێڵی بادا. ئەسپەکەی زۆر وێچوو نەبوو. ئەو ئەسپە دزییە تازە لە ئۆرفەوە هاتبوو. زینێکی چەرکەزییانەی زیوکفتیان بۆ ئەسپە عەرەبییەکەی دراوسێ پەیدا کرد.

لە سەر ئەسپەکە شان و شکۆیەکی کارتێکەری هەبوو. بەرەو گوندەکەی باجاق لێی خوڕی. سەعاتێك دواتر لە حەوشەی ماڵەکەی ئالاتەمیر بوو.

"تەمیر، تەمیر، تەمیر ئاغا."

دەنگی زایەڵەیەکی ئاغایانە و لووتبەرزانەی تێدابوو. قامچییە زیوکفتەکەی بەدەستی راستییەوەو دەستی چەپەی لەسەر رانی دانابوو. لەنێوماڵی زینەکە قیت دانیشتبوو و لە بن برۆ تێکنراوەکانییەوە سەیری پێش خۆی دەکرد.

ئالاتەمیر دەنگەکەی ناسیبۆوە. بە هەڵەداوان و لە حالێکدا پانتۆڵەکەی هەڵدەکێشایەوە، هاتە دەرێ:"فەرموون بەگ. فەرموون، فەرمووی بەگم. بەخێرهاتی و گەورەت کردم. خێر و بەرەکەتت هێنا. سەربەرزت کردم. ئەوە خۆر لە کام لاوە هەڵاتووە وا بەگمان بەسەری کردوومەوە؟"

ئاوڕی دایەوە و بە تین و خرۆشەوە هەرای کرد:"کچێ ژنەکە، ژنەکە وەرە بزانە ژنەکە. وەرە بزانە کێ هاتووە؟ وەرە بزانە کێ هاتووە..."

هەوساری ئەسپەکەی گرت:"فەرموون، فەرموو بەگ."

جافر بەگ هەروا لە پشت ئەسپەکەیەوە دانیشتبوو و دوای ئەوەی تاوێك سەیری دوور دووری کرد، بەسپایی لە ئەسپەکەی دابەزی و وەژوور کەوت و لەسەر دۆشەگەڵەیەك کە ژنەکە لە تەنیشت ئاورگە کوژاوەکە رایخستبوو، دانیشت و پاڵی وەپاڵەوپشتەکە دا و لاقە چەکەمەپۆشەکانی درێژ کرد.

تەمیر ئاغا داخ و کەسەری خۆی دەربڕی:"کوڕە لەو دەوروزەمانەیەدا کار و گرفتاری... ئەمن چ بکەم، چ بکەم برالە. ئەوە خاوەن شکۆمان بەندەی خۆی بەسەر کردووەتەوە و هاتووەتە ماڵەکەم و خۆزگە کوێر بوایەم، خۆزگە نەژیابایەم... کوڕە لەو کاولاشەی مندا خۆ کووپە قاوەیەکیش دەست ناکەوێ، ئیستیکانە چایەك، پەرداخە دۆیەکیش...."

خۆی حەجمینی نەبوو و ژنەکەش لە قوژبنێك هەڵکورمابوو و چاوێکی کردبووە چوار چاو و سەیری جافر بەگی دەکرد وەك بوونەوەرەرێکی سەیر و سەمەری دیتبێ.

جافر ئۆز پۆلاد بە دەنگێکی زایەڵەدار و پتەو و لەسەر خۆ گوتی:"هیچم پێویست نییە."

تەمیر داسەکنی و بێدەنگ دەستەونەزەر راوەستا و چاوی لە زاری بڕی. "وەرە دانیشە. ئەگەر راستیت دەوێ، بۆ کارێك هاتوومەتە سەر بەڕەکەت. گوتم تەمیر لە خزم و عەشیرەتی خۆمە."

تەمیر هاتە پێشەوە و لەبەر چەکمەکانی ئۆزپۆلادەوە لە سەر چۆکان دانیشت.

جافر ئۆز پۆلاد بۆ ئەوەی کەڵك لەو یەکەم کاریگەرییەی وەرگرێ، بە چاو تێیگەیاند کە زەعیفەکە بچێتە دەرەوە. ژنەکەی دەسبەجێ هەستا و دوای ئەوەی کونجکۆلانەی سەیرێکی مێردەکەی کرد، چووە دەرێ.

"تەمیر، هاتوومەتە لات. بۆ ئەوەی من بەگی ئێوەم و چاوەڕوانی یارمەتیم لێتە. ئەتۆ دەوڵەمەندترین و پڕکارترین و ماقووڵترین و ئازاترین پیاوی عێل و عەشیرەت و هۆبەکەمانی. لە چیا و لێڕە کێوییەکانەوە هاتی، بەڵام نانەکەت دەخۆن، بەڵام گوێشت لێ دەگرن. ئەمن و هەموو عێلەکەم شانازیت پێوە دەکەین و ناوت وێردی زار و زمانمانە. لەو دەمەوە تۆ هاتوویەتە ئەو گوندە، ئەو گوندە رەسەنایەتی و ماقووڵبوونەکەتی..."

دەبوایە بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی زیاتری لەسەر دابنێ، کۆمەڵێك وشەی عەرەبی و فارسی بەدوای یەکدا ریز بکات.

"عەلی کوولل‌ی، بەعام تۆ بوویتەتە پیاوێکی ماقووڵ ... کە لە نێو پیاوماقووڵاندا مەقام و روتبەتەیەکت هەیە و لەبەر چاوی کافرانیش..."

ئالاتەمیر لە حاڵێکدا سەری دەلەقاند و زاری هەتا بن گوێچکانی داپچڕیبوو، چاوەکانی قیچ کردبوون و لە زاری بەگەکەی خۆی کە هاتبووە ماڵی، ورد ببۆوە و گوێی لە قسەکانی گرتبوو. کانیاوی هەنگوین بوو لە زاری هەڵدەقوڵی. ئای چەندێ جوانیش قسەی دەکرد و لێشی تێنەدەگەیشت."

"بناو علیە، کە تۆ دواتر هاتی، ئێمە بە دڵ و گیان وەرمانگرتی."

جافر بەگ قسەکانی خۆی تەواو کرد و چاوە سەوزە پۆڵاییەکانی لە چاوی تەمیر بڕی و چاوەڕێ ما و کە تەمیر دەیەویست چاوی لێ بدزێتەوە، نیگای سواری چاوی کرد و گوتی:"داوایەکم لێت هەبوو."

"فەرموو بەگ، ئەمرت چییە، ئەمر بفەرموو."

"دەمەوێ برنج بچێنم. دەمویست لەگەڵ تۆ ببمە شەریك. لەبەر ئەوەی من..."

"بەگ... من من... ئاخر ... م مـ.."

قسەکەی پێ بڕی:"هاتووم ... سەد هەزار لیرەم بدەیتێ."

ئەوجار توند گوتی:"تێگەیشتی؟"

"بەگ... بەگ... بەگ..."

"نەقد ... قەباڵەش دادەنێم... کە پاییز داهات، سەد هەزارەکەت بە بەهرەکەیەوە دەدەمەوە. تەواو."

"بەگ، بەگ، لەکوێ بێنم..."

"بەگوێمدا ناچێ. هەتە... دەشزانم هەتە و چەندیشت هەیە... ئەتۆ کە هەڵۆ..." هەستایە سەرپێ و بە "بەگ، بەگ..." گوتن و سەرسوورڕماو وەدەر کەوت. سوور سوور هەڵگەڕابوو و چاوەکانی زەق ببوونەوە:

"ژنەکە، ژنەکە، گوێت لێ بوو تووشی چ بەلایەك بووین؟ گوێت لێ بوو؟"

ژنەکە بەبێ ئەوەی وەسەر خۆی بێنێ گوتی:"چما چ بووە؟"

"بەگ پارەی لێمان دەوێ، ئەویش سەد هەزار. دەیەوێ لەگەڵمان ببێتە شەریك. بۆ برنج چاندنێ..."

"ئێ ێ ێ، دەی جا بیدەیە. مادام بەگی گەورەمان، هاتووەتە دەرگامان، چما دەکرێ بە دەستی بەتاڵ بەڕێی بکەینەوە؟ کوڕە شەرم بتگرێ پیاوەکە. هەی خودا کوێرت بکا. بەگ، بەگ، کوڕە بەگ هاتوووەتە بەردەرگامان... تێگەیشتی پیاوەکە؟"

تەمیر گەڕایەوە ژووری و لەسەر جێیەکەی خۆی دانیشتەوە.

"بیست و پێنج هەزارم هەیە."

جافر بەگ کە گوێی لە قسەی ژنە ببوو، دڵنیا بوو سەد هەزارەکە وەردەگرێ. بەبێ ئەوەی وەسەر خۆی بێنێ، لەسەرخۆ گوتی:"نا، نا، بەس نییە."

تەمیر دیسان چۆوە دەرێ.

"بە بیست و پێنج هەزار قایل نەبوو."

"چەندی ویست بیدەیە و واز لەو سەرسواڵکەرییەت بێنە. خۆ بەگ پارەکەت ناخوا... ئەوجار بشیخوا با بیخوا چییە. نۆشی گیانی بێ."

گەڕایەوە و دیسان ئەژنۆی دادا و کەوتە نووزانەوە و لاڵانەوە. بەگ چاوی لێکنابوو و گوێی دابووە قسەکانی. دوای ئەوەی تێر نووزایەوە و بە سوێندانەوە شین و ڕەش بۆوە و زۆری پرتە پرت کرد و پشووی لێ بڕا، جا بەگ وەقسە هات:"پێویستم بە سەد هەزارە. یەك فلْسی کەمتر بێ نابێ."

تاوێك بێدەنگ بوو. بەگ بەچاوی لێکنراوییەوە چاوەڕێی بوو و تەمیر لەسەر ئەژنۆی دانیشتبوو و بیری دەکردەوە. ئاخرییەکەی تەمیر سەری هەڵێنا:"بەگ، بەگ، قەباڵەم لێت ناوێ. ناشبمە شەریکیشت. قەرزت دەدەمێ و ئەتۆش پاییزێ دەمدەیتەوە. باشە؟"

"باشە."

تەمیر بە پێوە ڕاوەستا و گوتی:"ژووری گەرمە. وا باشترە بچینە دەرێ و لە بن دارتووەکە دانیشین. دەبێ بشمبووری..."

جافر ئۆز پۆلاد دووقرانییەکەی کەوت. دەسبەجێ هەستا و وەدەر کەوت. بەر لەوەی بگاتە بن دارتووەکە، ژنەکەی غای دا و دۆشەگەڵەکەی هێنا و لە بن سێبەری دارەکە بۆی ڕاخست. بەگ دانەنیشت. هەر وا بە قامچییەکەی لە ملیوانی چەکمەکەی دەدا و کەوتە پیاسەکردن.

ئەوجار سەری هەڵێنا و بە ژنەکەی ـ کە لەسەر جێی خۆی وسك هەڵاتبوو ـ گوتت:"چۆنی خوشکە؟ باشی؟"

ژنە وەڵامی دایەوە:"سەری بەگمان سلامەت بیٚ. بۆ دەبیٚ باش نەبم؟ لە سایەی سەرتانەوە باشین."

"ئەی منداڵەکان چۆنن؟"

"بەنۆکەرت بن، باشن..."

دیسان نێوچاوانی تێکنایەوە و کەوتەوە بیرکردنەوە و پیاسەکردنەوە و بەقەمچی بەربۆوە لێدانی ملیوانی چەکمەکانی."

تەمیر لە ژوورەوە قوتووەکانی دەرهێنا و دراوەکانی هەڵڕشتبووە سەر جلێك و دەیژماردن.

تەمیر هەتا نیوەڕۆ هەر دراوی ژمارد و جافر ئۆز پۆلادیش هەروا پیاسەی کرد و بە قەمچی لە ملیوانی چەکمەکانی دەدا و بە تیلەی چاوان و بە گومانەوە سەیری ماڵەکەی دەکرد کە نەکا تەمیر کلاوی لەسەر نابیٚ و بۆی دەرچووبیٚ.

ئاخرییەکەی تەمیر بە توورەکەیەکەوە هاتە دەریٚ. جافر بەگ بە دیتنی کەیفخۆش بوو و ئەوەندە دڵی خۆش بوو حەزی دەکرد لە هەمبەر ئەو دووانەدا و لەسەر ئەو خۆڵ و خاك و پەین و پاڵەی بەسەر عەرزەکەوە بوو، خۆی بگەوزێنیٚ و هەر لێرەوە بە حیندرخۆ و سەرموقلات تا دەرەوەی گوندەکە بڕوات. بەڵام بۆ ئەوەی شادییەکەی دەرنەخا، دانی بەجەرگی خۆیدا گرت و لەسەرخۆ و بەبیٚ هەڵپە سواری ئەسپەکەی بوو و توورەکەکەی لە تەمیر، کە بە هەردوو دەست بۆی راداشتبوو، وەرگرت و گوتی:

"هەر بژی و عەمرت درێژ بیٚ تەمیر."

جا پێی لە رکێفان نا و ئاوڕێکی دایەوە و دیسان گوتی:"ئەتۆش عەمرت درێژبیٚ و رووت سپی بیٚ خوشکە."

ئەسپەکەی لە حاڵێکدا تەپوتۆزێکی لە پشتەوەی خۆی هەستاندبوو، خوشی و وەك ئەستێرەیەکی راخوشیو لە چاوان ون بوو. جافر ئۆز پۆلاد لەگەڵ ماراشییەکاندا ببوە شەریك و سیٚ هەزار دۆنم زەویی چاندبوو. بۆ باقی دراوەکەشی، بەشێك لە موڵك و زەوییەکەی بە رەهن دانابوو و دابینی کردبوو.

پاییز داهات و حاسلات کۆکرایەوە و خەرمانی شەلتووك هەلدرایەوە. جافر ئۆز پۆلاد ئەوەندەی پارە وەسەر یەك نا، بەشی حەوت پشتی دەکرد.

هەموو زانیبوویان کە تەمیر ئەو دەسمایەی خستبووە بەردەستی جافر ئۆز پۆلاد. هەندێك هەر پێیان سەیر بوو و هەندێکیش وەبەر جنێویان دا. "گەواد، بۆخۆی وەك سەگ بەدووی پاروە نانێکدا دەچێتە ئەوسەری دنیا و لە برسان وەختە گیانی دەربچێ و خەلکی دیکەش ئاوا پێدەگەیەنێ."

کێچیان خستە کەولی تەمیرەوە. دەگەیشتە هەر کوێیەك، باسی سەد هەزارەکە دەهاتە گۆڕێ.

"جافر ئۆز پۆلاد سەد هەزارەکەت دەداتەوە، کۆلێکیش بەهرەی لەسەر دەبێ. ئەدی ئەدی تۆ پەلەی مەکە. شەیتان پەلەی کرد چاوی خۆی کوێر کرد. کەرە مەمرە بەهار دێ، کورتان بۆ لەشار دێ..."

"ئاخ، ئاخ، ئاخ، ئاخ، تەمیر ئاخ ئاخ. کوڕە خودا ئەو گیانەی پێی داوە، بۆی ناستێنرێتەوە. ئاخ، ئاخ... یانی ئەوەی گیان بە خودا ناداتەوە، پارەی تەمیر دەداتەوە. قەت بڕوا بە شتی وا مەکە."

"با چ گیان کەنشت و خوێنی دلّ خواردنەوەیەك ئەو سێ چوار فلسەت خستبووە سەر یەك داماو. چما خوا کەری کردبووی ئاوا لە زاری پشیلەت هاویشت.؟"

"ئای خۆزگە ئەو هەمووە پارەیەت ئاگر دابایە و چەند لیرەیەکت دابایە بە جووتە پێلاوێك لەو پێیانەتت کردبایە و پانتۆلێکت کڕیبایە قوونتت پێ شاردبایەوە و چاکەتێك بۆ بەری خۆت کڕیبایە و لە نێو خەلکی خوایدا وەك بنیادەمان چووبای."

"ئەوانە دەرەبەگن تەمیر. هەر بیریش لەو پارەیە مەکەرەوە. ئەوانە، نە لەو شتە دەپرسنەوە و وەریدەگرنەوە کە دەیدەنە یەکێك و نە ئەو شتەش دەدنەوە کە وەریانگرتووە."

"ئەتۆش هەر لێرەوە راست بڕۆوە و واز لەو سەد هەزارە بێنە و بیریشی لێ مەکەرەوە."

"سەیر بکە، ئەوە چەند مانگە حاسلات و خەلەوخەرمان هەلگیراوەتەوە. پارەی خۆشی وەرگرتووە، ئەی بۆچی دراوەکەی تۆ ناداتەوە؟. چونکە نایەوێ پێتی بداتەوە. چونکە ئەو هەمووە پارەیەی وەریگرتووە، نۆشی گیانیشی کردووە."

"داماو، تەمیری داماو."

"مالّی خۆنەخۆری، لەبۆ چکمە بۆری."

"کوڕه ئەوە ئەوپەڕی بێ ویژدانییە. بێ ویژدانییەکی تەواو. بێ ویژدانی و بێ ئینساقی، جا وەرە پارە لە یەکێك وەرگرە و بەو پارەیە برنج بچێنە و ملوێنێکت پێ ببڕێ ئەوجار خۆش بدزیتەوە لە دانەوەی قەرزەکەت. کوڕە هەر لانیکەم نیوە، نیوەی ئەو پارەیە بدەرەوە بەندەی خودا. ئینساف شتێکی باشە..."

"سەیرکە تەمیر، نەکا بە مێشکتدا بێ و بچیتە لای جافر بەگ و داوای پارەکەی لێ بکەیتەوە. شتی وانەکەی. ئەو بەگانە بەزەیی و روحم و دڵیان نییە. ئەوانە وەك ئاوخواردنەوە پیاو دەکوژن. هەم پووڵەکەت دەچێ و هەم دەبینی تەرمی بۆگەنکردووت لە خەرەندێکدا دەدۆزرێتەوە. ئەگەر لە منت دەوێ، لەخێر و بێری ئەو پارەیە بچۆ دەرێ."

"نەکا، نەکا مل لەبەر ملی بنێی ها تەمیر. ئالاتەمیر، نەکەی، نەکەی...."

"ئەوانە وەك ئەسپی چەمووش وان. کەس نازانێ لە کام لاوە جووتە داوێن."

تەمیر گوێی لە هەموو ئەو قسانە دەبوو و متەقی نەدەکرد. دادەنیشت و ئەو تەپوتۆزەی لە جلوبەرگەکەی نیشتبوو، بە شووڵێك دەیتەکاند. چاوە وردەکانی لە بازنەی هەوڵێکی خۆڕایی و بیرکردنەوەیەکی ناخۆشدا وردتر دەبوونەوە و لەگەڵ تێپەڕینی رۆژەکاندا پتر تێك دەسڕما و روومەت و بن چاوەکانی پتر بەقووڵدا دەچوون و دەستەکانی دەلەرزین.

هەموو رۆژێك بەر لە تاوهەڵاتنێ لەخەو هەڵدەستا و وەدەر دەکەوت و دەستی دەکردە سێبەری چاوەکانی و هەتا تاو دەکەوت سەیری رێگەی گوندەکەی جافر ئۆز پۆلادی دەکرد بەشکم پەیدا بێ. کە تاو هەڵدەهات، دەگەڕایەوە ماڵێ و شلە برۆێشەکەی هەڵدەقوڕاند و دیسان لە ماڵەکەی دەچووە دەرێ و بە دڵی پڕ لە هیواوە شێلگیرانە چاوەڕێی جافر ئۆز پۆلاد دەبوو... حەیف بوو بۆ ئەوە هەمووە پارەیەی کە فلس فلس خستبوویە سەر یەك... ئاخری هەر دێ... بەگ دێ.

زستان داهات و سەرما هەڵی کرد و با و بۆران و کڕێوە و باڕن دنیای شێواند و بەفر رەشایی لە وڵات بڕی و دیسان بەگ هەر سۆراغی نەبوو.

"نایە. نایە نا تەمیر. دڵنیا بە بەگەکەمان هەر نایە."

"نایە."

"نایە."

بارانە دوورودرێژەکانی چوکووراوا هەر وەك داو و هەودایەکی لە ئاسمانەوە رۆهێشترابێنە سەر زەوی، دەستیان پێ کرد. دەباری و خۆشی نەدەکردەوە... ئالاتەمیر لە بەر باو باڕن و

بۆران و بەفر و باراندا خووساو و کرووشمەکردوو، لە تەنیشت ماڵە قامیشییەکەی چاوەڕێی هاتنی بەگەکەی، سپی داگەڕا.

شەوێکیان بەخۆی گوت کە ئیتر وا نابێ. لەوانەیە هەر لەبیریشی نەمابێ. بەگەکان زوو شتیان لەبیر دەچێتەوە. با بچم و خۆمی پێشان بدەم تا بزانم چ دەبێ. دەستی دایە تێلاکەی و ملی ڕێیەی گرت. تەمیر هەر چنگە ئێسك و پرووسکێکی لێ مابۆوە. لە ڕێگا ئەژنۆکانی دەلەرزین و بەر چاوی ڕەش دەبوون و دادەنیشت و پشوویەکی دەدا و ئاهێکی وەبەر دەهاتەوە و بیری لەوە دەکردەوە کە بڵێی هەر بەراستی من تووشی وەها ڕۆژێك هاتووم؟ کەواتبوو دەرد و ئازاری بزرکردنی پارە لە کوڕ مردنێك ناخۆشترە؟ بەڵام ئێستا، تاوێکی دی دەگەیشتە کۆشکی بەگەکەی و بەگەکەی هەر چاوی پێی بکەوێ، سەری دەسوورمێ و دەڵێ ... زۆر داوای لێبوردن دەکەم... زۆر زۆر داوای لێ بوردن دەکەم... کوڕە خۆ هەر لەبیریشم نەمابوو... هانێ، هانێ براله دراوەکەت... دەبوو خۆم بیهێمەوە ماڵێ...

کوڕە بەگم، سەری تۆ سلامەت بێ ماڵی دنیا چییە. ئەمن ئێستا پێویستیم پێی نییە، با هەر لای خۆت بێ. هەر کات لێت زیاد بوو، دەمدەیتەوە. پێویست نییە گیانی من. گیان و ماڵمان بەقوربانی بەگەکەمان بێ. جا کێ بەگی وای هەیە. جا دراوەکەی وەردەگرێتەوە و دەیخاتە تەنگەی باخەڵییەوە. ئەوجار بەگ دەڵێ ئەمڕۆ لێرە بمێنەوە... خاتوون چێشتێکی خۆش لێ دەنێ. بیری کردەوە... گوتی قازێك سوور دەهاتەوە... قازی سوورەوەکراو... سوور سوور. قەڵەو قەڵەو و چەور چەور لەسەر پلاوەکە... و لە تەنیشت دۆیەکە...

چووە حەوشەی کۆشکەکە. بەگ لە دوورەوە دیتبووی. لە پێشدا ویستبووی خۆی پێشان نەدا، بەڵام دوای ماوەیەك دوودڵبوون، بڕیاری دا میوانداری لە تەمیر بکا.

بانگی نۆکەرەکەی کرد:"کوڕە، هەر تەمیر هاتە حەوشە، دەسبەجێ بەرخێك سەر بڕە."

بە ژن و کارەکەرەکانیشی گوت:"میوانێکی خۆشەویستمان هەیە، چۆن باشە ئاوای میوانداریی لێ بکەن."

ئەوجار بە پێکەنینەوە:"خاوەن شکۆمانە."

هەر تەمیر وەژوور کەوت، حافر ئۆز پۆلاد بەپیرییەوە چوو:"کوڕە بەخێر بێ، یاخوا بەخێر بێ ئاغا بەخێر بێی، بەخێر بێی... زۆر زۆر داوای لێ بوردنێ دەکەم، کاکە گرفتاری و کوێرەوەری ئەوەندە زۆر بوون تا ئێستا لەدەستم نەهاتووە بێمە خزمەتت. کاکە بەسەهوو چووین، گوتمان ئەو گەورەمانە و لێمان خۆش دەبێ. گوتمان چکۆڵە کەتنێ دەکەن و گەوران

لێیان خۆش دەبن و نەمانتوانی بێین. وا دیارە ڕێگەی ماڵی ئێمەشت پێ دەزانی ئاغا گیان؟ گەورەت کردین. کۆشکە سەیوان بەرزەکەی قۆش ئۆغلێیت پڕ کرد لە ڕووناکایی و شەرەف."

بن پیلی ئالاتەمیری کە ئەژنۆکانی دەلەرزین، گرت و لە پلیکانەکان بردییە سەرێ. ئەو کابرا داماوەی کە هەر چوار پەلی ساغ و تۆکمە بوو، چی بەسەر هاتووە وا بەحاڵ گیانی لەبەردا ماوە؟ خۆ ئەو داماوە تین و تاقەتی نەماوە و پرزەی لێ براوە. کوڕە خۆ تۆزە گۆشتێکی بە لەشییەوە نەماوە. ڕوومەتی دەرپەڕیون. چاوەکانیشی تەواو بەقووڵدا چوون و ترووسکاییان لێ براوە... ئیتر ڕاستەوڕێ بردییە دیوەخانەکە و لەسەر مۆبلێکی نەرم کە ڕووپۆشێکی سپیی گوڵدۆزیکراوی بەسەردادرابوو و بۆنی سابوونی لێ دەهات، داینیشاند. تەمیر هەر دانیشت، لاقەکانی جووت کردن و دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی دانان و چاوە زەردەکانی کە ئیتر لە نێو چرچ و لۆچاندا ون بوون، لە پێش خۆی بڕی.

جافر ئۆز پۆلاد یەك پشوو دەیگوت:"تەمیر ئاغا وەك ماڵی خۆت دانیشە. ئاسوودە دانیشە. ئێرە ماڵی خۆتە. بەماڵی خۆتی بزانە."

جافر بەگ هەرچی زیاتر وای دەگوت، ئەو پتر خۆی گرمۆڵە دەکرد و دەستەکانی توندتر لەسەر کەشکەژنۆی دادەگرت و ئەژنۆی پتر پێکەوە دەنووساند.

کچێکی حەڤدەساڵانەی چاو سەوزی کەڵەگەت کە قژە پەلکەکراوەکانی کەوتبووە سەر پشت و سینگی، بە مەسینە و تەشتۆکە و خاولییەکەوە وەژوور کەوت.

پۆتینەکانی ئالاتەمیری بە پۆز و ئیفادەیەکەوە کردەوە و کە لە لاقی هێنایە دەرێ، بۆگەن ژوورەکەی داگرت. کچە بێ ئیختیار لووتی خۆی گرت.

جافر ئۆز پۆلاد بەبێ ئەوەی وەسەر خۆی بێنێ، ڕووی کردە ئەندەروون (ژووری ژنان) و بانگی کرد:"جووتێك لەو گۆرەوییانەی من بێنن. نوێ بێ."

دەسبەجێ جووتێکیان گۆرەوی هێنا. کچە لاقە زبر و کەمرە بەستووەکانی ئالاتەمیری کە هەرکامیان هێندەی تاشەبەردێك دەبوون، جوان و زەریف بە ئاو و سابوون شوشت و بە خاولی وشکی کردەوە و گۆرەوییەکانی لە پێی کرد. کچە ئارەقەی ڕەش و شینی کردبوو.

"پۆتینەکانی ئاغا بەرنە خوارێ. جووتێکیش سەرپێیی (نەعل)ی نوێ بێنن.

پێڵاوی سەرپێشیان بۆ هێنا.

تەمیر هێشتا جووڵەی نەکردبوو و بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ هەروا چاوی بڕیبووە پێش خۆی. شانازیی بەخۆیەوە دەکرد و لە خۆشیان وەخت بوو باڵ بگرێ و هەڵفڕێ، بەڵام وەڕووی

خۆی نەدەهێنا. ئەوەی لە شێر بێ هەر شێر دەردەچێ و گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە. چما پیاوێکی ئاوا مەزن و خانەدان و ئاغا، کە لە هەڵۆی شاخان دەچێ، دێ و پارەی داماوێکی دەستوپێ سپیلکەی وەك من دەخوا؟ ئەویش دوای ئەو هەمووە رێز و حورمەتە...

پیاوێکی زلەی سمێڵ پان بە کێردێکی گەورەی قەسابییەوە وەژوو کەوت و گوتی:"کام مەڕ سەر ببڕم بەگ؟"

"لەو میوانەم شەریفتر و ئازیزتر نابێ. لەوەتەی ئەو کۆشکە ساز کراوە، پیاوی وا ئازیز دەرگای لێ نەکردووەتەوە. ئەو کۆشکە بەنرخەی باپیرە گەورەم، پارێزگار و وەزیر و بەگ و سەرۆکانی زۆر هاتووەتێ، بەڵام یەکەم جارە ئازیزێکی ئاوا دەگرێتە ئامێز. کام بەرخ دابەستە و پڕ گۆشتە ئەو سەربڕە تێگەیشتی؟"

"تێگەیشتم بەگ..."

ئالاتەمیر لە شەرمان سوور سوور هەڵگەڕابوو، لێوەکانی جوولان و گوتی:"پێویست نییە، پێویست نییە. زەحمەت مەکێشن."

گریانێك، وەك مستێکی قووچاو بەر ئەوکی گرتبوو. بەسەر خۆیدا زاڵ نەبوایە، خۆی دەخستە سەر پێیەکانی جافر بەگ و وەك منداڵێك دەیدایە قولّپەی گریان و لە دڵی خۆیدا دەیگوت، هەم گیان و هەم ماڵەکەشم بەقوربانی وەها بەگێکی بەگزادە. خۆ ئەگەر حەزی لێ بوو با پووڵەکەم هەر نەداتەوە و چەندیشی ویستی، با داوا بکا. وەڵڵا دێنێ هەتا مردن هەر کار بکەم و ئاغایەکی ئاوا دانیشێ و بیخوات.

هەتا شەوێ هەروا دەست لەسەر ئەژنۆ دانیشت. ئەگەر جافر بەگ پرسیارێکی دەکرد، ئەو خۆی پتر کۆ دەکردەوە و وەڵامی دەدایەوە.

خۆر ئاوابوو و شەو داهات. لە خوارەوە، لە چێشتخانەکەوە بۆنی کەباب دەهات. سفرەیەکی درێژ و رەنگین راخرابوو. لەو کاتەدا، وەرزێرەکانی جافر بەگ، یەك یەك و دوو و دوو دەستەونەزەر دەهاتن و لە بەرانبەر ئالاتەمیردا بە حورمەتەوە دەستیان لەسەر سینگیان دادەنا و دادەهاتنەوە و بەخێرهاتنیان دەکرد و لەسەر مۆبلەکان دادەنیشتن. تەمیریش هەروا دەستی لەسەر ئەژنۆکانی و ئەژنۆکانیشی پێکەوە دەنووساند... بەڵام ئیتر چاوی لە پێش خۆیەوە نەبڕیبوون بەڵکو نیگا کونجکۆڵەکانی خۆی بەسەر خەڵکەکەدا دەگێڕا.

سفرەکە لە تەختی ژوورەکە راخرابوو. خواردنیان هێنا. گوندی سووکێ لە مۆبلەکان خزینە خوارێ و لەسەر ئەژنۆیان لە دەوری سفرەکە بە ریز دانیشتن. تەمیر لە نێوان بەساڵاچووترین

جووتیاری گوند و جافربەگدا دانیشتبوو. بەگ، بەگی دوازدە گوندان، بەخۆشیی من میوانیی وەڕێ خستووە... شایی لە دڵی گەڕابوو. بۆنی کەبابەکە سەرخۆشی کردبوو. چی خواردبا؟ بۆخۆشی نەیدەزانی.

گوندییەکان لە سەر سفرە بێدەنگ بوون. دوای نان خواردنێ چەنەیان گەرم داهات و بەربوونە چەنەوەڕی. هەر لە نرخی لۆکە و برنجەوە تا دەگاتە حکوومەت و دەوڵەتەکانی دیکە و یاغی و سەرچڵەکان و باسی زۆر شتی دیکەش کرا. تەمیر متەقی لێوە نەهات. دەستی لەسەر ئەژنۆی هەر گوێی دەدانێ و چاوە بەقووڵداچووەکانی پێدا دەگێڕان.

کاتی خەوێ هات. گوندی هەستان. تەمیر لە عومریدا ئەوەندە درەنگ نەنووستبوو. کچۆڵەکە دیسان هاتەوە ودەستی گرت و بردییە ژوورێك و لەوێ قەرەوێڵەیەکی نیشان دا و وەدەر کەوت. تاوێك دواتر جافر بەگ هات و گوتی:"شەوت خۆش میوانە بەناوبانگەکەم."

تەمیر بە بن دەرپێ و کراسێکەوە لە قەرەوێڵەکە دەرپەڕییە دەرێ و قیت ڕاوەستا و بە پلتەپلت گوتی:" خوا ڕاوەستاوت کا، ڕاوەستاو بی، ڕاوەستاو بی بەگ."

جافر بەگ دەستی گرت و لەسەر تەختەکە داینایەوە. پێخەفەکانی بەسەر کێشا و وەدەر کەوت.

تەمیر هەر سەری لەسەر بالیف دانا، خەوی لێ کەوت.

کەڕەی بەیانی لەخەوێ هەستا. ڕۆنی کەرە و پەنیر و هەنگوین و ترخێنەیەکی چەور کە بۆنی سیری لێ هەڵدەستا لەسەر سفرە ریز کرابوون. تەمیر هیچی لەبیر نەما و لە پێشدا کەرە و هەنگوینەکەی بە قەپووچکان ڕامالّی و ئەوجار شیرە گەرمەکەی کە لە قاپێکدا هەڵمی لێ هەڵدەستا، هەڵقوڕاند و بە کەوچکان وەرگەڕایە ترخێنەکە. ئەوەندەی خوارد زگی وەك دەهۆڵی لێ هات. کاتێ جێی نەما تێی بکا، قیت بۆوە و بە کەیفخۆشییەوە گوتی:"خودا بەرەکەتی برایمی خەلیل بەسەر سفرەکەتاندا ببارێنێ."

ئیتر دەسبەجێ هەستا و چۆوە سەر جێیەکەی خۆی و دەستی لەسەر ئەژنۆی دانایەوە.

بەگ ڕۆیشت و هاتەوە. چووە گوندی و چووە دەم جەیهان و نیوەڕۆ داهات. تەمیر هەروا دانیشتبوو. نانی نیوەڕۆیەشی ئاوا بە حەز و ئیشتیاوە خوارد و دیسان لەسەر جێیەکەی خۆی لەسەر مۆبلەکە دانیشتەوە. دەستەکانی لەسەر کەشکەژنۆی دانانەوە... شەو داهات. ڕۆژ بۆوە... هەر وا...

سێهەم ڕۆژ بەیانییەکەی، چاوی پڕ لە پاڕانەوەی خۆی لە بەگ بڕی. بە لارەملییەوە، خۆی لەسەر مۆبلەکە گرمۆڵە کردبوو و بە هەموو گیانی، هەر لە نووکی پێیانییەوە هەتا تەپڵی سەری دەپاڕایەوە. بەگیش وەك سیحری لێ کرابێ. لە بەرەکەی دیکەی مۆبلەکانەوە بەبێ جووڵە دانیشتبوو. نە ئەو دەیزانی چەند سەعات ئاوا تێپەڕیوە و نە ئەویتر...

نانی نیوەڕۆیان هێنا. لە سەر سفرەکەش تەمیر هەر وا بە زمانی بێ زمانی دەپاڕایەوە.

کە نانی نیوەڕۆ خورا، گوتی:"بەگ، کوڕی بەگی گەورەمان، ئەمن ئیتر دەبێ بڕۆم."

لەو کاتەدا تۆزێکی هیوا لە دڵیدا نەمابوو.

جافر گوتی:"بۆ کوێ، ئاغا گیان، بۆ کوێ. مەڕۆ گیانی من... بۆ دەڕۆی؟... جا کە هەر دەڕۆی ڕاوەستە با بڵێم عارەبانەکە ئامادە بکەن و بتگەیەننێ."

هەستا. پێدەکەنی و دڵی خۆش بوو:"زۆر زۆر گەورەت کردم. زۆر. دیسان چاوەڕوانت دەبم. وەڵڵا لەوەتەی ئەو کۆشکە هەیە میوانی وەك تۆ گەورەی بەخۆوە نەدیتبوو. وەڵڵاهی وەبیللاهی. چما دەهێڵم میوانی وا ئازیز لێرە، بەپێیان بڕواتەوە؟"

ئالاتەمیر لەسەر جێی خۆی وشك بوو. بە سەرسووڕمانەوە چاوی بڕیبووە جافر ئۆز پۆلاد. جافر ئۆز پۆلادیش پەیتا پەیتا ئەوسەرئەوسەری دیوەخانەکەی دەکرد و قسەی دەکرد. هەتا لەخوارەوە گوتیان:"عارەبانەکە ئامادەیە بەگ." بەگ یەك پشوو قسەی دەکرد. ئەوجار لە ئالاتەمیر کە سەرلێشێواو لەجێی خۆی وشك ببوو، چووە پێشێ. دەستی ڕاستەی گرت. وەك سەهۆڵ سارد بوو. بن پیلی گرت و زانی ئەژنۆی و هەموو ئەندامی دەلەرزێ. تۆزێکیش بەزەیی پێیدا هاتەوە.

لە خوارێشەوە، لە بەر پلیکانەکان، نۆکەرێك پۆتینەکانی ئالاتەمیری بەو دەستەوە بوو. داهاتەوە و بە دەستە لێهاتووەکانی، پۆتینەکانی ئالاتەمیری کردەوە پێی و قەیتانەکانی بۆ توند کردەوە. سێ کەس ئالاتەمیریان سواری عارەبانەکە کرد. وا سارد ببۆوە، لاقەکانی لەخۆوە تێك دەئالان و خۆی تینی ئەوەی تێدا نەبوو سواری عارەبانەکە بێ.

عارەبانەچییەکە، ئەسپەکانی دایە بەر قامچی و لێی خوڕین. جافر ئۆز پۆلاد بەو دیمەنە تێك چوبوو و هەر جەرگی جەرگی دەخواردەوە.

"کوڕە تۆ وەرە سەیری ئەو گەوادە گوو خۆرە. لەگەڵ فلْسێك گیانی دەردەچێ. مەرد ئەگەر کاری بە نامەردانە... دەردی سەرباری هەموو دەردانە*. کوڕە خۆ لەگەڵ فەلْسێك گیانی دەردەچێ... تف لەو رووت سەی بەرەڵڵا... سەگی..."

لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و بە حەوشەکەدا دەهات و دەچوو. ئەوەندە هات و چوو هەتا مێشکی هاتەوە سەر خۆ و کە دامرکایەوە، ئالاتەمیری هێنایەوە پێش چاوی و کەوتە پێکەنین. ژنەکەی و ئەو نۆکەرانەی لەوێ بوون و هەرچی ئالاتەمیری دیتبوو، باسیان دەکرد و پێی پێدەکەنین.

جافر ئۆز پۆلاد رادەوەستا و بیری دەکردەوە و قاقای دەکێشا و دەیگوت:"قورومساغی هیچ و پووچ. گوو ناکا دەڵێ برسیم دەبێتەوە."

کە عارەبانەکە گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی ئالاتەمیر، ئەو بە بزرکاوی و بێ هێزییەوە دابەزی.

ژنەکەی بە شڵەژاوییەوە و بە هەڵەداوان هات و پرسی:"ئەوە چیتە، چ بووە؟"

تەمیر گوتی:"نەیدامەوە."

ئیتر بەرەوددەم کەوت. ژنەکەی لە تەنیشتی دانیشت و کەوتە دڵدانەوەی:"خەمی لێ مەخۆ بەقوربان. بە قوربانی خۆت بێ. بەگی خۆمانە. نەشمانداتەوە، با نەیدا. دا بڵێ بزانم چۆنی بەخێرهاتن کردی؟ هیچ رێز و حورمەتی گرتی؟"

ئالاتەمیر هیچ وەڵامی نەدایەوە، زمانی نەدەگەڕا.

تەمیر ماوەیەك دواتر، بەبێ ئەوەی لە جێی خۆی بجووڵێ، رووی بەلای راستدا وەرگێڕا و بە ژنەکەی گوت:

"زوهرە، زوهرە، سەت خۆزگە چاوت لێ بوایە چۆن وەك میوانداری لە شا بکەن، ئاوایان رێز گرتم. گاو گەردوونیان لە پێش کردم. کچۆڵەیەك بە سابوون دەست و پێی بۆ شوشتم، بە دەستە ناسك و نەرمەکانی خۆی... لەسەر قەرەوێڵە و لە نوێنی پەڕی قازدا نوستم. بەگ لەو سێ رۆژەدا ئەوەندەی رێز گرتم هەر خوا دەزانێ چەندە."

"دەی دەی، ئەی بۆچی وا داماوی؟"

"هەر لە رووشم هەڵنەهات داوای قەرزەکەمی لێ بکەمەوە. ئەویش هەر وەبیریشی نەهاتەوە بڵێ ها وەرە پارەکەت بدەمەوە. دەزانم ئەو پارەیەی بۆ نەدامەوە؟"

---

* ئەو بەیتە شێعرەم لە پیرەهەڵۆکەی مامۆستا هەژار وەرگرتووە.

"دەمداتەوە. نەشیدامەوە با نەیدا. ئێستا کە لە نێو ماڵ و منداڵەکەی خۆیدا وەك بنیادەمان ڕێزی گرتووی و ئاوا میوانداریی کردووی، با هەر نەیدا. یاخوا نۆشی گیانی بێ. با بێ و هەرچی پارەی هەمانە لێمانی وەرگرێ و بیبا."

"هەنگوین و کەرە. بۆ نانی شەوێ، هەموو خەڵکی گوندەکەی بانگ کردبوو. هەرچی ڕەعیەتە دەستە و نەزەر لە پێشم سەریان دانواند و سڵاویان لێ کردم و بەخێرهاتنیان کردم. بەگ پێی گوتن ـ هە ڕێك ئاوا گوتی:"ئەو ماڵە گەلێك پیاوماقووڵ و ناوداری لێ میوان بووە، بەڵام لەوەتەی هەیە پیاوی وەك تەمیر ئاغا پێی تێ نەناوە. ئەمنیش تەریق بوومەوە و پێم عەیب بوو داوای قەرزەکەمی لێ بکەمەوە."

"کارێکی زۆر باشت کردووە. ئەتۆ ئینسانییەتی خۆتت نیشان داوە. لێ گەڕێ با بەگیش تێ بگا کێ بنیادەمە و کێ دوژمنە. لێ گەڕێ با باشمان بناسێ."

تەمیر پاتەی کردەوە:"با، باشمان بناسێ."

ئیتر هەستا. هێشتا بۆنی سابوونەکەی تۆزێك هەر لێوە دەهات و سەرخۆشی دەکرد. دوای ئەوە، ئیتر تەمیر هەر بە مانگێك، دوو مانگ سەرێکی لە کۆشکەکەی بەگ دەدایەوە و هەموو جارێکی ئاوا بە گەرمی پێشوازییان لێ دەکرد. دەست لە سەر ئەژنۆیان و لە تەپڵی سەرەوە هەتا نووکی پەنجەی پێی، دەبووە پاڕانەوە و ئاخرییەکەشی تووشی بێهیواییەکی وادەبوو خەریك بوو ئیفلیج بێ. چاوی لە چاوەکانی بەگ دەبڕی و بەگیش وەك مێشێکیشی لێ میوان نەبێ وەڕووی خۆی نەدێنا. هەر دەتگوت قەت قەت فلسێکیشی لێ وەرنەگرتووە.

جاری واش بوو بەگ لە کۆشك نەدەبوو. تەمیر زوو تێگەیشت کە بەگ ئیتر ڕووی ناداتێ. هەر لە دوورەوە کە دەیبینێ لە ماڵێ وەدەر دەکەوێ. ڕۆژێکیان بەگ لە ماڵێ نەبوو، خاتوونی وەگیر کەوت و بۆی لە بنی کوولەکە دا و بەڕەی لەسەر هەتیوان هەڵدایەوە و ئاخرییەکەشی گوتی:"بە بەگ بڵێ پارەکەی من بداتەوە. ئەو بەگی مەزنمانە."

ژنە لەسەر خۆ وەڵامی دایەوە:"پێی دەڵێم ئاغا گیان، بێ و نەبێ بەگ لەبیری نەماوە."

تەمیر دڵی خۆش بوو:"دەزانم، دەزانم بەگ لەبیری چووەتەوە. بەڵام... تۆ وەبیری بێنەوە."

خاتوون دیسان خواردنی خۆشی بۆ هێنا و لە نوێنی پەڕدا نواندی. دەی دیارە لەبیری چووە. ئێستا خاتوون وەبیری دێنێتەوە و بەگ بە هەزار عوزرخواستن و داوای لێبوردن، پارەکەم بۆ دێنێتەوە بەر دەرگا.

دیسان چاوەڕێ ما. هەر لە کەڕەی بەیانییەوە هەتا ئێوارێ بە هیواوە چاوەڕێی هاتنی بەگ دەبوو.

گوندیش یەك پشوو سەریان دەخستە سەری و خوێیان بە برینانەوە دەکرد و هانیان دەدا.

ئاخرییەکەی دیسان تەمیر تاقەتی نەما و وەك بای شەماڵ ئەو ڕێگەیەی گرتەوە بەر، کە هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ چاوی تێ دەبڕی. بەگ دیسان وەك جاری جاران بە گەرمی پێشوازیی لێ کردەوە و بەپیرییەوە هاتە بەر دەرگای حەوشە و بن پیلی گرت. بەڵام تەمیر ئەوجارەیان زۆر بە تووڕەییەوە دەستی لادا و وەپێش بەگ کەوت و لە پلیکانەکان چوونە سەرێ. لە سەر مۆبلەکە و هەر لە سەر جێیەکەی جارانی دانیشتەوە و دەستی لە سەر ئەژنۆکانی دانایەوە و چاوی لە چاوی بەگ بڕییەوە و ملی قوت کردنەوە. بەگ سەری سووڕمابوو و نەیدەزانی چ بکا. یەك پشوو دەیگوت:"بەخێر هاتی ئاغا، ئاغا، ئاغا. بەخێر هاتی ئاغا."

ئالاتەمیر بە دەنگێکی گڕ و پڕ لە تووڕەییەوە گوتی:"بۆچی ئەو قەرزەم نادەیەوە براله؟ چما بە پارەی من دەوڵەمەند نەبووی؟ با، بووی، ئەوەی تۆ دەیکەی نە لە ئینسان دەوەشێتەوە و نە لە... و نە... پارەکەم بدەرەوە. ئەگەر نەمدەیتەەوە، نەمدەیتەوە، ئەگەر نەمدەیتەوە... دەزانی..."

جافر ئۆز پۆلاد هاتەوە سەرخۆ و بە تەوسێکەوە پرسیی:"ئەگەر نەتدەمەوە چ دەکەی؟"

تەمیر دەستی لە سەر ئەژنۆی هەڵگرت و وەك برێشکەی سەر سێڵێ هەڵبەزییەوە و بە چاوی زەق و دەماری هەستاوی لاملییەوە گوتی:"جا بۆخۆم دەزانم چ دەکەم."

دەنگی لە هەموو ئاوایییەکە گەڕا. گوندی بۆ ئەوەی بزانن چ باسە، هەموو هاتن و لە بن دارە تووەکانی نزیك کۆشکەکەی بەگ کۆ بوونەوە.

تەمیر بە دەنگێکی پڕ لە پاڕانەوە لە بنەوە دەیگوت:"خۆ بە گیانی ناخێرت ئەتۆش بەگی، بنیادەمی؟ سەگ هەزار جاران لە تۆ بەشەرەفترە. ئەتۆ بە پارەی من بوویە پیاو. بەڵام ئەوەندەت شەرەف و نامووس نییە قەرزەکەت بدەیتەوە..."

"بڕۆ شوکرانەبژێر بە لە ماڵی خۆمی."

"بۆ ئەگەر لە ماڵەکەتدا نەبوایەم، ئەتۆی بێ نامووس کە وەك سەگ دامبەستووی، دەتتوانی چیم لێ بکەی؟"

جافر ئۆز پۆلادیش لەدین دەهری بوو و هەڵچوو. هەستایە سەر پێیان و پەلاماری دا. ئالاتەمیر یەك جێ دەنگی نزمتر کردەوە. دەتگوت تێگەیشتووە پێی لە بەڕەی خۆی پتر

ڕاکێشاوە. لەبەر چاوی ژن و منداڵەکەی زۆر خراپم پێ کرد. هەر کردمە پەڕۆیەکی گواوی. نەدەبوو وای لێ بێ... قسەی لە دەمم زلترم کرد..."

دەسبەجێ لە سەر جێیەکەی دانیشتەوە و دەستی لەسەر ئەژنۆکانی دانانەوە و ملی بەلارەوە نا و دیسان هەموو گیانی پڕ بۆوە لە پاڕانەوە و گوتی:"پارەکەم بدەرەوە بەگ. هیچ دەزانی ئەو پارەیەم بە چ حاڵی سەگێك وەسەر یەك نابوو؟ شەو و ڕۆژ خوێنی جەرگی خۆم خواردووەتەوە. بە خواردنی بڕوێش و یۆنجە و برسێتی کێشان... تەنانەت کاتێ نۆبەتێ چی نەمابوو بمکوژێ، دیسان دەستم لە کارێ هەڵنەگرت. ساڵ دوازدەی مانگ لەبەر باران و لە قوڕ و چڵپاوێدا هەر لە کەڕەی بەیانییەوە هەتا تەنگەی نوێژی شێوانێ خۆم کوشت بۆ ئەوەی "سەنار"ێك بکەمە دینارێك... چما پارەیەکی ئاوات لە گەرووی دەچێتە خوارێ؟ ئاخۆ کەس بە پارەیەکی ئاوا بەختەوەر دەبێ؟ سەر هەڵێنە و خوای ببینە."

جافر ئۆز پۆلاد توانجی تێگرتەوە:"لێی ببڕەوە..."

ئالاتەمیر دیسان وەك فەنەر لەجێی خۆی دەرەپەڕی و چاوی نووقاند و زاری کردەوە و چی لە زاری هاتە دەرێ پێی دەگوت و لە پلیکانەکان چووە خوارێ و کە گەیشتە حەوشەکە، دەنگی گەیشتە ئاسمانێ:"باشە ئەتۆش، ئەتۆیەك کە هەقی لێقەوماوان دەخۆی... بەگی؟ هەی گوو بە گۆڕی باوکە بەگەکەت... پارەکەی من، پارەکەی من، من، هەی بوودەڵەی، بوودەڵەی..."

ئاگای لە خۆی نەمابوو و خوێن بەرچاوی گرتبوو و کەفی هەڵدەخڕاند و چی دەهاتە سەر زاری دەیگوت. لە نێوەڕاستی حەوشەکە دەستی ڕادەوەشاند و دەینەڕاند و وەك مریشکێکی سەریان بڕیبێ، پەلەقاژەی بوو و هەڵدەبەزی، بەڵام لە سەرەوە هیچ دەنگێك نەدەهات.

هەتا ڕۆژاوابوونێ هەروا نەڕاندی و چیی جنێوی دەیزانی بە جافر بەگی دا و هەموو جارێکیش بە جافر بەگی دەگوت بێ شەرەف و بەد حیساب، هەتا وای لێ هات لە زمان کەوت.

دوای ئەوە ترسێکی قورس سواری شانی بوو. لە هیچ کوێوە وستە و سریوەیەك نەدەهات. ئەوجار ترساو و زراو تۆقیو لە دەنگی خۆی، کەوتە پەلەقاژە و لە نەکاو هێور بۆوە و بەبێ جووڵە لەجێی خۆی چەقی. ترووسکاییەکی هیوا کەوتە دڵییەوە و ترسەکەی دەڕەواندەوە.

لە نەکاو دەنگێکی کپ لە قوڕگییەوە هەستا:"بەگ، بەگ، بەگ... ئەمن وازم لەو هەقەی خۆم هێنا و هەر نەمویستەوە. بۆ تۆ. با بۆ تۆ بێ. وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ.

زۆری قەراغ لێ کێشابوو. زۆر زۆر. ئاخۆ بەگ ئەو هەمووە سووکایەتی و جنێو و بێ فەزیحەتییەی قەبووڵ دەکرد و لێی خۆش دەبوو؟ بێ ئەملا و ئەولا تۆڵەی هەر لێ دەکردەوە. بەڵام باش بوو رێگە چارەیەکی بۆ قوتاربوون و گیان نەجاتدان دۆزیبۆوە. رێگەیەکی باشیش بوو.

شەوگار شەق ببوو کە بە کەیف و دڵخۆش گەیشتەوە ماڵەوە.

ژنەکەی پرسیی:"وەرتگرتەوە؟"

تەمیر بە روویەکی گەشەوە وەڵامی دایەوە:"نا."

چاوەکانیشی پێکەنین.

"ئەی چ بوو؟"

"ئەو داماوە پیس بەکۆستی خۆیدا کەوتووە. زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە. زۆر زۆر. چی نەمابوو دانیشم و تێر بۆی بگریم. واتە بەگێکیش، بەگەکەی خۆشمان، کە ئەو هەمووە چاکەیەی لەگەڵ من کردووە و مەڕی لە پێش کوشتوومەتەوە، دەکرێ ئاوا لێی بقەومێ؟ ... بڕوا ناکەی... ئاورم بۆی تێبەربوو. زۆر."

"دیسانیش لەرووت هەڵنەهات داوای قەرزەکەتی لێ بکەیتەوە؟"

"کە چاوم پێی کەوت، ئاگرم بۆی تێبەربوو و لێی خۆش بووم. وەك منداڵان ملی بەلارەوە نابوو و لێو و لچی هەڵقرچاندبوو و چیی وای نەمابوو بداتە قوڵپی گریان. ئەمنیش بنیادەمێك نیم چاکەم لەدەست نەیە. پێم گوت ئیتر لەمەودوا قازێکیش چییە قەرزبار نیت. هەرکاتێکیش لێت قەوما و دەستکورت بووی، دیسان وەرەوە. ئەگەر نەشێی، دەستت لێ هەڵناگرم. چما ئێمە چەند بەگی دیکەمان هەیە. هەر بەگێك. بەگێك و هیچی دی... خۆ ناشکرێ و عەیبیشە بهێڵین ئەو دەست بەتاڵ و برسی بێ."

زوهرە گەش گەش بۆوە و لە خۆشیان باوەشی بە مێردەکەیدا کرد و گوتی:

"چاکت کرد.. پیاوی وەك تۆ هەر ئەو چاوەڕوانییەشی لێ دەکرێ."

"هەر ئەو چاوەڕوانییەش لە من دەکرا... بەگی مەزن..."

"قسەکەی تەواو نەکرد. بارێکی قورسی لەسەر شانی لاچوبوو و هەستی کرد سووك بووە. بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا لە خۆشیان خەوی لێ نەکەوت. دەتگوت باڵی گرتووە و فڕیوە.

جافر بەگ دوای ئەوەش هاتەوە لای ئالاتەمیر بۆ پارە. ئالاتەمیر دیسانیش پارەی پێ دا. دیسانیش ئەوەندەی چاوەڕوانی کێشا تا چاوی سپی بوون و ئەو هەر نەهات و هەر نەیهێنایەوە.

تەمیر دیسان گەلێ جاران سەردانی کۆشکەکەی قۆش ئۆغلیی کردەوە و جافر بەگ بە گەرم و گوڕی پێشوازی و میوانداریی لێ کرد و بن پیلی گرت و بەخۆشیی ئەو خەڵکی بانگهێشت کرد و ئەویش لە سەر جێیەکەی خۆی و لەسەر مۆبلەکە دانیشت و دەستی لەسەر کەشکەژنۆکانی دانا و ئەژنۆکانی پێکەوە نووساندنەوە. لاقەکانیان بە سابوونی بۆنخۆش بۆ شوشت و هەموو گیانی بۆوە بە پاڕانەوە و چاوی لە چاوەکانی بەگ بڕییەوە و لە بێهیواییدا دەست و پێی سڕ بوون.

دوایی دیسان وەك جاری جاران مردوو و زیندووی جافر بەگی نەهێشت و دانییە بەر جنێوان و چیی جنێوی دەیزانی لە حەوشەی ماڵەکەیدا پێی دا و ئاخرییەکەی دیسان لە هەقەکەی خۆی خۆش بوو و پێی بەخشی.

زۆر لە مێژ بوو ئەو پەیوەندییە هەروا بەردەوام بوو. تەمیر جنێوی دەدا و خۆش دەبوو. جافر بەگ هەموو جارێ پێویستیی بە پارە دەبوو و پارەی پێویستی پێ دەدا. هەردووکیشیان لەگەڵ تێپەڕینی زەمەن، وێکڕا دەوڵەمەند دەبوون.

جافر ئۆز پۆلاد گوتی:" ئەوە هەلێکی زێڕینە ئاغا. دەروێش بەگ مێردی خوشکەکەی خۆی کوشتووە و کوشتنەکەشی بەستۆی یەکێك لە نۆکەرەکانیدا دێنێ. گوندیش وێکڕا دەڵێن کامیل خۆی کوشتووە. دەروێش بەگ بۆ ئەوەی لەو گێچەڵە نەجاتی بێ پێویستیی بە پارەیەکی زۆر دەبێ... پارەیەکی زۆر... ئێمەش کە وازی لێ ناهێنین. دەروێش ناچار دەبێ زەوی و زارێکی زۆر بفرۆشێ. ئەتۆ دەبێ دەمودەست بچیتە لای. ئەو تۆی خۆش دەوێ."

تەمیر لیچی بنەوەی وەك هیی ئەسپێکی سەرکەوتوو داچۆڕابوو. گوتی: دەی باشە. ئەو کەیفی بە من دێ. وەختییەتی... خوا راوەستات بکا بەگم. بە پارەیەکی کەم زەوی و زارێکی زۆر دەکڕم. ئاقچاسازیش... دەبێتە هەزار دۆنم، دە هەزار دۆنم."

جافر بەگ گوتی:"دە هەزار دۆنم. بەشی منیشت لەبیر نەچێ."

ئالاتەمیر خۆی گیڤ دا و لە خۆمانە خۆی دەخستە سەر شانی جافر بەگ کە بن باڵی گرتبوو، گوتی:"بەیانی، بەر لەوەی تاو هەڵێ، لە کن دەروێش بەگم."

جافر بەگ دووپاتەی کردەوە:"بەر لە تاوهەڵات."

# ٣٨

قالۆنچەکە هەر وا لە قوڵکەکەدا بوو. پشتەوخوار ببوو. لاقەکانی کۆ ببوونەوە و بە بەر زگییەوە نووسابوون. مێرووله بچکۆڵەکە سۆراغی نەبوو. وازی لە قالۆنچەکە هێنابوو و بەجێی هێشتبوو. هەموو ئەو مێروولانەی دوێنی تێکی بەردابوون، لێك ببوونەوە. تەنیا دوو مێرووڵەی بچووك کە لە بن دەوەنێکی شلکدا هێشتا لەگژ یەك راچووبوون.

مێروولەکە زۆر شێلگیرانە دانەوێڵەکانیان دەکێشایەوە و لە کاتی هاتن و گەڕانەوەیاندا بۆنیان بە یەکترییەوە دەکرد و کە بە دەم قوڵکەی قالۆنچە مردووەکەشدا تێدەپەڕین، بۆنێکیان پێوە دەکرد و دەڕۆیشتن.

چاوەکانی مستەفا بەگ لە نەکاو لە خۆشییان تroوسکانەوە. مێرووله بچووکەکە هاتبۆوە و بۆنێکی بە قالۆنچەکەوە کردبوو و قەفی زاری لە زاری قالۆنچەکە گیر کردبوو و کەوتبووە هەوڵ و دەوڵەوە.

مستەفا بەگ بە هەژاوییەوە گوتی:"هەی لە منت کەوێ مێرووله بچکۆڵەکە. وەك شێر وایە. هێشتا نەبەزیوە. با بزانین چیی لێ دێتەوە. ئەو مێرووله بچووکەش لەگەڵ ئەوەدا کە دەزانێ ئەو قالۆنچەیەی پێ نابزوێ، بەڵام نایەوێ مل بۆ بەزین و تێ شکان کەچ بکات، هەر بۆیە بەردەوامە لە خەباتەکەی. نەك بۆ شکاندنی، بەڵکو بۆ ملکەچنەکردن و نەبەزین... ئەگەر ئەو مێرووله بچکۆڵەیە رووی خۆی لێ وەرگێڕابایە و بەجێی هێشتبایە، لە راستیدا ئەوە قالۆنچە مردووەکە بوو کە سەرکەوتبوو. ئێستا، لە درێژایی ئەو ماوەیەدا کە شێلگیرانە لە خەبات دایە، تەنانەت ئەگەر بۆ جارێکیش چییە نەتوانێ قالۆنچەکەی لەجێی خۆی ببزێوێ، هێشتا نەبەزیوە و ناتوانی بڵێی شکستی خواردووە.

مێرووله‌كه‌ قه‌پی به‌ زاری قالۆنچه‌كه‌دا كردبوو و ده‌سته‌كانی له‌ جێیه‌كی سه‌خت توند كردبوو. به‌ڵام پێیه‌كانی ده‌خلیسكان و ته‌پوتۆزێكی نه‌دیاریان هه‌ڵده‌ستاند.

هه‌نگی زل زل به‌ كلكی ئاڵقه‌ئاڵقه‌ و كوڵكن و به‌ باڵی خاڵ خاڵییه‌وه‌ كه‌ له‌ ژیانیدا شتی وای نه‌دیبوو، به‌ ده‌وری گوڵه‌ پێنج په‌ڕه‌كاندا ده‌خولانه‌وه‌ و ده‌نیشته‌وه‌ و دیسان ده‌فڕینه‌وه‌.

مه‌ستان له‌ ده‌ره‌وه‌ له‌ بن ده‌وه‌نه‌كه‌، چاوه‌ڕوان لاقی لێ راكێشابوو و خۆی خستبووه‌ سه‌ر ئانیشكان و دیسان له‌ دڵی خۆیدا مسته‌فا به‌گی دابووه‌ به‌ر جنێوان.

گه‌رمایه‌كی گران و خه‌ست به‌سه‌ردا هاتبوو. باڵنده‌یه‌ك به‌ ئاسمانه‌وه‌ نه‌بوو. هه‌ر جار نه‌جارێك ناخی زۆنگاوه‌كه‌ قوڵته‌یه‌كی لێوه‌ ده‌هات و هه‌ڵی داویشت و ده‌وروبه‌ره‌كه‌ی ده‌له‌رزانده‌وه‌. له‌گ له‌گه‌كان به‌و لاقه‌ درێژ و سووره‌كانیانه‌وه‌ له‌ نێو گوڵه‌ نیلوفه‌ڕ و نێرگزه‌كانی ده‌م زۆنگاوه‌كه‌دا كه‌ گوڵی سپی و زه‌ردی درشت درشتیان لێ پشكووتبوو، ته‌مبه‌ڵ و ته‌وه‌زه‌ل ده‌گه‌ڕان. هه‌ر كام له‌ گوڵ نیلوفه‌ڕه‌كان هێنده‌ی دوله‌په‌ ده‌ست ده‌بوون. گرمه‌ی قوڵته‌قوڵته‌كانی زۆنگاوه‌كه‌ له‌ ره‌وه‌زه‌كانی ئاناوه‌رزادا ده‌نگی ده‌دایه‌وه‌.

مسته‌فا به‌گ گه‌لێ ساڵان له‌ ده‌وری ئه‌و زۆنگاوه‌دا ژیابوو و هه‌موو جێیه‌كی زۆنگاوه‌كه‌ی وه‌ك به‌ری ده‌ستی خۆی ده‌ناسی و شاره‌زای بوو. به‌ڵام قه‌ت نه‌یدیبوو ئاوا به‌جۆش و خرۆش بێت. هه‌ستی ده‌كرد نه‌گبه‌تییه‌ك به‌ڕێوه‌یه‌.

حه‌مدی له‌گه‌ڵ دوو كه‌سی دیكه‌دا وه‌دوای وه‌لی شه‌ماڵ خستبوو. به‌ڵام ئه‌وان پاش چه‌ند رۆژ گه‌ڕان به‌ ده‌وری كۆشكه‌كه‌دا به‌ سه‌ر و سۆراغیان نه‌زانیبوو و نه‌یاندۆزیبۆوه‌. ئاخۆ وه‌لی شه‌ماڵ چوبووه‌ شوێنێكی دیكه‌؟ یان تووشی به‌ڵایه‌ك ببوو؟ به‌ڵام ئه‌و پێی وابوو وه‌لی شه‌ماڵ له‌وانه‌ نییه‌ به‌ ته‌ڵه‌وه‌ بێ و بیگرێ. ئه‌ی ده‌بێ چی به‌سه‌ر هاتبێ؟

له‌ ماڵه‌وه‌ش ده‌تگوت رووداوێكی ناخۆش به‌ڕێوه‌یه‌ و ده‌قه‌ومێ. دایكی دوێنێ شه‌وێ، دوژمنانه‌ نا، به‌ڵكو دڵسۆزانه‌ و هیوابڕاوانه‌ سه‌یری كردبوو. زانیبووی ئه‌و خه‌فه‌ت و په‌ژاره‌یه‌ چییه‌ له‌ ناخیدا په‌پكه‌ی خواردووه‌. نیگاكانی دایكی ته‌واو بێ هیواییان لێ ده‌باری. شتێك ده‌گۆڕدرا، به‌ڵام چ بوو؟ چ ده‌بوو؟

چی وای بۆ نیوه‌ڕۆ نه‌مابوو.

مه‌ستان له‌ ده‌ره‌وه‌ هه‌ستایه‌ سه‌ر پێ و گوڕاندی:"دیتم."

حه‌مدی و بله‌ ئیبۆ له‌ پێشه‌وه‌ و مسته‌فا به‌گ به‌ دوویاندا ده‌رپه‌ڕینه‌ ده‌رێ. قوڵته‌قوڵتی زۆنگاوه‌كه‌ شه‌پۆلی خستبووه‌ گه‌رماكه‌وه‌ و له‌ ره‌وه‌زه‌كاندا ده‌نگی ده‌دایه‌وه‌.

"نەکا بمانبینیٚ. زوو خۆ مات کەن، لە بن دەوەنە پێنج پەڕەکان..."

خۆیان مەڵاس دا. ئەو سوارەی لەسەر تەپۆڵکەکەوە دیتبوویان، لغاوی ئەسپەکەی کە زین و ڕێشمەی لە بەر تاوەکە دەبریسکانەوە، بەردابوو. ئەسپەکە ملی ڕێگەی گرتبوو و لەسەرخۆ و هێمن دەهاتە پێشیٚ. هات و هات و تەواو لێیان نزیك بۆوە. پەنجەی هەر چواریان لەسەر پەلەپیتکە بوو. زۆنگاوەکە دوو جاری دیکەش پشووی کێشا و قوڵتەی هات. سوارەکە هەستایە سەر ڕکێفان و ملی کێشا و سەیرێکی نێو قامیشەڵان و پێنج پەڕەکانی کرد، کە ئەوانی تێدا مات ببوون و ئیتر لە سەر زینەکەی دانیشتەوە و یەکسەر بەرەو لای ئەوان لێی خوڕی.

مەستان بە سرتە لە بن گوێی بەگ گوتی:"لەسەر سەری خۆم گرێو دەکەم پیاوی دەروێش بەگە. دەیەویٚ جێیەکەمان هەڵ بنیٚ. سەرم لە گرێودا دادەنێم..."

بەگ:"دەی کەوابوو بێدەنگ بە با نەمانبینیٚ."

خۆیان لە بن دەوەنەکان ڕۆکرد. سوارەکە هەتا بن دەوەنەکان هاتە پێشیٚ و داهاتەوە و سەیری کرد. چاوەکانی هەڵگلۆفی و ئەسپەکەی بەرەو قامیشەڵانەکە تاو دا و لەوێوە بەرەو قەڵای حەمیتە لێی خوڕی.

مەستان گوتی:"دیتینی. پیاوی دەروێش بوو. لە ئێمە دەگەڕا. پێشم وایە جێیەکەمانی دۆزییەوە. هەر لێرە بەسەرماندا دەدا و شتێکمان لیٚ دەکا."

مستەفا بەگ:"سەت خۆزگە ئێمەیان دۆزیبایەوە. سەت خۆزگە جێیەکەمانیان پیٚ زانیبا. پێیان زانیبا و هاتبایەن، جا شەڕمان دەکرد و یەکێکمان دەکوژراین. یان هەردووکمان بەرەوڕوو شەڕمان دەکرد و دەکوژراین..."

حەمدی گوتی:"نا بەگ. نا. ئەوە دروست نییە. ئەوە دەڵێی چی بەگ؟ ئێمە دەیگرین. بڵێی و نەڵێی ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك ئەو سوارە و وەك سەگێك بە بۆنکردن ئاوا دێتە بەر دەستمان. جا ئێمەش دەیگرین. دواییش ئەتۆ دەمانچەکەی لیٚ دەردێنی و لوولەکەی لەسەر شەویلکەی دادەنیٚ و رایدەگری. سەعاتێك، دوو سەعات... سیٚ، پێنج، دە... و هەر کات چاوی لیٚ نا، ئەمن درۆشەکەی لە بن پێی ڕۆدەکەم."

مستەفا بەگ ئاخێکی داماوانە ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"وەڕەز بووم. ئەگەر دایکم نەبوایە، دەستم لیٚ هەڵدەگرت و لێی دەگەڕام. ئیتر وەڕەز بووم. سەیر بکە چەندە چاوەڕوان بووین. بنیادەمێك کە هەموو ڕۆژیٚ بەو ڕێیەدا تێدەپەڕی، بۆ جارێکیش چییە ڕێی نەکەوتووەتەوە ئەو دەوروبەرانە. گرتنی کەسێکی کە ئەوەندە لە مردن دەترسیٚ، زۆریش ئاسان

نییه. ئاااخ، ئەگەر دایکم نەدەبوو. ئاااخ ئەگەر ئەو نەدەبوو... ئاخرییەکەی هەر دەمگرت. دەمگرت و گەمەم پێ دەکرد. ئەو کە زراوی لە مەرگ چووە و لێی تۆقیوە، ئەوەندەم دێنا و دەبرد ئەوەندەم دەکوشت و دەمژیاندەوە ئەوەندەم هەڵدەسووڕاند فەلەك گوتبای دەستخۆش... وام لە نێوان مەرگ و ژیاندا هەڵدەسووڕاند کەس نەیدیبێ و نەیبیستبێ."

یەك پشوو و بە ئاخ و داخەوە قسەی دەکرد:"بەڵام دایکم پەلەم لێ دەکا. ئەگەر دایکم بەر لە دەروێش بمرێ، تازە لە داوخستن و گرتنی دەروێش بەکاری چی دێ؟"

بلە ئیبۆ ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"بەکاری چی دێ؟"

مەستان گوتی:"نامرێ. قەرەقیز خاتوون نامرێ. قەرەقیز خاتوون هەتا بەچاوی خۆی سەری دەروێش بەبڕاوی نەبینێ، نامرێ. هەر دەژیێ... نامرێ. ئەگەر ئەو هەزارساڵیش نەکوژرێ، قەرەقیز خاتوونیش هەزار ساڵی دیکەش هەروا لەوێ پاڵ بەو ئەستوندەکەوە دەدات و دەستی لەسەر دڵی دادەنێ و چاو دەبڕێتە ئەو ڕێگەیە و چاوەڕوان دەبێ. ئەمن ئەو دەناسم. کەس لەگوێن ئەو نییە. ئەو چاوەڕوان دەبێ...."

حەمدی گوتی:"ئەو چاوەڕوان دەبێ. ئەگەر پێویستیش بێ، دەساڵیش، پانزە ساڵیش هەر چاولەڕێ دەبێ. نامرێ. ئەو چاولەڕێ دەبێ..."

مستەفا بەگیش لە دووی دان و گوتی:"وایە. دایکم نامرێ... بەڵام چاوەڕوانییەکەی، چاوەڕوانیی هیوادارنەی ئەو، منی کوشتووە و دەمکوژێ."

مەستان گوتی:"سەیر کەن، سەیر کەن، وا سوارێکی دیکە لە پشت تەپۆڵکەکەوە دەرکەوت."

مستەفا بەگ گوتی:"دیتم."

چاویان لە سوارەکە بڕی. سوارەکە بەرەوڕوویان دەهات. هەر هات و هات و لە بەردەمیان ڕاوەستا. سەیرێکی دەوروپشتی خۆی و نێو دەوەنەکان و نێو زۆنگاو و قامیشەڵانەکەی کرد و بەو گەرمایە بەرەو چیای حەمیتە کە وەك گەواڵە هەڵمێك دیار بوو، ئەسپەکەی لینگ دا.

مەستان گوتی:"ئەو ماستە بێ موو نییە. چاوی دەگوت بەگژ ئەو سوارەدا دەچێتەوە."

ئیبۆ گوتی:"ئەو ماستە بێ موو نییە."

حەمدی گوتی:"بێ موو نییە."

مستەفا بەگ گوتی:"ئەمڕۆ دێ. ئیتر بەسە. با بێ. بەسە ئیتر. بەس."

"یانی تۆ دەفەرمووی بە جێیەکەمانیان زانیوە؟"

مستەفا بەگ گوتی:"پێیان زانیوە. ئەگەر دەروێش تا ئێستا نەیزانیبێ لە کوێ بۆسەی بۆ دەنێینەوە، دەبێ بڵێم قوڕی بەسەری... بەڵام ئەمڕۆ دێ... ئەمڕۆ ئەو گێچەڵە کۆتایی دێ."

حەمدی سوارێکی دیکەی دی. لە دوورەوە و نزیك لەو شوێنەی ساورۆن و زۆنگاوەکە تێکەڵ دەبوونەوە و لە قەراغ دارستانە بییەکە... سوارەکە دەستەکانی هەڵدێنا و دایدەنواندنەوە. بەرەبەری نیوەڕۆیە بوو کە گوێیان لە خرمەی ناڵی ئەسپ بوو. تارمایی سوارێك بەسەر ئەسپەکەوە هەر هێندەی منداڵێك دیار بوو.

دەنگێکی توند و گڕی هەبوو و لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دەدایەوە. بەڵام دیار نەبوو دەڵێ چی.

هەستان و سەیری ئەو بنیادەمەیان کرد، کە بە گوڕەگوڕ بە لێواری زۆنگاوەکەدا بەرەو لایان دەهات. ئەمڕۆ شتێك دەقەوما، بەڵام چ بوو؟

سوارەکە، کە نزیکتر بۆوە، لێی تێگەیشتن دەڵێ چی.

مستەفا بەگ نیگەران بوو و دڵی توند لێی دەدا. بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا. ڕووداوێکی تاڵ دەقەوما. هەر لە بەیانییەوە لە دڵی گەڕابوو کە ئەمڕۆ شتێکی ناخۆش دەقەومێ. بەڵام ئەو ڕووداوە ناخۆشە دەکرا چ بێ؟"

پرسی:"دایکم نەمردبێ، مەستان؟ ئەی ئەگەر مردبێ؟"

مەستان بە دڵنیاییەوە گوتی:"مەحاڵە. ئەو نامرێ. تازە، خۆ سوارەکە ئاشنا نییە... ئەگەر هەواڵێکی کۆشکی پێ بوایە، دەماناسی."

"ئەگەر... ئەو بێگانەیە..."

"کوڕە لە سەر ئەسپەکە هەر هێندەی مستێك دیارە، بەڵام دەنگێکی زۆر بە قەوەتی هەیە."

"مستەفاااا بەەەەەگ، مستەفاااااا بەەەەەەگ، مستەفاااااا بەەەەەگ."

دەنگەکەی لە ڕەوەزەکان دەگەڕا. دەنگێکی بەرز و گەرم و پڕ زایەڵە. دەتگوت تێی هەڵکردووە و گۆرانییەکی چوکووراوایی دەچڕێ... مستەفا بەگ ئەو دەنگەی گوێ لێ ببوو، بەڵام لە کوێ؟ دەنگەکە لە گوێیدا ئاشنا بوو. هەموو ئەو ئاشیق و گۆرانیبێژانەی هێنایەوە پێش چاوی خۆی کە دەیناسین. بە گوێی گیان دەنگەکەی بیست، بەڵام نەیناسییەوە. چی نەمابوو خاوەنی دەنگەکە بناسێتەوە.

"مەستان تۆ وەرە دەرێ و بچۆ پێشێ بزانە کێیە. ئێمەش وا باشترە بچینە بن دار بییەکان، جا ئەو دۆست بێ یان دوژمن، با شوێنی بۆسەکەمان پێ نەزانێ."

مەستان بە هەشتاو بەرەو لای سوارەکە چوو و ئەوانیش هەستان و چوونە بن دار بییەکان کە لە سەر یەکێك لە تەپکەکانی ئاقچاساز لە تۆپەڵەیەکی سەوز دەچێ و قامیشی بەرز و سوورباو وەك دیوارێك دەوریان داوە.

مستەفا بەگ گوتی:"ئێرە فێنکە. بڕوانە کانییەکی زولاڵیش لێرە هەڵدەقوڵێ. کوڕە خۆ لەو قامیشەڵانەدا بۆ بابی خۆمان ئاقڵ بووین. نە تاوێك دەیگرێ و نە بایەك. پیاو لەوێدا پشووی سوار دەبێ و دەخنکێ."

حەمدی گوتی:"دەخنکێ."

بلە ئیبۆ گوتی:"دەخنکێ. ئەمن ئەو دار بییە باش دەناسم. لەو سەرەوە، سەر لکەکانی جێی سێ کەسی دەبێتەوە. ئەو کاتی قاچاغ بووم، سێ مانگی رەبەق هەر لە سەر ئەو دارە دەنووستم. شوێنی خەوەکەم وەك هێلانەی مەل نەرم بوو. ژەندەرمەکان نێو هەموو بییەکانی ئاقچاسازیان سەنگ و سووژن دەدا، بەڵام ئەقڵیان بەوە نەدەشکا سەرێك لێرەش هەڵێنن. ئێرە بەهەشتی چوکووراوایە. شنەیەکی فێنك بێ بڕانەوە دەست بەسەر یاڵ و بژی ئەو دار بییەدا دێنێ..."

مستەفا بەگ قسەی پێ بڕی:"

"ئەی بۆچی ئەو هەمووە رۆژەی لەو قامیشەڵانە بەقوڕێ گیراوەدا وەخت بوو گیانمان دەربچێ، باسی ئێرەت نەدەکرد؟ ئەگەر ئەوەی دێ بێگانە نەبێ..."

بلە ئیبۆ گوتی:"وا باشترە لە لای دەوەنەکان بچینە پێش کابرا. ئەگەر وا بکەین، پشتیشمان بە ئاقچاسازەوە دەبێ. لەوانەیە ئەوێش هەر لێرە بمێنینەوە."

"حەز ناکەم بچمەوە ماڵێ. چاوم بەرایی نادا دایکم ببینم. ئەوەندە مات و خەفەتبار سەیرم دەکا، ئاگرم لە جەرگی بەر دەدا. چاوە گریاناوییەکانی هەر دەڵێی چاوی ئاسکن... ئیتر تاقەی ئەو چاوانەیم نییە. ئەگەر دیسان بمانەوێ بۆسە بۆ دەروێش دابنێینەوە، شەو و رۆژ هەر لێرە چاوەڕێی دەبین... لە نێو ئەو قامیشەڵانەدا کەژاوەی هەڵدەدەین."

دەنگی پیر و بە لرخەی مەستان لە دوورەوە بیسرا:"جاڕچی، جاڕچی هاتووە، جاڕچی."

بلە ئیبو بە سەرسووڕمانەوە گوتی:"جاڕچی هاتووە بەگ. جاڕچی هاتووە..."

"جارچی لە خۆڕایی نایەتە ئێرە. جارچی لایەنگری ئێمەیە. دیارە شتێك قەوماوە دەنا جارچی لە شارۆچکەوە نەدەهاتە ئێرە."

تاوێك دواتر جارچی لە ئەسپەکەی دابەزی. بۆ دەرکردنی تەزووی لاقە کورتەکانی، چەند جاران نووشتاندنییەوە و راستی کردنەوە. بەگ لەولاوە لە تەنیشت گولێکی شلێرەوە کە مێش لەسەر گوڵە سوورباوەکان دەجوولانەوە، راوەستابوو و کونجکۆلانە سەیری هەلسوکەوتی جارچییەکەی دەکرد. جارچی هەر چاوی بە بەگ کەوت، بەرەو لای غاری دا و دەستی گرت و خۆمانە دەستی گوشی. روخسارە تێکسمڕاو و چاوە بەقوولداچووەکانی و دەستە لەرزۆ و ئارەقەکردوو و لێوە بەبار برینە تازەکەی سەر لا رووەمەتی چەپەی و پانتۆلە تازە دڕاوەکەی و کووڕاییەکەی پشتی، هەر هەمووی لە بەر چاوی بەگ زەق زەق دیار بوون.

بەبێ ئەوەی نیگەرانی و دلەڕاوکێی خۆی ئاشکرا بکات، چاوەڕێی بیستنی هەوالێکی ناخۆش بوو.

"بەخێر بێی، دەنگ و باس؟"

"سلامەتیی سەرت."

"چۆنت زانی ئێمە لێرەین؟..."

"ئەمڕۆ بەیانی بەر لەوەی تاو هەلبێ، بە غاردان چوومە کۆشکەکەتان و لەوێ سۆراغی تۆم گرت. کەس نەیدەزانی لە کوێن. هەر ئەوەندەیان گوت کە لە ئاقچاسازن. ئەمنیش گوتم بە هەراکردن، دەیاندۆزمەوە. ئەو ئەسپەش قەرەقیزخاتوون پێی دام. قسەم لەگەل کرد."

"چی؟ قسەت لەگەل کرد؟ یانی قسەی لەگەل کردی؟ تۆی دواند؟"

"بەلێ منی دواند.... ئەو هەر نیگەرانی ئەوە بوو کە بەو کەڕەی بەیانییە بۆ هاتووم و چیم بە دەمەوەیە. کە گەیشتمە کۆشك لە خەو هەلنەستابوون. قەرەقیز خاتوون قالی وەئەستووندەکێك دابوو و لاقەکانی لەبن خۆیدا کۆ کردبوونەوە و لەسەر کورسییەك هەلکورمابوو و چاوی بڕیبووە ئێرە. هەر دەتگوت لەتە بەردێکە و پالی وەکۆلەکەکە داوە."

"ئەتۆ چیت پێ گوت؟"

"ئەمن نەمتوانی هیچی پێ بلێم. هەر ئەوەندەم پێ گوت ئاغاکانی شارۆچکە دەیانەوێ بمکوژن. ئەویش گوتی بڕۆ مستەفا بدۆزرەوە با فریات بکەوێ و رزگارت بکا. چاوی لێرە هەلنەدەگرت. بەبێ ئەوەی چاو بتروکێنێ، چاوی لێرە بڕیبوو. ئەمنیش بە سێرەی چاوی ئەوڕا زانیم دەبێ لێرەوە بن و لێی سواری ئەسپ بووم و راستەوڕی بەرەو ئێرە لێم خوڕی."

مستەفا بەگ گوتی:"جارێ دانیشە براڵە، با پشوویەکت بێتەوە بەر خۆت ئێستا دێمەوە."
بەگ چووە نێو قامیشەڵانەکە و زوو گەڕایەوە. جارچی بە حورمەتی ئەو لە جێی خۆی هەستایە پێ.
مستەفا بەگ خۆمانە و میهرەبانانە گوتی:"دانیشە براکەم. هێشتا هەر خەریکە. وەك شێر. باڵی قالۆنچەکەی بەرنەداوە... دەڵێی شێرە، نە دەبەزێ و نە بێهیوا دەبێ و نە مەیدان چۆڵ دەکا."
دەستی جارچییەکەی گرت و بردییە نێو قامیشەڵانەکە و...
"دانیشە... ئەو مێرووڵە بچکۆڵانەیە دەبینی؟ خۆ دیوتە دەیەوێ ئەو قالۆنچە زلە لە جێی خۆی ببزێوێ و بیباتەوە هێلانەکەی؟ دەیبینی؟ خۆ دیوتە؟ ئەو مێرووڵەیە چەند رۆژ لەوە پێش ئەو قالۆنچەیەی هەتا ئێرە راکێشاوە و لێی کەوتووەتە نێو ئەو قووڵکەیە. بەڵام شل نابێ و نابەزێ. یەك پشوو لەگژ قالۆنچکەکە رۆدەچێ و قەوەی دەداتێ و لە رێگە چارەیەك دەگەڕێ. ئەو مێرووڵە بچکۆڵانەیە ئاخرییەکەی رۆژێك لە رۆژان ئەو قالۆنچەیە لەو قووڵکەیە دێنێتە دەرێ. لەوە بەولاوە نییە."
جارچییەکەی کە دەستی لە دەستەکانی ئەودا بوو، دیسان لە قامیشەڵانەکە هێنایەوە دەرێ.
"کێ دەیەوێ بتکوژێ؟"
"ئاغاکان."
"باشە بۆ؟"
جارچی نەغد و پوخت بۆی لەبنی کوولەکە دا. کە لە قسە بۆوە، ئارەقەی رەش و شینی دەرکردبوو. دەنگی دەلەرزی. گوتی:"دەمکوژن. بۆم گرنگ نییە. ئاسنگەرەکە هەر ماوە... ئەو ئاسنگەرە لە برا باشترە بۆم. ئاگای لە ژن و منداڵەکەم دەبێ و ناهێڵێ حەوجێ بەکەس بن. چاوی بەسەر منداڵەکانەوە دەبێ تا دەرسەکانیان تەواو دەکەن و دەبنە پیاوێك بۆخۆیان. هەر بۆیە ئەمن لە مردنێ ناترسم."
"ئەها، دوورمان دەخەنەوە. ئەمرۆ و سبەی؟ دەروێشیش ئاگادارە؟"
"ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلی بە منی گوت... گوتی دەستم بە داوێنت، جارچی گیان... ئەگەر من بچم ئاغاکان پێم دەزانن. بۆخۆت بچۆ. چوونی تۆ باشترە. لە پێشدا بچۆ لای مستەفا بەگ و دوای ئەویش بچۆ لای دەروێش بەگ و بۆیان لەبنی کوولەکەی بدە و پێیان بڵێ

وەزعەکە شپرێوە. هەم خۆیان و هەم خزم و کەسەکەشیان بە عێل و عەشیرەتەوە دەنێرنە ئەدرنێ و قارس. هەر بۆ ئەوەی دەستبەسەر زەوی و زارەکەیاندا بگرن."

"ئاوا؟"

مستەفا بەگ کە لە فکرەوە رۆچووبوو، لە نەکاو دایە قاقای پێکەنین و ئەوەندە پێکەنی وەختابوو ببوورێتەوە و چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو:"ئاوا بە هەڕ و گیڤەوە لە ترۆمبێلەکەی دابەزی و بە تووڕەییەوە بۆت هات.... هههههههههه.... هههههه.. پەلاماری دای... پەلاماری پیاوی پیاوان... جوامێری جوامێران. لوولەی دەمانچەکەی بە نێوچاوانتەوە نا... ههههههههه ئەی تۆ چیت گوت؟ چی، چی چی چیت گوت؟"

وێکڕا پێدەکەنین و قاقایان دەکێشا...

"ئەتۆش گوتت... بیتەقێنە، بیتەقێنە دەی... سەگبابە دەی بیتەقێنە... دەمانچەکەشی هەر لەسەر نێوچاوانت بوو، سارد سارد... بیتەقێنە سەگباب، بیتەقێنە. ئەگەر نەیتەقێنێ دایك و ژنەکەت... زەرد هەڵگەڕا، پێی بە عەرزییەوە رەق بوو، ههه ههه ههه هههه.."

چەند جاران دیمەنی دەمانچە کێشانەکەی قۆرت بۆغای گێڕایەوە و هێنایە پێش چاویان. چاوەکانی سڕییەوە و گوتی:"وەی باوکەڕۆ مردم. وەی لە پێکەنینان مردم. لە مێژساڵە ئەوەندە پێنەکەنیوم. کوڕە هۆی گەوادی ژن کوژ. هۆی پارەپەرستی بێ رەگ و بێ غیرەت."

"بەڵام هەر دەمکوژن بەگ. دەمکوژن. بێ ئەملا و ئەولا دەمکوژن. ئەگەرچی هیچ ترسێکم نییە، با بێن و بمکوژن. شانازیی پێوە دەکەم. ئەگەر ئاسنگەرەکەم لە پشت نەبوایە، بەزەییم بەخۆمدا دەهاتەوە. بەڵام ئێستا مردن و ئاوخواردنەوەم پێ وەك یەك وایە. ئەمن گەلێ جاران لەگەڵ مەرگ دەستەوئێخە بم و ئیتر خووم پێوە گرتووە. چونکە گەلێ جاران مردووم و ژیاومەتەوە، بۆیە ترسم لێی شکاوە. لەبەر ئەوەش کە دوای مردنم خەمی هیچم نییە... بە دڵخۆشی و پێکەنینەوە بەپیر مەرگەوە دەچم."

بەگ بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی دڵی جاڕچییەکە بداتەوە. جا ئێستا کە وای لێ هاتبوو، ئاغاکان بێ ئەملا و ئەولا جاڕچییەکەیان دەکوشت. چارەنووسێکە و ئاوایە. لە نەکاو شتێکی بە مێشکیدا هات. سەری هەڵێنا و گوتی:"بڕوانە برالە، پێشنیارێکم هەیە. ئەمن ئێستا بۆ ئەوەی تۆ بتوانی لە شارێکی دیکە بژێی پارەیەکت...."

جاڕچی دەسبەجێ هەستا و گوتی:"ناکرێ، شتی وا ناکرێ و نابێ."

"راوەستە برالە تووڕە مەبە. گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی."

"بڕوانە مستەفا بەگ، لانیکەم تۆ شتی وا مەڵێ..."

"ئاخر تۆ لەسەر ئێمە دەکوژرێی."

"دەکوژرێم. با بکوژرێم. بەڵام تاقەت ناهێنم خەڵك لە پشتەسەرم بڵێن جاڕچییەکە بۆ ڕزگاری کردنی گیانێکی بێ نرخ، ترسا و لێی دا و ڕۆیشت. پشتی لە زێد و وڵاتەکەی کرد. ڕەوا نییە بۆ گیانێکی بێ نرخ، خەڵك لە پشتەملە جوێن بە دایك و خوشکم بدەن. لانیکەم مستەفا بەگ ئەتۆ..."

تووڕە و زویر، لە حاڵێکدا یەك پشوو دەیبۆڵاند و دەیگوت:"لانیکەم تۆ... تۆ... تۆ.. لانیکەم تۆ..." و بەرەو ئەسپەکەی کەوتە ڕێ.

بە دوویدا مستەفا بەگ بانگی کرد:

"ڕاوەستە، ڕاوەستە، ڕاوەستە براله، ڕاوەستە. زویر مەبە و دڵت نەیەشێ. مەبەستێکی خراپم نەبوو."

باسکی گرت و جاڕچیی، کە دەتگوت هەڵمساوە و گەورە بووەتەوە و کووڕاییەکەی پشتی تواوەتەوە، گێڕایەوە. هەر ڕێك لەو کاتەدا سوارێك کە لە دوای خۆی هەورێکی لە تەپوتۆز بەجێ دەهێشت، بە ڕێیەکەدا ڕادەبرد. مستەفا بەگ سوارەکەی ناسییەوە کە بەتاو ئەسپەکەی لینگ دەدا. گوتی:"ئەوە سلێمان سامییە. بلە ئیبۆ خۆی بگەیەنێ. بێ و نەبێ لە ئێمە دەگەڕێ."

جاڕچییەکە گوتی:"ئەویش قاباقچی ئۆغلی ناردوویەتی."

بلە ئیبۆ خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکە و وەشوێن سلێمان سامی کەوت. تاوێك دواتر دوو سوار بەرەو لایان هاتن. سلێمان سامی هەر دابەزی، باوەشی بە بەگدا کرد و بە هات و هاوارەوە گوتی:"دەرتان دەکەن و دوورتان دەخەنەوە بەگ. دوورتان دەخەنەوە. ئەمڕۆش نەبێ، سبەی. ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ، سبەی... سبەی... سبەی... و ئەنگۆش ئاگاتان لە مەحموودی بێ زەواد نییە. دوورتان دەخەنەوە."

هەموو شتێکی لەبنی کوولەکە دا و گوتی:"ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلی سڵاوی گەیاندی. ئێستێ هەموو کارەکە بە بڕیاری پیرەقازییەوە بەندە. پیرە قازیش تەنیا بە قسەی عەزیزئاغا دەکا. ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلی گوتی بەگ یان دەبێ چاوی بە عەزیز ئاغا بکەوێ یان خۆی ڕاستەوخۆ بچێتە لای پیرە قازی."

هەتا نوێژی شێوانێ لەوێ باسی هەموو رووداوەکانی شارۆچکەیان کرد و ئەوجار لێی سواری ئەسپان بوونەوە و هاتنەوە کۆشکێ.

قەرەقیزخاتوون هەر لە سەر جێیەکەی خۆی پاڵی وە ئەستۆندەکەکەوە دابوو و لاقەکانی لە بن خۆیدا کۆ کردبوونەوە و لەسەر کورسییەکە گرمۆڵە ببوو و چاوەڕوانی دەکرد. مستەفا بەگ بەسەرکزی بەبەر چاویدا تێپەڕی. قەرەقیزخاتوون تەواو بەرەو لای وەرسووڕایەوە و سەیری پشتەسەری کوڕەکەی کرد و لە بن لێوانەوە گرماندی. بەڵام مستەفا بەگ نەیبیست.

"دەرمان دەکەن مستەفا، دەرمان دەکەن. دەرمان دەکەن بۆ ئەوسەری دنیامان دەنێرن. دوژمنەکانیشمان بۆ ئەوسەرەکەی دیکەی دنیا. تۆڵەکە دەمێنێتەوە قیامەتێ. تۆڵەی خوێنی مورتەزاکەم ناکرێتەوە..."

مستەفا بەگ لە هاوسەرەکەی کە بەدوایدا هاتبووە ژوورێ، پرسیی:"دایکم دەڵێ چی؟"

"ئەمرۆ دوای رۆیشتنەکەی جارچی، دەستی کرد بە گریان و بۆڵەبۆڵ. یەك پشوو دەکڕووزایەوە و دەینالاند کە دەرمان دەکەن. ئەوە ئێستا تۆزێك هێور بووەتەوە."

رێك لەو کاتەدا قەرەقیزخاتوون وەك تارماییەك وەژوور کەوت:"پەلە بکە و دەست ببزێوە مستەفا، پەلەی بکە. سەیر بکە ئێستاش دەیانەوێ دەرمان بکەن و دوورمان بخەنەوە. مەهێڵە تۆڵەی مورتەزام بکەوێتەوە رۆژ بازاڕی قیامەتێ. با خوێنی مورتەزام بەخۆڕایی و بەفیڕۆ نەچێ. مەهێڵە بەفیڕۆ بچێ مستەفا."

گەڕاوە و دەرگاکەی پێوە دایەوە و چۆوە سەر کورسییەکەی خۆی کرووشمەی کردەوە.

تاوێك دواتر هاتنە سەر سفرەی شێو. سلێمان سامی یەك پشوو قسەی دەکرد. لە نەکاو چاوی بە جارچییەکە کەوت کە لەسەر سفرەکە گرمۆڵە ببوو، گوتی:"ئەو ئاغایانە هار بوون. بڕوانە، بڕوانە بەگ. ئێستاش ئەو پیاوە دەکوژن. قۆرت بۆغا جارچییەکەی ماڵۆێرانی ئاوا..."

پەنجەی بۆ لای ئەو راکێشا و گوتی:"سێ زرتە زەلامی لات و پووتی داناوە ئەو داماوە بکوژن. تۆ خوا هەر کەسێك تۆزە بۆنێکی مرۆڤایەتیی بەسەردا هاتبێ، دەست لەسەر لێقەوماوێك بەرز دەکاتەوە؟"

سلێمان سامی قسەی دەکرد و جارچییش لە بنەوە لێی مۆڕ دەبۆوە و لە بنەوە دەیبۆڵاند.

هەر سفرەکە کۆ کرایەوە، جارچی دەسبەجێ هەستا و گوتی:"ئیزنم بدەن دەڕۆم. رێیەکەم دوورە."

مستەفا بەگ کە لێی سوور بوو دەیەوێ بۆ کوێ بچێ، پێشی بە ڕۆیشتنەکەی نەگرت و نەیگوت ئەمشەو لێرە بمێنەوە و بەیانی بڕۆ. هەتا بەر دەرگای حەوشە لەگەڵی ڕۆیشت و بە دزییەوە شتێکی لەگوێی خوێند.

جارچی بە دەم بیرکردنەوە لە مەرگ بە گشتی و مەرگی خۆی و ئەوەیکە چۆناوچۆن دەکوژرێ و گیانکێشان و گیاندانەکەی چەندە دەکێشێ، تاریکاییەکەی دەبڕی و دەڕۆیشت. پیاوی وەك ئەو ئاسنگەرە لە دنیادا نییە. ئەوە ئەوپەڕی بەختەوەرییە پیاو دۆستێکی وەك ئەوی لەو دنیایەدا هەبێ. جارچی سێ برای هەبوو. هەر سێکیان دەستەوستان و خوێری و فسۆس. جارچی کوژرابایەش ئەوان مێشێکیان لێ میوان نەبوو.

جار و بارە رادەوەستا و سەرسام دەبوو و دەیگوت:"خوایە، خوایەگیان، پیاوێکی پیر و کەنەفتی وەك من چۆنا و چۆن دەکوژن؟ من، من، من چۆن دەمرم؟ کە وەبیری دەهاتەوە چۆن قۆرت بۆغای کردبووە پەڕووە بەگوویەك، مووچڕکەی پێدا دەهات و مووی لێ دەبوونە نەشتەر. چۆن؟ بۆ دەکوژرێم؟ کێ سێ کەسی بۆ کوشتنی من تەرخان کردووە؟ کوڕە سەیر کە تەنانەت دەمانچەیەکی بچووکیشم پێ نییە.

سەردەمانێك دەمانچەی لە قەدی دەدا و زۆریش ئەنگێوە بوو. کوڕە چما بنیادەم دەبێ وەك دەست و پێ بەستراوان خۆ بەدەستەوە بدا؟... دەبێ بکوژی، لانیکەم دووکەس سێ کەس بکوژی جا...

شەوگار شەق ببوو کە گەیشتە کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی. هیدایەت دەمودەست چووە سەرێ و بە بەگی گوت:"پشتکووڕەکە هاتووە."

دەروێش بەو شتەی زانیبۆوە کە ئەوێ ڕۆژێ قەومابوو، بۆیە چاوەڕێی هاتنی جارچی بوو. بە گەرم و گوڕی پێشوازییان لێ کرد و زۆر خۆمانە، توند دەستەکانی گوشی و بە پێکەنینەوە گوتی:"خواردن بێنن بۆ ئەو کووڕە تەرەسە. کوڕە ئەوە چت لە قۆرت بۆغا کردووە؟"

جارچی گوتی:"نانی شەوم خواردووە و برسیم نییە."

دەروێش بەگ گوتی:"هەتیوە پشتکووڕە دەزانم لە کوێوە دێی."

بردیانە دیوەخانێ. نەخش و نیگاری ڕەنگینی تەختی دیوەخانەکە لە بەر تیشکە کزەکە و لە سێبەر و تارماییەکاندا دەتگوت دەبزوێ و دەجووڵێن. سندووقە دارینەکان لە چێوی گوێز... گوڵ و دەوەن و مەل و مامز و دار و ئەستێرەیان لەسەر هەڵکۆڵرابوو و بە ریز لە بن دیوارەکەوە دانرابوون... نەخشە جووڵاوەکان لە بەر ڕووناکاییەکی کز و بزرکاو.

"باشت بەو داوێن پیسە ترسنۆکە کردووە. باش کردووتە بە پەڕۆگوو... ئەوانە وەك ژن وان. ئێمەش دەر دەکەن، ها؟ قوونی رەش و سپی دەردەکەوێ.

"ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغڵی دەڵێ ئاغاکان ئەمجارەیان کاری خۆیان بەپتەوی کردووە و کارقامییان کردووە. گوتی چار نییە، جگە لەوەی بەگ خۆی سەردانێکی پیرە قازی بکا. گوتی...

"راستییەکەم پێ بڵێ جارچی. ئەتۆ پیاوێکی ژیر و چاو و گوێکراوەی. تۆ پێت وا نییە هەموو ئەو گۆنگەڵ و گێچەڵانە لە بن سەری ماهیربەگ دان؟"

"هەر ئەو خۆی چووەتە لای داواکاری گشتی و لەگەڵی دانیشتووە... هەموو ئەو شتانە ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغڵی رێکی خستووە. ئەدی هەمووی لەبن سەری ئەو دایە."

"ئەی باشە، ئەگەر وایە، ئەو پەیام ناردن و راسپاردانەی لە چییە؟"

جارچییەکە گوتی:"ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغڵی زۆر لە ئێوە دەترسێ. زراوی لێتان چووە. دەزانێ لەو سەری دنیا یەکێك بترێ، ئەنگۆ دەیبیستنەوە. خۆی شیرین دەکا..."

دەروێش بەگ نێوچاوانی تێك نا و لە بن لێوانەوە گرماندی:"بێ شەرەفی هیچ و پووچ."

جارچییش هەر وا بە بێزراوییەوە دووپاتەی کردەوە:"بێ شەرەفی هیچ و پووچ."

دەروێش بەگ لە نەکاو رووی کردە جارچی و چاوەڕواننەکراو لێی پرسی:"قۆرت بۆغا تۆ دەکوژێ وایە؟"

جارچی لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:"دەمکوژێ. بەگ دەمکوژێ. هەر لە ئێستاوە سێ زرتە زەبەلاحی لات وپووتی تەرخان کردووە بۆ کوشتنی من."

"ئەو یەك دوو مانگە، لێرە، لە مولکەکەی مندا... ژن و منداڵەکەشت هەڵگرە و بیانهێنە ئێرە. ئەوانیش با وەڕەزییەکیان بشکێ."

جارچی گڕی گرت و خوێن بەری چاوانی گرت و دەماری لاملی وەك گوریسیان لێ هات و وە برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە و بەرەو لای دەروێش نووشتایەوە و کووڕییەکەی پشتی پتر دەرپەڕی:"ئەو چاوەڕوانییەم لەتۆ نەبوو بەگ. لە هەموو کەسم بوو لە تۆم نەبوو. دەزانم مەرگ سەختە. ناتوانم مل بۆ مەرگ راکێشم، ناتوانم، بەڵام ناشتوانم ئەوە قەبووڵ بکەم، کە بڵێن فلانی لەبەر قۆرت بۆغا هەڵات. بۆ رزگارکردنی گیانێکی پووچ، ئەو سەرشۆڕییە قەبووڵ ناکەم. دەمکوژێ با بمکوژێ... ئاسنگەرەکە..."

بەگ هەستا و دەستی گرت و داینیشاند و گوتی:"تووڕە مەبە براله. راست دەکەی. بۆ گیانێك، نابیٚ لەبەر ئەو گەوادانە را بکەی. دوای ئەوەی سینگت بە دەمانچەکەیەوە نا و دایك و خوشك و ژنیت کردە دراوێکی سووتاو، تازە بۆوەی نابیٚ را بکەی. دانیشە براله. هەقت بوو تووڕە بی. ئێستاش ئیدی هێور بەوە. ئەگەر لەو دنیایەدا کەسێك هەبیٚ لێت تیٚ بگا ئەو کەسە منم."

جارچی بە روخسارێکی سیس و ژاکاوەوە وەدەنگ هات:"دەزانم. هەر تۆی. کەس نییە تۆ نەبی."

دەروێش بەگ گوتی:"کەوابوو هێشتا جوامێری نەبڕاوەتەوە، براله. هێشتا تەواو نەبووە. ئەگەر جوامێر و مرۆڤایەتی لە لایەکەوە دابکشیٚ، لە لایەکی دیکەوە ئەوەندەی دیکە هەڵدەکشێتەوە. لە سایەی سەری جەنابتەوە ئەو راستەقینەیەم بۆ وەدەرکەوت. برای خۆم، کە دەمانچەکەی لیٚ کێشای و ئەتۆش سینگت بە سینگییەوە نا و گوتت ئەگەر نەیتەقێنی... چیی کرد؟"

جارچی لە خۆباییانە بە دەنگێکی گڕ و بە بزەیەکەوە گوتی:"چاوم لە چاوەکانی بڕی. دەست و ئەژنۆی کەوتنە لەرزین. سپی سپی هەڵگەڕا. چاوەکانی کەوتنە هەڵبەزدابەز بە نیگا بیٚ ئۆقرەکان دەپاڕایەوە ئاخۆ کەس هەیە لەو گێچەڵە رزگارم بکا؟..."

"دەزانم. هەموویم بیستووە. زۆر زۆر باش بوو. قیامەتت ناوەتەوە. ئەو گەوادەت باش شکاندووە."

دەستەکانی لێك دان و دەستی بە قسە کردەوە:"کارەکەت ئەوەندە باشە نەبێتەوە... دانیشە تا دەگەڕێمەوە."

ئەوەی گوت و وەدەر کەوت و تاوێك دواتر بە دەمانچەکەیەوە گەڕایەوە و بۆ جارچییەکەی راداشت. جارچی هەستا و دەستی لەسەر سینگی دانا و دەمانچەکەی لە بەگ وەرگرت و لە خۆشییان زاری هەتا بن گوێچکەی داپچڕیبوو، لە سەر مۆبلەکە دانیشتەوە.

چاوی لە دەمانچەکە هەڵنەدەگرت. ناغانێکی دەسك شفرەی بریقەدار بوو.

گوتی:"ئەوە ناغانی برا جوانەمەرگەکەمە. پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو. ناغانی براکەم دەدەمە برایەکی چاونەترس و ئازای دیکەم.

قایشە چەرمییەکە و توورەکەیەکی پڕ لە فیشەکیشی بە دەستی چەپییەوە بوو، بۆ جارچییەکەی راداشتن و گوتی:"هانیٚ."

جارچی لە خۆشیان شاگەشکە بوو. هەر وا دەمانچەکەی بارەوبار دەکرد و وەبەر تیشکی چراکەی دەدا و چاوە پڕ لە سوپاسەکانی خۆی لە دەروێش دەبڕی و تاوێك دواتر دیسان چاوی لە دەمانچەکەی دەکردەوە و پەیتا پەیتا دەستی بەسەردا دێنا.

"بیستووشمە زۆر ئەنگێوەی."

شەرمگرتوو و زمانشکاو، چاوە پڕ لە بریسکەی خۆشییەکانی بڕییە دەروێش و بە بزەیەکی سەر لێشێواوانەوە و بە بزەیەکەوە لە ناخی دڵییەوە سوپاسی بەگی کرد.... گریانێك ئەوکی گرتبوو. خۆ ئەو گریانە ئەوکی بەردابایە، لە ناخی دڵییەوە بە گیان و دڵ سوپاسی دەروێش بەگی دەکرد، بەڵام چیی کردی و کراندی، زمانی نەگەڕا.

هەرچۆنێکی بوو، توانیی شەویلگەی ببزێوێ و قەڵت و پەڵت چەند قسەیەك بدرکێنێ:"لەوەتەی هەم، لەوەتەی هەم... بەگم... ئارەزووومە... ئارەزووم دەکرد..."

نیگای پڕ لە سەرسووڕمانی لە دەمانچەکە بڕییەوە و بێدەنگ بوو. ئەوجار پێکەنی. پێکەنینێکی پڕ لە هەستی بەختەوەرییەکی چاوەڕواننەکراو... دواجار قسەکەی تەواو کرد:"دەمانچەیەکی ئاوام هەبێ."

دیسان هۆش و گۆشی چۆوە سەر دەمانچەکە.

ئەو شەوە لە خۆشییان نەخەوت. تا بەیانی هەر دەمانچەکەی بارەوبار کرد. هەر فیشەکی لەبەر نا و بەتاڵی کردەوە. تۆپەکەی سووڕاند و سووڕاندی... چووە بەر پەنجەرەکە و وەبەر تیشکی ئەستێرەکانی دا. دەمانچەکە لەبەر تریفەی ئەستێرەکان نەدرەوشایەوە. جارچی هەڵچوو و تووڕە بوو و ئەستێرەکان، ئەو گەوادە هیچ و پووچانەی دایە بەر جنێوان کە هەر خۆیان ڕووناك دەکەنەوە و هیچی دی...

کەڕەی بەیانی، بەر لەوەی تاو هەڵێ، هەستا و دەمانچەکەی وەبەر ڕووناکایی تاریك و ڕوونی بەیانی دا. بەڵام دیسان دەمانچەکەی نەبریسکایەوە. ئەو جارە جنێوی بەو خۆرە دا کە درەنگ هەڵدێ. هات و چوو و پەیتا پەیتا دەمانچەکەی وەبەر ڕووناکایی پەنجەرەکە دا و جنێوی بە تاریکایی دا، هەتا یەکەم تیرێژەکانی ڕووناکایی بەسەر تاریکی و ڕەشایی دەمانچەکەدا هات و بریسکایەوە. بریسکەبریسکێکی بەشەپۆل. جارچی مەست و شاگەشکە، نەیدەتوانی چاو لەسەر دەمانچەکە هەڵگرێ و ماوەیەك هەروا لەبەر پەنجەرەکە چاوی بەسەر دەمانچەکەیەوە مایەوە.

به دەنگی دەروێش بەگ کە لە پشت سەرییەوە هەستابوو، راچڵەکی و وەخۆ هاتەوە و تەریق بۆوە و بە هەڵەداوان دەمانچەکەی لەسەر عەرزی دانا. رووی کردە لای دەروێش بەگ و بە دەنگێکی پڕ لە دڵنیاییەوە گوتی:"سڵاو بەگ. چاوەڕێ بووم لەخەو هەستی. ئیزن دەخوازم بڕۆم."

"بەرچایی..."

جاڕچی قسەی پێ بڕی:"دەسبەجێ، دەسبەجێ، دەسبەجێ دەبێ خۆم بگەیەنمەوە شاری... بێت و وەدرەنگی بکەوم هەزار قسە و قسەلۆکم بۆ هەڵدەبەستن. دەکرێ دەروازەی شار دابخەی، بەڵام زاری خەڵکی داناخرێ. دەبێ بڕۆم. پاروەکیش چییە لە گەرووم ناچێتە خوارێ."

بەگ قایل بوو:"زۆر باشە برالە، راست دەکەی. ئێستا دەڵێم ئەسپت بۆ حازر بکەن. ئەسپەکە لە شاری بدەوە بە رەمەزان موهاجیر، دەیهێنێتەوە. لێرە کاری هەیە."

جاڕچی گوتی:"بەسەر چاو."

ئیتر دەستی بەگی ماچ کرد و خێرا لە پلیکانەکان چووە خوارێ و سواری ئەسپێکی چەرموو بوو و وەك برووسکە لە حەوشەکە دەرچوو. جارێ ئەسپەکەی کە لە بنیدا وەك با دەفڕی، دەدایە بەر قامچی و جار و بارەش دەمانچەکەی دێنا دەرێ و سەیری دەکرد.

تاو رمبێك بەرز ببۆوە کە گەیشتەوە شاری و وەك نەیزەك بە بازاڕەکەدا تێپەڕی. لەو سەری بازاڕەکەش ئەسپەکەی پێ رانەوەستا و ئەسپەکە هەڵیگرت و لە شاری بردییە دەرێ. ماوەیەك دواتر بە یۆرغە گەڕایەوە بازاڕەکە. قیت و قنج لەسەر خوانی زینەکە دانیشتبوو و چاکی چاکەتەکەی لێ بەلادا کردبوو و دەستی راستەی لەسەر رانی دانابوو و دەمانچەکەی بەرقەدی وەدەر خستبوو. خرمەی ناڵی ئەسپەکەی، پەڕەی لووتی هەڵدەبەزاندەوە. لغاوی ئەسپەکە کەفاوی بوو و هەموو گیانی شەڵاڵی ئارەقە. خۆ ئەگەر سوارەکە هەوسارەکەی بۆ شل کردبایە، دیسان ئەسپەکە دەکەوتەوە چوار ناڵە. جاڕچی لە بەرانبەر دووکانی ئاسنگەرەکە، کە کەوتبووە گۆشەیەکی بازاڕەکەوە هەوساری ئەسپە تووڕەکەی کێشا. دابەزی و ئەسپەکەی لە دارێك بەستەوە و خۆی بە دووکانەکەدا کرد. ئاسنگەرەکە ئاگرەکەی دەگەشاندەوە و پشکۆ و سکڵەکان لە ئاورگەکەدا پزیسکیان دەپژاند. جاڕچی لە خۆشیان باوەشی پێدا کرد و بە دەنگی بەرز گوتی:"بڕوانە، بڕوانە."

ئاسنگەر کە لوولەی دەمانچەکەی لەسەر لووتی خۆی دی، راچڵەکی و ئەوجار دایە پێکەنین.

جارچی:"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، بە دیاری دایمێ. هی برا جوانەمەرگەکەیەتی... پێی گوتم، ئەو جوامێر و نەترس و ئازا بوو. دەمانچەکەی ئەو پێشکەش بەتۆ... بەتۆ کە دوژمنداری... و دوژمنەکانیشت هەموو زاڵمن، کافر و چەپەڵن... پێویستیت بەوە دەبێ..."

دەنگی لە نەکاو پەژارەیەکی لێ نیشت:"بەڵام بەکاری چ دێ، هەر شتێك بکەم ئەوان هەر دەمکوژن..."

ئاسنگەرەکە بە تووڕەییەوە گوڕاندی:"ناتوانن. ناتوانن بتکوژن. چما ئێمە لێرە پنگەین؟"

ئەوجار مستەکانی قووچاندن.

جارچی هەوڵی دا هێوری بکاتەوە:"تووڕە مەبە براله، تووڕە مەبە. بە تووڕەیی هیچ ناکرێ. ئەوان من دەکوژن."

ئاسنگەرەکە بە توندی دەستی بەسەر دەسکی بادەوەکەدا کێشا و گوتی:"ئێمەش پنگە نین."

ئەوانەی جارچییەکەیان بەو هەڕ و گیڤەوە لە بازاڕەکەدا دیتبوو، لە بن دار چنارە چڕەکەی بەر دووکانی ئاسنگەرکە کۆ دەبوونەوە. دووکاندارەکان هەموو دەهاتن بزانن چ باسە. سەراجیش هات. نانکەرەکەش هات.

ئاسنگەر و بە دووی ئەودا جارچییەکە لە دووکانێ هاتنە دەرێ.

جارچییەکەی یەك پشوو دەیگوت:"تووڕە مەبە براله. باشە ئەمن بشکوژرێم چ دەبێ؟ ژن و منداڵەکەم بەتۆ دەسپێرم. ئەتۆ لە خۆم باشتر چاوت بەسەریانەوە دەبێ و ناهێڵی بێ باوکییان پێوە دیار بێ. چما یەکێکی برادەری وەك تۆی لەپشت بێ ـــ ئەتۆیەك کە وەك کێوی قاف لە پشتی راوەستاوی ـــ لە مەرگ و زوڵم و لە ئاغا بێ دایك و بابانە دەترسێ؟"

ئاسنگەرەکە گرماندی:"هەر کەس دەستت لێ هەڵێنێتەوە، بەقوربانی گوللەیەك دەکرێ... هەر کەس خێسەیەکت لێ بکا... ئێمە چیمان هەیە لە دەستی بدەین؟ سندانە شکاوێك و کوورەیەکی ئاسنگەریی تێکشکاو، تەواو. بەڵام ئەوان بمرن، ئەو هەمووە ماڵ و منداڵ و ماڵی دنیا و سەروەت و سامان و ئەسپ و پەیتوون و کۆشك و ژنە گاندەرەکانیان لەپاش بەجێ دەمێنن و گەنجی کووچە و بازاڕ لێیان دەگێن... ژنە گاندەرەکانیان، کچە قەحپەکانیان و بووکە سۆزانییەکانیان لەپاش بەجێ دەمێنن. ئێمەش هەر سندانە شکاوێك و هیچی دی. با ئەگەر ئەوان پیاون بێن و دەستمان لێ هەڵێننەوە بزانە ئەو دنیایەیان چۆن لێ دەکەمە کونە مشك. گەوادی بێ چاو و ڕوو، هەر دەرەقەت هەژار و لێقەوماوان دێن. ئەوانە هەموو شتێکیان هەیە و ئێمەش هەر

سندانە شکاوێك. سندانێك کە هەر دەڵێی دڵێکی شکاوە... وەجاغمان پڕە لە ئاگر. هەر لێرەوە رایدەگەیەنم هەر کەس لە گوڵ کاڵتر بەو برا جارچییەم بڵێ، ئەوە نییە بۆخۆی دەیزانێ... وەجاغی کوێر دەکەینەوە. لە حەوت تا حەفتا ساڵەیان... لە حەوت تا حەفتا ساڵەیان..."

دەمارەکانی گەردنی درێژتر ببوونەوە و هەستابوون و دەستە گەورە تووکنەکانی گەورەتر بوونەوە. دەستی جارچییەکەی گرت و پاڵی پێوەنا بۆ پێشەوە:"بچۆوە سەر کار و ژیان و ماڵت براله. ئەگەر هاتن، جا من دەزانم چییان لێ دەکەم. ئەگەر ئێمەش مردین، پەتێك و قایشە پشتوێنێکمان لەپاش بەجێ دەمێنێ و ئەوانیش بمرن، ژنی وەك مامز و گاندەریان لەپاش بەجێ دەمێنێ....

لێ گەڕێ با بێن و بمانکوژن."

چۆوە نێو دووکانەکەی و بە تووڕەییەوە کەوتەوە خۆشکردنەوەی کوورەکەی. لە نێو کوورەکەوە خۆڵەمێش و پشکۆ و پزیسکی ئاگر دەردەپەڕین و ئاسنەواڵەکە هێندەی نەبرد وەك دندووکی کەو سوور بۆوە. ئاسنگەرەکە ئاسنە سوورەوەبووەکەی لەسەر سندانێ دانا و کەوتە کوتانی و دووکانەکە پڕ بوو لەو پڕیشکە ئاگر و پشکۆیانەی لە بن کوتکەکەیەوە دەردەپەڕین و دەکووژانەوە.

جارچی، کە لە دەرێ و لە نێو حەشامەتەکەدا مابۆوە، وەدەنگ هات:"چما ئەمن نازانم ئەوان دوای ئەوەی کردم، ناهێڵم بە زیندوویی دەربەرم؟ بێ ئەملا و ئەولا دەمکوژن. ئەمن هەر ئێستاش وەك مردووان وام و بەس دەجووڵێم. ئەوە باش دەزانم. پیاوانە و ماقووڵانە خۆم بۆ مەرگ ئامادە کردووە. ئەوە دەمانچەکەشم بە قەدمەوەیە."

چاکی چاکەتەکەی بەلادا کردو و دەستکە شفرەییەکەی دەمانچەکەی خستە دەرێ و لەسەری رۆیشت:"جارێکی دیکە هەڵناکەوێتەوە ئاوا هەمووتان پێکەوە ببینمەوە. نان و نمەکی زۆرتانم کردووە. لە خۆشی و خەم و ناخۆشیتاندا بووم. لە رۆژی تاڵ و شیریندا پێکەوە بووین. هەرکەسێك، تەنانەت ئەگەر هێندەی سەرە دەرزییەکیش دڵی لێم ئێشاوە، داوای لێ ی‌بوردنی لێ دەکەم. ئەمن ئیتر بەجێتان دێڵم براینە. گەردنم ئازا کەن."

هەر هەموو خەمبار و وێکڕا گوتیان:"گەردنت خۆش و ئازا بێ."

جارچی گوتی:"مەرگ تاڵە. زۆر تاڵە کە بنیادەم دەستەوستان چاوەڕوانی مەرگ بێ. پێیان گوتم رابکە. پارەیان بۆ کۆ کردمەوە. بەڵام ئەگەر لە ترسی مەرگ رام کردبایە، هەر هەمووتان لە پشتەسەرمەوە مردووتان لە گۆڕێ دێنامەوە دەرێ و زیندووتان نەدەهێشتم. دەتانگوت،

جارچی بوو ئیدی. چنگێك ئێسك و پرووسك هەر ئەوەی لێ دەوەشایەوە... بەڵام ئێستا ئەوە دەبینن کە هەر لێرە، لە نێوەندی ئەو بازاڕە پان و بەرینەدا راوەستاوم و لەسەرخۆ و بێ ئەوەی بشڵەژێم چاوەڕوانی مەرگم. زۆر پیاوانە و بە شێوەیەك کە هیچ کام لەو دەوڵەمەندانە قوونی ئەوەیان نییە کاری وا بکەن... تۆ خوا گەردنم ئازا کەن، گەردنم ئازا کەن، گەردنم ئازا کەن..."

بە بازاڕەکەدا تێهەڵبوو. دەستێکی بە دەسکی دەمانچەکەیەوە بوو. تووشی هەر ناسیارێك دەبوو، دەیگوت، براله گەردنم ئازا کە. ئاغاکان دەیانەوێ بمکوژن. فتوای کوشتنمیان داوە. گەردنم ئازا بکەن...."

هەر وا بە داوای گەردن ئازاییەوە لە بازاڕەکە هاتە دەرێ و بەرەو باکووری رۆژهەڵاتی شاری کە ئاشەکان لەوێوە هەڵکەوتبوون، وەڕێ کەوت. جاڕچییەکە هەر بەراستی دانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو و نەشڵەژابوو. زۆر زۆریش باش.

لەوێ، دەنگی خوڕەی ئەو ئاوانەی لە ماشەوە دەڕژانە نێو کۆرەگەی ئاشەکەوە، لەگەڵ گرم و هۆڕی بەرداشەکان تێکەڵ دەبوو و گوێی فەلەکیان کەڕ دەکرد. جاڕچی تاوێك راوەستا و چاوی لەو ئاوە کەفچڕانە کرد کە بەسەر چەرخ و دەندەی ئاشەکەدا شۆڕ دەبوونەوە ئەوجار چووە نێو ئاشەکەوە. بۆنە گەرمەکەی ئاردەکە هەموو ئاشەکەی داگرتبوو و ئاردە سپییەکە لە بن بەرداشەکانەوە دەهاتە دەرێ.

ئاشەوانەکە کابرایەکی بەساڵاچوو بوو. دەنگی لە نێو گرم و هۆڕ بەرداش و ئاوەکەوە هەستا. کە چاوی بە جاڕچییەکە کەوت گەشایەوە، پیرەپیاوێکی کەڵەگەتی پشتکۆمی ئارداوی بوو. هەر چاوی و ددانەکانی لە نێو دەموچاوە ئارداوییەکەیدا دەدرەوشانەوە.

جاڕچی گەوتی:"هاتووم بۆ گەردن ئازایی. دەزانی فەرمانی کوشتنیان دەرکردووم. ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ سبەی..."

ئاشەوانەکە گوتی:"بیستمەوە. ئاخر باشە ئەتۆ چکارت بەو سەگە گلاوانە دابوو. باشە پیاو سەری نەیەشێ بۆ دەبێ پرێسکەی لێ ببەستێ؟ چما نابینی ئەوانە لە سەر هیچ و خۆڕایی وەك ئاوخواردنەوە پیاو دەکوژن؟"

سەرێکی بە داخ و کەسەرەوە راوەشاند و گوتی:"سەت بریا خۆت تێکەڵی ئەو گۆنگەڵ و گێچەڵە نەکردبایە... ئاااااخ خۆزگە...."

هەستا و دەستی جاڕچیی گرت و پێکەوە لە ئاشەکە هاتنە دەرێ و چوونە بن شۆڕە بییەکە. لەوێ باشتر دەیانتوانی قسان بکەن و جەفەنگێکیش لێ بدەن:"ئەگەر یەك دوو ساڵ لێ دوور

کەوتبایەیتەوە... ئەمن لەگەڵ ژن و منداڵەکەت دەتنێرمە گوندەکەی خۆمان. یەك دوو ساڵان هەتا ئاوێك بە ئاگرەکەدا دەکرێ، دواتر دەگەڕێیەوە. کێ چووزانێ سبەی کێ پادشایە؟ هەتا ئەو کات ئەوەش لەبیر دەچۆوە."

" حەمە گیان، شتی وا نەبووە و ناکرێ. یانی تۆ دەتەوێ رابکەم؟ ئەویش دوای ئەوەی ئاوا سینگی خۆم دایە بەر دەمانچەکەی کابرا؟ جا دوای ئەوە چیم بۆ دەمێنێتەوە؟ ئیتر ژیانم بەکاری چی دێ؟ چما وا باشتر نییە لە بەرامبەر مەرگدا بەغیرەتتر بم؟"

ئاشەوانەکە هیچی نەگوت. تاوێك هەروا رووبەڕووی یەکتری و لە بن شۆڕە بییەکاندا پاڵیان وەدارەکانەوە دابوو، بەبێدەنگی تێپەڕی و ئاخرییەکەی جاڕچییەکە وەدەنگ هات:" هاتووم بۆ گەردن ئازایی. دەسەڵات چییە؟ وامان لە چارەی نووسراوە بڵێین چی؟"

ئاشەوانەکە بە پەژارەیەك لە دەنگیدا گوتی:"گەردنت خۆش و ئازا بێ... وا خەریکە دەبارێ."

جاڕچییەکە سەیرێکی لووتکەی چیاکانی کرد و گوتی:"جا چ بارانێکیش."

ئاشەوان حەزی لێ بوو ئاواتێکی خۆی دەربڕێ و پێشنیارێکیش بکات، بەڵام نەیدەزانی چۆن؟ بە دڕدۆنگییەوە گوتی:"دەڵێی چی نانی شەوێ پێکەوە لێرە لە ئاشی بخۆین؟"

لەوە دەترسا نەکا جاڕچی دڵی بێشێ... بنیادەم چۆن دڵی دێ بڵێ ئەتۆ دەکوژرێی... ئەتۆ کە ئەوەندەت کولیچەی سەر سکڵ و پشکۆی پێ خۆشە، دەمەوێ کولیچەیەکت بۆ دروست بکەم بۆ ئەوەی لەو دوا ساتانەی ژیانتدا تێر زگی خۆت بخۆی...

جاڕچی هەر لە کۆنەوە، جار و بارە کە کەیفی ساز دەبوو، دەستی دەدایە سازەکەی و دەهاتە ئاشی و هەرای دەکرد:"ئەو گرم و هۆڕە بێدەنگ بکە."

دادەنیشت و لەسەر بەردە سپییەکەی بەردەم ئاشەکە بەسەر سازەکەیدا دەنووشتایەوە و یەك پشوو ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە. دەنگێکی گەرم و بەسۆزی هەبوو و لەو چوکووراوایەدا کەس لە سازلێدان و گۆرانیگوتندا دەسکی لە دوو نەدەکرد. ژنەکەی کە دەکرێ بڵێین کاتی خۆی جوانترین کچی ئەو شارۆچکەیە بووە، گوێی لە دەنگی دەبێ و دڵی لێی دەچێت و ئاخرییەکەشی مێردی پێ دەکا.

ئاشەوانەکەش هەر لە خۆشەویستیی ئەو دۆستە هونەرمەندە تاقانەیەی، هەویری دەگرتەوە و بە وەردێنە پانی دەکردەوە و لەگەڵ پیاز و بیبەر و رۆنی کەرە و پەتاتە و گەڵا پنگە و سەوزە و جەعفەری هەڵیدەشێلا و وەبن پشکۆی دەدا.

جاڕچییەکەش زاری ئاوی دەکرد و بێ ئۆقرە بەسەر ئاوردانەکەوە رادەوەستا. دوایی وردە وردە خۆڵەمێشەکە لادەدرا و کولیچە برژاوەکەیان بەو هەمووە جوانییەوە دەردێنا. ئەو کولیچەیەی ئاشەوانەکە دروستی دەکرد لە دنیادا بێ وێنە بوو.

ئاخرییەکەی شەیتانی بە نەعلەت کرد و بە شەرمەوە گوتی:"دەڵێی چی... ئەمشەو ... کولیچەیەکت... کە زۆریشت حەز لێیە ... بۆ دروست بکەم..."

جاڕچی کە پڕ بە روخساری خۆی پێدەکەنی و گەش ببۆوە گوتی:"جا لەوە باشتر؟ رەحمەت لە گۆڕی مردووت... چ لەوە باشتر تێر زگی خۆم بخۆم. ئەی باشە مامە بۆچی شەرمت دەکرد؟ مەرگ وشترێکە و لەبەر دەرگای هەموومان دەنوێ. کەس لە مەرگ دەرباز نابێ. دەچم سازەکەشم دێنم با بەر لە مردنم هەوایەکت بۆ لێ بدەم. ئەتۆ هەر لە ئێستاوە خەرکی کولیچەی خۆت بە."

گەواڵە هەورێکی چڕ، رەنگ خۆڵەمێشی، لە سەرووی چیاکانەوە هەڵدەستا و بێوچان دەهاتە پێش.

لە پێشدا بایەکی سارد کە لە راست و چەپەوە تێك دەچرژا، هەڵی کرد. پشتی جاڕچییەکە تەزووی پێدا هات. ئەوجار لە دوورەوە برووسکە و هەورە تریشقە دەستی پێکرد، بەڵام شریخ و هۆڕەکەی نەگەیشتە گوێی ئەوان. بایەکی گەرم هات و بە دوویدا دەنکی درشت و شلەتێنی باران داباریں و قوولکەی وردیلەیان لەسەر خۆڵەمڕەکەی کرد و نەمان. لە دوورەوە، لەگەڵ ئەو هەورەتریشقانەی وا لە قووڵایی ئاسماندا دەتەقینەوە، باران وەك گۆزەی سەروبن دای کرد. رێژنەکە پتر لە نیو سەعاتێکی نەکێشا. هەوا پاکژ و فێنکەکەی دەوروبەریان خاوێن و زوڵاڵ بۆوە و بۆنی خاك و خۆڵەکە هەستا. پەڕەی لووتی جاڕچییەکە هەڵبەزینەوە.

چیای دوڵدوڵیش شۆرابۆوە و لە نێو رووناکاییە پەمەییەکەدا دەدرەوشایەوە و لە لووتکەکەیدا کۆلکەزێڕینەیەکی جوان رسکابوو. سێبەری بزرکاو و کەسك و مۆر و نارنجی وسوور و دیسان نارنجی و مۆر و کەسك و شینەکەی حەوتەوانەکە کەوتبووە سەر چیای دوڵدوڵ. حەوتەوانەکە (کۆلکەزێڕینەکە) هەتا ئێوارێ بەسەر چیا پاکژبووەوەکانەوە درەوشایەوە و ببووە کۆبەیەکی مۆر و پەمەیی دەوری هەورەکان و ئاسمان و رازندبوونییەوە.

جاڕچی کە کولیچەکەی دەخوارد، ئەوەندەی پێخۆش بوو، چاوی لەسەر یەك دادەنا و بیری لە مندالەکانی دەکردەوە و بەخۆی دەگوت، کوڕە خۆ ژن بۆوەی نابێ هەر ئاوا باسی مەرگ و کوژرانیان لەلا بکەی.

"بڕوانە ژنەکە، مەرگ وشترێکە و لەبەر دەرگای هەموو کەس ئیخ دەخوات. ئەوە ئەمری خوایە. ئەگەر هات و مردم، ئەوە ئاسنگەرەکە زیندووە. ئەو ئاگای لە منداڵەکانم دەبێ و ناهێڵێ چاوت لە دەستی کەس بێ و حەوجێت بەکەس هەبێ. ئەگەر ڕۆژێك هات و مەرگ لە دەرگای ماڵمی دا، دڵنیابە سەربەرزانە بەپیرییەوە دەچم و شانازییەکی گەورە بۆ منداڵەکانم بەجێ دێڵم. بڕوانە ژنەکە، هیچ ئاگات لێیە چ سەگ بە حەوشەیەکم بە قۆرت بۆغا کردووە؟... دڵنیا بە ئەوانە دێو و درنجیش بن، تۆزێك چییە لێیان ناترسم... دەتوانی وەك باب و براکانت متمانەت بە ئاسنگەرەکە هەبێ. ئەو زۆر لەو برایانەم زیاتر کە تەنیا حەز دەکەم مەرگیان ببینم. ئەو لە دایك و بابیشم لێم نزیکترە... ئەو سەرپەرشت و گەورەی منداڵەکانمە...."

# ٣٩

"سەری بڕاو و چاوی بە مۆڵەق وەستاو."

کەس نەیدەزانی چۆن دەستی پێ کردووە. لە تاڵانکردنی یەك دوو هۆبە و عەشیرەتەوە بە دەستی دوو کەسی لایەنەکەی دیکە دەستی پێ کردبوو. لەوانەشە کێشەکە لەسەر گەرمێن و کوێستانێ بووبێ و ئاگرەکەی تەشەنەی کردبێ. یەکەم رووداوێك کە نەوەکانی دواتر بیستبوویانەوە، زۆر دوای نشتەجێکردنی رەشماڵنشینەکان قەومابوو. تورکمانەکانی ئەو دەوروبەرە ئێستاشی لەگەڵ بێ هەر باسی ئەو رۆژە دەکەن. گەلێ سەردولکە و چەمەری و گۆرانی بەسەر ئەو شەڕەدا هەڵگوتراون و چیرۆکەکەی زار بە زار و نەوە بە نەوە گوێزراوەتەوە. کوژراوەکانی ئەو شەڕە لەسەر گردێکی چوکووراوا کە پێی دەگوترێ گۆڕستانە کوێرە، نێژراون.

لە کوێستانێوە دەگەڕانەوە. ساری ئۆغڵییەکانی لە سەرووی دیکەنلییەوە و لە ئەسلانتاشەوە بەرەو حەمیتەی داگەڕابوون. لە پێشدا لە بوزقۆیو بار و بنەیان دەخست و دوایی دەگەڕانەوە هەوارگەکەی خۆیان.

کەس نازانێ راست و دروست لە چ کات و ساتێکدا دەبوو. لەوانەشە پێش نیوەڕۆ بووبێ. گژەبای پاییزی کەوتبوون. لەوانەشە رێك لە نیوەڕۆیەدا بووبێ. گەرما زەردەکەی پاییزان وەك گەرماکەی هاوینێ باڵی بەسەردا کێشابن. کورتی ببڕینەوە دوو عارەبانەکە لە رێگەیەك تووشی یەکتری هاتن. ماوزەرەکان، تاپڕەکان، دەمانچە و قۆچەقانی و خەنجەر و تێلا کەوتنە کار و شەڕێك هەڵگیرسا سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە. ژن و منداڵیش پێوەر بوون و تێك بەر بوون. کەس نەیدەزانی لە پێشدا کام لا لەویتر راسا و یەکەم کەس کێ بوو تەقەی کرد. گرنگ نییە...

دەڵێن ئەو شەڕە حەوتووەکی خایاند و سەد و سی کەس پیر و لاو و ژن و منداڵ لە خوێن گەوزین... سەگەکان بێ پسانەوە دەیانلووراند و ئەسپەکان تا بەیانی دەیانحیلاند و مانگاکان دەیانهۆڕاند. هەندێ ل ئاژەڵەکان روویان کردە بیابان و هەرگیز نەگەڕانەوە.

هیچ هێزێکی دەوڵەتی خۆی لەو شەڕە وەرنەدا و عەشیرەت و هۆبەکانی دیکەش نێوبژیوانییان نەکردن. سەرانسەری چوکووراوا لە شەڕ و تێکهەڵچوون و لێکدانەکەی ئەوان وەڕەز ببوون. هەمووان دەیانگوت:"لێیانگەڕێن با یەکتری بخۆن. ئیشەڵڵا تۆویان دەبڕێتەوە و وەجاغیان کوێر دەبێتەوە و لە کۆڵ چوکووراوای دەبنەوە."

دیارە دوای حەوتووەك ئاگری شەڕەکە دامرکاوەتەوە و هەردوولا مردووەکانیان کۆ کردوونەتەوە و لە گۆڕستانە کوێرە ناشتوویانن. مێش و مەگەزی کەسکی لە رەنگی پۆڵا لەسەر ئەو خوێنە ئاڵەی بەسەر شینکە و چیمەنەکەی چوکووراوادا رژابوون، دەنیشتنەوە.

ئەوکات حاجی یاقوب، سەرۆك عەشیرەتی "ئاق یۆللی"یەکان و کەریم بەگ سەرۆك عەشیرەتی ساری ئۆغڵییەکان بوون. لەو شەڕەدا کەریم بەگ لە هەشت کوڕان پێنجی کوژرا. لەو سێ کوڕەی بۆی مابۆوە یەکێکیان شێت بوو. لە نۆزدە کوڕەکەی حاجی یاقوبیش دەیان کوژران و سێ کوڕیشی سەری خۆیانیان هەڵگرت و لێیان دا و رۆیشتن و بەو مەملەکەتەدا نەگەڕانەوە و کەس بە سۆراغی نەزانینەوە.

"سەری بڕاوە و چاوی بە مۆڵەق وەستاوە."

دووەمین شەڕێك کە ئاگامان لێیەتی، لە چیای حەمیتە، رێك لە لووتکە و لە نێو کۆمەڵە گابەرد و رەوەزێك دا قەوما کە زیارەتگەیەکی لێیە. تورکان لە گەڕانەوەیاندا کە گەرمێنەوە چوبوونە سەر چیاکە قوربانی بکەن. لە تەپڵ و دەهۆڵیان دەدا و گۆرانی و دوعایان دەگوتەوە و پێکەوە هەڵدەپەڕین و شمشاڵیان لێ دەدا. کچۆڵە ناسك و ژیکەڵە و نێوقەدباریکە تورکمانییەکان بە جلوبەرگ ئاڵ و واڵا سوور و کەسك و مۆر و پەمەیی و نارنجی و شینەکانیانەوە رەوەزەکانیان رازاندبۆوە. لە پڕ تەقەی تفەنگێك هات و خوێنێکی سوور بەسەر رەوەزە مۆرەکاندا شۆڵاوگەی بەست. بوو بەهەڵڵا و زەنا زەنا. عەشیرەتەکان خۆیان لەو رووداوە هەڵنەقوتاند. رێورەسمی قوربانی و زیارەتەکەیان بەرێوە برد و لە کێوەکە هاتنە خوارێ.

کوڕ و نەوەکانی کەریم بەگ و کوڕ و نەوەکانی حاجی یاقوب بەگ پێك هەڵپڕژابوون. ئەوان لەسەر لووتکەی چیاکە و لە دەوروپشتی پیرە گوێزەکە و لە نێو گابەرد و رەوەزە رژد و سەختەکاندا هەر لێکیان دا. کەس نازانێ شەڕەکەی چیای حەمیتە چەند رۆژی خایاند. لەو شەڕەدا سێ کەس خۆیان لەسەر هەڵدێرەکەوە هەڵداشتە خوارێ. ئەوانەی خۆیان هەڵداشتبوو، وا هەپروون بەهەپروون ببوون کەس ئێسك و پرووسکیشی نەدیتنەوە. تەنانەت لەتێك لە جلوبەرگیشیان نەدۆزرایەوە... ئەو سێ کەسە خۆیان لەبەر ژانی ئەو فیشەکانە رانەگرتبوو، کە

بەریان کەوتبوو و ئیتر خۆیان فڕێ دابووە خوارەوە. لە سەر ئەو شوێنەوە کە ئەوانی لێ کەوتبوون، سێ ڕۆژی ڕەبەق هەڵۆ و داڵ و بایەقۆش بە قاووقیژ سووڕانەوە. دوای ئەوە هەڵۆکان لەسەر ڕەوەزەکان نیشتنەوە و هێور بوونەوە.

عەشیرەتەکان تەرمی بیست کەسیان بە سەردولکە و شین و شەپۆڕەوە لە حاڵێکدا هەڵۆکان بەژوور سەریانەوە دەسووڕانەوە و سێبەری باڵیان کەوتبووە سەریان، لە چیاکان هێنایە خوارێ.

دوای ئەوە، زۆری پێچوو هیچ شەڕێك نەهاتە ئاراوە هەتا شەڕەکەی بەلکان و شەڕی یەکەمی جیهانی قەومان. زۆربەی ئەوانەی چوبوونە شەڕگە هەر نەگەڕانەوە و ئەوانەش کە بەزیندوویی دەرچوون و گەڕانەوە یان نەخۆش بوون یان کەمئەندام ببوون. ئیتر هەر هەموو لە شەڕ و کوشت و کوشتار بێزار ببوون. هەرکەسە و گرفتاری دەردی خۆی بوو.

خەڵکی هەردوو عەشیرەتەکە، کاتێ تووشی یەکتری دەبوون، هەوڵیان دەدا ئەوەندەی بۆیان دەکرێ چاو لە چاوی یەکتری نەکەن. بەو جۆرە زۆری برد و بەشەڕ نەهاتن و پێك هەڵنەپڕژان. شەڕی ڕزگاریخوازانە، شەڕ لەگەڵ فەڕەنسی و گرووپە چەکدارە ئەرمەنییەکان... دەرفەتی ئەوەی بۆ نەهێشتبوونەوە سەری خۆیان بخورێنن.

یەکەم شەڕی گەورەی نێوانیان، ڕێك دوای بڕانەوەی شەڕی ڕزگاریخوازانە، قەوما. لەو کاتدا حیسام ئاغای نەوەی یاقووب ئاقا سەرۆکی "ئاق یۆللی"یەکان و خورشید بەگی نەوەی کەریم بەگیش سەرۆکی ساری ئۆغڵییەکان بوون.

شەڕەکە لە پێکهەڵپڕژان و لێکدانی دوو شوانەوە دەستی پێ کرد کە لەسەر دەراوی ئاوێ لێکیان دابوو. شەڕی شوانەکان پشکۆیەك بوو کەوتە نێو لۆکەوە. وای دانێین هەردوو شوانەکە یەکتریان شل و کوت کردبێ، دیسانیش دەکرا هەر لەوێ ببڕێتەوە. ئەگەر دوو عەشیرەت و هۆبە دراوسێیەکە چاوی تەماحیان لە هەوار و لەوەڕگەکانی یەکتری نەبوایە، لەوانەبوو ئەو ئاگری قین و ڕقە دێرینەیەی نێوانیان جارێکی دیکە هەڵنەگیرسابایەتەوە.

عەلی بەگی کوڕی خورشید بەگ بە بیانووی ئەو ڕووداوە لە مێشەڵانەکەی نارلیدا خۆی مات کرد و قادراغای کوڕی حیسام ئاغای نەوەی حاجی یاقوب ئاغای ـــ کە ئەندامی ئەنجومەنی گشتیی هەرێمەکان بوو و بەرەو شاری دەچوو ـــ بەدیلی گرت. قادر بەگ خۆی بێزی لە تۆڵەئەستاندنەوە و شتی وا هەڵدەستا. حزبی گەل سەرەڕای ئەوەی ساری ئۆغڵییەکان خوێندەوارتر و میوانگرتر و دەستڕۆیشتووتر بوون، بەڵام قادراغایان وەك نوێنەری ئەنجومەنی گشتیی هەرێمەکان هەڵبژاردبوو. سەرۆکی لقی هەرێمەکانی حزبیش ڕەشید ئاغای برا بچووکی

قادر بەگ بوو. بەو جۆرە ساری ئۆغڵی نە لە حکوومەت و نە لە حیزبدا هیچ پێگە و دەسەڵاتێکیان نەبوو. ئەوەش بەو واتایە بوو کە عێل و عەشیرەتەکەیان زۆری نەدەبرد، کە لە چوکووراوادا تۆویان دەبڕایەوە. زۆر بەگی دیکەش بە هۆی نەبوونی پشتیوانێکی جێ متمانەیان لە نێو حکوومەتدا، زۆر زوو پێگە و حورمەتیان نەمابوو و عێل و عەشیرەتیان لێك ترازابوو.

قادراغایان گرت و بە چلەی زستانێ بردیاننە کوێستانەکەی مازقاچ و لەوێ خۆی و هاوڕێیەکانیان رووت و قووت کردنەوە و لە دار بەفراوییەکانیان بەستنەوە و بە مووسی دەلاکی سەر تا پێیانیان شەقار شەقار کردن. خوێنی سوور لە برینەکانەوە کە دەهاتە دەرێ و دەچۆڕایەوە، دەسبەجێ دەیبەست. بایەکی سارد هەڵیکردبوو و وەك قەمچی لێی دەدان.

عەلی بەگ و پیاوەکانی شەو و رۆژ پەیتا پەیتا برینیان دەخستە جەستەی ئەو بنیادەمانەوە کە لەو دارانە بەسترابوونەوە. دیلەکان لە بەر باڕن و کڕێوەدا زامار و لە خوێن شەلاڵ و بەستوو، چلّیان دەدا و ئازاریان کێشا و گیانیان دا.

عەلی بەگ، قادرئاغا بە هاوڕێیەکانییەوە هەروا لەبەر باڕن و کڕێوەکەدا بەجێهێشت و خۆی بەرەو چوکووراوا گەڕایەوە. هەتا گەیشتەوە متەقی لێوە نەهات و نوقمی خەیاڵی خۆی بوو. هەڵلایەکی لە دڵی دا بوو ئیزن و مەجالی ئەوەی نەدەدایە بیر لە دەرەوەی خۆی بکاتەوە. کە گەیشتەوە دەوروبەری قەڵای بۆینۆ، هەوساری ئەسپەکەی کێشا و گوتی:"با لێرە تۆزێك راوەستین. ئەنگۆ دامەبەزن. لە جێی خۆتان مەبزوون و هەر لێرە راوەستن." بەرەو لای ئەو کانییە چوو، کە تۆزێك لەولاترەوە لە بن دار سنۆبەرێکەوە هەڵدەقوڵی. قۆڵی هەڵماڵی و دانیشت و دەسنوێژی هەڵگرت. ئەوجار عەباکەی لە تەنیشت کانییەکە راخست و نوێژەکەی دابەست. نوێژەکەی زۆری خایاند. کە نوێژەکەی تەواو بوو، پاڵی بە کاژ (سنۆبەر)ەکەوە دا و ماوەیەك چاوی لەسەر یەك دانا و خەیاڵ هەڵیگرت.

ئاخرییەکەی سەری هەڵێنا و بە دەنگێکی بێ گیان گوتی:"برادەرینە، من کارێکی زۆر خراپم کرد. ئەوە پیاوەتی نەبوو کردم. هیچ کەس هەقی ئەوەی نییە ئاوا لە بنیادەمێکی دیکە بکا ئەوەی من کردم. ئەنگۆشم لە تاوانێکی وا وەردا. بەڵام ئەنگۆ بێ تاوانن..."

بەحاڵ دەنگی دەبیسترا. دەتگوت لە بنی بیرێکەوە دێتە دەرێ:"بنیادەمێکی تووشی وەها تاوانێك بووبێ، تەنانەت بە خۆکوشتنیش لەو لەعنەتە، لە تووکی ئەبەدی و تاهەتایی خۆی رزگاری نابێ. ئەمنیش رزگار نابم. بەڵام... هیچ چارم نییە و دەبێ خۆم بکوژم."

دەمانچەکەی کێشا و ڕووی لە پیاوەکانی کرد کە لەسەر خوانی زینێ حەپەسابوون:"دوای ئەوەی خۆمم کوشت، سەرم لێ دەکەنەوە و دەیبەن بۆ حیسام ئاغا و هەموو شتێکی مووبەموو بۆ دەگێڕنەوە و بۆ لەبنی کوولەکە دەدەن و داوای لێ دەکەن کۆتایی بەو وەحشیگەرییە بێنێ. لە زمانی منەوە پێی دەڵێن بنیادەم حەیفە تووشی ئەو وەحشیگەری و ئەو چارەنووسە بێت. ئەنگۆش چاری خۆتان بکەن... ئەگەر دوای ئەوە خۆتان لەو تۆڵە ئەستاندنەوە و خوێن و خوێن ڕشتنەوەیە وەرنەدەن، لەوانەیە ئەو کارە ناحەزە لەبیر بکەن."

چاوەکانی لێك نا و لوولەی دەمانچەکەی لەسەر دڵی خۆی دانا و پەلەپیتکەی ترازاند و تەرمە بێ گیانەکەی بە عەرزیدا کەوت.

هەر لە سەر وەسییەتەکەی هۆی، سەریان بڕی و بەرەو ماڵی حیسام ئاغا وەڕێ کەوتن. حیسام ئاغا بە دیتنی سەلکەکەی لە پێشدا کەیفی ساز بوو و قاقایەکی کێشا و گوتی:"ئەوە سەلکی عەلی بەگە. ئەوە عەلی بەگە ها... ئەو سەلکی عەلی بەگی ساری ئۆغڵییە... هاهاااااا."

بەڵام کە گوێی لە بەسەرهاتەکە بوو، شێت بوو و سەلکەکەی عەلی بەگی دایە بەر شەقان و ئەوجار دەمانچەی کێشا و یەکێك لەوانەی سەلکەکەیان هێنابوو دایە بەر فیشەك و کوشتی و ئەوانی دیکە، لە هەڵلایەکەدا خۆی خستە سەر خوانی زین و بۆی دەرچوون. ئەگینا هەر هەموویان لە کۆشکەکەی ئاق یۆللی"دا دەکوژران.

"سەری بڕاو و چاوی بە مۆڵەق وەستاوبوو."

دوای ئەو ڕووداوە شەڕەکە ڕاگیرا. کاتێ هەمووان دەیانگوت ئیتر کۆتایی هات و بڕایەوە، شەوێکیان وەلی ئاغا پەیامێکی لە گوندەکەی ئاناوەرزاوە بۆ ڕەشاد ئاغای برای قادر ئاغا نارد. ڕەشاد ئاغا پەیامەکەی بیست و لە خۆشییان شاگەشکە بوو. دەسبەجێ پیاوەکانی کڕ کردەوە. هەموو لێی سوار بوون و کەوتنە ڕێ. تۆفان و وەیشوومە و باو بۆرانێك بوو مەگەر خودا بزانێ. چاو چاوی نەدەدی. شەوگار شەق ببوو کە ڕەشاد ئاغا گەیشتە ماڵی وەلی ئاغا.

وەلی ئاغا سەری بردە بن گوێی و بە سرتە گوتی:"هەر سێکیان لەو ژوورەدا نوستوون. تاوێك لەوە پێش تفەنگەکانیانم بەتاڵ کرد و فیشەکدانەکانیانم هەڵگرت."

ڕەشاد ئاغا لە بن لێوانەوە گوتی:"زۆر باشە. ئەو چاکەیەی تۆم قەت لەبیر ناچێتەوە."

"ئەوان نەیانزانی کە من ناسیومنەتەوە. وەژوور کەوتن. هەر سەیرم کردن زانیم لە بەرەی ساری ئۆغڵین. گوتم چ بکەم باشترە... وەبیر تۆ کەوتمەوە. گوتم وا باشترە بڕۆم و خەنیمەکەیان

ئاگادار بکەمەوە. کار بە کارزانان بسپێری خۆیان دەزانن چ بکەن. دوێنێ بەیانی کوڕەکەم سوار کرد و گوتم ئەسپەکەت تا توانای لەبەردا بێ تاوی بدە و خۆت بگەیەنە کۆشکەکەی ئاق یۆللی". لەو سێ کەسە یەکێکیان ناوی فەتحی یەکێکی دیکەیان ناوی ئەنوەر و ئەوی دیکە نیازییە... برازاکانی عەلی بەگی ساری ئۆغلێن."

ڕەشاد ئاغا و پیاوەکانی هەڵیانکوتایە سەر ژوورەکە و لە جێوبان کێشایاننە دەرەوە. ئەنوەر نۆزدە، فەتحی بیست و یەك ساڵان و نیازی حەڤدە ساڵان بوو. دوای ئەوەی دەستەکانیان شەتەك دان، لە ئاناوەرزاوە بەرەو پردەکەی چوکوور کەوتنە ڕێ.

ڕەشاد ئاغا لە ڕێیە بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد:"با هەڵیانگرین و بیانبەینە چیا و لە دارەکانیان شەتەك بدەین. بە مووسی دەللاکی... وەك عەلی بەگ چیی کردبوو، ئەنجن ئەنجن...."

یەکێك لە پیاوەکانی گوت:"ئاوا ئەستەمە بگەینە چیا. ئەگەر ساری ئۆغلێیەکان و ژەندەرمەکان پێ بزاننەوە، لێمان دەشێوێ. وا باشترە هەر ئەمشەو تەواویان بکەین."

هاوڕێیەکانی دیکەی ڕەشاد ئاغاش بە قسەیان نەکرد و گوتیان هەروا باشترە لێرە بیانکوژن و تەرمەکانیان بە رووبارەکەی سۆمباسدا بدەن.

ڕەشاد ئاغا ئاخرییەکەی گوتی:" ئەگەر وایە با لێرە بیانکوژین. دوایی کە ساری ئۆغلێیەکی دیکەمان وەدەست کەوت، دەیبەینە چیاکان و لەوێ مووس کێشی دەکەین..."

یەکێکیان گوتی:"گەیشتووینەتە سەر پردەکەی چوکوور."

ڕێك لەو کاتەدا هەر سێ دیلە دەست بەستراوەکە خۆیان بە ئاوەکە دادا.

"رایان کرد."

"لێیان دەن."

پانزدە کەس وێکڕا خوار پردەکەیان دایە بەر دەسرێژ. بەو تاریکییە لە درێژایی رووبارەکەدا، هەر پەڵە و تارماییەکی دەیاندی گوللە بارانیان کرد.

گوندەکەی پردی چوکوور بە تەقی تفەنگ لەخەو رابوون. دەنگی تەقەی تفەنگ هەتا بەیانی لە لێوار و دەم چۆمەکەی سۆمباس دەهاتە گوێ. بەیانی پەردە لەسەر هەموو نهێنییەکان هەڵگیرا. نهێنییەکەی وەلی ئاغاش...

فەتحی و ئەنوەر و نیازی لە ئاوە ساردەکەدا هەڵچۆقین و نوقم بوون و هاتنەوە سەرێ.

سۆمباس کە خوارتر دەکشا، پانتر و بەرینتر دەبۆوە. ئەوان بە پێ مەلە* لەگەڵ لووزەوی ئاوەکەدا رۆیشتن و لەوبەری ئاناوەرزاوە لە ئاوەکە هاتنە دەرێ. ئەنوەر ئەنگێورابوو. نیازی و فەتحی لە حاڵێکدا مردوویەکیان هەڵگرتبوو، گەڕانەوە ماڵەکەی وەلی ئاغا لە گوندی ئاناوەرزا. وەلی ئاغا کە دیتنی لە جێی خۆی وشك بوو.

گوندییەکان دەوریان دان و دەستیان کردنەوە و جلوبەرگی وشکیان بۆ هێنان.

وەلی ئاغا گوتی:"ئەمن هیچ خەتایەکم نییە. شەوێ بەسەر ماڵەکەمیان دادا و ئەوانەیان گرت و بردیانن."

نە گوندییەکان بڕوایان بەو قسانەی کرد و نە فەتحی و نیازی.

ژەندەرمەکان وەلی ئاغایان گرت و بردیانە شاری. ئەویش زۆربەی ئەوانەی هەڵیانکوتابووە سەر ماڵەکەی یەك بە یەك ئاشکرای کردن و ئەوانەشی کە نەیدەناسین لەسەریان گوتی:"ئەوانەی وا دەیانگرن، دەزانن ئەوانی دیکە ناویان چ بوو."

وەلی ئاغا کە لە شارییەوە دەگەڕایەوە، گوندییەکی خۆی کە لەسەر رێگەی بۆسەی بۆ دانابوو، کوشتی. ئەوەی وەلی ئاغای کوشت، گەنجێك بوو تازە خەتی لێ دابوو و هیچ کۆنە دوژمنایەتی و رقێکیشی لەگەڵی نەبوو. ئەو لەو فەرماندە پۆلیسەی لێی دەپێچییەوە، پرسیبووی:"ئەگەر تۆ لە جێی من بوایەی، چیت دەکرد جەنابی فەرماندە؟"

لەوە پتر هیچی نەگوتبوو.

بەگەکان، ئاغاکان و نوێنەرەکانی ئەنجومەنی ئەدەنە و جەیهان و کووزان، پارێزگار و سەرۆکی پۆلیسخانەکان دەکرێ بڵێین بۆ بیستەمین جار بوو نێوبژیوانییان دەکرد بەشکم ئەو دوو بنەماڵەیە ئاشت بکەنەوە، کەچی ئەوان هەر لاسارییان کرد. ملیان بۆ ئاشتبوونەوە رانەکێشا و نەشیاندەتوانی ئاشت ببنەوە.

ساری ئۆغلێیەکان چواریان و "ئاق یۆللی"یەکان سێ کەسیان لە بەندیخانەدا بوون...

هەشت کەس لە پیاوەکانی رەشاد ئاغا کە ئەوێ شەوەکە بەشداری بەدیلگرتن و گوللەبارانکردنی گەنجەکان ببوون، گیران. سی و شەش کەس شایەتییان دا لەسەر ئەوەی ئەو رۆژە رەشاد ئاغایان لە شاری دیتووە.

---

* وەرگێڕە فارسەکە وەك لەبیری نەمابێ کە چەند دێڕ سەرووتردا دەڵێ: بە دەست بەستراوی خۆیان بە ئاوەکەدا دا. لێرەدا دەڵێ بە دەست و پێ مەلەیان دەکرد. بنیادەمی دەستبەستراو ناتوانێ بەدەست مەلە بکا. لە خوارتریشەوە دەڵێ خەڵکی ئاواییەکە دەستیان کردنەوە....

ئەمساڵ دورموش، برایمی کوشت... عوسمانی برای برایم، حەسەنی کوشتەوە. حەسەن پیرەپیاوێکی هەشتا ساڵانە بوو کە بۆرە خزمایەتییەکی لەگەڵ ساری ئۆغڵییەکان هەبوو. حەسەن حەوت کوڕی هەبوو کە هەموو پیاوەکانی بنەماڵەی عوسمانیان کوشتنەوە و سەریان بڕین و لەبەر دەروازەکەی کۆشکی ئاق یۆللۆکان لەسەر یەکیان دانا."

"سەر بڕدران و چاو بە مۆڵەق وەستان."

# ٤٠

گەڕەکە کۆن و قوڕەکە خەریك بوو تێك دەتەپی و کاول دەبوو. دیوارە گڵەکانی خانووەکان درزیان بردبوو و سەربان و میچەکان داتەپیبوون و دیواری حەوشەکان لێرە و لەوێ رووخابوون. ژەنگەسوورە و مێشەکەرانەی بە وزەوز لە کەلێن و قەڵشتی دیوارە بەرزەکانی کۆڵانان و لە بانیژەکاندا هێلانەیان کردبوو. دارە هەنار و زەیتوون و تووەکان ئیتر پیر ببوون. باوەشی سێ پیاو لە قەدی دار زەیتوون نەدەگەیشتەوە یەك. توێژکاڵێکی تۆز و خۆڵ لەسەر گەڵا درشت و زبرەکان نیشتبوو. دار هەنارە ئەستوور و چڕ و بەلك و پۆپەکان بە گوڵی درشت و گەورەوە کە گەڵا کەسکەکانیان تەواو داپۆشیبوو، کۆڵانە چۆڵەکانیان بە رەنگی سوور دەڕازاندەوە. بە سەدان جۆر مێشەنگوینی ورد و درشت لە لکێکەوە دەفڕینە سەر لکێکی دیکە و وەك هێشوو خۆیان پێوە هەڵدەواسی و بە باڵ روون و تەنکەکانیانەوە وا بێ جووڵە دەمان، دەتگوت چاوەڕوانی مەرگن... لە کۆڵانە چۆڵ و خەڵوەتە پڕ دار هەنارە تۆزاوییەکان و پڕ لە مێشەکەرانە و ژەنگەسوورەدا، بنیادەم و ئەسپە بەرەڵڵای مۆزکردوو* و پیرە گوێدرێژی کەنفت و لێکەوتوو بە سەرکزییەوە، مات و زورهان و پرزەلێبڕاو دەسووڕانەوە و جاری وابوو وچانێکیان دەگرت و تۆزێك رادەوەستان و لە نێو ئەو کاولاش و بێدەنگییە قووڵەدا، دەتگوت نوقمی حەژمەت و سەرسووڕمان دەبن یان بیر لە شتێك دەکەنەوە کە ئێمە هەرگیز پەی پێ نابەین.

کۆڵانە چۆڵەکان رۆژێ دووجار، جارێکیان بەیانی دوای تاو هەڵاتن و جارێکیش ئێوارە کاتی خۆراوابوون، دەبووژانەوە و ئاوەدان دەبوونەوە. مێشی نیشتووی سەر گوڵەکان، بە وزەوز و هەڵڵا و هەنگەمەوە هەولێان دەدا و ئەوجار کە نیوەڕۆ و گەرما بەسەردا دەهاتن، لە جموجۆڵێ

* مۆزکردن: لە موکریان بە مێشەکەرانە دەڵێن مۆز. کاتێ بە وڵاخ و رەشەوڵاخەوە دەدا و دەریاندەپەڕێنێ، لەوێ دەڵێن "مۆزی کرد" لە دەشتی هەولێر دەڵێن "وڵاخەکە مێشانەی کرد."

دەکەوتن. دەنگیان لێ دەبڕا و لە دەوروبەری گوڵەکان تەنیا جووڵەی باڵێکیش چییە نەدەبینرا. تەنگی ئێواریێ، شەمشەمە کوێرە وەك تیرێکی لە کەوانێ دەرچووبێن، لە کەلێنی دیوارەکانەوە دەردەپەڕینە دەرێ و لە ئاسمانە تاریکەکەدا خولیان دەخورادەوە و دەهاتنەوە خوارێ و بەرەوژوور هەڵدەکشانەوە و جیك و فیکیان دەکرد و دەیانکردە هەڵلا. لە گەڕەکەکەدا، مارەیەك منداڵ شێت و شەیدای گرتنی شەمشەمەکوێرە بوون. ئەوان شەوانە لە دار و دیوارەکان وەسەر دەکەوتن و شەمشەمە کوێرەکانیان، ئەو باڵندە بچووکانەی دەندووکیان وەك گاز تیژە و چنجرووکیشیان لە هەر جێیەك توند بکەن، گۆشتی لێ دەپچڕن، لە هێلانەکانیان قەتیس دەکردن و دەیانگرتن. جاری وابوو منداڵ لەو سەرەوە بەردەبوونەوە و دەست و لاق و سەریان دەشکا یان تەنانەت جاری وابوو دەشمردن و ژنە تورکمان دەستیان دەکرد بە شینگێڕان و سەردولکە بۆ ئەو منداڵانە.

دوو کوڕی سەرۆکی دادگای تاوانەکان لە دار هەنارەکەوە کەوتنە سەر بەردەچنی کۆڵانە چۆڵەکە و سەری هەردووکیان شکا. بۆ سبەی بەیانییەکەی منداڵەکانیان دۆزییەوە کە لەسەر بەردەچنەکە و لە سفرەی خوێنە مەیوەکەیان گەوزیبوون. مێشە کەسکەکان لە سەر سەر و دەستە زەردهەڵگەڕاو و بزڕکاوەکەیان هەڵدەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە و سەری یەکێکیان پڕ ببوو لە مێروولەی زەرد.

سەرۆکی دادگای تاوانەکان لەسەرخۆ هات و بەسەر منداڵەکانییەوە راوەستا. ئەژنۆی لەرزین. داهاتەوە و دەستی ئەوی بچووکیانی گرت و هەڵیستاندەوە و بە سینگییەوە نووساند. ئەوجار دەستی کوڕە گەورەکەی... رێك لەو کاتەدا دکتۆرەکان و داواکاری گشتی هاتن و سەرۆکی دادگای تاوانەکان تەرمی کوڕەکان بەوان ئەسپارد و لێی دا و رۆیشت.

دەنگۆی سەیر و سەمەرە سەبارەت بە مەرگی منداڵەکان کەوتنە سەر زار و زمانان و هیچ نەما نەیلێن و کەس نەما تاوانباری نەکەن... خزم و کەسی ئەوانەی بە دەستی دادوەرەکە حوکمی ئیعدام یان بەندیخانەی درێژخایەنیان بۆ بڕابۆوە، یەك بە یەك ناویان هاتە نێو ناوانەوە. لێکۆڵینەوەکان بەردەوام بوون و ئاخرییەکەی شەمشەمەکوێرەکان بەتاوانبار دەرچوون.

سەرۆکی دادگای تاوانەکان گەلێ شەوان تا بەیانی نەنوست و پەیژەیەکی دەخستە سەر شانی و بە دزییەوە بە دار و دیواران هەڵدەگەڕا و کون بە کون و کەلێن بە کەلێن دەگەڕا و شەمشەمەکوێرەی دەگرتن. خەڵکی گەڕەکەکە جاری وابوو کە بەیانیان هەڵدەستان، ئەو هەموو شەمشەمەکوێرەیەیان دەدی کە سەریان هەڵکەنراوە و لەبەر دیوارەکان فڕێ دراون. ئەو

ڕەوتە زۆری خایاند، بەڵام سەرۆکی دادگای تاوانەکان نەیتوانی جووقەواری شەمشەمەکوێرەکان ببڕێتەوە. دادوەرکە هەموو ڕۆژێ ئێوارێ کە لە دایرە دەگەڕایەوە ماڵێ دیسان گوێی لە دەنگی بێ بڕانەوەی شەمشەمەکوێرەکان دەبۆوە. ئەوەی کە ئەو چی دەبیست و هەستی بە چی دەکرد، کەس نەیزانی چییە و لێی تێنەگەیشت.

هەندێك سوێند و قورئانیان دەخوارد کە دادوەرەکە هەموو شەوێ لە تۆڵەی مندالەکان بە پەیژەیەکەوە دەچێتە راوە شەمشەمەکوێرە.

سەرۆکی دادگای تاوانەکان خانووەکەی خۆی نەگۆڕی. ئەو زۆری ئەو گەڕەکە کۆن و کاولە خۆش دەویست کە ئەو دار هەنار و پیرە هەنجیرە نێو قەد کلۆرانەی تێدا بوو. کە پڕ بوو لەو دار زەیتوونانەی دڵنیا بوو هی سەردەمی بیزەنتییەکانن و بن دارەکان مووزاییككاری کراون. مووزاییکەکان شکڵ و شێوەی رەنگاورەنگی کەو و تاوس و ئاسکی و سەلکی بنیادەم و داری زەیتوونیان لێ کێشرابوو و پێی رازێنرابوونەوە... سەرۆك دوای هەر ڕێژنەبارانێك و وەڕێکەوتنی لافا لە کۆڵانەکاندا، بۆ دۆزینەوەی مووزایك لە بن دار زەیتوونەکان، دەستی دەدایە گۆچانەکەی و بە کۆڵانە چۆڵەکان و باغەکانی شارەکەدا دەگەڕا. هەروەها دوای هەر لافاوێك کە خۆڵ و خاکەکەی رادەدا، مووزاییك و کاشیی وا وەدەردەکەوتن، کە بە دیتنەوەیان شاگەشکە دەبوو. سەرۆك لەو ڕۆژانەدا هەموو کاروبارێکی خۆی لەبیر دەچۆوە و هەتا شەوێ بە دەوری کاشی و مووزاییکەکاندا هەڵدەخولا و بە سەرسووڕمانەوە لێیان ورد دەبۆوە و نوقمیان دەبوو و لە هێڵ و نەخش و نیگارەکانیان ورد دەبۆوە و هەتا تاریکان بەسەردا دەهات، لێیان دوور نەدەکەوتەوە. دوای ئەوە پارێزەرەکان و دادوەر و کارەبەدەستەکانی شاری، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەهاتنە خزمەتی دادوەری یەکەم و دەستەونەزەر و سەرسام لەو کاشی و مووزاییکانە ورد دەبوونەوە کە تازەی دۆزیبوونەوە. سەرۆك خۆی دەیزانی ئەوان هەڕە لە بەڕەی ناکەنەوە و هیچ کام نازانن ئەو مووزاییکە جوانانە چین و بۆچی دەبن و هەر لەبەر خاتری دڵی ئەو دێن و سەیریان دەکەن. زۆر زۆری پێ ناخۆش بوو، کە نەیتوانیبوو تەنانەت برادەرێك بدۆزێتەوە لەوەدا لەگەڵی هاوڕا بێت. تەنیایی و تووڕەیی ژیانی لێ تاڵ دەکرد.

سەربانی کۆنە خانووە دوونهۆمییەکەی هەر گڵ بوو. کە باران دەباری، دڵۆپەی دەکرد. مووزاییك و کاشییەکانی تەختی حەوشەی ماڵە گەورەکەی کە پڕ بوو لە دار و گوڵ و دەوەنی چڕ و هەنار و زەیتوون و چنار و پنگە و پڕتەقاڵ و تووترك، لەبەر بارانێ دەبریسکانەوە. لە

دەرەوەی ماڵەکەی تاتە بەردێکی گەورە کە رەگەی رەش رەشی تێگەڕابوو، هیی سەردەمی یۆنانییەکان بوو و گوڵ و گەڵا و نووسراوی لەسەر نەخش کرابوو.

کە دەنگی دەرگای ماڵەوە هات، شەوگار شەق ببوو. سەرۆك کە هێشتا نەنووستبوو، پلیتەی لامپاکەی هەڵکێشا و تیشکێکی زەرد ژوورەکەی داگرت. سەعاتەکەی ژوور سەری خۆی هەڵگرت و سەیرێکی کرد. لە جێوبانەکەی خزییە دەرەوە و پانتۆڵەکەی لەپێ کرد. نەرم نەرم لە دەرگاکە دەدرا. بەرلەوەی کراسەکەی لەبەر بکا، دەمانچەکەی لە بن سەرینەکەی هەڵگرت و لە پلیکانە چێوییەکان کە لە بن پێیانیدا قرچەقرچیان لێوە دەهات، چووە خوارێ.

"کێیە؟"

دەنگی قورس و قایم و تۆکمە و بێ نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بوو. لە ماوەی بیست و پێنج ساڵ دادوەرییەکەیدا ئەوە یەکەم جاری بوو تووشی وەها شتێك بێ. هەتا ئێستا کەس نەیوێرابوو نیوەشەوێ بێت و لەدەرگای ماڵی بدات. سەرۆك تەنانەت ئەوەشی پێ سەیر نەبوو کە یەکەم جارە شتی وا دەبێ.

"جەنابی سەرۆك، جەنابی سەرۆك، منم. من. مستەفای ئاق یۆللۆ. زۆر داوای لێبوردنێ دەکەم. زۆر داوای لێبوردنێ دەکەم... هیچ چارم نەبوو. هەر دەبوو ئێستا بێم و کاتت بگرم. تکا دەکەم ئیزن بفەرموون بێمە خزمەتت."

سەرۆك دەنگی هات:"هەر ئێستا."

دەسبەجێ لە پلیکانەکان چووە سەرێ. لامپای دیوەخانێی هەڵکرد و هەڵیگرت. لە پلیکانەکان چووە خوارێ و دەرگای هەڵگرت. گوتی:"فەرموون."

"سوپاست دەکەم جەنابی سەرۆك."

سات بە سات لك و پۆی بریسکە بریسکەکان ئاسمانە تاریکەکەیان دەبڕی و هەموو وڵاتیان رووناك دەکردەوە و ئەوجار هەورەتریشقە و گرمەی دوورودرێژ لەسەر شارەکە دەگەڕا و دەرگا و پەنجەرەی دەلەرزاندەوە و باران وەك گۆزەی سەروبن دەهاتە خوارێ.

مستەفا بەگ خووسابوو. جلوبەرگەکانی بە گیانییەوە نووسابوون و ددانەکان شەقەشەق وێك دەکەوتن.

سەرۆك پرسیی:"ئەی کوا ئەسپەکەت؟"

"لە دار زەیتوونەکەم بەستەوە."

لە پلیکانەکان چوونە سەرێ و چوونە ژوورێك کە مافوورێکی گەورەی ئێرانیی کاڵەوەبووی ڕاخرابوو. دەوراندەوری ژوورەکە مۆبلی لێ دانرابوو و مێزێکی مۆرکەخواردووی پواو لە نێوەڕاستەکەی دانرابوو، کە سەری پڕ بوو لە کتێبی ئەستوور ئەستوور. سەۆك دیسان پلیتەی چراکەی هەڵکێشا و ژوورەکە تۆزێکی دیکەش رووناك داگەڕا. لەو کاتەدا، خێزانی سەرۆك کە وەك خۆی قەڵەو و گۆشتن بوو و بلێی و نەلێی دەستێکی بە سەر و روخساریدا هێنابوو، وەژوور کەوت و بەرەو لای مستەفا بەگ چوو:"ئەیەڕۆ ۆ ۆ چۆن خووساوی... ئەیەڕۆ ۆ ۆ. وەی لەو بارانەی دەبارێ."

دەستی بەرز کردەوە و گوتی:"بەخێر بێی."

رووی لە سەرۆك کرد:"قاوە بێنم؟"

"بەڵێ، سوپاس خاتوون."

زیقە و هەرای منداڵەکان و زڕکوڕە خەوزڕاوەکەی هەستا.

سەرۆك"وەخەبەر هاتن خاتوون. تکایە بێدەنگیان بکە."

"بێدەنگیان دەکەم."

مستەفا بەگ:"وایە."

سەرۆك:"وایە."

لەسەر کورسییە چێوییەکان و رێك بەرەوڕووی یەکتری دانیشتبوون.

"جەنابت چ دەفەرمووی جەنابی سەرۆك؟ ئیشەڵڵا خۆ ئێمە بە ژن و منداڵەکانمانەوە یەك جێ ئیعدام ناکەی."

سەرۆك وەك رووی قسەی لەخۆی بێ، لە بن لێوانەوە پرسیی:"یانی تۆ دووخرانەوەت ئەوەندە بەلاوە دژوار و تاڵە؟"

مستەفا بەگ هەر بەو لەبزە شەرمن و نەرم و نیانەیەوە گوتی:"ئەوە بۆ ئێمە واتە مردن. ئەگەر دەرمان بکەن و دوورمان بخەنەوە، تێدادەچین و دوژمنەکانیشمان کە باش لەوە ئاگادارن، بۆ داگیرکردنی زەوی و زار و موڵکەکانی ئێمە و هەر بۆ ئەوەی وەك گۆشتی قوربانی ئاقچاساز بەسەر خۆیاندا دابەشن... دەیانەوێ دوور بخرێینەوە. هەر بۆیەشە لەو با و بۆرانەدا و لەو نیوەشەوەدا هاتوومەتە لاتان. خۆ ئەگەر تۆ نەبوای و لە بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەرەوە نەمناسیبای، مەحاڵ بوو بێمە بەردەرگات. نەدەهاتم. ئەگەر هەر بۆ گیانێك بوایە، ئەگەر هەر گیانی خۆم لەگۆڕێ بوایە، بەخوای سەر و دڵم نەدەگرتی."

"وایە."

"بەڵێ. دایکێکم هەیە پێیەکی لەسەر لێوی گۆڕە. نەوەد ساڵە تەمەنی... ئاخرین هەناسەی ژیانی هەڵدەکێشێ... چاوەڕوانی کوژرانەوەی قاتڵی کوڕەکەیەتی. دەنا تا ئێستا سەد کفنی رزاندبوو. هەر خۆی رادەگرێ.

"وایە."

خاتوون قاوەی هێنا. سەرۆك دەسبەجێ خولّقی کرد بۆ کێشانی جگەرەیەك و چەرخەکەی دەرهێنا و لە پێشدا جگەرەکەی مستەفا بەگ و دوای ئەو جگەرەکەی خۆی داگیرساند. هەردووکیان بێدەنگ بوون. دەتگوت هیچ شتێکیان نییە قسەی لەسەر بکەن. دوای خواردنەوەی قاوەکە، سەرۆك چاوی لە چاوەکانی مستەفا بەگ بڕی و لێی ورد بۆوە و وەك شتێکی ترسناکی تێدا بەدی کردبێتن، راچڵەکی. چاوەکانی زەق بوونەوە. کشایەوە دواوە. لێوەکانی چەند جار لێك کردنەوە و دایخستنەوە. پەڕەی لووتی هەڵبەزینەوە. رەنگی بە روخسارییەوە نەما و دەستی راستەی لەسەر شەویلگەی دانا و دایماڵی و ئاخرییەکەی گوتی:"دەی وایە."

دەنگی بارانەکە هەر دەهات و پتر دەبوو. هەردووکیان چەند ساتێك گوێیان لە دەنگی بارانەکە راگرت. جار نەجارێکیش دەنگی تاقە باڵندەیەك لە خرم و هۆڕی بارانەکەدا کپ دەبوو.

" وایە."

مستەفا بەگ نە دەیتوانی هەستێ بڕوات و نە قسەی پێ دەکرا. زۆر شت هرووژمیان بۆ مێشکی دێنا. بەڵام نەشیدەوێرا بیاندرکێنێ. دەیەویست هەستێ و بڕوا، بەڵام هێزی رۆیشتنێی نەبوو. لەپێ کەوتبوو و تەواو داتەپیبوو و تینی ئەژنۆی نەمابوو...

سەرۆك بە دەنگێکی بەرز دووپاتەی کردەوە "وایە."

مستەفا بەگ ئاخرییەکەی وەقسە هات:"لەم دنیایەدا زۆر کار دەقەومێ کە لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی ناوەشێنەوە. کاری قۆڕ و بیهوودە. بەڵام چ دەکرێ؟ کار و کردەی بنیادەمان بێهوودە و بێ واتان. هەم بێهوودە و هەمیش بێ واتا. هەموو کارەکانی هەر لە هەستان و رێگە رۆیشتن و هەستان و دانیشتنییەوە بگرە هەتا دەگاتە گریان و پێکەنین و خەوتن و هەستان و عەشق و خۆشەویستییەکەی و کوشتن و مردنەکەی و لەدایکبوونەکەی و... هەر هەمووی پووچ و بێ مانایە. کارەکەی ئێمەش شتێکی پووچ و بێ مانایە لە نێو ئەو هەمووە

خۆڕایی و بێ ماناییەدا. نە کەمتر و نە زیاتریش. دڵۆپەیەکیش ئێمە تکاندوومانەتە نێو ئەو دەریایەوە. چ تەوفیرێکی هەیە جەنابی سەرۆك....؟"

"وایە."

"بنیادەم لە دایکبوونەکەشی پووچ و خۆڕاییە. بەڵام لە دایکبوونی مەل و باڵندە و دەعبا و مێرووله و ماسییەکانی دەریا و ئاسکەکێوییەکان پووچ و خۆڕایی نییە. بنیادەم لەسەر ئەو هەردە هەر جووڵەیەکی دەشیکا هەر پووچ و بێ مانایە."

"وایە."

"گەورەترین بێهوودەیی و پۆچبوونی بنیادەم بیرکردنەوەکەیەتی. ئەوەی ئەوی تووشی ئەو پووچی و بێ ماناییە کردووە، تێگەیشتنەکەیەتی.

سەرۆك بەو قەڵافەتە زلەیەوە وا لە جێی خۆی دەرپەڕی دەتگوت درۆشەیەکیان بە ورگە زلەکەیدا کردووە. ئەوجار لای کردەوە بەلای مستەفا بەگدا و بەسەرسووڕمانەوە سەیری دەموچاوی کرد و ئاخرییەکە لە نێو قوڕگییەوە وەك بلوورێنێ گوتی:"وایە. زۆر زۆر تەڕ بووی. خووساوی. ئەوە هەڵدەلەرزی. زۆر توند دەبارێ. وانییە. وایە وایە."

مستەفا بەگ گوتی:"وایە."

ئیتر متەقی لێوە نەهات.

چەند ساتێك بێدەنگ مایەوە. سەرۆك کە مووی لێ ببوونە نەشتەر و سینگ و ورگی وێکڕا خوار و ژووریان دەکرد، دوای ئەوەی رەنگی و رووی هاتەوە سەرخۆی، لە رووناکاییە نارنجییەکەی ژوورەکەدا کەوتە پیاسەکردنێ و کە دەیویست لەسەر جێی خۆی دانیشێتەوە، جارێکی دیکەش بە لەبزێکی توندەوە گوتی:"بەڵێ وایە."

"پووچیی بیرکردنەوە و گەوجێتییەکەشی. ئەوەی بیر ناکاتەوە دوژمنایەتییش ناکا و رقیش هەڵناگرێ. کوشتن، کوشتن بەرهەمی بیرکردنەوە لە کوشتنە. لە جیهانی وارسکە (غەریزە)دا شتێکی تێدا نییە بە ناوی کوشتنی هۆشیارانە. کوشتنی هۆشیارانە کوشتنە و وەحشیگەرییە و لە گەمژەیی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ."

سەرۆك بە تووورەییەك لە دەنگیدا گوتی:"وایە."

ئەوجار پێکەنین، پێکەنینێکی بێ مەبەست کە چرچ و لۆچی خستە بن روومەتە پانەکانییەوە.

"ئەگەر ئێمە دەربکەن و دوورمان بخەنەوە چ دەبێ؟ ئێمە دیسان یەکتری دەدۆزینەوە. دایکم دیسان پاڵ بە ئەستوندەکەوە دەدا و چاوەڕوان دەبێ. ئەو گیان بە حەزرەتی قابیز نادا. دایکم

بوونەوەرێکی پووچ نییە. دایکم، دایکی من، قەرەقیز خاتوونی دایکم، ئەو... ئەو ... ئەو پووچ نییە. هیچ جووڵەیەکیشی لە خۆڕایی نییە. وارسکەی ئەو بەسەر ئەقڵیدا زاڵە جەنابی سەرۆك، جەنابی سەرۆك...."

بە کەفوکولێکەوە باوەشی لێك کردنەوە و لەسەری رۆیشت:"گەورەم، لە وەچەی ئادەمیزاد هەر دایکمی لێ هەڵکەوتووە پووچ نەبێ. لە نێو وەچەی بنیادەمدا هەر ئەوە کە دەزانێ چ دەکا."

جا لە حاڵێکدا کە هەر دەتگوت لە ژێر تیشکی گەیشتن بە حەقیقەت و راستەقینەیەکی مەحاڵدا کەفوکوڵی هەستاوە، گوتی:"گەورەم، گەورەم... پووچییەکەی دایکم، دایکم، دایکم... لە پوچبوونی هەر هەموومان کەمترە."

چاوەکانی بریسکانەوە و بە دڕدۆنگییەوە راوەستا:"پووچبوونەکەی ئێمەش، ئێمەش، ئێمەش..."

سەرۆك گوتی:"بەڵێ وایە."

قاقایەکی کێشا:"وایە."

هەتا بەیانی بەبێدەنگی دانیشتن و بە خەواڵوویی و زیندەخەوەوە، گوێیان دایە ترپەی باران.

کاتێ رۆژ بۆوە و تاو هەڵات، خاتوون بە لار و لەنجەوە، سینییەکی پڕ لە سەر دەستان هاتە ژووری و لەسەر مێزەکەی دانا و گوتی:"فەرموون. چای سەیلان. دوێنێ لە قاچاغچییەکانم کڕی."

جا رووی لە مستەفا بەگ کرد:"دەڵێی شمەکەکانت وشك بوونەتەوە. باش بوو وشك بوونەوە دەنا نەخۆش دەکەوتی. خێزانەکەت دەناسم. دەڵێی زمانی لە زاری دا نییە. زاری وەك تەڵەی تەقیو وایە و لێکی ناکاتەوە. چما تورکمانی رەسەن دەبێ هیچ قسەیەك نەکا و متەقی لێوە نەیە؟"

مستەفا بەگ بە پێکەنینێکەوە ددانە سپییەکانی دەرخستن و گوتی:"تۆزێك قسان دەکا، بەڵام هەمیشەش نا."

بە دوای قسەکەیدا سێبەری لووتە زلەکەی کەوتە سەر لایەکی روومەتی.

خاتوون:"چایەکەتان سارد نەبێتەوە. دیوتە چ بۆنێکی خۆشی هەیە!"

سەرۆك:"بەڵێ، فەرموو مستەفا بەگ. هیچ کەس لە دروستکردنی بەرچاییدا ناگاتەوە خاتوونی من. وایە."

مستەفا بەگ بەسەرسووڕمانەوە سەیرێکی خاتوونی کرد و گوتی:"وایە."

خاتوون سەرسووڕمانەکەی هەست پێ کرد و پێی خۆش بوو و گوتی:"کولیچەی بەهەنگوینیشم دروست کردووە جەنابی سەرۆك."

سەرۆك:"هەر بژی نیلوفەر خاتوون."
لەتێکی لە کولیچەکەی پچڕی.
شتێکی وای نەمابوو بەرچاییەکەیان بخۆن کە لە دەرگای ماڵێ درا. کولیچەی بەهەنگوین و پەنیری خۆماڵی و ڕۆنی کەرەی زەردیان بە نانی گەرمەوە خواردبوو و سێ کووپ چای سەیلانیشیان بەسەردا کردبوو.
نیلوفەر خاتوون هەرای کرد:"ئەوە هاتم. هاتم."
لە پلیکانە چێوییەکان کە لە بن بارستایی و قورسایی جەستە قەڵەوەکەیدا قرچ و هۆڕیان بوو، چووە خوارێ و دەرگاکەی کردەوە، دیتی کابرایەك هەوساری ئەسپەکەی بەدەستەوەیە و لەبەر دەرگا راوەستاوە. کابرایەکی خووساو لەبەر باران و چەکمەکان بەباران شۆردرابوونەوە و بریقەیان دەهات. کابرایەکی ئەسمەری کەڵەگەت بوو کە پشتی تۆزێك کووڕ ببۆوە و لە یەکەم نیگادا ئێسکە زەقەکانی روومەتی و چاوە مەڕییە گەورەکانی سەرنجیان بەرەو خۆیان رادەکێشای.
کابراکە هەروا لەبەر بارانەکە راوەستابوو و بەگران و سەنگینییەکەوە پرسیی:"جەنابی سەرۆك تەشریفی لەماڵەوەیە؟ دەمویست چاوێکم پێی بکەوێ."
دەنگی پڕ بوو لە دڵنیایی و متمانەبەخۆیی. دوای تۆزە راوەستانێك گوتی:"ئەمن دەروێش بەگم. دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی..."
نیلوفەرخاتوون زمانی شکا. رەنگی بە روخسارەوە نەما. بە پەلەپەل بەرەو پلیکانەکان گەڕایەوە و هێشتا هەنگاوی نەنابوو ئاوڕی دایەوە و بە دڕدۆنگییەوە سەیرێکی کرد و بە ترسەوە گوتی:"کێ؟ کێ؟"
نیلوفەر خاتوون سەری لە گێژەوە دەهات و حەپەسابوو. لەو جەنگەیەدا چاوی بە پەیژەیەك کەوت کە مێردەکە شەوانە بە دزییەوە پێیدا وەسەردەکەوت و ئاگری لە هێلانەی باڵندەکان بەردەدا و سەری ئەو باڵندانەی هەڵدەپساندن کە نەیدەتوانی هێلانەکەیان ئاگر بدات. دەسبەجێ وەخۆ هاتەوە و بە پەلەپەل لە پەیژەکە وەسەر کەوت.
"بەگ، جەنابی سەرۆك..."
دەنگی کپ بوو.
"سەرۆك بەگ... لە پشت دەرگا.... ئەو.... ئەو... ئەو..."
"کێیە؟"
بە دەستی جارێ ئاماژەی بە مستەفا بەگ دەکرد و جارێك بە دەرگا.

"ئەو، ئەو، ئەو... خۆی... لێی گەڕێم بێتە ژووریٚ؟ ئەگەر... ئەگەر... ئەگەر هات و..."

سەرۆك هەستا و گوتی:"ئەوە چیتە خاتوون؟ چ بووە؟ کێیە؟ راوەستە با بزانم کێیە وا شڵەژاوی؟"

بە هانکەهانك لە پلیکانەکان چووە خواریٚ و تاوێك دواتر دەنگی هات:"فەرموو، فەرموو، فەرموو دەروێش بەگ."

دەروێش بەگ بە دڕدۆنگی و سەرسووڕماو لە هەڵسوکەوتە نائاساییەکەی ژنەکە لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. دەرگای ژوورەکە کرابۆوە. هەر لەوێوە مستەفا بەگی ناسییەوە کە دەستی راستەی لەسەر دەسکی دەمانچەکەی بوو کە کەوتبووە سەر رانی.

"فەرموو. فەرموو. ئێمەش خەریکی بەرچایی خواردنیٚ بووین."

دەروێش بەگ بە خێسەیەکەوە سەیرێکی مستەفا بەگی کرد و دوای ئەوە وەك بڵێی نە بای دیتبیٚ نە بۆران، وەژوور کەوت و لە حاڵێکدا شانی راستەی دەکردە لای پشتەوە ئەو کابرایەی وا بەپێوە راوەستابوو، رۆیشت و گەیشتە مۆبلەکە. کونجکۆڵییەك وەك کێچ کەوتە کەوڵی مستەفا بەگەوە. بەڵام ئاوڕی نەدایەوە.

"فەرموو. فەرموو.."

مستەفا بەگ خۆی پیٚ نەگیرا و لەنەکاو بەبیٚ ئەوەی بەدەست خۆی بیٚ، ئاوڕێکی دایەوە و بە دەنگێکی زۆر ئاسایی و بە بزەیەکی ساردەوە گوتی:"ئیزن دەخوازم جەنابی سەرۆك. زۆر سوپاست دەکەم بۆ هەموو شتێکت."

ئیتر بەبیٚ ئەوەی بتوانیٚ پێشی خۆی بگریٚ و سەیری دەروێش بەگ نەکا، وردە وردە لە پلیکانەکان چووە خواریٚ. لە نەکاو زانیی دەستی خزیوەتە سەر دەمانچەکەی. ئەوەندە خێرا دەستی لەسەر لابرد، دەتگوت لەسەر ئاگری داناوە. مێشکی گەرمدا هات و سوور سوور هەڵگەڕا. زۆر تەریق ببۆوە. بۆ ئەوەی بزانیٚ ئاخۆ سەرۆك ئەوەی دیتووە یان نا، سەیرێکی کرد. سەرۆکیش هەموو شتێکی دیتبوو و تێگەیبوو. چاویان کە لە چاوی یەکتری ئاڵقا، گوتی:بوایە وایە. خوویە خوو."

# ٤١

دارەکان کە هێشتا چرۆیان دەرنەکردبوو لە دەم رووبارە پڕ لە وردکەبەرد و چەوەکە ریزیان بەستبوو و چی نەمابوو لێوی چرۆی سووریان بپشکوێن. وشترالووکی بەزر و مۆر گوڵیان دابوو. گژ و گیا و شەغرە و یۆنجە چووزەرەیان دەردابوو و لە هەندێ جێ هەتا ئەژنۆش هەستابوون. نێرگزە چاو رەشەکان لە دەم ئاقچاساز و دار هەڵووچە بەرزەکانەوە لە نێو رەوەزەکانی دۆڵی "هەڵووچان"دان خۆیان لەبەر تاوی بەهارێ هەڵخستبوو. بۆن و بەرامەی هێشووی سونبول و وەنەوشە لە رەوەزەکانی چیای حەمیتەدا دامرکابۆوە. ئەو شنەیەی هەڵیکردبوو، بۆن و بەرامەی تیژی گوڵەکانی نێو دۆڵەکەی بەولاولادا دەبرد و بڵاوی دەکردەوە. حەیزەران و گوڵی نەسرین و تووترکی چڕ و گەش سەریان بەرز کردبۆوە. خاکەکەی چوکووراوا بە هەزار و یەك گوڵ و رەنگ و بۆن و بەرامە و گژ و گیا رازابۆوە. مێشەنگوین و پەپوولە و باڵندە و قالۆنچە و چی دەعبا بوو لە هێلانەی هاتبوونە دەرێ و خۆیان دابووە دەست هەتاوەکەی چوکووراوا و جێژنی جووتبوونیان بوو. مار و بۆقی قەڵەو قەڵەو بە دەشتەکەدا بڵاو ببوونەوە و بەبێ هیچ ترس و رەوینەوەیەك خۆیان لەبەر تاوەکە هەڵخستبوو.

لە نێو مەزرا سەوز و گەشکەوە کە لەبەر لووزەوی با و لەبەر تیشکی تاوەکەدا کەروێشکەی دەکرد، قاسپەی کەو و سوێسکە دەهات. ئاوی بەهارانە بە لرفە بە ئاودڕ و جۆگە و جۆبارەکاندا دەخوشی. داوە تیشکەکان بە هەڵکشان و داکشان و گۆڕانی بەردەوامەوە، دەبوونە تان و پۆ. باڵندەکان لە نێو لك و پۆی دارکان و لە کون و کەلێنی بەردەکان و دەوەنەکاندا خەریکی هێلانە دروستکردن و چاکردنەوەی هێلانەکانیان بوون. خاکە بەپیتەکەی چوکووراوا لەبەر تیریێژی نەرم و نیانی هەتاوەکە و بارانی زۆردا، حاسڵات و بەروبووی جۆراوجۆر و بەپیت و بەرەکەتی خۆی پەروەردە دەکردن.

ڕەوە ئاسك بە پاناوکی دەشتەکە وەربیوون... کۆتاییەکانی مانگی ڕێبەندان، لە خوارەوە لە ڕەوەزەکانەوە لە سوریاوە و لە سەرووی حەران و لە چیاکانی عەبدولعەزیزەوە هاتبوون. ئەوان زینەت و خشڵی چوکووراوا بوون کەس لێرە کاری بەسەریانەوە نەبوو.

ڕەوە ئاسکەکە، کە لە خوارووی دۆملۆوە هاتبوون، ڕوویان کردبووە لای ڕۆژهەڵاتێ و هاتبوونە قامیشەڵانەکەی حاجیلار. قامیشەڵانەکەی حاجیلار زۆر پان و بەرین بوو. لە ئەسلانلی و حەمام و پردەکەی چوکوورەوە هەتا دەگاتەوە ڕووبارەکەی جەیهانی داگرتبوو. نێوەڕاستەکەشی پاناوکێکی شیناوەرد و گژ و گیای بێ پەڵە بوو. ئاسکەکان لە قامیشەڵانەکە تێپەڕین و هاتنە پاناوکە شینابییەکە و دەمیان نایە لەوەڕەوە. لە هیچ کوێی دیکە گژ و گیای ئاوا گەش و تورت و نەرم و شیلەداریان دەست نەدەکەوت. کە تاو هەڵات و گەرماکە هەڵیکرد، پۆلە هەڵۆیەك لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاوە هەستان و بە شاباڵی لێك کراوە و درەوشاوەوە وەك شمشێرێکی لە کالان دەرکێشراو هاتنە سەر مامزەکان. دوای ئەوە بە ئاسمانەکەدا خوشین و بە حەواوە وەك هەڵاوەسرابێتن مانەوە و لە نەکاو باڵیان جووت کردن و بە قاووقیژێکی توندەوە بەرەو زەوی لوور بوون. ڕەوە مامز ڕەوییەوە و پەرش و بڵاو بوون و هەر یەکەی بۆ لایەك تێیان تەقاند و پەنایان بردە نێو دار و دەوەنەکان. کە نێچیرێك دەگلا، چەند هەڵۆ وێکڕا پەلاماریان دەدا و لەتوپەتیان دەکرد. ئەو هەڵۆیانەش کە هیچ نێچیریان دەست نەکەوتبوو، بەرەو ئاسمان دەکشانەوە و دیسان وەك هەورە تریشقە لوور دەبوونەوە. لە گۆشە و کەناری دەشتەکەدا، پۆل پۆل ئاسك لە حاڵێکدا چەند هەڵۆیەك سەریان لە دوو نابوون و دەم لەسەر پشت راویان دەنان، لە ترسانا رایان دەکرد.

ئەو مامزەی بە خوار گوندی دلی لەردا بەلەسە ببوو و ڕووی کردبووە شیوی عەلی، ئاسکێکی خرتی موو سوور بوو کە وەك بریسکە و با دەخوشی. ئەو ئاسکە خرتە، باڵندەیەکی باڵی مسی سەری لەدوو نابوو. لەوانەشە هەر لەو پۆلە هەڵۆیە بووبێ یان لەوانەیە هەڵۆیەکی "یالقۆز" بووبێ کاتێك بە تاقی تەنیا بەسەر ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاوە لەنگەری گرتووە، بە چاوە تیژ و مووئەنگێوەکانی خۆی ئاسکێکی بەلەسەبووی لە خوارووی دەشتەکەوە بەدی کردووە. هەر چاوی بە ئاسکەکە کەوت، لە ئاسمانێ خۆی وێك هێنا و وەك نەیزەکێك بەسەریدا هات. ئاسکەکە سڵەمیبۆوە و زراوی تۆقیبوو، بەڵام زیت و قوت و لەسەر پێ بوو بۆیە توانیی خۆی لابدات و وەك با بفڕێ و خۆی بگەیێنێتە لێواری جەیهان و خۆی بە نێو دارە ئاغینەکاندا بکا. باڵندە باڵ مسییەکە، ئەوەندەی یەك و دوو لە نێو دار و دەوەنەکەدا ئاسکەکەی دۆزییەوە.

ئاسکەکە ئەگەر دیسان زیت و وریا نەبوایە، ئیتر ئەمجارەیان تێداچوبوو. کە باڵندەکە ڕێك گەیشتبووە سەر مامزەکە و دەیویست چنجڕووکە تیژەکانی لە مازەی پشتی ڕۆبکا، ئاسکەکە وەك تیر بەرەو لای چەپ خۆی لاکردەوە و باڵندەکەی دوور بەجێ هێشت. چی وای نەمابوو وەعەرزی بکەوێ و باڵندەکە کەوانەی کرد و توانیی لە سەر رووبارەکەی جەیهان خۆی بگرێتەوە. ئاسکەکەش وەك بای شەماڵ لەوێ دوور کەوتەوە و لە نێو پنگەجارەکەی مەجیدییەدا پشوویەکی هاتەوە بەرخۆ. باڵندە مس ڕەنگەکە باڵی توند کرد کە بگەڕێتەوە، گەیشتبووە سەر کسیك ئەللی. ئاسکەکە نەیدەویست لە جێیەك لە بن دەوەنەکان مات بێ و خۆی حەشار بدا. هەر ئەقڵی بەوە نەدەشکا خۆی بشارێتەوە. هەر دەتگوت لە وارسکەیدا شتێك بە ناوی خۆ شاردنەوە نییە. متمانەی بە لاقە باریك و بەهێز و توندوتۆکمەکانی خۆی هەبوو و لەسەر ئەو باوەڕە بوو ئەو لاقانە لە هەموو بەڵایەکی ڕزگار دەکەن. چوار پێنج هێندەی بەرزایی پێیەکانی قەڵەمبازی داویشت و خۆی فڕێ دەدا... و باڵندە لاو و دڕندەکە سەرەڕای ئەوەی شاباڵەکانی زۆر بەهێز بوون، بە حاستەم تۆزی پێی ئاسکەکەی دەشکاند کە دەشیگەیشتێ، نەیدەتوانی چنچڕووك لە نێوقەدە باریکەکەی توند بکا.

ئاسکەکە لە نێو پێدەشتە پڕ لە هەڵاڵەکەدا کە ڕێك و سوور دەچۆوە، بازرە ببوو و زۆر لە فڕندە دڕندەکە دوور کەوتبۆوە و ترسی مەرگی دوور دەبینی. پێیەکانی کەوتبوونە لەرزین و ئەژنۆکانی دەنوشتانەوە. جار بە جار شلتر دەبۆوە و قەڵەمبازە بەرزەکانی کورتتر دەبوونەوە. لە هەڵاڵەجارەکە تێپەڕی و گەیشتە چیمەنکێکی پڕ لە گوڵاڵە کێوی. گوڵاڵە کێوییەکان بە گوڵی گەورە گەورەی پێنج پەلکەی شین و سوور و زەرد و مۆر و پەمەیی و سپییەوە کە نێوەڕاستەکەیان وەك چاوی بنیادەمی سەرسووڕماو زەق ببوو، لێرە لە خوارووی ئەندلەوە هەتا بنار و داوێنەکانی چیای حەمیتەیان داگرتبوو و زەوییە شینەکە لەبەر لووزەوی بایەکەدا کەروێشکەی دەکرد.

ئاسکەکە کە بەرەو چیای حەمیتە بای دابۆوە، لە حاڵێکدا نەتوند و نە شل ڕای دەکرد، بە نێو هەوری پەپوولاندا تێپەڕی. غاردانەکەی ریتمێکی ڕێکی هەبوو و هەر تاوێك ڕای دەکرد قەڵەمبازێکی داویشت. لاقەکانی ئەوەندە بەهێمنی دەجووڵان تەنانەت چڵی گوڵاڵە کێوییەکانیشیان نەدەشکاندەوە. دەتگوت جۆگەلە ئاوێك یان تیشکێکی سوورباوە بە داوێنی دەشتەکەوە. چیمەنکەکە ڕێك و یەکدەست بوو و تەنانەت پۆلە دەوەنێکی بەرز یان کۆگا گیایەکیش ئەو یەکدەستییەی لێ تێك نەدەدا. ئاسکەکەش کە مووە سوورەکانی دەبریسکانەوە، بەو تەختایی و ڕێکییەدا دەخوشی...

دەنگێکی سامناکی لە پشتەوەی خۆی گوێ لێ بوو. هەموو شتێك لە نەکاو گۆڕدرا. باڵندە خرت و تووڕەکە باڵە مسییەکانی جووت کردبوون و بە بەرزایی باڵای بنیادەمێك بەسەر گوڵاڵە کێوییەکاندا وەك بریسکە دەهات. دەنگی گڤەی ئەو بایە لە ئاسکەکەی دەدا و قاووقیژ و هاشوهووشەکە، هەواڵی نزیکبوونەوەی باڵندەی مەرگی بۆ دێنا. خۆ ئەگەر ئاسکەکە لەو کاتەدا خۆی بە ئاودرێکدا نەکردبایە، تەواو تێداچوبوو. باڵندەکە چنجڕووکی خۆی لە پشتەستۆی مامزەکە توند کرد و دڕی و تێپەڕی. خوێن لە برینەکەیەوە فیچقەی کرد. ئاسکەکە ئەوەندەی یەك و دوو هەستایەوە سەر پێیان. بەڵام باڵندەکە بە بەرزایی باڵای بنیادەمێك و نزمتریش، بەسەر هەڵاڵەکاندا خۆشی بوو و رۆیشتبوو. لە لای چیای حەمیتە خۆی گرتەوە. بە خێراییەکەی سەرسووڕهێنەر هەتا چەقی ئاسمان کشا و تارمایی ئاسکەکەی دیت کە بە قەڵەمباز و گورگەلۆقە بەرەو بوزقۆیۆ دەڕۆیشت. ئاسکەکە ئەمجارەیان خێراتر غاری دەدا. بەهۆی برژانەوەی برینەکەی و لە ترسی گیانی دەفڕی. ترس و دڵەڕاوکێ و خەم لە چاوە گەورە و رەشەکانی دەباری و درەوشانەوەی سووری گوڵاڵەکانی و باڵندە باڵ مسییەکە تێیاندا رەنگی دەدایەوە.

چەند عارەبانەیەك بە جیڕەجیڕ و تەقەتەق بە تەنیشت گوڕستانە کوێرەدا تێدەپەڕین. ئاسکەکە عارەبانەکانی نەدی، بەڵام هەر گوێی لە دەنگەکەیان بوو، بەرەو پشت چیای حەمیتە و بەرەو لای چاتالێ بای دایەوە. کەوتە نێو زەوییە سوور و پڕ لە وردەکەبەردی هاڕدراوی رەوەزەکانەوە. بە نێو دار چەقەکاندا کە سوورایی گەڵاکانیان لەبەر تۆخبوون مەیلەوڕەش دەچوونەوە و رەوەزەکانیان پەڵەی سوور و کەسکیان پێوە بوو، پۆل پۆل گوڵی زەعفەرانی روابوون. گوڵی زەرد زەرد لە نێو رەوەزەکانەوە شین ببوونەوە و خاکە سوورەکەی دنیایان هەتا دوور دوور و ئاسمانە شینەکەیان لە هاڵاوی بریقەدارییاندا نوقم کردبوو.

وەنەوشەکان بۆنە توند و قورسەکانی خۆیانیان لەبەر پێی دەوەن و گیای "مۆرتك"ی کەسك و گوڵ سپیدا پێشکەشی خاك و بەهار و هەتاو دەکرد. سوێسکەیەك لە خواری دەشتەکەوە سێ جاران قاسپاندی. مامزەکە، کاتێ گەشتە رەوەزەکان، دووجار گوێی لە دەنگی باڵی فڕندەکە بوو. دەنگی هانکە هانکەکەی لە بن گوێیانی بوو. لە بەردێکەوە بازی دەدایە سەر زنارێك و لاقەکانی دەکوتران. چاوە رەشەکانی جار بە جار زەقتر دەبوونەوە. چاوەکانی هەردەتگوت هەموو دەموچاوەکەیان داگرتووە.

باڵندەکە ئەمجارە هێندەی سپیدارێك بەرز ببۆوە و بەسەر ئاسکەکەدا تێپەڕی. پتر و پتر هەڵکشا. ئەوەندە هەڵکشا دەتگوت بە میچی ئاسمانە شینەکەوە نووساوە. باڵەکانی لێك

کردبوونەوە و هێور هێور بە ئاسماندا بازنەی گەورە گەورەی دەکێشا و جار بە جاریش دەیقیشکاند. دەتگوت ئەویش ماندووە بووە و بە لێککردنەوە باڵەکانی و لەنگەرگرتنی بە ئاسمانەوە، پشوویەك دەدا.

لە نەکاو پەلاماری دا و ئاسکەکەش کە ئاگای لێی بوو، خۆی خستە پشت ڕەوەزێکەوە و پەلامارەکەی بێ ئاکام هێشتەوە. ئەگەرچی سێ پەڕی لە باڵی هەڵوەرین، بەڵام گیانی رزگار بوو. ئاسکەکە لە چاتاڵ داگەڕا و ڕووی لە ڕەوەزەکانی ئاداجا کرد. ڕەوەزەکانی ئاداجا یەك سەر بە گوڵە نێرگز داپۆشرابوون. ئەو گوڵانەی بۆن و بەرامەکەیان هەموو وڵاتی داگرتبوو. ئاسکەکە لە ئاداجادا ون بوو. باڵندەکە چیی سەر و خواری کرد و بە چاوە مووئەنگێوەکانی هەموو کەلێن و قوژبنەکانی سەنگ و سووژن دا، ئاسەوارێکی لە مامزەکە نەدیتەوە.

باڵندە لاسارەکە دەیزانی ئاسکەکە هەر لێرە، لە ڕەوەزەکانی ئاداجادا خۆی مەڵاس داوە و لێرە دوور نەکەوتووەتەوە.

لە مانگەشەوەکەدا هەتا بەیانی بەسەر چەقەڵ و ڕێوی و پشیلە کێوییەکانەوە کە بۆ ئاوخواردنەوە دەهاتنە دەم گۆلەکان، قیشکاندی و سووڕایەوە. دوای تاوهەڵات دیسان ئاسکەکەی دیت کە بە نێو گەواڵە مژەکاندا دەڕۆیشت و دەهاتەوە دەرێ. باڵە ماندووەکانی لێك دان. چنجڕووك و دەندووکی وێك هێنا و بە تووڕەییەوە وەك نەیزەکێك بەرەو ئەو نێچیرەی ئەوەندەی سەرگەردان کردبوو، هورووژمی برد. بەڵام چیی نزیکتر دەبۆوە، ئاسکەکە خێراتر دەفڕی. هێندەی هەزار شەقاوێك مەودایان بوو. ئەو مەودایە هەتا کسیك ئەللی بەبێ کەم و زۆر بوون هەروا مایەوە و هەتا پنگەجاڕەکەی ئاقچاسازیش هەر بەردەوام بوو.

لە پنگەجاڕەکەی ئاناوەرزا ئاسکەکە هەر دەهات و شل دەبۆوە. ئاسکەکە بە چەپ و ڕاستدا خۆی داویشت، بەڵام نەیدەتوانی لەو پنگەجاڕە چڕە و لەو عەرزە خلیسك و شەقارشەقارە خۆی دەرباز بکا.

کە ئاسکەکە لە نێو دەوەنەکان هاتە دەرێ، قرچەی گەرمای نیوەڕۆیە بوو. مێش و مەگەز لە کۆنەبرینەکەی دوێنێی جێ پەنجەی هەڵۆکە هاڵابوون. ئاسکەکە جار بە جار شلتر دەبۆوە و لە داماوییان شێت ببوو. دەنگی باڵی باڵندەکە لە بن گوێی بوو و جار بە جاریش نزیکتر دەبۆوە. شەڕەکە ئیتر تەن بە تەن بوو. ئیتر نە ئاسکەکە توانای ئەوەی بوو بە ڕاکردن خۆی رزگار بکا و نە باڵندەکەش دەیتوانی چنجڕووکە تیژەکانی خۆی لە پشتەملی مامزەکە ڕۆبکا و بە چنجڕووك چاوەکانی دەربێنێ. ئەوە عادەتی باڵندە دڕندە ڕەنگی مسی و چاوکەسکەکانە کە لە پشتی

کەروێشك و مامزان ڕۆدێن و لە پێشدا چاوەکانیان دەردێنن و دوایی بە پۆل و هەر کامەیان پارچەیەك لە گۆشتی دەعبا کوێر و لەکارکەوتووەکەیان دەپچڕن و کەلاکەکەی بۆ کەلاکخۆران بەجێ دێڵن و کەلاکخۆرەکانیش تەنیا ئێسقانە سپییەکانی دەهێڵنەوە.

ئاسکەکە هەر دەهات و قەڵەمبازی کورتتر دەبوونەوە و لەگەڵ هەر قەڵەمبازێکیدا ئەژنۆی دەنووشتانەوە. باڵندەکەش دەتگوت تێی گەیشتووە، بۆیە لە نەکاو بەرەو تەشقی ئاسمانێ بەرز بۆوە و باڵەکانی لێك کردنەوە و کەوتەوە سەیران. ئاسکەکە ئیتر خێرا و بە هەشتاو نەدەڕۆیی. گەیشتە دڕووەلانێك و گەڕایەوە. زۆر زۆر هێور ببۆوە. بەشوێن قامیشەلان و گژ و گیایەکی بەرزەوە بوو کە بتوانێ خۆی تێدا بشارێتەوە. بەڵام هەتا چاوی هەتەری دەکرد شوێنی وا بەدی نەدەکرد. باڵندەکەش دوور کەوتبۆوە و ڕۆیشتبوو.

لە نەکاو گرمە و قیژەیەك لە بن گوێی هەستا و رایچڵەکاند. ئاوڕێکی دایەوە و لە دەم دڕووەلانەکە سەیری کرد ئەوە بەپڕتاو دێ. باڵندەکە پشووی هاتبۆوە بەرخۆی و بەتاڵووکە و پڕتاو ڕێك خۆی گەیاندەوە سەر سەری مامزەکە. کە دڕووەلانەکە بڕایەوە و گەیشتەوە هەڵاڵەجاڕەکە، تۆزێك لە لاقانی وەراند و خێراتر ڕۆیشت و باڵندەکە چوار پێنج هەنگاوان لێی بەجێ ما و ڕێك لەو کاتەدا خۆی وێك هێنا و هەر لەوێوە وەك بریسکە خۆی بە پشتی ئاسکەکەدا دا و ئاسکەکە لە ترسان وا دەرپەڕی کە سەری باڵندە بەرەو لایەك و باڵ و پەنجەی بەرەو لایەکی دیکە وەرسووڕانەوە. مامزەکە قوتار بوو و خۆی بە سیواکەجاڕەکەدا کرد کە تازە گوڵی کردبوو. باڵندەکە ڕێك لەو کاتەدا جارێ دیکەش خۆی کۆکردەوە و پەلاماری دایەوە. ئاسکەکە دیسان دەرپەڕییەوە و باڵندەکە کەوتەوە.

مستەفا بەگ دەسبەجێ خۆی گەیاندە لێواری هەڵدێرەکە و هەر ئەوەندەی پێ کرا لاقەکانی ئاسکەکە ببینێ کە ئەوانیش ڕۆچوون و ئاوی زۆنگاوە وردە وردە هاتەوە سەرێ و وێك هاتەوە وەك شەوێکی...

مستەفا بەگ ماوەیەك نەیتوانی چاو لەو شوێنە هەڵگرێ، کە ئاسکەکەی قووت دابوو و لەسەر خوانی زینێ هەروا دەستی لەکەلەکەی نابوو و ڕاوەستابوو. چاوی لەو زۆنگاوە بڕیبوو، کە وەك شەوێك وێك هاتبۆوە....

# ٤٢

تازه تاو کەوتبوو کە مێرسدێس بێنزەکەی ئالاتەمیر لەبەر دەرگای کۆشکەکەی دەروێش بەگ رایگرت. ترۆمبێلە رەشەکە وا لە تەپوتۆزدا نوقم ببوو نەتدەزانی چ رەنگێکە.

لە پێشدا شۆفیرەکە، کە تەپوتۆزی رێگە سەروچاوی سپی داگێڕابوو، دابەزی و دەرگاکەی کردەوە. ئالاتەمیر گورج و گۆڵ بە ترۆمبێلەکە دابەزی و کەوتە داتەکاندنی تۆز و خۆڵی سەر پانتۆڵ و جلوبەرگی کارەکانی و کڵاوە گەڕگەڕییەکەی. برایم کە دەیانگوت بنیادەمی ئاوای زۆر دیتبوو کە دەست و لاقی زل بوون و شوێن شوێن سەری رووتابۆوە و جلوبەرگەکانی لە دوورەوە هاواریان دەکرد و جووتێ کالەی لەپێدا بوو، هێشتا بە سەرسوورِمانەوە سەیری دەکرد. برایم کە لەو کۆشکەدا دڵی هێندەی نیسکێکی لێ هاتبۆوە، هەر گوێی لە خرمەی ناڵ و هاڕەی ترۆمبێل دەبوو، دەسبەجێ خۆی دەگەیاندە بەر دەرگا و بە دڵەڕاوکێوە چاوەڕوانی بیستنی هەواڵێکی ناخۆش و دیتنی رووداوێکی کارەساتبار دەبوو. لە پشت دەرگاوە سەری دەکێشایە دەرێ و بەسەرسوورِمانەوە لەو کەسەی دەڕوانی کە هاتبوو. وای لێ دەڕوانی وەك بڵێی یەکەم جارێتی خولقێنراوێکی لە شێوەی بنیادەم دەبینێ... زمانی دەشکا.

چاوی لە دەستە رێکەکانی بنیادەمەکان و نێوقەدیان هەڵنەدەگرت و لێیان ورد دەبۆوە، کە نەکا دەمانچەیەك دەربکێشن و... ئەگەر یەکێك بە هەڵەش دەستی بۆ نێوقەدی خۆی دەبرد، برایم بۆ رزگارکردنی گیانی خۆی رووی دەکرد چیا و چۆڵان و وەك وەلی شەماڵ شاخ و کێوانی دەتەقاند. لە ترسان شەو هەتا رۆژ خەوی لێ نەدەکەوت و هەتا تاوهەڵدەهات وەك شێتان و لە حاڵێکدا ترس هەتا سەر ئێسقان سڕ و بێهێزی دەکرد، خۆی دەخزاندە نێو قەدی دارە ئەستوورەکانەوە و نێو باخچە و کەلێن و قوژبنە چەپەکەکانەوە و لە پشت دەوەنەکان هەڵدەکورما و خۆی مات دەکرد. شەوی وابوو وا دەترسا، سەیری دەکرد چووەتە سەرچڵووکی

چناره هەرە بەرزەکان و هەتا بەیانی لەوێ گوێ هەڵدەخست. جاری واش بوو بە پێچەوانەوە دەجووڵایەوە و سەری خۆی بەردەدایەوە و بەو لینگە درێژانەیەوە دەکەوتە رێ و بانەکان و سەربەخۆ سەری خۆی هەڵدەگرت و رووی دەکردە کۆشکەکەی ئاق یۆللی" و لە نێو حەوشەی ماڵەکەیدا وا نوقمی حەمە عەلی و تەراکتۆرەکانی و جلوبەرگی کارکردنی و دەستە چەورەکانی دەبوو کە خەریکی تەراکتۆرەکانی دەبوو، ئیتر ئاگای لە ئاوابوونی خۆر نەدەما. نە حەمە عەلی و نە هیچ کەسێکی دیکەش لێیان نەدەپرسی تۆ کێی و چ کارەی و خەڵکی کوێی و بۆ کوێ دەچی؟ برایمیش بە دڵێکی خۆشەوە خۆی بە تاریکایی و ئەنگوستەچاوەکەدا دەکرد و لە رێگایەدا ئەو ترسەی لە ناخیدا پەپکەی خواردبوو، لە خەوێ هەڵدەستا و وەك مارێك سەری هەڵدێنا. بۆ ئەوەی بگاتەوە کۆشکەکەی خۆیان لە لاقانی دەوەراند و تا خێراتر غاری دەدا ترسەکەی توندتر دەبوو و ئەوەندی پتریش ترسابا خێراتر غاری دەدا. ئەو ترسەی سەری لەدوو نابوو، خەریك بوو شێتی دەکرد.

جوتیارەکان شەوێکیان بەرەبەری بەیانی لە سەر لێواری هەڵدێرێك دیتیانەوە کە خەریك بوو وەك بنیادەمێکی نوقم بووبێ، دەینووزاند و بەدەم نووزەوە داوای یارمەتیی دەکرد. لە سەر لێوی هەڵدێرەکە، کە وەك هەڵۆیەکی زامار پەلەقاژەی دەکرد، یەك پشوو هاواری دەکرد"دەمکوژن، خەریکن دەمکوژن، فریام کەون، فریام..." دەتگوت سیحری لێ کراوە. خۆ ئەگەر جوتیارەکان نەیگەیشتبانێ، لەتی گەورەی گوێچکەی دەبوو.

برایم دەیگوت:"ئەگەر مستەفا ئاغا بابم بکوژێ، دیارە هەر دەشیکوژێ، ئەمن نە مستەفا ئاغا دەکوژمەوە و نە حەمە عەلییش. ئەمن لەگەڵ حەمە عەلی ئاشت دەبمەوە و دەبمە برادەری. منداڵەکانم هیچ لە مەرگ ناترسن. ئێمە زەوی و زارمان زۆرە. حەمە عەلییش زۆری کەیف بە زەوی و زار دێ. زەوییان کەم بووە و وەرزێرەکانی لە دێ دەرکردووە. ئەمن نیوەی زەوی و زارەکەی خۆم دەدەم بە حەمە عەلی. چما ئەو دەشتە کاکی بە کاکییەی ئاناوەرزا هیی ئێمە نییە؟"

ئەوجار ترس چنگی لە دڵی توند دەکرد و لە ترسی خۆی، تووڕە دەبوو و لە دین دەهری دەبوو و ئاگای لەخۆی نەدەما و بە شڵەژاوی و وەك شێتان بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و ماسوولکە و پێستی لەشی لەبەر یەك دەکشانەوە و بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ، هاواری دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"دەیکوژم. دەیکوژم... تاق و جووقەواریان لێ دەبڕم. نە پیاو و نە ژنێك... ئەگەر باب و باپیرەکانمان ئەقڵیان بەوە شکابوایە، تا ئێستا تۆویان دەبڕینەوە. نە بابم، نە بابم، نە بابم... ئەی هاوار، هاوار، هاوار، نە ئێمەش بەو جۆرە رۆژێ هەزار جاران لە

ترسان نەدەمردین و زیندوو نەدەبووینەوە. شەوێك دینامێتێکان لە ژێرزەمینی کۆشکەکەیاندا بۆ دەنێمەوە هەر هەموویان، هەر هەموویان وێکڕا پەرش و بڵاو دەکەم. بێت و یەك کەسیشیان لێ بمێنێتەوە هەر تاقە کچۆڵەیەکیش، ئەوە گەورە دەبێ و مێردێ دەکا و کوڕێکی دەبێ و جا رۆژێك دێ و دەمانکوژێتەوە. هەر بۆیە یەکجێ هەموویان..."

دوایی بەسەر نووکی پەنجەکانی و بەسپایی دەچووە پشت ژوورەکەی بابی رادەوەستا و گوێی هەڵدەخست و بە دەنگێکی کە خۆیشی بەحاستەم دەیبیست، دەیگوت:"بابە، بابە، بابە، ئەتۆ کەنگێ، هەموویان، یەك بە یەك دەکوژی و نەجاتم دەدەی؟ ئەمن، ئەمن دەکوژن، بابە دەمکوژن."

برایم کە بیستی دەریاندەکەن و دووریان دەخەوە، لە پێشدا لە خۆشیان شاگەشکە بوو و سێ رۆژان لە خۆشیانا بە نێودێیەدا گەڕا. ئەوانیان یەك بە یەك دەنارده قوڕنەیەکی وڵات و "ئاق یۆللی"یەکانیشیان بەڕێی قوڕنەیەکی دیکە دەکرد و ئیتر نە ئەوان دەیانتوانی لە کەمپەکەی خۆیان بڕۆنە دەرێ و نە ئەوانی دیکەش. دەی لەوە باشتر؟ لە بەر رووناکایی ئەو شادییەدا بوو کە "ناقان"ـە سەدەف نیشانەکەی خۆی، ئەوەی وا بابی بەکوڕێکی شیرینی نەدەدا، دای بە عەلی. دوای ئەوە ئیتر دەمانچەی بۆ چ بوو؟ بۆ تا هەتایە لە کوژرانێ نەجاتی ببوو. چووە شاری. بە هەڵەداوان و وەك شێتان بە بازاڕێدا گەڕا و سەری لە ئاسنگەر و دووکاندار و عارەبانەچییەکان هەڵێنا. یەك دوو قوتوو شوکلاتی نوقڵ و نەباتی کڕی و بەسەر منداڵەکانی گوندێیدا بەخشییەوە. کەچی لەولاوە بابی وەك شێتانی لێ هاتبوو و لە داخان و بە توڕەییەوە و بە حەژمەتەوە یەك پشوو دەیگوت:

"بێت و دوورم بخەنەوە، ئەو شارە ئاگر دەدەم. بە سەرۆکە پیرەشی گوت ئەگەر بیانەوێ دوورم بخەنەوە، نایەڵم دار بە سەر بەردی ئەو شارەوە بمێنێ. خاکی ئەو شارە بە توورەکە دەکێشم و وای لێ دەکەم بە چیرۆکان بیگێڕنەوە. ئێرە کاول دەکەم و دواتریش تەرمی من لەو کاولبووەدا دەدۆزنەوە."

بابی و دایکشی زۆر زۆر لە مەرگ دەترسان... هەموو خەڵکی دێیەکەش لە مەرگ تۆقیبوون. گوندییە داماوەکانی ئاق یۆللۆکان لە گوندەکە بنەبڕ کران.

زۆر باشە. ئەی باشە بۆچی ئەو بنیادەمانەی ئەوەندە لە مردنێ دەترسان، بە دڵێکی خۆشەوە بە پیر دوورخرانەوەوە نەدەچوون و دەیانویست شارەکە کاول بکەن؟...

شەوەکەی ئەو ڕۆژە وا بابی هەواڵەکەی بیستبۆوە، وەك بای شەماڵ و وەك گورگێکی برسیی ڕاوی نابێ، بە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا هەڵگەڕا و گورج خۆی گەیاندە ئەو جێیەی گەلێ جاران گەیشتبووە ئەوێ. لە سەر لێواری هەڵدێرەکە ڕاوەستا و دەستی کرد بە نەڕاندن و گوڕاندن. شوانە قوتەکانی ئاناوەرزا گورج گەیشتنێ و بە بێهۆشیی لە ڕەوەزەکان هێنایانەوە خوارێ و بردیانەوە ئاوەدانی. شوانەکان چونکە هەر جارێکی برایمان دێنایەوە، شاباش و دەسخۆشانەیەکیان لە دەروێش بەگ وەردەگرت، زۆربەی جاران بزنەکانیان لە نزیك هەڵدێرەکانەوە دەلەوەڕاند.

"کوڕە ڕاوەستە بزانم. ئاخۆ دەروێش بەگ لە کۆشکە؟ ئەوە هاتم... ئالاتەمیرم."

برایم کە چاوەکانی زەق زەق ببوونەوە، گوتی:"لە سەرێیە."

ئالاتەمیر! ئەو ناوەی زۆر بیستبوو، یانی ئەو کابرا پیس و پۆخڵەیە؟ ئاخۆ هەرە دەوڵەمەند و بەکاری چوکووراوا ئەو دێوەزمە خێچ و خوارەیە کە دەڵێی بنەتای دارە؟ هەر ئەو کەسەی کە بۆ سەد هەزار لیرە مردوو و زیندووی جافر یۆز پۆلادی نەهێشتبوو؟ یانی ئەو بنیادەمەی لە دنیایەدا هەر لەوە چێژ وەردەگرێ و ئەوە نەبێ هیچ لەزەتی لەم دنیایە وەرنەگرتووە و لەبەر لەچەری و ڕەزیلی لە نان و دۆ و بڕوێش بەولاوە هیچی دیکە ناخوا، ئەو هیچ و پووچەیە؟

برایم لە نەکاو دایە قاقای پێکەنین. ئالاتەمیر بە چاوە وردیلە و لێو و لچە شۆڕەکەی و دەموچاوە پڕ لە چرچ و لۆچەکەیەوە کە بەو حاڵەوە منداڵانەش دیار بوو و لە بنیادەمێکی دڵپڕ دەچوو کە دەتگوت ئێستا نا ئێستا دەگری، کافر بەزەیی پێیدا دەهات. ئالاتەمیر ئێستا بەو ڕوخساری منداڵانەو گریاناوییەوە کە لە هەمانکاتدا تووڕەش دیار بوو، سەیری برایمی دەکرد. ئالاتەمیر کە تووڕە دەبوو، ڕوخساری ڕەش هەڵدەگەڕا. ڕەنگی دێنا و دەبرد و گرژ و دڕندە دەبوو. ئێستاش ڕوخساری دوو حاڵەتی سەیری پێوە دیار بوو. جارێ منداڵانەی دەنواند و دەمێك دڕندەیی بەسەریدا زاڵ دەبوو. هیچ کام لەو دوو حاڵەتەش بەردەوام نەدەبوون. ئالاتەمیر دڕدۆنگ و بەگومان بوو و سەری لێ شێوابوو. بە هەڵداوان بەرەو ژوورەکەی وەڕێ کەوت. هیدایەت بەپیرییەوە هات و گوتی:"فەرموو، فەرموو، فەرموو ئاغا. بەخێر هاتی. بەگ لەسەرێیە."

جا بەرەو لای کۆشکەکە وەپێشی کەوت. هیدایەت زۆری پێ خۆش بوو کە ئالاتەمیر هاتبوو. چونکە ئالاتەمیر تەنیا بۆ شتێك سەردانی شوێنانی دەکرد. دیارە هەر بۆ ئەو شتەش هاتبووە ماڵەکەی دەروێش بەگ و ئەو شتەش زەوی و زارەکەی بوو... زەوی و زار لە دەروێش

بەگ دەکڕێ و چەندی پارەی ویست دەیداتێ. دەروێش بەگیش هەر ئەوەندەی پارەی بە دەستەوە بێ، تووشی هەرکەس بێ گیرفانی پڕ دەکا. پارەیەکی زۆریش بەوان دەدا. بەڵام ئەو راوێژکارە سەگبابە.... لە کوێ بوو؟ ئەگەر ئالاتەمیر لێرە ببینێ، هەر خۆی دەکوژێ. راوێژکارەکە پێی خۆش بوو بمرێ و بستە زەوییەك بە کەس نەفرۆشێ. چی لە دەستی دەهات دەیکرد بۆ ئەوەی نەهێڵێ پارچە زەوییەك بفرۆشرێ. ئەو دەردەی بە رۆستەم بەگ دا و وای لێ کرد نەك هەر روو لە کۆشك نەکاتەوە، بەڵکو هەر ناوێرێ بێتەوە ئەو گوندەش. دەی چ باشتر، باشتر کە بەو گوندەدا نایەتەوە.

گورج و گۆڵ پلیکانەکانی دووان دووان و سێ سێ بڕی و زوو گەڕایەوە:"فەرموون. بەگ لە دیوەخان چاوەڕێتە. لە پەنجەرەوە دیتووتی و ناسیوتییەوە. بە دیتنت کەیف خۆش دەبێ..."

ئالاتەمیر گەش گەش بۆوە و برایمیش کە هێشتا زایەڵەی پێکەنینەکەی لە دەرەوەڕا دەبیسترا، وەبیری هاتەوە و دەمودەست پێکەنینەکەی بڕایەوە و ئاسەوارەکەشی رەوییەوە و بەتووڕەییەکەوە لە دەنگیدا لە هیدایەتی پرسی:"ئەوە کێیە؟ ئەو منداڵە کەرە دەڵێم کە ئاوا حیلکەحیلك پێدەکەنێ؟ وەك دار چنار درێژ و بێ بەرە. خۆ لووتی بگری گیانی دەردەچێ..."

"ئەو کوڕەی پێدەکەنێ؟"

"بەڵێ، ئەو دەیلاغە. هەر دەڵێی گێلە."

هیدایەت بە لەبزێکی بلێی و نەڵێی ریایی و داوای لێبوردنی پێوە دیار بوو، گوتی:

"برایم بەگە، کوڕی بەگ..."

ئالاتەمیر لە سەر پلیکانەکان وشك بوو. شووی زۆر لێ کێشابوو و سووکایەتیی بە کوڕەکەی بەگ کردبوو.

سەیرێکی هیدایەتی کرد و ئاوڕێکی دایەوە و هەوڵی دا لە دەرگا کراوەکەوە دەرەوە ببینێ. هیدایەت هیچ دڵمەندبوونێکی بەروخسارییەوە دیار نەبوو و ئەوەش بڕێك هێنایەوە سەرخۆ.

"شتی وا نەڵێی؟ ئەوە برایم بەگ بوو؟ کوڕە گەورەکەی بەگ، ها؟ ماشەڵڵا و هەزار ماشەڵای خولای لێ بێ زۆر گەورە بوو. خوا بیپارێزێ. سەیر هەڵی داوە. بووەتە گەنجێکی ئازا، بێ چاوێنی بێ هەی. کوڕە جا چووزانم ئەوە هەوە. ماشەڵڵا، دەك خوا بیپارێزێ. خوا بیپارێزێ..."

لە پلیکانەکان سەر کەوت. دەروێش بەگ لە نێوەڕاستی دیوەخانێدا دەستی راستەی بە قەمچییەکەوە لە کەلەکەی نابوو و بەپێوە چاوەڕوانی بوو. ئالاتەمیر بە پەلەپەل خۆی گەیاندێ

و دەستی بەسەر سینگەوە نا و وا داهاتەوە و خۆی نوشتاندەوە، دەتگوت دەیەوێ خۆ بخاتە سەر پێڵاوەکانی. دەروێش بەگ گرتی و قیتی کردەوە و دەستی راستەی خستە نێو دەستی خۆی و گوتی:"دەی، بەخێر بێی ئالاتەمیر. دەنگ و باس؟ چاك لەبیرت کردین. تا دەوڵەمەندتر دەبی، پتر پشت لە دۆست و برادەرانت دەکەی."

بە دەنگێکی پوختە و بەلەبزێکی تۆزێك تەوساوییەوە قسەی دەکرد.

ئالاتەمیر بە گیان و دڵ چاوەڕوان بوو و بە ئەدەبەوە دەیگوت:

"خوا راوەستاوت بکا بەگ. راوەستاو بی، سەلامەت بی ئاغای من."

"دەی دانیشە برالە. کار و بار چۆن دەڕوات؟"

ئالاتەمیر دانیشت و لاقی کۆ کردنەوە و دەستەکانی لەسەر رانی دانان. قامکەکانی خواروخێچ و چرچ و لۆچاوی و ئەستوور بوون و کەمرەیان گرتبوو و نینۆکە زبرەکانی قەڵشیبوون. لە نێوقەد بەرەو سەرێی قیت و رەپ راگرت. چاوە زەقەکانی بڕییە وێنەی ئەو پیاوە مەزنەی لە بەرانبەرییەوە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو.

"ئاسوودە دانیشە بابەگیان. تەنگاو مەبە."

کە ئەو گوتی ئاسوودە دانیشە، ئالاتەمیر پتر خۆی کۆکردەوە و خۆی وێك هێنا و چاوەکانی بەبێ ترووکاندن لە وێنە گەورەکراوە بە دەست کێشراوەکەی بەرامبەری بڕی و قامکەکانی توندتر بە کەشکەژنۆی خۆیەوە نووساند و گوتی:"بەگم بێ مزەڕەت بێ. ئەمن ئاوا ئاسوودەترم."

"باااشە، ئاااشە. کەوابوو چۆنی حەزت لێیە وا دانیشە."

دەورێش بەگ بۆی دەرکەوتبوو هەرچییەکی بکا، ئالاتەمیر چۆنی دادەنیشت هەروا دادەنیشێ.

"ئەرێ ئالاتەمیر، بەینی خۆمان بێ. ئەتۆ زۆر دەوڵەمەند بووی. بیستوومە بۆ هەر کام لە کوڕەکانت ترۆمبێلێکت کڕیوە. دەڵێن کوڕە گەورەکەت چووە سەیارەی لە ئەلمانییەکان کڕیوە. ماشەڵڵا... ماشەڵڵا..."

"لە سێبەری بەگی خۆمدا. لە سێبەرتاندا... لە سایەی گەورەییتاندا... ئێمەش... بەگم سلامەت بێ، هەتا قیامەتێ... لە نانی شەوێمان و لە دەمی خۆمان دەگرینەوە و شتێك پاشەکەوت دەکەین..."

"کوڕە بوویەتە قاڕوون... دەڵێن ... هەر بە سێ مانگ جارێك سەد هەزار لیرەت دەدایە جافر ئۆز پۆلاد و لەبەر چاوی ژن و منداڵ و نۆکەرەکانی هەر لە بەیانییەوە تا ئێواری جنێوت بە دایك و خوشکی دەدا. جنێو بدە برالە. جنێو بدە تەمیر، گەردنت ئازاد بێ. هەر بۆ ئەوەی دەبێ... جنێو بدە براکەم. ئەو گەوادانە هەر شیاوی ئەوەن. جنێویان بدەیە. چی جنێو بەو ژن حیزانە بدەی، دیسان کەمت داونەتێ. جنێویان بدەیە براکەم، جنێویان بدەیە."

ئالاتەمیر بە نیشانەی پێخۆش بوون، فیکەی سمێڵانی دەهات و بزەیەکی هاتێ و وەك ئەوەی تەریق بووبێتەوە، سەری داخست و بە راوێژێکی کەیفخۆشانە بەو مانایەی سەرکەوتووم، دەتگوت دەیەوێ بڵێ، بڵێین چی ئێمە هەر ئەوەمان لەدەست دێ. گوتی:"دەمگۆیە بەگ، دەمگۆیە. باشە، دیارە تۆزێك لە رادەبەدەر پشووم لێ کێشا و..."

دەروێش بەگیش قاقایەکی کێشا و گوتی:"نا، نا، ئەمن لە یەکێکم بیستەوە کە بە گوێی خۆی گوێی لێ ببوو. جافرت باش کردبووە پەڕووە بەگوو. جنێو نەماوە پێت نەدابێ و ناو و نیتکە نەماوە لێت هەڵنەدابێ. ئەوەی شیاوی خۆی بووە پێت داوە."

جا دەستی هەڵێنا و گوتی:"ئەمن دەزانم. دەزانم. پێویست ناکا حاشای لێ بکەی. ئەو چوکووراوایە لە ئەنگۆی خەڵکی کوێستانێ چاوقایمتری تێدا دەست ناکەوێ. ئەوانە ، ژن و عەشیرەتیان بە سەد هەزار بگێی دەنگێ ناکەن.... بۆ سەد و پەنجا هەزار دایك و خوشکیشیانت دەدەنێ... بێنە سەد و پەنجا هەزار، بێنە دەی، بێنە و لە پێشدا ژنەکەی جافر و دوایی خوشکەکەی و دواتر ژن خوشکەکەی، دوایی، دوایی هەرچی ژنی لە عێل و عەشیرەتیان دا هەیە و ئەوەی بە حەوت پشت دەیگاتەوە... بێنە دەی، بێنە دەی ئالاتەمیر ئەوەندەی دێنێ... بێنە سەد و پەنجا هەزارەکە، بێنە دەی.. بنیادەم جارێك لە دایك دەبێ. ئەگەر جافر ئۆز پۆلاد بەشی نەکردی، ژن و خوشکەکانی ماهیر قاباقچیش هەن... ئەوان پارەیەکی زۆریان ناوێ... ئەوان هەر خۆیان هەرزانفرۆش دەکەن.... هەر یەکەی بە سێ هەزار... هەر ئەوەندەیە کەس پێ نەزانێ."

ئالاتەمیر بە بێ ئۆقرەییەوە و پەیتاپەیتا دەیگوت:"ئەستەغفیروڵڵا، ئەستەغفیروڵڵا..."

ئەو باش دەیزانی دەروێش بەگ لە هەموو جێیەك ئەو قسانە دەکا، هەر بۆیەش بێ ئۆقرەیی دەنواند:" ئەستەغفیروڵڵا، ئەستەغفیروڵڵا، ئەستەغفیروڵڵا، بەگ، دوور بێ یاخوا لە عێل و عەشیرەتەکان، کوڕە ئەو غەڵەتانە لە زاری ئێمە زیادین. ئەوان بەگە ماقووڵەکانی ئێمەن..."

"بێنە سێ هەزارەکە... سەیر کە، بە راستیمە، ئەوەندەی دێنێ ئالاتەمیر کوڕم. ئەتۆش ... ئەتۆش لەگەڵ ژنێکی دیکەی جیا لەو دێوەزمە سی جاران زاوە... کوڕە ماڵی دنیا وەك دنیا وایە، ئالاتەمیر ئەتۆش بەرخوێنەکەیان کە هەر ماڵی دنیایە... بێنە سێ هەزار، بێنە دەی."

"نا، نا، ئێمە لەوانە نین نان بخۆین و نان‌دێنێ بدڕین. ئەوان بەگی ئێمەن. تاجی سەرمانن. سەری ئێمە ناگاتە ئەو شوێنەی پێی ئەوانی دەگاتێ."

"ئەتۆ سێ هەزارم بدەیە پیاو. ماڵی دنیا وەك دنیا وایە. کفن گیرفانی نییە ئالاتەمیر. ئەوەندە ماڵپەرست مەبە ئالاتەمیر. ئەتۆش ئەم دنیایە لەکیس خۆت مەدە. ئەوان دین و ئیمانیان پارەیە. پارە خودای ئەوانە. ئەتۆش پارەت هەیە. بێنە سێ هەزارەکە... ژنەکانیشیان جوان و ناسك و نەشمیلن... دەڵێی هوڕەی لۆکەن... ئەمن دەزانم دەڵێم چی... ئەتۆ هەر جارێکی بەتاقی بکەوە..."

"نا بەگ، نا، نا."

ئالاتەمیر کە ئارەقەی شین و مۆری کردبوو، بەبێ ئەوەی دەستی لەسەر ئەژنۆی جوێ ببنەوە، سێ جار هەستا و دیسان هەروا یەك پشوو دەیگوت نا، نا، و دادەنیشتەوە.

دەروێش بە پێوە راوەستابوو و ئەوسەر ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد و یەك پشوو دەیگوت:"بێنە، بێنە. هەقی خۆتە. ئارەقەی نێوچاوانی خۆت و سۆمای چاو و بەرهەمی ماندوویی دەستەکانتە."

ئالاتەمیر گوێی لەهیچی دیکە نەدەبوو و گوێچکەکانی دەزرینگانەوە.

دەروێش بە دەم پیاسەکردنەوە گوڕاندی و ئالاتەمیری راچڵەکاند:"کوڕینە، کوڕینە... کێ لەوێیە؟ کێ؟ خۆشەویستترین پیاوی ئەو چوکووراوایە هاتووەتە ماڵی من و ئەنگۆش کووپێك قاوەتان بۆ نەهێناوە. خۆشەویسترین و ئازاترین... سەد هەزار لیرە و جنێوێك ژنـ... خێرا قاوەیەك..."

تەوس و توانجێك لە دەنگەکەیدا هەبوو:"قاوەیەك بێنە خێرا. خێرا. هیدایەت."

"فەموور بەگ."

"زوو برۆ خوارێ و مەڕێك سەربڕە... خۆشەویستترین و هێژاترین پیاوی دنیا هاتۆ و ماڵەکەمی رازاندووەتەوە. چما نابێ وەك خۆی میوانداریی لێ بکەین؟ کوڕە بەختەوەری و شانازیی ئاوا بۆ هەموو کەس هەڵناکەوێ. دەی یاڵڵا دەی زوو بە."

چەندی پتر دەهات و دەچوو، خێراتر دەبوو و لەگەڵ خێراتربوونەکەشی پتر هەڵدەچوو و تووڕەتر دەبوو. ئالاتەمیر هەستی دەکرد، کە تۆفانێك خەریکە نزیك دەبێتەوە و نەیدەزانی چ بکا. لە کۆنێك دەگەڕا خۆی تێ پەستێوێ. زۆر پەشیمان ببۆوە لەوەی هاتبوو و لە دڵەخۆیدا تووك و لەعنەتی لەو کەسانە دەکرد بەڕێی ئەوێیان کردبوو و چی جنێوی پیس بوو پێی دەدان...

لەو جەنگەیەدا راوێژکارەکە گەیشتێ و چاوێکی پڕ لە پرسیاری لە دەروێش بەگ کرد.

دەروێش بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:"چیت دەویست راوێژکار؟"

"سەری بەگم سلامەت بێ."

جا لە حاڵێکدا گەردەنە پڕ لە چرچ و لۆچەکەی وەك ملی قاز درێژ دەکردەوە و سێبەرێك دەکەوتە سەر چاوە کاڵەکانی، گوتی:"گوتم نەکا بەگ کارێکی پێم بێ. شتێکم بیست و هاتم."

"دانیشە. کارێکم پێت نەبوو. وەرە لێرە دانیشە."

جا ئاماژەی بە ئالاتەمیر کرد:"ئەتۆ ئەو پیاوە هێژایە، ئەو پیاوە زۆر خۆشەویستە دەناسی؟ ماڵی ساری ئۆغلی لەوەتەی هەیە لەو پیاوەی خۆشەویستتر لێ میوان نەبووە... بەڵێ ێ ێ ماڵی ساری ئۆغلی..."

نزمتر گوتی:"بنیادەمی زۆر مەزن و بەڕێزی هاتوونێ. سەردەمانێك کە هێشتا لە نێوان دیجلە و فوراتدا کۆچەری و رەشماڵنشین بووین، واتە لە دەشتەکەی خوار "رەسولعەین"ی ئێستا، گەرمێن و کوێستانمان دەکرد، سوڵتان موراد لە سەرفەرەکەیدا بۆ بەغدا کە هوردووەکی دووسەد هەزار کەسیی لەگەڵ بووە، دەبیستێتەوە کە لێرە هۆبە و هەوارێکی تورکمانی هەن و هێندەی عێلێك گەورەیە و بەگەکەشی خێوەتێکی هەیە کە لە خۆراسانەوە هێناویێتی. خێوەتێك بە چواردە قوبەی هەر یەکەی هێندەی کۆشکێك و بە ئەستوندەکی شین و مۆر و سەدەق و مەرجان و گەوهەر نیشانەوە. بەڕە و مافوورەی خۆراسانی و لبادی بوخارایی و فەڕشی ئێرانییشی تێدا راخستووە... نە لە هیندستان و نە لە یەمەن و نە لە فەڕەنگستان و نە لە سارای (بیابانی) عەرەبستانێش کۆشکێك نییە شان لە شانی ئەو خێوەتە بدات."

ئالاتەمیر بە زاری داچەقیوەوە، چاوە زەقەکانی لە بەگ بڕیبوو و بە گیان و دڵ گوێی دابووە قسەکانی و دەستەکانی بە کەشکەژنۆیەوە ئارەقەیان کردبوو.

"سوڵتان موراد بانگ دەکا، حەیفە، هاوڕێیان، حەیفە بێرەدا تێپەڕین و سەرێك لەو خێوەتە هەڵنەهێنین. باپیرەی ئێمە بەگی "قایی"یش بە وەها خێوەتێکەوە لە خارەزمەوە

هاتبوو... با بچین و خێوەتی باپیرانمان ببینین و بیرەوەریی ئەوێ رۆژانی خۆش دیسان و بەر لەوەی بەغدای گەورە لە یاغییەکان بستێنینەوە، زیندوو بکەینەوە. سەری ئەسپی خۆتان وەرگێڕن و بەرەو کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی... دێنە کۆشکێ. بیابان گەرم ببوو و رەشماڵ و هۆبە لەسەر کۆچ دەبن. پادشا ئارەقە دەکا. سەرۆك و سەرلەشکر و وەزیرەکان ئارەقە دەکەن. پادشا لە خێوەتێ وەژوور دەکەوێ و پێی وادەبێ چووەتە بەهەشتەوە... بەهەشتی بەرین... پادشا سەری لە جوانیی خێوەتەکە سوور دەمێنێ. هەر ژوورەی رەنگ و جوانکاریی تایبەت بەخۆی و بە شێوەیەکی جوێ و هەموو فێنك و دڵگر. ژوورێك پڕ لە پێستە ئاسك بوو. پێستی دەگمەنی بزنەکێویی خۆڵەمێشی، نێرییە کێوی، ئاسکی سپی، مامزی موو سوور... لە ژوورە گەورەکەی میوانان کەوڵە پڵینگێکی زێڕکفتیان لەبەر پێی پادشا راخستبوو. پادشایەك بەو شان و شکۆیەوە، خۆی پێ نەگیرابوو و دەستی بردبوو لۆی کەوڵەکەی هەڵگێڕابۆوە..."

ئەوجار خێرا وەرسووڕایەوە و گوتی:"ئەتۆ بڵێ ئالاتەمیر."

ئالاتەمیر دەست و پێی کۆ کردنەوە و بە پتەپت گوتی:"یانی ئەمن ئەو کەوڵەم پێ جوانە، بەگ."

"بەڵێ یێ یێ یانی بە دڵمە. قاوەکەی دەخواتەوە و نانەکەی دەخوات و کاتێ دەیەوێ هەستێ و بڕوا حاجی قوتولمووشی باپیرمان دەڵێ، پادشا ئەمشەو لێرە میوانی من دەبی. هۆردووەکەشت... پادشا پێی سەیر دەبێ کە بەگی عێلێك چۆن دەتوانێ هۆردوویەکی دووسەد هەزار کەسی نان بدات؟ پێی خۆش دەبێ بزانێ بۆیە دەڵێ زۆر باشە، دەمێنمەوە. ئەو شەوە میوانداریيەکی وا لە هۆردووەکەی دەکرێ، کە لەسەر سفرەکەیان تەنیا شیری مریشکی لێ نەبووە...

دووەم ئەوەی کە پادشا، حاجی قوتولموشی باپیرمان بانگ دەکا و دەڵێ هەرچیت لەمن دەوێ داوای بکە. دەڵێ ئەگەر دەتەوێ دەتکەمە بەگلەربەگی ئەنەدۆل. حاجی قوتولموشی باپیرمان سەری کڕنۆشی بۆ دادەنوێنێ و دەڵێ ئەمن هەر سلامەتی و راوەستاویی پادشام دەوێ و هیوام وایە هەموو دنیای لە بن رکێفدا بێ. سوڵتان مورادیش ئەموستیلەکەی قامکی خۆی دەردێنێ و بە دەستی خۆی دەیکاتە پەنجەی حاجی قوتولموشی باپیرەمان و دواییش پێی دەڵێ حاجی قوتولموش هەقتە داوای هیچ ناکەی و هیچ وەرناگری. ئەمن کە پادشای ئەو مەملەکەتە پان و بەرینەی عوسمانلیم، هێندەی تۆم دەست نارِوا."

دەروێش بەگ لە نەکاو گوێی لە دەنگی کلپەی گریانێك بوو. ئالاتەمیر دەموچاوی خستبووە نێو لەپی دەستەکانییەوە ودەگریا... دەروێش بەگ دەسبەجێ لێی چووە پێشێ.. بە نیگەرانییەوە لێی پرسی چ بووە؟ بۆ دەگریی برالە؟ چیت بەسەر هاتووە؟"

"هیچ هیچم نییی ــــە بەگ. ئەتۆ بفەرموو، بفەرموو دەی بفەرموو... کە... کە... لەکوێوە هاتووینەتە کوێ؟"

"لەوێوە هاتووینەتە ئێرە ئالاتەمیر."

دەسبەجێ سەری هەڵێنا و قیت بۆوە. قسەکانی کاریان لە دڵی خۆیشی کردبوو:"ئەدی راوێژکار، ساری ئۆغڵی ئەگەر سوڵتان موورادیشی حیساب بکەین، تا ئێستا میوانێکی وەك "ئالاتەمیر"ی نەبووە. ئەوە ئالاتەمیرە... سەد هەزار لیرەی داوە... وەك ئەو ئالاتەمیرە..."

ئالاتەمیر فرمێسکی چاوەکانی سڕینەوە و جارێ زەردەیەکی لە روخساری دەزا و دوای ئەوە دەسبەجێ قەڵافەتێکی خەمباری بەخۆوە دەگرت. رواڵەتی هەر جارە و رەنگێکی دەگۆڕی. نەیدەزانی ئاخۆ دەروێش گاڵتەی پێ دەکات و بەکەری دەزانێ یان بەراستییەتی. دەنگی دەروێش بەگیش یەك هەوا نەبوو. جاری وابوو تەوس و پلاری پێوە بوو و جاری واش بوو لەبزێکی شیرین و خۆمانەی هەبوو.

دەروێش هەتا نیوەڕۆیە هەروا قسەی کرد و لێی نەبڕییەوە. راوێژکار سێ جاران چووە دەرێ و هاتەوە ژوورێ. کە دەروێش بەگ لە تەنیشت ئالاتەمیرەوە دادەنیشت، ئەو وەدەر دەکەوت.

دەروێش بەگ سووك ببوو و بە پێکەنین و کەیفخۆشییەوە دەستی لەسەر شانی ئالاتەمیر دانا و گوتی:"دەی ی ی، ئەتۆ لە خۆڕا سەردانی هیچ کوێ ناکەی ئالاتەمیر. دا بڵێ بزانم چۆنە هاتووی؟"

"راست دەفەرمووی بەگ. راستە. چاوی کوێر و دەستی شکاوم بەگ. یاخوا لە چاوان کۆرە بین. رێی ئەو ماڵەمان لە بیر چۆوە و هەزا بەڵا بەربینگی گرتین. چما بنیادەم دەرگای ئاوا لە بیر دەکا؟ وەی خۆزگە هەردوو چاوەکانم کوێر بووبایەن بەگ..."

"کوڕە جا ئەو چاوەانەی تۆ حەیف نین؟ دوژمنت کوێر بێ."

ئالاتەمیر دیسان وەك منداڵێك بگری، ئاوا لیچی خۆ هەڵقرچاند. دیسان نەیزانیبوو ئاخۆ بەگ بەراستێتی یان هەر گاڵتەی پێ دەکا.

"بەگی خۆم، لەم دنیایەدا هەر لە مار و مێرووەوە بگرە هەتا مەخلووقاتی عەرز و ئاسمانێ، هەر هەموویان لە خوانی گەورەیی و نیعمەتی خوای دەخۆن. بەڵام ئێمە تا ئێستاش

هەر بێ بەش ماوینەوە. لە حاڵێکدا بەگەکانی ساری ئۆغلّی، بەگەکانی ئێمە بە خەڵکی کوێستانێش لەقەڵەم دەدرێن. کوڕە باڵندە بە باڵ دەفڕێ. ئاواتەخواز بووم دە برای باشم هەبوایە، جا ئەو کات دەمزانی کێ دەوێرێ بەگەکان دەربکا و دووریان بخاتەوە... هەڵۆ پیر دەبێ، بەڵام نێچیری خۆی نادۆڕێنێ. لەوەتەی بووە هەر وابووە، بێچووە شێر نابێتە رێوی. چیاکانی ئێمە ساڵ دەری دوازدەی مانگێ بۆن و بەرامەی پنگەی کێوییان لێوە دێ. جگە لەوە چیاکانی ئێمە نەعنە و جاترەشیان لێ دەڕوێ و گوڵە زەردە لەوێ خێوەتی هەڵداوە.

ئەمن کاتێ منداڵ بووم، بۆ باپیرەت ـ هەر ئەوەی سواری ئەسپەکەی بوو و ئەو سەری بردی نەیهێنایەوە ــ پنگە کێویم کۆ دەکردەوە... هەمووان وادەزانن ئەوەی هەمە هەمووی پارەی دایکی منداڵەکانە، بەڵام هەرچی هەمە لە سایەی سەری باپیرەی تۆوەیە یارەبی گۆڕەکەی پڕ بێ لە نوور. بۆ هەر چەپکە پنگەیەکی بۆم دەبرد و لوێچی دراوی دەدامێ. لەوەتەی دنیا دنیایە پیاوی وەك باپیرەت گەورە و خانەدانی بەخۆوە نەدیتووە بەگ. ئەو ملی بۆ مەرگ کەچ نەکرد بەگ. بۆ ئەوەی بنیادەمەکان مردنی ئەو نەبینن و کەس سەیری تەرمی مردووی نەکا، سەری خۆی هەڵگرت و وەك هەڵۆی بەرزەفڕ لەو چیایانەدا کە بنیادەم نەگەیشتبووە بنار و داوێنیان، ون بوو. ئەو کەسێك بوو کە لەگەڵ مەرگدا ملەی کرد و نەبەزی."

چاوەکانی دیسان پڕ بوونەوە لە فرمێسك و دەنگی لەرزی.

"ئەمنیش هەرچی دراوی ئەو پێی دام پاشکەوتم دەکرد. ئەگەر ئەوەی بەگەکەمان دەیدامێ نەمکردبایە بناغەی ماڵی خۆم، ئەوەندە پارەیەم دەبوو؟ چما خوای گەورەم دەیگوت پێشکەوە بەندەی خۆم ئالاتەمیر؟ ئەگەر بەرەکەتی ئەو پارەیە نەدەبوو، نەیدەگوت، نەیدەگوت بەگی گەورەم..."

دەنگە شڵەژاوەکەی ئالاتەمیر جار بە جارێ بەرزتر دەبۆوە و لەرز و قرخەکەی نەدەما. جار و بارەش بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ دەستی لەسەر ئەژنۆی دەترازان، بەڵام دەسبەجێ دەیزانی و دایدەنانەوە و خۆی کۆ دەکردەوە و قیت و رەپ دادەنیشتەوە.

"رۆیشتنی مێروولە لەسەر عەرز و فڕینی باڵندە بە ئاسمانەوە لە سایەی تۆوەیە. بە سەری ئەو کەسەی رۆیشت و لەو چیایانەی پێی بنیادەمیان نەگەیشتبووە بنار و داوێنی، ون بوو... بەسەری ئەو کەسەی لەبەر مەرگ نەبەزی... و لەو نێوەدا هەر من، ئالاتەمیری نۆکەرت لە چوکووراوا هەر منم لە گەورەیی و بەخشندەییتان بێبەش ماوم... سوێند بەو کەسەی گاڵتەی بە مەرگ کرد و رووی کردە ئەو چیایانەی کە پێی بنیادەمیان نەگەیشتبوویە و سێبەری هەڵۆی

بەرزە فڕ نەبێ پێی هیچ گیانلەبەرێکیان وێنەکەوتبوو، و لەوێ ون بوو. ئەوەی سواری ئەسپێکی کوێت و ڕەسەن دەبوو و ئەسپەکەی وەك بای شەماڵ دەفڕی... لە حاڵێکدا کەس نەماوە لە سایەی گەورەییتدا شتێکی پێ نەبڕابێ، و ئەمنی نۆکەرییشتان هەرچی هەمە لەسایەی سەری ئەو بنەماڵەیەوە هەمە، بۆچی دەستی موبارەك و متفەڕکی خۆتت لێ دوور خستوومەوە و پشتت بەرداوم؟ یانی ئەمن بۆوەی نابم سەودایەکی ئاوام لەگەڵ بکەی؟ هەر نەبێ ئەمنیش یەکێکم لە سێ هۆزەکە. ڕەچەڵەکی منیش دەچێتەوە سەر نۆ هۆزەکە."

بەپەلە هەستا و دیسان دانیشتەوە. چاوەکانی لە کاسەی چاویدا کەوتنە خولانەوە:"منیش، ئەمنیش شانازی دەکەم بەوەوە کە گیان و ماڵی خۆم لە پێناوی نۆ هۆزەکەدا فیدا بکەم. ئەو نۆ هۆزەی وا... دایانە چیا و لێی سواری ئەسپ کوێتی خۆشبەز بوون و چوونە شەڕی مەرگ..."

دەروێش بەگ لەبەری پێیەوە هەتا تۆقی سەری لێی ورد دەبۆوە و ورد ورد زەینی دەدایە هەموو جووڵە و هەڵسوکەوت و گۆڕانی لەبز و قەڵافەتی. بەگ لە ژیانی ئاوا لە کەس ورد نەببووەوە.

"یانی لەو دنیایەدا کەس نییە نەزانێ ئەمن ئەو دوو دراوە سووتاوەم چۆن کۆ کردووەتەوە بەگ."

ئەوجار دەنگی گریاناوی دیار بوو. وای قسە دەکرد دەتگوت شین دەگێڕێ:"خەوم لێ نەکەوت. گوێم بە باران و قوڕ و چڵپاو و با و بۆران نەبزووت و بەبێ حەسانەوە یەك پشوو و بێوچان کارم کرد و ئەو چەند فلسەم خستە سەر یەك. ساڵ دەری دوازدەی مانگ نانی ڕەق و دۆی ترشم خوارد. تەنانەت ڕۆژی وابوو نانە ڕەقە و دۆ ترشەکەشم لە دەمی خۆم دەگێڕایەوە. ئەدی، ئەی بەگی جوانچاکی چاو بەڕوو، بەگە قامك قەڵەمییەکەم، بەو حاڵەشەوە هیچ شك نابەم. دەستم بگرە بەگ. ئەمن مەلێکی بچووکم کە پەنام هێناوەتە بەر دەوەنێك. پەنام بدە. داڵدەم بدە. ئەوە لە شان و شکۆی بەگایەتی دەوەشێتەوە. بە ئاواتەوەم..."

تفی زاری قووت دایەوە و نەیتوانی لەسەر قسەکەی بڕوات.

دەروێش بەگ خۆی پێ نەگیرا:"چیت دەوێ ئالاتەمیر؟ ئاواتەکەت چییە؟"

"ئاواتەکەم ئەوەیە کە بەگی خۆم، مەزراکەی قۆرت قولاغی بە هەر نرخێکی دەفەرمووی بە نۆکەری خۆتی بسپێری. گەورەیی و بەخشندەییت لە من زیاتر کەسی بێبەش نەکردووە و

هەمووانی گرتووەتەوە. ئەتۆ مەزراکەی قۆرت قولاغی هەر دەفرۆشی، دەی چ لەوەی باشتر بە نۆکەری خۆتی بفرۆشی. ئەمن مەزرای قۆرت بولاغیم لە تۆ دەوێ بەگم."

دەروێش بەگ وەك برێشکەی سەر سێڵێ هەڵبەزییەوە و دەنگە پڕ لە تووڕەییەکەی وەك بۆمب تەقییەوە:"کوڕە هەی گەوادی سپڵەی بێ شەرەف. تووتکە سەگی بێ دایك و باب. ئەتۆ چۆن بۆنت بەسەردا هاتووە و لەکوێوە زانیوتە ئەمن دەمەوێ قۆرت بولاغی بفرۆشم؟ لەکوێ زانیوتە دەروێش بەگ حەوجێی بە پارەیە؟ کوڕە هەی قالاوی کەلاك خۆرینە... جافر ئۆز پۆلاد، ئەو سەگە بەرەڵڵایە، حاجی قۆرت بۆغای چەپەڵی گەماری هیچ و پووچی پیاوکوژ، ئەو سلێمانە..."

پەلاماری دا و شەقێکی لە رانی هەڵ دا و وای بەسەردا گوڕاند، لە دوور دوورەوە گوێیان لە دەنگی بوو:"هەستە، هەستە لەپێش چاوم ون بە. ئەتۆ یەکەم سەگێکی کە لەو ماڵە دەرت دەکەم. ئەتۆ سەگێکی لە جلوبەرگی بنیادەمدا. یەکەم دەرکراوی لە ماڵەکەی ساری ئۆغلی..."

ئالاتەمیر لە جێی خۆی نەجوولا و دەستەکانی پتر بە ئەژنۆیەوە گوشین و قیت و قنجتر دانیشت. چاوەکانی لە چاوی مەڕێکی سەربڕاو دەچوون. وەك شووشە و بێ جووڵە.

"گوتم هەستە و ملت بشکێنە. هیچ و پووچی بێ شەرەف. یاڵڵا دەی هەستە با چاوم بەو قەلافەتە شوومەت نەکەوێ. گوتم لە پێش چاوم ون بە و لەوە پتر خوێنم پیس مەکە... هەستە لە پێش چاوم ون بە..."

خێرا و بەهەشتاو بە نێو دیوەخانێدا ئەمسەر ئەوسەری دەکرد و هەر لە ئالاتەمیر نزیك دەبۆوە، شەقێك یان نووکە شەقێکی تێ هەڵدەدا و ئالاتەمیر دەست و پێی خڕ دەکردنەوە و قیتتر دادەنیشت و ئەوەندەی خۆ وێك دێنا و خۆی دەگوشی، ماسوولکەکانی ژانیان دەکرد، بەلام لە جێی خۆی هەڵنەدەستا.

ئاخرییەکەی، کە دوایین شەقی تێهەڵدرا، بەنیگایەکی پڕ لە تکاوە وەقسە هات:"بەگ، بەگ، لێرە بمکوژە.. بشمکووژی خوێنەکەم هەر بەرەو لای خۆت دەگەڕێتەوە. ئەگەر دەرم بکەی، پاش ئەوە ئیتر چۆن لە لای ژن و منداڵەکەم سەرم هەڵبێ؟"

دەروێش بەگ هات و بەسەر سەرییەوە راوەستا و ماوەیەك لە ژوور سەرییەوە چاوی تێوە بڕی و ئاخری دیسانەکەش نەڕاندی:"تف لەو روویەت کوڕە هەی ناپیاوی چەپەڵ. هەی بێ رەگ، کە لە زگی دایکتدا بەر تووکی خوای کەوتووی." جا تفێکی لە نێو چاوانی کرد.

ئالاتەمیر بە پاڕانەوەوە گوتی:"بمکوژە. بمکوژە، بەگ. هەرچی گوتت قەبووڵمە. هەر لێرەم دەر مەکە. خەڵك چیی باش نالێن. دەڵێن چووەتە ماڵی بەگەکەی و بەگەکەی خۆی لە ماڵێ وەدەری ناوە. هەر لێرە لە کۆشکە مەزن و هەیوان بەرزەکەتدا بمکوژە. بمکوژە با خوێنەکەم بگەڕێتەوە لات..."

دەروێش تێ مابوو. دیسان بەدەم بۆڵەبۆڵەوە کەوتەوە پیاسەکردن بە ژوورەکەدا. چەندی دەهات و دەچوو، تووڕەتر دەبوو و تا تووڕەتریش دەبوو، پتر هەستی بە داماوبوونی خۆی دەکرد. ئەو بێ چاو و رووە لێرە ناڕوا. لە کۆڵمان نابێتەوە. نەیدەتوانی دەست بۆ دەمانچەکەشی بەرێ و وەك سەگ بیتۆپێنێ... بیری لەوە کردەوە ئەمر بکا بێن ئەو بوونەوەرە چەپەڵ و پیسە فڕێ بدەنە دەرەوە. لەوانەش بوو وا بکا. رێك لەو کاتەدا دەنگی برایم وەخۆی هێنایەوە. برایم لە حاڵێکدا دەستەکانی لێك دەخشاندن پەیتا پەیتا دەیگوت:"بابە، بابە، بابە..."

خەم و پاڕانەوەیەك لە دەنگیدا هەبوو. ئەو حاڵ و لەبزەی برایم زۆر کاری تێدەکرد. بیستنی دەنگی خەفەتباری کوڕەکەی، هەموو شتێکی و ئالاتەمیریشی لە بیر بردەوە و نەرمی کردەوە.

"بابە، بابە، بابە، بڕوانە ئەو کابرایە چەندە سەیر دانیشتووە. سەیر کە، سەیر کە، سەیر بکە چۆن دانیشتووە، بابە سەیری..."

دەنگە خەمبارەکە دەسبەجێ بوو بە پێکەنینی شاد و خۆش. ئالاتەمیر وای دەنواند کە پێدەکەنێ. دەروێش بەگیش بە پێکەنینێکی سادەوە لەگەڵی پێدەکەنی. ئەویش دەستەکانی لەسەر رانی دانابوون و هێندە پێکەنین بوون چی نەمابوو ببوورێنەوەز ئالاتەمیریش وەك ئەوان قاقای کێشا. دەنگی قاقای هەرسێکیان تێکەڵ ببوون. لەو نێوەدا راوێژکارەکەش هاتە ژوورەوە و ئەویش بلێی و نەلێی کەوتە پێکەنین. دەروێش ئێستا باشتر بیری دەکردەوە. ئەو ئالاتەمیرە شێتێکی بەتەواو مانایە. شێتی پارە. شێتە. ئەو چی گوتبوو، کە ئاوا دڵی هێشابوو و دەیویست لە ماڵەکەی خۆی دەری بکا؟ پارەپەرست هەر هەموویان ئاوا شێتن. هەموو پێودانگەکانیان ئەوەیە، کە چۆن بە پێنج بکڕنەوە و بە دە بیفرۆشنەوە؟

"دەك خودا کوێرت بکا هەی تەمیر، کوڕە بەخوا تەڕت لەدین دەهری کردم. خودا بە قوربانی ئەو برایمەت بکا شێتە. ئەگینا دەمدای لەو کۆشکەوە وات هەڵدێرنە دەرەوە، ئێسقانت ورد و پرد بن. هەی خودا لەسەر ئەو عەرزە پاکت بکاتەوە."

ئالاتەمیر قایل و لێوبەپێکەنین و بەبێ ئەوەی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆی لابەرێ، وەك مەیموونێك لەجێی خۆی هەستا:"بەگم سلامەت بێ. چما گۆشت لە ئێسقان جوێ دەبێتەوە؟ ئەگەر بیستیشت بڕوا مەکە. برایم بەگیش خوا بیپارێزێ و عەمری درێژ بێ. خێر و خۆشی لە گەنجێتییەکەی ببینێ. تەمەنی درێژ بێ ئیشەلا. ببێتە داری بەری بەگ. مەملەکەتی عوسمانی گەنجی ئاوا بەشان و باهۆی نەبووە. ئاغام. یاخوا بێ چاوێنی بێ. وایە کاکە گیا لە سەر پنجی خۆی شین دەبێ، یاخوا چەم قەت بێ ئاو نەبێ...."

دیسان دانیشتەوە. ددانە سپییەکانی بریقەیان دەهات و لەبەر پێکەنین و هەڵسوکەوتی جوان، شاگەشکە ببوو و بۆنی دڵبزوێنی گۆشتەکەی، کە لە خوارەوە دەهات هەڵدەمشت و زاری ئاوی دەکرد.

"بابە، بابە."

دەروێش بەگ بە ڕوویەکی گەش و پڕ لە پێکەنین رووی تێ کرد و دەستی لەسەر شانی دانا و وتی:"چییە برایم. بڵێ رۆڵە گیان چییە."

"بابە، قۆرت قۆلاغی بدە بەو کابرا سەیر و سەمەرەیە. هەر دەڵێی حاجی یاتمازە * وەك دار..."

دەروێشیش دووبارەی کردەوە:"وەك دار."

پێکەنی. پێکەنینەکەی لە نەکاو رەوییەوە و سێبەرێکی رەش جێی گرتەوە. ئاخێکی لە ناخەوە هەڵکێشا، کە ئالاتەمیر ئاگای لێ بوو.

"بەداخەوە، بەداخەوە ناچارم بڕێکی دیکە لە زەوی و زارەکەم بفرۆشم. داخێك و سەد مخابنێ. هەر بستۆکەیەکی ئەو زەوییە بابی خوێنی هەزار سەگی ئاوایە. سەد هەزار سەگی وەك رۆستەم ئۆغلی..."

راوێژکار:"ئەوە پێم نەگوتی پەشیمان دەبیتەوە بەگ؟ چما نەمگوت بە رۆستەم بەگی مەفرۆشە؟"

دەروێش بەگ مۆڕەیەکی لە راوێژکارەکەی کرد. کاتێ ئاوای سەیر دەکرد، راوێژکار دەسبەجێ هەڵدەستا و دەچووە دەرێ.

"مەیدە بە رۆستەم ئۆغلی. بیدە بەو پیاوە باشە. سەیری بکە چۆن دانیشتووە. سەیری بکە بابە، سەیری بکە چۆن چۆن دانیشتووە."

* داوەڵێکە بنی پڕ دەکەن لە قورقوشم هەر بۆیەش بەردەوام قیت رادەوەستێ و لار نابێتەوە.

ئالاتەمیر کە ئەوەی بیست، قیتتر دانیشت و دەستەکانی توندتر لەسەر ئەژنۆی داگرتن. قامکە لێککراوەکانی پێکەوە نووساند و ملی درێژتر کردەوە.

پێکەنینێکی شادی دیسان روخساری دەروێش بەگی گەشاندەوە و بە پێکەنینەوە گوتی:"دەی باشە. دەیدەمێ."

لە ئالاتەمیر چووە پێشێ و ئالاتەمیر دەسبەجێ لە جێی خۆی هەستا و دەستەو نەزەر رووبەڕووی راوەستا.

"خودا بەنۆکەری برایمت بکا تەمیر. ئەوە "قۆرت بۆلاغی"م پێ دای. قۆرت بۆلاغی وەك خەنجەرێك وایە لە زگی ئاقچاساز رۆچووبێ. وا نییە؟"

"خودا بەگ بپارێزێ."

"ئەو مەزرایەت هەبێ، لانیکەم پێنج هەزار دۆنمی دیکەت وەدەست دەکەوێ.."

ئالاتەمیر قیتتر راوەستا. قیت قیت وەك خەدەنگ.

"جافریش شتێکی لەو سەودایە پێ دەبڕدرێ."

"پێی نابڕێ بەگم."

"دەزانم هیچت بۆ ئەوان لێ هەڵناوەرێ."

"لێم هەڵناوەرێ بەگم.

"دەزانم، دەزانم، لە جێی خۆت دانیشەوە."

ئەژنۆکانی ئالاتەمیر نووشتانەوە و لەسەر مۆبلەکەی دانیشتەوە. برایم دیسان دایەوە قاقای پێکەنین. ئەوجار ئالاتەمیر خۆی تێکەڵ پێکەنینە بەتوێکڵەکان کرد.

لەو کاتەدا هیدایەت لەگەڵ کچۆڵەیەك سفرەکەی دەڕازاندەوە.

"فەرموونە سەر سفرەکە."

ئالاتەمیر لە خۆشیی ئەو دان بەخۆداگرتنە شاگەشکە ببوو. ئەگەر ئەو نانی نیوەڕۆیەی دەخوارد و سواری مێرسدێس بێنزەکەی دەبوو و وەك بای شەماڵێ دەفڕی و ئەو خەبەرە سەیر و سەمەرەیەی بە هەموو دنیایە وەردەکرد..."

ئالاتەمیر ئاگای لێ نەبوو چۆن چوونە سەر سفرەکە و چۆن لە سەر سفرەکە هەستانەوە و چییان گوت و چییان خوارد. هەر ئەوەندەی وەبیر هاتەوە، کە بە دڵێکی زۆر خۆشەوە سواری سەیارەکەی ببوو و بە شۆفیرەکەی گوتبوو:"هەڵێ بکە با بڕۆین کوڕم."

# ٤٣

هەواکەی خەست و شێدار بوو. سروەی بایەکی نەدەهات. هەڵمێکی گەرم و خنکێنەر بە داوێنی دەشتەکەوە نیشتبوو. ئاسۆ لە پێشدا ڕەش ڕەش هەڵگەڕا و وردە وردە ڕوون بۆوە و مۆر هەڵگەڕا و ئاخرییەکەشی پەمەیی داگەڕا. بای فێنك و بلاوێنی بەیانی تاوێك هەڵیکرد و کەوت. هەڵمی نیشتووی سەر دەشتەکە جمی. تاوێك دواتر تاو هەڵدێ و دەشتەکەی لە گەرمایەکی سووتێنەردا نوقم دەکا. باڵندە و تەنانەت مێشیش ئیدی ناتوانن باڵ ببزێون و مێشەنگوینیش لە پوورە هەنگ نایەنە دەرەوە. دەشتەکە جووڵەی تێدا نەمابوو و گەڵایەکیش چییە نەدەبزووت. دەنگی باڵندەیەك، بۆقێك و سیسرەیەکیش نەدەبیسرا. هەڵمی خەست، گژ و گیا و دار گوێزە تۆزاوییەکان و ئاوە ڕاوەستاو و تۆز لەسەر نیشتووەکان... گیانلەبەرێك پەردەی تۆزی سەر ئاوە قورسەکەی زۆنگاوەکەی بڕی و بە نێو پووش و پەڵاشەکاندا توند و خێرا دەخزی و لە لایەکەوە بەرەو لایەك دەخوشی و لە مەودای نێوان ڕەگی دوو داری بیدا لە هات و چۆدا بوو.

هەورەکانی سەر ئالاداغ، کەوتبوونە جمووجۆڵ و گەواڵ گەواڵ دەبوون و لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دیکە دەچوون. چیای دولدوڵ لە نێو گەواڵە هەورە چڕەکەدا قەتیس مابوو. هەورە ڕەشەکان ئەوەندەی یەك و دوو ئاسۆشیان داپۆشی. دوای ئەوە هەورەکان لە چوار لاوە هاتنە سەر دەشتەکە. هەورەکان دەهاتن و لەسەر یەك کەڵەکە دەبوون. ئاسمان لە دوورەوە گرماندی. بریسکەیەك لە لای ئالاداغەوە لێی دا و هەتا سەر دەریای ناوەڕاست ڕۆیشت و نەدیو بوو. دەتگوت بە خاکدا ڕۆچوو... بایەکی سارد و بەتەزوو لە لای باکوورەوە هەڵیکرد... بایەکان دواتر گەرم و شەپۆل شەپۆل و لە هەر چوار لاوە هەڵیانکرد. تەپوتۆز و خۆڵ و خاك، هەورەکان، گەڵا و گژ و گیا و پووش و پەڵاش تێك وەردران. لە نەکاو، بارانێکی سەر بەکلاوە بەسەر تۆز و خۆڵ و ئەو خاکە نەرمەدا کە هەتا ئەژنۆ لێی ڕۆدەچووی، دایکرد. بارانەکە خۆڵەکەی هەتا سەر

سەختایی عەرزەکە دەبڕی و دڕی پێ دەدا و روخساری تۆزە سپییەکەی دابێژ دابێژ دەکرد. دەوروبەر نوقمی تاریکی بوو و بارانەکە وەك پەردەیەکی رەش رێگەی رۆشنایی گرتبوو. دوایی وردە وردە، تەوژمی بارانەکە هێورتر بۆوە و دارەکان وردە وردە وەدەر کەوتن. رێگەکان رووناك بوونەوە و بارانی نوور بەسەر ئاوەکاندا پژا. تاریکییەکان وردە وردە بێ پەلە، هەتا بناری چیاکانی دەوروبەرمان کشانەوە. بارانێکی زەرد، کە دەتگوت وردە داوێکی پۆلاّیین، لە ئاسمانەوە رۆهێشترابوون. لە پڕ بایەکی شێت هەڵیکرد و داوەکانی لێك پچڕی و پەرش و بلاّوی کردن. با و بۆران هەڵی کردبوو و خاکە نەرمەکەی دابووە بەر قەمچی و پووش و پەلاّشەکانی بە عەرزەکەوە دەنووساند. بارانە زەردەکە دار و رەوەز و گیشەگیا و ئاو و زۆنگاو و دەوەن و گوڵەکان و نیلوفەرە سپییەکانی زۆنگاوەکە و هەڵۆ هەڵکورماو و خۆ مەلاّسداوەکانی نێو رەوەزەکانی ئاناوەرزا و تەونی جاڵجاڵۆکە و پوورە وشك هەلاّتووەکانی بەر قرچەی تاو و گەرماکەی نوقمی نوورێکی زەرد زەردی بلوورین کردبوو. مستەفا بەگ لە دار بییەکە هاتبووە خوارێ و چوبووە نێو قامیشەلاّنەکەوە و سەماوەرەکەی تێخستبوو*. مەستان لە دەرەوەی قامیشەلاّنەکە تقەنگ لەسەر دەست لەسەر بنەتای حەیزەرانێك دانیشتبوو، چاوە تیژەکانی بڕیبووە ئەو رێیەی لە کۆشکەکەی دەروێش بەگەوە دەهات. بلەئیبۆ تفەنگەکەی چەور دەکرد و حەمدی دانیشتبوو سەیری هەوڵ و تێکۆشانی بێوچان و ماندوویی نەناسانەی مێرووڵە بچکۆڵەکەی نێو قولکەکەی دەکرد. هەر جارێکی مێرووڵەکە لاقی قالۆنچەکەی دەبزوواند، حەمدی دەیگوڕاند:"بەگ، بەگ، بەگ، وەڵلاّ تەکانی دا. ئەو مێرووڵەیە ئاخری دەرەقەتی دێ."

بەگیش بە دەنگێکی قورس و دڵنیاوە دەیگوت:"دێ، دێ."

سەری کاس بوو و وەك پارچە قورقوشمێك قورس بوو و هیچی بۆ نەدەچۆوە سەر یەك. ئەمڕۆ نە چێژی لە بیرکردنەوەیەك وەردەگرت و نە لە چاوەڕوانی و خەون و خەیالاّن.

سەرتاپای، خوێنی نێو دەمارەکانی و مێشکی و چاوی و هەستی بۆنکردنی هەر هەمووی کڕ و سڕ بوو. جاری وابوو هەروا بەبێ ئەوەی بۆخۆی و ئەوانی دیکەش بزانن لەگەڵ مێرووڵەکەیەتی یان دەروێش دەیگوت و دووپاتەی دەکردەوە:"دێ."

هەر جارێکی دەیگوت "دێ" دەنگ و لەبزەکەشی دەگۆڕدرا. جاری وابوو لێبڕاوانە، جاری وابوو سارد، جارێك بە گوڕە و جارێ بەهێوری و لە بن لێوانەوە.

---

* تێخستن لێرەدا تەنیا بە مانای پێکردن و هەڵکردن و داگیرساندن دێ. لە لای ئێمە نالێن سەماوەرم هەڵکردووە. دەڵێن سەماوەرم تێخستووە.

حەمدیش هەرجارێکی لە وەڵامەکەیدا دەیگوت:"دەرەقەتی دێ. ئەمن تا ئێستا شێلگیری و پێداگریی ئاوام نەدیوە. قسەی تێدا نییە دەرەقەتی دێ."

حەمدی حەزی لێ بوو قالۆنچە مردووە باڵ رەقەکە، کە بە هەزرا رەنگ دەربریسکایەوە، بە نووکە شەقێك لە قووڵکەکە بێنێتە دەرێ. ئەگەر وای کردبایە، لەکۆڵیان دەبۆوە. ئەگەر وای کردبا قالۆنچەکەی بە راکێشان دەبردە بەر شارەکەیان. بەڵام خۆی دەبوارد. ئەگەر بەگ لە کاتی ئەو کارەدا جومگەی لاقی گرتبایە، دەیکردە قیامەتێك ئەوسەری دیار نەبێ. لە لایەکی دیکەوە دڵەڕاوکێی ئەوەی بوو کە ئەگەر ئەو مێروولە بچکۆلەیە بەو هەمووە شێلگیری و پێداگرییەوە هەر نەیتوانی قالۆنچەکە لەو قووڵکەیە دەربێنێ، چ دەکا؟ ئاخۆ دەستی لێ هەڵدەگرێ؟ چۆنی دەست لێ هەڵدەگرێ؟ ئەگەر وازی لێ هێنا و قووڵکەکەی بەجێ هێشت چ دەکا؟ ئاخۆ میزی پێدا دەکا؟ مێروولە درشتەکان دەهاتن و لە بە دەوروبەری قالۆنچەکەدا دەخولانەوە و بۆنیان پێوە دەکرد و ئەوجار بە لاقە تۆزاوییەکانیان و بە چاوە زەقە تۆز لێنیشتووەکانیان، بەو جەستەیەوە کە لەبەر تۆز و خۆڵ ئیتر نەدەدرەوشایەوە، دوور دەکەوتنەوە. هەر دەتگوت ئەوانیش سەریان لە شێلگیرییەکەی مێروولە بچکۆڵەکە سووڕماوە. بەو بیرەوەرییانەی کە دەهاتەوە بیریان و بە شانازیکردن بە ئەزموونەکانی ژیانی خۆیان و بە دڵسۆزی و بەزەیی پێداهاتنەوەوە بە مێروولە بچکۆڵەکەدا...

بارانەکە هەڵیبرینگاند. مستەفا بەگ هەروا پەیتا پەیتا و بێ پسانەوە بیری دەکردەوە. کە بای دەهات، دەنکە بارانەکانی پەخش و بڵاو دەکردەوە. بارانەکە رەش و مۆر و کەسك و سپی و زەرد زەرد بوو. هەر کەسە و لە چاوی خۆیەوە لە دنیا دەڕوانێ. بنیادەم پێی وایە هەموو شتێك مرۆڤە. ئەو مێروولەیەی بۆ دەرکێشانی قالۆنچەکە لەو قووڵکەیە هەوڵی دەدا و ئەو مێروولە درشتانەی بۆنیان بە قالۆنچە و مێروولەکەوە دەکرد و رادەبردن، باڵندە و مێشەنگوین و ئاسك و هەڵۆ و ماسی و هەر بوونەوەرێکی زیندووی سەر زەوی و ئاسمان، هەر هەموویان وەك بنیادەم هەڵسوکەوت دەکەن و تێدەگەن. بنیادەم کە سەیر دەکا، هەموو شتێك لە سرووشتێدا وەك بنیادەم دەبینێ.

مستەفا بەگ گوتی:"دێ".

جا قاقا پێکەنی و لەسەری رۆیشت:"دێ. مێروولەکە دەرەقەتی قالۆنچە مردووەکەی دێ و ئاخرییەکەی هەر بەتەنێ دەیباتەوە بەردەم هێلانەکەیان و لە زستانێدا نۆشی گیانی دەکەن. دەروێش بەگیش بێرەدا دێ. هەرچۆنێك بێ هەر دێ..."

جا بیری کردەوە کە دایکم خەریکە لە پێ دەکەوێ. زۆر کەنفت و پیر و زورهان بووە. تینی تێدا نەماوە، بەڵام شەو و ڕۆژ هەر چاوەڕوانە. هیوابڕاو نەبووە و ئاگری تۆڵە لە دڵیدا نامرێ و هەروا زیندووی رادەگرێ. چاوەڕوان دەبێ و بەر لەوەی دەروێش بمرێ، خۆ بەدەست مەرگەوە نادا. دەروێش دەمرێ و دایکم جا بە بیستنی خەبەری مەرگەکەی رادەچڵەکێ. هەر لەگەڵ دەروێش بەگ دایکیشم دەکووژم... دوو کەس پێکەوە... دەروێش دەمرێ... گۆشت، ئێسقان، چاو و گوێ و لووت و زار و دڵ و جەرگی دایکم هەمووی دەپوێ و دەڕزێ... ئەو مێروولەیەش رەنگە ڕۆژێك لە هەوڵ و تەقەلای هێنانەدەرێی ئەو قالۆنچەیەدا بمرێ. هەرچی لە سرووشت دایە، بنیادەمە. ئەو بنیادەمانەی لە بنیادەم ناچن. جگە لە مرۆڤ هەرچی لە سرووشتدا هەیە... بەرد و خۆڵ و مار و مێروو و باڵندە و خشۆك و خزۆك، هەر هەمووی بنیادەمن.

دەروێش بەگ، هیدایەت، زەکەریا و هەشت کەسی دیکە زۆر بەر لە داکردنی باران و بەر لەوەی ئاسۆ پەمەیی داگەڕێ، کاتێ لووتکەی چیا سەربەتەمەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە مۆر دەچوونەوە، بە زۆنگاوەکەدا، لەسەر خۆ و هێور هێور بەرەو لای ئەو قامیشەڵانەی مستەفا بەگ بۆسەی تێدا دانابۆوە، دەڕۆیشتن. وایان انابوو کە ئەوان بە ئاماژەی دەروێش بەگ و لە پڕێکا هەڵکوتنە سەر قامیشەڵانەکە و هەر چوار پیاوەکە بگرن و ئەگەر بەهەر هۆیەك نەیانتوانی بیانگرن، دەست بۆ چەك بەرن و هەرچواریان یەك جێ بکوژن، جا دوای ئەوە لە سنوور بپەڕنەوە و بچنە کورد داغی لە سوریا. دۆست و برادەرانی دەروێش بەگ، خزم و کەسەکانی سوڵتان ئاغا لەوێ دەژیان. ئەگەر دەروێش پەنای بۆ بردبایەن و خۆی لە ماڵێ هاویشتبایەن، نەك ئەویان بەدەست کەسەوە نەدەدا، بەڵکو هەتا پیاوێکیان لە عەشیرەتیدا مابایەوە، لەسەریشیان دەکردەوە. دەروێش بەگ، بڕیارێکی پڕ لە مەترسیی دیکەشی دابوو، بەڵام تەنانەت نەیدەوێرا لە دڵی خۆشیدا باسی بکا. دوای کوشتنەکەیان و شرت و گوم کردنیان* (شوێنبزرکردنیان) لە ئاقچاسازدا، دەچێتە کۆشکەکەی ئاق یۆللی" و زیندەوەری تێدا ناهێڵێتەوە و لەوێوەو دەچێتە شارۆچکە و گوندەکەی دراوسێیان و هەموو ئەوانەی بە حەوت پشتان دەگەنەوە ئاق یۆللی" گوللەباران دەکا و جا ئەوجار بە قوونە شەڕ خۆی دەگەیەنێتە چیاکێو و پەنا دەباتە بەر خزم و کەسەکەی سوڵتان ئاغا. دەروێش بەگ هەر لە کۆنەوە هەرکاتێ بەقیندا دەچوو و ترسی مەرگ چنگی لە دڵی گیر دەکرد و لە ژووره دەرگا و پەنجەرە

---

* شرت و گومکردن: شوێنبزرکردن

داخراوەکەیدا پشووی سوار دەبوو و ئارەقەی شین و مۆری دەردەکرد، ئەو بیرە ترسناکەی بەمێشکیدا دەهات.

بارانە زەردەکە بەخۆڕەم دەباری و وەك گۆزەی سەروبن دەهاتە خوارێ. ئەو بارانەی شەوی پێشوو دەباری، بۆن و بەرامەی گیا و خاك و زۆنگاو و گیانە ئارەقەکردووەکانی بڵاو دەکردەوە و هەتا سەر ئێسقانەکانی جەستە گەرمەکەیان دەچووە خوارێ. بارانەکە هەر دەهات و توندتر دەبوو و زەردتر هەڵدەگەڕا و پتر دەدرەوشایەوە. دەروشانەوەیەکی زەردی بلوورین و ئەوەندە چڕ کە پەنجا گەز ئەو لای خۆتت نەدەدی. بارانەکە هەتا توندتر دەبوو، دەروێش بەگ کەیفخۆشتر دەبوو. با و بۆرانە بەتەوژمەکان سەر و دەموچاوی ئەوان و قوڕ و لیتەکەی دابووە بەر قامچی.

دەروێش بەگ ئاوڕی لە هیدایەت دایەوە و بە سرتەیەك پێی گوت:"هەموو شتێك، چۆنی گوتوومە وای لێ دەکەین. ئەتۆ و زەکەریا لەگەڵ من دێن و لەپڕ هەڵدەکوتینە سەر مستەفا بەگ. لە پێشدا تۆ، هەر ئێمە هەستاین، هاوار دەکەی، مستەفا بەگ، مستەفا بەگ؟ و بە شڵەژاوی خۆ بە قامیشەڵانەکەدا دەکەی. مستەفا بەگ، مستەفا بەگ، دایکت... دایکت.. دایکت..."

هیدایەت پتر لە مانگ بوو لە ژوورەکەی دەروێش بەگدا خۆی رادێنا بتوانێ لاسایی دەنگی مستەفا بەگ بکاتەوە:"مستەفا بەگ، مستەفا بەگ. مستەفا بەگ، دایکت، دایکت... دایکت..."

لەگەڵ شەپۆلی با و بۆرانەکەدا دەرپەڕین و رێك لەو کاتەشدا دەنگی هەرای هیدایەت بەرز بۆوە:"مستەفا بەگ، مستەفا بەگ، دایکت... دایکت... دایکت..."

دەنگەکەی بە هەڵپە و شڵەژێنەر بوو. مستەفا لەو ساتەدا کە هەستا بزانێ دەنگی کێیە، سەیری کرد ئەوە سێ کەس پەلاماریان دا و دەمودەست دەروێش بەگی ناسییەوە. ساتێك پێی بە عەرزییەوە رەق بوو. دەستی دەمانچەکەی دۆزییەوە و تا هات وەخۆ بکەوێ، دوو دەست لە پشتەوەڕا مچەکەیان گرت. مستەفا بەگ خۆی راپسکاند و مەچەکی لەدەستیان دەرهێنا و ئامبازی دەروێش بەگ بوو لە بەردەمی راوەستا. دەروێش بەگ دوای تاوێك دڕدۆنگی و دوودڵبوون دەستی دەمانچەکەی ئەوی گرت و بای دا و دەمانچەکەی دوای سێ تەقەکردن بەرەو لایەك فڕێ درا. ملیان لەبەر ملی یەکتری نابوو و مقۆ مقۆیان بوو. هەر فیشەك بوو لە قامیشەڵانەکەدا ویزەی دەهات.

دەنگی مەستان دەهات.

مستەفا بەگ بە خۆ راپسکاندنێك خۆی قوتار کرد و بە هەراکردنێ بەرەو دەرەوەی قامیشەڵانەکە رای کرد:"مەستان لێم بدە. لێم بدە. لێم..."

دەروێش بەگ سەیری کرد مستەفا بەگ چی وای نەماوە لە قامیشەڵانەکە بچێتە دەرێ و ئەگەر لە قامیشەڵانەکە دەرچووبایە، مەستان یان زەکەریا تەقەیان لێ دەکرد، گورج و خێرا وەك باڵی گرتبێ، خۆی گەیاندێ. هەردووکیان پێکەوە تلێپ کەوتنە نێو چاڵاوێکەوە. ئاوەکە بەسەروچاویان پرژا. لە چاڵەکەشدا یەکتریان دێنا و دەبرد و یەکتریان هەڵدەشێلا و لێك دەبوونەوە و تێك بەردەبوونەوە.

دەروێش بەگ ناڵاندی:"هیدایەت، هیدایەت..."

هیدایەت دەسبەجێ خۆی گەیاندە نێو چاڵاوەکەوە وخۆی بە مستەفا بەگ دادا. بەدوای ئەودا زەکەریا هات و ئەوجار ئەوانی دیکە. پێنج شەش کەس خۆیان بەسەر مستەفابەگدا دابوو و بەو حاڵەشەوە بۆیان نەدەگیرا و نەیاندەتوانی دەستی ببەستن. مستەفا لەگەڵ شەش پیاوەکەدا، شەش پیاوی سەرتاپێ قوڕاوی هەڵدەستایەوە و وێکڕا دەکەوتنەوە نێو چاڵاوەکەوە. زۆریان یەکتری هێنا و برد و یەکتریان هەڵشێلا، مستەفا بەگ جار بە جار ماندووتر دەبوو. هەتا وای لێ هات شەکەت بوو و کەوت. لەسەر گازەرای پشتێ کەوتبوو و رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو.

دەروێش بەگ بە هانکەهانك گوتی:"بەشکم نەشمردبێ... رووتی بکەنەوە. زوو بن زوو. با هەر دەرپێیەکەی لەپێدا بێ. هەر دەرپێیەکەی. دەستەکانی لە پشتەوەڕا شەتەك بدەن. لاقەکانیشی... خەنجەری لێ هەڵکێشن و شمەکی لەبەر دادڕن... دەرپێکەشی. دەرپێکەشی لە پێی داکەنن."

لە قامیشەڵانەکە هاتە دەرێ و لوولەی تفەنگەکەی مەستانی دیت. نەڕاندی:"مەستان دەست هەڵگرە دەنا دەتکوژم. لەوێ وەرە دەرێ. کارم پێت نییە. ئەتۆ پیاوێکی ئازا و چاونەترس و جوامێری و کەست لەم دنیایەدا نەماوە. ئەو کاتەی من گیرام... ئەو رۆژەم قەت لەبیر ناچێ. زەوییەکت دەدەمێ زۆر زۆر پتر بێ لەوەی مستەفا بەگ بەڵێنی پێ داوی... لەوێ وەرە دەرێ."

مەستان لە حاڵێکدا بە دەم گریانەوە دەیگوت"وەلی شەماڵ، وەلی شەماڵ" پەلەپیتکەی ترازاند.

دەروێش بەگ کە پێشبنیی کردبوو مەستان چ دەکا، بەر لەوەی تەقەی لێ بکا خۆی خستبووە نێو قووڵکەکەی تەنیشتییەوە. رێك لەو کاتەدابوو کە وەلی شەماڵ بە پێکەنینەوە و

بەبێ ترس لە قامیشەڵانەکە هاتە دەرێ و بەرەو لای دەروێش بەگ کە لە نێو قوڵکەکەدا بوو، چوو و گوتی:"بەستمانەوە بەگ. جلوبەرگیشمان لەبەر داکەند."

"وەلی شەماڵ، وەلی شەماڵ بیگرە."

وەلی وەك برووسکە بەرەو مەستان گەڕایەوە کە لە قوڵکەیەکی دیکەدا سەنگەری گرتبوو، هەرای کرد و گوتی:"بمکوژە. تەقە بکە مەستان. بمکوژە پیرە سەگ. بمکوژە دەی. بمکوژە و بیبرێنەوە. دوای ئەم ژیانە..."

رێك لەو کاتەدا ویزەی گوێ کەڕکەری مەستان بە بن گوێیدا رابرد و نەرمەی گوێی ماڵی. وەلی شەماڵ لە پێشدا تۆزە پارێزێکی کرد و دواتر وەك هیچ نەقەومابێ، لەسەرخۆ گوتی:"بمکوژە مەستان، دوای ئەوە ئیتر، چیمان بۆ مایەوە کە؟ بمکوژە، تەقەی بکە پیرە سەگ.... ئەگەر تۆ من نەکوژی، من تۆ دەکوژم."

وردە وردە بەرەو لای مەستان دەچوو. رۆیشت و گەیشتە ژوور سەری مەستان و راوەستا و لەسەر خۆ گوتی:"بمکوژە مەستان. بمکوژە برالە."

مەستان ئیتر تەقەی پێ نەکرا. لەگەڵ وەلی شەماڵ چاویان تێك ئاڵقا و هەردووکیان چاویان لێك دزییەوە.

مەستان هەستا و لە قوولکەکە هاتە دەرێ و لە وەلی شەماڵ چووە پێشێ. ماوەیەك هەروا لە تەنیشت یەکتری و بەبێ ئەوەی سەیری یەك بکەن، راوەستان و ئاخرییەکەی مەستان دەستی برد و دەستی وەلی شەماڵی گرت و لەسەر خۆ گوشیی و گوتی:"یاڵڵا برالە، با بڕۆین. خودا ئەو بەگانە لەسەر عەرزی پاك بکاتەوە. چارەڕەشیان کردین... با بڕۆین."

مەستان تفەنگەکەی فڕێ دا و وەلی شەماڵیش بە دوای ئەودا دەمانچەکەی لە قەدی خۆی کردەوە و فڕێی دا:"با بڕۆین برالە."

دوو پیاوی بەساڵاچوو دەستیان لە دەستی یەك نابوو، بەبێ ئەوەی تەنانەت بە تیلەی چاویش سەیرێکی دەروێش بەگ و قامیشەڵانەکە بکەن، بەرەو رەوەزەکانی ئاناوەرزا وەڕێ کەوتن.

دەروێش بەگ لە قوڵکەکە هاتە دەرێ و تاوێك راوەستا و لە حاڵێکدا سەری رادەوەشاند لە پشتەوەڕا سەیری کردن. بارانە زەردەکە بە خوڕەم دەباری و با و بۆرانەکە لە هەموو لایەکەوە هەڵی کردبوو و دەشتەکەی دابووە بە قەمچی. داوە باریك و زەردەکان، زەردی بلوورین، بەپرزە و وەك دڕك و درەوشاوە....

# ٤٤

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە، جافر ئۆز پۆلاد، حاجی قۆرت بۆغا، ئالاتەمیر ئاغا، ماهیر قاباقچی ئۆغلی و مامۆستا رۆستەم بەگ و سلێمان سامی و چەند کەسێکی دیکەش لە یانەکەی شار کۆ ببوونەوە و کپ و بێدەنگ سات بە سات قوت و سڵ، دانیشتبوون و بەبێ ئۆقرەییەوە، چاوەڕوانییەکەیان جار بە جار خەستتر دەبۆوە.

ئەو کەسەی ئاخرییەکەی بێدەنگییەکەی شکاند، ماهیر قاباقچی ئۆغلی بوو:"یانی راستە؟"

ئیتر چاوە پڕ لە پرسیارەکانی خۆی بە روخساری یەك بە یەکیاندا گێڕا. بەڵام کەس وەڵامێکی نەدایەوە. حاجی قۆرت بۆغا لە حاڵێکدا چرچ و لۆچە پان و قووڵەکانی سەر دەموچاوی درێژ و باریکتر دەبوونەوە، هەر خەریکی سمێڵی بوو. ئەوەندە تووڕە بوو تاڵ تاڵ تووکی سمێڵی هەڵدەکێشا و بە دەستە لەرزۆکەکانی بەر زگی هەڵدەکڕاند. دیار بوو قامکەکانی ئەستوور بوون و بەر چاوەکانی ئاوساون. ملی درێژ و رەپ و قیت و نێو شانەکانی پان و پۆڕ بوون.

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە، لاقەکانی خستبووە سەر کورسییەکەی بەردەمی و گۆرەوییەکانی دەرهێنابوو و یەك پشوو نێوان قامکەکانی لاقی دەخوراند. جافر ئۆز پۆلاد ئۆقرەی نەبوو. ئەوەندە تووڕە بوو، دەتگوت ئێستا نا ئێستا مێشکی دەتەقێ. ئاگای لێ بوو لەو جۆرە کۆبوونەوە و مەجلیسانەدا و بە تایبەتی کاتێ ئالاتەمیر لەوێیە، لەبیری نەچێ کە دەبێ بەوجۆرە بێ.

مامۆستا رۆستەم بەگ خاکەڕایانە و رووخۆش و لەبەر دڵان، بە روخسارێکی هێور و هێورکەرەوە، ئەوەندە ئاسوودە و بێخەم دانیشتبوو، هەر دەتگوت هیچ نەقەوماوە. بەڵام

ماندوویەتیی بە روخسارییەوە دیار بوو و جار جارەش بریسکەی چاوەکانی دەهات و جاریَ دەدرەوشانەوە و لەو کاتانەدا تەنیا ئەوانەی موویان لە ماست دەردەکێشا، هەستیان بە چاوەڕوانی و دڵەکوتەی ئەو دەکرد.

ئالاتەمیر ئاغا دیسان لاقەکانی جووت کردبوون و دەستی لەسەر ئەژنۆی دانابوو و چاوی بڕیبووە سەر چڵووکی ئەو دارتووەی لە پەنجەرەکەی بەرانبەرەوە دیار بوو و بێجووڵە راوەستابوو و لەخۆیدا بوو.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی ئارا و قارای لێ هەڵگیرابوو و بەردەوام لەبەر لێوانەوە دەیبۆڵاند. هەڵدەستا و دادەنیشتەوە و ئەمسەروئەوسەری تەلارەکەی دەکرد و نیگای شڵەژاوی لە پەنجەرەکەوە دەبڕییە هەوراز و نشێوی ئەو چیایانەی لە باکووری رۆژئاواوە سپی دەچوونەوە و سەربەز و قیت راوەستابوون و ئەوجار دەگەڕایەوە و لە رواڵەت و روخسارێکی دەهری بووەوە لەسەر جێیەکەی دادەنیشتەوە.

"یانی راستە؟"

دیسان کەس متەقی لێوە نەهات.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی ئەمجارەیان راستەوخۆ لە سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەی پرسی:"سلێمان ئاغا، ئەتۆ دەزانی هەر هەمووومان دەستمان لەو کارەدا بووە، بەڵام ئەگەر مەحموودە کوردە گیرابێ، ئەو شانازییە هەر بەتۆ دەبڕێ و تەواو. لە داوخستن و گرتنی مەحموودە کوردە و شکاندنی دەروێش، بەتۆ نەبێ، بە کەس ناکرێ."

سلێمان ئاغا چاوە درشت و مەڕییەکانی خۆی وەرگێڕا و کاس و وڕ سەیری دەکرد. ماهیر قاباقچی ئۆغڵی هیچی لەو نیگا و سەیرکردنەی هەڵنەکڕاند، دیسان پرسییەوە:"یانی گیراوە؟"

سلێمان ئاغا هیچ حاڵەتی چاوەکانی کە زەق زەق دەرپۆقیبوون، نەگۆڕی.

"باشە هەر بە راستی مەحموودە کوردە گیراوە؟"

حاجی قۆرت بۆغا وەڵامی دایەوە:"جارێ ئەوە چاوەڕوانین... بەشکم..."

سلێمان سامی قسەکەی لە زاری وەرگرتەوە:"گیراوە. هەر کەسێك بکەوێتە نێو پەنجەی شێرانەی سلێمان ئاغامان، ئەگەر هەڵۆش بێ، نەجاتی نابێ. دڵنیابن مەحموودە کوردە گیراوە و مەحاڵە و ناتوانێ لە چنگی سلێمان ئاغا دەربچێ. مەحموود کاری تەواوە."

مامۆستا رۆستەم بەگ بە زەردەخەنەیەکی ماقووڵانەوە گوتی:"هەموو نیشانەکان ئەوە دەردەخەن، کە ئەو کابرایە گیراوە. بۆ دەبێ نەگیرابێ؟ هەر دەبێ گیرابێ."

ئەوجار خەتی ئوتووی پانتۆڵەکەی لە سەر ئەژنۆیەوە گرت و دەلینگەکانی بە هێمنی هەڵکێشایەوە و لەسەر قسەکەی ڕۆیشتەوە:"بەڵێ کاکی خۆم. ئەو بێچووە کوردە هەتا ئێستا دەبوو گیرابایە. یانی هەر دەبوو بگیردرێ. بێچووە کوردێك و دەروێش بەگێکی کە دەستی لە پشتی دەدا، ناتوانن مل لەبەر ملی حکوومەتێك بنێن کە شەڕی لەگەڵ دنیایەکی بەوهەمووە گەورەییەوە کردووە. گاڵتەی پێ ناکرێ. لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان دەبێ حکوومەتەکەمان هەبێ، یان ئەوانە. سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە ئاغا سەری سلامەت بێ. ئەگەر ئەو نەدەبوو، ئەو کوردە پیاوکوژە وا زوو کلکی بە تەڵەوە نەدەبوو."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە لە جێیەکەی خۆی جووڵەیەکی کرد و کورسییەکەی لە بن بارستایی جەستەیدا جیڕە جیڕی لێ هەستا. دوای ئەوەی پاڵی بە کورسییەکەوە دا، قوڕگی خاوێن کردەوە و وەقسە هات:"بەڵێ، مامۆستا بەگ ڕاست دەکا. ئەو دەمەی ئێمە هەبووین حوکمەت نەبوو. ئەوە ئێمە بووین دوژمنەکانی نیشتمانمان بە زەبری شان و باهۆ و بەهێزی چەکەکانمان بەرپەرچ دایەوە. ئێمە سەرمان لە پێناوی ئەو نیشتمانەدا لەسەر دەستمان دانا و خوێنی ئاڵی خۆمانمان پێی بەخشی و ڕزگارمان کرد. بەڵام فایدەی چی... خاکی نیشتمان بۆ ئەو بەگانە دەمێنێتەوە، کە جگە لە خواردن و خەوتن و زل کردنی ورگیان هونەرێکی دیکەیان نییە. ئێستاش کە ئاوایە ئەتۆش وەرە و بۆسە دابنێوە و مەحموودە کوردە بگرە و وەقسەی بێنە بۆ ئەوەی حکوومەتە خۆشەویستەکەمان دەرەقەتی ئەو بەگانە بێ. دەرەقەتیان بێ بۆ ئەوەی ئێمە ببینە خاوەنی بستە حاکێك. ئاخۆ ئەوە ڕەوایە؟ ئاخۆ ئەو حاڵ و وەزعە شیاوی ئینسانییەتە؟ جا ئێستا کە کۆمارەکە پێکهاتووە و پادشا گۆڕ بە گۆڕ چووە، وانییە مامۆستا بەگی خۆشەویست؟... ئێستا کە ئەو کۆمارە سوپایەکی ئاوای هەیە کە بتوانێ لەگەڵ حەوت دەوڵەتان، ئەویش دەوڵەتی زەبەلاح ململانێ بکا و بەرەنگاریان بێتەوە، جا بۆچی لە شەوێکدا هەموو ئەو بەگانە، هەر هەموویان..."

ددانی چیڕ کردنەوە و لە کەلێنی ددانەکانییەوە گرماندی:"بۆچی هەرچی بەگە، بە شەوێك تێکیانەوە ناپێچێ و لێرەوە تا دەگاتە قەیسەرییە سێدارەیان بۆ هەڵناخا و هەر هەموویان ناکوژێ؟ وەڵڵاهی جا پیاو بڵێ چی؟ بڵێ چی؟ بڵێ چی؟... بڵێم چی هەرهیچ نەڵێم باشترە..."

دیسان ددانی چیڕ کردنەوە و دەستی ڕاستەی شڵپ لە کەشکەژنۆی دا و لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:"ئەگەر دەفەرمووی ئەوە حوکمەتە و نایەوێ دەستی بە خوێنی هاوولاتییەکانی سوور بێ، بێت و بە ئێمەی گوتبایە، هەر وەك لە حاجین... بۆ پێشەوە هاونیشتمانی، بۆ خۆت باشتر

دەزانی چ دەبوو... ئاخۆ ئاوا هەموو شتێك كۆتایی نەدەهات؟ ئەگەر وا بوایە، هەموو رۆژێ هەر شمشێرەكەی من بەس نەبوو بە هەزار و پێنج سەد كەس لەو دەرەبەگانە؟ یانی ئەمن هەر لە رۆژێكدا، ئەرێ وەڵڵا لە رۆژێكدا هەر هەموویان بە ناوی ئەوەوە كە خوێن و ماڵی ئەو بەگانە حەڵاڵە، نەمدەكوشتن و هەر بە فەرموودەی دین، گۆڕبەگۆڕم نەدەكردن...؟ جا ئێستا وەرە و هەر چاوەڕێ بە كە ئاخۆ مەحموودە كوردەی ئەستۆشكاو گیراوە یان نا. ئەو هەمووە نیشتمانپەرەوەری وەك شێر دەنەڕێنن، بێ دەسەڵات بن... چما خودا ئەوەی پێ خۆشە؟ یانی ئێمە بستە خاكێكی ئەو بەگانە بە هەزار فرت و فێڵ داگیر دەكەین و بەختەوەر دەبین؟ باشە بۆچی هەموو ئەو بەگانە نادەنە دەست ئێمە؟ بۆ؟ لەبەر چی؟...

هەستا و مستی قووچاندن و دەمارەكانی لاملی هەستان و نێوچاوانی ئارەقەی دەركرد و لە قوڕگییەوە گرماندی:"بۆ؟ لەبەر چی؟ بۆ؟ لەبەر چی؟"

ئالاتەمیریش لەو ساتەدا هەستایە سەر پێیان و دەستەكانی كە هەر كامەی دەتگوت وشكەڵە دارێكن، راوەشاندن و لە حاڵێكدا لەبەر تووڕەییان دەلەرزی، رووی لە جافر ئۆز پۆلاد كرد و بە دەنگێكی گڕ گوتی:"بۆ؟ لەبەر چی؟ بۆ؟"

دەنگە گڕەكەی پەنجەرە گەورەكانی تەلارەكەیان لەرزاندەوە:"بۆ؟ لەبەر چی؟"

ئەوجار، وەك هیچ نەقەومابێ، لەسەر جێی خۆی دانیشتەوە. دەستەكانی لەسەر ئەژنۆی دانانەوە و چاوی بڕییەوە سەر چلۆوكی دار تووەكە.

ماهیر قاباقچی ئۆغلی هێمن و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە رووداوەكان دیسان پرسییەوە:"یانی وایە؟"

ئەوجار حاجی قۆرت بۆغا هەڵی دایە:"ئەوە حوكمەتە. كەس لێی تێناگا. جارێك دەڵێ مەحموودە كوردەی گرتووە، كەچی دواتر دەردەكەوێ كە نەیگرتووە یان بە پێچەوانەوە دەیگرێ و وەڕووی خۆی ناهێنێ. وەڕووی خۆی ناهێنێ هیچ، هەر نكوڵیشی لێ دەكا. ئەوە حوكمەتە. كەس لێی تێناگا."

مامۆستا رۆستەم بەگ قوڕگی خاوێن كردەوە، گوتی:"ئەو ملازمە كە وەك منداڵی خۆمان وایە، ئەو كەسێك نییە لە قسەی ئێمە مل بادا یان خودای نەخواستە خەیاڵی خەیانەتكردن لە ئێمەی بە مێشكدا بێ. ئەو هەرگیز دژی بەرژەوەند و قازانجەكانی ئێمە ناجووڵێتەوە. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی حەزی لە سەركەوتن و پێشكەوتنە. ئەمن مردوو ئێوە زیندوو، ئەو هەتیوە رۆژێك سەری بە پادشایەتی دەگا و لە ژیانی ئەو خەڵكەدا رۆڵێكی گەورەی دەبێ. ئەگەر پەیامی

ناردبیٚ که مه‌حمووده کورده، قاتڵه دڵڕه‌قه‌که‌ی مورته‌زا به‌گ، ئه‌و گه‌نجه به زیپکوزاکوونه‌ی گرتووه، دڵنیا بن گرتوویه‌تی."

سلیٚمان سامیش پشتڕاستی کرده‌وه:"دیاره گرتوویه‌تی. بیٚ ئه‌ملا و ئه‌ولا وه‌ك ده‌ڵیٚ هه‌ر وایه. ئه‌من له‌وه‌ته‌ی له دایك بوومه ملازمی ئاوا ئازا و چاونه‌ترسم نه‌دیتووه. جاریٚ راوه‌سته با به‌خت و شانس یارمه‌تیده‌ری بیٚ و پیٚ بگا، جاریٚ ئه‌وه هیٚشتا ئه‌وه‌ڵییه‌تی."

جافر ئۆز پۆلاد وه‌ك پیاوماقووڵان هه‌ڵی دایه:"جاریٚ وا باشتره راوه‌ستین."

سلیٚمان ئه‌سلاٚن سۆوی په‌نجه‌ش دووپاته‌ی کرده‌وه:"جاریٚ وا باشتره راوه‌ستین و سه‌بر بگرین براینه."

ئالاته‌میریش شه‌کری شکاند:"باشتر وایه سه‌بر بگرین. خۆ بنیاده‌م به تۆزه سه‌بریٚك گیانی ده‌رناچیٚ."

قیت قیت هه‌ستایه سه‌ر پیٚیان... دیسان له سه‌ر جیٚیه‌که‌ی دانیشته‌وه.

ئه‌وجار بیٚده‌نگییه‌ك باڵی به‌سه‌ر ته‌لاره‌که‌دا کیٚشا. نیٚو ته‌لاره‌که جگه له ده‌نگی مۆره‌ی تاوڵه ده‌نگی دیکه‌ی لیٚوه نه‌ده‌هات. هه‌موو چاویان قیچ کردبوو و له نیٚوان خه‌و و بیٚداریدا چاوه‌ڕوانییان ده‌کیٚشا.

ئه‌و چاوه‌ڕوانی و بیٚ هیٚزییه هه‌ر به‌رده‌وام بوو هه‌تا ده‌نگی پیٚیه‌ك له پلیکانه‌کانه‌وه به ته‌ق و هۆڕ به‌رز بۆوه.

هه‌ر چه‌کمه‌کانی ملازم له‌به‌ر ده‌رگاکه‌وه بینران، هه‌مووان له جیٚی خۆیان هه‌ستان. ملازم نوقمی تۆز و خۆڵ بوو. تویٚژیٚك ته‌پوتۆز له سه‌ر چه‌کمه و جلوبه‌رگ و ئه‌ستیٚره‌کانی و لیٚواری شه‌پقه‌که‌ی و برۆ و مژۆڵ و چاوه شینه پڕ له ره‌زامه‌ندی و غرووره‌کانی نیشتبوو و قیت و ره‌پ له نیٚوه‌ڕاستی ته‌لاره‌که راوه‌ستا. لاقی راسته‌ی له پیٚشه‌وه دانابوو و ده‌ستی راسته‌ی له سه‌ر نیٚوقه‌دی و ده‌ستی چه‌په‌ی خستبووه سه‌ر هیٚڵی پانتۆڵه‌که‌ی و دوای ئه‌وه‌ی تاویٚك هه‌روا راوه‌ستا، له‌سه‌رخۆ و سه‌رکه‌وتووانه گوتی:"گیرا. کاریٚکی سووك و سانا نه‌بوو. به‌ڵام ئاخرییه‌که‌ی سه‌رکه‌وتین. سیٚ شه‌و و رۆژان له‌گه‌ڵی به‌شه‌ڕ هاتین. بۆ ئه‌وه‌ی بتوانین بیگرین، زۆری پیٚوه ماندوو بووین."

قۆرت بۆغا یه‌ك جیٚ ئامبازی بوو و باوه‌شی پیٚدا کرد و که‌وته زمانلووسی:"کوڕه مامه حاجیت ئه‌و گونانه‌ت بخوا. هه‌ر سه‌ربه‌رز بیت لاوه. خیٚر و خۆشی له‌و گه‌نجیٚتییه‌ت ببینی. هه‌ی رووی ئه‌و شیٚره‌ژنه سپی بیٚ کوڕی وه‌ك تۆی له داویٚنی به‌ربۆته‌وه و گه‌وره‌ی کردووه.

رزگاریدەری نیشتمان. کوڕی کۆماری، بێچوە شێری تورك... شێری تورکی تورکزادە... تورکی ڕەسەنی ڕەسەنزادە. تورکی بێخەوش. کۆتاییهێنەر بە جینایەت و تاوانی بێ شەرمانەی ئەو دەربەگانە..."

ماهیر خۆی گەیاندە بەر دەمی و ئاماژەی دەکرد. حاجی دەسبەجێ ملازمی بەر دا. ماهیر قاباقچی ئۆغلی وەقسە هات:"لە ناخی دڵەوە پیرۆزباییت پێ دەڵێم جەنابی ملازم. ئەگەر ئەوانی پێشتریش وەك تۆ غیرەتیان دابایەتە خۆیان و چاوپۆشییان لە زوڵم و تاوانی ئەو بەگانە نەکردبایە، ئێستا هەموو شتێك کۆتایی هاتبوو و ئیتر نیشتمانەکەمان تووشی ئەو پشێوی و ئاڵۆزییانە نەدەبوو. بەڵام ئەوانەی پێش تۆ... کەس وەك تۆ لە مەبەست و ئامانجی دەوڵەتی تورك تێ نەگەیشت. ئەدی، دواپین دەوڵەتی تورك..."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە... سلێمان ئاغا کە شێت و شەیدای ناوبانگی بنەماڵەکەی خۆی بوو و لە هەرجێیەکی هەل و درەفەتی بۆ ڕەخسابایە، ناو و شۆرەتی بنەماڵەکەی دەگوتەوە، قسەی بە ماهیر بەگ بڕی:"ئەوانەی پێش تۆ هەبوون... ئەفسەرەکانی پێش تۆ کە پاشماوەی عوسمانی بوون، ببوونە هاودەست و هاوکاری ئەو دەرەبەگە جینایەتکارانە. ئەوان لەسەر سفرەی ئەو دوژمنگەلی نیشتمانە هەڵنەدەستان. ملازم نوورەدینێك هەبوو، ئەوی ردێن و سەر و قژ سپییەکە... دوور لە رووت، سەگی ئەو بەگانە بوو... بەڵام... سەیری چاوی ئێمەی نەدەکرد. هەر چاوی لە ئێمە نەدەکرد. ڕۆژێکیان پێم گوت:"کوڕم نوورەدین، سەیر بکە، ئەمن کێم؟ ئەمن سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەم. ئەوەت لە بیر بێ. بە من دەڵێن سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە. بنیادەم دەکەمە بەردی قۆچەقانی و تووڕی دەدمە شوێنێك کەس بەسەر و سۆراغی نەزانێ..."

حاجی قۆرت بۆغا هاتە پێشتر و بن پیلی سلێمان ئاغای گرت:"هەستە برالە. هەستە سۆوی ئەسلان پەنجە. هەستە ئەسلان سۆوی پەنجە. سلێمان ئاغا. هەستە. هەستە با بڕۆین بزانین مەحموودە کوردە چ دێوەزمەیەکە. هەستە سۆوی ئەسلان سۆوی پەنجە، هەستە."

"ئەسلان سۆوی پەنجە."

"ئەسلان سۆوی پەنجە."

ئالاتەمیر بەلەرزەلەرز، بە جینگڵەوە، بە دەماری هەستاو و پشووی سوارەوە هاتە پێشێ. سوور سوور هەڵگەڕا بوو لە ملازم چووە پێشێ. هەوڵی دەدا لەبەر دەستەوستانییەکەی ئەوەی لە زەینی دایە لەبیری نەچێتەوە:"ملازم، ملازمەکەم، ملازمەکەم..."

گوتی و زمانی شکا. کۆمەڵێك وشە و قسەی جوانی دۆزیبوونەوە، نەدەهاتنە سەر زاری. نووکی زمانی... زمانی... زمانی...

"ملازمەکەم... ملازمەکەم... راوەستە... تۆ، تۆ، تۆ... یاخوا هێندەی مارشاڵ فەوزی چاقماق پاشا بەرز و گەورە بی..."

پشوویەکی قووڵی هەڵکێشا. زەردەخەنەیەکی کرد. دڵخۆش و قایل بوو. دوپاتەی کردەوە:"پایەبەرزی... پایە بەرزی... هێندەی ئەو پادشا کافر کوژەمان... پایەبەرز..."

مامۆستا رۆستەم بەگ هەلی بە دەرفەت زانی، قسەکەی لە زاری ئالاتەمیر وەرگرتەوە:"پیرۆزباییت پێ دەڵێم جەنابی ملازم... هەر بە راستی دەبێ رەگی گەندەڵیی ئەو دەرەبەگایەتییە لەو مولکە خاشەبڕ بکرێ. ئەوەش ئەرکی کەسی وەك ئێوە، رۆڵە ئازا و بەتوانا و خۆشەویستەکانمانە..."

رێك لەو کاتەدا پووە پێشتر و بن پیلی ملازمی گرت و دەمی بردە بن گوێی و بە سرتەیەکەوە لێی پرسی:" دانی پێدا نا؟"

ملازم سەری هەڵتەکاند، گوتی:"نا، هێشتا لێی نەپێچراوەتەوە، بەڵام وای لێ دەکەین پێی لێ بنێ. هەر چۆنێك بێ وای لێ دەکەین پێی لێ بنێ. چاری دیکەمان نییە."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی بن پیلەکەی دیکەی گرت و گوتی:"چارەیەکی دیکەمان نییە. ئێستا با بچینە پۆلیسخانە و خەریکی کاروبارەکەمان بین."

قۆرت بۆغاش چووە سەر قسەکەی:"بەڵێ. نابێ دەرفەت لە کیس خۆمان بدەین."

جافر ئۆز پۆلاد بێدەنگ بوو و لە فکردا بوو.

ملازم لە پێشەوە و ماهیر قاباقچی ئۆغڵی و قۆرت بۆغاش بەشوێنیدا و سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە کە هەوڵی دەدا وەپێشیان بکەوێ.... لە پلیکانەکان چوونە خوارێ و بە پەلە بەرەو پۆلیسخانە وەرێ کەوتن. مامۆستا رۆستەم بەگ کە لەبەر پشووسوارییەکەی نەیدەتوانی پێ بە پێیان بڕوا، بە زۆری شەقاوی گەورەی داویشت بۆ ئەوەی زۆر وەدوا نەکەوێ.

قاباقچی بە هانکەهانك بە ملازمی گوت:"ئەتۆ جەنابی قایمەقام و داواکاری گشتیت لە سەرکەوتنەکەت ئاگادار کردووەتەوە؟"

ملازم وەك هیچ نەبووبێ:"کام سەرکەوتن؟ گرتنی راکردوویەکی سووك و چرووك؟... بۆچی؟ لەبەر چی؟"

"ئەوە دەڵێی چی جەنابی ملازم؟ ئەوە خاکەڕاییە. ئەوەی تۆ گرتووتە، واتە هەموو دەرەبەگایەتی. سیستەمی فیودالیتە. ئەمن بەیانی وەزیری نێوخۆ و پارێزگار و فەرماندەی پۆلی بە تەلەگراف لەو سەرکەوتنەت ئاگاداری دەکەمەوە. پێشان دەڵێم چەندە گرنگە. بۆچی، لەبەرچی، چییە؟"

ئاوڕی دایەو. سلێمان سامیی بە دواوە بوو.

سلێمان".

"فەرموو ماهیر بەگ..."

"دەسبەجێ بچۆ لای قایمەقام و داواکاری گشتی و پزیشکی پشکێنەر... کات بەفیڕۆ مەدە. ئاگاداریان بکەوە و پێیان بڵێ دەسبەجێ بێنە پۆلیسخانە. باشە ملازم؟"

"چۆنی ئێوە حەزتان لێیە با وابێ."

بەبێ قسە کردن ڕۆیشتن.

سەر مێزە درێژەکەی ژووری سەرۆکی پۆلیسخانەکە، بە قوماشێکی کەسک داپۆشرابوو و چەند کورسییەکی شڕ و کۆنەش لە دووبەرییەوە دانرابوو.

کە پۆلیسە ئێشکگرەکان چاویان پێیان کەوت، سڵاوی سەربازییان لێ کردن. عەریف ڕەحمی بە غاردان هاتە پێشێ و هەردوو پاژنەی لێك جووت کردن و گوتی:"کۆت و بەندم کردووە جەنابی فەرماندە."

هەر لە سەر جێیەکەی خۆی ڕەپ و قیت ڕاوەستا و بە تیلەی چاو سەیری ملازمە گەنجەکەی دەکرد و گوتی:"سەری زنجیرەکەشیم لە ئاڵقەیەك بەستووەتەوە و کەلەپچەکەشیم نەکردەوە. زێرەڤانێکیشم لەبەر دەرگاکەی داناوە. عەریف حەسەن ئوزاتمالییش بە دوو سەربازەوە ئامادەیە. سەربازەکان دەست پەروەردەی عەریفن."

"زۆر باشە. چاوەڕێی فەرمانم بن."

ڕێزی سەربازیی بەجێ هێنا. ملازم کەیفی بە ڕێز و سڵاوی سەربازییانە عەریف ڕەحمی دەهات. ئەو وەك ئەڵمانییەکان سڵاوی سەربازیی دەکرد، نەك بە شێوازی ئەمریکییەکان کە هیچ سەرنجڕاکێش نییە. ڕێزیش هەر ڕێزی ئەڵمانییانە. عەریف حەسەنیان بە تایبەتی لە بنەکانی کوێستانەوە بانگ کردبوو. بیست ساڵێك دەبوو خزمەتی دەکرد. یەکێك لەو سەربازانە بوو کە بە ویستی خۆی و خۆبەخشانە لە بەشی پۆلیسدا خزمەتی دەکرد. ئەو کەسانەی پێیان دەگوترێ ئۆزاتمالی، هەرە دەستکورت و هەژارە گوندییەکانن. ئەوانە بۆ ئەوەی لەبری

جلوبەرگی سەربازی جلوبەرگی پۆلیسی لەبەر بکەن و ببنە ئۆزاتمالی، لە هیچ کارێك ناپرینگێنەوە و کە بووشنە ئۆزاتمالی، ئیتر شومری*یش دەرەقەتیان نایە... بەرتیلخۆرتر، زمانلووستر، بێ چاوڕووتر و رووهەڵماڵراوتر لەوانە دەست ناکەوێ. گوندییەکان لە سینگ و گوڵمیخ دەبەستنەوە و لێیان دەدەن و ئەشکەنجەیان دەکەن و هەر بۆ ئەوەی باج و پیتاکیان لێ بستێنن، لە هیچ جینایەتێك ناپرینگێنەوە. ژمارەیەك لە نزوولخۆر و سووتخۆرەکانی شارییش، هەر ئەو عەریف و نایب عەریفە ئۆزاتمالییانەنە. ئەوانە ئەو پارە و پووڵە کۆ دەکەنەوە کە بە فێڵ و تەڵەکە لە گوندییەکانی دەستێنن، دواتر دەکەونە سووت خۆری و سەلەم کردن و بە ملهوڕ و بازرگانی و بێ چاو و روویی و بێبەزەیی خۆیان، لە ماوەیەکی کورتدا لەسەر گەنجی قاروون دادەنیشن.

ژوورەکە درێژ و گەورە بوو.

"رەحمی."

"بەڵێ جەنابی فەرماندە."

"عەریف حەسەن بانگ بکە بێتە ئێرە."

کە لەسەر کورسییەکانی دەوری مێزە کەسکەکە دانیشتن، بوو بە جیڕە جیڕ.

"فەرموون، فەرموون... فەرموون ئاغا، فەرموون."

ئالاتەمیر بە پێوە راوەستابوو و دانەدەنیشت. چاوەڕوان بوو ملازم جێیەکیان نیشان بدا. ئالاتەمیر لەو کاتەدا وەبیری هاتەوە کە چۆن رۆژێك لە رۆژان، لە مەزرایەکدا کە بە قاچاغ توتنیان تێدا چاندبوو، رۆژێکیان "ئۆزاتمالی"یەك بە خەرەزەنێکەوە (بە قامچییەکەوە) کەوتبووە سەری و لێی دەدا. پۆلیسەکانیش پۆل پۆل و چەپك چەپك توتنەکەیان دەڕنییەوە و بەو جۆگەیەیان دادەدا کە بە قەراغیدا دەڕۆیشت. بابیشی شەلاڵی خوێن، لە حاڵێکدا خوێن لە تاڵە درێژەکانی مووسی سەر و سمێڵە شۆڕەکەی دەچۆڕایەوە، لە بن بەردێك دەیناڵاند. دایکیشی کە هەموو جلوبەرگەکانی تیتۆڵ تیتۆڵ و شڕ ببوون، لە بەردەم پۆلیسێکدا کە لێی دەدا دەنووزایەوە و دەپاڕایەوە. پشتی خوێناوی بوو و لە حەژمەتان خۆی بە نێو رەوەزەکاندا دەکرد. سێ جاران کەوت و هەر سێ جار بارانی قەمچیی ئۆزاتمالیی بەسەر و پشتیدا باری. ئیتر تینی

---

* شومر: ئەوەی سەری ئیمامی حوسێنی کوڕی ئیمام عەلیی سەر بڕی و بۆ یەزیدی کوڕی مەعاویەی برد. شیعەکان هەموو کەسێکی خراپەکار و دزێو بەو دەشوبهێنن.

تێدا نەمابوو و چاوی ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد. هاوارێکی کرد:"دەمرم. وەی بابە مردم. بەسە بەسە."

باوکی کە گوێی لە هاواری مەرگاویی ئەو بوو، هەستایە سەر پێیان. هەموو گیانی شەلاڵی خوێن بوو. بە گریانەوە ڕووی لە نایب عەریف ئۆزاتمالی کرد:"دەست ڕاگرە ملازمەکەم. دەست ڕاگرە ملازمەکەم. دەست ڕاگرە دوو قسەم پێتە. بەسە لێمان مەدەن. مانگایەکی دۆم هەیە، ئەوت دەدەمێ. بۆتۆ."

نایب عەریف دەستی ڕاگرت و بەزەردەخەنەیەکەوە کە خزیبووە ڕوخسارییەوە، گوتی:"زۆر باشە دەست ڕادەگرم. دەست ڕادەگرم. خۆت و شانسی خۆت ئەمڕۆ زوو ماندوو بووم. ئاااخ ئیتر پیر بووم."

دوای ئەوە گوتی:"ئیتر پیر بووم براله، ئەگینا تا ئێستا خۆت و ژن و منداڵەکەشت پشووتان لێ بڕابوو... ئاااخ گەنجێتی چیت لێ هات یادت بەخێر. ئەو دەستانەی بیست و پێنج ساڵ، بیست و پێنج ساڵی ڕەبەق یەك پشوو تێهەڵدانیان لە خەڵك دەدا و بۆ تاقە یەك جاریش چییە ماندوو نەدەبوون... باشە، گوتت مانگا؟ مانگاکەت چۆنە؟ باشە؟"

کابرا شەلاڵی خوێن بە ناڵەناڵەوە گوتی:"باشە. زۆر باشە. هەر جەمەی دە کیلۆ شیر دەدا."

نایب عەریف ئۆزاتمالی گوتی:"باشە. بەیانی لەگەڵ گۆلکەکەی بیهێنە بنکە و لەوەودواش تووتنێ مەکە."

کابرای خوێناوی دیسانەکە نالاندییەوە:"تۆبە، تۆبە، تۆبە ملازمەکەم. ملۆێنێك جاران تۆبە."

ملازم بە حورمەتەوە بە ئالاتەمیری گوت:"ئاغا بە پێوە مایەوە."

جا سەیرێکی دەوروپشتی کرد. دەسبەجێ کورسییەکی دۆزییەوە و کێشایە تەنیشت مێزەکە و گوتی:"فەرموو لێرە دانیشە تەیموور ئاغا."

ئالاتەمیر زۆری کەیف هات کە ملازم بە تەیموور ئاغا بانگی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی:"ملازم گیان، لە عۆدەی ئەو تەیموور ئاغا گوتنەت دێمە دەرێ. خزمەتێکت پێ دەکەم هەموو دنیا سەری سووڕ بمێنێ."

دەمودەست لەسەر کورسییەکە دانیشت و دەستەکانی بە ئەژنۆیەوە نووساند و گوتی:"فەرموو جەنابی فەرماندە."

ملازم کە سەرقاڵی ئەوە جێگە بە میوانەکان نیشان بدات و پەیتا پەیتا چای و قاوەی دێنا، گوێی لە قسەکەی ئالاتەمیر نەبوو. عەریف حەسەن لە گۆشەیەکی ژوورەکەوە لەجێی خۆی چەقیبوو. پێڵاوی "ڤیَرنی"ی لە پێیدا بوو و پانتۆڵێکی فشوفۆڵ و گنج و لۆچ و پینەکراوی لە پێ کردبوو. یەخەیەکی چاکەتەکەی کەوتبووە سەر زگی و لایەکەی دیکەی کەوتبووە سەر سینگی. قایشی مانۆرەکەی جێیەکەی گۆڕیبوو و دیار نەبوو قایشی مانۆرە یان پشتوێنەی ئاسایی پانتۆڵ. یەخەی کراسە هێڵ هێڵە هەویشمییەکەی خستبووە دەرێ. زنجیر سەعاتێکی زێڕی زۆر ئەستووری، لەوانەیە هێندەی سێ قامك ئەستووری لە گیرفانەکەیەوە بەسەر سینگیدا هەتا نێوقەدی شۆڕ کردبۆوە. ردێنی پاك پاك تاشیبوو و قژە ماش و برنجییەکەی لە بن کڵاوەکەیەوە وەدەر کەوتبوو. سمێڵە زبرەکەی سپی دەچۆوە. لە بنەوە بە چاوە کاڵە پڕ لە قین و رازەکانی سەیری دەوروبەری دەکرد.

تاوێك دواتر قاوەیان هێنا. ملازم لە نەکاو وەبیر حەسەن کەوتەوە و سەیری کرد ئەو لەو سەری ژوورەکەیە. رێك لەو کاتەدا چاوی بە ئالاتەمیر کەوت. عەریف حەسەن و ئالاتەمیر زۆر سەیر لە یەك دەچوون. دەتگوت سێوێکن و لە نێوەڕاستەوە لەتت کردوون.

"وەدەرە پێشتر عەریف."

عەریف بە پەلە هاتە تەنیشت مێزەکە و پاژنەی جووت کردن و لەبەر دەمی ئالاتەمیر چەقی.

"تۆ پێت وایە دەتوانی ئەو پیاوکوژە وەقسە بێنی؟"

"وەقسەی دێنم جەنابی فەرماندە."

"چەند دەخایەنێ."

عەریف حەسەن بە سەرسووڕمانەوە سەرێکی لەقاند و چاوە کاڵەکانی کە لە چرچ و لۆچدا ون ببوون، بە سەر دیوار و ملازم و دواتر بەسەر خەڵکەکەدا گێڕا. کە لە نیگای بەسەر ئالاتەمیرەوە گیرسایەوە، گیانێکی وەبەر هاتەوە. جۆرە خۆمانەبوونێك لەو کابرایەدا هەبوو کە سڕ و ساردێتیی ژوورەکەی دەڕەواندەوە و گیانی هێور دەکردەوە و غیرەتی وەبەر دەنا.

"کوڕە ئەوانە کەس لێیان تێناگا جەنابی فەرماندە. ئیی وایە بە دوو شەپلاخە بەیدەست دەبێ و هەرچی هەیەتی هەڵیدەڕێژێ و بەڕە لەسەر هەتیوان هەڵدەداتەوە و کەسی واش هەیە کای لە پێستی سەری بئاخنی هیچی لە بن زمانی دەرناکێشرێ. بشیکوژی..."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی بە دەنگێکی زمانلووسانە و دلڕەوەانە و تۆزێکیش خۆ بە گەورە زانانەوە پرسیی:"باشە تا ئێستا قەت وا هەبوو یەکێك بە تێهەڵدانێ مردبێ جەنابی عەریف؟"

عەریف حەسەن کە هیچ چاوەڕێ نەبوو پرسیارێکی ئاوای لێ بکرێ، نەیتوانی دەسبەجێ وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە. چاوێکی پڕ لە پرسیاری لە ملازم کرد و لە روخساری ئەودا وای خوێندەوە کە "بلێ، بلێ" ئەوجار نیگای باڵی گرت و لەسەر روخساری ئالاتەمیر نیشتەوە و غیرەتێکی وەبەر هاتەوە و وەقسە هات:"چۆن نەبووە بەگ. چما دەبێ نەبووبێ؟ هەر شتێك بێ ئادەمیزادە. بنیادەم چییە هەناسەکێشان و هەناسەدانێکە. زۆۆۆر. ئەمن بیست و پێنج ساڵی رەبەقە ئەوە کار و پیشەمە. لە هەموو جۆرێکیم دیتووە. چما دەبێ لەبەر دەستم دەرچووبێن؟ زۆۆۆۆر. بنیادەم هەیە ئەوەندە لاسارە ئێسك و پرووسکی بهاڕی و کای لە پێستی بئاخنی، قسەی لێ نابیستی..."

عەریف دەتگوت وەکوڵ هاتووە، دەنگی گۆڕا:"جارێکیان یەکێکم وەچنگ کەوت کە لە بن دارگوێزێك هەشت رۆژان لەسەر یەك دەستدرێژیی کردبووە سەر چوار کیژۆڵە. جا بە تاقی تەنیاش... سێ کەسیانی لەیەك بەستبوو و عەرزت بکەم گابوونی..."

شەرمنانە سەری داخستبوو و بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە و سەیری کەسێك بکا، قسەی دەکرد:"یەکێکیانی دەکردەوە و لەبەر چاوی سێ کچەکەی دی یەك دوو سەعاتی تەواو ... ئەوجار ئەوی دەبەستەوە و ئەوی دیکەی دەکردەوە، بەوجۆرە... ئەو کابرایەم بە کچەکانەوە لە یەك جێ گرت و دەستم پێ کرد. ئەویش چۆن... چۆن... دوایی..."

ملازم سەیری دەکرد و بە چاو و برۆ ئاماژەی پێ دەکرد. هەمووان ئاگایان لە ئاماژەکانی چاو و برۆی ملازم بوو و جا چونکە عەریف حەسەن دیسان هەر تێی نەگەیشت، ملازم ئاخرییەکەی وەقسە هات:"عەریف!"

عەریف دەسبەجێ خۆی خڕ کردەوە و ئامادە راوەستایەوە ولەسەری رۆیشت:"وەبن گلّم دا و لە زاری فووم دا... ئەوەندەم فوو دا... ئەوەندەم...."

"عەریف."

تێخوڕینەکەی ملازم وەخۆی هێنایەوە.

"فەرموو جەنابی ملازم."
"بڕۆ مەحموود بێنە ئێرە."
"بەسەر چاو جەنابی ملازم."
سلاوی سەربازییانەی دایەوە و تەریقی قسە نیوەچڵەکەی، وەدەر کەوت.
"چ پێویست دەکا، چ پێویست دەکا..."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە هەڵی دایە:"خۆ ئەگەر بێت رۆژێك ئەو میللەتە تێهەڵدانی لەسەر لاچێ، ئێمە تێدا دەچین. ئەو میللەتە نابێ تێهەڵدانی لەسەر لاچێ. کوتەك لە بەهەشتەوە هاتووە. هەر بژی و بەردەوام بێ عیسمەت پاشامان و هەروەها پاشا نیشتمانپەروەرەکەی دیکەمان چاقماق پاشاشمان، مارشالی یەکەممان، سەرتۆپی سوپاکەمان، گلێنەی چاومان کە تێهەڵدان و قامچیی لەو میللەتە نەبڕی. نەشیدەتوانی بیبڕێ و ناشیبڕن و ناشبێ بیبڕن."

قۆرت بۆغا لەسەر قسەکانی ئەسلان سۆوی پەنجە رۆیشت:"ئەو میللەتە بەبێ تێلا ناژی. کوڕە رۆژێکی چی، هەر تاقە خولەکێك دار و تێلایان لەسەر نەبێ، جا وەرە بزانە چۆن هەوسار دەپچڕێنن. بەخوای بز بە بنیادەمەوە دەکەن. ئەدی گیانەکەم، بز، بز... و لەوەش خراپتر..."

ئالاتەمیر قەوەی خۆی دایە و بۆ ئەوەی لەو نێوەدا ئەویش قسەیەکی کردبێ:"خودا لەو سەرە ئاگادارە، ئەو میللەتە داریان لەسەر نەبێ، هەر بە رۆژێك هەموومان سەر دەبڕن. سەری پاشاکەمان بەر لە خۆمان و سەری عیسمەت پاشای گەورەشمان بەر لە هی هەمووومان. یارەبی خودا لەو پۆلیسانە رازی بێ... رۆژ نییە پێنج داران لە گوندییدا نەشکێنن. بەڵام ئاخ لە دەستی ئەو گوندییانە کە بەبێ دار وەك دڕکی ژەهراوی وان... وەك ماری ژەهراوی... گوندییەکی تێی هەڵنەدرابێ، کەس نازانێ لە کوێوە پێوە دەدا. هەر کەس نازانێ. خودا پێمان نەگرێ، پێمان نەگرێ... خودا لە پاشامان رازی بێ کە دار و تێلای داهێنا... ئەو میللەتە لە سایەی دیموکراسیدا ناتوانێ بەبێ تێلا بژی. ناتوانێ ئاغا. ناتوانێ."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی قسەکەی لە زاری ئالاتەمیر وەرگرتەوە. تەمیر لەوەیکە هەلی بۆ رەخسابوو لە بەردەم ملازمدا، لەبەر دەم کابرایەکی ئاوا گەورە و گراندا قسەی ئاوا بکا، لە خۆشییان وەخت بوو بفڕێ... بەڵام ئەو فێڵەی قاباقچی لێی تێك دا. هەر بۆیە چاوی وا لە قاباقچی سوور کردەوە کە یانی تۆ زەبری خۆتت وەشاند و چاوەڕێی زەبرێکی منیش بە. بەڵام ئەویان هیچ وەڕووی خۆی نەهێنا و تەمیر بەوە پتر تێك چوو.

"بەڵێ ئاغای من. هەر میللەتێك گەوهەری خۆی هەیە. قوڕی ئێمەشیان بە تێڵا و کوتەك شێلاوە. یەك لەسەر سەد، یەك لە هەزار، یەك لە ملیۆنی ئەو دارەی لە میللەتی ئێمە دراوە، لە هەر میللەتێکی دیکە درابایە، ئۆتۆریتە و فاشیزم و نازیزم و دیکتاتۆرییان، وێکڕا تێکەوە دەپێچا و لە ناویان دەبردن. هیچ میللەتێك هێندەی میللەتی ئێمە تاقەتی تێهەڵدان و تێڵاخواردنێی نییە. ئەو میللەتەی ئێمە لە تاقەتهێنان دەرچووە. ئەو میللەتە چێژ لە داپلۆسین وەردەگرێ... ساڵێك دار و تێهەڵدانیان بەسەرەوە نەبێ، جا دەبینی چۆن "دوور لە رووی تۆ ملازمەکەم ـ هەوسار دەپسێنین و فیتنە و فەسادێك نامێنێتەوە نەکرێ جەنابی ملازم. وەك گوتوویانە مردووش چاوت بەسەرییەوە نەبێ، لە کفنەکەی دێتە دەرێ. ئەوە ئەفسەرە پایەبەرزە نیشتمانپەروەکانی وەك ئێوەن، کە دەبێ ئەو راستییە بکەنە ئالقەی گوێیان کە نابێ تێڵا و تێهەڵدان لەسەر ئەو خەڵکە لابەرن. بەبێ دار و تێهەڵدان، گا ناچێتە سەر خەرمان. ئەو میللەتە هەر دەبێ تێی هەڵدەی و تەواو... بەبێ بیانوو دەبێ تێی هەڵدەی. تێهەڵدەی و شل و کوتی بکەی ملازم. ئێمە هەر لە بنەوە بە تێڵا و تێهەڵدانێ رۆنراوین. هەر بۆیەشە حەوسەد ساڵە کاربەدەست و پۆلیسە رەسەنەکانی ئێمە لەو میللەتە هەڵدەدەن. لە سەردەمی کۆمارییشدا لەبەر ئەوەی بە کردەوە تێگەیشتین کە پێویستە، دە ئەوەندە و بگرە سەد ئەوەندەی دیکەمان پتر کرد. ئەگەر پاشا مەزنەکانمان ئەوەیان بۆ دەرنەکەوتبایە، ئەو نیشتمانە دەمێك بوو تێدا چووبوو. دنیا لەسەر پشتی گا و ماسی نییە، بەڵکو تورکیا لەسەر شاخی تێڵا و تێهەڵدانە."

حاجی قۆرت بۆغا بەبێ ئەوەی بەدەستی خۆی بێ گوتی:"خودایە، خودایە..."

جا دەستەکانی هەڵبڕی و لە بن لێوانەوە گوتی:"خودایە سێبەری دار و تێڵا لەسەر ئەو میللەتە کەم نەکەی... خودایە... ئێمە بەبێ دار و تێڵا تێدادەچین."

ئەسلان سۆوی پەنجە دووپاتەی کردەوە:"تێدا دەچین."

لەو نێوەدا قایمەقام لە پێشەوە و داواکاری گشتی و دوکتۆر پشکێنەرە گەنجەکە بە دوایدا وەژوور کەوتن و هەمووان لەبەریان هەستان.

ئالاتەمیر هەروا کە راوەستابوو، لە زمانی دەرپەڕی:"تێدا دەچین."

ئەوجار بەبێ ئەوەی بەدەستی خۆی بێ چەنەی گەرم داهات و قسە و رستەکان پەیتا پەیتا لە زاری دەرژانەدەرێ:"ئەوە هەزار ساڵە تێمان هەڵدەدەن. پەنا بە خودای، ئەگەر بێت و رۆژێك

تێیان هەڵنەدابایین، ئەو دنیایەمان سەروبن دەکرد. تێهەڵدان سەهلە، دەبێ بمانکوژن، بمانکوژن... دەبێ گیانمان لە بنی نینۆکەکانمانەوە دەرکێشن..."

ئەوانەی تازە وەژوور کەوتبوون، قسەکانی ئالاتەمیریان دەبیست و نەیاندەزانی چ باسە. قایمەقام بە پێکەنینەوە، نەیهێشت ئالاتەمیر لەوە پتری لەسەر بڕوا:"پیرزە جەنابی مەلازم. پیاوکوژەکەتان گرتووە. بە راستی سەرکەوتنێکی گەورەیە..."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی هاتە نێو قسەکانی:"بفەرموون سەرکەوتنێکی بێوێنە. ئەوە یەکەم سزای تاوانەکانی ئەو فیودالیتە تاوانکارەیە..."

دوکتۆر:"پیرۆزباییت پێ دەڵێم جەنابی ملازم. راست وایە."

داواکاری گشتی:"ماهیر بەگ جوانی فەرموو و قسەی تێدا نەهێشتەوە. ئەوە هەر بەراستی یەکەم سزادانی دەرەبەگایەتیی جینایەتکارە."

جا باسکی ماهیر بەگی توند گوشی.

ملازم:"زۆر سپاس. دێ."

ئالاتەمیر:"دێ."

جا لەسەر پێ راوەستا و دیسان دانیشتەوە و هەروا قسەکانی لە زاری هەڵدەڕژان:"خودایە گیان دێ. ئەو هیچ و پووچەی مورتەزا بەگەکەی کوشت دێ. دێ، دێ. خودایە گیان..."

دەتگوت لە ترسان چاوی دەپەڕێ و چاوەکانی دەرپۆقیبوون:"دێ. کوردی کافری خوێنمژ دێ. دێ لە حاڵێکدا کە دەستەکانی هەتا ئانیشکی بەخوێن سوورە."

زمانی شکا و رەنگی بە روخسارییەوە نەما و چاوە روون و بێجووڵەکانی بەسەر شوێنێکەوە گیرسانەوە. ملی بەرەو دەرگای وەژوورکەوتن کێشابوو.

مەحموودە کوردە یەکی کەڵەگەت و سمێڵ بابڕ و مووخورمایی بوو. برۆکانی هەڵگێڕابوونەوە و سەیری هیچ لایەك و کەسی نەدەکرد، هەر بۆیە کەس رەنگی چاوەکانی نەدەدی. قامکەکانی باریك و جوان، نێوشانی پان، برۆی تێکەڵ، ئێسکی سەر روومەتی بڵێی و نەڵێی تۆزێك قیت، لێوەکانی سوور و ئەستوور و ئەو هێڵەی لە بن روومەتییەوە چووبۆوە گۆشەی لێوەکانی، قووڵ بوو. روخساری تاوەسووت و دەوروبەری چاوەکانی پڕ لە چرچ و لۆچ.

بە تەق و هۆڕ و خرینگەخرینگ وەژوور کەوت. لەسەر لاقە لێك بڵاوەکانی، وەك ئێستر لە نێوەڕاستی ژوورەکە چەقی. پانتۆڵە فش و فۆڵە پەشمینەکە قاوەییەکەی و چاکەتە رەشە خەت

خەتییەکەی لە جۆری قاچاغ بوو. زیپکەیەك بەلای راستی نێوچاوانییەوە بوو کە سوور دەچۆوە. پشتوێنێکی سپیی پەشمینەی لە پشتی بەستبوو.

هەر وەژوور کەوت، بێدەنگییەکی قوولٚ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا و هەمووان بە واق ورماوییەوە سەیری یەکتریان کرد.

ئالاتەمیر لە بن لێوانەوە گوتی:"دایك قەحپە، چ بەژن و بالایەکی هەیە."

کەس گوێی لە قسەکەی نەبوو.

ئەگەر ماهیر قاباقچی ئۆغلی بێدەنگییەکەی نەشکاندبایە، کەس متەقی لێوە نەدەهات:"ئەتۆ مورتەزا بەگت کوشت، وایە؟ باشە پێت حەیف نەبوو؟ ئەو کە لە ئەستەنبولٚ و ئەوروپا دەرسی خوێندبوو. ئەتۆ کێی؟ چیی؟ بایی چەندی؟ چۆن دلٚت هات بنیادەمێکی وەك ئەو بکوژی؟"

قۆرت بۆغا گرماندی:"چۆنت دلٚت هات، سەگی کورد؟ چۆن ئەو شێرەت پیٚ حەیف نەبوو؟ هەر دلۆپەخوێنێکی ئەو دە هەزار کوردی وەك تۆی دێنا. گەنجێکی خوێندەواری ئەوروپا دیدەی ئاشقی خزمەت بە نیشتمان... نەك دەهەزار، سەد هەزار... نەك سەد هەزار، ملوێنێك... نەك ملوێنێك..."

هەستایە سەرپیٚ و پەلاماری دا. بەلاٚم پێشی بەخۆی گرت...

ئەگەر لێرە نەجاتی دەبوو و قوتار دەبوو و پەنای دەبردەوە بەر چیاکان و یاغی دەبوو، جا ئەو کات مالٚوێرانی دەکرد... بەو حالٚەشەوە هەردوو قامکی بە توورەییەوە بەرەو چاوەکانی ئەو راداشت و لە بن ددانەکانییەوە گرماندی:"بڕوانە، ئاوا، هەر ئاوا چاوەکانت، چاوەکانت، ئەو چاوە حیزانەتم دەردێنا. چاوەکانت، چاوەکانت، چاوەکانتم دەردێنا. هەر ئاوا کوردی... چۆن ئەو گەنجە شێرئاسایەت کوشت؟"

مەحموود بەهێمنی سەری هەلٚێنا و نیگای ئاگراویی خۆی کە دەتگوت دوو شیشی پۆلاٚن، لە چاوەکانی بڕی. دوای ئەوە سەرە زلەکەی بەهێمنی بەردایەوە و پێلٚووەکانی لەسەر یەك دانان. هەر نیگای لە نیگای قۆرت بۆغا ئالٚقا، قامکە رەقەکانی شل بوونەوە و دەستە درێژەکەی شۆڕ بۆوە و گۆشەی لێوەکانی لەرینەوە و رەنگی بە روخسارییەوە نەما. تفی زاری قووت دایەوە و هەولٚی دا لەبەر چاوی خاو و خێزان وەسەر خۆی نەهێنیٚ. گرێیەکەی بن قوڕگی لەخۆوە سەر و خواری دەکرد. ئاخرییەکەی لێوەکانی کەوتنە جوولٚە و چەند قسەیەك کە لە

گەروویەوە خزیبوونە سەرەوە، بە هێمنییەکی هەستپێکراو لە زاری هاتنە دەرێ:"هەی بەڵا لەو سەرو چڕ و چاوەت بدا، تۆ خوا حەیف نەبوو؟"

نیگاکەی مەحموود هیچی لە دڵیدا نەهێشتبۆوە:"تۆ خوا ئەو غەڵفە چنارە حەیف نەبوو؟"

لەبزێکی گلەیی و لاواندنەوە لە دەنگیدا بوو:"بەڵا لەو چڕ و چاوەت بدا..."

دەنگی نزمتر کردەوە و کەوتە ورتەورت:"بڕوانە مەحموود کوڕم، هەموو دنیا ئەوە دەزانن کە دەروێش بەگ ئەتۆی تیژ کرد مورتەزا بکوژی. ئەەتۆ بێ تاوانی. ئەوە لەسەر کاغەزێ دەنووسن و ئەتۆ ئیمزای دەکەی. ئیمزات هەیە، وایە؟"

عەریف حەسەن هەڵی دایە:"بەڵێ، خوێندەوارە. دەزانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە. سەرەتایی تەواو کردووە. کە وەشوێنی کەوتبووین، زۆر شتی لەسەر فێر بووم."

قۆرت بۆغا دیسان وەقسە هاتەوە:"زۆر باشە، زۆریش باش. سەیر کە مەحموود گیان، هەر ئەوەندە بەسە تۆ بڵێی مورتەزا بەگ بە فەرمانی دەروێش بەگ کوژراوە... هەر ئەوەندە و هیچی دیکە..."

جا سەری بردە بن گوێچکەی و بە سرتە پێی گوت:"ئەتۆ کاری بەوی دیکەی نەبێ... ئەمن لێرە دەربازت دەکەم و دەتنێرمە مەڵبەندەکەی خۆمان. ئەو بێ دینانە، ئەو ملازمە کافر و بێدینە لە ئەمریکاوە فەرمانی پێ دراوە کە یان وەقسەت دێنێ یان دەتکوژێ. گوێ بدە قسەکەی من و بەر لەوەی کارەکە خراپتر بێ، راستییەکەی بڵێ و گیانی خۆت رزگار بکە. ئەو گەنجە حەیف نییە؟..."

بە هێمنی لێی دوور کەوتەوە و بەبێ دەنگی لە جێی خۆی دانیشتەوە. دەنگی زۆر گڕ بوو. ئەگەرچی هەوڵی دەدا بەسرتە قسەکانی پێ بڵێ، بەڵام ئەوی لەوێ بوون هەموو گوێیان لێی ببوو.

دوای قۆرت بۆغا کەس قسەی نەکرد. لەوانەشە خۆیان نەیانویستبێ. هەمووان لە بن بارستایی هەستێکدا دەگوشران و خۆشیان نەیاندەزانی ئەو هەستە چییە. هەمووان چاویان بڕیبووە ئەو کابرا بەژن و باڵا جوانە کۆت و زنجیر لە مل و سندم لە پێ و کەلەپچە لە دەستەی وەك پەیکەرەی شانازی قورس و قایم راوەستابوو.

ئالاتەمیریش لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"دەڵێی باڵی هەڵۆیە. سوورە هەڵۆیەك کە باڵەکانی وەك مس وابن."

مەحموود لەو ماوەیەدا بێ جوولە ڕاوەستابوو. هەر یەك دوو جاران ئەم پێ و ئەو پێی کرد و چەند ئاڵقەیەکی زنجیرەکانی زرینگەیان لێ هەستا. جارێکیش دەستەکانی بەرەو لای زگی هەڵکشان و دەسبەجێ هاتنەوە خوارێ. ئەو جوولەیەش زرینگەزرینگی لە زنجیرەکە هەستاندەوە.

ملازم وەك ئەوەی لە نەکاو وەخۆ هاتبێتەوە، گورج ئاوڕێکی لە عەریف حەسەن دایەوە و فەرماندەرانە گوتی:"بیبە خوارێ. دەروێش بەگ دانی بەوەدا ناوە کە مورتەزا بە فەرمانی ئەو کوژراوە. ئەگەر ویستت دەروێش بەگ لە ژوورەکەی دیکە بێنە و لەگەڵی بەرەوڕووی بکەوە. لەگەڵ هەردووکیشیاندا جوان و ماقووڵ بجووڵێوە. مەحموودیش دوای ئەوەی دانی بەوەدا نا کە مورتەزای بە فەرمانی دەروێش بەگ کوشتووە ئازادی بکە، با بڕوا وەشوێن کاروباری خۆی بکەوێ بەڵام بەر لەوەی ئازادی بکەی، تاوێك بیهێنە لای من. قسەیەکم پێیەتی... ئەگەر دانی پێی لە تاوانەکەی نەنا و ملی بادا، لە نێوان هەردوو سەعاتدا جارێك ئاگادارم بکەرەوە. ئەگەر پێشی لێ نا، دەسبەجێ ئاگادارم بکەرەوە، ئێمە.."

ماهیر قاباقچی خێرا هاتە نێو قسەکانییەوە و گوتی:"ئێمە، لە ماڵەکەی ئێمەین. لەوێ هەموو شتێك ئامادەکراوە. گوتم ماڵەکەی ئێمە لێرە نزیکترە..."

حاجی قۆرت بۆغا بە نارەزایەتییەوە گوتی:"شتی وا نابێ. لە ماڵی ئێمەش هەموو شتێك ئامادە کراوە."

ڕۆستەم بەگیش دەنگی هەڵێنا:"لە ماڵی ئێمەش..."

ملازم هاتە نێوانیانەوە:"ماڵی ماهیر بەگ هەر دوو هەنگاوێك لێرەوە دوورە. کەوابوو وا باشترە بچینە ماڵی وی. زۆرم حەز لێیە بزانم ئەو کابرایە کەنگێ وەقسە دێ؟ خەریکە شێت دەبم."

داواکاری گشتی گوتی:"هەر پێی لێ بنێ، دەسبەجێ دەروێش بەگ دەگرین. دەسبەجێ، گیان و دڵم. دەمودەست بڕیاری گرتنەکەی دەنووسم. لەگەڵ جەنابی قازی لەسەری ساغ بووینەتەوە. ئاااخ، خۆزگە وەقسە هاتبایە."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە تووڕەییەکەی خۆی خواردبۆوە و هاتە قسە:"وەقسە دێ. چاری نییە هەر دەبێ قسە بکا. قسە ناکا چ دەکا؟ دیارە قسە دەکا. عەریف حەسەن، جا ئەودەم..."

وێکڕا هەستان و بەرەو ماڵی ماهیر بەگ وەڕێ کەوتن. ژنەکەی ماهیر بەگ لەگەڵ چەند کچۆڵە بە پێشوازییانەوە هاتن. سفرەیەکی ڕەنگین و جوانیان ڕازاندبۆوە.

ماهیر بەگ لە بن لێوانەوە گوتی:"دەستت خۆش بێ خاتوون، شەرمەزارت نەکردم."

خاتوون:"دەمزانی گەورەمان دەکەیت و تەشریف دێنییە ماڵی ئێمە... چونکە بیستم گیراوە..."

جا سەری بردە بن گوێی مێردەکەی و پرسی:"کابرایەکی چۆنە؟ هەر ئەو دعبایەیە وا باسیان دەکرد؟ وەك دەیانگوت ئاوا چوارشانەیە؟"

"زۆر لەوە سەیرترە کە باسیان دەکرد. دێوەزمەیەکی بێ شاخ و کلکە."

رۆژ ئاوا ببوو و شەو بەسەردا هاتبوو. لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون. سەری شووشەیان هەڵپچڕیبوو و مریشکی سوورەوەوەکراو و گۆشت بەرخ و هاروێی سەوز و ناسك و قوونچکەگوڵ و پەنیری سپی و بیبەری سەوز و هێندێك خواردنی دیکەشیان هێنا. دوو کچۆڵەی ژیکەڵە و کوڕەلاوێك خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆریان لەسەر سفرەکە ریز کرد.

"بەخۆشیتان."

"خۆشتان بێ."

"خۆشیتان."

"دەرد و بەلا لەگەڵ خۆی بەرێ."

"هەموو رۆژێکمان وەك ئەمڕۆ بێ."

"بەردەوام بێ و نەبڕێتەوە."

ئەوجار قۆڵیان لە خواردنەکان هەڵماڵی. ماوەیەك دەنگی تەقەی کەوچك و چەتاڵ و قاپ نەبێ، دەنگی هیچ نەدەهات. هەمووان بەبێ ئەوەی متەقیان لێوە بێ خەریکی خواردن و خواردنەوە بوون. ئاخرییەکەی داواکاری گشتی بێدەنگییەکەی شکاند:"بە دەستی کەلەپچەکراوەوە سێ دەوری ئەو بازارەی پێ لێدەدەم. دەبێ سزای ئەو تاوانانەی ببینێتەوە. دەبێ وای لێ بکەین. ئەگەر لێی خۆش بین، ولاتەکەمان تێدا دەچێ. هەر ئەو دەروێشە، هەر ئەو دەروێشە ئەو ولاتە بەرەو لەنێوچوون و فەوتان دەبا. گەنجەکانی راسپاردووە کتێب بخوێننەوە. ئێستا دەبێ سزای کردەوەکانی ببینێ."

قۆرت بۆغا پەیکەکەی هەڵێنا و گوتی بەخۆشیتان:"خۆشت بێ و هەر بژیی. نیشتمان قەرزباری خزمەتەکانت دەبێ، داواکاری گشتی. نیشتمان لە سۆنگەی ئەو خزمەتەتەوە... بەیانی تەلەگراف دەکەم بۆ ئەنکەرە... بە شانازیی داواکارە گشتییە مەزنەکەی شارەکەمان..."

پێکەکانیان هەڵدا.

"بەخۆشیی..."

جافر ئۆز پۆلاد کە هەتا ئێستا بێدەنگ ببوو، دوای هەڵدانی چەند پەیکێك زمانی کرایەوە. پەیکێکی هەڵدا و گوتی:"بەخۆشی. بە خۆشیی هەموو لایەك. هەمووان. دەمویست بڵێم ئەمن مەحمووده کورده باش دەناسم. وەك ڕۆژ لێم روونە قسە ناکا. لەم دنیایەدا کەس لەو کورده ئازاتر و بەجەرگتر و جوامێرتر و خۆڕاگرتر و پتەوتر نییە. قۆناغی منداڵیمان پێکەوە بووین. تۆ مەحمووده کوردەیەکت هەبێ، ئیتر پێویستیت بە سوپایەکی تەیار و پڕ چەك نییە."

داواکاری گشتی نێوچاوانی تێك نا:"قسە دەکا."

ملازمیش بە گنەگن و لە بن لێوانەوە گوتی:"ئەگەر دەتوانێ، با قسە نەکا. ئەوە دەیبینین."

ئەوانی دیکەش وێکڕا دووپاتەیان کردەوە:"دەیبینین."

"ئەمن بیست ساڵی ڕەبەقە شار بە شار گەڕاوم. بیست ساڵی ڕەبەقە ئەو ئۆزاتمالییانە دەناسم. عەریف حەسەنیش بنیادەم سەهلە، بەرد و ئاسنیش وەقسە دێنێ."

قۆرت بۆغا گوتی:"وەقسە دێنێ. بەردیش، خاکیش... ئەو ئۆزاتمالییانە مردووش وەقسە دێنن."

ئەسلان سۆوی پەنجە گوتی:"ئێستا نا ئێستا عەریف هەواڵی ئەوەمان بۆدێنێ کە کورده وەقسە هاتووە و ئەوەی دەیلێ نایلێتەوە و لێفە لەسەر هەتیوان هەڵدەداتەوە."

قۆرت بۆغا دیسان گوتی:"ئەو عەریفە زۆر بەتوانایە. دوو ساڵێکیش لە بنکەی گوندەکەی ئێمە خزمەتی کردووە. شەو ڕۆژ کاری ئەوە بوو کتێب بخوێنێتەوە لەسەر شێوازەکانی ئەشکەنجەدان. شێوازە تازەکەی ئەمریکا بۆ قسەدەرکێشان بەلایەوە هەر هیچ نییە. دوو ساڵ لە ئەستەنبوڵ و سێ ساڵ لە ئەنکەرە چووەتە خولی ڕاهێنانی چۆنێتیی وەقسەهێنانی تاوانباران. لەوانەیە کە مردوو وەزمان دێنێتەوە. مردووەك بە سێ ڕۆژان دێنێتە قسە و دەیباتە سەر مینبەر. مەحمووده کوردەی چی، مردووەکیش دێنێتەوە زمان."

ئاغاکانی شاری بۆ گرتنی مەحمووده کورده زەحمەتێکی زۆریان کێشابوو. پارەیەکی زۆریان خەرج کردبوو و چی پیاوی دەروێش بەگ بوون لە چیاکان، هەر هەموویان کڕیبوون. بەو حاڵەشەوە گرتنی مەحمووده کورده زۆری خایاندبوو. مەحموود وەك جیوە وایە و لە هیچ کوێ نەدەگیرسایەوە. تۆڕێکی هەواڵگرییان لە شاخ و چیاکان بۆ پێك هێنابوو کەس بڕوا ناکا.

دەروێش بەگیش پارە و چەکێکی زۆری بۆ دەنارد. ئەگەر حەیدەرە کوردە کە خۆی لە فرت و فێڵاندا چی لە مەحموود کەمتر نەبوو و لەو نەدەمایەوە، خەیانەتی پێ نەدەکرد، کەس نەیدەتوانی مەحموودە کوردە بگرێ. لەو کاتەدا کە فیشەکی لێ تەواو دەبێ و بەرەو جەندەرمەکان رادەکا بۆ ئەوەی بە فیشەك لێی بدەن، حەیدەرە کوردە لە پشتەوەڕا توند دەیگرێ و مەحموود لەو حاڵەتەدا ددانەکانی لەسەر یەك داگرتبوو و گرماندبووی:"ئیشەڵا رۆژێك چاومان بە چاوی یەکتری دەکەوێتەوە، حەیدەر."

جا حەیدەر لە وەڵامیدا تەنیا پێکەنیبوو.

ئەوی لەوێ بوون، لەسەر سفرەکەی قاباقچی ئۆغلی بە سەرسووڕمانەوە سەیری جافر ئۆز پۆلادیان دەکرد. ئەو چۆن وێرابووی لە وەها مەجلیسێکدا قسەی ئاوا بکا.

قایمەقام بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە گوتی:"لەوانەیە ئەو نەیەوێ قسان بکا، بەڵام وەقسەی دێنین. لەم سەردەمەدا ناتوانی قسە نەکەی."

ئەوجار دوکتۆر لەسەر قسەکەی رۆیی:"ناتوانی قسە نەکەی. بنیادەم سنوورێکی هەیە بۆ خۆڕاگرتن. ئاخرییەکەی دەشکێ. ئاخرییەکەی وای لێ دێ خۆڕاناگرێ و بنیادەم لێ دەکەوێ."

جافر ئۆز پۆلاد ملی بادا:"ئەو مەحموودە کوردەیەی من دەیناسم، ئەگەر بشیکوژی، مادامەکی خۆی نەیەوێ قسان بکا، هیچ هێزێك ناتوانێ وەقسەی بێنێ."

ملازم بە نێوچاوانێکی تاڵەوە ئاوڕی لە ئۆز پۆلاد دایەوە:"مەرج دەکەی لەسەر دە هەزار لیرە؟... ئەمن دەڵێم ئەوپەڕەکەی بە دووسەعات وەقسە دێ. هەتا ئێستا کەس پتر لە دوو سەعات نەیتوانیوە لەبەرانبەر ئەو عەریف حەسەنەدا تاقەت بێنێ و خۆ راگرێ. ئەمریکییەکان ئەو هەمووە لەو کارەدا وەك باقی بوارەکانی دیکە پێشکەوتوون، بەڵام سەریان لە شێوازەکانی عەریف حەسەن سوور دەمێنێ و وەباڵی بۆ دەکێشن. مەرج بکەین؟"

جافر ئۆز پۆلاد چاوقایمانە گوتی:"با بیکەین."

ئەوەی لەوێ بوون بە بێزارییەوە چاویان لە جافر ئۆز پۆلاد بڕی.

تۆزێك دواتر باسەکە گۆڕدرا. باس هاتە سەر خوشکەکەی دەروێش بەگ و ئەوەی کە وەچەی ساری ئۆغلی هەمیشە ئافرەتی ئاوا بە ئالۆوشی هەر لێ کەوتووەتەوە و زۆریان لەو بارەوە رست و دوکتۆر گوتی، ئەوە جۆرە نەخۆشییەکە. دوای ئەوە چوونە سەر باسی مورتەزا ئاغا کە چۆن داوێن و بنیاری کێوەکانی بەپانەوە دەکڕی و زەیتوونەکانی موتوربە دەکرد. دوایی هاتنە سەر سەرۆکی شارەوانی و باسی ئەوەیکە لە ئەدەنە "بارِ"ێکی پاوان کردووە و هەر رانەی ژنێکی

لەسەر داناوە و هەتا بەیانی لە پێڵاوی ژنەکاندا شامپانیی خواردووەتەوە و... ئەو کابرایە ئەو هەمووە پارەیەی لە کوێ بوو؟ هیچ کەس باسی ئەو تۆڕە قاچاغچییەی نەکرد کە ئەو پێکی هێنابوو.

ملازم لە سەر جێیەکەی خۆی ئۆقرە و ئارامی نەبوو و سات بە سات سەیری سەعاتەکەی دەکرد. جارێ دەچووە پشت پەنجەرەکە و دەگەڕایەوە و پەیکێکی هەڵدەدا و دیسان سەیرێکی سەعاتەکەی دەکردەوە و دیسان هەڵدەستایەوە. تەواو وەڕەز ببوو و دڵی تۆزێکی لێ هاتبۆوە. بە هەڵەداوان خواردنەکەی دەخوارد و بێ ئۆقرەییەکەی پێوە دیار بوو و بەردەوام دەچووە بەر پەنجەرەکە و دەگەڕایەوە...

"کوڕە هۆی گەنجۆ."

"فەرموو ملازم."

"بەو پۆلیسەی لەو خوارەیە بڵێ بێتە ئێرە.گ

پۆلیسەکە هات و پاژنەی پێی لێك دان:"ئەمر بفەرموو جەنابی فەرماندە."

"بڕۆ بە عەریف حەسەن بڵێ دەسبەجێ بێتە ئێرە."

"بەسەر چاو جەنابی فەرماندە.

تاوێك دواتر عەریف حەسەن هات. شەرمەزار بوو و سەری داخستبوو. دەستەونەزەر راوەستابوو، بەڵام خەریك بوو بەلادا دەهات. هەموو گیانی دەلەرزی و بۆی نەدەشاردرایەوە.

"چ بوو حەسەن؟ ئەوە سێ سەعاتە کە... هونەرەکەت هەموو ئەوەندە بوو؟"

"متەقی لێوە نایە جەنابی ملازم. هەر بیست نینۆکەکەیم دەرکێشاوە، بەڵام متەقی لێوە نەهاتووە. کارەبام لە گونەکانی دا، دیسان قسەی نەکرد. قەتم بنیادەمی وا نەدیتووە."

"چی دیکەی کرد حەسەن؟ کابرا سێ سەعات لەبەر دەستدا بووە، پیاو."

عەریف حەسەن بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ، گوتی:"هێشتا ماوێتی بۆ بەیانی جەنابی ملازم."

"چاوەڕێتم عەریف."

"لاساری وام نەدیتووە، جەنابی ملازم."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە لە جێی خۆی قیت بۆوە و رووی کردە عەریف حەسەن و گوتی:" بڕوانە عەریف، ئەمن دنیایەك پارەم لەسەر ئەوە داناوە. ئەگەر نەتوانی وەقسەی بێنی،

هەموو ریسەکانمان لێ دەبێتەوە خوری. هەوڵ بدە وەقسەی بێنی. هەزار لیرەشت دەستخۆشانە دەدەمێ. وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ."

ملازم:"وەقسە دێ."

قایمەقام:"وەقسە دێ."

دوکتۆر:"دەبێ وەقسە بێ."

داواکاری گشتی:"دیارە وەقسە دێ... کۆماری تورکیا هەموو شتێکی پێ دەکرێ."

قۆرت بۆغاش رووی کردە عەریف حەسەن و گوتی:"هەزار لیرەشت لای من بێ. هەر ئەوەندە بەسەر وەقسەی بێنی. ئەگەر ئەو قسە نەکا، دەکرێ بڵێین داهاتوومان رەشە عەریف. هونەری خۆت بنوێنە شێرەپیاو."

قاباقچی ئۆغلی:"هەزار لیرەشت لای من."

جافر ئۆز پۆلاد سەیرێکی هەمووانی کرد:"لە خۆڕاوە خۆ ماندوو دەکەن. بڕوانە عەریف، ئەگەر ئەتۆ توانیت ئەو مەحموودە وەقسە بێنی و تاقە یەك قسەی لە بنی زمانی دەربکێشی، ئەمن پێنج هەزار لیرەت دەستخۆشانە دەدەمێ."

ئالاتەمیر بە تەتەڵەی زمانەوە گوتی:"دوو هەزار لیرەشت لای من."

جا لە بنەوە پرسی:"جا قسە بکا، باشترە؟"

عەریف وەك گیانێکی تازەیان بە بەردا کردبێتەوە، گوتی:"قسە دەکا. ئاخرییەکەی لە زاری دەردەکێشم. دێوەزمەش بێ، شاخی دەشکێنم.

بە هەشتاو و بەپەلە وەدەر کەوت. ئەگەر وەقسەی هێنابایە، گەلێکی پارە دەست دەکەوت. وەك دەوڵەمەندانی لێ دەهات. هەر چۆنێکی بێ دەبوو قوفڵی زمانی بشکێنێ و مۆری سەر لێوی هەڵپچڕێ... ئیتر چ شێوازێك بەکار بێنێ باشترە؟ جگە لەوانەی لە خولە ئەمریکییەکاندا فێریان ببوو...

لە پێشدا کەوتە پاڕانەوە. ماوەیەکی زۆر لەبەر ئەو پیاوە پاڕایەوە کە شەڵاڵی خوێن بوو و زمانلووسیی کرد بۆ ئەوەی بەزەیی پێی دا بێتەوە. دەیگوت:"بڕوانە برالە، ئەتۆ بۆچی ئەوەندە لاساری دەکەی؟ چما من چیم لێت دەوێ؟ دوو قسەیە. پێی لێ نێ و تەواو. بۆ دەبێ لەخوت و خۆڕایی خۆت بە کوشتن بدەی؟ تۆ خوا ئەو لاوەتییەت حەیف نییە؟ ئەگەر بەزەییت بە گەنجێتییەکەتدا نایەتەوە، لانیکەم بەزەییت بە حاڵی ژن و منداڵەکەی مندا بێتەوە. باشە ئەو هەمووە کەللەرەقی و لاسارییە بۆچی؟ لەبەر کێ؟ وەرە و وەك منداڵی بنیادەمان قسە بکە و

ئەو گەمەیە ببڕێنەوە. تۆ گیانی من و منداڵەکانیشت، واز لەو لاساری و کەللە شەقییە بێنە. سەیر کە، هیچ دەزانی کە ئەگەر تۆ قسە بکەی، چ پارەیەك بەمن دەبڕدرێ؟ ئەوکات ئیتر بە قەرمی دەبمە عەریف و پلەم دەدرێتێ. عەریف. ئیتر واز بێنە و بیبڕەوە براله. تۆ گیانی من بەسە. خۆت بە قوربانی... کەر مەکە. تکات لێ دەکەم، لەبەرت دەپاڕێمەوە، چیت دەوێ دەتدەمێ. دەست و پێیانت ماچ دەکەم، خۆت لە ماڵی دەخەم. هەڵەیەکە و کردوومە و خۆم لە ماڵت خستووە. کلیلی بەختەوەریم بەدەستی تۆیە. مەهێڵە نانبڕاو بم. کوڕە بەخت و شانس هەر جارێك لە دەرگای پیاو دەدا. ئێستاش ئەوە تۆی دەبێ ئەو دەرگایەم لەسەر هەڵگری. سەیر کە گیانەکەم، بیست و پێنج ساڵی ڕەبەقە زەحمەت دەکێشم و خوێن دەخۆمەوە، ئەدی خوێنی دڵم دەخۆمەوە. پێت وایە زۆر سانایە؟ گاڵتە نییە براله، گاڵتە نییە. ئەو هەمووە سەگمەرگییەم کێشاوە، بەڵام تا ئێستا ئەوەندە پارەیەی بەڵێنیان پێ داوم، لە هیچ کوێم نەدیوە. مەحموود گیان، ئەمنیش ژن و منداڵم هەیە. رزق و رۆزییەکەیان مەبڕە. کوڕە هەر کەس رزق و رۆزیی خەڵك ببڕێ، سەری بەبڕین دەچێ. چما ئەو دەروێش بەگە چی تۆیە؟ لە حاڵێکدا من، من... هەتا دەمرم ئەو چاکەیەتم لە بیر ناچێ. ئەگەر ئەو چاکەیەم دەرهەق بکەی، وا دەکەم لەو بەندیخانەیە را بکەی. ئەگەر بڕیاری ئیعدامت بۆ دەربکەن، لە سێدارە دەتهێنمە خوارێ. وەرە و بڵێ مورتەزا بەگت بە ئەمری دەروێش بەگ کوشتووە. وەرە تۆ غیرەتت وا بڵێ. هەر ئەوەندە و هیچی دیکە. ئاخر چما ئەو قسەیە چی تێدایە ئەوەندەی لێ دەترسی و بە لاسارییەکەت ئەمن ماڵوێران دەکەی..."

عەریف حەسەن زۆری زمانلووسی کرد، بەڵام مەحموود زاری وەك تەڵەی تەقیو قووچاند و لێکی نەکردەوە. عەریف حەسەن ئاخرییەکەی تاقەتی نەما و بەسەریدا نەڕاندی:"ئەوە پێم گوتی. ئیتر هەرچی دەیبینی لە چاوی خۆتی دەبینی. دوای ئەوە ئیتر کەیفی خۆتە و هیچ خەتای من نییە. ئەمن ئەوەی دەمەوێ، هەر چۆنێکی بێ، لە بن زمانتی دەردەکێشم."

جافر ئۆز پۆلاد گوتی:"با مەرج بکەین."

ملازم بەتووڕەیی و لێبڕاوانە گوتی:"وەقسە دێ."

قایمەقام گوتی:"کۆمارەکەی تورکیا..."

ئالاتەمیر کە مەشرووبی نەدەخواردەوە و دەستی لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو و تاقەتی نەمابوو، گوتی:"هەر بژی و بەردەوام بێ."

دوکتۆر بەتەوسەوە گوتی:"ئەوە ئەوپەڕی بێ شەرەفییە. لایەنگرییە لە پیاوکوژێکی چەپەڵ. وا نییە؟"

جافر ئۆز پۆلاد لەسەرخۆ پرسیی:"لەگەڵ منتە؟"

وێکرا گوتیان"جا شتی وا دەبێ؟ ئەتۆ دەڵێی چی؟"

دوکتۆر و جافر ئۆز پۆلاد هەردووکیان بێدەنگ بوون.

قۆرت بۆغا سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و بەنیگەرانییەوە پرسیی:" سەعات بووەتە چوار و چی وای نەماوە بۆ بەیانی. عەریف حەسەنیش سۆراغێکی نییە."

ملازم گوتی:"ئێستا پەیدا دەبێ. ئەنگۆ خەمتان نەبێ."

"ئەگەر ئیزن بدەن، ئەمن بە دوو خولەك وەقسەی دێنم جەنابی ملازم. لێم دەگەڕێن؟"

"قەی چی دەکا. ئەگەر پێت وایە شتێکت لە دەست دێ، فەرموو. گرنگ ئەوەیە کابرا وەقسە بێنی. جا لەگەڵ عەریف حەسەن بێ یان هەر خۆت بەتەنێ."

قۆرت بۆغا بەلارەلار چووە بنکەی پۆلیس. دەیزانی مەحموود لەکوێ ئەشکەنجە دەکرێ. لە دەرگای دا. حەسەن دەسبەجێ دەرگاکەی لێ کردەوە. لە ژوورەوە شەش زابتی لێ بوو و مەحموودیش کە لە نێو کۆت و زنجیر و قوڕ و پیساییدا بێ جووڵە کەوتبوو. کزە تیشکێکی لامپاکە کەوتبووە سەر دیوارەکە و لەسەر ئاڵقەکانی زنجیرەکە شۆقێکی خەفەتبارانەی دەدایەوە....

قۆرت بۆغا فەرماندەرانە گوتی:"هەمووتان بڕۆنە دەرێ. ئەتۆش عەریف... دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم. بە زمانێکی خۆش..."

دەرگاکە بەجیڕەجیڕ کرایەوە و بە دوای زابتەکان و عەریفدا داخرایەوە. قۆرت بۆغا هاتە ژوور سەری مەحموود و دەستی راستەی خستە نێو دەستی خۆیەوە. دەستە خوێناوییەکەی مەحموود گەرم بوو.

"خۆ عوسمانت دەناسی؟ هەر لەو شوێنەی تۆ لێی کەوتبووی، گیانی دەرچوو. بە زەجر و ئەشکەنجە چی خوێنی دەرمای بوو کێشایان. خۆ زۆر باشیش دەزانی سی و نۆ کەسیان بە بیانووی ئەوەی لەگەڵ دەستەی حاجی وەلی ویستوویانە رابکەن، لە سەر لێواری هەڵدێرێك لە ساری چام ریزیان کردن و یەکسەر گوللەبارانیان کردن. بەڵام چ بوو؟ باشە کەس گونی گرتن؟ یوزجویان کوشت و تەرمەکەیان لە بنکەی پۆلیسی یالینزتۆت فڕێ دایە نێو خەرەندێکەوە و گوتیان لە راکردنێدا لێی دراوە. کێ لێی پرسینەوە؟ سەری رەسوولێیان بڕی و بۆ ئەوەی ببێتە

پەندی عالەمێ و گوندیی پێ چاوترسێن بکەن، ناردیانەوە بۆ دایکی... کێ بانگ کرا بلێن بۆ؟ جەندەرمە هەشت کەسیان لە گوندەکەی ساری تانیشلی لەبەر چاوی گوندییەکان لەتوپەت کرد هەتا گیانیان بە قوونیاندا دەرچوو، کێ مێشێکی لێ میوان بوو؟ چما ئەتۆ هەموو ئەوانەت نەدی و نەتبیستنەوە؟ ئێستاش بەر لەوەی تاو هەڵبێ، تۆش دەکوژن. تەنانەت دکتۆر پسوولەی ناشتنەکەشتی نووسیوە. باشە.... تۆ حەیف نی؟ کورە لێ گەڕێ با لە جێی تۆ دەروێش بکوژرێ. بەڵێنت دەدەمێ رزگارت دەکەم. لە ئاقچاساز زەوی و زارت دەدەمێ. وەرە و ئەو هەلە لە دەست مەدە برالە. مەحموودەکەم. چاوی چاوم. یاڵڵا دەی زوو بە. هەتا درەنگ نەبوو قسە بکە، قسە بکە و بڵێ دەروێش رایسپاردم مورتەزا بەگ بکوژم. یاڵڵا زوو بە گیانی من... ژیانی خۆت رزگار بکە ئەگینا..."

دەنگی وەك دەنگی دایك و باب و برا، میهرەبان و بلاوێن بوو....

دیسانیش قسەی بۆ کرد. بە دوورودرێژی و سۆزدارانە و دۆستانە و برایانە. بەڵام مەحموود زاری وەك تەڵەی تەقیو، متەقی لێوە نەهات. قۆرت بۆغا ئیمانی نەما و بە نووکی پێی مەحموودی جووڵاند و بە دەنگێك کە بە ئاشکرا تووڕەیی پێوە دیار بوو، گوتی:"مەحموود، مەحموود، مردی؟ گیانت بە قوونتدا دەرچوو؟ هەی دایك و ژنەکەت بگێم... گەودا... کوردی کەللە رەق، حەیوان..."

لە داخان نەڕاندی:"عەریف حەسەن، عەریف حەسەن، ئیتر گوناحی ئەو کابرایە لە ئەستۆی من نییە. بیکوژە ئەو دایك قەحپەیە..."

دەنگەکەی بڕایەوە و خێرا و لە حاڵێکدا رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو، هاتەوە و چۆوە نێو دیوەخانەکەی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی و بە دەنگێکی تەواو جاڕزەوە گوتی:"قسە ناکا."

جا پەیکە ئارەقەکەی خۆی بەسەرییەوە نا.

جافر ئۆز پۆلاد هەستایە سەر پێیان و گوتی:"لێم گەڕێن با ئەمنیش سەرێکی لێ بدەم. برادەری منداڵیم بوو. لەوانەیە قسەی من لە عەرزی نەدا. گەلێك جوامێر و پیاوە."

هەمووان وێکڕا گوتیان:"بچۆ. برادەری منداڵیتە و قسەت ناشکێنێ."

جافر ئۆز پۆلاد پەیکەکەی خۆی هەڵدا و لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

داوێنی ئاسۆ وردە وردە روون دەبۆوە و چەند کەڵەبابێك وەدوا کەوتبوون و لە گۆشە و قەراغی ئاوەدانی هێشتا دەیانقووقاند. کە گەیشتە پشت دەرگای ئەشکەنجەگایەکە، دەنگێکی وەك دەنگی خرمەی شکانی بیست. بەندی جەرگ و دڵی داخورپا. دەسبەجێ لە دەرگایدا.

عەریف حەسەن دەرگاکەی کردەوە، کە چاوی بە جافر ئۆز پۆلاد کەوت، تۆقیو و وەگیان هاتوو گوتی:"قسە ناکا. قسە ناکا. دەترسم نەتوانم وەقسەی بێنم."

ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا.

جافرئۆز پۆلاد فەرمان دا:" ئەنگۆ بڕۆنە دەرێ. هەمووتان. لێگەڕێن ئەمنیش با دوو قسەی لەگەڵ بکەم."

مەحموود بەنیوەزیندوویی لەسەر تەختی چیمەنتۆیەکە تەڕ و خووساو کەوتبوو. خوێن لە قوڵکەکانی تەختی ئەشکەنجەگاکەدا مەیبوو. بۆنێکی هێڵنج هێنەر ژوورەکەی پڕ کردبوو. جافر ئۆز پۆلاد رووی وەرگێڕا و بەر دەم و لووتی گرت و ئەوجار دەستی پێ کرد:"کاکە کوشتوویانی. ئەو خوانەناسانە کوشتوویانی. مەحموود، بڵێ براله... بۆچی کەللەرەقی دەکەی؟ ئەگەر قسە نەکەی دەتکوژن. دەروێش بەگ ئەوپەڕەکەی هەژدەساڵی زیندان بۆ دەبڕنەوە. ئەتۆش لێبوردنت بۆ دەردەچێ و بەر دەبی. خۆت بۆ دەروێش بە کوشت مەدە...."

بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکا، خۆی گەیاندە دەرێ. لەبەر بۆگەنەکەی ناوەوە چی نەمابوو بڕشێتەوە.

یەك پشوو هەتا ماڵەکەی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی رۆیشت و هەر وەژوور کەوتەوە، بە هانکەهانك گوتی:"تینی قسەکردنی تێدا نەماوە. بەحاڵ زیندووە. مەحموود ناژی."

پەیکەکەی هەڵگرت و بەسەرییەوە نا.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی هەستا و گوتی:" با منیش تاقیی بکەمەوە. ئەوە چووم."

قاباقچی ئۆغڵی بە ترسەترس و لە حاڵێکدا لاقەکانی تێك دەئالان، لە دەرگای ئەشکەنجەگاکە وەژوور کەوت و هەر چاوی بە مەحموود کەوت، گوتی:"مەحموود، مەحموود، مەحمووده کوردە؟ شەرت بێ ئەگەر ناوی دەروێش بەگ بێنی، مەزرایەکی دوو هەزار و پێنج سەد دۆنمت لە ئاقچاساز دەدەمێ، ئەگینا دەمری. ئەگەر راستییشت دەوێ، ئەتۆ ئیتر زیندوو نیت و وەك مردووان وای..."

دوای ئەو قسانە، دەمودەست وەدەرکەوت. کە گەڕایەوە، سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەش خۆی تاقی کردەوە. کابرای شەلاڵی خوێنی لە باوەش گرت، زمانلووسیی کرد. مەحموود بە یەك وشەش چییە وەڵامی نەدایەوە.

"دەمری. دەمری. باشە ئەو گەنی و جوامێرییەی تۆ حەیف نییە؟ کوڕم هەر قامێکی تۆ سەد سەگی وەك دەروێش دێنێ... شێرە پیاوەکەم...."

ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"حەیف."

لەوێ وەدەر کەوت. کە وەژوور کەوتەوە، بە ناخۆشییەوە گوتی:"تازە ناژی. هیچ قسەیەك کاری لێ ناکا. خەریکە دەمرێ. دەمرێ. بەبێ ئەوەی قسەیەکی لە زاری بێتە دەرێ دەمرێ."

داواکاری گشتی:"دیارە."

قایمەقام:"کۆماری تورکیا دەتوانێ مردووش وەقسە بێنێ."

جافر ئۆز پۆلاد هەستا، دەستێك بە جامی بادەوە و دەستێکی لەسەر سینگی دانا و دروشمی دا:" ئەی تورك، شانازی بکە، هەوڵ بدە و دڵنیا بە..."

وێکڕا چەپڵەیان لێ دا و گوتیان بژی.

ئالاتەمیریش هەستا:"ئیزن بدەم ئەمنیش خۆمی لەسەر تاقی بکەمەوە."

دەستی لەسەر ئەژنۆی هەڵگرت و هەستا. کە گەیشتە ئەشکەنجەگاکە، چی نەمابوو تاو هەڵبێ. بە پێڵوو تررووکاندن چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا و نیگای لەسەر مەحموود گیرسایەوە و لێوەکانی لەسەر یەك جووڵان:"ئاخ، وەییش ش ش ، کوشتوویانی."

جا لە تەنیشتی هەڵتووتەکا و بە هێواشی سەری بردە بن گوێی و گوتی:" خۆ ڕاگرە برالە. چی نەماوە تاو هەڵبێ. دەروێش ئاشکرا مەکە. ئاشکراشی بکەیت هەر دەتکوژن، نەشیکەی هەروا. لەگەڵ تاوهەڵاتنێ دکتۆر دەرزییەکی ژەهرت لێ دەدا و دەتکوژێ. کۆڵێکمان پارە داوەتێ بۆ ئەو کارە. ئێستا کە تۆ هەر ڕزگار نابی، دەروێش بە کوشت مەدە. خوا حافیز. گەردنم ئازاکە شێرە کورد."

بە گریانەوە و لە حاڵێکدا سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەقەنرا، وەدەر کەوت. ناچار بوو لە پشت ماڵەکەی ماهیر بەگ ماوەیەك ڕاوەستێ. فرمێسکی بەچاوییەوە بەند نەدەبوو. بەخۆی دەگوت:"ئەو پیاوانەی دەوڵەت و ئەو ئاغاواتانە هیچ دین و ئیمان و بەزەیی و ئینسانییەتیان نییە. هەموو ساڵێ هەزاران خەڵکی داماو بەو جۆرە دەکوژن. دەکوژن."

دوای سڕینەوەی فرمێسکەکانی بە دەسرۆکەیەك، لە پلیکانەکان وەسەر کەوت.

گوتیان:"زۆرت پێ چوو، چ بوو؟"

"قسە دەکا. چاری نییە."

ملازم:" قسەی تێدا نییە وەقسە هەر دێ. عەریف حەسەن..."

"فەرموو گەورەم."

"بەر لە تاوهەلاّتنیّ، وەقسەی بێنە. هەر بەلاّیەکی دەیزانی و چی لەدەستت دێ بەسەری بێنە. هەر چۆنێك بیّ لە زاری دەربکێشە."

"قسە دەکا بەگی خۆم."

دکتۆر بەخەوالّوویی و کاس و گێژییەوە هەستایە پیّ. لە دوێنیّ شەوێوە بە سەدان نۆبەتێدار و تا لێهاتوو، لە پشت عەیادەکەی ریزیان بەستبوو. دکتۆر پێنج سالّ لەوە پێش راسپێردرابوو لەو شارۆچکەیەدا خزمەت بکا. لە بنەمالّەیەکی دەستکورتی ئەرزەرۆمیدا لەدایك ببوو. لە ئەستەمبولّ بە هەزار کوێرەوەری و دەردیسەری و برسێتی دەرسی خوێندبوو و رقی لە هەرچی بوونەوەری سەر ئەو زەوییە هەلّگرتبوو. تاقانە دکتۆری شارۆچکەکە بوو و هەموو رۆژێ دەرزیی "کینین"ی لە سەدان کەس دەدا.

لە شارۆچکە دەمگۆی ئەوە داکەوتبوو کە بەهۆی گرانبوونی دەرزیی کینین، لە جێی ئەو دەرزییە هەر ئاویان بۆ دەکاتە سرنجەکەوە. کورتی ببڕینەوە، دکتۆر لە ماوەی پێنج سالاّندا مالّ و سامانێکی زۆری وەسەر یەك نابوو. باغێکی پرتەقالّی هەبوو حەفتا دۆنم و زەوییەکیشی هەبوو شەش هەزار دۆنم لە ئاناوەرزا. مالّێکی شایانەشی لە نێوەڕاستی باخچەکانی بۆ خۆی ساز کردبوو...

باوێشکێکی دا و گوتی:"ئەمن دەبیّ بڕۆم. ئەو کوردە کەللە رەقە قسە ناکا. ئەمن راپۆرتەکەی دەنووسم."

قەلّەم و کاغەزەکەی دەرهێنا. یەك دوو جاران بە نووسینەکەیدا چۆوە و دوایی سەرێکی لەقاند کە یانی بەلّیّ باشە و بۆ لای داواکاری گشتیی راداشت:"

"بەهۆی راوەستانی دلّەوە، لە کاتی راگواستنیدا بۆ بنکەی پۆلیس لە رێگایە مردووە... ئەگەر مرد ئەوە بەلّگەی مردنەکەی و ئەگەر نەشمرد و ژیا، بیدڕێنن و فڕێی بدەن..."

عەریف حەسەن:"نامریّ دکتۆر بەگ."

گوتی و وەدەر کەوت.

دکتۆر:"ئاااا، ئەگەر نەمرد، بەلّگەی مەرگەکەی دەدڕێنن و تووڕی دەدەن، ئێستا نەخۆش دەرگای عەیادەکە لە رێسمە دەبەن. من وا رۆیشتم."

حاجی قۆرت بۆغا هەستایە سەر پێیان:"دکتۆر، شتێکم بە مێشك گەیشت کە دەمویست پێتانی بلّێم."

"چ شتێك؟"

ملازمیش کە رەنگی روخساری وەك پەڕی کاغەز سپی هەڵگەڕابوو، بەماندوویی و وەڕەزییەوە گوتی:"چ شتێك".

داواکاری گشتیش خەواڵوو و رەنگ پەڕیو قسەکەی ملازمی دووپاتە کردەوە:"چ شتێك".

"بەگەکان، ئاغاکان و هەروەها مامۆستا بەگ دەڵێن..."

رۆستەم بەگ کە لە خەونووچکە راچڵەکیبوو، بەبێ ئەوی بەدەست خۆی بێ پرسیی:"دەڵێن چی؟"

"ئاغا و بەگەکان دەڵێن، با بەهەمووومان کاغەزێك بگرینەوە و بڵێین مەحموودە کوردە وەقسە هاتووە و ئیمزاکەشی لە بنی بدەین."

ئەسلان سۆوی پەنجە گوتی:" با لێی بدەین."

جافر ئۆز پۆلاد گوتی:" با لێی بدەین. ئەی هاوار و داد. باشە بۆچی لەو دەمەوە بیرمان لەوە نەکردبۆوە و شەوەکەمان لە خۆمان تێك دا؟"

ئالاتەمیر ئاخێکی لە ناخەوە هەڵکێشا و گوتی:"تف، مەحموودە جوامێرەکەیان کوشت. حەیف..."

قاباقچی ئۆغڵی بێدەنگ بوو.

ملازم هاواری کرد:"نەخێر، ئەو بەچەقی لەعنەتدا چووە، ئەوجار... قسەش دەکا."

داواکاری گشتی گوتی:"بەچەقی لەعنەتدا چووە. ئەویش لە بەرامبەر کێدا؟ لە بەرامبەر هێزەکانی دەوڵەتدا. لە بەرامبەر هێزەکانی دەوڵەتەکەماندا راوەستاوە و ملی باداوە. ئەو یاغییە. یاغییە. ئەگەر ئەمڕۆ قسە نەکا، ئێمە سبەی رۆژێ ناتوانین ئەو خەڵکە بێدەنگ بکەین و دەرەقەتیان نایەین. ئەگەر ئێمە نەتوانین وەقسەی بێنین، ئیتر خەڵك هەر ترێکیشمان بۆ ناکەنن. کەوابوو دەبێ ئەو یاغییە، ئەو لاسارە وەقسە بێ. ئەو دەبێ قسە بکا. قسەش دەکا، گەورەم، ئاغای من."

قایمەقامیش لەسەر قسەکەی داواکاری گشتی رۆیشت:"قسە دەکا. ئێمە ئیزن بەکەس نادەین ئاوا لە هێزەکانی دەوڵەت یاغی بێ. ئەگەر نەتوانین چەند کاغەز و بەڵگەیەکی بۆ پێکەوە بنێین، ئەوە نیشانەی کەمتوانایی ئێمەیە. دەوڵەت بەڵگەی تەزویر پێکەوە نانێ. ئەو پیاوە دەبێ قسان بکا. تەواو."

ئیتر ملازم کە دەتگوت کەوانە وێك هاتووە، لە جێی خۆی دەرپەڕی و هاواری کرد و ژوورەکە لە دەنگی پڕ بوو:"ئیزنی ئەوە تەنانەت بە مردوویەکیش نادەین کە... دەستدرێژیی

بکاته سەر یەکپارچیی نیشتمان و ئاسایشمان و بەربەست بێ لەبەردەم بەختەوەری و ژیانی میللەتدا و کۆسپ و تەگەرە بۆ سەقامگیریی دوایی دەوڵەتی تورك دروست بکا. لێش ناگەڕێین، تەنانەت مێشوولەیەکیش زیان بە بەرژەوەندیە باڵاکانمان بگەیەنێ. حکوومەتێك، دەوڵەتێك بەڵگەی تەزویر دروست ناکا. دوایین دەوڵەتی تورك..."

بە هانکەهانك لەسەر جێیەکەی دانیشتەوە و لە حاڵێکدا لەبەر تووڕەیی لێوەکانی دەلەرزین، پەیتاپەیتا دەیگوت:"ئەنگۆ دەڵێن چی؟ رای ئەنگۆ چییە؟ ئەو چ قسەیەکە؟ بەڵگەی تەزویر؟ ئەوە چ قسەیەکە؟..."

داواکاری گشتییش وەك ملازم قیت بۆوە و لە حاڵێکدا هەوڵی دەدا وا بنوێنێ کە تووڕەیە، وای نەڕاند دەماری ملی هەستان:"ئەگەر تەنانەت مێشوولەیەکیش، جانەوەرێکیش، مێشێك، قالۆنچەیەك و تەنانەت مێروولەیەك بیەوێ دژمان راوەستێتەوە، بە هەموو هێزی خۆمانەوە لێی دەدەین. خاکی بەتوورەکە دەکێشین. ئەوە چ قسەیەکە."

دەستەکانی وا لێك کردنەوە دەتگوت فێری هەڵفڕینیان دەکات و لە حاڵێکدا خۆی بەرەو پێش و دواوە دەنوشتاندەوە، لەسەری رۆیشت:"ئەوە چ قسەیەکە؟ ئەنگۆ دەڵێن چی؟ بەڵگەی تەزویر دەرهێنان چییە؟ شتی وا نەبووە و ناکرێ. حکومەتەکەمان دەتوانی مەحموودە کوردە وەقسە بێنێ."

قۆرت بۆغا:"دەتوانێ."

ئۆز پۆلاد:"دەتوانێ."

ئەسلان سۆوی پەنجە:"دەتوانین."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی: ئەوە چ قسەیەکە لە زارمان دەردەپەڕێ و ئابڕووی دەوڵەتەکەمان دەبا. کێیە پێشنیاری وا دەکا؟"

هەمووان وێکڕا پرسییان:"کێیە؟"

ملازم بە دەنگێکی بەبڕشت و دڵنیا و تووڕەوە گوتی:"مەحموود وەقسە دێ."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە گرماندی:"وەقسە دێ. کێ دەتوانێ لە بەرامبەر هێزی دەوڵەتدا خۆ راگرێ؟"

دکتۆر:" ئەگەر هات و قسەی نەکرد و مرد، ئەوە بەڵگەی مردنەکەیتان بەدەستەوەیە."

خۆر رمبێك لە ئاسمان هەڵکشابوو کە عەریف حەسەن گەڕایەوە. ئەوانەی لە چاوەڕوانیدا تەواو وەڕەز ببوون و وەگیان هاتبوون و هەر کامەیان ببوونە تۆپەڵەیەك لە تووڕەیی، یەك پێ

هەستان و چاویان لە زاری حەسەن بڕی... عەریف هەموو گیانی خوێناوی و پیسایی بوو. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و دەموچاوی درێژ ببۆوە. ئەو بنیادەمە تێکسمڕاو و تێك شکاو و سەرشۆڕە هیچ لە عەریف حەسەنەکەی یەکەم شەو نەدەچوو.

ملازم سێ جاران بە دەوری عەریف حەسەندا کە لاقی بەسەر عەرزەکەدا کێشابوو و هاتبووە نێوەڕاستی ژوورەکە، خولایەوە وپرسیی:"چ بوو؟ وەقسە هات؟"

حەسەن زمانی تەتەڵەی کرد و بە دەنگێکی کە بەحاڵ دەبیسرا گوتی:"هەتا گەرووی لە عەرزم گرت و ئەوجار بە شێوازە ئەمریکییەکە بە پەمپ فووم دا."

"دوایی، دوایی، دوایی....؟"

"زۆر کەللە ڕەقە."

"دەزانم. دەزانین لاسارە. بەڵێ لاسارە. وایە... دوایی... ئاخری وەقسەت هێنا؟ ها؟"

"من، من، من... من... لەوەتەی هەم پیاوی ئەوەندە لاسار و کەللە ڕەقم نەدیوە."

ملازم توند قۆڵی گرت و رایکێشا:"ئاخرییەکەی چ بوو؟ ئاخرییەکەی چ بوو؟"

"لاسار، لاسار، لە لاسارییان..."

ملازم هەڵچوو و بە نووکی پۆتینەکەی گرم لە بن ئەژنۆی عەریفی کوتا:"دەی گیانت دەرچێ قسە بکە. دەی گیانت دەرچێ دەی. چ بوو؟"

عەریف بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"مرد. کەللەرەقییەکەی خۆی سەری خوارد. کە فوومان دەدا... زۆریشمان فوو نەدابوو..."

ملازم وەك شێتان لووراندی:"ئەمنیش ئەتۆ، ئەمنیش ئەتۆ، ئەمنیش ئەتۆ دەکوژم."

حەوت کۆڵان لەولاترەوە گوێیان لە نەرەنەرِی دەبوو. بە تووڕەییەکی هەوسارپچڕاوەوە گرووبان* (عەریف)ی دایە بەر مست و شەق. گرووبان کە لەبەر ماندوویی و شەکەتی خۆی لەسەر پێیان ڕانەدەگرت، هەر بە یەکەم شەق وێك هات و لەسەر عەرزەکە گرمۆڵە بوو. نووك و بنی پۆتینەکەی ملازم وا وەپشت و کەلەکەی دەکەوت، هەردووکیان نیوەگیان ببوون. ملازم هەتا تەواو قینی خۆی پێ نەڕشت، دانەمرکایەوە و خۆ ئەگەر دادوەر نێوبژیوانیی نەکردبایە، خوا بزانێ گرووبان لەبەر ئەو پێ لەقانەدا چی لێ دەهات.

"ئەوەندە پیش مەخۆوە و هەڵمەچۆ ملازم. خۆت بۆ ئەو هیچ و پووچە سووك و چرووکانە مەکوژە. بەزەییت بەخۆتدا بێ ملازم. تێدا دەچی."

*گرووبان/ عەریف: دەرەجەیەکی سەربازییە.

جا بن پیلی گرت و لەسەر کورسییەکەی داینایەوە.

ملازم دوای ئەوەی تۆزێك دامرکایەوە و هێندێ وەخۆی هاتەوە، بە زەردەخەنەیەکەوە کە تۆزێك لێوەکانی لێك کێشابۆوە پرسیی:"یانی قسەی نەکرد و مرد؟ کەوابوو دەوڵەتی کۆماری تورکیا بەو مەزنییەوە دەرەقەتی نەهات؟ بە مەرگی خۆی ئێمەی بەزاند، ئای دەستخۆش."

خەریك بوو دیسان هەڵدەچوو و تووڕە دەبۆوە، هەرچۆنێك بوو، بەسەرخۆیدا زاڵ بوویەوە و بەدەنگێکی هێمن گوتی:"هەستە گرووبان. هەستە. تازە هەر مردووە، کەلاکی ئەو سەیە هەڵگرە و بیبە لە گۆڕەپانەکەی نێوەڕاستی بازاڕ فڕێی بدە... هەرچۆنێك بێ هەموان دەزانن چۆن مردووە. لانیکەم با بۆیان ببێ بە پەند..."

تەرمی ونجڕونجڕ و شپرزەی مەحموود ماوەی دوو ڕۆژ و دانێك لەسەر ئەو گۆڕە مەڕمەڕینەی لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە مابۆوە و کەوتبووە مەیدانی بازاڕەکەوە، مایەوە. مێشی سەوزی ڕەنگی پۆلایی پەیتا پەیتا لێی دەنیشتن و دەفڕینەوە.

# ٤٥

ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا لەبەر قرچەی گەرماکەدا هەڵدەچۆقا و دووکەڵ و هاڵاویان لێ هەڵدەستا. بۆن و بەرامەی جاترە و نەعنا لەسەر ڕەوەزەکان نیشتبوو و ئەو بایەی جار و بارە هەڵی دەکرد، شەپۆلێکی بۆن و بەرامەی جاترە سووتاو دێنا. مێش  بە بن سکی سەوزی پۆلاییینەوە و بە باڵی کەسك و ڕوونەوە، بە بریسکەبریسك لە دەوری پوورە هەنگەکانیان دەخولانەوە. لە چەقی ڕەوەزە مۆرە وشك و برینگ و پەڵەپەڵە سپی تێکەوتووەکانەوە، لوورەیەك هەستا. ئەو گوڵانەی یۆنانییەکی چاخی کۆن چاندبوونی، لێرە و لەوێ لە ڕەوەزە مۆرەکاندا، ئەرخەوانی دەچۆوە. دیوارە ئەستوور و پتەوەکەی کۆنەقەڵاکە پاڵی بە سەدەکانەوە دابوو و بە گابەردە داتاشراوەکانییەوە لە نێوان دەوەنەکانی جاترەدا و وشترالووك و هەنجیرە کێوییەکاندا قوت دەبۆوە. لەتوپەتی کاشییە جوانکاریکراوەکان بە هێڵی شین و ڕەش و سپی لە سەر ڕووکارە قاوەییەکە، خاکە کێوییەکەی دەنەخشاند. مارێکی خاڵ خاڵی قورس و پوولەکەدار لە نێو لەتە کاشییەکانەوە بەسپایی دەخزییە کەلێنێکەوە. مارمێلکە دروێشە سوورەکان سلۆك سلۆك بە دروێشەی دەرکێشراویانەوە، لەملاوە بۆ ئەولا ڕایان دەکرد. پۆلە کەوێکی قاوەیی لە پەنای گابەردێی ڕەگەسوور، بە سینگی شینی درەوشاوەیانەوە، بە دەندووك و لاقی سووریانەوە، بە باڵە سپی و ڕەشەکەیانەوە و بە لەشولارە کەسکە ڕوونەکەیانەوە لە نێو خۆڵە نەرمەکەدا چینەیان دەکرد. بەردەکان وا سوور ببوونەوە، دەست نەیاندەوێرایە. ئەو بایەی تۆزێك لەوە پێش جاروبارە هەڵی دەکرد، ئیتر پشووی لێ بڕابوو.

سێ پیاوی دەست و پێ بەستراویان لە سەر ئەسپەکانەوە فڕێ دایە سەر ڕەوەزەکان. پیاوە دەست و پێ بەستراوەکان متەقیان لێوە نەهات. بێ جووڵە و لە حاڵێکدا ددانیان لەچیڕەوە بردبوو، لە سەر ڕەوەزە سوورەوەبووەکان مانەوە. دەبرژان و دانیان بەخۆیاندا دەگرت.

دەروێش بەگ چەکمە لە پێ لە سەر ڕەوەزەکانەوە هات و چۆی دەکرد و جار نەجارێکیش بە تیلەی چاو سەیرێکی مستەفا بەگی دەکرد کە لەسەر گازەرای پشت کەوتبووە سەر ڕەوەزەکان. لاقەکانی هیدایەت توندوتۆڵ هەتا ئەژنۆی هەڵبەسترابوون. دەروێش بەگ بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، نیگای دەچووە سەر گونەکانی مستەفا بەگ و لەخۆڕا بیری لە گونەکانی دەکردەوە. بچووك ببۆوە و گرمۆڵە ببوو و هەر دەهات و بچووکتر و گرمۆڵەتریش دەبووەو و ڕەش هەڵدەگەڕا. چی وای نەمابوو لە نێو پێیەکانیدا ون بێ. گونی پیاوی ڕەسەن و ئەسپی نەجیم لە کاتی خەوتنێدا بچووکتر دەبێتەوە... و لە بەخەبەریدا هەتا تووڕەتر بێ، گەورەتر دەبێتەوە. مرۆڤایەتیی کۆن گەورە و بچووکبوونی گونەکانی کردبووە پێوەری هەڵسەنگاندی ڕەسەنایەتیی بنیادەم. هەر ئەندامێکی جەستەی بنیادەم، لووتی، لێوەکانی، چەناگەی، لاقەدرێژەکانی، مەچەکە ناسکەکانی و ئەندامەکانی دیکەی کە نیشاندەری ڕەسەنایەتیی ئەون، دەگۆڕدرێن، بەڵام گونی بنیادەم یان ئەسپی ڕەسەن ناگۆڕێ. لە یۆنان و ڕۆمی کۆندا، درێژتربوونی دووەم قامکی پێ لە قامکەکانی دیکە نیشانەی ڕەسەنایەتی بوو. ئەوە درۆیە و هەڵبەستراوە... ئەوان نەیاندەزانی گون چییە. کۆمەڵگەکانی یۆنان و ڕۆم رووخابوون. کۆمەڵگە کۆنەکانی وەك سۆمەرییەکان و ئۆرارتووەکان و هیتییەکان، بە دڵنیاییەوە زانیویانە گون نیشانەی ڕەسەنایەتییە. گونی دەروێش بەگیش ڕێك وەك گونی مستەفا بەگ وابوو. ئەوە بەرێکەوت نەبوو. هیی باب و باپیرە و مامەکانیشی بێ گومان هەر وا بووە. داهاتەوە و لە تەنیشت لاقەکانی مستەفا بەگ کە لەسەر تەختە بەردەکە هەموو گیانی توند ببوو و دەلەرزی، هەڵتووتەکا و چاوی لە لاقەکانی ئەو بڕی. سەیرە، دووەم قامکی پێشی لە قامکەکانی دیکەی درێژتر بوو. دەسبەجێ لەوێ دوور کەوتەوە و بەرەو دیوارەکە چوو و لە پشت گابەردێك چەکمەی لە پێی خۆی داکەند و بە سەر سووڕمانەوە لێی ورد بۆوە. دووەم قامکی لاقی ئەویش درێژتر بوو. دڵخۆشیی ڕەسەنایەتی ناخی تەنییەوە. بەخۆی گوت: هەیە. بێ گومان بنیادەمی ڕەسەن هەیە. بنیادەمەکان دەبێ بە پێوەری گون و قامکی دووەمی لاقیان هەڵسەنگێنرێن... ئەگەر یەکێك لەوانە لە بنیادەمدا هەبن، ئەوە نیوە ڕەسەنە و ئەگەر هەردووکیشیان هەبوون، ئەوە بەروپشت ئەتڵەسە و تەواو ڕەسەنە. جوامێری و پیاوەتییش هەیە. بنیادەمی ڕەسەن بە مەرگ نابەزێ و مل کەچ ناکا. بنیادەمی ڕەسەن لەبەر ژیانێکی هەورین، خۆی نادۆڕێنێ. بەپەلە چەکمەکەی لەپێی کردەوە و لە حاڵێکدا بیری دەکردەوە کە:"ئێستا ڕەسەنایەتیی برای ڕەسەنمان مستەفا تاقی دەکەمەوە، با بزانم ڕەسەن ڕەسەنە یان نیوە ڕەسەنە و لە قامکەوە

ڕەسەنە یان لە گونەوە یان بەهەردووکیان..." بە پەلەپەل گەڕایەوە لای پیاوە رووت و قووتە دەست و پێ بەستراوەکانی سەر تەختەبەردەکان.

"هیدایەت."

"فەرموو بەگ."

"ئێستا ئەوانە یەك لە دوای یەك دەکوژین. لە پێشدا مستەفا بەگ. ئەوان دەیانەویست من ئەشکەنجە بکەن و بەمانگێك بمکوژن. ئەمن هەر ئێستا و لێرە ئەوان دەکوژم."

بلەئیبو کە تاوێك بوو هۆن هۆن دەگریا، کەوتە لالانەوە و پاڕانەوە:"ئەمن مەکوژە بەگ. گوناحی من چییە؟ ئەمن شوێنی بۆسەناوەکەمانم بە وەلی شەماڵ گوت و ئەنگۆ هاتن و ئێمەتان گرت. ئەوەیە هەقی خزمەتەکەم؟ ئەوەیە خەلاتەکەم؟ ژن و منداڵم هەیە بەگ. بەزەییت بە منی داماودا بێ بەگ... ئەگەر ئەمن شوێنی بۆسەکەمانم نەگوتبایە و مستەفا بەگم نەبردبایەتە ئەوێ، ئەنگۆ ئاوا سووك و سانا نەتاندەتوانی بمانگرن. بەگ، بەگ، بەگ، بەنۆکەرت بم، دەردت و مەرگت بۆ من بێ، دەست و پێیانت ماچ دەکەم..."

نووزانەوەکەی نەدەبڕایەوە. حەمدییش کەوتە لالانەوە و نووزانەوە و پاڕانەوە. پیاوەکانی دەروێش بەگ لە دەم دیوارەکە ریزیان گرتبوو و بێ دەنگ دەیانڕوانی.

"ئەوانە هەڵگرن و بیانبەنە شوێنێك گوێم لە دەنگیان نەبێ. هەر گوێتان لە دەنگی تفەنگ بوو هەردووکیان هەڵگرن و بیانهێننەوە. نەچن بیانکوژن ها. ئەوان بۆخۆم دەیانکوژم. ئەوانەی هەر ڕۆژەی بە جۆرە ئەشکەنجەیەك دەمکوژن..."

پیاوەکانی دوو کابرا رووتەکەیان هەڵگرت، بە دەرگا بەردەکەدا چوونەدەرێ و بردیاننە پشت قەلاکە.

"هیدایەت، زەکەریا، ئەنگۆش مستەفا بەگ هەڵگرن و بەبێ ئەوەی ئازارێکی پێ بگا پاڵی بە دیوارەکەوە بدەن و لێرە بڕۆن و هەتا گوێتان لە دەنگی تفەنگ نەبێ و بانگتان نەکەمەوە، مەیەنەوە ئێرە."

هیدایەت و زەکەریا بەگیان هەڵگرت و بەپێوە پاڵیان بەدیوارە بەرزەکەی قەلای ئاناوەرزاوە دا. دەشتەکە لەو خوارەوە خۆی هەڵخستبوو و بنیادەم و ترۆمبێلەکان و عارەبانە و ئەو ئەسپانەی بە ڕێیەکەدا تێدەپەڕین، لەوێوە زۆر گەورە دەهاتنە بەرچاو...

"وەسەر کەون."

هیدایەت و زەکەریان ڕۆیشتن. بێدەنگی خێوەتی هەڵدابوو. لوورەیەکی لێڵ لە دوورەوە دەهات کە دەروێش بەگیش گوێی لێ نەدەبوو.

روخسار و جەستەی لەرزۆکی مستەفا بەگ کە لە بەر دیوارەکە راوەستابوو، وەك مێوی هەنگوین زەرد زەرد هەڵگەڕابوو. چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی هەر دەهات و قووڵتر و درێژتر دەبوونەوە. مستەفا بەگ چاوەکانی قووچاندبوون و لە مردوویەك دەچوو کە بەدیوارەکەیانەوە نابێ. ئەگەر ئاگات لە لەرزین و چلدانی جەستەی نەبوایە، بێجووڵە دیار بوو.

دەروێش بەگ لەسەر گابەردە رەگەدارە نارێکەی شەش هەنگاو لەولاترییەوە بوو، راوەستابوو. قرچەی گەرما بەتینەکەی بەردەکانی بن لاقی خۆی هەست پێ دەکرد.

دەمانچەکەی لە بەر پشتوێنەکەی دەرهێنا و فیشەکەکانی بە خلەخل بەتاڵ کردنە نێو لەپی دەستی. دیسان پڕی کردەوە. مستەفا بەگ چاوی هەڵنەهێنا. دەروێش بەگ لەسەرخۆ چاوەڕوانی چاوهەڵێنانی ئەو بوو.

هەتاو خەریك بوو دەگەیشتە چەقی ئاسمانێ. سێبەری مستەفا بەگ و دەروێش لە بن دیوارەکە چووبوونەوە سەر یەك و تێك ئاڵابوون.

چاوەکانی دەروێش بەگ لە نەکاو بریسکانەوە. سینگی مستەفا بەگ دەفی دەدا و نێوان پەراسووەکانی هەڵدەستا و دەنیشتەوە. ئەو هەستان و نیشتنەوەیە هەر دەهات و پتر دەبوو. بەڵام چاوی هەروا قووچاندبوو. دەموچاوی شەلاڵی ئارەقە دەبوو و ئارەقەکەی وشك دەبۆوە و روخساری سوور هەڵدەگەڕا و زەرد دادەگەڕا. لێوەکانی دەلەرینەوە و رەش هەڵدەگەڕان و پەڕەی لووتی وەك باڵی مێشەنگوین نەرم نەرم دەلەرینەوە و چاوەکانی لە بن پێڵووە لێك نراوەکانییەوە وەك چاوی کوێران پەیتاپەیتا لە گلێنەیدا دەگەڕان. لوولەی دەمانچەکەی دەروێش بەگیش رێك بە نێوچەوانییەوە نووسابوو. بەبێ ئەوەی دەستی بەحاستەم بلەرزێ و بجووڵێ، رایگرتبوو. دەمانچە تۆپدارەکەی لەبەر تاوە تیشکدارەکەدا، رەنگی دەگۆڕدرا و دەبریسکایەوە.

ئێستا روخسار و هەموو گیانی مستەفا بەگ لەبەر یەك کێشرابووەوە و دەلەرزی و وەگیان هاتبوو و گیانی چلی دەدا. دەروێش بەگ دڵی بەوە خۆش بوو. ئەگەر هەر ئاوا لەبەر دیوارەکە بەبێ هیچ کاردانەوەیك راوەستابایە، زۆر خراپ بوو. ئەگەر هەروا رۆیبایە، ناچار بوو هەرچی فیشەکی پێیەتی بە سینگییەوە بنێ و دوای ئەوەش ملی رێیە بگرێ و بڕوات.

ئەژنۆکانی لەنەکاو دەتگوت نوشتانەوە. دەی چ باشتر. دوژمن خەریك بوو چۆکی دادەدا. بەڵام مستەفا بەگ خۆی خڕکردەوە. لەرزینەکەی هێورتر بۆوە و پەڕەی لووتی لە لەرینەوە

کەوتن. زەردایی روخساریشی رەوییەوە. ئیتر بن پێڵووەکانیشی نەدەجوولان. دەموچاوی وەك دەمی چەقۆیەکی تیژ و هەموو گیانی وەك تەختە بەردێکی لێ هات. دەروێش بەگ پێی وابوو خەریکە وەخۆی دێتەوە. دەبێ دەرکەوێ چەندە خۆ لەبەر ئەو لەبەریەك کێشراوەییە رادەگرێ و چەندە تاقەت دێنێ؟ هێزی جەستە و ورەی بنیادەمێك چەندەیە؟

مستەفا بەگیش سات بە سات چاوەڕوانی تەقەی تفەنگ بوو. لە کەلێنی پێڵووەکانییەوە چاوەڕوانی بریسکانەوەی دەمانچەکە بوو. روخساری بۆ ساتێك زەردەخەنەیەکی تێ گەڕا. سێبەرێکی تار دەمودەست ئەو زەردەخەنەیەی داپۆشی. روخسارەکەی جار جار گەش دەبۆوە و بلێی و نەلێی بزەیەکی تێ دەزا و جار جاریش گرژ و بێ هەستی دەنواندەوە. تیریژی خۆر لەسەر روخساری سات بە سات گۆڕانیان تێ دەکەوت.

دەروێش بەگ بەسەرسووڕمانەوە ئاگای لێ بوو مووی گیانی جاری وەك نەشتەریان لێ دێ و جارێ خاو دەبنەوە. هەرکات مووی لێ دەبوونە نەشتەر، روخساریشی وشك و گرژتر و درێژتر دەبووە و روومەتەکانی بەقووڵدا دەچوون.

دەروێش بەگ هەر بۆ لاساریی بەخۆی دەگوت، پەلەپیتکەی ناترازێنم. هەتا چاوی نەکاتەوە، ئەمنیش هەر ئاوا دەمانچەکەمی لەسەر تەختی تەوێڵی رادەگرن و چاوەڕێ دەبم. بە دڵنیاییەوە ساتێك چاوەکانی هەر هەڵێناون و ئەو دەمانچەیەی دیتووە. مەحاڵە نەیدیتبێ. ئەگەر نەشیدیبێ، خۆ هەستی کردووە لوولەکەی لەسەر نێوچاوانییەتی. کاتی پڕ و بەتاڵکردنەوەی دەمانچەکەی مەزەندەی کردبوو لەکوێیە. لوولەی دەمانچەکە سات بە سات پتر لە نێوچاوانی توند دەبوو. جێگەی کونی لوولەکەچاوەڕوانەکە، بریندار دەبێ. بەر لەوەی بکوژێ، بەچۆکی دادێنم. لە پێشدا ناچاری دەکەم چاوی هەڵێنێ. مستەفا ئەگەر دە شەو و رۆژی دیکەش ئاوا راوەستێ، ئەمنیش هەر رادەوەستم. دەستی لەزری. ئەوە چییە؟ ئاخۆ دەستم ماندوو بوو؟ ئەی ئەوە چییە؟ یانی خۆم پێ راناگیرێ و بەبێ ئەوەی خۆم بمەوێ پەلەپیتکەی لێ دەترازێنم؟ جا ئەگەر وابێ، لەبری من ئەوم کوشتبێ، وەك ئەوە وایە ئەو من بکوژێ.

لووتی مستەفا بەگ وێك هات و لێوەکانی سپی هەڵگەڕان و پڕ لە چرچ و لۆچ بوون و هەڵقرچان. روومەتەکانی بە قووڵدا چوون.

گەرما پشووبڕەکەی نیوەڕۆ داهاتبوو. ئەو شنەیەی جار و بارە لە رەوەزەکان دەگەڕا، دەتگوت شەپۆلی گڕن. وەك شەپۆلی گڕ دەیانسووتاند. بۆن و بەرامەی قورسی جاترەکان بە

گابەردەکانەوە نووسابوو. جگە لە بۆنی خاکی هەڵبرینگاو و بەرد، هیچ بۆنێکی دیکە نەدەهات.

دەروێش بەگ لەنەکاو هەستی کرد تینوویەتی:"هیدایەت، ئاو."

هیدایەت ئەوەندەی یەك و دوو، قومقمۆکەکەی بۆ هێنا.

"دەستی چەپەم، بیدە دەستی چەپەم."

بەبێ ئەوەی چاو لە روخساری مستەفا بەگ هەڵگرێ، ئاوەکەی بە دەستی چەپەی بەسەرییەوە ناو قوڵتەقوڵت خواردییەوە. کە قومقمۆکەکەی دەدایەوە دەست هیدایەت، مستەفابەگی دیت بەسپایی لێوەکانی لستەوە و بن پێستی وردە لەرزەیەکی تێکەوت و رەش داگەڕا و مووەکانی بوونەوە نەشتەر.

پێستی گیانی مستەفا بەگ ئێستا وردە وردە دەگەڕایەوە سەر رەنگە سرووشتییەکەی خۆی و ئازای ئەندامی ئارەقەی شین و مۆری کردبوو. تاوێك دواتر نێوچاوانە چرچ و لۆچاوییەکەشی شەلاڵی ئارەقە بوو و دڵۆپە درشتەکانی ئارەقە کەوتنە سەر روومەتەکانی و خزینە خوارەوە و لە دەوری پێیەکانی دوو بازنەی رەشی ئارەقە دروست بوون. دواتر ئارەقەکەی وشك بۆوە. پێستی پتر لەبەر یەك کشایەوە و چرچ و لۆچ بوو و شۆڕ بووەوە. دەتگوت لەبەر هەڵم و هالاوێ ماوەتەوە و سەرمای بووە، کرووشمە بوو. هێور بۆوە. تەنیا بن پێڵووەکانی پەیتاپەیتا چلّیان دەدا.

دەروێش بەگ خۆی دەیزانی، هەر بە حاستەم بجووڵێ یان دەنگێکی لێوە بێ، ئەوە مـنەتێکە بەسەر مستەفا بەگەوە. هەروا لە جێی خۆی راوەستابوو و ئارەقە لە ئازای ئەندامی دەچۆڕایەوە. جلوبەرگەکانی و نێو چەکمەکانی تەواو خووسابوون. دەستی راستەی کە دەمانچەکەی پێ بێ، ئارەقەی لێوە دەچۆڕایەوە و دەنکی درشتی ئارەقە بەر لەوەی بکەونە سەر ئەو گابەردانەی لە بن پێیانیدا دەسووتان، دەبووە هەڵم.

بارانێکی زەرد دایکرد. لە نەکاو بارانێکی سەربەکلاوە دایدا. ئەو رەوەزانەی مۆر دەچوونەوە و رەگەی سووریان تێدابووو، خاکە هەڵبرینگاو و رەشبوەکەی بەر تاوەکە، و ئەو ئاسمانەی خۆڵەمیشین دەچۆوە و رووبارەکەی جەیهان کە لەو خوارەوە دەتگوت قورقوشمی تواوەیە، زەرد هەڵگەڕان. رێژنەیەکی دیکەش هات و رابرد. دوای ئەوە بارانەکە هێورتر بۆوە و وردە وردە و نەرم وەك بلوور باری.

جەستە زەردهەڵگەڕاوەکەی مستەفا چرچ دەبوو. گەش دەبۆوە و دەژاکا. بن مووەکانی بای دەکرد... دەمارەکانی لاملی هەڵدەستان و روخساری پڕ بوو لە چرچ و لۆچ. چاوەکانی لە پشت پێڵووە قووچاوەکانی وەك دوو تۆپەڵە پەپتاپەیتا دەخولانەوە.

دەروێش بەگ تێگەیشت کە جەستەی مستەفا بەگ جوان دیارە لە تەپڵی سەرییەوە هەتا بەری پێی هێدی هێدی لەبەر یەك دەشێ و وشك هەڵدێ و وای بە مێشکیدا هات کە ئەوە ئاسانترە. زۆر ئاسانتر... بنیادەم کاتێ چاوەکانی لێك ناوە، فیشەکێکی وێکەوێ و بمرێ. ئەوە زۆر ئاسانە. دەتەوێ بمری بچۆ بەغدا*. فیشەکێکت وێدەکەوێ و تەواو دەبی. نە ژانێك و نە برژانەوەیەك. لە نەکاو و تەواو. نێوچاوانت ئەوەتا لەبەر دەستمە. شێرەکەم، مستەفاکەم، بەجەرگەکەم، هەتا چاوت هەڵنەهێنی، هەروا بە دەمانچەیەکەوە چاوەڕوانت دەبم... هەتا چاوت هەڵدێنی و لوولە ساردەکەی دەمانچەکە لەسەر نێوچاوانت هەست پێ دەکەی... هەر رادەوەستم و سەبر دەکەم. هەتا شوێنی لوولەی دەمانچەکە لە نێوەڕاستی تەوێڵت نەبێتە برین، هەر دەست رادەگرم. دوای ئەوەی تۆ مەردانە و چاو لە چاوم دەبڕی و دەمری... لە دوا چرکەی ژیانتدا، شەپۆل شەپۆل ترس و پاڕانەوە لەو چاوە بەڕوییانەتدا دەبینین. مستەفا... دوژمنە ئاق یۆللۆییە رەسەنەکەم.

جەستە کرووشمە کردووەکە، لە نێوچاوان و شەویلکەکانەوە هەتا نێو شان و بن پیلەکانی ئارەقەی شین و مۆری دەرکردبوو و ئەوجار چرچ و لۆچەکانی وردە وردە رەوینەوە. تۆپەڵەکانی بن پێڵووە داخراوەکانیشی وەك فڕفڕە کەوتنە خولانەوە.

دەروێش لەپڕ پێی وابوو ئەو لە کەلێنی پێڵووەکانییەوە و لە پشت مژۆڵەکانییەوە سەیری لوولەی دەمانچەکە دەکا. لێوەکانی مستەفا بەگ رەش دەچوونەوە. سمێڵە شۆڕەکەی و زارە نیوەکراوەکەی سێگۆشە ببوو. مێشێکی گەورە و هەڵمساو و رەش بە وزە وز و خێرا خێرا سێ جاران بە دەوری سەری مستەفا بەگدا سووڕایەوە و هەروا بەخێراییش هەڵکشا و دوای ئەوەی تۆزێك بەسەر دیواری قەڵاکەدا خولایەوە لە نێو گابەردەکاندا لە چاوان ون بوو. وزەوزی خێرای مێشەکە بۆ تاوێك مستەفا بەگی وەخۆ هێنابۆوە. مستەفا بەگ

دوای رۆیشتنی مێشەکە دیسان لە بۆشاییەکی بێسنوور و پان و هەراودا، لە بۆشاییەکدا کەس نەزانێ بەری بەکوێوەیە، لە بۆشاییەکی تاریك و نووتەکدا رۆچوو و نووکی لوولەی

---

* فارسییەکەی نووسیوێتی: دەتەوێ بمری بچۆ بۆ گەیلان. ئەوە ئیدیۆمێکی فارسییە. لە کوردیدا هاوواتایەکیم نەدۆزییەوە بەڵام ئێستا کە کە بەغدا هەموو رۆژێ خەڵکێکی زۆری تێدا دەکوژرێ، بۆیە من وام دانا.

دەمانچەکەی کە وەخت بوو نێوچاوانی بسمێ، جارێ سارد سارد وەك ئاسنێکی بەستوو، جارێکیش وەك ئاسنێکی سوورەوەکراو لە سەر نێوچاوانی هەست پێ کرد.

لەرزین و چڵدانی پێستەکەی دیسان دەستی پێ کردەوە. بریسکەیەك کە لە رانییەوە هەڵدەستا و هەتا نێوقەدی دادەگرت و چڵێك کە لە هەر مووغەرەی پشتییەوە دەستی پێ دەکرد و گەیشتە گردەڕانەکانی. جاری واش بوو لەرزینە درێژماوەکە هەموو گیانی دەتەنییەوە.

کە مێشەکە رۆیشت، مستەفا بەگ جارێکی دیکەش پێڵووەکانی هەڵێنان. دڵی دەگوشرا و تاقەتی ئەو هەمووە چاوەڕوانییەی نەبوو. سات بە سات چاوەڕوانی ئەو فیشەکە بوو، کە دەبوایە لە کونی ئەو لوولەیەوە بێتە دەرێ و هەر نەدەهات. عەرزی بن پێیەکانی هەڵدەستا و دەنیشتەوە و بەر چاوەکانی رەش دەبوون. دڵی وا لێی دەدا کە دەتگوت ئێستا نا ئێستا هەڵدەکەنرێ. زەوی لە بن پێیەکانیدا هەڵدەستا و دەنیشتەوە و بەر چاوی رەش دەبوون. چاوەڕێ بوو. پشووی سوار دەبوو. بمکوژە، بمکوژە هەی سەگی گڵاو. دەکرێ بڵێی هەزار جار پتر لە دڵی خۆیدا نەڕاندی و وای گوت. لە پێشدا لەو لاوە شەش دەوەنە کەنگرە کێویی گەشی بینی کە هەرکامەیان هێندەی مستێکی قووچاو لە بن گابەردێك رِوابوون. ئەوی لە هەمووان گەورەتر هەڵێدابوو و خۆی دابووە بەر تیشکی تاوەکە و نێوەڕاستەکەی رەش دەچۆوە. شەش چڵی رەشی دڕکاوی کە لە بن پێڵووەکانیدا گەش دەبوونەوە، دەخولانەوە و رەشییەکەیان تۆختر دەبۆوە. ئاڵقەکانی تیشکی تاوەکەش توێژ توێژ دەبوون و وەك رەنگی حەوتەوانە خۆیان دەنواند و هەر دەهاتن و پتر دەبوون. لە نێو ئەو خەرمانەی کۆلکەزێرینەیەدا کە هەر دەهات و تۆختر دەبۆوە، تۆپەڵەیەکی دڕکاوی و لە سەرووی ئەویشەوە زارکی تاریکی لوولەی دەمانچەیەکی بریقەدار کە دەتگوت بیرە. زۆر رووناك، زۆر دڕکاوی زارکی بیرێکی زۆر تاریك. جا لە چاوەڕوانی زارکی بیرەکەدا و حەز لە خۆفرێدانێکی شێتانە بۆ ناوی. پشوو لە سینەدا سوار و رەشەژانێکی خزۆك وەك نەیزەك و تیژ وەك دەمی تیغی دەللاکی کە بە ناخدا بگەڕێ... وەگیانهاتوو لەبەر داماوی، هەڵچۆقیو و زگ بەخۆسووتان و لە چاوەڕوانیدا. چاوەڕوانی مەرگ. چاوەڕوانی مەرگێکی نزیك و دوورەدەست. چاوەڕوانییەکی پشووبڕ و شێتکەر. وێڵبوون بەدوای رێگەچارەیەکدا بۆ ئەوەی زوو بگاتێ و نەدۆزینەوەی رێگەچارە و لە داماویدا وێکهاتن و گرمۆڵەبوون و توندبونی هەموو ماسولکە و جومگەکانی گیان. ساردبوونەوە و راوەستانی لەنەکاوی ترپەی توندی دڵ. کەوتنێکی وەك کەوتن بەسەر دەمی تیغی دەلاکیدا و هەپروون بە هەپروون و لەتوپەتبوون و لەهەر لەتێکدا ژان و ئازارێکی دوور لە باوەڕ. ئەوجار هیوادار و

پشتبەستوو، داماو و ئارەقەکردوو، سەرداخستوو و لەپێ کەوتوو و خۆبەدەستەوەدراو، چاوەڕوان و چاوەڕوانی کێشان و گەروو وشك و تینووی چاوترووکاندنێك. رووناکایی خۆرەکە لەو دیوە پێڵووە سوورەوەبووەکان هەر دەهات و خەستتر دەبۆوە و نارنجی دەبوو.

دەنگێك بەرزتر لە لوورەیەکی لێڵ، وەك قاقایەك، وەك قوڵپەی گریان، کێشرانی پێ بەسەر عەرزدا، وەك فڕەی باڵی باڵندە دەبیسرا. دەنگەکە هەر دەهات و پتر دەبوو. دوور دەبۆوە و دادەمرکایەوە. لوورەکە لەگەڵ ئەو رووناکاییەی هەر دەهات و پتر دەبوو و لە پشت پێڵووەکانەوە خەستتر دەبۆوە، نزیك دەبۆوە و وەك تۆفان هەڵدەچوو.

دەروێش بەگ زانیی مستەفا بەگ خەریکە بەلادا دێ و ئیتر وردە وردە خۆی پێناگیرێ و دەکەوێ. ئێستا لەپێ دەکەوێ و چاوەکانی هەڵدێنێ و ئەویش بەدەم چا لە چاوبڕینەوە پەلەپیتکەی لێ دەترازێنێ. بەڵام چاوەکانی لە کاتی گیاندەرچوونیدا بڵێی چ دەبڕن؟ سەیرێکی گونەکانی کردەوە. چرچ و رەش هەڵگەڕابوون و هەڵکشابوون و بە بەر زگییەوە نووسابوون. خۆشی ماندوو دەبوو. باشە ئاوا لەسەر هەست و بە دەمانچەی دەستییەوە لەو گەرما تاقەتپڕووکێنەدا و لە نێو ئەو گابەردانەدا کە ئاگریان لێ دەبارێ، تاکەی خۆ رادەگرێ؟ دەتوانێ بەپێوە بوەستێ؟ ئارەقە لە ئازای ئەندامی دەچۆڕایەوە. چەکمەکانی پڕ ببوون لە ئارەقە و جلوبەرگەکانی تەڕدەبوون و یەکجێ وشك دەبوونەوە و لە نێو توێژێکی سپیدا دەمایەوە.

خۆر گەیشتبووە چەقی ئاسمانێ و وەك بزمارێك لە تەپڵی سەری دەچەقی. جەستە گرمۆڵە و وێك هاتوو و کرووشمەکردووەکەی مستەفا بەگ سپی و هەڵبزڕکا بوو.

بە سەر سەریانەوە پۆلە باڵندەیەك بە قاووقیژ رابردن. جەستەی مستەفا بەگ چەند جارێك بە راست و چەپدا هات. تۆزێکیش ئارەقەی کرد و دواتر ئارەقەکە وشك بۆوە و بوو بە هەڵم.

دەروێش بەگ هەستان و داکشانەوەی جەستەی و ترپەی دڵی، کە خۆی بەدیواری سینگیدا دەدا، دیت. جەستەی دەلەرزی و توند رادەتڵەکا.

مارێك بە دەنگێکی تیژ و خشەدارەوە لە گابەردەکانی لای باکوورەوە فیشکاندی. دەروێش بەگ ئەوەندەی پێ سەیر بوو لە جێی خۆی وشك بوو. مستەفا بەگ لەنەکاو چاوەکانی کە شینکەکان لەناویدا دەدرەوشانەوە و هەڵدەستان، هەڵێنان. هەموو هێزی خۆی دابووە چاوەکانی و تیشکێکی وەك نووکی دەرزی لە بریسکەی چاوەکانیدا بە درەوشانەوەیەکی پۆڵایین، سەیری دەکرد. کرانەوەی چاوەکانی مستەفا بەگ تووشی سەرسووڕمانی کردبوو، بەڵام سەری پتر لەوە سووڕ دەما کە هەر ئەو بریسکە پۆڵایینە نیشانەی ئازایەتیی ئەو بوو. لە پێشدا دەتگوت

کەیفی ساز بووە. مستەفا بەگ لە زارکی تاریکی دەمانچەکەیدا کە ئامادەی رشانەوەی مەرگ بوو و لە روخسارە گرژەکەی و لە چاوە واق وڕماوەکانیدا، شەپۆلی هاتن و رەوینەوەی خۆشییەکی بەدی کرد. هەر لەو کاتەدا ئەویش دڵی خۆش بوو. دەروێش بەگیش تیشکی ئەو شادییەی لە روخساری ئەودا دیت. لەخۆی خوڕی کە ئیتر بەسە و بیبڕێنەوە. پەلەپیتکەی بترازێنە... رێك لە تەختی نێوچاوانی... بەڵام دەستی راگرت.

چاوەکانی مستەفا بەگ کە مەرگیان لە روخساری دەروێش بەگدا بەدی کردبوو، لە نەکاو لە درەوشانەوە کەوتن و روون بوونەوە، زەق بوونەوە و رەشییەکەیان سپی داگەڕا. روخساریشی هەڵبزڕکا. رەش هەڵگەڕا و ژاکا. رەشییەکی مەیلە و تاڵ هات و لە روخساری نیشت. پەڕەی لووتی چەند جارێك لەرینەوە و لێوەکانیش وێك هاتن و لەسەر یەك توند بوون و تەنیا هێڵێکی باریکیان لێ مایەوە. دوای ئەوە لێك بوونەوە و وەك خۆیان لێ هاتەوە. لەو چاوەڕوانییەدا دڵەکەی دیسان وەك شێتان لێی دایەوە و هەموو ئازای ئەندامی کەوتەوە لەرزین.

مستەفا بەگ هەر ئەوەی دیت، لەرزینی گیانی رەوییەوە. روخساری رەنگێکی وەبەر هاتەوە و شەپۆلی رەنگێکی شادی، خۆشیی چرکەیەك زیاتر ژیان تێی گەڕا و دەروێش بەگ هەر ئەوەی دی، دەمانچەکەی هەڵێنا و لە تەختی نێوچاوانی دانایەوە... روخسارەکە دیسان رەنگی بزڕکایەوە و گرژ بۆوە و چاوە روونەکانی وەك سەهۆڵ... دەروێش بەگ دڵی تێکەڵ هات. بێزی لە هێندێ شت هەستا. مستەفا بەگیش وەك ئەو دڵی تێکەڵ هات و بێزار بوو. ئاوێکی تڵخ و لیچق لە زاری چۆڕایەوە و کەوتە سەر سینگی.

مستەفا بەگ پێ دەکەنێ. راشکاوانە پێ دەکەنێ. چاوی بڕیوەتە شوێنێکی جەستەی و پێدەکەنێ. پێکەنینەکە زاری پێ داپچڕیوە. پێدەکەنێ؟ لە خۆشییان؟ بە دڵخۆشییەوە؟... دەمانچەکە چۆوە سەرێ. ترس و زەردەخەنە تێکەڵ بوون و دوای ئەوە خەمێکی قورس و ئەوجار پاڕانەوە... چاوەکانی بڕیبووە خاڵێك، بڕیبوویە دوگمە(قۆپچەیە)ـیەك، دوگمەی چاکەتەکەی، نا نا، دەرزیی بۆنباخەکەی، نا، پشتوێنەکەی... دەروێش بەگی زۆری هەوڵدا بزانێ ئەو سەیری کوێی دەکا و ئاخرییەکەی زانیی. خاڵخاڵۆکەیەك بە یەخەی کراسەکەیەوە نووسابوو و لە جێی خۆی نەدەبزووت. کە دەروێش بەگ سەرقاڵی گەڕان بوو، مستەفا بەگ وردە وردە وەخۆ هاتبۆوە و چاوی دەترووکاند و ئیتر پاڕانەوە و ترس و دڵەڕاوکێ و هەستە تاڵەکانی لە خۆی دادەڕنی و خۆی لێ قوتار دەکردن.

دەروێش بەگ ددانی چیڕ کردنەوە و گوێچکەی زریکاندی و ئەو دەستەی کە بەدەمانچەکەوە بوو، کەوتە ژان و دەمانچەکەی لە سەر نێوچاوانی هێنایە خوارێ و ڕێك لەسەر دڵی داینا. چاوەکانی مستەفا بەگ پاڕانەوەیان لێ دەباری. دەروێش بەگ هیچ پێی وانەبوو وا دەبێ. پێی سەیر بوو. هێز و تینی لە قامکی پەلەپیتکەیدا نەما و وا بە سەرسووڕمانەوە سەیری کرد کە مستەفا بەگ تەریق بۆوە و چاوی لێك نا و ڕەنگێکی هێنا و برد. خۆی پێ نەگیرا و دیسان چاوەکانی هەڵێنا و روخسارە گەشەکەی دەروێش بەگی دیت. دەستەکانی بەردابوونەوە و چێژ و لەزەتی سەرکەوتن سەرخۆشی کردبوو. مستەفا بەگ چاوی لێك نا و هەڵیهێنانەوە و لێکی نانەوە و دەروێش بەگی دیت لە بەرامبەری کەیفخۆش و ئاسوودە ڕاوەستاوە. روخساری لە پڕێکا لەبەر تووڕەیی و نەفرەتێکی قووڵ گرژ و مۆن بوو. چاوەکانی بریسکەیەکیان لێ هەستا و بووژانەوە. ئەو بریسکە پۆڵایینە زیندووە دیسان هاتەوە و وەك نووکی نەشتەر لەسەر تروسکەی نیگای نیشتەوە. لێی ڕاما. بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ، وەك مەرگ، بەبێ چاوەڕوانیی مەرگ، بە لەسەرخۆیی و وەك ئەوەی هیچ نەقەومابێ. دەروێش بەگ کە ئەوەی دی، ئەوەندە تووڕە بوو هەموو گیانی کەوتە لەرزین. لوولەی دەمانچەکەی خێرا و بەپەلە لە نێوچاوانی چەقاند و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی بزاوت و ڕێك لەوکاتەدا چاوی لە چاوەکانی بڕی. ڕاچڵەکی. چاو و رخساری هیچ نەگۆڕابوو. دەمانچەکەی هێنایە خوارێ و بزەیەکی هاتێ. ئەو تروسکاییە هەروا لە چاوەکانی مستەفا بەگدا مابۆوە. هێڵ و چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی گرژ و تێکەڵ ببوونەوە. ئەو مستەفا بەگە چما هەر ئەو مستەفایە نەبوو کە تاوێك لەوە پێش بە هەموو چرچ و لۆچەکانی هێڵ و چرچ و لۆچەکانی روخساری و بە پێست و مووە نەشتەرەکانییەوە بە سمێڵە شۆڕەکەی و چاوە لەژێڵاهاتووەکانی و بە گونە چرچەکەی ... بە هەموو گیانی دەپاڕایەوە.

هەڵۆیەك لە چەقی ئاسمانێدا بەرەو خوارێ لوور بوو. یازدە مارمێلکەی گەورەی درەوێشە سوور لە دەرەوە بە دیوارەکەی قەڵا هەڵگەڕان و لەودیوی دیوارەکە لە چاوان ون بوون. مێشێکی رەش و زل کە هەزار ئاڵقەی زەردی لەسەر دەبریسکایەوە، بە وزەوزێکی مێشك بەرەوە لە دەوری سەری مستەفا بەگ گەڕا. دەموچاوی مستەفا بەگ کە وەکو لەتە بەردێك رەق هەڵاتبو و چاوە گەش و بووژاوەکانی بەهۆی تروسکایی خۆشییەوە، نەدەگۆڕدران. هیچ گوێی بە گەرما و ترس و مەرگ و ئەو فیشەکە نەدەبزووت کە لەوانەبوو ئێستا نا تاوێکی دیکە بتەقێ.

دەروێش بەگ بەخۆی گوت بڕوای کردووە نایکوژم. کوڕە سەیری ئەو سەگبابە بکە. هەموو گیانی لە تووڕەییان گرژ بووەتەوە. دەمانچەکەی هەڵێنا. چاوەکانی لێك نا بۆ ئەوەی... نەیتوانی. بەر لەوەی پەلەپیتکەی لێ بترازێنێ چاوەکانی هەڵێنا... هەڵیهێنان بۆ ئەوەی ... مستەفا بەگ بەگەکەی پێشوو نەبوو. بەلادا هاتبوو، تێك شکابوو، لێو و سمێڵەکانی شۆڕ ببوونەوە و سەری کەوتبووە سەر سینگی و نیگاکانی دۆڕاندبوو. دەستی دەروێش بەگ هاتە خوارێ. مستەفا بەگ دیتی دەستی بەردایەوە. هەموو گیانی، روخسار و دەموچاوی و دەست و پێ و ددانە سپییەکانی کە بە بزەیەکی ئاشکرا و لێڵ دەرکەوتبوون و دەمار و مێشکی ئێسقانەکانی هەر هەمووی تژی بوون لە خۆشی و شادی. دەروێش بەگیش نەیتوانی خۆی لەو خۆشیی، شادی و خۆشیی تۆزێك پتر ژیان، تۆزێك پتر ژیان و دیسان هەر ژیان، رزگار بکا. ئەوجار لە نەکاو بەخۆی و لە مستەفا بەگ تووڕە بوو. تاوێك بێجووڵە و سەرسووڕماو لەجێی خۆی وشك بوو. مستەفا بەگ لەو تووڕەییەی تێگەیشت. ئیتر رزگاربوونێك لەگۆڕێ نەبوو. دەتگوت هەورە تریشقەیەکی بەسەردا هاتووە. لە خۆیدا ورد و خاش بوو. تێك سڕا. هەردوو چاوی قووچاندن و دەمودەست هەڵی هێنانەوە. هەورێکی سپی و روون سێبەرە هەوریشمینەکەی بەسەر رەوەزەکاندا کێشابوو. هەور و سێبەرەکە رادەبردن. چاوەکانی مستەفا بەگ لەسەر هەورەکە بەمۆڵەق وەستان. نیگای دەروێش بەگیش بەبێ ئەوەی خۆی بیهەوێ بەرەو هەوەرەکە کشا. هەورەکە خزی و رۆیشت. سێبەکەی، دەشت و شیو و دۆڵ و هەوراز و نشێ و زۆنگاو و رێگە پڕ لە خۆڵ وخاکەکانی مشاتەوە و بەرەو چیاکانی تۆرووس کشا. مێشی بچووك بچوك هێندەی مێشە بن سك کەسکەکان لە دەوری جاترە وشکهەڵاتووەکان دەنیشتن و دەفڕینەوە و وزەوزێکیان هەڵگیرساندبوو مەگەر خوا بزانێ. مستەفا بەگ لە نێو پێڵووە وێك هاتووەکانییەوە هەموو ئەو شتانەی وەك خەیاڵان دەدی و هەستی پێ دەکردن. لە دەوروبەری رەوەز و بەردەکان مارمێلکەکان کۆ دەبوونەوە. هەر کامەیان مێشکێکیان بەسەر دروێشە سوورەکانیانەوە مابۆوە. جاڵجاڵۆکەیەکی لۆق دێژ کە چەند هێڵێکی سپی سەرپشتیان بەش بەش کردبوو، داوێکی لە نێوان سێ گابەرد و دڕوویەکدا تەنیبوو. لە تەنیشت داوە هەڵخراوەکەی بەبێ جووڵە دانیشتبوو و سەیری مێشی گەورە و بچووك و ئەو مێشەنگوینانەی دەکرد کەوتبوونە داوەکەیەوە و پەلەقاژەیان بوو. وەك پادشایەك، دیکتاتۆر و لووتبەرز و لەخۆبایی بوو. داوەکەی، کە وەك خێوەتی شەو هەڵیدابوو، دیار بوو تان و پۆی توند و پتەون و رەشەبای ئاناوەرزا زەفەری پێ نابەن.

دەروێش بەگ کە دەستی ماندوو ببوو و وا دامابوو نەیدەزانی چ بکا و چاوەکانی لەسەر جاڵجاڵۆکە و مێش و گوڵەکانی کەنگرەکەوە کە هەردەهاتن و پتر ڕەش هەڵدەگەڕان، دەچووە سەر گونەکانی مستەفا بەگ و لەوێوە دەکشا بەرەو چاوە قیچ کردووەکانی و هەتا سەری نینۆکەکانی و سەر و قژە ئارەقەکردووەکە و دەگەڕایەوە و لە هەر هاتن و چوونێکی چاویدا، پتر وەڕەز دەبوو. لەنەکاو دەستی کرد بە پیاسەکردن. توورە و بە هەشتاو لە نێوان دیواری قەڵاکە و ئەو بەردەی مستەفا بەگی لەسەر کەوتبوو، دەهات و دەچوو. چاوە بێهیواکانی مستەفا بەگیش کە دەتگوت بەوەوە بەستراونەتەوە هەروا بەخێراییەوە لە کاسەی سەریدا دەخولانەوە و بەوردی سەرنجیان دەدایە شێوەی و حاڵەتەکانی ڕوخساری و جووڵەی دەست و پێی و شانەکانی کە هەڵێدەتەکاندن و چاوەکانی کە جارێ دەقووچان و زەق دەبوونەوە و جارێ قیچی دەکردن. لە کاتی پیاسەکردنێدا، جۆرێك لۆقی داویشت، دەتگوت لە گیانی بوونەتەوە و ئیتر ناگەڕێنەوە. دەستی سەر دەمانچەکەشی وا شۆڕ ببۆوە و ڕای دەوەشاند، دەتگوت گلاو بووە و هێشتا بیسمیل و حەوتاوی نەکردووە*. پەیتا پەیتا چاوی دەترووکاند. دەموچاوە چرچ و لۆچاوییەکەی جارێك گەش دەبۆوە و جارێ گرژ دەبوو. جارێ پەمەیی و ئاسوودە و شاد دەبوو و چرچ و لۆچی لێ دەڕوینەوە و نەرم دەبوونەوە و لەنەکاو گرژ و توورە دەبوونەوە و لە نێو سەدان چرچ و لۆچی وشکدا نوقم دەبۆوە. تاوێك دواتر مستەفا بەگیش لەو ڕوخسارەدا نەرمە فڕینێکی شادیی بەدی دەکرد و بەدەست خۆی نەبوو ئەویش لەگەڵێدا شاد دەبوو و دواتر هەر گرژ دەبۆوە، ئەویش نێوچاوانی تێك دەنا. دەروێش بەگ لەو هاتن و چوونەیدا تووشی ترسێك ببوو مەگەر خوا بزانێ و وەخت بوو شێتی بکا. لە بۆشایی مەرگدا دەتلایەوە و خوێن لە دەماریدا دەمەیی. هەتا کەشکەڵانێ دەچوو و دەچوو و شوێنێکی بۆ ڕاوەستان شك نەدەبرد و لە نەبووندا هەوڵی دەدا. مستەفا بەگیش هەر وای بەسەر دەهات. ئەژنۆی هەردووکیان، هەم دەروێش بەگ کە دەهاتە بەردەمی مستەفا بەگ و دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە جار بەجار خێراتر دەبوو، هەمیش مستەفا بەگ کە سەیری هەڵسوکەوت و جووڵەکانی ئەوی دەکرد و لەگەڵ هەموو هەستەکانی ئەو دەژیایەوە، دەلەرزین. دەروێش بەگ لەنەکاو ڕاوەستا، چاوەکانی مستەفابەگیش جووڵەیان لێ بڕا و ڕوون و لەژێڵلاهاتوو لەسەر خاڵێك گیرسانەوە. دەروێش بەگ سەیری ئەژنۆ لەرزۆکەکانی خۆی و مستەفا بەگی کرد.

---

* بیسمیل و حەوتاوکردن: ئەگەر شتێك دەمی سەگی وێدەکەوت و گلاو دەبوو، بە ئاوێکی قوڕاو حەوت جاران دەیانشۆرد و پێی دەگوترا بیسمیل کردن یان حەوت ئاو لێ دەرکردن.

بارانە زەردەکە لەپڕێکا دایکرد. بارانێك وەك گۆزەی سەروبن.

بزەیەکی هاتێ. مستەفا بەگیش ریاییکەرانە بزەی هاتێ. مێشکی گەرم داهات و دەسکی دەمانچەکەی وا لە نێو دەستەکانیدا گوشی خوێنی لەبەری دەستی هات. بارانە زەردەکە، رەش داگەڕا و رەنگی گوڵە رەش و دڕکاوی و دووکەڵ ئاساکانی گوڵە کەنگرەکانی گرت. لافاوێکی بەکەفوکوڵ و لێڵ، رەوەز و گابەردە سامناك و قورس و چڕ و درشت و ئەرخەوانی و مۆر و پەمەیی و سوور و کەسك و بە خاڵی بەڵەکانی داگرت.

لە لووتکەی ئالاداغ، گەواڵە هەورێك کە سات بە سات رەشتر دەچۆوە و چڕتر دەبۆوە و لەسەر یەك کەڵەکە دەبوو و لایەکی هەر دەهات و دەستەملانی تاریکایی شەوەکە دەبوو و هاوکات لەگەڵ تاریکداهاتنەکەدا، پتر هەڵدەکشا و بەرەو سەر دەشتەکە دەخزی و چڕتر دەبۆوە و دەهات و لە ئاسمانە زۆر دوورەکەی دەشتی ئاناوەرزادا لەسەر یەك کۆ دەبۆوە، دەسووڕایەوە، دەیگرماند و هەورەتریشقەی دەدا و ئاسمانی ئاگرباران و دەشتەکەی جار بە جار وەك رۆژی روون رووناك دەکردەوە، بارانە رەشەکەی وەك شێتان بەملاولای دەشتەکەدا دەپڕژاند.

خوێن لە بەری دەستی دەرپەڕی. لە جێیەکەی خۆی پیێ و پێی کرد (لە سەر پێیەکییەوە خۆی دایە سەر پێیەکەی دیکەی) و هەوڵی دا و مایەوە. هەموو گیانی کوترابوو. وڕ وکاس بوو. ئەو دەمانچەیەی بە نێوچاوانی مستەفا بەگەوە نرابوو و بەردەوام دەبریسکایەوە، هاتە خوارەوە. دەروێش بەگ خۆی وێك هێنابوو و دیسان دەستی کردەوە بە پیاسەکردن. سەری داخستبوو و چاوی بڕیبووە بەر پێی خۆی وسەری هەڵنەدەهێنا. نوقمی بیرێکی قووڵی سەر دوو ڕێیان بوو و هەنگاوەکانی لەگەڵ خێرایی بیرکردنەوەکەیدا رێك دەخست. چاوەکانی مستەفا بەگ لەگەڵ ئەودا غاریان دەدا. نیگای لە لاقییەوە دەچووە سەر ئەو دەستە شین هەڵگەڕاوەی دەسکەکەی دەگوشی و ئەو پشتەی کووڕ دەبۆوە و قیت دەبوویەوە. لەوێوە دەچووە سەر چاوەکانی و گوێچکەی و ئەو نێوچاوانەی کە گنجیان تێ دەکەوت و دەڕەوینەوە و ئەو لێوانەی شۆڕ دەبوونەوە و گرژ دەبوونەوە. دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە.

مستەفا بەگ لەنەکاو دڵی تێکەڵ هات و هێڵنجی دا، بەڵام بەسەرخۆیدا زاڵ بوو و نەڕشایەوە. دەروێش بەگ راوەستا و بە سووکایەتییەوە سەیرێکی کرد. سینگی مستەفا بەگ هەڵێداویشت. دڵی دەروێش بەگیش بەو ریتمە کەوتە لێدان.

رێژنەیەکی زەرد دایکرد.

دەروێش بە هەڵپەتر لەسەر هات و چۆیەکەی بەردەوام بوو. مستەفا بەگیش بە چاو و بە سەر و نێو شان و سەر و قژ و برۆ و زار و گەردەن و بە هەموو ئازای ئەندامی بەغاردان بەدوویەوە بوو و دەتگوت دەیگاتێ. بیرێکی وەك برووسکە بەمێشکیدا هات و بەخۆی گوت: هەموو شتێ تەواو بوو. دڵنیا ببوو کە دەروێش بەگ نایکوژێ. هیواکەی بەبادا چوو، سێبەرێکی دڕدۆنگی لەسەر روخساری پەپکەی کرد. چاوەکانی قیچ کردن. روومەتی چەپەی کە سێبەری لوولەی دەمانچەکەی کەوتبووە سەری، مێرووڵەی دەکرد، گنجی تێ کەوت و چاو و رووومەتەکەی لە چرچ و لۆچەوە پێچران و گۆشەی لێوەکانی لەبەر یەك کشانەوە. ساتێك لە وەحشەت و ترسدا نەیتوانی بیر بکاتەوە و دەروێش سڕ بوو و گیانی لە دەست و پێیدا نەما و زاری بوو بە تەڵەی تەقیو و زمانی بەمەلاشوویەوە نووسا. دوای ئەوە سێبەری تارمایی داماوییەکی خنکێنەر بە روخساریدا تێپەڕی و جێگەی خۆی دا بە رەنگی پاڕانەوە و لالانە و ئەوجار شادییەك کە لە هیوا و گەشبینییەوە لە گیانیدا چرۆی کرد و هەڵیدا و هەموو گیانیی داگرت...

دەروێش بەگیش ، هەستەکانی، سووکبوونەکەی بەهۆی پاڕانەوەوە و ئەو رِیاییکردنەی لە شادییەکەیدا هەبوو و چاوەڕوانییەکەی لە بۆشاییدا و ترسی ساتێك و هێوربوونەوە و ماندوویەتی و ئۆخژن وەبەرهاتنەوەی بەهۆی رزگاربوونی، وای هەست بەوانە کرد و لەگەڵیان ژیا، دەتگوت بەشێکن لە خۆی.

روخساری مستەفا بەگ گرژ بوو. بەژن و بالای و شان پیل و کەمەر و لاقەکانی و گونەکانی، بەرگەدە و قژی سەری هەموو گرژ بوونەوە و توند بوون. هەستی کرد ئەوەندە لە دەروێش بەگ بێزارە و رقی لێیەتی مەگەر خوا بزانێ. بە هەموو ئەو قین و رقەوە کە لە رەچەڵەکییەوە نەوە بە نەوە پێیەوە گەورە ببوون، سەیری دەروێش بەگی کرد. رێك، بێ ترس، بەسووکایەتییەوە، بۆ کوشتن، لێ نەبوردە و هەرگیز لێنەبوردە، سەیری کرد. گەورەیی قین و سامناکیی تووڕەییەکە تەنیا لە چاوەکانیا دەرکەوت. دەروێش بەگ لە نێو تەوژمی سامی ئەو تۆڵەئەستاندنەوە سامناکەدا وەك هەورەتریشقە لێی دابێ، تێك شکا و ورد بوو و بەلادا هات. شێتانە دایە قاقای پێکەنین. قاقا پێکەنینەکان، چاودزینەوە لە نیگای ئەو و دیسان سەیرکردنەوە هیچ کام لەوانە نەیانتوانی ئەو ترسەی لێ بڕەوێننەوە و باری تەزووی کوشتن و ئەو تووڕەییە سەهۆڵینەی خوێنەکەی دەمەیاند و هەموو ناخی

دەتەنی و ڕەقی دەکرد، لەسەری سووك بکا. لە نەکاو بەمێکیشدا هات لێی ڕانەوەستێ و بیکوژێ، بەڵام دەسبەجێ پاشگەز بۆوە.

دەسبەجێ، دەسبەجێ، بەبێ ڕاوەستان دەبێ بیکوژێ. رووی لە مستەفا بەگ وەرگێڕا و لەسەر گابەردێك دانیشت. وا کەوتبووە هانکەهانك دەتگوت لەمسەر بۆ ئەوسەری ڕەوەزەکان یەکپشوو غاری داوە. دەبێ بیکوژی، دەبێ بیکوژی، دەبێ بیکوژی بەبێ ڕاوەستان... کوشتنی ئەو لەم حاڵەتەیدا کە پیاوەتی و مەردایەتییەکەی پشکووتووە و ڕق و قینی وەجۆش هاتووە... وەك ئەوە وایە هەتا ڕۆژی قیامەتێ ئەو نەترسی و ئازایەتی و بەخۆنازینەی لەبەرامبەر مەرگدا بۆ ڕاگریت... یانی ئەوەی نەمربوونەکەی دەستەبەر بکەی. چما هەروا نییە، کە پیاو لەمردنێ چ هەستێکی هەبێ هەروا دەمێنێتەوە؟... دەبێ کوشتنەکەی زۆر بخایەنێ زۆر... لە حاڵێکدا پاڕانەوە و داماوە و ترس لە ڕوخساریدا قەتیس ماوە... بزەیەکی ڕیاییکەرانە...

دەروێش بەگ هەستی کرد گڕی نیگایەکی بەتین خەریکە پشتی دەسووتێنێ و کونی دەکا و نەیوێرا ئاوڕێك بداتەوە.

بۆرانێکی زەرد هەڵیکرد و تێپەڕی. گوڵەکانی کەنگرە مۆرەکە کە هەتا ئەژنۆ لە ڕەوەزەکاندا هەستابوون و هەرکامەی هێندەی مستێکی قووچاو گرمۆڵە ببوون و نێو ڕەوەزەکانیان کردبووە بێستانێکی مۆر و ڕازاندبوویانەوە، دایهێنایەوە و ڕایخست و هەڵیستاندەوە و بەتوندی دەریخست. لافاوێکی زەرد و بەخرۆش بەنێو ڕەوەزەکاندا بەرەو دەشتەکە دەخوشی.

دەروێش بەگ نەیدەزانی لە کەیەوە بەو دەمارە گرژانەوە و لەبن بارستایی ئەو نیگا سووتێنەر و کونکەرەدا و لە لافاوی بیر و خەیاڵدا نوقم بوو و جینگڵی دا و لەوێ لەسەر تاتە بەردەکە مایەوە. لە پێشدا هەستی کرد ئەو دەستەی بەدەمانچەکەوەیە سڕ و بێ تین بووە. دوایی کاتێك کەوتبووە بۆشاییەوە، لە ناخیدا شەپۆل شەپۆل کە لە شادی و خۆشی دەچوون سەریان هەڵدا. کە گەڕایەوە سەیری کرد، مستەفا بەگ دەڵێی لە گیانەڵا دایە. چاوەکانی لە بریسکانەوە کەوتبوون و گیانی لەبەردا نەمابوو.

هێور هێور بەلادا هات و لەسەر تیژایی ناخۆشی ئەو بەردەی تاوێك لەوە پێش لەسەری هەستابوو، بەرەو رووی مستەفا بەگ دانیشت. جەستەی باریك و تێکسمڕاوی مستەفا بەگ کە جار بە جار بچووکتر و گرمۆڵەتر دەبوو، جووڵەی لێ بڕابوو و لە سینگی و لە دەموچاوە وشك هەڵاتووەکەی و چاوە بێ نیگا و سیس و ژاکاوەکەیدا هیچ جووڵەیەك بەدی نەدەکرا. باشە

ئەگەر مردبایە، بەعەرزیدا نەدەکەوت؟ نەکا خەوی لێ کەوتبێ؟ باشە چما دەکرێ پیاو بەسەر پێوە بمرن و بەر لە کەوتنێ دەتوانن بنوون؟ دەروێش بەگ بیری کردەوە: مستەفا مرد. ئیتر ئەو پیاوە بۆوەی نابێ فیشەکی پێوە بنێی. ئیتر دەبێ لێرە بەجێی بێڵی و بڕۆی. دەبێ دەست و پێی بکەیەوە و هەر لێرە بەجێی بێڵێ و بڕۆی و ئەو بیرە لە مێشکت دەرباوێی کە منیش دوژمندارم. بەر لەوەی فیشەکی وێکەوێ گیانی دەرچوو. تۆپی. ترسنۆکی هیچ و پووچ... باشە یانی بنیادەمێك ئەوەندە خۆی سووك بکا بۆوەی دەبێ بیکوژی؟ تۆخوا ئەو فیشەکە حەیف نییە لەوەی خەسار بکەی؟ کوشتنیش دەبێ ڕێوشوێن و دامودەستووری خۆی هەبێ. کوڕە خۆ هەموو کەس بۆ کوشتنێ نابێ. هەموو کەسێك شیاوی ئەوەی نییە بیکوژی. تەنانەت باڵندە و مار و مێروو و هەموو بوونەوەرەکان... و هەڵکەندنی گوڵەکانیش دەبێ دامودەستوورێکی هەبێ. بنیادەم نابێ دەست بۆ ژنی دووگیان و لە گوڵی تۆوی بەرێ... باشە ئەگەر من کەوتبایەمە دەستی مستەفا بەگ، ئەو ئاوا منی دەکوشت؟ هەر لەخۆوە کەوتەوە بیری ئەو تووڕەیی و قینەی تاوێك لەوە پێش بە چاوەکانی مستەفا بەگدا شەپۆلی دەدا و گوتی ئەو کابرایە بەو هەمووە تووڕەیی و قینەوە، مردووەکەشمی هەزار جاری دیکە دەکوشتەوە. بەڵام ئەو بنیادەمە لەگەڵ ئەو هەمووە قین و نەفرەتەشدا دیسان ئاوا دەتوێتەوە. کاتێ دەیویست بانگی هیدایەت بکات و بڵێ وەرن دەست و پێی ئەوە بکەنەوە با بڕۆین، بۆ دوایین جار سەری هەڵێنا و سەری سوور ما. هەر چاوی بە مستەفا بەگ کەوت، دیتی دیسان روخساری بووژاوەتەوە و گەشبووەتەوە. ئیتر بەس سەیری کرد. دەمانچەکەی هەڵێنا هەتا لوولەکەی گەیشتە رێکی دەموچاوی مستەفا بەگ و تەختی نێوچاوانی. روخساری گۆڕا. پڕ بوو لە چرچ و لۆچ، بزڕکا و سیس بوو و خوێنی نێو دەمارەکانی بەستی و مەیی. دەروێش بەگ دیسان سەری وا سووڕ ما نەیتوانی پەلەپیتکەی لێ بترازێنێ. دەستی لەرزی و بە مێشکیدا هات:"هەی ئاگرت تێبەر بێ." و دەمانچەکەی قورس بوو و شۆڕ بۆوە. گەڕایەو و دیسان کەوتەوە پیاسەکردن. پیاوی وا بۆوەی نابێ چاویشی لێ بکەی. جار بەجار خێراتر دەبوو و تەنانەت بۆ جارێکیش چییە سەیرێکی مستەفا بەگی نەدەکرد.

مستەفا بەگ هەستی کرد هەموو شتێك تەواو بووە ... جا لە بن لێوانەوە کەوتە پاڕانەوە و دوعاکردن. ئەوەندەی دەروێش بەگ خێراتر دەبوو، پاڕانەوە و جووڵەی لێوەکانی مستەفا بەگیش خێراتر دەبوو. کاتێ وا خێرا ببوو، رق و قینەکەی گەیشتبووە ئەوپەڕی خۆی... لێوەکانی مستەفا بەگ لەپڕ لە جووڵە کەوتن و هەموو گیانی کەوتە پاڕانەوە.

نووکی لوولەی داغی دەمانچەکەی دەروێش بەگ کە چەور کرابوو، بەتەختی نێوچاوانییەوە نووسا. پاڵی بە تەوێڵییەوە نا و سێ جاران کەللەی سەری بە دیواری قەڵاکەدا کوتا. هەردووکیان لە تووڕەییان هەتا مێشکی ئێسقانەکانیان لەرزین. ئیتر ئەمجارە کۆتایی بوو. دەیکوشت. شادی و چێژێکی پێداگرانە زریکەیەکی نەرمی لە ناخی دەروێش بەگ هەستاند. هەنگاوێکی لێ کشایەوە. چاویان لە چاوی یەك ئاڵقا. پەنجەی دەروێش بەگ جووڵا..

مستەفا بەگ بە لالانەوەوە گوتی:"بەسە. بەسە. بیبڕەوە دەروێش... بمکوژە... بمکوژە..."

ئاگای لە خۆی نەما و وەك مردووان لە تەنیشت دیوارەکە بەلادا هات و کەوتە سەر بەردەکان و چاویشی لێك نا. روخساری وشك هەڵاتبوو و هەر دەهات و رەنگی هەڵدەبزڕکا...

بە دەنگێکی کە بە حاستەم دەبیسرا و لە نێو لێوە بارلێنیشتووەکانییەوە قەڵت و پەڵت دەهاتە دەرێ بە لالانەوەوە گوتی:"بمکوژە، بمکوژە. بیبڕەوە دەروێش بمکوژە."

دەروێش ئیتر قسەکانی ئەوی نەدەبیست.

لە شادییەکدا نوقم ببوو مەگەر خوا بزانێ و تێیدا دەتلایەوە.

دەمانچەکەی خستەوە سەر جێیەکەی خۆی و ئیتر بە تیلەی چاویش تەنانەت سەیری ئەو کابرایەی نەکرد، کە لەسەر عەرزەکە کەوتبوو و هەر بە پێویستیشی نەزانی سەیری بکا.

خۆ ئەگەر زانیبای ئەوەی کەوتووە حاڵی چۆنە و چ دەچێژێ و گوێی لە :"بمکوژە، بمکوژە"ـکەی بوایە کە بە پاڕانەوەوە دەیگوتن، ئەوەندەی دیکە شاگەشکە و دڵخۆش دەبوو.

بۆرانە زەردەکە چەند جار لە لای رۆژئاواوە پەیتا پەیتا هەڵی کرد و ئەوجار، بە مەودایەکی کورت و شەپۆل شەپۆل لە لای باشوور و رۆژهەڵات و باکوورەوە هرووژمیان هێنا. بۆران و باهۆزەکان جاروبارە شین و مۆر وەك دڕکی کەنگرەکە هەڵدەستان. لەو نێوەدا رەوەزەکان و شوورا و دیوارەکانی قەڵاکە و داروپەردووی کۆنە کلێسەکە و دەرگا گەورەکەی خوارەوە و ئەو ژوورە گەورەیەی کورسییەکانی بۆ سەیرکەرانی شانۆ لە بەرد تاشرابوون و پاش چەندین سەدەش هەروا مابوونەوە، رێگەکان و ئاوەکە و ئەو زۆنگاوەی لەو خوارەوە سەوز دەچۆوە هەر هەموو کەوتنە بن ئەو لافاوە زەردەی کە لە ئاسمانەوە دایکردبوو و بەجۆش و خرۆشەوە بە شیو و دۆڵەکاندا بەرەو خوار دەخوشی و نوقم بوون. تاریکاییەکی زەردباو ئاسمانە پوولەکەدارەکە و کێوپارە و زەوییەکانی کۆنە چوکووراوای داپۆشی.

گۆپاڵ بارانەکە لە نەکاو خۆشی کردەوە و بە دوایدا تاوێکی بەتین هەڵات و وڵاتی هەڵبرینگاند.

دوای تاو هەڵاتنەکە، هاتنەوە کۆشکەکەی "ئاق یۆللی"یەکان. قەرەقیزخاتوون پاڵی بە ئەستووندەکەکەوە دابوو و لە تەنیشت رەیحانە و گوڵە مەخمەرییەکانەوە بەبێ ئەوەی شەوێ تاکوو بەیانی چاوی لێك نابێ، بە دڵێکی بەکوڵ، هەروا چاوەڕوانی کوڕەکەی بوو کە دوو رۆژ بوو بێ سەر و شوێن ببوو.

مستەفا بەگ، حەمدی، بلە ئیبۆ رووت و قووت و دەست و پێ بەستراو، لەسەر زگ، خرابوونە سەر ئەسپە بێ زینەکانیان و سەریان بەلاملیاندا شۆڕ ببۆوە و بەملاولادا دەکەوت.

قەرەقیزخاتوون شیمانەی کرد ئەوەی پێشەوە کوڕەکەیەتی، بەڵام بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەکرد.

زەکەریا دەرگای حەوشەی هەڵگرت. لە پێشدا دەروێش بەگ بە سواری و بە شانازییەوە وەژوور کەوت و بەدوایدا هیدایەت... ئەسپەکانیان لێخوڕی بۆ تەنیشت تەراکتۆرە شینەکە و لەسەر هەست و بەڕێزەوە راوەستان.

زەکەریا سێ ئەسپە بێ زین و شمەکەکەی راکێشا و هەر سێکیانی لە دەرگای کۆشکەکە بەستەوە. بەرەو سەر، سەیرێکی قەرەقیزخاتوونی کرد و ئاگری لە جەرگ و دڵی بەربوو.

دەروێش، قەرەقیزخاتوونی دیت کە بە پشتی کۆماوەوە بە حاڵەحاڵ لە جێیەکەی هەستا و لەو سەرەوە سەیرێکی ئەو پیاوە رووت و قووتانەی دەکرد کە خرابوونە سەر ئەسپە بێ جل و زینەکان. ئەسپەکەی لێ خوڕی و بە رێزەوە لە حەوشەکە چووە دەرێ. هەتا لە کۆشك دوور نەکەوتبوونەوە، هێواش و لەسەرخۆ دەڕۆیشتن و کە کۆشکەکەیان بەجێ هێشت، ئیتر ئەسپەکانیان تاو دا.

بارانە زەردەکە وەك گۆزەی سەروژێر دەباری.

## ٤٦

پشتەکوورەکەی وەسەر سەری کەوتبوو. وەك سەلکی سەری بە سینگییەوە نووسابیّ، لە نێوشانە پانەکەی چەقیبوو. چاوەکانی لە دەموچاوە درێژ و سپی هەڵگەڕا و بیّ خوێن و بیّ گنج و لووسەکەیدا، درشت و گەش بوون. چاوەکانی وەك چاوی ئەسپێکی رەسەن بە خەمبارییەوە دەدرەوشانەوە. لسپێك لە قژە لوولەکەی لەسەر نێوچاوانی پەرش و بڵاو ببوو و شەپۆلی دەدا. دەموچاوی جاڕچییەکە یەکپارچە خەم بوو. هەر دەتگوت خەمی هەموو ئەو دنیایەیان لەدڵی ئاخنیوە. لەو دەموچاوە سارد و سڕەدا، لێوە تەڕ و تورتەکەی و ددانەکانی، وەك ددانی منداڵێك سپی دەچوونەوە. جاڕچی کە پێدەکەنی، رواڵەتێکی دیکەی بەخۆوە دەگرت. کووڕییەکەی پشتی هەر نەدەبینرا و بزر دەبوو. جاڕچی لە منداڵێکی تۆزێك هەراش دەچوو کە باش هەڵی دابیّ... تێهەڵدراو و زوڵم لێکراو...

"لەم دنیایەدا هیچ روخسارێك نییە لە دەموچاوی منداڵی زوڵم لێکراو خەمبارتر دیار بیّ."

جاڕچی گوتی:"نییە."

"ئەوە ئێستا، بەو ئێوارەیە بۆ کویّ؟"

"دەچمە هایتلی بۆجاق."

"زۆر کەساسی، چ باسە؟"

"یانی پێمەوە دیارە؟ پێم سەیرە."

"هیچ سەیر نییە. قەڵافەتت لە دوورەوە هاوار دەکا کە تێگیراوییەکت هەیە. دەتەویّ چ بکەی؟"

"دەمەوێ بیکوژم. تازە دەبێ بیکوژم. رێك لە نێوەڕاستی بازاڕەکە و لە بن چنارە بەرزەکە."

ئەویش رێك ئەوکاتەی دەسنوێژ هەڵدەگرێ. رێك لە تەختی نێوچاوانی، سێ فیشەك داڵ بەداڵ. لە یەك شوێن. لە بن چنارەکە و لەو خۆڵ و خاکەدا لەسەر گازی پشت دەکەوێ. مێشە کەسکەکان هرووژمی دەکەنێ و دەچنە کونە تفنەکانییەوە و دێنەوە دەرێ... و لە نێوان تۆپە شکاوەکانی عارەبانەدا... بە هەموو چوکووراوای بین بۆغا وەردەبێ کە لە حاجی قۆرت بۆغایان داوە. ئەویش یەکێکی بستەبالاَ. بەلاَم سەیری وردبوونەکەی بیبەر مەکە، بیخۆ بزانە چەندە تیژە. شەهێنیش وردیلەیە، بەلاَم نێچیری لە چنگ دەرناچێ.

"ئەو کابرایە بۆچی کوشتوویەتی؟ بۆ؟ لەبەر چی؟"

"باشە پیاوێکی ئاوا گەورەت بۆ کوشت؟ کوڕە هەر دڵۆپە خوێنێکی هەزاری وەك تۆی دێنا، بۆ کوشتت؟"

"بۆ؟"

"بۆ قسە ناکەی گەماڵ؟"

"ئەو زمانەت لە پشتەسەرتەوە دێنمە دەرێ و ئاخرییەکەی وەقسەت دێنم. بۆ؟"

مستەفا بەگ و دەروێش بەگ گوتیان بیکوژە، وایە؟ راستە؟ دەی بیڵێ سەگی کووڕ."

"ئەتۆ چ سات و سەودایەکت لەگەڵ قۆرت بۆغا هەبوو؟ ئەو لەکوێ و تۆ لەکوێ؟"

"هەر نامەردەکان چاویان بە پیاوی مەرد هەڵنایە."

"قەت دیتووتە پیاوی پیاو یەکتری بکوژن."

قۆرت بۆغا هەموو شتێکی لەبیر کردووە. چما بنیادەم بۆ تووڕەبوونێك دەستی خۆی بەخوێنی یەکێکی دیکە سوور دەکا جارچی؟ ئاغایەکی وا گەورە بۆ دەبێ تۆ بکوژێ؟ تووڕەییەك بوو و هات و رابرد. ئاگرێ بوو بڵێسەی سەند و دامرکایەوە. ئەتۆش شتەکەت زۆر بە هەند وەرگرتووە برالە. ئەوانە سەرێکیان هەیە و هەزار سەودا. کوا پێیان دەکرێ سەری خۆیان بخورێنن تا بیر لە تۆ بکەنەوە؟ بەهەندی مەگرە. ئەو دەمانچەیەش دانێ. جوان نییە بە دەمانچە هەڵگرتن تووڕەی بکەی. با بزانم، چما برالە ئەتۆ شەڕکەری؟ هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ لە هەر جێیەك هەڵدەستی و دادەنیشی و تووشی هەر کەس دەبی زمانت وەك مقەستی سەرتاش دەگەڕێ و دەڵێی دەمکوژن، دەمکوژن. دەی، با بتکوژن. با بێن بتکوژن، چییە. چما چ دەبێ؟ بەرد هەتا لە جێی خۆیەتی گران و سەنگینە و دەعبای سەرەڕۆ بە دندووك پێوە

دەبێ. پیاو لە هەمبەر مەرگدا ئاوا خۆی نادۆڕێنێ. باشت بیر لێ نەکردەوە کووڕەی ماڵوێران. مەرگ وشترێکە لەبەر دەرگای هەموو ماڵێك رادەوەستێ. مەرگ هەقە و هەیە و هەر کەس کاتی هات، خۆ شاردنەوەی بێ فایدەیە. منداڵەکانت؟ دایکیان بەسەریانەوەیە. ئەی ئاسنگەر؟ چما برای گیانی بەگیانیت نییە؟ چما ئاسنگەر دەهێڵێ منداڵەکانت بێ باوکییان پێوە دیار بێ؟ ئەلحەمیللا داهاتێکی باشیشی هەیە. ئاسنگەرەکە نەك هەر منداڵەکانی تۆ، ئەگەر بیەوێ، دە منداڵی دیکەی وەك ئەوانی تۆش وەك گوڵ بەخێو دەکا. سمێڵی باریك و نێوشانی پان و شان و باهۆی بەهێز و نێوقەدی باریك و قامکی درێژ و بەخۆوە و دەست قەڵشیو... بەخوای دەستی ئەو ئاسنگەرە جوانن.

قالۆنچە بە باڵی روون و لەرزەلەرزەوە بەدەم بۆنکردنی بەردەچنەکەوە، ئەمبەر و ئەوبەری بازاڕەکەیان دەکرد و دەسووڕانەوە. مێشەکەرانە بە باڵە روون و سوورە مەیلەو کەسکەکانیانەوە، لە توێکڵە شووتییەکان نیشتبوون.

رووناکایی و هێمنیی بەرەبەیانی باڵی بەسەر بازاڕەکەدا کێشابوو. سێبەری چنارەکان بازاڕە بەردچنکراوەکەی رازاندبۆوە. سریوەی هیچ دەنگێك نەدەهات. لك و پۆپ نا، تەنانەت گەڵایەکیش نەدەبزووت. بەرسوورکە درێژە ناسك و بۆرەکان بۆنیان بە بەردەکانەوە دەکرد و...

جاڕچییەکە لە چەقی بازاڕەکەدا بەتاقی تەنێ راوەستابوو. قۆچەکی چیا دوورەکەی دوڵدوڵ نزیك ببۆوە و رەنگە پەمەییەکەی وردە وردە سپی هەڵدەگەڕا. جاڕچی سەیری چیای دوڵدوڵی کرد.

"دەبێ بیکوژم."

"کێ سەراسوێیی منداڵەکانت دەکا؟"

"بۆخۆت ژنەکە، بۆخۆت. ئەگەر نەیکوژم، نابێ. نەیکوژم، ئەو من دەکوژێ."

"ئەو تۆ ناکوژێ. خۆت شێت مەکە. ئەمن چۆن هەم ئەو منداڵانە بەخێو بکەم و بەتۆش رابگەم لە بەندیخانەدا؟"

ئاسنگەرەکەش هەیە، برادەرە ئاسنگەرەکەم."

ئەو قەت پێناکەنێ. سوعبەت لەگەڵ کەس ناکا. زۆر جوامێرە، بەڵام...

"بنیادەم شیری خاوی خواردووە و دیار نییە دوای مەرگی تۆ لەگەڵ ئێمە چۆن دەبێ..."

"ئاگات لە زمانت بێ. ئەو قسەیەت کرد، جارێکی دیکە لە زارت نەیبیستمەوە. ئەتۆ چۆن دڵت دێ ئاوا باسی براکەی من، گیانی من، جوامێرەکەی من بکەی؟ ئەوە دەڵێی چی؟ جوامێری وەك ئەو تا ئێستا لە دایك نەبووە. زارت لێ بنێ و ئیتر قسەی وا مەکەوە.

کێڵگەی پێنج پەڕان، پڕ بوو لە زیخ و چەو. رووبارەکە بە نێوەڕاستیدا دەڕۆیشت و چەوەکانی بە پاناوێکی پڕ لە پنگە وەردەکرد. هەموو ولاّت، وردکەبەرد و چەو و خاك و دارە گەزەکان و بییەکان و سپیدارەکان بۆنی گوڵی پێنج پەڕ و پنگەیان لێ دەهات. پنگە و پێنج پەڕەکان گوڵە بنەوش (مۆر)ەکانی خۆیانیان لەبەر تاوە پڕشنگدارەکەی چوکووراوا هەڵخستبوو. کێڵگەی پێنج پەڕان لەبەر وزەوزی مێش و سیسرە هەر جمەی دەهات.

روخسارە سڕ و ساردەکەی جاڕچی، درێژتر بۆوە و گرژ بوو. چاوەکانی پڕ بوو لە شەپۆلی بریسکە.

پەپوولەی باڵ سپی، لە سپیاییەکی دوور لە باوەڕدا، پۆل پۆل دەفڕین و دەسووڕانەوە. پۆلە پنگەیەکی چڕ لە سەر تەپۆڵکەیەکەوە گوڵی دەرکردبوو و بۆنەکەی بنیادەمی گێژ دەکرد. جاڕچییەکە لە نێو پۆلە پنگەیەکدا لەپڕ لە بەری پێیەوە تا تۆقی سەری لە شەپۆلێکی رەنگی نارنجیدا رۆچوو و هاتەوە دەرێ. لەگەڵ نزیکبوونەوەی ئەو، بەهەزاران پەپوولە لە پنگەکە هەڵفڕین. بە دەوریدا خولانەوە و ئەوجار وەك شەپۆل رۆیشتن و ون بوون. تاوێك دواتر جاڕچی لە بنەوشێکی یاسەمەنیدا نوقم بوو... چاوەکانی بۆ ساتێك جگە لە رەنگی بنەوش هیچ رەنگێکیان نەدی... بە هەزاران باڵندەی رەنگ بنەوشی یاسەمەنی وەك گەردەلوولێك تەندوورەیان کرد و وەك هەورێك بە ئاسمانێ وەربوون و جاڕچی لە تەڕایی بنەوشێکی یاسەمەنیدا گیانی مێروولەی دەکرد و بە سەر سووڕمانەوە دەستەکانی لێك دەکردنەوە و وێکی دێنانەوە.

"دەبێ بیکوژم. ژن و منداڵەکەشم بە برا گیانی گیانییەکەم، بە برا و دۆستە ئاسنگەرەکەم دەسپێرم. هەی تەمەن درێژ بی پیاو. پانزە ساڵ دەچمە کونێ (زیندان) و دوایی وەك شێر دێمە دەرێ. وا نییە؟ پیاو دەبێ پیاوانە بژیێ. سەیر بکە مستەفا، بڕوانە براڵە، ئەتۆ ناهێڵی ئەمن وەك لەتکە بەردێکی نێو بیرێك، لە زیندانێدا بمێنمەوە. وا نییە؟ سەیر بکە مستەفا، بڕوانە براڵە، برای گیانی گیانیم، هیوایەکم بە تۆیە. کوڕە هۆی کووڕەی داماو، ئەگەر تۆ ئەوەندە چارەڕەش و داماو نەبوایەی و کەرێك نەبوایەی و کوشتنت واجب نەبوایە، چما خوا ئاوای دەخولّقاندی؟ هیچ دەزانی بۆ ئەوەی بەو قەد و قەلاّفەتەوە بخولّقێی، چیها کێشە و چەرمەسەریت ناوەتەوە؟ ئیتر بیبڕێنەوە، تۆ راست دەکەی، براڵە مستەفا. ئاسنگەرەکەم. من، ئەو، ئەو پیاوکوژە بێ شەرەفە کۆچکەبەسەرە داماوە دەبێ بکوژم بۆ ئەوەی لێی حاڵی بێ ژن کوشتن یانی چی. ئەگەر ئەو منی؟"

جا كە دەستە براوەكەی، برایەوە، جا دڵی دەردەهێنرێ. ژانێكی تاقەتبڕ. خوێن فیچقە دەكا. شمشێرەكان لە كووڕاییەكەی پشتی هەڵدەچەقن. كووڕە لەتوپەت و ونجڕ بە ونجڕ دەكرێ. چاوەكانی دەردەپەڕن و بە هەودایەكەوە لە نێو خوێنێكی كەفكردوودا دەتلێنەوە...

ئاسمان پڕە لە ئەستێرەی گەورە و بچووك و درەوشاوە. چیای دوڵدوڵێش كە لە بەردە ئەستێی پەمەیی تاشراوە، لە رۆژهەڵاتەوە نزیكتر بۆتەوە، هەر دەڵێی ئەستێرەكان رژاونەتە سەر لووتكە و داوێنەكەی. ئەستێرەی بەیانییش بە داوێنی لای چەپییەوە پڕشنگ داوێ...

لەپڕ دەكرێ بڵێی سەد هەورە تریشقە یەكجێ تەقینەوە و هەموو وڵات وەك رۆژ رووناك بۆوە. چەوە كەسك و زەرد و بنەوشەكانی دەم ئاوەكە، ماسییەكان بە پوولەكی درەوشاوەیانەوە، گوڵە پنگە و پێنج پەڕەكان بە چاوە رەش و مۆرەكانیانەوە بینران. لە هەورەتریشقەكەدا هەموو وڵات بۆ ساتێك نوقمی تیشك و رووناكی بوو. جارچییەكە بە دەست و پێی سڕ و بێ تینەوە سەری هەڵێنا. یەكێك لە ئەستێرەكان، كە لەوانەیە ئەوی لە هەمووان گەورەتر بووبێ، لەم سەر بۆ ئەو سەری ئاسمانێ راخوشی. ئەستێرەكە هەر راخوشی و خوشی و هات و رێك لەسەر سەری جارچی، لەوانەشە هەر هێندەی پێنج منارە بەرز لە حاڵێكدا نوورەكەی سەد و هەزار بەرابەر ببوو، بڵاو بوو. جارچی بۆ ساتێك چاوی بەشەوارە كەوت. چاوەكانی هەڵگلۆفین و هەڵیهێنان و دیسان نەیتوانی هیچ ببینێ. دوای ئەوە دیسان هەموو شتێك وردە وردە وەك خۆی لێ هاتەوە.

"نەكەی خەلیل. مەكە. خەلیل، خەلیل. خەلی ی ی ل، مەكە. چن و منداڵت هەیە خەلیل."

"ژنەكەشت زۆر جوانە خەلیل."

"بەڵام ئاخر ئەو دەمكوژێ."

"وردە شەپۆلی لەرزۆك لە دەمانچەكە هەڵدەستان... باشە دەمانچەكان ئاوا بریقەدار دروست دەكەن. گەلێ رۆژان هەر نوقمی سەیركردنی بریقەدانەوەكەی بە و قەت لە چاولێكردنەكەی تێر مەبە. لەبەر تیشكی تاو بریقە بۆیقەكەی بە هەزار و یەك رەنگی بەشەپۆل...

بەسواری ئەسپێك لە نێوەڕاستی بازاڕەكە. دەمانچە بریقەدارەكە بەدەستەوە، دیاریی دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی. سێ جار بە غاردان بەنێوەڕاستی بازاڕەكەدا...

"لەجێی خۆت نەجووڵێی سەگباب. راوەستە، راوەستە، راوەستە مەجووڵێ. مەجووڵێ. زارت لێك بكەوە... تەق، تەق، تەق."

"چی گوت، چی گوت، چیی گوت خەلیل جاڕچی؟ گوتی زارت داپچڕە..."

"زارت داپچڕە هەی ئاغای سەگ سیفەت."

"زارت داپچڕە هەی ناپیاو."

"شایەتمان بێنە ناپیاو."

"دەرەقەتی ئەو زەعیفە داماوانەت دێی، هەی فلانی فلانە پێکراو. زارت داپچڕە..."

"چیت بەسەر ئەو هەمووە ژنە هێنا؟ کوشتنت، لەکوێ گلەسەرت کردن؟ زارت داپچڕە."

"ئەتۆ من... من، من... من کێم پێ دەڵێن؟ کووڕە؟ بەمن دەڵێن خەلیل جاڕچی خەلیل جاڕچی. زارت داپچڕە."

نێوەڕاستی بازاڕەکە لەهەموو جێیەکی دیکە باشترە. لەوێ دەبێ هەمووان ببینن کە چۆن گیانی دەردەچێ. چۆن لە حاڵێکدا چنگی لە بەردەکان توند دەکا و پەلەقاژەیەتی و هەوڵ دەدا قەپ لە بەردەکان بگرێ. شەلاڵی خوێن، لە تەڵی سەرییەوە تا بەری پێی شەلاڵی خوێن... بەناڵەناڵ ولەخوێن گەوزیو...

"جارێکی دیکە، جارێکی دیکە، پەلەپیتکەی بترازێنە جاڕچی... بیکوژە..."

لەسەرخۆ:"ئەنگۆ خۆی تێهەڵمەقوتێنن. برینکەی کارییە. تازە بە لوقمانی حەکیمیش چاك نابێتەوە." وەك گا دەیبۆڕاند، دەینەڕاند و لە حاڵێکدا خوێن لە برینەکەی فیچقەی دەکرد، پەلاماری کووڕە دەدا. چاوەکانی کە لە چاوی گا دەچن، دەرپەڕیون...

"بگرە، بگرە، بگرە، ئەوەش یەکی دیکە بیگرە."

رێك لە تەختی نێوچاوانی.

"کێ کوشتی؟ کێ؟"

"خەلیل جاڕچی."

"وەك دارێکی رزیو کەوت."

پۆل پۆل خەڵك لە کازیوەی بەیانییەوە بەرەو بازاڕ دادەگەڕێن... سێبەرەکان قورس و تار لێرە و لەوێ کەوتبوونە سەر بەردچنە سپییەکە و بازاڕەکەیان بەڵەك کردبوو. ئاسنگەرەکان هەر لە کۆنەوە خۆڵەمێشی کوورەکەیان لە بن ئەو دارە رۆدەکرد. دەوری کۆگای خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵەکەی لای راست، کە کەوتبووە پانزە هەنگاوی ئەو لای کانییەکە و بن لك وپۆی چڕی دارچنارەکەوە، بە تەل دڕووەکی کورت گیرابوو. چیمەنێکی گەش و سەوز پەڵە پەڵە تەپۆڵکەی خۆڵەمێشەکەی کە هێندەی مەیدانێکی داگرتبوو، داپۆشیبوو.

لە پێشدا عوسمان بوو کە سوورایی خوێنەکەی بەسەر چیمەنی پشت پەرژینەکەوە دیت و موراد گوێ چەمەنی زبلڕێژی بانگ کرد. عوسمان چۆن پەڵەی سووری ئەو خوێنەی بەسەر چیمەنەکەوە دیتبوو؟ عوسمان هەموو رۆژێ بەر لە تاوهەڵاتێ، لەنێو کۆگای خۆڵەمێشەکەدا رەژووی نیوەسووتی کۆ دەکردەوە.

خەڵکەکە شەپۆل شەپۆل بەرەو بن چنارەکە، بەرەو بازاڕی ئاسنگەران دادەگەڕێن. منداڵ و پیر و لاو بەنێوچاوانێکی مرچ و مۆنەوە لە بوولێڵی بەریانیدا. خەواڵوو نا، ترساو. چیای دوڵدوڵ پەمەیی، لە بەردەئەستێ تاشراو، نزیکتر، لووتکەکەی سوورهەڵگەڕاو و تیژ. بە ژوور سەرییەوە خۆر وەك دڵۆپە خوێنێکی هەڵواسراو.

"لە ئاسنگەرەکەیان داوە... لە ئاسنگەرە..."

دەستی چەپەی توند بە سندانەکەوەیە... کوتکەکەی بە دەستی راستییەوە و درێژ بووە و گەیشتووەتە کوورەکە و سەری شۆڕ بووەتەوە، بەڵام نەگەیشتووەتە سەر عەرزی. لە بن کەلەکەی راستەیەوە گۆمیلکەیەکی خوێن مەیوە. دەستی زلەکەی کوتککگرتنەکەشی کەوتووەتە نێو خوێنەکەوە. پاژنێی قەڵشیوی لاقە کەمرەگرتوو و شەقار شەقارەکانیشی لە خوێن شەڵاڵ بوون. پانتۆڵەکەشی هەتا بن ئەژنۆکانی داکێشراوە.

"لە ئاسنگەرەکەیان داوە.... ئاسنگەرەکە..."

جارِچی خولایەوە و خولایەوە و خولایەوە. هەر بە دەوری خۆیدا خولایەوە. وەك دەروێشێکی جەزمەگرتوو.

" ئاسنگەرەکە لێی دراوە... ئاسنگەرەکە..."

چاوەکانی دەرپەڕیبوون و دەموچاوە درێژووکە سێگۆشەکەی سپیتر هەڵدەگەڕا.

"لە ئاسنگەرەکە دراوە."

هەموو گیانی وەك مێژۆکە دەلەرزی.

دووکانی ئاسنگەرەکە وەك پوورەی هەنگ هەر جمەی دەهات. هەرچی دەچووە ژوورێ، بە نێوچاوانێکی گرژەوە، بە سەرسووڕمان و نەفرەتەوە و بە چاوی تەڕ و تۆقیوەوە لە دووکانەکە دەهاتە دەێ.

"لە پشتەوەڕا لێی دراوە. لەپشتەوەڕا."

"فیشەکێك لە پشتی دراوە و ئێسکی سینگی هەڵتەکاندووە و دەرچووە."

"ئاسنگەرەکە پیاوێك نەبوو بە فیشەکێك بکەوێ."

"من کوشتم. من."

جارچی نەیتوانی لە مەیتی ئاسنگەرکە بچێتە پێشێ. تاوێك لەبەر دەرگای دووکانەکە، سەیرێکی دەستی خوێناویی کوتکەکەی و لاقە کەمرەبەستووە رووتەکانی کرد و لەوە پتر خۆی پێ نەگیرا. چوو و لەسەر تاتە بەردەکەی تەنیشت تەل دڕووەکەی دەوری خۆڵەمێشەکە دانیشت و گوتی:"ئەمن کوشتم. من. ئەو بێشەرەفانە منیان نەکوشت. منیان بە شیاوی کوشتنێ نەزانی... حاجی قۆرت بۆغا نەیتوانی خۆی قایل بکا من بکوژێ... من ئەوم کوشت عەلی... ئەمن ئەوم کوشت... من..."

"هەمووان دەزانن کێ ئەوی کوشتووە خەلی ی ی ل. خەلیل جارچی...."

"تۆ."

"من عەلی من... سێ فیشەك... لە تەختی پشتی... سێ فیشەك.... عەلی، تکایەکم هەیە، عەلی...."

"فەرموو خەلیل ئاغا."

"خەلیل ئاغا بە قوربانت بێ عەلی، ئەگەر نەمردم و ژیام، لە بن باری ئەو چاکەیەت نایەمەدەر..."

"بڵێ دەی خەلیل، بیلێ. بڵێ بزانم چیت دەوێ."

"لاقەکانی رووتن. چڵکنن عەلی. عازەب بوو عەلی. بێکەس و کارە عەلی. ئەو پارەیەم لێ وەرگرە و جووتێ گۆرەویی بۆ بکڕە و لە پێی بکە... لەبەر چاوی ژن و منداڵ و دۆست و دوژمن، شۆرت و بن کراسیشی بۆ بکڕە. با ئەو کاتەی دوکتۆر رووتی دەکاتەوە، بەخاوێنی بیبینێ. برالە مستەفا ئاسنگەرەکە کوڕە عازەب بوو."

مێشە سەوزەکانی نێو دووکانی ئاسنگەرەکە پتر بوون. لەسەر تەرمەکە و لە دەوروپشتی نیشتن و فڕینەوە و خولانەوە. قالۆنچەکان بۆنیان بە بەردە رووتە مۆرەکانەوە دەکرد و هەڵدەفڕین. بە سەدان هەزار پەپوولە بە باڵی یاسەمەنیی لێك کراوە و جەستەی بۆرەوە وەك گێژەڵووکە بەنێو پێنج پەڕەکاندا دەسووڕانەوە.

تاوەکە کەوتە سەر دەستی راستەی مستەفا ئاسنگەر. هەر ئەو دەستەی کوتکەکەی پێوە بوو. تاوەکە کەوتە سەر دەموچاوە بزڕکاوەکەی خەلیل جارچیش کە لەسەر بەردەکە کرووشمەی کردبوو.

حاجی قۆرت بۆغا هەر دەتگوت بزەیەکی لەسەر لێوە، داهاتەوە و لە دەرگای دووکانی ئاسنگەرەکەوە وەژوور کەوت و تاوێك لەوێ مایەوە. بە خۆشی و لەخۆباییبوونێکەوە کە لە روخساریدا خۆی دەنواند، بەدەم بەباداکردنی دووکەڵی جگەرەکەیەوە، لەوێ هاتە دەرێ. پێنج جەندەرمە بە عەریفێکەوە لە بن دارچنارەکە دەستەونەزەر راوەستابوون.

قۆرت بۆغا بە بە شەقاوی گەورە گەورەوە بەرەو جارچی کە لەسەر تەختە بەردەکە دانیشتبوو، رۆیشت. رووبەرووی راوەستا و گوتی:"ئەتۆ مستەفا ئاسنگەرت کوشت. تۆ کوشتت هەی کووڕی خێچ و خوار. تو کوشتت هەی نەگبەت. ئێستاش ئەوە دانیشتووی و دەم و لچت تێك ناوە، ها؟ ئەتۆ کوشتت، تۆ، تۆ کوشتت، تۆ ۆ ۆ ۆ."

جارچی گرمۆڵەتر بوو. وەك گولۆڵەیەك و وەك مستێك.

"بیگرە عەریف. کەلەپچەی بکەن. ئەو کووڕە پیسە پاڵەوانێکی ئاوا گەورەی کوشتووە و ئێستاش ئەوە قیت و قنج دەسوورێتەوە. کەلەپچەی لە دەستی بدە... جا کە پەتی سێدارەی لە ملی کرا، ئەوکات دەزانێ کوشتنی پیاوێکی ئاوا زل یانی چی. کەلەپچەی بکەن."

جەندەرمە هاتن و خەلیل جارچییان کە وەك مردوو رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو، وەك جەواڵێکی بەتاڵ هەستاندە سەر پێیان و کەلەپچەیان لە مەچەکی دا. دوو جەندەرمە بن باڵیان گرت و بردیان. خەڵك هەتا لە چاوان ونبوون چاویان بەدوویانەوە بوو. نە غەڵبەغەڵب و نە نارەزایەتییەکی لێ کەوتەوە و نە کەس پێی سەیر بوو و نە کەسیش پێی شاد بوو. هەمووان وڕ و کاس سەیریان کرد و لەبەر خۆیانەوە گوتیان:"جارچی ئاسنگەرەکەی کوشتووە، ئاسنگەرەکەی."

"نزیکترین دۆستی خۆی."

"بۆ؟"

"دیارە مەسەلەی نامووسی لەگۆڕێ بووە."

"مستەفا لە ماڵەکەی ئەو نەدەهاتە دەرێ."

"موویان لە بەینەوە نەدەچوو."

مستەفا ئاسنگەری پاڵەوان، خۆ ئاشقی چاوە رەشەکانی ئەو کووڕە گڵاوە نەببوو..."

"بەڵام ئیتر کووڕە گەیشتبووە سەر ئێسکی... بە قوربانی سێ فیشەکی کرد."

"هەی بژی کوورە. گاڵتەی پێ ناکرێ، نامووس لەگۆڕێیە کاکە. کوورە، با کووریش بێ. چما کوورِ ئینسان نییە؟ چما پیاو نییە؟ با کوورِ بێ، دەی جا چییە؟ چما کوێر و گێڕ و کوورِ خوا نەیخوڵقاندوونە؟"

"ئەی ئەگەر ژنەتیوە کەیفی بە کوورە نەیە..."

"ژنەکەی تاقانەی دنیایە..."

"خوا دەزانێ ئەگەر من لە جێی کوورە بوایەم، سێ فیشەکی چی، سی فیشەکم لێ دەدا و دەمکردە بیژینگ."

"بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێ بوو. یەكپشوو دەیگوت من کوشتم. ئەمن مستەفام کوشت."

"هەمووان ئەوەیان بیست برا. ئێستا هەر مردووەکان نازانن لەو شارەدا چ باسە. کەس نییە نەزانێ.

"هەتا بەیانی بە گەڕەکدا گەڕاوە و تووشی هەر کەس بووە، گوتوویەتی ئەمن براکەی خۆم، ئاسنگەرەکەم، مستەفام کوشتووە."

"پەیتاپ پەیتا."

"باشە بۆ کشوتوویەتی.... ژنەکەی جاڕچی، ژنێکی بێ حەیا و بێ ئابڕوویە. بەو جاڕچییە پیسکەیە بڵێ..."

"هەموو گیانی کوورە..."

"باشە ئەو ژنە کوێی ئەو کوورەی بەدڵ بووە؟"

"چی بەدڵ بووە. بەدڵی نەبووە چاوەکەم... ئەوەیە ئەنجامەکەی."

"بەڵام زۆر بەخۆی دەنازی کە ئاسنگەرکەی کوشتبوو."

"دەی کوشتوویەتی، با کوشتبێتی، هەقی خۆی بوو."

"لەسەر شەرەفی خۆی وەجواب هاتووە."

"بەوە دەڵێن پیاو."

"هەقی خۆیەتی، برالە هەقێتی. یەکێکی کارێکی ئاوا گەورەی خوڵقاندبێ، هەر دەبێ بەخۆی بنازێ."

تاوێك دواتر ملازمیش هات و چووە نێو دووکانی ئاسنگەرەکە. تاوێك لەوێدا مایەوە و دوایی هاتە دەرێ و بەبێ ئەوەی مێشێکی لێ میوان بێ، خۆی کوورِ کردبۆوە و لێی دا و

ڕۆیشت. هەر دەتگوت هیچ نەقەوماوە. قۆرت بۆغا پێشی گرت و بن باڵی گرت و شان بەشانی وەڕێ کەوت.

دەچوونە بنکەکەی پۆلیس. عەریف حەسەن لەبەر دەرگای ژوورەکەوە ڕاوەستابوو. دەتگوت گورگێکی فێڵبازە* و لەسەر پێیە کە پەلاماری نێچیرەکەی بدات. پاژنەی لێك دان و گوتی:" لە ژووریم کرد. کۆتم لە ملی کرد و سندمم کردە پێی. ئێستا ئامادەین بیکەینە بنیادەم."

"فەرموو حاجی."

"ئەستەغفیرۆڵڵا جەنابی ملازم. خۆت وەپێش بکەوە."

ملازم بە قەڵافەتێکی فەرماندەرانەوە، دەرگای کردەوە و بە دەنگێکی گڕ بە قۆرت بۆغای گوت:"جەنابت میوانی منی. دەبێ وەپێش بکەی. بەتایبەتی لە منیش گەورەتری."

حاجی قۆرت بۆغا شەرمن و زەردەخەنە لەسەر لێو و لەسەر خۆ وەژوور کەوت.

"بەڵێ ێ ێ ێ، بەڵ ڵ ڵ ێ ێ ێ."

باوێشك دەنگی لێ بڕی و دوای ئەوەی خۆی خاوکێش کرد، ئەوجار خۆی کۆ کردەوە و بە دەموچاوێکی گرژ و مۆنەوە لەسەری ڕۆیشت:"دەی عەریف. دەسبەجێ وەقسەی بێنە با پێی لێ بنێ. هەر ئێستا دەچیتە خوارێ و وای لێ دەکەی کوشتنەکەی مستەفا ئاسنگەر وەئەستۆ بگرێ. ناوەکەی خۆی چییە؟"

"خەلیل فەلەك جەنابی فەرماندە."

ئەوە مانگێکت دەرفەت دەدەمێ. دەبێ خەلیل فەلەکم بۆ وەقسە بێنی و وای لێ بکەی دانی پیا بنێ. مەبەستم ئەوەیە لەو ماوەیەدا خەلیل فەلەك ناچار بکەی دانی پیا بنێ. بەڵام وای لێ نەکەی لە کەڵك و کار بیکەوێ ها... ئەگەر تا مانگێك نەتتوانی وەقسەی بێنێ، ئەوکات هەرچییەکت پێ خۆشە بەسەری بێنە."

"بەسەر چاو..."

"خێرا دەست پێ بکە. دوای تاوێکی دیکە لێی ئاگادارم بکەوە. با بزانم پشت کووڕ چەندە خۆ رادەگرێ."

"بەسەر چاو گەورەم."

"سەیرکە، پیاوە نقوستانەکان بەزۆری لاسارن. بەتایبەتی کەڕ و کووڕەکان."

---

* نازانم بۆچی نووسیوێتی گورگی فێڵباز؟ چونکە وا باوە ڕێوی بە فێڵباز ناسراوە. مامۆستا هەژار بە کۆشکی بلوورینددا دەڵێ:"
دەعبای نەهێشت لە کێوی ...... بەخوای فێڵبازە ڕێوی

"هیچ شتێك لەسەر کوورەکان نازانم، بەڵام هەی داد لە دەستی کەرەکان... گۆج و ئیفلیجەکانیش... حەزرەتی فیلیش دەرەقەتی ئیفلیجەکان نایە. ئێستا ئەوە کوورەش تاقی دەکەینەوە. با بزانین چەندە پیاوە."

"دەی برۆ دەی. برۆ خەریك بە."

عەریف حەسەن وەدەر کەوت.

"قاوەتان هەیە؟"

"بەڵێ گەورەم."

تاوێك دواتر سەربازێك کە بەروانکەیەکی سپیی بەستبوو، قاوەی هێنا.

"یانی خۆ رادەگرێ؟"

"ئەو کوورە لە مەحموود لاسارترە. دەترسم بتۆپێ."

بلێی و نەلێی ملازم نێوچاوانی تێك نا. کەنێوچاوانی تێك دەنا، برۆی لێك نزیك دەبوونەوە و چاوەکانی سپی هەڵدەگەڕان. هەر بەو قەڵافەتەیەوە و بە بنزاراوەیەکی کۆچەریانەوە گوتی:"ئەمجارەیان ئەو وەقسە دێنم، حاجی قۆرت بۆغا ئەگەر عەریف حەسەن بە شێوازی خۆی نەیتوانی وەقسەی بێنێ، خۆم قۆڵی لێ هەڵدەماڵم. بژی ئەمریکا کە ئەو هەمووە کەلوپەل و کەرەسە و دامودەزگا پێشکەوتووەی خستووەتە بەردەستمان و شێوازی ئاوا کاریگەری فێر کردووین کە بە لەکارهێنانیان تەنانەت دەکرێ بەرد و خاك و دار و ئاسنیش وەقسە بێنی. کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی قەت ئەو خزمەتەی لەبیر ناچێتەوە کە ئەمریکا پێی کردووە."

حاجی قۆرت بۆغا گوتی:"لەبیری ناچێتەوە.

"ئەگەر دۆستی گەورەمان، ئەمریکا نەدەبوو، ئەو کەرەستەی ئەشکەنجەکردنە و ئەو رێوشوێنانەی ئەشکەنجەیە دروست نەدەکرد و داینەدەهێنا و بۆ ئێمەی نەدەنارد و فێریشی نەدەکردین، تاوانکارەکانی زۆربەری زۆریان هەر نەشدەناسران."

حاجی قۆرت بۆغا گوتی:"نەدەناسران. ئەمریکا دۆستی شەریف و ژیر و وریای ئێمەیە. ئیتر ئەو..."

ملازم قسەکەی پێ بڕی:"ئەگەر ئەمریکا نەدەبوو، ئێمە هەر لەبرسان دەمردین... ئەگەر ئەمریکا نەدەچوو... فڕۆکە لە ئاسمان، پاپۆڕ لە ئاودا... ئەو رێگاوبانە لە سایەی سەری کێدا و بە یارمەتیی کێ..."

حاجی قۆرت بۆغا لێی زیاد کرد:"ئەی ئەو ترۆمبێلانەی بە هارەهارِ دێن و دەچن.."

"ئەوەی دێنیٚ کە پیاو جارێك بنگەی ئینجیرلیك ببینیٚ... فڕۆکەی وای لێیە لە هیچ کویٚ نییە... ئەوانەی کە بۆوەی دەبن پێیان بچیتە سەر مانگیش."

"ئەمریکا گیانی ئێمەیە."

"هەر ئێستا، هەر ئێستا وەقسە دیٚ."

قاوەکانیان پێدا کرد. هێشتا هەر بەئەمریکایان هەڵدەگوت کە عەریف حەسەن شەلاٚلیٚ ئارەقە وەژوور کەوت. ئەوەندە پەشێو بوو دەتگوت ئێستا وەگریان دەکەویٚ. دەتگوت منداڵێکە کەرەستەی یاریکردنەکەیان لە دەست دەرهێناوە. سووکایەتی پیٚ کراو و داماو و شپرێو و شلّەژاو لە بەرامبەر ملازمدا وەك بزمار چەقی.

ملازم لەسەر کورسییەکەی قیت بۆوە و چاوی لە چاوەکانی بڕی و بە نیگەرانییەوە لێی پرسی:

"مرد؟"

حەسەن بە دەنگێکی ماندووی وەك مردووان وەلاٚمی دایەوە:"نەمرد، نەمرد، بەلاٚم...."

ملازم بەپەلە پرسی:"بەلاٚم چی؟ چ بووە؟ رای کرد؟"

حەسەن بە دڵەکوتە و پەرێشانییەوە گوتی:"قسەی کرد. گوتی ئەمن ئاسنگەرەکەم کوشت..."

تاوێك لە بێدەنگیدا مانەوە. کەس متەقی لێوە نەهات. دەتگی ترپەی دڵیان دەبیسرا.

ملازم پاش تاوێك سەری هەڵێنا:"گوتیشی بۆ؟ لێت پرسی؟"

"پرسیم، بەلاٚم هیچی نەگوت."

"باشە. بیدەیە با بن دان پێدانانەکەی مۆر و ئیمزا بکا."

"ئیمزای کردووە گەورەم."

ئەوجار ئەوکاغەزەی بە دەستییەوە بوو بۆ ملازمی راداشت. ملازم بە سەرسووڕمانەوە کاغەزەکەی وەرگرت و خوێندییەوە و گوتی:"سەیرە، سەیرە، سەیرە. هیچ چاوەڕوانیی ئەوەم نەبوو. وا نییە حاجی؟"

"کوڕە ئەو جاڕچییە بۆگەنە لەوە زیاتر دەبیٚ چاوەڕێی چی دیکەت لێی بیٚ. مەگەر ئەوانەی ئاسنگەرەکەیان دەکوشت، نەیاندەزانی ئەو کووڕە بۆوەی نابیٚ بیکوژی؟ بەلاٚم ئەو دەرەبەگە کەرانە نافامن و تێناگەن... تێناگەن و دەمانچەش بە دیاری دەدەنە ترسنۆك و دەستەوستانی

وەك ئەو جۆرە کەسانە. ئەویش یادگارییەکەی باوکیان... جا با بێن و پشت کوورەکەیان وەرگرنەوە و بزانن پاڵەوان فس فسەکەیان چی لێ کەوتووەتەوە..."

"ئەی شوێنی دەمانچەکەشت پێ زانی؟"

"پرسیم جەنابی ملازم. دەڵێ ئەمن دەمانچەم نییە و کەسیش دەمانچەی بە دیاری نەداومەتێ."

"برۆ خوارێ عەریف. با ئەوەت پێ بڵێم کە دەمانچەکەم هەر دەوێ و دووەم ئەوەیکە لە زاری دەربکێشە بزانە ئەو تاوانەی بۆچی کردووە."

حاجی قۆرت بۆغا لە قوولایی دڵییەوە قاقایەکی کێشا... پێدەکەنی و لە پێکەنینان دەبوورایەوە. ملازمیش وێڕای ئەو پێکەنی. هەردووکیان پێکەنین و پێکەنینەکانیان تێکەڵ بوون.

گەڕانەوەی عەریف حەسەن بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکەیان زۆری خایاند. سەعاتێکی لە دوانیوەڕۆ لادابوو کە دەست لە گونان درێژتر گەڕایەوە.

"چ بوو حەسەن؟"

"هیچ ناڵێ گەورەم."

روخساری عەریف حەسەن زەرد زەرد هەڵگەڕابوو و لەبەر ماندوویەتییان بەلادا دەهات.

"چیت کرد؟"

"شێوە ئەمریکییەکەم لەکار هێنا."

"ئەی چ بوو؟"

"لەهۆش چوو گەورەم. نە دەڵێ بۆچیم کوشتووە و نە دەشڵێ دەمانچەکە لەکوێیە. ئەمن لە ژیانمدا تووشی دەعبای وا چەرم ئەستوور نەبوومە."

ملازم قست بۆوە و بە تووڕەیی و هات و هاوارەوە گوتی:"بەردەوام بە، بەردەوام بە عەریف. ئەمشەو خۆم دەست پێ دەکەم. بە نوێترین شێوازی ئەمریکی. جا ئەوجار با بزانین دەعبای پێست ئەستوور کێیە. ئەتۆ جارێ بچۆ خەریك بە... هەتا ئێستا وەهۆش هاتۆتەوە. بەردەوام بە."

"فەرمانتە گەورەم."

# ٤٧

لەو بەرەوە، لە رۆژهەلاتەوە، لە دوور دوورەوە، چیای دولدولْ دەتگوت لە مس تاشراوە، بە رەنگێکی مسیی پەمەییەوە، تیژ لە بەردی ئەستێ کە مسییەکی سەوز دەنوێنێ، رەنگ بزرکاو، خالْ و بەلەك ئەوەندە نزیك بووەتەوە، دەلێ ئەگەر دەستی بۆ بەری، دەگیردرێ. سێبەری تاری مسیی تۆخ کەوتووەتە سەر قەلشتەکانی. سێبەر بەرەو باکوور دەکشێن و هەورەکانی سەریشی بەرەو باکوور هەلدەستن. جارێك وەك پەردەیەك لە پشت چیا داتەپیو و سواو و خەوتووەکانەوە بەنازێکەوە کەروێشکەی دەکرد و کالْ دەبۆوە و لە چاوان ون دەبوو و جارێکیش سەخت و تیژ و زبر دەینواند.

لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە داگەران. بە نێو جاترە و نەعنای ناسکی گەلا پوولەکەیی و گولە وشکهەلاتووەکانی چەقەدا تێپەرین. شینکەیەکی گەش و تورت لە دەشتەکەدا چووزەرەی دەرکردبوو و چی نەمابوو گولْ بپشکوێن. شنە بایەك هەلی کردبوو و بۆن و بەرامەیەکی نامۆی بلاو دەکردەوە. ئاقچاسازی تژی لە بالندە و جروجانەوەری جۆراوجۆر و بۆن و بەرامە و گیای بێ وێنەی تازە شینبوو و حەیوانی تۆکمە، دەیلووراند. ئاقچاساز بە خێراییەکی هەستپێکراو رۆژ بە رۆژ وشك دەبوو. خاکێکی بەپیت و وشك و شەقارشەقار دەوراندەوری ئاقچاسازی داگرتبوو. خاکەکەی ئاقچاسازی تژی، ئەوەندە بەپیت و ئامادە بوو، بەردیشی لێ شین دەبوو. بە هەزار و یەك جۆرە گیا و گولْ و بەر و بوو و رەنگ ئاوس بوو. هەراو و خۆ هەلخستبوو لەبەر هەتاو و چاوەروانی بەرگرتن. چاوەروانییەکی بەکەفوکولْ و بەتینی چەند سالانە و تینوو.

جا حەمە عەلی بەوەی دەزانی.

ئالاتەمیریش دەیزانی.

جا ئالاتەمیر لە ناخەوە هەستی بە چاوەروانی و بەپیتبوونی ئەو خاکە دەکرد.

لەگەڵ هەر هەنگاوێکی کە دەینا و پۆتینە سوورە زبر و تازەکانی لە خاکە رەمڵین و نەرمەکەدا رۆدەچوو، لەخۆوە دەیگوت:"ئەی لەوە، ئەی لەوە... ئەی لەوە، سەیرە، ئەی لەو خاکە، وەی لەو خاکە. کوڕە ئەوەندە لە شوێنێك مەوێستە. برۆ حەمە عەلی بەگ. ئەگەر لە شوێنێك راوەستی، لەپڕێکا شین دەبی و چرۆ دەکەی کاکە گیان. شین دەبیتەوە گیانەکەم. لە جێی خۆت پنج دادەکوتی و سەرت گوڵی لێ دەپشکوێ. وەی لەوە، سەیرە، ئەی لەو خاکە، وەی لەو خاکە..."

ئالاتەمیر لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. لەو کاتەوە گەیشتبووە ئاناوەرزا و پێی نابووە سەر ئەو خاکە رەش و چەورە، سەرخۆش ببوو. شاگەشکە ببوو و جڵە و هەوساری بەدەست خۆیەوە نەمابوو و بە چەقڵەسەماوە خۆی رادەوەشاند و وشەیەکی نەدەدۆزییەوە هەستی دڵی پڕ لە کوڵی خۆی پێ دەربڕێ و بەردەوام دەیگوت و دەیگوتەوە:"وەی لەوە، ئای لەوە، ئەی لەوە..."

"بەڵێ مامە تەیموور بەگ، باسی ئەوەم بۆ دەکردی، کارێکی باشت کرد. کارێکی زۆر باشت کرد. بەراستی زۆرم پێ خۆش بوو مامە تەیموور بەگ."

حەمە عەلی زۆری پێ سەیر بوو. قەت ئالاتەمیری ئاوا نەدیتبوو. نە مات دەبوو و نە دەست و پێیەکانی کۆ دەکردنەوە و نە دەستە زلەکانی لە سەر ئەژنۆ جووتکراوەکانی دادەنا... ئالاتەمیر شاگەشکە ببوو و هەموو گیانی ببووە جموجۆڵ و کەفوکوڵ و پێکەنین. سەرو قژ و دەموچاوی گەش ببۆوە، چاوە کاڵە مەیلەو سەوزەکانی و ددانە سپییەکانی هەموو جوان دیار بوون. ئەو ئالاتەمیرە بنیادەمێکی سەیر شیرین بووە. هەر دەڵێی منداڵە. هەر جارێکی بەری پێی وەعەرزی دەکەوت، وەك منداڵان چەپڵەی لێ دەدا. کە بۆ یەکەم جار چاوی بە یەك دوو گوڵی نامۆ دەکەوت و تووشی پەپوولەیەك دەبوو هێندەی باڵندەیەك، پەپوولەیەکی رەش، بریقەدار، خاڵخاڵ یان ئاڵقە ئاڵقەی تۆخی پڕ لە زەردە خاڵ... دەستی لێك دەدا و وەك منداڵان دەکەوتە هەڵەکە سەما. خۆ ئەگەر ماندوو نەبوایە و پیری برستی لێ نەبڕیبایە و جگە لەوەش ئەگەر شەرمی نەکردبا و پێی عەیب نەبوایە، سەری لەدووی پەپوولەکان دەنا و وێڕای ئەوان غاری دەدا.

"ئای لەوە، ئای لەوە، وەی لەوە."

"سەیر بکە مامە تەیموور بەگ، هەموو ئەو زەوی و زارانەی دەوری ئاقچاساز دەبێ بگرین. کارێکی باشت کرد کە قۆرت قۆلاغیت لە چنگی دەرویش بەگ دەرهێنا. بڕوانە مامە تەیموور بەگ، دەبێ هەموو ئەو زەوی و زارە بکڕم و پارەی بۆ دابین بکەم. زەوی و زارەکەی قەراغ،

دەبێ پارچە پارچە بیکرین. کە زۆنگاوەکە وشك بوو، وەنێوی دەکەوین و دەچینە ناوەندەکەی، دەچینە قووڵاییەکەی، وا نییە؟ دەزانی مامە تەیموور بەگ، ئەو زۆنگاوە پتر لە سەد هەزار دۆنم رووبەرەکەیەتی... لەوانەشە سەد و پەنجا. بیری لێ بکەرەوە. بیری لێ بکەرەوە. بیری لێ بکەرەوە مامە... هەر پارچە زەوییەکی لەو زۆنگاوە دێتە دەرێ، یەك و سەد بەر دەداتەوە. یەك دۆنمەکەی پێنج سەد کیلۆ بەر دەگرێ. دەبێتە هیی خۆمان. ئەمساڵ ئی ئێمە... بیری لێ بکەوە، بیر لێ بکەوە، بیری لێ بکەوە مامە تەیموور بەگ... بیری لێ بکەرەوە.."

بەرەو زۆنگاوەکە دەچوونە پێشێ. ئالاتەمیر لەپڕێکا راوەستا. دەموچاوە رەش و تاوبردووەکەی لەبەر ئارەقە دیار نەبوو. دەستە پەڵشیوەکانی هەڵێنا و بەدەنگێکی بەرز گوتی:"بیری لێ دەکەمەوە. سەیرە، سەیرە... سەیرە... ئەوە خاك نییە گەوهەرە."

ئەوجار ئەژنۆی دادا و چاوی لە خۆر بڕی کە خەریك بوو هەڵدەهات و ساتێك ئاوا مایەوە و هێندێ دووعای لە بن لێوانەوە گوتەوە و بەدوایدا دەستەکانی رووەو ئاسمانێ هەڵبڕی. دەستەکانی بۆ ماوەیەك وەك بڵێی بیەوێ ئاسمان لە باوەش بگرێ، بە کراوەیی مانەوە و لێوەکانی هەروا جووڵان و چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی رەوینەوە و گەش بۆوە.

حەمە عەلی سەری سووڕ مابوو و نەیدەزانی لەو حاڵەتەدا دەبێ چ بکا. دوایی دەستەکانی شۆڕ بوونەوە، بەڵام دەموچاوی هەروا رووە و ئاسمان مانەوە. دەستەکانی چوونە سەر و بە دەموچاویدا خشکان. هێندێ شتی لە بن لێوانەوە گوت و فووی بە دەستەکانیدا کرد. فووی کرد و بەسەر و چاویدا هێنا و چەند جارێك ئەوەی پاتە کردەوە. دوایی بەسەر خاکەکەدا نووشتایەوە. دوو دەستەکەی لە پێش خۆیەوە دانابوو و نێوچاوانی لە خاکەکە خشکاند و تاوێك هەروا مایەوە...

کە بە هێمنی سەری بەرز کردەوە تاو رەمێك لە ئاسمانێ بەرز ببۆوە. رووی کردبووە رۆژهەڵاتێ و چاوی بڕیبووە چیا بەفراوییەکەی دودڵدوڵ کە سەری لە مس و بەردە ئەستێ تاشرابوو. چیای دوڵدوڵ نوقمی هەوری نوور بوو و ئەوەندە رووناك بوو دەتگوت بەرد و هەڵم و کەلێنەکانی و گوڵ و دەوەن و قالۆنچە و مێشەکانی یەك بە یەك دەبینرێن... هەر دەتگوت دەبینرێن... دەشبینران...

"ئەی لەوە، وەی لەوەی، خوایە، ئەی خوایەگیان وەی لەوە، وەی لەو خاکە."

"بڕوانە مامە تەیموور بەگ..."

هەستا و هاتە پێشێ و بە چاوی تژی لە خۆشەویستی و سوپاسەوە لە حەمە عەلی ورد بۆوە. یەکەم جاری بوو بنیادەمێك، ئەویش ئەو منداڵە ئاوا بەرێز و حورمەتەوە دەیدواند. وەختەبوو لە خۆشیان بفڕێ کە وەك بنیادەم سەیریان کردبوو و دەیەویست لە بەرانبەریدا دەستەونەزەر راوەستێ. کوڕە وای قسە لەگەڵ دەکا هەر دەڵێی لە هەمبەر پادشایەکدا راوەستاوە و سەر و بنی قسەکانی مامە تەیموور بەگ، مامەتەیموور بەگە... لەو چوکووراوایەدا کەس نییە لە وێنەی حەمە عەلی. حەمە عەلی بێوێنەیە. نە بەگە و نە لەو لوتبەرزە بەپۆز و ئیفادانەیە... مامە تەیموور بەگەکەی خۆی هەر خزمەتێکی لە دەستی بێ لەسەر چاوی دادەنێ. مامە تەیموور بەگەکەی تێی دەگەیەنێ و بۆی روون دەکاتەوە کارکردن لەسەر ئەو خاکە و هەوڵدانی بێ ماندووبوون و راوەستان لەبەر ئەو خۆرەتاوە یانی چی. لە دنیا هەموو شتێك پووچ و خۆڕاییە شتێك نەبێ، ئەویش کارکردن و هەوڵدانە. ئیتر خاکی خۆڵەمیشی، خاکی رەنگ کازیوەیی، خاکی حەساوە و زیندوو و بەپیت... مامە تەیموور بەگت پێت دەڵێ خاك و هەوڵدان و ئەوەی بەنرخ و بەقیمەتە، کێهەیە. ئەوانە ژیانیان هەر بەلاوە خواردن و خەوتنە و تەواو. مامە تەمیر بەگت دنیات پێ دەناسێنێ حەمە عەلی، حەمە عەلی... وەرێ کەوە و بزانە مامە تەمیر بەگت وەك کێوی قاف لە پشتت راوەستاوە، نا نا، مامە تەیموور، تەیموور بەگت. تەمیر نا، تەیموور."

"مامە تەیموور بەگ..."

"مامە تەیموور بەگ لەسەرت گەڕێ حەمە عەلی گیان."

حەمە عەلی سەری سووڕمابوو. خۆشەویستییەکی گەرموگوڕ و نامۆ هەموو گیانی تەنیبوو. گیانی تژی بوو لە خۆشەویستی.

"بڕوانە مامە تەیموور بەگ، هەم دەورێش بەگ و هەم باوکیشم هەردووکیان شێتن. ئەو عەلی ئاغا کوردەیە، هەر ئەو پیرەی زۆر کەسیش بە پیاوێکی ژیر و ماقووڵی دەزانن، هەر شێتی وەك خۆی نییە. ئەو کۆنە بەگانە هەر هەموویان شێتن. دایە گەورەم، دایکی بابم دەڵێم، شێتێکە ئاو ناپیاڵێوێ... شێتێکی خەست. بڕوانە مامە تەیموور بەگ، ئەوی لەو کۆشکەی ئێمەدایە هەمووی شێتە. مامە مورتەزا بەگیشم، ئەویش ئەقڵی پارسەنگی دەویست."

ئالاتەمیر ئەوەندەی پێ سەیر بوو چاوی زەق بوونەوە و هەنگاوێك لە حەمەعەلی چووە پێشتر: "راست وایە، راست وایە، ئەوانە هەر هەموویان شێتن. وا نییە؟"

حەمە عەلی داخ و کەسەری بەرووبەوە دیار بوو، گوتی:"راست وایە. راست وایە مامە تەیموور بەگ، راست..."

ویستی بزانێ، بۆیە پرسیی:"ئەی عەولخالق ئەفەنی؟"

حەمە عەلی پێکەنین و بەپێکەنینەوە گوتی:"ئەویان هەر باسی مەکە. شێتێکە ئاو ناپیالێوێ. هەرچی لەو چوکووراوایەدایە، لە سایەی سەری ئەوەوە بوونە خاوەن زەوی و زار، کەچی بۆخۆی کەپرێکی نییە لە بن میچەکەیدا بحەسێتەوە. لە حالێکدا ئەگەر ویستبایەی، چوکووراوا بەپانەوەی هیی ئەو بوو و ئێستا جێی نەدەما پارەی تێ بئاخنێ. کەس لەو شێتتر نییە. مامە تەیموور بەگ..."

حەمە عەلییش باش تێگەیشتبوو کە ئالاتەمیر بەو مامەتەیمووربەگ گوتنەی ئەو وەختە شاگەشکە بێ، هەر بۆیە سەر و بنی قسەکانی مامەتەیموور بەگ بوو.

ئالاتەمیر لە حالێکدا چاوە دەرپەڕیوەکانی خۆی بە سەرسوورِمانەوە لە حەمە عەلی بڕیبوو لەدووی دا"وایە."

ئەوجار نەیدەزانی دیسان قسە بکا و لەسەری بڕوات یان نا، بۆیە نیگای پڕ لە پرسیاری خۆی لە چاوەکانی حەمە عەلی بڕی. بە دوای ئەوەدا کەوتە پیاسەکردن. دەهات و دەچوو و لە پێش حەمە عەلییەوە رادەوەستا و چاوە پڕ لە پرسیارەکانی لە چاوی ئەو دەبڕی و دیسان دەکەوتەوە هاتوچۆکردن و ئاگری هەژان و کونجکۆڵی و بێ ئۆقرەیی حەمە عەلیی تین دەدا.

ئاخرییەکەی بە شەرمەوە و بە منەمن پرسیی، دەستی گرت و گوتی:"مامە تەیموور بەگ، دەکرێ پرسیارێکت لێ بکەم؟"

بە هەژاوییەوە و لەڕێوە وەڵامی دایەوە:"بپرسە، بپرسە، بپرسە."

"چاو لێکە مامە تەیموور بەگ..."

ئالاتەمیر چاوەکانی وەك دوو بزمار لە چاوەکانی حەمەعەلی بڕی، چاوەڕێی پرسیارەکەی بوو:"دەڵێن ئەتۆ هەموو ساڵێ، سەد، دوو سەد، سێسەد هەزار لیرەت داوەتە جافر بەگ..."

رەنگی روخساری ئالاتەمیر دەسبەجێ وەك گەچ سپی هەڵگەڕا. دەموچاوی سیس بوو. لێوەکانی رەش هەڵگەڕان و چاوەکانی کەوتنە پتەپت. جا حەمە عەلییش ئاگای لە هەموو ئەو شتانەی بوو. خۆزگە باسی ئەو شتەی نەکردبایە. پەژیوان(پەشیمان) بوویەوە، بەڵام تازە کار لە کارێ ترازابوو و تیرەکە لە ماڵی کەوانێ دەرچووبوو. کەوتە تەتەپەتە:"هەموو ساڵێ... ئەویش... ئەویش ئەو پارەیەی بە قەرز لێی وەرگرتووی نەیداوێتییەوە. ئەتۆش هەموو ساڵێ

چوویەتە ماڵەکەی و چاوت قووچاندووە و زارت کردووەتەوە و چیی هاتووەتە سەر زارت نەتگێڕاوەتەوە و لەبەر چاوی ژن و منداڵ و نۆکەر و کارەکەر کردووتە بە پەڕۆبەگوویەك و کە ماندووش بووی و پشووت لێ بڕاوە، جا لە قەرزەکەت خۆش بووی و گەڕاویتەوە ماڵەکەت. دەڵێن هەموو جارێ پاش ئەوەی کە بەسەریدا رشاویتەوە، لە خۆشییان شاگەشکە بووی و لە خۆشییان فڕیوی و بە شوکرانەبژێری پێنج مەڕت کردووەتە قوربانی و بەسەر گوندییەکانتدا بەخشیوەتەوە و سێ رۆژ و سێ شەوان خەو نەچووەتە چاوەکانت و هەتا بەیانی لەخۆشیان گۆرانیت چڕیوە... وا دەڵێن."

ئالاتەمیر بەسپایی سەری هەڵێنا و چاوە کزەکانی لە حەمە عەلی بڕی. وردە وردە روخساری گەش دەبۆوە و خوێنی تێ دەگەڕایەوە و چاوەکانی گەش دەبوونەوە.

لەسەرخۆ و بەهێمنی گوتی:"وایە. هەموو راستە. بەڵام مەسەلەکە... جۆرێکی دیکە..."

بێدەنگ بوو و متەقی لێ بڕا و خەیاڵ و بێدەنگی هەڵی گرت. بۆ تاوێك قسەیان پێکەوە نەکرد و ئالاتەمیر دیسان وەخۆ هاتەوە و بە سەرکزییەوە گوتی:"جۆرێکی دیکە..."

"چۆن؟"

"جۆرێکی دیکە... ئەو بەگ... بەگی ئێمە."

حەمە عەلی تفەکەی زاری قووت دایەوەو گوتی:"بەڵام ئەو لە بەگەکانی دیکە جوێیە. ئەو وەك ئەوانی دیکە شێت نییە. ئەو هەموو چوکووراوا دەخاتە بن چۆکی خۆی... ئەو زۆر دەوڵەمەند دەبێت. چما نایبینی مامە تەیموور بەگ؟ نیوەی لێوارەکانی ئاقچاسازی بەناوی خۆی لەقەباڵەکە کردووە."

ئالاتەمیر گوتی:"وایە راست دەکەی."

ئەوجار رووی لە حەمە عەلی کرد:"من؟ ... من..."

"ئەتۆ زۆر ژیری مامە گیان. ئەتۆ هەموو شتێکت بە ئاقڵی خۆت و بە کار و ماندووبوون و شان و باهۆی خۆت کۆ کردووەتەوە. ئەتۆ خۆت خۆتت پێگەیاندووە."

ئەو لەبزی خۆتت پێگەیاندووەی، زۆر چاك بە دڵی ئالاتەمیرەوە نووسا. ئەویش چەند جاران لەبن لێوانەوە بە ورتە ورت گوتییەوە:"خۆت پێگەیاندووە، خۆت پێگەیاندووە، خۆت... خۆت... پێ..."

"ئەگەر جافر بەگیش وای نەکردبا..."

ئالاتەمیر بۆ ئەوەی ئەو باسە ببڕێنێتەوە، قسەکەی لە زاری حەمەعەلی وەرگرتەوە:"ئەو شتەی دیکە... ئەو، ئەو، ئەو،.... جۆرێکی دیکە... جۆرێك کە... ئەویان شتێکی دیکەیە..."

حەمە عەلی سەری داخست:"ئەتۆ ژیری، ئەتۆ لەوەش باشتری لێ دەزانی مامە تەیموور بەگ... تۆ لەوەش باشتری لێ دەزانی..."

گورج و گۆڵ ئاوڕی لێ دایەوە:"ئەو کارەی دیکە، ئەو کارەی دیکە..."

ویستی لەو باسە بێتە دەرەوە و بیبڕێنێتەوە.

بەرەو کەنارێ وەڕێ کەوتن. ئالاتەمیر لە پێشەوە و حەمە عەلی بەدوایدا. بە سەر خاکە نەرم و رێکەکەدا شەقاوی گەورەیان داویشت.

هاتنە قەراغێ. زۆنگاوەکە لێرەوە جوان جوان دیار بوو. ئاوەکە ئەوەندە روون بوو، قوڕە رەش و خەستەکەی تەرکی بنی دەبینرا.

ئالاتەمیر بەرەو رۆژهەڵات گەڕایەوە و لە حاڵێکدا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت، دارەکانی (قاراجان)ی پێشان دا کە تێك چڕژابوون:"دەبێ هەتا ئێرە بکڕم حەمە عەلی بەگ؟"

"هەتا ئەوێ مامە تەیموور بەگ... دەروێش بەگ خۆ بە دەست خۆی نییە. ناچارە لە ماوەی چوار پێنج ساڵاندا هەموو زەوی و زارەکەی بفرۆشێ. چونکە زۆر گرنگی بە مەکینە نادا و ئێستاشی لەگەڵدا بێ زەوی و زارەکەی بەنیوەکار دەدات. خۆت دەزانی تەراکتۆرێك لە هەزار پیاو پتر کار دەکا و دەروێش بەگ مەحکوومە بە نەمان... ئەنگۆ ئاگات هەر لێی بێ. بیستوومە کەیفی بەتۆ دێ. رۆستەم ئۆغلێی لەماڵەکەی دەرکردووە و زەویی بەتۆ فرۆشتووە.... دەروێش بەگ خەریکە دەفەوتێ و تێدا دەچێ..."

ئالاتەمیر بەلارەملی و روخسارێکی گرژەوە و بە کەسەرەوە گوتی:"خەریکە تێدا دەچێ... خەریکە دەفەوتێ..."

"دەمەوێ سێ دەزگای مەکینەی دروێنە(دەراسە) بکڕم مامەگیان..."

هەر کامەیان لەسەر بنەتای پۆلە قامیشێك رووبەڕووی یەکتری دانیشتن. حەمە عەلی تاسەبارانە چاوی لە روخساری مامە تەیموور بەگی بڕیبوو. وەك واق وڕماوێك. هەرلەو کاتەوە کە دیتبووی و ناسیبووی، ئاوا بە واق وڕماوییەوە سەیری دەکرد. هەردووکیان نوقمی فکر و خەیاڵەکانی خۆیان بوون. هەردووك وێکڕا سەریان هەڵبڕی و سەیری رۆژهەڵات و لای چیای دوڵدوڵیان کرد.

چیای دوڵدوڵ لە پشت ریزی چیا داپلۆسراو و داتەپیوەکاندا لە پەردەیەکی شین دەچوو، سەری قیت راگرتبوو و لە دووکەڵێکی خەست و تاریکدا نوقم ببوو و کشابۆوە دواوەترو دوورتر ببۆوە.

"بڕوانە مامە، ئەمن تراکتۆرەکان، مەکینەکانی دروێنەکردن و ترۆمبێلم زۆر خۆش دەوێن. بڕوانە مامە تەیموور بەگ، ئەمن بۆ ئەوەی بتوانم ئەوهەمووە تەرکاتۆر و مەکینەی درویێنە و کامیۆنە بکڕم، هەر هەموو زەوی و زارەکانی دوور لە ئاقچاساز بە گوندی و بە کوردەکان دەفرۆشم. دەزانی مامە تەیموور بەگ، ئەو گوندییانە ئەوەندەیان پارە هەیە دەڵێی جوولەکەن. کەس نازانێ ئەو هەمووە پارەیان لەکوێ هێناوە. بڕوانە، ئەوەندە، بە خەروار، خەروار..."

قسەکەی بەنیوەچڵی و ناتەواوی هێشتەوە و بێدەنگ سەیری چاوەکانی ئالاتەمیری کرد. دەموچاوە ناسکەکەی وردە وردە سوورهەڵدەگەڕا. یەك دوو جاران ویستی لەسەر قسەکەی بڕوا، بەڵام قسەکانی خۆی خواردنەوە و هەروا چاوی لە چاوەکانی هاوڕێیەکەی خۆی هەڵنەگرت...

ئالاتەمیر گوتی:"بڵێ دەی حەمە عەلی گیان. ئەمن بە مامی خۆت بزانە. ئەمن لە بابیشت لەتۆ نزیکترم. چیت لە دڵدایە و چیت بە زەیندا دێ، دەتوانی بەمنی بڵێی و بۆم باس بکەی."

حەمە عەلی تاسەبارتر، نوقمی چاوەکانی و گنجی دەموچاوەکەی ببوو.

بێدەنگییەك باڵی بەسەردا کێشابوون و حەمەعەلی ئاخرییەکەی تینی دایە خۆی و لە حاڵێکدا دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات و کەللەی گەرمدا هاتبوو، بەهانکەهانك گوتی:"مامە تەیموور بەگ، دەمەویست پێشنیارێکت پێ بکەم."

زەردەخەنەیەك روخساری ئالاتەمیری گەش کردەوە. دیارە هەر کاتێکی دەهاتە لای، هەستی بەختەوەری لە دڵیدا چرۆی دەکرد و دەپشکووت.

"بیکە، بزانم حەمە عەلی گیان. پێشنیارەکەت چییە؟"

"پێشنیارەکەم ئەوەیە کە مامە تەیموور بەگ،ئەوەیە کە، پێنشیارەکەم ئەوەیە کە... ئەو زەوی و زارانەی گوندییەکان ملی خۆیانی بۆ دەشکێنن... ئەو زەوی و زارانەی بڵێی و نەڵێی ئەمن دەیانفرۆشم و دەیاندەم بە مەکینە و ترۆمبێل و هیچ چاریشم نییە، پێشنیارم ئەوەیە ئەو زەوییانە تۆ بیانکڕی، حەیفن..."

ئالاتەمیر دەسبەجێ هەستا و دیسان دانیشتەوە و هەر دانیشتوە دەستی راستەی لەسەر شانی حەمە عەلی دانا و لاواندییەوە و بەدەنگێکی بەرز گوتی:"کوڕە جا بە چاوان، حەمە عەلی گیان. بەچاوان. مامە تەمیرت قسەی تۆ لە عەرزی نادا."

حەمە عەلی شاگەشکە بوو. دەیتوانی بە هەر نرخێکی پێی خۆش بێ زەوی و زارەکە بە مامە تەیموری بفرۆشێ و دامەزراوە کشتوکاڵییەکەی خۆی زۆر زوو مۆدێرنیزە بکا. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو و ئەوەندە کەیفخۆش ببوو لە خۆشیان دەیویست لە کەناری ئەو ئاقچاسازەدا سەرموقلات لێ بدا. ئاااخ، ئاخ، خۆ ئەگەر مامە تەیموور بەگی زانیبای ئەو چیی لە دڵ دایە، دەیزانی چەندی حەز لێیە سەرموقلاتێك لێ بدا.... لە جێی خۆی هەستابوو و بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ بەدەوری ئالاتەمیردا کە وڕ و کاس لەسەر کۆتەرەیەك دانیشتبوو، دەخولایەوە و یەك پشوو قسەی دەکرد. قسەیەك لێرە و یەك لەوێ و وەك سامگرتووان قسەیەکی تەواو نەدەکرد دەچووە سەر باسێکی دیکە. هەر دەتگوت لەخەوێدا قسان دەکا.

"سپیدار... مامە تەیموور بەگ، سپیدارێکی بەرز... دارستانی سپیدار.... ئوکالیپتووس... ئوکالیپتووس لە ماوەی چەند ساڵێك وا هەڵدەدا ... کە بە دوو کەسان باوەشیان لێی نەگاتەوە.... پانزە مەتر بەرز... نۆبەتێداری لە بن بنوێنن چاك دەبێتەوە... دیارە ئەوە زانستی نییە... کارخانە.... خۆ ئەگەر کارخانە نەبێ هەر نابێ. کارخانەی وا کە شەو و رۆژێ راناوەستن و کار دەکەن. هەر هەمووی، هەمووی دەخەمە گەڕ. دەبێ وەڕێیان بخەم. مامە تەیموور دەبێ بخرێنە گەڕ. خاك هیم و بناغەیە. دوایی کارخانە، دوایی بانك... پارە پارە گەورە دەکا. خۆت باشتر دەزانی مامە تەیموور بەگ..."

"گەورەی دەکا."

"ئەگەر پارە، پارە گەورە نەکا... ئەو پارەیەی گەورەی ناکا، مەحکوومە بە نەمان. پارە هەموو رۆژێ، دەبێ هەموو رۆژێ بزێ."

" چ شتێك بزێ."

پارە، پارە... ئەگەر نەزێ، دەمرێ. خاکیش، بنیادەمیش، مار و مێرووش و هەموو مەخلووقاتیش ئەگەر نەزێن، لەناو دەچن و دەفەوتێن. تێدا دەچن."

"تێدا دەچن."

ئەندازیار (پسپۆڕ)ی ئاوداشتن، سەرئەندازیارەکەی بنیادەمێکی ئەمڕۆیی، لەبەردڵان و بەمێشکە. دەیگوت زنەکێشێك بۆ ئاقچاساز لێ دەدەین و لە ماوەی ساڵێکدا ئاوەکەی دەکەینەوە نێو رووبارەکەی جەیهان. خۆ ئەگەر بەندێکیش لەبەر saroon هەڵبەستین، ئاقچاساز وشك وشك دەبێتەوە... وشك وشك.... ئەمن گوتم دەتەوێ چ بکەی جەنابی ئەندازیار؟ گوتم نەکەی وا زوو وشکی بکەیتەوە. گوتم ئەگەر بتەوێ ئەوێ وشك بکەیەوە، ئێمە دەبینە ترِی بن گۆم و تێدا دەچین. ئەمن پێم نەگوت، چما دەمتوانی راوەستە با جارێ ئێمە لەگەڵ مامە تەیموور بەگم هەموو دەوروبەرەکەی هەڵگرینەوە جا ئەو کات. دوای ئەوە، وشککردنەوەی زۆنگاو خۆ شتێکی وا نییە. ئەوە منیش دەیزانم... من پێیم گوت... مامە تەیموور بەگ... گوتی دەیناسم... ئەو پیاوێکە خۆی خۆی پێگەیاندووە. پێی گوتم تۆی خۆش دەوێ. گوتی بەو ئاواتەوەم لە هەموو ئەو چوکووراوایەدا بنیادەمی وەك ئەو پەیدا بن. ئەو پێی گوتم ئەگەر چوکووراوا بکەوێتە دەست پیاوی ئاوا گەورە و مەزن، دەبێتە بەهەشت. مەڵبەندەکەمان دەبێتە بەهەشت. ئەو پێی گوتم... دەورێش لە مردووەك بەولاوە نییە. دەبێ زەوی و زارەکەی لە چنگی دەربێنین. راوێژکارێکی کەللەکەری سیسارکەی هەیە کە دەبێ زاری گرێ بدەین. هەتا نەزانین ئەو بەچی دەسەکنێ، کارەکەمان سەر ناگرێ. ئەگەر ئەو سیسارکەیە نەبوایە، تا ئێستا... هەرچی زەویی هەیبوو هەمووی فرۆشتبوو. ئەو ناهێڵێ. ئەگەر من نەدەبووم، باوکیشم فرۆشتبووی... نەمهێشت... نا. کارخانە، مردووو... بانك... ئەستەنبوڵ... خوێندم. دەبێ زۆر بخوێنی مامە تەیموور بەگ، زۆر، زۆر... دەبێ، دنیا، جیهانی بازرگانی بناسی. ئەگەر دانەیەکت خوارد، دەبێ هەزاری لە جێی دابنێیتەوە..."

قسەی دەکرد، دەهات و دەچوو، پێدەکەنی. ئالاتەمیر جار نەجارێ قەڵەمبازێکی داویشت و بەسەر سووڕمانەوە سەیرێکی دەکرد و لە قووڵایی دڵییەوە دەیگوت خۆزگە خودا کوڕێکی ئاوای دەدامێ و هەرچی موڵك و ماڵ و منداڵە لێی دەستاندمەوەو دەیبردەوە بۆخۆی. وەك وێردێك ئەوەی لە دڵیدا دووپاتە دەکردەوە. هەرکەس دەست بداتە دەستی ئەو لاوە، پشتی وەعەرزی ناکەوێ.

حەمە عەلی ئاخرییەکەی ماندوو بوو. بە هەژاوییەوە هەوڵی دەدا و کەیفخۆش بوو و ئارەقەی کردبوو. شاگەشکە و بێدەنگ لە پاڵ دەستی ئالاتەمیرەوە دانیشت و چیلکەیەکی هەڵگرت و دەستی کرد بە خەتخەتکردنی خاکە بەپیتەکە و خەیاڵ بردییەوە. ئالاتەمیریش هەروای کرد.

چیی نەمابوو بۆ نیوەڕۆ کە دەنگی سمی ئەسپێك وەخۆی هێنانەوە. سەریان هەڵێنا دەبینن ئەوە سێ سوارە بەلینگدان بەرەو لایان دێن.

ئالاتەمیر لە ترسان چاوەکانی دەرپەڕیبوون و لێوە رەنگ بزڕکاوەکانی لەسەر یەك جووڵان:"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ. هار بووە. خەریکە بەرەو لای ئێمە دێ. وا باشترە لە زۆنگاوەکەدا خۆ حەشار بدەین. دەی خێرا بە."

حەمە عەلی لە چاوترووکانێکدا خۆی بە لێڕی زۆنگاوەکەدا کرد و ون بوو. لە حاڵێکدا ئالاتەمیر بەو لاقە خواروخێچانەیەوە هەوڵی دەدا خۆی بگەیەنێتە لێڕەکە. سوارەکان دووسەد مەترێك لێی دوور بوون. ئەوجار بە دەم قاقای پێکەنینەوە کە پێکەنینەکانیان لە رەوەز و گابەردەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دەدایەوە، بەرەو خوارووی جەیهان داگەڕان و دوور کەوتنەوە.

ئالاتەمیر هەر گوێی لە تەقەی تفەنگ ببوو، خۆی خستە نێو ئاودڕێکی قووڵەوە. پەیتا پەیتا دەینەڕاند و بەپەلەپەل لە گیانە زەردهەڵگەڕاوەکەی خۆیدا لەبرین دەگەڕا. هەموو گیانی وەك مێژۆکە دەلەرزی، بەڵام هیچ برینێکی بەخۆیەوە نەدەدۆزییەوە...

# ٤٨

"گوتم وسوو، وسوو هەستە بڕۆ. هەستە بڕۆ. هەستە بڕۆ."

لەبەر دەرکی رەشماڵەکە تاژییەکی موو خەنەیی راوەستابوو. لۆق درێژ و لەسەر لینگ، گورج و گۆڵ و نێوقەد باریك وەك کەوان. چاوەکانی درشت و کل تێکراو، گوێچکە شۆڕ، مل باریك و سێبەری کەوتبووە سەر لمی بیابانەکە و چەمیبۆوە. یەك سمێکی خۆڵەمێشی، گوێی لەمووچەوە بردبوون. ئەسپێکی بەرز کە کوڕژنی دەکرد و سەری قیت راگرتبوو و هەوای بیابانەکەی بە کونە تفنکە لێك رەویەوەکانیدا هەڵدەمشت.

بیابانەکە گەرم بوو. تاژییەکە هەروا لەجێی خۆی چەقیبوو. گولێکی زەردی گەورە، خۆی دابووە دەست گەرمای بیابانەکە. چیی گەرماکە بەتینتر دەبوو، گوڵە زەردەکە لك و پۆی پتر دەردەکرد، هەڵی دەدا و پتر دەدرەوشایەوە.

وسوو بە دەوری تاژی و خێوەت و هۆبەکەدا دەسووڕایەوە. وەك بڵێی بە پەتێکی قایم لێك بەسترابێن. ژنە عەرەب وێکڕا گۆرانییان دەگوت. دەنگیان گەرم و خۆش و بەسۆز و رەوان و وەك بیابانەکە بێ سنوور بوو.

گوتی وسوو، وسوو هەستە، هەستە، هەستە، هەستە بڕۆ. تاژییەکی خەنەیی. مووە زبرەکانی تاژییەکە دەبریسکانەوە. لەوێ، لە تەنیشت ئەسپە شەودێزە بەرزەکە و لەبەر پێی تاژییەکە. لەوێ، لەبەر دەمی رەشماڵەکە و لە نێو لمە بەشەپۆلەکەدا. رەشماڵەکان لە سەردەمی کۆنەوە، لەوەتەی خێوەت پەیدا ببوو، مابوونەوە. ژنی چاو و برۆ رەش و پووز و بەلەك بەرزی عەرەب و پیاوی کەڵەگەت و رەش ئەسمەری خەنجەر لەقەدی بەتین و گوڕ و چاوڕەش و قامك درێژ.

وسوو لە چیاکانەوە هاتبوو. وسوو نوقمی خەون و جادوو بوو. وسوو کەیفی بە بیابان دەهات. وسوو ئاشقی بیابان بوو. گوتی، وسوون وسوو، هەستە بڕۆ. وسوو لە مەودایەکی دوور لە هۆبەکە و بە دەوریدا بەبێ ئەوەی چاو لەسەر تاژییەکە هەڵگرێ، غاری دەدا. مووی تاژییەکە هەر یەکەی لە رەنگێك. خەنەیی، سوور، زەرد، شینی بیابانی کە وەك چۆن تەنکە دووکەڵێکی هەستێ و لەچاوان ون بێ... گوتی، وسوو، وسوو، هەستە، وەرێ کەوە. وسوویان لە تاژییەکە بەستبۆوە. وسوو بەدەوری تاژییەکەدا دەخولایەوە، لە بازنەیەکی تازەدا...

"ئەو تاژییە بدە بەمن ئاغا. هەتا زیندووم نۆکەریت دەکەم. ئەمیری ئەمیران ئەو تاژییەت بدە بەمن، ئاشقی بوومە."

چاو خومار و دەست هەوریشمین، چاوتیژی سمێڵ رەش، لووت هەڵۆیی و ردێن لوول و بێدەنگ بوو.

"ئەو تاژییەم بدەیە، چیت دەوێ دەتدەمێ. هەر شتێك بوێ."

وسوو لە کەرەی بەیانییەوە هەتا تەنگەی نوێژی شێوان لە بەرامبەر عەرەبەکەدا لەسەر چۆك دانیشت و پاڕایەوە و عەرەبەکە هیچی نەگوت. لەسەرخۆ و دانبەخۆداگر جارێ سەیری تاژییەکە و جارێك سەیری وسووی دەکرد. دواییش نیگای لە دەشتەکاکی بە کاکییەکە بڕی. باڵندەیەك بەسەر خێوەتەکانەوە باڵی لێك کردبۆوە و دەسووڕایەوە. عەرەبەکە جارێ سەیری باڵندەکە و جارێ سەیری ئەسپە مەیلەوڕەشەکەی دەکرد و دیسان هەر بێدەنگ بوو.

گوتی، وسوو، سوو، هەستە بڕۆ.

وسوو لەگەڵ تاریکایی شەو و شەوی بیابانەکە تێکەڵ بوو. وسوو لێی سواری ئەسپەکەی بوو. ئەسپەکەی وسوو جوان بوو.

"هانێ ئەو ئەسپە، ئەو تاژییەم بدەیە، بێنە تاژییەکەت. ئەسپێکی رەسەنە. سێ سەد ساڵە وەچەکەی ناسراوە. سێسەد ساڵ..."

عەرەبەکە دیسان هیچی نەگوت. بە روخسارێکی سارد و سڕەوە هەروا کڕ و کپ مایەوە.

وسوو هەستە بڕۆ.

وسوو لەخۆی دەرچوو.

شەوەکەش، ئەو دەمەی ئەستێرە زۆر درشت و گەورەکانی ئاسمانی شەوان تیشکیان بە روخساری دەشتەکەدا دەپژاند، تاژییەکەی لە سینگەکە کردەوە و لە باوەشی گرت و ئەسپەکەی لە شەوێدا، لە شەوێك کە پڕ لە هەڵڵا و هەنگەمە و زریکە و هاوار بوو، لینگ دا. ئەو کاتەی

ئاسۆکانی دەشتێ سوور دادەگەڕان و بە لم و ئاسمان و ئەستێرە و خێوەتەکانییەوە رووناك دبۆوە، ئەو عەرەبانەی بە سوار کەوتبوونە شوێنی، گەیشتنێ. وسوو تاژییەکەی توند لە ئامێز گرتبوو. سوارەکان خەنجەرەکانی خۆیان لە سوورایی ئاسۆ دەرکێشا. لم و وردکە سوورەکان پەرش و بڵاو بوون.

گوتی:"وسوو، وسوو... وسوویان لە تاژییەکە جوێ کردەوە. ئەو لەو گۆشەیەی بیابانەکەدا هەروا تەخت کەوتبوو و ئەسپە رەسەنەکەی بە چاوی گەورە و خەمبارەوە بە ژوور سەرییەوە و... ددانی لە جلوبەرگەکەی وسوو توند کرد و هەڵی گرت و خستییە سەر پشتی و وەك بای شەماڵ کەوتە شوێن ئەوانەی تاژییەکەیان بردبوو. وسوو لە نیوەی رێیە لەسەر پشتی ئەسپەکە وەخەبەر هات و دیسان تاژییەکەی لە ئامێز گرتەوە، لە گۆشەیەکەی بیابانەکە، لە شوێنێك لە گوڵی زەردی لێ پشکووتبوون، ئەو کاتەی عەتر و بۆن و بەرامەکەی شەپۆل شەپۆل دەشتەکەی دادەگرت و خۆڵ و لمەکەی نەرم نەرم وەجووڵە کەوتبوون، دیسان گەیشتنەوە سەری.

گوتی، وسوو، وسوو، هەستە بڕۆ. ئەو جارەیان تاژییەکە لە باوەشی وسوودا نەبوو. وسوو لەسەر پشتی ئەسپەکەی سێ رۆژ و سێ شەوان سەردولکە و وایلۆکی بۆ تاژییەکە چڕی و بە دیاری دایە دەشتەکە.

گەیشتە سوبحان داغی. چیا سەخت و رژد و قیتەکە، لەوێش لە بن سپیدارە بەرزەکان، کچۆڵەیەکی کەزی پەلکەکراو راوەستابوو. چاوە گەورە خەمبار و روونەکان لە چاوی مامزێك و گەردنی لە گەردنی قاز و قولێنگ دەچوو. ئەو کاتەی دوڕناکان بە لاقە درێژ و گەردنە کەسك و درێژەکانیانەوە بە پەڕ و باڵە شۆڕ و رەنگاورەنگەکانیان و بە رانی قەڵەو و گۆشتنی و ژنانەیانە لە دەشتە پڕ لە گوڵەکەی پاتنۆس دەنیشتنەوە و درەوشانەوەی چیای سوبحان لە لایەکەوە دەکەوتە دەریای رەش و لە لایەکی دیکەوە دەکەوتە سەر دەشتە پڕ لە گوڵ و بژوێنەکە... کاتێك گۆلی وان تاوێك لە ئاوێکی وەك شیردا، مەیلەوکەسك و وەك برووسکە دەدرەوشایەوە و دادەگەڕا و لە سەوزییەکی روون و نارنجییەکی تاریکدا دەبریسکایەوە و تاوێك لە سپییەکی وەك بەفردا دەیبەست و دەبووە سەهۆڵ و سپییەکی نیلی لە لووتکە و دوورەئاسۆکانەوە لە ئاسمان دەگەڕا، شەپۆلی دەدا و لە چاوان ون دەبوو، لەوێ، لە بناری چیای سوبحان، کچۆڵەیەکی کێل گەردنی ددان سپی بلێی و نەڵێی قیت بۆتەوە و لە حاڵێکدا روخساری لە جوانییەکی گەش و بێ فرت و فێڵی مندالانەی زۆر دلڕفێندا کاڵ دەبۆوە و دەوروبەری چاوە بادامییە گەشەکانی کە خەمی هەموو دنیایان دەنواندەوە، قیچ دەبوون، لە کزەی تووڕەییەکدا کە هێور هێور لە دڵ

دەنیشت و دەم و چاوەکەی هەردەهات و باریکتر و ناسکتر و جوانتر دەبوو، گوتی، وسوو، وسوو، وسوو، وسوو... و هەرای کرد، وسوو. بەسەر چیا و ئاو و دەریاکاندا نەڕاندی. هەموو شتێك سڕایەوە و لە چاوان ون بوو و کە تاو هەڵات، ئاسمان هەزار ئەوەندەی دیکە شین بۆوە.

گۆلی وان تۆخ و تاریکتر بۆوە. ئاسمان، گۆلی وان، چیا سپییەکەی سوبحان، دەشتە سەوزەکەی پاتنۆس، ئەرجیشی مورادیە تاریك چوونەوە. چیا سوورباوەکەی ئەسرۆك و دەشتە پەمەییەکە بە رەوەزە سوورەکانییەوە تاریك داهاتن. دارەکان، باڵندە و ئەو بنیادەمانەی وەك مار و مێروو لە شارەکانیانەوە وەدەرکەوتبوون و لەبەر قرچەی تاوەکە پەرش و بڵاو ببوون، رەش چوونەوە. لە خاکە سوور سوورەکەی شیوی "سەور" کۆمەڵێك کەوی خەنەیی لە فڕەی باڵیان دا. با گۆرانییە کۆن و گەرم و بێ بڕانەوەکانیانەوە... دوڕنا مەیلەوڕەشەکان لە لافاوێکی تیشکدا بە ئاسمانەوە رەش داگەڕان. گەڵایەکی بڵێسەش، بە چەرخ و خول، کەوتە نێو جەرگەی شەو و تاریکایی و رووناکاییەکەوە. کە بەریش بۆوە، سوور سوور دەچۆوە.

چاوێکی گەورە، رەش و تۆقێنەر، لە نێو تاریکاییەکەدا زەق زەق بۆوە. سوورایی بڵێسەیەك لە تەنیشت گەڵا و رەگە و هێڵەکانی گەڵا گەورەکەدا سوورتر و بڵێسەدارتر و تیژی و سووتێنەرییەکی رەش لە درەوشانەوەی مەرجانێکی سووردا... کچە کێل گەردنەکە گوتی، وسوو، وسوو، ئەوە بۆ وات لێ هاتووە، وسوو؟

وسوو بە قاچە درێژ و باریکەکانییەوە بە لارەولارەوە و لە حاڵێکدا ردێنە لوولەکەی کەروێشکەی دەکرد و وسوو بە روومەتی قوپاو و ددانە سپییەکانی و لێوە سوورە ئەستوورەکەی و بە تیلەی چاوەکانییەوە جوانتر دیار بوو و پێکەنینێکی گەش، روومەتەکانی سوور هەڵگێڕابوو و پڕ پڕ بوو لە شادی و دەوروبەرەکەی خۆیشی پڕ دەکرد لە خۆشی و شادی... هاتە بن سپیدارە بەرزەکان. سپیدارەکان رەش چوونەوە و چیا سپییەکەی سوبحان تیشکی خستە سەر تاریکی.

وسوو ئەژنۆی دادا. دوڕناکان قەتار قەتار بە ئاسمانێدا تێپەڕین. رەوە مامزێك بە سپیایی چیاکەدا تێهەڵبوو. ئەسپەکان تاو دران و شمشێرە رووتەکان درەوشانەوە و سێبەرەکانیان کەوتە سەر سپیاییەکە. وسوو گوتی: ناوت چییە، ناوت چییە؟ کچە متەقی لێوە نەهات و هیچی نەگوت. وسوو بە دار و بەرد و هەور و چیا و ئاسك و ئەسپ و ئاو و دوڕناکانی گوت: ناوت چییە، ناوت چییە؟ کچۆڵە هەروا بێ دەنگ مایەوە. وسوو ئەژنۆی لەسەر خاکی عەشق دادا و سەری نا بە چیای سەد هەزار ساڵەی ئەشقەوە. بارانێك تار و پاکژ دەباری. وسوو نێوچاوانە

داغەکەی بە بارانی دێرین سپارد. ناوت چییە؟ ناوت چییە؟ باران گوتی:ئاسکە. هەور، ئاو، گوڵەکان، دوڕناکان، مێروولەکان، باڵندەکان، خاکەسوورەکەی شیوی "سەور" و بەردە سەر بەرزەکان، ئاگرە بەتینەکە، تار و شەپۆلدار گوتیان:" ئاسکە." چاوی کچە لە چاوی ئاسك دەچوون. هەموو ئاسکەکان لە دەشتە دوورەکەوە دەنگیان تێکەڵ بەیەك کرد و وێکڕا گوتیان: ئاسکە، ئاسکە. و وسوو ناوی کچەی نا ئاسکە. وسوو ناوی تاژییەکەی نێو ئەو دەشتەی نا ئاسکە. ناوی ئەسپەکەی، دایکی و کانییەکە و هەرچییەکی خۆشی دەویست ناوی نان ئاسکە. وسوو چل شەو و ڕۆژان گۆرانیی چڕی. چل شەو و ڕۆژان دەستەونەزەر لە بەردەم ئاسکەدا، لەسەر خاکی هەزار ساڵەی ئەشق ئەژنۆی دادا. وسو ئاخرییەکەی سێ جاران گوتی:ئاسکە، ئاسکە. چیی گۆرانیی بلاوێن و دڵ تاوێن بوو لە دڵییەوە هەڵقوڵێن و بە دنیا وەربوون. ئەو لە هەموو شوێنێك و لە هەموو شتێکدا ئاسکەی دەدی. لە هەر قسە و گۆرانییەکدا.

گوتی، وسوو، وسوو هەستە بڕۆ. وسوو، وسوو، وسوو، وسوو، دڵی وسوو ئاگری تێبەربووبوو. ئاسکە وەك خوێن بە دەماری گیانی وسوودا دەگەڕا. وسوو، وسوو، وسوو، لە خۆشەویستیی دنیادا هەڵچوو. دەستی وسوو گەیشتە هەر کوێیەك، ئاگری تێبەردا و ئاسکە لە چاوانی وسوودا تێکەڵی ڕەوەی مامزان بوو. هەر بۆیەش چاوی لە چاوی ئاسکان دەچێ. وسوو... و تیشکەکانی ئاسۆ تاریك دادەگەڕان. وسوو لەبیری نەچۆوە. هیچ، هیچ، هەرگیز... بوو بە باوکی سێ کچ و هەر سێکیانی ناو نا ئاسکۆڵ.

جا لەوێ لە بازاڕەکەی شاری، لە بن ئەو دارەی کارگەی ناڵبەندەکە بوو، وسوو بە تاژییەکەیەوە ڕاوەستابوو. هەر لەوێش لە حاڵێکدا قالۆنچە بریقەدارەکان لە بەردەمی بەدەم بۆنکردنی بەردچنی شەقامەکەوە دەفڕین، وسوو چاوی بە ملازم کەوت کە سێ جەندەرمەی بە دواوە بوو. وێنەی دەموچاو بەسەر چەکمە بۆیاغکراوەکەی ملازمەوە... وسوو زۆر ترسا. ملازم لەبەر چاوەکانی وسوو لە پەیکەرێکی قێزەون چوو. کە بە تاژییەکەوە بە دەوری دارەکەدا هەڵدەخولا، ملازم تاژییەکەی لە باوەشیدا دیت و پێی جوان بوو و بانگی کرد:"ڕاوەستە، ڕاوەستە دێهاتی."

وسوو ڕاوەستا.

"ئەو تاژییەت لە کوێ دۆزیوەتەوە؟"

"له بیابانیٚ. له عەرەبستانەوە هێناومە گەورەم. زۆری بەشوێندا گەڕاوم. دایك و بابەکەیان نەدامیٚ. هێشتا بێچوویە." "دەی باشە، تاژییەکەت بدە بەو جەندەرمەیە. لێی بستێنن و بیبەنەوە ماڵەکەی من. دەی باشە، باشە، زۆر باشە."

لاقی راستەی هێنابووە پێشەوە. لە گورگێکی زەرد دەچوو. راست وەك خەدەنگ... وای سەیری وسوو دەکرد دەتگوت سەیری دارەکە، مێروولەیەك، خاکەکە یان هیچ شتێك، سەیری شوێنێکی چۆڵ دەکا... وەك ئەوەی لە دوورەوە و بە گاڵتەپێکردنەوە سەیری ترسێك، شڵەژاوییەك، تووڕەییەك، سووکایەتییەك، ژانێك، تاڵییەك بکا...

وسوو لەگەڵ ئەوەدا جەندەرمەکان دابوویانە بەر مست و پێلەقە، توند توند قەڵادەکەی گرتبوو. "سەگباب، تاژییەك... تاژییەك نادا بە ملازمێك، بە ملازمێکی کۆماری، بە من... ملازم..."

ملازم دەتگوت گورگێکی کاڵە و کەف هەڵدەخرێنیٚ و تووڕەیە.

"گەمژە... نایدەی بە ملازمێك... بە ملازمێکی کۆماری... سەگبابی گەمژە. تێی هەڵدەن. درێژی کەن لەسەر عەرزەکە ئەو دایك گاندەرە با پێی بڵێم پووتێك چەند کیلۆیە."

خەڵك لە بن دارەکە کۆ بوونەوە.

سیٚ جەندەرمە وسوویان لەسەر عەرزەکە درێژ کرد. هەڵڵایەکی سەرکەوتووانە لە نێو حەشامەتەکەوە هەستا و بازاڕەکەی پڕ کرد. ملازم بە تووڕەییەکی هەوسارپچڕاوەوە وسووی دایە بەر شەق و پێلەقان. لە پشت و کەلەکەی و پاش قوونی هەڵدەدا هەر دەتگوت لە لبادی دەدا. دەتگوت دڵی بەوەندە ناسرەویٚ و رقەکەی نانیشێتەوە. ئەو هەڵڵا و قریوەی جار نە جارێك هاندەرانە لە نێو خەڵکەکەوە هەڵدەستا، شێتتری دەکرد:"تاژییەك، تاژییەك، بە ملازمێکی..."

ملازم لە گورگێکی زەرد دەچوو. بەر لەوەی ورگی نێچیرەکەی بدڕیٚ، لەتوپەتی دەکرد...

ملازم کە ئیتر پشووی لیٚ بڕا، جا داهاتەوە و قەڵادەی تاژییەکەی لە چنگی دەرهێنا. رووی کرد حەشامەتەکە و بزەیەکی هاتە سەر لێوی و چاوەڕیٚ بوو لە دووی بدەن. بەڵام حەشامەتەکە متەقی لێوە نەات. دەتگوت وشك هەڵاتوون. دیوارێکی بیٚ جووڵە.

ملازم بە ناڕەزایەتییکەوە گرماندی:"نامەردینە."

دڕی بە حەشامەتەکە دا و ڕۆیشت. پەیتا پەیتا سەیری ئەملا و لای خۆی دەکرد و ئاوڕی دەدایەوە و لە بن لێوانەوە دەیورتاند:"نامەردینە. ئەنگۆش، ئەنگۆش. ئەنگۆش تاژییەکی تسکەن نادەن بە ملازمێك، ها؟ تاژییەك، یەك تاژی... ها؟"

لە نێوەڕاستی حەشامەتەکە ڕاوەستا و لاقی ڕاستەی بەرز کردەوە و لە عەرزەکەی کوتا. دەتگوت پەیکەرەی بەردی گورگێکی زەردە. بە تووڕەییەوە لوورەیەکی لە ناخی دڵییەوە کێشا:"بڵاوەی بکەن سەگی بەرەڵڵا. بۆچی وا حەپەساون و چاوتان تێوەبڕیوم؟ بڕۆن ملتان بشکێنن. هەی سپڵەی بێ چاوڕوو."

ئەوجار حەشامەتەکە بەبێ دەنگی بڵاوەیان کرد.

گوتی، وسوو، وسوو، هەستە بڕۆ.

وسوو لەوێ، لە بناری ئەو چیایە... زۆر گەڕا. وسوو تاژییەکەی خۆی لەبیر نەچۆوە. نەیتوانی لەبیری بچێتەوە. ناوی تاژییەکەشی نابوو ئاسکە...

ساڵێك دواتر، لە وەرزی گوڵاندا، ملازم لاقەی ڕاستەی چەکمە لەپێی لە نێوەندی بازاڕەکەدا لە عەرزی کوتا و ڕاوەستا و ئاوڕێکی دایەوە و سەیری دواوەی کرد. ئەو کابرایەی دیت کە سێ ڕۆژبوو بەشوێنییەوە بوو. سێ ڕۆژ بوو وەك سێبەرێك لێی نەدەبۆوە. ملازم سەری لێ شێوابوو و زراویشی چوبوو. ئاوڕێکی دایەوە و هەستی کرد نیگای کابرا وەك دەرزییەك بە هەموو گیانیدا ڕۆدەچێ. غیرەتی نایە بەر خۆی و بە دڕدۆنگییەوە لە کابرا چووە پێشێ. کابرا نیگای کونجکۆڵانە و پێکەنیناوییەکەی لەسەر هەڵنەدەگرت. پێکەنینی پیاوەکە فێنکاییەکی لە دڵی ملازم گێڕا و ترسە پەپکەخواردووەکەی نێو دڵیی ڕەواندەوە و بزەیەکی نەرم و سلۆکی گەڕاندە گۆشەی لێوەکانییەوە.

ملازم هێشتا کابرای نەناسیبۆوە. گوتی:"سلاو، کارێکت بە من هەبوو؟"

"وسوو، وسوو... لە گۆلی وان. تاژی، تاژی... ئاسکە."

ملازم لە پڕ پێی بە عەرزییەوە وشك بوو. نێوچاوانی تێك نا و کەللەی گەرمدا هات و لە داخان شێت بوو.

"کوڕە چاو ئەو سەگبابە بێ مێشکە دەڵێی سۆنەیە تەڕ نابێ. سەیری ئەو چاو و ڕووەی بکە. سەگبابی ڕووهەڵماڵڕاو و بێ کاروبار لە چیای سوبحانەوە، لە پانتۆسەوە، لە دەشتەکەی پانتۆسەوە، لە گۆلی وانەوە هەستاوە و هاتووە، لەبەر تاژییەك، هاتۆتە ئێرە.."

وەك بڵێی کونجکۆڵییەکەی تۆزێك جۆش و خرشەکەی دامرکاندبێتەوە، بە دەنگێکی هێورتر پرسیی:"لەوێوە چۆن تائێرە هاتووی؟ چۆنت زانی من لێرەم؟"

لەگەڵ هێوربوونەوەی ملازم، بریسکەی شادییەك چاوەکانی وسووی گەش کردەوە. زەردەخەنەیەك زایە لێوەکانییەوە و بۆی گێڕایەوە کە بۆی دۆزینەوەی، چیها چەرمەسەری و کوێرەوەریی دیتووە. لە وانەوە تا ئێرە، هەتا لێوارەکانی دەریای ناوەڕاست، ئەسکەندەروون، هەمووی بڕیوە و مانگ و نیوێك بەڕێوە بووە.

"ئەو تاژییە هەردوو چاومە. تاژییەکەم بدەرەوە ملازم."

جا بەچوار جەندەرمە وسوویان لە نێوەڕاستی بازاڕەکە لەسەر عەرزی راکێشا... ئەوجار ملازم لە نێو بازنەی حەشامەتە تووڕەکە بە پۆستاڵان وەری گەڕایە و جا چیت خواردووە ترش و چەوەندەر...

دەموچاوی لە پۆستاڵەکەدا دەردەکەوت و خوێنەکەشی دەچۆڕایە سەر چیمەنتۆ رەقەکە... ملازم چاوێکی بەسەر حەشامەتە بێدەنگەکەدا گێڕا کە دەوریان دابوو. بزەیەکی هاتێ، بەڵام حەشامەتەکە متەقی لێوە نەهات و وەك دیواری لێ هات. تەزوویەك بە مووغەرەی پشتی ملازمدا هات و لە تووڕەییان ئاگری گرت. ددانی چیڕ کردنەوە، دیسانیش خەڵکەکە هەر نەبزووتن. دڕی بە حەشامەتەکەدا و دوای ئەوەی لە بازنەکەیان چووە دەرێ، هەستێکی راگرت، تۆڵە لە حەشامەتەکەدا شەپۆلی دەدا.

"کوڕە تاژییەکم پێوە رەوا نابینێ. بە ملازمێکەوە... ئەو کابرا هیچ و پووچە گەمژە کێوییە ئەوە ساڵێکی رەبەقە وەك سێبەر بە دوامەوەیە. دەچمە هەر جێیەك وەك سێبەر لە دووم دەخشێ... لە وانەوە هاتووەتە ئێرە وەدووی تاژییەك کەوتووە...

تاژییەك بە ملازمێکی دەوڵەتەوە رەوا نابینێ. کوڕە خۆ روویەکی خۆشی پێشان بدەی، بەو کەسەی بۆ تاژییەك ئاوا دەکا و لەبەر تاژییەك لە چیای سوبحانەوە هەڵدەستێ بە پێیان دێتە ئێرە، تۆ بڵێ بۆ کاری گرنگتر چ ناکا؟ وا نییە؟ تۆ خوا بنیادەمی ئاوا دژی ئاسایشی دوایین دەوڵەتی تورك ناجووڵێتەوە؟ دوایین، دوایین، دوایین..."

هەرچی گوتی و لێی رست*، حەشامەتەکە متەقی لێوە نەهات. چاوە کەسکە مارییەکانی ملازم ئاگریان لێ باری و هەوساری تووڕەییەکەی پچڕا. دەستی لێك ئاوەڵا کرد و نەڕاندی:"دەی بڵاوەی بکەن. دەی بڕۆن بە دوای کاروبارتاندا دەی... یالڵا ملتان بشکێنن."

---

*لێڕستن: زۆر گوتن. چەنەوەڕیکردن. زۆرگوتنەوەی قسە.

خەڵکەکە لەگەڵ ئەو هەتاوەی تەشك و داوێنی خۆی کۆ دەکردەوە، وردە وردە و لەسەرخۆ بڵاوەیان کرد. وسوو لەوێ، لە حاڵێکدا خوێنی لەبەر دەڕۆیی و لەسەر چیمەنتۆکە دەمەیی، بەجێ ما.

گوتی، وسوو، سوو، هەستە بڕۆ. هەستە بڕۆ وسوو.

وسوو دار و بەرد و خاك و هەرچی لەبەر چاوی جوان خۆی دەنواند، بەو خۆرەی هەڵدەهات و ئەو مانگەی ئاوا دەبوو، ئاسۆکان و درەوشاوەترین ئەستێرەکان، گۆلەکەی وان کە هەر تاوەی لەسەر رەنگێك بوو و ئەو رووناکییەی لە چاوترووکانێکا وەك تیرێکی سوور لە لایەك رۆدەچوو و لە لایەکەی دیکەوە دەهاتەوە دەرێ، کەڵەکێوی و دوڕناکان و هەرچییەکی لەبەر چاوی جوانن، هەرچی لەبەر چاوی خۆی جوان دەنواند، ناوی نا ئاسکە. شەو و رۆژ تێی چریکاند و گۆرانیی گوت.

تاژییەکە درێژ و نێوقەدباریك و لەسەر لینگ بوو. تاژییە گوێ خەنەییەکە، لاق و لەتەری سوور و قەپۆزدرێژ و چاو گەورە و جوان لە خەیاڵیدا هەر لە بیابانەکەی عەرەبستانەوە هەتا دەشتەکەی پانتۆس هەتا گۆلەکەی وان، وك نەیزەکێك خوشی.

خەو نەچووە چاوی وسوو. وسوو دیسان هاتەوە ئەسکەندەروون. ملازم لەوێ نەبوو. گوتیان بەڕێ کراوە بۆ شوێنێکی دیکە. وسوو وەشوێن ملازم کەوت. بەخۆی دەگوت ئەگەر ئەمجارەیان ملازم بدۆزمەوە، تاژییەکەم دەداتەوە. تاژییەك بەلای ئەوەوە ئەگەر زۆریشی خۆش بوێ، هەر تاژییەکە و هیچی دی. بەڵام تاژییەکە بەلای منەوە شتێکی دیکەیە. تاژییەك، هەموو بیابانە چاوڕەشەکەی عەرەبستانە. هەموو ئاسکەکان و گۆلی وان و دەشتەکەی پانتۆس و ماڵ و حاڵەکەمە.

زۆر گۆرانیی لەو جۆرەی گوتن. دەبوو هەموو شتێکی بە گۆرانی بۆ ملازم گێڕابایەوە.

بە پرسیارکردن و گەڕان، ئاخرییەکەی لەم شارۆچکەیەی و لە بناری تۆرووسی سەربەرزدا ملازمی دۆزییەوە. وسوو چیای دوڵدوڵی دیت. لە مس تاشرابوو و بەفر داپۆشیبوو. دودڵدوڵ، چیای سوبحانی خستەوە بیر. لە چوکووراواش تاژییە نێوقەدباریکەکانی دی.

چوو و لە بن سێبەری دەرگای ماڵەکەی ملازم راوەستا. ملازم دوو رۆژ بەیانی و شەوێ بە بەردەمیدا تێپەڕی و نەیدی. سێهەم رۆژ بەیانییەکەی ملازم بە دەنگی گۆرانییەك لەخەوێ هەستا. گۆرانییەك بوو ئاگری لە دڵی بەرد بەردەدا، گۆرانییەکی خۆش و خەمبار و دڵ بلاوێن... لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد. کابرایەکی دیت چوارمەشقی دانیشتووە و دەستی

ناوەتە بن گوێی و تێی چریکاندووە و ئەوەی دەیڵێ نایڵێتەوە. کابرایەکی رەقەڵەی ریوەڵەی مل باریك و درێژۆکە. گەردنی لەگەڵ گۆرانییەکەدا درێژتر دەبۆوە و خۆی رادەژاند. چزووی نیگاکەی بەگیانیدا چوو. بەڵام نەیناسییەوە. هەستا و جلوبەرگەکەی لەبەر کرد و هاتە لای کابرای کرووشمەکردووی گۆرانبێژ و دەسبەجێ ناسییەوە. قاقایەکی گاڵتەجارانەی کێشا و لەبەر پێکەنینان بوورایەوە... و پرسی:"دیسان هاتووی بۆ تاژییەکە، وایە؟ تاژییە خەنەییەکە، وایە؟"

ئەوجار وەك شێتان نەڕاندی:"تاژییەکەم کوشت. کوشتم. بەقوربانی فیشەکێکم کرد..." وسوو وەك کەوانێکی پۆڵایین لەبەر یەك کشا و بە هەر دوو دەستی قورقوڕۆچکەی ملازمی توند گرت. هەردووکیان پێکەوە وەعەرزی کەوتن. گلان و تلانەوە. لە خۆڵەکەی گەوزین و سەر و بن بوون. چیی پەنجەکانی وسوو پتر لە قورگی ملازم توندتر دەبوون، چاوەکانی پتر دەردەپەڕین. لێوەکانی رەش هەڵدەگەڕان و روخساری زەردتر. وسوو ئەوەندەی رێك گوشی ملازم گیانی لەبەردا نەما. وسوو لە ترسی گیانی خۆی رووی کردە چیا.

وسوو چیاکانی دی. چیا بەرزەکەی سوبحان. کاروانە رێی گەورەی دیت. وسوو تیربار، وسوو بۆمب، وسوو گەلێ تفەنگ و جەندەرمە و سەربازی دی. وسوو حەوت ساڵان بە کێوانە بوو.

وسووەکان لە چیا زۆرن. ملازم لە دەشتەکان زۆرن.... چیایی لەگەڵ دەشتی بەشەڕ هاتن. گەلێ بنیادەم لە خوێن گەوزین. وسوو تۆرووسی دیت. دەریای رەشی دیت، دەریای نێوەڕاست... خانووی کاول و وەجاغی کوێرەوەبوو... وسوو لە باریکەرێیەکی نێوان رەوەزە بەردئەستێکان و لە تەنیشت تەرمی هاوڕێ کوژراو و بریندار و لەخۆچووەکانی لە پشت تیربارەکەی گیرا.

وسوو قازیی دیت. وسوو لێوی هەڵنەپچڕی و مەتەقی لێوە نەهات. هەر دەتگوت زمانی لەزاری دا نییە. دادوەر کە وەك لەتە بەردێك لەسەر جێیەکەی دانیشتبوو و بەردەوام وەنەوزی دەدا، وسووی ترساند. زۆر پتر لەوەی لە ملازم و سەربازەکان و جەندەرمە و فیشەك و ئاگر ترسابوو. دادوەرەکە لە دانیشتنەکانی دادگاییکردنێدا چەندی پێی خۆش بوو وەنەوزی دەدا و خەونی دەدی. وسوو لە حاڵێکدا دڵی وەك دڵی مەلی نێو قەزفەز لێی دەدا، هەر ئەوەندەی دەتوانی سەرە رووتاوە بێ تووکەکەی ببینێ و سەیری بکا. دادوەر لە خەونیدا بلێسەی دەدی و ئەو شەمشەمە کوێرانەی لە کلّی ئاگرەکەدا دەبوونە کوڵوو. سەدان... پەیژە بەدەست، شەوێ تا بەیانی ئاگریان لە هێلانەی شەمشەمە کوێرەکان بەردەدا و سەرخۆش و بەکەیفساز بەهۆی دیتنی سووتان و چزەچز و جیکەجیکی باڵندەکان، بەرەبەری بەیانی بە دڵێکی خۆشەوە

گەڕایەوەماڵێ و لەگەڵ تاوهەڵاتنێدا قاوەکەی هەڵدەقوڕاند و لە دانیشتننەکانی دادگاییکردنەکەدا نوقمی خەون و خەیاڵە شیرنەکانی، هێلانەی هەموو تەیرەکانی دەسووتاند و بەهەستێکی شیرین سەرخۆش و مەست دەبوو.

"وسووی کوڕی حەسەن مەحکووم کراوە بە ئیعدام."

هەستاوە، وەك شتێکی تاڵی خواردبێ، نێوچاوانی تێك ناوە، ئیمزایەك لە گۆشەی ئەو کاغەزە دەدات کە لە بەردەمی دانراوە و دوایی...

وسوو بەندیخانەی دیت. برینەکانی لە زیندانێ چاك بوونەوە.

وسوو گوێی لە گۆرانییەك بوو. گۆرانییەکی کۆن، زۆر کۆن و لە دڵ هەڵقوڵیو... وسوو بەرەنگاری مەرگ بوویەوە. وسوو گاڵتەی بە مەرگ کرد.

هاتمە بن شووراکانی دیاربەکر. لەسەر خاکەکەی کڕنۆشم برد. کڕنۆشم برد بۆ سەوزیی کۆنە بەردەکان و پیرە گیا و کۆنەدەرگا و کۆنە ئاسن و مسە زۆر کۆنەکانی. بۆ رووناکایی و درەوشانەوە و بریسکانەوەی ئاوەکەشی.

لەودیوی شووراکانی دیاربەکرەوە نەڕاندم بۆ ناوەوە... دیوارەکانی دیاربەکرم سێ جاران لەگەڵ عەرزەکە تەخت کرد. سێ جاران خاکی زیندانەکەی دیاربەکرم بە توورەکە کێشا. وسووم سێ جار دی... سێ جاران دەستی وسووم توند بە دەستەکانم گرت و وسووم سێ جاران لاواندەوە.

چوومە لای دادوەر و گوتم: ئەمن ئاسکەم. ئاسکە. گوتم ئاسکە چاو مامز منم. ئاسکی دەشتەکان منم. سەر ئاخوڕەکەی باوکم پڕە لە ئەسپی عەرەبی. هەر هەمووی بۆ تۆ. هەر ئەوەندەم دەوێ لە وسوو خۆش بی. من ئاسکەم، ئاسکە. قژ زێڕینم. قژی زێڕینم دەبڕم. هانێ بۆ تۆ. هەمووی بۆ تۆ. هەر ئەوەندە لە گیانی وسووی خۆش بە. من ئاسکەم، ئاسکەی چاو مامز و چاوەکانم لە چاوی هەموو ئاسکۆڵەکانی دەشتێ جوانترن. چاوەکانم دەربێنە بۆخۆت. چاوەکانم بۆ تۆ. هەر ئەوەندە لە گیانی وسووی خۆش بی.

شووراکە هەنجیری لێ روابوو و دار هەنارەکان گوڵیان پشکوتبوو. لەوێ لە بن گوڵە مۆرە پشکوتووەکەدا گۆرانییەك دەلەرییەوە.

دیاربەکر بۆنی گۆڵی دێ. بۆنی وەنەوشەی لێ دێ. بۆنی زوڵمی لێ دێ. هەموو بازاڕ و شەقامەکانی دیاربەکر دەکەنە وەنەوشە و گوێ. مۆر و مەیلەوڕەش و چەپك شەپك... و هەر چەپکەی بە دوو قرۆش و نیو...

لە بازاڕەکانی دیاربەکرێ گوڵ دەفرۆشم. وەنەوشەی باغەکان، دەشتەکان و بیابانەکان بەپانەوە دەچنمەوە. وسوو رزگار دەکەم. گیانی وسووی...

ئاسکە بەرەو رۆژهەڵات چوو. دەتگوت بە زنجیر و کەلەپچە لە دەروازەی زیندانەکەی دیاربەکریان شەتەك داوە... ئاسکە وەنەوشەی فرۆشت. بە دادوەر و ملازمەکان. ئەمن ئاسکەم. دوڕنای چیا و ئاسمان و دەشتەکانم. مامزی بیابانەکانم. لە حەسار و خاك و دڵمدا گوڵی عەشق رووان. گوڵی عەشقم لە دیوارە بەردینەکانی دیاربەکردا رواند. پشکوواندم. ئەمن ئاسکەم. ئاسکە... سێ جار بانگی قەتاری دوڕناکانم کرد. سێ جارم بانگی وسوو کرد.

وسوو عەلیجیکیشی دی. گوتی:"هەستە وسوو. رابە و بڕۆ. هەستە بڕۆ دژی زڵم و ناهەقی."

عەلیجیك ماڵەکەی خۆی سووتاند. ماڵەکانی دیکەش. کۆشکەکەشی ئاگر دا. عەلیجیك دەشتەکەی ئاناوەرزاشی سووتاند. عەلیجیك شێت ببوو و دەستی بەهەر شتێك راگەیشت سووتاندی. عەلیجیك ئاخرییەکەی ئاگری لە خۆیشی بەردا...

عەلیجیك نیوەزیندوو و نیوە سووتاو هاتە زیندان. گوتی، وسوو، وسوو... وسوو، وسوو، هەستە، مەڵحەمێك بۆ برینەکانی عەلیجیك بگرەوە... دایك و باب و نەنکی وسوو شارەزای دروستکردنی گەلێك داوودەرمان بوون.

مەڵحەمەکەی وسوو کاری خۆی کرد و برینەکەی عەلیجیك سارێژ بۆوە و وسوو عەلیجیکی چاك کردەوە.

ئەوجار وسوو، ئەوجار وسوو، جاڕچییشی دیت. هەلاهەلایان کردبوو و فڕێیان دایە نێوەڕاستی بەندیخانەکەوە. جاڕچییەکە لەوێ کەوت پشووی نەدەهات. دەموچاوی درێژ ببۆوە و دەرپەڕیبوو. ئێسك و پرووسکێك بوو. چاوەکانی سێ جاران هەڵێنان و لێکی نانەوە. هەموو دەموچاوەکەی بوو بە چاوە گەورە و خەمبارەکانی. خۆشەویستی و دۆستایەتی لە چاوەکانی جاڕچییەکەدا بریسکانەوە.

کۆت و زنجیری قورس و گران بەدەست و پێیەوە... بەڵام هیچ لە جاڕچی نەدەچوو. دەتگوت منداڵێکیان لە کۆت و بەند کردووە. کۆتێك لەملدا، ملەباریکەکەی بەکۆت و زنجیرێکی ئەستوور...

گوتی، وسوو، وسوو، هەستە... جاڕچییەکە کەوتە پاڕانەوە...

وسوو دەستی گرت و لەسەر دڵی خۆی دانا....

گوتی:"براله، براله، خۆڕاگر بە، چاك دەبییەوە."

دوای ماوەیەك جارچی زمانی كرایەوە. ئەوەی لە زارییەوە دەهاتە دەرێ دەنگ نەبوو، شتێك بوو لە هەناسەیەكی كز دەچوو. بە نیخەنیخەوە گوتی:"ئەمن كوشتم. من كوشتم. ئاسنگەرەكە من كوشتم. بە كەسیش نالێم بۆ كوشتم. بمكوژن، بمكوژن. من بكوژن. نایلێم. بمكوژن."

وسوو ملازمی دیت.

وسوو تاییەكە، ئاسكە، عەلیجیك، جارچی و چیا و دوڕنا و زنجیر و خوێن و بلێسە و دادوەر و تەیرەكان و زوڵم و زۆر و ناهەقیی دیت. وسوو قژی زێڕینی دی.

هەر بۆیە چاوەكانی ئاسكە لە چاوی مامزان دەچن.

# ٤٩

"دەمرێ. مۆستۆق دەمرێ."

قەرەقیزخاتوون کچی بەگە تورکمانێك بوو لە کۆنەبنەماڵەیەکی خوارووی کووزان. قەرەقیزخاتوون بە چاوە بادامییەکانی و بە دەم و چەناگە ناسك و رێکەکەیەوە و بە روومەتی قیت و گەردنە درێژە تورکمانییەکەی و کولمەی گۆشتن و گەش و روخسارە سوور و سپی و گەشەکەیەوە کچێك بوو دڵ و سەد دڵ ئاشقی دەبوو.

سواری ئەسپ دەبوو و دەچووە راوی مامزان. وەك پیاوان تەفنگی داویشت و دارێنی دەکرد. لێی سوار ئەسپ دەبوو و دەشتاو دەشت و کێواوکێو تاوی دەدا. تاقە خوشکەی شەش برایان بوو.

رۆژێکیان کەرەی بەیانی، ئەو کاتەی گوڵە گەنمە زێڕینەکان بەدەم شنەی بەیانییەوە کەروێشکەیان دەکرد و وشتراڵووك ئاسۆیان رەش داگیرابوو و چیای دوڵدوڵ بە مەندیلێکی سپییەوە نوقمی تیشك و نوور بەرەو دەشتەکە دەخزی، قەرەقیزخاتوون ئەسپەکەی بەرەو دەشتەکە لینگ دا. مۆستۆق بە مەڵەغانێکەوە لەنێو مەزراکەدا دی. مۆستۆق کەڵەگەت و باریکەڵە و ئەسمەر بوو. بزەیەکی مندالانە لە روخساری نیشتبوو و ددانە سپییە رێك و جوانەکانی بریقەیان دەهات. دەتگوت سێبەری سیحر و جادوویەك کەوتووەتە سەر گنج و هێڵەکانی دەموچاوە درێژووکەکەی. چاوە سڵەکان لە تا و یاوی عەشقێکی نامۆدا دەسووتا. لەسەر جێی خۆی حەپەسا. تاوێك دواتر بەبێ ئەوەی خۆی ویستبێتی، بەرەو لای مۆستۆق کشا و کە سەری هەڵێنا لەبەر دەمی بوو.

مۆستۆق سەری داخست. رووبەڕوو، لە نێو دڵی ئەو خۆرەدا کە هەڵدەهات و لە چەقی مەزراکەدا قەرەقیزخاتوون سیحرلێکراو و مۆستۆقی شەرمگرتوو و سەرداخستوو، هەر وا

مانەوە و ئەوەندە مانەوە هەتا خۆر هێندەی سپیدارێك بەرز بۆوە. ئەوجار مۆستۆق لەحزەیەك بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، سەری هەڵێنا و سەیرێکی قەرەقیزخاتوونی کرد. نیگایان تێك ئاڵقا و قەرەقیزخاتوون سەری ئەسپەکەی خۆی بەرەو چیاکان وەرگێڕا و تاوی دا و وەك با لە مەزراکە چووە دەرێ و دوور کەوتەوە.

دوای ئەوە قەرەقیزخاتوون هەموو رۆژێ بەرەبەری بەیانی، دەهاتە مەزرای پڕ لە گوڵە گەنمە قورسەکان و هەتا تاو هەڵدەهات رووبەڕووی یەکتری رادەوەستان. دوایی مۆستۆق بەهێمنی سەری هەڵدێنا و وەك سیحرلێکراوان سەیرێکی قەرەقیزخاتوونی دەکرد.

مۆستۆق دروێنەی کردبوو و خەرمانی داختبوو و خەریکی خەرمانکوتانێ بوو. بۆنی تفت و تاڵی کای بەر گەرماکە هەستابوو. قەرەقیزخاتوون لە کازیوەی بەیانییەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی و لە تەنیشت خەرمانەکە راوەستابوو. مۆستۆق لە ئاورینگەی دڵییەوە هەستی کرد ئەو لەئەسپەکەی خۆی فڕێدایە خوارێ و غاری دا و سواری جەنجەڕەکە بوو و بڵێسەیەك هەموو گیانی داگرت. دەستەکانیان، لاقەکانیان، دڵیان لە نێو کەفوکوڵ و جۆش و خرۆشی تاسەبارییەکدا یەکتریان دۆزییەوە و تێك ئالان و بوونە یەك. قەرەقیزخاتوون دەتگوت بڵێسەیە و بەرەبەری نیوەڕۆیە دوای ئەوەی هەموو گیانی مۆستۆقی بە ماچی ئاگرین ماچباران کرد، هەروا لەسەر لۆدە کایەکە بەنیوەبێهۆشی و ئاگالەخۆنەماوی بەجێی هێشت و لێیدا و رۆیشت.

مۆستۆق هەموو رۆژێ کەرەی بەیانی، هاتە بن دارچنارەکەی بەر ماڵی قەرەقیزخاتوون و تەنگەی نوێژی شێوانێ لەوێ رۆیشت.

دوای ئەوە بوو کە قەرەقیزخاتوونیان لە بابی مستەفا بەگ مارە کرد. مۆستۆق هەموو شەوێ هات و لە دەوری کۆشکەکە خولایەوە. قەرەقیزخاتوون لە پشت پەنجەرەکانەوە دەیدیت و لە دڵی خۆیدا پەسنی ئەو ئەشقەی دەکرد، بەڵام خۆی دەبوارد لەوەی لێی نزیك بێتەوە.

مۆستۆق سیس بوو و ژاکا و ردێنە لوول و رەشەکەی و چاوە رەشە گەورەکانی پرووش بوون و لە درەوشانەوە کەوتن.

شایی و زەماوەندێکیان بۆ قەرەقیزخاتوون وەڕێ خست حەوت شەو و رۆژان نەبڕایەوە. مۆستۆق رووی کردە نێو رەوەز و گابەردەکانی ئاناوەرزا و حەوت شەو و رۆژان لەگەڵ داڵ و هەڵۆیان ژیان.

لە ئاناوەرزایە داگەڕا و چووە گوندەکەی یۆللی. قەرەقیزخاتوون دیتی. دەموچاوە درێژ و زەردهەڵگەڕاوەکەی مۆستۆق ئاشقتر و سیحرلێکراوتر دیار بوو.

قەرەقیزخاتوون ئەو گەنجەی کە لە حەوشەی کۆشکەکەدا راوەستابوو پیشان دا و گوتی:"ئەو گەنجە خەڵکی گوندەکەی ئیمەیە. ئەو لێرە دەمێنێتەوە."

مۆستۆقیان هێنایە ژووری و تۆز و خۆڵیان لیێ تەکاند و دوای ماوەیەکی زۆر دیسان بە دیتنەوەی قەرەقیزخاتوون بزەی لە لیوانی گەڕایەوە. لەوانەیە دوای ئەو هەمووە ساڵە ئەوە یەکەم جاری بێ پێکەنیبێ.

قەرەقیزخاتوون لە جێی ئەو رەیحانە و گوڵە مەخمەرانەی ئێستا، لە تەنیشت ئەستوندەکەکە رادەوەستا و چاوی لە مۆستۆق دەبڕی کە لەخوارەوە و لە تەنیشت دیوارەکە حەپەسابوو. مۆستۆقیش بەبێ ئەوەی چاوبتروکێنێ، بە چاوە ئاشقەکانی سەیری دەکردەوە.

قەرەقیزخاتوون لە ئەستوندەکەکە دوور دەکەوتەوە، کۆشکەکەی بەجێ دەهێشت و سەردانی شاری دەکرد و بۆ گەڕان و سەیاحەت دەچووە دەشتێ و مۆستۆق بە شەو و رۆژ لەبن ئەو دیوارە لانەدەچوو.

"مۆستۆق دەمرێ، دەمرێ."

مانگ و ساڵان تێپەڕین. مۆستۆق کز و بنێس بوو. توایەوە و لە بن دیوارەکە و لەجێی خۆی هەلا نەجوولا.

قەرەقیزخاتوون شەوێکیان لەجێ و بانەکەی هاتە دەرێ. تەم و مژێك شەوەکەی داگرتبوو. شەوەکە ئەوەندە تاریك و خەست بوو چاو چاوی نەدەدی. تاریکایی و مژی شەوێکی پاییزی بوو. قەرەقیزخاتوون بە چنگەکوتە مۆستۆقی لە بن دیوارەکە دۆزییەوە و وەك شێتان ئاوێزانی بوو. لە چاوترووکانێکدا رووت و قووتی کردەوە و خۆیشی رووت بۆوە. لە بن دیوارەکە و لە سەر گژ و گیایەکە و لە حاڵێکدا رەیحان و گوڵەمەخمەرییەکانیان دەشێلا، هەردووکیان لە بڵێسەیەکی بەتیندا تێك ئالان. مۆستۆق ئاخرییەکەی ئاخێکی هەڵکێشا کە دەمێك بوو لە سینەیدا قەتیس مابوو.

قەرەقیزخاتوون لە تاریکیی شەوەکەدا جلوبەرگەکانی لەبەر کردەوە. دواییش هەتا کازیوەی بەیانی هەموو گیانی ماچباران کرد.

"مۆستۆق دەمرێ."

تاو هەڵات. مۆستۆق گرمۆڵە ببوو و لە بن دیوارەکە رەش دەچووە. گرمۆڵە و تێك شکاو و وێك هاتوو.

"مۆستۆق مردووە."

قەرەقیزخاتوون لەوێ ڕۆژێوە ڕەشی پۆشی... و یەکەم کوڕەکەی بەناوی مۆستۆقەوە کرد. دواتر بە مۆستۆقیان گوت مستەفا.

قەرەقیزخاتوون مستەفای خۆی ئاوا دیت. رووت و قووت خرابووە سەر پشتی ئەسپ. دەروێش بەگی دیت. دەستی لە دەوری کۆڵەکەکە بووەوە و شۆڕ بوونەوە. نە گریانی هات و نە پێکەنین...

پێی وابوو کوڕەکەی مردووە. مستەفا بەگ و پیاوەکانییان لە ئەسپەکان داگرتە خوارێ و بردیاننە نێو کۆشکەکەوە. قەرەقیز خاتوون کە زانیی کوڕەکەی زیندووە، پتر رووخا. کوڕەکەی هێشتا وەخۆ نەهاتبۆوە. قەرەقیزخاتوون یەك پشوو خودا خودای بوو کوڕەکەی وەهۆش نەیەتەوە و پەیتاپەیتا دەیگوت:"ئیشەڵڵا دەمرێ. دەمرێ. ئیشەڵڵا مستەفام دەمرێ.... مستەفا کە دوژمنەکەی رووتی کردووەتەوە و قایلیش نەبووە بیکوژێ، ئیشەڵڵا دەمرێ."

چۆوە ژوورەکەی و دەرگای لەسەر خۆی پێوە دا. نە حەزی لێ بوو چاوی بە چاوی کەس بکەوێ و نە پرسیارێکی کرد. لە جێوبانەکەیدا بەبێ جووڵە، زەردزەرد، نیوەزیندوو کەوت. لە ماوەی چەند رۆژاندا رووخا و توایەوە و هەر ئێسك و پێستێکی لێ مایەوە. بریسکەبریسکی چاوەکانیشی نەما و کوژانەوە.

هەموو گیانی مستەفا بەگ وەك لە دەسکاونگدا کوتابێیان، ڕەش و مۆر ببۆوە و کوترابوو. لە جێوبانەکەیدا درێژیان کرد و پیاویان ناردە شوێن نەشتەرگەر. نەشتەرگەرە کوردەکە زوو هات. لە بن دارچنارەکەی حەوشەی کۆشکەکەی ئاق یۆللی، لە تەنیشت تەراکتۆرە رەنگاورەنگەکان، گژ و گیای جۆراوجۆر و گوڵ و رۆنی لە مەنجەڵۆکاندا کوڵاندەوە و مەڵحەم و دەرمانی لێ دروست کردن. کۆشك و دار و بنیادەمەکان چەند رۆژان هەر بۆنی جۆراوجۆری تاڵ و خۆش و تیژ و نەرمی لێ دەهات. کوردە نەشتەرگەرەکە هەموو رۆژێ گیانی مستەفا بەگی مشتومالٚ دەدا و لە تەپڵی سەرییەوە تا بەری پێی مەڵحەمی بۆ تێهەڵسوی. لەوانەیە رۆژێ دوو سێ جاریش ئەو کارەی کردبێ. جەستەی مستەفا، چەندی پتر مەڵحەمەکانی هەڵدەمشت ئەوەندە دەبووژایەوە.

نەشتەرگەرەکە دەیگوت و دووپاتەی دەکردەوە:"هیواکان لە بێهیوایی دان. ئەو پیاوە دەمرد، بەڵام ماشەڵڵا لە کاری خوای. ئەگەر خوا ئیرادە بکا، مردوو زیندوو دەبێتەوە..."

کوردەی نەشتەرگەر ڕۆژێ نا ڕۆژێکیش سەرێکی قەرەقیزخاتوونی دەدا. دەستە سار و سڕ و بێ تینەکانی دەگرت و چاوی لە دەموچاوە چرچ و لۆچ و سارد و سڕ و تێك سمڕاوەکەی دەبڕی و فکر و خەیاڵ هەڵی دەگرت.

کوردەی نەشتەرگەر زۆر دەمێك بوو قەرەقیزخاتوونی دەناسی. بەزەیی پێی داهات، کە ئاوا و بەو رق و قینەوە دەمرێ.

"ئینسان هەر جارێك دەمرێ، بەڵام قەرەقیزخاتوون هەزار جار مرد. ئێستاش ئەگەر بمرێ... مەرگ بۆ ئەو لە هەموو شتێك باشترە. خوایە قەرەقیزخاتوون لەو هەورازە وەسەر بخەی. گیانی ئەو شاجوانەی دنیا بکێشە."

لە ژوور سەری قەرەقیزخاتوون ئەژنۆی دادا و دەستی هەڵێنا و لە بن لێوانەوە بە زمانی کوردی دەپاڕایەوە.

گەلێ ڕۆژ تێپەڕین و بەیانییەك قەرەقیزخاتوون چاوە گەورە و بریسکەلێبڕاو و دەرپەڕیو و بێ تینەکانی هەڵێنان. سەرسووڕماو و لەوانەشە بەبێ ئەوەی هیچ ببینێ، سەیرێکی دەورویشتی خۆی کرد. تاو لە پشت چیاکانەوە هەڵدەهات. مۆستۆق لە بن دیوارەکە گرمۆڵە ببوو. چاوە گەورەکان، رەش و پڕ لە ئەشق و نور بوون و پێدەکەنی. قەرەقیزخاتوون وەك تەیرێك بە قاوقیژەوە بە دەوری مۆستۆقدا خولایەوە. هەتا مردنێ چاوەڕوانی یارم دەبم. چاوەڕوانی یار...

مۆستۆق لە مەزراکەی ــ کە با کەروێشکەی بە گوڵەزێڕینەکانی دەکرد ــ بوو. مۆستۆق سەری لە دووی دەنا و ئەویش مۆستۆقی راو دەنایەوە...

قەرەقیزخاتوون گوتی:"دەوا و دەرمانم دەوێ حەکیم. خواردنم بۆ بێنن. خێرا، خێرا..."

کوردەی نەشتەرگەر لە حاڵێکدا دەستەکانی دەلەرزین و لاقەکانی تێك دەئالان، رای کردە دەرەوە. خەونێك وەدی هاتبوو.

"خێرا، دەسبەجێ خواردن بۆ قەرەقیزخاتوون بێنن. لە پێشدا شلەی ترخێنە، دوایی فڕووجاوێکی خەست... دوایی گۆشتی سپیی مریشك، دوایی هەنگوین، دوایی هەنگوین... خێرا... قەرەقیزخاتوون هێشتا ڕۆژی نەهاتبوو. قەرەقیزخاتوون نامرێ."

قەرەقیزخاتوون بە سێ چوار ڕۆژان بووژایەوە و وەخۆ هاتەوە. لە جێ و بانەکەی هاتە دەرێ و لە کۆشکەکەدا کەوتە هاتوچۆ. چووە ژووری کوڕەکەی و لە ئامێزی گرت و وەك چۆن بەمنداڵی ماچی دەکرد، هەر وەك چۆن مۆستۆقی ماچ ەکرد، ماچبارانی کرد. مستەفا بەگ

دوای گەلێ ساڵان هەستی کرد بەو ماچانەی لەبیری چوبوونەوە، ماچ دەکرێ و شاگەشکە بوو و خۆی گرتەوە. مەڵحەمەکان دەمێك بوو شووخاڵەکانی گیانیان چاك کردبۆوە. شادییەکەی دایکی هیچ بەلاوە سەیر نەبوو. لە مێژبوو هەر لە منداڵییەوە، دایکی قەت ئاوا نەببوو و ئاوا بە خۆشی و شادی و بەهەژاوییەوە لە ئامێزی نەگرتبوو و ماچی نەکردبوو. مستەفا بەگ وا نوقمی کەفوکوڵ و شادییەکەی دایکی ببوو دەرفەتی ئەوەی نەبوو بیر لەوانە بکاتەوە و بەهیچ جۆرێك سەری سووڕ نەما لەوەی کە دایکی چۆن دوای ئەو هەمووە بەڵا و نەهامەتی و چارەڕەشییانە ئاوا باڵی گرتبوو و بۆچی و لەچی ئاوا پڕ ببوو لە کەفوکوڵ و شادی، هیچ پێی سەیر نەبوو. هەموو شتێك بەلایەوە ئاسایی بوو.

قەرەقیزخاتوون بانگی بووکەکەی کرد، گوتی:"حەمامەکە گەرم بکەن. خەنەش بگرنەوە. دەمەوێ سەرم لە خەنە بگرم.

سەری بە هەموو ژوور و کەلێن و قوژبنەکانی کۆشکەکەدا دەکرد و وەك پشیلەیەك هیچ شتێکی نەدەبوارد.

سندووق و مێز و کورسییە دار گوێزە هەڵکۆڵراوە پڕ نەخش و نیگار و جوانەکانی وەستای "ماراش" و بەرشە و مافوورە تورکمانییەکانی دار و دیوارەکانیان پێ رازابۆوە، توورەکە و خۆرجین و جلی مەرەزی رەشی بەنەخش و نیگار و کەو و سوێسکەی وشکەوەکراوی جوان، تفەنگە قۆنداغ سەدەفکراوەکان و شمشێری تورکمانیی زێڕکفت کە ئایەتی قورئانیان لە دەمەکانیان هەڵکەنرابوو... و قەرەقیزخاتوون سەیری جیازی بووکێنییەکەشی دەکرد. یەك بە یەك دەری دێنان و لەبەر تیشکی تاوەکە لێیان رادەما. چەند سەعاتان بزەیەك لە سەر لێوان نوقمی سەیرکردنی نەخش و نیگارێك، قوماشێك و... دەبوو و لە سەیرکردنێ تێر نەدەبوو.

مستەفا بەگیش ئەو رۆژە تەواو گۆڕابوو و هاتبۆوە سەرخۆ و لە جێوبانەکەیدا دڵی بە شادی و کەیفخۆشییەکەی دایکی خۆش بوو و خواردنی بەباشی دەخوارد و دەنوست و بزەی بەختەوەرانەی لە لێو و روخساری نەدەڕەوییەوە. کوردەی نەشتەرگەر بە زۆرپێوەنانەوە پەیتاپەیتا تاریفی بەگەکانی پێشووی رۆژهەڵات و بەگەکانی پێشووی چوکووراوای دەکرد. مستەفا بەگ وەك لەبیری چووبێتەوە چی بەسەر هاتووە، تەنانەت هێندەی نووکەدەرزییەکیش چیە بیری لە دەروێش بەگ نەدەکردەوە.

دە پانزە رۆژێك ئاوا تێپەڕی. قەرەقیزخاتوون تەواو گۆڕابوو. چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی کە دەتگوت داوی جاڵجاڵۆکەن، رەوییبوونەوە، گەردنی وەك جاری جاران دێژ ببۆوە و چاوەکانی

پڕ ببوون لە شادی و بەختەوەری و خۆشی و گەش ببوونەوە. پشتە کۆماوەکەی تەواو قیت ببۆوە و وەك کچۆڵەیەکی گورج و گۆڵ لار و لەنجەی بوو.

هەموو رۆژێ بەیانی لە ژوورەوە دەرگاکەی دادەخست و تفەنگە "ناقان"ـەکەی مێردەکەی هەڵدەگرت و چەند سەعاتان خەریکی دەبوو. چەوری دەکرد و لە بریسکە و بریقەبریقەکەیدا نوقم دەبوو. تۆپەی فیشەکەکان پڕ دەکرد و بەتاڵی دەکردەوە و سێرەی لەو تەیرانە دەگرت کە لەسەر لك و پۆی چنارەکەی دەم پەنجەرەکە هەڵنیشتبوون و لەو کاتەیدا کە دەیویست تەقەیان لێ بکا، پاشگەز دەبووەوە و دوایی دەمانچەکەی وەك ئەمانەتییەکی پیرۆز لە قوماشێکەوە دەپێچا و لە سندووقەکەی دەخستەوە.

بەیانییەی رۆژێکیان گوتی:"ئەسپەکەم بۆ بێنن."

ئەسپێکی رەشی رەسەنیان بۆ هێنا. قەرەقیزخاتوون ئەسپەکەی کێشایە تەنیشت بەردەسوارەکە و بەبێ ئەوەی داوای یارمەتی لەکەسێك بکات، خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکە و تاوی دا. لە رێگایە دەمانچەکەی کێشا و بۆ تاقیکردنەوە سێ جاران داڵ بە داڵ تەقەی لە لکی دارە زمانەچۆلەکەکە کرد. لکەکە شکا و بەربۆوە. قەرەقیزخاتوون دوای ئەو هەمووە ساڵە هێشتا هەر ئەنگێوە بوو. کەیفخۆش و شاگەشکە بەرەو کۆشکەکەی ساری ئۆغلی لێی خوڕی. کە ئەسپەکە لە حەوشەی کۆشکەکەی ساری ئۆغلی گیرسایەوە، قەرەقیزخاتوون تازە وەخۆ هاتەوە. تاوێك نەیزانی چ بکا، بەڵام بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و نەشڵەژا. پشووی هێور کردەوە و لەسەرخۆ لەو گەنجەی لەبەردەم قوت ببۆوە، پرسیی:"ئەمن لە رێیەکی زۆر دوورەوە هاتووم. ئاخۆ ئەوە کۆشکە بەناوبانگەکەی ساری ئۆغلییە؟ دەروێش بەگ لەماڵە؟ ئەمن یەکێکم لە دۆستەکانی باو باپیرانی ئەو. دەمەوێ دەروێش بەگ ببینم."

مێرمنداڵەکە بە روویەکی گەشەوە بەخێرهاتنی کرد و گوتی:"بەخێر بێ و خێر و خۆشیت لەگەڵ خۆت هێناوە. خاتوونی مەزن. فەرموو دابەزە."

ئیتر هەوساری ئەسپەکەی گرت و گوتی:"فەرموو دابەزە. بابم ئێستا پێش تۆ سوار بوو و وەدەر کەوت. چووبێتە هەرجێیەك، بۆ نیوەڕۆیە دێتەوە. تۆ فەرموو پشوویەك بدە تا بابم دێتەوە."

قەرەقیزخاتوون رەنگی بە روویەوە نەما. دەستەکانی لەرزین و لێوەکانی لەرینەوە. تاوێك بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە وڕ و کاس بوو و ئاخرییەکەی بە دەنگێکەوە کە هەوڵی دەدا نەرم و

نیان بیّ، پرسیی:"ناوت چییە؟... کوڕی کێی رۆڵە؟ ماشەڵڵا چەندە بەخۆوەی. دەڵێی غەڵفی چناری."

"کوڕی دەروێش بەگم. ناوم برایمە.... فەرموو خاتوونی مەزن... بەخێر..."

هەر دەمانچەکەی هەڵکێشا و سینگی برایمی دایە بەر گوللە. برایم هەر ئەوەندە هاوارێکی لیّ هەستا. کەوتە عەرزی و لەسەر چیمەنەکەی حەوشەکە بەرەوپشت کەوت. دەتگوت خەوی لیّ کەوتووە.

ئەسپەکە لەگەڵ تەقەی یەکەم فیشەك هەستایە سەر پاشووان و قەرەقیزخاتوون توانیی تا دوا فیشەك جڵەوەکەی راگریّ. کە دواین فیشەکی پێوە نا، ئەسپەکە دەرپەڕی و بە دەشتەکەی ئاناوەرزادا وەك با فڕی. ئەسپەکە وەك با دەفڕی و لە پێشدا رووی کردە لای تۆزلۆ ئاڵتی. لەویّ لە دەوەنە تووترکێك سڵەمییەوە و بەبیّ ئەوەی شل بێتەوە بەرەو لای کسیك کلیّ تێی تەقاند. لەوێشەوە بەرەو یالینزتۆت و لەوێوە بەرەو لای دەربەندەکەی جیغ جیق غاری دا و کە گەیشتەوە کۆشك، هەموو گیانی شەڵاڵی ئارەقە بوو.

سینگ و کەلەکەی ئەسپەکە وەك کوورەی ئاسنگەران دەفی دەدا. قەرەقیزخاتوون هەروا خەولێکەوتوو بەسەر ئەسپەکەوە مایەوە و دوایی بەلادا هات و خزی و بەسەر سەریدا کەوتە بەر پێی ئەسپەکە. کوردەی نەشتەرگەر لە پێش هەموو خەڵکی کۆشکەکەدا دەرپەڕییە دەریّ و ئەوانی دیکەش بەدوویدا. کوردە داهاتەوە و دەستی خاتوون گرت و لێوەکانی بزووتن:"تەواو بووە. سارد بۆتەوە."

ئەسپەکە لە سەر جێیەکەی خۆی بە ئارەقەوە دەی هانکاند. زەردەیەك لە روخسارە هێمنەکەی قەرقیزخاتوون نیشتبوو.

"مۆستۆق دەمریّ. مۆستۆق، مۆستۆق دەمریّ. قەرەقیزخاتوون دەمریّ. مۆستۆق دەمریّ."

## ٥٠

قوڕاوەکە لە تەختی بنەوە شەپۆلی دەدا. چاوە زەق و حەپەساوەکان شەپۆل دەدەن. جاریٚ لەبەر یەك دەکشێن، هێلکەیی، جاریٚ کورت دەبێتەوە خڕ و بازنەیی. سێبەری سەلکی سەری لە نێو ئاوەکەدا درێژ دەبێتەوە. کەم و زۆر دەبیٚ. گەورە و بچووك دەبێتەوە. سێبەرەکەی بەسەر وردە چەوەکاندا دەکشیٚ. چەکمەکەی پڕ دەبیٚ. ئاو و خوێنە کەفکردووەکەی لیٚ دێتە دەریٚ. سێبەری سەگێکیش کەوتووەتە تەرکی ئاوەکە و سەر وردە چەوە پڕ لە جوولە و قەوزەگرتوو و قوڕاوییەکان. سێبەری سەگەکە جار جار لە گامێش دەچیٚ، هەڵدەماسیٚ و بایەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، با دەکا و باریك دەبێتەوە. تروسکەی چاوەکان لەگەڵ جوولەی ئاوەکەدا دەلەرێتەوە. سەگەکە لە بن ئاوەکەدا راوەستاو و روون، لە حاڵێکدا چاوی لە چاوەکانی بن ئاوەکەوە بڕیوە، خۆی دەلێسێتەوە. ئاوەکە لە دەوری سەرە قژنەکە هەڵمساو و درێژەوە بووەکەی دەگەڕیٚ. ماسییەکی بچکۆلانە دەمی لیٚ دەدا و بە نێو ئاوەکەدا رادەکا و پەنا دەباتە چۆلایی تاریکی لاچەپەکێکەوە و دوای چەند ساتێك دێتەوە لای سەلکەکە و دیسان دەمێکی تیٚ دەسرەوێنێتەوەو را دەکاتەوە. خوێن لە کونە تفنك و درزەکانی سەرییەوە دەچۆڕیٚ و ئاوەکە سوور هەڵدەگێڕیٚ وەك هێڵ و خەتی باریك باریك بەرەو خوار و بەرەو بن پردەکە دەکشیٚ. یەکێك لە هێڵەکان لە بن گوێی چەپییەوە هەڵدەقوڵیٚ. رێك لە بنییەوە...

فیشەکەکان تلپەتلپ و بە دەنگێکی کپ کەوتنە نێو ئاوەکەوە. بەسەر وردکەبەردە سپییە وشکەکاندا تێپەڕی. هەر هەنگاوێکی دەینا، شڵپەی لیٚ هەڵدەستا، و لەبری شوێنی پیٚ، خوێنی لە جیٚ پێیەکانی بەجیٚ دەما و ئەو خوێنەی لووتییەوە لووزەوی بەستبوو، هەموو گیانە خووساوەکەی دادەگرت...

له تەنیشت ڕەوەزەکانی خوار گردەکە و لە قەراغ قامیشەڵانی دەم زۆنگاوەکە، سێ جاران سەرەنگرێ بوو. جارێ سێهەم نەیتوانی هەستێتەوە. چەکمەکانی پڕ بوون لە خوێن.

"هەستە سەگباب خێو."

هەشتا. وەك بووکەڵەیەکی قورمیشکراو.

وەپێشم کەوە.

بەرەو ڕەوەزەکان وەڕێ کەوت.

"بەلادا مەیە، قیت ڕاوەستە. قیت بەرێگادا بڕۆ."

کرووشمەی کرد.

"گوتم بەلادا مەیە."

بەدەستە کوتە و بەبێ ئەوەی ئەژنۆی بنووشتێنەوە، قیت و وشکەڵاتوو هەنگاوی دەنا و مژێکی زەردباو لەسەر زۆنگاوەکە نیشت. خۆرە کەسیرەکە لەودیو مژەکەوە نەرم نەرم دەلەرزی. دارەکان، قامیشەڵانەکە، گژ و گیایەکانی دیکە و ڕەشەباکانیش دەبەرینەوە. ترۆمبێل و کامیۆنەکان لە مژەکەدا هەر هەموو وێکڕا گلۆپەکانیان داگیرساندووە و دەڕۆن. تیشکەکان وەك دەنگێکی کپی دوور و نووساو، لە بن قورسایی باهۆزەکاندا بەقرچەقرچ دەلەرزێن. نیلوفەرە زەرد و سپی و گەورەکان بەسەر ئاوەکەوە پشکووتوون و لەگەڵ شەپۆلان کەروێشکە دەکەن.

فیشەکەکان لە یەك کاتدا و بەبێ ئەوەی پەنجەکان بگرن، ، خێرا تۆپەی دەمانچەکە پڕ دەکەنەوە. تەپ، تەپ ڕژانە سەر لێفەکە.

"ڕاوەستە."

ڕەوەزەکە درێژ و نێوشانی ئارەقە کردوو. هەواکەی گەرم و بەتینە و ڕەوەزەکان وەك پشکۆی گڕ.

"لەو هەڵدێرەوە خۆت هەڵدێرە."

وەك بیر، تاریك. دارستان، زۆنگاو، مرۆڤەکان و گوندەکان لەو خوارەوە، ئەوەندە بچووك دەتگوت هەمووان لە مستتدا جێیان دەبێتەوە. ئاوەکان هەرکامە وەك هێڵێکی باریك، پڕ پێچ و گەو و بریقەدار.

"مەبزوو. ئەو دینامێتانەی لە لاقەکانی ببەستە مەستان. مەترسە، یەل وەلی ئەتۆش فتیلەکەی لێ گرێ بدە."

دەستەکانی مەستان راهاتوون. وەلی شەماڵ ناتوانێ خاتری بەگەکەی نەگرێ. دڵی نایە. زەرد زەرد هەڵگەڕاوە. خۆی دەزانێ. لە هەموو کەس باشتر دەزانێ. وەلی شەماڵیش چەند رۆژێکی دیکە سزای خۆی دەبینێتەوە. ئەی چۆنە دوای ئەو کافرە لەو هەڵدێرەوە خۆی فڕێ بداتە خوار؟"

"وەلی شەماڵ ئەوەیان لە دارەکە ببەستەوە."

پیرە داربەڕوویەك لە قەڵشتی لێواری زەرد و رەوەزەکە.

"زوو بە مەستان."

"بەستەمەوە بەگم. دینامێتم لە هەردوو لاقی و لە گیانیشی بەست. بیدە بە وەلی شەماڵ، ئاوا... ئاوا.."

فتیلەکە درێژە. هەر لاقەی فتیلەیەك.

"تەواوە. هەر من تەقەم کرد، ئەنگۆش فتیلەکان ئاگر بدەن. نا، نا، سەری فتیلەکە بدەنە خۆم."

فتیلەکە درێژە. بۆ کوێت پێخۆش بێ دەکرێ بیبەی. دەبێ لە دوورەوە ئاگری بدەی. بە چرتەچرت دەسووتێ و دووکەڵ دەکات و هەڵدەکشێ... چاوی لە مەرگێك بڕیوە کە لەسەر خۆ لێی دێتە پێشێ... چاوی تێوە بڕیوە و چاوەڕوانە...

داهاتەوە. کشاوە دواوە. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. شقارتەکەی لێدا بۆ ئەوەی ئاوری بدا، بەڵام پاشگەز بۆوە. هێمن و لەسەخۆ و لە حاڵێکدا دەستەکانی شۆڕ ببوونەوە، لە دارەکە نزیك بۆوە و دە مەتر لەولایەوە دانیشت.

مەستان کابرای بە راکێشان بردبوو و لە دارەکەی شەتەك دابوو. کابرا چاوەکانی لێك نابوو. خوێن لە کونە لووتەکانییەوە دەچۆڕایەوە و بە گۆشەی لێوەکانیدا لووزەوی بەستبوو و دەڕژایە نێو چەکەمەکانییەوە و کەفی دەکرد. مێشە سەوزەکان دەخولانەوە. پێکەنی. مەستانیش پێکەنی. پێکەنینێکی بەرزی وەك جنێو. وەلی شەماڵیش پێکەنی. پێکەنینێکی گریاناوی. دەیزانی چیی بەسەر دێ. چاوەکانی هەڵنەهێنا. رێك لەسەر سەری و لە پەنا گوێی... دەستەکانی لەرزین. حەوت فیشەك. وێکڕا چوونە نێو تۆپەی دەمانچەکەی. حەوت فیشەك. یەك جێ حزینە نێو تۆپەی دەمانچەکەوە. سێ فیشەك داڵ بە داڵ هاوێژرا و چۆلەکەکان شڵپ و هۆڕ لە سەر چڵووکەکانەوە بەربوونەوە.

چاوی هەڵناهێنێ. فیشەك سەهلە، تۆپیشی پێوەنێی نایکاتەوە.

هەتا نیوەڕۆ ڕەوەزەکەیان کون کون کرد و کونیان پڕ کرد لە دینامێت. مێشە کەسکەکان لە ڕەوەزەکاندا لە دەوری خوێن کەفکردووەکان وزەوزیان بوو و وەك فیشەك دەردەچوون...

"ئەمن دەچمە لای. دەبێ، نێو چاوەکانی، چاوەکانی ببینم."

مەترێکی مابوو بیگاتێ ڕاوەستا. دەمانچە ڕووتەکەی بەدەستەوە و تۆپەکەی وەك فرفرە لە سووڕاندا. فیشەکەکان دەخزێن و پڕ دەبن. وەك ئەو دلۆپە ئاوانەی لە سەر پەنجەکانەوە دەتکێنە خوار. چاوی لە بن پێڵووەکانیدا دەخولێنەوە. ڕوومەتەکانی لە بن چاوییەوە دەپەڕن و چڵ دەدەن. لێوە بەبار و وشکەڵاتوو و تویێژ تویێژبووەکەی چڵ دەدات و دەلەرزێ. جار نە جارێك زمانە سوورەکەی دەردێنێ و لە لێو و سمێڵی دەخشێنێ. ئازای ئەندامی دەلەرزێ. ئازای ئەندامی... لە تەپڵی سەری تا بەری پێی... جەستە گرژبووەکەی، کە دەلەرزێ، ئەو دارەش دەلەرزێنێتەوە کە لێیان بەستووەتەوە. لك و پۆپ و نێوقەدی دارەکە نەرم نەرم دەلەرزێتەوە. جار جاریش بە توندی...

گرمەی دینامێتەکان لە ناخەوە خاك و ڕەوەزەکانی ڕاتڵەکاند. گرمە و تەقینەوەکە لەگەڵ تەقینەوەی پەیتاپەیتا دەنگی دایەوە. نەیتوانی چاوەکانی هەڵێنێ. توندتر قووچاندنی. قولینچکی چاوەکانی پتر گنج و لۆچ بوون. تاوێك تەمومژێك لە نێوانیان نیشت. دوایی کە بەسپایی ڕەوییەوە، چاوەکانی هەروا لێك نابوو. دینامێتەکان لەوێ و لێرە و لە نزیك نزیکەوە و بە پەرش و بڵاوکردنی لەتکەبەردان پەیتاپەیتا دەتەقینەوە و گرمەگرمەکەیان لە نێو دڵی ئاسمانێدا دەنگی دەدایەوە. پێڵووەکانی جار بە جار پتر لە سەر یەك دادەگرت. ئیتر بن پێڵووەکانی نەدەجووڵان. جێی چاوەکان جار بە جار قووڵتر دەبوون. دارەکەش جار بە جار پتر دەلەرزی. دارەکە دەتگوت تۆفانی بەسەردا هاتووە. دادەهاتەوە و ڕاست دەبۆوە. ڕادەتڵەکی و گەڵاکانی لەبەر ڕەشەبایەکە خشەخشیان بوو و هەڵدەورین و دەفڕین.

"وەلی شەماڵ، وەلی شەماڵ، دەست ڕاگرن. ئیتر مەتەقێنن. ئەوە هاتم."

بە غاردان لە فتیلەکان نزیك بووەوە.

فیشەکەکان لە دەمانچەکەوە خلۆر بوونە دەرەوە و دیسان هێدی هێدی وەك دلۆپەی ئاو چوونەوە نێو دەمانچەکە. هەر دەتگوت لەخۆوە.

چووە پشت گابەردەکە. فتیلەکە ئاگر دەدا و ئەوەندەی یەك و دوو تەواو دەبێ. مێشکی دەبێتە هەرزا لەت و دەستی هەزار لەت و بەرەو ئاسمان بڵاو دەبن و ئەوجار وەك کۆڵوویەکی ڕەش بەسەر ڕەوەزەکاندا پەرش و بڵاو دەبنەوە.

له حاڵێکدا ڕەوەزە تیژەکانی چەکمەکانیان دەجوی و دەیانسوی، غاری دا... خەنجەرەکەی کێشا و ددانی چیڕ کردنەوە و گوتی:"ها سەگباب. بگرە سەگباب."

جا نووکی خەنجەرەکەی سێ جاران لە ران و زگی رۆکرد. جۆگەلەیەکی خوێن لە جێ برینەکان شۆلاوگەی بەست. مێشە سەوزەکان هەر دەهاتن و پتر دەبن و پتر دەهارووژان. بۆگەنێکی بۆ هات. بۆنی بە دوور دوورەوە، بە هەتاوەکەوە و بە گوڵەکانەوە و بە مژەزەردباوەکەوە و بەم لایەوە کرد. بۆنەکە لە هیچ کوێوە نەدەهات. بە دەنگێکی زوڵاڵ نەڕاندی:"فتیلەکە ئاگر بدەن. ئاگری بدەن با ئەم کافرە لەتوپەت بێ. دەی مەستان، وەلی شەماڵ، ئاگری بدەن..."

وەلی شەماڵ لە خوارەوە، لە خوار رەوەز و هەڵدێرەکەوە غاری دەدا...

"راوەستە وەلی شەماڵ..."

فیلینتاکەی راکێشا و ئەژنۆی دادا و سێرەی لێ گرت و داڵ بەداڵ سێ فیشەکی بە بەر پێیەوە نا... وەلی شەماڵ نەڕاندی و گەوزی و نەڕەی لەگەڵ تەقەی فیشەکەکان تێکەڵ بوو و لە رەوەزەکاندا دەنگی دایەوە و ئاخرییەکەی تەخت وەعەرزی کەوت و جووڵەی لێ بڕا.

"سەی بەرەڵڵا."

لە نەکاو چاوی بەو کابرایە کەوت کە لە دارەکە بەسترابۆوە و هەر لەبیر چووبۆوە. چاوەکانی هەڵێنابوو و بە گاڵتە و تەوسێکەوە سەیری دەکرد.

"مەستان، مەستان فتیلەکە ئاگر بدە."

مەستان دەنگی نەهات.

"ئەتۆش ملی خۆتت شکاند مەستان؟"

سەیری خوارەوە ئەو شوێنەی کرد کە وەلی شەماڵ لەوێ کەوتبوو... سەیری کرد و چ ببینێ؟ وەلی شەماڵی لە شوێنەکەی نەدی. لەولاترەوە لە دەم ئاوەکە وەك فیشەك دەڕۆیشت. ئەژنۆی دادا و بە فیلینتاکەی سێرەی لێ گرت و پێنج فیشەکی دیکە پێوە نا. وەلی شەماڵ کەوت. دیسان هەستایەوە. ئاوڕی دایەوە. کابرای لە دار بەستراوی دی زەردەیەکی مات و لێڵی لە بن روومەتەکانی گەڕابوو و چاوەکانی زەق زەق ببوونەوە. وەك شەپۆل دەخوشی و درێژ دەبۆوە و دەبووە هێڵێك و دوایی دەبووە گلۆڵەیەك.

رای کرد و فتیلەکەی ئاگر دا. فتیلەکە دووکەڵی دەکرد و دەسووتا و لە کابرای بەستراوە نزیك دەبۆوە.

"چاوەکانت بکەوە. چاوەکانت هەڵێنە. سەیر بکە، وا هات، هات. دەتەقیتەوە. دەتەقیتەوە. فتیلەکە سووتاو تەواو بوو. چیی لیٚ نەماوەتەوە."

پەلەقاژەی بوو و دەینەڕاند:"هەڵیهێنە، هەڵیهێنە، هەڵیهێنە چاوەکانت هەڵێنە..."

سووتانی فتیلەکە نزیك دەبۆوە و پیاوە لە دار بەستراوەکە هەموو گیانی لەبەر یەك دەکشایەوە و چەندی دەکشایەوە، چاوەکانی پتر دەقووچاندن و چەندی پێڵووەکانی پتر وێك دێنا، چاوەکانی پتر بەقووڵدا دەچوون.

ئاگر و دووکەڵی فتیلەکە سیٚ چوار گەزی مابوو بیگەنیٚ کە رای کرد و دەستی کێشا و فتیلەکەی راکێشا و پساندی و تووڕی هەڵدا. فتیلەکەی کەوتە بەر گابەردەکە و گڵۆڵە بوو و سووتا. دووکەڵە ناسکەکەی بۆ تاوێك وەك هێڵێکی خۆڵەمێشی و زیوین و رەنگ پەڕیو بەسەر رەوەزەکەدا کشا و ون بوو.

"چاوەکانی دەڵێی پێدەکەنن، وایە؟"

"دەیبینی، ئەمجارە دەیبینی، دەیبینی کە چۆن دەتتەقێنمەوە. بزانین چاوەکانت چۆن لێك دەنێی..."

گڵۆڵە فتیلەیەکی دیکەی هێنا. سەرەکەی لەو دینامێتانە بەست کە بە گیانی کابراوە بەسترابوونەوە و ئالقەکەی کردەوە و گەیشتە پشت گابەردەکە. دەسبەجیٚ ئاگرەکەی کردەوە و بە غاردان هات و سیٚ مەتر لە نزیك کابراوە راوەستا. چاوەکانی زەق زەق دەرپەڕیبوون و بڕیبوونییە ئاگری ئەو فتیلەیەی کە بە دووکەڵکردنەوە لێی نزیك دەبۆوە. بیٚ جووڵە بوو و ملیشی بەرەو لای فتیلەکە جار بە جار درێژتر دەبۆوە. چاوەکانیشی پتر دەرپەڕیبوون و لە ژێڵڵا هاتبوون. فتیلەکە پانزە مەترێکی مابوو بیگاتیٚ. پیاوەکە رەش رەش داگەڕاو و چاوی زەق و دەرەپەڕیو و دەموچاوی شەتڵی ئارەقە... فتیلەکە هەردیٚ و کورتتر دەبێتەوە. ئاخر را بکا یان نا؟ رای کرد، بەڵام گەڕاوە. پێنج هەنگاو. روخساری کابرا زەرد زەرد و چاوەکانی لێك نراو... لە نەکاوی پەلاماری فتیلەکەی دا و پساندی. چۆلەکە و پاسارییەکان لەبەر پەنجەرەکە و لەسەر لك و پۆپی دارەکە جیکەجیکیان بوو. فیشەکەکان بەسپاییەوە لە نێو دەستە لەرزۆکەکانەوە رژانە سەر لۆکەکەوە و ماوەیەك هەر پەرش و بڵاو بوون تا دەستەکانی هێور بوونەوە.

فتیلەکەی دیسان لە دینامێتەکان بەستەوە و سەرەکەی راکێشا و بردییەوە پشت گابەردەکە. پیاوەکە بە شڵەژاوییەوە چاوەکانی هەڵدێنا و لەو ئاگرەی دەبڕین کە فتیلەکەی دەسووتاند و دەهاتە پێشیٚ بۆ ئەوەی بیتەقێنێتەوە و کە پانزە مەترێکی لیٚ نزیك دەبۆوە، دەموچاوی درێژ دەبۆوە و

بەلادا دەهات و ئارەقەی دەکرد و رەنگی هەڵدەبزڕکا و رەش هەڵدەگەڕا و زەرد دادەگەڕت و چاوەکانی زەق دەبوونەوە و دەکەوتنە سەر یەك و سەری بەلامليدا شۆڕ دەبۆوە و دەکەوتە سەر سینگی و چاوەڕێی دوا چرکەسات دەبوو. هەموو ئەوانەی دەدی. سێ هەنگاو، دوو هەنگاو، هەنگاوێك... فتیلەکەی رادەکێشا... ئەو گەمەیە هەتا ئێوارێ هەر بەردەوام بوو و ئەو دینامێتانەی لە کابرا بەسترابوونەوە هەر نەتەقینەوە.

ئەو خوێنەی لە لووتییەوە دەچۆڕایەوە، راوەستا. خوێنی کەفکردووی نێو چەکمەکانیشی نیشتەوە. مێشە سەوزەکان تێکەڵی بوولێڵی ئێوارە بوون. شەو کەوتە سرتوخورت و ورتەورت. پیاوەکەی لە دارەکە کردەوە. دینامێتەکانی لێ کردەوە. پیاوەکە ئاگای لە خۆی نەبوو. بە راکێش راکێش بردییە تەنیشت گابەردەکە. پیاوەکە لەوێ بەبێ جووڵە گرمۆڵە بوو. دینامێتەکانی لە دارەکە بەستنەوە. فتیلەکەی لێ بەست. کێشایە پشت رەوەزەکەوە و ئاگری دا و گوتی:"سەیر کە، سەیر کە چۆن لەتوپەت دەبووی. سەیری دارەکە بکە. سەیری بکە. تەنانەت تۆزێکیشی لێ نامێنێتەوە."

داوە دووکەڵێك بەسەر فتیلەکەوە کشا و گەیشتە دارەکە و لە چاوترووکانێکدا تەقینەوەیەك وەك ئاسمان بڕووخێ، گرمەی هات و رەوەزەکانی لەرزاندەوە و پیاوەکە بەدەست و پێ بەستراوییەوە لە جێی خۆی چەند مەتر لەولاترەوە فڕێ درا و وەعەرزی کەوت. ناڵینێك هات کە ناخی دڵەوە هەستابوو. چاوەکانی زەق بوونەوە و حەپەسا. نە دارێك مابوو و نە ئاسەوارێك لە دارەکە. تەنانەت ئەو گابەردەش کە دارەکەی لێ هاتبووە دەرێ، ئاسەواری لێ نەما.

"بڕوانە، ئاوا دەتتەقێنمەوە. جا چاوت بکەیتەوە یان نەیکەیتەوە..."

کابرا دەتگوت زەردەیەکی بزڕکاوی لەسەر لێوێتی.

خۆرەکە لە پشت مژێکی زەردباوەوە خزی. لە پێشدا درەوشایەوە و دوایی شۆڕ بۆوە و لە داوێنی چیاکە نیشت. چیاکە لە پشت مژەکەوە، زەرد و مۆر و مسی و سوور دەچۆوە و لەو دیوی تەمەکەوە دەتگوت لە مەودایەکی دوورەوە شەپۆل دەدا.

"پێت وایە بەزەییم پێتدا هاتۆتەوە، وایە؟ خۆ دارەکەم پێشان دای... تا بەیانی خەوتی، وایە؟..."

خوناو کەوتبوو. دەتگوت خوێن لە دەماریدا راوەستاوە.

لەسەر لێوی هەڵدێرەکە دارێکی دیکە دیار بوو. ئەستوور و بەرز. وەك دارەکەی دیکەش پڕ بوو لە گرێ. کابرای لەسەر بەردەکە هەڵگرت و رایکێشا و بردی. کابرا بەحاستەم زیندوو بوو. رووت و قووت بوو و تینی لەبەردا نەمابوو. پاڵی بە دارەکەوە دا. کابرا داتەپی و تلپ کەوتە سەر عەرزی و تخێڵ بوو. هەڵیستاندەوە و داینایەوە. بەڵام کابرا خۆی بەسەر پێیانەوە رانەدەگرت. ئاخرییەکەی بە

پەتکێك، کە بە بن پیلیدا هێنابوو، بە لکێکەوە هەڵیواسی. لاقەکانی کابرا گەیشتبوونە عەرزی و سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ ببۆوە. دینامێتەکانی لە لاقی بەست.

"ئێستا، ئێستا مەترسە. تاوێك دواتر هەردووکمان لەو زەلکاوە رزگارمان دەبێ، ئازاکەم. ئیتر بەسە. پێم وایە پاك لە پاك بووین. تۆڵەی هەموو ئەو شتانەم لێ کردیتەوە کە لێم دیتبووی. ئێستاش سەری فتیلەکەت زۆر لێ دوور دەخەمەوە. مەودای نیو سەعاتێك... ئاگرەکە وردە وردە لێت نزیك دەبێتەوە... ئەتۆ بەخێر و ئێمە بە سلامەت."

فتیلەکەی لێ بەست. ئەمجارە سەرەکەی بەرەو رۆژهەلات برد و زۆری دوور خستەوە. زۆر ماندوو ببوو. جگەرەیەکی دەرهێنا و دایگیرساند. پەپوولەیەکی رەشی هێندەی لەپی دەستێك، کە قەراغی رەش و نارنجییەکانی خاڵ خاڵ بوون و دەتگوت کۆبەی* تێ گیراوە، جوولا. پەپوولەکانی دیکەش هاتن. هاتن و هاتن. گوڵە ماهوورەکە رەش هەڵگەڕا. رەوەزەکان جار جار تیشکی نارنجییان لێ هەڵدەستا.

چاوی کابرای دیت. دیسان ملی بەلای فتیلەکەدا درێژ کردبۆوە. درێژ درێژ. چاوەکانی زەق زەق دەرپەڕیبوون و دەماری لاملی وەك کاریتەیان لێ هاتبوو. گنجەکانی دەموچاویشی قوولتر ببوون.

فیشەکەکان لە دەمانچەکەوە دەرژانە نێو لەپی دەستییەوە و لە دەستییەوە دەخرانەوە نێو تۆپەی دەمانچەکەوە و تۆپەکەی پەیتاپەیتا دەخولایەوە.

دەموچاوی لە بن ئاوەکەدا دەتگوت جارێ درێژ دەبێتەوە و جارێ وێك دێتەوە. جووتێك چاوی روون و سەهۆڵین لە بن ئاوەکەدا. چاوەکانی لەبەر یەك دەکشانەوە. وێك دێن و لێك دەنرێن و دەکرێنەوە. زۆر گەورە، زۆر سڕ، لە تەرکی ئاوەکەدا. بریسکەبریسکی چاوەکانی دەلەرزێتەوە و سپیاییەکانی بریقەیان دێ. ئاوەکە تەندوورە دەکا و جووتێك چاوی بریقەداری مات و سڕ لە بن ئاوەکە. قەوزە و وردەچەوە قوڕاوییەکانیش لە تەرکی ئاوەکەدا. ماسییەك دەم لە چاوەکانی دەدا و را دەکا. دوای ئەوە ماسییەکان زیاد دەبن. چاوەکانی دیسان دەکرێنەوە و لێك دەنرێنەوە و دەبنەوە سەهۆڵ. ماسییەکان لە چاوەکانیدا. ئاوەکە دەبزوێ و هێشووی ماسی دەجووڵێن و لە پڕ بلاو دەبن. دیسان لەسەرخۆ و بەترسەوە کۆ دەبنەوە. کۆ دەبنەوە و بلاو دەبنەوە. سێبەرەکانیان لە تەرکی ئاوەکەدا گەمە دەکەن. کەسێکی تۆخ کەوتووەتە سەر زولالییەکە و لەگەڵ شەپۆلەکاندا ورد ورد دەبێ. هێمن، بێ جووڵە، ساتێك...

---

*کۆبەتێگرتن: ئەو پارچەقوماشەی لە قەراغ و لێواری شتێکی دەدوورن. دوورین و داگرتنەوەی لێواری شتێك.

# ٥١

" ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون...

بارانەکە تێکەڵاوی مژ و هەڵمێکی زەرد دەباری. وەك داوی پۆڵایین، بەبێ خواربوونەوە و شکانەوە و لە دڵی ئاسمانەوە تا سەر عەرزی. بریسکەیەکیش جاروبارێ دوور دوور لە ئاسمان... و لە سەرووییەوە سێبەری شۆڕ و لەرزۆك... و هەزاران باڵندەی بچووك لە دارستان و قامیشەڵانەکان هەڵدەفڕین و خۆیان بە بارانەکەدا دەکرد و بڵاو دەبوونەوە. بارانەکە بوو بە قوڕاو. خەست بوو. پیاوی دەخنکاند. هەڵۆیەکی باڵ مسی، باڵەکانی لێك کردبۆوە و خووساو و بێ جووڵە، لە حاڵێکدا شەبەنگی وەك دەرزیی بارانەکە لە باڵ و دەندووك و گیانی دەنیشت، لە نێوان دوو سپیدارەوە و هاوتەریب لەگەڵ زەوی دەخزی و دەخوشی. چاوە گەورە زەقبووەکانی پتەپتیان بوو. تەرمێك لە نێوەڕاستی حەوشەکەدا کەوتبووە سەر قوڕە چەقەکە. لە مژ و هەڵمەکەدا. چاوەکان زەق و وەك شووشە. ترسێکی لەتاریف نەهاتوو لە روخساری نیشت. روخساری مەرگ نا، روخساری ترس و سەرسامیی دەنواندەوە و ترس و سەرسووڕمانەکە جوان دیار بوو. روخسار، چاو و دەست و پێیەکانی و گیانە تۆقیوەکانی کابرا لەبەر بارانەکە و لە نێو هەڵمە زەردەکەدا درێژ و درێژتر و باریکتر دەبۆوە. خوێنەکەی تێکەڵی قوڕەکە دەبوو و قوڕەکە خوێنە بۆندارەکەی هەڵدەمشت. بارانەکە، ئەو خوێنەی دەشوشتەوە کە لە قولینچکی لێوەکانییەوە دەهاتە دەرێ. لك و پۆی گیا "مۆرتك"ەکە لەبەر گوڵی سپی دیار نەبوو و فەزا پڕ بوو لە بۆنی باران و بۆن و بەرامەی مۆرتك و توێکڵی رزیوی دار و پڕ لە بۆنی ژەنگی زەرد. برایم مسگەرەکانی خۆش دەویست. روخساری نوقمی ترسێکی لەنەکاو و خۆشی و شادییەکی تۆقیو. برایم درێژتر دەبۆوە و گیانی بۆنی باروتی لێوە دەهات. لە نیزیکەوە... و سەردولکە و شینگێڕی دەستی پێ کرد. شین و گریانی میرۆ دوورودرێژ و بێ بڕانەوە دەگەیشتە ئەودیوی چیاکان... و چاوی بڕیبووە تەرمە دابێژراوەکەی مێردەکەی. لێوە هەڵقرچاوەکانی و روخساری پڕ لە چڵدان و پەڕین و لەرزین. خزم و کەسی مەحموودیش دەستیان کرد بە پێداهەڵگوتن و

لاواندنەوەی بێ بڕانەو و نامۆ. میرۆ ئێستا زریکەیەکی بەرز... ئۆقرە و ئارامی نییە. لەتوپەت... دەروێش بەگ دەستی لە بن باڵی هەڵپێکاوە ، کافر بەزەیی پێیدا دێتەوە. ئێستا پتر بەزەییت پێدا دێتەوە و بەبێدەنگی لەبەر بارانەکە، بارانە زەردەکە و لە بن باڵە مسییە لێك بڵاوەکانی هەڵۆ بێ جووڵەکەدا لە ئاسمان، راوەستاوە و بەبێ ئەوەی چاو لە مردووەکە هەڵگرێ، لە جێی خۆی نابزوێ.

خوێنی نێو چەکمەکانی، لەسەر رکێفانەوە دەچۆڕێتە خوارێ. دڵۆپەی خوێنەکە خاکەکە قووڵ دەکەن. سمی ئەسپەکە هەتا گوێزینگانی لە قوڕەکە رۆچووە.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا."

کەوتە بەر سمی ئەسپەکە. گەڵای دارەکە هەتا بن ئەژنۆیان حەوشەکەی پڕ کردبوو. لەسەر پشت کەوتبووە سەر گەڵا خووساوەکانی بەرباران. چەند تفەنگێك پەیتاپەیتا لە پشت دیوارەکەوە تەقەیان کرد. خرمەی ناڵ و بزمار دەهات.

سێ کەس وەژوور کەوتن. دانیشتن و دەست لەسەر سینگ و سەرداخستوو. بێ دەنگ راوەستان و چاوەڕێ بوون و ئاخرییەکەی گوتیان.

"سوڵتان ئاغامان رادەست بکە. ئەگەرچی پەنای هێناوەتە بەر سێبەری کۆشکەکەت و ناتوانی بەدەستییەوە بدەی، بەڵام رادەستمانی بکە بەگ..."

لە تاریکایی شەوەکەوە هاتنە دەرێ. خەو برای مەرگە. لە کاتی خەوێدا پەلاماریان هێنا. خەنجەرەکانیان تا بەیانی لە کار دابوو. بەیانی، لەگەڵ تاوکەوتنێ، هەموو وڵات نوقمی خوێن بوو. نێو کۆشکەکە، هەر لە ساوای سەر پشتی لانکەوە بگرە تا منداڵ و کچۆڵە و ژن و مێرمنداڵ و پیاو و پیران، هەر هەموویان درابوونە بەر خەنجەر. هەموو شەلاڵی خوێن بوون.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا... ئەومان بدەیە... لێتی دەستێنین. هەرچی خەڵکی دەشتی حەرانە روو لێرە دەکەن و لێتی دەستێنین. ئێمە ئەومان پێویستە، پێویستمانە. بیدە دەستمان... ئەو مەدە دەست هیچ کەسی دی. باران دەبارێ. ئەو بدە بە ئێمە. بە حورمەتی ئەو تەرمەی لە حەوشە کەوتووە بە ئێمەی بسپێرە..."

بێدەنگ و دەستەونەزەر، هەروا لە تاریکاییدا راوەستان و لێوەکانیان بەبێ جووڵە و ددان لەچیڕەوەبردوو.

بە تەراکتۆر و کامیۆن و ئەسپ و عارەبانەکانیانەوە هاتن. دەستەونەزەر کۆشکەکەیان گەمارۆ دا. چاوەڕێ بوون شەو بەسەردا بێ. شەو لە چیاکانەوە داگەڕا. گەردەلوولێکی بەرز و گەورە و پڕ لە بڵێسە و توند و بەچەرخ و خول لە پشت دەرگا و لە نێو جەرگەی شەودا وێستا.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا..."

سوڵتان ئاغا وەك گڕی تەندووریٚ داییسا و ردیٚنە لوول و رەشەکەی لە ئارەقەدا خووسابوو و دەموچاوی زەرد هەڵدەگەڕا.

شین و لاواندنەوەی میرۆ لە دوورەوە و لەو دیوی شەوەوە دەهات... لەتوکوتی خویٚناویی گیانی مەحموود دەکەوتە سەر قوڕە خویٚناوییەکە و سپیایی ئیٚسکەکانی لە چاویان دەدا و هەڵۆ مسییەکان، باڵیان لیٚك کردبۆوە و لە ئاسمانیٚدا بەبیٚ جووڵە و بەقاوقیژ لەنگەریان گرتبوو.

کەوتە بۆشاییەکەوە. دەرویٚش بەگ بەتاڵ بەتاڵ و نوقمی خەیاڵیٚکی بیٚبڕانەوە. بۆشاییەك لەوبەری مەرگەوە، دوای مەرگ. لیٚی سواری ئەسپەکەی بوو. پیٚی قەرەقیزخاتوونی نەوەد ساڵە لە رکیٚفدا و سەری لەسەر عەرزەکە و لینگدانی بیٚ راوەستان. سەرە خویٚناوییەکەی قەرەقیزخاتوون خویٚنی لەبەر دەڕۆیشت و بەسەر دەوەن و بەرد و قوڵکە و دڕوو و گوڵەکاندا دەکیٚشرا.

گەردەلوولیٚکی بچووك و روون لە دەم ئاناوەرزاوە، لەویٚ، لە دەم رووبارەکەی جەیهانەوە وردە وەردە دەخولایەوە. ئەوەندە لەسەرخۆ بوو دەتگوت ئیٚستا نا ئیٚستا دەکەویٚ.

ئاسکیٚکی لەڕ و لاواز کە هەر ئیٚسك و پیٚستەکەی مابۆوە، لە حاڵیٚکدا ئەژنۆکانی دەنووشتانەوە و لاقەکانی تیٚك دەئالاّن، لە دەم زۆنگاوەکە و بە نیٚو نیٚرگزەکاندا دەکەوت و هەڵدەستایەوە و دەڕۆیشت و لە نیٚو نیٚرگزەجاڕەکەدا جاریٚ لە چاوان ون دەبوو و جاریٚ دەردەکەوتەوە.

دەرویٚش بەگ لە تاریك و روونی بەیانیدا وەك شیٚتان بەدەوری کۆشکەکەدا دەخولایەوە. لە تەنگەی نویٚژی شیٚوانەوە دەینەڕاند و لە حاڵیٚکدا بەدەوری کۆشکەکەدا دەخولایەوە، پەیتا پەیتا فیشەکی بە پەنجەرەکانەوە دەنا.

قەرەقیزخاتوون پیٚی لە رکیٚفان گیر ببوو و سەری کەوتبووە سەر عەرزەکە و شەتڵی خویٚن و چاوی بەستراو. ئەسپەکە بەبیٚ جووڵە هەر دەتگوت لە بەرد داتاشراوە. لاقی قەرەقیزخاتوون لە رکیٚفدا... لاقی راستەی و سەری لە سەر عەرزەکە و بەبیٚ ئەوەی چرچ و لۆچیٚکی لە دەموچاویدا بیٚ. جارچی لە نیٚو ئاوە سویٚر و پڕ لە خویٚیەکەدا گرمۆڵە ببوو.

کووڕە دەموچاوی دریٚژ ببۆوەو ئیٚسکەکانی دەرپەڕیبوون و داچۆڕابوو و چاوەکانی جار بە جار گەورەتر دەبوونەوە..

سەردولکە و شیوەنەکان تیٚکەڵ دەبوون. حەمە عەلی رایکردووە و رۆیشتووە. حەمە عەلی بزر بووە. تەراکتۆر و ترۆمبیٚل و خاکی ئاقچاسازی بەجیٚ هیٚشتووە و سەری خۆی هەڵگرتووە و رۆیشتووە. بەبیٚ ئەوەی قسەیەکی کردبیٚ.

بارانەکە بەلێزمە و وەك داوی پۆلایین بە چڕی دەبارێتە سەر قوڕ و چلپاوەکە و بۆنی مۆرتك فەزای پڕ کردووە.

سێبەری رەشی دەروێش بەگ دەکەوێتە سەر عەرزەکە. گەرماکە کردوویەتە جەحەندەم. دەروێش بەگ بەتاقی تەنێ و بەبێ جوولە لە چەقی دەشتەکەدا راوەستاوە و ئەسپەکەی بنی شەلالی ئارەقەیە.

سەری هەلێنا. کۆشکەکەی ئاق یۆللی دەتگوت لەسەر گەرما هەلکۆلراوە. کرێکارەکان سەریان بەردابۆوە و لە مەزرا و لەبەر گەرما زەردەکە دەتگوت مێروولەن لە هەولێ و تێکۆشاندان.

یەك دوو گەردەلوول لە گردەقوببەوە هەستان و روویان کردە دەییرمەن ئۆجاغی. چیای دولدولێ لە مس و نوقمی بریسکەبریسکێکی سوور و دووکەلاوی. دووکەلی مسی تواوە.

جا لە پشت دەرگا راوەستان.

"سولتان ئاغا، سولتان ئاغا..."

"سولتان ئاغا دەلێ راوەستن، ئەوە دێم. راوەستن هەی سەگینە. راوەستن هاتم. ئەنگۆ هەزار کەسن و ئەمن بەتەنێم. قەیناکا. راوەستن وا هاتم..."

ردێنە رەش و چاوە گەشەکانی... هەلدەستێ و ناتوانێ بەسەر پێوە راوەستێ و دەکەوێ.

ردێنە سپییەکانیان درێژ و چڕ و چلکن بوو. لە بەربەرۆچکەکە، لە بن دیوارەکە دانیشتبوو و پالی بە دارەکەوە دابوو. چاوی لێك نابوو. دەروێش بەگ ئەسپەکەی بەرەو کۆشکەکە لینگ دا و لە حالێکدا پەیتاپەیتا پەنجەرەکانی دەدایە بەر فیشەك، بە دەوری کۆشکەکەدا خولایەوە. کەس لە کۆشکەوە وەلامی نەداوە. دەتگوت چۆلەکەکوژی تێدا نییە.

پیرەپیاوە کەنفتەکە چاوی هەلێنا. کاتێ گەردەلوولەکان لەبەر دەم بایەکەی رۆژئاوا شێوابوون و سێبەری گەوالە هەورە سپییەکان وەك بادەوایەك بەسەر زەوی و زارەکاندا غاریان دەدا، پیرە کەنفتەکە چاوی هەلێنا. دەروێش بەگ هەروا دەخولایەوە، لە حالێکدا بۆشاییەکەی ناخی جار بە جار گەورەتر و بەرینتر دەبۆوە. وەك دوای مەرگ..

" ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و سەری خۆیان هەلگرت و رۆیشتن.